سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٢

# مەکتووبات

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

Nawrasi, Said
نورسی، سعید، ۱۸۷۳ ـ ۱۹۶۰م.
مه کتوبات / بدیع‌الزمان سعید نورسی؛ مترجم فاروق رسول یحیی.-- تهران: احسان، ۱۳۸۳.
۹۰۷ ص.
ISBN: 964-356-399-5
عنوان اصلی: المکتوبات.
کردی.
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
۱. نور سلوک -- عقاید. الف. یحیی، فاروق رسول، ۱۹۵۰ - م، مترجم. ب. عنوان.
BP ۲۴۴/ ۸ن۹۶۰۴۷ ۲۹۷/۵۲۹
۱۳۸۳
کتابخانه ملی ایران ۴۲۵۲۶-۸۳م

## مەکتووبات

✦مؤلف: بدیع‌الزمان سعید نورسی
✦مترجم: فاروق رسول یحیی
✦ناشر: نشر احسان
✦تیراژ: ۱۰۰۰ نسخه
✦نوبت چاپ: اول ـ ۸۴
✦چاپ: چاپخانه مهارت
✦قیمت: ۷۰۰۰ تومان

➢ فروشگاه شمارهٔ ۱: تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ۴۰۶ ـ تلفن: ۶۹۵۴۴۰۴
➢ فروشگاه شمارهٔ ۲: تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۱/۱۱ ـ تلفن: ۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱۴۹۵

ISBN: 964-356-399-5
شابک: ۹۶۴-۳۵۶-۳۹۹-۵



نشر احسان

بسم الله الرحمن الرحيم

وَبِهِ نَسْتَعِينُ

# مەکتووبی یەکەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

"پوختەی وەڵامی چوار پرسیار"

**پرسیاری یەکەم:**

ئایا حەزرەتی "خضر" - دروودی لەسەر بێت - لە ژیاندا ماوە؟

ئەگەر ئێستا لە ژیاندایە، ئەدی بۆچی هەندێ زانای بەڕێز دان بە ژیانیدا نانێن؟

**وەڵام:**

حەزرەتی "خضر" لە ژیاندایە. بەڵام دەبێ بزانرێت کە "ژیان" پێنج پلەی هەیە، ئەو لە پلەی دووهەمیاندایە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەندێ کەس لە زانایان گومانیان لە ژیانیدا هەیە.

چینی *یەکەمی ژیان*: ئەم ژیانەی ئێمەیە، کە پابەندی چەندین هەلومەرجی تایبەتی‌یە.

چینی *دووهەمی ژیان*: پلەی ژیانی حەزرەتی "خضر" و "ئیلیاس"ە - دروودیان لەسەر بێت - کە بە تەواوی پابەندی ئەو هەلومەرجانەی ژیانی ئێمە نی‌یە و هەندێ سەربەستیی تێدایە. واتە دەتوانن لە یەك کاتدا لە چەندین جێی جیاجیادا ئامادە بن و، لە خواردن و خواردنەوەشدا - هەر کات بیانەوێت - سەربەستن. کەواتە ئەوان وەك ئێمە گیرۆدەی پێداویستی‌یە مرۆڤانەکانی ژیان نین.

ئەولیایانی "ئەهلی کەشف و شهوود" چەندین ڕووداوی ڕاستەقینەی ئەم چینەمان بە "تەواتور" بۆ دەگێڕنەوە. ئەو ڕووداوانەی کە ئەوان بۆمان دەگێڕنەوە، بوونی ئەم چینەی ژیانمان بۆ دەچەسپێنن و ڕوونی دەکەنەوە. بە ڕادەیەك کە لە مەقامەکانی ئەولیایاندا مەقامێك هەیە ناوی "مەقامی خضر"ە. چونکە ئەو وەلی‌یەی کە دەگاتە ئەم پلەیە، لەگەڵ حەزرەتی "خضر" دادەنیشێت و دەرسی لە لا دەخوێنێت. بەڵام هەندێ جار بە هەڵە وا گومان دەبرێت کە خاوەنی ئەم پلەیە خودی "حەزرەتی خضر" بێت.

چینی *سێهەمی ژیان*: پلەی ژیانی حەزرەتی ئیدریس و حەزرەتی عیسایە، دروودیان لەسەر بێت.

ئەم چینەی ژیان، لەبەر ئەوەی بە تەواوی خۆی لە پێداویستی‌یەکانی ژیان داماڵیوە و ڕۆشتووەتە ناو ژیانێکی مەلائیکەت ئاساوە، ئەوا ناسکیی "نوورانێتی"ی لەم ڕێیەوە بەدەست هێناوە.

ئەم دوو پێغەمبەرە - دروودیان لەسەر بێت - هەر بە لەشولارە دنیایی‌یەکەیانەوە - کە وەك جەستەیەکی میسالیی نیان و ئەستێرەیەکی ڕووناك وایە - لەناو ئاسمانەکاندا دەژین.

حیکمەتی ئەو فەرموودە پیرۆزەش کە دەری دەخات: حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - لە ئاخر زەماندا دادەبەزێت و بە شەریعەتی حەزرەتی محەمەد ﷺ حوکم دەکات[1] بەم جۆرەی خوارەوەیە:

بەرامبەر بە تەوژمی "ئیلحاد" و "ئینکاری کردنی بوونی خوای گەورە" کە فەلسەفەی سروشتی(ماددی) لە ئاخر زەماندا بەرپای دەکات، ئایینی عیسایی پاڵفتە و پاکژ دەبێت و، دەستی لە خورافات دادەشوات. جا لە کاتی ئەم پاڵفتەبوون و گۆڕانەیدا بۆ ئیسلامەتی، کەسێتیی مەعنەویی حەزرەتی عیسا - کە ئایینەکەیەتی - شمشێری "وەحی"ی ئاسمانی بە دەستەوە دەگرێت و کەسێتیی مەعنەویی ئیلحادی پێ دەکوژێت و لەناوی دەبات، هەروەك خودی حەزرەتی عیسا خۆیشی - کە نوێنەر و نمایندەی

---

(١) ئەمەی مامۆستا نوورسی ئاماژەی بۆ دەکات، لە ڕاستی‌دا ناوەڕۆکی چەندەها فەرموودەی پیرۆزە، کە ئەمەی خوارەوە - بۆ نموونە - یەکێکە لەو فەرموودانە:
عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: "والذي نفسي بيده ليوشكنَّ أن ينـزلَ فيكم ابن مريم حكماً عدلاً، فيكسر الصليب ويقتل الخنـزير، ويضع الحرب ويفيض المالُ حتى لايقبله أحد. حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها". ثم يقول أبو هريرة: اقرؤا إن شئتم: **﴿وإنْ من أهلِ الكتابِ إلاّ لَيُؤْمِنَنَّ به قبلَ موتِه ويومَ القيامةِ يكونُ عليهم شهيداً﴾**(النساء:١٥٩). رواه البخاري ومسلم.

کەسێتیی مەعنەویی ئایینی عیسایی‌یە - بە دەستی خۆی دەجاڵ دەکوژێت کە نوێنەر و نمایندەی ئیلحادە لەناو جیهاندا. واتە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - چەمکی "ئینکاری کردنی بوونی خوای گەورە" دەکوژێت و لەناوی دەبات.

*چینی چوارەمی ژیان*: ژیانی شەهیدانە، کە لە چاو ژیانی مردووانی گۆڕستاندا گەلێ بەرز و بڵندترە، وەك بە دەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە.

بەڵێ، ئەو شەهیدانەی کە لە پێناوی ڕاستیدا ژیانی دنیایان بەخت کردووە، خواوەندی مەزن - بە کەماڵی بەخشندەیی خۆی - لە جیهانی بەرزەخدا ژیانێکی هاووێنەی ژیانی دنیایان پێ دەبەخشێت، بەڵام ژیانێکی بێ ئازار و پەژارە و ماندوویی، چونکە ئەوان بە خۆیان نازانن کە مردوون، بەڵکو لایان وایە بەرەو جیهانێکی باشتر گواستوویانەتەوە. لەبەر ئەوە، تام و چێژ و بەختەوەریی تەواو لەو ژیانەیان دەبەن و، ئازاری لێکدابڕان و جودایی خۆشەویستان ناچێژن وەك ئەوەی مردووانی تر دەیچێژن، چونکە مردووانی تر هەرچەندەش ڕۆحەکانیان ماوەتەوە، بەڵام بە خۆیان دەزانن کە مردوون. هەر لەبەر ئەوەشە کە لەزەت و بەختەوەریی مردووانی تر لە جیهانی بەرزەخدا گەلێ کەم و کورتترە لەچاو ئەو تام و لەزەتەی کە شەهیدان لە ژیانی بەرزەخیان دەیچێژن.

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی کە:

دوو کەس لە خەونیاندا ڕۆشتنە ناو کۆشکێکی ڕازاوە و ڕەنگینی چەشنی بەهەشت. یەکێکیان لە خەونەکەیدا دەیزانی کە ئەوەی دەیبینێت خەونە و ڕووداوی ڕاستەقینە نی‌یە. لەبەر ئەوە، تام و لەزەتێکی کەمی لەو خەونەی دەچەشت، چونکە خۆی بە خۆی دەوت: "هەر ئەوەندەی لە خەو بێدار بوومەوە ئەم تام و چێژە نامێنێت"! بەڵام ئەوی تریان نەیدەزانی کە ئەوەی دەیبینێت خەونە. لەبەر ئەوە هەستی بە لەزەت و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێ گەرد دەکرد.

هەر بەم چەشنەش دەستکەوتی "شەهیدان" و "مردووانی تر" لە ژیانی بەرزەخدا لە یەکتر جیایە.

بەدەستهێنانی ئەم جۆرە ژیانە بۆ شەهیدان و، باوەڕبوونیان بەوەی کە زیندوون و نەمردوون، بە چەندەها ڕیوایەت و ڕووداوی زۆری لەسنووربەدەر چەسپاوە. بە ڕادەیەك کە پەنادانی حەزرەتی حەمزەی "سەرداری شەهیدان" بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە پەنایان بۆ بردووە و، ئەنجامدانی خواستە دنیایی‌یەکانیان و هاندانی بۆ کەسانی تریش کە ئەو

خواستەی پەنابۆهێنەرانی ئەنجام بدەن.. ئەمانە و چەندین ڕووداوی تری هاوبابەت، ژیانی شەهیدانی ئەم چینەی چەسپاندووە و ڕوونی کردووەتەوە. تەنانەت من خۆم ئەمەی خوارەوەم بەسەر هاتووە:

"عوبەید"ی خوشکەزام یەکێك بوو لە قوتابی‌یەکانم و، لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا لە نزیکی منەوە و لە بریی من شەهید بوو. جا هەرچەندە من لە دیلی‌دا بووم و نەمدەزانی لە کوێ نێژراوە و سێ مانگە ڕێش لە شوێنی ناشتنیەوە دوور بووم، کەچی لە خەونێکدا کە پێم وایە: "رؤيا صادقة" بوو، ڕۆشتمە ناو گۆڕەکەیەوە کە لە خانوویەك دەچوو لە ژێر زەوی‌دا بنیات نرابێت. لەو خەونەدا ئەوم لە چینی پلەی شەهیداندا بینی. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە من مردووم و پێی ڕاگەیاندم کە گەلێ بۆم گریاوە! باوەڕیشی وابوو کە هێشتا خۆی ماوە، بەڵام لەتاو مەترسیی داگیرکردنی ڕووس خانوویەکی جوانی لە ژێر زەوی‌دا بۆ خۆی بنیات ناوە!

جا ئەم خەونە هەندەکی‌یە، لەگەڵ هەندێ مەرج و نیشانەدا، قەناعەتی تەواوی تا پلەی "شهود"ی سەبارەت بەو ڕاستی‌یە پێ بەخشیم.

چینی *پێنجەمی ژیان*: ژیانی "ڕۆحانی"ی مردووانی گۆڕستانە.

بەڵێ، "مردن" بریتی‌یە لە: جێ گۆڕین و، سەربەست بوونی گیان و، تەسریح بوون لە کار و فرمان.. "مردن" هەرگیزاو هەرگیز: ئیعدام و نەبوون و نەمان نی‌یە. چونکە:

دەرکەوتنی ڕۆحی ئەولیا و بەرجەستە بوونیان بۆ "ئەهلی کەشف" بە چەندین ڕووداوی لەژمارەبەدەر..

هەروەها پەیوەندیی گشت مردووانی گۆڕستان بە ئێمەوە، چ لە بێداری و چ لە خەوندا..

هەروەها یەکاویەك دەرچوونی ئەو هەواڵانەی کە ئەوان ڕایاندەگەیەنن لەگەڵ واقیعدا..

ئەمانە و، چەندین بەڵگەی تری هاوچەشنی ئەمانە، ئەم چینەی ژیان دەچەسپێنن و ڕوونی دەکەنەوە.

وتەی "بیست و نۆهەم" کە تایبەتە بە باسی "مانەوەی ڕۆح"ەوە، بە چەندین بەڵگەی گومانبڕ و بە تەواوی ئەم چینەی "ژیان"ی چەسپاندووە.

**پرسیاری دووهەم:**

ئایەتی پیرۆزی: ﴿الذي خَلَقَ الموتَ والحياةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً﴾ (الملك:٢) لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەکانی تری هاووێنەی‌دا: "مردن" وەك "ژیان" بە "نیعمەت" و

"بەدیهێنراو"ێکی خوای گەورە دادەنێن. بەڵام خۆ وەك لە بەرچاودایە "مردن": هەڵوەشان و نەمان و داڕزان و کوژانەوەی ڕووناکیی ژیان و لەناوچوونی هەموو تام و چێژەکانە، ئیتر چۆن بە "نیعمەت" و "بەدیهێنراو" دادەنرێت؟

**وەڵام:**

لە کۆتایی وەڵامی پرسیاری یەکەمدا وتمان:

"مردن" - لە ڕاستیدا - تەسریح بوون و کۆتایی هێنانە بە ژیانی دنیا و، "جێ" و "بوون" گۆڕینە و، بانگەواز و پێشەکی‌یە بۆ ژیانی هەمیشەیی نەبڕاوە. چونکە هەروەك هاتنەدنیای "ژیان" بەپێی نەخشە و بەدیهێنانی خوای گەورەیە، ماڵئاوایی کردنیشی لە دنیا بە هەمان جۆرە؛ دەبێ بەپێی نەخشە و بەدیهێنانی خاوەند بێت. چونکە مردنی ساکارترین زیندەوەر (کە ڕووەکە) ڕێسایەکی ئەوەندە ورد و داهێنانکاری‌یەکی وەهای لەمەڕ بەدیهێنان تێدایە کە لە خودی ژیان گەلێ مەزنتر و ڕێکوپێکتر و خاوەن ڕێساترە. بۆ نموونە: مردنی "بەر" و "تۆو" و "دانەوێڵەکان" کە بە ڕواڵەت داڕزان و هەڵوەشانەوەیە، لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە: هەڵشێلانی زنجیرە کارلێکێکی کیمیایی لەوپەڕی وردی و تەرازوو کاری و.. پێکهێنان و ڕێکخستنی گەردیلەکان لەگەڵ یەکتردا بەوپەڕی دانایی و وردبینی. بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئەو "مردن"ەی بە چاو نابینرێت و ئەم هەموو ڕێسا پڕ لە دانایی و وردەکاری‌یە قەشەنگانەی تێدایە، لە شێوەی "ژیانێك"ی گەشەکردووی گوڵەگەنم و ڕووەکی باڵابەرز و بەرداردا دەردەکەوێت. ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە مردنی "تۆو" سەرەتای ژیانی نوێی ڕووەکە، چ ڕووەکێك بێت گوڵ بگرێت یاخود بەردار بێت. بەڵکو لە ڕاستیدا مردنەکەی خودی ژیانە نوێ‌کەیەتی! کەواتە مردن بەدیهێنراوێکی کتومت وەك ژیانە.

هەروەها ئەو خۆراکەی کە بەروبوومێکی زیندووە یاخود شتێکی گیاندارە و لە گەدەی مرۆڤدا دەمرێت، لە ڕاستیدا مردنەکەی سەرەتای بەرزبوونەوە و سەرکەوتنیەتی بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێك لەناو ژیانی بەرەوپێشچووی مرۆڤدا. کەواتە مردنەکەی بەدیهاتوویەکی گەلێ ڕێکوپێکترە لە ژیانی یەکەم جاری ئەو خۆراکە.

جا ئەگەر مردنی ڕووەك - کە لە نزمترینی چین و پلەکانی ژیاندایە - بەدیهاتوویەکی ئاوا ڕێکوپێك و پڕ لە دانست بێت، دەبێت مردنی مرۆڤ چۆن بێت کە خاوەنی بلندترینی چینەکانی ژیانە؟

کەواتە – بێ هیچ گومانێك – مردنی مرۆڤ ژیانێکی هەمیشەیی لە جیهانی بەرزەخدا بەرهەم دەهێنێت، کتومت وەك "تۆو" کە بە مردنی لە ژێر خاکدا دەبێت بە ڕووەکێکی تابلێی ڕەنگین و جوان و پڕ لە دانایی لە جیهانی هەوادا.

ئنجا سەبارەت بەوەش کە ئایا چۆن مردن بە "نیعمەت" دادەنرێت، ئەوا بۆ وەڵامی ئەمە تەنها چوار "ڕوو" لەو ڕووە زۆر و زەبەندانە باس دەکەین کە دەری دەخەن: مردن "نیعمەت"ە:

یەکەم: مردن بریتییە لە ڕزگاربوونی مرۆڤ لە کار و فرمانی ژیانی دنیا و ئەرکی قورس و سەختی گوزەران. لە هەمان کاتیشدا دەرگای بە یەك گەیشتنەوەیە لەگەڵ نەوەد و نۆ لە سەدی خۆشەویستاندا کە لە جیهانی بەرزەخدان. کەواتە لەم ڕووەوە "مردن" نیعمەتێکی گەلێ مەزنە.

دووهەم: مردن دەرچوونە لە بەندیخانەی تەنگ و تار و شڵەژاوی دنیا و، ڕۆیشتنە بۆ ژێر سایەی چاودێری و میهرەبانیی فراوانی خۆشەویستی ڕاستەقینە و هەمیشەیی. هەروەها لەزەت چەشتنی نیعمەتی ژیانی فراوان و ڕووناك و بەردەوامە کە هیچ مەترسییەك تاڵی ناکات و، لێڵیی هیچ خەم و پەژارەیەکیش ئاوێتەی نابێت.

سێهەم: "پیری" و هۆکارەکانی تری هاوچەشنی، کە "ژیان" لە مرۆڤ دەکەن بە ئەرکێکی ناهەموار و بارێکی دژوار، دەری دەخەن کە "مردن" نیعمەتێکە گەلێ لە نیعمەتی "ژیان" بڵند و پایە بەرزترە!

چونکە ئەگەر بێت و وا دابنێیت کە هەموو باپیرانی پێشینت چووبن بە ساڵدا و لەگەڵ باوك و دایکی پیر و پەککەوتەت ئێستا لە ژیاندا مابن و تێکڕا گیرۆدەی چەندین باری بەسوێ و ئازار بووبن و لە بەرچاوتدا بەو حاڵە پەرێشانەوە بتلێنەوە، ئەوا تێدەگەیت کە ژیان چەندە مایەی بێزاری و پەرێشانییە و، مردنیش نیعمەتێکی چەندە بەرز و بەنرخە!

جگە لەمەش، گەر مرۆڤ بیر لە مردنی ئەو مێش و مێروووە ڕەنگینانە بکاتەوە کە شەیدای گوڵە ناسکۆڵە و خەمڵاوەکانن و، لە دەمی پەرەسەندنی سەرمای سەختی ڤزستاندا دەمرن و ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵن، ئەوا مەودای ئەو میهرەبانییە تێدەگات کە لە مردندا هەیە و، ئەو سەختی و گیروگرفتانەشی بۆ دەردەکەوێت کە ئەو مێروووانە گرفتاری دەبوون گەر درێژە بە ژیانیان بدرایە!

*چوارەم:* هەروەك "نوستن" حەوانەوە و میهرەبانییە بۆ مرۆڤ، بە تایبەت بۆ گیرۆدەبووان و زامدار و بیماران، بە هەمان جۆر "مردن"یش – کە برای نوستنە –

میهرەبانیو نیعمەتێکی مەزنە بۆ هەموو ئەو کەسانەی گیرۆدەی بەڵای ئەوەندە سەخت بوون، کە لەوانەیە دووچاری خۆکوشتنیان بکات.

(هەموو ئەم نیعمەتانەی کە باس کران، هی مردنی ئیماندارانن) بەڵام مردنی گومرایان - چەشنی ژیانیان - بەڵایەکی مەزن و ئەشکەنجەیەکی ئاوێتەی ئازارە، وەك لە چەندین "وتە"دا بە جۆرێکی گومانبڕ چەسپاندوومانە. دیارە ئەم لایەنەش لە دەرەوەی بازنەی ئەم باسەی ئێرەدایە.

**پرسیاری سێهەم:**

دۆزەخ لە کوێیە؟

**وەڵام:**

جگە لە خوای گەورە کەس ئاگاداری "غەیب" نییە. خواوەند دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللهِ﴾ (الملك:٢٦). بەڵام لە هەندێ ڕیوایەتدا ئەوە هاتووە کە: "دۆزەخ لە ژێر زەویدایە". چونکە گۆی زەوی بە سووڕانەوە ساڵانەکەی خۆی هێڵی بازنەیەك بە دەوری گۆڕەپانێکدا دەکێشێت کە لە دواییدا دەبێت بە جێی حەشری دواڕۆژ، وەك لە چەندین شوێنی تردا ئەمەمان ڕوون کردووەتەوە.

مەبەستی ئەو ڕیوایەتانەش کە دەڵێن: "دۆزەخ لە ژێر زەویدایە" ئەوەیە کە لە ژێر سووڕگە ساڵانەکەی زەویدایە. هۆی نەبینین و هەست پێنەکردنیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دۆزەخ ئاگرێکی بێ ڕووناکییە و بە پەردەیەك داپۆشراوە. ئنجا گومانیش لەوەدا نییە کە لە نێوان ئەو ماوە(مسافة) یەکجار زۆرەی سووڕگەی ساڵانەی زەویدا گەلێ بەدیهاتووی زۆر و زەبەندە هەن کە لەبەر ئەوەی دارای ڕووناکی نین، دەرناکەون و بە چاو نابینرێن. واتە هەروەك "مانگ" کاتێك ڕووناکیی ئاراستە ناکرێت نابینرێت و هەست بە بوونی ناکرێت، بە هەمان جۆر گەلێ بوونەوەر و تەن و قەبارەی تریش هەن کە بەهۆی ئەوەی تاریکن و ڕووناکییان نییە، لێمان دەرناکەون و بە چاو نابینرێن، هەرچەندەش لە بەرچاوماندا بن.

ئنجا دۆزەخیش دوو دۆزەخە: دۆزەخی بچووك و دۆزەخی گەورە..

بچووکەکەیان وەك "ناوك"ی گەورەکەیان وایە، چونکە لە پاشەڕۆژدا دەبن بە یەك و، بچووکەکەیان مەنزڵێك دەبێت لە مەنزڵگاکانی گەورەکەیان.

واتای ئەوەش کە: "دۆزەخی بچووك لە ژێر زەویدایە"، ئەوەیە کە: لەناو چەقی زەویدایە. چونکە "ژێر"ی هەر تۆپێك بریتییە لە چەقەکەی. ئەوەتا وەك لە زانیاریی

"چینەکانی زەوی"دا دەرکەوتووە: هەرکات زەوی هەڵدەکەنرێت، بە هەڵکەندنی هەموو سی و سێ مەترێك – زۆربەی جار – یەك پلەی گەرما زیاد دەکات. واتە پلەی گەرمای چەقی زەوی دەگاتە دووسەد هەزار پلە، چونکە نیوەتیرەی زەوی لە شەش هەزار کیلۆمەتر زیاترە. واتە ئاگری چەقی زەوی دووسەد ئەوەندەی ئاگری سەر ڕووی دنیایە. ئەمەش لەگەڵ فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ یەکاویەك دەردەچێت[1]!

ئەم دۆزەخە بچووکەش گەلێ ئەرك و فرمانی دۆزەخی مەزنی ئەنجام داوە و دەیدات، چ لەم دنیا و چ لە جیهانی بەرزەخدا، وەك فەرموودە پیرۆزەکان ئاماژەیان بۆ کردووە.

بەڵام لە جیهانی دوارۆژدا "گۆی زەوی" خۆی لە دانیشتووانی خاڵی دەکاتەوە و دەیانهاوێتە ناو مەیدانی حەشرەوە، دۆزەخە بچووکەکەی ناویشی – بە فەرمانی خوای گەورە – بە دۆزەخی مەزن دەسپێرێت.

ئەو وتەیەی هەندێ لە زانایانی موعتەزیلە کە وتوویانە: "هێشتا دۆزەخ دروست نەکراوە". هەروەك هەڵەیە، لە هەمان کاتدا کەودەنییەکی ئاشکرایشە! هۆی ئەم هەڵەیەشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە "ئێستا" دۆزەخ بە تەواوی دەرنەکەوتووە و بەو جۆرەی کە خەڵکی سەر زەوی دەیانەوێت ئاشکرا نەبووە.

ئنجا دەبێ بزانین بینینی مەنزڵگاکانی دوارۆژ – کە بە پەردەی چاوە دنیاییەکانمان داپۆشراون و ڕووپۆشی غەیبیان بەسەردا دراوە – تەنها بەوە دەبێ کە تێکڕای گەردوون (واتە دنیا و قیامەت) هێندەی دوو شار بچووك بکرێنەوە، یاخود چاوەکانی ئێمە بە ئەندازەی ئەستێرەکان گەورە بکرێن تاکو جێگاکانی ئەو مەنزڵگایانەی دوارۆژ ببینرێن و پیشان بدرێن! چونکە مەنزڵگاکانی سەر بە ژیانی دوارۆژ بە چاوە دنیاییەکانی ئێمە نابینرێن. "والعلم عند الله".

بەڵام لە ئاماژەکانی هەندێ ڕیوایەتەوە دەردەکەوێت کە دۆزەخەکەی دوارۆژ پەیوەندیی بەم دنیایەی ئێمەوە هەیە. چونکە لە بارەی گەرمای بەتینی هاوینەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "من فيح جهنم"[2]. واتە: گەرمای بەتینی هاوین لە گڕەی دۆزەخەوەیە. کەواتە ئەو ئاگرە هەرە بەتین و مەزنەی دۆزەخ بە چاوی ژیرییە کزەکانی ئێمە

---

(١) سەبارەت بە پلەی گەرمای دۆزەخەوە سەیری ئەم سەرچاوانەی فەرموودە بکە:
البخاري – بدأ الخلق: ١٠، مسلم – الجنة: ٣، الترمذي – جهنم: ٧، المسند ٢/٣١٣. (وەرگێڕ)

(٢) دەقی فەرموودەکە: قال النبي ﷺ: "أبردوا بالظهر فإنَّ شدةَ الحرِّ من فيحِ جهنم". رواه البخاري وأحمد وابن ماجه عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه. (وەرگێڕ)

نابینرێت. بەڵام دەتوانین لەبەر ڕووناكایی ناوی "الحكیم"ی خوای گەورەدا بەم جۆرەی خوارەوە بۆی بڕوانین:

ئەو دۆزەخەی كە لە ژێر سووڕگەی ساڵانەی زەویدایە، وەك ئەوە وایە دۆزەخە بچووكەكەی ناوچەقی زەویی كردبێت بە وەكیلی خۆی و، بەم پێیە ئەم دۆزەخ كارەكانی ئەو دۆزەخ جێبەجێ بكات. خۆ موڵكی خواوەندی بەتوانای شكۆمەندیش تابڵێی فراوانە و، دانستی ئەو خواوەندەش دۆزەخ بۆ هەر لایەك ئاراستە بكات، ئەوا لەوێدا سەقامگیر دەبێت.

بەڵێ، ئەو بەتوانا شكۆمەند و دانا خاوەن كەماڵەی كە دارای فەرمانی: ﴿كُنْ فَيَكُونْ﴾ە و.. وەك لە بەرچاودایە بەپێی ڕێسا و دانایییەكی تەواو "مانگ"ی پەیوەستەی "زەوی" كردووە و.. بە هەمان ڕێسا و بەپێی مەزنیی توانستی خۆی زەویشی پابەندی "خۆر" كردووە و.. بەهۆی مەزنیی پەروەردگارێتییە شكۆدارەكەیەوە خۆریشی - لەگەڵ هەسارە گەڕۆكەكانیدا - بە خێراییەكی نزیك لە خێرایی سووڕانەوەی ساڵانەی زەوی، خستووەتە گەڕ و، بەرەو "خۆری خۆران" (لەسەر بناغەی فەرەزییەیەك) دەیداتە بەر و.. ئەستێرە درەخشان و چرا ئاساكانیشی كردووە بە چەند بەڵگە و نیشانەیەكی نووورانی و ڕووناك لەسەر مەزنیی پەروەردگارێتیی خۆی و، بەمەش پەروەردگارێتیی شكۆمەند و مەزنیی توانستی یەكجار بەدەستەڵاتی خۆی دەرخستووە.

بەڵێ، لە كەماڵی دانایی ئەم بەتوانا شكۆمەندە و لە مەزنیی توانا و دەستەڵاتە پەروەردگارییەكەیەوە، هەرگیز ئەوە بە دوور نازانرێت كە دۆزەخی وەك گەنجینەی كارگەیەكی ڕووناكیبەخش لێ كردبێت و ئەو ئەستێرانەی پێ داگیرساندبێت كە ڕوویان لە دواڕۆژە و، لەو گەنجینەیەوە گەرمی و هێزیان پێ ببەخشێت. واتە: گەرمی و ئاگریان لە دۆزەخەوە بۆ بنێرێت و لە بەهەشتیشەوە - كە جیهانی ڕووناكییە - نوور و ڕووناكییان بۆ ڕەوانە بكات و، لە هەمان كاتیشدا دۆزەخ بكات بە نیشتەجێ و بەندیخانەی ئەوانەی كە شایانی تۆڵە و سزان.

هەروەها ئەو بەدیهێنەرە دانایەی كە درەختێكی گەورە و زەبەلاحی بە ئەندازەی چیایەك لە تۆوێكی یەكجار بچووكی چەشنی تۆوە خەرتەلەیەكدا هەڵدەگرێت، هەرگیز لە توانا و دانایی ئەو بەدیهێنەرە بە دوور نازانرێت كە دۆزەخی هەرە مەزنیش لەناو تۆوی ئەو دۆزەخە بچووكەدا بپارێزێت كە لە ناو چەقی گۆی زەویدایە.

لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

"بەهەشت" و "دۆزەخ" دوو بەری پەلی درەختی بەدیهاتووانن، تا ئەبەد شۆڕ بوونەتەوە. دیارە جێی بەریش لە کۆتایی پەلدایە..

هەردوو کیان ئەنجامی زنجیرەی ئەم بوونەوەرانەن. دیارە جێی ئەنجامیش لە کۆتایی زنجیرەکەدایە، نزم و قورسەکان لە لای خوارەوە و ڕووناکەکانیش لە لای سەرەوە..

ئەو دوانە، گەنجینەی لافاوی کاروبارە خواییەکان و داهاتە مەعنەوییەکانی گۆی زەوین. وەك ئاشکرایشە شوێنی گەنجینە بەپێی جۆری داهاتەکەیە: خراپ لە بنەوە و باشیش لە سەرەوە..

هەروەها ئەو دوانە دوو گۆمن بۆ پەنگ خواردنەوەی ئەو بوونەوەرە لافاو ئاسایانەی کە تا ئەبەد بەخوڕ دەڕۆن و شەپۆل دەدەن. خۆ جێی حەوز و گۆمیش لەو شوێنەدایە کە لافاوی تێدا دەگیرسێتەوە، واتە: چەپەڵەکان لە بنکدا دەنیشن و خاوێن و پاڵفتەکانیش سەردەکەون..

هەروەها دوو جێگان بۆ درەوشانەوە و دەرکەوتنی "لوتف" و "قەهر" و، "میهرەبانی" و "مەزنی"ی خواوەند. خۆ دەکرێ شوێنی لێدرەوشانەوە لە هەموو جێیەکدا بێت. خواوەندی میهرەبان و "قەهھار" و خاوەنی "جوانی و شکۆمەندی" لە هەر جێیەك ویستی لەسەری بێت درەوشانەوەی خۆی دەردەخات.

بوونی "بەهەشت" و "دۆزەخ" بە جۆرێکی گومانبڕ لە وتەی: دەهەم و بیست و هەشتەم و بیست و نۆهەمدا چەسپاوە. بەڵام لێرەدا ئەوەندە دەڵێین کە:

بوونی "بەر" بە ئەندازەی بوونی "لق" یەقین و دڵنیاییبەخشە..

بوونی "ئەنجام"یش بە قەدەر بوونی "زنجیرە" لە گومان بەدەرە..

بوونی "گەنجینەی ئازووقە"ش بە ئەندازەی بوونی "داهاتەکان" بێ گومانە..

بوونی "حەوز"یش بە قەدەر بوونی "جۆگە" گومان لێ نەکراوە..

شوێنی لێدرەوشانەوەش بە قەدەر دڵنیاییمان لە بوونی "میهر" و "قەهر" ئاشکرایە و دوور لە هەموو دوودڵییەکە.

**پرسیاری چوارەم:**

عیشقی "مەجازی"ی خۆشەویستان دەکرێ بگۆڕێت و لە ئەنجامدا ببێت بە عیشقێکی "حەقیقی". جا ئایا دەگونجێ ئەو عیشقە مەجازییەی دنیاش کە لە دڵی زۆربەی خەڵکیدا هەیە، ئەویش بگۆڕێت بە عیشقی حەقیقی؟

وەڵام:

بەڵێ.. بە مەرجێ ئەو عاشقە مەجازییەی "ڕووە فانییەکەی" دنیا، چەپەڵی و ناشیرینیی نەمان و لەناوچوونی ئەو ڕووە ببینێت و، لەمەوە پشتی تێ بکات و، بە دوای خۆشویستراوێکی هەمیشەیی لەناونەچوودا بگەڕێت و، خوای گەورەش یارمەتیی بدات بۆ بینینی دوو ڕووە جوانەکانی دنیا، کە بریتین لە: "ئاوێنەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە" و "کێڵگەی دواڕۆژ". ئیتر ئەو کاتە عیشقە مەجازییە نارەواکەی ئەو عاشقەی دنیا دەبێت بە عیشقێکی ڕاستەقینە(حەقیقی). بە مەرجێ دنیا فانی و لەناوچووە بگۆڕەکەی خۆی کە پەیوەندیی بە ژیانی تایبەتیی خۆیەوە هەیە، لەگەڵ دنیا دەرەکییە گشتییەکەدا لێ نەئاڵۆزێت. چونکە ئەگەر ئەویش چەشنی گومڕا و بێئاگایان خۆی لە بیر بچێتەوە و لە ئاسۆکانی دنیادا ڕۆبچێت و بکەوێتە ناو داوی ئەو گومانەی کە لای وابێت دنیا تایبەتییەکەی بە وێنەی دنیا گشتییەکە وابێت و، لەم ڕێیەوە گرفتاری عیشقی دنیا ببێت، ئەوا لە لیتاوی "سروشت"دا دەچەقێت و تیایدا دەخنکێت، مەگەر کەسێك دەستی چاودێری پەروەردگار - بە چەشنێکی دەراسا(خارق) - فریای بکەوێت و لەو بارە ناهەموارە ڕزگاری بکات.

سەرنج لەم نموونەیەی خوارەوە بدە کە ئەم ڕاستییەت بۆ ڕوون دەکاتەوە:

وا دابنێ ئێمە - هەر چوارمان - ڕۆشتینە ناو ژوورێکەوە کە هەر چوار دیوارەکەی بە ئاوێنەی گەورە گەورەی پڕ بەو دیوارانە داپۆشرابوون. وەك ئاشکرایە ژوورەکە بەم ئاوێنانە دەبێت بە پێنج ژوور، یەکێکیان ژوورێکی ڕاستەقینە و گشتییە و چوارەکەی تریش میسالی و تایبەتین.

ئنجا هەریەك لە ئێمە لە ڕێی ئاوێنەکەی خۆیەوە، دەتوانێت شکڵ و شێوە و ڕەنگ و ڕوخساری ژوورە تایبەتییەکەی خۆی بگۆڕێت و دەستکاریی بکات. خۆ ئەگەر ئاوێنەکەمان بە سوور ڕەنگ بکەین ئەوا ژوورەکەمان سوور پیشان دەدات و، گەر ڕەنگی سەوزیشی بکەین، ژوورەکەمان سەوز پیشان دەدات.

بەم پێیە دەتوانین تەنها بە دەستکاری کردنی ئاوێنەکە چەندین باری جۆراوجۆر بەسەر ئاوێنەکەدا بهێنین. واتە: دەتوانین لە چەندەها باری جوان و ناشیریندا، یان هەر شکڵ و شێوەیەکدا بمانەوێت، ژوورەکەمان دەربخەین. بەڵام هەر بەو ئاسانییە ناتوانین دەستکاری و ئاڵوگۆڕ لە ژوورە گشتییە دەرەکییەکەدا بکەین، چونکە هەرچەند ژوورە گشتی و ژوورە تایبەتییەکان لە ڕاستیدا هەر یەکێکن، بەڵام حوکمی

هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە، ئەوەتا دەتوانیت تەنها بە بزواندنی پەنجەت ژوورەکەی خۆت تێکبشکێنیت و بیڕووخێنیت، بەڵام ناتوانیت بەردێك لە ژوورە گشتییەکە - بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەکیش - لە جێی خۆی بترازێنیت!

دنیاش بە هەمان جۆرە، چونکە "مەنزڵ"ێکی مەزنی ڕازاوەیە و، "ژیان"ی هەریەکەشمان ئاوێنەیەکی گەورە و فراوانە. هەموو یەکێك لە ئێمە لە ناوەندی ئەم دنیا گشتییەدا دنیا و جیهانێکی تایبەتیمان هەیە. ستوون و مەڵبەند و دەرگای دنیا و جیهانە تایبەتییەکەی هەر یەکەمان "ژیان"ەکەمانە. بەڵکو - لە ڕاستیدا - دنیا و جیهانە تایبەتییەکەمان لاپەڕەیەکە و ژیانیشمان پێنووسە، گەلێ شت بەو پێنووسە لەسەر لاپەڕەی تۆماری کردەوەکانماندا دەنووسرێن.

جا ئەگەر لە پێشدا "دنیا تایبەتییەکەی خۆمان" خۆش بوێت و پاشان بۆمان دەربکەوێت و هەست بکەین کە ئەویش وەك "ژیان"ەکەمان فانییە و بەرەو نەمان دەڕوات، چونکە دەبێ بە دڵنیاییەوە ئەوە بزانین کە ئەم دنیا تایبەتییەمان لەسەر بناغەی ئەو ژیانە فانییە بنیات نراوە، ئەوا ئەو کاتە خۆشویستنی دنیاکەمان دەبێت بە خۆشویستنی "نەخشونیگار"ی ناوە جوانەکانی خوای گەورە کە لە ئاوێنەی دنیا تایبەتییەکانماندا دەردەکەون، ئنجا لەویشەوە - ئەو خۆشەویستییە - دەگوێزرێتەوە بۆ خۆشویستنی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە.

پاشان هەرکات پەیمان برد بەوەی کە دنیا تایبەتییەکەمان "کێڵگە"یەکی کاتییە بۆ "داهاتەکان"ی ئەودنیا و بەهەشت، ئنجا هەموو هەست و نەستە توند و تیژەکانمان کە بۆ دنیا بەکاریان دەهێنین (وەك: هەڵپە و خۆشەویستی و داواکاریی دنیا) هەموویانمان بەرەو ئەنجام و بەربووم و داهاتەکانی ئەو کێڵگەیە ئاراستە کرد کە سوود و دەسکەوتەکانی سەر بە دواڕۆژن، ئەوا ئەو کاتە عیشقە مەجازییەکەمان دەبێت بە عیشقێکی حەقیقی. دەنا گەر بە پێچەوانەی ئەمە ڕەفتار بکەین، دەچینە ڕیزی ئەوانەی کە خوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿نَسُوا اللهَ فأنْساهم أنْفُسَهُمْ أُولئِكَ هُمُ الْفاسِقُونَ﴾ (الحشر:١٩).

کەواتە ئەو کەسەی کە خۆی لە یاد دەچێتەوە و ئاگای لە خۆی نامێنێت و بیر لە نەمان و تیاچوونی ژیانی ناکاتەوە و، لای وایە دنیا تایبەتییە فانییەکەی چەشنی دنیا گشتییەکە نەگۆڕ و چەسپاوە و، تەواوبوونی ژیانیشی لە بیرچووەتەوە و خۆی لە ژیاندا بە نەمر و ڕەگ داکوتاو دەزانێت و، پاڵی لێ داوەتەوە و پشتێنی لێ شل کردووە و، بە

توندی دەستی بە داوێنی دنیاوە گرتووە.. ئەو کەسەی ئەمە ڕەفتاریەتی، سەرەنجام لەو دنیایەدا کە خۆشی ویستووە نوقم دەبێت تا بە تەواوی تیادەچێت!

کەواتە ئەو خۆشەویستی‌یەی دنیا، میهرەبانی و دڵنەرمی‌یەکی نائومێدی‌دەری چەشنی نائومێدیی هەتیوان بەرهەم دەهێنێت. ئیتر ئەو مرۆڤە لەتاو باروودۆخی زیندەوەرانی دەوروبەری ئازار دەچێژێت، تەنانەت بە هەستێکی گەلێ ناسکەوە ئازاری ئەو لێکدابڕان و جودایی‌یانە دەچێژێت کە دووچاری بوونەوەرە جوانەکان دێن، ئەوانەی کە گرفتاری زللەی جودایی و نەمان دەبن.. ئەم مرۆڤە، کاتێ نەمانی ئەوان و بێ دەستەڵاتیی خۆیشی لە بەرامبەریانەوە دەبینێت و، دەزانێت هیچ کارێکی پێ ئەنجام نادرێت و، ناتوانێت بە هانایانەوە بڕوات و فریایان بکەوێت، ئەوا بۆ خۆی لە ناوەندی نائومێدی‌یەکی گەلێ سەخت و تاڵ و ئازاربەخشدا دەتلێتەوە.

بەڵام کەسی یەکەمیان ـ کە لە داوی بێ‌ئاگایی ڕزگاری بوو ـ بەرامبەر بەو ئازاری میهر و شەفەقەتە بەسۆ و ئازارە، دەرمان و مەلهەمێکی شیفابەخش و سارێژکار شك دەبات، چونکە لە نێوان مردنی زیندەوەران و نەمانی هەموو ئەوانەی کە خەمیان بۆ دەخوات، مانەوەی ئاوێنەی ڕۆحەکانیان دەبینێت کە هەردەم درەوشانەوەی بەردەوامی ناوە جوانە هەمیشەیی‌یەکانی خوایەکی مەزن و باقی و نەمریان تێدا دەردەکەوێت. ئەو کاتە میهر و شەفەقەتە بەسۆکەی دەبێت بە دڵخۆشی‌یەکی بەردەوام و.. لە پشت ئەو بەدیهاتووانەی کە گرفتاری نەمان دەبن: نەخشونیگار و ئارایشتدان و ڕازاندنەوە و چاکەکاری و ڕووناککردنەوەیەکی هەمیشەیی دەبینێت کە هەردەم جوانی‌یەکی موقەددەس و خاوێنی یاد دەخەنەوە. بە ڕادەیەك کە ئەو "نەمان" و "تیاچوون"ە بە جۆرێکی: "زیادکردنی جوانی" و "نوێکردنەوەی تام و لەزەت" و "جاڕبۆدانی سنعەت" دەبینێت. دیارە ئەمانەش پتر لەزەت و شەوق و سەرسووڕمانی ئەو زیاد دەکەن.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی دووهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(ئەمە پارچەیەکە لەو وەڵامەی کە بۆ قوتابییەکی ناسراو و ناوبراوەکەی خۆی نارد، بە بۆنەی ئەو دیارییەوە کە بۆ ئەمی ناردبوو)[1]

........

(سێهەم): تۆ دیارییەکت بۆ ناردووم و، دەتەوێت بە وەرگرتنی ئەو دیارییە دەستوورێکی گرنگی ژیانی خۆم بگۆڕم!

برام! من ناڵێم: "وەك لە عەبدولمەجیدی برام[2] و عەبدوڕڕەحمانی برازام[3] دیاری وەرناگرم، لە تۆشی وەرناگرم". نەخێر، چونکە تۆ لەوان لە پێشتری و لە گیانیشم نزیکتریت. کەواتە ئەگەر دیاریی هیچ کەسێك وەرنەگیرێت، هی تۆ وەردەگیرێت، بە مەرجێ هەر تەنها بۆ یەك جار بێت!

---

(١) مەبەست لەو قوتابییە: بەڕێز "خلووصی یەحیا گیل"ە کە یەکێکە لە قوتابییانی دێرینی مامۆستا نوورسی لە "بارلا" و، ئەو دەمە ئەفسەر بووە لە پلەی "نەقیب"دا. هەر پرسیارێکی سەبارەت بە بابەتەکانی ئیمان ببوایە دەیناردن بۆ مامۆستا نوورسی و ئەویش وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. پاشان بە ڕێنمایی مامۆستا خۆی ئەم وەڵامانە کۆکرانەوە و ناونران "مەکتووبات" کە ئەم کۆمەڵە پەیامەی بەردەستی خوێنەری بەڕێزە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٦ز و لە تەمەنی نەوەدو یەك ساڵیدا کۆچی ماڵئاوایی لە دنیا کرد، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٢) بچووکترینی براکانی مامۆستا نوورسییە. بەشێکی لە پەیامەکانی نوور کردووە بە عەرەبی، هەروەك "إشارات الإعجاز" و "المثنوي العربي النوري"یشی کردووە بە تورکی. لە پێشدا مامۆستای زمانی عەرەبی و، پاشان موفتی و، ئنجا مامۆستای زانستە ئیسلامییەکان بووە لە پەیمانگای باڵای شاری "قۆنیا". لە ساڵی ١٩٦٧ز لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٣) ناوی "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلا"یە و برازای مامۆستا نوورسییە. لە ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی "نوورس" لە دایك بووە و، لە ساڵی ١٩٢٨زیشدا لە گوندی "ذوالفضـــــل"ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت. ژیاننامەیەکی مامۆستا نوورسیی نووسیوە کە هەر لە سەرەتای ژیان و لەدایکبوونی مامۆستاوە تا ساڵی ١٩١٨ز باسی ژیانی ئەوی تێدا کردووە و، لە کتێبێکدا کە لە ئەستەمبووڵ چاپی کردبوو، بڵاوی کردەوە. (وەرگێڕ)

وا بەم بۆنەیەوە، نهێنیی ئەو دەستوورەی ژیانی خۆم بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون دەکەمەوە:

"سەعیدی کۆن" ئازار و منەتی هیچ کەسێکی هەڵنەدەگرت، بەڵکو مردنی گەلێ پێ باشتر بوو لەوەی منەتباری خەڵکی بێت. ئنجا سەرباری ئەو هەموو گیرو گرفت و ئەشکەنجانەش کە هاتنە ڕێی ژیانی، کەچی هەر دەستی لەو دەستوورەی ژیانی خۆی هەڵنەگرت و هیچ ڕەفتارێکی پێچەوانەی ئەوی نەکرد.

جا ئەم ڕەوشتەی کە لە "سەعیدی کۆن"ەوە بە میرات بۆ ئەم برا کۆڵەوارەت ماوەتەوە، نە زوهدێکی ڕواڵەتی‌یە و نە دەرخستنی پێویست نەبوونیشە بە خەڵکی بە جۆرێکی ساختە و دەستکرد. بەڵکو لەسەر بناغەی چەند هۆکارێکی ئاشکرا دامەزراوە:

**یەکەم:**

گومڕایان هەمیشە "زانایان" بەوە تۆمەتبار دەکەن کە گوایا زانیاری‌یەکەیان دەکەن بە داوێك بۆ ڕاو کردنی دەستکەوتەکانی دنیا! ئا لێرەوە بە ناحەق هێرشیان دەکەنە سەر و پێیان دەڵێن: (ئەوانە زانست و ئایینیان کردووە بە هۆکارێك بۆ دەستخستنی گوزەرانیان). کەواتە دەبێ بە کردار و ڕەفتار ئەو گومڕایانە بەدرۆ بخرێنەوە.

**دووهەم:**

دەبێ ئێمە لە ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی "حەق"دا شوێن پێی پێغەمبەران - علیهم السلام - هەڵبگرین. ئەوەتا قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەوانەی "حەق"یان بڵاو کردووەتەوە، بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا ڕایانگەیاندووە کە: پێویستی‌یان بە هیچ کەسێك نی‌یە و، فەرموویانە: ﴿إن أجريَ إلاّ على الله﴾ ، ﴿إن أجريَ إلاّ على الله﴾[1].

ئنجا ئەو ئایەتەی سوورەتی "یاسین"یش کە دەفەرموێ: ﴿اتّبعوا مَن لا يسئلُكُم أجراً وهم مُهتدون﴾ چەندین واتای زۆر و ناوەرۆکی قووڵی تێدایە سەبارەت بەم مەسەلەیەی کە لێی دەدوێین.

**سێهەم:**

لە وتەی یەکەمدا ڕوون کراوەتەوە کە: (دەبێ بەخشین بە ناوی خواوە بێت و وەرگرتنیش هەر بە ناوی خواوە بێت). بەڵام دەبینیت زۆربەی جار وا ڕوو دەدات کە "بەخشەر" بێ‌ئاگایە و بە ناوی خۆیەوە دەیبەخشێت و، لە ناوەرۆکدا منەت دەکات!

---

(١) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەران - درودیان لەسەر بێت - لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە. وەك: (یونس:٧٢)، (هود:٢٩)، (سبأ:٤٧). (وەرگێڕ)

یـاخود "وەرگـر" بێئاگایـە و، ئـەو شـوکرانەبژێری و سوپاسـەی کـە تایبەتـە بـە نیعمەتبەخشی ڕاستەقینەوە، دەچێ ئاراستەی هۆکارە ڕواڵەتییەکانی دەکات و، بەم کارەشی دووچاری هەڵە دەبێت!

**چوارەم:**

تەوەککول و قەناعەت و دەست پێوەگرتن گەنجینەیەکی گەورە و بەنرخی ئەوتۆن کە هیچ شتێك جێیان ناگرێتەوە. منیـش نامـەوێت بە وەرگرتنـی پارەوپوولی هیـچ کەسێك دەرگای ئەو گەنجینە نەبڕاوەیە لە خۆم دابخەم.

هەزاران سوپاس بۆ ڕۆزیدەری شکۆمەند کە هـەر لـە منداڵیمـەوە هـەتا ئێستا ناچاری ئەوەی نەکردووم لە ژێر منەتی هیچ کەسێکدا بمێنمەوە. ئێسـتاش هـەر پشـت بـە کـەرەمی ئەو خواوەندە مەزنە دەبەستم و لـە میهرەبانیی ئـەو ئومێـدەوارم کـە پاشـماوەی تەمەنیشـم لەسەر هەمان ڕەوت و دەستوور بەسەربچێت.

**پێنجەم:**

وا نزیکـی دوو سـاڵە، بـە چـەندین نیشـانە و تاقیکردنـەوەی زۆر، قەناعـەتی تـەواوم کردووە کە مۆڵەت نەدراوم پارەوپوولی هیچ کەسێك، بە تایبەت دیـاریی دەوڵەمـەندان و کارمـەندانی دەوڵـەت، وەربگـرم. چونکـە بـە هـەندێکیان ئـازارم پێ دەگـات. تەنانـەت دەستێکی پەنهان وا لەو دیارییانە دەکات کە ئازاری مرۆڤ بدەن و، ڕێ لە خواردنیـان دەگیرێت! هەندێ جاریش ئەو دیارییانە شێوەیەك دەگرنەخۆ کە زیـانم پێ دەگەیـەنێت. کەوا تە ئەم حاڵەتە فەرمانێکی مەعنەوییە بە: وەرنـەگرتنی پـارەوپوولی خـەڵکی و، نـەهیم لـێ دەکات تا توخنی شتی وا نەکەوم!

جگە لەوەش، من - بـە سروشـت - لـە تێکـەڵیی خـەڵکی بێزارم و نـاتوانم مۆڵـەت بـە هەموو کەسێك بدەم کە لە هەموو کاتێکدا سەرم لـێ بدات. خۆ ئەگەر ڕێ بە وەرگرتنی دیارییەکانیان بدەم، ئەوا بـۆ ڕێزلێنـان و چـاودێری کردنـی هەسـت و شـعووریان ناچـار دەبم ڕێ لە سەردانیشیان نەگرم. ئەمەش کارێکی ناچاری و لەڕوودامانە و، پڕ بـەدڵ پێـم ناخۆشە.

من ئەوەم پێ باشترە کـە لەتـە نـانێکی وشـك بخۆم و بـەرگێك بپۆشـم کـە سـەد و یـەك پینەی پێوە بێت و لە ڕیاکـاری بمپـارێزێت، تـا ئـەوەی کـە بـەتامترین و خۆشـترین شـیرینیی کەسـانی تـر بخۆم و باشـترین پۆشـاکی ئـەوان بپۆشـم و ناچـار بم چـاودێریی هەسـت و شعووریان بکەم، چونکە ئەم کارە ناچارییەم گەلـێ پێ ناخۆشە.

**شەشەم:**

گرنگترین هۆکاری پێویست نەبوونم بە خەڵکی: ئەو وتەیەیە کە "ئیبن حەجەر"ی[١] باوەڕپێ کراو - لە لای ڕێڕەوانی مەزهەبی ئیمەی شافیعی - وتوویەتی: "گەر تۆ پیاوچاك نەبیت و شتێکت بە نیازی پیاوچاکی پێ ببەخشرێت، حەرامە وەری بگریت"[٢].

بەڵێ، مرۆڤی ئەم چەرخە، لەبەر هەڵپە و تەماع، دیارییە هەرزانەکەی خۆی بە نرخێکی گران دەفرۆشێت! ئەوەتا کەسێکی گوناهباری کۆڵەواری وەك من بە وەلییەکی پیاوچاك دادەنێت و ئنجا کولێرەیەکم بە دیاری دەداتێ! جا ئەگەر من - خوانەخواستە - لەو باوەڕەدا بم کە پیاوێکی چاکم، ئەوە نیشانەی لەخۆ باییبوونە و بەڵگەی ناچاکییە. خۆ گەر باوەڕیشم بەوە نەبێت کە پیاوچاکم، ئەوا وەرگرتنی ئەو ماڵە بۆ من دروست نییە.

هەروەها وەرگرتنی سەدەقە و دیاری بەرامبەر بەو کارانەی کە ڕوویان لە دوارۆژە، وەك ئەوە وایە کە مرۆڤ لەم دنیادا و بە چەشنێکی "فانی" چەند بەروبوومێکی "هەمیشەیی" ئەو دنیا لێ بکاتەوە و بە فەنایان بدات!

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) زانا و لێکۆڵەرێکی میسرییە و ناوی: ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی حەجەری هەیتەمییە. لە نێوان ساڵەکانی (٩٠٩ - ٩٧٤ ك)دا ژیاوە. گەلێ بەرهەمی بەنرخی جێهێشتووە، وەك: "الفتاوى الهيتمية" و "تحفة المحتاج لشرح المنهاج" لە فیقهی شافیعیدا، هەروەها "شرح الأربعين النووية" و "شرح مشكاة المصابيح"ی تەبریزی و... هتد.. بڕوانە: "الأعلام للزركلي ١/٢٣١". (وەرگێڕ)

(٢) دەقی وتەکەی "ئیبن حەجەر" - کە مامۆستا نوورسی پوختەکەی هێنا - ئەمەی خوارەوەیە:
(هەر کەسێك گومانی سیفەتێکی وەك فەقیری و پیاوچاکی و نەسەبی پێ ببرێت و لەبەر یەکێك لەو سیفەتانە شتێکی پێ ببەخشرێت، بە چەشنێك کە بەڵگە و نیشانەی زۆر بۆ ئەوە لە ئارادا بن کە لەبەر ئەو سیفەتانە ئەو شتەی پێ بەخشراوە، یان بەخشەرەکە ڕاستەوخۆ بڵێت لەبەر ئەو سیفەتە شتەکەی پێ داوە، ئەو کەسەش لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەو سیفەتە بێت کە گومانی پێ دەبرا، ئەوا حەرامە وەری بگرێت. بە هەمان جۆر گەر سیفەتێکی نادیاری وای تێدا بێت کە ئەگەر بەخشەر پێی بزانێت، ئەو بەخشینەی نەداتێ... هتد..) بڕوانە: "تحفة المحتاج لشرح المنهاج" لابن حجر الهيتمي الشافعي ٧/١٧٨. (وەرگێڕ)

# مەكتووبی سێهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(بەشێكە لەو نامەیەی كە ناردی بۆ قوتابی‌یە ناسراوەكەی)

......

**پێنجەم:**

لە نامەیەكدا حەز و ئارەزووی خۆت دەربڕیوە بۆ بەشداری كردن لەو هەست و نەستانەم كە لێرە لە دڵمدا دێنە جۆش. كەواتە فەرموو لە نێوان هەزاران دانەی ئەو هەست و نەستانەم گوێ لە یەكێكیان ڕابگرە:

شەوێك لەسەر بەرزایی‌یەكی گەورە بووم لەناو كەپرێكدا كە بەسەر چڵەپۆپەی درەختێكی بەرزی "قەتران"ی سەر لوتكەیەكی نێوان لوتكەكانی چیای "چام"ەوە دروست كرابوو..

لەوێوە سەیری ڕووی گەش و هاوڕاز(أنیس)ی ئاسمانم كرد كە بە ئەستێرەكان نەخشابوو، یەكسەر نوورێكی بەرز و بڵندی ئیعجازم لەو سوێندەدا بینی كە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە: ﴿فلا أُقسِم بالخنّس ۞ الْجَوار الكُنّس﴾ (التكویر:١٥-١٦) و نهێنی‌یەكی ڕەوان و درەخشانی نێوان نهێنی‌یەكانی ڕەوانبێژیم تێدا بەدی كرد.

بەڵێ، ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ هەسارە گەڕۆكەكان و پەنهان بوون و پاشان دەركەوتنەوەیان دەكات و، نەخشێكی ناوازە و وردی بەدیهێنان دەخاتە پێش‌چاوان و، وێنەی تابلۆیەك دەكێشێت كە دەرسی پەند و عیبرەت دابدات.

بەڵێ، هەر هێندەی ئەم هەسارە گەڕۆكانە لە بازنەی "خۆر"ی سەركردەیان دەردەچن و دەڕۆنە ناو بازنەی ئەستێرە چەسپاوەكانەوە، ئەوا گەلێ نەخشونیگاری نوێ و یەك لە دوای یەك و ناوازە لە ڕووی ئاسماندا دەكێشن.. جاری وا هەیە یەكێكیان لەگەڵ یەكێكی وەك خۆیدا شان بە شانی یەكتر دەردەكەون و جوانی‌یەكی ناوازە و

ڕه‌نگـین پێكده‌هێنـن.. هـه‌ندێ جـاری تـر یـه‌كێكیان خـۆی ده‌كـات بـه‌ناو ئه‌سـتێره بچووكه‌كاندا و به وێنه‌ی سـه‌ركردایه‌تی كردنی ئه‌ستێره گه‌وره‌كان بۆ بچووكه‌كان، سه‌ركردایه‌تی‌یان ده‌كات. به تایبه‌ت ئه‌ستێره‌ی دره‌خشانی "زوهـره" كه لـه‌م وه‌رزه‌دا و دوای خۆرئاوابوون به ئاسۆوه ده‌رده‌كـه‌وێت. هـه‌روه‌ها هه‌سـاره هاووێنه‌كه‌ی كه پێش ده‌می به‌یان به دره‌خشانترین شێوه ده‌رده‌كه‌وێت.. ئه‌م دوانه جوانی‌یه‌كی گه‌لێ نـاوازه و ڕه‌نگین به ئاسۆ ده‌به‌خشن!

پاشان دوای ئه‌وه‌ی كه هه‌موو یه‌كێك له‌و ئه‌ستێره و هه‌سارانه كاری ئه‌ستۆی خۆی ئه‌نجام دا و سه‌رپه‌رشتیی ئه‌وانی تریشی كرد و به وێنـه‌ی مـه‌كووك خزمه‌تگوزاری‌یـه‌كانی خۆی لـه چنینی نـه‌خش و نیگـاره ناوازه‌كـه‌دا بـه‌جێ هێنـا، ده‌گه‌ڕێتـه‌وه بۆ نـاو بازنـه‌ی "پادشـــا" شـــكۆداره‌كه‌ی كـه "خـۆر"ه و، پۆشـاكی ڕوونـاكی ده‌پۆشـێت و خـــۆی ده‌شـــارێته‌وه و له پێش چاودا ون ده‌بێت!

جـا ئـه‌م هه‌سـاره گه‌ڕۆكانـه‌ی كـه قورئـانی پـیرۆز بـه: "الخنـس" و "الكنـس" نـاوی هێناون، خوای گه‌وره لـه‌گه‌ڵ ئه‌م "زه‌وی"یه‌ی خۆماندا به وێنـه‌ی كه‌شتی بـه‌ناو ده‌ریـای گه‌ردووندا ده‌یانگێڕێت و، وه‌ك مه‌ل و باڵنده‌ش به‌ناو بۆشایی ئاسماندا ده‌یـانفڕێنێت و، بـه ڕێكوپێكی‌یه‌كی یه‌كجار ته‌واو گه‌شـتێكی دوور و درێژیان پێ ده‌كـات و، ئـه‌م كـاره‌ش بــه وێنــه‌ی خــۆری ناوجــــه‌رگه‌ی ئاسمــان ده‌كــات بــه به‌ڵگــه له‌ســـــه‌ر مــــه‌زنیی په‌روه‌ردگاریتی‌یه‌كه‌ی و شكۆمه‌ندیی خوایه‌تی‌یه‌كه‌ی خۆی.

ئه‌و پادشا به‌توانایه چه‌نده شكۆمه‌نده كه له نێـوان كه‌شتی و فڕۆكـه‌كانی‌دا هـی وای تێدا بێـت هه‌زار جار له زه‌وی خۆمان گه‌وره‌تر بێت و، لـه مـاوه‌ی یـه‌ك چركـه‌دا مـاوه‌ی هه‌شت سه‌عات ببڕێت! بۆخۆت مه‌ودای ئه‌و به‌خته‌وه‌ری‌یه به‌رز و شه‌ره‌فمه‌ندی‌یه مه‌زنـه لێك بده‌ره‌وه كه ده‌ستی ئه‌و كه‌سه ده‌كه‌وێت "به‌ندایه‌تی" بۆ ئـه‌م پادشـا مه‌زنـه ده‌كات و له ڕێی ئیمانه‌وه په‌یوه‌ندیی پێوه ده‌به‌ستێت و ده‌بێـت بـه میـوان لـه‌سـه‌ر خوانی نیعمـه‌ت و ڕێزلێنان و به‌خششه‌كانی!

پاشان سه‌یری "مانگ"م كرد و، بینیم ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه: ﴿**والقمرَ قدّرناهُ منازلَ حـــتى عادَ كالعُرجون القديم**﴾ نوورێكی تیشك به‌خش و دره‌خشانی ئیعجاز ده‌رده‌خات.

به‌ڵێ، ته‌قدیر و ده‌ستنیشان كردنی یه‌كجار وردی مانگ و سووڕاندنه‌وه‌ی بـه ده‌وری زه‌وی‌دا و ڕووناك كردنــه‌وه‌ی و ســـازاندنی كاروباره‌كـــانی و پێ‌به‌خشـــینی چـــه‌ند بارودۆخێك له به‌رامبه‌ر خۆر و زه‌وی‌یه‌وه.. هه‌موو ئه‌م كارانـه، بـه حسـابێكی لـه‌وپه‌ڕی

وردی و چاودێری‌دا دەستنیشان کراون کە ژیریی مرۆڤی تێدا سەرسام دەبێت و، لەهەمان کاتدا دەشبێت بە ڕێنمای ئەو خاوەن هەست و شعورانەی ئەم تەقدیرە وردە دەبینن کە بڵێن: (ئەو کەسە بەتوانایەی کە بەم شێوازە دەراسا و دەستنیشانکاری‌یە وردە ئەم کاروبارانە ڕێك بخات، هەرگیز هیچ شتێکی بەلاوە گران نی‌یە). کە ئەمەش مرۆڤ تێدەگەیەنێت لەوەی: بکەری ئەم کارانە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

پاشان هەڵهاتنی مانگ بە دوای ئاوابوونی خۆردا گەلێ بە وردی حسابی بۆ کراوە کە تەنانەت بۆ چرکەیەکیش هەڵەی تێدا ناکات و بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەکیش لە کارەکەی دوا ناکەوێت. خۆ ئەمەش هەموو مرۆڤێکی سەرنجدەر هان دەدات کە بڵێت: "سُبحانَ مَن تَحَيَّرَ في صنعِهِ العقولُ"! چونکە "مانگ" بە تایبەت لە کۆتایی مانگی ئایاردا ـ وەك زۆر کاتی تریش ـ شێوەی دەمەداس(هیلال) و پەلە دارخورمایەکی کۆن لەخۆ دەگرێت کاتێ کە دەڕواتە ناو مەنزڵی ئەستێرەی "کۆ"(ثریا)وە، تەنانەت دەڵێی "ثریـــا" هێشوویەکی خورمایە و لە پشت پەردەی ئاسمانەوە بەو پەلە وشکەوە شۆڕبووەتەوە، ئەمەش وا لە پێش‌چاوی ئەندێشەی مرۆڤدا دەردەخات کە درەختێکی نوورانی و گەورە لە پشت پەردەی ئاسمانەوە هەبێت و یەکێك لە لقە نووك‌تیژەکانی، پەردەکەیان دڕیبێت و نووکەکەی و ئەو هێشووەی لێ هێنابێتە دەرەوە و "ثورەیا" و "هیلال"ی پێکهێنابێت!

ئەم تابلۆ ڕەنگینە ئەوە بە ئەندێشەدا دەهێنێت کە ئەستێرەکانی تریش بەری ئەم درەختە غەیبی‌یە بن.

ئیتر بۆ خۆت نەرم و ناسکیی ئەم ئایەتە پیرۆزە ببینە و تامی شیرینی ڕەوانبێژی‌یەکەی بچێژە: ﴿**كالعُرجُون القديم**﴾.

پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەم بە دڵدا هات کە دەفەرموێ: ﴿**هو الذي جَعَلَ لكـــم الأرضَ ذَلولاً فامْشوا في مَناكِبِها**﴾ (الملك:١٥) و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "زەوی" کەشتی‌یەکی گوێڕایەڵ و کاری‌ سپێردراوە. لەم ئاماژەیەوە خۆمم لەسەر شوێنێکی بڵندی ئەو کەشتی‌یە مەزنەدا بینی‌یەوە کە بە خێرایی بەناو بۆشایی ئاسماندا دەڕۆشت و، یەکسەر وتم: ﴿**سبحان الذي ســَخّر لنا هـــذا وما كُنّا له مُقْرنــين**﴾ (الزخرف:١٣) کە سوننەتە لە کاتی سواربوونی وڵاخ و کەشتی و شتانی وەك ئەواندا بوترێت[1]!

---

(١) عن ابن عمر رضي الله عنهما: (أن رسول الله ﷺ كان اذا استوى على بعيره خارجاً الى سفر كبّر ثلاثاً، ثم قال: سبحان الذي سخّر لنا هذا وما كنا له مقرنين، وإنّا الى ربنا لمنقلبون) رواه مسلم ١٣٤٢.

هەروەها بەم جموجوولە، گۆی زەویم وا هاتە بەرچاو کە شێوەی مەکینەیەکی سینەمای لەخۆ گرتبێت و دیمەنەکان پێشان بدات، ئەوەبوو ئەستێرەکانی ئاسمانی جوولاند و بە وێنەی سوپا ئەو ئەستێرانەی دایەبەر بۆ نمایش کردن و پێش‌چاو خستنی گەلێ دیمەنی ناسك و سەرنج بزوێن کە خەڵکانی "خاوەن بیر و ژیری" گرفتاری سەرسامی و سەرسوورمان دەکەن و، مەستی بینینیان دەبن و، دەڵێن: "سبحان الله!.. ئەم کارە مەزن و سەرسوورهێن و ناوازە و بەرز و بڵندانە چەندە کەم خەرجی و مەسرەفن"!

لەم خاڵەوە دوو سەرنجی ئیمانیم بە دڵدا هات:

*یەکەمیان*: چەند ڕۆژێك پێش ئێستا یەکێك لە میوانەکانم پرسیارێکی لێ کردم کە گومانێکی لەخۆ گرتبوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی: بەهەشت و دۆزەخ گەلێ دوورن لە یەکترەوە. وا دابنێ کە خەڵکی ناو بەهەشت بە لوتف و سۆزی خوای میهرەبان و بە وێنەی بروسکە و بوراق دەفڕن و تێ‌دەپەڕن، ئەی ئایا ئەهلی دۆزەخ کە لە ژێر کۆڵی قورسی گوناهە مەزنەکانیاندا دەناڵێنن، چۆن و لە ڕێی چ هۆکارێکەوە دەڕۆن بۆ ناو دۆزەخ؟

ئەوەی بە دڵدا هات بریتی بوو لەوەی کە:

ئەگەر هەموو نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی بۆ کۆنگرەیەکی گشتی بانگێشت بکرێن کە – بۆ نموونە – لە "ئەمریکا"دا ببەسترێت، ئەوا هەموو نەتەوەیەك سواری کەشتی‌یە گەورەکانی خۆیان دەبن و دەڕۆن بۆ ئەوێ.

"کەشتیی گۆی زەوی"ش کە لەسەر گەشتی دوور و درێژی ناو زەریای گەردوون ڕاهاتووە و لە ماوەی ساڵێکدا ماوەیەك دەبڕێت کە دەگاتە بیست و پێنج هەزار ساڵ ڕێ.. ئەم کەشتی‌یە، سەرنشینەکانی خۆی هەڵدەگرێت و دەیانبات بۆ مەیدانی حەشر و لەوێ ڕۆیان دەکات. هەروەها دۆزەخە بچکۆلەکەی ناوجەرگەی زەویش لەوێ ڕۆ دەکات کە پلەی گەرمی‌یەکەی دەگاتە دووسەد هەزار پلە – کە پلەیەکە لەگەڵ ئەوەی لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە یەکاویەك دەردەچێت – بە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو سی و سێ مەترێك پلەیەك زیاد دەکات و، بەپێی ڕیوایەتی فەرموودەی پیرۆز، لە دنیا و بەرزەخدا هەندێ لە کارمەندی‌یەکانی دۆزەخی مەزن ڕادەپەڕێنێت. پاشان بە فەرمانی خوای گەورە "زەوی" دەگۆڕێت و دەبێت بە زەوی‌یەکی تری جوانی هەمیشەیی و مەنزڵێك لە مەنزڵەکانی جیهانی دوارۆژ.

*سەرنجی دووهەم کە بە دڵدا هات:*

کردگاری بەتوانا و دانای تاك و تەنیا، بۆ مەبەستی دەرخستنی توانست و جوانی و دانستی خۆی و بەڵگە هێنانەوە لەسەر "یەکتایی"یەکەی، یاسا و عادەتێکی سەرسوورهێنەری خستووەتەکار کە بریتی‌یە لە ئەنجامدانی گەلێ کاری زۆر و زەبەندە لە رێی شتێکی یەکجار کەمەوە و، جێبەجێ کردنی چەندین ئەرکی مەزن بەهۆی شتێکی یەکجار سادە و بچووکەوە..

لە هەندێ "وتە"دا وتوومانە کە:

ئەگەر بەدیهێنانی شتان بدرێتە پاڵ خوای تاك و تەنیا، ئەوا تا رادەی پلەی "وجوب" ئاسانی لە بەدیهێناندا دەردەکەوێت، بەڵام گەر بخرێتە ئەستۆی هۆکارەکان و وەستا و ئەندازیارە زۆر و زەبەندەکانەوە، ئەوا تا پلەی "ئیمتیناع" گیروگرفتی زۆر و زەبەندە دێنە پێش و سەرهەڵدەدەن. چونکە هەر تاکە کەسێکی تەنیا - با بڵێین ئەفسەرێکی سوپا یان بەننایەك بێت - دەتوانێت بەتەنها یەك جوڵە و بەوپەڕی ئاسانی ئەو ئەنجامەی کە دەیەوێت بەدەستی بهێنێت و، بارودۆخی پێویست بە چەندین سەرباز یان بەرد و کەرەسەی خانووبەرەکە بدات، بە رادەیەك کە ئەگەر ئەم کارە بخرایەتە ئەستۆی یەك بە یەکی سەربازەکان یان بەردەکانی خانووەکەوە، هاتەدیی ئەو ئەنجامانەی دژوار دەکرد، تەنانەت مەگەر زۆر بە سەختی و دەگمەن بهاتنایەتەدی.

کەواتە هەرچی کاری: "هاتوچۆ" و "کێش بوون" و "خولانەوە" و دیمەنی ناسك و نیان دەبینیت و گوزارشت لە تەسبیحات کردن دەکەن بۆ خوای گەورە، بە تایبەت لە چوار وەرزەکان و ئاڵوگۆڕی رۆژ و شەودا، گەر ئەمانە بدرێنە پاڵ "یەکتایی" ئەوا بە تەنها یەك فەرمانی خوایەکی تاك و تەنیا کە بۆ یەك دانە لەو "گۆ" و قەبارانەی دەربکات، گەلێ باروودۆخی بەرز و ئەنجامی بەنرخ بەدەست دەهێنرێت، وەك: دەرخستنی لایەنە سەرسوورهێنەکانی سنعەت لە ئاڵوگۆڕی وەرزەکاندا و، دانستە نامۆکانی جیاوازیی نێوان شەو و رۆژ و، تابلۆ هونەری‌یە بەرز و بڵندەکانی لەمەڕ بزووتنی رواڵەتیی مانگ و خۆر و ئەستێرەکان..

بەڵێ، هەموو ئەمانە ئاوا بە ئاسانی روو دەدەن، چونکە سەرجەمی بەدیهاتووان سەربازی ئەون و، ئنجا بە ویستی خۆی سەربازێکی ئاسایی (وەك گۆی زەوی) لە نێوانیاندا دەستنیشان دەکات و دەیکات بە سەرکردەی ئەستێرەکان و.. خۆری

گـەورە و زەبەلاحیش دەکات بە چرایەکی ئەوتۆ کە ڕووناکی و گەرمی بە سەرنشـینانی زەوی بـدات و.. چـوار وەرزەکـانی سـاڵیش - کـە تـابلۆی نـەخش و نیگـاری توانسـتی خواوەنـدن - دەکـات بـە مـەکووك و.. شـەو و ڕۆژیـش - کـە لاپـەڕەی تێـدا نووسـینی حیکمـەتی پـەروەردگارە - دەکـات بـە سـپرنگ و.. مـانگیش لـە چـەند مـەنزڵێکدا دەستنیشان دەکـات، بۆ مەبەستی زانینی کاتەکان و.. ئەستێرەکانیش دەخاتە شێوەی چەند چرایەکی ڕووناکی بەخش و درەخشان و نیانەوە لە دەستی ئەو مەلائیکەتانەدا کە "جەزبە"ی مەستیی شادی و خۆشحاڵی‌یان لـێ هاتووە!

بەم جۆرە و بەم چەشنە بارودۆخە جوان و ڕەنگینانە، خـوای گـەورەی تـاك و تـەنیا گەلـێ دانستی زۆری تایبەت بە "زەوی" دەردەخات.

جا ئەم بارودۆخانە، گەر لە زاتێکی شکۆمەندی ئەوتۆ داوا نەکرێت کە فەرمانەکانی لە سـەرتاسـەری بوونەوەراندا جێبـەجێ دەکرێـت و، هـەموویان ڕوویـان لـە سیستەم و یاسـا و کارسازیی ئەو نەبێت، ئەوا دەبێ گشت خۆر و ئەسـتێرەکان، هـەرچی ڕۆژە، بـە جووڵەیەکی سووکەڵە و بچووك و لە خێراییی‌یەکی بێ‌سنووردا گەلـێ مـاوەی بێ‌سـنوور ببڕن!

بـەم جـۆرە دەردەکـەوێت کـە لـە "یـەکتایی"دا ئاسـانی‌یەکی بـێ سـنوور و، لـە "زۆری"شدا گیروگرفتێکی نەبڕاوە و بێ‌کۆتایی هەیە. هەر لەبەر ئەمەشـە کـە بازرگـان و پیشـەسـازەکان "یـەکبوون"ێـك بـە "زۆری" دەبەخشـن، واتـە لـە نێـوان خۆیـاندا هاوبەشایەتی و کۆمپانیاکان دادەمەزرێنن، تاکو کارەکانیان بە سووکی و ئاسـانی بـەڕێ بکەن!

پوختەی ئەم قسانە بریتی‌یە لەوەی کە: ڕێی "گومڕایی" گەلـێ گـیروگرفتی نـەبڕاوە و بێ‌کۆتایی تێدایە و.. ڕێی "هیدایەت" و "یـەکتایی"ش تـابلێی سـووکە و ئاسانی‌یەکەشی بێ‌کۆتایی‌یە.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەكتووبی چوارەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

سلام الله ورحمته وبركاته عليكم وعلى إخوانكم لاسيما.... الخ

برا ئازیزەكانم!

من ئێستا لەسەر چڵەپۆپەی درەختێكی گەورە و بەرزی سنەوبەردام كە بەسەر یەكێك لە لوتكە بەرزەكانی چیای "چام"ەوەیە..

لە ڕاستیدا من لە مرۆڤ بێزار بووم و پتر دڵم بە ئاژەڵ و گیانلەبەران دەكرێتەوە!

خۆ هەر كات حەزم لێ بێت لەگەڵ خەڵكیدا دابنیشم و گفتوگۆیان لەگەڵ بكەم، ئەوا بە ئەندێشە وا دادەنێم كە ئێوەم لێ نزیكن و قسەتان لەگەڵ دەكەم، تا بەم شێوەیە دڵنەوایی بە خۆم ببەخشم!

گەر هیچ ڕێگرێك نەیەتە پێش، نیازم وایە یەكدوو مانگ لێرەدا بە تەنیایی بمێنمەوە. جا هەركات هاتم بۆ "بارلا" ئەوا بەپێی خواست و ئارەزووی خۆتان بە دوای هۆكارێكی چاوپێكەوتن و گفتوگۆدا دەگەڕێین. بە ڕاستی من لە ئێوە زیاتر تاسەمەند و موشتاقی بارلام!

وا ئێستاش ئەو واتایانەتان بۆ دەنووسم كە بەسەر ئەم درەختی سنەوبەرەوە بە دڵدا هاتن:

یەكەمیان: خاتیرەیەكی تا ڕادەیەك تایبەتییە، چونكە یەكێكە لە نهێنییەكانم، بەڵام ئێوە كەسانێك نین كە نهێنیتان لێ بشارڕێتەوە. ئەویش بریتییە لەوەی كە:

هەروەك بەشێكی ئەهلی حەقیقەت نوورەكانی ناوی جوانی "الـودود"ی خوای گەورەیان دەست كەوتووە و، لە پەنجەرەكانی بوونەوەران و لە ڕێی درەوشانەوەكان و پلەی هەرە بەرزی ئەو ناوەوە ڕوانیویانەتە خواوەندی "واجب الوجود".. ئەم برایەشتان كە هەر هیچ نییە و لەگەڵ هیچ شتێكدا ناونابرێت (دانەر مەبەستی خۆیەتی) لەو كاتەدا

كە تەنها خزمەتی قورئانی پیرۆز دەكات و خەریكی بانگی خەڵكی‌یە بۆ ئەو گەنجینە بێ كۆتایی‌یانەی قورئان، وەسفێكی پێ بەخشراوە كە بەهۆیەوە لە نوورەكانی ناوی جوانی "الرحیم" و "الحكیم"ی خوای گەورە بەهرەمەند دەبێت!

جا سەرجەمی "وتەكان" چەند درەوشانەوەیەكی ئەو بەهرەمەندی‌یەن!

لە خوای گەورە ئومێدەوارین كە "وتەكان" بەهرەمەندی ناوەڕۆكی ئەم ئایەتە پیرۆزە بكات كە دەفەرموێ:

﴿ومَن يؤتَ الحِكمةَ فقد أُوتِيَ خيراً كثيراً﴾ (البقرة:٢٦٩).

دووهەمیان: كتوپڕ ئەم بڕگەیەم هاتەوە یاد كە لە تەریقەتی نەقشبەندی‌دا دەوترێت:

در طريق نقشبندى لازم آمد چار ترك    ترك دنيا، ترك عقبى، ترك هستى، ترك ترك[1]

یەكسەر دوای ئەوە، ئەم بڕگەیەی خوارەوەم بە دوای ئەوەی پێشوودا بە دڵدا هات:

در طريق عجزمندى لازم آمد چار چيز

فقر مطلق.. عجز مطلق.. شكر مطلق.. شوق مطلق، اى عزيز[2]

پاشان ئەو شیعرە ڕەنگین و بەپێز و پڕ لە واتا و وەسفەی تۆم هاتەوە یاد كە دەڵێت:

سەیری لاپەڕەی ڕەنگینی پەڕاوی گەردوون بكە... هتد..

پاشان لە دەلاقەی ئەو شیعرەوە سەیرێكی ئەو ئەستێرانەم كرد كە بە بنمیچی ئاسماندا شۆڕبوونەتەوە.. لەبەر خۆمەوە وتم: خۆزگا شاعیر بوومایە تا ئەم شیعرەم تەواو بكردایە. جا هەرچەند بەهرەی شیعر و هۆنین لە خۆمدا شك نابەم، كەچی دەستم دایە تەواوكردنی، بەڵام نەمتوانی لە شێوەی شیعردا تەواوی بكەم، بەڵكو چۆن بە دڵدا هات هەر وەهایش نووسیم. جا ئەگەر تۆ پێت خۆشە - ئەی ئەو كەسەی كە میراتگری منیت! - بیكە بە شیعر و بیهۆنەرەوە.

---

(١) واتە: لە تەریقەتی نەقشبەندی‌دا مرۆڤ دەبێ تەركی چوار شت بكات: "تەركی دنیا". واتە دنیا نەكات بە ئامانج و مەبەست. دووهەم: "تەركی ئاخیرەت بە حسابی نەفس" واتە: مەبەستی دەستكەوتنی ئاخیرەتیش نەبێت، بۆ هێنانەدیی خواستەكانی نەفسی. هەروەها "تەركی نەفس" بەوەی كە نەفس لەبیر ببرێتەوە. پاشان "تەركی تەرك" واتە: هەر بیر لەم تەرك كردنەش نەكاتەوە، بۆ ئەوەی دووچاری خۆ بەگەورە زانین و لەخۆبایی‌بوون نەبێت! (وەرگێر لە وتەی بیست‌وحەوتەمی كتێبی "وتەكان"ی دانەرەوە هێناویەتی).

(٢) واتە: ئەی برای ئازیزی دەستەوسان! لە ڕێگەی "كۆڵەواری و دەستەوسانی"دا دەبێ چوار شت ئەنجام بدەیت: هەژاریی ڕەها.. كۆڵەواری و دەستەوسانیی ڕەها.. شوكرانە بژێریی ڕەها.. شەوق و تاسەمەندیی ڕەها. (وەرگێر)

ئەو خاتیرەیەش - كە كتوپڕ بە دڵدا هات - بەم جۆرە بوو:
گوێ بۆ وتاری بەتام و شیرینی ئەستێرەكانیش ڕابگرە..
با بزانیت كە: مۆری حیكمەتی نەخشاوی سەر ڕوخساری "بوون" چیی بڕیار داوە!

* * *

دەبینیت: هەموویان پێكەوە لەسەر زمانی "حەق" دەدوێن و، بە یەك دەنگ دەڵێن:
ئێمە بەڵگەی ڕوونی درەخشانین لەسەر سام و هەیبەتی خواوەندی بەتوانای شكۆمەند.

* * *

ئێمە شایەتی ڕاستین لەسەر "بوون" و "تەنیایی" و "توانست"ی بەدیهێنەری مەزن..
بە چەشنی مەلائیكەت، تەماشای ئەو موعجیزاتە خنجیلە و ناسكۆڵانە دەكەین كە ڕووی زەوییان ئارایشت داوە.

* * *

ئێمە هەزاران چاوی بینەرین كە لە ئاسمانەوە بەسەر ڕووی زەویدا دەڕوانین و، سەیری بەهەشت دەكەین[1].

* * *

هەزاران بەری ڕەنگینی درەختی بەدیهاتووانین كە دەستی دانستی خواوەندی شكۆمەند و خاوەنی جوانی بە ئاسمان و لق و پەلەكانی ڕێی كاكێشاندا هەڵی واسیوین.

* * *

(١) ڕووی زەوی شەتلگا و كێڵگەی بەهەشتە، چونكە چەندین موعجیزاتی بێسنووری توانستی خوای گەورەی تێدا پێشچاو دەخرێت. جا هەروەك "مەلائیكەتان"ی ناو جیهانی ئاسمانەكان تەماشای گۆی زەوی دەكەن و ئەو موعجیزاتانەی تێدا دەبینن، بە هەمان جۆر "ئەستێرەكان"یش - كە وەك چاوی بینەر وان بۆ تەن و قەبارەكانی ئاسمان - بۆ ئەو موعجیزاتانە دەڕوانن، كەواتە ئەوانیش بە وێنەی مەلائیكەتەكان هەركات بۆ ئەو بەدیهاتووە ناسكۆڵانەی ڕووی زەوی دەڕوانن، سەیرێكی بەهەشتیش دەكەن و، ئەو كارە دەراسا و كاتییانەی ئێرە لە شێوە باقی و هەمیشەییەكانی ئەوێدا دەبینن. واتە ئەو ئەستێرانە لەو كاتەدا هەروەك تەماشای گۆی زەوی دەكەن و چاوێكیان لە زەوییە، بە ڕوانینێكی تر ئاوڕیش لە بەهەشت دەدەنەوە و چاوەكەی تریان لەسەر بەهەشتە. بەو واتایەی كە هەردوو لایان چاویان لە هەردوو جیهانەكەوەیە. (دانەر)

ئێمە بریتیین لە چەند مزگەوت و خانە و لانەیەکی گەڕۆك و بلند و، چەند گلۆپێکی ڕووناکی بەخش و، چەندەها کەشتی و فڕۆکەی گەورە بۆ ئاسمان نشینان.

* * *

ئێمە موعجیزەی توانستی بەتوانایەکی خاوەن کەماڵ و.. کاری دەراسای سنعەتی دانایەکی شکۆمەندین و..

دانایی نایاب و.. بەدیهاتووانی گەورەو گرنگ و.. چەندەها جیهانی ڕووناکیمان لە ئامێز گرتووە!

* * *

بەم جۆرە دەرکەوت کە: ئێمە بە سەد و یەك هەزار زمان، سەد و یەك هەزار بەڵگە بەرچاو دەخەین و دەیاندەین بە گوێی کەسانێکدا کە مرۆڤی ڕاستەقینەن.

دەك چاوی بابای مولحید کوێر بێت، کە ڕووی ڕووناکی ئێمە نابینێت و، گوفتارە ڕوون و ڕەوانەکانمان نابیستێت!.. ئێمە چەند بەڵگەیەکی ڕاست و ڕەواین کە "حەق" لەسەر زارمان دەردەچێت.

* * *

سکە و مۆری هەموومان هەر یەکێکە و.. تێکڕا تەسبیحات گوزار و بەندەی پەروەردگارمانین و لە ژێر فەرمانی ئەودایین.

ئێمە بەدەم جەزبەی خۆشەویستیی خوای گەورەوە یاد و زیکری ئەو دەکەین و، هاوبەشی بازنەی زیکری ڕێی کاکێشانین!

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی پێنجەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

ئیمامی ڕەببانی[1] - خوای لێ ڕازی بێت - کە خۆری تیشك بەخشی زنجیرەی نەقشبەندی‌یە، لە مەکتووباتەکەی‌دا دەفەرموێت:

(ڕوونبوونەوەی ڕاستی‌یەکانی ئیمانم لە هەزاران چێژ و کەرامەت پێ باشترە)[2]!

هەروەها فەرموویەتی:

---

(۱) "ئیمامی ڕەببانی" (۹۷۱-۱۰۳٤ ك) ناوی (ئەحمەدی کوڕی عەبدولئەحەد)ە و خەڵکی (سەرهەند)ی هیندستانە و نازناوی بە "فاروقی" بڵاوبووەتەوە چونکە لە نەوەی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتابە، خوای لێ ڕازی بێت. نوێکاری ئایین(مجدد) بووە لە سەرەتای هەزارەی دووهەمی کۆچی‌دا و بە ڕاستیش ئەرکی تازەکردنەوەی بەجێ‌هێناوە. لە زانیاری‌یەکانی سەردەمی خۆی‌دا دەستێکی تاباڵێی باڵای بووە، جگە لەوەی کە خاوەنی دەروونێکی پاك و ئیخلاصێکی کەم وێنە و ڕۆحێکی پەروەردەکراو بووە لە بەندایەتیی‌دا بۆ خوای گەورە و، دڵێکی هەمیشە بێداری بووە. چەندین جار پلەوپایەی بەرزی دراوەتێ هیچیانی وەرنەگرتووە. ئەو ئاشووبەی (ئەکبەرشا)ی هیند بۆ لەناوبردنی ئیسلام هەڵی‌گیرساند، ئەم زاتە توانیی بەرەنگاری ببێتەوە و ڕووبەڕووی ڕابوەستێت و دەوڵەتی مەغۆل لە هیندستاندا لە "ئیلحاد" و "بێ‌بڕوایی" و "بەرهەمی"یەوە بگێڕێتەوە بۆ باوەشی ئیسلام لە ڕێی بڵاوکردنەوەی پەیڕەوی بەیعەت و برایەتی و ڕێنمایی خەڵکی‌یەوە و، توانیی (تەصەووف) لەو شتانەی تێکەڵی بووبوون و لێڵیان کردبوو، پاك بکاتەوە. بەم پێیە ئیمامی ڕەببانی بە خۆری تیشکداری قوتابخانەی نەقشبەندی دەژمێرێت لە تەصەووفدا. بانگەوازەکەی بە شێوەیەکی بەربڵاو لە نیوە دوورگەی هیندا بڵاو بووەوە و، یەکێك لە بەروبوومەکانی (ئۆرنگ زیب)شای خواناس بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا سەری ئیسلام و موسڵمانان بەرز بووەوە و کافرانیش سەرشۆڕ کران. تەریقەتەکەی بەهۆی گەورە زانا و کەسایەتیی بەناوبانگی کورد: "مەولانا خالیدی نەقشبەندی"یەوە (۱۱۹۲-۱۲٤۲ ك) لە هەموو جیهانی ئیسلامی‌دا بڵاوبووەتەوە.. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، بەناوبانگەکەیان "مەکتووبات"ە کە "محەممەد موراد مەنزیلەوی" کردوویەتی بە عەرەبی. (وەرگێڕ)

(۲) ئەمە پوختەی وتەیەکی ئیمامی ڕەببانی‌یە لە مەکتووبی دووسەد و دەهەمی مەکتووباتەکەی‌دا. بڕوانە: (مكتوبات الإمام الرباني) ج۱/ص۱۸۲. (وەرگێڕ)

(ئـەنجام و ئامـانجی سـەرجەمی تەریقەتـە سـۆفی‌یەکان بریتی‌یـە لـە: دەرکـەوتن و ئاشکرابوونی ڕاستی‌یەکانی ئیمان)[1].

هەروەها فەرموویەتی:

(ویلایەت سێ بەشە. یەکەم: ویلایەتی "صوغـرا"یە، کە بریتی‌یە لـەو ویلایەتـەی لای خەڵکی ناوبانگی هەیە. دووهەم: ویلایەتی "وسـطا - مامنـاوەندی"یە. بەشی سێهەم: ویلایـەتی "کوبـرا"یـە. ئـەم بەشـەیان بریتی‌یـە لـە کردنـەوەی ڕێـیەکی ڕاسـتەوخۆ بـەرەو حەقیقەت بێ ئەوەی مـرۆڤ بـەناو بـەرزەخی تەریقـەتدا تێپـەڕ ببێـت، کـە ئەمـەش بـەهۆی "میراتگری پێغەمبەرەوە ﷺ دەست دەکەوێت)[2].

هەروەها فەرموویەتی:

(لە تەریقەتی نەقشبەندی‌دا بە دوو باڵ سلووك دەکرێت: باوەڕی ڕاسـت و دامـەزراو بـە ڕاستی‌یەکانی ئیمـان، لەگەڵ ئـەنجامدانی تـەواوەتیی فـەرزەکان. خـۆ ئەگـەر هـەر کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەك لە هـەر کـامی ئەم دوانـەدا ببێـت، ئـەوا گەلـێ دژوارە کـە بتوانرێت ئەم تەریقەتە بگیرێتەبەر)[3].

بەو واتایەی کە: تەریقەتی نەقشبەندی سێ دیمەنی هەیە.

*یەکـەمیان*: کـە مەزنترینیانـە و لـە هـەموویان لـە پێشـترە، بریتی‌یـە لـە: خزمـەتکردنی ڕاستەوخۆی "ڕاسـتی‌یەکانی ئیمـان"، ئـەو خزمەتـەی کـە ئیمـامی ڕەببـانی خـۆی لـە دواڕۆژەکانی ژیانی‌دا گرتیەبەر.

دووهەم: خزمەتکردنی فەرزەکانی ئایین و سونەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ لـە ژێـر سـایە و پەردەی تەریقەتدا.

سێهەم: هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی نەخۆشـی‌یەکانی دڵ و دەروون لـە ڕێـی تەسـەووف و سەیر و سلووك و هەنگاونانی دڵی مرۆڤەوە.

یەکـەمیان لـە حوکمـی "فـەرز"دایـە و.. دووهـەمیش لـە حوکمـی "واجـب"دا و.. سێهەمیش لە حوکمی "سوننەت"دایە!

---

(١) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە. مامۆستا نوورسی لێرەدا پوختەی قسەکەی ئیمامی ڕەببانیی هێناوە. (وەرگێڕ)

(٢) پوختەی مەکتووبی دووسەد و شەستەمە. بڕوانە سەرچاوەی پێشوو: ج١/ص٢٤٠. (وەرگێڕ)

(٣) بڕوانە هەمان سەرچاوە: مەکتووبی حەفتا و پێنجەم (ج١/ص٨٧) مەکتووبی نەوەدو یەکەم (ج١/ص٩٩) مەکتووبی نەوەدو چوارەم (ج١/ص٩٩-١٠٠). (وەرگێڕ)

جا مادەم حەقیقەت وایە، ئەوا من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر "شێخ عەبدولقادری گەیلانی"[(١)] و "شاهی نەقشبەند"[(٢)] و "ئیمامی ڕەببانی" و هاوچەشنیان لە قوتبەکانی ئیمان – خوا لە هەموویان ڕازی بێت – لەم سەردەم و چەرخەی ئێمەدا بوونایە، هەموو توانایەکی خۆیان بۆ بەهێزکردنی "ڕاستییەکانی ئیمان" و "عەقیدەی ئیسلام" بەکاریان دەهێنا. چونکە بەختەوەریی هەمیشەیی لەم دوانەوە پەیدا دەبێت و، هەر کەمتەرخەمی کردنێك تیایاندا ئەنجامەکەی بەدبەختیی هەمیشەیی دەبێت. ئەوەتا هەرگیز ناگونجێ بە بێ ئیمان کەس بچێتە بەهەشتەوە، بەڵام زۆر کەس هەن کە بێ تەسەووف بەهەشتیان دەستگیر دەبێت و دەڕۆنە ناوی. مرۆڤ بێ "نان" ناژی، بەڵام دەتوانێت بە بێ "میوە" ژیان بباتەسەر! کەواتە تەسەووف میوەیە و ڕاستییەکانی ئیسلامیش نانن!

جاران سەرکەوتن و بەرزبوونەوە لە ڕێی "سەیر و سلووکەوە" بۆ هەندێ لە "ڕاستییەکانی ئیمان" چل ڕۆژ تا چل ساڵی دەخایاند. ئەگەر لەم سەردەمەدا میهرەبانیی

---

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ساڵی ٤٧٠ی کۆچی هاتووەتە دنیاوە و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنە. بۆ خوێندن ڕۆیشتووە بۆ بەغدا و سەرجەمی زانستە ئیسلامییەکانی ئەو ڕۆژگارەی لای زانایانی پایەبەرزی بەغدا، خوێندووە. یەکێکە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئایینی ئیسلام و، چەندەها کەس لە گاور و جوولەکەکان لە خزمەتیدا موسڵمان بوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە و دەستبەرداری کردەوە خراپەکان بوون. چەند کتێبێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە وەك (الغنية) و (فتوح الغيب) و (الفتح الرباني). لە ساڵی ٥٦١ك لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە قوتابخانەکەی خۆی لە بەغدا نێژراوە. بۆ مەبەستی ناسینی پایەبەرزیی ئەم مەردە مەزنە و ئاشنا بوون بە ڕۆڵی کاریگەری لە مێژووی ئیسلامدا، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو فەسڵانە دەکەین کە مامۆستای مێژوونووسی هاوچەرخ (أبو الحسن الندوي) ـ خوا لێی خۆش بێت – لە بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)دا تۆماری کردوون. هەروەها کتێبی: (هكذا ظهر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس) نووسراوی: (د. ماجد عرسان الكيلاني) بە تایبەت (ص: ٢٠٢-٢٥٤). (وەرگێڕ)

(٢) شاهی نەقشبەند ناوی (محەممەدی کوڕی محەممەد)ە و ناسراوە بە (خواجە محەممەد بەهائەددین) و دامەزرێنەری (تەریقەتی نەقشبەندی)یە. لە مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ٧١٧ك لە گوندی (قەصری عاریفان)ی نزیکی (بوخارا) کە پێشی دەوترێت: (قەصری هیندوان) لە دایك بووە و لە (سەمەرقەند) خوێندوویەتی و چەندین شوێنی تر گەڕاوە و بەهرەمەندی دەرس و پەروەردەی گەلێ زانا و پیاوباشی سەردەمی خۆی بووە، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ بوخارا و لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا ژنی هێناوە. دوو جاریش حەجی کردووە و تا کۆتایی ژیانی لە بوخارادا ماوەتەوە و، هەر لەوێش (تەریقەتی نەقشبەندی)ی دامەزراندووە. لە بەرواری (شەوی دووشەممە ٣/ڕەبیعی یەکەم/٧٩١ك) و لە سەرەتای تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە گوندەکەی خۆی (قەصری عاریفان) ئەسپاردەی خاك کراوە. چەند بەرهەمێکی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، وەك: (رسالة الواردات)، (الأوراد البهائية)، (حياتنامه)، (دليل العاشقين). (وەرگێڕ)

خواوەند ڕێیەك ئامادە بکات کە لە ماوەی چل دەقیقەدا مرۆڤ بەو ڕاستییانە بگەیەنێت، کارێکی ژیرانە نییە وازی لێ بهێنرێت و نەگیرێتەبەر!

بەڵێ، ئەو کەسانەی کە سیوسێ وتەی کتێبی "وتەکان"[1] (سۆزلەر) بە وردی و سەرنجدانەوە دەخوێننەوە، دان بەوەدا دەنێن کە ئەو وتانە ڕێیەکی قورئانیی وەك ئەمەیان لە بەردەمدا بۆ کردوونەتەوە!

جا مادەم ڕاستی ئەمەیە، ئەوا کتێبی "وتەکان" کە نهێنییەکانی قورئانی پیرۆز ڕوون دەکاتەوە:

کاریگەرترین دەرمان و باشترین هۆکاری ساڕێژکردنی زامەکانی ئەم چەرخەیە و.. سوودمەندترین ڕووناکییە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی کە دووچاری هێرشەکانی سوپای تاریکی بووە.. تەنانەت ڕاسترین ڕابەرە بۆ ئەوانەی کە سەرگەردانی ناو شیو و دۆڵی گومڕایی بوون.

دەسا براکەم!

تۆ باش دەزانیت کە:

ئەگەر "گومڕایی" لە "نەزانی"یەوە سەری هەڵدابێت، نەهێشتن و لابردنی کارێکی ئاسان دەبێت. بەڵام گەر لە "زانین"ەوە بێت، ئەوا گەلێ دژوارە لاببرێت!

جاران ئەم بەشەی دوایی زۆر دەگمەن بوو، لە هەزار کەسدا مەگەر یەکێك بە ناوی "زانست"ەوە لە ڕێ بترازایە.

جا ئەگەر گومڕایانی لەم جۆرە سەر هەڵبدەن، ئەوا لە هەزاران کەسدا مەگەر تەنها یەك دانەیان بگەڕێتەوە و ڕێی ڕاست بدۆزێتەوە. چونکە ئەو جۆرە کەسانە لە خۆیان ڕازین و، لەو کاتەدا کە نەزان و نەشارەزان، پێیان وایە زانا و ئاگادارن!

من لەو باوەڕەدام کە خوای گەورە تایبەتکاریی: چارەسەری شیفابەخش و دەرمانی دژ بە ژەهرەکانی کوفری "ئەم گومڕایی"یەی سەردەمی بە: "وتەکان" بەخشیوە، کە لە ڕاستیدا بریتین لە چەند بریسکەیەکی مەعنەویی ئیعجازی قورئان.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) (وتەکان) لە لایەکەوە ناوە بۆ یەکەمین بەرگی کۆمەڵە پەیامەکانی نوور، کە مامۆستا نوورسی داینـاون و بریتین لە سیوسێ وتە(پەیام)، لە لایەکی تریشەوە ناوە بۆ سەرجەمی پەیامەکانی نوور. (وەرگێڕ)

# مەکتووبی شەشەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

سلام الله ورحمته وبركاته عليكما وعلى اخوانكما ما دام الملوان(١) وتعاقب العصران وما دام القمران(٢) واستقبل الفرقدان(٣).

ئەی دوو برای بەغیرەت و هاوڕێی جوانمەردم! ئەی ئەو دوو کەسەی کە مایەی دڵنەواییمن لەم دنیای خانەی نامۆیییەمدا!

مادەم خوای گەورە هەردوو کتانی لەگەڵ مندا بەشداری ئەو واتایانە کردووە کە بە نیعمەت و بەخشایشی خۆی بە "بیر"ی منی بەخشیون، ئەوا مافی خۆتانە کە لە هەست و نەستەکانیشمدا بەشداریم بکەن.

وا هەندێك لەو ئازاری جودایییەتان بۆ دەگێڕمەوە کە لەم غەریبییەمدا پێوەی دەناڵێنم و، ئەوانەشیان کە ئازار و سوێیان زیاترە لە دڵی خۆمدا هەڵیان دەگرم و نایانخەمە ڕوو، تاکو ئێوەش بە ئازارەکانمەوە نەتلێنمەوە:

دوو سێ مانگە بە تەنیایی ماومەتەوە و، مەگەر نزیکەی بیست ڕۆژ جارێك میوانێك بێت و سەرم لێ بدات، دەنا زۆربەی کاتەکانی تر بە تەنیا کەسی دەمێنمەوە. وا نزیکەی بیست ڕۆژە هیچ کەسێکم لە خەڵکی چیاکە لە دەوروبەردا نەماوە و هەموویان بڵاوەیان لێ کردووە.

---

(١) الملوان: شەو و ڕۆژ و ئەم سەر و ئەو سەری شەو و ڕۆژ. (وەرگێڕ)

(٢) القمران: مانگ و خۆر. (وەرگێڕ)

(٣) الفرقدان: دوو ئەستێرەی گەشن بە ئاسمانەوە. (وەرگێڕ)

لەم چەشنە چیا چۆڵانەدا کە غەریبیم بە یاددا دەهێنن، کاتێ کە شەو پەردەی خۆیم بەسەردا دادەداتەوە و جگە لە خشەی خەم بزوێنی گەڵای دارەکان هیچ دەنگ و زایەڵەیەکی تری تێدا نابیسترێت، خۆم لە نێوان پێنج جۆری غەریبیدا دەبینمەوە:

یەکەمیان: لەبەر ئەوەی هەندێ بەساڵا چووم و پیری کاری خۆی تێدا کردووم، ئەوا هەستم بە غەریبی و دووریی خۆم کرد لەو کەسوکار و هاوڕێ و خۆشەویستانەم کە بەجێیان هێشتووم و کۆچیان بۆ جیهانی بەرزەخ کردووە..

هەر لەم غەریبییەوە بازنەی غەریبییەکی ترم لێ خرایە سەرپشت، کە بریتی بوو لەوەی هەستم بە غەریبییەکی ئاوێتەی ئازاری جودایی کرد، چونکە بینیم زۆربەی ئەو بوونەوەرانەی کە پەیوەندیم پێیانەوە هەیە، بە وێنەی بەهاری ڕابوردوو، ڕۆشتوون و بەجێیان هێشتووم!

ئنجا لە ناوەندی ئەم غەریبییەوە بازنەی غەریبییەکی تر کرایەوە، کە غەریبیمە لە نیشتمان و کەسوکار، چونکە هەستم بە غەریبییەکی ئاوێزانی ئازاری جودایی کرد کاتێ بینیم بە تەنیایی و دوور لە نیشتمان و کەسوکارم دەژیم.

هەر لە ناوەندی ئەم غەریبییەوە، بارودۆخی شەوی تار و چیا بەرجەستەکانی بەردەمم غەریبییەکی ئەوتۆیان بەسەردا دادامەوە کە خەم و خەفەتێکی ئاوێتەی سۆز و بەزەیی لەگەڵ خۆدا هێنابوو.. کە ئەمەش کارێکی کرد هەست بکەم مەیدانی غەریبییەکی تر لە بەردەم ڕۆحمدا کراوەتەوە، کە وەختە ئەم میوانخانە فانییە جێ بهێڵێت و ڕووەو ئەبەد و هەتاهەتایی بکەوێتە ڕێ. لەمەوە هەستم کرد کە غەریبییەکی نائاسایی منی لە ئامێز گرتووە. بۆیە کەوتمە بیرکردنەوە و یەکسەر لەبەر خۆمەوە وتم: "سبحان الله". ئنجا بیرم کردەوە لەوەی کە ئایا چۆن مرۆڤ بتوانێت ڕووبەڕووی ئەم هەموو تاریکییە زۆر و یەك لەسەر یەك و غەریبییە جۆراوجۆرانە ببێتەوە کە بەم چەشنە ئاوێتەی یەکتری بوون؟

"دڵ"م هاواری لێ هەڵسا و وتی:

ئەی پەروەردگارم! من غەریب و تەنها و لاواز و بێ توانا و نەخۆش و دەستەوسان و پیر و بێ ئیختیارم!

ئەی خوای گەورەم! هانام بۆ هێناویت! دەسا فریام بکەوە.. داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم.. لە دەرگانەی تۆدا دەستەوسان و بێ دەستەڵات کەوتووم، هێز و توانات لێ دەخوازم!

یەکسەر "نووری ئیمان" و "ڕێژنەی قورئان" و "لوتف و سۆزی پەروەردگار" هاتن بە هانامەوە و هێندە هێز و پێزیـان پـێدام کـە هـەر پێنـج جـۆرە غەریبیـیـە تاریکـەکانی دەوروبەریان بۆ ڕەواندمەوە و گۆڕییان بە پێنج بازنەی نوورانیی شاد و دڵنەواییبەخش.

ئیتر "زمان"م دەستی کرد بە دووپات کردنەوەی ئایەتی:

﴿حسبنا الله ونعم الوكيل﴾ (آل عمران:١٧٣).

"دڵ"یشم ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە کە دەفەرموێ:

﴿فان تولّوا فقل حَسبيَ الله لآ إلـــه الا هـــو عليـــه توكلـــتُ وهـــو ربُّ العـــرشِ العظيم﴾(التوبة:١٢٩).

پاشـان "عەقـڵ"یشـم ڕووی گوفتـاری ئاراسـتەی "دەروون"ی نیگـەران و دەم بـە هـاوار و شڵەژاوم کرد و وتی:

ئەی بێچارە!

واز لە سکاڵا و هاوار بهێنە و، پشت بە خوای گەورەی خۆت ببەستە..

چونکـە سـکاڵا - خـۆی لـە خۆیدا - بەڵایـەکی ئاوێتـەی بەڵایـە و گوناهێکـە لـە دووتوێی گوناهباریدا.

* * *

گەر بە بۆنەی ئەم بەڵایەتـەوە "بەڵابـەخش" بناسیت و بیدۆزیتـەوە، ئـەوا بەڵاکـەت لـە ڕاستیدا دەبێت بە بەخششێکی مەزن و سەفایەکی یەکجار زۆر.

کەواتە واز لـە سـکاڵا بهێنـە و، قـازانجی شـوکرانەبژێری دەسـتی خـۆت بخە، چونکـە زەردەخەنەی گوڵ لە شەوقی ڕووی: "بولبولی عاشقیەتی"!

* * *

ئەوەتا دنیاکەت ـ بە بێ خواناسی - سەرانسەر ئازارە و هەردەم ڕوو لە نەمانە.

کەواتە وەرە لەم بەڵایەدا پشت بە خوا ببەستە..

بۆچی بەم جۆرە لە دەست بەڵایەکی بچووك وا هاوار دەکەیت، کە لـە هـەمان کـاتدا پڕ بە دنیا کۆڵی بەڵات لەسەر شانە؟!

* * *

زەردەخەنەی "تەوەککول" لە ڕووی بەڵادا بنوێنە، با ئەویش بە پێکەنین بـەرەو ڕووت بێتەوە..

چونكە تا ئەو لە پێكەنیندا بێت، ئەوا هێدی هێدی بچووك دەبێتەوە، هەتا بە تەواوی نامێنێت.

* * *

پاش ئەمە، منیش بە وێنەی یەكێك لە مامۆستاكانم، كە مەولانا جەلالەددینی رۆمی‌یە[١] و لەگەڵ نەفسی خۆی‌دا دواوە، وتم:

او گفت "ألستُ" و تو گفتی "بلي" شـكر "بلي" چيست؟ كشيدن بلا
سـرّ بلا چيست؟ كه يعني منم حـلقه زنِ درگـه فقـر و فنـا[٢]

واتە:

ئایا دەزانیت چ نهێنی‌یەك لە "بەڵا"دا هەیە؟

ئەو نهێنی‌یە بریتی‌یە لەوەی كە مرۆڤ لە دەرگای "هەژاری" بدات و دەست لە خەڵكی و موحتاج بوونی پێیان دابشوات.

ئا لەم كاتەدا لەبەر خۆمەوە وتم:

---

(١) مەولانا جەلالەددینی رۆمی لە شاری (بەلەخ) لە دایك بووە و لە شاری (قۆنیە)ش كۆچی دوایی كردووە. لە نێوان ساڵەكانی: (٦٠٤-٦٧٢ك/ ١٢٠٧-١٢٧٣ز)دا ژیاوە. لە فیقهی حەنەفی و سەرجەمی زانستەكانی رۆژگاری خۆی‌دا زانایەكی بەناوبانگ و بەتوانا بووە و، دوای وەفاتی باوكی لە ساڵی ٦٢٨كدا لە چوار قوتابخانەی شاری "قۆنیە"دا دەرسی وتووەتەوە. پاشان رێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و (شەمسی تەبریزی) لەم بوارەدا رابەریی كردووە. پاشان تەریقەتی "مەولەوی"ی دامەزراندووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێ‌هێشتووە، وەك (فیه ما فیه، دیوان شمس تبریزی، دیوان كبیر) بەڵام بەناوبانگترینیان (مەسنەویی مەعنەوی)یە كە بیست و شەش هەزار بەیتی شیعرە بە زمانی فارسی و، بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕراوە و بووە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی مەولانا لە سەرتاسەری جیهاندا. بۆ زانینی درێژەی ژیانی بڕوانە: (مولانا جلال الدين الرومي في حياته وشعره، تأليف: الدكتور محمد عبدالسلام الكفافي، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧١) هەروەها بەرگی یەكەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام) نووسینی خوالێخۆشبوو (السيد أبو الحسن الندوي). (وەرگێڕ)

(٢) واتە: كاتێ خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ لە وەڵامدا وتت: ﴿بَلَـــى﴾. بەڵام ئەی كوانێ شوكرانەی وتنی ئەم ﴿بَلى﴾یە؟ ئەو شوكرە -لە راستی‌دا- بریتی‌یە لە تلانەوەی مرۆڤ بەدەست بەڵاوە. ئەی ئایا دەزانیت نهێنیی بەڵا چی‌یە؟ ئەو نهێنی‌یە بریتی‌یە لەوەی كە مرۆڤ لە پێناوی خوای گەورەدا لە دەرگای هەژاری و فەنا بدات. بڕوانە: (دیوان كبیر)ی مەولانا جەلالەددین ص ١٥٧ غەزەلی ژمارە: ٢٥١. (وەرگێڕ)

بەڵێ.. ڕاستە.. هەر تەنها بە: دەستەوەسانی و تەوەککول و هەژاری و هانابردن بۆ خوای گەورە، تاریکی‌یەکان دەڕەوێنەوە و دەرگای ڕووناکیش لە مرۆڤ دەخرێتە سەرپشت. کەواتە سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەر "نووری ئیمان و ئیسلام".

ئەم بڕگەیەی خوارەوەم لە پەندە بەناوبانگەکانی "الحکم العطائیة"[(١)] بەرچاو کەوت کە ڕاستی‌یەکی مەزنی لەخۆ گرتووە، دەڵێت:

"ماذا وجَدَ مَن فقدَه وماذا فقدَ مَن وجَدَه"[(٢)]؟

واتە:

ئەو کەسەی کە خوای دۆزیبێتەوە، هەموو شتێکی دەست کەوتووە، بەڵام ئەو کەسەی نەیدۆزیێتەوە جگە لە "بەڵا" هیچی تری دەست ناکەوێت.

ئنجا لە نهێنی‌یەکی فەرموودەی پیرۆزی: "... طوبى للغربـاء..."[(٣)] تێگەیشتم و، شوکرانەم پێشکەشی خوای گەورە کرد.

---

(١) دانەری ئەو کتێبە ناسراوە بە "ابن عطاء الله السكندري"و ناوی (تاجەددین ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی عەتائوڵڵا)یە. مرۆڤێکی خواناس و، زانایەکی مەزن بووە لە تەفسیر و حەدیث و فیقهـ و ئوصول و نەحودا، هەروەك ڕابەرێکی مەزنی سالیکان بووە. دوازدە ساڵ لە خزمەتی "شیخ أبو العباس المرسي"دا ماوەتەوە و لەسەر دەستی ئەودا خوای گەورە دەرووی لێ کردووەتەوە. لەسەر کورسیی وەعزی مزگەوتی ئەزهەر ئامۆژگاریی پێشکەش کردووە و، گوفتاری ئەهلی تەسەووف و ئاسەوارەکانی سەلەفی لەگەڵ جۆرەکانی زانستدا پێکەوە لە ئامۆژگاری‌یەکانی‌دا تێکەڵ دەکرد و خەڵکانێکی زۆر لێی بەهرە مەند بوون. ساڵی: (٧٠٩ ك/١٣٠٩ز) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: (مختصر تسهذيب المدونة) لە فیقهدا، (أصول مقامات الوصول)، (الحكم العطائية)، (لطائف المنن) (مفتـاح الفلاح). (وەرگێڕ)

(٢) ئەم بڕگەیە: (ماذا وجد من فقدك وما الذي فقد من وجدك) دەکەوێتە کۆتایی "الحكـم العطائيـة"وە. کتێبی ناوبراو گەلێ شەرح و لێکدانەوەی زۆری لە کۆن و نوێدا لەسەر کراوە، جوانترین شەرحی نوێی ئەو کتێبە لە لایەن زانای هاوچەرخی کورد: دکتۆر محەممەد سەعید ڕەمەزان بۆتانی‌یەوە نووسراوە، کە لە پێنج بەرگی گەورەدایە بە زمانی عەرەبی.

حاجی خەلیفە لە کتێبی (کشف الظنون)دا بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسەی "الحكم العطائية" دەکات: چەند دانستێکە لەسەر زاری ئەهلی تەریقەت دەماودەمیان پێ دەکرێت. کاتێ دانەر ئەم حیکمەتانەی نووسی، پیشانی شێخەکەی خۆی دا کە ناوی "شيخ أبو العباس المرسـي"یە، ئەویش بە وردی سەرنجی لێ دان و، پاشان فەرمووی: "کوڕم! ئامانجەکانی "إحياء"ت لەم ناملیکەیەدا کۆکردووەتەوە".. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەهلی چێژبردن لەم بابەتانە لەبەر واتا ناسك و ڕەوانەکانی، شەیدای بوون. (وەرگێڕ)

(٣) ئەسڵی فەرموودەکە بەم شێوەیە: (بدأ الاسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدأ غريباً، فطوبى للغربـاء). رواه مسلم عن أبي هريرة مرفوعاً. ورواه أيضاً بألفاظ متقاربة: الترمذي وابن ماجه وأحمد. (وەرگێڕ)

جا برایانم!

هەرچەندە تاریکی‌یەکانی ئەم جۆرە غەریبی‌یانە بە نووری ئیمان ڕەوینەوە و لە دەوروبەرمدا نەمان، بەڵام هەر هەندێ جێ پەنجەی فەرمانەکانی خۆیان لە مندا بەجێ‌هێشت و، ئەم بیرەیان بە خەیاڵدا هێنام:

مادەم خۆم غەریبم و لە غەریبی‌دا دەژیم و بەرەو غەریبیش دەڕۆم، ئایا بڵێی ئەمە وا بگەیەنێت کە ئەرکی سەرشانم لەم میوانخانەیەدا کۆتایی پێ هاتبێت تاکو ئێوە و "وتەکان" بکەم بە وەکیل و لە بریی خۆم داتان‌بنێم و، بە تەواوی پەیوەندی‌یەکانم بەم دنیایەوە ببچڕم و دەستی لێ دابشۆم؟

جا لەبەر ئەوەی ئەم بیرەم بەم شێوەیە بە دڵدا هات، ئەوا ئەم چەشنە پرسیارانەی خوارەوەم ئاراستە دەکردن کە:

ئایا "وتەکان" سەروزیادن؟ ئایا ناتەواوی‌یان تێدایە؟

مەبەستیشم لەم پرسیارانە ئەوە بوو کە: ئایا ئەرکی سەرشانم تەواو بووە؟ تا دنیا لە بیری خۆم بەرمەوە و بە دڵنیایی‌یەوە خۆم بهاومە ناو باوەشی غەریبی‌یەکی گەرموگوڕ و نوورانی و بەلەزەت و ڕاستەقینەوە و، منیش وەکو مەولانا جەلالەددین بڵێم:

دانی سماع چه بود؟ بیخود شدن ز هستی أندر فنای مطلق ذوق بقا چشیدن![1]

خۆزگا دەمزانی مافی ئەوەم هەیە بە دوای غەریبی‌یەکی ئاوا بەرز و بڵندا بگەڕێم؟!

بەڵێ، لەبەر ئەمە بوو ئەو پرسیارانەم ئاراستە دەکردن!

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) واتە: ئایا دەزانیت سەماع چی‌یە؟ ئەوەیە کە لەم وجوودە فانی ببیت و تامی "بەقا" لە "فەنای موتلەق"دا بچێژیت. (وەرگێڕ)

# مەکتووبی حەوتەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیزەکانم!

"حافظ تۆفیق"تان[1] ڕاسپاردبوو کە دوو مەسەلەم پێ بڵێت:

یەکەم: گومڕایانی ئێستا - وەك مونافیقانی پێشین - لەو ژن هێنانەی پێغەمبەر ﷺ کە زەینەبی مارە کرد، ڕەخنە و بیانوو دەگرن، چونکە لایان وایە ئەو ژن هێنانە لەسەر بناغەی هاندەری دەروونی و ئارەزوو بووە!

**وەڵام:**

نەخێر، هەزار جار نەخێر.. دەستی ئارەزووە نزمەکان گەلێ لەوە کۆتاترە کە بە چمکێکی داوێنی ئەو پلە بەرز و بڵندە بگات..

بەڵێ، کەسێ خاوەنی هێندەی گەردیلەیەك ویژدان بێت، دەزانێت پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە تا چل ساڵی، کە تەمەنێکە گەرمیی غەریزەی تێدا قوڵپ دەدات و ئارەزووی دەروونیشی تێدا گڕ دەگرێت، بە شایەتیی دۆست و دوژمنانی، ئەو

---

(١) "حافظ تۆفیق" (١٨٨٧ - ١٩٦٥ز) لە یەکەم دەستەی قوتابییانی نوور و نووسەرەوەکانی پەیامەکانی نوورە و، بۆیە پێی دەوترێ: "حافظ" چونکە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە و، بۆیە بە نازناوی "شامی"ش بەناوبانگە چونکە ماوەیەکی زۆر لە شام لەگەڵ باوکیدا ماوەتەوە کە لەوێ ئەفسەر بووە. پیاوێکی زانا و خاوەن تەقوا بووە و، لە شارۆچکەی "بارلا" و پاشان لە بەندیخانەکانی: "ئەسکی شەهر" و "دەنیزلی" لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بووە، خوای گەورە لێی خۆش بێت و پلەی بەرز بکاتەوە. (وەرگێڕ)

بە خاوێنی و داوێن پاکیی تەواو ژیاوە و، بە ژنێکی نیمچەپیر - کە حەزرەتی خەدیجەیە، خوای لێ ڕازی بێت - قایل بووە.

کەواتە شتێکی گەلێ ئاشکرا و بەڵگەنەویستە کە فرەژنیی ئەم مەردە بەڕێز و داوێن پاکە لە دوای تەمەنی چل ساڵی، واتە لە کاتی وەستانی گەرمیی غەریزە و ئارەزووەکاندا، هی داخوازیی دەروون نی‌یە، بەڵکو لەسەر چەندین دانایی گرنگ بنیات نراوە، کە ئەمەی خوارەوە یەکێکیانە:

هەموو فەرموودە و کردار و حاڵەت و ڕەفتار و وەستان و جموجووڵەکانی پێغەمبەر ﷺ کانگای ئایین و سەرچاوەی ئەحکامەکانی شەریعەتن.

هاوەڵە بەڕێزەکان - خوایان لێ ڕازی بێت - ئەم ئەحکامانەیان گێڕاوەتەوە و، ئەرکی ڕاگەیاندنی لایەنی ئاشکرای ژیانی پێغەمبەریان ﷺ بە تەواوی خستووەتە ئەستۆ.

بەڵام ریوایەت کردن و هەڵگرتن و ڕاگەیاندنی ئایین و ئەو ئەحکامانەی شەریعەت کە سەرچاوەیان حاڵەت و بارە نادیارەکانی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ و لە چوارچێوەی کاروبارە تایبەتی و کەسی‌یەکانی ئەودان، تەنها خێزانە پاك و بێ گەردەکانی ئەنجامیان داوە و ڕایان گەیاندووە. چونکە ئەم ئەرکەی ئەستۆیان بە ڕاستی و دروستی ئەنجام داوە و مافی خۆیان داوەتێ. تەنانەت نیوەی ئەحکام و نهێنی‌یەکانی ئایین لە ڕێی ئەوانەوە وەردەگیرێن..

بەڵێ، ئەو فەرمانبەری‌یە مەزنە، پێویستی بە چەند خێزانێکی زۆر دەبێت کە مەشرەبیان لە یەکتر جیاواز بێت.

سەبارەت بە مارەبڕینی زەینەبیش لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوا لە تیشکی سێ‌هەمی ڕۆشنایی یەکەمی "وتەی بیست و پێنجەم"دا[1]، لە بارەی ئەم ئایەتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ماكان محمَّدٌ أبا أحدٍ من رجالِكم ولكِنْ رسولَ اللهِ وخاتَمَ النبيين﴾ (الأحزاب:٤٠)..

وتراوە کە:

تەنها یەك ئایەت چەندین واتای زۆر بە چەند ڕوویەك و بەپێی تێگەیشتنی چینەکانی خەڵکی، دەگەیەنێت..

---

(١) مەبەست پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"یە. (وەرگێڕ)

ئەوەتا چینێکی خەڵك بەشیان لە تێگەیشتنی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەمەیە:

حەزرەتی زەید - خوای لێ ڕازی بێت - کە بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەرە ﷺ و ، شەرەفمەندی ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ بە: "کوڕم" بانگی کردووە.. ئەم زەیدە، هەستی کرد هاوشانی ئەو هاوسەرەی ژیانی نییە کە بەلایەوە ئازیزە. ناچار تەڵاقی دا. وەك چەندین ڕیوایەتی صەحیح لەم ڕووەوە هەیە و، زەید خۆیشی دانی بەمەدا ناوە.

واتە زەینەب لە ئاستێکی بەرزتری خوو و ڕەوشتدا بەدی هێنرابوو، زەیدیش بە فیراسەتی خۆی هەستی بەمە کرد و، زانیی شایانی ئەوەیە هاوسەری پێغەمبەرێك بێت نەك ئەو. چونکە هەستی کرد هاوشانی نییە. ئەمەش بوو بەهۆی پێکەوە نەگونجانی دەروون و ڕۆحی هەردوو کیان. ئەوەبوو زەید تەڵاقی دا و، پێغەمبەریش ﷺ بە فەرمانێکی خوای گەورە مارەی کرد.

ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿زَوَّجناکها﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە عەقدێکی ئاسمانی لە پێغەمبەر ﷺ مارە بڕاوە. کەواتە عەقدێکی نائاساییە و لە سەرووی داب و عورف و مامەڵەی ڕواڵەتییەوەیە، چونکە عەقدێکە تەنها بە فەرمانی قەدەری خوای گەورە ئەنجام دراوە، بە ڕادەیەك کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە ناچاری ملی بۆ ئەو فەرمانەی خوای گەورە کەچ کرد، لە کاتێکدا کە لە دەروونەوە حەزی لەو کارە نەبوو.

جا ئەم حوکمەی قەدەری خوای گەورە، فەرمانێکی شەرعیی گرنگ و ، دانایی و بەرژەوەندییەکی گشتیی تێدایە. چونکە بەپێی ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی: **﴿لکي لا یکون علی المؤمنین حَرَجٌ في أزواجِ أدعیائِهِم﴾** (الأحزاب:٣٧) گەر مرۆڤ کەسی لە خۆی بچووکتر بە: "کوڕم" بانگ بکات، ئەوا ئەم بانگ کردنە ئەحکامەکانی شەرع ناگۆڕێت. چونکە ئەمە هاوچەشنی ئەوە نییە کە یەکێك بە ژنی خۆی بڵێت: "پشتی تۆ وەك هی دایکم وایە" کە بەوە ژنەکەی لێ حەرام دەبێت.

هەروەها پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - و گەورەپیاوان کاتێ لەگەڵ نەتەوەکان و میللەتانی خۆیاندا دەدوێن و بە چاوی باوکایەتی بۆیان دەڕوانن، تەنها لە ڕووی ئەرکی پێغەمبەرێتیی سەرشانیانەوەیە و، هەرگیز لە ڕوانگەی کەسێتیی مرۆڤانە و خزمایەتییەوە نییە، تاکو ژن هێنانیان لەوانە لێ حەرام بێت.

چینێکی تری خەڵك بەم جۆرە لە ئایەتەکە تێدەگەن کە:

سەرگەورەیەکی مەزن و فەرمانڕەوا، بە چاوی باوکایەتی‌یەوە بۆ میللەتەکەی خۆی دەڕوانێت، واتە: بە وێنەی باوك خاوەنی میهر و شەفەقەتە بۆیان. جا ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایە دەستەڵاتدارێکی ڕۆحیی ئاشکرا و پەنهان بێت، ئەوا میهرەبانی‌یەکەی چەندین ئەوەندەی هی باوکان زیاتر دەبێت و، خەڵکەکەش وەك بۆ باوکیان بڕوانن ئاوا بۆ ئەو دەڕوانن، وەك بڵێی منالی ڕاستەقینەی ئەو بن..

جا لەبەر ئەوەی کە گەلێ زەحمەتە ڕوانینی باوکایەتی بگۆڕێت بۆ مێردایەتی و، ڕوانینی کچایەتیش بە ئاسانی ناگۆڕێت بۆ ڕوانینی ژنێتی، ئەوا عامەی خەڵکی بەلایانەوە زەحمەت بووە کە پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە کچی ئیمانداران مارە بکات. جا قورئانی پیرۆز ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەی ئەوان ڕاست دەکاتەوە و پێیان دەفەرموێ:

پێغەمبەر ﷺ گەلێ بەشەفەقەتە بۆ ئێوە و وەك باوك مامەڵەتان لەگەڵدا دەکات و، بە ڕوانینی میهرەبانیی خوای گەورە بۆتان دەڕوانێت، واتە سەبارەت بەو پەیامەی بۆی هێناون، ئێوە وەك کوڕی ئەو وان. بەڵام سەبارەت بە کەسێتیی مرۆڤانەی خۆی و لەو ڕووەوە، دیارە باوکی ئێوە نی‌یە تاکو ئەم ژن هێنانەی ئەوتان پێ زەحمەت بێت، هەرچەندە بە: (کچانم!.. کوڕانم!)یش لەگەڵتان بدوێت. چونکە ئێوە، بەپێی ئەحکامی شەرع، کوڕی ئەو نین، کەواتە نابن بە کوڕی ڕاستەقینەی.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی هەشتەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

گەلێ دانستی زۆر لەوەدا هەیە کە هەردوو ناوی: "الرحمن الرحيم" ڕۆشتوونەتە ناو "بەسمەلە"وە و، لە سەرەتای هەموو کارێکی گرنگیشەوە دەوترێن. پشت بە خوا ڕوونکردنەوەی ئەو دانستانە بۆ کاتێکی تر هەڵدەگرین. بەڵام لێرەدا هەست و نەستێکی تایبەت بە خۆمەوە باس دەکەم.

برام!

من دەبینم دوو ناوی "الرحمن الرحيم" نوور و ڕووناکی‌یەکی ئەوتۆیان هەیە کە دەوزاندەوری سەرانسەری گەردوونی داوە و، هێندەش هێز و درەخشانی‌یان بۆ هەموو ڕۆحێك تێدا دەبینم کە سەرجەمی پێداویستی‌یە هەمیشەیی‌یەکانیان نەهێڵێت و لە دوژمنە زۆر و لەژمارە بەدەرەکانیشیان ڕزگاریان بکات..

چونکە بۆم دەرکەوت کە گرنگترین هۆکار و ڕێی گەیشتن بەم دوو نوورە مەزنە بریتی‌یە لە: "هەژاری لەگەڵ شوکرانەبژێری" و "کزڵەواری لەگەڵ شەفەقەت"دا. بە واتایەکی تر بریتی‌یە لە: "بەندایەتی" و "هەژاری".

جا بە بۆنەی ئەم مەسەلەیەوە، من بە پێچەوانەی ڕای زانا لێکۆڵەرەکانەوە، تەنانەت بە پێچەوانەی مامۆستاکەشمەوە کە ئیمامی ڕەببانی‌یە، دەڵێم:

ئەو هەست و سۆزە توندوتیژ و درەخشانەی کە حەزرەتی یەعقووب بەرامبەر بە حەزرەتی یووسف - درووودیان لەسەر بێت - دەری بڕیوە، هەڵقوڵاوی "عیشق" و "مەحەببەت" نین، بەڵکو لە کانیاوی شەفەقەتەوە هەڵقوڵاون. چونکە شەفەقەت لە عیشق و مەحەبەت کاریگەرترە و لە هەردوو کیشیان درەخشانتر و بەرزتر و خاوێنترە، کەواتە شەفەقەت شایانترە بۆ مەقامی "نبووەت".

بەڵام "مەحەبەت" و "عیشق" شایانی پلەوپایەی نبووەت نین، گەر بە توندی ئاراستەی خۆشەویستانی مەجازی و بەدیهاتووان بکرێن.

واتە ئەو هەست و سۆزانەی حەزرەتی یەعقووب بەرامبەر بە حەزرەتی یووسف - درووودیان لەسەر بێت - کە قورئانی پیرۆز لە درەخشانترین شێوە و بریسکاوەترین ئیعجازدا باسی کردووە و هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە ناوی "الرحیم"ی خوای گەورە، بریتییە لە پلەیەکی یەکجار بەرز و بڵندی "شەفەقەت".

بەڵام "عیشق" کە هۆی گەیشتنە بە ناوی "الودود"ی خوای گەورە، لە خۆشەویستیی "زولەیخا"ی خێزانی عەزیزدا بۆ حەزرەتی یووسف - درووودی لەسەر بێت - دەردەکەوێت.

کەواتە قورئانی پیرۆز لە چ مەودایەکی بڵند و باڵادا بەرزیی هەست و سۆزەکانی حەزرەتی یەعقووب بەسەر هەست و سۆزەکانی زولەیخادا روون دەکاتەوە، لە هەمان مەوداشدا بەرزیی "شەفەقەت" لە چاو "مەحەبەت"دا دەخاتە روو!

مامۆستاکەم (ئیمامی ڕەببانی) فەرموویەتی:

"جوانیی حەزرەتی یووسف لە جۆری جوانییەکانی دوارۆژ بووە. کەواتە ئاراستە کردنی مەحەبەت بەرامبەر بەو جوانییە لە جۆری مەحەبەتە مەجازییەکان نییە، هەتا قسوور و ناتەواویی بدرێتە پاڵ"[(١)]..

چونکە ئیمامی ڕەببانی پێی وایە عیشقی مەجازی بە تەواوی شایانی مەقامی "پێغەمبەرایەتی" نییە.

بەڵام من دەڵێم:

ئەی مامۆستای بەڕێزم! ئەمە تەئویلێکی دژوارە! دەبێ حەقیقەت بەم جۆرە بێت:

ئەو هەست و سۆزانە، هەست و سۆزی "مەحەبەت" نین، بەڵکو پلەیەکی "شەفەقەت"ن کە سەد هێندەی مەحەبەت درەخشانتر و فراوانتر و بەرز و بڵندترە.

بەڵێ، هەموو جۆرەکانی "شەفەقەت" ناسك و خاوێنن.. بەڵام زۆر جۆری "عیشق" و "مەحەبەت" هەن کە تەنازولیان بۆ ناکرێت!

پاشان ئەوەش هەیە کە "شەفەقەت" فراوانە، چونکە ئەو باوکەی کە شەفەقەتی بۆ منداڵەکانی خۆی هەیە، بەرامبەر هەموو منداڵێکی بچووك تەنانەت بەرامبەر گیانلەبەرانیش

---

(١) بروانە: (مكتوبات الإمام الربانـي) ج٣/ص١٣٤ مەکتووبی سەدەمم. (وەرگێڕ)

خاوەنی شەفەقەت و بەزەیی‌یە و، بەم كـارەش یـەكێك لـە نوورەكـانی نـاوی "الرحیـم"ی خـوای گـەورە دەردەخــات كـە دەورانـدەوری هــەموو شـتێكی داوە. بـەڵام "عیشـق" خۆشەویستیی مرۆڤ تایبەت دەكات بە تەنها خۆشەویستەكەی خۆیەوە، بە ڕادەیەك كە هەموو شتێكی تری لە پێناودا بەخت دەكات یان بە شێوەیەكی ناوەكی(ضمـــني) زەمی ئەوانی تر دەكات و لە شـان و شـكۆیان دەهێنێتـە خـوارەوە، لـە پێنـاوی بەرزكردنەوەی ڕێز و بایەخی خۆشەویستەكەی خۆی!

بۆ نموونە یەكێك لە عاشقان وتوویەتی:

(خۆر كاتێ جوانیی خۆشەویستەكەم دەبینێـت شـەرم دەیگرێـت و لـە پشـت پـەردەی هەورەوە خۆی دەشارێتەوە تاكو نەیبینێت)!

ئەی عاشقی شەیدا! بە چ مافێك "خۆر" شەرمەزار دەكـەیت، كـە لاپەڕەیـەكی هێنـدە نوورانی‌یە هەشت ناوی مەزنی خوای گەورە دەردەخات؟!

پاشان ئەوەش هەیە كە "شـەفەقەت" بێ گەردە و هیـچ خواسـتێكی لـە شـەفەقەت پێـدا هاتووەكـە نـاوێت! كەواتـە خاوێنـە و داوای پاداشـت ناكـات. بەڵگـەش لەسـەر ئەمـە: شـەفەقەتی دایكـانی گیانلەبەرانـە كـە ئاوێتـەی خۆبەختكردنـە و لــە نزمـترین پلــەی شەفەقەتدایە. چونكە هیچ شتێكی لە بەرامبەر شەفەقەتەكەیەوە ناوێت..

كـەچی "عیشق" داوای پاداشـت دەكـات.. گریـە و زاریـی عاشـقان جۆرێكـە لـەو داواكاریی حەق و پاداشتە!

كەواتە شەفەقەتی حەزرەتی یـەعقووب - دروودی لەسـەر بێـت - كـە درەخشـانترین نوورە لە درەخشانترین سوورەتی قورئان(سوورەتی یووسف)دا، هەردوو نـاوی جوانـی: "الرحـمن الرحیـم" دەردەخـات و ڕایدەگەیـەنێت كـە: "شــەفەقەت" ڕێگـای بـەزەیی و میهرەبانی‌یە.

ئنجا چارەسەركردنی ئازاری ئەو شەفەقەتەش بریتی‌یە لە:

﴿فاللهُ خيرٌ حافظاً وهو أرحمُ الراحــمين﴾! (یوسف:٦٤).

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی نۆهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(ئەمە بەشێکە لە نامەیەك کە بۆ قوتابی‌یە ناسراوە بێ‌گەردەکەی خۆی ناردووە)

.......

**دووهەم:**

برام! شەوق و چالاکی و بەدەستهێنانی سەرکەوتنتان لە بواری بلاوکردنەوەی نوورەکانی قورئاندا، ئیکرام(ڕێزلێنان)ێکی خوایی‌یە، بەلکو کەرامەتێکی قورئانی و چاودێری‌یەکی پەروەردگارە، پیرۆزبایی‌تان پێشکەش دەکەم لەسەری.

وا بە بۆنەی باسی کەرامەت و ئیکرام و چاودێری‌یەوە، جیاوازی‌یەکتان لە نێوان "کەرامەت" و "ئیکرام"دا بۆ باس دەکەم، کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

دەرخستن و ئاشکراکردنی "کەرامەت" گەر پێویست نەبێت، زیانی تێدایە.. بەلام دەرخستنی "ئیکرام" بە باسکردنی نیعمەت(تحديث بالنعمة) دادەنرێت.

جا ئەو کەسەی کە شەرەفمەندی "کەرامەت" بووە گەر کارێکی دەراسای لێ دەربکەوێت و بەخۆیشی بزانێت، لەوانەیە ڕوودانی ئەو کارە نائاسایی‌یە سەبارەت بەو ببێت بە "ئیستیدراج"، گەر نەفسی ئەممارەی وەك خۆی مابێتەوە و تەزکیە نەکرابێت، لەو ڕووەوە کە لە خۆی ڕازی بێت و پشت بە کەشفەکەی ببەستێت و تووشی لەخۆبایی‌بوونی بکات..

بەلام گەر بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت و هەستی پێ بکات، کارێکی دەراسای لێ دەربکەوێت، وەك ئەوەی کەسێك بێت بۆ سەرلێدانی و لە دلی خۆیشیدا پرسیارێکی

پێ بێت و، ئەو خاوەن کەرامەتەش یەکسەر وەڵامێکی تێروتەسەلی بداتەوە و خوای گەورە زمانی بە حەق بخاتە گوفتار، ئەوا دوای ئەوەش کە بە رووداوەکە دەزانێت، پشت بە خۆی نابەستێت، بەڵکو متمانە و دڵنیایی‌یەکەی پتر زیاد دەکات بە خوای گەورە و، لە بەرخۆیەوە دەڵێت: من چاودێر و پارێزگارێکی ئەوتۆم هەیە کە لە خۆم زیاتر پەروەردە و سەرپەرشتیم دەکات. ئیتر لەم رێیەوە پشت‌بەستن(التوكل)ی بە خوای گەورە پتر زیاد دەکات.

ئەم چەشنە کەرامەتە هیچ زیانێکی تێدا نی‌یە و، داوا لە خاوەنەکەشی ناکرێت کە بیشارێتەوە، بەڵام نابێ بە شانازی پێوە کردنەوە هەوڵی دەرخستنیان بدات، چونکە لەوانەیە ئەو کاتە کارە دەراساکە بداتە پاڵ خۆی، لەو رووەوە کە بە رواڵەت هەندێ دەسکەوتی مرۆڤی تێدایە.

بەڵام "ئیکرام" تەنانەت لەم بەشی دووهەمە سەلیم و بێ زیانەی "کەرامەت"یش بێ‌وەی‌تر و سەلامەتترە و، پێم وایە لەویش بەرزترە. کەواتە ئاشکراکردنی جۆرێکە لە باسکردنی نیعمەت، چونکە هیچ بەشێکی دەستکەوتی مرۆڤی تێدا نی‌یە و "نەفس" ناتوانێت بیداتە پاڵ خۆی.

بەم جۆرە - برای بەڕێزم! - تا ئێستا هەر چاکەیەکی خواییم سەبارەت بە خۆم و خۆتەوە دیوە و نووسیوە، بە تایبەت خزمەت‌کردنمان بۆ قورئان، لە جۆری "ئیکرامی خوایی"یە و، دەرخستن و ئاشکراکردنی بریتی‌یە لە باسکردن و دەرخستنی نیعمەتی خوای گەورە. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە رووی باسکردنی نیعمەتەوە باسی تەوفیقی خواوەندت لەم خزمەتەدا بۆ دەنووسم. دڵنیاشم لەوەی کە ئەم کارە دەماری شوکرت تێدا دەبزوێنێت نەك فەخر و شانازی!

**سێهەم:**

بەختەوەرترین کەس بەلامەوە ئەو کەسەیە کە: دنیا لە بەرچاوی‌دا وەك میوانخانە و مەنزڵگایەکی سەربازی وابێت و، گومانیشی لەمەدا نەبێت و، هەموو رەفتارێکیشی بەپێی داخوازی‌یەکانی ئەم بۆچوونەی بێت..

ئەو کەسە، بەم روانینەی بۆ دنیا، دەتوانێت بە زووترین کات مەزنترین پلەی دەست بکەوێت و پێی بەهرەمەند بێت، کە پلەی رەزامەندیی خوای گەورەیە. چونکە مادەم بەو

چەشنە بۆ دنیای ڕوانی، ئەوا بە پارەی ئەڵماسی گرانبەها و هەمیشەیی هەرگیز وردە شووشەی بێ‌نرخ ناکڕێت، بەڵکو کارێك دەکات کە تێکڕای ژیانی بە خۆشی و ئیستیقامەت بباتەسەر.

بەڵێ، ئەو شتانەی کە سەر بە دنیان، لە ڕاستیدا وەك وردە شووشە وان، شایانی شکاندنن. بەڵام ئەو شتانەی کە دەمێننەوە و سەر بە دوارۆژی هەمیشەیین، بە چەشنی ئەڵماسی قایم و مەحکەم بەنرخن.

ئارەزووی توند و.. خۆشەویستیی بەجۆش و.. هەڵپەکاریی سامناك و.. پرسیار و داخوازیی توندوتیژ و.. چەندین هەستی تری چەشنی ئەمانە کە لە مرۆڤدا هەن و بە قووڵی ڕەگیان لە ناخیدا داکوتاوە، بۆ ئەوە پێی بەخشراون کە بە هۆیانەوە کاروباری سەر بە دوارۆژی دەستگیر ببێت و لەم ڕووەوە سوودیان لێ وەربگرێت. کەواتە ئاراستە کردنی ئەو هەستانە و بەکارهێنانیان بە خەستوخۆڵی لە کاروباری فانیی دنیادا، وەك گۆڕینەوەی ئەڵماس وایە بە وردە شووشەی بێ‌نرخ!

بە بۆنەی ئەم مەسەلەیەوە، ئەم خاڵەم بە دڵدا هات، وا باسی دەکەم بۆتان:

"عیشق" خۆشویستنێکی توند و بەهێزە. کاتێك ئەم عیشقە ڕووە و خۆشویستراوە فانییەکان ئاراستە دەکرێت، یان خاوەنەکەی بە ئێش و ئازارێکی بەردەوامەوە دەتلێنێتەوە، یان ناچاری دەکات بە دوای خۆشویستراوێکی باقی و ڕاستەقینەدا بگەڕێت، چونکە ئەو خۆشویستراوە مەجازییە شایانی ئەو خۆشەویستییە توندوتیژەی ئەو نییە! ئیتر ئەو کاتە عیشقە مەجازییەکە دەگۆڕێت بە عیشقی حەقیقی.

هەزاران هەستی هاوچەشنی ئەمە لە مرۆڤدا هەن، کە هەریەکەیان وەکو عیشق دوو پلەیان هەیە، یەکێکیان مەجازی و ئەوی تریان حەقیقییە.

بۆ نموونە: "خەم و پەژارە بۆ ئاییندە" هەستێکە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە. جا کاتێ کە مرۆڤ زۆر بە گەرمی خەم بۆ ئاییندەی خۆی دەخوات، دەبینێت لە لایەکەوە هیچ بەڵێن و پەیمانێکی نەدراوەتێ کە دەگاتە ئەو ئاییندەیەی خەمی بۆ دەخوات، لە لایەکی تریشەوە دەبینێت ڕزق و ڕۆزیی ئەو ئاییندەیەی کە ماوەکەی کەم و کورتە، لە لایەنی ڕۆزیدەرەوە بۆی مسۆگەر کراوە. کەواتە شایانی ئەم خەم و پەژارە گەرمە نییە. کاتێ مرۆڤ دەگاتە ئەم دەرئەنجامە، یەکسەر ڕووی خۆی لەو ئاییندەیە وەردەچەرخێنێت و ڕوو

دەکاتە ئایندەیەکی ڕاستەقینەی دوور و درێژ، کە وا لە پشتی گۆڕەوەو، بۆ بێئاگایان مسۆگەر نەکراوە.

پاشان مرۆڤ "هەڵپە"یەکی توندوتیژ ڕووەو "سامان" و "پلەوپایە" دەردەبڕێت. بەڵام دوایی کە بۆی دەردەکەوێت: ئەو ماڵ و سامانە وەك ئەمانەتێکی کاتی بە دەستی سپێردراوە و، ئەو پلەوپایەیەش کە خولگەی ناوبانگ دەرکردنێکی سەر بە موسیبەت و بەڵایە و سەرچاوەی ڕیاکارییەکی ئەوتۆیە مرۆڤ لەناو دەبات، هیچیان شایانی ئەو هەڵپە توند و تیژە نین..

کاتێ ئەمەی بۆ دەردەکەوێت، یەکسەر ڕوو دەکاتە "پلەوپایەی ڕاستەقینە" کە پایە مەعنەوییەکان و پلەکانی نزیکبوونەوەن لە خوای گەورە و توێشووی دواڕۆژن.. هەروەها ڕوو دەکاتە "سامانی ڕاستەقینە" کە ئەو کردەوانەن بۆ دواڕۆژ ئەنجام دەدرێن. ئەو کاتەش هەڵپەکارییە مەجازییەکەی - کە چەند ڕەوشتێکی بێ کەڵکن - دەگۆڕێت بە هەوڵدانێکی ڕاستەقینە، کە بریتییە لە چەند ڕەوشتێکی جوان و بەرز و باش.

نموونەیەکی تر: مرۆڤ هەندێ جار لەسەر چەندین شتی فانی و بێنرخ عینادی دەکات و لەسەریان سوور دەبێت. پاشان هەست دەکات ئەو شتەی کە ساڵێکی ڕەبەق لەسەری سوور بووە، شایانی یەك خولەکیش سەرسەختی و عینادی نییە و ئەوە ناهێنێت بەو چەشنە لەسەری سوور بێت. کەواتە "عینادی" و "سووربوون" لەسەر یەك قسە، مرۆڤ لەسەر هەڵوێست و قسە و شتێك دەهێڵێتەوە کە سەبارەت بەو چەشنی ژەهر وان و زیانیان تێدایە..

بەڵام کاتێ کە دەزانێت ئەم هەستەی بۆ ئەوە نەدراوەتێ لەم جۆرە شتە فانی و بێنرخانەدا بەکاری بهێنێت، چونکە بەکارهێنانی لەم بوارەدا پێچەوانەی ڕاستی و داناییە، ئەوا ڕەوتی (سوور و سابت بوون و عینادییە سەختەکەی خۆی) ڕووەو چەندین کاروباری نەبڕاوە و بلند ئاراستە دەکات، کە بریتین لە حەقیقەتەکانی ئیمان و بناغەکانی ئیسلام و ئەو کردەوانەی کە بۆ دواڕۆژ جێبەجێ دەکرێن. ئیتر ئەو هەستە مەجازییە توند و تیژەی "عینادیکردن و سوور و سابت بوون" کە ڕەفتارێکی خراپ و نەفرەت لێکراو بوو، دەگۆڕێت بە خوو و ڕەفتارێکی بەرز و خاوێن کە: "دامەزراویی ڕاستەقینە"یە و بریتییە لەوەی کە مرۆڤ لەسەر "حەق" سوور و دامەزراو بێت.

بەم جۆرە و بە گوێرەی ئەم نموونانەی باس کران، ئەگەر ئەو ئامێرە مەعنەوی‌یانەی کە بە مرۆڤ بەخشراون، لە پێناوی نەفس و دنیادا بیانخاتەکار – وەك بلێی لە دنیادا هەمیشەیی بێت – ئەوا ئەو ئامێرانەی بۆ دەبن بە سەرچاوەی چەندین خوو و ڕەفتاری نزم و کانگای ئیسراف و زیادەڕەوی لە کاروباردا و سەرچاوەی بێ‌مەبەستی‌یەکی بێ سوود و ئەنجام.. بەڵام گەر مرۆڤ هەستە ناسك و سووکەڵە و تەنکەکانی بۆ دنیا و، توندوتیژ و سەختەکانیشی بۆ دواڕۆژ و ئەو کردارانە ئاراستە بکات کە مەعنەوین و بۆ ئەودنیا بەجێ دەهێنرێن، ئەوا هەستەکانی بۆ دەبن بە سەرچاوەی ڕەوشتە بەرزەکان و، ڕێیەکی تەختایی بەرەو بەختەوەریی هەمیشەیی و یەکجار لەبار و گونجاویش لەگەڵ دانایی و حەقیقەتدا.

جا لەم ڕووەوە، من لەو باوەڕەدام کە هۆیەکی بێ‌ئەنجامیی ئامۆژگاری و نەسیحەتی ئامۆژگارانی سەردەم ئەوەیە کە بە مرۆڤی خراپکار دەڵێن:

حەسوودی مەبە.. هەڵپە مەکە.. دوژمنایەتی مەکە.. سەرسەخت مەبە.. دنیات خۆش نەوێت..

واتە پێی دەڵێن: (سروشتی خۆت بگۆڕە)!

دیارە ئەمەش تەکلیفێکە لە توانایاندا نی‌یە!

بەڵام گەر پێیان بڵێن:

(ئەم ڕەوشت و خوو و سیفەتانەی لە ئێوەدایە بەرەو کردەوەی خێر ئاراستەیان بکەن و لە کرداری چاکەدا بەکاریان بهێنن)، ئەوا ڕەوتی ئەو سیفەت و ڕەوشتانە دەگۆڕێت و ئامۆژگاری‌یەکەش سوودی دەبێت و لە دەروونـدا کاری خۆی دەکات و جێ دەگرێت. چونکە ئەو کاتە داواکاری‌یەکە لە سنوور و بازنەی ویست و ئیختیاری مرۆڤدایە!

چوارەم:

سەبارەت بە جیاوازی‌یەکانی نێوان "ئیمان" و "ئیسلام"ەوە گەلێ باسی دوور و درێژ لە نێوان زانایانی ئیسلامدا ڕووی داوە. بەشێکیان وتوویانە: هەردوو کیان هەر یەکێکن. بەشێکی تریان وتوویانە: نەخێر یەکێك نین. جگە لەمانەش گەلێ ڕا و بۆچوونی جیاوازی تری وەك ئەم دوانەیان باس کردووە. بەش بە حاڵی خۆیشم جیاوازی‌یەکی وەك ئەمەی خوارەوەم لە نێوانیاندا هەست پێ کردووە:

"ئیسلام": ئیلتیزامە، بەڵام "ئیمان" دان پێدانانە. یان بە دەستەواژەیەکی تر: "ئیسلام": وەلاء و تەسلیم بوون و ملکەچ کردنە بۆ "حەق".. بەڵام "ئیمان": تەسدیق و قبوولکردنی "حەق"ە.

کاتی خۆی هەندێ کەسانی بێدینم دەبینی وەلائێکی توندوتیژیان بۆ ئەحکامی قورئان هەبوو، بەو واتایەی کە ئەو کەسە مولحیدە، لە رووی ئیلتیزام کردنی بە "حەق"ەوە، جۆرە ئیسلامەتی‌یەکی بەدەست هێناوە و، پێی دەوترێت موسڵمانی بێ دین!.. پاشان هەندێ ئیماندارم بینی کە نە وەلائیان بۆ قورئان هەبوو نە ئیلتیزامیشیان پێوە دەکرد، واتە وەك ئەوە وان پێیان بوترێت: ئیمانداری ناموسڵمان!

جا ئایا دەگونجێ "ئیمان"ی بێ "ئیسلام" ببێت بەهۆی رزگارکردنی مرۆڤ لە رۆژی قیامەتدا؟

**وەڵام:**

هەروەك "ئیسلام"ی بێ "ئیمان" نابێت بەهۆی رزگاربوونی مرۆڤ، بە هەمان جۆر "ئیمان"ی بێ "ئیسلام"یش نابێت بەهۆی رزگاربوونی.

سوپاس و حەمد و سەنا بۆ خوای گەورە کە تەرازووەکانی "پەیامەکانی نوور" بە چەشنێکی تێر و تەسەل و، بەهۆی رێژنەی ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆزەوە: بەروبوومەکانی ئایینی ئیسلام و ئەنجام و حەقیقەتەکانی قورئانیان بە چەشنێك روون کردووەتەوە کە ئەگەر مرۆڤی بێ ئایینیش لێیان تێ بگات، هەرگیز ناگونجێ وەلائی بۆیان نەبێت و پشتگوێیان بخات.

هەروەها ئەم پەیامانە بەڵگەکانی "ئیمان" و "ئیسلام"یشیان بە چەشنێکی هێندە مەحکەم و بەهێز خستووەتە روو کە ئەگەر مرۆڤی ناموسڵمانیش لێیان تێبگات، ئەوا بێ هیچ گومانێك تەسدیقیان دەکات و ئیمانیان پێ دەهێنێت، تەنانەت گەر لەسەر غەیری ئیسلامیش بمێنێتەوە.

بەڵێ، "وتەکان" بەروبوومەکانی "ئیمان" و "ئیسلام"یان هێندە بە روونی و شیرینی خستووەتە پێش‌چاو دەڵێی تام و لەزەتی درەختی تووبای بەهەشتن و.. ئەنجامە پێگەیشتووەکانی ئەم دوانەشیان بە وێنەی خۆشترین بەختەوەریی هەردوو دنیا روون کردووەتەوە، بە رادەیەك کە هەستی وەلاء و لایەنگری و تەسلیم بوونی تەواوەتی بە

هەموو ئەو کەسانە دەبەخشن کە دەیانبینێت و دەیانناسێت. تەنانەت بە ئەندازەی هێز و ڕەگداکوتاویی سەرجەمی بوونەوەران و بە ژمارەی گەردیلەکان بەڵگەیان لەسەر ڕاستی‌یەکانی "ئیمان" و "ئیسلام" هێناوەتەوە و، هێندە ملکەچی و دامەزراوی و توندوتۆڵیش لە بواری "ئیمان"دا بە مرۆڤ دەبەخشن کە سنووری نەبێت..

تەنانەت کە من هەندێ جار وشەی شایەتمان لە "ئەورادی شاهی نەقشبەند"دا دەخوێنم و دەگەمە سەر ئەوەی کە دەفەرموێ: "على ذلك نحيا وعليه نموت وعليه نبعث غداً" هەست بەوپەڕی ئیلتیزام دەکەم، بە ڕادەیەك کە ئەگەر سەرانسەری دنیاشم بدەنێ هێشتا یەك دانە حەقیقەتی ئیمانیی لە پێناودا بەخت ناکەم، چونکە گریمانکردنی هەر شتێك کە پێچەوانەی حەقیقەتێك بێت - با بۆ ماوەی یەك خولەکیش بێت - ئازارێکی هێندە قورسی هەیە کە لە توانامدا نی‌یە بەرگەی بگرم! تەنانەت نەفسم ئامادەیە کە ئەگەر سەرجەمی دنیاشی ببێت هەر هەمووی لە پێناوی یەك حەقیقەتی ئیمانی‌دا بدات و بەختی بکات..

ئنجا کە لەو ویردانەدا دەشگەمە سەر ئەم بڕگەیە: "وآمنا بما أرسلت من رسول، وآمنا بما أنزلت من كتاب، فصدقنا" هەست بە هێزێکی ئیمانیی یەکجار گەورە و بێ سنوور دەکەم و، هەر شتێك دژ و پێچەوانەی حەقیقەتێك بێت لە حەقیقەتەکانی ئیمان بە مەحاڵی عەقڵیی دەزانم و، گومڕایان لەوپەڕی گێلی و شێتی‌دا دێنە پێش چاوم.

ڕێز و سڵاوی زۆرم بە دایك و باوکت بگەیەنە و تکای دوعای خێریان لێ بکە بۆم. جا لەبەر ئەوەی تۆ برای منیت ئەوا ئەوانیش لە حوکمی دایك و باوکی مندان. سڵاوم بە سەرجەمی خەڵکی گوندەکەتان بگەیەنە بە تایبەتی ئەوانەی کە "وتەکان"ت لێ دەبیستن.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی دەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

وەڵامی دوو پرسیار:

❑ **یەکەمیان:**

پەراوێزی "مەبەستی دووهەم"ی وتەی سیهەمە، کە تایبەتە بە: "خودیی مرۆڤ و بزووتنی گەردیلەکان"ەوە:

لە چەند جێیەکی قورئاندا ﴿**إمام مبين**﴾ و ﴿**كتاب مبين**﴾ هەن. هەندێ لە تەفسیرنووسان وتوویانە: هەردووکیان یەك واتایان هەیە. هەندێکی تریش وتوویانە: واتاکانیان لە یەك جیایە و، چەند ڕوویەکی جیاجیا و جۆراوجۆریان بۆ ڕاستیی واتاکانیان لێك داوەتەوە. کورتەی قسەکانیان لەوە دەرناچێت کە وتوویانە: ئەم دوانە دوو ناونیشانی جیای زانیاریی خواوەندن.

بەڵام من، بەهۆی ڕێژنەی نووری قورئانی پیرۆزەوە، دڵنیایی تەواوم بۆ پەیدا بوو کە: "ئیمامی موبین" ناونیشانی جۆرێکە لە "زانست" و "فەرمانەکانی" خواوەند کە زیاتر ڕوویان لە جیهانی پەنهانی غەیبە تاکو جیهانی بینراو. واتە: زیاتر بۆ ڕابوردوو و داهاتوو دەڕوانن تاکو کاتی ئێستا. بە دەستەواژەیەکی تر دەڵێین: تۆمارێکی قەدەری خوای گەورەیە کە زیاتر بۆ بنەچە و نەوە و ڕەگ و تۆوی هەموو شتێك دەڕوانێت تاکو بوونە ڕواڵەتییەکەی. لە وتەی بیست و شەشەم (پەیامی قەدەر) و لە پەراوێزی وتەی دەهەم(پەیامی حەشر)دا بوونی ئەم تۆمارە چەسپێنراوە.

بەڵێ، ئەم "ئیمامی موبین"ە ناونیشانی جۆرێکی "زانست" و "فەرمانی" خوای گەورەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە: بەرهەمهێنانی بنەما و ڕەگ و بنەچەی شتان بەوپەڕی ناوازەیی و وردەکاری و داهێنانەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕێکوپێکییە بەپێی تۆماری دەستوورەکانی "زانست"ی خواوەند ئەنجام دەدرێن.. هەروەها ئەنجام و نەوە و تۆوی شتان، لەبەر ئەوەی بەرنامە و پێڕستی بوونەوەرانی داهاتوویان تێدایە، ئەوا تۆمارێکی بچووکی "فەرمانەکانی" خواوەندن. بۆ نموونە: دەتوانرێت بوترێت: "تۆو" بەرنامە و پێڕستێکی بەرجەستەیە بۆ هەموو پێکهێنەرەکانی درەختی زەبەلاح و بۆ ئەو "فەرمانە تەکوینییانە"ی خواوەند کە ئەو بەرنامە و پلان و پێڕستانە دەستنیشانیان دەکەن.

بە کورتی: "ئیمامی موبین" وەك پێڕست و بەرنامەیەك وایە بۆ "درەختی بەدیهێنراوان" کە بە چواردەوری ڕابوردوو و ئایندە و جیهانی پەنهانی "غەیب"دا ڕەگ و لق و پەلیان هاویشتووە. کەواتە: "ئیمامی موبین" بەم واتایە: تۆماری قەدەر و دەفتەری دەستوورەکانی خواوەندە و، کاتێ گەردیلەکان بەرەو جموجووڵ و کار و فەرمانبەرییان لەناو شتاندا دەدرێنەبەر، ئەوا بەپێی داخوازی و فەرمانەکانی ئەو دەستوورانە بەرەو ئەو مەبەست و ئامانجانە دەبرێن.

بەڵام "کیتابی موبین" زیاتر ڕووی لە جیهانی بینراوە تاکو جیهانی پەنهان. واتە: زیاتر ڕووەو کاتی ئێستا دەڕوانێت تاکو ڕابوردوو و ئایندە. چونکە زیاتر ناونیشان و تۆماری کتێبی "توانست و ویست"ی خواوەندە تاکو ئەوەی ناونیشانی زانست و فەرمانەکانی خوای گەورە بێت. بە دەستەواژەیەکی تر دەڵێین: هەروەك "ئیمامی موبین" تۆماری "قەدەر"ی خواوەندە، "کیتابی موبین"یش تۆماری "قودرەت"ی ئەوە. واتە: ڕێکوپێکی و وردەکاری کە لە هەموو شتێکدا هەن، چ لە "بوون"ی دا، چ لە "چییەتی"یەکەی دا، چ لە سیفەتەکانی دا، چ لە کاروباری دا، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە کاتێ ئەو شتە بوونی پێ دەبەخشرێت و وێنەکانی بۆ دەستنیشان دەکرێت و، ئەندازەی بۆ دیاری دەکرێت و، شێوەیەکی تایبەتیی پێ دەدرێت، هەموو ئەمانەی بەپێی چەند دەستوورێکی توانستێکی تەواو و یاساکانی ویستێکی جێبەجێ کراو، بۆ ئەنجام دەدرێت.

کەواتە ئەو "توانست و ویستەی خواوەند" دارای چەندین یاسای هەمەکی و گشتین و، ئەم یاسایانەش لە تۆمارێکی مەزندا هەڵگیراون و پارێزراون، بە چەشنێك کە بەرگ و پۆشاکی جۆرەکانی "بوون"ی هەموو شتێك و وێنە و شێوە تایبەتی‌یەکانی، بەپێی ئەو یاسایانە دەبڕرێن و دەدوورێن. بوونی ئەم تۆمارە و بوونی "ئیمامی موبین" لە پەیامی "قەدەری خوا و جوزئی ئیختیاری"دا چەسپێنراون.

سەیری نەفامی و گومڕایی و بێ‌ئاگایی فەیلەسووفەکان بکە.. ئەوەتا ئەوان هەستیان بە بوونی لەوحی پارێزراوی توانستی بەدیهێنەرانەی خواوەند کردووە و، بە دیاردەکانی ئەو کتێبە بینەرەی دانایی پەروەدگار و ویستە جێ‌بەجێ کراوەکەی ئەویان لە شتاندا زانیوە و، پەی‌یان بە وێنە و نموونەکانی بردووە.. بەڵام - بە داخەوە - ناوی "سروشت"یان لێ ناوە و، بەمەش ڕووناکی‌یەکەیان کوژاندووەتەوە!

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە: بە داخوازیی "ئیمامی موبین" واتە: بەپێی فەرمانی "قەدەر"ی خوای گەورە و دەستوورە جێ‌بەجێ کراوەکانی ئەو، توانست(قودرەت)ی خواوەند کاتێ شتان دروست دەکات، ئەوا زنجیرەی بوونەوەران دەنووسێت کە هەریەکەیان لە خۆی‌دا نیشانەیەکی سەربەخۆیە و گەردیلەکان لە "لەوحی کوژانەوە و تۆمارکردن"دا - کە لاپەڕەی میسالیی "کات"ە - بەدی دەهێنێت و دەیانبزوێنێت.

واتە: جموجووڵ و بزووتنی گەردیلەکان، لە ڕاستی‌دا، بریتین لە چەند لەرینەوە و بزووتنەوەیەك کە دێنە ڕێی بوونەوەران کاتێ لە "نووسین" و "لەبەرگرتنەوە" و "جیهانی پەنهان"ەوە بەرەو جیهانی بینراو دێن و دەپەڕێنەوە. واتە کاتێ لە: "زانست"ەوە بۆ "توانست" دەڕۆن و دەگوێزرێنەوە.

"لەوحی کوژاندنەوە و تۆمارکردن"یش لە ڕاستی‌دا تۆمارێکی بگۆڕی لەوحی پارێزراو(اللوح المحفوظ)ی مەزن و هەمیشەیی و چەسپاوە و، تابلۆیەکە لە بازنەی "مومکینات"دا شتانی تێدا دەنووسرێن و دەکوژێنرێنەوە. واتە: تۆمارێکە بۆ ئەو شتانەی کە هەردەم مردن و ژیان و نەمان و بوونیان لە ڕێدایە، بە چەشنێ کە ڕاستیی "کات" بریتی‌یە لەم تۆمارە. بەڵێ، هەرچی شت هەیە دارای ڕاستی‌یەکە، ڕاستیی ئەو شتەش کە ئێمە ناوی "کات"مان لێ ناوە و وەك ڕووبارێکی مەزن و بەخوڕ وایە بە گەردووندا دەڕوات، کاغەز و مەرەکەبی نووسینەکانی توانستی خواوەندە لەو "لەوحی کوژاندنەوە و تۆمارکردن"ەدا! "لایعلمُ الغیبَ إلا اللّٰه".

□ پرسیاری دووهەم:

مەیدانی حەشر لەکوێیە؟!

وەڵام:

"العلم عند الله" واتە خوای گەورە خۆی دەزانێت..

بەڵام ئەوەندە هەیە: ئەو دانستە مەزن و بەرزەی بەدیهێنەری دانا، کە هەر بۆ خۆی لە هەموو شتێکدا ئاشکرای دەکات، تەنانەت لە بەستنەوەی چەندەها حیکمەت و زانستی زۆر و مەزندا بە شتێکی بچووکەوە دەری دەخات و دەیخاتە ڕوو، ئەم دانستەی بەدیهێنەری دانا، ڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:

گۆی زەوی لە گەشتە ساڵانەکەی‌دا بێ مەبەست و بە هەڕەمەکی هێڵی بازنەیەکی ئاوا مەزن ناکێشێت، بەڵکو بە دەوری شتێکی مەزندا دەسووڕێتەوە و هێڵی بازنەی مەیدانێکی گەورە و بەرین دەکێشێت و سنوورەکانی ئەو مەیدانە دەستنیشان دەکات و بە دەوری مەڵبەندە ناوبانگ(مَشـهَر)ێکی گەورەدا دەخولێتەوە و داهاتە مەعنەوی‌یەکانی زەویی پێ دەسپێرێت، تاکو لەو مەحشەرە مەزنەدا و لە پێش‌چاوی خەڵکی‌دا ئەو داهاتانە پیشان بدرێن. بەو واتایەی کە - وەك لە ڕیوایەتێکدا هەیە[1] - مەیدانی حەشرێکی مەزن لە ناوچەی شامەوە ڕادەخرێت و ئەو ناوچەیە لە حوکمی "ناوك" و "تۆو"ێکدا دەبێت کە پاشان بازنەیەکی ئەوەندە مەزن پڕ دەکاتەوە کە دەوراندەوری نزیکەی بیست و پێنج هەزار ساڵ ڕێ دەبێت.

داهاتە مەعنەوی‌یەکانی ئێستای زەوی بەردەوام بەرەو دەفتەر و لەوحەکانی ئەو مەیدانە دەنێررێن کە ئێستا لێمانەوە دیار نی‌یە و پەردەی غەیبی بەسەردا دراوەتەوە. خۆ کە لە داهاتوودا دەرگای ئەو مەیدانە دەکرێتەوە، ئەوا گۆی زەوی و دانیشتووانی ناویشی لە هەمان مەیداندا ڕۆ دەکات و، ئنجا ئەو داهاتە مەعنەوی‌یانەش لە دۆخی: "غەیب" دەردەچن و بەرەو جیهانی ئاشکرا و بینراو دەڕۆن و دەردەکەون.

---

(١) (انكم تحشرون رجالاً وركباناً، وتجرون على وجوهكم هاهنا ونحى بيده نحو الشام) السيوطي في الـدر المنثور ٣٤١/٥ وقال أخرجه ابن ابي شيبة وأحمد والترمذي وحسّنه والنسائي وابن مردويه والحاكم.
(وەرگێڕ)

بەڵێ، گۆی زەوی لە حوكمی "كێڵگە"دایە و، وەكو سەرچاوەیەك وایە و، چەشنی پێوەری دەغڵ و خەرمانە، كە هێندە داهات و حاسڵاتی زۆر و زەبەندەی بەرهەم هێناوە ئەو مەیدانە پڕ بكاتەوە و، ئەوەندە بەدیهاتووی بەخوری وەك لافاوی لەبەر ڕۆشتووە كە لەو مەیدانەدا پەنگ دەخۆن و جێیان دەبێتەوە و، هێندەش دروستكراوی زۆری لێ دەرهاتووە كە مەیدانەكە پڕ دەكەنەوە. واتە: گۆی زەوی چەشنی "ناوك"ە و ئنجا مەیدانی حەشر و شتانی ناویشی وەكو درەخت و گوڵەگەنم و كۆگای ئازووقە وان.

بەڵێ، هەروەك ئەگەر "خاڵ"ێكی ڕووناك بە خێراییەكی زۆر ببزوێنرێت، ئەوا هێڵی بازنەیەك دەكێشێت. گۆی زەویش بە هەمان جۆرە؛ چونكە بەو سووڕانەوە و جووڵە خێرا و پڕ لە دانستەی خۆی، دەبێت بەهۆی نواندنی بازنەی "بوون"، ئنجا ئەو بازنەیەش لەگەڵ داهاتەكانی ناویدا دەبن بە خولگەی پێكهاتنی مەیدانی حەشر.

﴿قُلْ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِنْدَ اللهِ﴾.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی یازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

**(ئەم مەکتووبە چارەسەرێکی گرنگە و ئاماژە بۆ چەند وردە گەوهەرێك دەکات کە لە گەنجینە مەزنەکانی چوار ئایەتی پیرۆز دەرهێنراون)**

برای بەڕێزم!

قورئانی حەکیم لە چەند کاتێکی جیاجیادا دەرسی ئەم چوار مەسەلە جۆراوجۆرانەی بە نەفسی ئەممارەم وتووەتەوە. وا دەیاننووسم بۆ هەرکام لەو برایانەم کە حەز دەکەن بەشێك یان دەرسێکی لێ وەربگرن.

جا ئەم مەسەلانە چەند گەوهەرێکی گەنجینەی چوار ئایەتی پیرۆزی جیاجیا ڕوون دەکەنەوە و، هەریەك لەو باسانەش شێوە و سوودی تایبەتیی خۆی هەیە.

☐ **باسی یەکەم:**

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾ (النساء:٧٦).

ئەی نەفسی نائومێدم لە ئەنجامی وەسوەسە و گومانەکانەوە!

یەکتر ڕاکێشانی ئەندێشەکان و بە دڵداهاتنی گریمانەکان: جۆرێکی نائیختیاریی "وێنە تێدا دەرکەوتن"ە. جا ئەگەر ئەم وێنە تێدا دەرکەوتنە لە شتانی "خێر" و "نوورانی"یەوە هاتبێت، ئەوا حوکمی حەقیقەتەکەی - تا ڕادەیەك - وێنە و نموونەکەشی دەگرێتەوە، کتومت وەك گواستنەوەی گەرمی و ڕووناکیی "خۆر" بۆ ناو ئاوێنە. بەڵام گەر ئەو وێنە تێدا دەرکەوتنە لە "شەڕ" و شتانی "لیڵ" و "چڕ"ەوە هاتبێت، ئەوا حوکم و

تایبەتکاریی ئەسڵەکەی هەرگیز شێوە و نموونەکەی ناگرێتەوە، وەك ئەوەی کە وێنەی شتی پیس و چەپەڵ لە ئاوێنەدا پیس و چەپەڵ نییە و وێنەی "مار"یش لە ئاوێنەدا بە کەسەوە نادات.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، "تەسەووری کردنی کوفر" مرۆڤی پێ کافر نابێت و، "بەخەیاڵدا هاتنی جوێن"یش بە جوێن دانانرێت. بە تایبەت گەر بە شێوەیەکی نائیختیاری و وەك گریمانێك بە دڵدا هاتبێت، ئەوا هەرگیز زیانی تێدا نییە.

پاشان هۆکاری پیس و چەپەڵیی هەر شتێك - بەپێی ڕێڕەوی ئەهلی حەق کە ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە - نەهی کردنی خواوەندە لەو شتە. خۆ مادەم ئەم کارەش ختوورەیەکە لە شێوەی گریماندا و بیرکێشەکیی ئەندێشەیە و بێ ویست و ئیختیاری مرۆڤ بە دڵدا هاتووە، ئەوا "نەهی"ی خوای گەورە نایگرێتەوە، کەواتە بە "ناشیرین" و "پیس و چەپەڵ" دانانرێت، هەرچەندەش وێنە بێت بۆ شتێکی پیس و چەپەڵ و ناشیرین.

❑ باسی دووهەم:

"بەر"ێکە لە سەوزەڵانیی چیایەکی (بارلا) و لە ژێر درەختی سنەوبەر و قەتراندا پێ گەیشتووە. خرایە ناو کتێبی "وتەکان"ەوە.

❑ باسی سێهەم:

ئەم مەسەلەیە و مەسەلەکەی دوای ئەمەش بەشێکن لەو نموونانەی کە دەستەوسانی و کۆڵەواریی شارستانێتیی نوێ لە بەردەم قورئاندا دەردەخەن کە لە "وتەی بیست و پێنجەم"دا باس کراون و، دوو نموونەن لەو هەزاران نموونانەی کە مەودای ئەو ماف خواردن و ستەمە دەچەسپێنن کە شارستانێتیی نوێ لە مافە مەدەنییەکاندا پیادەیان دەکات و دژ و پێچەوانەی ئەحکامی قورئانن.

ئەو فەرمانەی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء:١٧٦) یەکپارچە دادگەری و میهرەبانییە لە یەك کاتدا..

بەڵێ، ئەو حوکمە "دادگەری"یە، چونکە زۆربەی ڕەهای ئەو پیاوانەی ژن دەهێنن خەرجی و نەفەقەی ژنەکانیشیان دەگرنە ئەستۆ، بەڵام ژن کە شوو دەکات دەڕواتە لای مێردەکەی و خەرجی و نەفەقەکەی خۆیشی دەخاتە ئەستۆی ئەو مێردە و، لەم ڕێیەوە ناتەواویی میراتییەکەی پڕ دەکاتەوە.

پاشان فەرمانەكەی قورئان "میهرەبانی"شە، چونكە ئەو كیژە لاوازە گەلێ پێویستیی بە شەفەقەت و سۆزی باوكی و بەزەیی و میهرەبانیی براكەی هەیە. جا بەپێی ئەم حوكمەی قورئان، ئەو شەفەقەت و سۆزە بێ مەترسی‌یەی لە باوكیەوە دەستگیر دەبێت، چونكە باوكی بە جۆرێك بۆی دەڕوانێت كە مەترسیی لێ نەكات و هەرگیز لەبەر خۆیەوە نەڵێت: ئەم كچەم دەبێت بەهۆی گواستنەوەی نیوەی سامانەكەم بۆ بیانی‌یەكان. ئیتر بەم جۆرە شەفەقەت و سۆزە باوكانەكەی هیچ مەترسی و دڵەتەپێ‌یەكی ئاوێتە نابێت.

پاشان ئەو كچە، بەزەیی و پارێزگاری‌یەكی دوور لە حەسوودی و موونافەسەی لە براكەشیەوە دەستگیر دەبێت، چونكە ئەو كاتە براكەی وەك موونافیسێك بۆی ناڕوانێت كە بكوژێ نیوەی سامانەكەی باوكیان لەناو بەرێت و بیخاتە ناودەستی كەسێكی بیانی‌یەوە! دیارە ئیتر هیچ ڕق و كینە و لێڵی‌یەك سەرهەڵنادات تا بێ گەردی و خاوێنیی ئەو میهرەبانی‌یە لێڵ بكات.

جا لەم حاڵەتەدا بە ڕواڵەت ئەو كچەی كە بە فیترەت(سروشت) نیان و لاوازە، شتێكی كەمی لەدەست چووە، كەچی لە بریی ئەوە، سامانێكی نەبڕاوەی لە سۆز و بەزەیی كەسوكاری دەستگیر بووە.

دەنا گەر لە بەشی شایانی خۆی زیاتری بدرێتێ، بە بیانووی ئەوەی كە گوایا ئەو بەشە زیادەیە میهرەبانی‌یەكی زیاترە لە میهرەبانیی خوای گەورە! ئەوا هەرگیز ئەم كارە بەزەیی و میهرەبانی نی‌یە بەرامبەر بەو ئافرەتە، بەڵكو ستەمێكی ناهەموارە كە لێی كراوە. لەوانەیە ڕێ بۆ ئەو هەڵپە دڕندانەیە خۆش بكات - كە لەم سەردەمەدا بەسەر دەروونەكاندا زاڵ بووە - و ستەمێكی گەلێ لەوە ناهەموارتر ئەنجام بدات و ئەو غیرەتە دڕندانەیە بخاتەوە یاد كە بەسەر دەروونی خەڵكانی سەردەمی جاهیلییەتدا زاڵ بوو بوو تا گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی كچانیان زیندە بەچاڵ بكەن!

كەواتە هەموو حوكمەكانی قورئان - بە وێنەی ئەم حوكمە - تەسدیقی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دەكەن كە دەفەرموێ:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الأنبياء:١٠٧).

☐ **باسی چوارەم:**

لەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزەیە كە دەفەرموێ:

﴿فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء:١١).

مەدەنییەتی (بێ میم) – واتە دەنییەت – هەروەك بوو بەهۆی ئەم چەشنە ستەمە سەبارەت بە ئافرەت و لە مافی خۆیان زیاتری دانێ (وەك لە مەسەلەی پێشوودا باس کرا)، دەچێ ستەمێکی سەخت و دژوارتر بەرامبەر دایکان ئەنجام دەدات، لەوەدا کە لە مافی خۆیان بێ بەشیان دەکات!

بەڵێ، شەفەقەت و سۆزی دایکان، کە ناسکترین و بەتام و چێژترین درەوشانەوەی میهرەبانیی خوایە و، شایانتریشیانە بۆ ڕێزلێنان: بەرزترین و بەڕێزترین حەقیقەتە لە "وجوود"دا.

بە تایبەت "دایك" بەڕێزترین هاوڕێی ئازیز و میهرەبانترین خۆبەختکارە. تەنانەت بە هاندەری سۆز و بەزەیی‌یەکەی، دنیا و ژیان و حەوانەوەی خۆی بۆ مناڵەکەی بەخت دەکات، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ "مریشك" – کە لە سادەترین پلەکانی دایکایەتی‌دایە و تروسکایی‌یەکی ئەو شەفەقەتەی تێدایە – بۆ مەبەستی بەرگری‌کردن لە جووجەڵەکانی، لاریی لەوە نی‌یە کە پەلاماری سەگ بدات و هێرش بۆ سەر شێر بەرێت، هەرچەندەش گیانەوەرێکی لاوازە و لەو دڕندانە دەترسێت!

جا بێ‌بەش کردنی ئەو دایکەی کە ئەم چەشنە حەقیقەتە ئازیزەی بەم ڕادەیە لە خۆدا هەڵگرتووە، لە میراتی منالەکەی، ستەمێکی سامناك و کارێکی تاوانکارانەیە و سووکایەتی پێ‌کردنە و ناشکوریی نیعمەتێکە کە شایانی ڕێز و پێزانینە. ئەم ستەمەش لە ڕادەیەکی وەهادایە کە عەرشی میهرەبانی دەهێنێتە لەرزە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە دەبێت بەهۆی ئاوێتەکردنی ژەهر لە دەرمانی سوودبەخشی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤدا.

جا ئەگەر دڕندەکانی ناو گرۆی مرۆڤ لەوانەی کە لافی خزمەتی مرۆڤایەتی لێ دەدەن، لەمە تێ‌نەگەن، ئەوا مرۆڤە ڕاستەقینەکان دەزانن کە فەرمانەکەی قورئانی حەکیم: ﴿فَلأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء:١١) عەینی "حەق"ە و سەرتاپا "دادگەری"یە.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی دوازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم وعلى رفقائكم!

برا ئازیزەکانم!

ئەو شەوە پرسیارێکتان ئاراستە کردم و منیش وەڵامم نەدایەوە. چونکە بابەتەکانی ئیمان نابێ لە شێوەی "موناقەشە"دا باس بکرێن. خۆ ئێوەش ئەو شەوە باسەکەتان لەو شێوەیەدا خستبووە ڕوو!

وا ئێستا بە کورتی و پوختی وەڵامی ئەو سێ پرسیارەتان بۆ دەنووسم کە بناغەی موناقەشەکەی ئەو شەوەیە. درێژەی ئەم وەڵامانەش لەو وتانەدان کە ناوەکانیانم دا بە برای دەرمانگەر و لای خۆی نووسینی. بەڵام ئەو کاتە وتەی "بیست و شەشەم"م لە یاد نەبوو پێی بڵێم، کە باسێکی تایبەتە بە "قەدەر و جوزئی ئیختیاری"یەوە. وا ئێستا هاتەوە یادم و دەڵێم: ئەویش بخوێننەوە. بەڵام بە وردی، نەك بە وێنەی خوێندنەوەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان.

برای دەرمانگەریشم بۆیە ڕەوانەی ئەو وتانە کرد، چونکە ئەو گومانانەی کە لەم جۆرە بابەت و مەسەلانەدا باس دەکرێن، هۆکەیان تەنها لاوازیی باوەڕبوونە بە شەش پایەکانی ئیمان. ئەو وتانەش کە دەستنیشانم کردن بە تەواوی و ڕێکوپێکی هەر شەش پایەکانی ئیمان دەچەسپێنن.

❖ **پرسیاری یەکەمتان:**

دەرهێنانی حەزرەتی ئادەم – دروودی لەسەر بێت – لە بەهەشت و، ناردنی بەشێکی ئادەمیزاد بۆ دۆزەخ، چ حیکمەتێکی تێدایە؟

**وەڵام:**

حیکمەتەکەی "کار پێسپاردن"ە! چونکە کاتێ حەزرەتی ئادەم نێررایە زەوی کارێکی پێ سپێررا و ئەرکێکی مەزنی خرایە ئەستۆ، بە چەشنێ کە ئەنجام و بەرهەمەکانی ئەو کارەی پێی سپێرراوە بریتی‌یە لە:

* هەموو جۆرە پێشکەوتنە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤ و..
* دەرکەوتن و گەشەکردنی گشت توانا و لێهاتنەکانی و..
* بوونی ماهییەتی مرۆڤ بە ئاوێنەیەکی گشتی و دەرخەری سەرجەم ناوە جوانەکانی خوای گەورە.

خۆ ئەگەر حەزرەتی ئادەم - دروودی لەسەر بێت - لە بەهەشتدا بمابایەتەوە، ئەوا بەوێنەی "مەلائیکەت" تەنها یەك پلەی چەسپاو و دیاری‌کراوی دەبوو. ئەو کاتەش توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ گەشەیان نەدەکرد و لە ئاستی خۆیاندا دەمانەوە. خۆ مەلائیکەتیش - کە خاوەنی پلەیەکی هەمیشە نەگۆڕ و دیاری‌کراون - تابلێی زۆرن و، پێویست ناکات مرۆڤیش هەمان جۆرە پەرستش بخرێتە ئەستۆیەوە. لەبەر ئەوە، دانستی خوای گەورە خواستی لەسەر ئەوە بووە کە خانەیەکی ئەرك پێسپاردنی ئەوتۆ بۆ مرۆڤ دروست بکات کە لەگەڵ لێهاتنەکانی‌دا بگونجێت و مرۆڤ بتوانێت چەندین پلەی بێ‌کۆتایی تێدا ببڕێت.

جا لەبەر داخوازیی ئەو حیکمەتە، حەزرەتی ئادەم - دروودی لەسەر بێت - لەسەر گوناهەکەی لە بەهەشت هێنرایە دەرەوە، ئەو گوناهەی کە خواستی سروشتی "مرۆڤ"ە و لەمەدا لە "مەلائیکەت" جیا کراوەتەوە.

واتە: دەرهێنانی حەزرەتی ئادەم - دروودی لەسەر بێت - لە بەهەشت، دانست و میهرەبانیی ڕوون و بێ‌گومانە.. هەروەك ناردنی کافرانیش بۆ ناو دۆزەخ، یەکپارچە حەق و ڕەوا و دادگەری‌یە. چونکە هەرچەند بابای کافر - وەك لە ئاماژەی سێ‌هەمی وتەی دەهەمدا باس کراوە - "گوناهێك"ی لە تەمەنێکی کورتدا کردووە، بەڵام ئەو تاوانە لە ڕاستی‌دا تاوانێکی نەبڕاوەی مەزن و بەردەوامە..

چونکە کوفر - لە ناوەرۆکی‌دا - بە چاوی سووك سەیری بوونەوەران دەکات و لە نرخ و بەهایان دادەبەزێنێت و.. شایەتیدانی گشت بوونەوەران لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە بە درۆ دەخاتەوە و.. ئینکاریی درەوشانەوەی ئەو ناوە جوانانەی خوای گەورە دەکات کە لە ئاوێنەی بوونەوەراندا دەردەکەون و دەبریسکێنەوە.

لەبەر ئەوە، خواوەندی قەهھاری شکۆمەند و پادشای ئەو بوونەوەرانـە، کـافران دەهاوێتە ناو دۆزەخەوە و بە هەمیشەیی تیایدا دەیانهێڵێتـەوە و، بەم پێیـە تۆڵـەی هـەموو بوونەوەران لەو کافرانە دەسێنێتەوە.

ئنجـا هێشـتنەوەی هەمیشـەیی ئەوانـەش لـە دۆزەخـدا، کارێکـە سـەرتاپا حـەق و دادگـەریی ئاشـکرا و تـەواوە. چونکـە تـاوانی "بێ کۆتـایی" داخـوازی سـزای نـەبڕاوەی بێ کۆتاییە.

❖ **پرسیاری دووهەمتان:**

خـوای گـەورە بۆچی شـەیتانەکانی بەدی هێنـاوە؟.. ئـەوەتا شـەیتانەکان و شـەڕ و خراپەکانی دروست کردووە.. خۆ بەدیـهێنانی "شـەڕ" شـەڕە و دروسـتکردنی شـتی "ناشیرین"یش کارێکی ناشیرینە.. ئیتر ئایا چ حیکمەتێك لەمەدا هەیە؟!

**وەڵام:**

نەخێر وا نییە.. بەدیهێنان(خلق)ی شەڕ، شەڕ نییە. بـەڵکو بەدەستهێنان(کسـب)ی شـەڕ بـە "شـەڕ" دادەنرێـت. چونکـە "بەدیـهێنان" ڕووی لـە گشـت ئەنجامـەکانی دروستکردنە و پەیوەندیی بە هەموو بەرهەمەکانی بەدیهێنانەوە هەیە. بەڵام "بەدەستهێنان" پـەیوەندیی تەنـها بـە هـەندێ ئـەنجامی تایبەتییـەوە هەیـە، چونکـە پـەیوەندیی نێـوان "بەدەستهێنەر" و "بەدەستهێنراو" مامەڵەیەکی تایبەتیی نێوان ئەو دوانەیە.

بۆ نموونە: "باران" کە دەبارێت هـەزاران بـەروبووم و ئـەنجامی هـەیە و هەموویشـیان خـێر و جوانـن. بـەڵام ئەگـەر کەسێك، بـەهۆی ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتی هەڵـەی خـۆی، زیـانێکی لـە بارانـەوە پـێ گەیشـت، مـافی ئـەوەی نییـە بڵێـت: (بەدیـهێنانی "بـاران" میهرەبانیی تێدا نییە) و، هەرگیز بۆی نییـە بڕیـاری ئەوە بـدات کـە "بەدیـهێنانی بـاران" شەڕە و کارێکی خراپە. چونکە ئەو کەسە بەهۆی ئیختیار و ڕەفتاری هەڵەی خۆیەتی کە بـارانی بۆ بـوو بـە "شـەڕ" و، هۆکـاری ئـەو ئەنجامـە خراپە تەنـها "بەدەسـتهێنان"ەکـەی خۆیەتی.

هەروەها بەدیهێنانی "ئاگر" گەلـێ سوودی تێدایـە. هـەموو ئـەو سـوودانەش "خـێر" و "چاکە"ن. جا ئەگـەر کەسێك ئـاگری بـە خراپی بەکارهێنا و زیـانێکی لـە ئـاگرەوە پێ گەیشت، بۆی نییـە بڵێـت: (بەدیـهێنانی ئـاگر کـارێکی خراپـە). چونکـە ئـاگر تەنـها بـۆ

سووتاندنی ئەو دروست نەکراوە، بەڵکو هۆی ئەو سووتاندنە ئەوەیە کە خۆی دەستی خستووەتە ناو ئەو ئاگرەی کە خواردنەکەی بۆ پێدەگەیەنێت و، ڕەفتاری هەڵەی خۆی ئەو خزمەتگوزارە گوێڕایەڵەی لێ کردووە بە دوژمن.

**پوختەی قسە ئەوەیە کە:**

ئەگەر "شەڕێکی کەم" ببێت بەهۆی دەستکەوتنی "خێرێکی زۆر"، ئەوا ئەو شەڕە پەسەند دەکرێت و بە کارێکی سوودبەخش و بەکەڵك دادەنرێت. چونکە ئەگەر واز لە شەڕێك بهێنرێت کە خێرێکی زۆری بەرهەم دەهێنا، ئەوا شەڕ و خراپەیەکی زۆر ڕوو دەدات.

بۆ نموونە:

کە سوپا دەبرێت بۆ "جیهاد" بێ گومان هەندێ زیان و شەڕی بچووك و هەندەکیی ماددی و جەستەیی لەم کارەوە پەیدا دەبێت. خۆ ئاشکرایشە کە (جیهاد) خێروبێرێکی زۆری تێدایە، چونکە ئایینی ئیسلام و موسڵمانان لە دەستدرێژی و زاڵ بوونی کافران دەپارێزێت. جا ئەگەر لەبەر مەترسیی هاتنەدیی ئەو شەڕ و زیانە کەمانە واز لە "جیهاد" بهێنرێت، ئەوا جگە لەوەی کە خێرە زۆرەکەی لەدەست دەچێت، چەندەها شەڕ و خراپەی یەکجار زەبەندەش بەو بۆنەیەوە ڕوو دەدەن و پەیدا دەبن. دیارە ئەمەش ستەمێکی ناڕەوا و ئاشکرایە.

نموونەیەکی تر:

بڕینی ئەو پەنجەیەی کە تووشی (گەنگرینا) بووبێت، خێرێکی زۆری تێدایە و کارێکی باش و جوانە، هەرچەندەش لە ڕواڵەتدا بە شەڕ و کارێکی خراپ دەردەکەوێت. بەڵام ئەگەر ئەو پەنجەیە لەبەر ئەو شەڕە ڕواڵەتی‌یە بە زوویی نەبڕرێت، ئەوا لە ئەنجامدا هەموو دەستەکە دەبڕرێتەوە! دیارە ئەو کاتەش شەڕ و زیانەکە زیاتر و گەورەتر دەبێت و پتر گەشە دەکات.

بە هەمان جۆر، بەدیهێنانی: "شەڕ و زیان و بەڵا و شەیتانەکان" نە بە "شەڕ" دادەنرێت و نە کارێکی "ناشیرین"یشە. چونکە هەموو یەکێك لەوانە لەبەر دەستکەوتنی چەندەها ئەنجامی زۆر و گرنگ بەدی هێنراون. ئەوەتا (مەلائیکەتەکان) لەبەر ئەوەی شەیتانەکانیان بەسەردا زاڵ نەکراوە و دارای موجاهەدە نین، پلەی بەرزبوونەوە و پێشکەوتنیشیان نی‌یە، بۆیە پلەیان هەمیشە لە جێی خۆیدایە و گۆڕانی بەسەردا نایەت..

هەروەها گیاندارە ئاژەڵەکانیش لەبەر ئەوەی شەیتانەکانیان بەسەردا زاڵ نەکراوە، ئەوا پلەیان نەگۆڕ و هەمیشە ناتەواوە.

بەڵام لە جیهانی (مرۆڤ)دا ماوەی نێوان "پلەکانی نزمی" و "پلەکانی بەرزبوونەوە" تابلێی زۆر و فراوانە. چونکە هەر لە پلەی نزمی فیرعەون و نەمروودەکانەوە، تا دەگاتە پلەی بەرزی صیددیق و ئەولیا و پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - پلەی بەرزی و نزمی لە بەردەم مرۆڤدا کراوەتەوە. کەواتە بە بۆنەی بەدیهاتنی شەیتانەکان و، بەهۆی نهێنیی "تەکلیف" و کاریێ‌سپاردن و، ناردنی پێغەمبەرانەوە - دروودیان لەسەر بێت - دەرگای مەیدانی تاقیکردنەوە و جیهاد و پێشبڕکێ لە مرۆڤ خراوەتە سەرپشت، کە هەر بەم موجاهەدە و پێشبڕکێ و تاقیکردنەوەیە ڕۆحیانەتە بێ‌نرخ و نزم و خەڵووزئاساکان لەو ڕۆحیانەتانە جیا دەبنەوە کە وەك ئەڵماس بەرز و بەنرخ و بەهادارن. خۆ ئەگەر موجاهەدە و پێشبڕکێ نەبوایە، ئەوا هەموو توانا و لێهاتنەکانی جەوهەری مرۆڤایەتی لە شوێنی خۆیاندا مت دەبوون و، ئەوسا خەڵووز و ئەڵماس وەکو یەك دەردەکەوتن و لێك جیا نەدەکرانەوە. واتە: ئەو کاتە ڕۆحیانەتی بڵندی حەزرەتی ئەبووبەکر - خوای لێ ڕازی بێت - کە لە چڵەپۆپەی پلە بەرزەکاندایە، لەگەڵ ڕۆحیانەتی ئەبووجەهلدا، کە لە نزمترینی نزمایی‌یەکاندایە، یەکسان دەبوون!

کەواتە بەدیهێنان و دروستکردنی "شەڕ" و "شەیتانەکان" نە بە "شەڕ" دەژمێررێت و، نە بە "ناشیرین"یش دادەنرێت. چونکە بەدیهێنانی ئەوانە ڕووی لە چەندین ئەنجامی مەزن و گشتی‌یە، بگرە هەموو شەڕ و لایەن و ڕووە خراپەکان تێکڕا ئەنجامی هەڵسوکەوتی هەڵە و ڕەفتار و بەکارهێنانی خراپی مرۆڤەکە خۆیەتی. ئەمەش مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆی مرۆڤەکەیە و، دەگەڕێتەوە بۆ: (بەدەستهێنان)ی ئەو مرۆڤە نەك بۆ (بەدیهێنان)ەکەی خوای گەورە.

**ئەگەر پرسیار بکەن و بڵێن:**

کەسانێکی "زۆر" هەن کە بەهۆی بوونی شەیتانەکانەوە زیانیان پێ دەگات و دەکەونە هەڵدێری کوفر و گومڕایی، هەرچەندەش خوای گەورە پێغەمبەرانی - دروودیان لەسەر بێت - بۆ ڕێنمایی خەڵکی ناردووە. جا لەبەر ئەوەی هەموو بڕیارێك کە دەردەکرێت لایەنی "زۆرینە" ڕەچاو دەکات و، لەم کێشەیەشدا "زۆربەی" خەڵکی بەهۆی بەدیهێنانی شەیتانەکانەوە گرفتاری زیان دەبن، ئەوا دەکرێت بەدیهێنانی "شەڕ" بە

كارێكی شـەڕ و خـراپ دابنرێت، تەنانـەت دەتوانـرێ بوترێـت: نـاردنی پێغەمبـەران – درووديان لـەسەر بێـت – ميهرەبانيی بۆ مرۆڤ تێدا نیيە؟!

**ئەوا لە وەڵامدا دەڵێین:**

لـە چـاو "چۆنێتی"دا هـەرگيز بايـەخ بـە "چەندايـەتی" نـادرێت! ئنجـا لـە ڕاستيشـدا "زۆرينە" ڕووی لە "چۆنێتی"يە، نەك "چەندايەتی"!

بۆ نموونە:

ئەگـەر سـەد ناوكـە خورمـا هـەبن، بەڵام نەخـرێنە ژێـر گڵ و خاكـەوە و ئـاودێری نەكرێن و كـارلێكی كيمياييـان تێـدا ڕوونـەدات، واتـە ڕووبەڕووی موجاهـەدەی ژيـان نەبنـەوە، ئـەوا هـەر وەك خۆيـان دەمێننـەوە و، هـەر ئـەو سـەد ناوكـە خورمايـە دەبـن و، نرخيشيان هـەر سـەد درەم دەبێـت. بـەڵام ئەگـەر بخرێنـە نـاو گڵـەوە و ئـاودێری بكرێـن و ڕووبەڕووی موجاهەدەی ژيان بكرێنەوە، ئنجا لە ئەنجامی ئەمەدا هەشتا دانـەيان، بـەهۆی تێكچوون و خراپ بوونی سـروشتی خۆيانەوە، داڕزان و تەنـها بيسـتيان سـەوز بـوون و گەشەيان كـرد و بوون بە درەختی خـورمای بەردار، ئايا دەكرێ بڵێيـت: ئـاودێريی ئـەو تۆوانـە شەڕ و كـارێكی خراپە چونكە "زۆربـە"ی ناوكەكانی داڕزانـدووە؟! بـێ هيـچ گومـانێك مـافی ئەوەت نیيـە كـە گوفتـاری ئـاوا بڵێيـت. لـەبەر ئەوەی كـە ئـەو بيسـت ناوكەی سەوز بوون و پێ گەيشتن لە حوكمی بيسـت هـەزار ناوكـە خورمـادان. كەواتـە ئەو كەسەی "هەشتا"ی لەكيس دەچێت و "بيسـت هـەزار" دەباتـەوە، بێ گومـان قـازانجی كـردووە و تووشـی زيـان نـەبووە. لـەبەر ئـەوە، كـاری "ئـاودێری" هـەرگيز بـە "شـەڕ" دانانرێت!

هەروەها ئەگەر سەد هێلكـە تـاوس هـەبن، ئـەوا نرخەكەيان هـەر نرخـی سـەد هێلكـە تاوس دەبێت، كە پێنج سـەد قورشـە. بەڵام ئەگەر ئـەو هێلكانـە تاوسـيان بەسـەردا كڕ بخرێ و، ئنجا بيست دانەيان جووجكی تاوس هەڵبهێنن و هەشتاكەی تريشيان پيـس بـبن، ئايا دەتوانرێ بوترێـت: زيـانێكی زۆر ڕووی داوە؟ يـان ئـەم مامەڵەيـە شـەڕ و خراپـە؟ يـان كڕكەوتنی تاوس بەسەر هێلكەكەیدا كارێكی ناشـيرينە؟! بێ گومـان شـتی وا نـاوترێت، چونكە كارەكە كارێكی چاكە و، تاوسەكە و هێلكەكانی لە بريی ئـەو هێلكـە پيس‌بـووە كەم‌نرخانە، بيست تاوسی بەنرخ و گرانبەهايان دەست كەوت.

هەر بەم جۆرەش، گرۆی مرۆڤایەتی، بەهۆی پێغەمبەرانەوە - دروودی خوایان لەسەر بێت - و.. بە بۆنەی نهێنیی کار پێسپاردن و تەکلیف و.. بەرەنگار بوونەوەی شەیتانەکانەوە، قازانج و سوودێکی گەلێ زۆری دەست کەوت و، سەد هەزار پێغەمبەر و ملیۆنەها ئەولیا و ملیۆنان ملیۆن ئەصفیای لەم رێیەوە تێدا هەڵکەوت، کە هەر هەموویان خۆر و مانگ و ئەستێرەی پرشنگداری جیهانی مرۆڤایەتین.. بەڵێ، گرۆی مرۆڤایەتی ئەم هەموو سوود و قازانجە مەزنانەی دەست کەوت لە بەرامبەر ئەو زیانەی کە بەهۆی پەیدابوونی مونافقانەوە لێی کەوت، ئەوانەی کە بە "چەندایەتی" زۆرن، بەڵام بە "چۆنێتی" دارای هیچ نرخ و بایەخێك نین، هەروەها ئەو کافرانەش کە جۆرێکن لە ئاژەڵە زیانبەخشەکان!

❖ **پرسیاری سێهەمتان:**

ئاشکرایە کە هەر تەنها خوای گەورە موسیبەت دەنێرێت و بەلا زاڵ دەکات. جا ئایا ئەمە ستەم نییە لە بێ تاوانان، تەنانەت لە ئاژەڵەکانیش؟

**وەلام:**

نەخێر.. چونکە هەموان موڵکی ئەون، خۆ هەر تەنها "خاوەن موڵك" خاوەنی ئەو مافەیە کە بە هەر جۆرێك بیەوێت دەستکاری و ئاڵوگۆڕ لە موڵکی خۆیدا بکات.

ئایا گەر سنعەتکارێکی لێهاتووی وریا و کارامە، بە "کرێکار" ڕاتبگرێت و، وەك نموونە و مۆدێل بۆ بەرهەمەکانی بتخاتە کار و، بۆ ئەم مەبەستەش بەرگێکت لەبەر بپۆشێت کە بە جوانترین شکڵ و شێوە دووریبێتی، پاشان ئەو بەرگەی بەرت درێژ یان کورت بکات و لێی ببڕێت. پاشان تاوێ هەڵتبسێنێتە سەر پێ و تاوێ داتبنیشێنێت و تاوێکی تر بتنوشتێنێتەوە.. هەموو ئەم کارانەش بۆ ئەوە بە تۆ ئەنجام بدات تاکو لە بەرچاوی بینەرانی سنعەت و کارەکەیدا لێهاتن و کارامەیی خۆی دەربخات و، تۆیش بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەم کارە کرێی خۆت وەربگریت، ئایا تۆ مافی ئەوەت هەیە کە بڵێیت: جوانیی بەرگەکەی بەری منت تێك دا کە منی جوانتر کردبوو؟.. یاخود بڵێیت: ئەوەندە پێت وتم: هەڵبسە و دابنیشە تا بێزارت کردم؟! دیارە مافی ئەوەت نییە گوفتاری وا لە زارت دەربچێت. خۆ ئەگەر شتی وا بڵێیت و بیانووی ئاوا بگریت، ئەوا ئەو قسە و پەڵپ و بیانووانەت جگە لە شێتی و گێلی بەڵگەی هیچی تر نابێت!

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، بەدیهێنەر و دروستکەری مەزن، جەستەیەکی ناوازەی ئەوتۆی لەبەر کردوویت کە بە: چاو و گوێ و لووت و ئەندام و هەستەکانی تر ئارایشت دراوە و ڕازێنراوەتەوە. جا ئەو بەدیهێنەرە مەزنە، بۆ مەبەستی پیشاندان و دەرخستنی جێکار و ئاسەوارە جۆراوجۆرەکانی ناوە جوانەکانی خۆی، گرفتاری چەندین جۆری بەلا و موسیبەتت دەکات و، تاوێ نەخۆشت دەخات و تاوێ تر چاکت دەکاتەوە و، جارێ برسێتیت پێ دەچێژێت و، جارێکی تر تێرت دەکات و ماوەیەکی تر دووچاری تینوێتیت دەکات.. ئا بەم چەشنە و لەناو ئەم بارودۆخانەدا ئالوگۆڕت بەسەردا دەهێنێت، تاکو بەمانە "ماهییەتی ژیان" پتر بەهێز ببێت و درەوشانەوەی ناوە جوانەکانیش زیاتر دەربکەون.

جا ئەگەر تۆ بڵێیت: بۆچی خواوەند گرفتاری ئەم موسیبەتانەم دەکات؟ ئەوا سەد حیکمەتی مەزن ڕادەپەڕن و دەمکوتت دەکەن، وەك لە نموونەکەی پێشوودا ئاماژەیان بۆ کرا. چونکە وەك ئاشکرایە: ڕاوەستان و مەنگ بوون و ڕۆتین و بێ کاری، تێکڕا جۆرێکن لە "نەبوون" و زیان. جموجووڵ و ئالوگۆڕیش بە پێچەوانەوەن: "بوون" و "خێر"ن.

کەواتە (ژیان) بەهۆی بزووتن و جموجووڵەوە کامڵ دەبێت و پێدەگات و، بە بۆنەی بوونی گیروگرفت و بەلا و موسیبەتەکانەوە پێش دەکەوێت و، بە لێ درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەش چەند بزووتنێکی جۆراوجۆری دەست دەکەوێت و پاڵفتە دەبێت و هێز پەیدا دەکات و گەشە دەسێنێت و فراوانی بەدەست دەهێنێت، تا ئەم ژیانە دەبێت بە قەڵەمێکی جووڵاو بۆ نووسینی چارەنووسەکانی خۆی و، لەم ڕێیەوە "ژیان" دەتوانێت کارەکانی ئەنجام بدات و، شایستە و شایانی پاداشتی دوارۆژ دەبێت.

بەم ئەندازە کورت و پوختەی وەڵامی سێ پرسیارەکەتان وازدەهێنین کە ئەو شەوە وتوویژتان لەسەر دەکردن. درێژەی ئەم وەڵامانەش لە هەر سێ و سێ وتەکەی کتێبی "وتەکان"دا هەیە.

برای ئازیزم!

ئەم نامەیە بۆ برای دەرمانگەر و هەر کەسێکی تر کە خۆت بە شایستەی بزانیت لەوانەی کە ئامادەی ئەو موناقەشەیە بوون، بخوێنەرەوە و.. سڵاوم بە برای دەرمانگەر بگەیەنە کە یەکێکە لە قوتابییە تازەکانم و، پێی بڵێ:

نابێ بابەتە ئیمانییەکانی وەك ئەمانە لە شێوەی جەدەل و موناقەشەدا و بەبێ هیچ تەرازوویەك و لە بەردەم کۆمەڵی خەڵکدا باس بکرێن. چونکە ئەو کاتە لەبەر نەبوونی تەرازوو لە باسەکەدا، دەرمانەکان بۆ ئەوان دەبن بە ژەهر و، قسەکەران و گوێبیستانیش - پێکەوە - زیانیان پێ دەگات. تەنها لە یەك کاتدا دروستە باس بکرێن، کە ئەو کاتەیە بیری مرۆڤ سەرگەرمی شتی تر نەبێت و، دڵی هێمن و لەسەرخۆ بێت و، لێکۆڵەرانیش خاوەنی ویژدان بن و، ئنجا کارەکە تەنها لێکۆڵینەوەیەکی فیکری بێت و بەس!

هەروەها پێی بڵێ:

ئەگەر لەم جۆرە مەسەلە و بابەتانەدا گومانی بەدڵدا هات و وەڵامی گومانەکەشی لە "وتەکان"دا دەست نەکەوت، با نامەیەکی تایبەتیم لە بارەیانەوە بۆ بنووسێت.

هەروەها پێی ڕابگەیەنە کە ئەم لێکدانەوەیەی خوارەوم بە دڵدا هات سەبارەت بەو خەونەی کە بە باوکی خوالێخۆشبوویەوە دیبووی:

لەبەر ئەوەی باوکی خوالێخۆشبووی "پزیشك" بووە، ئەوا لە ژیاندا سوودی بە کەسانێکی خاوەن تەقوا و پیاوچاکی زۆر، تەنانەت بە ئەولیاکانیش گەیاندووە. جا ڕۆحیانەتی ئەو مرۆڤە خاوێنانەی کە سوودیان لێ وەرگرتووە، لە سەرەمەرگدا لە شێوەی چەند مەل و باڵندەیەکدا - لە کوڕە نزیکەکەی - دەرکەوتوون. لەمەوە ئەوەم بە دڵدا هات کە ئەمە پێشوازی لێکردنێکی دڵخۆشکەر و بەخێرهاتنێکی گەرموگوڕ و هاودەمە لەگەڵ شەفاعەت و تکاکارییاندا.

سڵاوم بە هەموو ئەو کەسانە بگەیەنە کە ئەو شەوە لێرە لەگەڵماندا ئامادە بوون.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی سیازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلامُ على من اتبع الهدى.. والملامُ على من اتبع الهوى

برا ئازیزەکانم!

گەلێ جار لە بارەی حاڵ و حەوانەوەم و.. سەرنەدانم لە بەرپرسانی دەولەت بۆ وەرگرتنی بەڵگەنامەی "ڕەهەندەکراوان" و.. بایەخ نەدانم بە بارودۆخی ڕامیاریی جیهان، پرسیارم لێ دەکەن. جا لەبەر ئەوەی پرسیارەکانتان هەمیشە دووپات دەبنەوە و، بە جۆرێکی "مەعنەوی"یش هەمان پرسیارم ئاراستە دەکرێن، ئەوا ناچارم بە زمانی "سەعیدی کۆن"، نەك "سەعیدی نوێ"، وەڵامی ئەم سێ پرسیارەتان بدەمەوە:

❍ **پرسیاری یەکەمتان:**

دەپرسن: ئایا چۆنیت؟.. باشیت؟.. لە ئیسراحەتدایت؟

**وەڵام:**

سوپاسی لەژمارەبەدەر بۆ خواوەندی میهرەبانم، لەسەر ئەوەی کە ئەو هەموو سەختی و ستەمەی ئەهلی دنیا[1] هێنایانە ڕێم، خوای گەورە هەموویانی بۆ گۆڕیم بە چەندان جۆر چاکە و میهرەبانی.

وا لە خوارەوەدا ئەمەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە:

لەو کاتەدا کە من لەناو ئەشکەوتی چیایەکدا بە گۆشەگیری دەژیام و دەستم لە سیاسەت داتەکاند و دنیام پشت گوێ خست و سەرگەرمی کاروبارەکانی قیامەتم بووم، ئەهلی دنیا هاتن لەوێ هێنایانمە دەرەوە و بە ناڕەوایی و ستەم ڕەهەندەی ئێرەیان کردم. بەڵام بەدیهێنەری دانا و میهرەبانم ئەم ڕەهەندەیی‌یەی ئێرەی بۆ گۆڕیم بە میهرەبانی و

(١) مەبەست ئەو دنیاویستانەیە کە بەهۆی دەستەڵات و فەرمانڕەوایی دنیا لە خۆیان بایی بوون. (وەرگێڕ)

خێر و خۆشی، چونکە ئەو گۆشەگیرییەی ناو چیاکەی ئەویّ (کە لەوانە بوو گرفتاری چەند هۆکارێکی ئەوتۆ ببێت کە ئارامی و ئاسایشی تێدا نەهێڵن و کەلێن لە ئیخلاسدا پەیدا بکەن) خوای گەورە بۆی گۆڕیم بە خەڵوەتێك لەناو چیاکانی (بارلا)دا کە لە هەموو لایەکەوە هێمنی و ئاسایش و ئیخلاس دەورەیان داوە.

ئەو دەمەی کە لە ڕووسیادا دیل بووم، بڕیارم دا و لە خوای گەورەش لاڵامەوە کە: لە کۆتایی تەمەنمدا گۆشەگیریم لە ئەشکەوتێکدا بۆ بڕەخسێنێت. وا خوای گەورەی میهرەبان لە بریی ئەو ئەشکەوتە: بارلای بۆ ڕەخساندم و سوودەکانی ئەو ئەشکەوتەی، کە من لە نیازمدا بوو، لە بارلادا بۆی ئاسان کردم و، گیرو گرفتەکانی ئەشکەوت نشینیی نەخستە ئەستۆی لاوازمەوە، جگە لە چەند تەنگوچەڵەمەیەك کە هێنرانە ڕێم بەهۆی ئەو وەهم و گومانانەی لە دڵی چەند کەسێکی خەڵکی بارلادا بوون، ئەوانەی کە پێشتر هاوڕێم بوون و پاشان وەهم و گومان سواری سەریان بوو، کاتێ لایان وابوو لە بەرژەوەندی و حەوانەی من هەوڵ دەدەن، بەڵام بەم وەهم و گومانەیان منیان گرفتاری دڵتەنگی و خزمەتی قورئانیشیان دووچاری زیان کرد.

ئنجا هەرچەند ئەهلی دنیا "بەڵگەنامە"ی گەڕانەوەیان بە هەموو "ڕەهەندە کراوەکان" دا و، لە گشت تاوانبارانیش خۆش بوون و لە بەندیخانەکان بەریان دان، کەچی بە ناڕەوا و ستەم بەڵگەنامەیان لە من قەدەغە کرد و پێیان نەدام.. بەڵام پەروەردگاری میهرەبانم ویستی وابوو کە لەم نامۆیی و ئاوارەییەدا بمهێڵێتەوە، تاکو پتر لە خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆزدا بمخاتە کار و ئەم نوورانەی قورئان زیاتر بنووسم کە ناوم لێ ناون: (وتەکان). بەم جۆرە منی لەم نامۆییە دوور لە جەنجاڵی و غەڵبەغەڵبەدا هێشتەوە و، ئەم هێشتنەوەیەشی بۆ کردم بە میهرەبانییەکی مەزن و فراوان.

هەروەها ئەهلی دنیا بواری مانەوەی ناو شارۆچکە و شارە مەزنەکانیان بە گشت سەرۆك هۆز و قسە ڕۆشتووە ڕەهەندەکراوەکان دا، لەوانەی کە دەتوانن دەست لە کاروباری دنیایی ئەماندا وەربدەن، هەروەك ڕێی خزم و کەسانیشیان دان کە بڕۆن بۆ لایان و سەریان لێ بدەن، کەچی بە ناڕەوایی و ستەمکاری ژیانی گۆشەگیرییان تەنها بەسەر مندا سەپاند و ڕەوانەی گوندێکی بچووکیان کردم و، ماوەی خزم و کەسانم و خەڵکی شارەکەشیان نەدام - یەك دوانێکیان نەبێت - کە سەرم لێ بدەن.

ئەهلی دنیا وا ڕەفتاریان لەگەڵدا کردم.. بەڵام بەدیهێنەری میهرەبانم ئەم گۆشەگیرییە سەپاوەی بۆ کردم بە میهر و بەزەیی و سۆزێکی فراوان. چونکە بوو

بەهۆی ساف بوون و خاوێن کردنەوەی زەینم لە شتانی بێ‌نرخ و ئاراستە کردنی بەرەو بەهرە وەرگرتن لە قورئانی پیرۆز بە جۆرێکی خاوێن و بێ گەرد و دوور لە هەموو ئامانج و مەبەستێکی تر.

پاشان لە سەرەتای هاتنمدا بۆ ئێرە و، لە ماوەی دوو ساڵی ڕەبەقدا، تەنها دوو نامەی ئاساییم نووسی بوو، کەچی ئەهلی دنیا ئەمەیان بە شتێکی زۆر و کارێکی گەورە لەسەر تۆمار کردم! تەنانەت لە ماوەی دە ڕۆژ یان بیست ڕۆژ یاخود مانگێکدا یەك دوو میوان دێنە لام، ئەهلی دنیا بەمە دڵگران دەبن و، پێیان ناخۆشە کەسێك بێت بە میوانم! لە کاتێکدا کە مەبەست لەو سەردانە تەنها دەستکەوتنی پاداشتی دوارۆژە. کەواتە ئەوان لەمەدا ستەمیان لێ کردم.. بەڵام پەروەردگاری میهرەبان و بەدیهێنەری دانام ئەو ستەمەی ئەوانی بۆ گۆڕیم بە میهرەبانی، چونکە لەم سێ مانگە پیرۆزەدا کە مرۆڤ داهاتی نەوەد ساڵی ژیانی مەعنەویی تیایاندا دەست دەکەوێت[1]، ئەوان منیان خستە گۆشەگیری‌یەکی پەسەند و بەکەڵکەوە.

کەواتە: "الحمد لله على كل حال".

ئەمەیە هەواڵی حاڵ و حەوانەوەم.

○ **پرسیاری دووهەمتان:**

بۆچی ناڕۆیت بۆ لای "بەرپرسان" تاکو بەڵگەنامەیەکیان لێ وەربگریت[2]؟

**وەڵام:** من لەم کێشەیەدا مەحکوومی "قەدەر"م نەك ئەهلی دنیا! کەواتە سەر لە قەدەری خوای گەورە دەدەم و موراجەعەی ئەو دەکەم. خۆ هەرکات ڕۆزیی ئێرەم بڕا و "قەدەر" بواری ڕۆشتنی دام، ئەوا کۆچ دەکەم و لێرە دەڕۆم.

ڕاستیی ئەم واتایە، ئەمەی خوارەوەیە:

هەموو ئەو شتانەی کە لەم دنیایەدا دێنە ڕێی مرۆڤ، دوو هۆکاریان هەیە:

یەکەمیان: هۆکاری ڕواڵەتی و.. ئەوی تریشیان: هۆکاری ڕاستەقینەیە.

---

(١) مەبەست مانگە پیرۆزەکانی: "ڕەجەب، شەعبان، ڕەمەزان"ە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەو کوردانەی کە دوای سەرنەگرتنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران ڕەهەندەی ناو تورکەکان کرابوون، پاش تەواوبوونی ماوەی ڕەهەندەیی، بەشی زۆریان بەڵگەنامەی تەواوبوونی مەحکوومییەت و گەڕانەوەیان بۆ ناو شار و گوندەکانی خۆیان بۆ کرا و گەڕانەوە. ئنجا ئەوانەشیان کە سەرۆك هۆز و پیاوماقووڵ و دیار بوون، دەرفەتیان پێ درا کە لە ناو شارە مەزنە تورکەکاندا بە سەربەستی بژین، جگە لە مامۆستا نوورسی کە هەموو مافێکی لێ زەوت کرا و پتر تەنگیان پێ هەڵچنی و بەڵگەنامەی بۆ نەکرا. (وەرگێڕ)

ئەهلی دنیا – لەم مەسەلەیەدا – هۆکاری ڕواڵەتین و ئەوان منیان هێنایە ئێرە. بەڵام "قەدەری خوا" هۆکاری ڕاستەقینەیە و ئەو فەرمانی ئەم گۆشەگیرییەی لەسەر دەرکردووم.

هۆکارە ڕواڵەتییەکە "ستەم"ی لێ کردم. بەڵام ڕاستەقینەکە "داد"ی لەگەڵدا بەکارهێنام!

هۆکارە ڕواڵەتییەکە بەم جۆرە بیری کردەوە:

(ئەم پیاوە زیاد لە پێویست خزمەتی زانست و ئایین دەکات، لەوانەیە دەست بخاتە ناو کاروباری دنیامان). ئەوان لەسەر بناغەی ئەم گریمانە منیان ڕەهەندەی ئێرە کرد و، لە سێ ڕووەوە ستەمی چەند جارەیان لێ کردم..

بەڵام قەدەری خوای گەورە، بینیی: (من خزمەتی بێ گەرد و تەواوی ئایین و زانست ناکەم). لەبەر ئەوە، بڕیاری ڕەهەندەیی لەسەر دەرکردم و، ستەمە چەند جارەکییەکەی ئەوانی بۆ گۆڕیم بە میهرەبانییەکی چەندین قات!

جا مادەم لەم ڕەهەندەییەمدا "قەدەر" حاکمە و، ئەویش حاکمێکی دادگەرە، ئەوا تەنها بۆ لای ئەو دەڕۆم و سەر لەو دەدەم و کارەکانم تەنها بەو دەسپێرم. هۆکارە ڕواڵەتییەکە جگە لە چەند پەڵپ و بڕوبیانوویەکی پڕوپووچ هیچی تری بە دەستەوە نییە.

واتە: سەردان و ڕۆیشتن بۆ لای ئەهلی دنیا، کارێکی بێ سوودە. خۆ ئەگەر ئەوان دارای حەقێك بوونایە، یان هۆی ڕاستەقینەیان بەدەست بوایە، دەکرا سەریان لێ بدرایە!

لە کاتێکدا کە من بە یەکجارەکی دەستم لە دنیای نەفرەت لێکراوی ئەوان داشۆرد و، بە تەواوی پشتم لە سیاسەتی بێ فەڕی ئەوان هەڵکرد.. کەچی ئەوان بەرامبەر بە من گرفتاری چەندەها گومان و دوودڵیی درۆینە و دوور لە ڕاستی بوون.

جا منیش بۆ ئەوەی بە سەرلێدانیان و ڕۆشتنم بۆ لایان کاڵای "سەلماندن" و "ڕاستێتی" بەبەر ئەو گومانانەی ئەواندا نەکەم، ئەوا نامەوێ سەریان لێ بدەم! چونکە ئەگەر ئەو چەشنە گومانەی ئەوان ڕاست بوایە و کەمترین حەز و ئارەزووم لە دەست تێوەردانی سیاسەتی ئەوان ببوایە – ئەو سیاسەتەی کە سەری پەتەکەی بە دەست بیانییەکانەوەیە! – ئەوا نەك لە هەشت ساڵدا بەڵکو لە هەشت سەعاتدا ئەو ئارەزووە شاراوەیەم دەردەکەوت. خۆ لای هەموان ئاشکرایە کە من لە ماوەی هەشت ساڵی ڕەبەقدا تەنها یەك ڕۆژنامەشم نەخوێندووەتەوە، تەنانەت حەزیشم لە خوێندنەوەی

نەبووە. ئەوەتا چوار ساڵە بە وردی چاودێریی هەڵسوکەوتم دەکرێت و لەم ماوەیەدا هیچ دیاردەیەکی وەهایان لێ نەبینیوم. بەو واتایەی کە: خزمەتکردنی قورئان هێندە بەرز و بڵندە لە سەرووی هەموو سیاسەتێکەوەیە، ئەمەش هانی دام کە خۆم بەرزتر ڕابگرم لەوەی ئاوێتەی سیاسەتە دنیاییەکان ببم کە "درۆ"یان بەسەردا زاڵ بووە!

هۆیەکی تری نەڕۆشتن و سەرنەدانم لێیان، ئەوەیە کە: داواکردنی "حەق" لە کەسانێك کە "ناحەق" بە حەق دەزانن، جۆرێکە لە "ناحەقی". خۆ منیش نامەوێت ناحەقی و نارەوایی وا بکەم!

❍ **پرسیاری سێهەمتان:**

کە سەرنجت دەدەین دەبینین: بە هیچ جۆرێك ڕەفتاری خۆت بەرامبەر ڕووداوەکانی سەر ڕووی زەوی ناگۆڕیت.. ئایا بۆچی تا ئەم ڕادەیە بایەخ بە هەواڵ و ڕەوتی سیاسەتی ئێستای جیهان نادەیت؟ ئایا ئەو ڕووداوانەت پێ خۆشە؟ یان دەترسیت و لە ترساندا بێدەنگ دانیشتوویت؟!

وەڵام: تەنها (خزمەتکردنی قورئان)ە کە بە توندی ڕێی جیهانی سیاسەتم لێ دەگرێت، تەنانەت بیرکردنەوەی ئەو جیهانەشی بە تەواوی لە بیر بردوومەتەوە!

دەنا هەموو مێژووی ژیانم شایەتە و دەیچەسپێنێت کە هەرگیز "ترس" دەستی نەبەستووم و ڕێی بەردەوام بوونمی لە شتێکدا لێ نەگرتووم کە بە "حەق"م زانیبێت.

پاشان لە چی بترسم؟ خۆ من جگە لە "ئەجەل" هیچ پەیوەندییەکی ترم بە دنیاوە نییە! ئەوەتا خاوەنی ماڵ و منداڵ و سامان نیم تاکو بیرم بەلایانەوە بێت.. هەروەها بیریش لە شەرەفی ئەسڵ و فەسڵ و بنەماڵە و نەسەب ناکەمەوە.. ئنجا سەبارەت بە پلەو پایە و سومعەی کۆمەڵایەتیشم، کە لە ڕاستیدا بریتییە لە: ڕیا و ناوبانگی درۆینە، ئەوا نەك هەر نامەوێت پارێزگاریی لێ بکەم، بەڵکو ڕەحمەت بۆ ئەو کەسەش دەنێرم کە یارمەتیم دەدات بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی!

کەواتە جگە لە "ئەجەل" هیچ شتێکی تر نەماوە کە مرۆڤ لێی بترسێت. خۆ ئەجەلیش تەنها بە دەستی خوای تاك و تەنیایە، کێ هەیە جورئەت و پرکێشی بکات - پێش کاتی خۆی - توخنی ئەجەلم بکەوێت؟!

واتە ئێمە هەر لە بناغەدا مردنێکی سەربەرزمان لە ژیانی سەرشۆڕی و ڕسوایی گەلێ پێ باشترە.

زووتر شاعیرێك - بە وێنەی سەعیدی کۆن - وتوویەتی:

ونحن أناسٌ لا تَوَسُّطَ بينَنا لنا الصَّدرُ دونَ العالمينَ أو القبرُ[(١)]

کەواتە هیچ کام لەو هۆکارانە نییە، بەڵکو تەنها (خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز)ە کە ڕێم نادات بیر لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی بکەمەوە.

وا بەم جۆرەی خوارەوە ئەمەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە:

ژیانی مرۆڤایەتیی هەموو کات و سەردەمێك - لە ڕاستیدا - کاروانێکە دەڕوات و بە دنیادا گوزەر دەکات..

ئنجا بەهۆی "نووری قورئانی پیرۆز"ەوە بۆم دەرکەوت کە ڕێی ئەم کاروانە، لەم زەمان و سەردەمەی خۆماندا، کاروانی مرۆڤایەتیی گەیاندە ناو قوڕ و لیتاوێکی بۆگەنی چەپەڵ. ئەوەتا ڕەوتی مرۆڤایەتی گرفتاری هەڵەنگوتن بووەو، هەر هێندەی هەڵدەستێتەوە سەر پێ یەکسەر دەکەوێتەوە ناو قوڕێکی چەپەڵ و لیتاوێکی بۆگەنی ترەوە.

بەڵام هەندێك لە خەڵکی ئەو کاروانە، بە ڕێیەکی بێ وەیدا دەڕۆن..

بەشێکی تریان چەند هۆکارێکی جۆراوجۆریان دۆزیوەتەوە کە - بەپێی توانا - لەو قوڕ و لیتاوە دەربازیان بکات..

بەشێکی تریان - کە زۆربەی خەڵکی کاروانەکەن - لە نێوان تاریکاییەکی چڕ و نووتەکدا بەناو ئەو قوڕ و لیتاوەدا هەنگاو دەنێن!

ئنجا لە سەدا بیستی ئەم بەشەیان، بەهۆی وڕی و مەستییانەوە، ئەو قوڕ و لیتە چەپەڵە بە میسك و عەنبەر دەزانن و دەموچاوی خۆیانی پێ دەهەنوون.. پاشان تاوێ هەڵدەستنەوە و تاوێکی تر دەکەونەوە ناوی.. هەر بەم چەشنە دەڕۆن تا لە ئەنجامدا تیایدا دەخنکێن!

کەچی لە سەدا هەشتاکەی تریان، بە خۆیان دەزانن کە کەوتوونەتە ناو چڵکاوەوە و هەست بە بۆگەنی و چەپەڵیشی دەکەن، بەڵام سەرسام و سەرگەردانن، ناتوانن ڕێی خاوێن و بێوەی ببینن و بیدۆزنەوە.

تەنها دوو ڕێگا چارە بۆ ئەم دوو تاقمە هەیە:

---

(١) ئەم دێڕە شیعرە هی "ئەبوو فیراسی حەمدانی"یە کە لە نێوان ساڵەکانی: (٣٢٠-٣٥٧ك)دا ژیاوە. لە هەندێ سەرچاوەدا نووسراوە: (لا توسط عندنا). واتە: ئێمە بە پلەوپایە مامناوەندییەکان قایل نابین. دەبێ یان لە پێشەنگی کاروانی هەموو خەڵکی جیهانەوە بین، یاخود دەبێ بە سەربەرزییەوە بڕۆینە ناو گۆڕەکانمان! (وەرگێڕ)

یەکەمیان: بێدارکردنەوەی لە سەدا بیستەکەیانە بە "چەکوش" و.. دووهەمیشیان: پیشاندانی ڕێی ڕزگاری و بێ وەیی‌یە بۆ سەرگەردانەکان. ئەمەش بەوە دەبێت کە "نوور" و ڕووناکی‌یەکیان پیشان بدرێت، واتە: ڕێنمایی بکرێن.

چار تەنها ئەمەیە..

بەڵام ئەوەی کە من دەیبینم شتێکی ترە، دەبینم هەشتا کەس بە چەکوشەوە بەرەنگاری بیستەکە بوونەتەوە و بەرامبەریان ڕاوەستاون، کەچی هەشتا کەسە نائومێد و بەدبەختەکان هیچ کەس بە هانایانەوە ناڕوات و ڕێی ڕووناکیی ڕاستەقینەیان پیشان نادرێت. خۆ ئەگەر پیشانیشیان بدرێت، ئەوا لەبەر ئەوەی ڕێ‌پیشاندەران (نوور) و (کوتەك)یان پێکەوە بە دەستەوە گرتووە، ئەوا جێی متمانە و دڵنیایی ئەو سەرگەردانانە نین، چونکە بابای سەرگەردان بە دڵەتەپێ و نیگەرانی‌یەوە بە خۆی دەڵێت: "تۆ بڵێیت ئەم مرۆڤە بیەوێت بەو "نوور"ەی کە پێ‌یەتی بێ‌خەمم بکات و لە خۆی نزیکم بخاتەوە، ئەوجا چەکوشەکەی دەستیم تێ بسرەوێنێت"؟!

ئنجا کە جاربەجار - بە بۆنەی چەند هۆکارێکەوە - ئەو چەکوشە دەشکێت، ئەوا نوورەکەش دەڕوات و نامێنێت، یان هەر بە تەواوی دەکوژێتەوە!

* * *

بەم پێ‌یە:

مەبەست لەو لیتاوە: ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەمڕۆی مرۆڤە، کە ژیانێکی چڵکن و بەرەڵا و بێ‌ئاگا و چەپەڵبووی دەستی گومڕایی‌یە..

مەستەکانیش: ئەو یاخی‌بووانەن کە لەزەت لە گومڕایی دەچێژن..

سەرگەردانەکانیش: ئەو کەسانەن کە بێز لە گومڕایی دەکەنەوە، بەڵام تێوەی تلاون و گرفتار بوون و ناشتوانن لێی دەرباز ببن.. ئەوانەن کە دەیانەوێت ڕزگاریان ببێت، بەڵام ڕێی ڕزگاری نادۆزنەوە و سەریان لێ شێواوە..

ئەو چەکوشانەش: ڕێچکە و تەوژمە سیاسی‌یەکانن.. ئەو نوورانەش: ڕاستی‌یەکانی قورئانی پیرۆزن.

(نوور) وەکو (چەکوش) نی‌یە و بە یەك چاو تەماشا ناکرێن و، غەڵبەی لە ئاستدا ناکرێت و، دوژمنایەتیی بەرامبەر نانوێنرێت و، کەس لێی هەڵنایەت، مەگەر شەیتانی نەفرەت لێ‌کراو.

لەبەر ئەوەیە كە پڕ بە دەم وتم: "أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة" تاكو پارێزگاریی نووری قورئانی پیرۆز بكەم. ئیتر لەو كاتەوە چەكوشی سیاسەتم فڕێ دا و، هەردوو دەستم بە توندی لە نووری قورئانی پیرۆز گیر كرد.

پاشان بینیم كە هەموو ڕێچكە و ڕێبازە سیاسییەكان – چ لایەنگرانی نووری قورئان و چ نەیارەكانی – كەسانێكی زۆریان تێدایە كە عاشقی ئەو نوورەن.

لەبەر ئەم ڕاستییە، ئەو دەرسە قورئانییەی كە لە شوێنێكی خاوێن و دوور لە هەموو بیر و بۆچوونێكی سیاسی و لایەنگریی مەبەستدارەوە دەوترێتەوە و، لە پلەیەكی گەلێ لەوانە بەرز و بڵندترەوە ڕێنمایی خەڵكیی بۆ لا دەكرێت، دەبێ هیچ لایەنێك دوورەپەرێزیی لێنەكات و، جێی گومانی هیچ چەشنە دەستە و تاقمێك نەبێت، هەرچییەك و لە هەر جۆرێك بن. مەگەر ئەوانەی كە كوفر و ئیلحاد بە سیاسەت دەزانن و لایەنی دەگرن، خۆ ئەوانەش – لە ڕاستی و ناوەڕۆكدا – شەیتانن لە شكڵی مرۆڤدا و، ئاژەڵن لە جەستەی ئادەمیدا خۆیان دەنوێنن.

سوپاس بۆ خوای گەورە، كە بەهۆی دوورەپەرێزی و دەستبەرداربوونم لە ڕێڕەوە سیاسییەكان، نرخی ئەڵماس بەهای ڕاستییەكانی قورئانم دانەشكاند و، بە تۆمەتی پڕ و پاگەندەی سیاسی نەمگەیاندنە ئاستی بێنرخیی وردە شووشەكان! تەنانەت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو گەوهەرانەی نووری قورئان لە بەرچاوی هەموو دەستە و تیرە و تاقمێكدا نرخیان زیاتر دەبێت و پتر گەشەدار دەبن و دەبریسكێنەوە.

﴿وقالوا الحمدُ لله الذي هدانا لهذا وما كنّا لنهتدي لولا أنْ هدانا الله لقدْ جاءت رُسُل ربّنا بالحق﴾ (الأعراف:٤٣).

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەكتووبی چواردەهەم

دانەنراوە

# مەکتووبی پازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

برای ئازیزم!

◆ **پرسیاری یەکەمت کە دەڵێت:**

ئاشکرایە کە هاوەڵە بچووکەکان گەلێ گەورەترن لە ئەولیا هەرە مەزنەکان، ئەدی بۆچی هاوەڵە بەڕێزەکان بە ڕوانینی "ویلایەت" ئەو دەستە و تاقم و کەسە خراپکارانەیان نەبینی و ئاشکرایان نەکردن کە لە ناو کۆمەڵی ئەواندا بلاو بووبوونەوە، بە ڕادەیەك کە بوون بەهۆی شەهیدبوونی سێ خەلیفەی ڕاشید؟

**وەڵامەکەی لە دوو مەقامدایە:**

## مەقامی یەکەم

بە ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی نهێنییەکی وردی "ویلایەت" گرێی پرسیارەکە دەکرێتەوە، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

ویلایەتی هاوەڵە بەڕێزەکان "ویلایەتی کوبرا"یە و، سەرچاوە و بناغە سەرەکییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ میراتگریی "پێغەمبەرایەتی". ڕێگای ئەم ویلایەتەش بریتییە لە ڕۆشتنی ڕاستەوخۆی ئەوان لە "ظاهیر"ەوە بۆ ناوجەرگەی حەقیقەت، بێ ئەوەی بە ڕێی بەرزەخی تەریقەتدا تێپەڕ ببن. ئەم ویلایەتەی ئەوان ڕووی لە دەرکەوتنی "ئەقرەبییەتی ئیلاهی"یە، چونکە ڕێی ئەم ویلایەتە هەرچەند تابلێی ڕێگایەکی کورتە بەڵام گەلێ بەرز و بڵندە و.. هەرچەندەش کەشف و کەرامەت و کارە دەراساکانی بە دەگمەن دەردەکەون؛ بەڵام فەزڵ و تایبەتکارییەکانی یەکجار پایەبەرزن.

هەرچی کەرامەتی ئەولیاکانی ترە، زۆربەیان بەبێ ویستی خۆیان ڕوو دەدات، چونکە هەندێ جار خوای گەورە ڕێزیان لێ دەگرێت و، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن کارێکی دەراسا(خارق)یان لێ دەردەکەوێت. ئنجا زۆربەی ئەم کەشف و کەرامەتانەش لە دەمی سەیر و سلووك و کاتی بڕینی بەرزەخی تەریقەتدا دەردەکەوێت، کاتێکیش – تا ڕادەیەك – لە بەش و خواستی مرۆڤانە دەستبەردار دەبن، چەند بارێکی دەراسا بەدەست دەهێنن.

بەڵام هاوەڵە بەڕێزەکان – خوا لە هەموویان ڕازی بێت – ناچار نین "بۆ گەیشتنیان بە حەقیقەت" لە ڕێی تەریقەتەوە بازنەیەکی مەزن بە سەیر و سلووك ببڕن. چونکە ئەوان شەرەفمەندی لێدرەوشانەوەی ڕووناکییەکانی هاوەڵێتیی پیرۆزی پێغەمبەری مەزن بوون ﷺ، کەواتە ئەوان لە ڕێی ئەم نهێنییەوە دەتوانن لە یەك کۆڕ و دانیشتندا و بە یەك هەنگاو ڕاستەوخۆ ڕووی ڕواڵەتی "ظاهیر" دیواودەر بکەن و یەکسەر بە "حەقیقەت" بگەن و پێی بەهرەمەند بن. بۆ نموونە: گەر بمانەوێت بە شەوی "قەدر" بگەینەوە کە دوێنێ بەسەرچوو و بوو بە ڕابوردوو، دوو ڕێگامان بۆ ئەم مەبەستە لە بەردەمدایە:

*یەکەمیان*: بڕینی ڕۆژ بە ڕۆژی ساڵێکی ڕەبەق تاکو جارێکی تر بەو شەوە پیرۆزە بگەینەوە. کەواتە بەپێی ئەم ڕێیە، دەبێ مرۆڤ ساڵێکی تەواو بە سەیر و سلووك ببڕێت تاکو "قوربییەتی ئیلاهی"ی دەست بکەوێت.

ئەمەش ڕێبازی زۆربەی ڕێڕەوانی تەریقەتەکانە.

*دووهەمیان*: دەربازبوونی جەستەی ماددیی پابەندی زەمانە لەو بەرگەی خۆی و بەرزبوونەوەی "گیان"ە بە دەستبەرداربوون لە جەستە و، ئنجا بینینی دوێنێ شەوی ڕابوردووی "قەدر"ە لەگەڵ سبەی شەوی "جەژن"دا پێکەوە و بە چەشنی ئامادەیی ئەمڕۆ. چونکە "گیان" بە کات و زەمانەوە بەند نییە.

جا هەرکات هەستەکانی مرۆڤ تا ڕادەی ناسکی و نیانیی "گیان" بەرزبوونەوەیان بەدەست هێنا، ئەوا کاتی "ئێستا"ی ئەو مرۆڤە فراوان دەبێت و، "ڕابوردوو" و "داهاتوو" لە خۆیدا دەپێچێتەوە و ئەو کاتانەی کە سەبارەت بە خەڵکییەوە بە "ڕابوردوو" و "داهاتوو" دادەنرێن، سەبارەت بەم وەکو کاتی "ئێستا" دەبن.

لەبەر ڕووناکیی ئەم نموونەیەدا دەڵێین: گەیشتن بە شەوی قەدری ڕابوردوو بە بەرزبوونەوەی مرۆڤ دەبێت تا پلەی "گیان" و ئنجا بینینی کاتی "ڕابوردوو"ە وەکو "ئێستا".

بناغه‌ی ئه‌م نهێنیی‌یه‌ ته‌ماوی‌یه‌ش بریتی‌یه‌ له‌ ده‌ركه‌وتنی "ئه‌قره‌بییه‌تی ئیلاهی".

با به‌ نموونه‌یه‌ك ئه‌مه‌ روون بكه‌ینه‌وه‌:

"خۆر" له‌ ئێمه‌وه‌ نزیكه‌، چونكه‌ یه‌ك به‌ یه‌كی "رووناكی" و "گه‌رمی" و "وێنه‌"ی ئه‌و له‌ ئاوێنه‌كانی ناو ده‌ستماندا ده‌رده‌كه‌وێت، به‌ڵام ئێمه‌ له‌ خۆره‌وه‌ دوورین.

جا ئه‌گه‌ر له‌ رووی نوورانییه‌ت و رووناكیی خۆره‌وه‌ هه‌ستمان به‌ "ئه‌قره‌بییه‌ت"ی خۆر كرد و په‌ی‌مان به‌و په‌یوه‌ندی‌یانه‌ برد كه‌ له‌گه‌ڵ وێنه‌ میسالی‌یه‌كه‌ی ئه‌ودا هه‌مانه‌ له‌ناو ئاوێنه‌كانماندا و، له‌و رێگایه‌وه‌ خۆرمان ناسی و هه‌ستمان به‌ راستیی رووناكی و گه‌رمی و شێوه‌ی خۆر كرد، ئه‌وا "ئه‌قره‌بییه‌تی" ئه‌ومان له‌ ئێمه‌وه‌ به‌ ئه‌ندازه‌یه‌ك بۆ ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ هانمان ده‌دات به‌ شاره‌زایی و نزیكی په‌یوه‌ندیی له‌گه‌ڵدا ببه‌ستین.

به‌ڵام گه‌ر بمانه‌وێت له‌ رووی دووریمانه‌وه‌ له‌ خۆر، پێی ئاشنا ببین و لێی نزیك ببینه‌وه‌، ناچار ده‌بین به‌ "بیر" و "ژیری"مان گه‌لێ رێگا ببڕین تاكو هاوده‌م له‌گه‌ڵ یاسا زانستی‌یه‌كاندا بیرمان بۆ ئاسمانه‌كان سه‌ربخه‌ین و له‌وێدا ته‌سه‌ووری خۆر بكه‌ین كه‌ له‌ناو بۆشایی گه‌ردووندا پرشنگ ده‌دات. هه‌روه‌ها ده‌بێ پشت به‌و یاسا زانستی و ورده‌كاری‌یه‌ یه‌كجار دوور و درێژانه‌ ببه‌ستین تاكو په‌ی به‌و رووناكی و گه‌رمی و حه‌وت ره‌نگه‌ ببه‌ین كه‌ له‌ ماهییه‌تی خۆردا هه‌ن. ئنجا دوای هه‌موو ئه‌مانه‌ له‌وانه‌یه‌ "قورببیه‌تی مه‌عنه‌وی"مان له‌ خۆره‌وه‌ ده‌ست بكه‌وێت وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌سی یه‌كه‌م به‌ تێڕامانێكی كه‌م له‌ ئاوێنه‌كه‌ی، ده‌ستی كه‌وت.

هه‌ر به‌ وێنه‌ی ئه‌م نموونه‌یه‌، "پێغه‌مبه‌رایه‌تی" و ئه‌و "ویلایه‌ته‌"ش كه‌ میراتگری پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌یه‌، هه‌ردوو كیان روویان له‌ ده‌ركه‌وتنی "ئه‌قره‌بییه‌تی ئیلاهی"یه‌. به‌ڵام زۆربه‌ی ویلایه‌ته‌كانی تر له‌سه‌ر بناغه‌ی "قورببیه‌تی ئیلاهی" سلووك ده‌كه‌ن و، ناچارن چه‌ندین پله‌ و قۆناغی زۆر و زه‌به‌نده‌ ببڕن پێش ئه‌وه‌ی به‌ پله‌ و پایه‌ی مه‌به‌ستیان بگه‌ن.

## مه‌قامی دووهه‌م

ئه‌و ده‌سته‌ په‌نهانه‌ی كه‌ له‌ پشتی رووداوه‌كانی ئاشووبی ئه‌و رۆژگاره‌وه‌ خۆی مه‌ڵاس دابوو، ته‌نها ژماره‌یه‌كی كه‌می جووله‌كه‌ نه‌بوون تاكو بتوانرێت ده‌ستنیشان بكرێن و ئه‌و فه‌ساده‌ له‌ شوێنی خۆی‌دا رابگیرێت و، ته‌نها به‌ ئاشكراكردنی ئه‌وان ئاگری ئه‌و ئاشووبه‌ بكوژێته‌وه‌.. نه‌خێر، چونكه‌ به‌ هاتنی چه‌ندین نه‌ته‌وه‌ی زۆر و زه‌به‌نده‌ و

جیاجیا بۆ ناو ئایینی ئیسلام و کۆمەڵگای ئیسلامی و، تێکەڵ بوونی چەندەها بیروڕا و تەوژمی دژ بە یەك و نەگونجاو لەگەڵ ناوەرۆکی بیروباوەڕی ئیسلامدا بە بیروڕای موسڵمانان، بە تایبەت ئەوانەی کە غرووری نەتەوایەتی‌یان بە گورزە توندەکانی دەستی حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - پێکرابوو، لە دەروونەوە نیازی تۆڵەسەندنەوەیان شاردبووەوە و بە دوای هەلێکدا دەگەڕان، چونکە ئایینی پێشوویان و دەستەلاتیان پووچەڵ کرایەوە و دەوڵەتەکەشیان کە مایەی سەربەرزی و شانازی‌یان بوو بە تەواوەتی لەناوبرا..

لەبەر ئەوە، چ بە خۆیان زانیبێت و چ نەیان زانیبێت، لە ناخەوە هەستیان بە تۆڵەسەندنەوە دەکرد لە خەلافەتی ئیسلام.

بۆیە وتراوە کە: مونافیقە پیلان سازە زیرەکەکانی وەك جوولەکە کەڵکیان لەو بارە کۆمەلایەتی‌یە وەرگرتووە!

واتە: بەرەنگاربوونەوە و نەهێشتنی ئەو ئاشووبانە بە چاکسازیی کۆمەڵ و ڕووناك کردنەوەی بیروڕا جۆراوجۆرەکان دەبێت، نەك بە ئاشکراکردنی چەند کەسێکی کەم لە خراپەکارانی ناو کۆمەڵ.

**ئەگەر بوترێت:**

حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - لەسەر مینبەرەوە بانگی لە "ساریە" کرد کە یەکێکە لە سەرکردەکانی سوپاکەی و مانگە ڕێیەك لێیەوە دوور بووە و فەرموویەتی: "يا سارية الجبل الجبـل!"[1] ئەم بانگ لێکردن و ڕێنمایی‌یەشی بوون بە هۆیەکی سەرکەوتنیان لەو جەنگەدا. ئەم ڕووداوە مەودای تیژیی بەسیرەتی حەزرەتی عومەر دەردەخات.. پرسیارەکەش ئەوەیە کە ئایا ئەم بەسیرەتە تیژە دووربینە بۆچی فەیرووزی قاتڵی خۆی نەبینی کە لە نزیکی خۆیەوە بوو؟

---

(١) صحيح: أخرجه احمد في فضائل الصحابة برقم ٣٥٥ بإسناد حسن، والطبري في التاريخ ٢/ ٣٨٠، وأبو نعيم في الدلائل ٣/٢١٠، ٢١١ والبيهقي في الدلائل واللالكائي في شرح السنة والزين عاقولي في فوائده، وابن الأعرابي في كرامات الأولياء، وابن مردويه وأبو بكر بن خلاد في الفوائد، وابن عساكر ٧/ ٦/ ١ و ٢/٦٣/١٣ ومن عدة طرق. قال ابن كثير في النهاية ١٣١/٧: "هذا إسناد جيد حسن" وقال الحافظ في الإصابة ٢/ ٣ إسناده حسن، ومثله قول ابن حجر الهيتمي في الصواعق المحرقة ص ١٠١. وانظر المقاصد برقم ١٣٣١ والدرر برقم ٤٦٢ والتمييز ١٩٤ وكشف الخفاء ٢/ ٣٨٠ والأحاديث الصحيحة برقم ١١١٠. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

**وەڵام:**

وەڵامی ئەم پرسیارە وەك وەڵامەکەی حەزرەتی یەعقووب - دروودی لەسەر بێت - دەدەینەوە[1] ئەوەبوو لە حەزرەتی یەعقووبیان پرسی: چۆن هەستت بە بۆنی یووسف کرد لە رێی کراسەکەیەوە کە هێشتا لە خاکی میسردا بوو، کەچی یووسفت لە بیرە نزیکەکەی خاکی کەنعاندا نەبینی؟ وەڵامی دانەوە: حاڵەتەکانی ئێمە وەك هەورەبروسکەی کتووپڕی وان، دەمێك دیار و دەمێکی تریش نادیارن، کاتی وا هەیە وەکو ئەو کەسەین کە لە بڵندترین مەقامدا دانیشتبێت و سەرجەمی دەوروبەری خۆی ببینێت، کاتی وایش هەیە تەنانەت پشت پێی خۆشمان نابینین!

**پوختەی قسە ئەوەیە کە:**

هەرچەندە مرۆڤ بکەر و خاوەن ویست و ئیختیار بێت، کەچی هەر ویستی خواوەند بناغەیە لە هەموو شتێکدا و، قەدەری خوای گەورەش زاڵ و فەرمانڕەوایە و، ویستی خوایی دەست بە رووی ویستی مرۆڤەوە دەنێت، بەپێی ناوەرۆکی ئایەتی: ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ اِلاَّ اَنْ يَشَاءَ اللهُ﴾ (الإنسان:٣٠) و، حەقیقەتی: "إذا جاء القدر عمي البصر"یش فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکات، خۆ هەر کاتیش قەدەر دوا، دەبێ توانست و ئیختیاری جوزئیی مرۆڤ بێدەنگ ببێت.

◆ **ناوەرۆکی پرسیاری دووهەمیشتان بریتییە لەوەی کە:**

ڕاستی و حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە چین کە لە سەردەمی حەزرەتی عەلیدا - خوای لێ ڕازی بێت - کەوتنە ناو ریزەکانی موسڵمانانەوە؟ ئەوانەش کە لەو ڕووداوانەدا مردن یان کوژران چ ناوێکیان لێ بنێین؟

**وەڵام:**

جەنگی "جەمەل" کە لە نێوان حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و دار و دەستەکەیدا لە لایەکەوە و، حەزرەتی تەلحە و زوبەیر و عائیشە - خوایان لێ ڕازی

---

(١) ز مصرش بوی پیراهن شنیدی  چرا در چاه کنعانش ندیدی
بگفت احوال ما برق جهان است  دمی پیدا و دیگردم نهان است
گهی بر طارم أعلی نشینم  گهی بر پشت پای خود نبینم
(سەعدیی شیرازی) (دانەر)(*)

(*) بروانە: (کلیات سعدی - گلستان) ص ٧٥ چاپ هشتم، انتشارات أمیر کبیر، تهران ١٣٦٩ هـ.ش. (وەرگێڕ)

بێت - لە لایەکی ترەوە، ڕووی دا، لە ڕاستیدا جەنگێك بووە لە نێوان دادگەریی ڕووت و دادگەریی نیسبی(گوێرەیی)دا. ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییەش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - دادگەریی ڕووتی کردبوو بە بناغەی سیاسەتی خۆی لە حوکمڕانیدا و، بەپێی خواستی ئەم دادگەرییە و لە ڕێی ئیجتیهادی خۆیەوە بەو چەشنەی کە حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر پێش خۆی لەسەری بوون، ڕەفتاری دەکرد.

بەڵام نەیارەکانی دەیانوت:

خاوێنیی دڵ و دەروونی خەڵکی لە سەردەمی ئەبووبەکر و عومەردا ڕێ خۆشکەر بوون بۆ ئەوەی دەسەڵاتی دادگەریی ڕووت بەسەر کۆمەڵدا جێبەجێ بکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو نەتەوانەی کە سروشت و ڕەوتیان گەلێ جیاجیا و جۆراوجۆرە و ئایینی ئیسلامیش لە دەروونیاندا لاوازە، کە بە درێژایی ئەو ماوەیە تێکەڵی کۆمەڵی موسڵمانان بوون، ئەوا چەند تەگەرە و ڕێگرێك هاتوونەتە کایەوە نایەڵن نیازی جێبەجێ کردنی دادگەریی ڕووت سەربگرێت و بەجێهێنانی کارێکی گەلێ دژوار دەبێت. بەم پێیە ئیجتیهادی ئەمان لەسەر بناغەی "دادگەریی نیسبی"یە کە بریتییە لە هەڵبژاردنی سووکترین شەڕ و بچووکترین زیان.

بەڵام لەبەر ئەوەی موناقەسەی نێوان ئەم دوو جۆرە ئیجتیهادە کەوتە مەیدانی سیاسەتەوە، ئەوا جەنگ لە نێوان هەردوو لادا هەڵگیرسا. ئنجا لەبەر ئەوەش کە هەریەك لەو دوو لایەنە بە نیازێکی خاوێن و بۆ مەبەستی ڕەزامەندیی خوا و بەرژەوەندیی ئیسلام گەیشتنە ئەو ئیجتیهادە و جەنگەکەش لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا و ئەنجامی ئەم ئیجتیهادە بێ گەردەوە بوو، ئەوا دەکرێت بڵێین: چ بکوژ و چ کوژراو هەردووکیان بەهەشتین و پاداشت دەدرێنەوە، هەرچەندەش دەزانین کە ئیجتیهادی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - ڕاست بووە و هی نەیارەکانیشی ڕاستیی نەپێکاوە. دەبێ بیشزانین کە ئەو نەیارانە شایانی تۆڵەی دوارۆژ نین، چونکە ئەو کەسەی لەبەر ڕەزامەندیی خوای گەورە ئیجتیهاد دەکات ئەگەر ئیجتیهادەکەی ڕاستیی پێکابێت ئەوا دوو پاداشتی هەیە، دەنا یەك پاداشتی هەر بۆ دەنووسرێت. واتە پاداشتی ماندووبوونی لەو ئیجتیهادەدا دەست دەکەوێت کە جۆرێکە لە پەرستش. بەو واتایەی هەڵەکەی چاوپۆشی لێ دەکرێت.

یەکێك لە زانا لێکۆڵەرە مەزنەکانمان کە قسەی ئەو بە بەڵگە دادەنرێت، لە شیعرێکی کوردیدا وتوویەتی:

**ژی شەڕێ صەحابان مەکە قال و قیل    لەورا جـەننەتینە قاتیل و هـەم قەتیل**[1]

واتە: لەو ڕووداوانە مەدوێ کە بەسەر هاوەڵاندا هات، چونکە بکوژ و کوژراوی ئەوان هەردوو کیان لە بەهەشتدان.

ڕوونکردنەوەی جیاوازیی نێوان دادگەریی ڕووت و دادگەریی نیسبی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لە دادگەریی ڕووتدا مافی یەك کەسی بێتاوان پارێزراوە و، هەرگیز لەبەر خاتری سەرجەمی مرۆڤایەتیش مافەکەی ئەو پێشێل ناکرێت. ئەمەش بەپێی ئاماژەی ئایەتی پیرۆزی:

﴿**مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّما قَتَلَ النَّاسَ جَميعاً**﴾ (المائدة:٣٢)

لەبەر ئەوە، هەرگیز لە پێناوی پاراستنی هەمواندا هیچ تاکە کەسێك قوربانیی پێ نادرێت! چونکە لە چوارچێوەی میهرەبانیی خوای گەورەدا "حەق" لە هەموو شوێنێکدا هەر حەقە و لە گۆشەی گەورە و بچووکییەوە سەیر ناکرێت. بۆیە هەرگیز "بچووك" لە پێناوی "گەورە"دا و "تاك" و "مافی تاك" لە پێناوی سەلامەتی و پاراستنی "کۆمەڵ"دا بەخت ناکرێت، گەر خۆی پێی ڕازی نەبێت، بەڵام گەر بە ڕەزامەندی و ویستی خۆی، خۆی بەخت بکات ئەوە باسێکی ترە.

دادگەریی نیسبیش بریتییە لەوەی بەشێك لە کۆمەڵ لە پێناوی سەلامەتیی هەمواندا بەخت دەکرێت! ئەم چەشنە دادگەرییە لە پێناوی بەرژەوەندیی "کۆمەڵ"دا مافی "تاك" پشتگوێ دەخات و لە ڕووی هەڵبژاردنی "سووکترین شەڕ"ەوە دەیەوێت جۆرێکی

(١) ئەم شیعرە هی زانای خواناسی کورد (مەلا خەلیلی سیعریدی)یە و، لە لاپەڕە (١٨)ی کتێبی (نهج الانام)یدا بەم جۆرە هاتووە:

ژی حەربا صەحابان مەکەن قال و قیل    لەورا بەهەشتینە قاتیل و هەم قەتیل

مەلا خەلیلی سیعریدیش (١١٦٤-١٢٥٩ ك) خەڵکی گوندێکی کوردستانی باکوورە لە نزیکی گوندی نوورس بە ناوی (گوهێك). پاشان لە شاری سیعرید نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێ هێشتووە کە زۆربەیان تا ئێستا هەر دەستنووسن و تەنها دوانیان لێ چاپ کراوە، یەکەمیان: (نهج الانام) بە زمانی کوردیی کرمانجیی ژووروو، دووهەمیشیان کتێبێکە لە زانستی مەنتیقدا بە زمانی عەرەبی.

تێبینی: بەشێکی ئەم زانیارییانەم لە مامۆستا عەبدولقادر بادیللی وەرگرت و بەشێکی تریشی لە کتێبێکی ئەو بە ناوی: (**Risale-i Nurun Kudsi Kaynakleri**) لاپەڕە (٣٨٦). (وەرگێڕ)

دادگەریی نیسبی ئەنجام بدات. بەڵام ئەگەر دادگەریی ڕووت بواری جێبەجێ کردنی بێت نابێ وازی لێ بهێنرێت و ڕوو لە دادگەریی نیسبی بکرێت. خۆ ئەگەر لە کاتێکی وادا دادگەریی نیسبی هەڵبژێررا ئەوا ستەم ڕوو دەدات.

جا ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - دەیفەرموو: وەك سەردەمی حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر بواری جێبەجێ کردنی دادگەریی ڕووت هەیە، بۆیە هەوڵی دا خەلافەتی ئیسلامی لەسەر بناغەی دادگەریی ڕووت بنیات بنێت.. بەڵام نەیارەکانی دەیانوت: دادگەریی ڕووت ناکرێت ئەنجام بدرێت، چونکە گەلێ تەگەرە و گیروگرفت لەکاتی جێبەجێ کردنیدا دێنە پێش، بۆیە ڕووی ئیجتیهادیان کردە دادگەریی نیسبی.

ئەمەیە هۆی ڕاستەقینەی ئەو ڕووداوانە. دەنا ئەو هۆکارانەی تر کە کتێبەکانی مێژوو باسیان کردوون، هەرگیز هۆکاری ڕاستەقینە نین، بەڵکو چەند بڕوبیانوویەکی لاواز و دوور لە ڕاستین!

**ئەگەر دەڵێیت:**

بۆچی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - وەك خەلیفەکانی پێش خۆی لە بەڕێوەبردنی خەلافەتدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، هەرچەندەش لەم لایەنەوە دارای گەلێ توانا و لێهاتنی زۆر و زیرەکیی بێوێنە و شایستەی مەنسەبی خەلافەت بوو؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - شایانی ئەنجامدانی گەلێ ئەرکی مەزنی ئەوتۆ بوو کە زۆر لە سیاسەت و حوکمڕانی گرنگترن، چونکە ئەگەر لە بواری سیاسەت و حوکمڕانیدا بە تەواوی سەرکەوتنی پێ ببەخشرایە ئەوا بە شایستەیی تەواو نازناوی "سيد الاولياء"ی بەدەست نەدەهێنا کە پلە و پایەیەکی مەعنەوییە و لە ڕاستیدا ئەو شایانیەتی. بۆیە حوکم و دەستەڵاتدارییەکی مەعنەویی دەست کەوت کە لە چاو خەلافەتی سیاسی و ڕواڵەتیدا گەلێ بەرز و پایەدارترە، چونکە وەکو مامۆستای هەموانی لێ هات و، حوکمڕانیی مەعنەویی ئەو هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام و جێبەجێ کراوە.

سەبارەت بەو جەنگەش کە لە نێوان ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و حەزرەتی معاويە و لایەنگرانی لە "صِفّين"دا ڕووی دا، لە ڕاستیدا جەنگێك بووە لە نێوان خەلافەت و پادشایەتیی دنیاییدا.

واتە ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - ئەحکامی ئایین و ڕاستییەکانی ئیسلام و ئاخیرەتی کردبوو بە بناغەی حوکمڕانیی خۆی و، بەم پێیە هەندێ لە

یاساکانی حوکمڕانــی و دەســەڵاتداری و داخوازییــەکانی سیاســەتی، لەوانــەی کــە ناحەقییان تێدا بوو، لە پێناوی ڕاستییەکانی ئیسلام و ئەحکامی ئایینددا بەخت دەکرد.

بەڵام حەزرەتی معاویە و شوێنکەوتــووانی دەستیان بە "ڕوخســەت"ی شـەرعییەوە گرت و وازیان لـە "عەزیمـەت" هێنـا، بـە مەبەسـتی ڕاگـیرکردنی ژیـانی کۆمەڵایـەتیی ئیسلامی بە سیاسەتی دەوڵەت و حوکمڕانی. بۆیە خۆیان بە ناچار زانی کە لـە جیـهانی سیاسەتدا ئەم ڕێبازە بگرنە بەر و، ڕوخسەتیان بەسەر عەزیمەتدا هەڵبژارد و، لـەم ڕێیـەوە کەوتنە ئەو هەڵانەی کە گرفتاریان بوون.

بەرەنگاربوونـەوەی حـەزرەتی حەســەن و حســەینیش - خوایـان لــێ ڕازی بێــت - بەرامبەر ئەمەوییەکان، لە ڕاسـتی و نـاوەڕۆکدا بریتییـە لـە: ململانێـی نێـوان "ئـایین" و ڕێبازی "نەتەوایەتی"! چونکە ئەمەوییـەکان بـۆ مەبەسـتی بـەهێزکردنی دەوڵـەتی ئیسـلام پشتیان بـە ڕەگـەزی عـەرەب بەسـت و بەسـەر نەتـەوەکانی تـردا پێشـیان خسـتن. واتـە پەیوەندیی نەتەوایەتییان بەسەر پەیوەندیی ئیسلامدا پێش خسـت و لە دوو ڕووەوە زیانیان گەیاند:

*یەکەم*: بەم تێڕوانینـەیان نەتـەوەکانی تریـان ئـازار دا و، ڕق و نـەفرەتیان لـە دەروونـدا چاندن.

*دووهەم*: ئـەو بناغانـەی کـە قەومییـەت و ڕەگەزپەرسـتی پیادەیـان دەکـەن و کاریـان لەسەر بنیات دەنێن چەند بناغەیەکی ستەمکارانەن و لـە دادگەرییـەوە دوورن و لـەگـەڵ حـەقدا یـەك ناگرنــەوە و بــەپێی دادگــەری هــەنگاو نـانێن، چونکــە فــەرمانڕەوای ڕەگەزپەرست هەمیشە هاوڕەگەزەکانی خۆی بەســەر کەسـانی تـردا پێـش دەخـات. ئیـتر چۆن دەتوانێت بە دادگەریی ڕاستەقینە بگات؟!

کەچی ئیسلامەتی وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "الاسلامُ یَجُبُّ ما قبلَــــه"[1]. هـەموو ڕەگەزایەتییەکی جاهیلییەتی پێش موسڵمان بوون دەپچڕێنێت و جیاوازی ناخاتە نێـوان قولێکی حەبەشی و سەردارێکی قورەیشی گـەر موسـڵمان بـن[2]. کەواتـە لەبـەر تیشـکی ڕوونـاکیی ئـەم فەرمانـە قەتعییـەی ئیســلامدا نـاکرێ پـەیوەندیی نەتەوایـەتی لــە بریـی

---

(١) رواه ابن سعد في طبقاته عن الزبير وجبير ابن مطعم، ورواه احمد والطبراني عن عمرو بن العاص. (كشف الخفاء ١/١٢٧). (وەرگێڕ)

(٢) وردت احاديث كثيرة عن النهي عن دعوى الجاهلية. انظر البخاري كتاب الجنائز والمنـــاقب وتفسـير القرآن ومسند احمد ٣/٣٣٨ و ٣٨٥، ٤/١٣٠ و ٢٠٢، ٥/٣٤٤ ومسند الطيالسي (١١٦٢). (وەرگێڕ)

پەیوەندیی ئایین دابنرێت، چونکە هەرگیز لە کاتی وادا هیچ چەشنە دادگەرییەك نایەتەدی، بەڵکو مافەکان پێ شێل دەکرێن و ویژدانیش لەکیس دەچێت!

جا حەزرەتی حسەین - خوای لێ ڕازی بێت - لەو بەرەنگاربوونەوەیەدا، دەستی بە "پەیوەندیی ئایینەوە" گرت و، لەم هەوڵەشیدا لەسەر حەق بوو! بۆیە بەرەنگاری ئەمەوییەکان بوویەوە تا پلەی "شەهیدی"ی خەڵات کرا.

**ئەگەر بوترێ:**

خۆ حەزرەتی حسەین - خوای لێ ڕازی بێت - لەسەر حەق بوو، ئەدی بۆ لەم هەوڵەیدا سەرنەکەوت و، چۆن "قەدەر" و "میهرەبانی"ی خوای گەورە بواریان بەوە دا کە دوا ئەنجامی حەزرەتی حسەین و ئالی بەیتی، کارەساتێکی دڵتەزێن بێت؟

**وەڵام:**

گەر ئێمە لەم مەسەلەیەدا کەسانی هەرە نزیکی حەزرەتی حسەین بخەینە لاوە، دەبینین ئەو نەتەوە جۆراوجۆرانەی هاتبوونە ناو ڕیزەکانی حەزرەتی حسەینەوە لەوانەی کە غرووری نەتەوایەتییان بە دەستی عەرەبە موسڵمانەکان پێکرابوو، لە ناخەوە نیازی تۆڵە سەندنەوەیان لەوان هەڵگرتبوو. کە ئەمەش بوو بەهۆی لێڵ بوونی ئەو نیازە خاوێنەی لە ڕێبازەکەی حەزرەتی حسەین و هاوەڵانیدا هەبوو. ئەم لێڵ بوونی نیاز و کزبوونی ڕووناکیی ڕێبازە بەرزەی ئەوانیش بوو بەهۆی پاشەکشێ و شکستیان لە بەردەم ئەمەوییەکاندا.

ئنجا حیکمەتی ئەو کارەساتە دڵتەزێنەش لە گۆشەی "قەدەر"ی خواوەندەوە، بریتییە لەوەی کە:

حەزرەتی حەسەن و حسەین و خزم و کەس و وەچەی ئەوان، بۆ دەستەڵاتدارێتییەکی مەعنەوی دەستنیشان کرابوون و، شایستەی گرتنە دەستی پلە و پایەیەکی بڵندی مەعنەوی بوون. جا لەبەر ئەوەی کۆکردنەوەی دەستەڵاتداریی دنیا و ئەو دەستەڵاتە مەعنەوییە کارێکی گەلێ دژوارە، ئەوا قەدەری خوای گەورە وای لێ کردن کە پشت لە دنیا هەڵبکەن و ڕووی چەپەڵ و ناشیرینی دنیای بۆ دەرخستن، تاکو هیچ چەشنە پەیوەندییەکی دەروونییان لەگەڵدا نەمێنێت و، هانی دان دەست لە دەستەڵاتی ڕواڵەتیی کاتی و لەناوچووی دنیا بتەکێنن و، بۆ هەڵگرتنی چەند کاروبارێکی دەستەڵاتدارییەکی مەعنەویی بەرز و هەمیشەیی دەستنیشانی کردن و، بەم

پێیە ئەوان بوون بە مەرجەعی قوتبەكانی ئەولیا، لە بریی ئەوەی مەرجەعی والی و كاربەدەستە ئاساییەكان بن!

◆ **پرسیاری سێهەمیشتان كە دەڵێت:**

"حیكمەت"ی ئەو موسیبەتە دڵتەزێن و مامەڵە ستەمكارانەیە چییە كە ئەو مرۆڤە خاوێن و پیرۆزانە گرفتاری بوون؟

**وەڵامەكەی ئەوەیە كە:**

پێشتر روونمان كردەوە، سێ بناغە هەبوون نەیارەكانی حەزرەتی حسەین - خوای لێ رازی بێت - كە ئەمەوییەكانن، لە سەریان دەڕۆشتن و لە ئەنجامدا وایان لێ كردن ئەو ستەم و مامەڵە سەختانەیان لەسەر دەست روو بدات:

یەكەم: ئەو دەستوورە ستەمكارانەیەی سیاسەتە كە بریتییە لەوەی: لە پێناوی پاراستنی دەوڵەت و باڵ ڕاكێشانی ڕێسا بەسەر وڵاتدا، قوربانی بە كەسان و خەڵكی ناو وڵات دەدرێت!

دووهەم: دەوڵەتی ئەمەوییەكان پاڵی بە ڕێبازی نەتەوایەتی و ڕەگەزایەتییەوە دابوو. فەرمانڕەوای دەمڕاستی كاروباریش ئەو یاسا قەومییە ستەمكارانەیە بوو كە پێی وایە: "هەموو شتێك لە پێناوی پارێزگاریی ئاسایشی نەتەوەدا بەخت دەكرێت"!

سێهەم: هەر لە دێر زەمانەوە دەماری مونافەسە لای ئەمەوییەكان بەرامبەر هاشمییەكان ڕەگی داكوتابوو! تا دوایی لە یەزید و هاوڕێنەی ئەودا دەركەوت و بەرجەستە بوو، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی چەند توانا و لێهاتنێكی ستەمكارانە و سەخت و بێبەزەییانە لەواندا بتەقێنێتەوە.

جگە لەمانە، هۆكارێكی تری چوارەم هەیە تایبەتە بەوانەی ڕۆشتبوونە ڕیزی حەزرەتی حسەینەوە، خوای لێ ڕازی بێت. كە بریتییە لەوەی: ئەمەوییەكان لە بەڕێوەبردنی كاروباری دەوڵەتدا تەنها پشتیان بە نەتەوەی عەرەب بەست و خۆیان بە گەورە دادەنا و بە چاوێكی سووك سەیری نەتەوەكانی تریان دەكرد، وەك بڵێی بەندەی ئەوان بن و پێیان دەوتن "الموالي". ئەم ڕەفتارەی ئەمەوییەكان غرووری ئەو نەتەوانەی تری پێكا و هانی دان بڕۆنە ڕیزی حەزرەتی حسەینەوە، نیازیان وەك ئەو خاوێن و بێگەرد نەبوو بۆ خوای گەورە، بەڵكو بناغەی نیازەكەیان هاندەری تۆڵەسەندنەوە بووە. ئنجا ئەم كارەی ئەوان ڕەگەزپەرستیی نەتەوایەتیی لای ئەمەوییەكان ورووژاند و وای لێ كردن ئەو كارەساتە دڵتەزێنە ئەنجام بدەن كە هیچ چەشنە بەزەیی و سۆزێكی تێدا بەدی ناكرێت.

ئەم چوار هۆکارانەی کە باس کران، هۆکاری ڕوالەتین..

بەڵام گەر لە گۆشەی "قەدەر"ی خوای گەورەوە بڕوانینە ئەم ڕووداوە، دەبینین حەزرەتی حسەین و ئالی بەیتی، چەند ئەنجامێکی قیامەتی و دەستەڵاتی ڕۆحی و بەرزبوونەوەی مەعنەوییان لە ڕێی ڕوودانی ئەو کارەساتە دڵتەزێنەوە بەدەست هێنا، بە ڕادەیەك کە ئەو ئازار و گیروگرفتانەی لەو کارەساتە دڵتەزێنەوە گرفتاری بوون، گەلێ کەم و بچووکن لەچاو ئەو پلەوپایە بەرزانەی کە بەدەستیان هێنا.

بۆ نموونە: ئەو کەسەی لە ئەنجامی سزادانی ماوەی یەك کاتژمێردا شەهید دەبێت، هێندە پلەوپایەی "شەهیدی" بەدەست دەهێنێت کە ئەو کەسەی (دە) ساڵی ڕەبەق ماندوو دەبێ و هەوڵ دەدات، نەتوانێت بەدەستی بهێنێت! خۆ ئەگەر ئەو شەهیدە، دوای بەهرەمەندبوونی بە پلەی شەهادەت، لە بارەی ئەو سزادانەوە پرسیاری لێ بکرێت، لەوەڵامدا دەڵێت:

(بە ئازارێکی گەلێ کەم، دەستکەوتێکی یەکجار زۆرم بەدەست هێنا)!

◆ **ناوەرۆکی پرسیاری چوارەمتان:**

دوای ئەوەی کە حەزرەتی عیسا — دروودی لەسەر بێت - لە ئاخر زەماندا دەجاڵ دەکوژێت، زۆرینەی ڕەهای خەڵکی دێنە ناو ئایینی حەق و ڕاستەوە.. کەچی لە هەندێ ڕیوایەتی تردا هاتووە کە: "لا تقوم الساعة حتى لا يقال في الأرض: الله.. الله.."[(١)] ئایا چۆن بەم ژمارە و ئەندازە زۆرە خەڵکی بەرەو شێو و دۆڵی کوفر دەکەونە خوارەوە، دوای ئەوەی کە بە زۆرییەکی ڕەها هاتنە ناو بازنەی ئیمانەوە؟!

**وەڵام:**

ئەو کەسانەی ئیمانیان لاوازە ئەو هەواڵە بە دوور دەزانن کە فەرموودەی صەحیح ڕایگەیاندووە سەبارەت بەوەی کە حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - دێتە خوارەوە و دەجاڵ دەکوژێت و بە شەریعەتی ئیسلام حوکم و ڕەفتار دەکات.

بەڵام گەر حەقیقەتی ڕیوایەتەکە ڕوون بکرێتەوە، ئەوا هەرگیز جێی بەدوور زانین لە مەسەلەکەدا نامێنێتەوە، کە ئەویش بەم جۆرەیە:

---

(١) حديث صحيح عن أنس بن مالك رضي الله عنه، رواه مسلم ١٤٨ واحمد والترمذي والحاكم ٤/ ٤٩٤ وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه. (وەرگێڕ)

واتای ئەو فەرمووده و ڕیوایەتانەی کە لە بارەی "مەهدی" و "سوفیانی"یەوە[1] ڕیوایەت کراون، بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لە ئاخر زەماندا دوو تەوژمی ئیلحاد گەلێ بەهێز دەبن و پەرە دەسێنن:

یەکەمیان: کەسێکی سامناك کە پێی دەوترێت: "سوفیانی" دێت و لە پشت پەردەی نیفاقەوە ئینکاریی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محمد ﷺ دەکات و سەرکردایەتیی مونافقان دەگرێتە ئەستۆ و بۆ ڕووخاندنی شەریعەتی ئیسلام تێدەکۆشێت. ئنجا کەسێکی نوورانیش لە ئالی بەیت ناوی "محمدی مەهدی"یە و سەرکردایەتیی ئەهلی ویلایەت و کەماڵ دەگرێتە ئەستۆ لەوانەی کە پابەندن بە زنجیرەی نوورانیی ئالی بەیتەوە، دێت و ئەو تەوژمی نیفاقە دەکوژێت و تەفروتووناى دەکات کە تەمسیلی کەسایەتیی مەعنەویی سوفیانی دەکات.

بەڵام تەوژمی دووهەم: تەوژمێکی ملنەدەری سەرکەش و سەرسەختە و، لە فەلسەفەی ماددییەوە سەر هەڵدەدات و بەرە بەرە بەهێز دەبێت و بڵاو دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە ئینکاریی خوایەتیی خوای گەورە بکات و، کەسانی ناو ئەم تەوژمە کە ئینکاریی خوای گەورە دەکەن، بە وێنەی چەند وردە نەمرووديێك، جۆرە پەروەردگارێتییەك بە خۆیان دەبەخشن، وەکو ئەو کەسەی کە پادشا ناناسێت و دان بە سەرباز و ئەفسەرەکانیدا نانێت، دەچێت جۆرێکی کاربەدەستی و شێوەیەکی فەرمانڕەوایی بە یەك بە یەکی سەربازەکان دەبەخشێت!

سەبارەت بە دەجالیشەوە، کە سەرگەورەکەیانە، ئەوا هێندە کاری دەراسا لەسەر دەستیدا ڕوو دەدات کە وەك سیحر و خەواندنی موگناتیسی وابێت و، لە ڕادەبەدەریش

---

(١) پەنجا حەدیث لە بارەی حەزرەتی مەهدییەوە ڕیوایەت کراوە، لە نێوان: (الصحیح) و (الحسن) و (الضعیف المنجبر)دا و، بێ هیچ گومانێك پلەی (متواتر)یان هەیە. بڕوانە: (الإذاعة لمحمد حسن صدیق خان) ص ١١٣-١١٤، هەروەها: (تحفة الأحوذي للمباركفوري) ٦/٤٨٥. هەروەها گەلێ فەرموودەی تریش سەبارەت بە دەجالی موسڵمانان (سوفیانی) ڕیوایەت کراوە. بۆ نموونە ئەم فەرموودەیە: "عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يخرج رجل يقال له السفياني في عمق دمشق وعامة من يتبعه من كلب، فيقتل حتى يقر بطون النساء ويقتل الصبيان فتجمع لهم قيس فيقتلها حتى لا يمنع ذنب تلعة، ويخرج رجل من أهل بيتي في الحرة فيبلغ السفياني، فيبعث إليه جنداً من جنده فيهزمهم فيسير منهم إليه السفياني بمن معه حتى إذا صار ببيداء من الأرض خسف بهم فلا ينجو منهم إلا المخبر عنهم" أخرجه الحاكم في المستدرك ٤/٥٢٠ وقال: هذا حديث صحيح الإسناد على شرط الشيخين ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي. (يقر: يفتح - كلب: ماء بين الكوفة والشام - لا يمنع ذنب تلعة: لا يخلو منه موضع. وأورده السيوطي في اللآلئ ٢/٣٨٨ والأسفرايني ٢/٧٥. وانظر البداية والنهاية لابن كثير وتذكرة القرطبي.

سنووری خۆی دەشكێنێت و لێی لا دەدات تا دەگاتە ئەوەی ناوی جۆرە پەروەردگارێتییەك بەسەر حكوومەتە بە ڕوالەت زلهێزەكەیدا ببڕێت و، ئیعلانی خوایەتی بۆ خۆی بكات!

دیارە لاف لێدانی خوایەتی لە لایەن مرۆڤێكەوە كە تەنانەت "مێش"یش بەسەریدا زاڵ دەبێت و بەرامبەر بەدیهێنانی باڵە مێشێك دەستەوسان دەمێنێت، ئەوپەڕی گەوجایەتی و نەفامییە و شایانی ئەوپەڕی گاڵتە و سووكایەتی پێ كردنیشە!

جا لەم چەشنە كاتانەدا كە وا دەردەكەوێت ئەو تەوژمە پتر بەهێز بوویێت، ئەو ئایینە ڕاستەقینەیەی كە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - هێنابووی و نوێنەرایەتیی كەسێتیی مەعنەویی ئەویش دەكات، سەر هەڵدەدات و پەیدا دەبێتەوە. واتە لە ئاسمانی میهرەبانیی خواوەندەوە دێتە خوارەوە و ئایینی نەصرانیی ئێستا لە بەرامبەر ئەو حەقیقەتەوە لە خورافات و دەستكاری، ڕزگار و پاڵفتە دەبێت و لەگەڵ حەقیقەتەكانی ئایینی ئیسلامدا یەكدەگرن. واتە ئەو كاتە ئایینی نەصرانی دەبێت بە جۆرێك لە ئیسلام. جا ئەو كەسێتییە مەعنەوییەی كە نوێنەرایەتیی ئەو ئایینە نەصرانییە دەكات، دەبێت بە شوێنكەوتەی قورئانی پیرۆز و، ئایینی ئیسلامیش هەر لە پلە و پایەی ئیمام و مەتبووعدا دەمێنێتەوە. ئنجا ئایینی ڕاستەقینە - لە ئەنجامی ئەم شوێن پێ هەڵگرتنەی قورئان و پشتگیرییەوە بۆ یەكتری - هێزێكی مەزنی دەستگیر دەبێت، چونكە لەو كاتەدا كە هەر یەكە لە ئایینی ئیسلام و مەسیحییەت بە تەنیا نەیدەتوانی بەربەستێك لە بەردەم لافاوی ئەو تەوژمەی ئیلحاددا دابنێن، ئەم جارە، بەهۆی یەكگرتنی نێوانیانەوە، دەتوانن بە تەواوەتی ئەو تەوژمە لەناوبەرن و بیروو خێنن. ئا لەم كاتەدا خودی حەزرەتی عیساش - دروودی خوای لەسەر بێت - كە بە جەستە و لەش و لاری بەشەریی خۆیەوە لە جیهانی ئاسمانەكاندایە، سەركردایەتیی تەوژمی ئەو ئایینە حەقە دەكات.

ئەم هەواڵەش هەواڵدەرێكی ڕاستگۆ ڕایگەیاندووە و لەمەشدا پشتی بە وادە و بەڵێنی كەسێك بەستووە كە دەتوانێت هەموو كارێك ئەنجام بدات. خۆ مادەم كەسێكی وا ڕاستگۆ هەواڵەكەی ڕاگەیاندووە، ئەوا ڕاستە و هیچ گومانێكی تێدا نییە. ئنجا مادەم كەسێكی بەتوانا بەسەر هەموو شتێكدا بەڵێنی داوە، ئەوا بە دڵنیایی بەڵێنەكەی دەهێنێتەدی.

بەڵێ، ئەو خواوەندەی كە (مەلائیكەتەكان) بە چین چین و یەك لەدوای یەك بۆ سەر زەوی دەنێرێت و هەندێ جار لەسەر شێوەی مرۆڤدا بەرجەستەیان دەكات (وەك حەزرەتی جوبریلی - دروودی لەسەر بێت - لە شێوەی هاوەڵی بەڕێز "دحیة الكلبي"دا

پیشان دا) و لە جیهانی ڕۆحیانەتەکانەوە چەندین ڕۆح دەنێرێت و دەیانخاتە شکڵ و شێوەی مرۆڤەوە، تەنانەت ڕۆحی گەلێ کەس لە ئەولیا کۆچ کردووەکان لە جەستە میسالی‌یەکانیاندا دەنێرێت بۆ دنیا، هەرگیز لە دانستی ئەو کەسەوە بە دوور نازانرێت کە حەزرەتی عیسا — دروودی خوای لەسەر بێت — بۆ دنیا ڕەوانە بکات، کە هەر ئێستا بە جەستە و لەشولاری خۆی زیندووە و لە ئاسمانی دنیادا دەژی. تەنانەت گەر مردبێتیش و ڕۆشتبێت بۆ ئەوپەڕی گۆشە و کەنارەکانی دوارۆژ، خوای گەورە هەر دەتوانێت و حیکمەتەکەشی داخوازی ئەوەیە کە سەرلەنوێ جەستەی بە بەردا بکاتەوە و، لەبەر ئەم ئاکامە مەزنە بینێرێتەوە بۆ دنیا و، میسکی خیتام و کۆتایی شکۆدار بەو ئایینە بهێنێت کە حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - خۆی هێناویەتی..

خوای گەورە لەسەر خواستی دانستی خۆی ئەم بەڵێنەی داوە. خۆ مادەم بەڵێنی داوە، ئەوا بە حەتمی و دڵنیایی دەینێرێت و بەڵێنەکەی دەباتە سەر.

مەرجیش نی‌یە کە لە کاتی هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسادا - دروودی لەسەر بێت - هەموو کەسێك بزانێت ئەوە حەزرەتی عیسایە! بەڵکو کەسانی تایبەتمەند و ئەوانەی کە لێیەوە نزیکن، بە نووری ئیمان، دەیناسن. چونکە هەموو خەڵکی تا ڕادەی شتانی بەدیهی حەزرەتی عیسا — دروودی خوای لەسەر بێت - ناناسن.

**پرسیار:**

لە هەندێ ڕیوایەتدا وتراوە کە: دەجاڵ بەهەشتێکی درۆینەی هەیە، شوێنکەوتووانی دەخاتە ناویەوە و.. بە هەمان جۆر دۆزەخێکی درۆینەشی هەیە ئەوانەی تێ‌دەخات کە شوێنی ناکەون. تەنانەت یەکێ لە دوو گوێی ولاخ(دابة)ەکەی وەك بەهەشت و ئەوی تریشیان وەك دۆزەخ دەبێت[1] و، لەش‌ولارێکی یەکجار گەورەشی هەیە کە هێندە و هێندە درێژە و.. گەلێ وەسفی تری وەك ئەمانەی هەیە کە بە هۆیانەوە دەناسرێتەوە.. جا ئایا مەبەست لەم ڕیوایەتانە چی‌یە؟

**وەڵام:**

کەسی ڕواڵەتیی دەجاڵ وەکو هەموو مرۆڤێکی تر وایە. بەڵام مرۆڤێکی فێڵبازە.. شەیتانێکی لەخۆباییە.. وەك فیرعەون لە سنووری خۆی لایداوە.. خوای گەورەی لەبیرچووەتەوە.. ناوی "خوایەتی"یشی لە فەرمانڕەوایەتی‌یە ڕواڵەتی‌یەکەی خۆی ناوە!

(١) عن ابي هريرة رضي الله عنه. ان رسول الله ﷺ قال: "ألا أحدثُكم عن الدجال، ما حَدَّثَ به نبيٌّ قومَه؟ انه أعور، وانه يجيء بمثال الجنة والنار. فالتي يقولُ إنها الجنة، هي النار. وإني أُنذِرُكُم به كما أنذرَ به نوحٌ قومَه" رواه البخاري في الأنبياء، ومسلم برقم ٢٩٣٦. (وەرگێڕ)

بەلام كەسێتی‌یە مەعنەوی‌یەكەی، كە بریتی‌یە لە تەوژمی توغیانی ئیلحاد، كەسێكی یەكجار گەورەو زل و زەبەلاحە. جا هەرچی ڕیوایەت لە وەصفی گەورەیی‌یەكەی‌دا هاتووە، ئاماژە بۆ ئەو كەسایەتی‌یە مەعنەوی‌یەی دەكات. هەروەك كاتی خۆی وێنەی سەركردەی گشتیی هێزەكانی ژاپۆن لە شێوەی مرۆڤێكدا كێشرابوو كە پێیەكی لەسەر زەریای ئارام و ئەوی تریشی لەسەر قەلای "بۆرت ئارسەر" دانابوو! كەچی ئەم شوێنە ماوەی دە ڕۆژ لە شوێنی یەكەمەوە دوورە. جا ئەم وێنەكێشانە بۆ ئەو سەركردە بچكۆلەیە، كەسایەتیی مەزنی سوپاكەی دەردەخات.

سەبارەت بە بەهەشتە درۆینەكەی دەجالیش، ئەوا بریتی‌یە لە مەلها و گەمە و گالتە بە ڕووكەش ڕازاوەو خەلەتێنەرەكانی شارستانێتیی ڕۆژگار.

ولاخ(دابة)ەكەشی هۆكارێكی گواستنەوەی وەك شەمەندەفەر وایە، لە سەرێكیەوە كوورەی ئاگری تێدایە و جار بە جار ئەوانەی تێ فڕێ دەدات كە شوێنی ناكەون.. گوێ‌كەی تری ئەو ولاخە (واتە سەرەكەی تری) بە چەندین ڕایەخی ڕەنگین و بە وێنەی بەهەشت ڕازاوەتەوە و بۆ دانیشتنی شوێنكەوتووانی خۆی ئامادەی كردووە.

لە ڕاستی‌دا شەمەندەفەر ولاخ(دابة)ێكی گرنگی شارستانێتیی هەرزە و ستەمكارە، چونكە بەهەشتێكی درۆینە بۆ كەسانی هەرزە و ئەهلی دنیا دەهێنێتە گۆڕێ، كەچی بەدەست شارستانێتیی ئێستاوە وەكو زەبانییەی دۆزەخی لێ هاتووە و، مردن و دیلی و زەلیلی بۆ ئاینداران و موسلمانە هەژارەكان لەگەل خۆی‌دا دەهێنێت.

هەرچەندەش لەو كاتەدا ئاینە ڕاستەكەی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - بەهۆی سەركەوتنی و بوونی بە ئیسلام، نوور و ڕووناكیی خۆی بەسەر زۆرینەی ڕەهای خەلكی‌دا بلاو دەكاتەوە، كەچی لە نزیكی بەرپابوونی قیامەتەوە - جارێكی تر - تەوژمێكی تری ئیلحاد سەرهەلدەدات و زال دەبێتەوە. ئەو كاتەش كەسێك - بە شێوەی زۆرینە - لەسەر زەوی‌دا نامێنێتەوە بلێت: (اللهُ.. اللهُ..). واتە كۆمەلێكی ئەوتۆ لە كایەدا نابێت كە جێ‌دەستیان دیار بێت و شوێنێكی گرنگی سەر زەوی‌یان ئاوەدان كردبێتەوە. دەنا فەرموودەكە ئەوە ناگەیەنێت كە هیچ كەسێكی ئەهلی ئیمان لەسەر ڕووی زەوی‌دا نامێنێت، بەلكو ئەهلی حەق لە بەرامبەر ئەهلی ئیلحادەوە بە كەمایەتی هەر دەمێننەوە، تا ڕۆژی قیامەت. بەلام پێش بەرپابوونی، خوای گەورە بەزەیی بە ئەهلی ئیماندا دێتەوە و گیانیان دەكێشێت، تاكو كارەساتە مەزن و سەختەكانی قیامەت نەبینن و قیامەت هەر بەسەر سەری كافرانەوە هەلبگیرسێت.

◆ **پوختەی پرسیاری پێنجەمتان:**

ئایا ڕۆحیانەتە باقی‌یەکان کارەساتەکانی قیامەت کاریان تێ‌دەکات؟

**وەڵام:**

بەڵێ، هەر یەکەیان و بە گوێرەی پلەی خۆی کاریان تێ‌دەکات، کتومت وەك (مەلائیکەتەکان) کە تەجەللیاتی قەهریی خوای گەورە کاریان تێ‌دەکات. چونکە گەر کەسێك لە شوێنێکی گەرموگوڕەوە سەیری کەسانێك بکات کە لەناو بەفر و سەهۆڵبەنداندا لەرزیان لێ هاتبێت، ئەو دیمەنە کاری تێ‌دەکات و بەهۆی ئەو ژیری و ویژدانەی کە خوا بەوی بەخشیوە، ئازار بۆ حاڵی ئەوان دەچێژێت.. هەر بەم شێوەیەش ئەو ڕۆحیانەتانەی کە نامرن و "باقی"ن و خاوەنی هەست و شعوورن و پەیوەندی‌یان بە گەردوونەوە هەیە، هەر یەکەیان بەپێی پلەی خۆی، کاریگەریی ڕووداوە مەزنەکانی گەردوونیان بەر دەکەوێت.

ئاماژەکانی قورئان دەری دەخەن کە ئەگەر ڕۆحیانەتەکان ئەهلی سزا و عەزاب بن، هەست بە ئازار دەکەن و.. گەر ئەهلی بەختەوەرییش بن، لە ڕێی ئیعجاب و پێ‌خۆشبوونەوە، تەنانەت بە جۆرە مژدە وەرگرتنێك هەست بە کاریگەریی ئەو بەختەوەری‌یەیان دەکەن.

جا مادەم قورئانی حەکیم لە شێوەی سەرزەنشت و هەڕەشەدا: ﴿لَتَرَوُنَّهَا﴾ کارەساتە مەزنەکانی قیامەت باس دەکات، لە کاتێکدا ئەوانەی کە بە لەشولارە مرۆڤانە و ماددی‌یەکانیان ئەو کارەساتانە دەبینن تەنها کەسانێکن کە دەکەونە دەمی هەڵگیرسانی قیامەتەوە، ئەوا دەبێ ئەو ڕۆحیانەتانەش کە جەستەکانیان لە گۆڕەکانیاندا پرتووکاوە و ڕزاوە، بەشی خۆیان لەم هەڕەشەیەی قورئان بەربکەوێت!

◆ **ناوەڕۆکی پرسیاری شەشەمتان:**

ئایا ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ اِلاّ وَجْهَهُ﴾(القصص:٨٨) ئەودنیا و بەهەشت و دۆزەخ و سەرنشینەکانیشیان دەگرێتەوە یان نا؟

**وەڵام:**

ئەم مەسەلەیە لە لایەن زانا لێکۆڵەرەکان و ئەهلی کەشف و ئەولیایانی پیاوچاکەوە گەلێ باس و لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. کەواتە قسەی پەسەند لەم مەسەلەیەدا هی ئەوانە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە خاوەنی فراوانی‌یەکی یەکجار مەزنە و گەلێ پلەی زۆریشی لەخۆ گرتووە. ئەوەتا بەشی هەرە زۆری لێکۆڵەران وتوویانە: ئەم

ئایەتە شموولی جیهانی "بەقا" ناکات. بەڵام کەسانێکی تر وتوویانە: ئەو جیهانەش تووشی جۆرە "فەنا"یەك دەبێت، بەڵام لە ماوەیەکی کەمی بە ئەندازەی چرکەیەك کە زەمانێکی هێندە کورتە هەست بە ڕۆشتنی بۆ فەنا و هاتنەوەی لەوێوە ناکرێت.

بەڵام ئەو بۆچوونەی هەندێ کەسی ئەهلی کەشف لەوانەی کە زیاد لە پێویست زیادەڕەوی لە بیرو بۆچوونەکانیاندا دەکەن و پێیان وایە: "فەنای موتڵەق" هەموو شتێك دەگرێتەوە، دارای هیچ ڕاستی و دروستییەك نییە. چونکە زاتی خوای گەورە هەمیشەیی و سەرمەدییە، کەواتە دەبێ سیفەت و ناوەکانیشی بە هەمان جۆر هەمیشەیی و سەرمەدی بن. خۆ مادەم سیفەت و ناوەکانی هەمیشەیی و سەرمەدین ئەوا دەبێ ئەهلی "بەقا" و ئەو شتانەش کە لە جیهانی بەقادا ماونەتەوە - کە ئاوێنە و درەوشانەوە و نەخش و نیگار و دەرخەری ئەو سیفەت و ناوانەن - ئەوانیش بە زەروورەت و بەداهەت و قەتعی، بمێننەوە و بەرەو فەنای موتڵەق نەدرێنەبەر.

هەر ئێستا دوو خاڵ لە ڕێژنەی قورئانی حەکیمەوە هاتنە دڵمەوە، وا بە کورتی دەیاننووسین:

*یەکەمیان*: توانستی خوای گەورە بێسنوورە. تەنانەت "وجوود" و "عەدەم" سەبارەت بە توانستی خواوەندەوە بە وێنەی دوو مەنزڵ وان کە ئەگەر ویستی لەسەری بێت لە ماوەی یەك ڕۆژدا تەنانەت لە ماوەی یەك چرکەدا بەوپەڕی ئاسانی شتانیان بۆ دەنێرێت یان شتیان لێوە دەهێنێت.

پاشان "نەبوونی ڕەها"(العدم المطلق) هەر وجوودی نییە، چونکە هیچ شتێك نییە لە دەرەوەی بازنەی زانستی خوای گەورەدا بێت تا شتێکی تێ فڕێ بدرێت! خۆ ئەو "عەدەم"ەش کە لە بازنەی زانستی خوای گەورەدا ناوی "عەدەم"ی لێ نراوە، مەبەست پێی عەدەمێکی دەرەکییە و پەردەیەکە بەسەر "وجوودی عیلمی"دا دادراوەتەوە و ناوێکە لەو وجوودە نراوە. تەنانەت هەندێ لە زانا لێکۆڵەرەکان ئەم وجوودە عیلمییەیان ناوناوە: (أعيانٌ ثابتة) واتە خاوەن بوونە چەسپاوە دامەزراوەکان. کەواتە ڕۆشتنی هەر شتێك بەرەو "فەنا" لە ڕاستیدا لەبەر داماڵینی کاتیی پۆشاکە دەرەکییەکانی ئەو شتەیە و ڕۆشتنیەتی بۆ ناو وجوودێکی مەعنەویی زانستی. واتە شتانی فانی و لەناوچوو "بوونی دەرەکی" لەبەر دادەماڵن و ماهییەتەکەیان "بوونێکی مەعنەوی" دەپۆشێت. یاخود لە بازنەی "توانست"ەوە دەڕۆنە دەرەوە و دەچنە ناو بازنەی "زانست"ەوە.

*حاڵی دووهەم:* لە زۆر (وتە)دا ڕوونمان کردووەتەوە کە:
هەموو شتێك بە "واتا ئیسمی‌یەکەی" و لەو ڕووەوە کە پێی دەڕوانێتە خۆی: فانی‌یە و لەناودەچێت و هەرگیز خاوەنی "بوون"ێکی سەربەخۆ و چەسپاوی تایبەت بە خۆی نی‌یە و، حەقیقەتێکی ئەوتۆشی نی‌یە کە هەر بۆ خۆی و لە لایەن خۆیەوە ڕاگیر بوو بێت..
بەڵام ئەو شتە لەو ڕوویەوە کە پێی دەڕوانێتە خوای گەورە، واتە گەر "واتای حەرفی"ی تێدا ڕەچاو کرابێت، ئەوا بە "فانی" دانانرێت، چونکە لەبەر ئەوەی چەند درەوشانەوەیەکی ئاشکرای ناوە "باقی"یەکانی خوای گەورەی تێدایە و سێبەری وجوودێکی سەرمەدیی لە خۆدا هەڵگرتووە، ئەوا گرفتاری "عەدەم" نابێت، هەروەك حەقیقەتێکی سابت و دامەزراویشی هەیە کە تابلێی بەرزە، چونکە سێبەرێکی نەجووڵ و دامەزراوی ناوێکی باقیی بەدەست هێناوە.
پاشان فەرموودەی خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ اِلاّ وَجْهَهُ﴾ شمشێرێکە بۆ ئەوەی دەستی مرۆڤ لەوە ببڕێت کە بۆ غەیری خوای گەورە درێژی بکات! چونکە ئەم ئایەتە پەیوەندی‌یەکانی مرۆڤ بە شتانی فانی‌یەوە لە دنیای فانی‌دا، کە لە پێناوی غەیری خوای گەورەدا بن، دەپچڕێنێت.
کەواتە حوکمی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووی لە شتانی فانیی دنیایە. بەو واتایەی کە: ئەگەر هەر شتێك لە پێناوی خوادا بێت، واتە بە "واتای حەرفی" بێت، هەرگیز بە غەیری خوا(ما سوى الله) دانانرێت هەتا بە شمشێری ئایەتی پیرۆزی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ اِلاّ وَجْهَهُ﴾ لە گەردنی بدرێت!

**پوختەی قسە:**

هەر شتێك گەر بۆ خوا بێت و خوای دۆزیبێتەوە، ئەوا سەبارەت بەو "غەیر" لە ئارادا نابێت تا سەری بقرتێنرێت. بەڵام گەر خوای نەدۆزیبێتەوە و لە پێناوی ئەودا نەیڕوانیبێت، ئەوا هەموو شتێك "غەیر"ە و دەبێ شمشێری: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هالِكٌ اِلاّ وَجْهَهُ﴾ی لێ هەڵبڕێت و ئەو پەردەیە بدڕێت، تاکو خوای گەورە بدۆزێتەوە.

الباقي هو الباقي
**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی شازدەهەم

بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿الذين قالَ لَهُمُ الناسُ إنَّ النّاسَ قد جَمَعُوا لكم فاخشَوْهُم فَزَادَهُم إيماناً وقالُوا حَسْبُنا اللهُ ونِعمَ الوَكيل﴾** (آل عمران:١٧٣)

**ئەم مەکتووبە نهێنییەکی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً﴾ی بەدەست هێناوە، بۆیە بە لەهجەیەکی توندوتیژ نەنووسرا. هەروەك وەڵامی پرسیارێکیشە کە زۆر کەس چ بە ڕاشکاوی و چ بە ناوەکی(ضمني) دەیکەن.**

(لە ڕاستیدا من هەرگیز حەز ناکەم و پێم خۆش نییە ئەم وەڵامە تۆمار بکەم، چونکە سەرجەمی کارەکانی خۆمم بە خوای گەورەی بەتوانا سپاردووە و پشتم تەنها بەو بەستووە. بەڵام ئەوان وازم لێ ناهێنن کە لەناو جیهانی خۆمدا بە حەوانەوە و بێدەنگی بژیم، بەڵکو ئاوڕم بۆ لای دنیا پێ دەدەنەوە. بۆیە ناچارم کە بە زمانی "سەعیدی کۆن" نەك "سەعیدی نوێ"، هەروەها بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی هاوڕێیانم و "وتەکان" ـ نەك خۆم ـ لەو ئازار و دوودڵی و گومانانەی کە ئەهلی دنیا بڵاویان دەکەنەوە، حەقیقەتی واقیعی حاڵی خۆم، لە پێنج خاڵدا، بخەمە پێش چاوی: برایانم و، ئەهلی دنیا و، بەرپرسانی حکومەت).

● **خاڵی یەکەم:**

**پێم دەوترێ:**

بۆچی لە مەیدانی "سیاسەت" کشاویتە دواوە و توخنی ناکەویت؟

**وەڵام:**

سەعیدی کۆن نزیکەی "دە"ساڵ ڕۆشتە ناو سیاسەتەوە بەو نیازەی کە لەو ڕێیەوە خزمەتی زانست و ئایین بکات، بەڵام هەموو هەوڵەکانی با بردنی و بێئەنجام دەرچوون، چونکە بۆی دەرکەوت کە ڕێیەکی گێچەڵاوی و گومان لێکراوە. هەروەك سەبارەت

بە منیشەوە خۆهەڵقورتاندنە لە شتانێكدا كە پەیوەندی‌یان پێمەوە نی‌یە، چونكە ڕێی ئەنجامدانی گرنگترین واجب و ئەركی سەرشانم لێ دەگرێت. هەروەك ڕێیەكی پڕ لە مەترسی‌یە و زۆربەشی درۆ و دەلەسە و فێڵ و تەڵەكەیە و، لەوانەیە مرۆڤ - بێ ئەوەی بە خۆیشی بزانێت - ببێت بە ئامراز بەدەستی بیانی‌یەكانەوە!

هەروەها ئەو كەسەی كە دەڕواتە ناو سیاسەتەوە: یان لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدایە، یان نەیاریەتی. جا ئەگەر من بەو سیفەتە بڕۆمە ناو ئەو بوارەوە كە لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدا بم، ئەوا ئەم كارە سەبارەت بە منەوە خۆهەڵقورتاندن و دەست تێوەردانە لە شتانێكدا كە پەیوەندی‌یان بە منەوە نی‌یە، چونكە من نە كارمەندی دەوڵەتم و نە ئەندامیشم لە پەرلەمانەكەیدا، دیارە تێوەگلاندنم بە سیاسەتەوە لە كاتێكی وادا هیچ جێگایەك ناگرێت، هەروەك ئەوانیش پێویستیان بە من نی‌یە تاكو خۆمی تێدا هەڵبقورتێنم..

خۆ ئەگەر بشڕۆمە ناو ئەو سیاسەتەوە كە هی نەیارانی دەوڵەتە، ئەوا دەبێ یان لە ڕێی "هزر و بیر" یان لە ڕێی "هێز"ەوە بڕۆمە ناوی. جا ئەگەر لە ڕێی "بیر"ەوە بڕۆم، ئەوا هیچ پێویستی‌یەك بە من لە گۆڕێدا نی‌یە، چونكە هەموو شتێك ڕوون و ئاشكرایە و خەڵكی هەموو شتێك دەزانن و ئاگادارن، كەواتە پێویست بە قسەی زیاد ناكات. ئەگەر لە ڕێی "هێز"یشەوە خۆم بكەم بەناو سیاسەتدا، واتە لە ڕێی نانەوەی گێچەڵ و گیروگرفتەوە و لە پێناوی چەند ئامانجێكی گومان لێكراودا بڕۆمە ئەو بوارە، ئەوا لەوانەیە بكەومە ناو هەزاران تاوان و گوناهەوە، چونكە ئەو كاتە گەلێ كەسی "بێ تاوان" بە تاوانی یەك كەسەوە تێوە دەتلێن، منیش ویژدانم ڕێم پێ نادات كە لەبەر یەكدوو گریمان لە نێوان دە گریماندا، خۆم بخەمە ناو گوناهەوە و كەسانی بێ تاوانیشی پێوە بگلێنم.

لەبەر هەموو ئەمانە، "سەعیدی كۆن" هاودەم لەگەڵ وازهێنانی لە جگەرە، وازیشی لە سیاسەت و كۆڕە دنیایی‌یەكانی و، تەنانەت لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەش هێنا!

شایەتی ڕاست و بێ گومانیش لەسەر ئەمە، بریتی‌یە لەوەی كە: من وا ماوەی هەشت ساڵە تەنها یەك دانە ڕۆژنامەشم نەخوێندووەتەوە و گوێبیستی كەسیش نەبووم بۆم بخوێنێتەوە. دەسا كێ دەتوانێت بیچەسپێنێت كە من لەم ماوەیەدا یەك ڕۆژنامەم خوێندبێتەوە یان گوێم لێ گرتبێت. لە كاتێكدا كە سەعیدی كۆن هەشت ساڵ پێش ئێستا هەرچی ڕۆژە نزیكەی هەشت ڕۆژنامەی دەخوێندەوە!

پاشان وا پێنج ساڵە بە وردی چاودێریی هەڵسوكەوت و باروودۆخی ژیانم دەكرێت، دەبا كێ دەتوانێت بێتە پێشەوە و بیچەسپێنێت كە شتێكم لێوە بینرابێت بۆنی سیاسەتی لێ بێت. دەبێ ئەوەش بزانرێت: یەكێكی وەك من كە خاوەنی سروشتێكی تووڕە بێت و هیچ پەیوەندییەكی بە كەسەوە نەبێت و گەورەترین فێڵ بەلایەوە بریتی بێت لە وازهێنان لە فڕوفێڵ، بەپێی دەستووری: "إنما الحيلة في ترك الحيل".. كەسێك ئەمە حاڵی بێت، نەك بۆ ماوەی هەشت ساڵ، بەڵكو ناتوانێت بۆ ماوەی هەشت ڕۆژیش "بیر"ی خۆی لە خەڵكی بشارێتەوە! چونكە كەسێكی ئاوا گەر حەز و ئارەزووی لە سیاسەت ببوایە، ئەوا كارەكەی وەك زرمەی تۆپ دەنگی دەدایەوە، نەك ئەوەندە پەنهان و پەنامەكی بێت كە پێویست بە پشكنین و لێكۆڵینەوە بكات!

● خاڵی دووهەم:

بۆچی "سەعیدی نوێ" زۆر بە توندی و تا ئەم ڕادەیە دوورەپەرێزی لە سیاسەت دەكات؟

**وەڵام:**

بۆ ئەوەی لە ئەنجامی خۆهەڵقورتاندنی لە ژیانێكی دنیایی گومان لێكراودا - كە یەك دوو ساڵ بڕ دەكات - ئەو هەوڵەی خۆی بەزایە نەدات كە بۆ بەدەستهێنانی ژیانێكی هەمیشەیی ملیارەها ساڵی دەیدات! پاشان لە پێناوی خزمەتكردنی ئیمان و قورئاندایە كە ئاوا بە توندوتیژی لە سیاسەت هەڵدێت، لەبەر ئەوەی ئەم خزمەتە لە هەموو خزمەتێك مەزنتر و پێویستتر و خاوێنتر و حەقترە، چونكە سەعیدی نوێ دەڵێت:

من هەتا بێت زیاتر پیر دەبم و نایشزانم كە دوای ئەم تەمەنەی ئێستام چەندەی تر دەژیم.. كەواتە سەبارەت بە منەوە باشتر وایە هەوڵ بۆ ژیانێكی هەمیشەیی بدەم كە لە هەموو شتێكی تر پێویستترە.

جا لەبەر ئەوەی ئیمان هۆی بەدەستهێنانی ژیانی هەتاهەتاییە و كلیلی بەختەوەریی هەمیشەییە، ئەوا پێویستە مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات. بەڵام خۆ من زانایەكی ئایینیم و بەپێی فەرمانی شەرع دەبێ سوود بە خەڵكی بگەیەنم، بۆیە دەمەوێ لەم بوارەشدا خزمەتیان بكەم، كەچی سوودەكانی ئەم خزمەتە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی كۆمەڵایەتی و دنیایی كە من دەستەڵاتم بەسەریدا ناشكێ، ئەمە چ جای ئەوەی كە زۆر دژوار و دەگمەنە لە ڕۆژگارێكی ئاوا سەخت و گێژەڵووكاویدا مرۆڤ بتوانێت كردەوەیەكی ڕاست و دروست ئەنجام بدات. بۆیە وازم لەم لایەنەش هێنا و، خزمەتكردنی ئیمانم هەڵبژارد و پێم

باشتر بوو، کە گرنگترین و پێویستترین و دروستترین خزمەتگوزارییە. ئنجا دەرگای ئەم خزمەتەشم خستە سەرپشت تاکو ئەو ڕاستییانەی ئیمان کە دەستی خۆمم خستن و ئەو چارەسەری و دەرمانە مەعنەوییانەش کە لە خۆمدا تاقیم کردنەوە، بە دەستی کەسانی تریش بگات، بەشکو خوای گەورە ئەم خزمەتەمان لێ قبوول بکات و بیکات بە کەفارەتی گوناهەکانی پێشوومان.

خۆ جگە لە شەیتان هیچ کەسێك – نە ئیماندار و نە کافر، نە دۆست و نە زەندیق – بۆی نییە ڕەخنە و پەلپ و بیانوو لەم خزمەتە بگرێت، چونکە هیچ شتێکی تر نییە بە وێنەی بێئیمانی بێت، لەوانەیە چێژ و لەزەتێکی شەیتانیی چەپەڵ لە ستەمکاری و فاسقی و گوناهی گەورەدا هەبێت، بەڵام هەرگیز هیچ چێژ و لەزەتێك لە بێئیمانیدا نییە! بەڵکو سەرتاپا ئازار و سزا و تاریکیی یەك لەناو یەکە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە: وازهێنان لە کار و کۆشش بۆ ژیانێکی هەمیشەیی و دەست هەڵگرتن لە کارکردن بۆ نووری موقەددەسی ئیمان و ڕۆشتنە ناو یاریی پڕ لە مەترسی و ناپێویستی سیاسەتەوە لە تەمەنی پیریدا، کارێکی پێچەوانەی ژیری و حیکمەتە بۆ کەسێکی وەك من کە هیچ پەیوەندییەکی بە کەسەوە نییە و بە تەنیایی دەژی و ناچارە بە دوای کەفارەتی گوناهەکانی پێشوویدا بگەڕێت.. تەنانەت ڕەفتاری ئاوا شێتی و گێلییەکی ئەوتۆیە کە کەسانی گێژ و گەلحۆش لەمە تێدەگەن.

**خۆ ئەگەر دەشڵێیت:** خزمەتی ئیمان و قورئان چۆن ڕێی سیاسەتت لێ دەگرێت؟

**دەڵێم:**

حەقیقەتەکانی ئیمان و قورئان، بە وێنەی گەوهەرەکانی ئەڵماس بەنرخ و گرانبەهان. جا ئەگەر من خۆم بە سیاسەتەوە خەریك بکردایە، کەسانی عەوام ئەم پرسیارەیان بە خەیاڵدا دەهات کە: ئایا ئەمە دەیەوێت بەرەو لایەنێکی سیاسی ڕامان بکێشێت؟ ئایا بڵێی ئەو شتەی کە بانگەشەی بۆ دەکات پڕوپاگەندەیەکی سیاسی نەبێت بۆ ڕاکێشانی خەڵکی و کۆکردنەوەی شوێنکەوتووان بۆ خۆی؟ واتە ئەو کاتە وەك شووشە وردەی بێ نرخ دەیانڕوانییە گەوهەر و ئەڵماسە بەنرخەکان. دیارە ئەو کاتە منیش بەو تێکەڵ بوونەم لەگەڵ سیاسەتدا ستەمێکی گەلێ مەزنم لەو حەقیقەتە بەنرخانە و بەها و بایەخیان دەکرد.

دەسا ئەی ئەهلی دنیا! بۆچی وازم لێ ناهێنن و بە هەموو شێوەیەك تەنگم پێ هەڵدەچنن؟

**ئەگەر دەشڵێن:**

هەندێ جار شێخانی تەریقەتە سۆفی‌یەکان دەست لە کاروبارمان وەردەدەن و، تۆش جاری وا هەیە پێت دەڵێن: "شێخ"!

**دەڵێم:**

بەڕێزان! من شێخی تەریقەت نیم، بەڵکو زانای ئایینیم! بەڵگەش لەسەر ئەمە وا چوار ساڵم لێرەدا بردووەتە سەر، گەر لەم ماوەیەدا یەکێکم فێری تەریقەت کردبێت، ئەوا مافی ئەوەتان دەبێت کە بتانخاتە گومانەوە. من لەم ماوەیەدا هەرکەسێك هاتبێت بۆ لام پێم وتووە: ئەم زەمانە کات و زەمانی تەریقەت نی‌یە.. ئیمان و ئیسلام پێویستە.

**گەر دەشڵێن:** تۆ پێت دەوترێت: "سەعیدی کوردی".. لەوانەیە بیرێکی دەمارپەرستیت لە خۆتدا هەڵگرتبێت و بانگەشەی بۆ بکەیت. خۆ ئەمەش لەگەڵ ئێمەدا ناگونجێ و بواری کاری وا نادەین؟

**دەڵێم:**

بەڕێزان! نووسینەکانی سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێتان لە بەردەستدایە و دەیانکەم بە شایەت لەسەر ئەوەی کە لە بۆچوونەکەتاندا نەتانپێکاوە. چونکە من بەپێی ئەو فەرمانە نەبەوی‌یە توندوتیژەی کە دەفەرموێ: "ئیسلام دەمارگیریی جاهیلییەت دەقرتێنێت" هەر لە مێژە وەك ژەهری کوشندە ڕوانیومەتە قەومییەتی سەلبی و دەمارپەرستی، چونکە نەخۆشی‌یەکی چەپەڵ و پەرەسێنی ئەوروپایی‌یە و، ئەورووپا بۆیە ئەو نەخۆشی‌یەی خستووەتە ناو موسڵمانان تاکو لەت لەت و پارچە پارچەیان بکات و ئنجا بە ئاسانی بتوانێت یەك لە دوای یەك قووتیان بدات. چەندەشم لە توانادا بووە هەوڵم بۆ چارەسەرکردنی ئەم دەردە چەپەڵە داوە، چ قوتابی‌یانم و چ ئەوانەش کە پەیوەندی‌یان پێمەوە هەیە، شایەتن لەسەر ئەمە.

جا مادەم حەقیقەت وایە، ئیتر بۆچی ئەی بەڕێزان! هەر ڕووداوێك ڕوو بدات، دەقۆزرێتەوە و دەکرێت بە بیانوو بۆ ئازاردانم و تەنگ پێ هەڵچنینم؟ کە ئەمەش وەك ئەوە وایە لەبەر تاوانی سەربازێك لە خۆرهەڵاتدا سەربازێکی تر لە خۆرئاوا سزا بدرێت، گوایا لەبەر ئەوەی هەردووکیان سەربازن! یان لە بەغدا دوکاندارێك دەستگیر بکرێت لەسەر تاوانی دوکاندارێك لە ئەستەمبووڵ، گوایا لەبەر ئەوەی کە هەردووکیان دوکاندارن! ئێوە لە هەموو ڕووداوێکی دنیایی‌دا ئەمە پیشەتانە، دەچن دەیکەن بە بیانوو بۆ تەنگ پێ هەڵچنینم. ئایا چ ویژدانێك ئەم بڕیارە دەدات و چ بەرژەوەندی‌یەکی تێدایە؟

● خاڵی سێهەم:

ئـەو هـاوڕێ و خۆشەویسـتانەم کـە سـەرنجی هەڵسـو کەوت و حەوانـەوەم دەدەن، سـەریان لە بێدەنگی و ئارامگرتنی من سووڕماوە سەبارەت بەو گیروگرفتانەی کـە دێنـە ڕێم و، دەپرسن:

تۆ زووتر مرۆڤێکی گەلێ تووڕە بوویـت و بـواری ئـەوەت نـەدەدا کـە هیـچ کەسـێك دەست بۆ عیززەتت ببات و کەمترین سووکایەتیت قبووڵ نەدەکرد.. ئەدی چۆن وا ئێستا دەتوانیت ئەو هەموو گیروگرفتانە هەڵبگریت کە دەهێنرێنە ڕێت؟

وەڵام:

گـوێ لـەم دوو بەسـەرهات و ڕووداوە ڕابگـرن و، وەڵامـی پرسـیارەکەتانی لـێ دەربهێنن:

❑ ڕووداوی یەکەم:

دوو ساڵ پێش ئێستا بەڕێوەبەرێکی بەرپرس - بێ هیـچ هۆیـەك - لـە پاشملـە چـەند قسەیەکی دەمهەڵبەستی کردبوو کە ئیهانەکردنی منی تێدا بـوو، پاشـان ئـەو قسـانەیان بـۆ گێڕامەوە. نزیکەی سەعاتێك، بە هەست و شعووری سەعیدی کۆن، خەمم پێ خـوارد. پاشان بە میهرەبانیی خوای گەورە حەقیقەتێکی وەك ئەمەی خـوارەوەم بـە دڵـدا هـات و، ئەو دڵتەنگی‌یەی نەهێشتم و، هانی‌دام لەو (کەسە) خۆش ببم.

حەقیقەتەکەش ئەمەی خوارەوەیە:

بە خۆمم وت:

ئەگـەر ئـەو ئیهانـە و سـووکایەتی و باسـکردنی قسـوور و کەموکووڕی‌یانـەی مـن ڕاستەوخۆ تایبەت بن بـە مـن و نەفسـی خۆمـەوە، ئـەوا خـوا لێـی ڕازی بێـت، چونکـە لـە عەیبەکانی خۆم ئاگاداری کردووم.

جـا ئەگـەر ئـەو مرۆڤـە ڕاسـتی کردبێـت، ئـەوا ڕەخنەکـەی ئـەو هـانم دەدات "نەفسـی ئەممارەم" پاکژ و تەمێ بکەم، کەواتە ئەو یارمەتیم دەدات تاکو لە غروور ڕزگارم ببێت..

ئەگەر درۆیشی کردبێـت، هـەر باشـە. چونکـە یارمـەتیم دەدات خـۆم لـە ڕیاکـاری و ناوبانگی درۆینە - کە بناغەی ڕیاکاری‌یە - دەرباز بکەم!

بـەڵێ، هیـچ کاتـێ لەگـەڵ نەفسـی خۆمـدا نەسـوڵحاوم، چونکـە پێـم نەگـەیاندووە و پەروەردەم نەکردووە! جا ئەگەر کەسێك ئاگـادارم بکاتـەوە لـەوەی کـە دووپشـکێك لـە شوێنێکی جەستەمدا هەیە، دەبێ پێم خۆش بێت و سوپاسی بکەم، نەك لێی زویر ببم.

خۆ ئەگەر ئەو ئیهانە کردنەی لەو ڕووەوە بێت کە من خزمەتگوزاری ئیمان و قورئانم، ئەوا پەیوەندیی بە منەوە نییە و، من (ئەو کەسە) حەوالەی خاوەنی قورئان دەکەم کە منی لە خزمەتگوزاریی قورئانەکەیدا خستووەتەکار، چونکە خاوەنی قورئان دانایە و دارای عیززەتە.

ئەگەر قسەکانی جۆرە سووکی و ئیهانەکردنێکیش بێت کە ڕاستەوخۆ ڕووی لە خۆم بێ و بۆ ئەوە بێت لە نرخ و بایەخی من کەم بکاتەوە، ئەمەش هەر تایبەت نییە بە منەوە، چونکە من مرۆڤێکی دیل و دەست بەستراوم و لەم شارەدا نامۆ و غەریبم و، ناتوانم بەرگری لە کەرامەتی خۆم بکەم، کەواتە ئەم بەرگرییە لە ئەستۆی ئەو کەسەدایە کە حوکمی ئەم گوندە، پاشان ئەم قەزایە، پاشان ئەم پارێزگایە دەکات کە من لە لایان میوانم. چونکە ئیهانەکردنی دیلێك ئیهانەیە بۆ ئەو کەسەی کە ئەوی لە ژێردەستدا دیلە. کەواتە ئەو بەرگرییە لە ئەستۆی ئەودایە.

دڵم، بەم ڕاستییە، دڵنیا بوو. منیش ئەم ئایەتە پیرۆزەم خوێندەوە کە دەفەرموێ:

﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللهِ إِنَّ اللهَ بَصِيرٌ بِالعِبادِ﴾ (غافر:٤٤).

ئیتر بە تەواوی ئەو ڕووداوەم پشتگوێ خست و وام دانا کە هەر ڕووی نەداوە و، بەم پێیە لە بیرم چووەوە.

بەڵام دوایی دەرکەوت کە - بە داخەوە - قورئانی پیرۆز مۆڵەتی نەدا و تۆڵەی لێ سەندەوە!

❑ ڕووداوی دووهەم:

ئەم ساڵ بیستم کە ڕووداوێك ڕووی داوە و دوای ڕوودانەکەشی و تەنها بە پوختی بەرگوێم کەوت، کەچی بە شێوەیەك مامەڵەم لەگەڵدا کرا کە وەك بڵێی پەیوەندیم پێوەی بووبێت! لە کاتێکدا کە من نامە لەگەڵ کەسدا ناگۆڕمەوە مەگەر بە دەگمەن نامەیەك بۆ برادەرێك لە بابەت و مەسەلەیەکی ئیمانیدا بنووسم، تەنانەت لە ماوەی چوار ساڵدا تەنها یەك نامەم بۆ براکەم ناردووە. واتە من خۆم لە تێکەڵی و پەیوەندی بوونەوە بە خەڵکی دەپاراست، چ جای ئەوەی کە ئەهلی دنیاش ڕێی ئەوەیان لێ دەگرتم و، لە ماوەی حەفتەیەکدا مەگەر یەك دوانێکم لە خۆشەویستانم یان لەو میوانانە چاو پێ بکەوتایە کە دەهاتنە ناو ئاواییەکەوە، کە ئەوانەش تاق و تەران و لە یەك دوانێك تێپەڕ ناکەن و، لە ماوەی یەك مانگدا تەنها بۆ یەك دوو دەقیقە و لە مەسەلەیەکی قیامەتیدا چاومان بە یەکتر دەکەوت..

من هەر بەم غەریبیی‌یەوە گیرۆدە بووبووم و تێكەڵاویی خەڵكی و تەنانەت هی هەموو شتێكی تریشم لێ قەدەغە كرا بوو، بگرە بە تەنیایی و غەریبی و بێ كەسی لە گوندێكدا مامەوە كە ئیش و كارێكی ئەوتۆی تێدا نی‌یە بۆ دەستكەوتنی خەرجی و مەسرەفی من دەست بدات. تەنانەت مزگەوتێكی رووخاویشم تێدا تەعمیر و ئاوەدان كردەوە و بۆ ماوەی چوار ساڵ پێشنوێژیم تێدا كرد (هیوادارم خوای گەورە قبووڵی بكات) چونكە لە شارەكەی خۆم بڕوانامەی "پێشنوێژ و ئامۆژگار"م وەرگرتووە. كەچی لەگەڵ ئەمەشدا مانگی ڕەمەزانی ڕابوردوو نەمتوانی بڕۆم بۆ مزگەوت و بە تەنیایی نوێژەكانم كرد و خێر و پاداشتی بیست و پێنج قاتەی نوێژی جەماعەتم لەكیس چوو.

جا لە بەرامبەر ئەم دوو ڕووداوەی كە هاتنە ڕێم، ئارامی و خۆڕاگری‌یەكی ئەوتۆم دەرخست كە لە ئارامی و خۆڕاگری‌یەكەی دوو ساڵ پێش ئێستام دەچوو لە بەرامبەر مامەڵەی ئەو بەرپرسەوە. پشت بەخوا لەمەولاش هەر لەسەر ئەم سەبر و ئارامە بەردەوام دەبم.

ئەو شتەی كە دێت بە خەیاڵمدا و دەمەوێت بیڵێم، بریتی‌یە لەوەی كە:

هەر سەختی و گیروگرفتێك ئەهلی دنیا دەیهێننە ڕێم و هەر تەنگ پێ هەڵچنین و ئازارێكیش كە منی پێوە گیرۆدە دەكەن، گەر لە بەرامبەر نەفسی تەقسیربار و خڵتانی گوناهمەوە بێت، ئەوا من لێیان خۆش دەبم، بەشكو نەفسم بەم ئازاردانەی ئەوان خۆی ڕاست بكاتەوە و بیكات بە كەفارەتی گوناهەكانی. خۆ ئەگەر من لەم میوانخانەیەی دنیادا گیرۆدەی ئازار بوویێتم، ئەوا شوكری خوای خۆم دەكەم، چونكە خۆشی و لەزەتەكانیشیم بینیوە.

بەڵام گەر ئەهلی دنیا لەبەر خزمەتگوزاری‌یەكانم بۆ ئیمان و قورئان ئازارم بدەن، ئەوا بەرگری كردن لە خۆم لە ئەستۆی مندا نی‌یە، بەڵكو حەواڵەی خواوەندی عەزیزی جەبباری دەكەم.

خۆ ئەگەر مەبەستیش لە دروستكردنی ئەو گیروگرفتانە ڕێ گرتن بێت لەخەڵكی تاكو ڕووم تێ نەكەن، واتە كەمكردنەوەی ئەو ناوبانگە درۆینەیە بێت كە هیچ بناغەیەكی نی‌یە، تەنانەت هۆی ڕیاكاری و لەناودانی ئیخلاسیشە، ئەوا ڕەحمەتی خوایان لێ بێت، چونكە لەو باوەڕەدام كە بەدەستهێنانی ناوبانگ و ڕوو تێكردنی خەڵكی سەبارەت بەكەسانی وەك منەوە زیانبەخشە. ئەوانەی پەیوەندی‌یان پێمەوە هەیە بە باشی دەمناسن.

من هیچ ڕێز و ئیحتیرامێك بۆ خۆم قبووڵ ناكەم، بەڵكو لە دەستیشی هەڵدێم، تەنانەت پەنجا جار زیاتر بەگژی دۆستێكی ئازیزمدا چوومەوە لەبەر ئەوەی گەلێ ڕێزی لێ دەگرتم!

بەڵام گەر سووكایەتی پێ كردنم و شكاندنی شان و شكۆم لە پێش‌چاوی خەڵكیدا لەبەر ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان و قورئان بێت كە ڕایان دەگەیەنم، ئەوا بە بێ‌هوودە خۆیان ماندوو دەكەن! چونكە ئەستێرەكانی قورئان بە هیچ پەردەیەك داناپۆشرێن. خۆ هەركەسێكیش چاوی خۆی لە ئاستیاندا بنووقێنێت، ئەوا تەنها ڕۆژگاری خۆی - نەك هی كەسی تر - دەكات بە شەوی تاریك.

● **خاڵی چوارەم:**

وەڵامی چەند پرسیارێكی گومان بزوێنەرە:

❖ **یەكەم پرسیاری گومان بزوێنەر:**

ئەهلی دنیا دەپرسن و پێم دەڵێن:

بە چی دەژییت؟ چۆن بە بێ كار و كەسابەت گوزەرانت بۆ هەڵدەسووڕێت؟ ئێمە لە وڵاتەكەماندا جێی ئەو تەمبەڵانە ناكەینەوە كە پاڵیان لێ داوەتەوە و لەسەر حسابی ڕەنج و كۆششی كەسانی تر دەژین؟!

**وەڵام:**

من بە "دەست‌پێوە گرتن" و "بەرەكەت" دەژیم و، جگە لە خوای ڕۆزیدەرم منەتی هیچ كەسێك هەڵناگرم و، بڕیاریشم داوە لە درێژایی ژیانمدا منەتی كەس هەڵنەگرم.

بەڵێ، ئەو كەسەی كە بە سەد "پارە" بەڵكو بە چل پارە[1] بژی، هەرگیز نایەوێت خۆی بخاتە ژێر منەتی كەسانی ترەوە!

هیچ كاتێك حەزم لە دەرخستنی ئەم مەسەلەیە نەكردووە و ئارەزوومەندی لێدوانی نەبووم، نەبادا وا هەست بكرێت كە لە خۆم بایی بوویێتم و دارای خۆپەرستی بم. چونكە زۆرم پێ ناخۆشە بیدركێنم و لەسەر "دڵ"م گەلێ قورسە باسی بكەم. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەهلی دنیا گومان و دوودڵی لە دەروونیاندا دروست دەبێت كاتێ ئەم پرسیارەم ئاراستە دەكەن، ئەوا ناچارم كە بڵێم:

---

(١) چل "پارە" دەكاتە یەك "قورش" دە قورشیش دەكاتە یەك لیرەی توركی! (وەرگێڕ)

– دەستووری سەرانسەری ژیانم بریتی‌یە لە: وەرنەگرتنی هیچ شتێك لـە کەسـانی تر، هەر لە منالیمەوە هیچ شتێکم لە خەڵکی – تەنانەت زەکاتی مالیشیان – وەرنەگرتووە.

پاشان مووچەوەرنـەگرتن و دەسـتنانم بـە رووی مـانگانەی حکومەتـەوە، جگـە لەوەی کە دەوڵەت بۆ ماوەی دوو ساڵ بۆی بڕیبوومەوە و هاوڕێیانم گەلێ رووی‌یان لـێ نام بۆ وەرگرتنی، کاتێ ئەندامی "دار الحكمة الاسـلامية" بووم.. هـەروەها ملنـەدانم بۆ هەڵگرتنی منەتی کەسانی تر لە هیچ پێداویستی‌یەکی ژیان و گوزەرانمدا..

هەموو ئەمانە، ئەو دەستوورەی ژیانم روون دەکەنـەوە. خـەڵکی شـارەکەم و ئەوانـەش کە لە شارەکانی تردا لە نزیکەوە دەمناسن، بە باشی ئاگاداری ئەم لایەنەی ژیانمن.

لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی رەهەندەییمدا زۆر کەس لە هاوڕێیـان بـە چـەندین هـەوڵی جۆراوجۆر ویستیان دیاری‌یەکانیان لـێ وەربگـرم، بـەڵام دەسـتم بـە رووی گشـت هەوڵەکانیانەوە نا.

جا ئەگەر لێرەدا پرسیار بکرێت و بوترێ: کەواتە بەچی دەژییت؟

دەڵێـم: بـە "بەرەکـەت" و "رێزلێنـانی خوایی" دەژیـم! چونکـە هەرچـەندە دەروونـی بـەدخوازم شـایانی هـەموو سـووکایەتی و نزمایەتی‌یەکـە، کـەچی لـە مەسـەلەی "رۆزی‌دان"دا هەمیشە بەرەکەتم دەستگیر دەبێـت، کـە رێزلێنـانێکی خوایی‌یـە و، وەك کەرامەتێکی خزمەتگوزاریی قورئانی پیرۆز بە خزمەتگوزارەکە دەبەخشرێت.

جا بۆ ئەوەی شوکرانەبژێریی مەعنەوی بەرامبەر بەو نیعمەتانەی خواوەند دەربـبڕم کـە بەهۆیانەوە رێزی لـێ ناوم و.. بۆ مەبەستی جێبەجێ کردنی ئایەتی: ﴿**وأمّا بنعمةِ ربّـك فَحَدِّثْ**﴾ (الضحـى:١١) وا چەند نموونەیەك لـەو بەرەکـەت و رێزلێنانـە خوایی‌یانـە بـاس دەکەم، هەرچـەندەش دەترسـم ئـەم شوکرانە مەعنەوی‌یە شتێکی لـە "ریـا" و "غـروور" تێکەڵ ببێت و ئەو بەرەکەتە خاوێن و پەروەردگاری‌یانە پووچەڵ بکاتـەوە و بیانسـڕێتەوە. چونکە دەرخستنی بەرەکەتی شاراوە بە شێوەیەك شانازی پێوەکـردن بگەیـەنێت، دەبێـت بەهۆی بڕین و نەمانی! بەڵام چی بکەم؟ ناچارم باسی بکەم:

یەکەم: ئەم شەش مانگەی ڕابوردوو، سـی و شـەش کولـێرە سـەروزیادم بـوون کـە لـە یەك "کیلە **Kile**"[1] گەنم دروست کرابوون. تا ئێستاش لەو نانە ماوە و نازانم کەی تەواو دەبێت؟[2]

(١) کیلە **Kile**: یەکەیـەکی پێوانەی گـەنمە و یەکسـانە بە (چل لیتر گەنم). (وەرگێڕ)
(٢) یەك ساڵی رەبەقی خایاند. (دانەر)

*دووهەمیان*: لەم مانگە پیرۆزەی ڕەمەزاندا، تەنها لە دووماڵەوە خواردنم بۆ هات. کەچی هەردووکیان نەخۆشیان خستم! لەمەوە تێگەیشتم کە خواردەمەنیی کەسانی تر لە من قەدەغەیە! ئنجا یەك "ئۆقیە"[1] برنج و سێ دانە کولێرە بەشی ڕۆژەکانی تری ڕەمەزانی کردم. هاوڕێی ڕاستگۆ: "عەبدوڵلا چاوش"ی[2] خاوەنی ئەو ماڵە موبارەکەی کە خواردنم تێدا بۆ ئامادە دەکەن، شایەتی لەسەر ئەمە دەدات. تەنانەت برنجەکە تا پازدە ڕۆژی دوای ڕەمەزانیش بەشی کردم!

*سێهەمیان*: خۆم و میوانە بەڕێزەکانم ماوەی سێ مانگی ڕەبەق لەسەر چیاکە یەك ئۆقیە "کەرە" بەشی کردین، هەرچەندەش ڕۆژانە بە نانەوە لێمان دەخوارد! تا جارێکیان میوانێکی موبارەکم لەلا بوو کە ناوی "سولەیمان"ە، لەو دەمەشدا نانەکەمان لەوەدابوو تەواو ببێت و ڕۆژیش چوارشەممە بوو..

پێم‌وت: برۆ بۆ ئاوایی نان بهێنە، چونکە ماوەی دوو سەعات ڕێ لەم لا و لەو لاماندا کەسی لێ نییە نانی لێ بکڕین.

وتی: دەمەوێ ئەم شەوی جومعە پیرۆزەی داهاتوو لەم سەر چیایە لەگەڵتدا بمێنمەوە، تاکو لە پاڕانەوە و نزاکانتدا هاوبەش و هاوڕازت بم.

وتم: کەواتە باشە، پشت بەخوا بمێنەرەوە.

پاشان پێکەوە بۆ سەر لووتکەی چیاکە سەرکەوتین، هەرچەندەش هیچ داخوازی و پێویستی‌یەك نەبوو بۆ سەرکەوتنمان. لەگەڵ خۆشماندا هەندێك ئاومان لەگەڵ کەمێك شەکر و چادا برد.

پێم وت: برام! چایەکمان بۆ لێبنێ.

ئەویش دەستی بە لێنانی چا کرد و، منیش لە ژێر درەختێکی قەتراندا دانیشتم و بە تێڕامانەوە سەیری شیوێکی قووڵم دەکرد و بە خەمەوە بیرم دەکردەوە و، لەبەرخۆمەوە بە خۆمم دەوت: لەتە نانێکی کەڕواویی کۆن نەبێ هیچی ترمان لە لا نییە و لەوانەشە هەر

(۱) یەك ئۆقیە یەکسانە بە: ۲۱۸۲ گرام. (وەرگێڕ)

(۲) "عەبدوڵلا چاوش" یەکەم پۆستەچیی نوورە، ڕەشنووسی پەیامەکانی نووری لە مامۆستا نوورسی وەردەگرت و دوور لە چاودێریی کاربەدەستان بە درێژایی شەو لەناو دۆڵ و چیاکاندا لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەڕۆیشت تاکو بە دەستی شەهید "حافظ عەلی"ی دەگەیاندن. پاشان پاکنووسەکانی لێ وەردەگرتن و بە هەمان شێوە و لە هەمان ڕێگاوە دەیگەیاندنەوە دەستی مامۆستا نوورسی! ساڵی ۱۹٦۰ز لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵی‌دا کۆچی دوایی کرد، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

تەنها بەشی ئەم ئێوارەیەی هەردوو کمان بکات. ئەی ئایا بۆ دوو ڕۆژەکەی تر چی بکەم؟ چی بەم پیاوە دڵپاك و دەروون خاوێنە بڵێم؟!

لەم کاتەدا کە من نوقمی ئەم ئەندێشەیە بووبووم، وەك بڵێی سەرم بۆلای درەختەکە وەربچەرخێنرێت ئاوا هەستم دەکرد. منیش کە ئاوڕم بۆ لای درەختەکە دایەوە، کولێرەیەکی گەورەم لە ناو لق و پەلەکانی درەختە قەترانەکەدا بینی کە بۆ ئێمەی دەڕوانی! یەکسەر وتم:

سولەیمان! مژدە بێ، وا خوای گەورە ڕۆزییەکی پێ بەخشیین!

پاشان نانەکەمان لەسەر درەختەکە داگرت و بە جوانی پشکنیمان تاکو بزانین ئایا شوێنەواری ئاژەڵ و باڵندەی لەسەر هەیە؟ کە سەرنجمان دا هیچ شوێنەوارێکی ئاژەڵمان پێوە نەبینی. سەرەڕای ئەوەش کە ماوەی سی ڕۆژ دەبوو هیچ کەسێك بەو چیایەدا سەرنەکەوتبوو. ئیتر ئەو کولێرەیە بەشی دوو ڕۆژی کردین. ئنجا هەر کە نانەکەمان لەوەدا بوو تەواو ببێت، ئەو مرۆڤە ڕاستگۆیە کە ناوی "سولەیمان"ە و[1] هاوڕێیەکی ڕاستی ماوەی چوار ساڵم بوو، سەرکەوتە سەر چیاکە بۆ لامان و نانی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێناین.

چوارەمیان: ئەم چاکەتەی بەرم حەوت ساڵ لەمەوپێش بە کۆنی کڕیومە! ئنجا چوار لیرە و نیویش بەشی خەرجی و مەسرەفی پۆشاك و پێلاو و گۆرەویی پێنج ساڵی ڕابوردووی کردم!

بەم جۆرە، بەرەکەت و.. دەستپێوەگرتن و.. میهرەبانیی خواوەند.. سەروزیادم بوون.

گەلێ نموونەی تری وەك ئەمانە هەن، چونکە بەرەکەتی خوایی لایەنی زۆری هەیە. خەڵکی ئەم گوندە لە گەلێ نموونەی بەرەکەت ئاگادارن.

بەڵام وریا بن! وا گومان نەبەن کە من ئەم نموونانە بۆ شانازی کردن دەهێنم. نەخێر.. من ناچار کرام باسیان بکەم. هەروەها ئەوەشتان بە دڵدا نەیەت کە ئەمانە چەند نموونەیەك بن بەڵگەی صەلاحەت و پیاوچاکیی من بن. نەخێر، ئەو بەرەکەتانە چاکەکاریی خوای گەورەن بەرامبەر میوانە دڵسۆزەکانم.. یاخود ڕێزلێنانێکی خواین بۆ

(١) ئەمەیان سولەیمانێکی ترە و بە "سولەیمان کاروانچی" بەناوبانگە و، لە پێشەنگی کاروانی خزمەتگوزارانی ئیمان و نموونەی بەرجەستەی ڕاستی و وەفا و ئیخلاس بووە. ساڵی ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

خزمەتگوزارانی قورئان.. یان چەند سوود و دەستكەوتێكی پیرۆزی دەست پێوە گرتنن.. یان ڕۆزیی ئەو چوار پشیلەیەن كە لێرەدا لەگەڵمدان و لێم جیا نابنەوە و هەمیشە لە مرەمرەكانیاندا "یارحیم.. یارحیم.. یارحیم" دەكەن. كەواتە ڕۆزیی ئەوانە لە شێوەی بەرەكەتدا بۆیان دێت و، منیش لە لایەنی خۆمەوە سوودی لێ وەردەگرم.

بەڵێ، ئەگەر گوێ لە مرەمری خەمناكی پشیلەكان ڕابگریت بە جوانی هەست دەكەیت كە زیكری: "یارحیم.. یارحیم.. یارحیم" دەكەن!

بە بۆنەی باسی پشیلەوە، مریشكیشم هاتەوە یاد..

مریشكێكم هەبوو، جار جار نەبێ، دەنا لەم زستانەدا هەرچی ڕۆژە هێلكەیەكی لە گەنجینەی میهرەبانیی خوای گەورەوە بۆ دەهێنام! تەنانەت ڕۆژێكیان دوو هێلكەی كرد! منیش گەلێ سەرم سووڕما و لە هاوڕێ خۆشەویستەكانم پرسی: ئایا لە زستاندا شتی وا ڕوو دەدات؟ وتیان: لەوانەیە ئەمە چاكەیەكی خوایی بێت.

هەر ئەم مریشكە، هاوین جووجەڵەیەكی هەبوو، ئەم جووجەڵەیە سەرەتای مانگی ڕەمەزان دەستی بە هێلكە دانان كرد و تا چل ڕۆژیش لەسەری بەردەوام بوو. ئیتر چ من و چ ئەو برایانەم خزمەتیان دەكردم، گومانمان لەوەدا نەما كە هێلكەكردنی ئەم جووجەڵە بچووكە لەم زستان و مانگی ڕەمەزانەدا جگە لە ڕێزلێنانێكی خوایی هیچی تر نییە. پاشان هەر ئەوەندەی دایكەكەی لە هێلكە چووەوە، ئەم جووجكەیە دەستی بە هێلكە دانان كردەوە و، سوپاس بۆ خوا، هێلكەی لێ نەبڕیم!

**❖ دووهەم پرسیاری گومان بزوێنەر:**

ئەهلی دنیا دەڵێن: چۆن بڕوات پێ بكەین و دڵنیا بین لەوەی كە تۆ دەست لە كاروباری دنیامان وەرنادەیت؟ لەوانەیە گەر وازت لێ بهێنین دەستی تێ وەربدەیت! پاشان چۆن بزانین تۆ فێڵمان لێ ناكەیت؟ ئەوەتا خۆت وەك كەسێك پیشان دەدەیت كە دەستی لە دنیا هەڵگرتبێت و بە ڕواڵەت هیچ شتێك لە كەس وەرنەگرێت، بەڵام لەوانەیە بە پەنهانی وەری بگرێت.. ئایا چۆن بزانین ئەمە فێڵ نییە؟!

**وەڵام:**

بەسەرهاتی بیست ساڵ پێش ئێستام لە دادگای سەربازیی عورفیدا و، ڕەفتارەكانم لە پێش ڕاگەیاندنی دەستووردا و، لەو بەرگرییەشدا كە لە كتێبی: "بەڵگەنامەی هەردوو قوتابخانەكەی موسیبەت"دا بڵاو كراونەتەوە و لای ئەو كەسانە ئاشكرایە كە دەمناسن..

هەموو ئەوانە، بە ڕوونی دەری دەخەن کە لە سەرانسەری ژیانمدا تەنازو لم بۆ بەکارهێنانی تەنانەت بچووکترین فڕوفێڵیش نەکردووە.

خۆ ئەگەر هەر فڕوفێڵێك لە ئارادا بوایە ئەوا لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەدا بە مەرایی و خۆبردنە پێشەوە سەردانێکی ئێوەم دەکرد! چونکە مرۆڤی فێڵباز تێدەکۆشێت خۆی لای خەڵکی خۆشەویست بکات، بەڵکو هەوڵیش دەدات لەخشتەیان بەرێت، نەك بچێت دوورەپەرێزییان لێ بکات..

خۆ من سەرباری ئەو هەموو هێرشانەی کرانە سەرم و ئەو ڕەخنە زۆرانەش کە ئاراستەم کران، تەنازولی ئەوەم نەکردووە کە لای هیچ کەسێك خۆم زەلیل و ڕسوا بکەم، بەڵکو ڕووم لە ئەهلی دنیا وەرچەرخاند و تەنها پشتم بە خوای گەورە بەست.

پاشان ئەو کەسەی کە حەقیقەتی ئاخیرەتی بۆ دەرکەوتبێت و پەردەی لە ڕووی حەقیقەتی دنیا هەڵدابێتەوە، گەر مرۆڤێکی ژیر بێت، تازە پەشیمان نابێتەوە و هەرگیز جارێکی تر دەست لە داوێنی دنیا گیر ناکاتەوە.

ئنجا کەسێك کە بە تەنیایی بژی و پەیوەندیشی بە کەسەوە نەبێت، ناچێت دوای بەسەربردنی پەنجا ساڵ تەمەن، لە پێناوی چەنەبازی و هەراجکاریی دنیاییدا ژیانی هەمیشەیی خۆی لەدەست بدات، خۆ ئەگەر کاری وا بکات و ئەو ژیانە هەمیشەییەی بدۆڕێنێت ئەوا بە مرۆڤێکی فێڵباز دانانرێت، بەڵکو بە شێت لەقەڵەم دەدرێت، جا ئایا دەبێ شێت چیی لێ بوەشێتەوە تاکو بایەخی پێ بدرێت!

سەبارەت بەو گومانەش کە: من بە ڕواڵەت دەستم لە دنیا شۆردبێت و لە ڕاستیشدا حەزی لێ بکەم و بەدوایدا بگەڕێم، دەڵێم:

بەپێی ناوەرۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزە:

﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ (یوسف:٥٣)..

هەرگیز "نەفس"م بە بێتاوان لە قەڵەم نادەم، چونکە هەمیشە بە دوای هەموو خراپکارییەکدا دەگەڕێت! بەڵام لەدەستچوونی ژیانێکی هەمیشەیی و بەختەوەرییەکی هەتاهەتایی، لەبەر چێژێکی کەم.. لەم دنیا فانی و.. میوانخانە کاتییە و.. لە دەمی پیری و.. تەمەنێکی ئاوەها کورتدا، کاری مرۆڤی ژیر و شایانی کەسانی خاوەن هەست نییە. لەبەر ئەوە، ئەو "نەفسە بەدخوازەم" - پێی خۆش بووبێت یان نا - ملی بۆ "عەقڵ" کەچ کرد و جڵەوی خۆی دایە دەستی!

❖ **سێهەم پرسیاری گومان بزوێنەر:**

ئەهلی دنیا دەڵێن:

ئایا ئێمەت خۆش دەوێت؟ ئایا لێمان ڕازییت و ئێمەت بە دڵە؟ ئەگەر ئێمەت خۆش دەوێت ئەدی بۆچی ڕووی خۆتمان لێ وەردەچەرخێنیت و تێکەڵمان نابیت؟ خۆ ئەگەر ئێمەشت خۆش ناوێت و لێمان نارازییت، مانای وایە نەیار(معارض)ی ئێمەیت، ئێمەش نەیارەکانمان دەهاڕین و وردوخاشیان دەکەین؟

**وەڵام:**

من گەر دنیاکەتانم خۆش بویستایە، چ جای خۆتان، ئەوا لێی نەدەکشامە دواوە و ڕووی خۆمم لێ وەرنەدەچەرخاند. کەواتە نە لە ئێوە ڕازیم و نە لە دنیاکەشتان!

بەڵام من بۆیە تێکەڵیی خۆتان و دنیاکەتان ناکەم چونکە ئامانجی من پێچەوانەی ئامانجی ئێوەیە.. دڵی من شتێکی ئەوتۆی تێدا جێگیر بووە و بە شتێك پڕ بووەتەوە کە ئیتر جێی هیچ شتێکی تری دنیای تێدا نەماوەتەوە تا بیری لێ بکەمەوە!

ئێوەش هەر تەنها هێندەتان لەسەرە کە بەپێی ڕواڵەت - نەك بەپێی ئەوەی لە دڵدایە - بڕیار لەسەر خەڵکی دەربکەن. چونکە ئێوە دەتانەوێت حوکمڕانی و ڕژێمەکەتان بەردەوام بێت و پتر ڕاگیری بکەن، خۆ منیش دەست لەو کارەتان وەرنادەم، کەواتە مافی ئەوەتان نییە بڵێن: با لە دڵەوە ئێمەت خۆش بوێت، چونکە ئێوە هەرگیز شایستەی ئەو خۆشەویستییە نین.

جا ئەگەر خۆتان لە کاروباری دڵدا هەڵبقورتێنن، دەڵێم:

هەروەك ئاواتەخوازم لە ناوەڕاستی ئەم زستانەدا بەهار بێتە کایەوە، بەڵام ناشتوانم بەهار بهێنم و ئەم ئاواتەم بهێنمەدی.. بە هەمان جۆر، ئاواتەخواز و دەست بە دوعاشم کە خوای گەورە بارودۆخی جیهان بەرەو باشی ببات و ئیصلاحی حاڵی ئەهلی دنیاش بکات. بەڵام خۆ ئەم کارە لە سەرووی ویستی منەوەیە و لە توانامدا نییە. بۆیە هەرگیز خۆمی تێدا هەڵناقورتێنم، چونکە نە کاری منە و نە لەتوانا و دەستەڵاتیشمدایە.

❖ **چوارەم پرسیاری گومان بزوێنەر:**

ئەهلی دنیا دەڵێن: هێندە بەڵا و گیروگرفتمان تووش بووە کە وامان لێ هاتووە باوەڕ بە کەس نەکەین. جا ئایا چۆن باوەڕ بە تۆ بکەین؟ یان ئایا چۆن بزانین کە ئەگەر هەلت بۆ بڕەخسێت دەست ناخەیتە ناو کاروبارمانەوە بەو شێوەیەی کە خۆت پێت خۆشە؟!

**وەڵام:** هەرچەند خاڵەکانی پێشوو سەروزیادن بۆ ئەوەی قەناعەتتان بداتێ و دڵنیایی بە دەروونتان ببەخشێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

لە کاتێکدا کە من لە شاری خۆم و لەناو قوتابییان و کەسوکارمدا و لە ناوەندی ئەوانەی گوێ بیستمن و پرس و ڕام پێ‌دەکەن، تەنانەت لە کاتی ڕوودانی توندوتیژی و بەسەرهاتە وروژێنەرەکانیشدا، دەستم لە دنیاکەتان وەرنەداوە، ئایا دەگونجێت بە تەنیایی و دەستەوسانی و لاوازی و لە وڵاتی غەریبیدا و لە کاتێکدا کە بە هەموو توانایەکی خۆی ڕووی لە ئاخیرەت کردووە، بچێ دەست لە دنیاکەتان وەربدات؟ بە تایبەتی کە لە تێکەڵ بوونی بە خەڵکی و نامەگۆڕینەوەش لەگەڵیاندا دابڕاوە و، چەند برادەرێکی قیامەتی‌یانەی نەبێ کەسی تر شك نابات و، لەناو خەڵکیدا نامۆیە و خەڵکیش نامۆن بەو، بەڵکو هەر بەم چاوەش سەیرتان دەکات؟ ئەم کەسە گەر خۆی لە دنیا نەزۆك و ترسناکەکەتاندا هەڵبقورتێنێت، دەبێ بە چەندین قات شێت بوو بێت!

● **خاڵی پێنجەم:** تایبەتە بە پێنج مەسەلەی بچکۆلەوە:

*یەکەمیان*: ئەهلی دنیا پێم دەڵێن: بۆچی دەستوور و داب و نەریتە شارستانی‌یەکانمان لە خۆتدا پیادە ناکەیت و، بە تەرز و شێوەی ژیانی ئێمە ناژییت و لە جۆری بەرگ و پۆشاکەکانمان لەبەر ناکەیت؟ کەواتە تۆ نەیاری ئێمەیت!

منیش دەڵێم:

بەڕێزان! بە چ مافێك داوام لێ دەکەن کە داب و نەریتە شارستانی‌یەکانی ئێوە بەسەر خۆمدا جێ‌بەجێ بکەم؟ لە کاتێکدا کە هەر ئێوە بە ناحەق ناچارتان کردم پێنج ساڵی ڕەبەق لە گوندێکدا بمێنمەوە و تەنانەت ڕێی ئەوەشتان نەدام کە نامە لەگەڵ خەڵکیدا بگۆڕمەوەو تێکەڵاوی‌یان بکەم، وەك بڵێی هەموو مافێکی مەدەنیتان لێ سەندبێتمەوە. ئەمە جگە لەوەی کە بە بێ هیچ هۆیەك لە هەموو شتێك داتانماڵیوم و، مەگەر یەك دوانێك دەنا نەتانهێشتووە چاوم بە هیچ کەسێکی خەڵکی شارەکەی خۆم بکەوێت، لە کاتێکدا کە هەموو نەفی کراوەکانتان ئازاد کرد و ڕوخسەتتان پێدان کە لە نێوان کەسوکاریان و لەناو شارەکاندا بژین و، ڕوخسەتنامەشتان بۆ ئەمە پێ بەخشین..

جا ئەم چەشنە ڕەفتار و مامەڵانەی کە لەگەڵ مندا دەیکەن، ئەوە دەگەیەنێت کە: بە یەکێکی ئەم نەتەوەیە و کەسێکی خەڵکی ئەم نیشتمانەم دانەنێن! گەر وایە ئیتر چۆن داوای جێ‌بەجێ کردنی یاسا شارستانی‌یەکەی خۆتانم لێ دەکەن؟

خۆ ئەوەتا ئێوە ئەم دنیا فراوانەتان لە من هێناوەتەوە یەك و لێتان کردووم بە بەندیخانە.. ئایا کەسێك کە لە بەندیخانەدا بێت داوای ئەم جۆرە شتانەی لێ دەکرێت؟

پاشان ئێوە دەرگای دنیاتان لە من داخست و، منیش لە شوێنی خۆمەوە لە دەرگای ئەودنیام دا و، میهرەبانیی خوای گەورەش ئەو دەرگایەی ئەوێی لێ کردمەوە. جا کەسێك کە لەسەر دەرگای دوارۆژ ڕاوەستابێت، چۆن داوای لێ دەکرێت داب و نەریتە ئالۆزەکانی ئەم دنیا لە خۆیدا جێبەجێ بکات؟

هەرکات بە سەربەستی بەرتاندام و ڕەوانەتان کردمەوە بۆ شار و نیشتمانی خۆم و، هەموو مافەکانی خۆمتان بە تەواوی پێدام، ئەو کاتە بۆتان هەیە داوای جێبەجێ کردنی داب و نەریتەکانی خۆتانم لێ بکەن!

*مەسەلەی دووهەم:* ئەهلی دنیا دەڵێن: ئێمە دەزگایەکی حکومەتیمان هەیە کە ئەحکامی ئایین و ڕاستییەکانی ئیسلام فێری خەڵکی دەکات. تۆیش کە بڕیاری نەفیت لەسەر دەرکراوە، مافی گرتنە ئەستۆی ئەم چەشنە کارانەت نییە. ئیتر بە چ صەلاحییەتێك دەچیت نامیلکەی ئایینی بڵاو دەکەیتەوە؟

**وەڵام:** حەق و حەقیقەت بە هیچ شتێك نابەسترێنەوە و پابەند ناکرێن و، لە هیچ کات و شوێنێکی دیاری کراویشدا سنووریان بۆ دانانرێت. کەواتە ئیتر چۆن ئیمان و قورئان لە دەزگایەکی ڕەسمیدا پابەند دەکرێن و دەبەسترێنەوە؟ ئێوە دەتوانن داب و یاساکانتان لە دام و دەزگاکاندا پیادە و جێبەجێ بکەن. بەڵام ڕاستییەکانی ئیمان و بناغەکانی قورئان هەرگیز ناتربخێنرێنە ناو مامەڵەی دنیایی و دام و دەزگا ڕەسمییەکانەوە کە بە پارە و مووچە کاریان تێدا جێبەجێ دەکرێت! تەنانەت ئەو ڕێژنە و نهێنییانەی ئیمان، بەخشش و بەهرەی خوایین و تەنها لە ڕێی نیازی خاوێن و دەست بەرداربوونەوە لە دنیا و وازهێنان لە حەز و بەشەکانی نەفس، ئەنجام دەدرێن.

ئەمە جگە لەوەی کە فەرمانگە ڕەسمییەکانتان منی لە شارەکەی خۆمدا بە "واعیز" قبووڵ کرد و لەو کارمەندییەدا دایمەزراندم و، هەر لە ڕاستیشدا ئەو کارمەندیی وەعز و ئامۆژگارییەم ڕاپەڕاند، بەڵام دەستم نا بە ڕووی مووچەکەیەوە و وەرمنەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا بڕوانامە و فەرمانی ئیداریی ئەو کارمەندییەم هەر ماوە. واتە من بەو بڕوانامەیە دەتوانم لە هەر شوێنێکدا بم ئەرکی وەعز و پێشنوێژی جێبەجێ بکەم، چونکە نەفی کردنەکەم ستەمێکی ئاشکرا و کارێکی نایاساییە. پاشان هەموو ڕەهەندەکراوەکان ڕەوانە کرانەوە بۆ ناو کەسوکاریان، کەواتە بڕوانامەکەی پێشووم کاری پێ دەکرێت.

دووهه‌م: ئه‌و ڕاستی‌یانه‌ی ئیمان كه‌ من نووسیومن، گوفتارێكن ڕاسته‌وخۆ ئاراسته‌ی خۆمم كردوون و، ناچم هه‌موو خه‌ڵكی‌یان بۆ لا بانگ بكه‌م، به‌ڵكو ته‌نها ئه‌و كه‌سانه‌یان بۆ لا بانگ ده‌كه‌م كه‌ وه‌ك من ڕۆحیان موحتاجی ئه‌و حه‌قیقه‌تانه‌یه‌ و دڵیان زامداره‌ و به‌ دوای ئه‌و ده‌رمانه‌ قورئانی‌یانه‌دا ده‌گه‌ڕێن كه‌ له‌و په‌یامانه‌دا ده‌ستگیریان ده‌بێت. هه‌موو په‌یامه‌كانم به‌م جۆره‌ بڵاو كراونه‌ته‌وه‌، جگه‌ له‌ یه‌كێكیان كه‌ تایبه‌ته‌ به‌ حه‌شره‌وه‌ و ماوه‌یه‌ك پێش جێ‌به‌جێ بوونی ئه‌م پیته‌ نوێیانه‌ داوام له‌ به‌ڕێزێك كرد بۆم له‌ چاپ بدات، تاكو قووت و گوزه‌رانی خۆمی پێ دابین بكه‌م. به‌ڵام پارێزگاره‌كه‌ی پێشوو كه‌ به‌رامبه‌رم سته‌می ده‌نواند، ئه‌و په‌یامه‌ی به‌ وردی پشكنی، كاتێ كه‌ هیچ شتێكی تێدا نه‌دۆزی‌یه‌وه‌ مایه‌ی ڕه‌خنه‌ بێت، به‌ خراپی ده‌ستی بۆ نه‌برد.

*مه‌سه‌له‌ی سێ‌هه‌م*: هه‌ندێ له‌ هاوڕێیانم ده‌چن به‌ ڕواڵه‌ت خۆیان له‌ من به‌ری ده‌كه‌ن، ته‌نانه‌ت ڕه‌خنه‌شم لێ ده‌گرن، گوایا بۆ ئه‌وه‌ی خۆیان لای ئه‌و كه‌سانه‌ی ئه‌هلی دنیا خۆشه‌ویست بكه‌ن كه‌ به‌رامبه‌رم به‌دگومانن! كه‌چی ئه‌و فێڵبازانه‌ی ئه‌هلی دنیا خۆ به‌ری كردن و دووره‌ په‌رێزیی ئه‌وانیان له‌ من خسته‌ قاڵبی ڕیا و بێ‌ویژدانی‌یه‌وه‌، له‌ بریی ئه‌وه‌ی بیخه‌نه‌ قاڵبی خۆشه‌ویستی و سۆزی ئه‌و براده‌رانه‌وه‌ بۆیان! بۆیه‌ به‌ چاوی گومانه‌وه‌ بۆیان ده‌ڕوانن!

وا منیش به‌و هاوڕێیانه‌ی ڕێی ئاخیره‌تم ده‌ڵێم:

هه‌رگیز له‌و خزمه‌تگوزاری‌یه‌ هه‌ڵ مه‌یه‌ن كه‌ بۆ قورئانی مه‌زنی ده‌كه‌م! چونكه‌ پشت به‌خوا له‌ لایه‌نی منه‌وه‌ هیچ زیانێكتان پێ ناگات. ته‌نانه‌ت گه‌ر سته‌میشم لێ بكرێت و موسیبه‌تیش بێته‌ ڕێمان ئه‌وا دڵنیا بن كه‌ به‌ "خۆ به‌ری كردن" له‌ من ناتوانن خۆتانی لێ ده‌رباز بكه‌ن! به‌ڵكو شایانی ئه‌وه‌ ده‌بن كه‌ موسیبه‌ت و گیروگرفتی زیاترتان به‌سه‌ردا بیارێت، یان زلله‌یه‌كی سه‌رزه‌نشتتان تێ بسره‌وێنرێت.. پاشان ئایا چی ڕووی داوه‌ هه‌تا گرفتاری مه‌ترسی و گومان بن؟!

*مه‌سه‌له‌ی چواره‌م*: له‌ ڕۆژگارانی ئه‌م ڕه‌هه‌نده‌یی‌یه‌مدا، چه‌ند كه‌سێك ده‌بینم له‌وانه‌ی كه‌وتوونه‌ته‌ ناو لیتاوی سیاسه‌ته‌وه‌ و دووچاری به‌ڵای "له‌خۆ ڕازی بوون"ن، به‌ چاوی موناڧه‌سه‌ و پشتگیریی لایه‌نێك بۆ من ده‌ڕوانن، وه‌ك بڵێی منیش - وه‌ك ئه‌وان - په‌یوه‌ندیم به‌ لایه‌ن و ته‌وژمه‌كانی دنیاوه‌ بێت!

به‌ڕێزان! بزانن كه‌ من ته‌نها له‌ ڕیز و ده‌سته‌ی ئیماندام و، به‌رامبه‌ره‌كه‌شم ته‌نها كۆمه‌ڵ و پێڕی ئیلحاده‌. هیچ په‌یوه‌ندی‌یه‌كم به‌ هیچ لایه‌نێكی تره‌وه‌ نی‌یه‌.

جا ئەو کەسەی مونافەسە و زۆرانبازیم لەگەڵدا دەکات و لە دژم ڕادەوەستێت و دەستدرێژیم دەکاتەسەر و دەبێت بەهۆی ئازاردانم، ئەگەر "بەکرێ گیراو" بێت، ئەوا لەوانەیە ئەم بەکرێ گرتنەی بەهانەیەك بێت بە دەستیەوە. بەڵام ئەو کەسەی بە "خۆڕایی" و بە ناوی غیرەتمەندی بۆ ئیسلام ئەم هەڵسوکەوتانە دەنوێنێت، با بزانێت هەڵەیەکی گەورە دەکات. چونکە وەك لەپێشدا چەسپاندمان هەرگیز هیچ چەشنە پەیوەندییەکم بە سیاسەتی ئێستای دنیاوە نییە و، هەموو ژیان و کاتێکی تەمەنم بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان تەرخان کردووە. کەواتە با ئەو کەسەی کە دەستدرێژی دەکاتە سەرم و دەچێتە هەڵوێستی مونافەسە و زۆرانبازی لەگەڵ مندا، بە باشی بیر بکاتەوە و بزانێت ئەم کارەی وەك ئەوە وایە کە لە پێناوی زەندەقە و ئیلحاددا دەستدرێژیی بۆ سەر ئیمان کردبێت.

*مەسەلەی پێنجەم:* مادەم دنیا فانییە و.. تەمەن کورتە و.. ئەرك و واجباتیش گەلێ زۆرن و.. ژیانی هەمیشەیی ئەودنیاش لێرە و لەم دنیایەدا بەدەست دەهێنرێت و هەوڵی بۆ دەدرێت و.. دنیاش بێ خاوەن نییە، چونکە ئەم میوانخانەیە پەروەردگارێکی دەست ڕەنگین و دانای هەیە و، سزا و پاداشتی خراپە و چاکەی لێ ون نابێت و، هیچ ئەرکێك ناخاتە ئەستۆی بەندەکانیەوە گەر لە توانایاندا نەبێت..

هەروەها مادەم ڕێی ڕاست و ڕێیەك ئازاری تێدا بێت وەکو یەك نین و.. هاوەڵان و پلە و پایەکانی دنیاش تا دەرگای گۆڕ زیاتر لەگەڵ مرۆڤدا نایەن..

ئەوا بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە:

لەبەر دنیا قیامەتی لەبیر ناچێت و.. ئەودنیای بۆ ئەمدنیا نادۆڕێنێت و.. ژیانی هەمیشەیی خۆیشی لەبەر ژیانێکی دنیایی ناشێوێنێت و.. تەمەنیشی بە شتێك پەیوەندیی بەوەوە نەبێ، بەفیڕۆ نادات و.. بە چەشنی گوێڕایەڵیی میوان بۆ میواندار، فەرمانبەرداری فەرمانەکانی خواوەند دەبێت، تاکو دەرگای گۆڕی بە دڵنیایی و ئارامی لێ بکرێتەوە و.. بە سەلام کردنەوە پێ بخاتە ناو خانەی بەختەوەری[1].

---

(١) لەسەر بناغەی ئەم هۆکارانە: نە گوێ بەو ستەمانە دەدەم کە هێنرانە ڕێی خودی خۆم و، نە ئاوڕیش لەو تەنگ پێ هەڵچنینە دەدەمەوە کە لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقەی داوم و، دەڵێم: شایانی بایەخ پێدان نین. بۆیە دەست ناخەمە ناو کاروباری دنیا. (دانەر)

پاشکۆی

# مەکتووبی شازدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

ئەو دنیاویستانەی کە لە هەڵپەدان بۆ تفاق و شمەکی قەڵبی ئەم دنیایە، لەو گومانە هەڵەیەدا بوون کە پیاوێکی دەستەوسانی وەك منی ئاوارەی دنیا، هێزی هەزاران پیاوی هەیە! ئەم وەهمەشیان وای لێ کردن کە زەبروزەنگی زۆرم لە ڕوودا بنوێنن و بە توندوتیژی ڕەفتارم لەگەڵ بکەن. ئەوەبوو - بۆ نموونە - نەیانهێشت یەك دوو شەو لە گوندی "بەدرە"دا - کە وەکو یەکێك لە گەڕەکەکانی "بارلا" وایە - تەنانەت لەسەر لوتکەی یەکێك لە چیاکانی نزیکیشیدا بمێنمەوە.

گوێم لێ بوو دەیانوت:

(سەعید هێندەی پەنجا هەزار کەس بەهێزە، لەبەر ئەوە ناتوانین بەری بدەین)!

منیش دەڵێم:

ئەی بەدبەختانی ئەهلی دنیا! خۆ ئێوە بە هەموو هێزێکتانەوە بۆ دنیا تێدەکۆشن، ئەدی بۆچی ئیشو کارەکانیشی نازانن و وەکو شێت بڕیار دەردەکەن؟!

ئەگەر ترستان لە "کەس"ی منی فانییە، ئەوا ترسێکی بێجێ و ناڕەوایە. چونکە هەر مرۆڤێك - نەك پەنجا هەزار کەس - دەتوانێت پەنجا ئەوەندەی من کار بکات، هیچ نەبێ دەتوانێت لە دەرگای ژوورەکەمدا ڕابووەستێت و بڵێت: "نابێ بێیتە دەرەوە" و، ئیتر مەترسییەکە بەمە تەواو دەبێت!

گەر ترسیشتان لە پیشەکەم و ئەرکی سەرشانم بێت، کە بانگەوازکردنە بۆ قورئانی پیرۆز و، مەترسیتان لەو هێزەی ئیمان بێت کە کردوومە بە چەکی خۆم، ئەوا باش بزانن

كە: هێزی من هی پەنجا هەزار كەس نی‌یە. نەخێر، بە هەڵەدا چوون.. بەڵكو بە فەزڵی ئیمان و بە حوكمی پیشەكەم بە ئەندازەی پەنجا ملیۆن كەس بەهێزم!!

وا من تەحەددای گشت ئەوروپا و هەموو مولحیدانی ئێوەش دەكەم! من یەك بە یەكی قەڵا مەحكەم و پتەوەكانی ئەوان كە پێیان دەڵێن: زانستە سروشتی‌یەكان، یان زانستە نوێكان، گەڕاوم و هەموو گۆشەیەكی قەدەغەكراویانم یەك بە یەك پشكنیوە و، پەردەم لە رووی هەموو نهێنی‌یە پەنهانەكانیان هەڵماڵیوە. ئنجا بەو ڕاستی‌یانەی ئیمان و ئەو بەڵگە گومانبڕانەی قورئانیش مەزنترین فەیلەسووفیانم دابەزاندووەتە پلەیەكی سەد هێندە نزمتر لە پلەی ئاژەڵان! خۆ ئەگەر سەرانسەری ئەوروپا و گشت مولحیدانی ئێوەش كۆببنەوە، ئنجا ناتوانن ڕێ لە تەنها یەك مەسەلەش لە مەسەلەكانی ئەرك و پیشەی سەرشانم بگرن و، بە ئیزن و فەرمانی خوا ناتوانن بە سەرمدا سەربكەون.

بە كورتی:

هەروەك من دەست ناخەمە ناو كاروباری دنیایی ئێوە، بە هەمان جۆر ئێوەش مافی ئەوەتان نی‌یە خۆتان لە كاروباری قیامەتمدا هەڵبقورتێنن، هەر بە هیچ جۆرێ ئەو هەوڵەش مەدەن. خۆ ئەگەر سوار سەری خۆتان بن و لە كەلی شەیتان نەهاتنەخوار و هەوڵتان دا دەست لە كاروباری قیامەتم وەربدەن، ئەوا بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بزانن كە هیچ شتێك سەوز ناكەن و هەموو هەوڵ و تەقەلاكانیشتان بێ‌مایە و پووچ دەردەچێت!

هێزی بازوو "تەقدیری خوا" بەرەودوا ناگێڕێتەوە

مۆمێك "مەولا" هەڵی‌بكات بە فووی دەم ناكوژێتەوە

ئەهلی دنیا بە تایبەتی شك و گومانیان سەبارەت بە من لە دڵدایە، وەك بڵێی خەمی مەترسی‌یەكیان ببێت كە لە لایەنی منەوە ڕووبدات!

ئەوەتا بە ئەندێشەی خۆیان ترسیان لە چەند شتێك هەیە كە هەر وجوودیان نی‌یە، تەنانەت گەر ئەو شتانەش وجوودیان هەبێت، هەرگیز جێی شك و گومانی سیاسی و مایەی تۆمەتبار بوون نابن، وەك: شێخایەتی و سەرۆكایەتی و حەسەب و نەسەب و قسە ڕۆیشتن لەناو عەشرەتدا و زۆریی شوێنكەوتووان و چاوپێكەوتن لەگەڵ خەڵكی‌دا و دەستگیر كردن لە داوێنی كاروباری دنیا..

تەنانەت تەسەووری دەست تێوەردان لە كاروباری سیاسەت و نەیاری كردنی دەوڵەت و شتی تری وەك ئەمانەش لە مندا دەكەن، كە چەند شتێكی وەهان من هەرگیز خۆمی پێوە خەریك ناكەم. لە ئەنجامی ئەم چەشنە ئەندێشانەشدا خۆیان گرفتاری گەلێ

شك و گومانی ناڕەوا دەکەن، بە ڕادەیەك کە کاتێ باسی لێبوردنی ئەوانەی ناو بەندیخانە و دەرەوەی بەندیخانەشیان هێنایە کایەوە و لەو کەسانەیان کۆڵییەوە کە لێبوردن دەیانگرێتەوە و ئەوانەش کە نایانگرێتەوە، منیان لە هەموو شتێك بێ بەش کرد!

وتەیەکی جوانی نەمر هەیە کە پیاوێکی فاسیدی لەناوچوو وتوویەتی، دەڵێت:

(ئەگەر "ستەم" قەڵا و تۆپ و تفەنگی هەبێت، ئەوا "حەق"یش بازوویەکی هێندە بەهێزی هەیە کە هەرگیز نانوشتێتەوە و، ڕوویەکیشی هەیە کە هەرگیز گەڕانەوە نازانێت)!

منیش دەڵێم:

(گەر ئەهلی دنیا حوکمڕانی و زەبر و زەنگیان بە دەستەوە بێت، ئەوا خزمەتگوزارەکەی قورئانیش لە ڕێژنەی قورئانەوە:

زانستێکی هەیە کە هیچ شتێکی لێ ئاڵۆز نابێت و.. گوفتارێکی هەیە کە هەرگیز بێدەنگ ناکرێت و.. خاوەنی دڵێکیشە کە بە کەس ناخەڵەتێ و.. نوورێکیشی بە دەستەوەیە کە هەرگیز خامۆش نابێت)!

ئەو فەرماندە سەربازییەی کە بەرپرسیی چاودێری کردنم بوو، هەروەها زۆر کەسیش لە هاوڕێیان، چەندین جار لێیان پرسیوم:

بۆچی سەردانی لایەنە ڕەسمییەکان ناکەیت و داواکارییەکیان ناخەیتە بەردەست تاکو بەڵگەنامە و مۆڵەتنامەت بۆ بکەن؟

**وەڵام:**

چەند هۆکارێك هەن کە ڕێی سەردانی ئەوانم لێ دەگرن، تەنانەت هەر ناشتوانم سەریان لێ بدەم و بڕۆم بۆ لایان:

*هۆکاری یەکەم:*

من نە دەستم لە کاروباری ئەهلی دنیا وەرداوە و نە تێکەڵی دنیاکەشیان بووم تاکو پێم وابێت لە لایەن ئەوانەوە مەحکووم بم، بۆیە موراجەعەم نەکردوون و سەرم لێ نەداون. بەڵکو موراجەعەی قەدەری خوای گەورە دەکەم، چونکە من لە لایەن ئەو قەدەرەوە و لەسەر کەموکوورییەکانم بەرامبەری، ئەم بڕیارەم لەسەر دەرکراوە.

*هۆکاری دووهەم:*

بە دڵنیاییەوە باوەڕم هێناوە بەوەی کە ئەم دنیایە میوانخانەیەکی هێندە کاتییە کە بە خێرایی و بەردەوام ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت، کەواتە خانەی مانەوە و نیشتمانی

ڕاستەقینەی مرۆڤ نییە. بۆیە هەموو شوێن و لایەکی بەلامەوە یەکسانن. خۆ مادەم لە نیشتمانەکەی خۆشمدا نامێنمەوە و بەجێیدەهێڵم، ئەوا هەوڵدان بۆ گەڕانەوەم کارێکی بێسوودە و هیچ جێگایەکم بۆ ناگرێت.

جا مادەم هەموو شوێنێکی دنیا میوانخانەیەکی کاتییە، ئەوا هەموو مرۆڤێك بۆ من هاوڕێیە و گشت جێگایەکیش بەسوودە، گەر بێت و بەزەیی و میهرەبانیی خاوەن ماڵ هاودەمی مرۆڤ بێت. دەنا هەموو کەسێك دوژمنە و گشت جێگایەکیش تەنگەڵانە و بەسەر دڵەوە قورس و قەبە و گرانە!

*هۆکاری سێیەم:*

موراجەعەکردن دەبێ لە چوارچێوەی یاسادا بێت. کەچی ئەو مامەڵە و ڕەفتارەی کە ماوەی ئەم شەش ساڵە لەگەڵ مندا کراوە هەمووی هەڕەمەکی و بێ یاسایی بووە. چونکە بەپێی یاسای ڕەهەندەکراوان مامەڵەم لەگەڵدا نەکراوە، بەڵکو وەکو کەسێك بۆیان ڕوانیوم کە لە هەموو مافێکی مەدەنی تەنانەت لە مافە دنیاییەکانیش داماڵرابێت..

کەواتە ئیتر موراجەعەکردنی یاسایی سەبارەت بە کەسێکەوە کە مامەڵەی نایاسایی لەگەڵدا کرابێت کارێکی نابەجێیە.

*هۆکاری چوارەم:*

ئەم ساڵ یەکێك بە ناوی منەوە ڕۆشتە لای بەڕێوەبەری ناوچەی "بارلا" تاکو بوارم بدات سەردانی گوندی "بەدرە" بکەم کە هێندە لە بارلاوە نزیکە بە یەکێ لە گەڕەکەکانی دادەنرێت، بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێك بۆ سەیران و حەوانەوە لەوێ بەسەر بەرم. کەچی مۆڵەتی نەدا! ئیتر چۆن موراجەعەی کەسانێك دەکرێت کە دەست بە ڕووی ئەم جۆرە شتە ئاساییانەوە بنێن کە هەست دەکەم پێویستم پێیانە؟

کەواتە موراجەعە کردنی ئەوانە خۆ زەلیل کردن و سەر دانەواندنێکی بێجێ و بێ سوودە!

*هۆکاری پێنجەم:*

داواکردنی "حەق" لەوانەی کە بە درۆ لافی "حەق" لێ دەدەن، هەروەها سەرلێدان و موراجەعەکردنیان، لە ڕاستیدا ستەمکردنە لە "حەق" و داگرتنی ڕێز و شان و شکۆیەتی. منیش نامەوێ ئەم ستەمە ئەنجام بدەم و لە شان و شکۆی "حەق" دابگرم. والسلام!

*هۆکاری شەشەم:*

تەنگ هەڵچنینی ئەهلی دنیا بە من، هی ئەوە نی‌یە کە خەریکی سیاسەت بوو بێتم. نەخێر.. چونکە ئەوان باش دەزانن کە من تێکەڵی کاروباری سیاسەت نابم. بەڵکو لەسەر ئەوە ئازارم دەدەن کە پەیوەندیم بە ئایینەوە هەیە و دەستم لە داوێنی گیر کردووە! واتە ئەوان – بە خۆیان بزانن یان نەزانن – لە پێناوی ڕازی کردنی زەندەقە و کوفردا ئازارم دەدەن. لەبەر ئەوە، موراجەعەتی ئەوانە پەشیمان بوونەوەیە لە ئایین و ڕازی کردنی ڕێبازی کوفر دەگەیەنێت.

لە لایەکی تریشەوە، ئەگەر بێت و موراجەعەیان بکەم "قەدەری دادگەری خوای گەورە" هەر بە دەستە چەپەڵەکانی ئەوان ئازارم دەدات! چونکە ئەوان لەسەر دەستگرتنم بە ئایینەوە ئازارم دەدەن، بەڵام قەدەری خوای گەورە لەسەر ناتەواوی و کەموکووڕیم لە تەقوا و ئیخلاسدا و لەسەر ئەوەش کە هەندێ جار مەرایی ئەهلی دنیام کردووە، ئازارم دەرخوارد دەدات.

کەواتە من ئێستا لەم چەشنە تەنگانەیە ڕزگارم نابێت. چونکە ئەگەر موراجەعەی ئەهلی دنیا بکەم قەدەری خوا پێم دەڵێت: دەسا ئەی مەرایی کەری ڕیاباز! سزای ئەم موراجەعەیەت بچێژە.. خۆ ئەگەر سەریشیان لێ نەدەم، پێم دەڵێن: تۆ دان بە ئێمەدا نانێیت، کەواتە لەو تەنگانەیەدا بمێنەرەوە!

*هۆکاری حەوتەم:*

ئاشکرایە کە یەکێك لە کار و ئەرکەکانی کارمەندی دەوڵەت بریتی‌یە لەوەی کە بوار بەو کەسانە نەدات زیان بە کۆمەڵ دەگەیەنن و، یارمەتیی ئەوانەش بدات کە سوودیان بۆ کۆمەڵ هەیە..

جا لە کاتێکدا کە من چێژێکی ناسکی وشەی: "لا إلــــه إلاّ الله"م بۆ پیرێکی بەساڵاچوو ڕوون دەکردەوە کە سەری لە گوێی گۆڕدا دەلەرزی، یەکسەر کارمەندی بەرپرسی چاودێری کردنم هات بۆلام! وەك بڵێی بیەوێت لە دەمی ئەنجامدانی تاواندا دەستگیرم بکات! کەچی زۆربەی کاتەکانی تر نەدەهات بە لامدا، وەك بڵێی ئێستا تاوانێکم ئەنجامدابێت! بەم جۆرە، ئەو مرۆڤە پیرە گوێبیست و خاوەن ئیخلاسەی لە بیستنی ئەو ڕێنمایی‌یە بێ بەش کرد و تووڕەیی منیشی ورووژاند. بەڵام گوێی بە کەسانی تری ناو ئاوایی نەدەدا، تەنانەت ڕێزی لەو بەدڕەوشتانەش دەنا کە ژەهرەکانیان لەناو کۆمەڵدا بڵاو دەکردەوە!

هەروەها ئاشكرا و زانراوە كە: هەر تاوانبارێك، تەنانەت گەر سەد تاوانیشی ئەنجام دابێت، دەتوانێت چاوی بە بەرپرسانی بەندیخانەكەی بكەوێت، چ سەرباز و ئەفسەرەكان و چ لە كەسانی تریش بن. كەچی بەرپرسی چاودێری كردنم و ئەو دوو كەسەش كە لای حكومەت دەستیان دەڕوات، ماوەی یەك ساڵی ڕەبەق هیچ هەواڵێكیان نەپرسیم و نەیانبینیم، هەرچەندەش گەلێ جار بە بەردەم ژوورەكەمدا هاتوچۆیان كردبوو.

لە پێشدا وامدەزانی كە بەهۆی دوژمنایەتی كردنەوە لێم ناپرسن و توخنم ناكەون، بەڵام دوایی بۆم دەركەوت كە ترس و گومانیان لێم هەیە و ناوێرن نزیكم ببنەوە، وەك بڵێی من قووتیان بدەم!

جا موراجەعە كردنی حكومەتێك كەسانی ئاوا كارمەند و پیاوی بن، هەرگیز بە كارێكی ژیرانە لەقەڵەم نادرێت، بەڵكو خۆ زەلیل كردن و سەردانەواندنێكی بێ‌سوود و بێ ئاكامە!

گەر "سەعیدی كۆن" لێرەدا بوایە، ئەوا وەك "عەنتەرە"[(١)] دەیوت:

ماء الحياة بذلة كجهنم وجهنم بالعز أفخر منـــزل[(٢)]

بەڵام خۆ "سەعیدی كۆن" ئامادە نییە.. بۆیە "سەعیدی نوێ" پێی وایە:

(تەنانەت قسەكردنیش لەگەڵ ئەهلی دنیادا كارێكی نابەجێیە! دەبا خوای گەورە بە خۆیان و دنیاكەیانەوە لەناویان بەرێت، چی دەكەن با بیكەن. بەڵام - پشت بەخوا - سبەینێ لە بەردەم دادگای هەرە مەزندا كێشەكەمان یەكلایی دەكەینەوە).

"سەعیدی نوێ" هەر هێندە دەڵێت و، ئیتر بێ‌دەنگ دەبێت.

یەكێكی تر لە هۆكارەكانی موراجەعە نەكردنم ئەمەیە:

*هۆكاری هەشتەم:*

"قەدەری خوا" لەسەر ئەو مەیلەی بەلای ئەهلی دنیادا هەمە و ئەوانیش شایانی نین، بە دەستی ئەو ستەمكارانەی ئەهلی دنیا سزام دەدات! بەپێی ئەو دەستوورەی كە دەڵێت: "پاداشت و ئەنجامی خۆشەویستیی نامەشرووع: دوژمنایەتی‌یەكی ستەمكارانەیە"!

---

(١) ناوی (عەنتەرەی كوڕی شەددادی كوڕی عەمری عەبسی)یە و خەڵكی ناوچەی نەجدە لە دوورگەی عەرەب. هەرچەند لە جەنگدا پاڵەوانێكی زۆر بە توانا و توندوتیژ بووە، بەڵام بە مرۆڤێكی ڕەوشت جوان و دەروون بەرز ناسراوە، هەروەك شاعیرێكی بە توانای توێژی یەكەمی شاعیرانی سەردەمی جاهیلی‌یە و یەكێكە لە خاوەن (موعەللەقات)ی شیعری ئەو سەردەمە. ساڵی ٦٠١ز (٢٢ پ.ك) كوژراوە. (وەرگێڕ)

(٢) لە هەندێ سەرچاوەدا نووسراوە: (أطيب منـــزل). (وەرگێڕ)

جا بۆیە لایەنی بێدەنگیم گرت، چونکە دەمزانی شایانی ئەم زللەیەم.. ئەوەبوو من بە سیفەتی سەرکردەی خۆبەخشەران لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا خزمەتم کرد و، رۆشتمە ناو چەندین جەنگەوە و قوتابییە باش و خۆشەویستەکانیشم لەو جەنگانەدا بەخت کرد و، تەقدیر و رێزی "ئەنوەر پاشا"ی سەرکردەی گشتیی سوپام بەدەست هێنا و، لە جەنگدا پێکرام و، بەو زامدارییەوە دیل کرام. ئنجا دوای گەڕانەوەشم لە دیلی، بەهۆی دانانی کتێبی "الخطوات الست"ەوە کە تەحەددای ئینگلیزم تێدا کرد لەو دەمەی کە ئەستەمبوولیان داگیر کردبوو، خۆم خستە ناو باوەشی مردنەوە.. واتە هاوکاریی ئەو برادەرانەم کرد کە بێ هیچ هۆکارێك منیان خستە ناو ئازار و سزای دیلییەوە. ئەمەش پاداشتی ئەوان بوو بۆ یارمەتییەکانم، ئەوەبوو لە ماوەی سێ مانگدا هێندە گیرو گرفت و ئازاریان هێنایە رێم کە گەلێ زیاتر بوو لەو ئازاری دیلییەی بۆ ماوەی سێ ساڵ لە رووسیادا پێوەی تلامەوە..

چونکە هەرچەند رووسەکان بە سیفەتی "سەرکردەی خۆبەخشەرانی کورد" بۆیان دەڕوانیم و وەك ستەمکارێك سەیریان دەکردم کە گوایا دیلەکان و قازاقەکان سەردەبڕێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا رێی دەرس وتنەوەیان لێ نەگرتم، بەڵکو دەرسم بە ئەفسەرە دیلەکانی هاوەڵم دەوتەوە کە ژمارەیان نەوەد کەس بوو، یەك جار نەبێ کە سەرکردەی رووسەکان هات و گوێی لە دەرسەکەم راگرت و، لەبەر ئەوەی زمانی تورکیی نەدەزانی پێی وابوو کە دەرسێکی سیاسییە، بۆیە ئەو جارە دەرس وتنەوەی لێ قەدەغە کردم. بەڵام دوای ئەو یەك جارە، رۆخسەتی دام لەسەر دەرسەکانم بەردەوام بم. پاشان ژوورێکمان لەناو سەربازگەکەدا - کە تیایدا دیل بووین - کردبوو بە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت و خۆیشم ئیمامەتم بۆ دەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کاتێك ئەو رووسانە دەستیان نەهێنایە رێمان و، تێکەڵاوی و هامشۆی یەکتریان لێ قەدەغە نەکردین و، رێی نامەهاتن و ناردنیان لێ نەبەستین.

بەڵام ئەم کەسانەی کە دەبوو بە برای ئایینی و نیشتمانی دابنرانایە، لەو کاتەدا کە من دەمەوێت سوودی ئیمانییان پێبگەیەنم، دەچن رێی دەرس وتنەوەم لێ دەگرن! کە دەشزانن من پەیوەندیم لەگەڵ دنیا و سیاسەتدا بڕیوە. ئنجا نەك سێ ساڵ، بەڵکو شەش ساڵیش گیرۆدەی دیلییەکی سەختیان کردم، چونکە رێی هامشۆی خەڵکی و دەرس وتنەوەیان لێ گرتم، بەڵکو لەناو ژوورەکەی خۆیشمدا رێی دەرس وتنەوەی تایبەتییان

نەدام. هەرچەندەش ڕوخسەت و بڕوانامەی ئەم دەرس وتنەوەیەم پێیە. ئنجا ڕێی نامەگۆڕینەوەیان لێ گرتم و نەشیانهێشت نوێژ لەو مزگەوتەدا بکەم کە هەر خۆم تەعمیر و ئاوەدانم کردەوە و چوار ساڵ ئیمامەتم تێدا کرد، بەم جۆرە لە پاداشتی نوێژی جەماعەت بێبەشیان کردم. تەنانەت ڕێی ئەوەشیان لێ گرتم کە پێشنوێژی بۆ سێ برای قیامەتیم بکەم کە بەردەوام پێشنوێژیم بۆ دەکردن. لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك ناوم بە باشی بهێنێت، کارمەندی بەرپرسی چاودێری کردنم تووڕە دەبێت و بە هەموو شێوە و هۆکارێك هەوڵ دەدات لە بەرچاوی خەڵکیدا سووکم بکات و پتر تەنگم پێ هەڵدەچنێت تاکو ئاوڕلێدانەوە و ڕێزلێنانی فەرماندەکانی بەدەست بهێنێت!

جا ئەی برای پرسیارکەر! فەرموو بۆخۆت بڕیار بدە و، سەبارەت بەم چەشنە حاڵ و بارودۆخەوە چی دەڵێیت بیلێ!

ئایا کەسێك ئەمە حاڵی بێت، موراجەعەی غەیری خوای گەورە دەکات؟

ئایا گەر "موددەعی" هەر خودی "حاکم" بێت، سکاڵا بۆ لای کێ ببرێت؟!

بەڵام من هێندە دەڵێم کە: گەلێ کەسی مونافق خۆیان کردووە بەناو ئەو برادەرانەمدا. ئاشکرایشە کە زیانی مونافق گەلێ زیاتر و چەپەڵترە لە هی کافر. هەر لەبەر ئەمەشە کە هێندە سزام دەدەن تەنانەت کافرەکانی ڕووسیش وا سزایان نەداوم!

دەسا ئەی بەدبەختینە! من چیم لەگەڵ ئێوەدا کردووە؟ یان چیتان لەگەڵدا دەکەم؟ خۆ من بۆ ڕزگار کردنی ئیمانەکەتان تێدەکۆشم و دەمەوێت بە بەختەوەریی هەمیشەییتان بگەیەنم. بەڵام وا دیارە خزمەتەکەم هێشتا خاوێن نەبووەتەوە بۆ خوای گەورە، بۆیە وا پێچەوانەی مەبەستەکەم دێتەدی و ئێوەش بەرامبەر بەوە هەر دەرفەتێکتان بۆ برەخسێت ئازارم دەدەن. بێ گومان هەردوو لا دەڕۆینە بەردەم دادگای هەرە مەزن، تاکو لەوێ ئەم کێشەیە یەکلایی بکەینەوە.

منیش هەر دەڵێم:

حسبنا الله ونعمَ الوكيل. نعم المولى ونعم النصير.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی حەڤدەهەم

پاشکۆی بریسکەی بیست و پێنجەم

**پرسەی منالێك**

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ برای ئازیزی ئاخیرەتم، بەڕێز: "حافظ خالید"!

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ۞ الَّذينَ إذا أَصابَتْهُمْ مُصيبَةٌ قالُوا إِنَّا للهِ وَإنَّا إِلَيْهِ راجِعُونَ﴾(البقرة:١٥٥–١٥٦)

برام!

هەواڵی مردنی منالەکەتان گەلێ ئازاری دام. بەڵام هەموو فەرمانێك بە دەستی خوای گەورەیە. ڕازیبوون بە قەزا و تەسلیم بوون بە قەدەری ئەو، درووشمی موسڵمانێتی‌یە.

لە خوا دەپاڕێمەوە ئارامی‌یەکی ڕەنگینتان پێ ببەخشێت و منالەکەتان بۆ بکات بە پشتگیر و تکاکار لە ڕۆژی دواییدا.

وا لێرەدا بۆ ئێوە و بۆ هەموو موسڵمانێکی خاوەن تەقوا و لە خواترس، پێنج خاڵی وا باس دەکەین کە مزگێنی‌یەکی خۆش و دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینەیان تێدا بێت:

● خاڵی یەكەم:

واتا و نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ بەم جۆرەیە:

منداڵی ئیمانداران كە پێش باڵغ بوونیان كۆچی دوایی‌یان كردووە، لە بەهەشتدا بە خۆشەویستی دەمێننەوە و هەتاهەتایی دەبن بە شێوەیەك كە شیاوی بەهەشت بێت و، دەبن بەهۆی دڵخۆشی بۆ دایكان و باوكانیان كە ڕۆشتوونەتە بەهەشت و، ناسكترین چێژی هەمیشەیی بۆ ئەو دایك و باوكانە دابین دەكەن كە بریتی‌یە لە خۆشەویستی و دواندنی منداڵ.

جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێكی خۆش و بەلەزەت لە بەهەشتدا هەیە، ئەوا ئەو وتەیە ڕاست نی‌یە كە دەڵێ: (لەبەر نەبوونی زاوزێ لە بەهەشتدا، خۆش ویستنی منداڵیشی تێدا نی‌یە و گەمە و گاڵتەش لەگەڵیاندا لەوێ دەست ناكەوێت)..

نەخێر ئەم وتەیە ڕاست نی‌یە. چونكە خۆشەویستیی منداڵان - كە دەسكەوتێكی گەورەیە - و گەمە و گاڵتە كردن لەگەڵیاندا، بە ملیۆنەها ساڵ لە بەهەشتدا، بەوپەڕی ڕێكوپێكی و دوور لە هەموو تاریكی و لێڵی‌یەك بەردەوام دەبێت، لە بریی ئەو دە ساڵە كورت و پڕ ئەشكەنجە و ئازارەی كە لە دنیادا لەگەڵیان دەبرێتە سەر.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕستەی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ هەموو ئەم واتایانەمان پێ‌ڕادەگەیەنێت و، ئەمەش دەبێتە مزگێنی‌یەكی گرنگ بۆ باوەڕداران و بەختیاری‌یەكە بۆ دواڕۆژیان.

● خاڵی دووهەم:

سەردەمێك پیاوێك لە بەندیخانەدا بوو. ماوەیەكی زۆری نەخایاند كوڕە خۆشەویستەكەشیان خستە لای! ئیتر جگە لە ئازاری تایبەتیی خۆی، ئازاری كوڕەكەشی و نەتوانینی دابین كردنی حەوانەوەی، ئەوەندەی تر ئازارەكەی ئەوی زیاد كردبوو..

فەرمانڕەواكەش لەبەر ئەوەی زۆر میهرەبان بوو، مرۆڤێكی نارد بۆ لای ئەم پیاوە كە پێی بڵێت:

(هەرچەند ئەم منداڵە كوڕی تۆیە، بەڵام لە هەمان كاتدا یەكێكە لە دانیشتووانی وڵاتەكەم و گەلەكەم. وا ئێستا دەیبەم بۆ لای خۆم و لە كۆشكێكی گەورەی ڕەنگین و ڕازاوەدا پەروەردەی دەكەم).

باو کە بەند کراوەکەش کە ئەمەی بیست، دەستی‌دایە گریان و ئاخ و ئۆف کردن و خەفەت خواردن.. پاشان وتی:

(نەخێر، ناتاندەمێ.. چونکە ئەم کوڕە هۆی دڵنەواییمە لەم بەندیخانەیەدا)!

هاوەڵەکانی بەندیخانەشی پێیان وت:

(برادەر! هیچ پێویست بە خەم خواردن ناکات و خەفەتیش دادی تۆ نادات. ئەگەر تۆ خەمی کوڕەکەتە، ئەوا ئەو بۆ کۆشکێکی بەرینی ڕازاوە دەڕوات لە بریی مانەوەی لەم بەندیخانە تەنگ و نالەبار و ڕزیوەدا. خۆ ئەگەر خەمی خۆشتە و بە دوای بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆتدا دەگەڕێیت، ئەوا باش بزانە کە ئەگەر کوڕەکەت لێرەدا بۆ مەبەستی دڵدانەوە و خەمڕەوێنیی تۆ بمێنێتەوە – کە ئەمەش سوودێکی کاتی‌یە و لەوانەیشە هەرگیز نەیەتەدی – تووشی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبێت.

بەڵام ئەگەر بڕواتە ئەو کۆشکەی پادشا، دەبێت بە هۆی دەستکەوتنی هەزاران سوود بۆ تۆ، چونکە مانەوەی ئەو لەوێ، دەبێتە تکاکارت و هۆی جووڵاندنی بەزەیی فەرمانڕەوا سەبارەت بە تۆ، ئیتر ڕۆژێك دێتە پێش کە فەرمانڕەوا حەز بکات لەگەڵ کوڕەکەتدا بە یەکتر شاد ببنەوە. خۆ گومانیشی تێدا نی‌یە کوڕەکەت نانێرێتەوە بەندیخانە بۆ لای تۆ، بەڵکو تۆ دەردەکات و دەتباتە ناو ئەو کۆشکە و، لەوێ بە دیتنی شاد و بەختەوەر دەبیت.. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی پادشا بیت و باوەڕت پێی هەبێت).

ئێستاش برای ئازیزم!

دەبێ باوەڕدارانی هاووێنەی تۆ لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەوە بیر بکەنەوە کاتێ منداڵێکیان کۆچی دوایی دەکات. واتە دەبێ بەم جۆرە بیر بکەنەوە:

(ئەم منداڵە بێ گوناهە و پاکە.. بەدیهێنەریشی تابڵێی بە بەزەیی و میهرەبانە.. میهرەبانی و چاودێریی ئەو خواوەندە گەورە و میهرەبانەش بردیەوە بۆ لای خۆی لە بریی ئەو دڵسۆزی‌یە کورت و پەروەردە کەموکووڕەی من و، لە بەندیخانەی ئێش و ئازار و بەڵای دنیا دەربازی کرد و ناردی بۆ بەهەشتە گەورە و ڕازاوەکەی خۆی.. خۆزگەم بە خۆی! چەندە بەختیارە! یاخوا پیرۆز و نۆشی گیانی بێت! کێ دەزانێت گەر لێرە بمایەتەوە چیی دەکرد؟ هەڵسوکەوتی لەم دنیایەدا چۆن دەبوو؟ هەر لەبەر ئەوەشە کە خەفەتی بۆ ناخۆم و بە بەختەوەری دەزانم.

ماوەتەوە بیرێك لە سوودی تایبەتیی خۆم بکەمەوە.

بەڵێ، ئەگەر بمایە، ئەوپەڕی ئەو سوودەی کە لێیەوە دەستم دەکەوت هێندە دەبوو کە دەیتوانی بۆ ماوەی دە ساڵێك خۆشەویستی‌یەکی ئاوێتەی ئازاری دنیام بۆ دابین بکات. دوای ئەوەش ئەگەر کوڕێکی باش و دڵسۆز و لە کاروباری دنیادا لێهاتوو بوایە، لەوانەیە هەندێ یارمەتی و هاوکاریی لەگەڵمدا بکردایە.

بەڵام بە مردنەکەی خۆشەویستی‌یەکی بێ گەردی دەیان ملیۆن ساڵی بەهەشتی هەمیشەیی بۆ دەستەبەر کردم و، بوو بە تکاکارم لە لای خواوەندی میهرەبان، تاکو منیش بڕۆمە بەهەشتی هەمیشەیی خانەی بەختیاری. کەواتە ئەگەر بەرژەوەندیی خۆیشم لێك بدەمەوە، دەبێ هیچ خەفەتێك نەخۆم، چونکە هەر شتێك کە خوا ویستی لەسەر بوونی هەبێت، هەر دەبێ ببێت. لە لایەکی تریشەوە: ئەگەر کەسێك سوودێکی گومان لێکراوی خێرای لە دەست دەرچووبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا هەزار سوودی بێ گومانی داهاتووی ماوەیەك درەنگی بۆ بەجێ مابێت، هەرگیز خەفەت و ئازار دەرنابڕێت و نائومێدی سەری تێ‌ناکات).

● **خاڵی سێ‌هەم:**

ئەم منداڵەی کە کۆچی دوایی کردووە، بەندە و بەدیهاتووی خوایەکی میهرەبان و خاوەن بەزەیی بوو، هەروەك هاوڕێ و برادەرێك بوو خوای گەورە لە لای دایك و باوکی دایدنابوو، تاکو لە ژێر چاودێریی ئەواندا بمێنێتەوە. هەروەها خواوەند ئەو دایك و باوکەی کردبوو بە دوو خزمەتکاری دڵسۆزی ئەو منداڵە. پاداشتی پێشەکی و زووی ئەو خزمەتەیشی پێ بەخشیبوون کە ئەو بەزەیی و شەفەقەتە بەتام و چێژەی باوك و دایکە بەرامبەر منداڵەکانیان. وا ئێستاش هەر ئەو بەدیهێنەرە خاوەن سۆز و بەزەیی‌یە کە - لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆ بەشی ئەو منداڵە هی ئەوە - گەر میهرەبانی و دانستەکەی خواستیان وا بوو منداڵەکە ببەنەوە و کار و ئەرکەکانی ئەستۆی کۆتایی پێ بهێنن، ئایا دەبێ مرۆڤی موسڵمان و ئەهلی ئیمان بگرین و نائومێدی دەربڕن؟ یان ئایا دەگونجێ دەست بکەن بە شین و هاوار و گریان، کە ئەمەش - لە ڕاستی‌دا - دەبێتە سکاڵا کردن لە خاوەنی هەزار بەشەکە لە بەرامبەر بەشێکی ساکاری بچووکەوە؟

ئەم چەشنە ڕەفتارە تەنها لە بێ‌ئاگا و گومڕایانەوە دەوەشێتەوە، نەك ئیمانداران!

● **خاڵی چوارەم:**

ئەگەر دنیا هەتاهەتایی بوایە..

ئەگەر مرۆڤ تیایدا هەمیشەیی بوایە..

یان:

ئەگەر "جودایی" ئەبەدی بوایە..

ئەو كاتە نائومێدی و خەفەت و ئازار واتایەكی تێدا دەبوو..

بەڵام مادەم دنیا میوانخانەیەكی سەرەڕێیە، ئەوا ئەو منالە كۆچ كردووە بۆ هەر لایەك بڕوات، ئێمەش و ئێوەش – هەموومان – بێ گومان دەڕۆین بۆ ئەوێ، ئەم مردنەش تەنها بۆ ئەو نییە، بەڵكو ڕاستە شەقامێكە بۆ هەموان. هەر كەسێك لەم سەرزەوییەدایە دەبێ ڕۆژێك پیایدا بڕوات.

جا لەبەر ئەوەی جودایی هەمیشەیی نییە، ئەوا لە ڕۆژانی داهاتوو، چ لە بەرزەخ و چ لە بەهەشتدا، بە یەكتر شاد دەبنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە كە پێویستە مرۆڤ لە هەڵوێستێكی وادا بڵێت:

(ئەمە فەرمانی خوایە و.. هەر ئەو بەخشیویەتی و هەر ئەویش بردوویەتیەوە).

هاودەم لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ كاڵای ئارامگرتن و شوكرانەبژێری بپۆشین و بڵێین: "الحمد لله علی كل حال".

● خاڵی پێنجەم:

میهرەبانی(شەفەقەت) ناسكترین و جوانترین و شیرینترین و پاكترینی درەوشانەوەكانی میهرەبانیی خواوەندە و، ئیكسیرێكی نوورانییە و، لە عیشق گەلێ كاریگەرترە و، كورترین و زووترین ڕێگا و هۆی گەیشتنیشە بە خواوەندی گەورە.

بەڵێ، هەروەك عیشقی مەجازی و عیشقی دنیایی – دوای بڕینی چەند قۆناغێكی سەخت – مرۆڤ دەگەیەننە "عیشقی حەقیقی" و لەوێوە خاوەنەكەی بە خوای باڵادەست دەگات، میهرەبانی و شەفەقەتیش بە هەمان جۆرە؛ دڵی مرۆڤ بە خوای خۆیەوە پەیوەست دەكات، تاكو لە كورترین ڕێگا و بە جوانترین شێوە و بە بێ هیچ سەختی و گیروگرفتێكیش، بە خوای خۆی شەرەفمەند ببێت.

بێ گومان دایك و باوك – یان هەر كامێكیان – منالەكەیان خۆش دەوێت و پارچەیەكە لە جگەریان. جا هەر كاتێك منالّ لە باوكی دەسێنرێتەوە، گەر ئەو باوكە بەختەوەر و ئیماندار بێت، ڕوو لە دنیا وەردەچەرخێنێت و بەخشندەی ڕاستەقینە دەبینێتەوە و دەڵێت:

(مادەم دنیا دەبڕێتەوە، ئەوا شایانی دڵ پێوە بەستن نییە. خۆ ئەو منالە بۆ هەر لایەك بڕوات، مرۆڤ هەست دەكات كە جۆرە پەیوەندییەكی تایبەتیی لەگەڵدا هەیە).

بەم جۆرە سوودێكی مەعنەویی بەرز و گرنگی دەست دەكەوێت.

ئەم مزگێنی و مژدانەش تەنها بۆ ئیماندارانن. چونكە بێئاگا و گومڕایان لە مزگێنی و بەختەوەریی ئەم پێنج "ڕاستی"یە بێبەشن.

دەتوانن ئەو بارە دەروونییە ئازاربەخش و بەسۆیەی ئەوانتان بۆ دەربكەوێت كاتێ كە هەریەك لەوان بەم جۆرە بیر دەكاتەوە و دەبینێت:

تاقانەیەكی هەیە و زۆریشی خۆش دەوێت، كەچی ئێستاش لە سەرەمەرگدا دەیبینێتەوە و، بیر لە سبەینێی ئەوماڵەی دەكاتەوە لە بریی جێگا و پێخەفی نەرمی ماڵەوەی لەناو خاكدا ڕاكشاوە. هێندەش بە هەڵەدا چووە كە - بە ئەندێشەی خۆی - پێی وایە مردن "نەبوون" و "جودایی"یەكی هەمیشەیی‌یە و، لە لایەكی تریشەوە وا تێدەگات كە مرۆڤ بە هەتاهەتایی لە دنیادا دەمێنێتەوە. ئنجا بە هیچ جۆرێكیش سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەبان و، نیعمەت و بەهەشتە ڕازاوەكەی ئەوی بە دڵدا نایەت!

تۆش دەتوانیت ئەمە بكەیت بە تەرازوویەك و ئەو خەفەت و ئازار و نائومێدی‌یەی ئەوانی پێ هەڵبسەنگێنیت، كە تەنانەت تروسكایی‌یەكیش ڕووناكیی تێدا بەدی ناكەیت، با بۆ خۆت بزانیت تا چ ڕادەیەك تاریك و پڕ لە نائومێدی‌یە.

كەچی لە هەمان كاتدا ئیمان و ئیسلام - كە هۆی بەختەوەریی هەردوو دنیان - بە مرۆڤی باوەڕدار دەڵێن:

ئەم منداڵەی كە ئێستا لە ئازاری سەرەمەرگدایە، دوای دەرباز كردنی لەم دنیا كەم نرخ و فانی‌یە، بەدیهێنەری میهرەبانی دەینێرێت بۆ بەهەشتی بەرینی خۆی و، دەیكات بە تكاكارت لە ڕۆژی دواییدا. پاش ئەوەش دەبێت بە منداڵێكی خۆشەویستی هەمیشەییت.

كەواتە، مەشڵەژێ و هەرگیز خەفەت مەخۆ، چونكە ئەم جودایی و لێكدابڕانەی نێوانتان بۆ ماوەیەكی كاتی و كەم خایەنە. دەسا بۆ خۆت ئارام بگرە و، بڵێ:

"الحكم لله".

﴿إِنَّا لله وَإِنَّا إِلَيهِ راجِعُونَ﴾.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی هەژدەهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

(ئەم مەکتووبە سێ مەسەلەی گرنگی لەخۆ گرتووە)

**☐ مەسەلەی گرنگی یەکەم:**

**پرسیارێك:**

چەند ئەولیایەکی بەناوبانگی وەك "شێخ محێدینی کوڕی عەرەبی"[1] – قُدِّسَ سِرُّه – کە خاوەنی کتێبی "الفتوحات المكية"یە و، "شێخ عەبدولکەریمی جیلی"ش[2] – قُدِّسَ سِرُّه – کە خاوەنی کتێبی "الإنسان الكامل"ە لە بارەی حەوت چینەکانی زەوی و زەوییەکی سپی لەودیوی کێوی قافەوە دەدوێن و، باسی چەند شتێکی سەیری وەك

---

(١) ناوی ئەبوبەکر محەممەدی کوڕی عەلیی کوڕی محەممەدی کوڕی عەرەبیی طائیی ئەندەلوسییە و بە "محێدینی کوڕی عەرەبی" بەناوبانگە و لە نێوان ساڵەکانی: (٥٦٠ – ٦٣٨ ك / ١١٦٥ – ١٢٤٠ ز)دا ژیاوە و نازناوی "الشیخ الأكبر"ی لێ نراوە. یەکێکە لە پێشەوایانی زانستەکانی سەردەمی خۆی. لە شاری "مەرسییە"ی ئەندەلوس لە دایك بووە و پاشان ڕۆشتووە بۆ "ئەشبیلییە" و، گەشتێکی بە وڵاتانی شام و ڕۆم و میسر و عێراق و حیجازدا کردووە و، خەڵکی میسر لە دژی ئەو "شطحات"ەی لە زاری دەرچووبوون لێی ڕاپەڕیبوون و تەنانەت هەندێکیشیان هەوڵی کوشتنیان دابوو، بەڵام خرایە بەندیخانەوە و پاشان "عەلیی کوڕی فەتحی بوجائی" بۆی تێکۆشا و لە بەندیخانە ڕزگاری کرد. دوای ئەوە لە "دیمەشق"دا گیرسایەوە و هەر لەوێشدا کۆچی دوایی کرد. بەناوبانگترینی بەرهەمەکانی بریتین لە: "الفتوحات المكية" و "فصوص الحكم" لە تەصەووف و دەروونناسیدا. بڕوانە: الأعلام ٢٨١/٦ فوات الوفيات ٢٤١/٢ ميزان الإعتدال ١٠٨/٣ جامع كرامات الأولياء ١١٨/١ شذرات الذهب ١٩٠/٥.

(٢) ناوی عەبدولکەریمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدولکەریمی جیلییە و، بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر شێخ عەبدولقادری گەیلانی. ساڵی (٧٦٧ ك) لە دایك بووە و (٨٣٢ك)یش وەفاتی کردووە. فەقیهێکی زاهید و سۆفی مەشرەب بووە و، گەلێ کتێبیشی داناوە، بەناوبانگترینیان کتێبێکە بە ناوی: "الإنسان الكامل في معرفة الأوائل والأواخر". (وەرگێڕ)

"مشمشية" دەكەن، وەك لە "فتوحات"دا هەیە! دەشڵێن: بە چاوی خۆمـان ئـەو شـتانەمان دیوە! ئایا ئەوەی دەیڵێن ڕاستە؟ خۆ ئەگەر بە ڕاستیانە، ئەوا شتی وا لـەم زەوییەی ئێمەدا نییە و، جوگرافیا و زانستەكانی ئێستا دان بەو شتانەدا نـانێن! خـۆ ئەگـەر قسەكانیشیان ڕاست نەبێت ئیتر چـۆن بـوون بـە ئـەولیا و پیاوچاك؟ ئایـا چـۆن دەگونجێ كەسـانێك بـە ئەهلی "حـەق" و "حەقیقـەت" دابنرێن كـە گوفتـاری ئـاوا دژی حەقیقـەت و پێچەوانـەی واقیعی هەستپێكراویان لە زار دەربچێت؟!

وەڵام:

بێگومـان ئەوانـە ئەهــلی "حــەق" و "حــەقیقەت"ن و، لـە هـەمان كـاتدا ئــەهلی "ویـلایەت" و "شهوود"یشن. كەواتە هەرچییەكیان دیوە، ڕاسـتە دیویانـە. بـەڵام هـەندێ جار لە بەشێكی ئەو بڕیارانەی كە سەبارەت بە بینینەكانیان لە جیهانی "شهوود"دا دەری دەكەن ـ كە جیهانێكی بێ سنوورە و شـتانی ناویشـی بـە قـاعیدە و دەسـتوورەكان ڕاگـیر نەكراون ـ هەروەها لـە لێكدانەوەی ئەو بینینەشیاندا كە وەك خـەون وایـە و خۆیـان مـافی لێكدانەوەیان نییە، دووچاری هەڵە دەبن.

چونكە هەروەك ئەو كەسەی كە خەونی دیوە، مـافی ئـەوەی نییـە خەونەكـەی خـۆی لێك بداتەوە، ئەو كەسانەی ئـەهلی "كەشـف و شـهوود"یـش بـە هـەمان جـۆرن، چونكـە مافی ئەوەیان نییە كـە هـەر خۆیـان لـەو حاڵـەتی شـهوودەدا بینینـەكانیان لێـك بدەنـەوە. بەڵكو تەنها زانایانی لێكۆڵەر و میراتگرانی پێغەمبەرانن ـ درووودیـان لەسـەر بێـت ـ كـە پێیـان دەوترێـت "ئــەصفیاء" مـافی لێكدانــەوەی بینینــەكانی ئــەهلی شــهوودیان هەیــە. بێگومان كاتێ ئەهلی شهوود خۆیشیان پتر بەرز دەبنەوە و دەگەنە پلــەی "ئەصفیاء"، بـە ڕێنمایی "قورئان" و "سـوننەت" پـەی بـە هەڵـەكانی خۆیـان دەبـەن و ڕاسـتیان دەكەنـەوە، هەروەك لە ڕاستیدا هەندێكیان هەڵەكانی خۆیان ڕاسـت كردووەتەوە.

ئێستاش بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم ڕاستییە گوێ لەم چیرۆكەی خوارەوە ڕابگرە:

دوو كەسی پیاوچـاك و ئـەهلی دڵ پێكـەوە شـوان بـوون. جارێكیـان هـەندێ شـیریان دۆشییە ناو دەفرێكەوە كە لە دار دروسـت كرابوو، ئنجا شمشاڵە قامیشەكەشیان لەسـەر نێوانی دەفرەكـە دانـا. پاشـان یـەكێكیان هەسـتی بـە وەنـەوز كـرد و هێنـدەی پێ نـەچوو خەوێكی قووڵی لـێ كەوت.

شوانەکەی تر سەیری هاوڕێ نوستووەکەی دەکرد. کتوپڕ شتێکی بچووکی بەوێنەی مێشی بینی کە لە لووتی هاورێکەیەوە هاتە دەرەوە و، پاشان بە خێرایی ڕۆشتە سەر لێواری دەفرەکە و سەیرێکی شیرەکەی کرد و ئنجا ڕۆشتە ناو سەرێکی شمشاڵەکە و لە سەرەکەی تریەوە هاتە دەرەوە. پاشان لە ژێر درەختێکی دڕکاویی نزیکی ئەو شوێنەدا ڕۆشتە ناو کونێکی بچووکەوە.. ئنجا پاش ماوەیەك هاتە دەرەوە و خۆی کردەوە بەناو شمشاڵەکەدا و لەو سەرەوە هاتە دەرەوە و ڕۆشتەوە ناو لووتی هاوڕێ نوستووەکەی. یەکسەر هاوڕێکەی لە خەو هەڵسا و، بەمی وت:

– هەر ئێستا، کە لێرەدا سەرخەوێکم شکاند، خەونێکی سەیرم دی!

هاوڕێکەی وتی:

– یاخوا خێر بێت! چیت دی؟

– لەو خەونەمدا دەریایەکی شیرم دی کە پردێکی سەیر و سەرسووڕهێنی لەسەر دانرابوو. ئەو پردە بنمیچی بۆ کرابوو، بنمیچەکەشی چەندین کلاورۆژنەی تێدا بوو. بەناو پردەکەدا تێپەڕیم و لەو سەرەوە دارستانێکی چڕوپڕم دی کە درەختەکانی نووکیان تیژ بوو. لەم کاتەدا کە من بە سەرسووڕمانەوە سەیرم دەکرد، ئەشکەوتێکم لە بنی درەختەکاندا بینی و، یەکسەر ڕۆشتمە ناویەوە و لەوێ گەنجینەیەکم دۆزیەوە کە یەکپارچە زێری پوخت و خاوێن بوو!

جا تۆ – ئەی هاوڕێکەم! – چی لەم خەونەم تێدەگەیت و چۆن لێکی دەدەیتەوە؟

هاوڕێ بێدارەکەی لە وەڵامدا وتی:

– ئەو دەریا شیرەی کە لە خەونەکەتدا بینیت، ئەم دەفرە شیرەیە.. پردەکەی سەر دەریاکەش ئەم شمشاڵەیە کە لەسەر لێواری دەفرەکەدایە.. دارستانەکەش ئەم ڕووەکە دڕکاوییەیە.. ئەشکەوتە گەورەکەش ئەم کونە بچووکەیە لە ژێر ئەم ڕووەکەی نزیکی خۆماندا. دەسا خێراکە بڕۆ پاچێکم بۆ بهێنە با بە دەستی خۆم گەنجینەکەشت پیشان بدەم!

کە هاوڕێکەی پاچەکەی هێنا و لە ژێر ئەو ڕووەکەدا دەستیان کرد بە هەڵکەندن، هێندەی پێ نەچوو گەنجینەیەکی زێریان دۆزیەوە کە بۆ ئەوە دەست بدات بەختەوەریی دنیای لەسەر بنیات بنێن.

بەم جۆرە، هەرچی هاوڕێ نوستووەکەی لە خەونەکەیدا دیویەتی ڕاست و دروستە و بە حەقیقەت ئەو شتانەی دیوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نوقمی دنیای خەو بووە و

جیهانی خەویش یاسا و دەستووریکی ئەوتۆی نی‌یە کە سنووری بۆ دیاری بکات، ئەوا کەسێك خەونی ببینێت مافی لێکدانەوەی خەونەکەی خۆی نی‌یە، ئەمە جگە لەوەی کە ناشتوانێت جیهانی ماددی و مەعنەوی لە یەك جیا بکاتەوە. لەبەر ئەوە، گەر خۆی لێکی بداتەوە، هەندێ لە بڕیارەکانی هەڵە دەردەچێت. تەنانەت بە ڕاستیەتی کاتێ کە بە هاوڕێکەی دەڵێ: دەریایەکی شیرم دی! بەڵام هاوڕێ بێدارەکەی دەتوانێت بە ئاسانی جیهانی میسال لە جیهانی ماددی جیا بکاتەوە. بۆیە ئەو مافی لێکدانەوەی خەونی هاوڕێکەی هەیە. ئەوەتا پێی دەڵێت:

- ئەوەی لە خەونەکەتدا دیوتە - ئەی هاوڕێی بەڕێزم! - حەق و ڕاستە. بەڵام ئەو دەریایەی بینیت دەریای ڕاستەقینە نی‌یە، بەڵکو دەفری شیرەکەیە لە خەونەکەتدا وەك دەریای لێ هاتووە و، شمشاڵەکەش بووە بە پرد و... هتد.

جا لەسەر بناغەی ئەم نموونەیە: دەبێ جیهانی ماددی و جیهانی ڕۆحانی لە یەك جیا بکرێنەوە. دەنا گەر تێکەڵ بکرێن، ئەوا بڕیارەکانی سەبارەت بەو جیهانانە هەڵە و دوور لە ڕاستی دەردەچن.

نموونەیەکی تر:

وا دابنێ ژوورێکی بچووکت هەیە و، لەسەر هەر چوار دیوارەکەیدا ئاوێنەی گەورە گەورە داکوتراوە بە چەشنێك کە هەموو دیوارەکان بگرێتەوە و دایانپۆشێت. جا کاتێ کە دەڕۆیتە ناو ژوورەکەتەوە دەبینیت ژوورە بچووکەکەت بە ئەندازەی مەیدانێکی گەورە و بەرین فراوان بووە. گەر تۆ لەم حاڵەتەدا بڵێیت:

- ژوورەکەم بە ئەندازەی مەیدانێکی فراوان دەبینم.. لەم گوفتارەتدا، بێ گومان، ڕاست دەکەیت.

بەڵام گەر بڵێیت:

- ژوورەکەم لە ڕاستی و واقیعدا بە ئەندازەی مەیدانەکە فراوانە، ئەوا لە بڕیارەکەتدا بە هەڵەدا چوویت. چونکە جیهانی میسالت - کە لێرەدا جیهانی ئاوێنەکەیە - لەگەڵ جیهانی ڕاستەقینە و واقیعدا - کە لێرەدا جیهانی ڕاستەقینەی ژوورەکەتە - تێکەڵی یەکتری کردووە.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە: ئەو شتانەی لەسەر زاری ئەهلی کەشف و لەناو کتێبەکانیاندا هاتووە، سەبارەت بە وێنەکێشانی حەوت چینەکانی زەوی، بێ ئەوەی بە

تەرازووەكانی قورئان و سوننەت هەڵیان بسەنگێنن، لەگەڵ شێوەی باری جوگرافیی زەوی‌دا یەك ناگرنەوە. چونكە وتوویانە:

یەكێك لە چینەكانی زەوی تایبەتە بە دێوەكانەوە و هەزاران ساڵ ڕێ فراوانە. كەچی لە ڕاستی‌دا سەرانسەری گۆی زەوی، كە بە چەند ساڵێك تەی دەكرێت و دەبڕێت، ئەو چینە سەرسووڕهێن و گەورە و فراوانانەی تێدا نی‌یە!

بەڵام گەر وا دابنێین گۆی زەوی لە جیهانی مەعنا و جیهانی میسال و جیهانی بەرزەخ و جیهانی ڕۆحدا، وەكو تۆوە سنەوبەرێك وابێت، ئەوا ئەو درەختە میسالی‌یەی كە لەو تۆوە پێ‌دەگات و گەشە دەكات و لەو جیهانانەدا تەمسیلی ئەو تۆوە دەكات، درەختێكی سنەوبەری یەكجار گەورە دەبێت لەچاو ئەو تۆوەدا.

لەبەر ئەوەیە كە هەندێ كەسی ئەهلی شهوود لە دەمی سەیر و سلووكی ڕۆحی‌یان و لە جیهانی میسالدا، چینەكانی زەوی زۆر بە فراوانی و بە ماوەی هەزاران ساڵ ڕێ، دەبینن.

كەواتە هەرچی دەبینن ڕاست و حەقیقەتە. بەڵام لەبەر ئەوەی جیهانی میسال بە شێوە و ڕواڵەت لە جیهانی ماددی دەچێت، ئەوا هەردوو جیهانەكە پێكەوە دەبینن و هەرشتێكیشیان دیوە یەكسەر بەو جۆرەی دیویانە دەیگێڕنەوە. جا لەبەر ئەوەی بینینەكانیان بە تەرازووەكانی "قورئان و سوننەت" هەڵنەسەنگاندووە و لەو جیهانەدا چۆنیان دیوە هەروەهاش لە كتێبەكانیاندا تۆماریان كردووە كاتێ هاتوونەتەوە جیهانی بێداری، ئەوا خەڵكی بینینەكانیان بە پێچەوانەی حەقیقەت دەبینن. چونكە هەروەك "وجوودی میسالی"ی كۆشكێكی مەزن و باخچەیەكی ڕەنگین لەناو ئاوێنەیەكی بچووكدا جێی دەبێتەوە، بە هەمان جۆر هەزاران ساڵی جیهانی میسال و حەقیقەتە مەعنەوی‌یەكان لە ماوەی یەك ساڵی جیهانی ماددی‌دا جێیان دەبێتەوە.

**كۆتایی:**

لەم مەسەلەیەوە وا دەردەكەوێت كە:

پلەی "شهوود" گەلێ لە پلەی "ئیمان بە غەیب" نزمترە. واتە كەشفیاتی بێ قاعیدە و دەستووری هەندێ لەو ئەولیایانەی كە تەنها پشت بە كەشفەكانیان دەبەستن، ناگاتە بڕیارەكانی میراتگرانی پێغەمبەران - درووددیان لەسەر بێت - لەو "ئەصفیا" و "لێكۆڵەران"ەی كە پشت بە "شهوود" نابەستن، بەڵكو پشت بە قورئان و وەحی دەبەستن و، بڕیارەكانیان سەبارەت بە حەقیقەتە ڕاست و دروستەكانی ئیمان، لەو

سەرچاوەیەوە دەردەکەن. واتە بڕیارەکانی ئەوان چەند ڕاستییەکی غەیبین، بەڵام خاوێن و بێخڵتەن و، بە تەرازووە شەرعییەکان هەڵسەنگێنراون و سنووریان بۆ دیاری کراوە.

کەواتە، تەرازووی هەموو بارودۆخێکی ڕۆحی و گشت کەشف و چێژ و بینینێك، تەنها هەر دەستووره بەرزەکانی "قورئان و سوننەت" و یاسا حەدسییەکانی ئەصفیا و لێکۆڵەرانن.

**❑ مەسەلەی گرنگی دووهەم:**

**پرسیار:**

کەسانێکی زۆر هەن کە "وحدة الوجود" بە بڵندترینی پلە و مەقامەکان دادەنێن. کەچی هیچ ئاسەوارێکی ئەم پلەیە لای ئەوانە نابینین کە خاوەنی "ویلایەتی کوبرا"ن، وەك: هاوەڵە بەڕێزەکان، لە پێشەکییانەوە، خەلیفە ڕاشیدەکان و.. هەروەها لای ئالی بەیت، لە پێشەکییانەوە ئەو پێنجەیان کە بە "أهل العباء" ناسراون و.. لای موجتەهیدەکانیش، لە پێشەکییانەوە چوار ئیمامەکان و.. هەروەها لای تابیعینیش..

جا ئایا ئەو کەسانەی کە لە دوای ئەو بەڕێزانەوە هاتوون، ڕێگایەکی بەرز و بڵندتریان لە هی ئەوانەی پێش خۆیان دۆزیوەتەوە؟ ئایا لەم بوارەدا پێشیان کەوتوونەتەوە؟

**وەڵام:**

نەخێر، شتی وا ڕووی نەداوە و هەرگیز لە توانای هیچ کەسیشدا نییە - هەر کەسێك بێت - بگاتە ئاستی ئەو ئەصفیایانەی کە نزیکترین ئەستێرەی درەخشانی دەوری خۆری پێغەمبەرایەتی و یەکەم ڕیزی میراتگرانی نبووەت بوون، چ جای ئەوەی کە بتوانن پێشیان بکەون. کەواتە ڕاستە شەقام هەر تەنها ڕێگاکەی ئەوان و ڕێبازی ڕاست و دروستیش هەر تەنها ڕێبازەکەی ئەوانە.

"وحدة الوجود"یش لە ڕاستیدا بریتییە لە مەشرەب و نەزعە و حاڵ و پلەیەکی ناتەواو، بەڵام لەزەتێکی ویجدانی و تام و چێژێکی ڕۆحیی تێدایە. بۆیە زۆربەی ئەو کەسانەی هەڵگری ئەو مەشرەبەن، یان دەکەونە ناوی، حەز ناکەن لێی دەربچن و تیایدا دەمێننەوە و، پێیان وایە کە دواهەمین پلەیە و پلەی تری لە دوا نییە و هیچ ئاسۆیەك نییە لەو ئاسۆیە بڵندتر بێت!

لەبەر ئەوە، هەڵگری ئەو مەشرەبە گەر خاوەنی ڕۆحێکی ڕووت لە "مادده" و هۆکارە ماددی‌یەکان بێت و پەردەی هۆکارەکانی دڕی بێت و شهوودێکی لە ناوەندی ئیستیغراقی هەمەکی‌دا بەدەست هێنابێت، ئەوا لەوانەیە بگاتە "وحدة الوجود"ێکی "حالی" کە لە "وحدة الشهود"ەوە پەیدا بووبێت، نەك "زانستی" کە لە "وحدة الوجود"ەوە پەیدا دەبێت. ئیتر کەماڵ و مەقامێکی تایبەتی بۆ خاوەنەکەی بهێنێتەدی، تەنانەت لەوانەیە بیگەیەنێتە ئەوەی کە لە کاتی چڕکردنی تێڕامانی لە "بوونی خوای گەورە"دا ئینکاریی "بوونی گەردوون" بکات!

بەڵام گەر خاوەنی ئەم مەشرەبە لەو جۆرە کەسانە بێت کە لەناو "مادده" و هۆکارەکانی‌دا نوقم بوون، ئەوا ئیدديعا کردنی "وحدة الوجود" لە لایەن ئەو کەسەوە، لەبەر خەستکردنی تێڕامانی لە "بوونی گەردوون"دا، لەوانەیە بیگەیەنێتە ئینکاریی "بوونی خوای گەورە"!

بەڵێ، ڕێی ڕاستە شەقام تەنها هی هاوەڵە بەڕێزەکان و تابیعین و ئەصفیاکانە کە لەو باوەڕەدان: "حەقیقەتی هەموو شتێك سابت و جێگیر و دامەزراوە". واتە: (حقائق الأشیاء ثابتة) و، ئەمەش دەستوورێکی کوللی‌یە لە لایان. هەروەها دەشزانن کە ئەدەبی شایان دەرحەقی خوای گەورە هەر ئەو فەرمایشتەی خۆیەتی کە دەفەرموێ:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ (الشورى:١١)..

واتە: خواوەند پاك وخاوێنە لە هاوچەشن و شوێن و دابەشبوون و، پەیوەندیشی بە بوونەوەرانەوە پەیوەندیی بەدیهێنەرە بە بەدیهێنراوانیەوە. کەواتە بوونەوەران "ئەوهام" نین وەکو ڕێڕەوانی ڕێبازی "وحدة الوجود" پێیان وایە. بەڵکو ئەم شتە ڕواڵەتی و لەبەرچاوانە هەندێکن لە ئاسەوارەکانی خوای گەورە.

لەبەر ئەوە، وتەکەی ئەوان کە دەڵێن: "همه اوست" واتە: "لا موجود إلاّ هو" ڕاست نی‌یە. بەڵکو ڕاست وایە بوترێت: "همه از اوست" واتە: "لا موجود إلاّ منه" چونکە مومکین نی‌یە کە خودی بەدیهاتووە دروستکراوەکان "ئەزەلی" بن.

دەتوانرێت بە دوو نموونە بابەتەکە لە زەینەکانەوە نزیك بخرێتەوە:

یەکەم: گریمان پادشایەك فەرمانگەی "دادگەری"ی هەبێت، دیارە ئەم فەرمانگەیە نوێنەری یەکێکە لە ناوەکانی پادشا کە ناوی: "پادشای دادگەر"ە.. ئنجا ئەم پادشایە لە هەمان کاتدا "خەلیفە"شە، کەواتە فەرمانگەیەکیشی هەیە کە ئەم ناوەی تێدا

دەربکەوێت.. هەروەك پادشا ناوی سەرکردەی گشتیی سوپاشی لێ نراوە، کەواتە دەبێ فەرمانگەیەکی سەربازیی ببێت ئەو ناوەی بەرجەستە بکات..

جا ئەگەر بوترێ: ئەم پادشایە هەر تەنها ناوی "پادشای دادگەر"ە و جگە لە فەرمانگەی "دادگەری" کە ئەم ناوەی پادشا دەردەخات هیچ فەرمانگەیەکی تر لە گۆڕێدا نی‌یە، گەر وا بوترێ، ئەوا بە ناچاری سیفەتێکی ئیعتیباریی ناحەقیقی بۆ وەسف و حاڵەتەکانی زانایانی فەرمانگەی کاروباری ئایینی لە ناوەندی کارمەندانی فەرمانگەی دادگەری‌دا دەردەکەوێت. واتە ئەو کاتە دەبێ تەسەووری سیفەتێکی سێبەرئاسا و شوێنکەوتە بۆ فەرمانگەی کاروباری ئایینی بکرێت لە ناوەندی کارمەندانی فەرمانگەی دادگەری‌دا. حاڵی فەرمانگەی سەربازیش بە هەمان جۆرە، چونکە ئەو کاتە دەبێ کاروبار و مامەڵەکانی ئەم فەرمانگەیە بە شێوەیەکی سێبەرئاسا و گریمان و ناحەقیقی لە ناوەندی کارمەندانی فەرمانگەی دادگەری‌دا دەربکەوێت.. فەرمانگەکانی تریش بە هەمان جۆر..

کەواتە لەم حاڵەتەدا تەنها ناوی "فەرمانڕەوای دادگەر" و سیفەتی فەرمانڕەوایی‌یەکەی لە فەرمانگەی دادگەری‌دا، بە "ناو" و "سیفەت"ی ڕاستەقینەی پادشا دەردەکەوێت و.. ناوەکانی تری وەك: "خەلیفە" و "سەرکردەی گشتیی سوپا" و... هتد، بە نیسبی و ناحەقیقی دەمێننەوە. کەچی لە ڕاستی‌دا ماهییەتی پادشا و حەقیقەتی پادشایی‌یەکەی داخوازی سەرجەمی ئەو ناوانەن بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و، ئنجا ئەو ناوانەش داواکار و داخوازی ئەوەن کە ئەوانیش فەرمانگەی ڕاستەقینەی خۆیان ببێت.

هەر بەم جۆرەش، پەروەردگاریتیی خوای گەورە داخوازی بوونی چەندین ناوی جوانی ڕاستەقینەیە، وەك: "الرحمن، الرزاق، الوهاب، الخلاق، الفعال، الكريم، الرحيم". ئەم سیفەت و ناوانەش بە هەمان جۆر داخوازی بوونی چەند ئاوێنەیەکی ڕاستەقینەن تاکو تیایاندا دەربکەون و بدرەوشێنەوە.

جا مادەم ڕێڕەوانی ڕێبازی "وحدة الوجود" دەڵێن: "لاموجود إلا هو"، بەمەش سەرجەمی "بوونەوەران" دادەگرنە پلەی "ئەندێشە" و "عەدەم"، ئەوا هەر تەنها ئەو ناوانەی خوای گەورە چەشنی: "واجب الوجود، الموجود، الاحد، الواحد" لەبەر چاویاندا بە جۆرێکی ڕاستەقینە دەردەکەون و لەناو فەرمانگەکانیاندا بە چەشنێکی ڕاستەقینە دەدرەوشێنەوە. تەنانەت گەر فەرمانگە و ئاوێنەکانی ئەم ناوانە حەقیقی و

ڕاستەقینەش نەبن - بەڵکو عەدەمی و ئەندێشـەیی بن - هیـچ زیـانێك لـەو ناوانـه نـادات، بگره لەوانەیه وجـووده حەقیقی‌یەکـه خاوێنـتر و بریسـکەدارتر دەربکـەوێت گـەر ڕەنگی وجـوود لـە ئاوێنەکـەی‌دا نـەبێت. بەڵام لـەم حاڵەتـەدا نـاوه جوانـەکانی تـری چەشـنی: "الرحـمن، الرزاق، القهار، الجبـار، الخـلاق" دەرکـەوتن و دەرەوشـانەوەی ڕاستەقینەیان نابێت، بەڵکو دەبن بە چـەند نـاوێکی ئیعتیبـاری و نیسبی. لـە کـاتێکدا کـه ئـەم ناوانـەش کتومـت وەك نـاوی: "الموجـود" حـەقیقی و ڕاسـتەقینه و ڕەسـەنن و، هـەرگیز نـاکرێت سێبەر و شوێنکەوته بن.

جا هاوەڵه بەڕێزەکان و موجتـەهیدان و پێشـەوایانی ئـالی بـەیت - خوایـان لـێ ڕازی بێت - کاتێ ئاماژه بۆ دەسـتووری: "حقائق الأشياء ثابتة" دەکەن، دان بـەوەدا دەنێـن کـه نـاوه جوانـەکانی خـوای گـەوره خـاوەنی درەوشـانەوەی ڕاستەقینەن و، هـەموو شـتانی مەوجوودیش دارای "بوون"ێکن که خوای گەوره لە ڕێی بەدیهێنانیانەوه پێی بەخشیون. خۆ هـەرچەنده ئەم "بوون"ە لەچـاو "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود"دا به سـێبەر و بوونێکی لاوەکی و لاواز دادەنرێـت، کـەچی لەگـەڵ ئەمەشـدا "بـوون"ێکی وەهمـی و ئەندێشەیی نی‌یه، چونکه خواوەند خۆی لە ڕێی درەوشانەوەی ناوی "الخلاق"ی خۆیەوه سیفەتی "بـوون"ی بـه شـتانی نـاو بوونـەوەر بەخشـیوه و هـەر خۆیشـی درێـژه بـه بوونیـان دەدات.

*نموونەی دووهەم:* با وا دابنێین که هەر چـوار دیـواری ئـەم ژوورەمـان چـوار ئاوێنـەی گـەورەیان لەسـەر قـایم کرابێـت. کەواتـه وێنـەی ژوورەکـه لەسـەر هـەموو یـەکێکی ئاوێنەکان دەردەکەوێت. بەڵام ئەوەنده هەیه که هەر یـەك لـەم ئاوێنانـه بـەو شـێوەیەی کـه لەگـەڵ ڕەنـگ و سـیفەتی خـۆی‌دا بگونجێـت وێنـەکان دەردەخـات، واتـه هـەر یەکـەیان دیمەنێکی تایبەتیی ژوورەکه پیشان دەدات..

جا ئەگەر دوو پیاو ڕۆشتنه ناو ژوورەکەوه و یەکێکیان چـاوی بـه یـەکێك لـەم چـوار ئاوێنەیـه کـەوت، ئـەوا لـەو بـاوەڕەدا دەبێـت کـه: هـەرچی شـتی نـاو ژوورەکەیـه لـه ئاوێنەکەی‌دا دەرکەوتووه. خۆ کاتـێ کـه دەبیسـتێت ئاوێنـەی تر لـه ژوورەکـەدا هەیـه و ئەوانیش وێنەی شتانی ناو ژوورەکه پیشان دەدەن، پێـی وا دەبێـت کـه ئەوانـه وێنـەی ئـەو ئاوێنـه بچووکانـەن کـه بـه بچووکـی لـه ئاوێنەکـەی خـۆی‌دا دەردەکـەون و جێگایـەکی کەمیان تێـدا گرتـووه، دوای ئـەوەی کـه دوو جـار بچـووك بوونەتـەوه و حەقیقەتەکەیان گۆڕانی بەسەردا هاتووه! بۆیه دەڵێت:

– من وێنە کە بەم جۆرە دەبینم، کەواتە حەقیقەت ئەمەیە کە من دەیبینم!

بەڵام پیاوی دووهەم پێی دەڵێت:

– بەڵێ وایە، تۆ وا دەبینیت و بینینەکەشت ڕاستە. بەڵام لە واقیعدا ئەوەی تۆ دەیبینیت وێنەی خودی حەقیقەتەکە نی‌یە، چونکە جگە لەو ئاوێنەیەی کە تۆ تیای‌دا دەڕوانیت چەند ئاوێنەیەکی تریش هەیە و، ئەوانیش بچووك و ڕەنگدانەوەی سێبەرەکان نین وەك تۆ لە ئاوێنەکەتدا دەیانبینیت.

بە وێنەی ئەم نموونەیە، هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورەش داخوازی ئاوێنەی سەربەخۆی خۆیانن. بۆ نموونە: مادەم ناوە جوانەکانی: "الرحمن، الرزاق" دوو ناوی ڕەسەن و حەقیقین، ئەوا داخوازی "بوون"ی بوونەوەرانێکن کە شایستەی ئەوان بن و موحتاجی ئەم چەشنە ڕۆزی و میهرەبانی‌یە بن.

جا هەروەك ناوی "الرحمن" داخوازی چەند بەدیهاتوویەکی زیندووی ئەوتۆیە کە لە جیهانێکی ڕاستەقینەدا پێویستیان بە ڕۆزی بێت، ناوی "الرحیم"یش داخوازی بوونی بەهەشتێکی ڕاستەقینەیە.

لەبەر ئەمانە، دانانی تەنها چەند ناوێکی دیاریکراوی چەشنی: "الموجود، الواحد، الاحد، واجب الوجود" بە ناوی ڕاستەقینە و، وەهمکردنی ئەوەی کە ناوەکانی تر سێبەر و شوێنکەوتەی ئەوانە بن، بڕیارێکی دادپەروەرانە نی‌یە و لادانە لە واجبی ڕێزنانی پێویست لەم ناوە جوانانە.

کەواتە ڕاستە شەقام، بەڵکو ڕێی "ویلایەتی کوبرا" هەر تەنها ڕێی هاوەڵە بەڕێزەکان و ئەصفیا و تابیعین و پێشەوایانی ئالی بەیت و پێشەوا موجتەهیدەکانە، خوایان لێ ڕازی بێت. کە ڕێیەکە دەستەی یەکەمی قوتابییانی قورئانی پیرۆز گرتوویانەتەبەر.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيم﴾.

﴿رَبَّنا لا تُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّاب﴾.

اللّهم صلّ على مَن أرسلتَه رحمةً للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين.

**❐ مەسەلەی سێهەم:**

بریتی‌یە لەو مەسەلە گرنگەی کە هەرگیز ناگونجێ بە "زیری" شی بکرێتەوە و، بە حیکمەت و فەلسەفەش ناتوانرێت دەربخرێت.

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ (الرحمن:٢٩).

﴿فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ﴾ (البروج:١٦).

**پرسیار:**

نهێنی و حیکمەتی ئەم کارایی(فعالیـة)یە چی‌یە کە مرۆڤ سەرسام دەکات و لـەم گەردوونەدا دەست بەکارە؟ بۆچی ئەم بوونەوەرە هەمیشە بزۆکانە هیچ کات لـە جوولـە ناوەستن، بەڵکو بەردەوام دەگۆڕێن و نوێ دەبنەوە؟

**وەڵام:**

ڕوونکردنەوەی ئەم دانستە هـەزار لاپـەڕەی دەوێـت. بۆیـە ئێستا ئـەو ڕوونکردنەوەیـە دەخەینە لاوە و، وەڵامەکەی بەوپەڕی پوختی لە دوو لاپەڕەدا جێ دەکەینەوە و دەڵێین:

هەرکەسێك ئـەرکێکی سروشتی ئـەنجام بـدات یـان کـارێکی گرنگـی کۆمەڵایـەتی جێبەجێ بکـات و بـۆ ئـەنجامدانی ئـەو کـارە هـەوڵێکی سـەرومڕ بـدات، ئـەوا بێ‌گومـان هەرکەسێك ببینێت هەست دەکات کە ئـەنجامدەری ئـەو کـارە لەبـەر دوو هـاندەر کارەکەی ڕادەپەڕێنێت:

یەکەم: لەبەر ئەو بەرژەوەندی و بەروبووم و سوودانەی کە ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەو ئەرك و کارمەندی‌یەن و پێیان دەوترێ: "عیللەتی غائی".

دووهەم: مرۆڤ لـە دەمی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەدا هەسـت بـە خۆشویسـتن و شـەوق و لەزەتێك دەکـات و، ئەمانـەش هـانی دەدەن کـە بـە گـەرموگوڕی و شـەوقەوە کارەکـەی ڕابپەڕێنێت. ئەمەیان پێی دەوترێت: "داواکار و داخواز"(الداعي والمقتضي).

"خواردن" نموونەیەکە بۆ ئەمە..

ئەوەتا "خواردن": کارمەندی و ئەرکێکی سروشتی‌یە و، مـرۆڤ بـە هـاندەری چێـژ و لەزەتی ئیشـتیهای خـواردن و، بـە شـەوق و تاسـەوە حـەز دەکـات ئـەنجامی بـدات. ئنجـا دوای ئەنجامدانی ئەم کارە، گەشە کردنی لەش و بەردەوامبوونی ژیانیش - وەك ئـەنجام و بەروبوومێکی ئەو خواردنە - پەیدا دەبێت.

سەبارەت بە خوای گەورەشـەوە — ولله المثل الأعلى - ئەوا ئەو کارایی‌یـەی کـە لـەم گەردوونـە فراوانـەدا دەسـت بـەکارە و دڵـی مـرۆڤ سەرسـام و ژیریشـی گرفتـاری سەرسووڕمان و حەپەسان دەکات، پاڵی بە دوو بەشـی ناوەکـانی خواوەنـدەوە داوە و لـە

ئەنجامی دەرخستنی دوو حیکمەتی فراوانەوە جێبەجێ دەبن کە هەریەکەیان هێندە فراوانن سنوورێك نییە دیاری و دەستنیشانیان بکات.

**حیکمەتی یەکەم:**

"ناوە جوانەکانی خوای گەورە" گەلێ درەوشانەوەی بێ ژمارە و بێ سنووریان هەیە، چونکە جۆراوجۆریی لە ڕادەبەدەری بەدیهاتووان ئەنجامی جۆراوجۆریی ئەو درەوشانەوە بێسنوورانەیە.

واتە ئەو ناوە جوانانە داخوازی ئەوەن کە درەوشانەوەی جوانییەکەیان لە ئاوێنەی نەخش و نیگارەکانیاندا ببینن و پیشانی غەیری خۆشیانی بدەن. بەو واتایەی کە ئەو ناوە جوانانە داخوازی نوێ بوونەوەی کتێبی گەردوونن، واتە نوێ بوونەوەی دەم بە دەم و چرکە بە چرکەی ئەو بوونەوەرانە بە بەردەوامی و بێ ڕاوەستان.

بە واتایەکی تر: ئەو ناوانە داخوازی ئەوەن کە بوونەوەران سەرلەنوێ و هەمیشە بە نووسینێکی ڕەوان و دانا و پڕ لە واتای ورد، بنووسرێنەوە، بە چەشنێکی ئەوتۆ کە هەموو یەکێ لەو نووسراوانە خۆی لە پێش چاوی بەدیهێنەرەکەیدا و لە بەرچاوی بوونەوەرە خاوەن هەست و شعوورەکانیشدا دەربخات و هانیان بدات بۆ خوێندنەوەی.

**هۆکار و حیکمەتی دووهەم:**

هەروەك کارایی ناو سەرجەمی بوونەوەران لە سەرچاوەی لەزەت و ئیشتیها و شەوقێکەوە هەڵقوڵاوە، تەنانەت هەموو کاراییەك لەزەتێکی تێدایە، تەنانەت هەریەك لەو کاراییانە - خۆی لە خۆیدا - جۆرێکە لە جۆرەکانی چێژ و لەزەت..

سەبارەت بە خواوەندیشەوە - ولله المثل الأعلى - شەفەقەت و مەحەبەتێکی موقەددەس و ڕەهای وای هەیە کە شایانی خواوەند بن و لەگەڵ دەوڵەمەندی و بەرز و بڵندی و خاوێنی و کەماڵی ئەودا بگونجێن و شایانی بن.. پاشان شەوقێکی ڕەها و موقەددەسیشی هەیە کە لەو شەفەقەت و مەحەبەتەوە هاتووە.. ئنجا شادمانییەکی موقەددەسی هەیە کە لەو شەوقە موقەددەسەوە سەرچاوەی گرتووە و.. لەزەتێکی موقەددەس و شایانیشی هەیە - گەر ئەم تەعبیرە دروست بێت - کە لەو شادمانییە موقەددەسەوە پەیدا بووە و.. پاشان میهرەبانییەکی ڕەهایشی هەیە کە لەو لەزەتە موقەددەسەوە هەڵقوڵاوە..

جا هەرچی ڕەزامەندیی گشتی و کەمالی شامیل - لە ناوەندی کارایی توانستدا - لە سەرجەمی بوونەوەرانەوە سەرهەڵدەدات و، ئەنجامی کامڵ بوونیان و دەرچوونی توانا و لێهاتنیانە لە دۆخی "هێز"ەوە بەرەو دۆخی "کار".. هەرچی لەمانەوە پەیدا دەبێت و سەرهەڵدەدات لە: "ڕەزامەندیی موقەددەس" و "شانازیی موقەددەس" - گەر ئەم تەعبیرانە دروست بن - هەموو ئەوانە، بەو شێوەیەی کە شایان و تایبەت بن بە خواوەندی بەخشندەی میهرەبانەوە، داخوازی کارایییەکی ڕەها و بێ سنوورن.

جا لەبەر ئەوەی فەلسەفە و زانست پەی بەم حیکمەتە وردە نابەن کە لەم کارایییە دەست بەکارەی ناو بوونەوەردا هەیە، ئەوا، فەیلەسووف و زاناکان دەچن: "سروشت"ی کەڕ و لاڵ و.. "ڕێکەوت"ی کتوکوێر و.. "هۆکار"ە وشك و بێ گیانەکان تێکەڵی ئەم کارایییە بینەرە زانا و دانایە دەکەن. بەو پێیە نەیانتوانی ڕێ بە نووری حەقیقەت ببەن، بەڵکو گەلێ دوور کەوتنەوە و لە ڕێ ترازان.

﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِم يَلْعَبُونَ﴾.

﴿رَبَّنا لا تُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ﴾.

اللّهم صلِّ وسلِّم على كاشفِ طلسمِ كائناتك بعدد ذرات الموجودات وعلى آله وصحبه ما دام الأرضُ والسموات.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی نۆزدەهەم

ئەم پەیامە زیاتر لە سێ سەد دانە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ ڕوون دەکاتەوە، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتی‌یەکەی. لە هەمان کاتیشدا دەری دەخات کە خۆی لە خۆی‌دا یەکێکە لە کەرامەتەکانی ئەو موعجیزانە و بەخششێکە لە بەخششەکانی ئەوان. بەم جۆرە، ئەم پەیامە شتێکی "خاریق" واتە دەراسا و لەعادەت‌بەدەرە، لە سێ ڕووەوە:

**یەکەم**: دانانی ئەم پەیامە، بێ هیچ گومانێك، کارێکی لەعادەت‌بەدەر بوو. چونکە سەرەڕای هێنان و ڕیوایەت‌کردنی ئەو فەرمووده زۆرانەی کە لە سەد لاپەڕە زیاتردا هەن، بە بێ گەڕانەوە بۆ هیچ سەرچاوەیەك دانراوە و، لەم کارەدا تەنها پشت بە "لەبەربوون" بەستراوە. سەرەڕای ئەوەش کە لە دەرەوەی ئاوەدانی و لەناو دۆڵ و چیا و لە دەوروبەری باخ و بێستانەکاندا و، لە نزیکەی چوار ڕۆژ و، ڕۆژی بۆ ماوەی سێ سەعات "واتە لە دوازدە سەعاتدا" دانراوە!

**دووهەم**: سەرەڕای دووررودرێژیی ئەم پەیامە، هەرکەسێك دەینووسێتەوە، چەندەش نوسخەی زۆری لەبەر بگرێتەوە، هەر لە نووسینەوەی بێزار نابێت و.. خوێندنەوەی بەردەوامیشی تام و لەزەتەکەی لەناونابات.

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە هیممەتی نووسەرەوە تەمبەڵەکانیشی بزواند و هانی‌دان بۆ نووسینەوەی، بە ڕادەیەك کە هەر لە دەوروبەری خۆمان و لە ماوەی تەنها یەك ساڵ و لەو کات و بارودۆخە دژوارەدا، نزیکەی حەفتا دانەیان لێ نووسی‌یەوە. ئەمەش قەناعەتی بە کەسانی ئاگاداری بارودۆخ بەخشی کە ئەم پەیامە یەکێکە لە کەرامەتەکانی ئەو موعجیزانە.

**سێهەم**: وشەی: "ڕەسوولی ئەکرەم"(پێغەمبەر) ﷺ لە هەموو پەیامەکەدا، لەگەڵ وشەی: "قورئانی پیرۆز" لە کەرتی پێنجەمدا، لە لای یەکێك لە نووسەرەوەکان بە یەك ئەندازە دەرچوون، بێ ئەوەی خۆی بەمەی زانیبێت. هەمان "تەوافوق" لە ژمارەی ئەم وشانەدا لە لای هەشت نووسەرەوەکەی تریش ڕووی دا، بێ ئەوەی کەسیان بە کەسی تریان گەیشتبن، تەنانەت پێش ئەوەش خۆمان بەمەمان زانیبێت. جا هەرکەسێك خاوەنی کەمێك ویژدان بێت، هەرگیز ئەم دیاردەیە ناخاتە ئەستۆی ڕێکەوتەوە. بەڵکو هەموو

کەسێك لەوانەی کە ئاگاداری ئەم کارە بوون، بە یەکێك لە نهێنیەکانی "غەیب"و کەرامەتێك لە کەرامەتەکانی موعجیزەی پێغەمبەریان ﷺ لە قەڵەم دا.

ئەمە لە لایەکەوە..

لە لایەکی تریشەوە: بنچینەکانی سەرەتای ئەم پەیامە گەلێ گرنگن و.. ئەو فەرموودانەش کە لەم پەیامەدان، سەرەڕای ئەوەی هەموویان "صحیح"ن و، لە لای زانایانی "زانستی فەرموودە" باوەڕ پێ کراون، سەرەڕای ئەمە و، لە هەمان کاتیشدا، ئەم پەیامە زیاتر ئەو ڕیوایەتانەی هێناوە کە لە هەموویان چەسپاوتر و بێ گومانترن.

جا ئەگەر بمانەوێ سەرجەم سیفەتەکانی ئەم پەیامە باس بکەین، ئەوا پێویستمان بە پەیامێکی تر دەبێت! لەبەر ئەوە، داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بەتاسەوەن بۆ ئەم پەیامە، دەست بە خوێندنەوەی بکەن و، گەر بۆ یەك جاریش بووە بیخوێننەوە، تاکو خۆیشیان هەست بەو سیفەتانە بکەن کە لەم پەیامەدا هەن.

**سەعیدی نوورسی**

**ئاگادارکردنەوەیەك:**

لەم پەیامەدا چەندین فەرموودەی پیرۆزی زۆرم هێناوە. لە کاتی دانانیشیدا هیچ کتێبێکی فەرموودەم لە لا نەبوو. جا ئەگەر لە وشەی هەر فەرموودەیەکدا هەڵەیەکم کردبێت، با چاك بکرێتەوە، یان بە "الرواية بالمعنى" وەربگیرێت. چونکە وتەی پەسەندکراوی زانایان لەم بارەیەوە ئەوەیە کە دروستە فەرموودە بە مەعنا ڕیوایەت بکرێت. واتە گێڕەرەوەی فەرموودە بۆی هەیە واتای فەرموودەکە بە وشەی خۆی دەرببڕێت. جا هەر هەڵەیەك لە وشەی فەرموودەکاندا هەبوو، با بەم چاوە سەیر بکرێت.

**سەعیدی نوورسی**

---

**تێبینی:**

ئەگەر لە داوێنی هەر پەراوێزێکی مەکتووبی نۆزدەهەمدا نەنووسرابوو: (دانەر) ئەوە یان هی وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکەیە، یان هی ئێمەیە. یان تەخریج کردنی "فەلاح عەبدوڕڕەحمان"ە و بە پوختی هێناومانە.

(وەرگێڕ)

## موعجیزاتی ئەحـمەدی

جوانترین درووود و سلاو لەسەر خاوەنەکەیان بێت

باسمه سبحانه

﴿وإنْ مِنْ شَيْءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِه﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً ۞ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّآءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمآءُ بَيْنَهُمْ تَراهُمْ رُكَّعاً سُجَّداً يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللهِ وَرِضْواناً سِيماهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُود ذلكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاة وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْئَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ (الفتح: ٢٨-٢٩).

**(لەبەر ئەوەی لە وتەی "نۆزدەهەم" و "سی و یەکەم"دا پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرمان ﷺ بە چەندین بەڵگەی توندوتۆڵ و بەهێز چەسپاند، ئەوا با خوێنەری بەڕێز لە کێشەی چەسپاندنی پێغەمبەرێتییەکەیدا سەیری ئەو دوو وتەیە بکات. بەڵام لێرەدا بۆ مەبەستی تەواوکردنی ئەوانەی لەوێدا باس کراون، چەند بریسکەیەك لەو ڕاستییە گەورەیە ڕوون دەکەینەوە، لە نێوان "نۆزدە" ئاماژەی ڕەوان و پڕ لە واتادا).**

## ئاماژەی ڕەوانی یەکەم

گومان لەوەدا نییە کە پەروەردگار و دەستەڵاتداری ئەم گەردوونە، هەر کارێك دەکات، بە زانایی و دانایی دەیکات. کەواتە هەموو شت و لایەنێکی ئەم گەردوونە دەبینێت و تەگبیر و پلانی بۆ دادەڕێژێت و بە زانستی خۆیشی هەموو شتێك چارەسەر و

پەروەردە دەكات. ئەمەش بۆ مەبەستی ئاشكرا كردن و دەرخستنی چەند دانایی و ئامانجێك كە لەو شتانەدا دەبینرێن.

جا لەبەر ئەوەی بەدیهێنەر زانایە، ئەوا دەبێ گۆیاش بێت، واتە بیشدوێت. دیارە گوفتار و قسەكردنیشی لەگەڵ ئەوانەدا دەبێت كە خاوەنی هەست و بیر و تێگەیشتنن. تەنانەت لەگەڵ ئەوانەدا دەدوێت كە باشترین جۆرەكانی خاوەن هەست و شعوور و تێگەیشتنن كە "مرۆڤ"ە. جا مادەم گوفتار و قسەكردنی لەگەڵ مرۆڤدایە، ئەوا لەگەڵ ئەو كەسانەدا دەدوێت كە شایستەی ئەوەن خواوەند گوفتاریان ئاراستە بكات و لە پێگەیشتووانی نەوەی مرۆڤن و، خاوەنی توانا و لێهاتوویی و ئامادەیی‌یەكی بەرزن و، چەندین ڕەوشتی جوان و شیرینیان هەیە و، شیاوی ئەوەن كە پێشەوا و پێشڕەوی بەرەی مرۆڤ بن. كەواتە هیچ گومانێك لەوەدا نی‌یە كە ئەو خواوەندە لەگەڵ كەسێكدا دەدوێت (مەبەست حەزرەتی محەممەدە ﷺ) كە هەموو دۆست و دوژمنێكی شایەتیی بۆ دەدەن لەسەر ئەوەی خاوەنی بەرزترین توانا و لێهاتن و جوانترین ئاكار و ڕەوشتە.. ئەو كەسەی كە پێنجیەكی خەڵكی جیهان شوێنی كەوتوون و شوێن پێ‌یان هەڵگرتووە و، لە ژێر سایەی ئاڵا مەعنەوی‌یەكەی ئەودا نیوەی دانیشتووانی ڕووی زەوی ڕیزیان بەستووە و، بەو نوورەی كە لە لای خواوەندەوە هێنای، بە درێژایی سیازدە سەدەی ڕەبەق، ئایندەی ڕووناك كردەوە.. ئەو كەسەی كە هەرچی ڕۆژە ئیمانداران پێنج جار پەیمانی لەگەڵدا نوێ دەكەنەوە و، داوای میهرەبانی و بەختەوەری و ستایش و خۆشەویستیی لە خوای گەورە بۆ دەكەن.. ئەو كەسەی كە خواوەند خۆشی ویستووە و، هەڵی بژاردووە و، ستایشی كردووە.

بەڵێ، لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا ﷺ دەدوێت، وەك لە ڕاستی‌دا لەگەڵی دوا.. دەیشیكات بە پێشەوای خەڵكی، هەروەك لە ڕاستی‌دا كردی بەو پێشەوایە.

## ئاماژەی ڕەوانی دووهەم

پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەرێتیی خۆی ئاشكرا كردووە و، بەڵگەشی لەسەر ئەمە پێشكەش كردووە، كە بریتی‌یە لە "قورئانی پیرۆز". نزیكەی هەزار موعجیزەشی بە ڕوونی پیشان داوە، هەروەك لە لای زانا لێكۆڵەرەكان چەسپاوە[1].

---

(١) بروانە: "فتح الباري" لابن حجر العسقلاني (٥٨٢/٦ - ٥٨٣) و "صحيح مسلم بشرح النووي" ٢/١.

ئەم موعجیزانەش بە گشتی و بە چەشنی چەسپاویی دەعوای پێغەمبەرێتی‌یەكەی، بێ‌گومان و چەسپاون. بەڵكو ئەوەش كە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی كافرەكانەوە دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ئەو كافرانە موعجیزاتی پێغەمبەریان بە "سیحر" لە قەڵەم داوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە تەنانەت ئەو كافرانەش دانیان بە ڕوودانی موعجیزەكانی پێغەمبەردا ﷺ ناوە و نەیانتوانیوە ئینكاریی بكەن. بەڵام لەبەر خۆخلافاندن و لەخشتەبردنی شوێنكەوتووانیان، ناوی سیحریان لەو موعجیزانە ناوە!

بەڵێ، بە ئەندازەی سەد دانە "تەواتور" موعجیزەكانی پێغەمبەر ﷺ موتەواتیر و بێ‌گومان و چەسپاون، كەواتە هیچ ڕێگایەك نی‌یە كە بۆ ئینكاری كردنی ئەو موعجیزانە بگیرێتەبەر.

موعجیزەش - خۆی لە خۆیدا - تەسدیقی خواوەندی پەروەردگارە بۆ دەعوای پێغەمبەرەكەی. واتە وەك ئەوە وایە خواوەند بفەرموێ: (ئەم بەندەیەی من ڕاست دەكات، دەسا ئێوەش بەگوێی بكەن)!

نموونەیەك بۆ ڕوونكردنەوەی ئەمە:

ئەگەر لە دیوەخانی پادشا و بە ئامادەبوونی خۆی، بە كەسانی دەوروبەری خۆتت وت: "پادشا فلانە كاری بە من سپاردووە ئەنجامی بدەم"، كەسانی دەوروبەریشت داوای بەڵگەیان لەسەر ئەم قسەیە لێ كردیت و، لەو كاتەدا پادشا ئاماژەی كرد كە: بەڵێ ڕاست دەكات ئەو كارەم پێ سپاردووە، ئایا ئەم ئاماژەیەی پادشا باشترین و ڕاسترین بەڵگە نابێت بۆ دەعواكەی تۆ؟ خۆ ئەگەر پادشا لەوەش زیاتری بۆ كردیت و، لەسەر داوای خۆت یاسا ئاسایی‌یەكانی ڕۆژانەی خۆی بۆ گۆڕییت، ئایا ئەم كارەی پادشا باشترین تەسدیق و سەلماندن نابێت بۆ دەعواكەت؟ یان ئایا لەوە بەهێزتر نی‌یە كە بلێت: (بەڵێ، ڕاست دەكات)؟

دەعوای پێغەمبەریش ﷺ لە پێغەمبەرێتی‌دا هەر بەو جۆرەیە، چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: من نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهانیانم، بەڵگەشم لەسەر ئەم دەعوایەم ئەوەیە كە كاتێ پەنا و هانا بۆ خواوەند دەبەم و لێی دەپاڕێمەوە، ئەو خواوەندە یاسا ئاسایی‌یەكانی خۆی دەگۆڕێت. ئەوەتا سەیری "پەنجەكانم" بكەن كە بە وێنەی پێنج سەرچاوە ئاویان لێ هەڵدەقوڵێت.. سەیری "مانگ" بكەن كە چۆن خواوەند تەنها بە ئاماژەیەكی پەنجەم دوو كەرتی دەكات.. سەیری ئەو "درەخت"ە بكەن كە چۆن دێت بۆ لام و تەسدیقم دەكات و شایەتی لەسەر پێغەمبەرێتیم دەدات.. بۆ ئەو مشتە خۆراكە

بڕوانن کە تەنانەت بەشی دوو سێ کەسیش ناکات، کەچی وای لێ دێت بەشی دووسەد و سێ سەد کەس بکات..

بەم جۆرە، پێغەمبەر ﷺ سەدان موعجیزەی وەك ئەمانەی پیشان داوە.

ئەوەش بزانە کە بەڵگەکانی ڕاستی و پێغەمبەریێتیی پێغەمبەر ﷺ تەنها لەو موعجیزانەدا نی یە، بەڵکو زانا وردەکار و لێکۆڵەرەکان ڕایان وایە کە هەموو ڕەفتار و کاروبار و ئاکار و گوفتار و ژیان و شێوەیەکی پێغەمبەر ﷺ ئیخلاس و ڕاستگۆیی ئەو دەچەسپێنن. تەنانەت بەشێکی زۆری زانا جوولەکەکان، وەك "عەبدوڵڵای کوڕی سەلام" تەنها بە چاوکەوتنیان بە پێغەمبەر ﷺ باوەڕیان پێ هێنا. ئەوەتا "عەبدوڵڵای کوڕی سەلام" دەڵێت: (هەر کە چاوم بە ڕوخساری پیرۆزی ئەو کەوت، زانیم ڕوخساری مرۆڤی درۆزن نی یە).

هەرچەند زانا لێکۆڵەرەکان نزیکەی هەزار بەڵگەیان لەسەر پێغەمبەریێتی و موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەوە. بەڵام نەك هەزار بەڵکو هەزاران بگرە سەدان هەزار بەڵگەی لەسەر هەیە.. ئنجا سەدان هەزار کەسی وا کە لە بیرکردنەوەدا لە یەك جیاوازن، لە سەدان هەزار ڕێگاوە، ڕاستیی پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەرکەوتووە و باوەڕیان پێ هێناوە، تەنانەت هەر قورئان خۆی هەزار دانە بەڵگە لەسەر پێغەمبەریێتیی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات. جگە لەو چل ڕووی ئیعجازەش کە لە خۆی‌دا هەیە.

جا لەبەر ئەوەی "پێغەمبەریێتی" لە بەرەی مرۆڤدا شتێکی چەسپاوە و هەیە و ڕووی داوە و، لەبەر ئەوەی سەدان هەزار مرۆڤ هاتوون و پێغەمبەریێتیی خۆیان بە خەڵك ڕاگەیاندووە و چەندین موعجیزەشیان لەم پێناوەدا پیشان داوە، ئەوا گومان لەوەدا نی یە کە پێغەمبەریێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ لە هی هەموویان چەسپاوترە. چونکە چۆنێتیی هەڵسوکەوتی پێغەمبەران لەگەڵ نەتەوەکانیاندا و، ئەو شتانەی کە بەڵگەن لەسەر پێغەمبەریێتیی پێغەمبەرانی وەك حەزرەتی مووسا و عیسا - دروودی خوایان لەسەر بێت - هەموو ئەو شتانە، بە جوانترین و باشترین شێوە و چاکترین ناوەرۆکەوە، لە پێغەمبەری ئیسلامدا ﷺ هاتوونەتەدی.

جا لەبەر ئەوەی کە هۆی پێغەمبەریێتی لەم پێغەمبەرەدا ﷺ زۆر ڕوونتر هاتووەتەدی، ئەوا بێ هیچ گومانێك پێغەمبەریێتیی ئەم لە هی ئەوان گەلێ ڕوونتر و چەسپاوتر و بێ گومانترە.

## ئاماژەی ڕەوانی سێهەم

موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ گەلێ زۆر و جۆراوجۆرن. چونکە لەبەر ئەوەی پێغەمبەرێتی‌یەکەی گشتی‌یە و هەموو بوونەوەران دەگرێتەوە، ئەوا لەگەڵ زۆربەی جۆرەکانی بوونەوەردا موعجیزەی هەیە.

با ئەمە بە نموونە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر نوێنەرێکی بەڕێز لە لایەن پادشایەکی گەورەوە بۆ شارێك بچێت، کە چەندین کۆمەڵی جۆراوجۆری تێدا بێت و، چەند دیاری‌یەکی بەنرخی جیاجیای بۆ هەموو ئەو کۆمەڵانە هێنابێت، ئەوا هەموو چین و کۆمەڵێك لە کۆمەڵانی شار نوێنەرێك بە ناوی خۆیانەوە دەنێرن بۆ بەخێرهاتن و پێشوازی کردن لەو نوێنەرەی پادشا.

هەر بەو جۆرەش کە جیهان بە هاتنی نوێنەری پادشای ئەزەل و ئەبەد، کە پێغەمبەری سەروەرە ﷺ، شاد و بەهرەمەند بوو و، ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە لایەن خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە بۆ لای سەرجەم خەڵکی سەر ڕووی زەوی ڕەوانە کرا و، چەندین دیاریی مەعنەوی و ڕاستیی ڕوونی ئەوتۆشی لەگەڵ خۆدا هێنا کە پەیوەندی‌یان بە هەموو بوونەوەرانەوە هەیە.. لەم کاتەدا، لە لایەنی هەموو دەستە و تاقمێك لەم جۆرانەی بوونەوەرەوە – هەر یەکەیان بە زمانی تایبەتیی خۆی – نوێنەریان بۆ پێشوازی لێکردن و بەخێرهاتنی ئەم پێغەمبەرە ﷺ هات و، هەر یەکەشیان موعجیزەی دەستە و تاقمی خۆیان لە بەردەم پێغەمبەردا ﷺ پێشکەش کرد. بەمەش تەسدیق کردن و بەخێرهاتنی پێغەمبەریان ﷺ دەربڕی. ئەوەبوو هەر لە بەرد و دار و ئاو و مرۆڤەوە، تا دەگاتە مانگ و خۆر و ئەستێرەکان، هەموو ئەم کارەیان ئەنجام دا. وەك‌بڵێی هەر یەکەیان بە زمانی‌حاڵی خۆی دەڵێت: "یاخوا بەخێربێیت"!

لە ڕاستی‌دا باسکردنی ئەو موعجیزانە پێویستی بە نووسینی چەندین بەرگ کتێب هەیە، چونکە گەلێ زۆر و جۆراوجۆرن. ئەوەتا زانا پاك و خواناسەکان چەندین بەرگی گەورەیان سەبارەت بە بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی و موعجیزاتی پێغەمبەرەوە ﷺ بە درێژی نووسیوە.

بەڵام ئێمە لێرەدا، لەناو جۆرە هەمەکی‌یەکانی ئەو موعجیزانەی پێغەمبەردا ﷺ بە چەند پوختە ئاماژەیەك وازدەهێنین و، ئاماژە بۆ ئەو موعجیزانە دەکەین کە بە تەواوی و قەطعی چەسپاون و موتەواتیری مەعنەوین.

بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ دوو بەشن:

**(یەکەم)**: ئەو حاڵەتانەی کە بە "ئیرهاص" ناونراون و بریتین لەو ڕووداوە دەراسایانەی لە پێش پێغەمبەرێتی‌دا ڕوویان داوە و پەیوەندی‌یان بە پێغەمبەرێتی‌یەکەیەوە هەیە. هەروەها ئەو حاڵەتانەش کە ڕووداوی لەعادەت‌بەدەرن و لە کاتی لەدایکبوونی‌دا ڕوویان داوە.

**(دووهەم)**: بەڵگەکانی تری پێغەمبەرێتی ئەو، ئەمانەش دوو بەشن:

*یەکێکیان:* ئەو ڕووداوە لەعادەت‌بەدەرانەیە کە پاش لەدایکبوونی و بۆ تەسدیقی پێغەمبەرێتیی ئەو ڕوویان داوە.

*دووهەمیان:* ئەو ڕووداوە لەعادەت‌بەدەرانەی کە لە سەردەمی ژیانی پیرۆزی‌دا دەرکەوتوون. ئەمانەش دەکرێن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی ئەو، کە لە خودی پێغەمبەردا ﷺ و لە ژیان و شێوە و ڕەوشت و کەماڵی عەقڵی‌دا دەرکەوتوون.

دووهەم: ئەو بەڵگانەی کە لە دەرەوەی زاتی پیرۆزی‌دا ﷺ واتە: لە دەوروبەر و گەردووندا دەرکەوتوون. ئەمانەش دیسان دوو بەشن:

**بەشی یەکەم**: مەعنەوی و قورئانی‌یە.

**بەشی دووهەم**: ماددی و گەردوونی‌یە. ئەمەش دەبێت بە دوو بەش:

بەشی یەکەم: ئەو موعجیزانەی کە لە سەردەمی بانگەوازی پێغەمبەرێتی‌دا دەرکەوتوون. ئەمانەش یان لەبەر شکاندنی فیز و دەمار و سەرسەختیی کافران بووە، یان بۆ بەهێزکردنی ئیمانی ئیمانداران. وەك: لەت بوونی مانگ و.. هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی و.. تێربوونی خەڵکێکی زۆر - بە بەرەکەتی ئەو - لە خۆراکێکی کەم و.. قسەکردنی ئاژەڵ و بەرد و دار لە خزمەتی‌دا و.. چەندین موعجیزەی هاوچەشنی تری وەك ئەمانە لەو موعجیزانەی کە دەگەنە بیست جۆر و، هەر جۆرەشیان لە پلەی تەواتوری مەعنەوی‌دایە و، لە هەر یەکەشیان چەند نموونەیەك دووپات بوونەتەوە.

بەشی دووهەم: ئەو ڕووداوانەن کە خواوەند پێغەمبەری ﷺ لە بارەیانەوە ئاگادار کردووەتەوە و، لە پێش ڕوودانیان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ڕوودانیانی داوە و، پاشانیش چۆنی فەرمووە هەر بەو جۆرە هاتوونەتە دی.

وا ئێمەش ئێستا دەست بەم بەشەی دوایی دەکەین، بۆ ئەوەی بگەینە پێڕستێکی گشتیی یەك لە دوای یەك[1].

## ئاماژەی ڕەوانی چوارەم

ئەو هەواڵە غەیبی‌یانەی کە خوای ئاگاداری غەیب پێغەمبەری ﷺ لە بارەیانەوە ئاگادار کردووەتەوە و ئەویش ڕایگەیاندوون، هێندە زۆرن کە لە ژمارە نایەن. لە وتەی بیست و پێنجەمدا - کە تایبەتە بە "ئیعجازی قورئان"ەوە - ئاماژەمان بۆ جۆرەکانی کردووە و بەڵگەکانیشیمان هەر لەوێ هێناوەتەوە. لەبەر ئەوە، هەرچی هەواڵدانی شتی پەنهان هەن و پەیوەندی‌یان بە خوایەتیی خوا و گەردوون و قیامەت و سەردەمە ڕابوردووەکان و پێغەمبەرە پێشووەکانەوە - درووەیان لەسەر بێت - هەیە، هەموویان لەوێ باس کراون و، هەر کەسێك دەیەوێت لەم بارەیەوە ئاگادار و شارەزا بێت، با سەیری ئەو وتەیە بکات.

بەڵام لێرەدا چەند نموونەیەك لەو هەواڵدانە غەیبی‌یە ڕاستانە دەهێنینەوە، کە پێش ڕوودانیان، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لە بارەیانەوە داوە، لەوانەی کە دوای خۆی و لە ڕۆژانی داهاتوودا دێنە ڕێی ئالی بەیت و هاوەڵان و نەتەوەکەی.

جا بۆ تێگەیشتنی تەواوەتی لەم ڕاستی‌یە، وا لە پێشدا - وەك پێشەکی‌یەك - شەش بنچینە باس دەکەین:

● **بنچینەی یەکەم**

دەگونجێ هەموو حاڵەتێکی پێغەمبەر ﷺ بکرێت بە بەڵگەی ڕاستیی پێغەمبەر و شایەت لەسەر پێغەمبەرێتی‌یەکەی. بەڵام ئەم قسەیە ئەوە ناگەیەنێت کە هەرچی ڕەفتار و حاڵەتی پێغەمبەر ﷺ هەیە هەموویان لەعادەت‌بەدەر بن. چونکە خوای گەورە کە پێغەمبەری ﷺ ناردووە، وەك "مرۆڤێکی پێغەمبەر" ناردوویەتی. بۆ ئەوەی بە کردار و

(١) بەڵام بە داخەوە نەمتوانی بەو جۆرەی مەبەستم بوو بیانووسم، بەڵکو بە بێ ویستی خۆم چۆنم بە دڵدا هات هەروەهاش نووسیمن، بێ ئەوەی بتوانم چاودێریی ئەم دابەشکردنە بکەم. (دانەر)

ڕەفتارەکانی ببێت بە ڕابەر و پێشەنگی سەرجەمی مرۆڤایەتی لە گشت ڕەفتار و جموجوولێکیاندا، تاکو بەم پێشەوایەتی‌یەی خۆی، بەختەوەریی هەردوو دنیایان بۆ بهێنێتەدی و، لایەنە نائاسایی و لەعادەتبەدەرەکانی سنعەتی پەروەردگار و کاروباری توانستی خواوەندیشیان لە شتە ئاسایی‌یەکاندا پیشان بدات، ئەو شتە ئاسایی‌یانەی کە هەریەکەیان موعجیزەیەکە بۆ خۆی.

خۆ ئەگەر هەموو ڕەفتار و کردارێکی پێغەمبەر ﷺ لەعادەتبەدەر و لە سەرووی توانای مرۆڤەوە بووایە، ئەوا بۆی نەدەگونجا کە ببێت بە پێشەنگ و پێشڕەوێکی ئەوتۆ کە شوێن‌پێی هەڵبگیرێت و، هەڵسوکەوت و حاڵەت و کردار و ڕەفتارەکانی چاویان لێ بکرێت.. لەبەر ئەمە، پێغەمبەر ﷺ جاربەجار و بەپێی پێویست و بۆ مەبەستی چەسپاندنی پێغەمبەرێتی‌یەکەی نەبوایە لە بەردەم کافرە سەرسەختەکاندا، پەنای بۆ پیشاندانی موعجیزات نەدەبرد.

جا لەبەر ئەوەی یەکێك لە داخوازی‌یەکانی ئەو تەکلیفەی کە خواوەند لە بەندەکانی دەکات، بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە(الإبتلاء) ببێتەوە و، خاوەنی ویست و ئیختیار بێت لە کردەوەکانی‌دا، ئەوا خواوەند موعجیزەی بەسەر مرۆڤدا زاڵ نەکردووە، بۆ ئەوەی تەسدیق و باوەڕ بە زۆر لە مرۆڤدا دروست نەبێت. چونکە نهێنیی تاقیکردنەوە و حیکمەتی تەکلیف داخوازی ئەوەن کە دەرگای ویست و ئیختیار لە بەردەم ژیری‌دا بخرێتە سەرپشت و ئەم ئیختیار و ویستەی لێ دانەماڵرێت. خۆ ئەگەر موعجیزە بە چەشنێکی زۆر بەدیهی دەربکەوتایە، ئەوا هیچ ئیختیار و ویستێك لە بەردەم ژیری‌دا نەدەمایەوە و، ئەو کاتە ئەبووجەهلیش وەکو ئەبووبەکر - خوای لێ ڕازی بێت - تەسدیقی دەکرد و، ئنجا هیچ سوودێك لە تەکلیف و هیچ ئامانجێکیش لە تاقیکردنەوەی مرۆڤدا نەدەما و، خەڵووزی بێ‌بایەخ و ئەڵماسی بەنرخ وەکو یەکیان لێ دەهات.

بەڵام ئەو شتەی مرۆڤ دەخاتە سەرسووڕمانەوە، ئەوەیە کە لە کاتێکدا هەزاران کەس، لەوانەی کە ڕەگەزی هەریەکەیان لەوانی تر جیایە، تەنها بە ڕێنمایی‌یەکی پێغەمبەر ﷺ، یان بە فەرموودەیەکی ئەو، یان تەنها بە تەماشاکردنێکی دیداری پیرۆز و جوانی، یان بە شتێکی تری هاوچەشنی ئەمانە، ئیمانیان پێ هێناوە.. هەروەها لە کاتێکدا کە هەزاران زانای وردەکار و ڕۆشنبیری لێکۆڵەر، بەهۆی ئەو هەواڵە ڕاست و

موتەواتیرانەی کە لە بارەی ڕاستیی پێغەمبەر ﷺ و ڕەفتارە جوانەکانیەوە پێیان گەیشتووە، هەموو ئیمانیان پێ هێناوە..

لە کاتێکدا کە هەموو ئەوانە ئیمانیان هێناوە، ئایا جێی سەرسوورمان نییە کە بەدبەختانی سەردەمی خۆمان ئەم هەموو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە دەبینن، کەچی وەك بڵێی هێشتا پێیان کەم بێت و هانیان نەدات بۆ ئیمان پێ هێنان و تەسدیق کردنی، ئەوەتا دەبینیت بەرەو هەڵدێری گومڕایی هەڵدەخلیسکێن و ئیمان ناهێنن..

بەڵێ، ئایا ئەمە جێی سەرسووڕمان نییە؟!

● **بنچینەی دووهەم**

پێغەمبەر ﷺ "مرۆڤ"ە، کەواتە لە ڕوانگەی مرۆڤێتییەکەیەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات.. لە هەمان کاتیشدا "پێغەمبەر"ێکی ئەمینە و، لە لایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە و، بە ناوی خواوە دەدوێت و ڕاگەیەنەرێکی ڕاستگۆی فەرمانەکانی خواوەندە. کەواتە پێغەمبەرێتییەکەی پشت بە ڕاستیی سرووش(الوحی) دەبەستێت. "سرووش"یش دوو بەشە:

*یەکەم:* سرووشی ڕاشکاو(الوحـي الصريـح). وەك قورئانی پیرۆز و چەند "حەدیث"ێکی قودسی. پێغەمبەر ﷺ لەم جۆرە سرووشەدا هەر تەنها ڕاگەیەنەرە، بێ ئەوەی هیچ دەستکارییەکی تێدا بکات.

دووهەم: سرووشی ناوەکی(الوحي الضمني). پوختە و کورتەی ئەم بەشەیان پشت بە ئیلهام و سرووش دەبەستێت، بەڵام درێژەپێدان و ڕوونکردنەوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ. واتە ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە سرووشە لە لایەن پێغەمبەرەوەیە ﷺ. هەندێ جار لەم ڕوونکردنەوەیەدا پشت بە ئیلهام و سرووش دەبەستێت و، هەندێ جاری تریش بە فیراسەتی تایبەتیی خۆی. ئەم جۆرە ڕوونکردنەوانەش کە پێغەمبەر ﷺ بە ئیجتیهادی تایبەتیی خۆی دەیانکات، یان ئەوەیە بەو هێز و توانا قودسییەی کە لە پێغەمبەرێتییەکەیدان دەیانکات، یان وەکو مرۆڤێك و بەپێی ئەو ئاستەی کە عورف و داب و نەریت و بیری خەڵکیی تێدایە، ڕوونیان دەکاتەوە.

کەواتە نابێت لە ڕوانگەی سرووشی ڕووتەوە سەیری گشت لایەنەکانی هەموو فەرموودەیەك بکرێت و، لەو مامەڵە و بیرکردنەوەیەدا کە لەسەر خواستی "مرۆڤێتی"یەکەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بینراوە و وەرگیراوە نابێ بۆ ئاسەواری "پێغەمبەرێتی"یەکەی بگەڕێین.

جا لەبەر ئەوەی هەندێ ڕووداو هەن كە "سرووش" بە شێوەیەكی پوخت و ڕەها لە بارەیانەوە دەدوێت و، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە فیراسەتی تایبەتیی خۆی، یان بە گوێرەی ڕوانینی عورفی گشتی[1]، ڕوونیان دەكاتەوە، ئەوا هەندێ جار پێویست بە لێكدانەوەی ئەم جۆرە كێشە و موتەشابیهانە دەكات كە لەو ڕوونكردنەوەیەدا هەن. چونكە هەندێ (ڕاستی) هەن بە لێكدانەوە و نموونەهێنانەوە نەبێت ناتوانرێت خەڵكیان لێ تێ بگەیەنرێت.

نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی كە جارێكیان ئەوانەی لە دەوروبەری پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوون، گوێیان لە زرمە و دەنگێكی بڵند و گەورە بوو. پێغەمبەر ﷺ ڕووداوەكەی بۆ ڕوون كردنەوە و فەرمووی:

(ئەوە دەنگی بەردێكە حەفتا ساڵە تلێر دەبێتەوە، وا ئێستا گەیشتە بنكی دۆزەخ)!

هێشتا سەعاتێك بە سەر ئەمەدا تێنەپەڕیبوو، یەكێك هاتە كۆڕەكە و وتی:

(فلانە موناڤیقی بەناوبانگ، كە تەمەنی گەیشتبووە حەفتا ساڵ، مرد و بەرەو دۆزەخ كەوتە ڕێ)!

ئەمەش لێكدانەوەی ئەو تەشبیهە پڕ لە بەلاغەت و جوانەی پێغەمبەر بوو ﷺ كە زووتر لە ڕوونكردنەوەی ڕووداوەكەدا باسی كردبوو.

● **بنچینەی سێهەم**

ئەو فەرموودە و ڕووداوانەی كە دەماودەم گێڕراونەتەوە، ئەگەر "موتەواتیر"[2] بوون، ئەوا بە "قەتعی"(بێ گومانی) چەسپاون و دڵنیایی دەبەخشن.

"**موتەواتیر**"یش دوو بەشە:

یەكەم: تەواتوری صەریح(ڕاشكاو)، كە پێشی دەوترێت: تەواتوری لەفزی.

دووهەم: تەواتوری مەعنەوی. ئەمەش دوو بەشە:

---

(١) وەك لە ڕێكخستنی سوپا و كاروباری جەنگ و بازرگانی و كشتوكاڵ و.. هتد.

(٢) "موتەواتیر": بەو ڕیوایەتە دەڵێن كە كۆمەڵێكی زۆر لە كۆمەڵێكی زۆری ترەوە دەماودەم هێنابێتیان و بەو جۆرە لە هاوەڵانەوە تا گەیشتبێتە سەردەمی تابیعی تابیعین (كە تەدوینی سونەتی تێدا كراوە) و، هەر یەك لەو كۆمەڵانەش لەوانە بن كە هەرگیز نەگونجێ لەسەر درۆكردن و هەواڵی دەمهەڵبەست یەكیان گرتبێت. زانایانی زانستی "أصول الفقه" خەبەری موتەواتیر بە "قطعي الورود" لە قەڵەم دەدەن. واتە: هیچ گومانێك لەوەدا نییە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە.

بەشی یەکەم: پێی دەوترێت: "سکووتی" واتە: دەربڕینی ڕەزامەندی بە بێ قسەکردن لە ئاستی‌دا. نموونەی ئەمە زۆرە، وەك ئەوەی کە ئەگەر یەکێك لەناو دەستە و کۆمەڵەکەی خۆی‌دا ڕووداوێکی گێڕایەوە کە لە بەرچاوی ئەواندا ڕووی دابوو، هیچ کەسێکیش لەو کۆمەڵە بە درۆی نەخستەوە و هەموویان لە ئاستی‌دا بێ‌دەنگ بوون، ئەوا ئەم بێ‌دەنگ بوونەیان ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوانیش تەسدیقی دەکەن و ئەو ڕووداوە لە ڕاستی‌دا بووە و ڕووی داوە. بە تایبەتی ئەگەر ئەو ڕووداوە پەیوەندیی بەو کەسانەوە بێت و ئەوانیش ئامادەی ئەوە بن کە ئەگەر ڕووداوەکە بە درۆ یان بە هەڵە بگێڕێتەوە ڕەخنەی لێ بگرن و بەرپەرچی بدەنەوە و هەرگیز بە هەڵە ڕازی نەبن، تەنانەت "درۆ" بە لایانەوە شتێکی زۆر ناشیرین و ناڕەوا بێت.. جا ئەگەر لەم چەشنە کاتەدا ئەوان بێ‌دەنگ بن، ئەوا ئەم بێ‌دەنگ بوونەیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕووداوە بە بێ گومانی ڕووی داوە.

بەشی دووهەمی تەواتوری مەعنەوی: بریتی‌یە لەوەی کە ئەو کەسانەی ڕووداوێك دەگێڕنەوە، لە ئەندازەیەکی هاوبەشی ئەو ڕووداوەدا یەکیان گرتبێت، هەرچەندەش دانە دانەی ڕیوایەتەکانیان جۆراوجۆر بن.

نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە ئەگەر بوترێت: یەك "ئۆقیە"[1] خواردەمەنی، دووسەد کەسی تێر کردووە. ئەو کەسانەی کە ئەمە دەگێڕنەوە، بە چەند شێوە و دەستەواژەیەکی جیاجیا باسی دەکەن. دەبینیت هەندێکیان سەد کەس باس دەکات و هەندێ دووسەد و هەندێ سێ‌سەد و، هەندێکی تر دوو "ئۆقیە" خواردەمەنی باس دەکات.. هەروەها بەم جۆرە.

دەبینیت هەموویان لە ئەندازەیەکی هاوبەشی ڕووداوەکەدا یەکیان گرتووە، کە بریتی‌یە لە: "تێربوونی خەڵکێکی زۆر بە خۆراکێکی کەم". کەواتە ڕووداوەکە بە شێوەیەکی ڕەها ڕووی داوە و موتەواتیری مەعنەوی‌یە و دڵنیایی دەبەخشێت، ئیتر جۆراوجۆریی شێوەکانی لە ڕیوایەتە جیاجیاکاندا هیچ زیانێك بەو دڵنیایی‌یە ناگەیەنێت.

"خەبەری ئاحاد"یش[2] کاتی وا هەیە لە ناوەندی چەند مەرجێکی تایبەتی‌دا وەکو موتەواتیر "قەتعی‌یەت"(واتە: بێ گومانی) دەبەخشێت. بەڵکو هەندێ جار بە بۆنەی چەند نیشانە و بەڵگەیەکی دەرەکی‌یەوە ئەم قەتعی‌یەتە دەگەیەنێت.

(١) یەك ئۆقیە دەکاتە نزیکەی ٢١٣ر٦ گرام.

(٢) "خەبەری ئاحاد" بەو ڕیوایەتە دەڵێن کە ژمارەیەکی کەمتر لە ژمارەی تەواتور گێڕابێتیانەوە.

ئیتر بەم جۆرە، بەشی هەرە زۆری بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی و موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێی تەواتوری صەریح، یان مەعنەوی، یان سکووتی‌یەوە (کە جۆرێکی تەواتوری مەعنەوی‌یە) بە دەستمان گەیشتوون. بەشێکی تریشیان لە ڕێگای "خەبەری ئاحاد"ەوە گەیشتووەتە دەستمان کە پێشەوایانی زانستی "جەرح و تەعدیل" لە نێوان چەند مەرجێکی تایبەتی‌دا وەریانگرتووە و پێی ڕازی بوون و، بەم بۆنەیەوە بووە بە "قەتعی" و وەك دەلالەتی فەرموودەی موتەواتیری لێ هاتووە.

جا ئەگەر چەندین زانای لێکۆڵەری "زانستی فەرموودە" وەك خاوەنانی "صیحاحی سیتە"[(١)] و لە پێشەکی‌یانەوە هەڵکەوتووانی وەك ئیمامی بوخاری و موسلیم کە هەریەکەیان - بە لای کەمەوە - سەد هەزار فەرموودەی لەبەر بووە، هەروەها هەزاران پێشەوا و زانای خواناس، لەوانەی کە نزیکەی پەنجا ساڵ نوێژی بەیانی‌یان بە دەستنوێژی عیشاوە ئەدا کردووە..

ئەگەر ئەمانە و زانایانی تری هاوچەشنیان "خەبەری ئاحاد"یان بەلاوە صەحیح بێت، ئەوا هیچ گومانێك لەوەدا نامێنێتەوە کە خەبەری ئاحاد قەتعی‌یە و، لەم ڕووەوە حوکمی لە هی "موتەواتیر" کەمتر نی‌یە.

بەڵێ، زانایانی "زانستی فەرموودە" و ڕەخنەگرانی ئەم بوارە، بە ڕادەیەکی وا کارامەیی و پسپۆڕی‌یان لەم هونەرەدا پەیدا کرد، کە لە ئەنجامدا توانی‌یان وتەی پێغەمبەر ﷺ و ڕەوانبێژیی گوزارش و شێوەی ڕوونکردنەوەکانی، لە وتەی غەیری ئەو جیا بکەنەوە، بە چەشنێ کە ئەگەر یەك وتەی "هەڵبەستراو"(موضوع) لە نێوان سەد فەرموودەدا ببینن، یەکسەر جیای دەکەنەوە و دەیگێڕنە دواوە و دەڵێن: (ئەمە هەڵبەستراوە) و هەرگیز ناکرێت فەرموودەی پێغەمبەر بێت ﷺ.

بەم جۆرە ئەو زانایانە وەك "صەڕڕاف"ی شارەزا و کارامەیان لێ هات و، فەرموودەی ڕاستەقینەی پێغەمبەریان ﷺ لەو خلتانە پاك و جیا کردەوە کە تێکەڵی بووبوون.

---

(١) خاوەنانی ئەو کتێبانە ئەم شەش پێشەوایەن: "ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئەبوداوود و تیرمیذی و نەسسائی و ئیبن ماجە". چوار کتێبەکەی ئەم چوار پێشەوایەی دوایی پێیان دەوترێ: (السنن). جگە لەمانیش چەندین زانای تری فەرموودە هەن، وەك: ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەحمەد و دارەمی و بەیهەقی و تەبەرانی و حاکم.. هتد

بەڵام هەندێ لە زانا لێکۆڵەرەکانی چەشنی "ابن الجوزي" هێندە توندوتیژییان لە رەخنەسازیی فەرموودەکاندا نواند کە هەندێ فەرموودەی "صەحیح"یان بە "هەڵبەستراو" لە قەڵەم دا!

دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەگەر بە هەر وتەیەك وترا: "مەوضووع" ئەوە ناگەیەنێت کە واتاکەی هەڵە و خراپە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت کە وتەی پێغەمبەر ﷺ نییە!

**پرسیار:**

ئایا چ سوودێك لە باسکردنی "سەنەد"ی[1] دوور و درێژی وەك: "عن فلان.. عن فلان"دا هەیە و، چ کەڵکێك لە ناوبردنیاندا دەست دەکەوێت؟

**وەڵام:**

سوودی زۆری تێدایە. چونکە باسکردنی ئەم سەنەدە درێژە جۆرە یەکدەنگییەکی تایبەتی دەردەخات لە نێوان ئەو زانایانەی لە سەنەدەکەدا ناویان هاتووە، کە تابلێی راستگۆ و جێی باوەڕ و متمانەن. کەواتە باسکردنی ئەو ناوانە لە سەنەدەکەدا، بەیەك گەیشتن و پشتگیری کردنی یەکتریی زانا لێکۆڵەرەکان لەو فەرموودەیەدا دەگەیەنێت و، وەکو ئەوە وایە کە هەر زانا و ئیمامێك ناوی لە سەنەدەکەدا هەیە، مۆری خۆی لەو فەرموودەیە دابێت و، ئیمزای "صەحیح" بوونی کردبێت.

**پرسیار:**

بۆچی هەموو موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ بە وێنەی حوکمە شەرعییە پێویستەکانی تر، بە گرنگییەکی زۆرتر و، هەموویان بە تەواتور و لە رێگای جیاجیاوە نەگێڕراونەتەوە؟

**وەڵام:**

لەبەر ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵکی، زۆربەی کاتەکان، پێویستییەکی زۆریان بە حوکمە شەرعییەکان هەیە، کەواتە ئەم حوکمە شەرعییانە سەبارەت بەوان "فەرزی عەین"ن[2]. چونکە ئەم حوکمانە پەیوەندییان بە هەموو کەسێکەوە هەیە. بەڵام مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا پێویستیی بە موعجیزات نییە. خۆ ئەگەر واش دابنێین کە پێویستیان بە بیستنی موعجیزات ببێت، ئەوا گەر یەك جار ئەو موعجیزانە ببیسترێن سەروزیادە و،

---

(١) "سەنەد": لە زانستی حەدیثدا بە ناوی ئەو زنجیرە زانایانە دەوترێت کە یەك لە دوای یەك هەر لەو هاوەڵەوە کە لە زاری پێغەمبەری ﷺ بیستووە تا دەگاتە کۆتایی زنجیرەکە، فەرموودەکەیان دەماودەم هێناوە.

(٢) "فەرزی عەین": بەو حوکمە شەرعییانە دەوترێت کە لەسەر هەموو موسڵمانێکی بالغی عاقڵ فەرزە جێبەجێیان بکات.

پێویست ناکات هەموو کەسێك بیانبیستێت. واتە "فەرزی کیفایەت"ن[1]، کەواتە ئەوەندە بەسە کە هەندێ کەس ئەو موعجیزانە بزانن.

هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێ جار دەبینیت ڕوودانی موعجیزەیەك چەندین ئەوەندەی حوکمێکی شەرعی و بە چەشنێکی بەهێزتر و بێ گومانتر چەسپاوە، کەچی یەك کەس یان دوان ڕیوایەتیان کردووە. بەڵام ئەوانەی حوکمە شەرعی‌یەکەیان ڕیوایەت کردووە دەگەنە دە کەس، کاتی وا هەیە بیستیش.

● **بنچینەی چوارەم**

بەشێك لەو ڕووداوانەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە لە ئایندەدا دێنەدی، چەند ڕووداوێکی هەمەکی(کُلّي)ن و، لە چەند کاتێکی جیاجیادا دووپات دەبنەوە. واتە هیچ کام لەوانە ڕووداوێکی تاك و هەندەکی(جُزئي) نی‌یە. کەواتە جاری وا دەبێت پێغەمبەر ﷺ چەند حاڵەتێکی هەندێ لەو ڕووداوانە ڕوون دەکاتەوە، چونکە ئەم چەشنە ڕووداوە هەمەکی‌یانە، چەندین ڕووی زۆریان هەیە و، لە هەر جارێکدا پێغەمبەر ﷺ یەکێك لەو ڕووانە باس دەکات. بەڵام گەر ئەو کەسەی کە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە لە یەك شوێندا ئەو هەموو ڕووانە کۆ بکاتەوە، ئەوا بە ڕواڵەت پێچەوانەی واقیع دەردەکەوێت.

بۆ نموونە:

گەلێ ڕیوایەتی جیاجیا سەبارەت بە "مەهدی"یەوە هەیە، بە چەشنێك کە درێژەپێدان و ڕوونکردنەوەکانیان جیا جیا و جۆراوجۆرن. پێغەمبەریش ﷺ کاتێ کە باسی "مەهدی" دەکات پشت بە سرووش دەبەستێ. ئەم باسکردنەش بۆ ئەوەیە کە هێزی مەعنەویی ئەهلی ئیمان لە هەموو سەردەمێکدا بپارێزێت و، لە بەردەم ئەو ڕووداوە سامناکانەدا ـ کە دێنە ڕێیان ـ نائومێدی سەریان تێ نەکات و، نەتەوەی ئیسلام بە پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵی مەعنەوی بە زنجیرەی نوورانیی ئالی بەیتەوە ببەستێتەوە (هەروەك لە وتەی بیست و چوارەمدا ئەمەمان چەسپاندووە). هەر لەبەر ئەوەشە کە خەڵکی هەموو سەردەمێك جۆرە (مەهدی)یەك، بەڵکو چەندین (مەهدی)یان، وەك ئەوەی لە ئاخر زەماندا دێت، لە ئالی بەیتدا بە خۆیانەوە دیوە، بە ڕادەیەك کە بەشێکی زۆری وەسفەکانی مەهدیی گەورەی ئاخر زەمانیان لە خەلیفە مەهدیی عەبباسی‌دا

(١) "فەرزی کیفایەت": بەو جۆرە حوکمە شەرعی‌یانە دەوترێت کە ئەگەر هەندێ کەس لە کۆمەڵدا جێ‌بەجێیان بکەن، وەك ئەوە وایە کە هەموو کۆمەڵ جێ‌بەجێیان کردبێت و لە ئەستۆیان لادەچێت.

بینیوە، کە ئەویش لە ئالی بەیت بوو.

بەم جۆرە، وەسفەکانی ئەوانەی پێش مەھدیی گەورە ھاتوون و دێن و، لە سەردەمەکانی خۆیاندا نوێنەری مەھدیی گەورەن (وەك خەلیفە و ئەقتابە مەھدیی‌یەکان) لەگەڵ وەسفەکانی "مەھدیی گەورە"دا تێکەڵ بە یەکتر بوون. ئا لێرەوە ئیختیلاف لە ڕیوایەتەکاندا دروست بووە.

● **بنچینەی پێنجەم**

پێغەمبەر ﷺ ئەوەی خوای گەورە فێری نەکردایە ھیچی لە غەیب نەدەزانی، چونکە: "لا يعلم الغيب الاّ الله". (واتە: خوا نەبێت کەس غەیب نازانێت). کەواتە خوای گەورە چی فێری پێغەمبەر ﷺ دەکات ئەویش ھەر ئەوە بە خەڵکی ڕادەگەیەنێت.

جا لەبەر ئەوەی خوای گەورە دانا و میھرەبانە، ئەوا دانست و میھرەبانی‌یە فراوانەکەی داخوازی ئەوەن کە زۆربەی شتانی غەیبی بشاررێنەوە و ئاشکرا نەکرێن، چونکە زۆربەی ڕووداوەکانی ئەم ژیانەی دنیا دڵخۆشکەر نین، زانینی ئەو شتانەش لە پێش ڕوودانیاندا، ئازاری زۆر بە دڵی مرۆڤ دەگەیەنن.

ھەر لەبەر ئەم حیکمەتەیە کە مردن و ئەجەل لە زانیاریی مرۆڤ شارراونەتەوە و، ھەر بەڵا و گیرو گرفتێکیش دێنە ڕێی، پەردەی غەیبیان بەسەردا دادراوەتەوە.

جا یەکێك لە داخوازی‌یەکانی ئەم دانست و میھرەبانی‌یەی پەروەردگار ئەوەیە کە: ھەرچی موسیبەت و ڕووداوی ناخۆش لە دوای پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئالی بەیت و ھاوەڵانی‌دا دێن، خواوەند پێغەمبەرەکەی ﷺ لە یەك بە یەکیان ئاگادار نەکاتەوە، بەڵکو - لەبەر چەند حیکمەتێك - پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی ﷺ تەنھا لە چەند ڕووداوێکی گرنگ و دوور لە ئازاری دواڕۆژی نەتەوەکەی ئاگادار کردووەتەوە، تاکو ئەو بەزەیی‌یە گەورە و فراوانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر نەتەوەکەی و ئالی بەیت و ھاوەڵەکانی ھەیەتی، زامدار نەبێت.. ھەروەك چەند مزگێنی‌یەکی خۆشیشی پێ داوە.

خواوەند ھەندێك لەم ھەواڵانەی بە پوختی و ھەندێکی تریشیانی بە دوور و درێژی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندووە[1].

---

(١) بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خواوەند بە (تەواوی) پێغەمبەری ﷺ ئاگادار نەکردووەتەوە لەوەی کە حەزرەتی عائیشە - خوای لێ ڕازی بێت - بەشداریی جەنگی "الجمل" دەکات، ئەوەیە کە بە خێزانەکانی فەرموو: ...بێ کامتان بێت کە سەگەکانی "حەوئەب" پیای‌دا بوەڕن"؟ واتە لەو جەنگەدا بەشداری بکات. ئەمەش بۆ

ئنجا هەر شتێك كە خوای گەورە بە پێغەمبەرەكەی خۆی ﷺ راگەیاندووە، ئەویش گەیاندوویەتی بە نەتەوەكەی خۆی. پاشان زانا راستگۆ و دادگەرەكانی زانستی فەرمووده، بە چەند ریوایەتێكی صەحیح و دەماودەم، بە ئێمەیان گەیاندووە. ئەو زانایانەی كە تابڵێی لەخواترس بوون و زۆر لەوە دوورتر بوون كە بەر ئەو هەڕەشەیەی پێغەمبەر ﷺ بكەون كە دەفەرمویّ: "مَن كذبَ عليّ متعمداً فليتبوأ مقعده من النار"[1]، ئەوانەی كە لە ترسی سزای ئەم ئایەتە پیرۆزە هەمیشە هەڵدەهاتن:

﴿فَمَنْ اَظْلَمُ مِمَّنْ كَذَبَ عَلَى اللهِ﴾[2]؟!

● **بنچینەی شەشەم**

حاڵەت و ئەوسافی پێغەمبەر ﷺ لە شێوەی مێژوودا باس كراون. زۆربەی ئەو حاڵەت و ئەوسافانەش تەنها لایەنی مرۆڤێتیی ئەویان دەرخستووە. چونكە كەسێتیی مەعنەویی زاتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ و ماهییەتی بەرز و نوورانیی ئەو بە رادەیەكی وایە كە هەرچی لە كتێبەكانی ژیان و مێژووی ئەحواڵ و وەسفی ئەودا نووسراون، هەرگیز ناگەنە ئەو پلە بەرز و بڵندەی كە لە راستیدا پێغەمبەر ﷺ هەیەتی..

ئەوەتا هەرچی رۆژ هەیە، بەپێی دەستووری: "السبب كالفاعل" هەر لە سەرەتای پێغەمبەرێتییەوە تا ئێستا، بە ئەندازەی پەرستشی نەتەوەكەی پاداشتی پەرستش و بەندایەتی دەخرێتە سەر لاپەڕەی كەماڵی ئەو پێغەمبەرە ﷺ.. ئنجا هەروەك سروەی میهرەبانیی بێ كۆتایی خواوەند بە شێوە و توانایەكی بێ كۆتایی دەورەی پێغەمبەر ﷺ دەدات، هەر بەو جۆرەش هەرچی رۆژە، لە ملیۆنەها كەسی نەتەوە لە ژمارەبەدەرەكەیەوە نزا و دوعای لە ژمارەبەدەری پێ دەگات.

كەواتە هەرچی بەسەرهات و حاڵەتی مرۆڤێتیی پێغەمبەر ﷺ هەیە و، كتێبەكانی مێژوو باسیان كردوون، هەرگیز ناگەنە ماهییەتی تەواوەتی و راستیی كەماڵاتی ئەو

---

ئەوەی ئەو خۆشەویستییە زۆر بەهێزەی كە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە حەزرەتی عائیشە هەیبوو، زامدار نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا دوایی خواوەند (بە پوختی) پێغەمبەری ﷺ لەمە ئاگادار كردەوە. چونكە بە حەزرەتی عەلیی فەرموو: "ارفق بـها وبلّغها مأمنـها". واتە: لەگەڵیدا نەرمونیان بە و بیگەیەنەرە شوێنی ئەمین و بێ وەیی خۆی. (دانەر)

(١) حديث صحيح. واتە: ئەوەی بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە هەڵببەستێت، با جێگایەك بۆ خۆی لە ئاگری دۆزەخدا ساز بكات. (واتە: بۆی سازكراوە و دەڕواتە ناوی).

(٢) (الزمر:٣٢) واتە: كێ لەوە ستەمكارترە كە درۆ بە دەم خواوە هەڵببەستێت؟

پێغه‌مبه‌ره پیرۆزه‌ی ﷺ كه‌ به‌ڕێزترین ئه‌نجام و پێگه‌یشتووترین به‌روبوومی بوونه‌وه‌رانه‌ و، ڕاگه‌یه‌نه‌ری فه‌رمانه‌كانی به‌دیهێنه‌ری بوونه‌وه‌ره‌ و خۆشه‌ویستی په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌كانه‌!

له‌ كوێ ئه‌م كه‌سێتی‌یه‌ پیرۆز و به‌رزه‌ی كه‌ هه‌ریه‌ك له‌ جیبریل و میكائیل له‌ غه‌زای به‌دردا هاوه‌ڵی ئه‌مینی بوون، به‌و حاڵه‌ته‌ ئاشكرایانه‌ی ژیانی ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ ته‌نها لایه‌نی مرۆڤێتیی ئه‌و ده‌رده‌خه‌ن، وه‌ك ئه‌و ڕووداوه‌ی كه‌ به‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ردا ﷺ هات له‌گه‌ڵ ئه‌و خاوه‌ن ئه‌سپه‌ی كه‌ ئه‌سپه‌كه‌ی به‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فرۆشت و دوایی ئینكاریی ئه‌وه‌ی كرد پێی فرۆشتبێت و، داوای شایه‌تی له‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ كرد و، له‌و كاته‌دا حه‌زره‌تی خوزه‌یمه‌ی هاوه‌ڵی پێغه‌مبه‌ر ﷺ هاته‌ پێشه‌وه‌ و شایه‌تیی بۆ دا[1]. به‌ڵێ، له‌ كوێ ئه‌و كه‌سێتی‌یه‌ پیرۆزه‌ له‌ چه‌شنی ئه‌م ڕووداوه‌دا ده‌رده‌كه‌وێت؟

جا بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی وه‌سفه‌ مرۆڤانه‌ و ئاسایی‌یه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌بیستێت، نه‌كه‌وێته‌ هه‌ڵه‌وه‌، ئه‌وا ده‌بێ هه‌میشه‌ سه‌ر به‌رز بكاته‌وه‌ و بۆ ماهییه‌تی به‌رزی پێغه‌مبه‌رێتیی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بڕوانێت و، سه‌یری كه‌سێتیی مه‌عنه‌وی و نوورانی و به‌رزی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بكات، كه‌ له‌ چڵه‌پۆپه‌ی پله‌ی به‌رزی پێغه‌مبه‌رێتی‌دایه‌. ده‌نا - خوانه‌خواسته‌ - یان بێ‌ئه‌ده‌بیی به‌رامبه‌ر ده‌نوێنێت، یان ده‌كه‌وێته‌ ناو وه‌هم و گومانه‌وه‌.

بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌، سه‌رنج له‌م نموونه‌یه‌ی خواره‌وه‌ بده‌:

(وا دابنێین كه‌) ناوكه‌ خورمایه‌ك له‌ ژێر خاكدا نێژرا و، له‌ پاشاندا بوو به‌ دارخورمایه‌ك كه‌ هه‌ردەم له‌ گه‌شه‌كردن و نه‌شونمادا بوو.. یان هێلكه‌ تاوسێك پاش ئه‌وه‌ی گه‌رمیی ئاراسته‌ كرا، جووجكه‌ تاوسێكی لێ هاته‌ ده‌ره‌وه‌، كه‌ هه‌تا گه‌وره‌ بوایه‌ و نه‌شونمای بكردایه‌، به‌و نه‌خشونیگارانه‌ی كه‌ قه‌ڵه‌می توانستی خواوه‌ند تیایدا كێشابوون، جوانتر ده‌بوو..

چه‌ندین سیفه‌ت و حاڵه‌تی تایبه‌ت هه‌ن كه‌ هی ئه‌و ده‌نكه‌ خورما و هێلكه‌ تاوسه‌ن و، هه‌ر یه‌ك له‌م دوانه‌ چه‌ندین مادده‌ی ناسك و وردیان تێدایه‌.. هه‌ر به‌و چه‌شنه‌، دارخورما و تاوسه‌كه‌ش چه‌ندین سیفه‌تی به‌رز و چۆنێتی و بارودۆخی ئه‌وتۆیان هه‌یه‌، كه‌ له‌ چاو هی ناوكه‌ خورما و هێلكه‌كه‌دا زۆر به‌رز و بڵند و جیاوازن..

---

(١) صحيح. رواه أبو داود والنسائي وابن ماجه وأحمد.

جا هەر كاتێ كە وەسفی ناوكە خورما و هێلكە تاوسەكە لەگەڵ وەسفی دارخورما و تاوسەكەدا دەكرێن و بە یەكەوە دەبەسترێنەوە، دەبێ ژیریی مرۆڤ سەر لە ناوكە خورماكەوە بەرز بكاتەوە و سەیری دارخورماكە بكات و، لە هێلكە تاوسەكەشەوە سەر بەرز بكاتەوە و بۆ تاوسەكە بڕوانێت، بۆ ئەوەی مرۆڤ ئەو وەسفانەی دەیانبیستێت وەریان بگرێت و لە ژیریی‌دا جێیان بكاتەوە. دەنا ئەگەر كەسێك بڵێت: هەزار "باتمان" خورمام لە مشتێك ناوكە خورما چنی، یان بڵێت: ئەم هێلكەیە شای باڵندەكانە، ئەوا یەكسەر ژیری بە درۆی دەخاتەوە.

"مرۆڤێتی"ی پێغەمبەریش ﷺ وەك دەنكە خورما و هێلكەكەی ناو نموونەكە وایە.. ئەو ماهییەتەش كە بەهۆی "پێغەمبەرێتی"یەكەوە پرشنگ دەداتەوە، وەك درەختی تووبا و باڵندەی بەهەشت هەمیشە لە گەشە كردن و بەرزبوونەوەدایە.

كەواتە ئەو كاتەی كە بیر لەو هەرایە دەكەینەوە لە بازاڕ لەگەڵ دەشتەكی‌یەكەدا ڕووی دا، دەبێ چاوی ئەندێشەمان بەرز بكەینەوە و، تەسەووری ئەو زاتە نوورانی‌یە بكەین كە سواری ڕەفرەف(بوراق) بووە و بەرەو: "قاب قوسین أو أدنی" ڕۆشتووە و، جیبریلی لە ڕێگادا بەجێ هێشتووە. دەنا "دەروونی بەدخواز" یان بێ‌ئەدەبیی لە بەرامبەرەوە دەكات و ئەوەندە دادەبەزێتە خوارەوە كە ڕێز و ئیحتیرامی كەم بكاتەوە، یان بە تەواوی پێی دەخلیسكێت و وای لێ دێت تەسدیقی نەكات.

## ئاماژەی ڕەوانی پێنجەم

ئەم ئاماژەیە تایبەتە بە چەند ڕووداوێكی وەهاوە كە پەیوەندی‌یان بە چەند شتێكی غەیبی‌یەوە هەیە. وا لێرەدا چەند نموونەیەكیان لێ باس دەكەین:

**نموونەی یەكەم:**

* لە وتار(خوتبە)ێكدا كە كۆمەڵێك لە هاوەڵە بەڕێزەكان ئامادە و گوێبیستی بوون و، ئەم وتارەش بە جۆرێكی صەحیح و موتەواتیر پێمان گەیشتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

"إنّ ابني هذا سيّدٌ ولعلّ اللّٰه أن يُصلحَ به بين فئتين من المسلمين"[1] لە ڕیوایەتێكی تردا: "عظيمتين".

---

(١) حديث صحيح رواه البخاري والترمذي والنسائي وأحمد والطيالسي. واتە: ئەم كوڕەم – حەسەن – سەروەرە و، لەوانەیە خواوەند بیكات بە هۆی سولحی نێوان دوو كۆمەڵی موسلمان.

ئەوەبوو پاش تێپەڕبوونی چل ساڵ، دوو سوپای گەورەی ئیسلام لە بەرامبەر یەك ڕاوەستان. بەڵام حەزرەتی حەسەن لەگەڵ معاویەدا - خوایان لێ ڕازی بێت - ڕێککەوت و سوڵحی کرد. بەم سوڵحەش تەسدیقی موعجیزە غەیبییەکەی باپیری بەڕێزی خۆی ﷺ کرد.

**نموونەی دووهەم:**

* بە نەقڵی صەحیح پێمان گەیشتووە و بۆمان چەسپاوە، کە پێغەمبەر ﷺ بە حەزرەتی عەلیی فەرمووە: "ستقاتلُ الناكثين والقاسطين والمــــارقين"[١]. بەمەش هەواڵی جەنگی "جەمەل" و، "صِفِّين" و، "خەواریج"ی پێ داوە.

* جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەلی و حەزرەتی زوبەیری بینی یەکتریان خۆش دەویست. بە زوبەیری فەرموو: "لتقاتلنَّه وأنتَ ظالِمٌ له"[٢].

* هەروەها بە خێزانەکانی خۆی فەرموو: "كيف بإحداكن تنبحُ عليــــها كـــلابُ الحوأب" [٣]. "يقتل عن يمينها وعن يسارها قتلى كثيرة"[٤].

ئەوەبوو لە پاش سی ساڵ لە جەنگی "جەمەل"دا کە لە نێوان حەزرەتی عەلی لە لایەکەوە و حەزرەتی عائیشە و تەڵحە و زوبەیردا - خوایان لێ ڕازی بێت - لە لاکەی ترەوە ڕووی دا و.. لە جەنگی "صِفِّين" کە لە نێوان حەزرەتی عەلی و معاویەدا ڕووی دا و.. لە جەنگی "حەروراء" و "نەهرەوان"دا کە لە نێوان حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - و خەواریجەکاندا ڕووی دا، هەموو ئەم فەرموودە صەحیحانە هاتنەدی.

* پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بە حەزرەتی عەلی داوە و پێی فەرمووە: "ئەو کەسەی کە دەتکوژێت، دەکێشێت بە سەرتدا و بە خوێنی سەرت ڕیشت تەڕ دەکات"[٥]. حەزرەتی

---

(١) رواه الحاكم والبـــزار والطـبراني في الأوسـط. واتە: جەنگ لەگەڵ پەیمانشکێنان و ناحەقڕەوان و دەرچووانداا دەکەیت.

(٢) أخرجه الحاكم ٤١٢/٣ بڕوانە: (شرح الشفا لعلـي القـاري ٦٨٦/١- ٦٨٧). واتە: لەگەڵ عەلیدا دەجەنگیت و لەمەشدا ستەمی لێ دەکەیت.

(٣) حديث صحيح رواه أحـمد وابن حبان والحاكم وأبو يعلى والبزار وابن أبي شيبة.

(٤) حديث صحيح رواه البزار. واتای هەردوو فەرموودەکە بە یەکەوە: "دەبێ حاڵی ئەو یەکەتان چۆن بێت کە سەگەلی حەوئەب (گوندێکە لەسەر ڕێی مەدینە - بەسرەدا) لێی دەوەڕن و، لە ڕاست و چەپیەوە کوشتارێکی زۆر دەکرێت"!

(٥) حديث صحيح رواه الطبراني والحاكم.

عەلیش - خوای لێ ڕازی بێت - ئەو کەسەی دەناسی کە "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی موڵجیمی خاریجی" بوو.

❋ هەروەها هەواڵی "ذو الثدية" (واتە خاوەن مەمك)ی ڕاگەیاندووە و نیشانەیەکی جیاکەرەوەی ئەویشی باس کردووە و، هەواڵی داوە کە لە کوژراوەکانی خەواریج دەبێت. لە ڕاستیشدا وابوو لە ناو کوژراوەکانیاندا بوو. ئەو نیشانەیەش کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردبوو، ئەوە بوو کە فەرمووبووی: "پیاوێکی ڕەش پێستە و یەکێك لە قۆڵەکانی وەك مەمکی ئافرەت وایە"[1]. لە پاشان حەزرەتی عەلی ئەمەی کرد بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خۆی لەسەر حەقە و، موعجیزەکەی پێغەمبەریشی ﷺ ئاشکرا کرد.

❋ هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە - وەك ئوم سەلەمە دەیگێڕێتەوە - کە حەزرەتی حسەین - خوای لێ ڕازی بێت - لە "الطف" واتە لە "کەربەلا"دا دەکوژرێت[2]. ئەوە بوو پاش پەنجا ساڵ ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە ڕووی دا و، هەواڵە غەیبی‌یەکەی پێغەمبەریش ﷺ هاتەدی.

❋ هەروەها پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك فەرموویەتی: "إن أهل بيتي سيلقون بعدي من أمتي قتلاً وتشريداً"[3]. هەروەهاش بوو کە هەواڵی دا.

* * *

**لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتەپێش کە ئەمەیە:**

دەڵێن حەزرەتی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - لەبەر ئەوەی خزمی نزیکی پێغەمبەرە ﷺ و، خاوەنی ئازایەتی‌یەکی کەم وێنە و زانیاری‌یەکی زۆر بووە، شایانتر بوو بکرێت بە جێ‌نشینی پێغەمبەر ﷺ، ئەدی بۆچی (لە جێ‌نشینی‌دا) پێش نەخرا؟

بۆچی لە سەردەمی ئەودا حاڵی موسڵمانان شڵەژا و تێکچوو؟

**وەڵام:**

یەکێك لە قوتبە گەورەکانی ئالی بەیت فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئاواتەخوازی ئەوە بوو کە حەزرەتی عەلی جێ‌نشینی بێت، بەڵام لە غەیبەوە ئاگادار کراوەتەوە، کە ویستی

(١) حديث صحيح رواه البخاري ومسلم.

(٢) حديث صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني. وانظر كذلك: (صحيح الجامع الصغير ٢١٧).

(٣) بڕوانە: (علي القاري ١/٦٨٥)، (الخفاجي ٣/١٨١)، وثبت في الحديث الصحيح الذي بمعناه ما رواه الطبراني في الكبير. انظر: (صحيح الجامع الصغير وزيادته ٢٥٥٨). واتە: ئەهلی بەیتی من دوای خۆم لەسەر دەستی نەتەوەکەم کوشتار و دەربەدەری‌یان دێتەڕێ.

خوای گەورە شتێکی تری غەیری ئاواتەکەی ئەوە. ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەبەر ویستی خوای گەورە، وازی لەو ئاواتەی خۆی هێنا.

وا (لە خوارەوەدا) یەکێك لەو حیکمەتە زۆرانەی ویستی خوای گەورە کە لەم کارەدا هەیە، باس دەکەین:

کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، هاوەڵەکانی زیاتر پێویستیان بە یەکێتی و پشتگیریی یەکتر هەبوو. ئیمامی عەلیش - خوای لێ ڕازی بێت - چەند ڕەوشتێکی هەبوو، وەك: تەقلید نەکردنی کەس و شوێنپێ هەڵنەگرتنی خەڵك و، زوهدێکی زۆر و، ئازایەتییەکی بێ وێنە و، پێویستینەبوونی بە هیچ کەسێك..

جا ئەگەر بهاتایە و ئیمامی عەلی - کە ئەم ڕەوشت و سیفەتانەی هەیە - لەو کاتەدا ببوایە بە جێنشین، ئەوا ئەم ڕەوشتانەی، دەماری مونافەسەی لای گەلێ کەس و لەناو زۆر دەستە و تیرەدا دەجووڵاند و، بەم جۆرە دووبەرەکی و ناکۆکی لەناو موسڵماناندا پەیدا دەبوو، بە وێنەی ئەو ئاشووب و ڕووداوانەی کە دوایی لە سەردەمی خەلافەتەکەیدا ڕوویان دا.

یەکێکیش لە هۆکارەکانی دواکەوتنی جێنشینیی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - ئەمەیە:

لەو کاتەدا کە ئەوی تێدا بوو بە جێنشین، نەتەوەی ئیسلام چەندین نەتەوە و کۆمەڵی جۆراوجۆر بوون و هەریەکەشیان تۆوی دووبەرەکیی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، وەك پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی دابوو، دەگەیشتنە حەفتا و سێ بەشی جیاجیا[1]..

ئا لەم کاتەدا کە گەردەلوولی ئاشووب و فیتنە لە هەموو لایەکەوە بەسەر نەتەوەی ئیسلامدا هەڵی کردبوو، موسڵمانان پێویستیان بە کەسێتییەکی گەورە و بەرزی وەها بوو کە خاوەنی چەندین سیفەتی وەك: هەیبەت و، ئازایەتیی زۆر و، فیراسەتی ڕاست بێت و، خاوەنی نەسەبێکی ڕەسەن و لە ئالی بەیت و نەوەی هاشم بێت. بۆ ئەوەی بتوانێت لە بەردەم ئەو هەموو فیتنە و ئاشووبانەدا خۆی پێ ڕاگیر بکرێت..

جا ئەم جۆرە کەسێتییە تەنها لە ئیمامی عەلیدا - خوای لێ ڕازی بێت - هاتبووە دی. ئەوەبوو توانیی لە بەردەم ئەو هەموو گەردەلوولانەدا خۆی ڕابگرێت. پێشتریش پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەوەی پێ دابوو کە: هەروەك خۆی (واتە پێغەمبەر ﷺ) لە پێناوی

(١) هەموو ئەو فەرموودانەی کە لە بارەی دابەشبوونی نەتەوەی ئیسلامەوە بۆ حەفتا و سێ دەستە و کۆمەڵ دەدوێن، هەموویان "صەحیح"ن.

نازڵ بوونی قورئاندا لەگەڵ دوژمنانیدا کەوتووەتە جەنگەوە، ئەویش (واتە ئیمامی عەلی) لە پێناوی تەئویلی قورئاندا لەگەڵ دوژمنانیدا دەکەوێتە جەنگەوە[1].

پاشان ئەگەر ئیمامی عەلی نەبوایە، ئەوا دەستەڵاتداریی دنیا، ئەمەوی‌یەکانی – بە تەواوی – لە ڕێی ڕاست دەترازاند و لە خشتەی دەبردن. بەڵام کە ئیمامی عەلی و ئالی بەیتیان لە بەرامبەری خۆیانەوە دەبینی، ئەوانیش هەوڵیان دەدا بگەنە ئاستیان و هاوشانی پلە و پایەیان بن، تاکو ئەو ڕێزەی لە لایەن نەتەوەی ئیسلامەوە دەستیان کەوتبوو، لە دەستی نەدەن. ئەوەبوو زۆربەی سەرۆکەکانی دەوڵەتی ئەمەوی ناچار بوون کە شوێنکەوتووانی خۆیان هەڵبنێن و هانیان بدەن بۆ پاراستنی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و ئەحکامەکانی قورئان و ئیسلام، هەرچەندەش بۆ خۆیان هیچ کارێکیان لەم ڕووەوە ئەنجام نەدا! لەبەر ئەوە، لە ژێر سایەی دەوڵەتەکەیاندا سەدان هەزار لە زانا لێکۆڵەرەکان و موجتەهیدان و ئەولیا و پیاوچاکان و لێبڕاوان بۆ ئایینی خوا، پەیدا بوون و گەشەیان کرد. کەواتە ئەگەر چەند کەماڵات و صەلاحەت و ئاینداری‌یەك نەبوایە کە لە ئالی بەیتدا هەبوون، ئەوا ئەمەوی‌یەکان پێیان دەترازا و، بە تەواوی لە ڕێی ڕاست لایان دەدا، هەروەك لە کۆتایی حوکمڕانیی ئەوان و عەبباسی‌یەکاندا ڕووی دا.

**ئەگەر پرسیار بکرێت و بوترێت:**

خۆ ئالی بەیت لە هەموو کەس زیاتر شایانی جێ‌نشینی بوون، ئەدی بۆچی ئەم جێ‌نشینی‌یەیان تێدا نەمایەوە؟

**وەڵام:**

دەستەڵاتداریی دنیا مرۆڤ لە خشتە دەبات. ئەهلی بەیتیش لە ڕاستی‌دا ئەرکی پاراستنی ڕاستی‌یەکانی ئیسلام و ئەحکامەکانی قورئانیان پێ سپێرراوە. ئەو کەسەش کە کاروباری جێ‌نشینی دەگرێتە دەست، دەبێ بە هیچ جۆرێك دنیا نەیخەڵەتێنێت. واتە یان وەك پێغەمبەر ﷺ "مەعصووم" بێت، یان وەك خەلیفە ڕاشیدەکان و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی ئەمەوی و مەهدیی عەبباسی، تەقوایەکی گەورە و زوهدێکی زۆری بێت، بۆ ئەوەی لە خشتە نەچێت و لە خۆی بایی نەبێت..

جا لەم ڕووەوە دەستەڵاتداریی دنیا بۆ ئالی بەیت دەست نادات، چونکە ئەرکە سەرەکی‌یەکەی خۆیان لە بیر دەباتەوە کە بریتی‌یە لە پاراستنی ئایین و خزمەتکردنی ئیسلام. خەلافەتی دەوڵەتی فاتیمی، کە لە میسردا بە ناوی ئالی بەیتەوە دامەزرا و،

---

(١) حديث صحيح رواه الإمام أحمد.

حكوومەتی "موەحیدەكان" لە ئەفریقیا و، دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران، هەریەكەیان باشترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە دەستەڵاتداری و حوكمڕانی بۆ ئالی بەیت دەست نادات. بەڵام لەو لاوە دەبینین كە هەركات ئالی بەیت وازیان لە دەستەڵاتداری هێنابێت، ئەوا هەوڵ و كۆشش و تەقەلایەكی زۆریان بۆ خزمەتی ئیسلام و بەرزكردنەوەی ئاڵای قورئان داوە.

ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بە جوانی بۆ دەربكەوێت، ئەوا فەرموو سەرنج لەو قوتبانە بدە كە لە بەرەی حەزرەتی حەسەن هاتوون، بە تایبەت چوار قوتبەكان و، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەت: شێخی گەیلانی (قُدِّسَ سِرُّهُ).. یان فەرموو سەرنج لەو پێشەوایانە بدە كە لە بەرەی حەزرەتی حسەینن، بە تایبەت "ئیمام زەینولعابدین" و "ئیمام جەعفەری صادق" و هاوچەشنیان.. دەبینیت هەریەك لەوانە (لە كاتی خۆیاندا) وەكو "مەهدی"یەكی مەعنەوی بوون و، بە بۆنەی خەریك بوونیانەوە بە بڵاوكردنەوەی نووری قورئان و ڕاستییەكانی ئیمان، هەرچی ستەم و تاریكایی مەعنەویی دەوروبەریان بووە، ڕەواندوویانەتەوە و نەیانهێشتووە. بەمەش چەسپاندوویانە كە بە ڕاستی میراتگری باپیری گەورە و سەروەریانن، هەزاران دروودی لەسەر بێت.

**ئەگەر بوترێت:**

"حیكمەت" لەو ئاشووبە خوێناوییە سامناكەدا چییە كە لە سەردەمی جێنشینیی خەلیفە ڕاشیدەكاندا – كە چاكترین سەردەمی مێژووی موسڵمانانە – تووشی نەتەوەی ئیسلام بوو، خۆ ئەو بەڕێزانە شایانی ئەو گرفت و بەڵایە نەبوون كە بێتە ڕێیان؟.. ئایا كامەیە لایەنی "میهرەبانی"ی خواوەند لەم كارەدا؟

**وەڵام:**

هەروەك هەورە بروسكە و بارانی زۆری بەلێزمە و تۆفی بەهار، توانا و لێهاتنی هەموو جۆرەكانی ڕووەك دەبزوێنێت و دەری دەخات و، بەمەش تۆوەكان دەكرێنەوە و گوڵەكانیان دەپشكوێن و هەریەكەیان كاری سروشتیی خۆی پێ دەسپێررێت.. هەر بەو جۆرەش ئەو فیتنەیەی كە هاتە ڕێی هاوەڵان و شوێنكەوتووانیان – خوایان لێ ڕازی بێت – تۆوی توانا و لێهاتنی ئەوانی هەژاند و، هەموو دەستە و كۆمەڵێكی بێدار كردەوە كە: ئایینی ئیسلام لە مەترسیدایە و خەریكە ئاگر لە موسڵمانان بەردەبێت!

ئەم بێداركردنەوەیەش وای لە هەموو دەستە و تاقمێكی موسڵمانان كرد كە فریای

پاراستنی ئیمان و ئیسلام بکەون. ئەوە بوو هەریەکەیان بەپێی توانای خۆی ئەرکێکی لەو ئەرکە زۆرانەی پاراستنی ئیمان و یەکێتیی موسڵمانانی لە ئەستۆ گرت و، بەوپەڕی ئیخلاس و لێبڕانەوە ئەو ڕێیەی گرتەبەر.. دەستە و تاقمی وایان هەبوو پاراستنی فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ و، هەندێکیان پاراستنی شەریعەت و، هەندێکی تریان پاراستنی ڕاستییەکانی ئیمان و، هەندێکی تریان پاراستنی قورئانی پیرۆزیان خستە ئەستۆی خۆیان..

بەم جۆرە، هەریەکەیان ئەرکێکی لەو ئەرکانەی کە پاراستنی ئیمان و ئیسلام لەو ڕۆژەدا داخوازی بوو، ئەنجام دا و، بە تەواویش بۆ ئەم کارانەی خۆیان لێ بڕان.

کەواتە ئەو تۆوانەی کە گەردەلوولی فیتنە و ئاشووبەکانی ئەو سەردەمە بە هەموو لایەکدا وەشاندنی، چەندین گوڵی ڕەنگاوڕەنگیان لە هەموو جێیەکی جیهانی ئیسلامدا بەرهەم هێنا، بە چەشنێ کە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلام وەك باخچەی لێ هات و، بە گوڵزار خەملا و ڕازایەوە..

بەڵام بە داخەوە لە ناوەندی ئەو باخچە و گوڵزارە پشکووتووانەدا دڕکوداڵی ئەهلی بیدعەتیش سەریان هەڵدا! وەك بڵێی دەستی توانستی خواوەند ئەو چەرخ و سەردەمەی بە سام و شکۆمەندیی خۆی و بە توندی ڕاتەکاند و، ئەمەش هیممەت و هەستی کەسانی خاوەن هیممەت و غیرەتی جوولاند. چونکە ئەو بزووتنەوەیەی کە لە ناو جەرگەی وڵاتی ئیسلامەوە تیشکی هاویشت، بەشێکی زۆری لە پێشەوا و موجتەهید و زانایانی فەرموودە و ئەقتاب و ئەولیا و پیاوچاکانی بە هەموو لایەکی وڵاتی ئیسلامدا پرژاند و بڵاوی کردنەوە و ناچاری کۆچ و ڕەوی کردن، موسڵمانانیشی هان دا کە بەم لاو ئەو لادا بڕۆن و دەرگای دڵانیان بکەنەوە و، لای ئەوان لە گەنجینەکانی قورئانی پیرۆز زانیاری هەڵبگۆزن.

* * *

با بڕۆینەوە سەر باسەکەی خۆمان:

ئەو ڕووداوانەی کە پێش ڕوودانیان پەنهان بوون و پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ڕوودانیانی دا و، پاشان وەك چۆن هەواڵی دابوو وەها هاتنەدی، ئەمانە لە هەزاران ڕووداو تێپەڕ دەبن. بەڵام ئێمە تەنها ئاماژە بۆ چەند نموونەیەکیان دەکەین، لەوانەی کە خاوەنانی هەر

شەش كتێبە صەحیحەكانی فەرمووده لـە بارەیانـەوە یـەكیان گرتـووە، كـە لـە پێـش هەموویانـەوە ئیمـامی بوخـاری و ئیمـامی موسـلیمن. تەنانـەت بەشـێكی زۆری ئـەو ڕووداوانە بە تـەواتوری مەعنـەوی پێمـان گەیشـتوون و زانایـان و لێكۆڵـەرانی ئەم بـوارە لەسەر "صەحیحی"ی هەندێكیان یەكیان گرتووە، كـە ئەمـەش وەكـو تـەواتوری صـەریح وایە.

✲ پێشەوایان و خاوەنانی كتێبە صەحیحەكان هەموو ئەو هەواڵانەیان گێڕاوەتەوە كـە پێغەمبـەر ﷺ بەڵێنی بـە هـاوەڵانی داوە بەسـەر دوژمنـاندا سـەردەكەون و، مەككـە[1] و، بەیتولمەقدیس[2] و، یەمەن و شام و عێراق[3] و، خەیبەر[4] فەتح دەكەن، هـەروەها هـەواڵی پێ دابوون كە گەنجینەكانی كیسرا و قەیسـەر لـە نێـوان خۆیـاندا دابـەش دەكـەن[5]، كـە دەوڵەتەكانی ئەم دوانەش گەورەترین دوو دەوڵەتی جیهانی ئەو سەردەمە بوون.

پاشان دەبێ بزانین كە پێغەمبەر ﷺ كاتێ ئـەم هەواڵانـەی داوە، هـەرگیز نەیفـەرمووە: "وا گومـان دەبـەم".. یـان: "لام وایـە".. یـان: "لەوانەیـە"، بـەڵكو بەوپـەڕی زانـین و دڵنیاییەوە، وەك ئەوەی چاوی لـێ بێـت، ئەم هەواڵانـەی ڕادەگەیاند و، لـە دواییشـدا وەها دەرچوون كە ڕایگەیاندن.

ئەوەشمان لە یاد نەچێت كـە لـەو كاتـەدا پێغەمبـەر ﷺ ئـەم هەواڵانـەی ڕادەگـەیاند لـە لایەن خوداوەندەوە فەرمانی كۆچ كردنی بـەرەو مەدینـە پێ درابوو، هاوەڵەكانیشـی كـەم بوون و، دەوروبەری مەدینە و هەموو جیهانیش دوژمنیان بوون!

✲ لە ڕیوایەتێكی صەحیحدا دەركـەوتووە كـە چـەندین جـار فەرموویـەتی: "إقتـدوا باللَّذَيْن من بعدي أبي بكر وعمر"[6]. واتە هەواڵی ئەوەی داوە كە ئەم دوانە دوای خـۆی

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم..
(٢) صحيح، رواه البخاري.
(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم ومالك.
(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم.
(٥) صحيح، رواه مسلم.
(٦) صحيح، رواه الترمذي وابن ماجه والحاكم وأحـمد والبيـهقي. واتـە: "لـە پاش خۆم شوێن ئەو دوانـە بكەون كە لە دوای من دێن، كە ئەبووبەكر و عومەرن".

دەمێنن و دەبن بە جێنشینی و، بە چەشنێ کە خوا پێی ڕازی بێت، ئەرکی جێنشینی ئەنجام دەدەن و، ئەبووبەکر ماوەیەکی کەم جێنشین دەبێت، بەڵام عومەر ماوەیەکی زیاتر.. چەندین فتوحاتی زۆریش دەکات.

* هەروەها فەرموویەتی: "إنّ اللّٰه زَوى لي الأرضَ فرأيت مشارقها ومغاربها، وإنّ أمتي سيبلغ ملكَها ما زُوِيَ لي منها"[1]. هەر بەو جۆرەش کە فەرمووی، هاتەدی.

* ڕیوایەتێکی صەحیح[2] دەڵێت: پێش دەست پێکردنی جەنگی بەدر، پێغەمبەر ﷺ شوێنی کوشتنی کافران و سەرکردەکانیانی لە بەدردا دەستنیشان کرد و فەرمووی: "ئەبوو جەهل لێرەدا دەکوژرێت.. عوتبە لێرەدا دەکوژرێت.. ئومەییە لێرەدا دەکوژرێت و.. فلان لێرەدا و فیساریش لەویادا.. هتد. پاشان فەرمووی: "بێشزانە کە ئوبەیی کوڕی خەلەف دەکوژرێت"[3].. کوشتنی هەموویان هەر بەو جۆرە هاتەدی کە لە پێشدا فەرمووی.

* هەروەها لە فەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە کە لەو کاتەدا هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای "موئتە"دا بوون، کە جێگایە کە لەسەر سنووری وڵاتی شام و مانگەڕێیەك لە مەدینەوە دوورە، پێغەمبەر ﷺ وەك چاوی لێ بێت، هەواڵی ئەوانی بە خەڵکی مەدینە ڕاگەیاند و فەرمووی: "أخذ الراية زيدٌ فأصيب، ثم أخذ جعفرٌ فأصيب، ثم أخذ ابن رواحة فأصيب، وعيناه تذرفان.. حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله حتى فتح الله عليهم"[4]. لە پاش چەند حەفتەیەك "یەعلای کوڕی مونەببیھ"ی هاوەڵی لە گۆڕەپانی جەنگەوە هاتەوە و ڕۆشتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ. پێش ئەوەی ئەو هیچ شتێك بگێڕێتەوە،

---

(١) صحيح، رواه مسلم والترمذي وأبو داود وابن ماجه وأحمد. واتە: "خوای گەورە زەویی بۆ هێنامەوەیەك بە چەشنێ خۆرهەڵات و خۆرئاوایم دی و، نەتەوەکەشم بە موڵك و دەستەڵاتداریی ئەو جێگایانە دەگەن کە هێنرانە پێش چاوم".

(٢) صحيح، رواه مسلم وأحمد والحاكم.

(٣) رواه البيهقي. بڕوانە: الشفا ١/٣٤٣.

(٤) صحيح، رواه البخاري وأحمد والنسائي. واتە: "زەیدی کوڕی حاریسە ئاڵاکەی هەڵگرت، ئنجا پێکرا.. پاش ئەو جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت، ئەویش پێکرا.. ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت، ئەویش پێکرا" تا لەم کاتەدا فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە. پاشان فەرمووی: "شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوا ئاڵاکەی هەڵگرت و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا".

هەرچی لە جەنگەکەدا ڕووی دابوو پێغەمبەر ﷺ لەبەر چاوی یەعلادا هەمووی گێڕایەوە. یەعلاش سوێندی خوارد و وتی: "بەو کەسەی تۆی بە حەق کردووە بە پێغەمبەر، یەك حەرفت لە قسەکانی ئەوان نەپەڕاند"[(١)].

* هەروەها لە ڕیوایەتێکی صەحیحدا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە خەلافەت لە دوای خۆی سی ساڵ بەردەوام دەبێت، پاشان دەبێت بە پاشایەتییەکی گەزندە[(٢)]، دەفەرموێ: "وإنّ هذا الأمر بدأ نبوّة ورحمة، ثم يكون رحمة وخلافة، ثم يكون ملكاً عضوضاً، ثم يكون عتواً وجبروتاً وفساداً في الأمة"[(٣)]. بەمەش ماوەی جێنشینیی ڕاشیدانەی بە سی ساڵ دەستنیشان کرد، کە بە شەش مانگەکەی خەلافەتی حەزرەتی حەسەن - خوای لێ ڕازی بێت - هەر سی ساڵەکە پڕ دەبێتەوە، ئنجا پادشایەتی و ستەمکاری و فەساد لەناو نەتەوەی ئیسلامدا یەك لە دوای یەك دێن و پەیدا دەبن. هەر بەو جۆرەش هاتەدی کە ئەو فەرمووی.

* بە ڕیوایەتی صەحیح چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە حەزرەتی عوسمان - خوای لێ ڕازی بێت - لە کاتێکدا دەکوژرێت کە قورئان دەخوێنێت[(٤)]. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إن الله عسى أن يلبسه قميصاً وأنهم يريدون خلعه"[(٥)]. وتەی: نزیکە خواوەند کراسێك بکاتە بەر عوسمان، بەڵام ئەوان دەیانەوێت لەبەری دەرکەن. هەر بەو جۆرەش کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی، هاتەدی.

* بە ڕیوایەتێکی صەحیحی تر دەگێڕنەوە کە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخ(الحجامة)ی دەگرت، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لە خوێنی پێغەمبەری ﷺ بۆ پیرۆزی خواردەوە و ڕۆی نەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: "ويل للناس منك، وويل لك من الناس"[(٦)]. بەمەش ئەوەی ڕاگەیاند کە: عەبدوڵڵا بە ئازایەتییەکی بێوێنە کاروباری خەڵکی دەخاتە ئەستۆی خۆیەوە و هێرشێکی سەختی دەکرێتەسەر و، بەهۆی

---

(١) بڕوانە: زاد المعاد بتحقيق الأرناؤوط (٣/٣٨٥).

(٢) صحيح، رواه أحمد والترمذي والدارمي وأبو يعلى وابن حبان.

(٣) صحيح، رواه أحمد والبزار والطبراني في الأوسط.

(٤) صحيح، بڕوانە: "فضائل الصحابة" للإمام أحمد ١/٥٠١ الحديث رقم ٨١٧.

(٥) صحيح، رواه الترمذي وابن ماجه.

(٦) حديث حسن، رواه الطبراني وأبو يعلى والبزار والحاكم.

ئەوەوە بەلا و موسیبەت تووشی خەڵکی دێت.. لە پاشەڕۆژدا، بەو جۆرەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دابوو، هاتەدی. ئەوە بوو لە سەردەمی ئەمەوی‌یەکاندا، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لە شاری مەککەدا جێ‌نشینیی خۆی ڕاگەیاند و، حەججاجی کوڕی یووسفی ستەمکاریش بە سوپایەکی زۆر گەورەوە ئابلۆقەی شاری مەککەی دا، لە پاش چەند شەڕێکی سەخت و چەند جەنگێکی خوێناوی و پاش دەرخستنی ئازایەتی‌یەکی بێ‌وێنە، عەبدوڵلا شەهید کرا.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پەیدابوونی دەوڵەتی ئەمەوی و سەرکارچوونی معاویەی ڕاگەیاندووە و، وەسیەتیشی بۆ کردووە و فەرموویەتی[1]: "ئەگەر حوکمڕانیت گرتە دەست، نەرمونیان و لێبوردە بە و، ئامۆژگاریی باش بکە"..

هەروەها هەواڵی ئەوەشی داوە کە ئەمەوی‌یەکان ماڵی خوا لەناو خۆیاندا دەستاودەست پێ دەکەن[2] و، پادشا و سەرکردەکانیان ستەمکار دەبن و، چەند کەسێکی وەك "یەزید" و "وەلید"یان تێدا پەیدا دەبێت[3].

* هەروەها هەواڵی ئەوەشی داوە کە "عەبباسی‌یەکان بە ئالای ڕەشەوە پەیدا دەبن و، موڵکیان چەندین ئەوەندەی ئەوانەی پێش خۆیان زیاد دەکات"[4]. بەمەش ڕایگەیاند کە عەبباسی‌یەکان دوای ئەمەوی‌یەکان پەیدا دەبن و لە ئەمەویی‌یەکانیش زیاتر لە حوکمدا دەمێننەوە. هەر بەو جۆرەش هاتەدی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دابوو.

* بە فەرموودەی صەحیح چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ویل للعرب من شرّ قد اقترب"[5]. ئەمەش هەواڵدانی ئاشووبەکانی جەنگیزخان و هۆلاکۆ بوو، کە دەوڵەتی عەبباسیی عەرەب لەناودەبەن. چۆنیشی فەرموو، هەر بەو جۆرە هاتەدی.

---

(١) رواه أحمد مرسلاً ورجاله رجال الصحيح، ورواه أبو يعلى موصلاً ورجاله رجال الصحيح.

(٢) رواه الترمذي والحاكم والبيهقي. لە واتای ئەم فەرموودەیەدا بڕوانە: (صحيح الجامع الصغير ٤١٢).

(٣) حديث حسن، رواه أبو يعلى. بڕوانە: (صحيح الجامع الصغير ٢٧٥٩)، (المطالب العالية لابن حجر ٤٥٢٨-٤٥٢٩).

(٤) رواه أحمد والطبراني والحاكم. وصحح إسناده العلامة أحمد شاكر في المسند.

(٥) صحيح، رواه البخاري ومسلم. واتە: بەدبەختی بۆ عەرەب، لەبەر ئەو شەڕ و ئاشووبەی لێیان نزیك بووەتەوە.

* ڕیوایەتێکی صەحیح دەڵێت: لە کاتێکدا سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص لە نەخۆشی‌یەکی سەختدا بووە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: "لعلّك تُخلَّفُ حتى ينتفع بك أقوام ويستضرّ بك آخرون"(١). ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ڕایدەگەیەنێت کە: سەعد دەبێت بە پێشەوایەکی گەورە و، خواوەند لەسەر دەستی ئەودا چەندین وڵات فەتح دەکات و، چەندین تیرە و دەستە و کۆمەڵیش بەهۆی ئەوەوە دێنە ڕیزی ئاینی ئیسلامەوە و بەمەش سوودێکی زۆریان دەست دەکەوێت، هەروەها چەند تاقمێکی تریش بەهۆی سەعدەوە زیانیان پێ دەگات و دەوڵەتەکەیان تیادەچێت.

لە ڕاستی‌دا هەر بەو جۆرە ڕووی دا کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دابوو. ئەوەبوو سەعد بوو بە پێشەوای سوپای ئیسلام و، دەوڵەتی فارسەکانی لەناوبرد و، بوو بەهۆی ئەوەی کە چەندین تیرە و نەتەوەی زۆر موسڵمان بین.

* هەروەها چەسپاوە کە لەو ڕۆژەدا نەجاشیی پادشای حەبەشە لە ساڵی حەوتەمی کۆچی‌دا، کۆچی دوایی کرد، هەر لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی ئەوی بە خەڵك ڕاگەیاند(٢) و، نوێژی مردووشی، لە دوورەوە، لەسەر کرد.. پاش تێپەڕبوونی حەفتەیەك لەو هەواڵدانەی پێغەمبەر ﷺ، دەنگوباس گەیشتە مەدینە، کە نەجاشی لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی کۆچی دوایی کردووە!

* هەروەها لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەند هاوەڵێکی هەڵبژاردەی خۆی‌دا، لەسەر چیای ئوحود ڕاوەستابوون (یان لەسەر ئەشکەوتی حیراء، وەك لە هەندێ ڕیوایەتدا هەیە) چیاکە کەوتە جموجووڵ. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "أُثبت، فإنما عليك نبيٌّ وصدّيق وشهيد"(٣). بەمەش ئەوەی ڕاگەیاند کە حەزرەتی عومەر و عوسمان و عەلی، شەهید دەکرێن. کۆتایی ژیانی ئەو سیانە بەو جۆرە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی.

ئەی ئەو مرۆڤە لاوازەی کە دڵی مردووە! ئەی سەر لێ شێواو!

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم. واتە: "لەوانەیە بمێنیتەوە تاکو چەند قەومێك سوودت لێ وەربگرن و چەند قەومێکی تریش لە تۆوە تووشی زیان دەبن".

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود ومالك والشافعي وأحمد والبيهقي.

(٣) صحيح، رواه البخاري وأبو داود والترمذي وأحمد وأبو يعلى وابن حبان. واتە: "ئەی چیای ئوحود! جێگیربە و مەجووڵێ، چونکە ئێستا ئەوانەی لە سەرت ڕاوەستاون، پێغەمبەر و صیددیق و شەهیدن".

لەوانەیە بڵێیت: محەممەد ﷺ مرۆڤێکی بلیمەت(عبقري) بووە و بەو هۆیەوە ئەم شتە غەیبییانەی زانیوە. لەوانەیە ئەمە بڵێیت و ئیتر لە ئاستی ڕاستیی "پێغەمبەرێتی"ی ئەودا - کە وەك خۆر دەدرەوشێتەوە - چاوت بنووقێنیت!

ئەی داماوی هەژار!

باش بزانە ئەوەی کە بیستت، تەنها بەشێکە لە پازدە جۆر لە جۆرە گشتییەکانی موعجیزاتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ. خۆ بە باشی زانیت کە بە چەندین ڕیوایەتی صەحیح و بە تەواتوری مەعنەوی هەموویان چەسپاون. کەواتە هێشتا بەشێکی کەم نەبێت لەو موعجیزانەی کە پەیوەندییان بە شتە غەیبییەکانەوە هەیە، هیچی ترت نەبیستووە.. جا ئایا ئیتر دوای ئەوەی کە مرۆڤ ئەم موعجیزانە دەبیستێت، هەر بە خاوەنی ئەو موعجیزانە دەڵێت: (ئەمە مرۆڤێکی بلیمەت بووە و بەو بۆنەیەوە توانیویەتی ئایندەی بۆ دەربکەوێت و ڕووداوەکانی بزانێت)؟!

گریمان ئێمەش وەك تۆ وتمان: بەڵێ بلیمەتە. بەڵام ئایا کەسێك خاوەنی زیرەکییەکی ئاوا پیرۆز و بلیمەتییەکی بەرزی سەدان جارەی کەسانی تر بێت، وەکو ئەو پێغەمبەرە ﷺ، هەرگیز سەری لێ تێکدەچێت و ئەو شتانەی دەیانبینێت لێی دەئاڵۆزێن؟ یان ئایا لەو ئاستە بەرزەی خۆی دادەبەزێتە خوارەوە کە چەندین هەواڵی وا ڕابگەیەنێت لە ڕاستییەوە دوور بن؟

ئایا ئەوپەڕی شێتی و گەلحۆیی نییە کە ئێمە پشت لەو هەواڵانە هەڵبکەین، کە ئەم مرۆڤە (بلیمەتە) سەبارەت بە بەختەوەریی هەردوو دنیا پێمان ڕادەگەیەنێت؟!

## ئاماژەی ڕەوانی شەشەم

* چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ بە فاتیمەی کچی ڕاگەیاندووە کە ئەو: "أول أهله لحوقاً به"[1]. واتە: کە حەزرەتی فاتیمە یەکەم کەس دەبێت لە ئالی بەیت لە دوای پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی دەکات.

پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەردا ﷺ حەزرەتی فاتیمە وەفاتی کرد.

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحـــمد والترمذي.

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بە "ئەبووذەڕ" داوە، کە ڕۆژێك دێت ئەبووذەڕ لە مەدینە نەفی دەکرێت و بە تەنیایی دەژی و لە تەنیاییشدا دەمرێت[١].. پاش بیست ساڵ فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆنی فەرمووبوو، وەها هاتەدی.

* هەروەها چەسپاوە کە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی "ئوم حەرامی" پووری ئەنەسی کوڕی مالیکدا نوستبوو، بە زەردەخەنەوە هەڵسا و فەرمووی: "ناسٌ من أمتي عُرِضوا عَلَيَّ غُزاةً في سبيلِ اللهِ يركبون ثَبَجَ هذا البحر ملوكاً على الأسرة"[٢]. واتە: "چەند کەسێکیان لە نەتەوەکەم پیشان دام کە لە پێناوی خوادا غەزایان دەکرد و سواری پشتی(کەشتیی) ئەم دەریایە دەبوون و پادشای سەر تەخت بوون". ئوم حەرام وتی: "ادع يا رسولَ اللهِ أنْ أكون معهم. فدعا لـها"[٣].. چل ساڵ پاش ئەم ڕووداوە، ئوم حەرام لەگەڵ "عوبادەی کوڕی صامیتی" مێردیدا ڕۆشتن بۆ فەتحی دوورگەی "قوبرص" و لەوێ کۆچی دوایی کرد. تا ئێستاش گۆڕەکەی لەوێ ئاشکرایە و خەڵکی زیارەتی دەکەن.

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إنَّ في ثقيفَ كذاباً ومُبيراً"[٤]. ئەمەش هەواڵدان بوو بۆ پەیدا بوونی "موختاری ثەقەفی" کە لافی پێغەمبەرێتیی لێدەدا و، "حەججاجی خوێنڕێژی ستەمکاریش" کە سەد هەزار کەسی کوشت.

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "لَتُفْتَحَنَّ الْقُسْطنطينية، فَلَنِعْمَ الأميرُ أميرُها ولَنِعْمَ الْجَيْشُ ذلك الجيش"[٥].

بەم هەواڵدانە ئەوەی ڕاگەیاند کە شاری ئەستەمبووڵ موسڵمانان فەتحی دەکەن و، "محەممەدی فاتیح"یش پلەیەکی بەرزی دەبێت: "نعم الأمير". هەروەهاش دەرچوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی.

---

(١) حسن، رواه أحمد والبيهقي وغيرهما.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وأبو داود وابن ماجه وأحمد ومالك والدارمي.

(٣) تەواوکەری فەرموودەکەیە کە لە پەراوێزی پێشوودا تەخریج کرا. واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خوا داوا بکە منیش یەکێك بم لەوانە. پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد.

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحمد واللفظ لمسلم. واتە: هۆزی سەقیف درۆزنێك و پیاوکوژێکی تێدا هەیە.

(٥) صحيح. رواه أحمد والحاكم وقال صحيح الإسناد والبخاري في التأريخ الصغير. واتە: شاری قوستەنتینییە (ئەستەمبوولی ئێستا) فەتح دەکرێت و، چاکترین میر و سوپا ئەو میر و سوپایەن کە فەتحی دەکەن.

* هەروەها چەسپاوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إن الدِّينَ لو كان منوطاً بالثريـا لتناولَه رجالٌ من أبناءِ فارس"(١). ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو زانا و ئەولیا و پیاو چاكانەی هاوچەشنی "ئیمامی ئەبوو حەنیفە: نوعمانی كوڕی ثابت"، كە خەڵكی وڵاتی "فارس"ە.

* هەروەها فەرموویەتی: "عالِمُ قُرَيْشٍ يَمْلأُ طباقَ الأرضِ عِلْماً"(٢).. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئیمامی شافیعی.

* هەروەها هەواڵی داوە كە:

"إن الأُمة ستفترق إلى ثلاث وسبعين فرقة وإن الناجية منها أهل السنة والجماعة"(٣).

* هەروەها فەرموویەتی: "القَدَرية مجوسُ هذه الأمة"(٤).

ئەمەش ئاماژەیە بۆ كۆمەڵی "قەدەرىیە" كە ئینكاریی قەدەری خوایان دەكرد و لەناو خۆیاندا چەند تاقم و كۆمەڵێك بوون.

* هەروەها هەواڵی پەیدابوونی چەند كۆمەڵ و تاقمێكی زۆری داوە، چونكە چەسپاوە كە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكیدا (كە ئەمە واتاكەیەتی) بە حەزرەتی عەلیی فەرمووە:

"تۆ وەك حەزرەتی عیسا وایت، دەبیت بەهۆی تیاچوونی دوو كۆمەڵ، یەكێكیان لە زیادە خۆشەویستیدا و ئەوی تریان لە زیادە دوژمنایەتیدا. چونكە گاورەكان ئەوەندە لە خۆشەویستیی حەزرەتی عیسادا لە سنوور دەرچووبوون، دەیانوت: "عیسا كوڕی خوایە"! جوولەكەكانیش ئەوەندە دوژمنایەتییان كرد كە ئینكاریی پێغەمبەرێتیی و پلەی بەرزی ئەویان كرد.. هەروەها كۆمەڵێكیش ئەوەندە لە خۆشەویستیی تۆدا ڕۆدەچن كە سنوور دەشكێنن و تیادەچن. چونكە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئەمانەوە فەرمووی: "لهم نـبزٌ

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي وأحمد. واتە: ئەگەر ئایینی ئیسلام تەنانەت بە ئەستێرەی كۆ(ثريا)یشەوە هەڵبواسرابێت، چەند پیاوێكی خەڵكی وڵاتی فارس دەستی خۆیانی دەخەن.

(٢) ضعيف، لكن الترمذي حسنه. وقال البيهقي وابن حجر: طرق هذا الحديث إذا ضُمت بعضها إلى بعض أفادت قوة وعُلم أنَّ للحديث أصلاً. واتە: زاناكەی تیرەی قورەیش سەر زەوی لە زانیاری پڕ دەكات.

(٣) هەموو ئەو فەرموودانەی كە لە بارەی دابەشبوونی نەتەوەی ئیسلامەوە بۆ حەفتا و سێ بەش دەدوێن، هەموویان صەحیحن، وەك پێشتر باسمان كرد. واتە: نەتەوەی ئیسلام دەبن بە حەفتا و سێ بەشەوە، تەنها ئەوەیان لە سزای خوای گەورە ڕزگاری دەبێت، كە شوێن پێی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەڵدەگرن و لە كۆمەڵی موسڵمانان لا نادەن.

(٤) حسن، رواه أبو داود والحاكم. واتە: دەستە و پێڕی "قەدەرىیە" مەجووسی ئەم نەتەوەیەن.

يقال لهم الرافضة"[1].. کۆمەڵێکی تریش لە ڕادەبەدەر دوژمنایەتیت دەکەن، کە بریتین لە "خەواریج" و هەندێ لەو کەسانەی لە ڕادەبەدەر پشتگیریی ئەمەوی‌یەکانیان دەکرد کە پێیان دەوترێت: "الناصبة".

**ئەگەر بوترێت:**

قورئانی پیرۆز فەرمانی بە خۆشویستنی ئالی بەیت داوە و پێغەمبەریش ﷺ خەڵکیی بۆ ئەم کارە هان داوە، لەوانەیە ئەمە ببێت بە بەهانەیەك بۆ هەندێ کەس و بڵێن: ئەم خۆشەویستی‌یە خوا فەرمانی پێ‌داوە و، ئەهلی خۆشەویستیش وەك مەست وان و ئاگایان لە واقیع نی‌یە. کەواتە بۆچی ئەو کەسانە سوود لەم خۆشەویستی‌یە وەرناگرن و لە سزای خوا ڕزگاریان ناکات؟ بەڵکو بە پێچەوانەوە، وەك فەرموودەکە ئاماژەی بۆ کردووە، ئەم خۆشەویستی‌یە لەڕادەبەدەرە زیانیان پێ دەگەیەنێت و تووشی ئازاریان دەکات؟!

**وەڵام:**

خۆشەویستی دوو جۆرە:

*یەکێکیان*: خۆشەویستی‌یەکە بە (مەعنای حەرفی). کە ئەمەش بریتی‌یە لەوەی ئەو کەسە حەزرەتی عەلی و حەسەن و حسەین و ئالی بەیتی تەنها لەبەر خوا و پێغەمبەر و لە پێناوی ڕەزامەندیی خوا و پێغەمبەردا ﷺ خۆش بوێت. ئەم جۆرە خۆشەویستی‌یە، لە خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ زیاد دەکات و دەبێتە هۆی خۆشەویستیی خوای گەورە. کەواتە ئەم خۆشەویستی‌یە شتێکی ڕەوایە و هیچ زیانێك لە زۆربوونی‌دا نی‌یە، چونکە لە سنووری خۆی تێپەڕ نابێت و داخوازی زەمکردن و دوژمنایەتیی غەیری خۆشەویستەکە نابێت.

*دووهەمیان*: خۆشەویستی‌یەکە بە (مەعنای ئیسمی). واتە ئەو کەسە هەموو ئەو [illegible] تانەی لەبەر خودی خۆیان خۆش بوێت! وەك ئەوەی حەزرەتی عەلیی لەبەر ئازایەتی و کەماڵی خۆش بوێت. یان حەزرەتی حەسەن و حسەینی تەنها لەبەر ڕەوشتە بەرزەکانیان خۆش بوێت، بە بێ یادکرنەوەی پێغەمبەر ﷺ، تەنانەت هی وا هەیە خوا و پێغەمبەریش ﷺ [illegible] سێت، کەچی ئەوانی خۆش دەوێت! دیارە ئەم جۆرە خۆشەویستی‌یە نابێتە مایەی

(١) جزء من حديث رواه الطبراني واسناده حسن. واتە: ئەوانە نازناوێکیان هەیە و پێیان دەوترێت ڕافزی‌یەکان.

خۆشەویستیی خوا و پێغەمبەر ﷺ. جا ئەگەر لەم خۆشەویستی‌یەدا زیادەڕەوی بکرێت، ئەوا دەبێتە هۆی زەمکردن و دوژمنایەتیی غەیری خۆشەویستەکە.

بەم جۆرە – وەك لە فەرموودەکەدا باس کرا – دەرکەوت کە:

هەندێ لەوانەی زیادەڕەوی‌یان لە خۆشەویستیی حەزرەتی عەلی‌دا نواند و خۆیان لە حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر بەری کرد، گرفتاری زەرەرمەندی‌یەکی یەکجار گەورە بوون و، ئەم خۆشەویستی‌یە سەلبی‌یە – نائیجابی‌یە – بوو بەهۆی زەرەرمەندی‌یان.

* هەروەها بە چەشنێکی ڕاست و بێ گومان پێمان گەیشتووە، کە پێغەمبەر ﷺ نەتەوەی ئیسلامی بێدار کردووەتەوە کە: "إذا مشوا المطيطاء، وخدمتهم بنات فارس والروم، ردَّ اللهُ بأسَهم بينهم وسلّط شرارَهم على خيارهم"[1]. لە پاش سی ساڵ چۆنی فەرموو، وەها هاتەدی.

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی خۆی ئاگادار کردووەتەوە کە "قەڵای خەیبەر لەسەر دەستی حەزرەتی عەلی‌دا – خوای لێ ڕازی بێت – فەتح دەکرێت"[2]. یەك ڕۆژ دوای ئەو فەرموودەیە، موعجیزەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا، هاتەدی. ئەوەبوو حەزرەتی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – دەرگای قەڵاکەی بە دەستەوە گرت و کردی بە قەڵغانی خۆی هەتا فەتحی خەیبەر تەواو بوو، پاشان فرێی دا. هێندەش ئەو دەرگایە گەورە بوو کە لە دواییدا هەشت کەس، لە ڕیوایەتێکی تردا: چل کەس، نەیانتوانی بەرزی بکەنەوە[3].

* هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "لاتقوم الساعةُ حتى تقتتلَ فئتـان دعواهما واحدة"[4]. بەمە هەواڵی ئەو جەنگەی ڕاگەیاند کە لە (صِفّـين) لە نێوان حەزرەتی عەلی و معاویەدا ڕووی دا، خوایان لێ ڕازی بێت.

---

(١) صحيح، رواه الترمذي. بروانە: (صحيح الجامع الصغير ٨١٣). واتە: هەر کات موسڵمانان وایان لێ هات کە بە فیز و دەمارەوە بە ڕێگادا بڕۆن و کچانی فارس و ڕۆم خزمەتیان بکەن، ئەوا خوا دەیانکات بە دوژمنی یەکتر و خراپکارانیان بەسەر چاکەکارانیاندا زاڵ دەکات.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحـمد.

(٣) ضعيف، بروانە: (كشف الخفاء ١١٦٨).

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وأحـمد. واتە: تاکو دوو کۆمەڵ کە بانگەشە بۆ یەك شت دەکەن، لەگەڵ یەکتردا نەجەنگن، قیامەت بەرپا نابێت.

✽ هەروەها یەکێکی تر لەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێش ڕوودانی هەواڵی داوە، ئەوەیە کە فەرموویەتی: "إن عماراً تقتله الفئة الباغيــــة"[١]. ئەوەبوو پاشان لە جەنگی (صِفّین)دا کوژرا و حەزرەتی عەلیش فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ و کوشتنی عەمماری لەم جەنگەدا کرد بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە شوێنکەوتووانی معاویە پێرە یاخیبووەکەن. معاویەش حەدیثەکەی تەئویل کرد و، عەمری کوڕی عاصیش وتی: یاخیبووەکان تەنها ئەوانەن کە عەمماریان کوشتووە و هەموومان ناگرێتەوە.

✽ هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إن الفتن لا تظهر مادام عمر حيّاً"[٢]. هەر بەو جۆرەش بوو کە فەرمووی.

✽ هەروەها لە ڕۆژی غەزای "بەدر"دا کە سوهەیلی کوڕی عەمر دیل کرا و هێشتا موسڵمان نەبووبوو، حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: "ئەمە پیاوێکی قسەزان و زۆربڵێیە، ڕوخسەتم بدە با هەردوو کەڵبەی خوارەوەی هەڵبکێشم، تاکو لەمڕۆ بە دواوە نەتوانێت قسەت پێ بڵێت"! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "وعسى أن يقوم مقاماً يسرّك يا عمر"[٣]. ئەوەبوو فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتەدی، چونکە کاتێ کارەساتی گەورە و دڵتەزێنی کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ڕووی دا، صەبر و ئارام لە لای موسڵمانان نەما. حەزرەتی ئەبووبەکر - خوای لێ ڕازی بێت - لە شاری مەدینە موسڵمانانی کۆکردەوە و وتارێکی ڕەوان و جوانی بۆ خوێندنەوە و تیایدا سەرەخۆشیی لێ کردن و هەوڵی دا دڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بهێنێتەوە جێی خۆی و ئارامی بە دڵانیان بدات. لە هەمان کاتدا "سوهەیلی کوڕی عەمر" لە شاری مەککەدا هەمان ڕۆڵی حەزرەتی ئەبووبەکری بینی و، وتارێکی هاوچەشنی وتارەکەی ئەوی بۆ خوێندنەوە، تەنانەت تا ڕادەیەکیش وشەکانی هەردوو وتارەکە یەك مەبەست و واتایان ڕادەگەیاند!

---

(١) صحيح، رواه مسلم وأحمد ورواه البخاري بغير الألفاظ السابقة. واتە: "عەممار کۆمەڵی یاخیبووان دەیکوژن".

(٢)صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي وغيرهم. واتە: "هەتا عومەر لە ژیاندا مابێت، فیتنە و ئاشووب هەڵ ناگیرسێت و سەرهەڵنادات.

(٣) رواه البيهقي وشيخه الحاكم عن الحسن بن محمد مُرسلاً. واتە: "ئەی عومەر! بەشکو ڕۆژێك بێت هەر ئەم پیاوە هەڵوێستێکی وای بێت کە دڵی تۆی پێ شاد بێت".

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە "سوراقە"ی فەرموو: "كيف بك إذا أُلبسْتَ سِوارَي كسرى"[١]! ئەوەبوو لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا - خوای لێ ڕازی بێت - دەوڵەتی کیسرا تەفروتوونا کرا و، بەرگ و پۆشاك و گەنجینە و بازنەکانی کیسرایان بۆ لای حەزرەتی عومەر هێنا. ئەویش کردنیە دەستی "سوراقە" و فەرمووی: "الحمد لله الذي سلبهما كسرى وألبسهما سراقة"[٢]. ئەمەی وت بۆ ئەوەی تەسدیقی هەواڵەکەی پێغەمبەر ﷺ بکات کە زووتر فەرموبووی.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إذا هَلَكَ كِسْرى فلا كسرى بعده"[٣]. لە ڕاستیشدا هەروەها بوو کە فەرمووی.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە نێرراوەکەی کیسرای وت: "خواوەند شێرۆیەی کوڕی کیسرای بەسەر کیسرادا زاڵ کرد و لە فلان کاتدا کوشتی"[٤]. پاشان کە ئەم نێرراوە لە کاتی کوشتنی کیسرای کۆڵیەوە، بۆی دەرکەوت: لەو کاتەدا کوژراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموبووی! ئیتر بەهۆی ئەمەوە موسڵمان بوو. هەندێ ڕیوایەت دەڵێن ئەم نێرراوە ناوی: "فەیرووز" بووە.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەو نامەیەی بە هاوەڵەکانی گەیاند کە "حاتەبی کوڕی ئەبوو بەلتەعە" بە نهێنییەوە بۆ کافرانی قورەیشی ناردبوو. ئنجا حەزرەتی عەلی و میقدادی نارد و پێی وتن: لە فلان شوێندا ئافرەتێکی لێیە و نامەیەکی پێیە، نامەکەی لێ بسێنن و بۆم بهێنن. کە هاتنەوە نامەکەیان لەو جێگایەوە هێنا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموبووی و، ئنجا دایانە دەستی. پێغەمبەریش ﷺ ناردی بە دوای حاتەبدا و لێی پرسی: بۆ وات کردووە؟ ئەویش عوزر و بەهانەی هێنایەوە و، پێغەمبەر ﷺ عوزرەکەی لێ قبووڵ کرد[٥]. ئەمەش ڕیوایەتێکی صەحیح و چەسپاوە.

---

(١) رواه البيهقي. واتە: "دەبێ حاڵت چۆن بێت کاتێ کە بازنەکانی کیسرا دەکرێنە دەستت؟"!

(٢) واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەمانەی لە کیسرا سەندەوە و کردنیە دەستی سوراقە. بڕوانە: (الشفا ٣٤٤/١).

(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي. واتە: "کە ئەم کیسرایە لەناوچوو، ئیتر کیسرای تری بە دوادا نایەت".

(٤) صحيح، رواه البيهقي.

(٥) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وأحمد.

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی عوتبەی کوڕی ئەبوولەهەبەوە فەرموویەتی: "يأكله كلبُ الله"(١). بەمەش هەواڵی دوارۆژێکی دژواری بۆ عوتبە ڕاگەیاند. پاش ماوەیەك "عوتبە" ڕۆشت بۆ یەمەن و، لە ڕێگادا دڕندەیەك(شێرێك) هەڵمەتی بۆ برد و خواردی و، بەمەش تەسدیقی هەواڵ و دوعاکەی پێغەمبەری ﷺ لە بارەی عوتبەوە کرد.

* هەروەها بە جۆرێکی صەحیح پێمان گەیشتووە کە لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککەی کرد، فەرمانی بە بیلال دا - خوای لێ ڕازی بێت - بچێتە سەربانی کەعبە و بانگ بدات. لەو کاتەشدا "ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب" و "عەتتابی کوڕی ئوسەید و حاریسی کوڕی هیشام" - کە لە سەرکردە و پیاوماقوولانی قورەیش بوون - لە نزیکی کەعبە و دەوروبەریدا دانیشتبوون. عەتتاب وتی: "خوا بەزەیی بە ئوسەید(واتە باوکی)دا هاتەوە، کە ئەم ڕۆژەی نەدی"! حاریسیش وتی: "محەممەد کەسی نەدۆزیەوە جگە لەم قەلە ڕەشە"؟! ئەبوو سوفیانیش وتی: "من هیچ نالێم، چونکە ئەگەر هەرچییەك بڵێم ئەم بەردە وردانە بۆ محەممەدی دەگێڕنەوە"! کتوپڕ پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوویان هات و، فەرمووی: دەزانم چیتان وت، ئاوا و ئاواتان وت، چییان وتبوو هەمووی بۆ گێڕانەوە! حاریس و عەتتاب کە ئەمەیان بیست، یەکسەر وتیان: شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت. چونکە هیچ کەسێکی ترمان لەگەڵدا نەبووە تاکو بڵێین ئەو بۆی گێڕاویتەوە(٢).

* * *

دەسا ئەی ئەو موەحیدەی کە باوەڕ بەم پێغەمبەرە ﷺ ناکات!

سەرنج لەم دوو سەرۆکە سەرسەختانەی قورەیش بدە کە چۆن تەنها بە یەك هەواڵی غەیبیی پێغەمبەر ﷺ لەو سەرسەختییە دابەزینە خوارەوە و ئیمانیان هێنا. دەبێ دڵی تۆ چەندە لە کەڵك کەوتبێت کە هەزاران موعجیزەی هاوچەشنی ئەمە دەبیستیت، کە هەموویان لە ڕێگای تەواتوری مەعنەوییەوە چەسپاون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دڵت لەسەر ئیمان دانامەزرێت و سەقامگیر نابێت..

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەمان:

---

(١) رواه الحاكم والبيهقي وغيرهما من طرق صحيحة. واتە: "بەکێك لە سەگەکانی خوا دەیخوات"!

(٢) بڕوانە: زاد المعاد (المحقق): (٣/٤٠٩-٤١٠)، ابن هشام: (٢/٤١٣).

* هەروەها چەسپاوە کە دوای ئەوەی عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ ئینکاریی ئەوەی کرد هیچ پارە و پوولێك شك ببات، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەو پارەیەی پێ دا کە مامی بە نهێنی لای (أم الفضل)ی خێزانی دانابوو[1]! ئەوەبوو عەبباسی مامی (کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو) لە غەزای بەدردا دیل کرا و، پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد بە پارە خۆی لە دیلی ڕزگار بکات. ئەویش وتی: پارە شك نابەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەی ئەو ماڵ و سامانەی لای دایکی فەزڵ دات نا، چیی لێ هات"؟ عەبباس وتی: جگە لە من و ئەو کەسی تر بەو پارەیەی نەزانیوە! ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی عەبباس موسڵمان ببێت[2].

* هەروەها چەسپاوە کە جوولەکەیەکی سیحربازی چەپەڵ کە ناوی: "لوبەیدی یەهوودی" بووە، بۆ ئەوەی ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات، سیحری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و، تاڵە مووی بە شانەیەکەوە بەستبوو و خستبوویە ناو بیرێکەوە. پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ فەرمانی بە حەزرەتی عەلی و هاوەڵەکانی دا کە بڕۆن بۆ فلانە بیر و ئەو ئامێرانەی سیحرەکەیان پێ کراوە بیانهێنن. ئەوانیش ڕۆشتن هێنایانن. جا هەر کە گرێیەکیان لێ دەکردەوە، کەمێك لە ئازارەکەی پێغەمبەر ﷺ کەم دەبوو.. تا هەموویان کردەوە[3].

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ بە کۆمەڵێکی فەرموو، کە ئەبوو هورەیرە و حوزەیفەشیان تێدا بوو: "ضرسُ أحدِكُم في النارِ مثلُ أُحُدٍ"[4]. بەمە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پاشگەزبوونەوەی یەکێکی لەوانە ڕاگەیاند و، پاشەڕۆژی سامناکی ئەوی دەرخست. ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: "ئەو کۆمەڵە هەموویان مردن و من و پیاوێك ماینەوە، ئەویش لە جەنگی یەمامەدا بە مورتەددی کوژرا"[5]. بەم جۆرە، هەواڵدانەکەی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوت و هاتەدی.

---

(١) رواه أحمد والحاكم وصححه، والبيهقي بسند صحيح.

(٢) بڕوانە: (الشفا للقاضي عياض ١/٣٤٣). مەرج نییە بەکسەر موسڵمان بووبێت، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ڕووداوەکە هۆکارێکی سەرەکی بووە لە موسڵمان بوونی حەزرەتی عەبباسدا.

(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم وابن ماجه وأحمد.

(٤) رواه الطبراني بسند صحيح. واتە: خڕنی یەکێکتان لە دۆزەخدا هێندەی چیای ئوحود دەبێت.

(٥) بڕوانە: (الشفا ١/٣٤٢). کاتێ ئەبوو هورەیرە دەفەرموێت: "من و پیاوێك ماینەوە" واتە جگە لە حوزەیفەش. لەبەر ئەوەی حوزەیفە لە کاتی جەنگی یەمامەدا مابوو، چونکە لە ساڵی سی و شەشی کۆچیدا وەفاتی کردووە.

* هەروەها بەسەرهاتەکەی نێوان (عومەیری کوڕی وەهب) و (صەفوانی کوڕی ئومەییە)ش چەسپاوە، کە دەگێڕنەوە صەفوان بە دزی‌یەوە مەرجی لەگەڵ عومەیردا کرد لەسەر ئەوەی کە ئەگەر عومەیر پێغەمبەر ﷺ بکوژێت، ئەم ئەندازەیەکی زۆری لە ماڵ و سامانی خۆی بداتێ. کاتێ لەسەر ئەمە رێك دەکەون، عومەیر دێت (بۆ مەدینە) بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەریش ﷺ هەموو بەسەرهاتەکەی نێوانی صەفوان و عومەیر، بۆ عومەیر دەگێڕێتەوە و دەستی پیرۆزی بەسەر سنگی عومەیردا دەهێنێت و، ئەویش موسڵمان دەبێت[1]!

سەرەڕای ئەمانە، چەندین ڕووداوی تری هاوچەشنی ئەم هەواڵدانە غەیبی‌یە ڕاستانە، ڕوویان داوە و، شەش کتێبە صەحیحە بەناوبانگەکان – بە سەنەدەوە – باسیان کردوون. زۆربەی ئەوانەی لەم پەیامەدا هێنراون، لە حوکمی تەواتوری مەعنەویدان و بە قەتعی و دڵنیایی چەسپاون و، صەحیحی ئیمامی بوخاری و موسلیم، کە بەپێی باوەڕی زانایان و لێکۆڵەران، ڕاسترین کتێبن لە دوای قورئانی پیرۆز، گێڕاویانەتەوە. ئەمە جگە لەوەی کە لە کتێبە صەحیحەکانی تردا، کە پێیان دەوترێت: (السُنن) باس کراون. وەك سوننەنی تیرمذی و نەسسائی و ئەبوداوود و موستەدرەکی حاکم و موسنەدی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و دەلائیلی بەیهەقی، کە هەر هەموویان بە سەنەدەوە باسیان دەکەن.

کەواتە ئەی موڵحیدی بێئاگا!

هەروا بە گۆترە قسە فڕێ مەدە و مەڵێ:

محەممەد پیاوێکی ژیر و زیرەك بووە! ئەمە بڵێیت و ئیتر هەر وا بڕۆیت..

نەخێر.. چونکە ئەم هەواڵدانە غەیبی‌یە ڕاستانە لە دوو شت بەدەر نین:

یان ئەوەیە دەڵێیت: ئەم پیاوە خاوەنی بلیمەتی‌یەکی فراوان و وردبین بووە. واتە: چاوێکی ئەوتۆی هەیە کە دەتوانێت ڕابوردوو و ئاییندە و هەموو دنیا بە یەکەوە ببینێت و، هەموو شت و هەموو ڕووداوێك دەزانێت و، هەموو لایەنێکی زەوی و جیهانی – بە خۆرهەڵات و خۆرئاوایەوە – لە بەرچاودایە و، ئەوەندە وریایە کە دەتوانێت هەرچی شت و کاروباری ئاییندە و ڕابوردوو هەیە دەریان بخات..

(١) رو ه الطبراني ورجاله رجال الصحيح. وللحديث شواهد أخرى من حديث محمد بن جعفر بن الزبير رواه الطبراني مرسلاً وإسناده جيد، وروي عن عروة بن الزبير بإسناد حسن مرسل.

ئەگەر وا دەڵێیت، ئەوا بزانە ئەم چەشنە حاڵەتە - وەك لە بەرچاودایە - هەرگیز لە توانای هیچ مرۆڤێکدا نیيە. خۆ ئەگەر لە هەر تاکێکی مرۆڤدا ببێت و ڕوو بدات، ئەوا دیارە شتێکی لەعادەتبەدەرە و بەهرەیەکی بەرزە خواوەند پێی بەخشیوە. کە ئەمەش لە خۆیدا موعجیزەیەکی گەورەیە..

یان ئەوەیە دەبێ باوەڕ بهێنیت کە ئەم مرۆڤە: قوتابی و کار پێسپێرراوێکە؛ ڕێنمایی و ئامۆژگاریی لە لایەن کەسێکەوە پێ دەگات کە چاوی لە هەموو شتێکە و، توانای بەسەر هەموو شوێنێکی گەردوون و سەرجەم کاتەکاندا هەیە و، هەر شتێك لە لەوحی پارێزراوی ئەودا تۆمار کرابێت، لە هەر کاتێکدا و بە هەر ئەندازەیەك بیەوێت، بە قوتابیيە خۆشەویستەکەی دەڵێت و فێری دەکات.

کەواتە بۆمان چەسپا کە: حەزرەتی محەممەد ﷺ وانەکانی لە لای مامۆستا ئەزەلیيەکەی خۆی دەخوێنێت و لەو مامۆستایەوە بە خەڵکیان ڕادەگەیەنێت.

* هەروەها چەسپاوە کە کاتێ پێغەمبەر ﷺ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ جەنگ کردن لەگەڵ "ئوکەیدەر"ی سەرۆکی "دومة الجندل"دا، پێی فەرموو: "إنـك ستجده يصيد البقر"[1]. هەروەها هەواڵی پێ دا کە بە بێ هیچ بەرگری کردنێك دیلی دەکات و دەیهێنێت، کە خالید ڕۆشت و گەیشتە ئەوێ، بینیی وەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا، خەریکی ڕاو بوو. یەکسەر دیلی کرد و هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ!

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ قورەیشیيەکانی ئاگادار کردەوە کە ئەو لاپەڕەیەی دەنگدابڕینی خۆیانیان لەگەڵ بەنی هاشمدا تێدا تۆمار کرد و لە کەعبەدا هەڵیانواسیبوو، هەواڵی پێ دان کە "مۆرانە" هەمووی خواردووە جگە لەو جێگایانەی کە ناوی خوای گەورەی تێدایە! کە ڕۆشتن بۆ سەیر کردنی، بینییان بەو جۆرە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی[2]!

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵیداوە: کاتێ "بەیتولمەقدیس" فەتح دەکرێت، تاعوون پەیدا دەبێت. ئەوە بوو لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا - خوای لێ

---

(١) رواه ابو اسحاق والبيهقي. بڕوانە: (الشفا ١/٣٤٤)، (زاد المعـاد المحقـق ٥/٥٦٨-٦٣٩). واتە: کە دەگەیتە لای، دەبینیت خەریکی ڕاوی گاکێوييە.

(٢) رواه البيهقي. بڕوانە: الشفا ١/٣٤٥، البداية والنهاية: ٣/٩٦-٩٧.

ڕازی بێت - لە کاتی فەتحی "بەیتولمەقدیس"دا تاعوون بە شێوەیەکی سامناك بڵاو بووبووەوە. بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بەهۆی ئەو نەخۆشی‌یەوە حەفتا هەزار کەس لە ماوەی سێ ڕۆژدا مردن.

❊ هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پەیدابوونی شاری "بەصرە"[١] و "بەغدا"ی[٢] داوە، پێش ئەوەی دروست بکرێن. هەروەها هەواڵی ئەوەشی داوە کە گەنجینەی سەرزەوی بۆ شاری بەغدا دەبرێت.

❊ هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بە هاوەڵەکانی داوە کە لەگەڵ "تورك"[٣] و نەتەوەکانی دەوروبەری دەریای "قەزوێن"دا دەجەنگن و، پاشان زۆربەی ئەو نەتەوانە موسڵمان دەبن و حوکمی عەرەب دەکەن، فەرموویەتی: "يوشِكُ أن يكثرَ فيكم العجمُ، يأكلون فيئَكُم ويضربون رقابَكم"[٤].

❊ هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هلاكُ أمتي على يدي أُغَيلمةٍ من قريش"[٥]. بەم چەشنە هەواڵی (یەزید) و (وەلید) و هاوچەشنی ئەوانی لە سەرۆکە خراپکار و زیانبەخشە ئەمەوی‌یەکان داوە.

❊ هەروەها هەواڵی داوە کە پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام لە چەند جێگایەکی وەك یەمامەدا ڕوودەدات[٦].

❊ هەروەها لە غەزای "خەندەق"دا لە بارەی قورەیش و ئەحزابەوە فەرمووی: "الآن نغزوهم ولايغزوننا، نحن نسير إليهم"[٧].

هەروەهایش بوو کە هەواڵی دا.

---

(١) صحيح، رواه أبو داود واللفظ له، وابن حبان.

(٢) الشفا ١/٣٤٤ رواه أبو نعيم وضعفه ابن كثير.

(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجه.

(٤) صحيح، رواه أحمد والبزار والطبراني بسند صحيح. واتە: نزیکە عەجەمتان تێدا زۆر ببێت، باجتان لێ دەسێنن و لە گەردنتان دەدەن.

(٥) صحيح، رواه البخاري وأحمد. واتە: نەتەوەکەم لەسەر دەستی چەند هەرزەیەکی قورەیشدا تیادەچن (تووشی ئەشکەنجە دەبن).

(٦) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

(٧) صحيح، رواه البخاري وأحمد. واتە: "ئیتر لەمەولا قورەیش و ئەو تیرانەی لەگەڵی‌دان، نایەنە سەرمان و غەزامان ناکەن. بەڵکو ئێمە غەزای ئەوان دەکەین".

✽ هەروەها چەسپاوە كە دوو مانگ پێش وەفاتی، هەواڵی كۆچی دوایی خۆی ڕاگەیاندووە و فەرموویەتی:

"إن عبداً خُيِّرَ فاختارَ ما عند اللّٰه"[1].

✽ هەروەها لە بارەی "زەیدی كوڕی صووحانەوە" فەرموویەتی:

"يسبقه عضوٌ إلى الجنة"[2]. ئەوەبوو لە جەنگی نەهاوەندا دەستی قرتا و شەهید بوو. بەم جۆرە دەستی پێش خۆی ڕۆشت بۆ بەهەشت.

* * *

تا ئێستا هەرچی‌یەكمان لە بارەی هەواڵدانە غەیبی‌یەكانەوە باس كردووە، تەنها جۆرێكە لە نێوان "دە" جۆری موعجیزەكانی پێغەمبەردا ﷺ. كەواتە ئێمە هێشتا یەك لە دەی ئەم جۆرەمان نەزانیوە. لە وتەی بیست و پێنجەمدا، كە تایبەتە بە ئیعجازی قورئانەوە، بە كورتی چوار جۆرمان لە هەواڵدانە غەیبی‌یەكان باس كردووە.

جا تۆیش ئێستا سەرنج لەم جۆرە بدە و بیخەرە سەر ئەو چوار جۆرەی كە پێغەمبەر ﷺ بە زمانی قورئانەوە ڕایگەیاندوون. ئیتر سەیر بكە و بزانە چۆن دەبێتە بەڵگەیەكی بێ گومان و پرشنگدار لەسەر پێغەمبەریتیی پێغەمبەر ﷺ بە چەشنێ كە هەر كەسێك ژیری و دڵی تێك نەچووبێت، سەری بۆ دادەنەوێنێت و، تەسدیقی ئەوە دەكات كە ئەم پێغەمبەرە بەرێزە ﷺ ڕەوانەكراوی خوایە و، لە لای زانای پەنهان و بەدیهێنەری هەموو شتێكەوە، ئەم هەواڵانە ڕادەگەیەنێت.

## ئاماژەی ڕەوانی حەوتەم

ئاماژە بۆ چەند نموونەیەك دەكەین كە بە چەند ڕیوایەتێكی صەحیح و بە جۆرێكی قەتعی و بە "تەواتوری مەعنەوی" چەسپاون و، لەو موعجیزانەی پێغەمبەر ﷺ دەدوێن كە لە بارەی بەرەكەت پەیدابوون لە خواردندا ڕوویان داوە. جا وا بە باش دەزانین كە لە پێشدا پێشەكی‌یەك لەو بارەوە باس بكەین:

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي. واتە: "بەندەیەكی خوا سەرپشك كراوە، ئەویش لای خوای هەڵبژاردووە".

(٢) الشفا ١/٣٤٣ واتە: ئەندامێكی پێش خۆی دەچێتە بەهەشت.

## پێشەکی

هەریەك لەو نموونانەی کە لە بارەی موعجیزەی زۆربوون و بەرەکەت تێکەوتنی خواردنەوە باسیان دەکەین، بە چەند ڕێگایەکی جیا جیا چەسپاون. تەنانەت هەندێکیان لە شازدە ڕێگاوە ڕیوایەت کراون. کەواتە زۆربەی ئەو نموونانەی باسیان دەکەین لە بەردەم کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵە بەڕێزەکاندا ڕوویان داوە و لە دەمی ئەوانەوە بیستراونەتەوە، کە ئەوانیش خاوەنی پلەیەکی تابلێی بەرز بوون و، لە ڕاستی و ئەمانەتدا ناوازە بوون.

**نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوە:**

یەکێك لەوانە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: "حەفتا کەس لە یەك "صاع"[1] خواردەمەنی تێریان خواردووە".

ئەو حەفتا کەسەش کە ئەم موعجیزەیەیان دیوە، کاتێ دەبیستنەوە یەکێکیان ئەمەی گێڕاوەتەوە، هیچ کامیان گێڕانەوەکەی ئەو کەسە بە درۆ ناخاتەوە. واتە ئەوان بەم بێدەنگ بوونەیان تەسدیقی گێڕانەوەکەی ئەو دەکەن.

دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەر ﷺ لە چلەپۆپەی حەق و ڕاستیدا بوون و، لە چاکترین سەدە و سەردەمدا ژیاون و هەرگیز چاوپۆشییان لە شتی ناڕەوا نەکردووە، بە چەشنێ کە ئەگەر - خوانەخواستە - هەرکامێکیان هەستیان بە درۆیەك بکردایە، با بچووکیش بوایە، بێدەنگ دانەدەنیشت و بە بێ هیچ گومانێك بەرپەرچی دەدایەوە.

جا ئەو ڕیوایەتانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین، سەرەڕای ئەوەی لە چەندین ڕێگای جیاجیاوە پێمان گەیشتوون، چەندین ڕێگای تریش لێیان بێدەنگ بوون، کە ئەمەش تەسدیقی ئەو ڕێگایانە دەگەیەنێت و دەری دەخات ئەوان بەم بێدەنگییەیان ڕیوایەتیان کردووە! کەواتە وەکو تەواتوری مەعنەوی - بە قەتعی - چەسپاون.

مێژووی ئیسلام، بە تایبەت مێژووی بەسەرهات و ژیانی پێغەمبەر ﷺ شایەتە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوای پاراستنی قورئانی پیرۆز، خۆیان بۆ پاراستنی سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ تەرخان کردووە. واتە هەموو حاڵەت و کردار و

(١) صاع: پێودرێکە چوار مشت دەگرێت.

گوفتارێکی پێغەمبەر ﷺ. ئیتر ئەو سوننەتانە پەیوەندییان بە ئەحکامە شەرعییەکانەوە بوو بێت، یان بە موعجیزاتەوە، ئەوان، بێ جیاوازی، پاراستوویانن. هاوەڵان لەم کارەیاندا – خوا پاداشتیان بداتەوە – هیچ ڕەفتارێکی پیرۆزی پێغەمبەریان ﷺ – با بچووکیش بوو بێت – پشتگوێ نەخستووە. بەڵکو بایەخیان پێ داوە و گێڕاویانەتەوە و لە لای خۆیشیان نووسیویانەتەوە. بە تایبەت حەوت "عەبدوڵلا" ناوەکان کە بە: (العبادلة السبعة) بەناوبانگن و، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەت "عەبدوڵلای کوڕی عەبباس" و "عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص" چونکە لای خۆیان ئەو فەرموودە پیرۆزانەیان نووسیوەتەوە.

بەم جۆرە لە سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکاندا فەرموودەکان پارێزران. ئنجا سی چل ساڵ دوای ئەوان هەزاران کەس لە زانا لێکۆڵەرەکانی "تابعین" هاتن و لەوانیان وەرگرتن و ئەم کارەیان بەوپەڕی ئیخلاس و ئەمانەتەوە گرتەئەستۆ و فەرموودەکانیان پاراست و نووسییانەوە. پاش ئەوانیش پێشەوا موجتەهیدەکان و هەزاران زانای لێکۆڵەر و زانایانی "فەرموودە" لەوانیان وەرگرتن و، لە ڕێی نووسینەوە و تۆمارکرنەوە ئەو فەرموودانەیان پاراست. ئنجا پاش تێپەڕبوونی دوو سەد ساڵ بەسەر کۆچی پێغەمبەردا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە، خاوەنانی هەر شەش کتێبە صەحیح و سوننە بەناوبانگەکانی فەرموودە کە لە پێش هەموویانەوە ئیمامی "بوخاری" و "موسلیم"ن، ئەو فەرموودە و موعجیزانەیان لەوانی پێش خۆیان وەرگرت و ئەرکی پاراستنی سوننەتیان خستە ئەستۆی خۆیانەوە.

پاش ئەمان دەوری زانایانی ڕەخنەسازی و (جەرح و تەعدیل) هاتە پێشەوە، کە ئەوانیش زانای توندوتیژی وەك "ئیبنولجەوزی"یان تێدا هەڵکەوت و، توانییان ئەو گوفتارانەی هەڵبەستراو(مەوضوع)ن و چەند مولحید و نەزانێك تێکەڵی فەرموودە پیرۆزە "صەحیحەکان"یان کردوون، جیا بکەنەوە و فەرموودەیان لێ پاڵفتە بکەن. پاش ئەمانیش چەند زانایەکی لەخواترس و خاوەن وەرع و هەڵکەوتوو هاتن، وەك "جەلالەددینی سیووتی" کە – وەك پیاوچاکەکانی ئەهلی کەشف دەڵێن – هەر لە حاڵەتی بێداریدا، حەفتا جار بە بینینی پێغەمبەر ﷺ شادبووە. ئەم زاتە و چەندین زانای تری وەك ئەم، هاتن و گەوهەر و مرواریی "فەرموودە صەحیحەکان"یان لە هەموو وتەیەکی

درۆ و دەست هەڵبەست کە بە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ کرابێت، یـان هـەر قسـەیەك درابێتـە پاڵ ئەو، جیا کردەوە.

بـەم جـۆرە، دەبینیـت ئـەو فـەرمـوودە و موعجیزانـەی باسـیان دەکـەین، هـەموویان لــە ڕێگای چەندین دەستی خاوێن و ئەمینی لەژمارەبەدەرەوە، بە پاکی و ڕاستی، بە دەستمان گەیشتوون. کەواتە هەزاران سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەم نیعمەتە و، پڕ بە دەم دەڵێین: "هذا من فضل ربـــي".

ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە ئیتر نابێ مرۆڤ ئەوەی بە دڵدا بێت و بڵێـت: ئایـا چـۆن دەزانین ئەم ڕووداوانەی کە لــە سـەردەمێکی زۆر کۆنـدا ڕوویـان داوە، بـە سـەلامەتی بە دەستمان گەیشتوون و دەسـتکاری نـەکراون؟ بـەڵێ، نابـێ وا بڵێـت، چونکـە بۆمـان دەرکەوت کە چۆن بە دەستمان گەیشتوون.

## چەند نموونەیەك لـە بارەی موعجیزاتی بەرەکەتی خواردەمەنی‌یەوە

### ❍ نموونەی یەکەم:

هەر شەش کتێبە صەحیحەکانی فەرموودە، لــە پێـش هەموویانـەوە کتێبـەکانی ئیمـامی بوخاری و موسلیم، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ:

"پێغەمبەر ﷺ ژنی هێنا و، دایکم(أم سليم) خواردنێکی بەم بۆنەیەوە دروست کرد کە پێی دەڵێن: "حەیس" (خواردنێکە لە خورمـا و ڕۆن و کەشـك دروسـت دەکرێـت) ئنجـا خستیە ناو دەفرێکەوە و، وتی: برۆ ئەمە ببە بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و عەرزی بکە: دایکم سەلامی لـێ دەکردیت و ئەمەی بۆ ناردیت و، عەرزیشی بکە: ئەمەی کـە ئێمـە هێناومانـە زۆر کەمە.

ئەنەس دەفـەرموێ:

بـردم بـۆ پێغەمبـەر ﷺ ئـەویش فـەرمووی: بـڕۆ فـلان و فـلان و فـلان و هـەر کەسـێکی تریشت لە ڕێگادا پێ گەیشـت بانگیـان بکـە. منیـش ڕۆشـتم ئەوانـەی پێغەمبـەر ﷺ نـاوی بردن و هەرکەسێکی ترم بینی، بانگم کردن. کاتێ گەڕامەوە بینیم ماڵەکە پڕبووە.

لەم کاتەدا یەکێك لە ئەنەسـی پرسـی ژمارەیـان چـەند بـوو؟ وتـی: نزیکـەی سـێ سـەد کەس دەبوون. پاشان وتی: چاوم لـێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی لەسەر خواردنەکە دانـا و چـی خـوا حـەز بکـات خوێنـدی بەسـەریدا و ، پاشـان دە کـەس دە کـەس بـانگی دەکـردن بـۆ خـواردن و، پێـی دەفـەرموون: نـاوی خـوا بـهێنن و هـەر کـەس لـە بـەردەمی

خـۆیەوە بخوات. ئـەوانیش ئـەوەندەیان خـوارد هـەتا تێر بـوون. بـەم جـۆرە دەسـتەیەك دەهـات و دەستەیەك دەڕۆشـت تـا هـەموویان تێر بـوون. ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: "ئەنەس! وەرە هەڵی بگرە" .

ئەنەس دەفەرموێ: نازانم کە یەکەم جار دامنا زیاتر بوو یان کە هەڵمگرت[1]!

○ **نموونەی دووهەم:**

کاتێ پێغەمبـەر ﷺ کۆچی بۆ مەدینـە کـرد، میوانـی ئـەبوو ئـەیيووبی ئـەنصاری بـوو، خـوای لـێ ڕازی بێـت. ڕۆژێکیـان ئـەبوو ئـەیيووب خـواردنێکـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ و حـەزرەتی ئەبووبەکر دروسـت کـرد، ئـەوەندەی بەشـیان بکـات. پێغەمبـەر ﷺ بـە ئـەبوو ئەیيووبی فەرموو: "أدعُ ثلاثين من أشراف الأنصار". واتە: سی کەسم لە پیاوماقووڵانی یاریدەدەران بۆ بانگ بکە. ئەویش بانگی کردن و هاتن و تێریان خـوارد و لێـیان مایـەوە. ئنجا فەرمووی: "ادعُ ستين". واتە: شەست کەسـی تـرم بـۆ بـانگ بکـە. ئـەوانیش تێریـان خوارد و لێیان مایەوە. پاشان فەرمووی: "ادعُ سـبعين". واتـە حـەفتا کـەس بـانگ بکـە. ئەوانیش بە هەمان جۆر تێریان خوارد و لێشیان مایەوە.. هەموو ئەوانەی کـە هـاتن و لـەو خواردنەیان خوارد، موسڵمان بوون و بەیعـەتیان لـەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ کـرد. جـا ئـەبوو ئەیيووب - خـوای لـێ ڕازی بێـت - دەفـەرموێ: "سـەد و هەشـتا کـەس لـەو خـواردنـەی منیان خوارد"[2].

○ **نموونەی سێهەم:**

ئەو ڕووداوەیـە کـە سـەلەمەی کـوڕی ئـەکوەع و ئـەبوو هورەیرە و عومـەری کـوڕی خەتتاب - خـوایان لـێ ڕازی بێت - دەیگێڕنەوە. ئەوەتا دەفەرموون:

لـە یـەکێك لـە غـەزاکانی پێغەمبـەردا ﷺ برسـێتی ڕووی کـردە ئـەو خەڵکـەی کـە لـە خزمەتیدا بوون. پێغەمبەر ﷺ داوای لـێ کردن هەرچی خواردنیان پێ مـاوە بیـهێنن. جـا هی وا بوو مشتێك یان زیاتری پێ مـابوو، دەیـهێنا. ئـەوەی کـە زۆری پـێ مـابوو صـاعێك خورمـای پـێ مـابوو دەیـهێنا.. بـەم جـۆرە تـا هـەمووی هێـنرا و ئامـادە کـرا. ئنجـا لـەسـەر پارچەیەك کۆی کردنەوە..

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وغيرهما.

(٢) رواه الطبراني والبيهقي. بڕوانە: (الشفا) ٢٩٢/١.

"سەلەمە" دەفەرموێ: قەبارەی بزنێك بەچۆكدا هاتبێت چەندە جێ دەگرێت، ئەو خورما و خواردەمەنییەش هێندە جێیان گرتبوو. ئنجا پێغەمبەر ﷺ داوای لە سوپاكەی كرد دەفرەكانیانی لێ پڕ بكەن، بە ڕادەیەك كە هیچ توورەكە و دەفرێك لە سوپاكەدا نەما پڕ نەكرێت. سەرەڕای ئەمەش، بە ئەندازەی ئەوەی یەكەم جار كۆ كرایەوە یان زیاتری لێ مابووەوە. خۆ ئەگەر هەموو خەڵكی سەر زەویش بهاتنایە، بەشی دەكردن[1]!

○ **نموونەی چوارەم:**

لە كتێبە صەحیحەكانی فەرموودەدا، لە پێش هەموویانەوە صەحیحی بوخاری و موسلیم، ئەم ڕووداوە چەسپاوە كە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حەزرەتی ئەبووبەكر دەیگێڕێتەوە. دەڵێت:

لە سەفەرێكدا سەد و سی كەس لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ. پاشان دەڵێت: چوار مشت ئاردیان شێلا و مەڕێكیشیان سەربڕی و جگەرەكەیان برژاند.. سوێند بە خوا هەر یەكە لەو سەد و سی كەسە بەشی خۆی بە چەقۆ لەو جگەرە كردەوە و خواردی. پاشان خواردنەكە لە دوو قاپی گەورەدا دانرا و هەموومان لێمان خوارد و لێشمان مایەوە و، ئەو زیادەیەشم لە حوشترەكەم بار كرد[2].

○ **نموونەی پێنجەم:**

ئەو ڕووداوەیە كە جابیر - خوای لێ ڕازی بێت - دەیگێڕێتەوە: كە لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا پێغەمبەر ﷺ هەزار كەسی لە یەك صاع ئاردی جۆ و گۆشتی كارژۆڵەیەك تێر كرد. جابیر دەفەرموێ: بە خوا ئەو هەزار كەسە تێریان لێ خوارد و لێشیان مایەوە و هێشتا مەنجەڵەكەمان هەر وەكو خۆی بە پڕی مابوو، هەویرەكەشمان هەر نانی لێ دەكرا[3]! هۆكەیشی ئەوەبوو كە پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە ئاوی پیرۆزی دەمی خۆی كردبووە ناو قازان و هەویرەكەوە و دوعای بەرەكەتی بەسەردا خوێندبوون.

جـ كاتێ جابیر لە بەردەم هەزار كەس لەو هاوەڵانەدا سوێند دەخوات و دەری دەخات كە ئەم موعجیزەیە پەیوەندیی بە هەموویانەوە بووە، ئەوا ئەم ڕیوایەتە شتێكی بێ گومانە و وەك ئەوە وایە كە ئەو هەزار كەسە هەموویان ڕیوایەتیان كردبێت.

---

(١) صحيح. رواه البخاري ومسلم.

(٢) صحيح. رواه البخاري ومسلم وأحمد.

(٣) صحيح. رواه البخاري ومسلم.

○ نموونەی شەشەم:

هەروەها لە کتێبە صەحیحەکانی فەرموودەدا چەسپاوە کە ئەبوو تەلحەی مامی ئەنەسی خزمەتگوزاری پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ:

ئەو نەختە نانەی کە لە ئاردی جۆ دروست کرابوو، ئەنەس لە بن‌بالی خۆیدا هەڵی گرت و هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ هەشتا کەسی لێ تێر کرد. لە پێشدا فەرمانی دا ئەو نانە لەت لەت بکرێت و ئنجا دوعای بەرەکەتی بە سەردا خوێند. پاشان ئەوەندە خەڵکی لێ کۆبوونەوە کە لە خانووەکەدا جێیان نەدەبووەوە، ناچار دە کەس دە کەس لێیان دەخوارد، بەم جۆرە دەهاتنە ژوورەوە هەتا هەموویان بە تێری دەگەڕانەوە[1].

○ نموونەی حەوتەم:

لە صەحیحی موسلیم و کتێبی (الشفا) و غەیری ئەمانەشدا چەسپاوە کە جابیری ئەنصاری دەگێڕێتەوە کە: جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و داوای خواردنی لێ کرد. ئەویش نیو بار جۆی پێ دا. ئەم پیاوە خۆی و ژن و میوانی ماوەیەکی زۆر لێیان دەخوارد. هەتا جارێك بۆ ئەوەی بزانن چەندەی کەم کردووە پێوایان. پاش پێوانەکە، دەرکەوت بەرەکەتەکەی نەما و وردە وردە کەم بووەوە. ئنجا هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و بۆی گێڕایەوە. ئەویش فەرمووی: "لو لم تكله لأكلتم منه ولقام بكم"[2].

○ نموونەی هەشتەم:

کتێبە صەحیحەکانی فەرموودە، وەك: تیرمیذی و، نەسسائی و، بەیهەقی و، کتێبی (الشفا)، لە "سەمورەی کوڕی جوندوب"ەوە دەگێڕنەوە، کە: "جارێکیان قاپێك خواردنیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هێنا کە هەندێ گۆشتی تێدابوو، ئنجا هەر لە بەیانییەوە تا شەو دەستە بە دەستە خەڵك دەهاتن لێیان دەخوارد و دەڕۆشتن"[3].

جا هەروەك لە پێشەکییەکەدا باسمان کرد، ئەم ڕووداوەی کە لە بارەی بەرەکەتەوە دەیگێڕنەوە، بە تەنها ڕیوایەتی سەمورە نییە. بەڵکو سەمورە وەك نوێنەرێکی ئەو کۆمەڵە زۆرانە وایە کە لەو خواردنەیان خواردووە و، ئەم لە بریی هەموو ئەوانە دەیگێڕێتەوە و ڕایدەگەیەنێت.

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحـــمد.
(٢) صحيح، رواه مسلم. واتە: ئەگەر نەتپێوایە هەر لێتان دەخوارد و بەشبەشی دەکردن.
(٣) صحيح، رواه الترمذي.

○ **نموونەی نۆهەم:**

چەند پیاوێکی بڕوا پێ کراوی وەك: خاوەنی کتێبی (الشفا) و "ئیبن ئەبی شەیبە" و "تەبەرانی" و چەند زانایەکی لێکۆڵەری تر، بە سەنەدێکی باشەوە دەگێڕنەوە کە ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دام هەموو ئەهلی (صوففە)ی بۆ بانگ بکەم. ئەهلی صوففەش هەزارە کۆچ کردووەکان بوون کە لە سەد کەس زیاتر دەبوون و لە صوففەدا - کە سەکۆیەکی مزگەوت بوو - نیشتەجێ بووبوون. ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: یەکە یەکە بە شوێنیاندا گەڕام تا هەموویانم کۆکردەوە و هێنامن. ئنجا قاپێك خواردنمان لە بەردەمدا دانرا. ئێمەش هەتا توانیمان لێمان خوارد، کە لێ بووینەوە، وەك چۆن یەکەم جار دانرابوو، هەر وەهابوو، ئەوەندە نەبێت کە جێگا پەنجەکانی تێدا دیار بوون"[1]!

کە ئەبوو هورەیرە - خوای لێ ڕازی بێت - ئەم هەواڵە دەگێڕێتەوە، ئەوا بە ناوی هەموو ئەهلی صوففەوە دەیگێڕێتەوە و پشت بە تەسدیقی ئەوان دەبەستێت. وەك بڵێی هەموو ئەهلی صوففە گێڕابێتیانەوە. جا ئایا دەگونجێ ئەم هەواڵە پێچەوانەی حەق و ڕاستی بێت و، ئەو مرۆڤە کامڵ و ڕاستگۆیانەش لە ئاستیدا بێدەنگ بن و بەرپەرچی نەدەنەوە؟

○ **نموونەی دەهەم:**

بە ڕیوایەتی صەحیح چەسپاوە کە ئیمامی عەلی فەرموویەتی:

"پێغەمبەر ﷺ هۆزی "بەنی عەبدولموتەلیب"ی کۆکردەوە، کە چل کەس دەبوون و، ئەمانەش هەندێ کەسانی وایان تێدا بوو کە بەچکە حوشترێکی نۆبەرەیان دەخوارد و چوار ئۆقییەش شیریان دەخواردەوە. ئنجا یەك مشت خواردنی بۆ دروست کردن. ئەوانیش تا تێربوون لێیان خوارد و، پاشان وەکو خۆی مایەوە. ئنجا داوای کرد لە قاپێکی وەهادا کە بەشی سێ چوار کەس بکات، شیری بۆ بهێنن. کە هێنایان هەموویان تێریان لێ خواردەوە و، ئەوەشی مایەوە، وەك بڵێی هیچی لێ نەخورابێتەوە وابوو"[2].

---

(١) رواه الطبراني باسناد حسن.

(٢) (كشف) ١/٢٩٣ (فضائل الصحابة) ١٢٢٠.

ئەمە تەنها یەك نموونەیە لە موعجیزەی بەرەکەتی خواردن و، بە ئەندازەی ئازایەتی و ڕاستگۆیی ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - قەتعی و بێ گومانە.

**○ نموونەی یازدەهەم:**

بە ریوایەتێکی صەحیح چەسپاوە کە: کاتێ پێغەمبەر ﷺ فاتیمەی کچی لە ئیمامی عەلی مارە کرد، فەرمانی بە بیلال دا بچێت چوار پێنج مشت خۆراك لە قاپێکدا ئامادە بکات و، یەك سەر حوشتریش بهێنێت تا سەری ببڕێت بۆ ئاهەنگ و زەماوەندەکەیان. بیلال دەفەرموێ: هێنامن و، پێغەمبەر ﷺ حوشترەکەی سەربڕی و، پاشان فەرمانی دا میوانەکانی دەستە دەستە بێنە ژوورەوە. ئەوانیش هاتن و، لەو خواردنەیان خوارد هەتا تێربوون. ئنجا بەشێکیشی لێ زیاد بوو، پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێند و، فەرمانی دا ببرێت بۆ خێزانەکانی و پێی فەرموون: "خۆتان و ئەوانەش دێن بۆ لاتان لێی بخۆن"[1].

بەڵێ، ئەم ژنهێنانە بەفەڕ و پیرۆزە، بە ڕاستی شایانی ئەم موعجیزە پڕ پیت و بەرەکەتەیە!

**○ نموونەی دوازدەهەم:**

ئیمام جەعفەری صادق، لە ئیمام محەممەد باقری باوکیەوە، ئەویش لە ئیمام زەینولعابیدینی باوکیەوە، ئەویش لە ئیمامی عەلیەوە - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە:

"حەزرەتی فاتیمە - خوای لێ ڕازی بێت - قازانێك خواردنی بۆ خۆی و حەزرەتی عەلی لێنابوو. پاشان داوای لە ئیمامی عەلی کرد بچێت بە دوای پێغەمبەردا ﷺ تاکو ئەویش بەشداریی ئەو خواردنەیان بکات. کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا، فەرمانی بە فاتیمە دا بۆ هەریەکە لە خێزانەکانی قاپێك تێ بکات. ئنجا بۆ خۆی و حەزرەتی عەلی و بۆ فاتیمە خۆیشی. پاشان کە خواردنەکە هەڵگیرا، قازانەکە هەر لێوان بوو. فاتیمە - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: تا خوا حەز بکات لێمان خوارد"[2].

(١) (الشفا) ١/٢٩٧.
(٢) (الشفا) ١/٢٩٤.

جا ئەی ئادەمیزاد!

تۆ مرۆڤێکی گەلێ سەیریت! دەنا بۆچی باوەڕ بەم موعجیزەیە ناکەیت، کە موعجیزەیەکە وەك بە چاو ببینرێت ئاشکرا و ڕوونە. بەتایبەت دوای ئەوەی کە زنجیرەی پاك و خاوێنی ڕیوایەتەکەت بیست؟ تەنانەت خودی شەیتانیش هیچ ڕێگایەکی بۆ ئینکاریی ئەم موعجیزەیە لە بەردەمدا نییە!

**○ نموونەی سیازدەهەم:**

پێشەوایانی وەك: ئەبوو داوود و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و بەیهەقی، لە "دوکەینی ئەحمەسیی کوڕی سەعیدی موزەین"ەوە و، لە نوعمانی کوڕی موقەڕڕینی ئەحمەسیی موزەینەوە - کە خۆی و هەر شەش براکەی بە هاوەڵێتیی پێغەمبەر ﷺ شەرەفمەند بوون - هەروەها لە ڕیوایەتی جورەیر و چەند ڕێیەکی ترەوە دەگێڕنەوە کە:

"پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب دا تێشوو بە چوارسەد سوارەی تیرەی ئەحمەس بدات. حەزرەتی عومەر عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! هەرچییەك هەیە تەنها چەند صاعێکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ بیاندەرێ. حەزرەتی عومەر ڕۆشت و لەو خورمایەی کە بە ئەندازەی جێی بەچکە حوشترێك (یخ بوو بێت) جێی گرتبوو، بەشی هەموویانی دا و، پاشان وەك خۆیشی مایەوە"[(١)]!

ڕوودانی ئەم بەرەکەتە، بەم جۆرە ڕووی داوە کە پەیوەندیی بە چوار سەد کەسەوە هەیە، بە تایبەت حەزرەتی عومەر، خوای لێ ڕازی بێت. ئەو چوار سەد کەسە هەموویان بە گێڕەرەوەی ڕوودانی ئەم بەرەکەتە دەژمێررێن. چونکە بێدەنگ بوونیان لە بەرامبەر گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە، تەسدیقە بۆ ڕوودانی.

هەرگیز مەڵێ: چەند کەسێکی کەم ڕیوایەتیان کردووە و "خەبەری ئاحاد"ە و، پشتیان بڕۆیت و ئاوڕ نەدەیتەوە.. نەخێر، ئەم ڕووداوە و ڕووداوەکانی هاوچەشنی، هەرچەند خەبەری ئاحادیش بن، هەر دڵنیایی بە دڵی مرۆڤ دەبەخشن. چونکە لە جێی "تەواتوری مەعنەوی"دان.

---

(١) رواه أحمد والطبراني، ورجاله رجال الصحيح.

○ نموونەی چواردەهەم:

لە کتێبە صەحیحەکانی فەرموودەدا و لە پێش هەموویانەوە لـە صـەحیحی بوخـاری و موسـلیمدا، ئـەو حەدیثـەی جابیر - خـوای لـێ ڕازی بێـت - لـە بـارەی قەرزەکـەی باوکیەوە، ڕیوایەت کراوە کە:

"پاش مردنی باوکی جابیر، هەرچی موڵك و ماڵێك کە باوکی بەجێی هێشتبوو هەموویانی دا بە خاوەن قەرزەکانی باوکی، بەڵام ئەوان قبووڵیان نەکرد. خۆ بەروبوومی دوو ساڵی باخەکەش قەرزەکەی ئەوانی پڕ نەدەکردەوە. پێغەمبەریش ﷺ تەشریفی بۆ لای جابیر هێنا و فەرمانی پێ دا کە بەروبوومەکە ببڕێت و لە جێی خۆیدا بیکات بە خەرمان. ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە ناو خەرمانەکەدا هاتوچۆی کرد و دوعای بەسەردا خوێند. پاشان جابیر قەرزی هەموو خاوەن قەرزەکانی باوکی لـێ دایەوە و هێشتا بە ئەندازەی بەری هەموو ساڵێکیشی لێ مایەوە. لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: بە ئەندازەی ئەوەی لێ مایەوە کە دایەوە بە خاوەن قەرزەکان.

جابیر دەفەرموێ: خاوەن قەرزەکان جوولەکە بوون، زۆر سەریان لەوە سووڕمابوو"[1]!

بەم چەشنە، ئەم موعجیزە ڕوونەی کە لە بارەی "بەرەکەتی خواردن"ەوە لەسەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ ڕووی داوە، تەنها یەك ڕیوایەت نییە کە تەنها جابیر و چەند کەسێکی کەم بیگێڕنەوە، بەڵکو لە واتا و ناوەرۆکدا ڕووداوێکی موتەواتیرە و وەك ئەوە وایە کە هەموو ڕاوییەکان گێڕابێتیانەوە و، جابیر لەم گێڕانەوەیەدا نوێنەری هەموو ئەو کەسانەیە کە ئەم ڕیوایەتە پەیوەندیی پێیانەوە هەیە.

○ نموونەی پازدەهەم:

زانا لێکۆڵەرەکان، لە پێش هەموویانەوە ئیمامی تیرمیذی و ئیمامی بەیهەقی بە ڕیوایەتێکی "صەحیح" لە ئەبوو هورەیرەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

"لە غەزایەکدا - لە ڕیوایەتێکدا: لە غەزای تەبووکدا - برسێتی زۆری بۆ خەڵك هێنابوو. پێغەمبەر ﷺ لێی پرسیم: "هل من شيء"؟ واتە: هیچ شتێکت لە لا هەیە؟ عەرزم

---

(١) صحيح، رواه البخاري وأحـــمد.

کرد: بەڵێ، نەختێك خورما – لە ڕیوایەتێکدا پازدە دەنك خورما – لە توێشەبەرەکەدا هەیە. فەرمووی: بۆم بهێنە. منیش بۆم هێنا و، ئەویش دەستی پیادا کرد و مشتێکی لێ دەرهێنا و بڵاوی کردەوە و دوعای بەرەکەتی بەسەردا خوێند. ئنجا فەرمووی: دە کەسم بۆ بانگ بکە. منیش بانگم کردن، ئەوانیش هاتن و تێریان لێ خوارد. پاشان دە کەسی تر.. بەم چەشنە تا هەموو سوپاکە تێریان لێ خوارد. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خُذْ ما جئتَ به، وأدخِلْ يدكَ واقبض منه ولا تكبه"[١].

ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: کە لێم وەرگرت زیاتر بوو لەو ئەندازەیەی هێنابووم و، لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکر و عومەریشدا هەر لێم دەخوارد و تەواو نەدەبوو. تا ئەو کاتەی عوسمان کوژرا ئەو تێشووەم لێ دزرا و برا. لە ڕیوایەتێکدا دەفەرموێ: ئەوەندە و ئەوەندە (وەسق)م[٢] لەو خورمایە لە ڕێی خوادا کرد بە خێر"[٣].

بەم جۆرە، ئەم موعجیزەی بەرەکەتە کە ئەبوو هورەیرە دەیگێڕێتەوە، ئەو ئەبوو هورەیرەیەی کە قوتابیی سەردار و مامۆستای گەردوون: حەزرەتی محەممەد ﷺ بووە و، بەوپەڕی چوست و چالاکی و لێبڕانەوە لە قوتابخانەی صوففەدا دەوامی کردووە و، بە بۆنەی دوعای پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ لەبەرکردن(الحفظ) پێش هاوەڵانی کەوتبووەوە.. ئەم هاوەڵە گەورە و بەڕێزەی پێغەمبەر ﷺ ئەم ڕیوایەتە لەناو کۆمەڵێکی زۆری خەڵکدا – وەك جەنگاوەرانی غەزای تەبووك – دەگێڕێتەوە. کەواتە دەبێ ئەم ڕیوایەتە لە ناوەڕۆکدا موتەواتیر بێت و، بە ئەندازەی هێزی هەموو سوپاکە خاوەنی هێز بێت. واتە وەکو ئەوە وایە کە هەموو یەکێکی ناو ئەو سوپایە گێڕابێتیانەوە.

### ❍ نموونەی شازدەهەم:

لە صەحیحی بوخاری و صەحیحەکانی تردا چەسپاوە کە: "جارێکیان برسێتی زۆر بۆ ئەبوو هورەیرە دەهێنێت، پێغەمبەریش ﷺ دەیخاتە شوێن خۆی تا لە ماڵەوە دەبینێت پەرداخێك شیری بە دیاری پێشکەش کراوە. ئنجا پێغەمبەر ﷺ داوای لێ دەکات کە هەموو ئەهلی صوففە بانگ بکات. ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: لە بەرخۆمەوە وتم: ئەم نەختە شیرە چی بۆ ئەوان دەکات؟ باش وابوو من قومێکم لێ بخواردایەتەوە تا نەختێ

---

(١) واتە: ئەوەی هێنات بیبەرەوە و، کاتێ کە لێت خوارد دەستی پێدا بکە و لێی دەربهێنە و مەیرێژەرە دەرەوە.
(٢) وەسق: شەست صاعە کە باری حوشترێکە.
(٣) (الشفا) ١/٢٩٥.

هێزم دەهاتەوەبەر! پاشان بانگم کردن، کە ئەوانیش لە سەد کەس زیاتر بوون، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دام بەسەریاندا بیگێڕم، منیش یەك بە یەك پەرداخەکەم دەدانێ و هەر کەسەش پەرداخەکەم دەدایە دەست تا تێر دەبوو لێی دەخواردەوە. پاشان یەکێکی تر وەری دەگرت.. بەم جۆرە تا هەموویان تێریان لێ خواردەوە. ئنجا پێغەمبەر ﷺ پەرداخەکەی وەرگرت و فەرمووی: بەس من و تۆ ماوین، دانیشە بخۆرەوە. منیش خواردمەوە. پاشان فەرمووی: بخۆرەوە، دیسان خواردمەوە. ئەو هەر دەیفەرموو: بخۆرەوە، منیش دەمخواردەوە تا تێرم لێ خواردەوە و وتم: بەو کەسەی کە تۆی بە حەق کردووە بە پێغەمبەر تێرم خواردووەتەوە و جێ نەماوە تێی بکەم! ئنجا پەرداخەکەی لێ وەرگرتم و، سوپاسی خوای کرد و، ناوی خوای هێنا و، پاشماوەکەی خواردەوە"[1].

سەد هەزار جار نۆشی گیانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ!

ئەم موعجیزەیەی کە لە هەموو گومانێکەوە دوورە و وەکو شیر خاوێنە، کتێبە صەحیحەکان ڕیوایەتیان کردووە، بە تایبەت صەحیحی ئیمامی بوخاری کە پێنج سەد هەزار فەرموودەی لەبەر بووە. کەواتە ڕیوایەتێکی ڕاست و چەسپاوە و هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نییە و وەك بە چاو ببینرێت وایە. هەروەك قوتابیی قوتابخانەی پیرۆزی ئەحمەدی، قوتابخانەی "صوففە"، حەزرەتی ئەبوو هورەیرەی باوەڕپێکراو(ثقـة) و (حافظ)، بە ناوی کۆمەڵی "صوففە"وە، گێڕاویەتەوە و ئەوانی کردووە بە شایەت لەسەری.

جا ئەو کەسەی کە ئەم هەواڵە دەبیستێ، وەك بە چاو ببینێت ئاوا باوەڕی پێ نەکات، دەبێ یان دڵی تێکچووبێت و مردبێت، یان ژیریی لەدەست دابێت.

ئاخۆ دەگونجێ هاوەڵێکی گەورە و بەڕێز و ڕاستگۆی وەك ئەبوو هورەیرە - خوای لێ ڕازی بێت - کە هەموو تەمەنی خۆی لە پێناوی پاراستنی فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ بردووەتە سەر، لە ڕێزی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کەم بکاتەوە و شتێك بهێنێت جێی گومان بێت و، بە پێچەوانەی حەق و واقیعەوە قسە بکات؟ ئەو ئەبوو هورەیرەیەی کە هەرخۆی لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە کە دەفەرموێ: "من كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مقعَدَهُ مِن النار"؟[2] نەخێر.. هەرگیز شتی وا ڕوو نادات.

---

(١) صحيح، رواه البخاري والترمذي.

(٢) واتای ئەم فەرموودەیە لە پەراوێزی لاپەڕە (١٦٤)دا ڕابورد.

ده‌سا ئه‌ی په‌روه‌ردگار! له‌به‌ر خاتری به‌ره‌كه‌تی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ به‌رێزه‌ ﷺ به‌ره‌كه‌ت بخه‌ره‌ ناو ئه‌و رۆزی‌یه‌ ماددی و مه‌عنه‌وی‌یانه‌ی كه‌ خۆت پێت به‌خشیوین.

*سه‌رنجێكی گرنگ:*

شتێكی ڕوون و به‌ڵگه‌نه‌ویسته‌ كه‌ هه‌ركات چه‌ند شتێكی لاواز كۆ بنه‌وه‌، ئه‌وا به‌هێز ده‌بن و، هه‌ركات چه‌ند تاڵێك ده‌زوو به‌ یه‌كه‌وه‌ ببه‌سترێن و یه‌كبگرن، ئه‌وا ده‌بن به‌ په‌ت و، ئه‌گه‌ر چه‌ند په‌تێكیش یه‌كبگرن، ئه‌وا هیچ كه‌سێك ناتوانێت بیپچڕێنێت.

ئێمه‌ش لێره‌دا شازده‌ نموونه‌مان بۆ به‌شێك له‌ پازده‌ به‌شی (یه‌كێك) له‌ جۆره‌كانی به‌ره‌كه‌ت باس كرد، كه‌ ئه‌ویش یه‌كێكه‌ له‌ (پازده‌) جۆری موعجیزاتی پێغه‌مبه‌ر ﷺ. هه‌ریه‌ك له‌و نموونانه‌ش له‌ خۆیدا تابلێی به‌هێزه‌ و سه‌روزیاده‌ بۆ چه‌سپاندنی پێغه‌مبه‌رێتیی پێغه‌مبه‌ر ﷺ. خۆ ئه‌گه‌ر به‌ فه‌رزی "مه‌حاڵ"یش وا دابنرێت كه‌ هه‌ندێكیان له‌ خۆیاندا لاواز بن، ئه‌وا ناتوانرێت بوترێت: ئه‌و نموونه‌یه‌ نابێت به‌ به‌ڵگه‌ی موعجیزه‌كه‌. چونكه‌ به‌ بۆنه‌ی یه‌ككگرتنیه‌وه‌ له‌گه‌ڵ نموونه‌ به‌هێزه‌كاندا، ئه‌میش هێز به‌ده‌ست ده‌هێنێت.

پاشان كۆبوونه‌وه‌ی ئه‌م شازده‌ نموونه‌یه‌ی كه‌ له‌ پله‌ی "ته‌واتوری مه‌عنه‌وی"دان، به‌ڵگه‌ی موعجیزه‌یه‌كی گه‌وره‌ی مه‌حكه‌م و به‌هێزه‌. خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌م موعجیزه‌ به‌هێزه‌ له‌گه‌ڵ چوارده‌ به‌شه‌كه‌ی تری موعجیزه‌ی به‌ره‌كه‌تدا – كه‌ لێره‌دا باس نه‌كراون – تێكه‌ڵ بكرێن، ئه‌وا ده‌بێته‌ موعجیزه‌یه‌كی گه‌وره‌ی وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌ چه‌ند په‌تێك وه‌ها یه‌كیان گرتبێت كه‌س نه‌توانێت بیپچڕێنێت..

ئنجا گه‌ر ئه‌م موعجیزه‌ گه‌وره‌ و به‌هێزه‌ له‌گه‌ڵ (چوارده‌) جۆره‌كانی تری موعجیزاتدا ڕیز بكرێن، ده‌بێت به‌ به‌ڵگه‌یه‌كی گه‌لێ ڕوون و به‌هێز و توندوتۆڵ له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رێتی و ڕاستیی پێغه‌مبه‌ر ﷺ، كه‌ هه‌رگیز له‌ جێی خۆیدا نابزوێت.

به‌م جۆره‌ ده‌ركه‌وت كه‌ سنووری پێغه‌مبه‌رێتیی پێغه‌مبه‌ری سه‌روه‌رمان ﷺ وه‌ك چیایه‌كی بڵندی گه‌وره‌ وایه‌، كه‌ له‌م هه‌موو موعجیزانه‌ پێكهاتووه‌.

خوێنه‌ری به‌ڕێز!

بێ گومان ئێستا ڕاده‌ی گه‌وجی و گه‌لحۆیی ئه‌و كه‌سه‌ت بۆ ده‌ركه‌وت كه‌ ئه‌م كۆشكه‌ به‌رز و ئاوه‌دانه‌ی پێغه‌مبه‌رێتی ده‌بینێت، كه‌چی پێی وایه‌ به‌ چه‌ند گومانێكی لاواز كه‌ له‌ چه‌ند نموونه‌یه‌كی جوزئی‌یه‌وه‌ به‌ زه‌ینی‌دا دێت، ئه‌م كۆشكه‌ ده‌ڕووخێت و نامێنێت!

بەڵێ، ئەو موعجیزانەی کە تایبەتن بە بەرەکەتی "خواردن"ەوە، بەڵگەیەکی گومان لێ نەکراون لەسەر پێغەمبەریێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ هەروەك بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کار بێ سپێرراوێکی خۆشەویستە لە لایەن خواوەندی میهرەبان و بەخشندەوە. ئەو خوایەی کە ڕۆزی دروست دەکات و دەیبەخشێت.. ئەم پێغەمبەرە ﷺ ئەوەندە بەندەیەکی بەڕێزە لە لای کە – بە پێچەوانەی عادەتەوە – لە "نەبوون"ەوە و لە گەنجینە بێ کۆتاییەکانی غەیبەوە، چەندین سفرە و خوانی میواندارى بۆ خۆشەویستەکەی دەنێرێت.

ئاشکرایە کە نیوەدوورگەی عەرەب شوێنێکی بێ کشتوکاڵ و کەم ئاوە، بە چەشنێ کە دانیشتووانی، بە تایبەت لە سەرەتای ئیسلامدا، لە ژیانێکی کولەمەرگی و بێ ئاوی و تینوویی و برسێتیدا دەژیان. جا لەسەر بناغەی ئەم حیکمەتە، گرنگترین موعجیزە ڕوون و ئاشکراکانی پێغەمبەر ﷺ لە بواری "خواردن" و "ئاو"دا دەرکەوتوون.

ئەم موعجیزانە وەك ڕێزلێنانێکی پەروەردگاری و بەخششێکی خوایی و میوانداریەکی میهرەبانیی خوای گەورە وان بۆ پێغەمبەر ﷺ کە لە کاتی پێویستیدا بەو موعجیزانە ڕێزی لێ دەگرێت. کەواتە ئەم موعجیزانە زیاتر ڕێزلێنانن تا ئەوەی بەڵگەی پێغەمبەریێتیی ئەو بن. چونکە ئەوانەی کە ئەو موعجیزانەیان بینیوە، تابڵێی ئیمانیان بە پێغەمبەریێتیی پێغەمبەر ﷺ بەهێز و دامەزراو بووە. دیارە موعجیزەش هەتا زیاد بکات ئیمانیش پتر زیاد دەبێت. بەم جۆرە، ئەو موعجیزانە نوور و ڕووناکیی زیاتریان بەو ئیماندارانە بەخشیوە.

## ئاماژەی هەشتەم

**(ئەم ئاماژەیە، بەشێك لەو موعجیزانە ڕوون دەکاتەوە کە پەیوەندییان بە "ئاو"ەوە هەیە)**

**پێشەکی:**

ئەگەر ئەو ڕووداوانەی کە لە بەرچاوی خەڵکی و لە ناویاندا ڕوودەدەن، لە ڕێی "ئاحاد" واتە: یەکە یەکەوە، بە دەستمان بگەن و کەسیش بە درۆیان نەخستبنەوە، ئەوا ئەم بەدرۆنەخستنەوەیە بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ڕوودانیان. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە ئەگەر درۆ ببیستێت ئاشکرای دەکات و دەری دەخات. بە تایبەت ئەوانەی کە

هەرگیز لە ئاستی درۆدا بێدەنگ نابن كە هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەری سەروەرن ﷺ بە تایبەتیش كـە ڕووداوەكـان پەیوەندی‌یان بـە خـودی پێغەمبـەرەوە ﷺ ببێـت. هـەروەها بـە تایبەتی ئەگەر گێڕەرەوەی ڕووداوەكان لـە هاوەڵـە بەناوبانگـەكان بـن. لـە كـاتێكی وادا گێڕەرەوەی ڕووداوەكە وەك نوێنەری هەموو ئەوانە وایە كە بە چاوی خۆیان بینیویانە.

دەبێ ئـەوەش بزانـین كـە هەریـەك لـە نموونـەكانی ئـەو موعجیزانـەی پـەیوەندی‌یان بـە "ئاو"ەوە هەیە و لەمەولا باسیان دەكـەین، لـە چـەند ڕێ‌یـەكی جیاجیـا و لـە زۆر هـاوەڵی پێغەمبـەرەوە ﷺ ڕیوایـەت كـراون. ئنجـا ئیمـام و زانایـانی "تـابعین" وەریـانگرتوون و پاراستوونیان و، هەموو یەكێك لە ڕیوایەتـەكانی ئـەو ڕووداوانـەیان بەوپـەڕی ئەمانەتـەوە تەسلیمی كەسانی تری سەردەمی دوای خۆیان كردووە. پاشـان چـەرخ و سـەردەمەكەی دوای ئەوان، بەوپـەڕی ئەمانـەت و لێبڕانـەوە وەریـانگرتوون و، ئنجـا ئـەوانیش تەسـلیمی زانایـانی سـەردەمی دوای خۆیـان كـردوون.. بـەم جـۆرە، هـەزاران زانـا، لــە هــەموو سەردەم و چینێكـی زانایـان، یـەك لـە دوای یـەك، ئەو ڕیوایەتانـەیان هێنـاوە تـا سـەردەمی ئێستامان.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە چەندین كتێبی "صەحیح" هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ نووسـراونەتەوە و، دەستاودەسـت هـاتوون تـا كەوتوونەتـە دەستی زانایـان و پێشـەوایانی فەرمـوودە، وەك ئیمامی بوخاری و موسلیم. ئەوانیش بە تـەواوی لێیـان تێ‌گەیشـتوون و، پاشـان هـەموو ئـەو ڕیوایەتانـەیان بە گوێرەی پلـەكانیان لـە یـەكتر جیـا كردووەتـەوە و، هـەركامێكیان "صـەحیح" بـووە و هیـچ جـۆرە گومـانێكی تێـدا نـەبووە، لــە كتێبــە صەحیحـەكانیاندا تۆماریـان كـردوون. بـەم كارەشـیان ئێمـەیان بـۆ فـەرموودە و ڕووداوە ڕاستەكان ڕێنمایی كردووە، خوا پاداشتی چاكەیان بداتەوە.

نموونەیـەك بـۆ ئەمـە: وەك هـەڵقوڵانی ئـاو لـە نێـوان پەنجـەكانی پێغەمبـەرەوە ﷺ و خواردنەوەی زۆر كەس لەو ئاوە. ئەمە ڕووداوێكی موتەواتیرە، كۆمەڵێكی زۆر لەوانەی كە هەرگیز ناگونجێ لەسەر درۆكردن یـەكیان گرتبێت، بـەڵكو هـەر مەحاڵـە درۆ بكـەن، گێڕاویانەتەوە. كەواتە ئەم موعجیزەیە بێ‌گومان و چەسپاوە. سـەرەڕای ئـەوەی كـە سـێ جار لە بەردەم سێ كۆمەڵی زۆر گەورەدا دووپات بووەتەوە.

ئـەم ڕووداوە، كۆمـەڵێك لــە هاوەڵــە بەناوبانگــەكان، كــە لــە پێــش هەموویانــەوە "ئەنەس"ی خزمەتگوزاری پێغەمبـەر ﷺ و "جابیر" و "ئیبن مەسعوود"ن، بە ڕیوایـەتێكی

صەحیح گێڕاویانەتەوە. پاشان لە چەند زنجیرە ڕێگایەکەوە پێشەوایانی فەرمووده وەك: ئیمامی بوخاری و موسلیم و ئیمامی مالیك و ئیبن شوعەیب و قەتادە - خوایان لێ ڕازی بێت - گێڕاویانەتەوە.

وا تەنها (نۆ) نموونە باس دەکەین، لەو موعجیزانەی کە پەیوەندییان بە "ئاو"ەوە هەیە:

❖ **نموونەی یەکەم:**

لە صەحیحی بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیشدا چەسپاوە کە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ:

"جارێك لە کاتی نوێژی عەسردا خەڵك بۆ ئاوی دەستنوێژ دەگەڕان و دەستیان نەدەکەوت. چاوم لە پێغەمبەر بوو ﷺ ئاویان بۆ هێنا کە دەستنوێژی پێ بگرێت. لەو کاتەشدا لە بازاڕ لە لای "زەوراء"دا بوو. پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە ناو ئاوەکە و فەرمانی بە خەڵکەکە دا بێن دەستنوێژی لێ بگرن. ئەنەس دەفەرموێ: ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەقوڵا و ئەو هەموو خەڵکە دەستنوێژیان لەو ئاوە گرت.

قەتادە دەڵێت: لە ئەنەسم پرسی چەند کەس بوون؟ وتی: "سێ سەد یان لەو نزیکەدا بووین"[(١)].

دەبینیت ئەنەس - خوای لێ ڕازی بێت - کە ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە، وەك نوێنەری ئەو سێ سەد کەسە وایە. چونکە ئایا دەگونجێ، لە ناوەڕۆکدا، ئەم سێ سەد کەسە بەشداریی گێڕانەوەی ئەم هەواڵە نەبن لەگەڵ ئەنەسدا؟ یان ئایا دەگونجێ، گەر ئەمە ڕووی نەدابێت، بە درۆی نەخەنەوە؟

❖ **نموونەی دووهەم:**

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا چەسپاوە کە: "سالیمی کوڕی ئەبولجوعد لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

لە ڕۆژی حودەیبییەدا خەڵك زۆریان تینوو بوو، پێغەمبەریش ﷺ کوندەیەك ئاوی لە بەردەستدا بوو دەستنوێژی لێ گرت، ئنجا خەڵکەکە هەموو بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم والنسائي والترمذي وأحمد.

ڕۆشتن. ئەویش فەرمووی: چی ڕووی داوە؟ وتیان: ئاومان لە لا نی‌یە چ بۆ دەستنوێژ چ بۆ خواردنەوە مەگەر ئەوەی بەردەستت! پێغەمبەریش ﷺ دەستی خستە ناو کوندەکەوە، یەکسەر ئاو لە نێوان پەنجەکانیەوە وەك کانی هەڵقولا. ئێمەش تێرمان لێ خواردەوە و دەستنوێژمان لێ گرت.

سالم دەڵێت لە جابیرم پرسی: چەند کەس بوون؟ لە وەڵامدا وتی: ئەگەر سەد هەزار کەسیش بووینایە بەشی دەکردین، هەزار و پێنجسەد کەس بووین"[١].

وا بۆت دەرکەوت کە ئەوانەی ئەم موعجیزەیان –لە مەعنادا– گێڕاوەتەوە، دەگەنە هەزار و پێنجسەد کەس. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە درۆ دەردەخات و دەڵێت: "ئەمە درۆیە". نەخوازەلا ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی کە گیان و سامان و باوك و کوڕ و خزم و هۆزی خۆیان لە پێناوی حەق و ڕاستیدا بەخت کرد. چ جای ئەوەی کە لە ئاستی درۆدا بێدەنگ بن، بە تایبەت دوای ئەو هەڕەشە ترسناکەی لە پێغەمبەریان ﷺ بیستووە کە فەرموویەتی: "هەرکەسێ بە ئەنقەست درۆم بە دەمەوە بکات، با جێیەك بۆ خۆی لە ئاگری دۆزەخدا ساز بکات"!

جا مادەم ئەوان بەم هەواڵدانەی جابیر ڕازی بوون و بە درۆیان نەخستەوە، ئەوا هەموویان لە ناوەڕۆکدا بەشداری ئەم ڕیوایەتەن و تەسدیقیان کردووە.

❖ نموونەی سێهەم:

صەحیحی بوخاری و موسلیم و صەحیحەکانی تر لە باسی غەزای "بُـــواط"دا دەگێڕنەوە کە: جابیر وتوویەتی: "پێغەمبەر ﷺ بە منی فەرموو: "ناد بِوَضُوءٍ" واتە: داوای ئاوی دەستنوێژ لە خەڵك بکە. عەرزم کرد: ئاو دەست ناکەوێ. پێغەمبەریش ﷺ داوای ئاوێکی زۆر کەمی کرد. بۆیان هێنا و دەستی خستە ناوی و شتێکی لەبەر خۆیەوە فەرموو نازانم چی بوو. پاشان فەرمووی: "نـــاد بجفنـــة الركـــب". واتە: داوا بکە جەفنە (تەشت)ێك[٢] بهێنن. منیش هێنام و لە بەردەستیدا دامنا. جابیر دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە ناو تەشتەکەوە و پەنجەکانی تێدا بلاوکردەوە و، ئنجا جابیر ئاوەکەی کرد بەسەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "بسم الله".

---

(١) صحيح: رواه البخاري ومسلم.

(٢) جەفنە: قاپێکی گەورەیە، خواردنی دە کەس دەگرێت.

جابیر دەفەرموێ: دەمبینی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانیەوە هەڵدەقوڵا هەتا تەشتەکەی پڕ کرد. ئنجا فەرمانی دا کە خەڵکەکە بێن ئاو بەن. ئەوانیش تا تێراوبوون لێیان خواردەوە، منیش وتم: ئایا کەس نەماوە پێویستیی بە ئاو بێت؟ ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەستی لە تەشتەکە هەڵگرت، هێشتا هەر پڕبوو"(١).

جا ئەم موعجیزە ئاشکرایە: موتەواتیری مەعنەوی‌یە. چونکە لەبەر ئەوەی جابیر لە پێشەنگی بینەرانی ئەم موعجیزەیەوە بووە، مافی خۆیەتی کە بە ناوی بینەرانەوە و لە بریی ئەوان بیگێڕێتەوە و ڕایبگەیەنێت. چونکە لەو کاتەدا ئەو خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد.

لە ڕیوایەتەکەی (ئیبن مەسعوود)دا(٢) - کە لە صەحیحی بوخاری‌دایە - دەفەرموێ: "بە چاوی خۆم دەمبینی کە ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەقوڵا".

ئایا ئەگەر چەند هاوەڵێکی بەڕێز و باوەڕپێکراوی وەك "جابیر" و "ئەنەس" و "ئیبن مەسعوود" بڵێن: "بە چاوی خۆمان بینیمان" ئایا دەگونجێ کە بە چاوی خۆیان نەیانبینیبێت؟

پاشان ئەم نموونانە بە یەکەوە ببەستە و یەکیان بخە، با بۆت دەربکەوێت کە ئەم موعجیزە گەورە و ئاشکرایە چەندە بەهێز و توندوتۆڵە. چونکە ئەگەر هەر سێ ڕێگاکە یەك بگرن، ئەوا ڕیوایەتەکە دەبێت بە "تەواتوری مەعنەوی" و بە بێ‌گومانی دەچەسپێت کە: ئاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەقوڵا.

جا ئەم موعجیزەیە گەلێ لە موعجیزەکەی حەزرەتی مووسا - دروودی لەسەر بێت - گەورەتر و بەرزترە، کە دوازدە کانیی لەناو بەرددا هەڵقوڵاند، چونکە تەقینی کانیاو لەناو بەرددا شتێکی مومکینە و بە گوێرەی عادەت هاوچەشنی هەیە. بەڵام هەڵقوڵانی ئاو، بە وێنەی کەوسەر و سەلسەبیل، لەناو گۆشت و ئێسکدا، شتێکە هاوچەشنی نی‌یە.

❖ **نموونەی چوارەم:**

ئیمامی مالیك لە کتێبە بەنرخەکەی‌دا: "الموطأ"(٣) لە هاوەڵی بەڕێزی وەك "موعاذی کوڕی جەبەل"ەوە، دەگێڕێتەوە کە: "لە غەزای تەبووکدا ڕۆشتنە سەر کانی‌یەك ئاوێکی یەکجار کەمی تێدا بوو کە بە ئەندازەی بنی پێڵاو جێی گرتبوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا هەندێك لە ئاوەکەی کۆ بکەنەوە. ئەوانیش بە دەست نەختێکیان لە شتێکدا کۆکردەوە.

---

(١) صحيح، رواه مسلم في حديث طويل.
(٢) صحيح، رواه البخاري والترمذي والنسائي.
(٣) صحيح، رواه مسلم وأحمد أيضا.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەست و دەموچاوی لەو ئاوەدا شۆرد و پاشان ڕۆی کردە ناو کانی یەکە. ئیتر ئەو کانی یە ئاوەکەی تەقی یەوە و زۆر بوو، خەڵکەکەش لە ئاوەکەیان بەکارهێنا.

تەنانەت لە ڕیوایەتەکەی "ئیبن ئیسحاق"دا دەڵێت: ئاوەکە ئەوەندە بە هوروژم بوو کە دەنگێکی وەك دەنگی هەورە بروسکەی لێ بەرز بووەوە.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە موعاذی فەرموو:

"یوشك یا معاذ إن طالت بك حیاة أن تری ما هاهنا قد مُلئ جناناً"(١).

هەر وەهایش بوو کە ئەو فەرمووی.

❖ **نموونەی پێنجەم:**

ئیمامی بوخاری لە "بەڕڕاء" و "سەلەمەی کوڕی ئەکوەع"ەوە و، کتێبە صەحیحەکانی تریش لە چەند ڕێیەکی ترەوە، دەگێڕنەوە کە ئەو هاوەڵانە دەفەرموون: "لە ڕۆژی حودەیبییەدا هەزار و چوارسەد کەس دەبووین. حودەیبییەش بیرێکە هەڵمان گۆزی و دڵۆپێك ئاومان تێدا نەهێشت. ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەسەر لێواری بیرەکە دانیشت و داوای ئاوی کرد، بۆیان هێنا. پاشان دەمی پیرۆزی بە ئاوەکە تەڕ کرد و، ئنجا کردیەوە ناو بیرەکە. ئێمەش زۆرمان پێ نەچوو ئاومان لێ هەڵگۆزی، بە جۆرێ کە خۆمان و وڵاخەکانمان تێراو بووین"(٢).

"بەڕڕاء" دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا دۆڵچەیەك ئاوی بۆ بهێنن. ئێمەش بۆمان هێنا. ئەویش ئاوی دەمی پیرۆزی خۆی تێکرد و دوعای بەسەردا خوێند. پاشان دۆڵچە ئاوەکەی کردە ناو بیرەکەوە. ئیتر بیرەکە تەقی یەوە و تا لێواری پڕ بوو لە ئاو. خەڵکەکەش تێریان لێ خواردەوە و وڵاخەکانیشیان لێ ئاودا.

❖ **نموونەی شەشەم:**

پێشەوایانی فەرموودە، وەك ئیمامی موسلیم و ئیبن جەریری تەبەری و غەیری ئەوانیش، لە ئەبوو قەتادەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ:

"پاش ئەوەی هەواڵی کوشتنی میرەکانی سوپای موسڵمانان لە غەزای "موئتە"دا بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، پێغەمبەر ﷺ ئێمەی بۆ یارمەتیدانی ئەو سوپایە برد کە لە "موئتە"دا

---

(١) واتە: ئەی موعاذ! ئەگەر تەمەنت درێژ بێت، نزیکە ئەم دەوروبەرە ببینیت پڕبووبێت لە باخ و بێستان.

(٢) رواه البخاري ومسلم وأحـــمد.

بوو. منیش "مەیضەئە"یەکەم[١] پێ‌بوو. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "إحفظ علینا میضـــــأتك فسیكون لها نبــأ"[٢] پاش ئەوە تینوێتی تەنگی پێ هەڵچنیین، ژمارەشمان حەفتا و دوو کەس - لە ڕیوایەتەکەی تەبەریدا: نزیکەی سێ‌سەد کەس - دەبووین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "مەیضەئەکەت بهێنە". کە هێنام پێغەمبەر ﷺ دەمی پیرۆزی نا بە دەمی دەفرەکەوە، ئیتر نازانم فووی پێدا کرد یان نا؟ پاش ئەوە حەفتا و دوو پیاو هاتن لێیان خواردەوە و دەفرەکانیشیان لێ پڕ کرد. ئنجا مەیضەئەکەم هەڵگرتەوە وەکو یەکەم جار پڕ بوو"[٣]. دەسا تۆیش سەرنج لەم موعجیزەیە بدە و بڵێ: "اللهم صلّ وسلم علیه وعلى آله بعدد قطرات الماء".

### ❖ نموونەی حەوتەم:

ئیمامی بوخاری و موسلیم، لە باسی گێڕانەوەی ئەو تینوێتی‌یەی کە لە هەندێ سەفەردا تووشی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بووە، لە "عیمرانی کوڕی حوصەین"ەوە - خوا لێی ڕازی بێت و لە ئێمەش خۆش بێت - دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ:

لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ خەڵکەکەش هانای تینوێتی‌یان بردە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ. ئەویش دابەزی‌یە خوارەوە. پاشان من و عەلیی بانگ کرد و فەرمووی بڕۆن لە فلانە شوێندا ئافرەتێك دوو کوندە ئاوی لە ئاژەڵێك بار کردووە بیهێنن بۆ ئێرە. کە ڕۆشتین لەو شوێنەدا ئافرەتێکمان بینی دوو کوندەی پڕ لە ئاوی پێ بوو، هێنامان بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەریش ﷺ داوای کرد شتێك بهێنن ئاوەکەی تێ بکەن. کە هێنایان دەمی هەردوو کوندەکەی کرایە سەر و دوعای بەسەردا خوێند و ئنجا بانگ لە خەڵکەکە کرا کە بێن بخۆنەوە و پڕ بکەن. دوای ئەوە لامان وابوو ئەو دوو کوندەیە لە یەکەم جاریان پڕتر بوون. ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردنی بۆ کۆ بکەنەوە. ئەوانیش خواردنیان بۆ کۆ کردەوە و خستیانە ناو پارچەیەکەوە و، لەسەر حوشترەکەی خۆی بۆیان بار کرد. ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتەکەی فەرموو: "تعلمـــــين ما رَزِئْنا من مائك شيئاً ولكن الله هو الذي أسقانا"[٤]. تا کۆتایی فەرموودەکە.

---

(١) مەیضەئە: جۆرە دەفرێکە بۆ دەستنوێژ گرتن ئاوی تێ‌دەکرێت.

(٢) واتە مەیضەئەکەمان بۆ هەڵبگرە، چونکە دوایی بەسەرهاتێکی دەبێت.

(٣) صحيح، رواه مسلم وأبو داود.

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحمد. واتە: دەزانیت هیچمان لە ئاوەکەی تۆ کەم نەکردەوە، بەڵکو خواوەند خۆی تێراوی کردین.

❖ **نموونەی هەشتەم:**

"ئیبن خوزەیمە" حەدیثەكەی ئیمامی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - لە بارەی (جيش العُسرة)وە، دەگێڕێتەوە و باسی ئەوە دەكات كە ئەوەندە تینوێتی تەنگی پێ هەڵچنیبوون پیاوی وا هەبوو لە ناچاریدا حوشترەكەی سەردەبڕی و ئاوەكەی ناو گەدەی دەخواردەوە. لەو كاتەدا حەزرەتی ئەبووبەكر - خوای لێ ڕازی بێت - داوای لە پێغەمبەر ﷺ كرد دوعا بكات. پێغەمبەریش ﷺ دەستەكانی بەرز كردەوە و داینەنان تا هەور ڕووی ئاسمانی گرت و ئەوەندە باری تا دەفرەكانیان لێ پڕ كرد.. لە سەر سوپاكەش بەولاوە نەباری[1]!

ئەمە موعجیزەیەكی تایبەتیی ئەحمەدییە و هەرگیز "ڕێكەوت" پەیوەندیی پێوە نەبووە.

❖ **نموونەی نۆهەم:**

عەمری كوڕی شوعەیب، كە كوڕەزای عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاصە و هەر چوار پێشەوایانی خاوەن "سونەنەكان" لە گێڕانەوەی فەرموودەدا بە "باوەڕپێ كراو" دایاننا وە، دەگێڕێتەوە كە:

"جارێكیان پێغەمبەر ﷺ لە (ذي مجاز)دا[2] لە پشت ئەبوو تالیبی مامیەوە سوار بووبوو. ئەبوو تالیب وتی: تینوومە و ئاویشم لەلا نییە. پێغەمبەر ﷺ دابەزی و پێی بە زەویدا دا و ئاو هاتە دەرەوە، ئنجا بە ئەبوو تالیبی فەرموو: "بخۆرەوە"[3]".

یەكێك لە زانا لێكۆڵەرەكان دەڵێت:

ئەم ڕووداوە هی پێش پێغەمبەرێتییە. كەواتە بە (ئیرهاص)[4] دادەنرێت.

هەڵقوڵانی ئاوی عەرەفە بە بەردەوامی تاكو دوای هەزار ساڵ، یەكێكە لەو ڕێزلێنانەی كە خوای گەورە لە پێغەمبەری ناوە ﷺ.

---

(١) حديث صحيح أو حسن. رواه البزار والطبراني وابن خزيمه وابن حبان والحاكم والبيهقي.

(٢) ذي مجاز: بازاڕێك بووە لە عەرەفەی شاری مەككە.

(٣) رواه ابن سعد. بڕوانە: الشفا ١/٢٩٠.

(٤) ئیرهاص: بەو ڕووداوە لە عادەتبەدەرانەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەوترێت كە لە پێش پێغەمبەرێتییدا ڕوویان داوە، بەڵام موعجیزە هی كاتی پێغەمبەرێتییەتی.

ئەو موعجیزانەی کە پەیوەندی‌یان بە ئـاوەوە هەیـە، ئەگـەر نەشـگەنە (نـەوەد) نموونـە، خۆ بە (نەوەد) ڕێگای جۆرا و جۆر ڕیوایەت کراون.

حەوت نموونـەکانی یەکـەم، گەلـێ بـەهێزن و وەك "تـەواتوری مەعنـەوی" وان. دوو نموونەکـەی دواییـش، هەرچـەندە ڕێگاکانیـان بـەهێز و زۆر نـین و ئەوانـەش کـە گێڕاویانەتەوە کەمن، بەڵام پێشەوایانی فـەرموودە، چەشـنی: ئیمـامی بەیهـەقی و حـاکم، موعجیزەیەکی تریان لە بارەی هەورەوە لە ئیمامی عومـەرەوە گێڕاوەتـەوە کـە پشـتی ئـەو موعجیزەیەی نموونەی هەشتەم دەگرێت، کە ئەویش هەر لە حەزرەتی عومەرەوە ڕیوایەت کرابوو.

ڕیوایـەتی ئـەو موعجیزەیـەی تـر کـە هـەر لـە حـەزرەتی عومــەرەوە دەیگێڕنـەوە، بـەم جۆرەیە:

"لە غەزایەکی پێغەمبەردا ﷺ خەڵککە تینوویـان بـوو، ئیمـامی عومـەریش داوای لـە پێغەمبـەر ﷺ کـرد دوعـا بکات، ئەویش دوعای کرد. ئنجا پەڵە هەورێك هـات و تێراوی کردن و پێویستیی نەهێشتن، پاشان لە بارانبارین کەوت"[(١)].

وەكبڵێی هەورەکە فەرمانی پێ درابوو تەنها سوپاکە تێراو بکات.

جا هـەروەك ئـەم ڕووداوە پشتی نموونـەی هەشـتەم دەگرێـت و بـەهێزی دەکـات و دەیکـات بـە ڕیوایـەتێکی قـەتعی و چەسپاو، هـەروەها (ئیبنوجـەوزی)ش کـە تـابڵێی لـە بەرامبـەر وەرگرتنی فـەرموودەوە توندوتیژیی نوانـدووە، تەنانـەت هــەندێ فـەرموودەی صەحیحیشی وەرنەگرتووە و بە "مەوضووع"ی لە قەڵەم داوە.. دەڵێت: ئـەو ڕووداوە لـە غەزای بەدردا بووە و، ئەم ئایەتەش لە بارەی ئەم ڕووداوەوە نازڵ بووە کە دەفەرموێ:

﴿وَيُنَــزِّلُ عليكم مِنَ السَّماءِ ماءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ﴾ (الأنفال: ١١).

جا مادەم ئەم ئایەتە لە بارەی ئەو موعجیزەیەوە نازڵ بوو‌بێت، ئەوا هیــچ گومـانێك لـە ڕوودانی‌دا نامێنێت.

زۆر جـار ڕووی داوە کـە بـە بۆنـەی پاڕانـەوەی پێغەمبـەرەوە ﷺ و پێــش ئـەوەی دەستەکانی لە پاڕانەوە داگرتبێت، باران باریوە. ئەمەش خۆی لە خۆی‌دا موعجیزەیـەکی

---

(١) رواه البيهقي والحاكم وصححه.

سەربەخۆیە. جاری وا بووە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر بۆ باران لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە، پێش ئەوەی دەستەکانی دابگرێت، باران باریوە. ئەمەش لە ڕێگایەکی موتەواتیرەوە چەسپاوە.

## ئاماژەی نۆهەم

یەکێك لە جۆرەکانی موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ بریتی‌یە لە گوێڕایەڵیی درەخت - بە وێنەی مرۆڤ - بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و جوولانیان لە جێی خۆیان و هاتنیان بۆ خزمەتی.

ئەم موعجیزەیەش کە پەیوەندیی بە درەختەوە هەیە، وەك موعجیزەی هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانیەوە، بە "تەواتوری مەعنەوی" لە قەڵەم دەدرێت و، بە چەند شێوەیەك ڕووی داوە و، لە چەند ڕێیەکی جیاجیاوە ڕیوایەت کراوە.

بەڵێ، دەتوانرێت بوترێ: هەواڵی هەڵکەندن و دەرچوونی درەخت لە جێی خۆیدا و هاتنی بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانی ئەو، "موتەواتیری صەریح"ە، چونکە لە ڕێی چەند هاوەڵێکی بەڕێز و ڕاستگۆ و ناسراوەوە ڕیوایەت کراون. وەك: "ئیمامی عەلی و ئیبن عەبباس و ئیبن مەسعوود و ئیبن عومەر و یەعلای کوڕی موڕڕە و جابیر و ئەنەسی کوڕی مالیك و بورەیدە و ئوسامەی کوڕی زەید و غەیلانی کوڕی سەلەمە" و هاوەڵانی جگە لەمانیش..

جا هەریەك لەم هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ بە چەشنێکی بێ گومان و چەسپاو هەواڵی ئەم موعجیزەیەی ڕاگەیاندووە کە پەیوەندیی بە درەختەوە هەیە. سەدان کەسیش لە پێشەوایانی "تابعین" بە چەند ڕێیەکی جیا جیا لەوانیان وەرگرتووە و، لە سەرەتای هەر ڕێگایەکیشدا ناوی یەکێك لە هاوەڵە گەورە و بەڕێزەکانی تێدایە. واتە: وەك ئەوە وایە بە تەواتوری چەندجارەکی پێمان گەیشتبێت. کەواتە هیچ شوبهە و گومانێك ئاوێتەی ئەم موعجیزەیە نابێت. چونکە لە حوکمی موتەواتیری مەعنەویی بێ گوماندایە.

جا هەرچەندە ئەم موعجیزەیە گەلێ جار دووپات بووەتەوە، بەڵام ئێمە چەند دانەیەك لە وێنە زۆر و صەحیحەکانی لە نێوان چەند نموونەیەکدا باس دەکەین:

○ **نموونەی یەکەم:**

ئیبن ماجە و دارەمی و بەیهەقی لە ئەنەسی کوڕی مالیك و ئیمامی عەلی‌یەوە و، بەززار و بەیهەقیش لە ئیمامی عومەرەوە - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە: سێ کەس لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ فەرموویانە:

پێغەمبەر ﷺ لەوەی کە کافران بەدرۆیان خستبووەوە زۆر خەفەتبار و دڵگران بوو. لەبەر ئەوە، لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی: "اللهمّ أرني آية لا أبالي من كذّبني بعدها"[1].

لە ڕیوایەتەکەی ئەنەسدا دەڵێت: حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - کە پێغەمبەری ﷺ بە خەفەتباری بینی، وتی: حەز دەکەیت نیشانەیەکت پیشان بدەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.. ئنجا پێغەمبەر ﷺ بۆ درەختێکی ڕوانی کە لە پشتی شیوەکەوە بوو، حەزرەتی جیبریل فەرمووی: ئەو درەختە بانگ بکە. کە بانگی کرد، درەختەکە کەوتەڕێ و هاتە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ. جیبریل فەرمووی: فەرمان بدە بچێتەوە شوێنی خۆی، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دا، گەڕایەوە بۆ جێی خۆی[2].

○ **نموونەی دووهەم:**

"قازی عەیاز"ی زانای هەرەگەورەی مەغریب، لە کتێبی (الشفا)دا بە سەنەدێکی بڵند و صەحیحەوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە:

"لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین ﷺ. پیاوێکی دەشتەکی لێی نزیك بووەوە. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "أين تريد"؟ واتە: بۆ کوێ دەڕۆیت؟ پیاوەکە وتی: بۆ لای خێزان و منالّم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هل لك إلى خير"؟ واتە: حەز دەکەی خێرێکت دەست بکەوێت؟ ئەویش وتی: کام خێر؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "تشهد أن لا إله إلاّ الله وحده لاشريك له وأن محمداً عبده ورسوله". واتە: شایەتمان بهێنیت کە تەنها خوای گەورە خوایە و هاوبەشی نی‌یە و، محەممەدیش بەندە و نێرراوی ئەوە. پیاوەکە وتی: جا ئایا کێ شایەتە لەسەر ئەوەی کە تۆ دەیلێیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هذه الشجرة

---

(١) واتە: خوایە! نیشانەیەکی وەهام پیشان بدە کە ئیتر گوێ بە هیچ کەسێك نەدەم بە درۆم بخاتەوە.

(٢) حديث حسن، رواه البزار وأبو يعلى والبيهقي.

السمرة". واتە: ئەو درەختی سەمورەیە[1]. درەختەکەش لە لێواری شیوەکەدا بوو. ئنجا درەختەکە ڕێگای بڕی و هاتە بەردەستی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەر ﷺ سێ جار داوای لێ کرد شایەتی بدات، درەختەکەش بەو جۆرەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، شایەتیی دا، ئنجا ڕۆشتەوە بۆ جێی خۆی[2].

لە ڕێی: "ئیبن صاحیبی ئەسەلەمی"یشەوە بە نەقڵێکی صەحیح لە "بورەیدە"وە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: دەشتەکی‌یەك داوای نیشانەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "قل لتلك الشجرة رسولُ الله ﷺ يدعوك". واتە: "بەو درەختە بڵێ: پێغەمبەری خوا بانگت دەکات". کە پێی وت، درەختەکە بە لای ڕاست و چەپ و بەردەم و پشتەوەی خۆیدا تەکانی دا و ڕەگەکانی قرتا و کەوتەڕێ و ڕەگەکانی بە دوای خۆیدا کێش کرد تا هاتە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا و وتی: "السلام عليك يا رسول الله". پیاوە دەشتەکی‌یەکە وتی: فەرمانی پێ بدە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. کە فەرمانی پێ دا، گەڕایەوە و، ڕەگەکانی شۆڕ کردنەوە بۆ ناو زەوی و، لە جێی خۆیدا ڕاوەستا و جێگیر بووەوە. ئنجا پیاوە دەشتەکی‌یەکە بە پێغەمبەری ﷺ وت: ڕوخسەتم بدە سوژدەت بۆ ببەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر فەرمانم بە سوژدەبردنی کەسێك بۆ کەسێکی تر بدایە، فەرمانم بە ژن دەدا سوژدە بۆ مێردەکەی ببات. دەشتەکی‌یەکە وتی: کەواتە ڕێم بدە هەردوو دەست و هەردوو قاچت ماچ بکەم. ئەویش ڕێی پێ دا[3].

❍ نموونەی سێهەم:

ئیمامی موسلیم و خاوەنی صەحیحەکانی تر لە جابیرەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ: لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین. پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت دەست بە ئاو بگەیەنێت، هیچی دەست نەکەوت تاکو خۆی پێ پەنا بدات و دەرنەکەوێت. لە لێواری شیوەکەشدا دوو درەخت هەبوون. پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ لای یەکێکیان و پەلێك لە پەلەکانی گرت و فەرمووی: "انقادي عليّ باذن الله". واتە: "بە

---

(١) سەمورە: درەختێکی دڕکاویی گەورەیە.

(٢) صحيح، رواه ابو يعلى بسند صحيح والبزار والطبراني وابن حبان في صحيحه.

(٣) أورده الهيثمي في المجمع (٩/١٠) وليس فيه ذكر السجود. وقال الخفاجي: رواه البزار مُسنداً. بروانە: نسيم الرياض في شرح الشفا للقاضي عياض" ٣/٤٩.

ئیزن و فەرمانی خـوا جڵـەوت بـدەرە دەسـتم و شـوێنم بکـەوە". درەختەکـەش وەکـو ئـەو حوشـترە لـەغاوکراوەی کـە شـوێن جڵەوبەدەستەکەی دەکـەوێت ئـاوا شـوێنی کـەوت. جابیر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وای لـە درەختەکـەی تریـش کـرد تـا هـەردووکیانی لـە ناوەڕاستی ماوەی نێوانیاندا ڕاگرت، ئنجا پێی فەرموون: "التئما عليّ باذن الله". واتە: "بە ئیزن و فەرمانی خوا یەکبگرن بۆم". ئەوانیش یەکیان گرت[1] و پێغەمبەر ﷺ لە پشتیانەوە دانیشت. ئنجا کە هەڵسا، فەرمانی پێ دان هەریەکەیان بڕواتەوە بۆ جێی خۆی.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ بە جابیری فەرموو: "یاجـــابر! قـــل لهـــذه الشجرة: يقول لك رسول الله إلحقي بصاحبتك حتى أجلس خلفكمـــا". واتـە: "جابیر! بـەو درەختـە بڵـێ: پێغەمبـەری خـوا پێـت دەڵێـت بـڕۆ بـۆ لای هاوەڵەکـەت تـا لـــە پشـتتانەوە دابنیشم". کە جابیر ئەمەی پێ وت، درەختەکـە ڕۆشـتە تەنیشـتی ئـەوی تـرەوە و پێغەمبـەر ﷺ لە پشتیانەوە دانیشت. جابیر دەفەرموێ: ئیتر مـن بـە ڕاکـردن گـەڕامـەوە و دانیشـتم و لەبەر خۆمەوە بۆ خۆم دەدوام، کە ئـاوڕم دایـەوە پێغەمبـەر ﷺ بـەرەو ڕووم دەگـەڕایـەوە و دوو درەختـەکـەش لـــە یـەك جیـا بوونـەوە و لەسـەر پێ ڕاوەسـتان، ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ ڕاوەستا و بەسەر ئاماژەی بۆ لای ڕاست و چەپ بۆ کردن"[2].

○ **نموونەی چوارەم:**

ئوسامەی کـوڕی زەیـد - خـوای لـێ ڕازی بێـت - کـە خزمـەتگوزارێکی ئـەمینی پێغەمبەرە ﷺ و یەکێکە لە فەرماندە سوپاییەکانی، دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ:

"لـە سـەفەرێك لەگـەڵ پێغەمبـەردا بووین ﷺ، جێگایـەکی وا چۆڵیـش نـەبوو کـە لـــە کەسەوە دیار نەبێت و بۆ ئەوە دەست بدات بکرێت بـە شـوێنی دەسـت بـە ئـاو گـەیاندن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "هل ترى من نخل أو حجارة"؟ واتـە: "هیـچ دارخورمـا و بـەردێك دەبینیت"؟ وتم: بەڵێ چەند دارخورمایەك دەبینم لە یەکەوە نزیکن. فەرمووی: "انطلـــــق وقل لهن: إن رسول الله ﷺ يأمركن أن تأتين لمخرج رسول الله وقل للحجارة مثل ذلـــــك". واتە: "بڕۆ پێیان بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێ دەدات کە بڕۆن بۆ ئـەو جێگایـەی

(١) صحيح، رواه مسلم في حديث طويل.
(٢) الشفا ٢٩٩/١، نسيم الرياض ٥١/٣.

دەستی تێدا بە ئاو دەگەیەنێت، بە بەردەکانیش هەروەها بڵێ". منیش ئەوەم پێ وتن. بەو خوایەی پێغەمبەری ﷺ بە حەق ڕەوانە کردووە، بە چاوی خۆم بینیم کە دارخورماکان لە یەکتر نزیك بوونەوە هەتا کۆبوونەوە و، بەردەکانیش یەك لەسەر یەك کەڵەکە بوون لە پشتی دارخورماکانەوە. کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە، فەرمووی: "قل لهن يفترقن". واتە: "پێیان بڵێ: لە یەك جیا ببنەوە". بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە، بە چاوی خۆم دەمبینی درەخت و بەردەکان بڵاوەیان کرد و هەریەکەیان ڕۆشتەوە بۆ جێی خۆی"[١].

ئەم دوو ڕووداوەی کە جابیر و ئوسامە گێڕایانەوە، یەعلای کوڕی موڕڕە و غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی و ئیبن مەسعوودیش لە باسی غەزای حونەیندا گێڕاویانەتەوە.

**○ نموونەی پێنجەم:**

ئیمامی ئیبن فەورەك(ابن فورك) کە زانای هەرەگەورەی چەرخی خۆی بووە و، لەبەر ئەوەی کە خاوەنی فەزڵی زۆر و ئیجتیهادی تەواو بووە بە "شافیعیی دووهەم" ناویان بردووە[٢]. ئەم ئیمامە مەزنە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ:

"لە شەوێك لە شەوەکانی غەزای تائیفدا، پێغەمبەر ﷺ بە وەنەوزەوە بە ڕێگادا دەڕۆشت، درەختێك هاتە ڕێی. یەکسەر درەختەکە دوو کەرت بوو، پێغەمبەریش ﷺ لە نێوانیانەوە تێپەڕی و، تا ئێستاش ئەم درەختە هەر بە دوولەتی ماوەتەوە"[٣].

**○ نموونەی شەشەم:**

یەعلای کوڕی سەییابە دەگێڕێتەوە کە: "جارێکیان، درەختی "تەلح" یان "سەمورە" بوو، هات و یەك جار بە دەوری پێغەمبەردا ﷺ گەڕا و پاشان ڕۆشتەوە بۆ جێگاکەی خۆی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "إنـها استأذنت أن تُسلّم عليّ". واتە: ئەم درەختە ڕوخسەتی وەرگرت بێت سڵاوم لێ بکات"[٤].

---

(١) حديث حسن، رواه أحمد باسنادين والطبراني بنحوه. وأحد إسنادي أحمد رجاله رجال الصحيح.

(٢) "ابن فورك": ناوی ئەبوبەکر محەممەدی کوڕی حەسەنی کوڕی فەورەکی ئەنصاریيە و، لە ساڵی (٤٠٦ك) لە نیسابوور کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە گەورە زانایانی زانستەکانی ئوصوول و کەلام و فیقهی شافیعی. لە بەصرە خوێندوویەتی و لە نیسابووریش قوتابخانەی دامەزراندووە و وانەکانی تێدا وتووەتەوە. "ئیبن عەساکر" لە بارەیەوە دەڵێت: ئەم زانایە نزیکی سەد کتێبی لە واتاکانی قورئان و ئوصوولی دین و ئوصوولی فیقهدا داناوە. بڕوانە: الأعلام للزركلي ٨٣/٦.

(٣) الشفا ٣٠١/١، نسيم الرياض ٥٧/٣.

(٤) صحيح رواه أحمد والبيهقي والطبراني.

❍ **نموونەی حەوتەم:**

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئیبن مەسعوودەوە دەگێڕنەوە، دەفەرموێ: "ئەو شەوەی کە جنۆکەکان هاتن گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ ڕاگرت، درەختێك هەواڵی بە پێغەمبەر ﷺ دا کە جنۆکەکان دەیانەوێت بێنە خزمەتت. ئەمەش لەو شەوەدا بوو کە جنۆکەکانی "نوصەیبین" لە "بطن النخل"دا[1] هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ تاکو موسڵمان بن. جا درەختێك بوو هات هەواڵی هاتنی ئەو جنۆکانەی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند. موجاهید لە ئیبن مەسعوودەوە، لە بارەی ئەم فەرموودەیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جنۆکەکان عەرزی پێغەمبەریان ﷺ کرد: کێ شایەتیت بۆ دەدات؟ (واتە لەسەر پێغەمبەرێتی) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەم درەختە". ئنجا بە درەختەکەی فەرموو: "درەختەکە وەرە"! ئەویش ڕەگەکانی لەگەڵ خۆیدا کێش کرد و، دەنگە دەنگێکی وەك دەنگی "چەك"ی لێ دەهات و، هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ"[2].

بەم جۆرە (بۆمان دەرکەوت کە) تەنها یەك موعجیزە سەروزیادی کۆمەڵی "جینی" بوو تاکو ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بهێنن. جا ئایا ئەو کەسەی کە هەزار موعجیزەی وەك ئەمانە دەبیستێ و پاشان هەر لە دۆخی ملنەدان و سەرسەختیدا دەمێنێتەوە و سەرپێچی دەکات و ئیمان ناهێنێت، ئایا لەو شەیتانە سەر لێ شێواوتر نییە کە قورئان لەسەر زمانی جنۆکەکانەوە لە بارەیەوە دەفەرموێ:

﴿يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى اللهِ شَطَطًا﴾؟ (الجن:٤)[3].

❍ **نموونەی هەشتەم:**

ئیمامی تیرمیذی لە "ئیبن عەبباس"ەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی دەشتەکیی وت: "أرأيتَ إن دعوتُ هذا العذق من هذه النخلة أتشهد أني رسول الله"؟ واتە: "ئەگەر بەو هێشووە خورمایە بڵێم: وەرە و

---

(١) ناوی جێگایەکە ڕۆژە ڕێیەك لە مەککەوە دوورە.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

(٣) واتە: (هەرزەی ئێمە درۆی ناڵەباری لە بارەی خواوە هەڵدەبەست). بڕوانە تەفسیری خاڵ جزمی بیست و نۆهەم - ل ١٦٨.

ئەویش بێت، ئایا شایەتمان دەهێنیت كە من پێغەمبەری خـوام"؟ وتـی: بـەڵێ. پێغەمبـەر ﷺ بـانگی كـرد. هێشـووەكەش بـە تـەكاندان هاتـە خزمـەتی. ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: "بگەڕێرەوە". ئەویش گەڕایەوە جێی خۆی"[1].

* * *

بەم جـۆرە، بۆمـان دەركـەوت كـە چـەندین نموونـەی زۆر هـەن، وەك ئەوانـەی باسمـان كردن، هەموویان لە چەند ڕێیـەكی جیاجیـاوە ڕیوایـەت كـراون. دەشـزانین كـە ئەگـەر چـەند تاڵـە دەزوویـەكی بـاریك یـەك بگـرن، پـەتێكی ئەسـتوور پێكدەهێنـن. جـا ئـەم موعجیزەیـە و هاوچەشنی كـە پـەیوەندییان بـە درەختـەوە هەیـە و، لـە چـەند ڕێیـەكی جیاجیا و، لە هاوەڵە بەناوبانگە بەڕێزەكانەوە ڕیوایەت كراون، دەبێ لـە هێزی تـەواتوری مەعنـەویدا بـن. بـەڵكو لـە ڕاستیدا موتـەواتیری ڕاستەقینەن. چونكـە بێ گومـان كاتـێ گەیشتوونەتە دەستی "تابیعین" بوون بە "موتەواتیر" بە تایبەت ئـەو ڕێگایانـەی كـە خـاوەنی صەحیحەكانی وەك: "بوخاری و موسلیم و ئیبن حیببان و تیرمیذی" و غەیری ئەمانیش بۆ وەرگرتنی فەرموودە گرتوویانەتەبەر، چەند ڕێگایەكی صەحیحن و هیچ گومانێكیان تێدا نییە. تەنانەت بینینی هەر فەرموودەیەك لە بوخاریدا، وەك ئـەوە وایـە كـە ڕاستەوخۆ لـە هاوەڵەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ ببیسترێت.

لە كاتێكدا كە درەختەكان – وەك نموونـەكانی پێشـوو بۆیـان دەرخسـتین – پێغەمبـەر ﷺ بناسن و، بە غەیری خۆیانی بناسێنن و، پێغەمبەرێتییەكەی بسـەلمێنن و، سـڵاوی لـێ بكەن و، بێن بۆ زیارەت و خزمەتی و، گوێڕایەڵی فەرمانەكانی بن..

لە كاتێكدا درەختەكان ئاوا بن، ئیتر چۆن ئەو بێ گیانەی كە خۆی ناوناوە "مرۆڤ"، نایناسێت و باوەڕی پێ ناهێنێت؟

ئایا ئـەو كەسە لـە "دڵ" و "ژیری" بێ بەش نییە؟ ئایا لـەو درەختە وشـك و تەختە ڕەقانەی كە تەنها شایستەی سووتاندنن، بێ بایەختر نییە؟!

---

(١) صحيح: رواه الترمذي وغيره.

## ئاماژەی دەهەم

ئەو شتەی کە پشتی ئەم موعجیزانەی لەمەڕ درەخت دەگرێت، موعجیزەی "حنين الجذع" واتە: "تاسە و بێتاقەتیی بنەدارەکە"یە، کە بە چەشنێکی "موتەواتیر" پێمان گەیشتووە.

بەڵێ، بێتاقەتیی ئەو بنەدارە وشکەی کە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا بوو ﷺ لەتاو ئەو جیابوونەوە کاتییەی لە پێغەمبەر ﷺ.. هەروەها ناڵە و گریانی لە بەردەم کۆمەڵێکی زۆری هاوەڵە بەڕێزەکاندا، پشتی ئەو موعجیزانە دەگرێت کە سەبارەت بە درەخت باسمان کردن. چونکە ئەو بنەدارە لە ڕەگەزی درەختە و ڕەگەزیان یەکێکە. ئەوەندە هەیە کە خودی ئەم موعجیزەیە بە "تەواتور" چەسپاوە، بەڵام بەشەکانی تر جۆرە تەواتورێکیان تێدایە کە ناگەنە تەواتوری تەواو، چونکە زۆربەی جوزئییات و نموونەکانی ناگەنە ئاستی تەواتوری صەریح.

(موعجیزەکەش بەم جۆرەیە):

مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا لەسەر چەند بنەدارێکی وشکی دارخورما سەری گیرابوو. جا هەرکات پێغەمبەر ﷺ بیویستایە وتاریان بۆ بدات، پاڵی بە یەکێك لەو بنەدارانەوە دەدا. بەڵام کاتێ کە دوانگە(منبر)یان بۆ دروست کرد و وتاری لەسەر خوێندەوە، دەنگێکی وەك دەنگی حوشتری ئاوس لەو بنەدارە بیسترا کە دەیناڵاند و دەگریا! لەم گریانەشیدا بەردەوام بوو هەتا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هات و دەستی خستە سەری و قسەی لەگەڵ کرد و دڵی دایەوە، ئنجا بنەدارەکە بێدەنگ بوو.

ئەم موعجیزەیە، لە چەند ڕێیەکی جیاجیای گەلێ زۆر و بە "تەواتور" پێمان گەیشتووە و بۆمان نەقڵ کراوە.

بەڵێ، موعجیزەی تاسە و بێتاقەتیی ئەم بنەدارە مەشهوور و بڵاوە و، هەواڵێکە بە "تەواتوری صەریح"[1] پێمان گەیشتووە. چونکە سەدان کەس لە پێشەوایانی "تابیعین" لە پازدە ڕێگاوە، لە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە گێڕاویانەتەوە و، پاشان ئەوانیش بە بەرەی دوای خۆیان گەیاندووە. هەندێ لەو هاوەڵانەی گێڕاویانەتەوە ئەمانەن:

(ئەنەسی کوڕی مالیك - کە خزمەتگوزاری پێغەمبەر ﷺ بووە - جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، سەهلی

---

(١) بڕوانە: النظم المتناثر في الحديث المتواتر، الإدريسي الكتاني ص ١٣٤- ١٣٥.

كوڕی سەعد، ئەبوو سەعیدی خودری، ئوبەیی كوڕی كەعب، بورەیدە، ئوم سەلەمەی دایكی ئیمانداران، خوایان لێ ڕازی بێت). هەر یەك لەم هاوەڵە بەڕێزانە لە سەرەتای یەكێك لەو ڕیوایەتانەی ئەم فەرموودەیەوە ناویان هاتووە.

ئیمامی بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش لە خاوەنی كتێبە صەحیحەكانی فەرموودە، ئەم موعجیزە گەورە موتەواتیرەیان ڕیوایەت كردووە.

جابیر – خوای لێ ڕازی بێت – دەفەرموێ: "كاتێ پێغەمبەر ﷺ وتاری بخوێندایەتەوە پاڵی بە یەكێك لەو بنەدارانەوە دەدا كە بنمیچی مزگەوتەكەیان لەسەر دانرابوو. كاتێ كە دوانگەكەیان بۆ دروست كرد و پێغەمبەر ﷺ بۆ وتار خوێندنەوە ڕۆشتە سەری، دەنگێكی وەك دەنگی حوشتری ئاوسمان لەو بنەدارە بیست، هەتا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هات و دەستی لەسەر دانا، ئنجا بێدەنگ بوو"[١]. نەیتوانی لە پێغەمبەر ﷺ جیا ببێتەوە.

ئەنەس دەفەرموێ: "بە ڕادەیەكی وابوو كە مزگەوتەكە لەبەر ناڵەناڵی ئەو بنەدارە، كەوتە لەرینەوە"[٢].

سەهلی كوڕی سەعدیش دەفەرموێ: "خەڵكەكەش كە ئەم گریان و بێتاقەتی‌یەی بنەدارەكەیان دی و بیست، زۆر گریان"[٣].

ئوبەیی كوڕی كەعبیش دەفەرموێ: "ئەوەندە گریا تا لەت و پەت بوو"[٤].

یەكێكی تری غەیری ئەمان شتێكی زیاتر دەگێڕێتەوە، دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "إن هذا بكى لما فقد من الذكر"[٥].

یەكێكی تر لەمەش زیاتر دەگێڕێتەوە، دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "والذي نفسي بيده لو لم ألتزمه لم يزل هكذا الى يوم القيامة"[٦]. واتە لە خەفەتی پێغەمبەردا ﷺ.

حەدیثەكەی بورەیدە، دەڵێت: كاتێ بنەدارەكە گریا، پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی لەسەر دانا و فەرمووی: "إن شئتِ أردّك إلى الحائط الذي كنتِ فيه، ينبت لك عروقك ويكمل خلقك ويجدد لك خوص وثمرة. وإن شئت أغرسك في الجنة فيأكل اولياء الله من

(١) صحيح، رواه البخاري والترمذي وابن ماجه وأحمد والدارمي.

(٢) أخرجه الضياء في المختارة ٤/٣٥٧ ورواه أحمد والدارمي.

(٣) أخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى: (١/٢٥٠). وقد عزا الخفاجي (٣/٦٢) روايته إلى الشيخين.

(٤) صحيح، رواه ابن ماجه والضياء في المختارة ٣/٣٩٣ والشافعي وأحمد والدارمي.

(٥) صحيح، رواه البخاري وأحمد وابن أبي شيبة. واتە: ئەمە لەبەر ئەو زیكرە گریا كە لە دەستی چوو.

(٦) رواه الدارمي عن أنس بن مالك، وفي رواية ابن عباس: (فأتاه فاحتضنه فسكن، قال: ولو لم أحتضنه لحن إلى يوم القيامة). قال العلامة أحمد شاكر في تحقيق المسند: إسناده صحيح. واتە: بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە ئەگەر باوەشم پێدا نەكردایە و دڵم نەدایەتەوە تا ڕۆژی قیامەت ئاوا دەگریا.

ثمرك"[١]. ئنجا پێغەمبەر ﷺ گوێی بۆ ڕاگرت تاكو بزانێ چی دەڵێت. ئەویش لە وەڵامدا وتی: "بل تغرسني في الجنة فيأكل مني أولياء الله وأكون في مكان لا أُبلى فيـــه"[٢]. هەموو ئەوانەی کە لێی نزیك بوون گوێیان لەم وەڵامە بوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "قـد فعلت"[٣]. پاشان فەرمووی: "إختار دار البقاء على دار الفناء"[٤].

ئیمام ئەبوو ئیسحاقی ئیسفرایینی، کە یەکێکە لە پێشەوایانی "زانستی کەلام"، فەرموویەتی:

پێغەمبەر ﷺ خۆی نەڕۆشتووە بۆ لای بنەدارەکە، بەڵکو بانگی کرد. ئەویش ڕێگای بڕی و هاتە خزمەتی و، پێغەمبەر ﷺ باوەشی پێدا کرد. ئنجا فەرمانی پێ دا بگەڕێتەوە بۆ جێگای خۆی، ئەویش گەڕایەوە[٥].

ئوبەیی کوڕی کەعب دەفەرموێ: "دوای دەرکەوتنی ئەم موعجیزەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا لە ژێر دوانگە(منبر)کەدا ناشتیان". جا هەرکات پێغەمبەر ﷺ نوێژی بکردایە، ئەو جێگایەی بنەدارەکەی تێدا نێژرابوو، دەکەوتە بەردەمیەوە. کاتێك مزگەوتەکەیان ڕووخاند بۆ ئەوەی تازەی بکەنەوە، ئوبەی ئەو بنەدارەی بردە لای خۆی و تا زەوی خواردی و هەڵپرتووکا، لای ئەو مایەوە[٦].

لەو کاتەدا کە "حەسەنی بەصری" - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - ئەمەی بۆ قوتابییەکانی دەگێڕایەوە، دەگریا و دەیفەرموو: "ئەی بەندەکانی خوا! تەختەدار لە تاسەی پێغەمبەردا ﷺ تاقەتی دەچێت و بۆی دەگری.. بەڵام خۆ ئێوە زیاتر شیاوی ئەوەن تامەزرۆی دیدار و بەخزمەت گەیشتنی بن"[٧]!

---

(١) واتە: ئەگەر دەتەوێ دەتنێژمەوە بۆ ئەو باخەی تیایدا بوویت، بە چەشنێ کە ڕەگەکانت بڕوێنەوە و بە تەواوی دروست بکرێنەوە و لق و پەل و بەرەکەشت نوێ بینەوە. ئەگەر دەشتەوێ لە بەهەشتدا دەتنێژم، تاکو ئەولیاکانی خوا لە بەروبوومت بخۆن.

(٢) واتە: بەڵکو دەمەوێ لە بەهەشتدا بمنێژیت، تاکو ئەولیاکانی خوا لە بەروبوومم بخۆن و لە جێگایەکدا بم هەرگیز دانەرزێم.

(٣) واتە: وا جێبەجێم کرد.

(٤) رواه ابن ماجه والشافعي وأحـــمد والدارمي. بڕوانە: الفتح الرباني، أحـــمد عبدالرحمن البنـــا ٤٩/٢٢
واتە: خانەی هەمیشەیی بەسەر خانەی فانیی دنیادا هەڵبژارد.

(٥) الشفا ٣٠٤/١.

(٦) الشفا ٣٠٤/١ رواه عبدالله بن الإمام أحـــمد في زوائده.

(٧) رواه ابن حبان٤٦٧/١٤ برقم (٦٥٠٧) تحقيق شعيب الأرناؤوط. هەروەها بڕوانە: الشفا ٣٠٥/١.

ئێمەش دەڵێین: بەڵێ! تاقەت چوون بۆ پێغەمبەر ﷺ و خۆشویستنی، تەنها بە شوێنکەوتنی سوننەتی بەرز و شەریعەتی پیرۆزی ئەو دەبێت.

***سەرنجێکی گرنگ:***

ئەگەر پرسیار بکرێت و بوترێ: ئایا بۆچی ئەو موعجیزانەی کە پەیوەندییان بە بەرەکەتی خواردنەوە هەیە، وەك ئەوەی کە لە غەزای خەندەقدا هەزار کەس لە چوار مشت خواردەمەنی تێریان خوارد.. هەروەها ئەو موعجیزانەش پەیوەندییان بەو ئاوەوە هەیە کە لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵقوڵا و هەزار کەسی لێ تێراو بوون.. ئەگەر بوترێ: بۆچی ئەم موعجیزانە وەك موعجیزەی "بێتاقەتیی بنەدارەکە" لە چەند ڕێیەکی زۆرەوە نەقڵ نەکراون، لە کاتێکدا کۆمەڵی ئەو هاوەڵانەی کە ئەو موعجیزانە لە بەرچاویاندا ڕووی داوە، زۆر زیاتر بوون لەو کۆمەڵەی کە موعجیزەی بنەدارەکەیان دیوە؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

ئەو موعجیزانەی کە لە سەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ دەرکەوتوون، دوو بەشن:

بەشێکیان ئەوەیە کە بۆ "تەسدیقی دەعوای پێغەمبەرێتی" لەسەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەون و دەبن بە بەڵگەی پێغەمبەرێتی. ئەم بەشەیان دەبێت بەهۆی زیادبوونی باوەڕی باوەڕداران و، پاڵ بە ئەهلی نیفاقیشەوە دەنێت کە بەرەو ئیمان و ئیخلاس بڕۆن و، داوا لە کافرانیش دەکات باوەڕ بهێنن. جا موعجیزەی بنەدارەکە لەم بەشەیانە، هەر لەبەر ئەوەشە کە چ عەوام و چ تایبەتمەندان دیویانە و، لە موعجیزەکانی تر زیاتر بایەخ بە بڵاوکردنەوەی دراوە.

بەڵام موعجیزاتی "بەرەکەتی خواردن و ئاو" زیاتر ڕێزلێنان(کەرامەت)ن تا ئەوەی موعجیزە بن. بەڵکو زیاتر ڕێزلێنانێکی خواین تا ئەوەی کەرامەت و ڕێزی ئاسایی بن. تەنانەت ئەم موعجیزەیە لەوەش زیاترە، چونکە میواندارییەکی میهرەبانیی خواوەندە و بەپێی پێویست ڕووی داوە.

جا هەرچەند ئەم دوو موعجیزەیە (واتە بەرەکەتی خواردن و ئاو) دەبن بە موعجیزە و بەڵگەی پێغەمبەرێتی، بەڵام مەبەستی سەرەکی تیایاندا بریتییە لەوەی کە ئەو سوپایەی نزیکەی هەزار کەس دەبوون، زۆر پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە دەبوو، خواوەندیش لە گەنجینەی غەیبەوە یارمەتیی بۆ دەناردن و، هەروەك لە یەك دەنکە خورما هەزار "ڕەتڵ"[(١)] خورما دروست دەکات، هەر بەو جۆرە لە یەك "صاع" خواردەمەنی

---

(١) ڕەتڵ وریتل: بریتییە لە ٢٥٦٤ گم.

هەزار کەسی تێر کرد. هەر بەو جۆرەش نزیکەی هەزار کەسی لەوانەی کە لە پێناوی خوادا جیهادیان کردووە، بە ئاوێکی پیرۆزی وەك کەوسەر تێراو کردووە کە لە نێوان پەنجەکانی پێشەوا هەرەمەزنەکەیانەوە هەڵیقوڵاند. لەبەر ئەمە، پلەی نموونەکانی موعجیزەی "خواردەمەنی و ئاوەکان" نەگەیشتوونەتە ئاستی پلەی موعجیزەی "بنەدارەکە". بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی هەمەکی سەیری ئەو دوو موعجیزەیە بکەین، ئەوا ڕەگەزی ئەوانیش - وەك ئەم - موتەواتیر دەردەچن.

لە لایەکی تریشەوە: هەموو کەسێك بەرەکەتی خواردن و تەقینەوەی کانیاو لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ بە چاو نابینێت، بەڵکو تەنها ئاسەوارەکانی ئەو موعجیزانە دەبینێت. بەڵام هەموو ئەوانەی کە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا بوون ﷺ، گوێیان لە گریانی ئەو بنەدارەوە بوو. بۆیە ئەم موعجیزەیە زیاتر بڵاو بووەتەوە.

**ئەگەر بوترێ:**

هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ گەلێ بایەخیان بە ڕەچاوکردنی هەموو هەڵسوکەوت و حاڵەتێکی پێغەمبەر ﷺ داوە، پاشان بەوپەڕی گوێ پێدان و ئەمانەتەوە نەقڵیان کردوون و بە ئێمەیان گەیاندوون.. جا ئایا بۆچی ئەم موعجیزە گەورەیە و هاوچەشنی ئەمە، تەنها لە بیست ڕێگاوە ڕیوایەت کراون و بە لای کەمەوە لە سەد ڕێگاوە نەقڵ و ڕیوایەت نەکراون؟ پاشان بۆچی زۆربەی ڕیوایەتەکان لە ڕێی: جابیر و ئەنەس و ئەبوو هورەیرەوەن و، لە ڕێی ئەبووبەکر و عومەرەوە نین، چەند ڕیوایەتێکی کەم نەبێت؟

**وەڵام:**

وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکەت، لە بنچینەی سێهەمی ئاماژەی چوارەمدا، ڕابورد. سەر لەوێ بدە بۆ وەڵامەکەی.

وەڵامی بەشی دووهەمیش بریتییە لەوەی کە:

هەروەك مرۆڤ کاتێ پێویستی بە دەرمان دەبێت دەچێت بۆ لای "پزیشك" و.. هەر کاتیش پێویستی بە خانوو کردنەوە بوو، دەڕوات بۆ لای "ئەندازیار" و.. هەر کاتێکیش پێویستی بە فێربوونی لایەنێکی شەریعەت بوو، ئەوا بۆ پرسیارکردن سەردانی "موفتی" دەکات..

هەر بەم جۆرەش، ئەرکی سەرشانی هەندێ لە زانایانی ناو هاوەڵەکان لەوەدا بووە

كە فەرموودەكان هەڵبگرن و بیانگەیەنن بە سەردەمەكانی دوای خۆیان. جا ئەو هاوەڵانە بەوپەڕی ئەو هێزەی كە خوای گەورە پێی بەخشیبوون، بۆ ئەم مەبەستە تێ‌دەكۆشان..

زانایەكی وەك ئەبوو هورەیرە - خوای لێ ڕازی بێت - هەموو ژیانی خۆی بۆ پاراستنی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ تەرخان كردبوو. لەو كاتەدا كە ئیمامی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - سەرگەرمی هەڵگرتنی ئەركی جێنشینی و سیاسەتی دەوڵەت بوو. لەبەر ئەوە، یەكێكی وەك ئیمامی عومەر لە ڕاگەیاندن و نەقڵ كردنی فەرموودەكانی پێغەمبەردا ﷺ پشتی بەو هاوەڵانەی وەك ئەنەس و جابیر و ئەبوو هورەیرە دەبەست، بۆیە ڕیوایەتی كەمی هەیە. ئەمە لە لایەكەوە.. لە لایەكی تریشەوە: ئەگەر كەسێك خۆی لە خۆی‌دا ڕاستگۆ بێت و شتێك بگێڕێتەوە كە ڕاستگۆیانی تر تەسدیقی بكەن، ئەوا تەنها ڕیوایەتەكەی ئەو سەروزیادە و پێویست ناكات هاوەڵانی تریش ڕیوایەتی بكەن. هەر لەبەر ئەوەشە كە هەندێ ڕووداوی گرنگ هەن تەنها لە دوو ڕێگا یان سیانەوە ڕیوایەت كراون.

## ئاماژەی یازدەهەم

هەروەك ئاماژەی دەهەم پەنجەی بۆ موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە "درەخت" ڕاكێشا، ئەم ئاماژەیەش موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە بێ گیانەكانی وەك: "بەرد" و "چیاكان" دەردەخات. جا لە نێوان نموونە زۆرەكانی ئەم موعجیزەیەدا، هەشت نموونە باس دەكەین.

**نموونەی یەكەم:**

* ئیمامی بوخاری و قازی عەیازی كەڵەزانای مەغریب لە "ئیبن مەسعوود"ی خزمەتگوزاری پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: "ئێمە گوێمان لە تەسبیحات كردنی خواردن دەبوو لە كاتێكدا كە دەخورا"[1]. واتە: كاتێ كە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بۆ خواردن دادەنیشتین.

**نموونەی دووهەم:**

* هەروەها لە ئەنەس و ئەبووزەڕەوە چەسپاوە، كە ئەنەس - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ دەستی لە بەردە وردە پڕ كرد و ئەم بەردانەش لەناو دەستی‌دا تەسبیحاتیان دەكرد بە جۆرێ كە ئێمە گوێمان لەو تەسبیحاتانە بوو. پاشان كردنیە

---

(١) صحيح، رواه البخاري والترمذي.

دەستی ئەبووبەکرەوە – خوای لـێ ڕازی بێت – لە دەستی ئەویشدا تەسبیحاتیان کرد.. پاشان کردنیە دەستی ئێمەوە، نەیان کرد"[١].

* ئەبووذەڕیش – خوای لـێ ڕازی بێت – هەر بەو جۆرە دەگێڕێتەوە و، ئەوەش دەفەرموێ: پاشان (واتە پاش ئەبووبەکر) کردنیە دەستی عومەرەوە – خوای لـێ ڕازی بێت – لە دەستی ئەویشدا تەسبیحاتیان کرد. ئنجا لەسەر زەوی دانیان، بێدەنگ بوون. پاشان کردنیە دەستی عوسمانەوە لە دەستی ئەویشدا تەسبیحاتیان کرد. پاشان کردنیە دەستی ئێمەوە، بێدەنگ بوون[٢].

**نموونەی سێهەم:**

* بە گێڕانەوەی "صەحیح" چەسپاوە، کە ئیمامی عەلی و جابیر و عائیشە فەرموویانە: پێغەمبەر ﷺ بە لای هەر چیا و بەردێکدا تەشریفی بڕۆشتایە، یەکسەر ئەو چیایە یان ئەو بەردە دەیوت: "السلام علیك یارسول الله"! لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی عەلیدا – خوای لـێ ڕازی بێت – دەفەرموێ: "لە مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ، تەشریفی برد بۆ هەندێ شوێنی دەوروبەری مەککە، هەرچی چیا و درەخت لەو ناوەدا بوون هەموویان وتیان: "السلام علیك یارسول الله"[٣].

* ڕیوایەتەکەی جابیریش دەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ بە لای هەر بەرد و درەختێکدا تەشریفی بڕۆشتایە، ئەو بەردە، یان ئەو درەختە، سوژدەی بۆ دەبرد"[٤]. واتە: هەریەکەیان ملکەچ دەبوو بۆی و دەیوت: "السلام علیك یارسول الله".

* لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە جابیری کوڕی سەمورەوە – خوای لـێ ڕازی بێت – دەیگێڕنەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "إني لأعرف حجراً بمكة كان يسلّم عليّ"[٥]. ئەمەش لە پێش پێغەمبەرێتیدا. دەڵێن: ئەمە ئاماژەیە بۆ "الحجر الأسود".

* حەزرەتی عائیشەش – خوای لـێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ

---

(١) رواه الطبراني والبزار عن أنس. وذكر العراقي أنه ضعيف. بروانە: الشفا ١/٣٠٦.

(٢) الشفا ١/٣٠٦. حەدیثی تەسبیحات کردنی بەرد لە زۆر ڕێگاوە ڕیوایەت کراوە و پشتی یەکتری دەگرن و ئیسنادی هەندێکیان "صەحیح"ە.

(٣) رواه الترمذي والدارمي والطبراني والحاكم والبيهقي.

(٤) رواه البيهقي. بروانە: الشفا ١/٣٠٧.

(٥) صحيح، رواه مسلم والترمذي وأحمد. واتە: بەردێك لە مەککەدا دەناسمەوە کە لە پێش پێغەمبەرێتیدا سەلامی لـێ دەکردم.

فه‌رموویه‌تی: "لما استقبلني جبريل بالرسالة، جعلتُ لا أمرُّ بحجر ولا شجر إلاّ قال: السـلام عليك يارسول الله"[١].

**نموونه‌ی چواره‌م:**

❊ له‌ حه‌دیثی "عه‌بباس"دا ده‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ حه‌زره‌تی عه‌بباسی مامی و هه‌ر چوار كوڕه‌كه‌ی: (عه‌بدوڵلا و عوبه‌یدیللا و فه‌ضل و قه‌ثم)ی كۆكردووه‌ و به‌ "چارۆكه‌"یه‌ك له‌گه‌ڵ خۆیدا داپۆشین و، دوعای بۆ كردن كه‌ خوا له‌ ئاگری دۆزه‌خ بیانپارێزێت و فه‌رمووی: "يارب هذا عمي صنو أبي وهؤلاء بنوه فاسترهم من النار كستري إياهم بملاءتي"[٢]. كه‌ ئه‌م دوعایه‌ی بۆ كردن، هه‌موو دیواره‌كان و چوارچێوه‌ و لاشیپانی ده‌رگاكه‌ش وتیان: "ئامین.. ئامین". به‌م جۆره‌ ئه‌وانیش له‌و دوعایه‌دا به‌شداری‌یان كرد.

**نموونه‌ی پێنجه‌م:**

❊ كتێبه‌ صه‌حیحه‌كانی فه‌رمووده‌، له‌ پێش هه‌موویانه‌وه‌: بوخاری و ئیبن حیببان و ئه‌بوداوود و تیرمیذی، هه‌موویان له‌ ئه‌نه‌س[٣] و ئه‌بوو هوره‌یره‌[٤] و ئیمامی عوسمان[٥] و سه‌عیدی كوڕی زه‌یده‌وه‌[٦] (كه‌ یه‌كێكه‌ له‌و ده‌ كه‌سه‌ی مژده‌ی به‌هه‌شتیان دراوه‌تێ) ده‌گێڕنه‌وه‌ كه‌: جارێكیان پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌گه‌ڵ حه‌زره‌تی ئه‌بووبه‌كر و عومه‌ر و عوسماندا پێكه‌وه‌ بۆ سه‌ر چیای ئوحود سه‌ركه‌وتن. ئوحودیش - چ له‌ سامی ئه‌واندا و چ له‌ خۆشی‌دا - كه‌وته‌ له‌رینه‌وه‌. پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ ئوحودی فه‌رموو: "اثبت أُحد، فانما عليك نبيٌّ وصدّيقٌ وشهيدان"[٧]. پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌م فه‌رمووده‌یه‌ی خۆی هه‌واڵێكی غه‌یبیی سه‌باره‌ت به‌ شه‌هیدبوونی حه‌زره‌تی "عومه‌ر و عوسمان" ڕاده‌گه‌یه‌نێت.

---

(١) حديث صحيح رواه البزار. بروانه‌: الشفا ١/٣٠٧ واته‌: دوای ئه‌وه‌ی جیبریل پێغه‌مبه‌رێتیی بۆ هێنام، به‌ لای هه‌ر به‌رد و دره‌ختێكدا تێده‌په‌ڕیم، ده‌یانوت: "السلام عليك يارسول الله". واته‌: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا! سلاوت لێ بێت.

(٢) رواه الطبراني وإسناده حسن. واته‌: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم! ئه‌مه‌ مامه‌، برای باوكمه‌.. ئه‌وانه‌ش كوڕه‌كانیه‌تی. خوایه‌! چۆن من به‌م چارۆكه‌یه‌ داپۆشین، تۆیش ئاوا له‌ ئاگری دۆزه‌خ بیانپارێزه‌ و بیانپۆشه‌.

(٣) صحيح، رواه البخاري وأبو داود، والترمذي.

(٤) صحيح، رواه مسلم والترمذي.

(٥) صحيح، رواه الترمذي والنسائي والدارقطني وذكره البخاري في صحيحه تعليقاً.

(٦) حسن، رواه الترمذي وأحمد وأبو داود والنسائي وابن ماجه والحاكم وابن حبان وصححه. والحديث صحيح بشواهده.

(٧) واته‌: ئوحودا! مه‌جووڵێ! چونكه‌ پێغه‌مبه‌رێك و صیددیقێك و دوو شه‌هیدت له‌سه‌ر ڕاوه‌ستاون. ته‌خریجی ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ ڕابورد. بروانه‌: په‌راوێزی (٣)ی ل (١٧٧).

❊ بۆ تەواو كردنی ئەم نموونەیە، دەگێڕنەوە كە: كاتێ پێغەمبەر ﷺ لە مەككەوە كۆچی كرد و كافرەكانی قورەیش بە دوایدا دەگەڕان، بەسەر چیای "ثوبەیر"دا[١] سەركەوت. "ثوبەیر" عەرزی پێغەمبەری ﷺ كرد: "ئەی پێغەمبەری خوا! دابەزە! دەترسم لەسەر پشتی مندا بتكوژن و پاشان خوا سزام بدات. لەم كاتەدا "حەراء" وتی: "إليَّ یارسول الله ﷺ" واتە: "ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ وەرە بۆ لای من".

ئا لەمەوەیە كە پیاوچاكان و "ئەهلی دڵ" لەسەر چیای ثوبەیردا هەست بە ترسویم دەكەن، بەڵام لە حەرائدا هەست بە هێمنی و ئارامی دەكەن.

لە كۆی هەموو ئەم نموونانەوە تێدەگەین كە: چیا گەورەكان، وەك هەر تاكێكی مرۆڤ، كار پێسپێرراو و بەندە و بەدیهێنراوی خوای گەورەن و، تەسبیحاتی خوای خۆیان دەكەن و، هەریەكەیان فەرمانبەرییەكی تایبەتیی خۆی هەیە و، پێغەمبەر ﷺ دەناسێت و خۆشی دەوێت. كەواتە بە هەڕەمەكی و ناڕەوا دروست نەكراوە.

**نموونەی شەشەم:**

❊ عەبدوڵڵای كوڕی ئیمامی عومەر - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە كە: "پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر ئایەتی: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ی[٢] خوێندەوە. پاشان فەرمووی: "يمجّد الجبار نفسه، يقول: أنا الجبار.. أنا الجبار.. أنا الكبير المتعال"[٣]. كە ئەمەی فەرموو، یەكسەر مینبەرەكە كەوتە لەرینەوە و تەكاندان، بە ڕادەیەك كە وتمان هەر ئێستا پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەكە دەكەوێتە خوارەوە"[٤]!

**نموونەی حەوتەم:**

❊ كەڵەزانای ئوممەتی ئیسلام و ڕوونكەرەوەی قورئان كە جەزرەتی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسە.. هەروەها ئیبن مەسعوود[٥] كە یەكێكە لە زانایانی هاوەڵانی پێغەمبەر

(١) ثوبەیر: ناوی چیایەكی موزدەلیفەیە و، دەكەوێتە دەستە ڕاستی ئەو ڕێبوارەی كە بۆ "مینا" دەڕوات. ئەم ڕووداوە پێش ئەوە بوو كە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی ڕووە و ئەشكەوتی ثەور - لە كاتی كۆچدا - بڕوات، تاكو خۆی تێدا بشارێتەوە.

(٢) (الأنعام: ٩١) واتە: وەك پێویست خوایان نەناسی.

(٣) صحيح، رواه مسلم والنسائي وأحمد. واتە: خواوەند تەمجیدی خۆی دەكات و دەفەرموێت: منم خواوەندی خاوەن زەبر و دەستەڵاتی زۆر.. منم خواوەندی خاوەن زەبر و دەستەڵاتی زۆر.. منم گەورەی لە هەموو شتێك گەورە و بەرزتر.

(٤) صحيح، رواه مسلم والنسائي وأحمد واللفظ له.

(٥) حديث ابن مسعود صحيح رواه البخاري ومسلم والترمذي وابن حبان.

ﷺ دەگێڕنەوە کە: "لە دەوروبەری کەعبەدا سێ‌سەد و شەست بت هەبوون قاچیان بە قوڕقوشم لەناو بەرددا قایم کرابوو. کاتێ لە ساڵی فەتحی مەککەدا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو مزگەوتەکەوە، بە دارێك - کە بە دەستیەوە بوو، بێ ئەوەش دەست لە بتەکان بدات - ئاماژەی بۆ ئەو بتانە دەکرد و دەیفەرموو: "جاءَ الحق وزهق البــاطل، إن البــاطِل كان زهوقاً"[١]. ئاماژەی بۆ ڕووی هەر بتێك دەکرد یەکسەر بە پشتدا دەکەوت و، بۆ پشتی هەرکامێکیشیانی دەکرد بە ڕوودا دەکەوت، تا هیچ بتێك لە کەعبەدا نەما[٢].

**نموونەی هەشتەم:**

* ئەم نموونەیە بریتی‌یە لە چیرۆکی بەناوبانگی "بوحەیرای ڕەبەن"[٣] کە بەم جۆرەیە: "پێغەمبەر ﷺ لە پێش پێغەمبەرێتی‌دا لەگەڵ ئەبوتالیبی مامی و کۆمەڵێکی قورەیشدا ڕۆشتن بۆ ناوچەکانی شام. کە گەیشتنە تەنیشتی کلیسای ئەو ڕەبەنە، دانیشتن.

ئەم ڕەبەنەش نەدەهاتە دەرەوە بۆ لای کەس، بەڵام ئەم جارە هاتە دەرەوە و بە ناویاندا گەڕا و یەکە یەکە سەیری دەکردن، تا دەستی پێغەمبەری ﷺ گرت و وتی: "ئەمە گەورەی هەموو جیهانە و خوای گەورە دەیکات بە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانەکان". چەند ڕیش‌سپی‌یەکی قورەیش پێیان وت: بە چی‌دا دەزانیت؟ وتی: "دار و بەرد نەما سوژدەی بۆ نەبەن، خۆ بۆ پێغەمبەر نەبێت سوژدە بۆ هیچ کەسێکی تر نابەن".

پاشان ڕاوی‌یەکە دەڵێت:

"پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هات و پەڵە هەورێکی بەسەرەوە بوو سێبەری بۆ دەکرد. کە نزیکی خەڵکەکە بووەوە، سەیری کرد ئەوان پێش ئەم لە ژێر سێبەری درەختەکەدا دانیشتوون. هەر کە ئەم دانیشت سێبەرەکە هات بۆ لای"[٤].

* * *

هەشتا نموونەی وەك ئەم هەشت نموونەیە هەن.

جا ئەگەر ئەم هەشت نموونەیە پێکەوە یەكبگرن، هێندە هێز بەدەست دەهێنن کە هیچ گومانێك نەتوانێت کاریان تێ بکات.

---

(١) (الاسراء:٨١) واتە: حەق هات و ناحەق بەتاڵ بووەوە و هەر دەشبێت بەتاڵ بێتەوە. ئەم فەرموودەیە تا ئێرە بوخاری و موسلیم و ترمیذی ڕیوایەتیان کردووە، لەمە بەولاوەش غەیری ئەوان.

(٢) حديث ابن عباس رواه الطبراني ورجاله ثقات. والبزار باختصار.

(٣) حديث الراهب صحيح رواه الترمذي.

(٤) نشفا ١/٣٠٨.

ئەم جۆرە موعجیزانە (واتە: قسەکردنی بێ گیانەکان) دەبێتە بەڵگەیەکی بەهێز و توندوتۆڵ بۆ چەسپاندنی دەعوای پێغەمبەرێتی و، لە حوکمی تەواتوری مەعنەویدایە و، هەر نموونەیەکی - جگە لە هێزی خۆی - هێزێکی تر لە هێزی هەموانەوە وەردەگرێت کە لە هێزە تایبەتی‌یەکەی خۆی زیاتر بێت.

ئەم نموونەیە، لەمەدا، وەك ئەو پیاوە لاوازە وایە کە دەچێتە ڕیزی سوپاوە و لەم ڕێگایەوە هێز پەیدا دەکات. بە ڕادەیەك کە دەتوانێت سنگ لە هەزار پیاو دەربپەڕێنێت.. یان وەك ستوونێکی لاواز وایە، کە لەگەڵ چەند ستوونێکی تردا یەكبگرێت، بەهێز دەبێت. ئەی ئەگەر هەموو ڕیوایەتەکان صەحیح و توندوتۆڵ بن؟!

## ئاماژەی دوازدەهەم

### سێ نموونەی گرنگ کە پەیوەندی‌یان بە ئاماژەی یازدەهەمەوە هەیە:

**نموونەی یەکەم:**

* بەپێی دەقی ڕوون و ئاشکرای ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾(الانفال:١٧)[1].. هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوەی هەموو تەفسیرنووسان و پێشەوایانی فەرموودە، چەسپاوە کە:

لە غەزای بەدردا پێغەمبەر ﷺ مشتێك گڵ و بەردە وردەی هەڵگرت و بە دەموچاوی سوپای کافراندا وەشاندی و فەرمووی: "شاهت الوجوه"[2]. جا هەروەك وشەی: "شاهت الوجوه" ڕۆشتە گوێی هەموو یەکێك لەو کافرانەوە، لەو مشتە گڵەش ڕۆشتە چاوی هەموویانەوە و دەستیان بە پاککردنەوەی چاویان کرد و ناچار بوون هەڵبێن، کە لە پێش ئەمەدا ئەوان لە هێرشدا بوون بۆ سەر موسڵمانان!

* ئیمامی موسلیمیش - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە: ئەو کاتەی کافران لە غەزای "حونەین"دا هێرشیان بۆ سەر موسڵمانان دەبرد، پێغەمبەر ﷺ مشتێك خاکی هەڵگرت و بە سەروچاوی بتپەرستاندا وەشاندی و فەرمووی: "شاهت الوجوه". ئیتر بە

---

(١) واتە: ئەوەی کە تۆ هاویشتت، لە ڕاستی‌دا تۆ نەتهاویشت، بەڵکو خوای گەورە هاویشتی.

(٢) حسن، رواه الطبراني. قال الهيثمي: ورجاله رجال الصحيح. واتە: ئەو دەموچاوانە تێکبچن و ناشیرین بن.

فەرمانی خوا، هەموو یەكێكی ئەو سوپایە لەو مشتە خاكە ڕۆشتە چاویەوە و، ئەو وشەیەشی بە گوێدا چوو. ئنجا هەموویان هەڵهاتن[١].

جا ئەم ڕووداوە لەعادەتبەدەرەی كە لە "بەدر" و لە "حونەین"دا ڕووی داوە، زۆر لە سەرووی توانای مرۆڤەوەیە. هەروەك ناشتوانرێت بدرێتە پاڵ هۆكارە ماددییەكان. هەر لەبەر ئەوەشە كە خواوەند دەفەرموێ:

﴿وَمَا رميتَ اذْ رَميتَ ولكنَّ اللّٰهَ رَمى﴾.

كەواتە ڕووداوێكە تەنها لە توانستی خوای گەورەوە سەرچاوەی گرتووە.

**نموونەی دووهەم:**

* كتێبەكانی پێشەواایانی فەرموودە، لە پێش هەموویانەوە هی ئیمامی بوخاری و موسلیم، دەگێڕنەوە كە:

"ئافرەتێكی جوولەكە - كە ناوی زەینەبی كچی حەرث بوو - مەڕێكی برژاوی ژەهراویی لە خەیبەردا پێشكەش بە پێغەمبەر ﷺ كرد. پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون لێیان خوارد. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ارفعوا أيديكـم، فإنـها أخبرتني أنـها مسمومة"[٢]. خەڵكەكەش دەستیان لێ هەڵگرت، بەڵام "بیشری كوڕی بەڕڕاء" بە كاریگەریی ژەهرەكە مرد. پێغەمبەر ﷺ ژنە جوولەكەكەی بانگ كرد و پێی فەرموو: "چی هانی دایت ئەم كارە ئەنجام بدەیت"؟ ئەویش وتی: "ئەگەر پێغەمبەر بیت، ئەوا ئەم كارەی من هیچ زیانێكت پێ ناگەیەنێت. خۆ ئەگەر پادشایش بیت، بەم كارەم خەڵكی لە دەستت ڕزگار دەكەم". ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بیكوژن"[٣].

هەندێ ڕیوایەت دەڵێت: فەرمانی بە كوشتنی نەدا. زانا لێكۆڵەرەكان دەڵێن: فەرمانی بە كوشتنی نەدا، بەڵكو تەسلیمی خزم و كەسانی بیشری كوڕی بەڕڕائیان كرد، ئەوانیش كوشتیانەوە[٤].

ئێستاش گوێ لەم سێ خاڵە ڕابگرە، با لایەنی موعجیزەت لەم ڕووداوەدا بۆ دەربكەوێت:

---

(١) صحيح، رواه مسلم.

(٢) واتە: دەستتان هەڵگرن. ئەم مەڕە هەواڵی پێ دام كە ژەهراوییە!

(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود وأحـمد والدارمي.

(٤) حسن، أخرجه الحاكم والبيهقي. واتە: لە پێشدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە كوشتنی نەدا، بەڵام كە "بیشر" مرد، فەرمانی دا بیكوژنەوە.

● خاڵی یەكەم:

لە هەندێ ڕیوایەتدا دەڵێت: هەندێ لە هاوەڵان گوێیان لەو مەڕە بووە كە هەواڵی ژەهراویبوونی خۆی بە پێغەمبەر ﷺ داوە[1].

● خاڵی دووهەم:

لە ڕیوایەتێكی تردا دەڵێت: دوای ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ هەواڵەكەی پێ ڕاگەیاندن، فەرمووی: بڵێن: "بسم الله" و بخۆن، كە ناوی خواتان هێنا ژەهرەكە زیانی نابێت.

ئەم ڕیوایەتە هەرچەند "ئیبن حەجەری عەسقەلانی" وەری نەگرتووە، بەڵام چەند زانایەكی تر قبووڵیان كردووە.

● خاڵی سێهەم:

هەموو یەكێك لەو كەسانەی ئەو هەواڵەیان لە پێغەمبەر ﷺ بیست كە: ئەو مەڕە ژەهراوییە، یەكسەر دڵنیایی پەیداكرد و وەك ئەوەی خۆی ئەو هەواڵەی لێ بیستبێت ئاوا باوەڕی پێ كرد. چونكە هیچ وتەیەكی پێچەوانەی واقیعی لێ نەبیستراوە، كە ئەمەش یەكێكە لەوانە. جا لەو كاتەدا كە جوولەكەكان پیلانیان بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ساز دەكرد، لە هەمان كاتدا و بەهۆی هەواڵێك لە غەیبەوە پیلانەكەیان ئاشكرا بوو، هەروەك فڕوفێڵە چەپەڵەكەشیان بەتاڵ بووەوە، هەواڵەكەی پێغەمبەریش ﷺ چۆنی ڕاگەیاند وەها دەرچوو!

**نموونەی سێهەم**

ئەم نموونەیەش موعجیزەیەكی تری پێغەمبەرە ﷺ لە سێ ڕووداودا، كە لە موعجیزەی "دەستی سپی"(الید البیضاء) و "عەسا"كەی حەزرەتی مووسا دەچێت:

(ڕووداوی یەكەم):

* ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودە صەحیحەی لە "ئەبوو سەعیدی خودری"یەوە - خوای لێ ڕازی بێت - گێڕاوەتەوە كە:

"لە شەوێكی بارانی تاریكدا قەتادەی كوڕی نوعمان نوێژی خەوتنانی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەدا كرد. پاشان پێغەمبەر ﷺ دارعەسایەكی كورتی بە نوعمان دا و فەرمووی: بڕۆ ئەم دارعەسایە دە گەز لە پێش خۆتەوە و دە گەزیش لە پشتتەوە ڕووناك دەكاتەوە. كاتێكیش گەیشتیتەماڵەوە شتێكی ڕەش دەبینیت، ئەوە شەیتانە و هەر بەم دارە لێی بدە تا دەڕواتە دەرەوە. قەتادەش ڕۆشت و تا گەیشتە ماڵەوە شتە ڕەشەكەی بینی و،

---

(١) ورد في تكلم الذراع حديث صحيح، رواه أبو داود والدارمي عن جابر.

به داره‌كه‌ی ده‌ستی لێی دا تاكو ڕۆشته ده‌ره‌وه"[١].

(ڕووداوی دووهه‌م):

❊ لـه غـه‌زای گـه‌وره‌ی به‌دردا - كـه سـه‌رچاوه‌ی چـه‌ندین شـتی سـه‌یر و سه‌رسووڕهێنه‌ره - شمشێره‌كه‌ی (عه‌كاشه‌ی كوڕی مه‌حصه‌نی ئه‌سه‌دی) شكا. پێغه‌مبه‌ر ﷺ دارێكی ئه‌ستووری دایه ده‌ستی و فه‌رمووی: شه‌ڕی پێ بكه. ئه‌م داره له ده‌ستی عه‌كاشه‌دا بوو به شمشێرێكی تیژی درێژی سپی و ئه‌ستوور و، جه‌نگی پێ كرد. ئیتر له هه‌موو غه‌زایه‌كدا ئه‌م شمشێره‌ی لا بوو به‌كاری ده‌هێنا، تا له جه‌نگی "یه‌مامه" - كه له‌گه‌ڵ پاشگه‌زبوواندا كرا - شه‌هید بوو[٢].

ئه‌م ڕووداوه ڕووداوێكه به قه‌تعی چه‌سپاوه و، عه‌كاشه به درێژایی ته‌مه‌نی شانازیی به‌م شمشێره‌وه ده‌كرد و، به شمشێری "العون" واته: "یارمه‌تی" ناوبانگی ده‌ركردبوو. جا ناوبانگ ده‌ركردنی ئه‌م شمشێره و، شانازی كردنی عه‌كاشه پێیه‌وه، دوو به‌ڵگه‌ی ترن كه ڕووداوه‌كه ده‌چه‌سپێنن.

(ڕووداوی سێهه‌م):

❊ "ابن عبدالبرّ" كه یه‌كێكه له زانا لێكۆڵه‌ر و هه‌ڵكه‌وتووه‌كانی چه‌رخی خۆی، له "عه‌بدوڵلای كوڕی جه‌حش"ه‌وه كه كوڕی پووری پێغه‌مبه‌ره ﷺ ده‌گێڕێته‌وه كه[٣]: (عه‌بدوڵلا له غه‌زای "ئوحود" و له‌و كاته‌دا كه خه‌ریكی جه‌نگ بوو شمشێره‌كه‌ی له ده‌ست چوو، پێغه‌مبه‌ر ﷺ په‌له دارخورمایه‌كی دایه ده‌ستی و له ده‌ستی "عه‌بدوڵلا"دا بوو به شمشێر). "ابن سید النـاس" له كتێبه‌كه‌ی‌دا ده‌ڵێت: ماوه‌یه‌كی زۆر ئه‌م شمشێره لای عه‌بدوڵلا مایه‌وه، تا له دوایی‌دا به دووسه‌د دینار فرۆشرا به یه‌كێك كه ناوی "بغاء التركي" بوو[٤].

جا ئه‌م دوو شمشێره، دوو موعجیزه‌ن وه‌ك موعجیزه‌ی "عه‌سای مووسا" وان. ئه‌وه‌نده هه‌یه دوای وه‌فاتی حه‌زره‌تی مووسا - دروودی له‌سه‌ر بێت - ئه‌و موعجیزه‌یه له عه‌ساكه‌ی‌دا نه‌ما، كه‌چی ئه‌م دوو شمشێره دوای وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ریش ﷺ هه‌ر مانه‌وه.

---

(١) رواه أحمد وابن خزيمة والحاكم، وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين و لم يخرجاه ووافقه الذهبي.

(٢) رواه البيهقي مسنداً. بروانه: نسيم الرياض ١٥٦/٣.

(٣) رواه البيهقي في حديث مُسند، بروانه: الإستيعاب لابن عبد البر، القسم الثالث ٨٧٩. هه‌روه‌ها: الشفا: ٣٣٣/١.

(٤) عيون الأثر لابن سيد الناس: ٢٠/٢ ، الإصابة لابن حجر: برقم: (٤٥٨٣).

## ئاماژەی سیازدەهەم

جۆرێك لە جۆرەكانی موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە شیفای نەخۆش و زامداران بەهۆی ئاوی دەم و فووی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەم جۆرە موعجیزاتە، ئەگەر وەكو "جۆر"ێك تەماشایان بكەین، ئەوا "موتەواتیری مەعنەوی"ن. كەچی دانە دانە و تاك تاكەكانی هەندێكیان لە حوكمی تەواتوری مەعنەویدان و، هەندێكی تریشیان "خەبەری ئاحاد"ن. بەڵام لەبەر ئەوەی زانایان و پێشەوایانی فەرموودە باوەڕیان پێ كردوون و بە صەحیحیان لە قەڵەم داون، ئەوا قەناعەتی زانستییانە و دڵنیایی بە مرۆڤ دەبەخشن.

وا لە نێوان نموونە زۆرەكانی ئەم جۆرە موعجیزەیەدا، تەنها چەند نموونەیەك باس دەكەین:

**نموونەی یەكەم:**

* قازی عەیاز لە "سەعدی كوڕی ئەبوو وەققاص"ەوە دەگێڕێتەوە[1]، كە یەكێك بووە لەو دە كەسەی مژدەی بەهەشتیان دراوەتێ و، خزمەتی پێغەمبەری ﷺ كردووە و، یەكێك بووە لە پێشەوایانی سوپاكانی و، لە سەردەمی ئیمامی عومەردا سەركردەی سوپای ئیسلام بووە، ئەم سەعدە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: "لە غەزای ئوحوددا پێغەمبەر ﷺ تیری بێنووكی دەدامێ و دەیفەرموو: "تێیان بگرە". هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەر ﷺ بە كەوانەكەی خۆی ئەوەندە تیری تێ گرتن تا كەوانەكەی شكا". ئەو تیرانەش كە نووكیان نەبوو، وەك ئەوەی باڵیان گرتبێت لە كەوان دەردەچوون و، لە جەستەی كافراندا جێگیر دەبوون.

* هەروەها قازی عەیاز دەفەرموێ[2]:

لەو ڕۆژەدا چاوی " قەتادەی كوڕی نوعمان " برینداركرا و بەسەر گۆنایدا شۆڕ بووەوە. پێغەمبەر ﷺ بە دەستی پیرۆزی شیفابەخشی خۆی، چاوی قەتادەی خستەوە جێگاكەی بە جۆرێك كە لە چاوەكەی تری جوانتر بوو.

ئەم ڕووداوەش ئەوەندە ناوبانگی دەركرد كە یەكێك لە نەوەكانی ئەم قەتادەیە كاتێ هات بۆ لای عومەری كوڕی عبد العزیز بەم شیعرانەی خوارەوە خۆی پێ ناساند:

---

(١) الشفا ١/٣٢٢.

(٢) رواه أبو يعلى والطبراني وابن أبي شيبة. بڕوانە: الشفا ١/٣٢٢، زاد المعاد بتحقيق الأرنــاؤوط ٣/١٨٦-١٨٧.

أنا ابن الذي سالَتْ على الخدّ عينُه     فرُدّتْ بكفٍّ المصطفى أحسنَ الردِّ
فعــادتْ كما كانت لأول أمرها     فياحسن ما عينٍ وياحسن ما ردّ[١]

* هەروەها چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ ئاوی دەمی خۆی خستە سەر ئەو برینەی کە تیرێك لە جەنگی "ذی قەرەد"دا[٢] لە دەموچاوی قەتادەدا دروستی کردبوو. قەتادە دەفەرموێ: "لە دوای ئەوە، برینەکەم نە ئازاری دام، نە کیمیشی کرد"[٣]، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەردا هێنابوو.

**نموونەی دووهەم:**

* بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش دەگێڕنەوە کە: "لە ڕۆژی خەیبەردا پێغەمبەر ﷺ ئاڵاکەی دا بە "عەلی"، ئەویش لەو کاتەدا گرفتاری چاوئێشە بوو. هەرکە پێغەمبەرﷺ تفی بۆ تێکرد، یەکسەر - بە ئیزنی خوا - بوو بە شیفا بۆی و چاوی چاك بووەوە"[٤].

بۆ بەیانی حەزرەتی عەلی دەرگای قەڵاکەی - کە لە ئاسن دروست کرابوو - وەك قەڵغان بە دەستەوە گرت و قەڵاکەی فەتح کرد.

* هەر لە غەزای خەیبەردا فووی بە ڕانی "سەلەمەی کوڕی ئەکوەع"دا کرد کە برینداربوو، یەکسەر چاك بووەوە[٥].

**نموونەی سێهەم:**

* ئیمامی نەسسائی لە "عوسمانی کوڕی حونەیف"ەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: "کوێرێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خوا داوا بکە چاوم چاك بکاتەوە و دەری بخات. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئاوا؟ یان وازت لێ بهێنم؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم کوێرییەم زۆر بێزاری کردووم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "انطلق فتوضأ ثم صلّ ركعتين، ثم قل: اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بنبيي محمدٍ نبي الرحمة، يا محمد إني أتوجه إلى ربك بك، أن يكشف لي عن بصري، اللّهم شفعّه فيّ،

---

(١) واتە: من کوڕی ئەو کەسەم کە چاوی بەسەر گۆنایدا هاتەخوارەوە، بەڵام بە دەستی پێغەمبەر ﷺ زۆر بە جوانی خرایەوە جێگای خۆی و وەکو یەکەم جاری لێهاتەوە. ئای چ چاوێکی جوان بوو! چ گێڕانەوەیەکی جوان بوو! (وەرگێڕ)

(٢) "ذی‌قەرەد": غەزایەکە دوای ڕێکەوتنەکەی حودەیبییە لە جێیەکی نزیکی مەدینە ڕووی داوە.

(٣) صحيح، رواه الترمذي والحاكم والبيهقي.

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

(٥) صحيح، رواه البخاري وأبو داود وأحمد.

وشفّعني في نفسي. فرجع وقد كشف الله عن بصره"[١].

واتە: برۆ دەستنوێژ بگرە و، دوو ڕكات نوێژ بكە و، پاشان بڵێ: خوايە! داوات لێ دەكەم و ڕووت تێدەكەم، بەهۆی پێغەمبەرەكەمەوە كە محەممەدە و پێغەمبەری میهرەبانییە.. ئەی محەممەد ﷺ! من بەهۆی تۆوە ڕوو لە خوا دەكەم كە پەردە لەسەر چاوم لابدات.. خوايە! شەفاعەتی ئەوم لێ وەربگرە و هی خۆیشم.

عوسمان دەفەرموێ: كە گەڕایەوە، خوا چاوی چاك كردبووەوە.

**نموونەی چوارەم:**

* لە غەزای بەدردا ئەبوو جەهل دەستی "موعەووەذی كوڕی عەفراء"ی بڕی، كە یەكێكە لەو چواردە كەسەی لە بەدردا شەهید بوون. موعەووەذ دەستە قرتاوەكەی هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەویش تفی بەسەردا كرد و لكاندیەوە بە جێگاكەی خۆیەوە و، جێی خۆی گرتەوە و لكایەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ جەنگ، تا شەهید كرا هەر شەڕی كرد.

ئەم ڕووداوە پێشەوای پایەبەرز "ئیبن وەهب" كە یەكێكە لە پێشەوایانی فەرموودە، ڕیوایەتی كردووە[٢].

* هەر بە ڕیوایەتی ئەم ئیمامە "خوبەیبی كوڕی یەساف" لە غەزای بەدر لەگەڵ پێغەمبەردا بوو ﷺ. شمشێر دابووی لە سەرشانی بە ڕادەیەك كە ئەو لایەی لار بووبووەوە. پێغەمبەر ﷺ خستیەوە جێی خۆی و فووی پێدا كرد هەتا چاك بووەوە[٣].

هەرچەند ئەم دوو ڕووداوە "خەبەری ئاحاد"ن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیمامی پایەبەرز: "ئیبن وەهب" بە صەحیحی داناون و، لەبەر ئەوەی كە لە كانگای موعجیزات(بەدر)دا ڕوویان داوە و، لەبەر ئەوەش چەندین ڕووداوی تری وەك ئەمانە هەن و، دەبن بە شایەت بۆیان..

هەموو ئەمانە، وا دەكەن كە هیچ كەسێك گومانی لە ڕوودانیاندا نەبێت.

بەم جۆرە، هەزار و یەك نموونە هەن و هەموویان بە حەدیثی صەحیح چەسپاون كە دەستی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بووە بە شیفابەخش و دەرمانی زامدار و بیمار و دەردەداران.

---

(١) صحيح، رواه النسائي واللفظ له، والترمذي وقال: حسن صحيح غريب، وابن ماجه وابن خزيمة والحاكم وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين ولم يخرجاه، والإمام أحمد والطبراني وابن السني.

(٢) بڕوانە: الشفا ١/٣٢٤، الإصابة ٦/١٩٣.

(٣) رواه ابن وهب والأصبهاني في دلائل النبوة والبيهقي وأحمد. بڕوانە: الشفا ١/٣٢٤.

## ئەم پارچەیە شایانی ئەوەیە بە ئاوی زێڕ
## بنووسرێت و بە ئەڵماسیش بڕازێنرێتەوە

لە ڕاستیدا وەك باسمان كرد:

تەسبیحات كردن و خشوعی بەردە وردە لەناو دەستی پێغەمبەردا ﷺ و، گۆڕانی خاك و بەردە وردە لەو دەستەدا بە شتێكی وەك بۆمبا و گوللـە لـە ڕووی دوژمناندا، بە چەشنێ كە هەموویان بە بۆنەی نهێنیی ئایەتی: ﴿وما رَمَيْتَ اذْ رَمَيْتَ وَلٰكِنَّ اللهَ رَمَى﴾ هەڵهاتن..

لـەت بوونی مـانگ و بوونی بـە دوو كەرتـەوە بـە تەنـها یـەك پەنجـەی هـەمان دەسـت، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾..

هەڵقوڵانی ئاو وەك كانی لە نێوان پەنجەكانیەوە و تێراوبوونی سوپا لەو ئاوە..

شیفا بەخشینی ئەو دەستە بە زامدار و بیمار و دەردەداران..

ئەمانـە بـە جوانـی: ڕادەی بەرەكـەتی ئـەو دەسـتە پـیرۆزە و.. ڕادەی ئـەوەی كـە چ موعجیزەیەكی گەورەی خواوەندە، دەردەخەن.

وەك بڵێـی ناولـەپی ئەو دەستە: گۆشـەیەكی بچووكی زیكر بێـت لـە نێـوان هـاوەڵان و خۆشەویستانیدا، بە چەشنێ كە ئەگەر بەردیشی تێ بڕوات، ئەوا ئەویش دەست بە زیكر و تەسبیحات دەكات..

وەك سەنگەرێكی بچووكی پەروەردگارییانە وایە لە بەرامبەر دوژمنانەوە، بە ڕادەیەكی وا كە ئەگەر خاكیش بڕواتە نـاوی، ئەوا وەك گوللـە و بۆمبا بەم لاو ئەو لادا دەتەقێتەوە و بڵاو دەبێتەوە.

دەشبێتەوە بە دەرمانخانەیەكی بچووكی میهرەبانی بۆ زامداران و بیماران و، ئەگەر بەر هەر دەردێك بكەوێت شیفای پێ دەبەخشێت.

خـۆ ئەگـەر هـەر كاتێ ئـەم دەسـتە تـەكانێك بـدات، ئـەوا بەوپـەڕی شـكۆمەندییەوە ڕادەپەڕێت و، بە تەنها یەك پەنجەی "مانگ" دوولەت دەكات.

هەر كاتیش ئاوڕی جوانی بداتەوە، ئەوا سەرچاوەیەكی وا دەتەقێنێتەوە كە لە دە كانیـاوەوە وەكو ئاوی ڕەوانی كەوسەر، "میهرەبانی" هەڵدەقوڵێت.

جا لـە كـاتێكدا كـە دەستی ئـەم پێغەمبـەرە بـەڕێزە ﷺ تـا ئـەم ڕادەیـە جێـی پیشـاندانی موعجیزاتی ڕوون و ئاشكرا بێت، ئایا ئیتر بە ڕوونی دەرناكەوێت كە ئەم پێغەمبەرە ﷺ :

تا چەندە لە بانگەوازەكەیدا ڕاستە و..

تا چەندەش لە لای پەروەردگاری بەڕێزە و..

چ ڕێز و بەختەوەرییەكی گەورەش دەستی ئەو كەسانە دەكەوێت كـە بەیعـەت بـەو دەسـتە پیرۆزە دەكەن؟

**پرسیارێك:**

تۆ لە بارەی زۆربەی ڕیوایەتەكانەوە دەڵێیت: "ئەمە موتەواتیرە". كەچی ئێستا نەبێت ئێمە نەمانبیستووە، ئایا "تەواتور" تا ئەم ڕادەیە شتێكی نەزانراو دەبێت؟

**وەڵام:**

گەلێ ڕیوایەت هەن لای زانایانی شەرع موتەواتیرن، بەڵام لای غەیری ئەوان نەزانراون. ئەوەتا زانایانی فەرمووده ئەوەندە حەدیثی موتەواتیریان لە لایە مەگەر خوا بزانێت، بەڵام لای غەیری خۆیان بە "ئاحاد" دانراون.

بەم جۆرە بۆمان دەردەكەوێت كە ئەو شتانەی لە هەر زانستێكدا بە بەدیهی و نەزەری دادەنرێن، ئەوا بەپێی دەستوور و ڕێبازی پسپۆڕانی ئەو زانستە ڕوون دەكرێنەوە و باس دەكرێن، بەڵام ئەو كەسانەی كە پسپۆڕی ئەو بابەتانە نین، لەم بارەیەوە پشت بە زانایانی ئەو بابەت و زانستە دەبەستن. جا یان ئەوەیە بە وتەی ئەو زانایانە قایل دەبن، یان دەچن خۆیان دەست بە لێكۆڵینەوەی ئەو زانستانە دەكەن تاكو ئەوانیش بە هەمان ئەنجام بگەن كە ئەو زانایانە زووتر پێی گەیشتبوون.

هەموو ئەو ڕیوایەتانەش كە ئێمە لە بارەیانەوە وتوومانە: موتەواتیری حەقیقی یان مەعنەوین، یان لە حوكمی موتەواتیرە مەعنەوییەكاندان، هەموو ئەمانە، زانایانی فەرموودە و، شەریعەت و، ئوصوول و، زۆربەی زانایانی تریش، حوكمەكانیان ڕوون كردوونەتەوە. جا ئەگەر عەوامە بێئاگاكان یان ئەو نەزانانەی كە چاویان لە ئاستی زانستدا نووقاندووە، نەیانزانن، ئەوا تەنها خۆیان لۆمە و سەرزەنشت دەكرێن.

**نموونەی پێنجەم:**

❊ ئیمامی بەغەوی دەگێڕێتەوە كە: (لە غەزای خەندەقدا پێی "عەلیی كوڕی حەكەم" پێكرا و شكا. پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەر شوێنی شكانەكەیدا هێنا و یەكسەر چاك بووەوە، بێ ئەوەی لە ئەسپەكەشی دابەزێت)[1].

**نموونەی شەشەم:**

❊ ئیمامی بەیهەقی و غەیری ئەویش دەگێڕنەوە كە: "جارێكیان حەزرەتی عەلیی كوڕی ئەبوو تالیب ئازارێكی هەبوو، دەستی بە پاڕانەوە كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "اللّهم اشفه" یان "عافه" [2]. پاشان پێغەمبەر ﷺ بەپێی خۆی لێی دا، ئیتر لە دوای ئەوە ئەو ئێش و ئازارەی نەما"[3].

---

(١) أخرجه البغوي والطبراني. بڕوانە: الإصابة ٥٦٢/٤، الشفا ٣٢٣/١، نسيم الرياض ١١٨/٣.

(٢) واتە: خوایە! شیفای بدەیت و چاكی بكەیتەوە.

(٣) رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى، ورواه الإمام أحمد والحاكم وابن حبان.

**نموونه‌ی حه‌وته‌م:**

* "لوو"یه‌ك له‌ ناوله‌پی "شوره‌حبیلی جوعفی"دا هه‌بوو، به‌و هۆیه‌وه‌ نه‌یده‌توانی ده‌سكی شمشێر و جڵه‌وی وڵاخه‌كه‌ی به‌ ده‌سته‌وه‌ بگرێت. ناچار سكاڵای ده‌ستی برده‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ. ئه‌ویش به‌رده‌وام ده‌ستی پیرۆزی خۆی پیادا ده‌هێنا، تا ئه‌و لووه‌ی هه‌ڵگرت و هیچ شوێنه‌وارێكی نه‌ما"[1].

**نموونه‌ی هه‌شته‌م:**

ئه‌م نموونه‌یه‌ بریتی‌یه‌ له‌ شه‌ش منداڵ، كه‌ هه‌ریه‌كه‌یان به‌ جیا جیا موعجیزه‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ریان ﷺ تێدا ده‌ركه‌وتووه‌:

(یه‌كه‌م):

"ئیبن ئه‌بی شه‌یبه" كه‌ یه‌كێكه‌ له‌ پێشه‌وایانی زانیاریی فه‌رمووده‌، ده‌گێڕێته‌وه‌ كه‌: "جارێكیان ئافره‌تێك له‌ تیره‌ی (خَثْعَم) هاته‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و منداڵێكیشی پێ بوو كه‌ تووشی به‌ڵایه‌كی وه‌ها بووبوو نه‌یده‌توانی قسه‌ بكات. پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئاوی له‌ ده‌می ڕادا و ده‌ستی شۆرد و پاشان ئه‌و ئاوه‌ی دا به‌ ئافره‌ته‌كه‌ و، فه‌رمانی پێ‌دا كه‌ ده‌رخواردی منداڵه‌كه‌ی بدات و پێی بهه‌نوێت. ئیتر منداڵه‌كه‌ چاك بووه‌وه‌ و له‌ پاشاندا مرۆڤێكی هێنده‌ ژیر ده‌رچوو كه‌ له‌ خه‌ڵكی ژیرتر بوو"[2].

(دووهه‌م):

"ئیبن عه‌باس" ده‌فه‌رمووێ: "ژنێك كوڕێكی شێتی خۆی هێنایه‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ. ئه‌ویش ده‌ستی پیرۆزی به‌سه‌ر سنگی منداڵه‌كه‌دا هێنا و منداڵه‌كه‌ش یه‌كسه‌ر ڕشایه‌وه‌ و شتێكی ڕه‌شی به‌ ئه‌ندازه‌ی خه‌یارێكی بچووكی له‌ سك هاته‌ ده‌ره‌وه‌"[3]. ئیتر منداڵه‌كه‌ به‌مه‌ چاك بووه‌وه‌.

(سێ‌هه‌م):

ئیمامی به‌یهه‌قی و نه‌سسائی ده‌گێڕنه‌وه‌، ده‌ڵێن: "محه‌ممه‌دی كوڕی حاته‌ب منداڵ بوو، جارێكیان مه‌نجه‌ڵێك ئاوی گه‌رم به‌سه‌ر ده‌ستی‌دا ڕژا. پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌ستی به‌سه‌ردا هێنا و دوعای بۆ كرد"[4] و فوویه‌كی ته‌ڕی به‌ برینه‌كه‌ی‌دا كرد كه‌ ئاوی پیرۆزی ده‌می پێوه‌ بوو، یه‌كسه‌ر چاك بووه‌وه‌.

---

(١) رواه الطبراني والبخاري في التأريخ الكبير واللفظ له. بڕوانه: الشفا ١/٣٢٤، الإصابة ٣/٣٣١.

(٢) أخرجه ابن أبي شيبة ومن طريقه ابن ماجه ورواه الطبراني. بڕوانه: الشفا ١/٣٢٤.

(٣) ضعيف. بڕوانه: الشفا ١/٣٢٤ به‌ڵام فه‌رمووده‌یه‌كی "صه‌حیح" له‌ باره‌ی چاكبوونه‌وه‌ی منداڵی شێت له‌ موسنه‌دی ئیمامی ئه‌حمه‌ددا هه‌یه‌. بڕوانه: المسند للإمام أحمد ٤/١٧٥.

(٤) رواه النسائي وابن حبان وابن أبي شيبة والطبراني. بڕوانه: الشفا ١/٣٢٤.

(چوارەم):
"منالێکیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە گەورە بووبوو بەڵام هێشتا زمانی نەگرتبوو. پێغەمبەر ﷺ بە منداڵەکەی فەرموو: من کێم؟ یەکسەر وتی: "رسول الله" واتە: تۆ پێغەمبەری خوایت!"[1] بەم جۆرە خوای گەورە زمانی بەردا.
(پێنجەم):
جەلالەددینی سیووتی، کە ئیمامی چەرخی خۆی بووە و هەر لە حاڵەتی بێداری‌دا چەندین جار بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ شەرەفمەند بووە، دەگێڕێتەوە کە: "پیاوێکی خەڵکی (یەمامە) منالێکی خۆی - هەر ئەو ڕۆژەی کە تیای‌دا لە دایك بووبوو - هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەر ﷺ بە منالەکەی فەرموو: "منالْ! من کێم"؟ یەکسەر منالەکە هاتە زمان و وتی: "أنت رسولُ الله". فەرمووی: "صدقت بارك الله فيك". پاشان ئەم منالە نەهاتەوە زمان تا گەورەبوو. خەڵکی پێیان دەوت: "مبارَكُ اليمامة" چونکە پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ کردبوو"[2].
(شەشەم):
جارێکیان منالێکی لاسار نوێژی بە پێغەمبەر ﷺ بڕیبوو. پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کرد کە خوا شوێنەواری ببڕێت. ئیتر منالەکە ئیفلیج بوو[3] و، سزای لاساری‌یەکەی وەرگرت.
(حەوتەم):
لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ خەریکی خواردن بوو، کچێك داوای خواردنی لێ کرد. پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی داین کە لە بەردەستی‌دا بوو. ئەم کچەش کەم شەرم بوو، وتی: ئەوەم دەوێت کە لەناو دەمتدایە! خۆ پێغەمبەریش ﷺ هەر شتێکی لێ داوا بکرایە دەیبەخشی.. لەبەر ئەوە، هەرچێکی لە دەمدا بوو دای بەو کچە. هەر هێندەی پاروەکە لە گەدەی ئەو کچەدا جێگیر بوو، ئەوەندە شەرمن و بە حەیا دەرچوو کە لە شاری مەدینەدا هیچ ئافرەتێکی تر نەبوو هێندەی ئەو بەشەرم و حەیا بێت[4].

* * *

(١) رواه البيهقي في الخصائص الكبرى. بڕوانە: نسيم الرياض ٣/١٠٥.
(٢) بڕوانە: الشفا ١/٣١٩، الإصابة ٦/١٨، ابن عساكر ٤/٣٧٨. ئیمامی سیووتی لە بارەی ئەم فەرموودە پیرۆزەوە فەرموویەتی: "حديث حسن".
(٣) رواه أبو داود وأحمد والبيهقي وابن حبان. بڕوانە: نسيم الرياض ٣/١٣٧.
(٤) رواه الطبراني. بڕوانە: الشفا ١/٣٢٥.

بەم جـۆرەی کـە لـە پێشـەوە باسمـان کـرد و وەك ئـەم نموونانـەی هێنامانـەوە، ئـەوەندە نموونە هەن کە لـە هەشتا بـەڵکو لـە هەشـت سـەدیش تێدەپەڕن. کتێبـەکانی فـەرمـوودە و مێژووی ژیانی پێغەمبەر ﷺ زۆربەیان باس کردوون.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی دەستی پیرۆزی ئەو ﷺ وەکو دەرمانخانەکەی لوقمـانی حـەکیم و، ئـاوی دەمیشی بـە وێنـەی ئـاوی کانیـاوی "ژیـان"ی حـەزرەتی خضر دروودی لـەسەر بێت و، فووەکەشی لە شیفا بەخشیندا وەك فووی حەزرەتی عیسا وایـە، دروودی خـوای لەسەر بێت..

مادەم ئادەمیزادیش - لە لایەکی ترەوە - گرفتاری چەندین جۆری بـەڵا و موسیبەت دێن..

ئەوا گومان لەوەدا نابێت کە چـەندین نـەخۆش و منـاڵ و شـێتی لـە ژمارەبەدەر، دێنـە خزمەتی. گومانیش لەوەدا نی‌یە کە هەر هەموویان لە نەخۆشی و ناتەواویی خۆیـان چـاك دەبنەوە و ڕزگاریان دەبێت.

تەنانەت "تاوسی یەمانی" کە یەکێکـە لـە پێشـەوایانی تـابیعین و بـە "زوهـد" و "تـەقوا" ناوبـانگی دەرکـردووە، چونکـە چـل جـار حـەجی کـردووە و چـل سـاڵی ڕەبـەقیش بـە دەستنوێژی نوێـژی خـەوتنان نوێژی بەیانیی کـردووە و، بـە خزمـەتی چـەندین هـاوەڵی بەڕێزی پێغەمبـەر ﷺ گەیشتووە.. ئـەم زانـا گەورەیـە، هـەواڵێکی بێ گومانمـان دەداتێ و دەفەرموێ: هەر شـێتێك هاتبێتـە خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ و ئـەویش دەسـتی پیرۆزی لەسـەر سنگی ئەو شێتە دانابێت، ئەوا لەو نەخۆشی‌یەی چاك بووەتەوە.

جا لـە کـاتێکدا ئیمـامێکی وەك "تاوسی یـەمانی" کـە بـە خزمـەتی هاوەڵـە بـەڕێزەکان گەیشتووە، هەواڵێکی ئـاوا بێ گومانمـان بداتێ، ئەوا هیـچ گومـانێك لـەوەدا نـابێت کـە ژمـارەیەکـی زۆری دەردەداران، کـە لـەوانـەیـە بگـەنـە هـەزار، هــاتوونەتە خزمـەتی پێغەمبەر ﷺ و هەموو شیان لەو دەرد و نەخۆشی‌یانەیان چاك بوونەتەوە.

## ئاماژەی چواردەهەم

جۆرێکـی گـەورە و گرنگـی موعجـیزاتی پێغەمبـەر ﷺ بریتی‌یـە لـەو شـتە لەعادەت‌بەدەرانەی کە بە بۆنەی دوعاکانیەوە هاتوونەتەدی.

جا ئەم جۆرە موعجیـزانە هیـچ گـومانێکیان تێدا نی‌یـە و موتـەواتیری ڕاسـتەقینەن. نمـوونە و یەکە یەکەی ڕووداوەکانیشی ئەوەندە زۆرن کـە لـە ژمـارە نایـەن. زۆر لـەو

نموونانە گەیشتوونەتە پلەی موتەواتیر، بەڵكو ئەو نموونانە ئەوەندە بەناوبانگن كە لە تەواتورەوە نزیكن. هەندێكی تریشیان چەند پێشەوایەكی گەورە نەقڵیان كردوون، بەمەش وایان لێ هاتووە كە وەك موتەواتیری بەناوبانگ بێ گومان بن.

ئێمەش لێرەدا و لە نێوان نموونە زۆرەكانی ئەم جۆرەدا چەند دانەیەك بۆ نموونە باس دەكەین كە لە "تەواتور"ەوە نزیكن، یان لە پلەی "مەشهوور"دان. هەروەها لە هەر نموونەیەكیش چەند شتێكی جوزئی باس دەكەین.

**نموونەی یەكەم:**

* پێشەوایانی فەرموودە، لە پێشەكیيانەوە ئیمامی بوخاری و موسلیم، دەگێڕنەوە كە: دوعای پێغەمبەر ﷺ بۆ باران بارین یەكسەر گیرا بووە. ئەمەش گەلێ جار ڕووی داوە، بە ڕادەیەك كە كاتێ وا دەبوو لەسەر مینبەر دەستی بەرز دەكردەوە و دوعای بۆ باران دەكرد، پێش ئەوەی دەستی دابگرێت دوعاكەی گیرا دەبوو. ئەو ڕیوایەتانەش كە ئەمە دەگێڕنەوە، هەموو چەسپاون و گەیشتوونەتە ڕادەی تەواتور. پێشتر باسی ئەوەمان كرد كە: لە سەفەرێكدا ئەو هۆردووەی لەگەڵیدا بوون زۆریان تینوو بوو، (هەموو جارێ بە بۆنەی دوعای پێغەمبەرەوە ﷺ) هەورەكە پەڵەی دەكرد و دەباری، ئەوانیش تێراو دەبوون، ئنجا لە بارین دەكەوت و دەڕۆشت.

* تەنانەت لە پێش پێغەمبەرێتیشیدا، دوعای پێغەمبەر ﷺ هەر گیرابووە[1]. ئەوەبوو لەو كاتەدا كە منداڵ بوو هەركات بێبارانی ببوایە، "عەبدولموتەللیب"ی باپیری لە خوا دەپاڕایەوە كە لەبەر خاتری ڕووی محەممەد ﷺ باران ببارێنێت! ئیتر باران دەباری. ئەم ڕووداوەش ئەوەندە بەناوبانگە، كە "عەبدولموتەللیب"لە هەندێ شیعری خۆیدا باسی كردووە[2].

* ئیمامی عومەری كوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - لە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی عەبباسی مامی پێغەمبەرەوە ﷺ لە خوا دەپاڕایەوە بۆ باران و دەیوت: "خوایە! تاكو پێغەمبەر ﷺ مابوو، ئێمە بەهۆی خۆیەوە داوای بارانمان لێ دەكردیت و تۆش بۆت دەباراندین، وا ئێستا بەهۆی مامی پێغەمبەرەكەمانەوە ﷺ داوای بارانت لێ دەكەین"[3]. بەمە بارانیان بۆ دەباری.

---

(١) رواه الطبراني واللفظ له، وابن عساكر.

(٢) ئەبووتالیبی مامیشی لە شیعرێكی خۆیدا باسی ئەمەی كردووە.

(٣) صحیح، رواه البخاري.

* ئیمامی بوخاری و موسلیم - خوایان لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە: داوا لە پێغەمبەر ﷺ کرا دوعای بارانیان بۆ بکات و خواوەند بە هانایانەوە بێت، ئەویش لە نوێژەبارانیدا داوای بارانی لە خوا کرد، یەکسەر بارانیان بۆ باری. ئەوەندەش باری کە ناچار هاتنەوە لای و سکاڵایان لە دەست باران کرد. ئەویش دوعای کرد، بارانەکە ڕاوەستا[1].

**نموونەی دووهەم:**

* بە ڕیوایەتێکی مەشهووری نزیك لە تەواتورەوە، دەگێڕنەوە کە: لەو کاتەدا ئیمانداران کەم بوون و باوەڕ و پەرستشەکانیان ئاشکرا نەدەکرد، پێغەمبەر ﷺ لە خوا پاڕایەوە کە یان بەهۆی موسڵمان بوونی "عومەری کوڕی خەتتاب"ەوە، یان بەهۆی موسڵمانبوونی ئەبووجەهلەوە، ئایینی ئیسلام سەربەرز بکات. ئەوەبوو دوعاکەی لە بارەی عومەرەوە گیرا بوو. دوعاکەش ئەوە بوو کە فەرمووی: "اللّهم أعز الإسلام بأبي جهل بن هشام أو بعمر بن الخطاب". کە ڕۆژ بووەوە، عومەری کوڕی خەتتاب هاتە خزمەتی و موسڵمان بوو[2]، ئەم موسڵمان بوونەشی بوو بەهۆی سەربەرزیی ئایینی ئیسلام. هەر لەبەر ئەمەش بە "الفاروق" ناو دەبرا.

**نموونەی سێهەم:**

* پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێ مەبەست دوعای بۆ هەندێ لە هاوەڵانی خۆی کردووە. ئەم دوعایانەش بە جۆرێکی لەعادەتبەدەر گیرا بوون، بە ڕادەیەك کە گەیشتوونەتە پلەی ئیعجاز.

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش، دەگێڕنەوە: پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی مامی کرد و فەرمووی: "اللّهم فقهه في الدين وعلّمه التأويل"[3]. ئەوەبوو لە دوای ئەم دوعایە پێی دەوترا: "حبر الأمّة" و "ترجمان القرآن". واتە: زانای نەتەوەی ئیسلام و ڕوونکەرەوەی قورئان.. ئنجا لە زانایی‌دا گەیشتە پلەیەك کە هەرچەندەش هێشتا منالْ بوو، کەچی ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێت - ڕوخسەتی دا لە کۆڕی زانا گەورەکانی هاوەڵانی پێغەمبەردا دابنیشێت.

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

(٢) صحيح، رواه الترمذي وأحمد والحاكم.

(٣) صحيح، رواه أحمد بهذا السياق وابن حبان وأورده الحاكم في المستدرك وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه (أي بهذا اللفظ). ورواه الشيخان والأئمة الآخرون بألفاظ متقاربة. واتە: خوایە! لە ئایین و تەفسیری قورئاندا شارەزای بکە.

❊ بوخاری و غەیری بوخاری لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ: دایکم عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! دوعا بۆ ئەنەسی خزمەتکارت بکە. ئەویش فەرمووی: "اللّهم أكْثِرْ مالَهُ وولدَه وبارك له فيما آتيتَه" [١]. لە ڕیوایەتەکەی عیکریمەدا ئەنەس دەفەرموێ: بە خوا سامانم تابڵێی زۆرە و، منداڵ و نەوەکانیشم نزیکی سەد کەس دەبن. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: کەس شك نابەم بە ئەندازەی من خۆش گوزەرانیی دەست کەوتبێت. بەم دوو دەستەی خۆم سەد کەسم لە منداڵەکانی خۆم ئەسپەردەی خاك کردووە. ناڵێم منداڵی منداڵم، یان ئەوەی لەبارچووە و بە مردوویی لە دایك بووە [٢]. هەموو ئەمانەش بەهۆی بەرەکەتی دوعای پێغەمبەرەوە بووە ﷺ.

❊ هەروەها ئیمامی بەیهەقی و غەیری ئەویش لە پێشەوایانی فەرموودە، دەگێڕنەوە کە: پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف" کرد [٣] - کە یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێ درا - بە بەرەکەتی ئەو دوعایە ماڵ و سامانێکی زۆری دەست کەوت. بە ڕادەیەکی وا کە جارێکیان کاروانێکی حەوت سەد حوشتریی، بە خۆیان و سوارە و بارەکانیانەوە، لە ڕێگای خوادا بەخشی [٤]! جا فەرموون سەیری بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر ﷺ بکەن و "ماشاء الله" بڵێن.

❊ بوخاری و غەیری ئەویش دەگێڕنەوە کە: پێغەمبەر ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ "عوروەی کوڕی ئەبولجوعد" کرد. جا عوروە دەفەرموێ: (لە بازاڕی "الكناسة"ی کووفەدا ڕادەوەستام، تا دەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە چل هەزارم قازانج دەکرد). ئیمامی بوخاری دەفەرموێ: ئەگەر گڵێشی بکڕیایە، کە دەیفرۆشتەوە قازانجی لێ دەکرد [٥].

❊ هەروەها دوعای بۆ "عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر" کرد کە بەرەکەت بکەوێتە کەسابەتەکەیەوە. ئەوەبوو وای لێ هات هەرچییەکی دەکڕی قازانجی لێ دەکرد [٦]، بە چەشنێك کە لە سەردەمی خۆیدا، هەروەك بە سەخاوەتمەند و دەستڕەنگینی بەناوبانگ بوو، هەروەها بە خاوەن سەروەت و سامانیش ناوبانگی دەرکردبوو.

ئەم جۆرە موعجیزانە، گەلێ نموونەی زۆریان هەیە و، ئەم چوارەمان تەنها بۆ نموونە هێنایەوە.

---

(١) واتە: خوایە! ماڵ و منداڵی زۆر بکە و، پیت و بەرەکەت بخەرە ئەوەی پێت بەخشیوە.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحـــمد.

(٣) صحيح، رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجه وأحمد.

(٤) الشفا ٣٢٦/١.

(٥) صحيح، رواه البخاري وأحـــمد والبيهقي.

(٦) صحيح، رواه أحـــمد والنسائي وأبو داود وأبو يعلى والطبراني مختصراً.

❊ ئیمامی تیرمیذی دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەر ﷺ دوعـای بۆ "سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص" کرد و فەرمووی: "اللّهم استجب لسعدٍ إذا دعاك"[١]. بەم بۆنەیەوە دوعای سەعد هەمیشە گیرابووە، بەم دوعا گیرابوونەش هێندە بەناوبانگ بووە کە خەڵکی دەترسان سەعد دوعایان لێ بکات!

❊ هەروەها پێغەمبەر ﷺ بە "ئەبوو قەتادە"ی فەرموو: "أفلحَ وجهُك، اللّهم بارِكْ له في شَعْرِه وبَشَرِهِ"[٢]. کە لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد، دەتوت تەمەنی پازدە ساڵ بووە[٣]!

❊ کاتێك شاعیری بەناوبانگ: "النابغة الجعدي" لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەم شیعرەی وت:

بلغنا السّما في مجدنا وسنائنا وإنا نريدُ فوق ذلك مظهرا[٤]

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "إلى أين يا أبا ليلى"؟ واتە: بۆ کوێ ئەبوو لەیلا؟ ئەویش وتی: "إلى الجنة يا رسول الله". واتە: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ بەهەشت.

پاشان پارچە شیعرێکی خوێندەوە کە پڕ بوو لە واتای گەورە و بەرز و بڵند. ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لا فَضَّ اللهُ فاكَ". واتە: خوا دەمت هەڵنەوەشێنێت. ئەوەبوو دەمودانی لە هی هەموو کەسێك جوانتر بوو، دانیشی دانەدەکەوت، خۆ ئەگەر داشبکەوتایە لە جێگای‌دا یەکێکی تر دەردەهات. سەد و بیست ساڵیش ژیا. هەندێك دەڵێن: زیاتریش ژیاوە[٥].

❊ ڕیوایەتێکی صەحیح دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ ئیمامی عەلی کرد و فەرمووی: "اللّهم اكفه الحرّ والقرّ". واتە: "خوایە گیان! سەرما و گەرمای لە کۆڵ بکەرەوە". ئەوەبوو هەرگیز نە سەرمای دەبوو، نە گەرما. لە زستاندا بەرگی هاوینە و، لە هاوینیشدا بەرگی زستانەی دەپۆشی[٦].

---

(١) صحيح، رواه الترمذي واللفظ له، وابن حبان والحاكم وقال: صحيح الإسناد ولم يخرجاه. واتە: خوایە! هەرکات سەعد لێت پاڕایەوە، دوعای گیرا بکە.

(٢)صحيح، رواه الحاكم. واتە: دەموچاوت سەرفراز بێت. خوایە! بەرەکەت بخەرە پێست و موویەوە.

(٣) رواه البيهقي. بڕوانە: نسيم الرياض ٣/١٢٨.

(٤) واتە: لە سەربەرزی‌دا گەیشتووینەتە ئاسمان، چاوەڕوانی لەوەش بەرزتر دەکەین پێی بگەین!

(٥) بڕوانە: شرح الشفا لعلي القاري ١/٦٦.

(٦) رواه ابن ماجه واللفظ له، والطبراني في الأوسط واسناده جيد، وابن أبي شيبة، ورواه الإمام أحمد، ضعفه محقق فضائل الصحابة، وحسنه محقق المسند للإمام أحمد ٢/١٢٠.

* (دوعای بۆ حەزرەتی "فاتیمە"ی کچی کرد کە: هەرگیز خوا برسێتیی بەسەردا نەهێنێت. حەزرەتی "فاتیمە" دەفەرموێ: پاش ئەوە هەر گیز برسیم نەبووە)(١).

* (توفەیلی کوڕی عەمر داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد نیشانە و بەڵگەیەکی بداتێ، تاکو هۆزەکەی باوەڕی پێ‌بکەن. پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کرد و فەرمووی: "اللّٰهمَ نَوِّرْ لَهُ". پاش ئەم دوعایە نوورێك لە نێوان هەردوو چاوی‌دا دەرکەوت و درەوشایەوە. پاشان وتی: خوایە! دەترسم خەڵکی بڵێن: نەنگی‌یە! ئنجا ئەو نوورە ڕۆشتە سەر نووکی دارەکەی دەستی، لە شەوی تاریکدا دەدرەوشایەوە. لەبەر ئەوە، پێیان دەوت: "ذو النور". واتە: خاوەن ڕووناکی)(٢).

ئەم ڕووداوانە هەرگیز گومان لە ڕیوایەتەکانیاندا نی‌یە.

* ئەبوو هورەیرە دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم ﷺ کرد: فەرموودەی زۆرت لێ دەبیستم کەچی لە بیرم دەچنەوە. فەرمووی بەرگەکەت ڕابخە. کە ڕامخست، دەستی پیرۆزی پیادا هێنا و پاشان فەرمووی: هەڵی بگرەوە، منیش هەڵمگرتەوە. ئیتر پاش ئەمە هیچ شتێکم لە بیرنەچووەتەوە(٣).

ئەم ڕووداوانە، هەموویان حەدیثی "مەشهوور"ن.

**نموونەی چوارەم:**

چەند نموونەیەك لە بارەی گیرابوونی چەند دوعایەکەوە باس دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ لە چەند کەسێکی کردوون:

* یەکەم: هەواڵ بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، کە: "پەروێز"ی پادشای فارس نامەکەی پێغەمبەری ﷺ لەتوپەت کردووە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "اللّٰهم مَزِّقْهُ". واتە: خوایە لەتوپەتی بکە. ئەوەبوو لەتوپەت کرا. چونکە خواوەند "شێرۆیە"ی کوڕی پادشای بەسەر باوکی‌دا زاڵ کرد و بە خەنجەر کوشتی. ئنجا سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاصیش موڵك و دەستەڵاتداری‌یەکەی لەتوپەت کرد و، بەم جۆرە هیچ شوێنەوارێکی ئەو پادشایە و سەرۆکایەتیی فارس لە دنیادا نەما(٤). بەڵام قەیسەر و پادشاکانی تر موڵك و پادشایەتی‌یان مایەوە، چونکە ڕێزی نامەکانی پێغەمبەریان ﷺ گرت.

---

(١) رواه الطبراني والبيهقي. بروانە: الشفا ٣٢٨/١.

(٢)بروانە: الشفا ٣٢٨/١، الإستيعاب ٧٥٩/٢.

(٣) صحيح، رواه البخاري والترمذي. ورواه غيرهما بسياقات أخرى.

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحمد والبيهقي.

* دووهەم: بە حەدیثی "مەشهوور"ی نزیك لە "موتەواتیرەوە" و بەوەش کە ئایەت هێمای بۆ دەکات، چەسپاوە کە: جارێکیان سەرکردەکانی قورەیش لە "المسجد الحرام"دا کۆبوونەوە و ڕەفتاری ناشیرینیان بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ نواند. ئەویش دوعای لێ کردن و لە دوعاکەشیدا ناوی هێنان. "ئیبن مەسعوود" دەفەرموێ: "بە چاوی خۆم لە غەزای بەدردا بینیم هەموویان کوژران"(١).

* سێهەم: دوعای لە "مُضَـر" کرد - کە هۆزێکی گەورە بوون - چونکە پێغەمبەریان ﷺ بە درۆ خستبووەوە. ئەوە بوو گرانی و بێبارانی تەنگیان پێ هەڵچنین، ناچار قورەیشەکان لە پێغەمبەر ﷺ پاڕانەوە دوعای ڕزگاربوونیان بۆ بکات، کە دوعای بۆ کردن، خوا بارانی بۆ ناردن(٢).

ئەم ڕیوایەتە لە تەواتورەوە نزیکە.

**نموونەی پێنجەم:**

ئەم نموونەیە بریتییە لە گیرابوونی دوعای پێغەمبەر ﷺ کە لە چەند پیاوێکی دیاری کراوی کردوون. وا لە نێوان نموونە زۆرەکانیدا سیانیان باس دەکەین:

* یەکەم: دوعای لە "عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب" کرد و فەرمووی: "اللّهم سَلِّطْ عليه كلباً مِن كلابك"(٣). لە پاش ئەم دوعایە عوتبە سەفەرێکی کرد، لەم سەفەرەدا شێرێك هات بە دوایدا دەگەڕا تا لەناو کاروانەکەدا هەڵی گرت و خواردی.

ئەم ڕووداوە بەناوبانگە و، زانایانی فەرموودە گێڕاویانەتەوە و، بە صەحیح لە قەڵەمیان داوە.

* دووهەم: پێغەمبەر ﷺ "سریە"یەکی بە سەرکردایەتیی "عامیری کوڕی ئەزبەت" بۆ جێیەك نارد و، "موحەللیمی کوڕی جەثامە"شی لەگەڵدا بوو. لە ڕێگادا موحەللیم بە غەدر عامیری کوشت. کە هەواڵ گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ، تووڕە بوو و فەرمووی: "اللّهم لا تغفِرْ لمحلِّم". واتە: "خوایە! لە موحەللیم خۆش مەبە". پاش حەوت ڕۆژ موحەللیم مرد(٤) و ناشتیان، کەچی زەوی (واتە: گۆڕەکەی) فڕێی دایە دەرەوە، پاشان ناشتیانەوە، دیسان چەند جارێکی تر فڕێی دایە دەرەوە. تا لە ئەنجامدا خستیانە ناو شیوێکەوە و، بە بەرد شیوەکەیان لەسەر پڕ کردەوە(٥)!

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحمد.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

(٣) رواه الحاكم والبيهقي وغيرهما من طرق صحيحة.

(٤) رواه أبو داود وابن ماجه وأحمد والبيهقي.

(٥) رواه أبو القاسم الأصفهاني في دلائل النبوة.

* سێهەم: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بە دەستی چەپ پارووی دەخستە دەمیەوە. پێی فەرموو: "کُل بیمینك". واتە: "بە دەستی ڕاستت بخۆ". پیاوەکە وتی: "لا أستطیع". واتە: ناتوانم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لا استطعت". واتە: "دەسا یاخوا هەر نەتوانیت". دوای ئەمە دەستی ڕاستی بۆ دەمی بەرز نەکردەوە[١].

**نموونەی شەشەم:**

وا چەند ڕووداوێکی لەعادەتبەدەری بێ گومان و چەسپاو باس دەکەین، کە بەهۆی دوعای پێغەمبەرەوە ﷺ ڕوویان داوە.

* یەکەم: پێغەمبەر ﷺ چەند تاڵێکی مووی سەری خۆی بە خالیدی کوڕی وەلیدی "شمشێری خوا" دا و، دوعای سەرکەوتنی بۆ کرد. خالیدیش ئەو تاڵە موواونەی لەناو سەرپێچەکەیدا دانا. پاش ئەوە لە هەر جەنگێکدا لەگەڵ خۆی هەڵی بگرتایە، سەرکەوتنی پێدەبەخشرا[٢].

* دووهەم: "سەلمانی فارسی" کۆیلەی جوولەکەکان بوو. ئاغاکانی پەیمانیان بۆ نووسی لە کۆیلەیی ئازادی بکەن، بە مەرجێ سێسەد شەتڵ خورمایان بۆ بڕوێنێت و سەوز بن و بەریان دەربکەوێت و بخورێت و، ئنجا چل "ئۆقیە"ش[٣] ئاڵتوونیان بداتێ.. پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و هەموو ئەو شەتڵانەی بە دەستی پیرۆزی خۆی بۆ ناشت، یەکێکیان نەبێت - کە یەکێکی تر ناشتی - هەموویان سەوز بوون ئەو یەکە نەبێت. پێغەمبەر ﷺ هەڵی کێشا و لە جێی خۆیدا سەرلەنوێ ناشتیەوە، ئنجا ئەویش سەوز بوو. "بەززار" لە کتێبەکەیدا دەگێڕێتەوە کە هەر ئەو ساڵە دارخورماکان بەرەکەیان دەرکەوت، یەکێکیان نەبێت، ئەویش پێغەمبەر ﷺ هەڵی کێشا و ناشتیەوە، هەر لەو ساڵەدا ئەویش بەرەکەی دەرکەوت.. ئنجا بە ئەندازەی هێلکەیەك ئاڵتوونی بە سەلمان دا، دوای ئەوەی کە هێنای بەسەر زمانی خۆیدا، تاکو بیبات بۆ ئاغاکانی. کە بۆی بردن، چل ئۆقیەی لەو ئاڵتوونە بۆ کێشان و، هێشتا بە ئەندازەی ئەوەی دای بەوان لەو ئاڵتوونە مایەوە![٤]

ئەم ڕووداوە، یەکێکە لەو ڕووداوە لەعادەتبەدەر و هەرە گرنگانەی کە بەسەر ژیانی حەزرەتی سەلمانی فارسیدا - خوای لێ ڕازی بێت - هاتووە و، پێشەوایانی باوەڕپێکراوی فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە.

---

(١) صحیح، رواه مسلم واللفظ له، وابن حبان والدارمي.

(٢) صحیح، رواه الحاكم واللفظ له، والطبراني وأبو یعلی.

(٣) یەك ئۆقیە یەکسانە بە نزیکەی: "٢١٣/٦ گم".

(٤) حدیث حسن، رواه أحمد واللفظ له، والبزار والطبراني والبیهقي.

❊ سێهەم: "ئوم مالیك" کە یەکێکە لە "هاوەڵان"، هیزەیەکی بوو ڕۆنی تێ دەکرد و بە دیاری بۆ پێغەمبەری ﷺ دەبرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دا کە هەڵی بگرێت و نەیگوشێت. ئنجا هیزەکەی دایەوە بە "ئوم مالیك". سەیری کرد هێشتا هەر پڕە لە ڕۆن. جا هەرکات منداڵەکانی داوای پێخۆریان لێ دەکرد، ئەگەر هیچیان نەبوایە، دەچوو بۆ لای هیزەکە و ڕۆنی لێ دەردەهێنا. بەم جۆرە مایەوە لایان، تا جارێکیان هیزەکەیان گوشی[1]، ئیتر پاش ئەوە ڕۆنیان تێدا نەبینییەوە.

**نموونەی حەوتەم:**

ئەم نموونەیە بریتییە لەوەی کە ئاوی تاڵ، بە بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر ﷺ و دەست لێدانی، بووە بە ئاوی سازگار و شیرین و بۆنی خۆشی لێ هاتووە. وا لەم بارەیەوە چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:

❊ یەکەم: ئیمامی بەیهەقی و پێشەوایانی تری حەدیث دەگێڕنەوە کە: هەندێ جار بیری "قەبا" ئاوەکەی کەمی دەکرد تا هیچی تێدا نەدەما. پێغەمبەر ﷺ لە پاشماوەی دەستنوێژی خۆی کردە ناوی. لە پاش ئەوە، ئیتر وای لێ نەهاتەوە[2].

❊ دووهەم: ئەبوو نەعیم لە "دلائل النبوة"دا و، پیاوانی تری فەرمووده، دەگێڕنەوە کە: بیرێك لە ماڵی ئەنەسدا بوو، پێغەمبەر ﷺ ئاوی دەمی خۆی ڕۆ کردە ناو ئەو بیرە و دوعای کرد. پاش ئەوە هیچ بیرێك لە مەدینەدا بە ئەندازەی ئەو بیرە ئاوەکەی خۆش و سازگار نەبوو[3].

❊ سێهەم: "ئیبن ماجە" دەگێڕێتەوە کە: "دۆڵچەیەك ئاوی زەمزەمیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەویش ئاوی لە دەمی ڕادا و کردیەوە ناوی. لە پاش ئەمە، بۆنی ئەو ئاوە لە بۆنی میسك خۆشتر بوو"[4].

❊ چوارەم: ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگێڕێتەوە کە: جارێکیان دۆڵچەیەك ئاویان لە بیرێکەوە بۆ هێنا، ئەویش ئاوی لە دەمی وەردا و کردیەوە ناوی. ئنجا ئەو دۆڵچە ئاوە کرایەوە ناو بیرەکە. لە پاش ئەوە، بۆنی ئاوی ئەو بیرە لە هی میسك خۆشتر بوو[5].

---

(١) صحيح، رواه مسلم واللفظ له، وأحمد.

(٢) رواه البيهقي. بروانە: الشفا ١/٣٣١.

(٣) الشفا ١/٣٣١.

(٤) حديث صحيح بالحديث الآتي بعده. رواه ابن ماجه وأحمد.

(٥) صحيح رواه الإمام أحمد.

* پێنجەم: "حەممادی کوڕی سەلەمە" کە یەکێکە لە پیاوە باوەڕپێکراوەکان و ئیمامی موسلیم حەدیثی لێ وەردەگرێت، دەگێڕێتەوە کە: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ کوندەیەکی لە ئاو پڕ کرد و دوعای بەسەردا خوێند و بەستی، ئنجا دای بە چەند کەسێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی و داوای لێ کردن نەیکەنەوە تا کاتی دەستنوێژ. کە لە ڕێگادا کاتی نوێژ هات، دابەزین و دەمی کوندەکەیان کردەوە، سەیریان کرد دۆیەکی خۆشی تێدایە و دەمەکەشی کەرەی لەسەرە[1]!

ئەم پێنج نموونە هەندەکی‌یەی باسمان کردن: هەندێکیان "مەشهوور"ن و چەند پێشەوایەکی گەورە گێڕاویانەتەوە. جا ئەم نموونانەی باسمان کردن، لەگەڵ ئەوانەی کە لێرەدا باسمان نەکردوون، بە یەکەوە و، بە تەواتوری مەعنەوی و، بە شێوەیەکی ڕەها، ئەم موعجیزەیە دەچەسپێنن.

**نموونەی هەشتەم:**

ئەم نموونەیە بریتی‌یە لەو مەڕانەی کە گوانیان وشك بووبوو، پاشان بە بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر ﷺ و دەستدانی لە گوانیان، لە شیر پڕبوون. ئەمەش گەلێ نموونەی زۆری لەسەر هەیە. وا ئێمەش سێ نموونەی بەناوبانگ و چەسپاویان لێ باس دەکەین.

* یەکەم: کتێبە باوەڕپێکراوەکانی باسی ژیانی پێغەمبەر ﷺ ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوە کە: ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبووبەکری صیددیقدا کۆچیان بۆ مەدینە کرد، لە ڕێگادا ڕێیان کەوتە لای ڕەشماڵەکەی "عاتیکەی کچی خالیدی خوزاعی" کە بە "ئوم مەعبەد" بەناوبانگ بوو. کە گەیشتنە ئەوێ، لای ئوم مەعبەد لایان دا. ئوم مەعبەدیش مەڕێکی لاوازی بێ شیری هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئایا شیری تێدا نی‌یە"؟ ئوم مەعبەد وتی: خوێنی تێدا نی‌یە ئیتر شیری لە کوێ بوو؟! پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەر پشت و گوانەکانی مەڕەکەدا هێنا و پاشان فەرمووی: "قاپێك بهێنن و بیدۆشن". کە دۆشی‌یان ئەوەندە شیری لێ‌هات، کە پێغەمبەر خۆی و حەزرەتی ئەبووبەکر لێیان خواردەوە و، ئەوەندەشیان لێ مایەوە کە خاوخێزانی ئەو ماڵە تا تێر بوون لێیان خواردەوە. ئەم مەڕەش هەتا ما هەر بەو جۆرە بەهێز و بەپیت بوو[2].

* دووهەم: بەسەرهاتی مەڕەکەی ئیبن مەسعوودە، کە بەم جۆرە بووە:

---

(١) الشفا ١/٣٣٤.

(٢) روي الحديث بطرق عديدة، وهو صحيح بطرقه.

ئیبن مەسعوود دەفەرموێ: شوانی ڕانمەڕی "عوقبەی کوڕی ئەبوو موعـەیت" بـووم. جارێك پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکـر بە لامدا تێپەڕ بوون. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شیرت لـە لا هەیە؟ وتم: بـەڵێ، بـەڵام کـراوم بـە ئـەمیندار لەسـەری. پێغەمبــەر ﷺ فـەرمووی: ئایـا مێیەکیش نیـیە نـێر توخنی نەکەوتبێت؟ ئیبن مەسـعوود دەفـەرموێ: شـەکەمێیەکم بـۆ هێنا، پێغەمبەریش ﷺ دەستی بە سەر گوانیدا هێنا و دوعـای کـرد، ئیـتر شـیری لــێ هاتـە خـوارەوە و شـیرەکەی دۆشــییە نـاو دەفرێکـەوە. ئنجـا لــە شـیرەکەی خــواردەوە و، دەرخواردی ئەبووبەکریشی دا[١]..

ئەم ڕووداوە بوو بە هۆی موسڵمان بوونی "ئیبن مەسعوود"، خوای لـێ ڕازی بێت.

❋ سێ‌هەم: بەسـەرهاتی مـەڕەکانی "حەلیمـەی سـەعدییە"یـە[٢]، کـە دایکـی شــیریی پێغەمبەرە ﷺ.

ئەم بەسەرهاتەش گەلـێ بەناوبانگە و، بەم جۆرە بووە:

ئەو سـاڵەی کە پێغەمبەریـان ﷺ بە منـاڵی نـاردە لای "حــەلیمە" بـۆ ئـەوەی شــیری بداتێ و خزمەتی بکـات، سـاڵێکی بێبـارانی بـوو، زەوی و زاری ئـەو ناوچەیـەش وشـك بووبوون. بـەم بۆنەیـەوە مـەڕومالاتیان لاواز بـوون و گوانیشیان وشـکی کردبـوو. بـەڵام هەر کـە پێغەمبـەر ﷺ لـەو سـاڵەدا نێرایە لای حەلیمـە، مـەڕەکانیان بـە باشـی لــەوەڕیان دەست دەکەوت و دەلەوەڕان و ئنجا شیری زۆریشـیان دەبـوو. کـەچی لـە هـەمان کـاتدا مەڕومالاتی کەسانی تـری هۆزەکـەی و ناوچەکـەی بـە پێچەوانـەوە بـوون. ئەمـەش تەنـها بەهۆی بەرەکەتی پێغەمبەرەوە بوو ﷺ.

جگە لەمانەی باسمان کردن، گەلــێ نموونـەی تر هـەن لـە کتێبـەکانی مێژووی ژیـانی پێغەمبـەردا ﷺ. بـەڵام ئەمانـەی بـاس کـران، سـەروزیادن بـۆ نموونـە و ڕوونکردنـەوەی مەبەستەکەمان.

**نموونەی نۆهەم:**

وا چـەند نموونەیـەك بـاس دەکـەین لـە نێـوان ئـەو نموونـە زۆر و بەناوبانگانـەی کـە هەموویان لەعادەت‌بەدەرن و لـەو کاتانەدا ڕوویان داوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بە سەر ڕوخسار و دەموچاوی هەندێکدا هێناوە و دوعای بۆ کردوون:

---

(١) صحيح، رواه أحـــمد.

(٢) أخرجه ابن حبان واللفظ له، ورواه ابن اسحاق وابن راهويه وابو يعلى والطبراني والبيهقي وأبو نعيـــم. ورمز محقق: "المطالب العالية" لابن حجر لحسنه.

* یەکەم: پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەری "عومەیری کوڕی سەعد"دا هێنا و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد. کاتێ کە عومەیر کۆچی دوایی کرد تەمەنی هەشتا ساڵ بوو، کەچی هێشتا نیشانەی پیریی لێ دەرنەکەوتبوو[١].

* دووهەم: پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەری "قەیسی کوڕی زەیدی جوزامی"دا هێنا و دوعای بۆ کرد. کاتێ قەیس لە تەمەنی سەد ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، سەری سپی بووبوو، بەڵام جێدەستەکەی پێغەمبەر ﷺ هەر بە ڕەشی مابووەوە. لەبەر ئەوە پێیان دەوت: "الأغرّ" واتە: سەر ماشوبرنج[٢].

* سێهەم: "عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب" بە منداڵی ناشیرین بوو. پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەر سەریدا هێنا و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد. کە گەورە بوو، بوو بە پیاوێکی کەڵەگەت و جوانچاس[٣].

* چوارەم: ڕوخساری "عائیذی کوڕی عەمر" لە ڕۆژی غەزای حونەیندا بریندار بوو، خوێنی پێدا هاتە خوارەوە. پێغەمبەر ﷺ خوێنەکەی لە ڕوخساری سڕی و دوعای بۆ کرد. ئیتر ئەو جێدەستەی وەك ناوچاوی ئەسپ سپی و دیار بوو[٤].

* پێنجەم: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بەسەر دەموچاوی "قەتادەی کوڕی میلحان"دا هێنا. لە پاش ئەوە ڕوخساری قەتادە بریقەی لێوە دەهات بە چەشنێ کە چۆن سەیری ئاوێنە دەکرێت بەو جۆرەش سەیری دەموچاوی ئەو دەکرا[٥].

* شەشەم: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەگرت، لە ئاوی دەستنوێژەکەی بە دەموچاوی "زەینەبی کچی ئوم سەلەمە"دا پرژاند کە هێشتا منداڵ بوو. لە پاش ئەوە هێندە جوان بوو، دەیانوت هیچ ئافرەتێك نەبینراوە دەموچاوی ئەوەندە جوان بێت[٦].

* * *

چەندین نموونەی تری هەندەکی هەن وەك ئەم نموونانەی باسمان کردن، کە پێشەوایانی فەرموودە گێڕاویانەتەوە و، بە گشتی تەواتوری مەعنەوی دەبەخشن و، ڕوونی دەکەنەوە کە ئەم موعجیزە ئەحمەدییە بە بێ هیچ گومانێك ڕووی داوە. تەنانەت گەر بە فەرزی

(١) الشفا ٣٣٤/١.
(٢) الشفا ٣٣٤/١.
(٣) الشفا ٣٣٥/١، الإستيعاب ٨٢٣/٢، الإصابة ٣٦/٥.
(٤) أخرجه الحاكم واللفظ له، والطبراني. بڕوانە: الشفا ٣٣٤/١.
(٥) الشفا ٣٣٤/١ ورواه الامام أحمد بغير هذا السند، ورجاله رجال الصحيح.
(٦) رواه الطبراني. بڕوانە: الشفا ٣٣٤/١.

مەحالّیش وا دابنێین کە هەریەك لەم نموونانە بە تەنها "خەبەرێکی ئاحاد" و لاوازە، ئەوا هەموویان بە یەکەوە و بە کۆمەڵی لە حوکمی تەواتوری مەعنەویدان. چونکە ئەگەر هەر ڕووداوێك لە چەند ڕێگایەکی جیاجیا و، بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر بگێڕرێتەوە، ئەوە دەگەیەنێت کە خودی ڕووداوەکە - بە بێ هیچ گومانێك - ڕووی داوە. ئەوەندە هەیە ڕیوایەتەکان و شێوەی گێڕانەوەکەیان جیاجیایە یان لاوازە.

بۆ نموونە: لە مەجلیسێکدا گوێیان لە زرمەیەك بوو. هەندێك لە ئامادەبووان وتیان: خانووی فلان کەس ڕووخا. یەکێکی تریان وتی: خانووی کەسێکی ترە ڕووخاوە. یەکێکی تریش وتی: خانووی فلانە..

بەم جۆرە، دەردەکەوێت کە هەر یەك لەم ڕیوایەتانە هەرچەند بە یەکە یەکە ئاحادن، یان لاوازن، یان پێچەوانەی واقیعن، بەڵام خودی ڕووداوە سەرەکییەکە بێ گومانە، کە بریتییە لە ڕووخانی خانوویەك.

کەواتە هەموو ئەو ڕیوایەتانەی باسمان کردن، بە گشتی و کۆمەڵ، چەسپانی ڕووداوەکە بە یەکدەنگی ڕادەگەیەنن، با یەکە یەکەشیان ئاحاد و لاواز بێت. بەڵام خۆ ئەو نموونە هەندەکییانەی هێنامانن هەموویان ڕیوایەتی صەحیحن. بەڵکو هەندێکیشیان گەیشتوونەتە پلەی "مەشهوور". جا ئەگەر بە فەرزی مەحالّیش وا دابنێین کە لاواز بن (کە وایش نییە) خۆ بە "تێکڕایی و کۆمەڵ" بەڵگەن لەسەر ڕوودان و بوونی ئەو موعجیزە ئەحمەدییەی باسیان کردووە، وەك لە نموونەکەدا ڕیوایەتەکان بوون بە بەڵگە لەسەر ڕووخانی خانوویەك.

هەروەها هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی موعجیزاتی ڕوون و ئاشکرای پێغەمبەر ﷺ، چەسپاوە و هیچ گومانێکی تێدا نییە. ئنجا نموونە هەندەکییەکانیشی بریتین لە چەند وێنە و نموونەیەکی جۆراوجۆری ئەو موعجیزە ڕەهایەی کە ڕووی داوە.

جا هەروەك دەست و پەنجە و فوو و ئاوی دەم و دوعا و گوفتاری پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، سەرچاوەی گەلێ موعجیزەی زۆری ئەون، هەر بە هەمان جۆر: گشت "لطائف" و هەست و نەست و ئەندامەکانی تریشی، سەرچاوەی چەندین موعجیزە و کاری لەعادەتبەدەری تری زۆر و زەبەندەن.

کتێبەکانی باس و مێژووی ژیانی پێغەمبەر ﷺ سەرجەمی ئەو کارە لەعادەتبەدەر و موعجیزانەیان باس کردووە و، هەموو ئەو بەڵگانەشیان ڕوون کردووەتەوە کە لە ژیان و شێوە و هەڵسوکەوت و هەستەکانی پێغەمبەردا ﷺ هەن.

## ئاماژەی پازدەهەم

هەرووەك دار و بەرد و خۆر و مانگ دەریانبڕی و ڕایانگەیاند كە پێغەمبەر ﷺ دەناسن و تەسدیقی پێغەمبەرێتی یەكەی دەكەن.. بە هەمان جۆر ئاژەڵەكان و، مردوان و، جینني و، مەلائیكەتانیش، ئەو پێغەمبەرە نازدارە ﷺ دەناسن و، بۆ مەبەستی ڕاگەیاندن و تەسدیق كردنی پێغەمبەرێتیی ئەو، چەند موعجیزەیەك دەنوێنن.
ئەم ئاماژەی پازدەهەمە، سێ لقی لێ دەبێتەوە:

### لقی یەكەم

ئەم لقە بریتی یە لەوەی كە "ڕەگەزی زیندەوەران" پێغەمبەر ﷺ دەناسن و موعجیزەكانی دەردەخەن. جا ئەم لقە نموونەی زۆری هەیە، ئێمەش لێرەدا تەنها ئەو نموونە و ڕووداوانە باس دەكەین كە "مەشهوور"ن و بە "تەواتوری مەعنەوی" چەسپاون، یان لە لایەن زانا لێكۆڵەرە پێشەواكان و نەتەوەی ئیسلامەوە قبووڵ كراون.

**ڕووداوی یەكەم:**

ئەم ڕووداوە بریتی یە لە ڕووداوی ئەشكەوتەكە، كە تا ڕادەی تەواتوری مەعنەوی بەناوبانگە و، بەم جۆرەیە:

* كاتێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ حەزرەتی ئەبووبەكری صیددیق لە ئەشكەوتەكەدا خۆیان حەشار دا تاكو لە دەست قورەیش، كە بە دوایاندا دەگەڕان، خۆیان ڕزگار بكەن، لەم كاتەدا "خواوەند فەرمانی بە دوو كۆتر دا كە لە دەرگای ئەشكەوتەكەدا ڕابووەستن[1]".

لە "حەدیث"ێكی تردا دەڵێت: جاڵجاڵۆكەش دەرگای ئەشكەوتەكەی تەنی[2]".

تەنانەت ئوبەیی كوری خەلەف - كە یەكێكە لە گەورە ناودارەكانی قورەیش و پاشان بە دەستی پێغەمبەر ﷺ لە بەدردا كوژرا - كاتێ كافرەكانی قورەیش پێیان وت: بڕۆرە ناو ئەشكەوتەكەوە بزانە لەوێن یان نا؟ پێی وتن: "چ كارێكتان بەم ئەشكەوتەیە، لە كاتێكدا هێندە تانوپۆی جاڵجاڵۆكەی پێوەیە كە من بە هی پێش لەدایكبوونی محەممەدیشی

(١) رواه الطبراني والأصبهاني والبزار.
(٢) الشفا ١/٣١٣.

دەزانم"؟! دوو کۆتریش لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا ڕاوەستابوون، کۆمەڵی قورەیش وتیان: ئەگەر ئەم ئەشکەوتە کەسی تێدا بوایە، ئەم دوو کۆترە لە دەرگاکەیدا نەدەبوون"[1]. پێغەمبەریش ﷺ لەناو ئەشکەوتەکەوە گوێی لە دەنگیان بوو. تاکو لە ئەنجامدا ڕۆشتن.

* "ئیبن وەهب" دەگێڕێتەوە کە: "لەو ڕۆژەدا فەتحی مەککە کرا، کۆترەکانی شاری مەککە سێبەریان بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ کردن"[2].

* حەزرەتی عائیشە - خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێ: "کۆترێکی ماڵیمان هەبوو، تا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە بوایە ئەو کۆترە بۆ خۆی لە جێی خۆیدا دەسرەوت؛ نە دەهات و نە دەڕۆشت، بەڵام هەر کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەردەچوو، ئەو دەکەوتە هاتوچۆ و جموجووڵ"[3]. واتە ئەو کۆترە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە و، هەتا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە بوایە، ئەو لە جموجووڵ کەوتووە.

**ڕووداوی دووهەم:**

* بریتییە لە بەسەرهاتی بەناوبانگی "گورگەکە". ئەم بەسەرهاتەش لە چەندین ڕێگاوە گێڕراوەتەوە، بە ڕادەیەك کە حوکمی تەواتوری وەرگرتووە. ئەم ڕووداوە سەیرە، لە گەلێ ڕێگای زۆر و لە هاوەڵە بەناوبانگەکانەوە وەرگیراوە، وەك: ئەبوو سەعیدی خودری[4]، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع[5]، ئیبن ئەبی وەهب، ئەبوو هورەیرە[6]، هەروەها ئەو هاوەڵەش کە بەسەرهاتەکەی بەسەردا هاتووە، کە ناوی: "ئوهبان"ی شوانە[7].

هەموو ئەوانە، لە چەند ڕێگایەکی جیاجیاوە دەگێڕنەوە کە:

لەو کاتەدا شوانێك خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکانی بوو، گورگێك هەڵمەتی بۆ یەکێك لە مەڕەکانی برد. شوانەکەش مەڕەکەی لە دەست ئەو گورگە دەرباز کرد. ئنجا گورگەکە لەولاوە هەڵتروشکا و کەوتە قسەکردن و بە شوانەکەی وت: "ئایا لە خوا

(١) الشفا ١/٣١٣.
(٢) الشفا ١/٣١٣.
(٣) صحيح، رواه أحـمد والبزار وأبو يعلى والبيهقي والطبراني.
(٤) رواه ابن حبان والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.
(٥) رواه الأصبهاني في دلائل النبوة.
(٦) صحيح رواه البخاري ومسلم.
(٧) رواه البخاري في التأريخ الكبير والبيهقي وأبو نعيم.

ناترسیت و ا نەتهێشت ڕۆژی‌یەکەم بخۆم"؟ شوانەکەش وتی: "شتێکی سەیرە! گورگ وەك مرۆڤ قسە بکات". گورگەکەش وتی: "لەوە سەیرترت پێ بڵێم؟ لەوە سەیرتر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە "مەدینە"دا دەنگوباسی ئەوانەی پێشوو دەگێڕێتەوە و، دەرگاکانی بەهەشتی بۆ خراوەتە سەرپشت و، ئێوەی بۆ بانگ دەکات تاکو لێیانەوە بڕۆنە ژوورەوە".

جا هەرچەند هەموو ئەو ڕێگا و ڕیوایەتانەی کە ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوە، لەسەر قسەکردنی گورگەکە یەکدەنگن، بەڵام بەهێزترینیان ئەو ڕیوایەتەیە کە ئەبوو هورەیرە - خوای لێ ڕازی بێت - دەیگێڕێتەوە. لەم ڕیوایەتەدا دەفەرموێ: "لەو کاتەدا کە ئەو گورگە وای بە شوانەکە وت، شوانەکە وتی: جا کێ سەرپەرشتیی مەڕەکانم بۆ دەکات تا دەڕۆم و دێمەوە؟ گورگەکە وتی: من! شوانەش مەڕەکانی پێ سپارد و ڕۆشت. ئنجا لە ڕیوایەتەکەدا بە درێژی بەسەرهاتەکەی و موسڵمان بوونی و بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەری ﷺ لە کاتی جەنگدا، گێڕاوەتەوە[1]. پاشان کە گەڕاوەتەوە بۆ لای مەڕەکانی، سەیری کردووە گورگەکە وەك شوانێکی دەستپاك سەرپەرشتیی مەڕەکانی کردووە و ژمارەیان کەمی نەکردووە، ئنجا لە پاداشتی ڕێنمایی کردنەکەی‌دا مەڕێکی بۆ گورگەکە سەربڕیوە.

* لە ڕێگایەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە کە: جارێکیان ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب و صەفوانی کوڕی ئومەییە، شتێکی سەیریان بەسەرهات، ئەوەبوو گورگێکیان دی کەوتبووە شوێن ئاسکێك، ئاسکەکەش خۆی کرد بە "حەرەم"دا و ئیتر بەمە گورگەکە وازی لێ هێنا! ئەوانیش سەریان لەم کارە سووڕما! گورگەکە هاتەزمان و وتی: "سەرتان سووڕ نەمێنێت، لەمە سەیرتر محەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە ﷺ لە مەدینە، بانگتان دەکات بۆ بەهەشت".

ئەبووسوفیان بە صەفوانی وت: "سوێند بە (لات) و (عوززا) ئەگەر ئەمە لە مەککەدا باس بکەیت، کەسی تێدا نامێنێت و چۆڵ دەبێت"[2]!

لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەسەرهاتی ئەم گورگە، وەك تەواتوری مەعنەوی، قەناعەت و دڵنیایی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

---

(١) صحيح، رواه أحمد وغيره.

(٢) الشفا ٣١١/١، نسيم الرياض ٨٤/٣.

**ڕووداوی سێهەم:**

❊ ئەم ڕووداوە بریتی‌یە لە بەسەرهاتی ئەو حوشترەی کە لە پێنج شەش ڕێگاوە لە هاوەڵە بەناوبانگەکانەوە گێڕراوەتەوە، وەك: ئەبووهورەیرە، ثەعلەبەی کوڕی مالیك، جابیری کوڕی ئەبووئەوفا و، چەند کەسێکی تریش لە هاوەڵانی وەك ئەمان. جا هەموو ئەم هاوەڵانە لەوەدا یەکدەنگن کە: حوشترەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و سوژدەی ڕێزی لە بەردەمدا برد و قسەی لەگەڵ کرد.

هەر ئەم هاوەڵانە لە چەند ڕێگا و ڕیوایەتێکی تردا، دەگێڕنەوە کە: ئەو حوشترە لە باخێکدا هەڵچووبوو، هەر کەسیش بڕۆشتایەتە ناو باخەکە هەڵمەتی بۆ دەبرد، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتە ناو ئەو باخە، حوشترەکەی بانگ کرد و دەمولمۆزی پێ نایە سەر زەوی و لەغاوی لە دەم کرد(١).

لە فەرموودەیەکی تردا دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لێی پرسین: بۆچی وا ئەو حوشترە هەڵچووە؟ لە وەڵامدا عەرزیان کرد: ویستمان سەری ببڕین(٢).

ڕیوایەتێکی تر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم حوشترە سکاڵای ئەوەی لە لا کردم کە لەو کاتەوە بچووك بووە تا ئێستا لە ئیشوکاری قورسدا کارتان پێ کردووە و، ئێستاش ویستووتانە سەری ببڕن. لە وەڵامدا عەرزیان کرد: بەڵێ وایە.

❊ هەروەها حوشترەکەی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی: "العضباء" بووە، لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ هیچی نەخوارد و نەخواردەوە هەتا مرد(٣).

ئەبوو ئیسحاقی ئیسفراینی، باسی ئەوە دەکات کە ئەم حوشترە(العضباء) لە کارێکی گرنگدا قسەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد.

❊ لە ڕیوایەتێکی صەحیح دا(٤) چەسپاوە کە: حوشترەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری لە سەفەرێکدا ماندوو بوو نەیتوانی بڕوات. پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە هێواشی چیلکەیەکی لێ دا، حوشترەکە یەکسەر کەوتەڕێ، بە ڕادەیەکی وا کە جڵەوەکەی لە دەست جابیر دەرچووبوو. ئەمەش بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتە نەرمونیانەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی‌دا نواندی.

---

(١) أحاديث تكلم الجمل وردت بأسانيد صحيحة وجيدة.

(٢)صحيح، رواه أحمد بإسناد جيد، وأخرجه الحاكم وقال صحيح الإسناد و لم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

(٣) الشفا ٣١٣/١.

(٤) صحيح، رواه الشيخان.

رووداوی چوارەم:

❊ ئیمامی بوخاری و پێشەوایانی تری فەرمووده دەگێڕنەوە کە: "شەوێك دانیشتووانی مەدینە لە دەنگێك ڕاچڵەکین، هەندێکیان ڕووەو دەنگەکە ڕۆشتن، لە ڕێگادا گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ کە لەوسەرەوە دەهاتەوە و پێش ئەوان بەرەو دەنگەکە ڕۆشتبوو، دەیفەرموو: مەترسن شتێکی ئەوتۆ نی‌یە مەترسیی بیێت. پێغەمبەر ﷺ بە سواری ئەسپەکەی ئەبووتەلحە بەرەو دەنگەکە ڕۆشتبوو، کە ئەسپەکەش زینی لەسەر نەبوو شمشێرێکیش کرابووە ملی"(١). پاشان بە ئەبووتەلحەی فەرموو: "إنا وجدنا فرسك بحراً". واتە: ئەسپەکەت زۆر تیژڕەوە. ئەم ئەسپەش زووتر لە ڕۆشتندا زۆر سست بوو، بەڵام پاش ڕووداوی ئەم شەوە، هیچ ئەسپێکی تری پێ نەدە گەیشتەوە.

❊ بە ڕیوایەتێکی صەحیح چەسپاوە کە: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا هەڵسا نوێژ بکات، بە ئەسپەکەی خۆی فەرموو: خوا فەڕ و بەرەکەتت پێ ببەخشێت، لە جێی خۆت مەجووڵێ هەتا نوێژەکەمان دەکەین. ئەمەی فەرموو، ئنجا لە ڕووی قیبلەوە داینا. هەتا پێغەمبەر ﷺ لە نوێژ بووەوە ئەو ئەسپە هیچ ئەندامێکی خۆی نەجووڵاند(٢).

رووداوی پێنجەم:

❊ ئەویش بریتی یە لە ملکەچ بوونی شێرێك بۆ "سەفینە" کە بەندەی ئازادکراوی پێغەمبەرە ﷺ. ڕووداوەکەش بەم جۆرە بووە:

(پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بە سەفینەدا بۆ "موعاذ" نارد لە یەمەن. لە ڕێگادا شێرێك ڕێی پێ گرت. سەفینەش خۆی بە شێرەکە ناساند کە نێرراوی پێغەمبەرە و نامەی ئەوی پێ‌یە. شێرەکەش دەنگێکی لێ هات و ڕێی بۆ چۆڵ کرد. لەو سەریشەوە کە گەڕایەوە، هەمان شتی بەسەرهات)(٣). لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: سەفینە لە گەڕانەوەکەیدا ڕێی ون کرد، لەو کاتەدا شێرەکەی پێ گەیشتەوە. سەفینە دەڵێت: بە شان ئاماژەی بۆ دەکردم تا خستمیەوە سەر ڕێ.

❊ لە حەزرەتی عومەریشەوە ڕیوایەت کراوە کە جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لەناو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا بوو، پیاوێکی دەشتەکی بزنمژەیەکی گرتبوو، وتی: ئەوە کێ‌یە؟ وتیان ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ. ئەویش وتی: سوێند بە (لات) و (عوززا) باوەڕت پێ

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجه وأحمد.
(٢) الشفا ١/٣١٥، نسيم الرياض ٣/٩٥.
(٣) صحيح، رواه البزار والطبراني والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم و لم يخرجاه.

ناكه‌م تا ئه‌م بزنمژه‌یه باوه‌ڕت پێ نه‌هێنێت. ئه‌مه‌ی وت و بزنمژه‌كه‌ی خسته به‌رده‌م پێغه‌مبه‌ر ﷺ. پێغه‌مبه‌ریش ﷺ پێی فه‌رموو: بزنمژه‌كه! من كێم؟، ئه‌ویش هاته زمان به جۆرێ كه هه‌موو خه‌ڵكه‌كه گوێیان لێ بوو، وه‌ڵامی دایه‌وه وتی: به‌ڵێ، له خزمه‌تتدام[1]! بهمه پیاوه ده‌شته‌كی‌یه‌كه ئیمانی هێنا.

❋ له "ئوم سه‌له‌مه"شه‌وه ده‌گێڕنه‌وه كه ده‌فه‌رموێ: "جارێكیان پێغه‌مبه‌ر ﷺ له بیابانێكدا بوو، له‌و كاته‌دا ئاسكێك بانگی كرد: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا!"... تا كۆتایی حه‌دیثه‌كه، كه تیای‌دا ده‌ڵێت: "ئاسكه‌كه ڕای ده‌كرد و ده‌یوت: أشهد ان لا إله الاّ الله، وأنك رسول الله"[2].

چه‌ندین نموونه‌ی تری زۆری هاوچه‌شنی ئه‌مانه هه‌ن، ئێمه لێره‌دا ته‌نها ئه‌وانه‌مان باس كردووه كه "مه‌شهوور" و بێ گومانن.

ده‌سا ئه‌ی كاكی مرۆڤ! ئه‌ی ئه‌و كه‌سه‌ی كه ئه‌م پێغه‌مبه‌ره نازداره ﷺ ناناسێت و گوێڕایه‌ڵیی ناكات! په‌ند وه‌ربگره! هه‌وڵ بده دانه‌به‌زیته پله‌یه‌ك كه له هی گورگ و شێر نزمتر بێت، چونكه ئه‌و ئاژه‌ڵانه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌ناسن و گوێڕایه‌ڵیی ده‌كه‌ن!

## لقی دووهه‌م

ئه‌م لقه بریتی‌یه له‌وه‌ی كه "مردووان" و "جنۆكه" و "مه‌لائیكه‌تان" پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌ناسن. له‌م باره‌یه‌وه گه‌لێ ڕووداوی زۆر هه‌یه، ئێمه چه‌ند دانه‌یه‌كیان بۆ نموونه باس ده‌كه‌ین، له‌وانه‌ی كه "مه‌شهوور"ن و، پێشه‌وا باوه‌ڕپێكراوه‌كان بۆیان باس كردووین. وا له پێشدا ئه‌و نموونانه باس ده‌كه‌ین كه په‌یوه‌ندی‌یان به "مردووان"ه‌وه هه‌یه. ئه‌وانه‌شیان په‌یوه‌ندی‌یان به جینني و مه‌لائیكه‌ته‌وه هه‌یه، ئه‌وا گه‌لێ زۆر و موته‌واتیرن.

**نموونه‌ی یه‌كه‌م:**

ئیمام حه‌سه‌نی به‌صری، كه پێشه‌وای زانایانی ئاشكرا و په‌نهانه و ڕاستگۆترینی قوتابی‌یانی ئیمامی عه‌لی‌یه له سه‌رده‌می تابیعینه‌كاندا، ده‌گێڕێته‌وه و ده‌فه‌رموێ: پیاوێك هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و عه‌رزی كرد كه كچێكی مردووه و له فلان شیودا ناشتوویه‌تی. پێغه‌مبه‌ر ﷺ دڵی بۆی نه‌رم بوو، له‌گه‌ڵی‌دا ڕۆشت بۆ ئه‌و شیوه. له‌وێ

---

(١) رواه الطبراني. بروانه: نسيم الرياض ٣/٧٩.

(٢) رواه الطبراني والبيهقي، وصححه ابن حجر لوروده من طرائق أُخر.

کچەکەی بە ناوی خۆیەوە بانگ کرد و فەرمووی: ئەی فلانە کەس! بە ئیزنی خوا وەلامم بدەرەوە. ئەویش هاتە دەرەوە و وتی: "لبيك وسعديك". پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایك و باوکت موسڵمان بوون، جا ئەگەر حەز دەکەیت دەتگێڕمەوە بۆ لایان. لە وەڵامدا وتی: هیچ ئیشێکم پێیان نییە، خوا باشترە بۆم تا ئەوان[1].

**نموونەی دووهەم:**

ئیمامی بەیهەقی و ئیبن عەدی، بە سەنەدەوە دەگێڕنەوە کە ئەنەسی کوڕی مالیك فەرموویەتی: (لاوێك کە تاقانەی دایکە پیرەژنە کوێرەکەی بوو، کۆچی دوایی کرد. ئێمەش بە پارچەیەك دامانپۆشی و سەرەخۆشیمان لە دایکی کرد. پیرەژنە وتی: کوڕی من؟! وتمان: بەڵێ. وتی: "خوایە! ئەگەر خۆت دەزانیت من تەنها کۆچم بۆ لای خۆت و پێغەمبەرەکەت کردووە، بۆ ئەوەی لە هەموو تەنگ وچەڵەمەیەکی ژیاندا یارمەتیم بدەیت، ئەوا تووشی ئەم موسیبەتەم مەکە". ئەنەس دەفەرموێ: پێش ئەوەی هەڵبسین، کوڕەکە پارچەکەی لەسەر خۆی لابرد و هەڵسا و نانی خوارد و، ئێمەش بەشداریمان کرد)[2].

ئیمامی بوصیری - خوای لێ ڕازی بێت - لە قەسیدەی بوردەدا ئاماژەی بۆ ئەم ڕووداوە سەرسووڕهێنەرە کردووە، دەفەرموێ:

لو ناسبت قدرَه آياتُه عظماً أحيا اسمُه حين يُدعى دارسَ الرممِ

**ڕووداوی سێهەم:**

ئیمامی بەیهەقی و غەیری ئەویش، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصارییەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: (من یەکێك بووم لەوانەی کە "ثابیتی کوڕی قەیس"یان ناشت، کە لە غەزای یەمامەدا شەهید بوو، لەو کاتەدا کە خستمانە ناو گۆڕەکەیەوە گوێمان لێبوو دەیوت: "محمد رسول الله، أبوبكر الصديق، وعمر الشهيد، وعثمان البرّ الرحيم". کە سەیرمان کرد، بینیمان گیانی تێدا نییە)[3]. واتە پێش ئەوەی حەزرەتی عومەریش ببێت بە جێنشین، ئەم هەواڵی شەهیدبوونی ئەوی دا.

---

(١) بڕوانە: الشفا ١/٣٢٠، نسيم الرياض ٣/١٠٦.

(٢) ضعيف، رواه البيهقي والطبراني. بڕوانە: الشفا ١/٣٢٠.

(٣) رواه البخاري في التأريخ الكبير. بڕوانە: الشفا ١/٣٢٠.

**ڕووداوی چوارەم:**

"نوعمانی كوڕی بەشیر، دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (زەیدی كوڕی خاریجە لە یەكێك لە كۆڵانەكانی مەدینەدا كەوت بەلادا و مرد، خەڵكەكەش هەڵیان گرت و دایانپۆشی. لە نێوان شێوان و خەوتناندا كە ژنان بەسەریدا دەگریان، گوێیان لێ‌بوو دەیوت: بێدەنگ بن! بێدەنگ بن! ئنجا سەری خۆی هەڵدایەوە و وتی: "محمد رسول الله". پاشان وتی: "السلام علیك یارسول الله ورحمة الله وبركاته". پاشان مردەوە)[1].

جا ئەگەر مردووی بێ ژیان تەسدیقی پێغەمبەریتیی پێغەمبەر ﷺ بكات، دەبێ ئەوانەی كە گیانیان تێدایە و تەسدیقی ناكەن، چۆن بن؟ ئایا ئەو قوڕبەسەرە زیندووانە، لەو مردووانە بێ گیانتر نین؟!

* * *

سەبارەت بەوەی كە "مەلائیكەتان" خزمەتی پێغەمبەریان ﷺ كردووە و خۆیان پیشان داوە، هەروەها سەبارەت بەوەش كە "جیننی" ئیمانیان پێ هێناوە و گوێڕایەڵی‌یان كردووە، ئەوا هەموو ئەمانە بە تەواتور چەسپاون. قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتی پیرۆزیدا بە ڕاشكاوی باسی ئەمەی كردووە و، لە غەزای بەدردا - وەك قورئان دەفەرموێ - پێنج هەزار مەلائیكەت وەكو هاوەڵان لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون. بە ڕادەیەك كە ئەو مەلائیكەتانە لەناو مەلائیكەتانی تردا، شەرەفمەندیی بەشداری كردنی غەزای بەدریان دەست كەوت، وەك ئەو هاوەڵانەی كە لە بەشداری كردنی ئەم غەزایەدا بەو پلەیە بەهرەوەر بوون.

جا لەم مەسەلەیەدا دوو لایەن هەیە:

*یەكەم:* بریتی‌یە لە بوونی "جیننی" و "مەلائیكەت" و پەیوەندی‌بوونیان لەگەڵماندا. ئەمەش شتێكی قەتعی‌یە و وەك بوونی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر بێ گومان و چەسپاوە. ئەمەشمان بە یەقینێكی تەواوەتی و گومانبڕ لە "وتەی بیست و نۆهەم"دا باس كردووە. كەواتە بۆ لایەنی چەسپاندنی بوونیان داوا لە خوێنەری بەڕێز دەكەین سەر لەو وتەیە بدات.

---

(١) صحيح، رواه الحاكم والبيهقي والطبراني باسنادين رجال أحدهما ثقات وذكره البخاري في التأريخ الكبير مختصراً.

*لایەنی دووهەم:* بریتییە لە بینینی مەلائیکەت و جینني و قسە لەگەڵکردنیان لە لایەن چەند کەسێکی ئەم نەتەوەیەوە، بەهۆی شەرەفمەندیی پەیوەندییان لەگەڵ پێغەمبەری نازداردا ﷺ. کە ئەمەش لایەنێکی شوێنەوارەکانی موعجیزاتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەردەخات.

❊ ئەوەتا بوخاری و موسلیم و پێشەوایانی فەرمووده، هەموویان، لە حەزرەتی عومەرەوە – خوای لێ ڕازی بێت – دەگێڕنەوە دەفەرموێ:

(ڕۆژێکیان کە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، لە پڕ پیاوێك کە بەرگەکانی بەری یەکجار سپی و مووی جەستەی تەواو ڕەش بوو، هیچ شوێنەوارێکی سەفەریشی پێوە دیار نەبوو، کەسیشمان نەماندەناسی، هات لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشت و پرسیاری لە بارەی: ئیسلام و ئیمان و ئیحسانەوە لە پێغەمبەر ﷺ کرد و، ئەویش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە. پاشان فەرمووی: عومەر! ئایا دەزانیت ئەوە کێیە ئەو پرسیارانە دەکات؟ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. فەرمووی: ئەوە جوبریلە، بۆ ئەوە هات، کە ئایینەکەتان فێر بکات)[1].

❊ هەروەها بە چەند ڕیوایەتێکی صەحیح و بێ گومان کە لە پلەی تەواتوری مەعنەویدان و پێشەوایانی حەدیث ڕیوایەتیان کردوون، چەسپاوە کە: زۆر جار هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ جوبریلیان لەسەر شێوەی هاوەڵی بەڕێز "دحية الكلبي"دا دەبینی کە پیاوێکی گەلێ جوانخاس بووه[2]. هەندێ لەو هاوەڵانە، ئەمانە بوون: ئیمامی عومەر، ئیبن عەبباس، ئوسامەی کوڕی زەید، حاریث، عائیشە، ئوم سەلەمە، خوایان لێ ڕازی بێت. هەموو ئەمانە دەفەرموون: زۆر جار جوبریلمان لەسەر شێوەی "دحية الكلبي"دا دیوه. جا ئایا دەگونجێ شتێکیان نەدیبێت، بڵێن: دیومانە؟!

❊ بە سەنەدێکی صەحیحەوە لە "سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاصەوە"، کە یەکێکە لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێ درا و، فاتیحی وڵاتی فارسە، خوای لێ ڕازی بێت، دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ:

---

(١) صحيح، رواه مسلم.

(٢) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحمد والحاكم والطبراني.

(لە غەزای ئوحوددا جوبریل و میکائیلمان لە لای ڕاست و چەپی پێغەمبەرەوە ﷺ دەبینی، کە لەسەر شێوەی دوو پیاودا بوون و بەرگ و پۆشاکی سپییان لەبەردا بوو، بەو شێوەیە پاسەوانی پێغەمبەر ﷺ بوون و، پارێزگارییان دەکرد)[1].

جا ئەگەر پاڵەوانێکی موسڵمانی وەکو "سەعد" بڵێت: "دەمانبینی" ئایا هەرگیز دەگونجێ وا نەبێت و بە پێچەوانەوە بێت؟

* پاشان ئەبووسوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموتەلیب کە ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ، لە ڕۆژی غەزای بەدردا، چەند پیاوێکی سپیی لە نێوان زەوی و ئاسماندا بینی، کە سواری چەند ئەسپێکی بەڵەك بووبوون[2].

* جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە کەعبەدا جوبریلی پیشانی حەمزە دا، ئەویش یەکسەر بووراییەوە[3].

کەواتە ئەو نموونانەی بینینی مەلائیکەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، تەواو زۆرن. هەموو ئەم ڕووداوانەش جۆرێکمان لە موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەردەخەن و، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مەلائیکەتەکان وەك پەپوولە بە دەوری نووری پێغەمبەرێتیی ئەودا دەخولێنەوە.

* * *

سەبارەت بە بینین و قسە لەگەڵ کردنی "جیننی"ش، ئەوا زۆر جار ڕوو دەدات. تەنانەت لەگەڵ زۆربەی خەڵکیشدا، چ جای هاوەڵەکان، خوایان لێ ڕازی بێت. ئەوەندە هەیە کە پێشەوایانی فەرموودە، ڕاستترین هەواڵ و چەسپاوترین ڕووداومان بۆ دەگێڕنەوە.

* "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود" لەو شەوەدا کە "جیننی" ئیمانیان هێنا، جیننیی بینی و قسەیانی بیست و، دەیشوبهاندن بە پیاوانی (زەط)[4]، کە تیرەیەکی کەڵەگەتی خەڵکی سوودانن.

* پاشان ڕووداوێکی بەناوبانگ هەیە، کە زانایان و پێشەوایانی فەرموودە دەیگێڕنەوە و باوەڕی پێ دەکەن، کە بریتی یە لەوەی: "خالیدی کوڕی وەلید - خوای لێ ڕازی بێت - کاتێ کە بتی: "العُزّى"ی ڕووخاند، ئافرەتێکی ڕووتی ڕەشی بینی قژی

---

(١) صحيح، رواه الشيخان.

(٢) رواه البزار في مسنده: ٩/٣١٧-٣١٨.

(٣) رواه البيهقي مرسلاً وابن سعد في الطبقات ٣/١٢. بڕوانە: الشفا ١/٣٦٢.

(٤) صحيح، رواه الترمذي واللفظ له وقال: حسن صحيح غريب، ورواه أحمد والطبراني.

بڵاو كردبووەوە و لەناو بتەكەوە هاتە دەرەوە، یەكسەر بە شمشێرەكەی لەتی كرد. پاشان ئەمەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: "ئەوە عوززا بووە"(١) كە خەڵكی دەیانپەرست كاتێ لەناو بتەكەدا بوو، لە دوای ئەوە ئیتر ناپەرسترێت.

* لە حەزرەتی عومەری كوڕی خەتتابەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە دەفەرموێ: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێكی پیر هات و دارعەسایەكی بە دەستەوە بوو، سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ كرد و، ئەویش وەڵامی سەلامەكەی دایەوە و، فەرمووی: ئەم دەنگە لە دەنگی "جیننی" دەچێت، تۆ كێیت؟ وتی: من "هامە"م.. لە "حەدیث"ێكی درێژدا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ چەند سوورەتێكیشی لە قورئانی پیرۆز فێر كرد(٢).

ئەم ڕووداوە هەرچەند لە لایەن پیاوانی حەدیثەوە ڕەخنەی لێ گیراوە، بەڵام چەند پێشەوایەكی تر بە صەحیحیان داناوە(٣). هەرچۆن بێت بە پێویستی نازانین زۆری لەسەر بڕۆین، چونكە نموونەی ئەم بابەتە گەلێ زۆرە.

دەبێ ئەوەش بڵێین كە:

ئەو كەسانەی بە نووری پێغەمبەر ﷺ ڕووناك بوونەوە و لەسەر بەرنامەكەی ئەو پەروەردە بووبوون، كە لە هەزاران كەس تێپەڕ دەبن، لە ئەولیا و ئەقتاب و زانایان و پیاوچاكانی وەك شێخی گەیلانی، هەموو ئەمانە، بە "مەلائیكەت" و "جیننی" گەیشتوون و قسەیان لەگەڵدا كردوون. ئەم ڕیوایەتانەش كە لەم بارەیەوە هەن، تابڵێی موتەواتیر و زۆر و گومانبڕن.

بەڵێ، گەیشتنی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بە "مەلائیكەت" و "جیننی" و قسەكردنیان لەگەڵیاندا، یەكێكە لە شوێنەوارەكانی پەروەردەی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ و ڕێنماییە بێوێنەكەی.

---

(١) صحيح، رواه البيهقي والنسائي وأبو يعلى.

(٢) رواه البيهقي.

(٣) "ابن الجوزي" لە بارەی ئەم فەرموودەیەوە دەڵێت: "موضوع لا أصل له". بەڵام زانایانی تر دەڵێن: "تعدد طرقه يدل على صحته". بڕوانە: نسيم الرياض للخفاجي ٣/٢٨٧.

## لقی سێهەم

پاراستن و پارێزگاری کردنی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خوای گەورەوە، موعجیزەیەکی ئاشکرا و ڕاستی‌یەکی یەکجار ڕوونە و، لە دەقی ئەم ئایەتەی قورئاندا باس کراوە کە دەفەرموێ:

﴿واللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدة:٦٧)!

جا لەم ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزاتی زۆر هەیە، چونکە لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەرێتیی خۆی ڕاگەیاند، تەحەددای تەنها تاقمێك، یان نەتەوەیەك، یان چەند پێشەوایەکی ڕامیاری، یان چەند کاربەدەستێکی دیاری کراوی نەکردووە، بەڵکو تەحەددای هەموو دەستەڵاتداران و خاوەن ئایینەکانی بە گشتی کردووە، لە کاتێکدا کە جگە لە خوا هیچ پارێزگارێکی نەبووە، تەنانەت مام و خزم و کەسوکار و تیرەکەشی دوژمنی بوون. کەچی سەرەڕای ئەمەش، بیست و سێ ساڵی ڕەبەق، بە بێ هیچ پاسەوانێك، ژیانی بەسەر برد و چەندین ڕووداوی سامناکیشی لەو ماوەیەدا بەسەرهات، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، هەر تەنها خواوەند دەیپاراست و، تا ئەو دەمەی کۆچی دوایی کرد بەوپەڕی دڵنیایی و ئاسوودەیی‌یەوە ژیا. ئەمەش بە وێنەی ڕووناکیی خۆری گەشی ئاسمان، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر دامەزراوی و بەهێزیی ئەو ڕاستی‌یەی کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەیە:

﴿واللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدة:٦٧)!

لێرەدا - بۆ نموونە - چەند ڕووداوێك باس دەکەین، لەوانەی کە بە شێوەیەکی گومانبڕ چەسپاون:

**ڕووداوی یەکەم:**

❊ زانایانی فەرموودە و شارەزایانی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بە یەکدەنگی دەگێڕنەوە کە: لەو کاتەدا قورەیش کۆبوونەوە و بڕیاری کوشتنی پێغەمبەریان ﷺ دا، شەیتان لە شێوەی پیاوێکی پیردا هات بۆ لایان و ڕێنمایی کردن کە: لە هەر تیرەیەکی قورەیش یەکێك بەشداریی کوشتنی بکات، بۆ ئەوەی لە پاشاندا ناکۆکی نەکەوێتە نێوانیان. ئەوەبوو نزیکەی دووسەد پیاو بە پێشەوایەتیی: "ئەبوو جەهل" و "ئەبوو لەهەب"، بەرەو ماڵی پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتن. لەو کاتەشدا حەزرەتی عەلی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوو. بە

فەرمانی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عەلی لە جێی پێغەمبەردا ﷺ نوست و، پێغەمبەر ﷺ خۆیشی چاوەڕوانی ئەوانی کرد، تا ئەو کۆمەڵەی قورەیش هاتن و دەوروپشتی ماڵەکەیان گرت. ئنجا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی لە ماڵ هاتەدەرەوە و بەسەر سەریانەوە ڕاوەستا و، خواوەند چاوی ئەوانی لە ئاستیدا کوێر کرد. ئنجا پێغەمبەر ﷺ مشتێك خاکی بەسەر دەموچاویاندا وەشاند و خۆی دەرباز کرد[1].

* هەروەها خواوەند پێغەمبەرەکەی خۆی لەوە پاراست کە کافران لە ئەشکەوتەکەدا ببینن، بە بۆنەی ئەو جاڵجاڵۆکەیەوە کە ناردی و دەرگای ئەشکەوتەکەی تەند و، ئەو دوو کۆترەش کە لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا ڕاوەستان[2].

**ڕووداوی دووهەم:**

* ئەم ڕووداوە بریتییە لە بەسەرهاتی "سوراقەی کوڕی مالیك" کە لە کاتی کۆچی پێغەمبەردا ﷺ بۆ مەدینە، ڕووی دا.. ئەوەبوو هۆزی قورەیش خەڵات و بەخششی بۆ ئەو کەسە ڕاگەیاند کە هەواڵی پێغەمبەر و ئەبووبەکریان بداتێ، یان بیانکوژێت، یان بە زیندوویی بیانگرێت.

سوراقەش کە ئەم ڕاگەیاندنەی قورەیشی پێ گەیشت، یەکسەر بە سواری ئەسپەکەی شوێن پێی پێغەمبەری ﷺ هەڵگرت، تا نزیکی پێغەمبەر ﷺ بووەوە. لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ کرد، یەکسەر چوارپەلی ئەسپەکەی لە زەویدا ڕۆچوو و لەسەری کەوتە خوارەوە. پاشان سوار بووەوە و ڕۆشت تا ئەوەندە لێیان نزیك بووەوە، کە گوێی لە پێغەمبەر بوو ﷺ قورئانی دەخوێند و لاشی لێ نەدەکردەوە. بەڵام حەزرەتی ئەبووبەکر لای کردەوە و، عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد: وا گەیشتنە سەرمان. ئەویش، هەروەك لەناو ئەشکەوتەکەدا پێی وت، لێرەشدا فەرموویەوە: "لا تحزن إنّ الله معنا". لەم کاتەدا هەر چوارپەلی ئەسپەکەی سوراقە بۆ جاری دووهەم تا ئەژنۆی ڕۆچوو بەناو زەویدا و لەسەری کەوتە خوارەوە. پاشان زۆری لێ کرد و هەڵیساندەوە، سەیری کرد چوارپەلی ئەسپەکەی شتێکی وەك دووکەڵی لێ هەڵدەسا! ئنجا بانگی لە پێغەمبەر ﷺ و حەزرەتی ئەبووبەکر کرد و وتی: "الأمان"! پێغەمبەریش ﷺ ئەماننامەیەکی بۆ

(١) صحيح، رواه الإمام أحـمد.
(٢) رواه الطبراني والبزار والأصبهاني.

نووسی و فەرمانی دایێ کە هەرکەسێکی دی ڕێی لێ ون بکات، تاکو نەکەوێتە شوێنیان. پاشان وازی لێ هێنان و ڕۆشت[١].

❋ لە خەبەرێکی تردا دەگێڕنەوە کە شوانێك دەنگوباسی پێغەمبەر ﷺ و ئەبووبەکری دەست کەوت، یەکسەر بە ڕاکردن ڕۆشت تاکو قورەیش ئاگادار بکاتەوە. کە گەیشتە مەککە، دڵی مۆر کرا و نەیدەزانی چی بکات و لە بیری برایەوە بۆچی هاتووە! تا گەڕایەوە جێی خۆی[٢]. لە دوایی‌دا بۆی دەرکەوت کە لە بیری براوەتەوە.

**ڕووداوی سێهەم:**

❋ پێشەوایانی فەرمووده لە چەند ڕێگایەکی جیاجیاوە دەگێڕنەوە کە: لە غەزای "غەتەفان و ئەنمار"دا سەرۆك هۆزەکەیان، کە ناوی: "غەورەثی کوڕی حاریثی موحاریبی" بووە، ویستی دەست لە پێغەمبەر ﷺ بووەشێنێت. ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ کاتێکی زانی ئەم کابرایە بە شمشێرەوە لەسەر سەری ڕاوەستاوە. فەرمووی: "اللّهم اكفنيه بما شئت". واتە: خوایە! بەهەر شتێك کە خۆت ویستت لەسەری بێت، لە کۆڵمی بکەرەوە! هەر کە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی فەرموو، یەکسەر ژانێك بە پشتی ئەو پیاوەدا هات کە لە جموجووڵی خست و، بە دەمدا کەوت و، شمشێرەکەشی لە دەست کەوتە خوارەوە[٣]!

❋ هەروەها دەگێڕنەوە کە جارێك کابرایەکی دەشتەکی بە شمشێرەوە هاتە سەر پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: ئێستا کێ لە دەستی من ڕزگارت دەکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "الله". یەکسەر دەستی پیاوە دەشتەکی‌یەکە کەوتە لەرزین و شمشێرەکەی لێ کەوتە خوارەوە[٤]. ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەڵی گرتەوە و فەرمووی: "ئەی ئێستا کێ تۆ لە دەستی من ڕزگارت دەکات"؟ هەر لەم ڕیوایەتەدا دەڵێت: لە ئەنجامدا پێغەمبەر ﷺ لێی خۆش بوو، ئەویش گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی و پێی وتن: لە لای باشترین مرۆڤەوە هاتوومەتەوە.

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأحـــمد.

(٢) الشفا ١/٣٥١.

(٣) ذكره القاضي عياض باللفظ المذكور، بروانه: الشفا ١/٣٤٨ والحديث أخرجه بنحوه البخـــاري وابـــن حبان والحاكم وأحمد وأبو يعلى والطبراني في الأوسط.

(٤) صحيح، رواه البخاري ومسلم.

* بە هەمان چەشنی ئەم بەسەرهاتە، دەگێڕنەوە کە لە غەزای بەدریشدا بەسەری هاتووە. ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: لە ڕۆژی بەدردا بە نیازی دەست بەئاوگەیاندن لە هاوەڵانی دوورکەوتەوە. یەکێك لە مونافیقان شوێنی کەوت. وەکو ڕیوایەتەکەی پێشوو، ئەویش شمشێری لە پێغەمبەر ﷺ بەرز کردەوە، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی لێ دایەوە، یەکسەر ئەو مونافیقە کەوتە لەرزین و شمشێرەکەی لە دەست داکەوت.

ڕووداوی چوارەم:

* بە ڕیوایەتێکی "مەشهوور"ی نزیك لە تەواتورەوە، لە پێشەوایانی حەدیثەوە دەگێڕنەوە، هەروەها زۆربەی زانایانی تەفسیریش لەوەدا لەگەڵیاندان کە هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتی: ﴿إنّا جعلنا في أعناقهم أغلالاً فهي إلى الأذقان فهم مُقمَحُون * وجَعَلْنا مِن بين أَيديهم سداً ومن خلفهم سداً فأغشيناهم فهم لا يُبصرون﴾ (يس:٨-٩) ئەوەبوو کە: ئەبووجەهل سوێندی خوارد: ئەگەر هەرکات محەممەد لە سوژدەدا ببینێت، ئەو بەردە گەورەیە بدات بە سەریدا. جارێك پێغەمبەر ﷺ لە سوژدەدا بوو، بەردێکی گەورەی هێنا تاکو بیدات بە سەریدا، لەم کاتەدا قورەیشیش سەیریان دەکرد. بەڵام بەردەکە لکا بە هەردوو دەستیەوە و، دەستەکانیشی تا ملی وشك بوون[1]، کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی بووەوە، ڕۆشت و دەستی ئەبووجەهلیش بەربوو. ئیتر ئەم دەست بەربوونەی یان لەبەر ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ دوعای کردووە بەربێت، یان لەبەر ئەوەی کە هیچ پێویستییەك نەما بەوەی بەردەکەی پێوە بلکێت.

* وەلیدی کوڕی موغیرە، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بە نیازی ئەوەی بیکوژێت. بەڵام خواوەند چاوەکانی وا کوێر کرد کە گوێی لە دەنگی پێغەمبەر بوو، کەچی بە چاو نەیدەبینی. ناچار گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکانی، ئەوانیشی نەبینی تا بانگیان کرد[2]! هەر بەم جۆرە مایەوە هەتا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی لە مزگەوتدا بوو. بەڵام کە لە مزگەوت ڕۆشتە دەرەوە، چاوی چاك بووەوە، چونکە هیچ پێویستییەك بە کوێریی ئەو نەما.

* هەروەها لە حەزرەتی ئەبووبەکری صیدیقەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەگێڕنەوە کە: دوای ئەوەی سوورەتی: ﴿تَبَّتْ يَدا أَبي لَهَب﴾ نازڵ بوو، "ئوم

(١) أخرجه ابن اسحاق وابن هشام والبيهقي وأبو نعيم بلفظ قريب، وأصله في البخاري والترمذي وأحمد وأبو يعلى.

(٢) الشفا ١/٣٥١.

جەمیل"ی ژنی ئەبوو لەهەب، كە ئەم سوورەتە بە ﴿حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾ ناوناتۆرەی لێ ناوە، دەستەكانی پڕ كرد لە بەرد و هات بۆ پێغەمبەر ﷺ لەو كاتەدا كە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبووبەكر لە "مسجد الحرام"دا بوو. كاتێ گەیشتە سەریان تەنها ئەبووبەكری بینی و، خوای گەورە لە ئاستی پێغەمبەرەكەیدا ﷺ چاوی ئەوی كوێر كرد. ئەوەبوو بە ئەبووبەكری وت: كوا هاوڕێكەت؟ بیستوومە قسەم پێ دەڵێت، بە خوا ئەگەر ببینم ئەم بەردانەی بە دەمدا دەكێشم[1].

بێ گومان "ژنە داركێشی دۆزەخ" ناتوانێت دەستەڵاتدارێكی هێندە گەورە و مەزن ببینێت كە خواوەند بە چەند پلەیەكی ئاوا بەرز لە كەسانی تر جیای كردووەتەوە.

**ڕووداوی پێنجەم:**

✽ بە نەقلی ڕاست و دروست ئەو بەسەرهاتە چەسپاوە كە بەسەر "عامیری كوڕی توفەیل" و "ئەربەدی كوڕی قەیس"دا هاتووە، كە بەم جۆرەیە:

"ئەم دوانە بە نوێنەرایەتیی تیرەكەیان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ. زووتر عامیر بە هاوڕێكەی وتبوو: من لە پێشەوە محەممەد بە قسە دەگرم، تۆیش لە كاتی قسەكردندا لێی بدە. لە پاشاندا نەیبینی هاوەڵەكەی هیچ كارێك بكات. كە دوایی لێی پرسی بۆ هیچت نەكرد؟ لە وەڵامدا وتی: بە خوا هەركات دەمویست لێی بدەم، تۆم لە نێوان خۆم و ئەودا دەبینی، ئایا لە تۆ بدەم"[2]؟

**ڕووداوی شەشەم:**

✽ هەروەها بە نەقلی صەحیح چەسپاوە كە: "شەیبەی كوڕی عوسمانی حەجەبی" لە ڕۆژی "حونەین" یان "ئوحود"دا گەیشتە سەر پێغەمبەر ﷺ. كاتی خۆیشی حەزرەتی (حەمزە) باوك و مامی ئەمی كوشتبوو. لەبەر خۆیەوە وتی: دەرفەتە، وا ئەمڕۆ تۆڵەی خۆم لە محەممەد دەسێنمەوە! كاتێ خەڵك لە جەنگەكەدا تێكەڵ بە یەكتر بووبوون، ئەم لە پشتەوە هات بۆ پێغەمبەر و شمشێرەكەی بەرز كردەوە بۆ ئەوەی دەستی خۆی بوەشێنێت.. خۆی دەیگێڕێتەوە، دەڵێت: لەم كاتەدا پێغەمبەر ﷺ پێی زانیم، بانگی كردم و دەستی خستە سەرسنگم، لەو كاتەشدا لە هەموو كەسێك زیاتر ڕقم لێی بوو. كە دەستی لەسەر سنگم هەڵگرت، لە هەرچی كەس هەیە زیاتر خۆشم دەویست. ئنجا پێی وتم: وەرە نزیك بەرەوە و لە دژی كافران بجەنگە. دەڵێت: نزیك بوومەوە و بە

---

(١) رواه البيهقي والحاكم وقال: صحيح الإسناد.

(٢) رواه ابن اسحاق والبيهقي وأبو نعيم والطبراني والأصبهاني واللفظ له.

شمشێرەکەم لەگەڵ کافراندا شەڕم دەکردو، خۆم کرد بە قەڵغان بۆ پێغەمبەر ﷺ خۆ ئەگەر باوکیشم بهاتایەتە بەردەست، دەمکوشت و نەمدەهێشت نزیکی پێغەمبەر ببێتەوە[1].

❋ "فوضالەی کوڕی عەمر"یش دەڵێت: لە ساڵی فەتحی مەککەدا کە پێغەمبەر ﷺ تەوافی کەعبەی دەکرد، ویستم بیکوژم. کە لێی نزیك بوومەوە، فەرمووی: "ئەوە فوضالەیە"؟ وتم: "بەڵێ". فەرمووی: "ئەوە لە دڵی خۆتدا چیت دەوت"؟ وتم: "هیچ". ئەویش پێکەنی و، داوای لێبوردنی لە خوا بۆکردم و، دەستی خستە سەرسنگم و، بەوە دڵم دامرکایەوە. بە خوا هەر کە دەستی لەسەر سنگم لابرد، لە هەرچی شت هەیە کە خوا دروستی کردووە پێغەمبەرم ﷺ زیاتر خۆش دەویست[2].

**ڕووداوی حەوتەم:**

❋ بە نەقڵی صەحیح چەسپاوە و دەگێڕنەوە کە: جارێك پێغەمبەر ﷺ پاڵی بە دیوارێکەوە دابووەوە، جولەکەکان پیلانیان لە دژی پێغەمبەر ﷺ سازکردو، یەکێکیان ویستی بەردێکی گەورەی بە سەردا بکێشێت. پێش ئەوەی دەستی خۆی بوەشێنێت، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و ڕۆشت[3]. بەو جۆرە و بە بۆنەی پارێزگاریی خوای گەورەوە، پیلانەکەیان سەری نەگرت.

ڕووداوی تری هاوچەشنی ئەمە زۆرن. ئەوەتا ئیمامی بوخاری و موسلیم و پێشەوایانی تری حەدیث، لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە، کە دەفەرموێت: تا ئەو کاتەی ئایەتی: ﴿واللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ نازڵ بوو، پێغەمبەر ﷺ پاسەوانی هەبوو. بەڵام کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، سەری لە ماڵەوە هێنایە دەرەوە و فەرمووی: "يا أيها الناس! انصرفوا، فقد عصمني ربي عز وجل"[4]. واتە: خەڵکینە! فەرموون بڕۆن، وا خوا خۆی دەمپارێزێت.

* * *

(١) الشفا ١/٣٥٣. نسيم الرياض ٣/٢٤٨.

(٢) رواه ابن اسحاق وابن هشام وابن سيد الناس. بڕوانە: الشفا ١/٣٥٣، الإصابة ٥/٣٧٢.

(٣) رواه ابن اسحاق. بڕوانە: الشفا ١/٣٥٢.

(٤) رواه الترمذي وعبد بن حميد وابن جرير وأبو نعيم والحاكم وقال: صحيح الإسناد.

ئەم پەیامە، هەر لە سەرەتاوە تا ئێرە، ئەوەی ڕوون کردەوە کە:

هەرچی جۆر و هەرچی جیهانی ناو ئەم بوونەوەرە هەیە، هەموویان پێغەمبەر ﷺ دەناسن و پەیوەندی‌یان لەگەڵی‌دا هەیە. چونکە ئەمانە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەراندا دەردەخەن. واتە دەری دەخەن کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێز و نازدارە ﷺ ڕەوانەکراوی بەدیهێنەری گەردوون و نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

بەڵێ، هەروەك فەرمانبەرێکی گەورەی دەوڵەت، یان پشکنیارێکی پایەبەرزی لای پادشا، هەموو فەرمانگەکانی دەوڵەت دەیناسن و، ئەگەر بڕواتە ناو هەرکام لەو فەرمانگەیانە، ئەوا ڕێزێکی گەرم و زۆری لێ دەگیرێت، چونکە لە لایەن پادشای مەزنەوە کاری پێ سپێرراوە. بەڵام ئەگەر وا دابنێین ئەم کار پێ‌سپێرراوە تەنها پشکنیاری "دادگەری" بێت، ئەوا تەنها فەرمانگەکانی "دادگەری" دەیناسن و ڕێزی لێ دەگرن و، فەرمانگەکانی تر بە باشی نایناسن. یان ئەگەر تەنها پشکنیاری گشتیی سوپا بێت، ئەوا فەرمانگە ڕەسمی‌یەکانی تری دەوڵەت نایناسن..

بەڵام خۆ لەو نموونانەی پێشوو، تێ‌دەگەین کە: هەموو فەرمانگەکانی دەستەڵاتداریی خواوەند، زۆر بە باشی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەناسن و، بە غەیری خۆشیانی دەناسێنن. هەر لە مەلائیکەتەوە تا دەگاتە جاڵجاڵۆکە و مێش..

کەواتە ـ بە بێ هیچ گومانێك ـ دواهەمین پێغەمبەرە ﷺ و، نێرراوی پەروەردگاری جیهانیانە و، پەیام و پێغەمبەرێتی‌یەکەشی وەك هی پێغەمبەرانی تر نی‌یە، تا تەنها بۆ یەك نەتەوە بێت، بەڵکو بۆ هەموو بوونەوەرانە بە گشتی.

## ئاماژەی شازدەهەم

ئەم ئاماژەیە بریتی‌یە لە "ئیرهاصات". واتە ئەو ڕووداوە لەعادەت‌بەدەرانەی کە لە پێش پێغەمبەرێتیی‌دا دەرکەوتوون. جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕووداوانە پەیوەندی‌یان بە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە، ئەوا بە جۆرێك لە بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی ئەو دادەنرێن.. ئەمانەش سێ بەشن:

## بەشی یەکەم

ئەم بەشە بریتی‌یە لەو هەواڵانەی کە "تەورات" و "ئینجیل" و "زەبوور" و "صوحوف"ی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لە بارەی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدەوە ﷺ رایانگەیاندوون. کە ئەمەش بە دەقی قورئانی پیرۆز چەسپاوە.

بەڵێ، مادەم ئەو کتێبانە "ئاسمانی"ن و خاوەنەکانیشیان (واتە ئەوانەی بۆیان هاتوون) چەند پێغەمبەرێکی بەڕێزن - درووودی خوایان لەسەر بێت - دەبێ ئەو کتێبانە بەوپەڕی بێ گومانی و بە جۆرێکی پێویست باسی ئەو کەسە بکەن کە بەهۆی ئەو نوورەی لە لایەن خواوە بۆی دێت نیوەی رووی زەوی روونـاك دەکاتەوە و ئایینەکانی تر هەڵدەوەشێنێتەوە و ڕوخساری گەردوونیش دەگۆڕێت..

چونکە ئەو کتێبانەی کە ڕووداوە جوزئی‌یەکان لە بیر ناکەن و تۆماریان دەکەن، هەرگیز ناگونجێ گرنگترین و گەورەترین ڕووداوی مێژووی مرۆڤایەتی، کە پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدە ﷺ، باس نەکەن.

جا مادەم باسی دەکەن، ئەوا باسکردنەکەیان یان بەدرۆخستنەوەی ئەو دەبێت تاکو ئایینەکانی خۆیان لە هەڵوەشانەوە و تیاچوون بپارێزن، یاخود بریتی دەبێت لە تەسدیق کردنی. واتە بۆ ئەوەی ئاینەکەیان لە دەستکاری و تەحریف و خورافات بپارێزن، تەسدیقی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دەکەن. خۆ قسەی هەموو دۆستان و دوژمنان لەوەدا یەکی گرتووە کە هیچ بەڵگە و نیشانەیەکی ئەوتۆ لەو کتێبانەدا نی‌یە بەدرۆخستنەوەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ رابگەیەنێت. کەواتە دەبێ بەڵگە و نیشانەی تەسدیقی ئەویان تێدا بێت.

ئێستاش مادەم بە شێوەیەکی ڕەها "تەسدیق کردن" لە ئارادایە و هۆکارێکی سەرەکیش هەیە کە داخوازی ئەم تەسدیق کردنەیە، ئەوا لێرەدا سێ بەڵگەی بەهێز و توندوتۆڵ لەسەر بوونی ئەم تەسدیق کردنەی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ لەو کتێبانەدا، دەهێنینەوە:

**بەڵگەی یەکەم:**

پێغەمبەر ﷺ چەند ئایەتێکی بەسەر شوێنکەوتەی ئەو ئایینانەدا خوێندەوە و، بەو ئایەتانە تەحەددای کردن. وەك بڵێی بە زمانی قورئانی پیرۆزەوە پێیان دەفەرموێ:

(ئەوەتا کتێبەکانتان تەسدیقی پێغەمبەریێتیم و ئەو وەسفانەی من دەکەن کە تیایاندایە و، لەو دەعوایەمدا کە بە هەموو جیهانەکانی ڕادەگەیەنم، بە ڕاستم دادەنێن).

ئەمانەش هەندێکن لەو ئایەتانەی کە ئەم تەحەددیەیان تێدایە:

﴿قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ (آل عمران:٢٩٣).

﴿قُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَا وَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَةَ اللهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ (آل عمران:٦١).

لەگەڵ ئەم تەحەددا ڕوون و ئاشکرایەشدا، هیچ کام لە زانا و قەشەکانی جوولەکە و گاورەکان نەهاتن هیچ شتێك دەربخەن کە پێچەوانەی ئەو ڕاگەیاندنەی پێغەمبەر ﷺ بێت. خۆ ئەگەر هەرشتێکیان پێچەوانەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ لە بەردەستدا ببوایە - با زۆر کەمیش بێت - ئەوا ئەو جوولەکە و کافر و مونافیقە یەکجار حەسوود و سەرسەختانەی کە لە هەموو کات و جێگایەکدا هەن، دەریاندەخست و ئاشکرایان دەکرد.

ناوەرۆکی ئەم تەحەددایەش بریتی بوو لەوەی کە: یان دەبێ بتوانن شتێك لە کتێبەکانیاندا بدۆزنەوە پێچەوانەی ئەوە بێت کە ئێستا ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە لایەن خواوە ڕایدەگەیەنێت.. یان پێغەمبەر ﷺ زۆر بە توندی جیهادیان لەگەڵدا دەکات. جا لەبەر ئەوەی نەیانتوانی شتێك بچەسپێنن کە پێچەوانەی ڕاگەیاندنەکەی پێغەمبەر ﷺ بێت، ناچاربوون بە جەنگ و کاولکاری و دەربەدەری ڕازی ببن. واتە شتێکیان دەست نەکەوت کە بیکەن بە بەڵگەی خۆیان و پێغەمبەری پێ بێدەنگ بکەن. چونکە ئەگەر شتێکی لەو جۆرەیان دەست بکەوتایە ئەوا ئاشکراکردنی گەلێ ئاسانتر بوو لەو ماڵ و سامان بەخت کردن و کاولکاری و دەربەدەرییەی کە بەسەریاندا هات.

**بەڵگەی دووهەم:**

لەبەر ئەوەی "تەورات" و "ئینجیل" و "زەبوور" بۆ چەندین زمانی یەك لە دوای یەك وەرگێڕراون و، قسەی ئەو کەسانەیان تێکەڵ بووە کە تەفسیریان کردوون و بە هەڵە لێکیان داونەتەوە و، چەندین وشەی نامۆیان ئاوێتە بووە.. لەبەر ئەمانە، دەبینیت ئەو ئیعجازەی کە لە ئایەتەکانی قورئاندا هەیە، لەواندا نییە. ئەمە جگە لەو دەستکارییانەش کە نەفامان و دەروون چەپەڵان تیایاندا کردوون و کەموکووڕی و ناتەواوییەکانی ئەو کتێبانەی زیاتر کردووە. تەنانەت گەورە زانای بەناوبانگ: "شێخ

رەحمەتوڵڵای هیندی"[1] هەزاران دەستكاریی لەو كتێبە ناوبراوانەدا دەستنیشان كردووە و، زانایانی جوولەكە و گاوری پێ بۆڕداوە.

سەرەڕای ئەم هەموو دەستكاری‌یانە، هەر لەم سەردەمەی خۆشماندا زانای بەناوبانگ: "حسین الجسر"[2] - خوا لێی خۆش بێت - سەد و دە بەڵگەی لەسەر پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرمان ﷺ لەو كتێبانەدا دەرهێناوە و ئەمەشی لە كتێبی "الرسالة الحميدية"دا چەسپاندووە. خوا لێخۆشبووش "ئیسماعیل حەققی مەناستەری" وەری گێڕاوە بۆ زمانی توركی. هەر كەسێك دەیەوێت با سەیری بكات.

پاشان بەشێكی زۆری زانایانی جوولەكە و گاور، دانیان بەم ڕاستی‌یەدا ناوە و وتوویانە: وەسفەكانی محەممەد پێغەمبەر ﷺ لە كتێبەكانماندا هەیە. وەك: "هەرقلی پادشای ڕۆم" كە دانی بەم ڕاستی‌یەدا نا و وتی: "حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - مژدەی هاتنی محەممەدی ﷺ داوە". هەر بەم جۆرە "موقەوقیسی پادشای میسر" و "ئیبن صوریا" و "ئیبن ئەختەب" و "كەعبی كوڕی ئەسەد"ی برای و "زوبەیری كوڕی باتیا" و، غەیری ئەمانەش لە زانایانی جوولەكە و سەركردەكانیان دانیان بەمەدا ناوە و، وتوویانە: وەسفەكانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ لە كتێبەكانماندا هەن.

---

(١) (شێخ رەحمەتوڵڵای هیندی) لە نێوان ساڵەكانی (١٨١٨ ـ ١٨٩١ز)دا ژیاوە. ئەم دەستكاری‌یانەشی لە كتێبەكەی‌دا كە ناوی "إظهار الحـــق"ە، باس كردووە. ئەم كتێبە بۆ زۆر زمان وەرگێڕاوە و بە وردترین لێكۆڵینەوەی ڕەخنەیی دادەنرێت لە هەردوو كتێبی تەورات و ئینجیلی ئێستادا. هۆی دانانی ئەم كتێبەش ئەوە بووە كە لە دەمی داگیركردنی هیندستان لە لایەن ئینگلیزەوە، موبەششیرەكان زۆر بە توندی هێرشیان دەكردە سەر ئیسلام. بۆیە گەلێ كەس لە زانایان بە توندی بەرەنگاریان بوونەوە. یەكەم مونازەرەی ڕەسمی لە نێوان دانەری ئەم كتێبە و سەرۆكی موبەششیرەكان لە بەرواری ١٠/٣/١٨٥٤زدا سازكرا و، سەرجەمی گفتوگۆكانی ئەم مونازەراتانەش بە ئامادەبوونی گەورە پیاوانی هیندستان تۆمار كران. لە ئەنجامدا موبەششیرەكە بە بەڵگە بەزێنرا و پێش ئەوەی مونازەرەكە كۆتایی پێ بێت شكستی هێنا و لە كۆڕی مونازەرەكە ڕۆشتە دەرەوە! بۆ زیادە ئاگاداری لە بارەی ئەم كتێبە و دانەرەكەی، بڕوانە كتێبی: "أكبر مجاهد في التأريخ: الشيخ رحمة الله الهندي" دانراوی: محمد سليم محمد ســـعيد. وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: فخرالديـن أحـــمد و د. أحـــمد حجازي السقا و سيد عبدالله محمد علاّم. الناشر: مكتبة الكليات الأزهرية - مصر - الطبعة الأولى ١٩٧٧. (وەرگێڕ)

(٢) حسين الجسر: لە (تەرابلوس)ی لوبنان لەدایك بووە و هەر لەوێش كۆچی دوایی كردووە. لە نێوان ساڵەكانی (١٢٦١-١٣٢٧ك/١٨٤٣-١٩٠٩ز)دا ژیاوە. ساڵی (١٢٨٤ك) خوێندنی لە ئەزهەر تەواو كردووە. كە گەڕاوەتەوە بۆ تەرابلوس یەكە پیاوی ئەوێ و شاعیر و زانا و فەقیهێكی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە. چەند بەرهەمێكی هەیە، بەناوبانگترینیان: (الرسالة الحميدية) و (الحصون الحميديـــة)یە. بڕوانە: (الأعلام)ی زەركەلی ٢/٢٥٨. (وەرگێڕ)

هەروەها بەشێکی زۆری تر لە زانایانی گاور و جوولەکە، دوای ئەوەی وەسفەکانی پێغەمبەریان ﷺ لە کتێبەکانی خۆیاندا چاو پێ کەوت و بۆ زاناکانی تریشیان ڕوون کردەوە و بەڵگەیان بۆ هێنانەوە، باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هێنا و دەستیان لە ئینکاری و سەرسەختی و دوژمنایەتی هەڵگرت. وەك: "عەبدوڵلای کوڕی سەلام و وەهەبی کوڕی مونەببیهـ و ئەبوو یاسر و شامووڵی هاوڕێی توبیەع" هەروەك "توبیەع" خۆیشی لە پێش هاتنی پێغەمبەردا ﷺ ئیمانی پێ هێنابوو. هەروەها "ئوسەید و ئەعلەبەی کوڕی سەعیە" ئیمانیان پێ هێنا. ئەوەبوو لەناو هۆزی "بـــني النضـــير"ی جوولەکەدا بە دەنگی بەرز نارەزایی خۆیان لەوە دەربڕی کە هۆزەکەیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەجەنگان و، وتیان: "والله هو الذي عهد إليكم فيه ابن هيبان".. واتە: "بەخوا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئیبن هەیبان بۆی باس کردن". ئەم ئیبن هەیبانەش پیاوێکی خواناس بوو، کاتی خۆی لە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕەوانە بکرێت، بووبوو بە میوانی "بەنی نەضیر" و پێی وتبوون: "قريبٌ ظهورُ نبيٍّ هذا دار هجرته". واتە: "پێغەمبەرێك بەم نزیکانە پەیدا دەبێت، کە بۆ ئێرە کۆچ دەکات". بەڵام "بەنی نەضیر" هیچ گوێیەکیان بەم هەواڵەی ئەم دوانە نەدا و، لە ئەنجامدا ئەوەیان تووش بوو کە تووشیان بوو.

هەروەها چەندین زانای جوولەکەی تری وەك: "ابن یاسین و، موخەیریق و، کەعبولئەحبار" و غەیری ئەوانیش، پاش ئەوەی وەسفی پێغەمبەریان ﷺ لە کتێبەکانیاندا بینی، ئیمانیان پێ هێنا.

یەکێك لە زانا گاورەکان کە ئیمانی پێ هێنا: "بوحەیرای ڕەبەن" بوو – وەك لە پێشدا باسمان کرد – ئەمەش لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا، لەگەڵ ئەبوو تالیبی مامی ڕۆشت بۆ شام. بوحەیرا لەبەر ڕێزنان لە پێغەمبەر ﷺ خواردنی بۆ کاروانەکەی قورەیش ئامادە کرد و بانگێشتی بۆ کردن. پاشان سەیری کرد ئەو پەڵە هەورەی سێبەری بەسەر کاروانەکەوە کردبوو، هەر لە جێی خۆیدا ماوە. لەبەر خۆیەوە وتی: وا دیارە ئەو کەسەی کە من مەبەستمە هەر لەوێ ماوە و نەهاتووە! لەبەر ئەوە، یەکێکی نارد بە شوێنیدا تاکو لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت. ئنجا بە ئەبووتالیبی مامی وت: بیبەرەوە بۆ مەککە، چونکە جوولەکەکان زۆر حەسوودن و گەر پێی بزانن بە فڕوفێڵ لەناوی دەبەن، چونکە ئێمە وەسفەکانی ئەم کوڕە لە تەوراتدا دەبینین.

"نەستووری حەبەشە" و "نەجاشی"ی پادشایان دوای ئەوەی کە وەسفەکانی پێغەمبەریان ﷺ لە کتێبەکانیاندا بینی، ئیمانیان پێ هێنا. هەروەها "زەعاتیر"ی زانای بەناوبانگی گاوریش وەسفەکانی پێغەمبەری ﷺ لەناو ڕۆمەکاندا ئاشکرا کرد و لەسەر

ئەمە شەهید کرا! هەروەها زانای دیانی بەناوبانگ و سەرگەورەی ڕۆحانییەکانی شام: "حاریثی کوڕی ئەبوو شەمری غەسسانی" و، پادشاکانی ئیلیا و ناوچەکانی تری شام، وەك: "هەرقل و ئیبن ناطوور و جارووود" و هاوچەشنیان دوای ئەوەی کە وەسفەکانی پێغەمبەریان ﷺ لە کتێبەکانیاندا چاو پێ کەوت، ئیمانیان پێ هێنا. بەڵام "هەرقل" لەبەر ئەوەی نەیدەویست فەرمانڕەواییەکەی لەدەست بدات، بە ڕەسمی ئیمانەکەی ئاشکرا نەکرد.

هاوچەشنی ئەمانە زۆرن، وەك "سەلمانی فارسی" کە پێشتر دیان بوو، وەسفەکانی پێغەمبەری ﷺ لە کتێبەکانیاندا دیبوو. لەبەر ئەوە، بە شوێن ئەو پێغەمبەرەدا ﷺ دەگەڕا و هەر کە چاوی پێ کەوت موسڵمان بوو! هەروەها وەك "تەمیم" کە زانایەکی بەڕێز و گەورەیە و، نەجاشیی پادشای حەبەشە و قەشەکانی حەبەشە و، ئوسقوفەکانی ناوچەی "نەجران". هەموو ئەوانە بە یەك دەنگ دەڵێن: پاش ئەوەی ئەوسافی ئەم پێغەمبەرەمان ﷺ لە کتێبەکانماندا بینی، ئیمانمان پێ هێنا.

**بەڵگەی سێهەم:**

وا بۆ نموونە چەند ئایەتێك لە تەورات و ئینجیل و زەبوور[1] دەهێنین، کە مژدەی هاتنی پێغەمبەر ﷺ دەدەن:

ئایەتێك لەزەبووردا دەڵێت:

"اللهم ابعث لنا مقيم السنة بعد الفترة"[2].

خۆ "مقيم السنة"ش یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ.

ئایەتێك لە "ئینجیل"دا دەڵێت:

"وقال المسيح: إنـي ذاهب إلى أبـي وأبيكم ليبعث فيكم الفارقليطا"[3].

---

(١) زۆربەی ئایەتەکانی ئەم کتێبە ناوبراوانە مامۆستا نوورسی لە ئەسڵەکەدا بە عەرەبی هێناونی و، هەندێکیشی بە تورکی. جا ئەوانەی کە ئەو بە عەرەبی هێناونی، هەر بە عەرەبی دامنانەوە و واتاکانیانم بە کوردی لە پەراوێزدا لێك داوەتەوە. ئەوانەش کە لە دەقەکەدا تورکین و وەرگێڕی عەرەبی کردوونی بە عەرەبی، من لە جێگای خۆیاندا کردوومن بە کوردی. بۆ هەردوو حاڵەتەکەش، لە وەرگێڕانی ئایەتەکانی ئینجیلدا پشتم بە دوو ئینجیلی کوردی بەستووە، یەکەم: ئەوەی کە لە ساڵی ١٩١٩زدا لە نیزیۆرك لە ئەمریکادا چاپ کراوە. دووهەم: ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٧٤ز دا لە سلێمانی لە چاپخانەی ڕاپەڕین لە چاپ دراوە.

(٢) واتە: خوایە پاش ئەو ماوەیە، دامەزرێنەری سوننەتمان بۆ بنێرە.

(٣) واتە: من بۆ لای باوکی خۆم و ئێوە دەڕۆم، تاکو "فارەقلیت"تان تێدا بنێرێت.

واتە: تاکو ئەحمەدتان تێدا بنێرێت بە پێغەمبەر.

ئایەتێکی تر لە "ئینجیل"دا دەڵێت:

"وإنـــي أطلب من ربـــي فيعطيكم فارقليطاً يكون معكم إلى الأبد"[١]. "فارەقليت" واتە: جیاکەرەوەی حەق لە ناحەق، ئەمەش ناوی پێغەمبەرە ﷺ لەو کتێبانەدا[٢].

ئایەتێکی تەوراتیش دەڵێت:

"إن الله قال لإبراهيم: إن هاجر تلد، ويكون مِن ولدها مَن يدُه فوق الجميع، ويـــد الجميع مبسوطة إليه بالخشوع"[٣].

ئایەتێکی تری تەورات دەڵێت:

"وقال يا موسى: إني مقيم لهم نبيّاً من بني إخوتـــهم مثلك وأجري قولي في فمـــه، والرجل الذي لايقبل قول النبي الذي يتكلم باسمي، فانا أنتقم منه"[٤].

ئایەتێکی تر لە تەوراتدا دەڵێت:

"قال موسى: ربّ! إني أجد في التوراة أمة هم خير أمة أخرجت للنـــاس، يـــأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويؤمنون بالله. فاجعلهم أمتي. قال: تلك أمة محمد"[٥].

---

(١) ئینجیلی یۆحەننا (١٤،١٦) واتە: لە پەروەردگارم داوا دەکەم "فارەقلیت"ێکتان بداتێ کە هەتا دنیا دنیایە لەگەڵتاندا بێت. ئینجیلی یۆحەننا دەڵێت: "لە باوکم داوا دەکەم".

(٢) وەرگێڕەکانی ئینجیل وشەی "فارەقلیت"یان لە زۆربەی وەرگێڕانەکاندا لابردووە و، وشەی تریان لە جێگەدا داناوە، چونکە دەزانن بۆ موسڵمانەکان دەرکەوتووە کە مەبەســت لەو وشەیە "محەممەد"ە ﷺ. "شێخ ڕەحمەتوڵڵای هیندی" لە کتێبەکەیدا هەموو جیاوازییەکانی چاپە جیاجیاکـانی ئینجیلی هەر لە کۆنەوە تا سەردەمی خۆی دەستنیشان کردووە. مامۆستا "عەبدولوەهاب نەججار"یش لە (قصـــص الأنبيـــاء)ەکەیدا (ص٣٩٧ – ٣٩٨) باسی ئەوە دەکات کە پرسیاری لە خۆرهەڵاتناسی بەناوبانگی ئیتالی "دوکتۆر کارلۆ نلینۆ" لە بارەی ئەم وشەیەوە کردووە بەو سیفەتەی کە پسپۆری زمانە یۆنانییە کۆنەکانە. لە وەڵامدا وتوویەتی: "فارەقلیت" یەعنی ئەو کەسەی کە زۆر "حەمد" بکرێت. واتە: کتومت وشەی: (محمد، أحمد) دەگرێتەوە!

(٣) سفر التكويـــن: ١٧ واتە: خوا بە ئیبراهیمی فەرموو: هاجەر منالی دەبێت و، لەو منالەش کەسێك دەکەوێتەوە، کە دەستی لەسەر هەموانەوە دەبێت و، دەستی هەموانیش بەوپەڕی ڕێزەوە لە بەردەمیدا بڵاو دەبنەوە.

(٤) سفر التثنية: ١٨ واتە: بە مووسای وت: من پێغەمبەرێکی وەك تۆیان لە برازایانی خۆیان بۆ دادەنێم و، وتەی خۆم لەسەر زاری ئەو دەردەبڕم، جا هەر کەس وتەی ئەو پێغەمبەرە وەرنەگرێت کە بە ناوی منەوە دەدوێت، خۆم تۆڵەی لێ دەسێنم.

(٥) واتە: مووسا وتی: ئەی پەروەردگار! دەبینم تەورات باسی نەتەوەیەك دەکات کە باشترین نەتەوەن لە مرۆڤدا هەڵبکەون و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن و باوەڕیان بە خوا هەیە. خوایە گیان! داواکارم ئەوانە بکەیت بە ئوممەتی من. خوا فەرمووی: ئەوە ئوممەتی محەممەدە.

*ئاگاداری‌یەك:*

ئەو كتێبانەی ناومان هێنان، نـاوی "محەممەد"یـان ﷺ بـە چـەند نـاوێكی سـوریانی و لـە نێوان چەند ناوێكی عیبری‌دا دەربڕیوە. وەك: "موشەففەح، مونحەمنا، حمیاطـــا" و چـەند ناوێكی تر، كە هەر هەموویان بـە عـەرەبی واتـای: "محەمـەد" دەگەیـەنن. بـەڵام ناوهێنـانی "محەممەد" بە ڕاستەوخۆیی بە دەگمەن نەبێ نی‌یە. ئەوانـەش جوولەكەكان دەستكاری‌یان كردوون و گۆڕیویانن. وەك ئەو ئایەتەی زەبوور كە دەڵێت:

"یا داود! یأتي بعدك نبـــيٌّ یسمی أحمد ومحمداً صادقاً، سیّداً، أمته مرحومة"(١).

چـەند زانایـەكی ئاگـادار، لـە پێـش دەسـتكاری كردنی تـەوراتدا، ئـەم ئایەتـــەیان دەرخستووە. وەك: "عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عـاص"، كە یەكێكە لـە حـەوت "عەبدوڵڵا" ناوە زاناكان و ئاگاداری‌یەكی فراوانیان لەو كتێبانەی زوودا بووە. هەروەها "عـەبدوڵڵای كـوڕی سـەلام" كـە پێـش هـاوەڵانی كـەوت و موسـڵمان بـوو. هـەروەها "كەعبولئەحبار" كە یەكێك بووە لە زانایـانی جوولەكە. هـەموو ئەمانە ئـەو ڕاستی‌یەیان ئاشكرا كردووە.

یەكێكی تـر لـەوانە ئەم ئایەتەیە، كـە پاش قسـەكردن لەگەڵ حـەزرەتی مـووسـادا – دروودی لەسـەر بێـت – ڕوو دەكاتە ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە لـە دوای مووسا دێـت و پێـی دەڵێت:

"یا أیها النبي! إنّا أرسلناك شاهداً ومبشرًا ونذیراً وحرزاً للأمیین. أنت عبدي. سمیتُك المتوكل. لیس بفظ، ولاغلیظ، ولاسخّاب في الأسواق. ولایدفع السیئة بالســـیئة، بـــل یعفو ویغفر. ولن یقبضه الله حتی یقیم به الملّة العوجاء بأن یقولوا: لا إله إلاّ الله"(٢).

---

(١) واتە: ئەی داوود! لە دوای تۆ پێغەمبەرێك دێت كە ڕاستگۆ و گەورەیە و نـاوی: "محەمـەد" و "ئەحـمـەد"ە و، ئوممەتەكەشی ڕەحم پێ كراون.

(٢) سفر أشعیا: ٤٣، صحیح البخاري ٥/٢٤١ باب (إنا أرسلناك شـــاهداً ومبشـــراً ونذیـــراً)، هـەروەها: المستدرك للحاكم ٦٧٨/٢ الأحادیث المختارة للمقدســـي ٤٦٠/٩. واتـە: ئـەی پێغەمبـەر! وا تۆمان نـارد و كردمانیت بە شایەت و مزگێنی‌دەر و ترسێنەر و داڵـدەی نەخوێندەواران. تۆ بـەندەی منیـت و نـاوم نـاویت بـە (پشت‌بەخوابەست) تۆ تـووڕە و توندوتیژ و قرەقركـەری نـاو بازاڕەكـان نیـت، پێغەمبـەرێكی وەهـایت كـە لـە تۆڵەی كاری خراپـدا خراپە ناكاتەوە، بەڵكو لێبوردە دەبێت. خـوا نایگێڕێتـەوە بـۆ لای خـۆی هـەتا میللەتـە لارەكەی پێ ڕاست نەكاتەوە، بەوەی كە بڵێن: "لا إله إلاّ الله".

ئایەتێکی تری تەورات دەڵێت:

"محمد رسول الله. مولده بمكة، وهجرته بطيبة، وملكه بالشام، وأمته الحمادون"[١]. وشەی "محەممەد" لەم ئایەتەی تەوراتدا بە ناوێکی سوریانی وتراوە کە واتای "محەممەد" دەگەیەنێت.

هەروەها ئایەتێکی تری تەورات دەڵێت:

"أنت عبدي ورسولي سميتُك المتوكل"[٢].

ئەم ئایەتە ڕووی قسەی لەو پێغەمبەرەیە، کە لە نەوەی ئیسماعیلی برازایانی ئیسحاقە و پاش مووسا خوای گەورە دەینێرێت و دەیکات بە پێغەمبەر.

ئایەتێکی تری تەورات دەڵێت:

"عبدي المختار ليس بفظٍ ولاغليظ"[٣].

"المختار" واتە: "المصطفى". کە بە واتای هەڵبژێرراوە و، یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ.

لە "ئینجیل"دا چەند پێناسەیەکی جیا جیا سەبارەت بە "سەرگەورەی جیهان" هەیە، کە موژدە دراوە ئەو سەرگەورەیە پاش عیسا دێت. یەکێك لەوانە دەڵێت: "معه قضيب من حديد يقاتل به وأمته كذلك". واتە: "پارچە ئاسنێکی بە دەستەوەیە جەنگی پێ دەکات، هەروەها ئوممەتەکەشی". دیارە مەبەست لە پارچە ئاسنەکە: شمشێرە. واتە: پێغەمبەرێك دێت کە خاوەنی شمشێر دەبێت و نەتەوەکەشی فەرمانی "جیهاد"یان پێ دەدرێت. قورئانی پیرۆز لە کۆتایی سوورەتی "الفتح"دا دەفەرموێ:

﴿وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْئَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ﴾ (الفتح:٢٩).

جگە لەمانە، چەندین ئایەتی تری هاوچەشنی ئەمانە لە ئینجیلدا هەیە.

لە بابی سی و سێهەمی کتێبی پێنجەمی تەوراتیشدا ئەم ئایەتە هەیە کە دەڵێت:

---

(١) ورواه الطبراني. بروانە: مجمع الزوائد للهيثمي ٢٧١/٨ وقال: فيه من لم أعرفهم. الفردوس للديلمي ٤٠٠/٢ ورمز لحسنه، وفيض القدير للمناوي ١٩٥/٤. واتە: محەممەد پێغەمبەری خوایە. لەدایکبوونی لە مەککەیە و، کۆچی بۆ (طيبه)یە و، موڵکی لە شامدایە و، ئوممەتەکەشی سوپاسگوزاری خوان.

(٢) ورد أيضاً في الحديث الصحيح الذي رواه البخاري وأحمد والبيهقي. واتە: تۆ بەندە و پێغەمبەری منیت و ناوم ناویت: (پشتبەخوابەست).

(٣) واتە: بەندە هەڵبژاردەکەم توورە و توندوتیژ نییە.

(وتی: پەروەردگار لە "سیناء"ەوە هات و، لە "ساعیرا"وە هەڵهات و درەوشایەوە و، لە چیای "فاران"یش حەق ئاشکرا دەکرێت و لە لای ڕاستیەوە هەزاران مرۆڤی پاکی لەگەڵ دەبێت)[1].

ئەم ئایەتە هەروەك بە باسی هاتنی پەروەردگار لە لای "سیناء"ەوە، هەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی مووسا دەگەیەنێت و، بەوەی کە دەڵێت: لە "ساعیرا" درەوشایەوە، هەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی عیسا ڕادەگەیەنێت، لە هەمان کاتیشدا هەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدمان ﷺ دەداتێ، بەوەی کە ڕایدەگەیەنێت: حەق لە لای چیای "فاران"ەوە ئاشکرا دەبێت. چونکە بە یەکدەنگیی هەموو شارەزایان: "فاران" ناوی چیاکانی ناوچەی حیجازە.

کەواتە ئەم ئایەتەی تەورات، بە بێ پێویست بوون بە هیچ بەڵگەیەکی تر، هەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەت ﷺ ڕادەگەیەنێت. ئنجا ئەوەش کە دەڵێت: "لە لای ڕاستیەوە هەزاران مرۆڤی پاکی لەگەڵ دەبێت" تەسدیقی فەرمانی ئەو ئایەتەی کۆتایی سوورەتی "الفتح" دەکات کە دەفەرموێ: ﴿ذلك مَثَلُهُمْ في التَّوْرَاة﴾ ، چونکە ئایەتەکەی تەورات وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە "پاکان" و "قیددیسان" دەکات، کە ئەولیا و پیاوچاکانن.

ئەم ئایەتەش کە لە بابی چل و دووهەمی "کتێبی ئەشعیا"دایە، دەڵێت:

"خوای حەقتەعالا لە ئاخر زەماندا هەڵبژاردەکەی خۆی ڕەوانە دەکات و (روح الأمین) کە جیبریلە، دەنێرێت بۆ لای و فێری دەکات. پاشان ئەویش جیبریل چۆنی فێر کردووە هەر بەو جۆرە خەڵکی فێر دەکاتەوە و، بە حەق و ڕەوا حوکمڕانیی نێوانیان دەکات. ئەو هەڵبژاردەیەی خوای گەورە ڕووناکییەکی وەهایە کە خەڵکی لە تاریکی دەرباز دەکات و بەرەو ڕووناکی دەیانبات. خوای پەروەردگارم، هەموو ئەو شتانەی فێر کردووم کە ڕوو دەدات، وا منیش بە ئێوەی دەڵێم".

کەواتە ئەم ئایەتە بە تەواوی وەسفەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕوون دەکاتەوە.

لە بابی چوارەمی کتێبی: "میخائیل پێغەمبەر"دا، ئەم ئایەتە هەیە:

"لە ئاخر زەماندا ئوممەتێکی ڕەحم پێ کراو دەبن کە خواوەندی حەق دەپەرستن و لە لای چیا پیرۆزەکە خەڵکێکی زۆر کۆدەبنەوە کە لە هەموو هەرێمێکەوە دێن و پەروەردگار دەپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نادەن".

---

(١) سفر التثنية: ٢/٣٣.

ئەم ئایەتە "عەرەفە" دەردەخات و، خەڵکە زۆرەکەش حاجیانن کە بەرەو ئەو چیا پیرۆزە دەچن و خواوەند دەپەرستن. ئوممەتە ڕەحم پێکراوەکەش ئوممەتی حەزرەتی محەممەدە ﷺ. چونکە ئەم وەسفە - لە ڕاستیدا - دروشمی ئەوانە.

لە بابی حەفتا و دووهەمی زەبووریشدا ئەم ئایەتە هەیە، دەڵێت:

"لە دەریاوە تا دەریا و، لە ڕووبارەکانەوە تا ئەوپەڕی زەوی، موڵکی "ئەو" دەبێت و، لە یەمەن و دوورگەکانەوە دیاریی بۆ دێت و، پادشایان ملکەچی دەبن و شوێنی دەکەون و، لە هەموو کاتێکدا سڵاواتی لەسەر دەدرێت و، لە هەموو ڕۆژێکدا دوعای بەرەکەتی بۆ دەکرێت و، لە مەدینەوە ڕووناکی‌یەکانی ئەو دەدرەوشێتەوە و، هەتا هەتایە ناوی هەر دەمێنێت و، پێش ئەوەی خۆر بەدیبهێنرێت ناوی ئەو بووە و، هەتا خۆریش بمێنێت ناوی ئەو هەر دەمێنێت".

ئەم ئایەتە بە ئاشکرا وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەکات. چونکە دوای حەزرەتی داوود - دروودی خوای لەسەر بێت - جگە لە محەممەد پێغەمبەر ﷺ ئایا هیچ پێغەمبەرێك هاتووە کە بانگەوازی ئایینی ئاشکرا کردبێت و، بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بڵاوی کردبێتەوە و، پادشایانی ملکەچ کردبێت کە باجی "جزیە"ی بدەنێ و، پادشا و دەستەڵاتدارەکان - بەوپەڕی خۆشەویستی‌یەوە - سەری ملکەچیی بۆ دابنەوێنن و، هەرچی ڕۆژە لە پێنجیەکی مرۆڤایەتی‌یەوە نزا و سڵاواتی پێشکەش بکرێت و، ڕووناکی‌یەکانی لە مەدینەوە بدرەوشێتەوە.. ئایا جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ کەسی تر هاتووە وەها بووبێت؟

ئایەتی بیستەمی بابی چواردەهەمی ئینجیلی یۆحەننا (کە بۆ زمانی تورکی وەرگێڕاوە)، دەڵێت:

"لە پاش ئەمە، قسەی زۆرتان لەگەڵ ناکەم، چونکە سەرگەورەی ئەم جیهانە دێت و، هیچی ئەو لە مندا نی‌یە"[١].

دەستەواژەی: "سەرگەورەی جیهان" بریتی‌یە لە "فەخری عالەم"، کە یەکێکە لە ناونیشانە بەناوبانگەکانی پێغەمبەر ﷺ.

هەروەها ئایەتی حەوتەمی بابی شازدەهەمی ئینجیلی یۆحەننا دەڵێت:

---

(١) ئەم ئایەتە لە ئینجیلە کوردی‌یەکاندا بەر ئایەتی "سی‌هەم" دەکەوێت نەك "بیستەم". دوابڕگەی ئایەتەکەش لە چاپەکەی ١٩١٩دا بەم جۆرەیە: "دە مندا هیچی نی‌یە" بەڵام لە چاپەکەی ١٩٧٤دا بەم جۆرەیە: "لە دژی من تانایی نی‌یە".

"من ڕاستیتان پێدەڵێم: بۆ ئێوە باشتر وایە كە من بڕۆم. چونكە ئەگەر نەڕۆم فارەقلیت (دڵدەرەوەكە.. یاریدەدەرەكە)[١] نایەت بۆ لاتان".

جا ئایا دوای حەزرەتی عیسا - دروودی لەسەر بێت - جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ هیچ دڵدەرەوەیەكی تر هەیە؟ خۆ تەنها هەر ئەوە كە مرۆڤایەتی لە حوكمی نەمان و لەناوچوونی هەمیشەیی ڕزگار دەكات و، بەمەش دڵدانەوە بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت و، هەر ئەویشە كە "سەرگەورە" و "مایەی شانازی"ی هەموو جیهان و بوونەوەران بێت.

ئایەتی هەشتەمی بابی شازدەهەمی هەمان ئینجیلی یۆحەننا، دەڵێت:

"كاتێ كە ئەو دێت، لەسەر گوناهـ و، چاكە و، دادوەری، سەرزەنشتی جیهان دەكات".

ئایا كێیە جگە لە حەزرەتی محەممەد پێغەمبەر ﷺ كە خراپە و گوناهی جیهانی گۆڕیوە و بەرەو چاكەی بردوون و، خەڵكی لە گوناهـ و تاوانكاری و بتپەرستی دەرباز كردووە و، بناغەی سیاسەت و دادوەریی لە دنیادا گۆڕیوە و، هی باشتری بۆ داناون؟ كێ هەیە جگە لەو؟

ئایەتی یازدەهەمی بابی شازدەش لە ئینجیلی یۆحەننادا، دەڵێت:

"كاتی هاتنی سەرگەورەی جیهان هاتووە".

یان دەڵێت:

"... وە لەسەر حوكم(داوەری) چونكە سەرگەورەی ئەم جیهانە حوكمڕانە".

كەواتە دەبێ مەبەست لە "سەرگەورەی جیهان"[٢]، سەرداری مرۆڤایەتی: حەزرەتی محەممەد بێت ﷺ.

ئایەتی سیازدەهەمی بابی دووهەمی[٣] ئینجیلی یۆحەننا، دەڵێت:

"كاتێ كە ئەو "گیانی ڕاستی"یە دێت، بۆ هەموو ڕاستییەك ڕێنمایی‌تان دەكات. چونكە لە خۆیەوە نادوێت، بەڵكو هەرچییەك دەبیستێت پێتان دەڵێت و، هەواڵی ئەو شتانەشتان پێ ڕادەگەیەنێت كە لە داهاتوودا دەبن و ڕوو دەدەن".

---

(١) وشەی (فارەقلیت) كە لە چاپەكەی موسڵ ساڵی ١٨٧٦زدا هەیە، لە هەندێ چاپ و وەرگێڕاوی ئینجیلدا بە (دڵدەرەوە) و، لە هەندێكی تریشدا بە (یاریدەدەر) نووسراوە.

(٢) بەڵێ تابلێی گەورەیە. چونكە وا ماوەی هەزار و سێسەد ساڵە لە هەموو سەردەمێكی ئەم ماوەیەدا سێسەد و پەنجا ملیۆن كەس بەوپەڕی گوێڕایەڵی و خۆشەویستییەوە شوێنی دەكەون و، ملكەچی فەرمانەكانی دەبن و، هەموو ڕۆژێك بە سڵاولێ‌كردنی، پەیمانی لەگەڵ نوێ دەكەنەوە. (دانەر)

(٣) ئەم ئایەتە لە ئینجیلە كوردییەكاندا بەر ئایەتی سیازدەی بابی شازدەهەمی ئینجیلی یۆحەننا دەكەوێت.

ئەم ئایەتە بە ڕوونی لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەدوێت، چونکە ئایا کێیە جگە لەو کە هەموو خەڵکیی بۆ "ڕاستی" بانگ کردبێت و جگە لە "سرووش"ی خوای گەورە هیچی تر نەڵێت و، هەرچی حەزرەتی جوبریل – دروودی لەسەر بێت – پێی بڵێت ئەویش ڕایبگەیەنێت و، هەواڵی ڕووداوەکانی دواڕۆژ و قیامەتی بە درێژی ڕاگەیاندبێت؟

پاشان لە "صوحوف"ی پێغەمبەراندا، چەند ناوێکی پێغەمبەر ﷺ هاتووە، کە بە زمانی سوریانی و عیبری واتای: "محمد" و "أحمد" و "المختار" و "مصطفى" دەگەیەنن.

ئەوەتا لە صوحوفی حەزرەتی شوعەیبدا – دروودی لەسەر بێت – وشەی "موشەففەح" بە واتای: "محەممەد" و.. لە تەوراتیشدا "مونەحەمنا" بە هەمان واتا هاتووە و.. لە زەبووردا وشەی: "حمیاطـــا" واتە: "پێغەمبەری حەرەم" هەیە، هەروەها "المختار"یشی تێدایە و.. لە تەوراتدا "الحـاتم" و "الخـاتم" و.. "مقیم السـنة"ش لە تەورات و زەبووردا و.. "مازمار" لە صوحوفی ئیبراهیم و تەوراتدا و.. "ئوحەید" لە تەوراتدا هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "اسمي في القرآن محمد وفي الإنجيل أحمد وفي التوراة أُحيد. وإنما سميت أُحيد لأني أُحيدُ عن أمتي نار جهنم"[1].

هەروەها لەو ناوانەی پێغەمبەر ﷺ کە لە "ئینجیل"دا هاتووە: "صـــاحب القضيـب والهراوة"یە. گومانیشی تێدا نییە کە پێغەمبەر ﷺ بە بۆنەی (جیهادی خۆی و جیهادی نەتەوەکەیەوە) گەورەی نێوان هەموو پێغەمبەرانە.

هەروەها یەکێکی تر لەو ناوانە بریتییە لە: "صاحب التاج". خۆ ئەم سیفەتە تایبەتە تەنها بە پێغەمبەرەوە ﷺ، چونکە تەنها عەرەبەکانن کە لە ناو هەموو نەتەوەکانی تردا بە مێزەر و عەگاڵ بەناوبانگ بن. دیارە تاج و مێزەریش یەك واتایان هەیە. کەواتە ئەو خاوەن تاجەی ئینجیل ناوی بردووە، جگە لە پێغەمبەر ﷺ کەسی تر نییە.

هەروەها لە "ئینجیل"دا ناوی (بارەقلیت) یان (فارەقلیت) هاتووە. واتا کـە شـــی – وەك لە تەفسیری "ئینجیل"دا نووسراوە – بریتییە لە: جیاکەرەوەی حەق لە ناحەق. کە ناوی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ خەڵکی بۆ لای "حەق" بانگ دەکات. حەزرەتی عیساش لە

(١) بڕوانە: (الأنوار المحمدية من المواهب اللدنية) ص١٤٣ واتە: من ناوم لە قورئاندا "محەممەد"ە و لە ئینجیلدا "ئەحمەد"ە و لە تەوراتدا "ئوحەید"ە. بۆیە (ئوحەید)یشم ناونراوە چونکە ئاگری دۆزەخ لە ئوممەتەکەم دوور دەخەمەوە.

"ئینجیل"دا فەرموویەتی: "من دەڕۆم تاکو سەرگەورەی جیهان بێت". ئایا لە دوای حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێت – جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ کەسی تر هاتووە کە سەرگەورەیی جیهانی کردبێت و حەق و ناحەقی لە یەك جیا کردبێتەوە و خەڵکی بۆ ڕێی خێر و چاکە ڕێنمایی کردبێت؟ واتە حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێت – هەمیشە مژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی داوە کە لە دوای خۆی دێت و، ئیتر پێوست بەم نامێنێت و، ئەم تەنها پێشەکیی هاتنی ئەوە.

وەك قورئان ئەمە بە ڕوونی دەردەبڕێت کە دەفەرموێ:

**﴿وإذ قال عيسى ابنُ مريمَ يا بني إسرائيلَ إنـي رسولُ الله إليكُم مُصَدِّقاً لما بين يَـدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِـي مِنْ بعدي اسْمُهُ أَحْـمد﴾** (الصف:٦).

بەڵێ، زۆر جار حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێت – مژدەی بە ئوممەتەکەی دەدا کە وا سەر گەورەی جیهان[1] دێت و، بە چەند ناوێکی سوریانی و عیبری ناوی دەهێنا. زانا لێکۆڵەرەکانیش ئەو ناوانە بە واتای: "ئەحمەد، محەممەد، جیاکەرەوەی حەق لە ناحەق" لێك دەدەنەوە.

**پرسیار:**

بۆچی حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێت – لە هەموو پێغەمبەرانی تر زیاتر مژدەی هاتنی پێغەمبەری داوە، بەڵام پێغەمبەرانی تر تەنها هەواڵی هاتنی ئەویان داوە؟

**وەڵام:**

چونکە پێغەمبەری بەڕێزمان ﷺ حەزرەتی عیسای لە بەدرۆخستنەوەی جوولەکەکان و ئەو وتە نەشیاوانەی بە دەمیەوە هەڵیان دەبەست، ڕزگار کرد. هەروەك ئایینەکەشی لە دەستکاری کردنە ناشیرین و نارەواکانی ئەوان پاراست. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ شەریعەتێکی لێبوردەی هێنا، لە بریی ئەو شەریعەتەی کە نەوەی ئیسرائیلی ماندوو کردبوو، ئەو نەوەی ئیسرائیلەی کە ئیمانیان بە حەزرەتی عیسا

---

(١) گەشتیاری بەناوبانگی تورك: "ئەولیا چەلەبی" لە گۆڕستانی "شمعون الصفا"دا ئینجیلێکی دیوە کە لە پێستی ئاسکدا نووسراوەتەوە، ئەم ئایەتەی تێدا بووە: (ئیتون) منداڵێك لەدایك دەبێت (تازەربیون) لە نەوەی ئیبراهیم (بروفتون) دەبێتە پێغەمبەر (لوغسلین) درۆزن نییە (بنت ئەفزولات) لە مەککە لەدایك دەبێت (کەکالوشیر) چاکە و ڕێنمایی بۆ خەڵك دەهێنێت (تونومنین) ناوی پیرۆزی (موامیت)(*) ئەحمەد، محەممەدە (ئیسفیدوس) ئەوانەی لەگەڵی دەبن و شوێنی دەکەون (تاکردیس) باخەی ئەم دنیایەن (بیست بیث) خۆیشی سەرگەورەی ئەم جیهانەیە. (دانەر)

(*) وشەی (موامیت) دەستکاری کراوی وشەی: (محەممەد)ە. (دانەر)

نەدەهێنا. جا ئەم شەریعەتە بێ گەردەی پێغەمبەر ﷺ پڕە لە ئەحکام و تەواوکەری شەریعەتەکەی حەزرەتی عیسایە – دروودی لەسەر بێت – ئیتر لەم ڕوانگەیەوە حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – ئەو مژدانەی سەبارەت بە هاتنی پێغەمبەرمان ﷺ ڕاگەیاندووە.

* * *

بەم جۆرە بینیمان کە چۆن تەورات و ئینجیل و زەبوور و صوحوفی پێغەمبەران – دروودیان لەسەر بێت – بایەخیان بە پێغەمبەری ئاخرزەمان ﷺ داوە.

ئەوەش بزانە کە ئێمە لێرەدا چەند نموونەیەکی کەممان باس کرد لە نێوانی چەندین ئایەتی زۆری تردا کە لەم بارەیەوە هەن. بۆیە بەمەندەش وازمان هێنا، چونکە ئەو ئایەت و وەسفانەی هێنامانن، سەروزیادن بۆ چەسپاندنی ئەوەی کە پێغەمبەری ئاخر زەمان جگە لە حەزرەتی "محەممەد" ﷺ کەسی تر نی‌یە.

## بەشی دووهەم

بەشی دووهەمی ئیرهاص و بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ بریتی‌یە لە هەواڵدانی کاهینان و ئەولیا و خواناسانی سەردەمی "فەترەت" (واتە: سەردەمی پێش پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ) لە بارەی هاتنی پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەوەبوو هەموو ئەوانە، بە ئاشکرا و لە بەرچاوی خەڵکدا هەواڵی هاتنی پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاندووە. ئەم هەواڵدانەشیان لە شیعرەکانیاندا بۆ بەجێ هێشتووین. هەتا بیشڵێی ئەم هەواڵانە زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەوانەیان باس دەکەین کە بەناوبانگ و بڵاون و، لە لای پیاوانی "سیرەت" و "مێژوو" باوەڕ پێ کراون[1].

(یەکەم): ئەوەیە کە شا توببەع – کە یەکێکە لە پادشاکانی یەمەن – لە بارەی وەسفی پێغەمبەرەوە ﷺ لە کتێبە کۆنەکاندا دیویەتی و، ئیمانی پێ هێناوە و، لە شیعرێکدا ئەمەی ڕاگەیاندووە، کە دەڵێت:

---

(١) ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە کە مامۆستا نوورسی ئەم نموونانەی ئێرەی لە کتێبەکانی سیرەت و مێژوو وەرگرتووە نەك لە کتێبەکانی فەرموودە، وەك ئەوەی لە ئاماژەکانی پێشوودا لەوان نەقڵی دەکرد. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە فەرموودە لە سەرچاوەی فەرموودە و مێژووش لە سەرچاوەی مێژوو وەردەگیرێت.

شـــهدتُ على أحمـــدَ أنّه رسولٌ من الله باري النسم
فلو مُدَّ عمـــري إلى عمره لكنتُ وزيراً له وابنَ عـــم

واتە وەکو حەزرەتی عەلی دەبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ.

(دووهـەم): قوسسی کـوڕی ساعیدەی ئـەیادی، کـە بـە ڕەوانبێژتریـنـی وتارخوێنـە عەرەبەکان و یەکتاپەرست بەناوبانگە، لە پێش ئیسلامدا بـەم بەیتانـەی خـوارەوە هـەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی ڕاگەیاندووە:

أُرســلَ فينا أحمـــد خـــيرُ نبيٍّ قد بُعــث
صلّى عليه اللهُ مـــا عجَّ له ركبٌ وحث

(سێهەم): کەعبی کـوڕی لوئـەی - کـە یەکێکـە لـە باپیرانی پێغەمبـەر ﷺ لـە بـارەی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدەوە ﷺ ئەم بەیتەی ئیلهام کراوە:

على غفلة يأتـــي النبيّ محمدٌ فيُخبِرُ أخباراً صدوقاً خبيرها

(چوارەم): بریتی‌یە لەوەی کە (سەیفی کوڕی ذی یەزەن)ی پادشای یەمـەن لـە کتێبـە پێشووەکاندا وەسفی پێغەمبەری ﷺ دیوە و، ئیمانی پێ هێناوە و موشتاقی بووە. کاتێ کە باپیری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کـاروانی قورەیشـدا بـۆ یەمـەن ڕۆشـتن، ئەم پادشـایە (سـەیفی کوڕی ذی یەزەن) پێی وتن: "إذا وُلدَ بتهامة ولد بين كتفيه شامة كانت لـــه الإمامـــة، وإنك يا عبدالمطلب لَجَدُّهُ"[(١)]!

(پێنجەم): کە یەکەم جار "وەحـی" (واتـە: سرووش) بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هـات، تـرس و سامی لـێ نیشت. خەدیجەی خێزانی - خوای لـێ ڕازی بێـت - بردی بـۆ لای "وەرەقـەی کـوڕی نەوفـەل"ی ئـامۆزای خـۆی و پێی وت: ئـامۆزا! گـوێ لـە برازاکـەت ڕابگـرە. وەرەقـەش بـە پێغەمبـەری ﷺ وت: برازام! چیـت دیـوە؟ پێغەمبـەر ﷺ چیـی دیبـوو بـۆی گێڕایەوە. وەرەقەش وتی: ئەمە ئەو یاسایەیە کە خوا بۆ مووسای نارد. خۆزگا ئەو کاتەی کە قەومەکەت دەرت دەکەن، مرۆڤێکی بەگوڕ و زیندوو بوومایە[(٢)].

یەکێك لـەو قسانەی کە وەرەقە کردی، ئەوە بوو وتی: "بشِّرْ يامحمد! إني أشهد أنّــك أنت النبيُّ المنتظر وبشَّرَ بك عيسى"[(٣)].

---

(١) واتـە: هـەرکات لـە توهامـەدا (واتـە: لـە حیجـازدا) منـاڵێك لـەدایك بـوو کـە لـە نێـوان هـەردوو شـانی‌دا نیشانەیەکی پێوە بوو، ئەوا پێشەوایەتی بۆ ئەو دەبێت، تۆیش ئەی "عەبدولموتەلیب"! باپیری ئەویت.

(٢) صحيح، رواه الإمام أحـــمد.

(٣) واتە: محەممەد! مژدە بێ، من شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو پێغەمبەرەیت چـاوەڕوان دەکرێـت و عیسـاش مژدەی هاتنی تۆی داوە.

(شەشەم): کاتێ "عەسکەلانی حیمیەریی خواناس" لە پێش پێغەمبەرێتی‌دا قورەیشی دی، لێی پرسین: کەستان تێدا هەیە بڵێ من پێغەمبەرم؟ وتیان: نەخێر.. لە پاش ناردنی پێغەمبەر ﷺ هەمان پرسیاری لێ کردنەوە، وتیان: بەڵێ، یەکێکمان دەڵێت: من پێغەمبەرم. ئەویش وتی: "هەموو جیهان چاوەڕێیەتی"!

(حەوتەم): "ئیبنولعەلا"، کە زانایەکی گاورە، پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ دێت. ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ رەوانەکرا، هاتە خزمەتی و عەرزی کرد: "والذي بعثَك بالحق لقد وجدتُ صفتك في الإنجيل وبشَّرَ بك ابن البتول"[1].

(هەشتەم): نەجاشیی پادشای حەبەشە - کە زووتر باس کرا - وتی: "ليتَ لي خدمَتَهُ بدلاً عن هذه السلطنة"[2].

* * *

دوای ئەوەی هەواڵدانی ئەو خواناسانەمان باس کرد کە بەهۆی ئیلهامەوە سەبارەت بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ خوا ئاگاداری کردبوونەوە، هەواڵدانی ئەو کاهینانەش دەهێنین کە تابلێی زۆرن و سەبارەت بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن جینی و ڕۆحانی‌یەکانەوە ئاگادار کرابوونەوە. تەنها ئەو هەواڵانەش لێرەدا باس دەکەین کە لە حوکمی "موتەواتیر"دان و، لە کتێبەکانی سیرەت و مێژوودا باس کراون. جا ئەو کەسەی کە دەیەوێت لە چیرۆك و بەسەرهاتە درێژەکان ئاگادار بێت، با سەر لەو کتێبانە بدات. چونکە لێرەدا تەنها پوختەکانیان باس دەکەین.

یەکەم: ئەو کاهینەی کە ناوی "شیق"ە (واتە: لەت) کە لەتە مرۆڤێك بووە، واتە بریتی بووە لە یەك دەست و یەك پێ و یەك چاو و... هتد.. ئەم کاهینە چەندین جار هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندووە، بە ڕادەیەك کە وتەکانی گەیشتوونەتە پلەی تەواتور.

دووهەم: "سەتیح"ی کاهینی "شام"ە، کە یەکێك بووە لە شتە سەرسووڕهێنەرەکان، چونکە تەنێکی بێ‌ئەندام و بێ جمگە و ئێسك بووە جگە لەسەر، دەموچاویشی لە سنگی‌دا بووە! ئەم کاهینە زۆر ژیاوە و، هەواڵدانە غەیبی‌یە ڕاستەکانی ناوبانگیان دەرکردووە. بە ڕادەیەك کە کیسرای پادشای فارس لە کاتی لەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ

(١) واتە: بەو خوایەی کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە! سیفەتی تۆم لە ئینجیلدا دیوە و، عیسای کوڕی مەریەمیش مژدەی هاتنی تۆی داوە.

(٢) واتە خۆزگا لە بریی ئەم پادشایی‌یەم، خزمەتگوزاری ئەو بوومایە!

خەونێکی ترسناکی بینی، لەو خەونەدا پەنجەرەکانی هەر چواردە هەیوانی کۆشکەکەی بینی شەقوپەق بوون و کەوتنە خوارەوە! کە ئەمەی دی، زانایەکی بە ناوی: "مویزان" بۆ لای (سەتیح) نارد تاکو حیکمەتی ئەم خەونەی لێ بپرسێت، ئەویش وەڵامێکی بەم واتایە بۆ نارد کە: "چواردە پادشاتان حوکم دەکات و، پاشان دەوڵەت و دەستەڵاتداریتان نامێنێت و، یەکێك پەیدا دەبێت کە ئایینێکی نوێ ئاشکرا دەکات و دەبێتە هۆی نەمانی ئایین و دەوڵەتتان".. بەم جۆرە و بە ڕوونی "سەتیح" هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمانی ﷺ ڕاگەیاند.

هەروەها "سەوادی کوڕی قاریبی دەوسی" و "خونافیر" و "ئەفعا"ی پادشایانی نەجران و "جیزلی کوڕی جیزلی کیندی" و "ئیبن خەلصە"ی دەوسی و "فاتیمەی کچی نوعمانی نەجاری" و کاهینە بەناوبانگەکانی تری هاوچەشنیان، هەر هەموویان، هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئاخرزەمانیان ﷺ ڕاگەیاندووە و، وتوویانە کە ئەو پێغەمبەرە حەزرەتی محەممەدە ﷺ، هەروەك کتێبەکانی سیرەت و مێژوو بە درێژی باسیان کردووە.

هەروەها "سەعدی کوڕی بنت کریز" کە خزمی حەزرەتی عوسمانە - خوای لێ ڕازی بێت - بە غەیب و لە ڕێی کاهینیەوە، هەواڵی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدی ﷺ پێ درابوو. ئەوەبوو لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامدا داوای لە حەزرەتی عوسمان کرد باوەڕی پێ بهێنێت و، پێی وت: "برۆ بۆ لای محەممەد و باوەڕی پێ بهێنە". حەزرەتی عوسمانیش ئیمانی هێنا و، سەعدیش ئەمەی لە شیعرێکدا تۆمار کرد و دەڵێت:

هدى الله عثمانَ بقولي إلى التي    بها رُشده والله يهدي إلى الحقِّ[1]

* * *

"هاتیف"یش - کە دەنگێکی بەرزە و دەبیسترێت و سەرچاوەکەی نابینرێت - بە وێنەی کاهینەکان هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندووە.

یەکێك لەوانە ئەو دەنگە بوو کە "ذیابی کوڕی حاریث" لە جینێیی بیست و بوو بە هۆی موسڵمان بوونی خۆی و چەند کەسانێکی تر، دەنگەکەش ئەمە بوو:

(١) واتە: بەهۆی ئەوەی کە عوسمان بەگوێی کردم، خوا ڕێنمایی کرد بۆ ئەوەی کە قازانجی عوسمانی تێدایە. دیارە هەر خوا ڕێنمایی خەڵك بۆ سەر ڕێی ڕاستی دەکات.

يا ذيـــاب! يا ذياب! اسمع العجب العجاب
بُعث محمد بالكتاب يدعو بمكة فلا يُجاب[١]

هەروەها ئەو دەنگەش کە "ئیبن قوڕڕەی غەتەفانی" بیستی، دەیوت:

جاء الحقُ فســـطع ودُمّر باطلٌ فانقمع[٢]

ئەمەش بوو بەهۆی ئیمان هێنانی هەندێ کەس.

کەواتە مژدەدانی کاهین و هاتیفەکان گەلێ بەناوبانگ و زۆرن.

* * *

هەروەك دەنگی هەواڵدانی هاتنی پێغەمبەر ﷺ لە کاهین و هاتیفەکانەوە بیستراوە، بە هەمان جۆر لەناو بتەکان و ئەو قوربانییانەشەوە کە بۆ بتەکان سەردەبڕران، چەند دەنگێك بیستراوە کە ئەوانیش هەواڵی هاتنی پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاندووە.

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە بتی هۆزی "مازین" هەواڵی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری ﷺ داوە، چونکە ئەم دەنگەی لەناوەوە لێ دەرچووە:

هذا النبيُّ المُرْسَل جاءَ بالحقِ المنـــزَّل[٣]

هەروەها هۆی موسڵمان بوونی "عەبباسی کوڕی میرداس" ئەم ڕووداوە بەناوبانگەیە کە دەگێڕنەوە: عەبباس بتێکی هەبوو ناوی "ضیمار" بوو، ئەم بتە ڕۆژێك وتی:

أودى ضمارٌ وكان يُعبد قبل البيان من النبيّ محمد[٤]

حەزرەتی عومەر - خوای لێ ڕازی بێت - پێش موسڵمانبوونی گوێی لە گوێرەکەیەك بوو، پیاوێك دەیویست لە نزیکی بتێکەوە سەری ببڕێت و بیکات بە قوربانی بۆ ئەو بتە، گوێی لێ بوو ئەو گوێرەکەیە دەیوت: "يا آل الذبيح! أمرٌ نجيـــح، رجلٌ فصيح، يقول: لا إله إلاّ الله"[٥].

چەند ڕووداوێکی تری زۆر و هاوچەشنی ئەمانەی هێنامانن، لە کتێبە باوەڕپێکراوەکانی سیرەت و مێژوودا باس کراون.

---

(١) واتە: ذياب ذياب! شتی سەیر بیستە! محەممەد ﷺ بە کتێبەوە نێرراوە و کراوە بە پێغەمبەر، والە مەککەدا خەڵك بۆ ئایینەکەی بانگ دەکات، بەڵام ئەوان بەدەم بانگەوازەکەیەوە نارۆن.

(٢) واتە: حەق هات و درەوشایەوە، ناحەقیش سەرکوت و دەمکوت کرا.

(٣) واتە: ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەوانە کراوە، حەقی نازڵ کراوی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

(٤) واتە: "ضیمار" تیاچوو، هەرچەند زووتر پێش ڕوونکردنەوەکانی محەممەد پێغەمبەر ﷺ دەپەرسترا!

(٥) واتە: ئەی خاوەنی ئەم قوربانییە! کارێکی سەرکەوتوو ڕووی داوە، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤێکی زمانپاراو دەڵێت: "لا إله إلاّ الله".

هەروەك کاهینان و خواناسان و هـاتیف و تەنانـەت بتـەکان و ئـەو قوربانییانـەش کـە پێشکەشیان کراون، هەواڵی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاندووە و، هـەر یـەك لـەو ڕووداوانەش بووە بەهۆی موسڵمان بوونی هەندێ کەس. هەر بەوجۆرەش هەندێ بەرد و کێلـی سـەرگـۆڕ بـە خـەتی کـۆن دەسـتەواژەی: "محـمد مصلـح أمـین"ی لەسـەر دۆزراوەتـەوە و، ئەمەش بووە بەهۆی باوەڕهێنانی بەشێکی خەڵك.

بەڵێ: دەستەواژەی: "محمد مصلح أمين" تەنها شایانی پێغەمبەرە ﷺ. چونکـە سیفەتی سوڵحکاری و ئەمینی هی ئەوە، جگە لەوەی کە پێش پێغەمبەر ﷺ چـەند کەسێکی کـەم نەبێت، کەس ناوی (محەممەد) نەبووە، ئەوانەش شایانی ئەم ناو و سیفەتە نین.

## بەشی سێهەم

بەشی سێهەم لە "ئیرهاص"ەکان ئەو نیشانە و ڕووداوانەن کە لە کـاتی لـەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ دەرکەوتوون. چونکە هەریەك لەو ڕووداوانەی کـە ڕوودانیـان پـەیوەندیی بە لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە یان پێـش پێغەمبـەرێتیی ڕوویـان داوە، بە یـەکێك لـە موعجیزەکـانی پێغەمبـەر ﷺ دادەنرێـن. ئەمانـەش گەلـێ زۆرن. بـەڵام ئێمـە لـێرەدا چـەند نموونەیـەکی بـەناوبانگیان بـاس دەکـەین، لەوانـەی کـە لـە لای زانایـانی فـەرموودە بـە (صەحیح) چەسپاون و، وەریانگرتوون.

(یەکـەم): ئەوەیـە کـە دایکـی پێغەمبـەر ﷺ دیویـەتی[1] کە بریتییـە لـە ڕووناکییـەك لەگەڵ لەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ بینراوە. ئەمەش جگە لە دایکـی پێغەمبـەر ﷺ، دایکـی عوسمـانی کـوڕی عـاص و دایکـی عەبدوڕڕەحـمانی کـوڕی عـەوفیش – کـە لـە شـەوی لەدایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ لە لای دایکی پێغەمبـەر ﷺ بـوون – دیویانـە و وتوویانـە: "لـە کاتی لەدایکبوونیدا ڕووناکییەکمان دی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوای گرتەوە".

(دووهەم): تێکشکان و بەدەماکەوتنی زۆربەی ئەو بتانەیە کە لە کەعبەدا بوون.

(سێهەم): جووڵانی هەیوانی کیسرایە لە جێگای خۆیدا و، داکەوتنی هەر چـواردە پەنجەرەکانیەتی.

(چوارەم): بریتییە لە ڕۆچوونی دەریاچەی "ساوە" لەو شەوەدا، ئەو دەریاچەیەی کە دەپەرستـرا، هـەروەها کوژانـەوەی "ئـاگری فـارس" کـە تـا ئـەو شـەوە هـەزار سـاڵ بـوو

(١) صحيح، رواه أحـــمد والبيهقي وجماعة، وصححه ابن حبان والحاكم.

نەكوژابووەوە[١]. چونكە هەمیشە لە "ئیستەخراباد" دایاندەگیرساند و مەجووسەكان دەیانپەرست.

ئەم چوار ڕووداوە ئاماژەن بۆ ئەوەی كە ڕۆژێك دێت ئەو تازە لەدایكبووە بتپەرستی ناهێڵێت و، دەسەڵاتی فارسەكان لەناو دەبات و، پەرستن و ڕێزلێنانی شتێك كە خوای گەورە ڕوخسەتی لەسەری نەبێت، حەرام دەكات.

(پێنجەم): بریتی‌یە لە بەسەرهاتی فیلەكە. هەرچەند ئەم بەسەرهاتە لە بەسەرهاتەكانی شەوی لەدایكبوونی پێغەمبەر ﷺ نی‌یە، بەڵام لە نزیكی لەدایكبووندا ڕووی داوە، كەواتە یەكێكە لە ئیرهاصەكان و، قورئانی پیرۆز بە ئایەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ﴾ (الفيل:١) تا كۆتایی سوورەتەكە، ڕوونی كردووەتەوە.

كورتەی بەسەرهاتەكەش بەم جۆرە بووە:

شا ئەبرەهەی حەبەشی ویستی كەعبە بڕووخێنێت و، فیلێكی گەورەشی بە ناوی "مەحموود"ەوە پێش ئەو سوپایە خستبوو كە بۆ ئەم مەبەستە خستبوویە ڕێ. ئنجا كاتێ فیلەكە گەیشتە نزیكی مەككە، چوارپەلی بە زەوی‌دا ڕۆچوو و، هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ دا، بێ‌سوود بوو نەیتوانی بەرەوپێش بڕوات. كە هیچ چارەیەكیان نەما، گەڕانەوە. بەڵام باڵندەی "ئەبابیل" نەیانهێشت ئەو سوپایە بە ساغی بگەڕێتەوە، ئەوەبوو بە بەردی سواڵەت بەردەباران و زەلیلیان كردن و، بەم جۆرە تێكشكان و ڕسوایی‌یە سەیرە، شكستیان هێنا.

ئەم بەسەرهاتە لە كتێبەكانی مێژوودا زۆر بەناوبانگە و، یەكێكە لە نیشانەكانی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ. چونكە هۆزەكەی و خۆشترین جێگا بە لایەوە كە كەعبەیە، بە جۆرێكی سەیر و لەعادەت‌بەدەر، لە كاولكاریی ئەبرەهە ڕزگاری بوو.

(شەشەم): بریتی‌یە لە سێبەركردنی هەور بۆ پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرەكانی‌دا.

دەگێڕنەوە كە حەلیمەی سەعدی‌یەی (دایەنی) كاتێ پێغەمبەری ﷺ بە مناڵی لە لا بوو، چاوی بە پەڵە هەورێك كەوت سێبەری بۆ پێغەمبەر ﷺ دەكرد[٢]. مێردەكەشی كە ئەمەی دی، خەڵكی تریشی لێ ئاگادار كردەوە و، ئیتر ئەمە بوو بە ڕووداوێكی زانراوی بەناوبانگ.

---

(١) نەبارەی ئەمەی كە لە (سێ‌هەم) و (چوارەم)دا باس كرا، موحەققیقی (الموضوعات الصغرى) دەڵێت: (ليس بصحيح)..

(٢) رواه الواقدي وابن عساكر وابن سعد في تأريخه عن ابن عباس.

هەروەها كاتێ كە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا لەگەڵ مامی ڕۆشت بۆ شام، بوحەیرای ڕەبەن پەڵە هەورێكی بەسەر ئاستی سەری پێغەمبەرەوە ﷺ دی و پیشانی كەسانی تریشی دا[1].

لە ڕیوایەتێكدا دەڵێت: كاتێ پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرەكەی شام گەڕایەوە، خەدیجە و ژنانی دەوروبەری دوو مەلائیكەتیان دی كە وەك پەڵە هەور سێبەریان بۆ دەكرد. خەدیجە كە ئەمەی دی، بۆ مەیسەرەی غولامی خۆی باس كرد (كە لە سەفەرەكەدا هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بوو) مەیسەرەش بە خەدیجەی ڕاگەیاند كە ئەو پەڵە هەورەی ئەو دیویەتی، ئەمیش بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ دیویەتی لەو كاتەوە بە یەكەوە بۆ سەفەر لە ماڵ دەرچوون[2].

(حەوتەم): بە نەقلی صەحیح چەسپاوە كە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێكی پێش پێغەمبەریدا، لایدایە ژێر سێبەری درەختێكی وشك، یەكسەر دەوروبەری سەوز بوو، درەختەكەش گەشەی كرد و، لق و پەلەكانی بەسەریدا شۆڕ بوونەوە[3].

(هەشتەم): پێغەمبەر ﷺ كە بە منالی لە ماڵی ئەبوو تالیبی مامیدا بوو، هەركات لەگەڵ مامی و خاوخێزانەكەی مامیدا خواردنی بخواردایە، خاوخێزان هەموویان تێر دەبوون، بەڵام ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئامادەی خواردنەكە نەبوایە، تێریان نەدەخوارد[4].

ئەمە ڕووداوێكی صەحیح و بەناوبانگە.

"ئوم ئەیمەنی" دایەن و كۆیلەی ئازادكراوی پێغەمبەر ﷺ وتوویەتی: "هیچ كاتێ نەمدیوە پێغەمبەر ﷺ لە دەست برسێتی و تینوێتی سكاڵا بكات، چ بە بچووكی، چ بە گەورەیی"[5].

(نۆهەم): بریتییە لەو پیت و بەرەكەتەی كەوتە ناو مەڕومالات و حوشترەكانی حەلیمەی شیردەریەوە، بە پێچەوانەی كەسانی تری ئەو تیرە و ناوچەیە، ئەمەش ڕووداوێكی بەناوبانگە و هیچ گومانێك لە ڕاستیی ڕوودانیدا نییە[6].

---

(١) صحيح، رواه الترمذي.
(٢) نسيم الرياض ٣/٣١٨.
(٣) نسيم الرياض ٣/٣١٨، الشفا ١/٣٦٨.
(٤) رواه ابن سعد وغيره. بڕوانە: نسيم الرياض ٣/٣١٥.
(٥) أخرجه ابن سعد في الطبقات ١/١٦٨ والخفاجي في نسيم الرياض ٣/٣١٥.
(٦) نسيم الرياض ٣/٣١٣.

هەروەها بریتی‌یە لەوەی کە هەرگیز "مێش" بە لەش و بەرگ و پۆشاکی پێغەمبەرەوە ﷺ نەدەنیشتەوە[1] و، هەرگیز ئازاری پێغەمبەری نەدەدا.. شێخ عەبدولقادری گەیلانی - قُدس سره - ئەمەی لە باپیرە گەورەیەوە ﷺ بۆ مابووەوە، چونکە ئەویش هەرگیز مێشی پێوە نەدەنیشتەوە.

(دەهەم): بریتی‌یە لە زۆریی ئەو تیرەستێرانە(شُهُب)ی کە لە کاتی هاتنی پێغەمبەردا ﷺ، بە تایبەتی لە شەوی لەدایکبوونی‌دا، دنیایان ئاگرباران دەکرد.

لە وتەی یازدەهەمدا ڕەجم کردنی شەیتانەکان و کەوتنە خوارەوەی تیرەستێرەکانی ئاسمانمان چەسپاندووە و، ڕوونمان کردووەتەوە کە مەبەست لە کەوتنە خوارەوەی ئەو تیرەستێرانەی ئاسمان، ئاماژەکردنە بۆ بڕینی ڕێگای سووسەکردنی هەواڵەکانی ئاسمان لەو جیننی و شەیتانانە. چونکە مادەم پێغەمبەر ﷺ بە سرووشەوە هاتووە بۆ لای هەموو جیهان بە گشتی، ئەوا دەبێ وتەی کاهینان و ئەوانەی بە ناوی غەیبەوە قسە درۆینە و دەمهەڵبەست و دوور لە واقیعەکانی جیننی لەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە، قەدەغە بکرێن، تاکو "سرووش" تێکەڵ بە غەیری خۆی نەبێت و، هیچ گومانێك لە مەسەلەی سرووشدا دروست نەبێت. چونکە لە پێش هاتنی پێغەمبەردا ﷺ بەکارهێنانی ئەوانە گەلێ زۆر بووە. بەڵام لە دوای نازڵ بوونی قورئان بە یەکجاری قەدەغە کران. تەنانەت بەشێکی زۆر لەو کاهینانە ئیمانیان بە پێغەمبەر ﷺ هێنا، چونکە ئەو هەواڵدەرە جیننی‌یانەی کە جاران هەواڵی غەیبیان بۆ دەهێنان، نەمان! کەواتە قورئانی پیرۆز ڕێی لێ بڕین و دەرگای لەسەر داخستن.

وا لە سەردەمی ئێستاماندا، جۆرێك لەو کاهینێتی‌یەی کۆن لە ئەورووپادا بڵاو بووەتەوە، لە لای ئەو وەسیتانەی کە دەیانەوێت "ڕۆح" ئامادە بکەن.. بە هەرحاڵ..

***بە پوختی:***

لە پێش پێغەمبەرێتیی پێغەمبەردا ﷺ ڕووداوی زۆر و کەسانی زۆر پەیدا بوون، کە پشتگیریی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدیان ﷺ کردووە.

---

(١) نسيم الرياض ٣/٣١٩.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە لە جیهانی مەعنادا دەبێت بە سەرگەورەی جیهان[١].. ئەو کەسەی کە ڕوخساری مەعنەویی جیهان دەگۆڕێت و دنیا دەکات بە کێڵگەی دواڕۆژ و.. پایەی بەرز و پلەی بەنرخی بوونەوەران دەردەخات و ڕایدەگەیەنێت.. ئەو کەسەی کە جینندی و ئادەمیزاد بۆ ڕێی ڕاست و بەختەوەری ڕێنمایی دەکات.. ئەو کەسەی کە حیکمەتی بەدیهێنان و مەتەڵی سەرسووڕهێنەری جیهان شیتەڵ دەکات.. ئەو کەسەی کە ئامانجەکانی پەروەردگاری هەموو جیهانان دەزانێت و کەسانی تریشیان لێ شارەزا دەکات.. ئەو کەسەی کە بەدیهێنەری مەزن دەناسێت و بە خەڵکیشی دەناسێنێت..

ئەو کەسەی بەم جۆرە بێت، دەبێ هەموو شتێك و هەموو جۆرێك و هەموو تیرەیەکی بوونەوەران، لە تاسەی هاتنیدا بن و.. بەوپەڕی گەرمی چاوەڕوانی بن و.. خۆیان بۆ پێشوازی لێکردنی ئامادە بکەن.. بەڵکو هەریەك لەوانە، گەر بەدیهێنەرەکەی ئاگاداری بکاتەوە، مژدەی هاتنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بە غەیری خۆی دەدات. وەك لە ئاماژە و نموونەکانی پێشووەوە بۆمان دەرکەوت کە هەریەکە لە جۆرەکانی بوونەوەران بە چەشنێك موعجیزەی خۆی پیشان دا وەك بڵێی بەخێرهاتنی دەکات و، بە زمانی حاڵی ئەو موعجیزەیەی دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ لەم بانگەوازەتدا ڕاست دەکەیت".

## ئاماژەی حەڤدەهەم

گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ لە دوای موعجیزەی قورئانی پیرۆز، بریتییە لە پێغەمبەر ﷺ خۆی! واتە بریتییە لە خوو و ڕەوشتە بەرزەکانی.

---

(١) ئەو کەسەی "لولاك.. لولاك"ی لە بارەوە وتراوە، لە ڕاستیدا سەرگەورەیەکی گەلێ مەزنە. چونکە وا هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵە دەستەڵاتی ئەو کەسە بەردەوامە و، لە هەموو سەردەمێکدا زیاتر لە سێ سەد و پەنجا ملیۆن کەس شوێنی دەکەون و، بەسەر نیوەی بەشە ئاوەدانەکەی سەر گۆی زەویدا ئاڵای خۆی هەڵکردووە و، شوێنکەوتووانی ئەو لە هەموو ڕۆژێکدا، بە درووود و سەلام بۆ ناردنی، بەوپەڕی ملکەچی و گوێڕایەڵییەوە، پەیمانی لەگەڵ نوێ دەکەنەوە و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن[*]. (دانەر)

(*) لەسەر "لولاك.. لولاك" زانایان زۆریان وتووە، چ لە بارەی سەنەدەوە و چ لەبارەی واتاکەیەوە. لە هەمووی جوانتر وتەکەی (علي القاري)یە لە شەرحی "الشفاء"دا، کە دەڵێت: "هەرچەند لە سەنەددا لاوازە، بەڵام واتاکەی ڕاستە". بڕوانە: "شرح الشفا لعلي القاري ٦/١".. بۆزانینی ئەوەش کە ئەم وتەیە واتاکەی ڕاستە و خوای گەورە لەبەر پێغەمبەر ﷺ گەردوونی دروست کردووە، بڕوانە: (الفتاوى لإبن تيمية ج ١١/ص٩٦ - ٩٨ مجلد التصوّف). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەی ئەم پەیامەوە، ص ١٥١).

هەموو دۆستان و دوژمنان بە یەكدەنگ قسەیان لەسەر ئەوە یەكانگیر بووە كە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو كەسێك پایەبەرزتر و گەورەتر و ڕەوشتی جوانترە. تەنانەت ئیمامی عەلی – خوای لێ ڕازی بێت – كە پاڵەوانی "ئازایەتی"یە، دەفەرموێ: "هەركات لە جەنگدا بكەوتینایەتە تەنگانەوە و لە تاوا چاومان سوور هەڵبگەڕایە، پەنامان بە پێغەمبەر ﷺ دەبرد و خۆمان بەو دەپاراست"! جا هەروەك لە "ئازایەتی"دا وەها بووە، لە هەموو ڕەوشتێكی تری باشدا هەر بەو جۆرە لە چڵەپۆپەیەكدا بووە كە جگە لەو كەسی تری پێ ناگات.

ئەو كەسەی كە دەیەوێت بە درێژی لەم موعجیزەیە ئاگادار بێت، با سەیری كتێبی: "الشفا في حقوق المصطفى"ی "قاضی عەیاضی مەغریبی" بكات. چونكە تابڵێی بە ڕێكوپێكی و باشی باسی كردووە و بە دوور و درێژی چەسپاندوویەتی.

* * *

پاشان "شەریعەتی ئیسلام" كە هیچ شەریعەتێكی تر وەك ئەو نەبووە و نابێت، موعجیزەیەكی گەورەی پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ كە دۆستان و دوژمنان گومانیان لەمەدا نی‌یە و قسەیان لەسەر ئەمە یەكی گرتووە.

ئەو كەسەی دەیەوێت بە درێژی و ڕوونی لەم موعجیزەیە ئاگادار بێت، ڕەوانەی دەكەین بۆ لای هەموو ئەو پەیامانەی نووسیومانن كە برتیین لە "٣٣" وتە و "٣٣" مەكتووب و "٣١" بریسكە و "١٣" تیشك.

* * *

ئنجا موعجیزە گەورەكەی، كە موعجیزەی "لەت كردنی مانگ"ە و بە چەندین ڕیوایەتی موتەواتیر ڕیوایەت كراوە و موعجیزەیەكی هێندە چەسپاوە كە هیچ گومانێك توخنی ناكەوێت، ئەم موعجیزەیە بە شێوەیەكی موتەواتیر و لە چەندین ڕێگاوە ڕیوایەت كراوە، وەك لە ڕێگای: (ئیبن مەسعوود و ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر و ئیمامی عەلی و ئەنەس و حوزەیفە) و زۆرێكی تر لە هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺ.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە قورئانی پیرۆز، ئەم موعجیزەیەی ڕاگەیاندووە و پشتی ئەو ڕیوایەتانەی گرتووە و، ئەمەشی لە ئایەتی: ﴿**اقْتَرَبَتِ السَّاعةُ وانشقَّ القمر**﴾دا ڕاگەیاندووە. تەنانەت كافرەكانی قورەیش، كە تابڵێی لە عینادی و سەرسەختی‌دا بوون، كە ئەم موعجیزەیەیان بینی، نەیانتوانی ئینكاریی بكەن و، خۆیان بەوە دەرباز كرد كە

وتیان: "ئەمە سیحرە"! واتە ڕوودانی "لەت بوونی مانگ" ڕووداوێکی ئەوەندە بێ گومان و چەسپاوە، کە تەناتەت کافرەکانیش دانیان پێدا ناوە و، بەوە خۆیان لێ دەرباز کردووە کە بە "سیحر" لە قەڵەمیان داوە!.

بۆ ئەمە، خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی پەیامی: "لەت بوونی مانگ" دەکەین کە پاشکۆی پەیامی "میعراج"ە و، (لە پاشکۆی ئەم پەیامی موعجیزاتەشدا دانراوە).

* * *

پاشان پێغەمبەر ﷺ هەروەك موعجیزەی "لەت کردنی مانگ"ی پیشانی سەرنشینانی زەوی دا، بە هەمان جۆر موعجیزەی گەورەی "میعراج"یشی پیشانی ئاسمان نشینان دا. بۆ ئەمەش خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی پەیامی "میعراج" دەکەین کە بریتی‌یە لە وتەی "سی و یەکەم" و پەیامێکە ڕاستیی ئەو موعجیزەیەی چەسپاندووە و بە ڕوونی باسی کردووە. بەڵام لێرەدا تەنها پێشەکیی موعجیزەکە باس دەکەین، کە بریتی‌یە لە سەفەرکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ "بەیتولمەقدیس" و، داواکردنی قورەیش لە پێغەمبەر ﷺ، لە بەرەبەیانی میعراجدا، کە وەسفی "بەیتولمەقدیس"یان بۆ بکات. چونکە ئەوەی لەم سەفەرەدا ڕووی دا، ئەویش موعجیزەیە:

ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ بەرەبەیانی شەوی میعراج هەواڵی ئەم سەفەرەی ڕاگەیاند، قورەیشی‌یەکان بەدرۆیان خستەوە و وتیان: ئەگەر ڕاست دەکەیت کە ڕۆشتوویت بۆ "بەیتولمەقدیس" وەسفی دەرگاکان و دیوارەکان و ئەحوالی "بەیتولمەقدیس"مان بۆ بکە!

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

"فكربتُ كرباً ما كربتُ مثله قط، فرفعه الله لي أنظر إليه"[1].

واتە: "بەیتولمەقدیس" خرایە پێش چاوی و سەیری دەکرد و وەسفی دەکرد بۆیان. ئیتر قورەیش دڵنیا بوون لە ڕاستیی هەواڵەکەی. ئنجا لێیان پرسی: ئەو کاروانەی کە لە ڕێگادا چاوت پێ کەوت کەی دەگاتە بەرەوە؟ فەرمووی: "ڕۆژی چوار شەممە". لە چوار شەممەدا قورەیش چاوەڕوانی کاروانەکە بوون تا نزیکی خۆرئاوا، کەچی کاروانەکە

(١) صحيح، رواه البخاري و مسلم والترمذي والنسائي. واتە: کەوتمە تەنگانەیەکی وەها کە تا ئەو کاتە شتی وام بەسەر نەهاتبوو. یەکسەر خواوەند خستی‌یە پێش چاوم، منیش سەیرم دەکرد.

نەگەیشت. پێغەمبەر ﷺ لە خوا پارایەوە، نزاکەی گیرا بوو و، ئەو ڕۆژە سەعاتێك لە ڕۆژ زیاد کرا و خۆرئاوابوون دواکەوت[1].

ئەوەتا دەبینیت کە گۆی زەوی بۆ ماوەی (یەك سەعات) لە کاری خۆی ڕابووەستێت و تەسدیقی هەواڵەکەی پێغەمبەر ﷺ بکات و، خۆری زەبەلاحیش بێت بە شایەت لەسەر ڕاستیی ئەو.. ئیتر دەبێ ئەو کەسە چەندە بەدبەخت بێت کە فەرموودەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ تەسدیق نەکات، لە کاتێکدا کە خۆر و زەوی تەسدیقی دەکەن. هەروەها دەبێ ئەوانە چەندە بەختەوەر بن، کە شەرەفمەندی بەجێهێنانی فەرمانەکانی ئەون؟ سەرنج لەمە بدە و بڵێ:

"الحمد لله على الإيمان والإسلام".

## ئاماژەی هەژدەهەم

گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە "قورئانی پیرۆز" کە سەدان بەڵگەی پێغەمبەرێتیی ئەوی تێدایە.

ئیعجازی قورئانیش لە چل ڕووەوە چەسپێنراوە، وەك ئەوەی کە لە: "وتەی بیست و پێنجەم"دا ڕوون کراوەتەوە. جا لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕووانەی ئیعجازی قورئان لەو وتەیەدا باس کراون، ئەوا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم گەنجینە گەورە پڕ لە موعجیزەیە خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین. بەڵام لێرەدا سێ سەرنجی ورد ڕوون دەکەینەوە:

### سەرنجی یەکەم

**پرسیار:**

ئەگەر بوترێت: نهێنیی ئیعجازی قورئانی پیرۆز لە "بەلاغەت"ە هەرە بەرزەکەیدایە. بەڵام خۆ مەگەر تەنها یەك لە هەزاری کەڵە زانایانی ڕەوانبێژی پەی بەم نهێنییە ببەن، لە کاتێکدا کە دەبوو هەموو چینێکی خەڵکی بەشی خۆیان لە زانینی ئەم نهێنییەدا ببوایە؟

---

(١) ئەم ڕووداوە هەندێ لە زانایانی حەدیث دەڵێن: "مەوضووعە"، هەندێکی تر دەڵێن: "ضەعیفە"، هەندێکی تریش بە "صەحیح" لە قەڵەمیان داوە. بڕوانە: پەراوێزی ژمارە (٢)ی لاپەڕە ١٥٤ی چاپە عەرەبییەکەی ئەم پەیامە و ص٢٣٧ "المكتوبات".

**وەڵام:**

"قورئانی پیرۆز" بۆ هەموو چینێك لــە چینـەكانی كۆمـەڵ و خـەڵكی ئیعجـازی خـۆی هەیە. بەڵام ئەم ئیعجازەی بە جۆرێكی تایبەتی و شێوازێكی دیاری كراو ڕادەگەیەنێت.

بۆ نموونـە: ئیعجـازی ڕەوانبێژیـیـە بەرزەكـەی بـۆ ئـەهلی"بەلاغـەت و فەصاحــەت" دەردەخـات.. هـەروەها شێـوازە بـەرز و جوانـە ناوازەكـەی خـۆی پیشــانی "شـاعیران و وتارخوێنان" دەدات، كە شێوازێكە هەموو چینێكی خـەڵكی لـەزەتی لـێ وەردەگرێـت، بێ ئەوەی هیــچ كەسێك بتوانێـت لاسایی بكاتـەوە! شـێوازێكە چ خوێندنـەوەی یـەك لـە دوای یـەك و چ هـاتوچۆ و ئـاڵوگۆڕی ڕۆژگـار كۆنـی ناكـات و، هـەرگیز نـابێزرێت. كەواتە شـێوازێكی هەمیشـە نوێیـە و، هـەردەم لـە تـافی لاوی‌دا دەمێنێتـەوە.. شـێوازێكە ئەندازەیەكی ئەوتۆی پەخشانی لە شیعرچوو و، وتەی هۆنراوی لە پەخشانچووی تێدایە كـە ئاسـتی قورئـان بـە تـەواوی بـەرز دەكاتـەوە و، لـە هـەمان كاتیشـدا خــۆش و بـەتامی دەكات.

ئنجـا قورئـان بــەو هەواڵدانـە غەیبی‌یانـەی كـە ڕایاندەگەیـەنێت، ئیعجــازی خــۆی دەردەخات و بەمەش تەحەددای چینی كاهینان و لاف لێدەرانی غەیبزانی دەكات.

پاشــان هێنــدە ڕووداوی جیــهان بــۆ "مێژووناســان" و زانایــانی عــەودالی ڕووداوە مێژوویی‌یەكان دەگێڕێتەوە كە وایان لـێ بكات هەست بە ئیعجازەكەی بكەن! ئەمەش لە ڕێــی باســـكردنی بەســــەرهات و ڕووداوە دێرینــــەكانی نەتـــەوە پێشـــینەكان و ئـــەو ڕووداوانەشەوە كە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن، چ لەم ژیانەی دنیادا و چ لە بـەرزەخدا و چ لەودنیادا. بەم ئیعجازە ڕوون و جوانەش تەحەددای هەموو ئەو كەس و چینانە دەكات.

هەروەها "قورئانی پیرۆز" بە باسكردنی ئەو یاسا كۆمەڵایەتی و دەستووره گشتی‌یانەی كە لە ژیان و كۆمەڵدا كار دەكەن، ئیعجـازی خـۆی بـۆ زانایـانی كۆمەڵناسـی و پیـاوانی سیاسەت و حوكمڕانانیش دەردەخات.. بەڵێ، شەریعەتی پاكی ئیسلام – كە لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەی گرتووە – بە تەواوی نهێنیی ئەو ئیعجازە دەردەخات.

بۆ ئەوانەش كە لە "خواناسی" و "ڕاستی‌یەكانی گـەردوون"دا ڕۆچـوون، بـە بۆنـەی باسكردنی ڕاستی‌یە بەرز و پیرۆزەكانی ســەبارەت بـە خـواوەنـدەوە: ئیعجـازێكی ڕوون و ئاشكرایان پیشان دەدات، یان وایان لـێ دەكات كە هەست بەم ئیعجازە بكەن.

سەبارەت بەوانەش کە ڕێگای "ویلایەت و تەصەووف" دەگرنەبەر، قورئانی پیرۆز بە بۆنەی گەنجینەکانی ئەو نهێنییانەی کە لە دەریای بێ بنکی پڕ شەپۆلی ئایەتەکانیدا هەن، ئیعجازی خۆی بۆ ئەوانیش دەردەخات.

بەم جۆرە، بۆ هەر چینێك لە چل چینەکانی خەڵکی، پەنجەرەیەك دەکرێتەوە کە بەسەر ئیعجازی ڕوون و ئاشکرای قورئاندا بڕوانێت..

تەنانەت قورئانی پیرۆز ئیعجازی خۆی بۆ ئەو بەشە زۆرەی خەڵکیش دەردەخات کە تەنها لە توانای بیستن بەولاوە هیچ توانایەکی تر شك نابەن و ناتوانن لە تێگەیشتندا ڕۆبچن. ئەوەتا دەبینین کە ئەوانە باوەڕ بە ئیعجازی قورئان دەهێنن و هەر تەنها بە بیستنی قورئان هەست بەم ئیعجازە دەکەن. چونکە ئەم مرۆڤە نەخوێندەوارە، خۆی بە خۆی دەڵێت:

(ئاشکرایە کە شێوازی ئەم قورئانە لە شێوازی کتێبەکانی تر جیایە.. جا یان ئەوەیە شێوازی ئەم لە هی ئەوان نزمترە، کە ئەمەش گریمانێکی مەحاڵە و تەنانەت ئەو کەسەش کە زۆر دوژمنی قورئانە گریمانی وای لە زار دەرنەچووە.. یان شێوازێکە لە هی هەموویان بەرزترە. کەواتە ئەم قورئانە خاوەن ئیعجازە).

ئەو مرۆڤە نەخوێندەوارەی کە لە بیستن و گوێ ڕاگرتن بەولاوە هیچی تری لە توانادا نییە، بەم جۆرەی باسمان کرد لە ئیعجازی قورئان تێدەگات.

جا بۆ ئەوەی لە تێگەیاندنیدا یارمەتیی بدەین، بەم جۆرەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

کاتێ بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆز هاتە ناو گۆڕەپانی زۆرانەوە، دوو جۆر ئارەزووی بەتینی لە لای خەڵکی ورووژاند:

(یەکەمیان): ئارەزووی چاولێکەری لە لایەن شوێنکەوتووانیەوە، واتە حەزێکی زۆر توندوتیژیان لەوە دەکرد کە چاو لە شێوازە بەرزەکەی قورئان بکەن. ئەوەبوو زۆر بە تاسەوە ئارەزوومەندی ئەوە بوون کە شێوازەکانیان لە هی قورئان بچێت.

(دووهەمیان): ئارەزووی ڕەخنەگرتن و نەیاری، کە لە لایەنی دوژمنانیەوە سەری هەڵدا. واتە ئارەزووی نووسینی شێوازێك کە لە هی قورئان بچێت، تاکو دەعوای "ئیعجازی قورئان" هەڵبوەشێننەوە و بەتاڵی بکەنەوە.

جا ئەم دوو ئارەزووە بەتینە بوون بەهۆی سەرهەڵدانی ملیۆنان کتێبی عەرەبی کە ئێستا لەبەر دەستماندان. خۆ ئەگەر ئێمە بەراوردی ڕەوانترین کتێب لە نێوان هەموو ئەمانەدا لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بکەین، واتە ئەگەر بە یەکەوە بیانخوێنینەوە، ئەوا هەموو گوێبیست و خوێنەرێك - بە بێ سێ و دوو - یەکسەر دەڵێت: قورئان لە هیچ کام لەو شێوازانە ناچێت. کەواتە قورئان لە ئاستی ئەو کتێبانەدا نییە. جا یان ئەوەیە شێوازی قورئان لە هی هەموویان نزمترە، کە ئەمەش بە بێ هیچ گومانێك گریمانێکی مەحاڵە و هیچ کەسێك شتی وای نەوتووە و تەنانەت شەیتانیش ناتوانێت قسەی وای لە زار دەربچێت[1]. کەواتە بۆمان چەسپا کە شێوازی قورئانی پیرۆز - بەهۆی ئیعجازە جوانەکەیەوە - لە سەرووی هەموویانەوەیە.

تەنانەت مرۆڤی نەزانی عەوامیش، کە هیچ شتێك لە واتاکانی قورئان نازانێت و لێی تێناگات، بەهۆی ئەوەی کە لە "بیستن"ی قورئان بێزار نابێت، هەست بە ئیعجازەکەی دەکات! چونکە ئەم مرۆڤە عەوام و نەزانە، خۆی بە خۆی دەڵێت: بەردەوامبوون لەسەر خوێندنی قورئان هەرگیز مرۆڤ بێزار ناکات، بەڵکو تا زیاتر بخوێندرێتەوە پتر لە بەرچاودا شیرین دەبێت. بەڵام گەر گوێ لە چەند قەسیدەیەکی جوان ڕابگرم، هەست بە بێزاری دەکەم. کەواتە بە بێ هیچ گومانێك قورئان وتەی هیچ مرۆڤێك نییە.

پاشان قورئانی پیرۆز ئیعجازی خۆی بۆ ئەو "منداڵانە"ش دەردەخات کە دەیانەوێت قورئان لەبەر بکەن. ئەوەتا هەرچەندەش چەند جێگایەك لە قورئاندا هەن کە لە یەك دەچن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانن لە عەقڵە ناسك و بچووکەکانیاندا ئەم قورئانە هەڵبگرن و بەوپەڕی ئاسانی لەبەری دەکەن، بەڵام یەك لاپەڕەی غەیری قورئانیان بۆ لەبەر ناکرێت.

تەنانەت "بیماران" و ئەوانەش کە لە "سەرەمەرگ"دان و بە ئاسانترین قسە ئازاریان پێ دەگات، قورئان لە گوێیاندا وەکو ئاوی سەلسەبیل وایە و گوێ بۆ ئایەتەکانی ڕادەگرن. بەمەش هەست بە ئیعجازی قورئان دەکەن.

لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

"قورئانی پیرۆز" هیچ کەسێك لە چەشتنی ئیعجازی خۆی بێبەش ناکات. چونکە هەر چینێك لە چل چینە جیاجیاکانی خەڵکی بەشی خۆی لەم ئیعجازەدا هەیە، یان قورئان وایان لێ دەکات کە هەست بە ئیعجازەکەی بکەن.

---

(١) بەشی یەکەم و گرنگی مەکتووبی بیست و شەشەم، ئەم بڕگەیە ڕوون دەکاتەوە. (دانەر)

تەنانەت قورئانی پیرۆز جۆرە ئیعجازێکی پیشانی ئەو کەسانەش داوە کە هیچ بەشێکیان لە زانیاریدا نییەو لە "بینین" بەولاوە هیچی تر شك نابەن[(١)] و توانای بیستن و تێگەیشتن و ئیدراکی دڵیان نییە. ئەویش بەم جۆرە:

ئەو قورئانە چاپکراوەی کە بە دەستخەتی (حافظ عثمان) نووسراوەتەوە، هەندێ لە وشەکانی بەرامبەری یەکترن و بۆ یەکتری دەڕوانن.

بۆ نموونە وشەی: ﴿وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ﴾ کە لە سوورەتی (الكهف)دایە، لەگەڵ وشەی ﴿قِطْمِيرٍ﴾ی سوورەتی (فاطر)دا، دەڕواننە یەکتر. خۆ ئەگەر لە وشەی یەکەمەوە لاپەرەکان کونبکرێن تا دەگاتە سەر ئەو لاپەڕەیەی کە وشەی دووهەمی تێدایە، ئەوا لەگەڵ کەمێ لاریدا، وشەی دووهەم دەردەکەوێت و ناوی سەگەکەی "أصحاب الكهف" دەزانرێت!

هەروەها وشەی: ﴿مُحْضَرُونَ﴾ کە دوو جار لە سوورەتی (یاسین)دا دووپات کراوەتەوە، یەکێکیان لە سەرووی ئەوی تریانەوەیە و، هەردووکیشیان بەرامبەری وشەی: ﴿مُحْضَرُونَ﴾ و ﴿مُحْضَرِينَ﴾ی کۆتایی سوورەتی (سبأ)ن! خۆ ئەگەر هەر یەکەیان - لەگەڵ کەمێ لاریدا - کون بکرێن تا دەگەنە سەر وشەکانی سوورەتی (سبأ)، ئەوا وشەکانی ئەوێ دەردەکەون!

هەروەها وشەی: ﴿مَثْنَى﴾ی سوورەتی (سبأ) دەڕوانێتە هەمان وشە کە لە سەرەتای سوورەتی (فاطر)دایە و، دوو جار دووپات بوونەتەوە. چونکە لە قورئاندا سێ دانە وشەی: ﴿مَثْنَى﴾ هەیە. خۆ تەوافوقی دوان لەو سیانە ئەوە دەردەخات کە جێی ئەوە نەبێتەوە بوترێت: کاری ڕێکەوتە!

---

(١) ڕوونکردنەوەی لایەنی ئیعجازی قورئان بۆ ئەم چینەی کە لە بیستن و زانیاری و تێگەشتن بێ بەشن و، لە بینین بەولاوە هیچی تر شك نابەن، هەر بە ناتەواوی و کورتی مابووەوە. بەڵام مەکتووبی بیست و نۆهەم و سیهەم(*) زۆر بە جوانی و تەواوی ئەم جۆرە ئیعجازەیان ڕوون کردەوە، بە چەشنێك کە تەنانەت مرۆڤی کوێریش دەتوانێت - بە دەست لێدان - هەستی پێ بکات. بۆ مەبەستی دەرخستن و پیشاندانی ئەم ڕووە جوانەی ئیعجازی قورئان موصحەفێکمان نووسیوەتەوە، لە خوای گەورە داواکارین کە چاپکردنیمان بۆ ئاسان بکات. (دانەر)

(خوا ئاسانی کرد و چەندین چاپ کرا). (وەرگێڕ)

(*) نیازمان وابوو کە زۆر بە جوانی و ڕێکوپێکی مەکتووبی سیهەم بنووسین. بەڵام جێگاکەی خۆی بۆ: "إشارات الإعجاز" بەجێ هێشت و، بەم پێیە لە مەیدانا دەرنەکەوت. (دانەر)

نموونەی ئەم جۆرە بەرامبەری و بۆ یەکتر ڕوانینە لە موصحەفدا گەلێ زۆرە. بە ڕادەیەك کە وشەی وا هەیە نزیکەی شەش جار دووپات دەبێتەوە. جا ئەگەر کونیان تێبکەین ئەوا - لەگەڵ کەمێ لاریدا - بە یەکەوە دەبەسترێن و یەکتر دەردەخەن.

لە موصحەفێکدا بینیم ئەو وشانەی کە لە لاپەڕە بەرامبەرەکاندا دەیانڕوانییە یەکتر، بە خەتی سوور نووسرابوونەوە. کە ئەمەم دی، وتم: "خەتی ئەمانە هێمان بۆ جۆرێك لە جۆرەکانی ئیعجازی قورئان". پاش ئەمە سەیری ڕستەکانی قورئانم کرد، بۆم دەرکەوت گەلێ ڕستە لە لاپەڕەکاندا هەن بە جۆرێك دەڕواننە یەکتری کە واتایەکی وردیان تێدا بێت.

جا لەبەر ئەوەی "تەرتیب"ی سوورەت و ئایەتەکانی قورئان تەرتیبێکی فەرمانپێدراوە و بە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ کراوە، پاشان خۆشنووسە بەهرەمەندەکانیش بە جوانی نووسیویانەتەوە، ئەوا لە نەخشە بێوێنە و خەتە جوانەکەیدا ئاماژەیەك بۆ جۆرە ئیعجازێکی تایبەتی هەیە. چونکە هەرگیز ناکرێت ئەم دانان و تەرتیبە - بەم جۆرە - کاری "ڕێکەوت" یان بەرهەمی "بیر"ی هیچ مرۆڤێك بێت. خۆ ئەگەر ناتەواوی لە چاپخانەکانی مرۆڤدا نەبوایە ئەوا ئەو وشانەی کە دەڕواننە یەکتر بە تەواوی لە چاپدا بەرامبەر یەك دەردەچوون.

پاشان لە سوورەتە "مەدەنی"یە درێژ و مامناوەندییەکاندا دووپات بوونەوەیەکی جوان و ڕێکوپێك لە وشەی: "الله"دا دەبینین. چونکە زۆربەی جار ئەم وشەیە بە ژمارەیەکی دیاری کراو بەکاردەهێنرێت. ئیتر یان پێنج، یان شەش، یان حەوت، یان هەشت، یان نۆ، یان یازدە جار دووپات دەبێتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە موناسەبەتێکی ژمارەیی ورد و جوان لەم دیو و لەو دیوی پەڕەکان و لەسەر هەردوو لاپەڕە بەرامبەر یەکەکانی قورئاندا دەردەخات[1].

(١) (پەراوێزێك لە چوار خاڵدا):

"١" ئنجا وشە جوان و سەروادارەکانی قورئان و شێوازە ڕەوان و بێوێنەکەی و تایبەتکارییەکانی ڕەوانبێژی کە سەرنج ڕادەکێشن، ئەمانە هەرچەندە زۆرن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا جیدییەتێکی یەکجار بەرز و دڵبێداری و ئارامی و خاترجەمی بە "ئەهلی زیکر و موناجات و پاڕانەوە" دەبەخشن. لە کاتێکدا ئەم چەشنە تایبەتکارییە ڕەوانبێژی و وشەئارایی و خۆبەستنەوەیە بە سەروا و "هۆنین"ەوە، لە هەر شتێکی غەیری قورئاندا بێت، یا جوانکارییەکی وشەیی‌شیان تێدا بێت، کەلێن لە ئیخلاس و لێبڕانی دوعاکەردا پەیدا دەکەن و، ئارامی و لەسەرخۆیی دڵی تێك دەدەن و، بیری مرۆڤ پەرتەوازە دەکەن.

تەنانەت ناسكترین و بە ئیخلاسترین و جیددیترین و ڕێكترین "موناجات" پارانەوەكەی ئیمامی شافیعییە – خوا لیی ڕازی بێت – كە بوو بەهۆی لابردنی گرانی و بێبارانی لەسەر میسر. گەلێ جار ئەم موناجاتەم بۆ خۆم دەخوێندەوە. سەرنجم دا، بەهۆی ئەوەی كە هۆنراوە و سەروادارە، پارێزگاریی ئەو ئیخلاسە تەواوەتی و جیددییەتە بەرزە ناكات كە پێویستە لە موناجاتدا بێت. خۆ هەرچەندە نزیكی نۆ ساڵ ئەم موناجاتە یەكێك بوو لە ویردەكانم، كەچی نەمتوانی تەوفیق لە نێوان جیددییەت و ئیخلاسی موناجات و، هۆنین و سەرواكەی ئەم موناجاتەدا بخەم! ئیتر دڵنیا بووم لەوەی كە سەروا فیتری و تایبەتییەكەی قورئان و وردەكاریی هۆنینی ئەو، جۆرێكن لە جۆرەكانی ئیعجازی قورئان. چونكە پارێزگاریی ئیخلاسی تەواوەتی و جیددی و بێداری و لەسەرخۆیی دڵ دەكات، بێ ئەوەی كە زیان بە هیچیان بگەیەنێت.

جا ئەگەر ئەهلی موناجات و زیكر بە (عەقڵ) هەست بەم جۆرە ئیعجازە نەكەن، ئەوا بێگومان بە (دڵ) هەستی پێ دەكەن!

"٢" یەكێك لە نهێنییەكانی ئیعجازە مەعنەوییەكانی قورئان ئەمەیە:

یەكەم: قورئانی پیرۆز پلەی بەرز و ڕووناكی ئیمانی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە بە لێدەركەوتن(تجلی)ی "ئیسمی ئەعزەم" بەهرەمەند بووە.

دووهەم: قورئان وەك نەخشەیەكی پیرۆز وایە و، ڕاستییە مەزنەكانی سەبارەت بە جیهانی دوایی و جیهانی پەروەردگاریی لەسەر دەستنیشان كراوە و، بە جۆرێكی سروشتیش پلەی هەرەبەرزی ئایینی حەق دەردەخات و دەری دەبڕێت.

سێهەم: پاشان قورئانی پیرۆز وتەی خواوەندی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە. ئەو خواوەندەی كە لەوپەڕی بەرزیی عیززەت و گەورەیی و پەروەردگاریی ڕەهادایە. كەواتە هەر دەربڕین و ڕوونكردنەوەیەك كە لە لایەنی ئەم قورئانەوە بێت، دەبێ عەقڵی هەرچی مرۆڤ هەیە بە گشتی نەتوانن هیچ شتێكی هاوچەشنی ئەو قورئانە بڵێن، با هەر هەمووشیان لە عەقڵی یەكێكیاندا كۆ بینەوە، وەك قورئانی پیرۆز خۆی دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ﴾ (الإسراء:٨٨). چونكە بەپێی ئەم "سێ" بناغەیە، هیچ كەسێك ناتوانێت نە لاسایی قورئان بكاتەوە، نە هیچ شتێكی هاووێنەی قورئان بهێنێت.

"٣" لە زۆربەی ئەو موصحەفانەی كە پێیان دەوترێت: "بەركەنار" لەگەڵ كۆتایی لاپەڕەكاندا ئایەتەكانیش تەواو دەبن و، بەم جۆرە لاپەڕەكە بە سەروایەكی جوان كۆتایی پێ دێت. نهێنیی ئەمەش لەوەدایە كە درێژترینی ئایەتی قورئان، كە ئایەتی "مودایەنە"یە، كراوە بە یەكەی پێوانە بۆ لاپەڕەكان و، سوورەتی "الإخلاص" و "الكوثر"یش كراون بە یەكەی پێوانە بۆ دێڕەكان. بەمەش ئەم تایبەتكارییە جوان و نیشانەی ئیعجازە، لە قورئانی پیرۆزدا دەركەوتووە.

"٤" لەم مەقامەدا و لەم باسەی ئێرەیدا بە چەند نموونەیەكی جوزئی و كەموكورت واز دەهێنم و تەنها چەند پوختە نیشانەیەكی باس دەكەم. چونكە ناچار بووم لە نووسیندا پەلە بكەم، هەرچەندەش ئەم باسە لەوپەڕی گرنگی و فراوانی و گەورەییدایە. ئەم مەقامەش كەرامەتێكی جوانی لەوپەڕی گرنگیدا – لە ڕوانگەی تەوفیقی خواوەندەوە كە پشتی پەیامەكانی نووری گرت – ڕوون دەكاتەوە. بەڵێ، ئەو كەرامەتە ورد و جوان و ڕاستییە گەورەیە، زنجیرە كەرامەتێكی "پەیامەكانی نوور" لە مەسەلەی تەوافوق و لە پێنج شەش جۆریدا دەردەخات. هەروەك جۆرێك لە ئیعجازەكانی قورئانیش دەخاتە ڕوو كە دەبێت بە سەرچاوەی ئاماژە و هێما غەیبییەكان.

## سەرنجی دووهەم

لە سەردەمی حەزرەتی مووسادا - درووودی لەسەر بێت - "سیحر" باو بوو. لەبەر ئەوە، موعجیزە گەورەکانی حەزرەتی مووسا بە جۆرێك بوون کە لە سیحر دەچوون.. لە سەردەمی حەزرەتی عیساشدا - درووودی لەسەر بێت - بایەخ بە "پزیشکی" دەدرا و باو بوو، لەبەر ئەوە، زۆربەی موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا - درووودی لەسەر بێت - لەم بابەتە بوون. لە سەردەمی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەریشماندا ﷺ ئەم چوار شتە لەناو دوورگەی عەرەبدا باویان هەبوو:

یەکەم: ڕەوانبێژی و زمانپاراوی.

دووهەم: شیعر و وتارخوێندنەوە.

سێهەم: کەهانەت و هەواڵدان لە غەیب.

چوارەم: لافی زانینی ڕووداوەکانی ڕابوردوو و داهاتوو.

کاتێ کە "قورئانی پیرۆز" هات، تەحەددای خاوەنی ئەم چوار جۆرە زانینانەی کرد! ئەوەبوو - لە پێشدا - ڕەوانبێژ و مرۆڤە زمانپاراوەکان، لە بەردەم ڕەوانبێژییە پڕ لە ئیعجازەکەی قورئاندا چۆکیان دادا و، بە سەرسوورمانەوە گوێیان لێ ڕاگرت.

شاعیر و وتارخوێنەکانیش مات و سەرسام مابوون. تەنانەت قورئان لە شان و شەوکەتی ئەو شتانەشی داگرت کە ئەوان شانازییان پێوە دەکرد، وەك "المعلقات السبعة" کە باشترین نموونەی شیعریان بووە و، بە ئاوی زێڕ نووسیبوویاننەوە و بە دیواری کەعبەدا هەڵیانواسیبوون.

---

ئەمەش لە دواییدا بە ڕاستی ڕووی دا. چونکە موصحەفێکی پیرۆز نووسرایەوە و لەو موصحەفەدا "تەوافوق" لە لەفزی جەلالە(الله)دا لە هەموو لاپەڕەیەکدا دەرکەوت. هەشت نامیلکەی بچووکیش بە ناوی: "هەشت هێماکان" دەرچوون، کە ئەو موناسەبەتە ورد و هێما غەیبییانە ڕوون دەکەنەوە کە لە تەوافوقی نێوان پیتەکانی قورئاندا هەن. پێنج نامیلکەش بۆ تەسدیقی پەیامەکانی نوور و نرخاندنیان دانران لە ڕووی نهێنیی ئەو تەوافوقانەی کە تیایاندایە و، بریتییە لە (کەرامەتی غەوثی). هەروەها سێ نامیلکەی تر لە (کەرامەتی عەلەوی) و پێنج نامیلکەش لە بارەی (ئاماژەکانی قورئان)ەوە نووسران.

کەواتە لە دانانی "پەیامی موعجیزاتی ئەحمەدی"دا هەستم بەم ڕاستییە گەورەیە کرد، بەڵام بە داخەوە دانەر تەنها لایەنێکی لاوازی لێ بینی و، تەنها یەك دڵۆپی لەو دەریایە دەرخست و، ئیتر وازی هێنا و نەگەڕایەوە سەری. (دانەر)

ئنجا قورئان "کاهین و سیحربازەکان"یشی شڵەژاند و، هەموو ئەو قسانەی لە بیر بردنەوە کە لە بارەی هەواڵدان لە غەیبەوە دەیانکردن. چونکە ئەو جینییانەی کە دەهاتن بۆ لای کاهین و سیحربازەکان، قورئان دەری کردن و، بە تەواوی پەردەی بەسەر پیشەی "کەهانەت"دا دادایەوە و بۆ هەتاهەتایی دەرگای لەسەر داخست.

ئنجا هەواڵی نەتەوە پێشینەکان و، ڕووداوەکانی داهاتووشی لە خورافات و درۆ و دەلەسە ڕزگار کرد و، ڕێنمایی خوێنەرانی "مێژوو" و گشت ئەو کەسانەشی کرد کە بە دوای ڕووداوەکانی ڕابوردوو و داهاتوودا عەودالن کە چۆن بە دوای حەقیقەتە ڕاستەقینەکەیدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە.

بەم جۆرە، هەر چوار چینەکە لە بەردەم گەورەیی قورئانی پیرۆزدا، بەوپەڕی سەرسامی و ڕێزلێنانەوە، بەچۆکدا هاتن و، بەرەبەرە بوون بە قوتابیی قورئان و هیدایەت و ڕێنمایییان لێ وەرگرت. ئیتر هیچ کام لەوانە نەیتوانی بە هێنانی شتێك کە وەکو سوورەتێکی قورئان وابێت، بەرەنگاریی قورئان بکات و لە بەرامبەریەوە ڕابووەستێت.

**ئەگەر بوترێت:**

چۆن دەزانین کە لە گۆڕەپانی بەرەنگاری کردنی قورئاندا کەس پەیدا نەبووە و، کەس نەیتوانیوە شتێکی وەکو قورئان بهێنێت و.. چۆن دەزانین هێنانی هاووێنەی قورئان خۆی لە خۆیدا کارێکی مەحاڵە و لە توانای مرۆڤدا نییە؟

**وەڵام:**

ئەگەر بەرەنگاری کردنی قورئان شتێکی مومکین بوایە، ئەوا بە بێ هیچ گومانێك هەوڵیان بۆ دەدا و کەسیان سستییان تێدا نەدەکرد، چونکە پێویستییەکی زۆریان بەم بەرەنگارییە هەبوو، تاکو لە مەترسیی تەحەددای قورئان دەرباز بن و، خۆیان و ئایین و ماڵ و منداڵیان ڕزگار بکەن. جا ئەگەر ئەمەیان لە تواناد بوایە، ئەوا کەسیان سڵیان لێ نەدەکردەوە. ئنجا کافر و مونافیقانیش - کە لەو دەمەدا زۆرینە بوون - هەواڵی ئەم بەرەنگاری کردنەیان لەناو خەڵکیدا بڵاو دەکردەوە، تەنانەت بە هەموو جێگایەکیشیان ڕادەگەیاند، وەك هەموو دوژمنایەتییەکی تریان بەرامبەر بە ئیسلام بڵاو کردەوە. ئنجا گەر ئەم بەرەنگاری کردنە مومکین بوایە و ڕووی بدایە و ئەمانیش بڵاویان بکردایەتەوە، ئەوا مێژوونووسان لە کتێبە زۆرەکانیاندا تۆماریان دەکرد. کەچی ئەوەتا هەموو کتێبەکانی مێژوومان لە بەردەستدان، هیچ شتێکیان سەبارەت بەمە تێدا نابینین، جگە لە

چەند بڕگەیەکی دەمهەڵبەستی "موسەیلەمەی درۆزن". لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز بە درێژایی بیست و سێ ساڵ تەحەددای دەکردن و، بە ئایەتە پڕ لە موعجیزەکانی خۆی و، بەم جۆرەی خوارەوە گوێی کاس کردبوون:

ئەوەتا قورئانی پیرۆزتان لە بەردەستدایە، دەسا ئێوە لە لای نەخوێندەوارێکی وەك محەممەدی ئەمینەوە ﷺ قورئانێکی ئاوا بهێنن!

خۆ ئەگەر لەمەدا کۆڵەوارن، دەبا لە لایەن زانایەکی گەورەوە بێت، نەك نەخوێندەوارێك!

خۆ ئەگەر لەمەشدا کۆڵەوارن، ئەوا نەك یەکێکتان بەڵکو هەمووتان بە "کۆمەڵ" شتێکی وەکو قورئان بهێنن و، با هەموو زانا و مرۆڤە ڕەوانبێژەکانتان بۆ ئەم مەبەستە کۆببنەوە و یارمەتیی یەکتر بدەن، تەنانەت ئەوانەش بانگ بکەن کە جگە لە خوا یاریدەدەرتانن و، با بە هەرهەموویان بتوانن شتێکی بە وێنەی قورئان بهێنن.

ئەگەر هەمووتان لەمەشدا دەستەوسان دەمێنن و کۆڵەوارن، ئەوا هەموو کتێبە بەلیغەکانی پێشوو بهێنن و لە بەرەنگاری کردنی قورئاندا پشتیان پێ ببەستن. جگە لەمە، بەرەکانی داهاتووش بانگ بکەن، تاکو یارمەتیتان بدەن!

ئەگەر لەمەشدا دەستەوسانن، دەبا ئەوەی دەیهێنن بە ئەندازەی هەموو قورئان نەبێت، بەڵکو بە ئەندازەی "دە" سوورەتی وەك سوورەتەکانی قورئان بێت.

خۆ ئەگەر ئەمەش ناتوانن، دەبا ئەوەی دەیهێنن لە ڕەوانبێژیدا وەکو قورئان ڕەوان و بەلیغ بێت، هەرچەند لە ناوەڕۆکیشدا "چیرۆکی دەمهەڵبەست و درۆ و دەلەسە" بێت!

ئەگەر ئەمەشتان لە تواناد نییە، ئەوا تەنها "یەك سوورەت" بهێنن، با کورتیش بێت.

ئەگەر لەمەیشدا دەستەوسان ڕاوەستان، ئەوا بزانن کە: هەروەك خۆتان و ئایینتان بۆ قیامەت کەوتوونەتە مەترسییەوە، هەر بەو جۆرە بۆ دنیاش لە مەترسیدان!

بەم چەشنە، قورئانی پیرۆز بە هەشت جار تەحەددای جینني و ئادەمیزادی کردووە. ئەم تەحەددییەشی تەنها لە چوارچێوەی بیست و سێ ساڵدا نەبەستووەتەوە، بەڵکو وا هەزار و سێسەد ساڵە بەردەوامە و، ئێستاش تەحەددای هەموو جیهان دەکات و، تا دنیاش دنیایە ئەم تەحەددایە هەر دەمێنێت و بەردەوامە.

لەبەر ئەمە، ئەگەر بەرەنگاری کردنی قورئان لە توانادا بوایە، ئەوا ئەو کافرانە ڕێگای جەنگ و کاولکارییان هەڵنەدەبژارد و، خۆیان و ماڵ و منالیان نەدەخستە تەنگانە و

دەردی سەری‌یەوە و، وازیان لە بەرەنگاری کردنی نەدەهێنا، کە ڕێگایەکی کورت و ئاسان بوو.

کەواتە بەرەنگاری کردنی قورئان و لاسایی کردنەوەی، هەرگیز لە توانای کەسدا نی‌یە. چونکە چۆن مرۆڤی ژیر، بە تایبەت خەڵکی دوورگەی عەرەب، لەناو ئەوانیشدا بە تایبەت قورەیش، خۆی و ماڵ و منالّی دەخاتە مەترسی‌یەوە و ڕێی جەنگ و کاولکاری هەڵدەبژێرێت، گەر بەرەنگاری کردنی قورئانی (بە سوورەتێکی بچووك) لە توانادا بێت و، بتوانێت لەم ڕێ‌یەوە خۆی و ماڵ و منالّی لە تەحەددای قورئان ڕزگار بکات، گەر ئەم بەرەنگاری کردنە کارێکی ئاسان بوایە؟

پوختەی قسە، ئەوەیە کە (جاحظ) وتوویەتی:

"لّما لم يمكن المعارضة بالحروف، اضطروا إلى المقارعة بالسيوف"[1]!

**ئەگەر بوترێت:**

هەندێ لە زانا لێکۆڵەرەکان وتوویانە: "بەرەنگاری کردنی هیچ ئایەت و وشە و ڕستەیەکی قورئان - چ جای سوورەتێك لە سوورەتەکانی - هەرگیز مومکین نی‌یە و، تا ئێستاش کەس نەهاتووەتە ئەم مەیدانەوە، واتە تا ئێستا لاسایی نەکراوەتەوە".. بەلاّم ئەم وتەیە زیادەڕەوی‌یەکی ئەوتۆی تێدایە کە ژیریی مرۆڤ قبوولی ناکات. چونکە زۆر ڕستە لەناو گوفتاری مرۆڤدا هەن کە لە ڕستە و دەستەواژەکانی قورئان دەچن. جا ئایا واتا و حیکمەتی ئەم وتەیەی زانا لێکۆڵەرەکان چی‌یە؟

**وەلاّم:**

لە بارەی ڕوونکردنەوەی ئیعجازی قورئانەوە دوو ڕێڕەو هەن:

*ڕێڕەوی یەکەم:* ڕێڕەوێکی "ڕاجیح"ە و زۆربەی زانایانی لەسەرە. ئەم ڕێڕەوە دەڵێت: وردەکاریی ڕەوانبێژی و تایبەتکاریی واتاکانی قورئان لە سەرووی توانای مرۆڤەوەن.

*ڕێڕەوی دووهەم:* کە ڕێڕەوێکی "مەرجووح"ە، دەڵێت: لاسایی کردنەوە و بەرەنگاری کردنی یەك سوورەتی قورئان، شتێکە لە توانای مرۆڤدا هەیە، بەلاّم خواوەند ئەم توانایەی لە خەڵکی قەدەغە کردووە، تاکو قورئانی پیرۆز ببێت بە موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) واتە لەبەر ئەوەی بەرەنگاری کردنی قورئانیان بە پیت (واتە بە وتە) لە توانادا نەبوو، ناچار دەستیان دایە شمشێر و جەنگیان هەڵبژارد!

دەتوانین بەم نموونەیەی خوارەوە ئەم ڕێڕەوە ڕوون بکەینەوە:

هەڵسان و دانیشتنی مرۆڤ لە چوارچێوەی توانای خۆیدایە. جا ئەگەر پێغەمبەرێك، بۆ دەرخستنی موعجیزەی خۆی، بە کەسێکی وت: "یاخوا نەتوانیت هەڵبسیتە سەرپێ" و، ئەویش لە ڕاستیدا پەکی کەوت و نەیتوانی هەڵبسێت، ئەوا موعجیزەکەی ئەو پێغەمبەرە هاتووەتە دی.

بەم ڕێڕەوە "مەرجووح"ە دەڵێن: (مذهب الصَّرفة) واتە: خواوەند جینی و ئادەمیزادی لە بەرەنگاری کردنی قورئان "صەرف" کردووە، واتە دووری خستوونەتەوە و نەیانتوانیوە بەرەنگاریی قورئان بکەن. دەنا گەر خواوەند لە هێنان و وتنی هاوچەشنی قورئان دووری نەخستنایەتەوە، ئەوا دەیانتوانی لە وێنەی قورئان شتێك بڵێن.

جا ئەو زانایانەی کە بەپێی ئەم ڕێڕەوە دەڵێن: "ناتوانرێت بە تەنها یەك وشەیش بەرەنگاریی قورئان بکرێت". وتەکەیان حەقە و گومانی تێدا نییە. چونکە خوای گەورە لەبەر دەرخستنی ئیعجازی قورئان ئەوانی لەو بەرەنگاری کردنە قەدەغە کردووە و، بە هیچ جۆرێك ناتوانن دەم بکەنەوە و بەرەنگاریی بکەن. خۆ ئەگەر بیانەوێت بۆ ئەم مەبەستە شتێك بڵێن، ئەوا بە بێ ویستی خوا هەرگیز ناتوانن.

سەبارەت بە ڕێڕەوی یەکەم، کە ڕێڕەوە ڕاجیحەکەیە و ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرە، ئەوا ئەو زانایانە ڕوویەکی وردیان تێدا مەبەستە، کە بریتییە لەوەی: وشە و ڕستەکانی قورئان ڕووەو یەکتر ڕاوەستاون و دەڕواننە یەکتری. جاری وا دەبێت تەنها (یەك) وشە دەڕوانێتە (دە) جێگا و بەم پێیە (دە) سەرنجی وردی ڕەوانبێژی و (دە) پەیوەندیت لەگەڵ وشەکانی تر، هەر لەم وشەیەدا، دەست دەکەوێت. ئەم پەیوەندییانەشمان لە تەفسیرەکەماندا: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز" ڕوون کردووەتەوە، چ لە تەفسیری سوورەتی (فاتحة)دا، چ لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا:

﴿الم۞ ذلك الكتابُ لاريبَ فيه﴾ (البقرة:١-٢).

با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر وا دابنێین دیوارەکانی کۆشکێکی گەورە بە چەند نەخش و نیگارێکی جوان و دڵڕفێن ڕازابنەوە، ئەوا دانانی ئەو بەردەی کە بناغەی ئەو هەموو نەخش و نیگارانەیە، لە شوێنە شیاوەکەی خۆیدا، کە پەیوەندیی بەو نەخشانەوە ببێت و بە سەریاندا بڕوانێت.. دانانی ئەم بەردە لەم جێگایەدا، پێویستی بە شارەزاییەکی تەواو

دەبێت لە بارەی سەرجەمی ئەو نەخش و نیگارانەی کە لەو کۆشکەدان.

نموونەیەکی تر کە لە جەستەی مرۆڤ وەری دەگرین:

دانانی بیلبیلەی چاوی مرۆڤ لە جێگای شیاوی خۆیدا، پشت بە زانینی پەیوەندیی (چاو) بە (جەستە)وە بە شێوەیەکی گشتی و، پەیوەندیشی بە هەموو بەشێك لە بەشەکانی ئەو جەستەیە و کارمەندییەکانیەوە، دەبەستێت.

بۆ خۆت نموونەکانی تر بە پێوەری ئەم دوو نموونەیە لێك بدەرەوە، تاکو بزانیت کە چۆن زانا پێشینەکانی ئەهلی حەقیقەت لایەن و ڕووە زۆرەکان و پەیوەندییەکانی نێوان ڕستە و ئایەتەکانی قورئانیان ڕوون کردووەتەوە، بە تایبەت زانایانی: "پیتزانیی قورئان – علم حروف القرآن" کە لەم باسەدا زۆر ڕۆچوون و، بە چەندین بەڵگە چەسپاندوویانە کە هەر پیتێك لە پیتەکانی قورئان هێندە نهێنیی وردی تێدایە، کە ڕوونکردنەوەی هەر یەکەیان پێویستی بە لاپەڕەیەکی تەواو هەیە.

بەڵێ، مادەم قورئانی پیرۆز گوفتاری پەروەردگاری هەموو جیهانەکان و بەدیهێنەری سەرجەمی شتانە، ئەوا دەبێ هەموو وشەیەکی وەك "تۆو" وا بێت، واتە دەگونجێ هەریەك لەو وشانە تۆوێك بێت و درەختێکی مەعنەویی لە نهێنی و واتای ورد لێ سەوز ببێت. یان وەك دڵێك وابێت کە واتا و نهێنییەکان بووبن بە جەستەی و دەوریان دابێت.

لەبەر ئەوە دەڵێین: بەڵێ، لە وتەی مرۆڤدا شتی وا هەیە کە لە وشە و ڕستە و ئایەتەکانی قورئان بچێت. بەڵام ئەو ئایەت و وشە و ڕستەیەی قورئان لە شوێنە شیاوەکەی خۆیدا دانراوە، بە ڕادەیەك کە هێندە پەیوەندیی زۆری تێدا ڕەچاو کراوە، کە پێویستیان بە زانیارییەکی فراوانی گشتی دەبێت تاکو لەو جێگایانەدا دایانبنێت.

## سەرنجی سێهەم

ڕۆژێکیان خوای گەورە بیرکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی سەبارەت بە پوختەی ماهییەتی "قورئانی پیرۆز" پێ بەخشیم. جا ئەو بیرکردنەوەیەم چۆن – بە زمانی عەرەبی – بە دڵدا هات هەر بە هەمان شێوە لە خوارەوە وەکو خۆی دەینووسمەوە، ئنجا واتاکەشی باس دەکەم:

(سُبحانَ من شَهِدَ على وحدانيّتِه وصرَّحَ بأوصافِ جمالِه وجلالِه وكمالِه: القـــرآنُ الحكيمُ: المنوّرُ جهاتُه الستُ، الحاوي لسرِّ إجماعِ كلِّ كُتُبِ الأنبياءِ والأولياءِ والموحدينَ المختَلِفين في الأعصارِ والمشاربِ والمسالكِ، المتفِقين بقلوبِهم وعقولِهم علـــى تصديـــقِ

أساسات القرآنِ وكلّيات أحكامِه على وجه الإجمال، وهو محـضُ الوحـي بإجماعِ الْمُنْزِلِ والْمُنْزَلِ والْمُنَزَّلِ عليه، وعينُ الهدايةِ بالبداهة، ومعـدنُ أنـوارِ الايمـان بالضرورة، ومجمعُ الحقائقِ باليقين، ومُوصِلٌ الى السعادةِ بالعيان، وذو الأثمارِ الكـاملين بالمشاهدة، ومقبولُ المَلَكِ والإنس والجان بالحَدْسِ الصادقِ من تفاريقِ الأمارات، والمؤيّدُ بالدلائلِ العقلية باتفاقِ العقلاءِ الكاملين، والمصدّقُ من جهةِ الفطرةِ السـليمة بشـهادة اطمئنان الوجدان، والمعجزةُ الأبديةُ الباقي وجه إعجازِه على مرِّ الزمـانِ بالمشـاهدة، والمنبسطُ دائرةُ إرشادِه من الملأ الأعلى إلى مكتبِ الصبيان، يستفيدُ مـن عـينِ درسِ الملائكةُ مع الصبيين، وكذا هو ذوالبصرِ المطلقِ يرى الأشياءَ بكمالِ الوضوحِ والظـهورِ ويُحيطُ بـها ويُقلّبُ العالَمَ في يدِه ويُعَرِّفُه لنا كما يُقلّبُ صانعُ الساعةِ الساعةَ في كفِه ويُعَرِّفُ للناس. فهذا القرآنُ العظيمُ الشأن هو الذي يقولُ مكرراً: الله لا إله الاّ هـو. فاعلم أنه لا إله الاّ الله).

واتای ئەم بیر کردنەوەیە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

هەر شەش لاکەی قورئان هێندە ڕووناکن کە هیچ گومانێکیان لێ نزیك نابێتەوە، چونکە قورئان:

عەرشی هەرە گەورەی پەروەردگاری لە (پشتەوە)یە و پاڵی پێوە داوە. کەواتە لەوێوە "ڕووناکیی سرووش"ی بۆ دێت.

(بەردەمی)شی بەختەوەریی هەردوو دنیایە، کە ئامانجی بنەڕەتیی قورئانە. چونکە پەیوەندییەکانی قورئان ئەوەندە زۆر و دوور و درێژ و بلاون کە ژیانی هەمیشەیی و ئەودنیاشیان گرتووتەوە. دیارە ئەوێش ڕووناکیی بەهەشت و بەختەوەریی لێیە.

لە (سەروو)شیەوە نیشانە و مۆری ئیعجازی لێ دەدرەوشێتەوە.

لە (ژێر)یشیەوە چەندین ستوونی توندوتۆڵ و دامەزراوی "بەڵگەی بێ گومان و بەهێز" هەن. کەواتە ئەم لایەی یەکپارچە ڕێنمایی ئاشکرا و بێ گومانە.

لە لای (ڕاست)یشیەوە، دەبینین قورئان ئەوەندە ﴿أفلا تعقلون﴾ی بەکارهێناوە کە عەقڵانی خستووەتە گۆ و تەسدیقی ژیریشی لەم ڕێیەوە بەدەست هێناوە.

لە لای (چەپ)یشیەوە، دەبینین قورئان داوای شایەتی لە "ویجدان" دەکات، بە ڕادەیەك کە ئەم ویجدانە – بەهۆی ئەو سروەیەی بەسەر دڵدا هەڵیدەکات – لە

سەرسوورماندا دەم دەکاتەوە و دەڵێت: "تبارك الله".

ئایا ئیتر لە کوێوە دوودڵی و گومان دەتوانن توخنی ئەم قورئانە بکەون؟

چونکە قورئانی پیرۆز نهێنیی یەکدەنگیی کتێبی هەموو پێغەمبەران و پیاوچاکان و یەکتاپەرستانی لەخۆدا کۆکردووەتەوە، هەرچەندەش هەموو ئەمانە سەردەم و مەشرەب و ڕێبازیان لە یەکتر جیایە. واتە سەرجەمی ژیران و خاوەن دڵانی دامەزراو پوختەی فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز و ئەو شتە بنەڕەتی‌یانەی کە قورئان خەڵکیان بۆلا بانگ دەکات، تەسدیق دەکەن. چونکە ئەوانیش باسی هەمان شت لە کتێبەکانیاندا دەکەن. کەواتە ئەمان وەك ڕەگ و ڕیشەی درەختە ئاسمانی‌یەکەی قورئان وان.

پاشان قورئان پشت بە "سرووش"ی خواوەند دەبەستێت، تەنانەت هەر قورئان خۆی سەرتاپا سرووشە. چونکە خواوەند بە سرووش بۆ سەر دڵی حەزرەتی محەممەد ﷺ نازڵی کردووە و، بە موعجیزاتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەشی ﷺ و بە سرووشی ڕووت و بێ گومان ڕوونی دەکاتەوە. قورئان کە لە لایەن خواوەندەوە نازڵ بووە، بە ئیعجازە ئاشکراکەی دەری دەخات کە لە عەرشی هەرە مەزنی خواوەندەوە هاتووە. ئنجا قۆناغەکانی ژیانی ئەو کەسەی قورئانی بۆ نازڵ بووە (کە پێغەمبەرە ﷺ) هەروەها شڵەژانی لە سەرەتا و کاتی نازڵ بوونی قورئاندا و، ئەو هەموو ڕێزەی کە لە قورئانی دەگرێت کە زۆر لە ڕێزگرتنی بۆ شتی تر زیاترە.. هەموو ئەمانە، دەری دەخەن کە "قورئانی پیرۆز" سەرتاپا سرووشی خوایە و لە لای پادشای ئەزەلەوە دێت و دەبێتە میوانی.

هەروەها بە چەشنێکی بەڵگەنەویست دەردەکەوێت کە قورئان یەکپارچە سرووشی خوایە، چونکە ئەو شتەی پێچەوانەی قورئانە، بریتی‌یە لە کوفر و گومڕایی.

پاشان بە بێ هیچ گومانێك دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز کانگا و سەرچاوەی ڕووناکی‌یەکانی ئیمانە. دیارە جگە لە تاریکی هیچ شتێکی تر دژ و پێچەوانەی ڕووناکی نی‌یە. ئەم حەقیقەتەشمان لە زۆر "وتە"دا چەسپاندووە.

ئنجا بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە دەرکەوتووە کە قورئان کۆگای حەقیقەتەکانە و، هەرچی خەیاڵ و خورافاتیشە تابڵێی لە قورئانەوە دوورە. چونکە ئەو جیهانی ئیسلامەی کە قورئان پێکی‌هێناوە و، ئەو شەریعەتەی ئەو هێناویەتی و، ئەو ڕەوشتە بەرزانەی کە ڕوونی کردوونەتەوە، تەنانەت باسەکانی سەبارەت بە جیهانی پەنهان(الغیب)ەوە کتومت وەکو

باسەكانی سەبارەت بە جیهانی بینراو(الشهادة) عەینی حەقیقەتن و هەرگیز هیچ شتێكی دژ و پێچەوانەی حەقیقەت تو خنیان ناكەوێت.

پاشان "قورئانی پیرۆز" مرۆڤ دەگەیەنێتە بەختەوەریی هەردوو دنیا و، مرۆڤایەتیش بەرەو ئەم بەختەوەرییە دەبات. ئەو كەسەی گومانی لەمەدا هەیە، تەنانەت گەر بۆ یەك جاریش بووە، با سەرێك لە قورئان بدات و گوێی لێ رابگرێت، ئنجا با بزانێت قورئان چی دەفەرموێت؟

پاشان ئەو بەروبومانەی كە مرۆڤ لە قورئانی پیرۆز دەیانچنێت، چەند بەروبوومێكی پێگەیشتوو و زیندوون. ئەمەش سەیر نییە، چونكە ڕەگەكانی درەختی قورئان لەناو حەقیقەتەكاندا ڕۆچوون و لەناو ژیاندا بڵاو بوونەتەوە. خۆ ژیانی بەروبوومیش بەڵگەی ژیانی درەختەكەیە. ئەگەر دەتەوێت ئەمەت بۆ دەربكەوێت، فەرموو بڕوانە قورئانی پیرۆز چەندە بەرهەمی بە مرۆڤایەتی پێشكەش كردووە، كە بریتین لەو بەندە پاك و پیاوچاك و دڵ ڕووناكە كاملانەی كە بە درێژایی هەموو چەرخ و سەردەمەكان قورئانی پیرۆز وەكو بەروبووم بە مرۆڤایەتیی بەخشیون.

پاشان قورئانی پیرۆز جێی ڕەزامەندیی جیننی و ئینس و مەلائیكەتانە، ئەمەش بە چەشنێكی ڕاست و بە "حەدس"[1] هەستی پێ دەكەین، چونكە لە كاتی خوێندنەوەی قورئاندا وەك چۆن پەپوولە بە دەوری ڕووناكیدا كۆ دەبنەوە، هەموو ئەمانەش بە هەمان جۆر لە دەوری ئەو قورئانە كۆ دەبنەوە.

پاشان هەروەك قورئان سرووشی خوایە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگە عەقڵییەكان پشتی دەگرن. شایەتیش لەسەر ئەمە: یەكگرتنی مرۆڤە تێگەیشتووە خاوەن ژیرییە تەواوەكانە، كە لە پێشەنگی ئەوانەوە زانایانی زانستی كەلام و بلیمەتەكانی فەلسەفەن، وەكو "ئیبن سینا" و "ئیبن ڕوشد" كە هەر هەموویان بە جۆرێكی یەكگرتووانە بناغە و بنچینەكانی قورئانیان بە بەڵگەكانی خۆیان چەسپاندووە.

ئنجا قورئانی پیرۆز لە لایەن سروشتی ساغ و بێ عەیبی مرۆڤەوە - بە مەرجێ ناتەواوی و نەخۆشی ڕووی لەو سروشتە نەكردبێت - تەسدیق كراوە. چونكە دڵنیایی "ویجدان" و سرەوتنی دڵی مرۆڤ، لە ڕووناكیی قورئانەوە پەیدا دەبن. واتە سروشتی ساغ بە دڵنیایی "ویجدانی" خۆی تەسدیقی قورئان دەكات. بەڵێ، سروشت(الفطرة) بە زمانی حاڵی خۆی ڕوو دەكاتە قورئان و دەڵێت:

---

(١) (حەدس) واتە: خێرایی زەینی مرۆڤ لە تێگەیشتندا.

"بە بێ تۆ کامڵ بوونی ئێمە نایەتە دی".

ئەم ڕاستی‌یەشمان لە چەند جێگایەکی جیاجیای پەیامەکاندا چەسپاندووە.

پاشان وەکو ئاشکرا و دیارە، قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی بەردەوام و هەمیشەیی‌یە، ئەوەتا لە هەموو کاتدا ئیعجازەکەی خۆی دەردەخات و، وەکو موعجیزەکانی تر ڕووناکی‌یەکەی ناکوژێتەوە و، کاتەکەشی تەواو نابێت، بەڵکو هەتا هەتایە هەر موعجیزەیەکی بەردەوامە.

پاشان پلەوپایەی قورئانی پیرۆز ئەوەندە گشتی و فراوانە کە تەنها یەك دەرس لەو قورئانە "حەزرەتی جیبریل" لەگەڵ منداڵێکدا پێکەوە وەری دەگرن و، چەندین فەیلەسووفی بلیمەتی وەك "ئیبن سینا" لەگەڵ ئاسایی‌ترین نەخوێندەواردا وەکو یەك لە بەردەم قورئاندا چۆك دادەدەن و هەمان دەرسی لێ وەردەگرن. تەنانەت لەوانەیە مرۆڤە نەخوێندەوارەکە، بەهۆی هێز و پاکیی ئیمانەکەی، زۆر لە "ئیبن سینا" زیاتر سوود لە قورئانی پیرۆز وەربگرێت!

پاشان چاوێکی بینەری تیژ لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، کە هەرچی شت لە بوونەوەردا هەیە دەیانبینێت و، هەموو ئەو بوونەوەرانە وەك لاپەڕەکانی کتێب دەخاتە بەردەستی خۆی. ئیتر هەموو چین و جیهانەکانی بوونەوەران ڕوون دەکاتەوە. هەروەك گەر سەعاتچی‌یەك سەعاتێکی بچووك لە کەسێك وەربگرێت، ئەوا سەیری ئەم دیو و ئەو دیوی دەکات و لێی دەدوێت و دەیکاتەوە، گەردوونیش لە بەردەم قورئاندا بە هەمان جۆرە، قورئانی پیرۆز باسی دەکات و لایەنەکانی بۆ گوێبیستان ڕوون و والا دەکاتەوە.

جا ئەم قورئانە گەورەیە، بە ئایەتی: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ﴾ (محمد:١٩) یەکتایی خواوەند دەچەسپێنێت.

* * *

اللهم اجعل القرآن لنا في الدنيا قريناً، وفي القبر مونساً، وفي القيامة شفيعاً، وعلى الصراط نوراً، ومن النار ستراً وحجاباً، وفي الجنة رفيقاً، وإلى الخيرات كلها دليلاً وإماماً. اللهم نوّر قلوبنا وقبورنا بنور الإيمان والقرآن. ونوّر برهان القرآن بحق وبحرمة من أُنزل عليه القرآن، عليه وعلى آله الصلاة والسلام من الرحمن الحنّان. آمين.

## ئاماژەی ڕەوانی نۆزدەهەم

لە ئاماژەکانی پێشوودا، بەوپەڕی دڵنیایی و بە چەندین بەڵگەی بەهێزی گومان لێ نەکراو، بۆمان چەسپا کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

جا ئەم محەممەدە ئەمینەی ﷺ کە بە هەزاران بەڵگەی بێ گومان پێغەمبەرێتی‌یەکەی چەسپاوە، هەر خۆی لە خۆی‌دا بەڵگەیەکی ڕووناکە لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە و "بەختەوەریی هەمیشەیی" (کە ئەو دنیایە).

وا لەم ئاماژەیەدا بە جۆرێکی کورت و لە شێوەی "پوختەی ئەم باسەدا" لەو بەڵگە ڕاست و ڕوونەی یەکتایی خوای گەورە دەدوێین. چونکە مادەم ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەڵگەیەکە لەسەر ناسینی خوا، ئەوا دەبێ ئەو بەڵگەیە و چۆنێتیی بوونی بە بەڵگە بزانرێت.. لەبەر ئەوە، بە کورتی‌یەکی زۆر پوخت ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە چۆن پێغەمبەر ﷺ دەبێت بە بەڵگە لەسەر "یەکتایی" خواوەند، هەروەك باسی ڕادەی ڕاستیی پێغەمبەریش ﷺ دەکەین و، دەڵێین:

هەروەك هەموو یەکێك لە بوونەوەرانی ناو گەردوون دەبن بە بەڵگە لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی گەورەی بەدیهێنەر، بە هەمان جۆر پێغەمبەریش ﷺ دەبێت بەو بەڵگەیە. ئنجا هەر خودی پێغەمبەر ﷺ چۆنێتیی بوونی خۆی و گشت بوونەوەرانی بەم بەڵگەیە ڕاگەیاندووە.. جا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر "یەکتایی خواوەند" ئەوا لە نێوان پازدە بنچینەدا ئاماژە بۆ ڕاستی و دروستی و لەسەرحەق بوونی ئەم بەڵگەیە دەکەین.

**بنچینەی یەکەم:**

ئەم بەڵگەیەی کە بە زمانی خۆی و زمان و بەڵگەی حاڵەتەکانی و زمانی حاڵی قۆناغەکانی ژیانی، دەبێت بە بەڵگە لەسەر بەدیهێنەری گەردوون، بەڵگەیەکی ڕاستگۆیە و، لە لایەن ڕاستی‌یەکانی گەردوونیشەوە تەسدیق کراوە. چونکە بەڵگەکانی هەموو بوونەوەران لەسەر یەکتایی خوا، وەکو شایەتی‌دان و تەسدیق‌کردن وان بۆ ئەو کەسەی کە لە بارەی یەکتایی خواوە دەدوێت، واتە ئەو شتەی کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ خەڵکی بۆ لا بانگ دەکات – کە یەکتایی خوایە – لە لایەن هەموو گەردوونەوە تەسدیق

کـراوە. ئـەوەتا ڕوونکردنـەوەکانی ئـەم پێغەمبـەرە ﷺ سـەبارەت بـە یـەکتایی خـوا - کـە کەماڵی ڕەهایە لە گەردووندا - مزگێنییەکانی سـەبارەت بـە بەختـەوەریی هەمیشـەیی - کـە خێری ڕەهایـە - بـە تـەواوی لەگـەڵ ئـەو جوانـی و کەماڵـەی کـە لـە ڕاسـتییەکانی جیـهاندان، یەکاویـەك دەردەچـن. واتـە ئـەم پێغەمبـەرە ﷺ بـە بـێ هیـچ گومـانێك، لـە دەعواکـەیدا ڕاسـتگۆیە. کەواتـە پێغەمبـەر ﷺ بەڵگەیـەکی ڕاست و تەسـدیق کـراوی وەهایە کە لە "یەکتایی خوای گەورە" و "بەختەوەریی هەمیشەیی" دەدوێت.

**بنچینەی دووهەم:**

پاشان ئەم پێغەمبەرە ڕاستگۆ و تەسدیق کراوەی ﷺ کە هەزاران موعجـیزەی هەیـە و، ئەم موعجیزانەشی زۆر لە هی پێغەمبەرانی پێشوو - دروودیـان لەسـەر بێـت - زیـاترن و، شـەریعەتێکی وای هێنـاوە کـە هـەرگیز گۆڕانکـاری و نـەمانی بەسـەردا نایـەت و، بانگەوازەکەشی بۆ هەموو گرۆی جینی و ئادەمیزادە.. دەبێ ئەم پێغەمبـەرە گەورەیـە ﷺ کە خاوەنی پلەوپایەیەکی ئاوا بەرزە، پێشەوای هەموو پێغەمبەران بێت.

لەبەر ئەوە، هەرچی دانست و نهێنی لە موعجـیزە و یـەکگرتنی پێغەمبـەرانی پێشـوودا هەیە، هەموویان لە لای ئەم کۆبوونەتەوە. کەواتە هێزی یەکدەنگیی هەموو پێغەمبـەران و شایەتیدانی موعجیزەکـانی ئـەوان، هـەموویان دەبـن بـە بەڵگـە و پاڵپشـتێکی تونـدوتۆڵ و دامەزراو بۆ ڕاستگۆیی و ڕاستیی بانگەوازەکەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ.

پاشـان هەموو پیاوچـاکان و هەڵبژاردە و ئەولیـاکان، تەنـها بـە بـۆنەی پـەروەردەی بەرز و ڕێنمایی شەریعەتە ڕاستەقینەکەی ئەم پێغەمبەرەوە ﷺ گەیشـتوونەتە ئـەو پلـە و پایـە بەرزەی کەماڵات کە بەدەستیان هێناون. چونکە هەر ئەم پێغەمبەرە ﷺ ڕابـەر و پێشـەوا و گەورەیانە. کەواتە نهێنیی کەرامەتەکانیان و یەکدەنگییان لە تەسدیق کردنیدا و هـێزی لێکۆڵینەوەکانیان، هەموو لەم پێغەمبـەرەدا ﷺ کۆبووەتـەوە. چونکـە ئـەوان ڕێگایـەکیان گـرتەبەر کـە مامۆسـتاکەیان ڕچـەکەی شـکاندووە و دەرگاکـەی بـۆ خسـتوونەتە سەرپشـت و بە کراوەیی خستیە بەردەستیان و، ئنجا ئەوانیش لەم ڕێیەوە "ڕاسـتی"یـان دۆزیـیـەوە و دەسـتیان کەوت. کەواتـە هـەموو کەرامەتـەکانیان و لێکۆڵینـەوە زانستییەکانیان و یەکدەنگییان، دەبن بە پاڵپشتێکی بـەهێز و دامـەزراو بـۆ ڕاسـتگۆیی مامۆستا خاوێن و پاکەکەیان و ڕاستیی بانگەوازەکەی.

ئنجا ئـەم پێغەمبـەرەی ﷺ کە بەڵگەیـەکی ئاشـکرا و ڕوونـە لەسـەر "یـەکتایی خـوای گـەورە" - وەك لـە ئامـاژەکانی پێشـوودا دەرکـەوت - هێنـدە مـوعجیزەی ئاشـکرا و ڕوون و بێ گومـان و، ئیرهـاصی لـەعادەت بـەدەر و، بەڵگەی پێغەمبـەرێتیی گومـان لـێ نـەکراوی هەیـە، کـە هەریەکەیان بـە جۆرێکی گـەورە و گرنـك تەسـدیقی دەکـەن، بـە چەشنێ کە ئەگەر هەموو گەردوون کۆ ببێتەوە و بیەوێت کـەلێنێك بخاتـە ئـەم تەسـدیقە و زامداری بکات، ئەوا هەرگیز لە توانایدا نابێت.

**بنچینەی سێهەم:**

پاشـان ئـەم پێغەمبـەرەی ﷺ کـە بانگـەواز بـۆ "یـەکتایی خـوای گـەورە" دەکات و مزگێنیی "بەختـەوەریی هەمیشـەیی" ڕادەگەیـەنێت و ئـەم هـەموو موعجیـزە ئاشـکرایانەی هەیـە، هێنــدە ڕەوشــتی بەرزیشــی تێدایــە - چ لــە خــودی خــۆیدا و چ لــە گــەیاندنی پەیامەکەیدا و چ لەو شەریعەت و ئاییندا کە لە لایەن خواوەندەوە ڕایدەگەیەنێت - کە دوژمنە سەرسەختەکانیشی ناچار دەکات تەسدیقی بکەن و ڕێگای ئینکاری کردنیان بـۆ نەمێنێتەوە.

جا مادەم بەرزترین و جوانترین و کاملترین و بەنرخترین ڕەوشــت لـە خـۆی و ئـەرکی سەرشـانی و ئایینەکـەیدا هەیـە، ئـەوا دەبێ ئـەو پێغەمبـەرە خۆشەویستە ﷺ هـەر خـۆی نموونـەی کـەماڵی هـەموو بوونـەوەران و، نوێنـــەر و نموونـەی بەرجەسـتەی ڕەوشـتیان و پێشەوای باشی هەموویان بێت.

لەبەر ئەوە، ئەو کەماڵاتانـەی کـە لـە خـۆی و ئـەرکی سەرشـانی و ئایینەکەیـەوە دەدرەوشێنەوە، پاڵپشتێکی هێنـدە گـەورە و بـەهێزن بۆ تەسـدیق کردنـی کـە هیـچ شتێك نەتوانێت جێیان پێ لێژ بکات.

**بنچینەی چوارەم:**

پاشان هەڵگر و خاوەنی ئەم بانگەوازی "یەکتایی" و "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە، کـە کانگا و سەرچاوەی هەموو کەماڵات و مامۆستای هەموو ڕەوشتێکی بەرزە، هەرگیز لـە خۆیەوە و بە ئارەزووی خۆی نادوێت. بەڵکو قسەکانی هەموو "سرووشی خواوەنـد"ن و لەویان وەردەگرێت و بە خەڵکیان ڕادەگەیەنێت. چونکـە ئـەو هـەزاران بەڵگانـەی کـە لەسەر پێغەمبەرێتیی‌یەکەی هەن - وەك لە بنچینەکانی پێشـوودا هـەندێکیان بـاس کـران و ڕوون کرانەوە - ئەوە دەچەسپێنن کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکان ئەو موعجیزانەی

پاشكۆی وته‌ی نۆزده‌هه‌م و سی و یه‌كه‌م

# موعجیزه‌ی له‌ت بوونی مانگ

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿إقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ ۞ وإنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ﴾

(القمر: ١-٢)

چه‌ند فه‌یله‌سووفێكی ماددی و ئه‌وانه‌ش كه كوێرانه چاویان لێ ده‌كه‌ن، ده‌یانه‌وێت په‌رده به‌سه‌ر ڕووی موعجیزه‌ی "له‌ت بوونی مانگ"دا، كه وه‌ك مانگی چوارده ده‌دره‌وشێته‌وه، بگێڕن و له به‌رچاودا لایببه‌ن. ئه‌وه‌تا چه‌ند وه‌همێكی هه‌ڵه و دوور له ڕاستی له باره‌یه‌وه بڵاو ده‌كه‌نه‌وه و ده‌ڵێن: (ئه‌گه‌ر موعجیزه‌ی له‌ت بوونی مانگ له ڕاستی‌دا ڕووی بدایه، ئه‌وا سه‌رانسه‌ری جیهان ده‌یزانی و، هه‌موو كتێبه‌كانی مێژوویش باسیان ده‌كرد)!

**وه‌ڵام:**

موعجیزه‌ی له‌ت بوونی مانگ له به‌رده‌م كۆمه‌ڵێكدا ڕووی داوه كه ده‌عوای پێغه‌مبه‌رێتیی پێغه‌مبه‌ریان ﷺ بیست و ئینكاری‌یان كرد، ئه‌م موعجیزه‌یه‌ش بۆ چه‌سپاندنی ئه‌و ده‌عوایه ڕووی داوه. ڕوودانه‌كه‌شی له شه‌ودا و له كاتێكدا كه خه‌ڵكی بێ ئاگابوون و به شێوه‌یه‌كی كاتیش بووه. ئه‌مه سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه جیاوازیی هه‌ڵاتگه‌كان(مطالع) و په‌ڵه هه‌ور و، هۆكاره‌كانی تری جگه له‌مانه‌ش، ڕێ له بینیی مانگ ده‌گرن. شتێكی ئاشكرایشه كه هۆكاره شارستانی‌یه‌كانی نوێ و كاروباری ڕوانین و سه‌یركردنی بۆشایی ئاسمان، وه‌ك ئێستا، باو نه‌بووه.

كه‌واته مه‌رج نی‌یه كه هه‌رچی كه‌س هه‌یه له هه‌موو جێگایه‌كدا ئه‌م له‌ت بوونه‌ی مانگ ببینێت و، ئه‌م ڕووداوه‌ش بچێته ناو كتێبه‌كانی مێژووه‌وه!

ئێستا له نێوان چه‌ندین خاڵی زۆردا گوێ بۆ پێنج خاڵ ڕابگره، كه گوێت ڕاگرت، ئه‌وا پشت به‌خوا، هه‌موو ئه‌و په‌ڵه هه‌وره وه‌همی‌یانه‌ی كه له‌سه‌ر ڕووی ئه‌م موعجیزه‌یه كه‌ڵه‌كه بوون، ده‌ڕه‌وێنه‌وه:

● خاڵی یەکەم:

سەرسەختی و ملنەدانی کافرانی ئەو کاتە - بەپێی هەواڵی مێژوو - شتێکی بەناوبانگ و زانراوە. جا کاتێ کە قورئانی پیرۆز ئەم موعجیزەیەی بە ئایەتی: ﴿وانشَقَّ القمر﴾ ڕاگەیاند و، دەنگدانەوەی ئەم ئایەتەش بە هەموو لایەکدا بڵاو بووەوە، هیچ کام لەو کافرانەی کە باوەڕیان بە قورئان نەدەکرد، نەیانتوانی و پڕ کێشیی ئەوەیان نەکرد کە ئەم ئایەتە بە درۆ بخەنەوە، واتە: بڵێن: درۆیە، ڕووداوی وا ڕووی نەداوە. چونکە ئەگەر لە ڕاستی‌دا ئەو موعجیزەیە ڕووی نەدایە و، شتێکی چەسپاو نەبوایە لایان، ئەوا بە توندی بۆ بەدرۆخستنەوەی و بەتاڵکردنەوەی دەعوای پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ ڕادەپەڕین. خۆ ئەوەتا هەموو کتێبەکانی مێژوو بگەڕێ، هیچ کامیان چ قسەیەکی کافرانی سەبارەت بە ئینکاری کردنی لەت بوونی مانگ نەقڵ نەکردووە، مەگەر ئەوە نەبێ کە قورئان خۆی لە ئایەتی: ﴿ویقولوا سحرٌ مستمر﴾دا ڕوونی کردووەتەوە. ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە: ئەو کافرانەی ئەم موعجیزەیان بە چاوی خۆیان دی، وتیان: "ئەمە سیحرە" کەواتە با چەند کەسێك بڕۆن بۆ شوێنانی تر و بپرسن ئایا خەڵکی ئەو شوێنانەش ئەمەیان دیوە یان نا؟ کە ڕۆژ بووەوە لە "یەمەن" و شوێنانی ترەوە کاروان گەیشتە ئەوێ، کافرەکانیش هەواڵی ئەمەیان لێ پرسین، ئەوانیش وتیان: بەڵێ، ئەمەمان دیوە. ئنجا کافرەکان وتیان: (سیحری هەتیوەکەی ئەبوو تالیب گەیشتووەتە ئاسمانیش)!

● خاڵی دووهەم:

زۆربەی پێشەوایانی زانستی کەلام، وەك سەعدی تەفتازانی، وتوویانە: (ڕوودانی لەت بوونی مانگ موتەواتیرە، وەك هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی و تێراوبوونی سوپایەکی تەواو لەو ئاوە و، وەك گریان و بێ‌تاقەتیی بنەدارەکەی ناو مزگەوت لە دووریی پێغەمبەر ﷺ کە لە کاتی خوتبەدا پاڵی پێوە دەدایەوە و، کە ئەمەش کۆمەڵی ناو مزگەوت هەموویان گوێیان لێ بوو.. واتە: ئەم ڕووداوە کۆمەڵێکی زۆر لە کۆمەڵێکی زۆرەوە، کە هەرگیز ناگونجێ لەسەر درۆ یەکیان گرتبێت، دەماودەم هێناویانە و بەم جۆرە بە ئێمەش گەیشتووە. کەواتە ڕووداوەکە موتەواتیری قەتعی و بێ‌گومانە، وەك گومان نەبوون لە هەواڵی دەرکەوتنی ئەستێرەیەکی کلکدار لە پێش هەزار ساڵدا و، بوونی دوورگەی: سەرەندیب، هەرچەندەش نەماندیوە).

بەم جۆرە بۆت دەرکەوت کە ورووژاندنی گومان لە دەوری ئەم مەسەلە بێ گومانە و هاوچەشنی ئەمەدا کە بە چاو دەبینرێن، لە نەفامی و بێ‌عەقڵی بەولاوە هیچی تر نی‌یە.

چونکە لەم مەسەلانەدا ئەوەندە بەسە کە بزانرێت یەکێکە لە گونجاوەکان(الممکنات) نەك لە نەگونجاوەکان(المستحیلات). خۆ لەت بوونی مانگیش شتێکی گونجاوە و وەکو ئەوە وایە کە چیایەك بە تەقینەوەی گڕکانێك لەت ببێت.

● خاڵی سێ‌هەم:

موعجیزە بۆ ئەوە پیشان دەدرێت کە ئەوانەی ئینکاریی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، قەناعەت بە پێغەمبەرێتی‌یەکەی بکەن، نەك بۆ ئەوەی ناچاریان بکات ئیمانی پێ بهێنن! کەواتە هەر هێندە پێویستە کە ئەو موعجیزەیە پیشانی ئەوانە بدرێت دەعوای پێغەمبەرێتیان بیستووە، بەو ئەندازەیەی کە بیانگەیەنێتە دڵنیایی و قەناعەتی تەواو لە ڕاستیی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەردا ﷺ.

بەڵام دەرخستنی ئەو موعجیزەیە لە هەموو جێگایەکدا و بە ڕوونی، بە جۆرێك کە خەڵکی ناچار بکات بۆ ئیمان هێنان و ملکەچ کردن، ئەم کارە، شتێکە دژی حیکمەتی خواوەندی دانای شکۆمەندە و پێچەوانەی نهێنیی "تەکلیف"ە کە خوا لە بەندەکانی دەکات. چونکە نهێنیی ئەو تەکلیفەی خواوەند داخوازی ئەوەیە کە دەرفەت بە ژیریی مرۆڤ بدات و "ویست" و "ئیختیار"ی لێ دانەماڵێت!

خۆ ئەگەر خواوەندی بەدیهێنەر موعجیزەی لەت بوونی مانگی بۆ ماوەی دوو سەعات بهێشتایەتەوە و پیشانی هەموو جیهانی بدایە و بچوایەتە ناو کتێبەکانی مێژوو ـ وەك فەیلەسووفەکان دەیانەوێت ـ ئەوا ئەو کاتە کافران دەیانوت: ئەمە دیاردەیەکی گەردوونیی ئاسایی‌یە و، ئیتر ئەو کاتە نەدەبوو بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر ﷺ و بە موعجیزەیەکی تایبەتیی پێغەمبەری مەزن ﷺ دانەدەنرا، یان دەبووە موعجیزەیەکی بەدیهیی وا کە عەقڵی ناچار دەکرد باوەڕ بهێنێت و ئیختیار و ویستی لێ دەسەندەوە و ئەو کاتەش ڕۆحە نزمە خەڵووزئاسا بێ‌نرخەکانی وەك هی ئەبووجەهل لەگەڵ ڕۆحە پاك و بەرز و ئەڵماس‌ئاساکانی وەك هی حەزرەتی ئەبووبەکری صیددیق ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ یەکسان دەبوون! واتە ئەو کاتە نهێنیی تەکلیفی خوا لە بەندەکانی، لەناودەچوو.

لەبەر ئەوە، ئەم موعجیزەیە بە شێوەیەکی کاتی و، لە شەودا و، لە کاتی بێ ئاگاییدا رووی داوە و، جیاوازیی هەڵاتگەکان و، هەور و شتی تریش بوون بە پەردە و رێیان لەوە گرتووە کە هەموو خەڵکی بیبینن. لەبەر ئەوانەیە کە ئەم موعجیزەیە نەڕۆشتووەتە ناو کتێبەکانی مێژووەوە.

● **خاڵی چوارەم:**

ئەم موعجیزەیە کە لە شەودا و، بە شێوەیەکی کاتی و، لە وەختی بێ ئاگاییدا رووی داوە، دیارە بێ هیچ گومانێك هەموو کەسێك لە هەموو جێگایەکدا نایبینێت. بەڵکو ئەگەر هەندێ کەسیش بیبینێت، باوەڕ بە چاوی خۆی ناکات! خۆ ئەگەر باوەڕیشی پێ بکات، ئەوا رووداوێکی وا کە لە دەمی یەك کەسەوە بگێڕێتەوە، لە لای مێژوو بایەخی پێ نادرێت.

زانا لێکۆڵەرەکان ئەو زیادەیەیان رەتداوەتەوە کە لە ریوایەتی ئەم موعجیزەیەدا زیاد کراوە کە گوایا: (دوای لەت بوون، مانگ هاتووەتە سەرزەوی)! ئەو زانایانە ئەم زیادەیەیان لە لا نەچەسپاوە و فەرموویانە: لەوانەیە هەندێ لە مونافیقان ئەمەیان لەسەر ریوایەتەکە زیاد کردبێت تاکو بایەخ بۆ هەموو ریوایەتەکە نەهێڵن و، نرخ و بەهایشی دابگرنە خوارەوە!

ئنجا دەبێ بزانین لەو کاتەدا کە موعجیزەکە رووی داوە، پەڵە هەوری نەزانی رووی ئاسمانی ئینگلتەرای داپۆشیبوو، کاتیش لە ئیسپانیا لە خۆرئاوابووندا بوو، ئەمریکاش لە رۆژی رووناکدا بوون و، لە چین و ژاپۆنیش تازە بەرەبەیان سەری دەرهێنابوو، لە وڵاتەکانی تریشدا چەند رێگرێکی تر هەبوون لە رێی بینینی ئەم موعجیزەیەدا، کەواتە ئەم موعجیزەیەیان تێدا نابینرێت!

جا کە ئەمەت زانی، ئنجا سەرنج لە قسەی ئەو کەسە بدە کە دەڵێت: (مێژووی ئینگلتەرا و چین و ژاپۆن و ئەمریکا و وڵاتانی تری وەك ئەوان، ئەم رووداوە باس ناکەن، کەواتە رووی نەداوە)!

ئەمە چ چەنەبازی‌یەکە ئەوانە دەیکەن؟!

دەسا زەرەرمەندی و رسوایی بۆ ئەوانەی کە بە پاشخوانی ئەورووپا دەژین!

● **خاڵی پێنجەم:**

"لەت بوونی مانگ" رووداوێك نی‌یە کە هەر لە خۆیەوە و لەسەر بناغەی چەند هۆکارێکی سروشتی و لە رێگای رێکەوتەوە رووی دابێت. نەخێر.. بەڵکو بەدیهێنەری

دانا - کە پەروەردگاری خۆر و مانگە - ئەم ڕووداوەی بەسەر مانگدا هێناوە و کردوویەتی بە ڕووداوێکی بازدەر بەسەر هەموو یاسا گەردوونی‌یەکاندا، لە پێناوی تەسدیق کردنی پێغەمبەریێتیی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیدا ﷺ و، بۆ ئەوەی کە دەری بخات بانگەوازی ئەم پێغەمبەرە ﷺ بانگەوازێکی ڕاستە. کەواتە خواوەندی گەورە بەپێی دانایی و، داخوازیی نهێنیی ڕێنمایی و تەکلیف و، حیکمەتی ڕاگەیاندنی پەیامەکانی خۆی کە پێغەمبەر ﷺ ڕایاندەگەیەنێت، ئەو موعجیزەیەی پیشان داوە و، بۆ ئەوەی بیانووی ئەو کەسانەش ببڕێت کە موعجیزەکەیان دیوە.. لە هەمان کاتیشدا خواوەند بەپێی خواستی حیکمەت و ویستی خۆی، ئەم موعجیزەیەی پیشانی دانیشتووانی شوێنەکانی تری جیهان نەداوە، لەو شوێنانەی کە بانگەوازی پێغەمبەرەکەی خوایان پێ نەگەیشتووە و، بە پەڵە هەور و جیاوازیی هەڵاتگەکان و مانگ هەڵنەهاتن یان خۆر هەڵهاتن لە هەندێ وڵاتدا و بوونی ڕۆژ لە هەندێکی تردا و خۆرئاوابوون لە غەیری ئەواندا، بەمانە و غەیری ئەمانە لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی نەبینینی مانگ، ئەو موعجیزەیەی پێش‌چاوی ئەوان نەخستووە.

جا ئەگەر ئەو موعجیزەیە پیشانی هەموو خەڵکی جیهان بدرایە، ئەوا یان: لە ئەنجامی ئیشارەتی پێغەمبەری مەزنەوە ﷺ و بۆ مەبەستی دەرخستنی موعجیزە پێغەمبەرانەکەی پیشانیان دەدرا، دیارە ئەو کاتە دەبوو بە شتێکی بەدیهی و خەڵکی ناچار دەبوون باوەڕی پێ بکەن. واتە "ویست" و "ئیختیار"یان لێ دەسەندرایەوە و نهێنیی تەکلیف تیا دەچوو. لە کاتێکدا کە ئیمان پارێزگاری لە سەربەستیی "عەقڵ" دەکات و نایەوێت ویست و ئیختیاری لێ دابماڵێت.. یان: وەك ڕووداوێکی ئاسمانیی ڕووت پیشانیان دەدرا، ئەو کاتەش پەیوەندیی بە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرەوە ﷺ دەپچڕا و، هیچ تایبەتکاری‌یەکی تێدا نەدەما.

**بە کورتی:**

هیچ دوودڵی‌یەك لە ڕوودانی "لەت بوونی مانگ"دا نی‌یە و، بە جۆرێکی بێ گومان بۆمان چەسپا. وا ئێستاش دوای ئەمە، لە نێوان بەڵگە بێ‌گومان و زۆرەکاندا بە شەش بەڵگە[1] ئاماژە بۆ ڕوودانی ئەم موعجیزەیە دەکەین، کە ئەمانەن:

---

(١) واتە شەش بەڵگەی توندوتۆڵی بێ‌گومان لە نێوان شەش جۆر یەکدەنگی‌دا هەن لەسەر ڕوودانی لەت بوونی مانگ. بەڵام بەداخەوە لەم مەقامەدا مافی خۆیان نەداین و بە کورتی مایەوە. (دانەر)

* یەکدەنگیی هەموو هاوەڵە دادوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ.

* یەکگرتنی زانایانی لێکۆڵەر و تەفسیرنووسان، کاتێك کە تەفسیری ئایەتی: ﴿وانشق القمر﴾یان کردووە.

* زانا ڕاستگۆکانی "فەرموودە" لە ڕیوایەتەکانیاندا ڕوودانی ئەم موعجیزەیەیان بە چەندین سەنەد و ڕێگای جیاجیا نەقڵ کردووە(١).

* شایەتیدانی هەموو ئەهلی "کەشف" و "ئیلهام" لە ئەولیا و پیاوچاکە ڕاستگۆکان.

* تەسدیق کردنی ئەم موعجیزەیە لە لایەن پێشەوا هەرە زاناکانی زانستی کەلامەوە، هەرچەند مەشرەب و ڕێبازەکانیشیان جیاوازن.

* قبووڵ کردنی ئەم موعجیزەیە لە لایەن نەتەوەی ئیسلامەوە، کە هەروەك لە فەرمووودەدا هاتوە: "لەسەر گومڕایی هەرگیز کۆ نابنەوە و یەك ناگرن".

هەموو ئەمانە، ڕوودانی لەت بوونی مانگ ڕوون دەکەنەوە و، وەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان دەیچەسپێنن.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد، شتێك بوو بە ناوی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە و بۆ مەبەستی بێدەنگ کردنی لایەنی بەرامبەر باسمان کرد. وا دوای ئەمە، بە ناوی "حەقیقەت" و لە پێناوی "ئیمان"دا دەدوێین. زانیمان کە لێکۆڵینەوەی زانستی چی دەڵێت..

بەڵام حەقیقەت دەڵێت:

کۆتایی‌هێنەر بە دیوانی پێغەمبەرێتی و مانگی درەخشانی ئەو ئاسمانە کە حەزرەتی "محمد المصطفى"یە ﷺ، ویلایەتی بەندایەتی‌یەکەی ئەو تا پلەی "مەحبووبییەت" بەرز

---

(١) لێرەدا سێ فەرموودە دەهێنین لەوانەی کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوون:
١- عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه قال: انشق القمر على عهد رسول الله ﷺ شقين فقال النبي ﷺ: "اشهدوا". متفق عليه. ٢- وعن انس رضي الله عنه أن أهل مكة سألوا رسول الله ﷺ أن يريهم آيةً، فأراهم انشقاق القمر. متفق عليه. ٣- وعن ابن عباس رضي الله عنهما إن القمر انشق في زمان النبي ﷺ متفق عليه راجع: مسند الإمام أحمد ١/ ٣٧٧، ٤١٣، ٤٤٧، ٤٥٦، ٣/٢٠٧، ٢٢٠، ٢٧٥، ٢٧٨، ٤/٨١ ورواه الطيالسي برقم ٢٩٥، ١٨٩١، ١٩٦٠. وتفسير ابن كثير (٦/٤٦٩) لمعرفة تواتر الحادثة. وانظر كذلك: اللؤلؤ والمرجان فيما اتفق عليه الشيخان. ج٣/ص٢٨٠ (وەرگێڕ)

بووەوە، ئەوەتا کەرامەت و موعجیزە هەرە گەورەکەی ئەوی بە "میعراج" دەرخست، واتە بە: هاتوچۆکردن و ڕۆشتنی جەستەیەکی سەر ڕووی زەوی بەناو ئاسۆکانی ئاسمانە بەرزەکاندا و خۆناساندنی بە ئەهلی ئاسمانەکان و، بەو موعجیزەیەی ویلایەتە گەورەکەی خۆی و، خۆشەویستی‌یە بێ‌گەردەکەی بۆ خوا و، بەرزبوونەوەی بەسەر ئەهلی ئاسماناندا بۆ ئاسمان نشینان چەسپاند..

هەر بەو جۆرەش خواوەند ئەو مانگەی کە بە ئاسماندا هەڵی واسیوە و پەیوەندیی بە زەوی‌یەوە هەیە، تەنها بە ئیشارەتێکی بەندەکەی خۆی لەسەر زەوی‌یەوە، کرد بە دوو لەتەوە و، بۆ مەبەستی چەسپاندنی پێغەمبەرێتیی ئەو بەندە خۆشەویستەی خۆی، ئەم موعجیزەیەی ئەوی پیشانی زەوی‌نشینان دا، بە ڕادەیەکی وا کە پێغەمبەر ﷺ وەك دوو بەشە ڕووناکەکەی مانگی لێ هات، چونکە بە هەر دوو باڵی نوورانیی: "ویلایەت" و "پێغەمبەرێتی" بۆ بەرزترین پلەی کەماڵات بەرز بووەوە تا گەیشتە "قاب قوسین" یان نزیکتر..

جا هەروەك مایەی شانازیی زەوی نشینانە، هەروەها بوو بە مایەی شانازیی ئەهلی ئاسمانیش!

علیه وعلى آله وصحبه الصلاة والتسليمات ملء الأرض والسموات.

**﴿سبحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علّمتنا إنك أنت العليم الحكيم﴾.**

پارچەیەك لە پاشكۆی پەیامی
موعجیزاتی ئەحـمەدی

## بۆچی تەنها "محەممەدی ئەمین" ﷺ بەم میعراجە مەزنە تایبەتمەند كرا؟

**ئەم باسە لە نێوان باسی بەڵگەكانی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ و لە وەڵامی پرسیارێكدا نووسراوە كە لە دەمی باسكردنی گرفتی یەكەمی سێ گرفتەكەی كۆتایی بناغەی سێهەمی پەیامی (میعراج)دا كرا. كەواتە ئەمە وەك پوختە پێڕستێك وایە.**

**پرسیار:**
بۆچی تەنها "محەممەدی ئەمین" ﷺ بەم میعراجە مەزنە تایبەتمەند كرا؟
**وەڵام:**
ئەم گرفت و ئیشكالەی یەكەمتان، بە درێژی لە هەر سی و سێ وتەكەی كتێبی سۆزلەر (وتەكان)دا شی كراوەتەوە. بەڵام لێرەدا و بە پوختە پێڕستێك سەبارەت بە كەماڵاتی ئەم پێغەمبەرە بەرێزە ﷺ و، بەڵگەكانی پێغەمبەرێتی‌یەكەی و، دەرخستنی ئەوەی كە تەنها ئەم پێغەمبەرە ﷺ شایانی ئەم میعراجە بەرزەیە، ئاماژەیەكی پوخت پێش‌چاو دەخەین.

یەكەم: كتێبە پیرۆزەكانی وەك تەورات و ئینجیل و زەبوور، چەندین ئاماژە و مزگێنی‌یان سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ تێدایە، هەرچەندەش بە درێژایی مێژوو دەستكاری كراون. لەم چەرخەی خۆماندا زانای لێكۆڵەر: "حسين الجسر" سەد و دە مزگێنیی لەو كتێبانە دەرهێناوە و، لە كتێبەكەی‌دا كە ناوی: "الرسالة الحميدية"یە تۆماری كردوون.

دووهەم: بەپێی هەواڵی "مێژوو" هەروەها بە گەلێ ڕیوایەتی صەحیح، چەندین مزگێنیی زۆری كاهینەكان چەسپاوە. وەك ئەو دوو كاهینە بەناوبانگەی كە ناویان (شیق) و (سەتیح)ە و، پێش ناردنی پێغەمبەر ﷺ مزگێنی‌یان داوە و هەواڵی هاتنی پێغەمبەری ئاخر زەمانیان ڕاگەیاندووە.

سێهەم: ئەو ڕووداوانەی لە شەوی لەدایکبوونی‌دا ڕوویان داوە، وەك: ڕووخانی بتەکانی ناو کەعبە و، ڕووخانی هەیوانی کیسرا و، سەدان ئیرهاص و ڕووداوی لە عادەت بەدەری تری وەك ئەمانە، کە تەواو بەناوبانگن و "کتێبەکانی مێژوو" باسیان کردوون.

چوارەم: هەلّقولاّنی ئاو لە نێوان پەنجە پیرۆزەکانی و تێراوکردنی سوپا لەو ئاوە و، تاسە و گریان و نالەی بنداره‌کەی ناو مزگەوت و، لەت بوونی مانگ، وەك دەقی ئایەتی: ﴿وانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ دەری بڕیوە و، چەندین موعجیزەی تری وەك ئەمانە کە لە لای زانا لێکۆڵەرەکان چەسپاون و هەزار موعجیزەی وەها دەبن و، کتێبەکانی بەسەرهاتی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و مێژوو تۆماریان کردوون.

پێنجەم: هەموو دۆستان و دوژمنان، بە جۆرێکی بێ گومان، لەوەدا یەکیان گرتووە کە: ئەو ڕەوشتە جوانانەی لە پێغەمبەردان ﷺ لە بەرزترین پلەدان و، ئەو سیفەتە باشانەی کە لە بانگەوازەکەی‌دا هەن لە ئاستێکی گەلێ بلنددان و، هەلّسوکەوتیشی لەگەلّ خەلّکی‌دا باشترین شایەتە لەسەر ئەمە. شەریعەتە پاك و بێ گەردەکەشی کاملترین ڕەوشتی بەرزی لە خۆدا کۆکردووەتەوە، هەروەك بەرزی و شکۆمەندیی ئایینەکەی شایەتە لەسەری.

شەشەم: لە ئاماژەی دووهەمی وتەی دەهەم(پەیامی حەشر)دا ئاماژەمان بۆ ئەوە کردووە کە:

زاتی پیرۆزی ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە بوو ﷺ کە بۆ جێ‌بەجێ کردنی ویستی خوا لە بارەی پیشاندانی خوایەتیی خوای گەورە و بەپێی خواستی حیکمەتی ئەو خوایە، بەو بەندایەتی‌یە گەورەیەی کە لە ئایینەکەیدایە، بەرزترین پلەکانی "بەندایەتی"ی پیشان دا.

هەروەها وەك شتێکی بەلّگەنەویستە هەر تەنها ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە بەڕێزترین ڕابەر و ڕێ پیشاندەرە بۆ جوانیی کەمالّی ڕەهای بەدیهێنەری جیهان و، باشترین و بەرزترین ناسێنەرە کە بەدەم بانگی ئەو ویستەی خواوە ڕۆشتووە سەبارەت بە دەرخستن و پیشاندانی ئەو جوانی‌یە لە ڕێی نێرراوێکەوە، وەك "ڕاستی" و "دانایی" داخوازی ئەمەن.

هەروەها، وەك شتێکی لەبەرچاو و بینراوە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە گەورەترین ڕێ پیشاندەرە و شارەزای کەمالّی سنعەتی بەدیهێنەری جیهانە، ئەو کەمالّەی کە لەوپەڕی جوانیی ڕەهادایە، ئەم ڕێنمایی‌یەشی بەوپەڕی گەورەیی دەرخستووە و بە زولاّلترین دەنگ ڕایگەیاندووە. بەم کارەشی بە دەم ویستی خوای گەورەوە ڕۆشتووە و

سەرنجی دنیای بۆ کەماڵی سنعەتی خواوەند ڕاکێشاوە و خەڵکی لێ ئاگادار کردووەتەوە.

هەروەها، وەك شتێکی پێویستە، هەر تەنها ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە کاملترین کەسێك بێت هەموو پلەکانی "تەوحید"ی بە خەڵك ڕاگەیاندبێت و بەم پێیە، بە دەم ویستی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە ڕۆیشتبێت و، "یەکتایی" خواوەندی بەسەر هەموو چینە زۆرەکانی بەدیهێنراواندا ئاشکرا کردبێت.

هەروەها، وەك شتێکی پێویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە خاوێنترین و ڕووناکترین ئاوێنەیە بۆ پیشاندان و ڕەنگدانەوەی جوانکارییەکانی جوانیی خاوەنی جیهان و وردەکارییەکانی جوانییە بێ وێنە و بەرزەکەی، وەك ئەو شایەتییەی کە ئاسەوارە بێ وێنەکانی دەستەڵاتی ئەو دەیدەن لەسەری. هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەرزترین و چاکترین کەسێکە خواوەند خۆشی ویستبێت و لە لای غەیری خۆیشی خۆشەویستی کردبێت. پێغەمبەریش ﷺ بەدەم ویستی خواوەندەوە ڕۆشت لەوەدا کە ئەو جوانییە بەرز و پیرۆزەی خواوەندی دی و، بەپێی داخوازیی "حەقیقەت" و "حیکمەت" پیشانی غەیری خۆیشی دا.

هەروەها وەك شتێکی بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ مەزنترین کەسێك بێت کە هەر شتێك لە گەنجینە پەنهانەکانی بەدیهێنەری جیهاندایە، بە جیهانی ناساندبێت، ئەو گەنجینانەی کە بە ناوازەترین موعجیزە و بەنرخترین گەوهەر پڕ کراون. ئەم پێغەمبەرە ﷺ گەورەترین و بەرزترین کەسە کە ئەمەی ئاشکرا کردووە و دەری خستووە و وەسفی کردووە. بەم کارەشی بە دەم ویستی خواوەندەوە ڕۆشتووە لەوەدا کە دەیەوێت ئەم گەنجینە شاراوانە دەربخات و ئاشکرایان بکات.

هەروەها، وەك شتێکی بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە کاملترین ڕابەر بێت بۆ جیننی و ئادەمیزاد، تەنانەت بۆ ڕۆحانی و مەلائیکەتانیش.. هەر تەنها ئەو مەزنترین کەسێکە واتای ئاسەوار و جێدەستەکانی بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرانەی ڕوون کردبێتەوە، کە بە جوانترین ئارایشتکاری ڕازاندوونیەتەوە و، دەرفەتی بە خاوەن هەستانی ناو بەدیهێنراوانیشی داوە کە بە بیرکردنەوە و پەند لێ وەرگرتن سەرنجی بدەن. بەمەش ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەدەم ئەو ویستەی خواوەندەوە ڕۆیشتووە کە دەیەوێت واتای

ئەو ئاسەوارانەی سنعەتی خۆی و دەستنیشان كردنی نرخیان بۆ ئەهلی بینین و بیر كردنەوە ڕوون بكاتەوە.

هەروەها وەك شتێكی ئاشكرا و بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ كە باشترین كەسێك بێت، لە ڕێی حەقیقەتەكانی قورئانەوە، ناوەڕۆكی ئەو "ئامانجە"ی ئاشكرا كردبێت كە لە ئاڵوگۆڕەكانی بوونەوەراندا هەن و، هەر ئەویشە كە مەتەڵ و گرێكوێرەی سەرسووڕهێنەری گەردوونی حەل كردبێت و كردبێتیەوە، كە بریتییە لە سێ پرسیارە سەختەكەی : (تۆ كێیت؟.. لە كوێوە هاتوویت؟.. بۆ كوێ دەڕۆیت)؟!

بەمەش ئەو ویستەی خوای گەورەی جێبەجێ كرد كە دەیویست ئەو نهێنی و گرێكوێرەیە بەهۆی نێرراوێكی خۆیەوە بۆ خاوەن هەستان دەربخات و بیكاتەوە.

هەروەها، وەك شتێكی ئاشكرا و بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ كە كامڵترین كەسێك بووبێت بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، ئامانجەكانی خوای گەورەی دەرخستبێت و، هەر ئەویشە ئەو ڕێگایەی ڕوون كردبێتەوە كە مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕەزامەندیی پەروەردگار. بەمەش ئەو ویستەی خواوەندی بەجێهێنا كە دەیویست بەهۆی نێرراوێكی خۆیەوە ڕوونی بكاتەوە كە: چیی لە خاوەن هەستان دەوێت و بە چی لێیان ڕازی دەبێت، دوای ئەوەی كە لە ڕێی بەدیهێنراوە بێ وێنە و ناوازەكانیەوە خۆی پێ ناساندن و، بە نیعمەت و بەخششە بەرز و بەنرخ و لە ژمارە بەدەرەكانیشی خۆی لە لا خۆشەویست كردن.

هەروەها، وەك شتێكی ئاشكرا و بەڵگەنەویستە، هەر ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ كە بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، مەزنترین كەسێكە ئەركی پێغەمبەرایەتیی بە تەواوی جێبەجێ كردبێت و، لە بەرزترین پلە و جوانترین و ڕێكترین شێوەدا و بەوپەڕی باشی ڕایگەیاندبێت. بەمەش بەدەم ئەو ویستەی پەروەدگارەوە ڕۆشت كە دەیویست ڕووی مرۆڤ لە "زۆری"یەوە بەرەو "یەك" و، لە "فانی"یەوە بەرەو "باقی" وەربگێڕێت..

ئەو مرۆڤەی كە خواوەندی بەدیهێنەر كردوویەتی بە بەروبوومی جیهان و.. هێندەش توانا و قابلییەتی پێ بەخشیوە كە جێی هەموو جیهانی تێدا ببێتەوە و.. بۆ بەندایەتییەكی گشتی ئامادەی كردووە و.. بە چەند هەست و شعوورێكیش تاقیی كردووەتەوە كە ڕوویان لە "زۆری" و "دنیا"یە..

جا لەبەر ئەوەی كە بەرزترین پلەی بوونەوەران: زیندەوەرانن و.. بەرزترینی زیندەوەرانیش: خاوەن هەستانن و.. بەڕێزترینی خاوەن هەستانیش: مرۆڤە ڕاست و كامڵەكانن.. ئەوا لەبەر هەموو ئەمانە، ئەو كەسەی كە لە نێوان هەموو مرۆڤە

بەرێزەکاندا ئەو فەرمانبەری‌یە ناوبراوانەی ئەنجام داوە و، بە شێوەیەکی جوان و پلەیەکی بەرز مافی خۆیانی پێ داون.. بە بێ هیچ گومانێك ئەو مرۆڤە بەهۆی میعراجی مەزنەوە بۆ بەرزترین پلەی وەك: (قاب قوسين أو أدنى) بەرز دەکرێتەوە و، لە دەرگای بەختەوەریی هەمیشەیی دەدات و، دەرگای گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوانی خواوەند دەکاتەوە و، ڕاستی‌یە پەنهانەکانی ئیمان بە بینینی چاو دەبینێت..

جا دەبێ ئەو کەسە کێ بێت جگە لەو پێغەمبەرە بەرێزە ﷺ ؟

حەوتەم: هەر کەسێك سەرنجی خۆی ئاراستەی ئەم بەدیهێنراوە پەرش و بلاوانەی ناو گەردوون بکات، بە حەتمی جوانکاری و ئارایشتکاریی لە ئەندازەبەدەر و ناوازەیان تێدا دەبینێت. خۆ شتێکی ئاشکرایشە کە ئەم جوانکاری و ئارایشتانە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە بەدیهێنەری ئەو بەدیهێنراوانە ویستی لەسەر جوانکاری و ئارایشتدانی ئەو بەدیهێنراوانەیەتی، جا ئەو ویستە توندوتیژەی ئەو - بە بێ هیچ گومانێك - دەبێت بە بەلگە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەدیهێنەرە حەزێکی بەرز و خاوێن و خۆشەویستی‌یەکی پیرۆزی لە بەرامبەر ئەو بەدیهێنراوانەی خۆیەوە هەیە..

لەبەر ئەوە، شتێکی ئاشکرا و بەلگەنەویستە کە: خۆشەویستترین کەس لە لای ئەو بەدیهێنەرەی کە بەدیهێنراوانی خۆی خۆش دەوێت، ئەو کەسەیە کە هەموو ئەو سیفەتانەی تێدا جەم بوو بێت و، لە خودی خۆیشی‌دا وردەکاری‌یەکانی سنعەتی خواوەند بە جوانی و تەواوی دەربخات و بیانزانێت و بە غەیری خۆیشیانی بناسێنێت.. کەسێك بێت کە خۆی لای خوای گەورە خۆشەویست بکات و، بەوپەڕی ڕێز و سەرسوورمانەوە دان بە جوانیی بوونەوەرانی تردا بنێت و، ئەو جوانی‌یانەیان دەربخات.

جا ئەو کەسە کێ‌یە کە بەرامبەر ئەو جوانکاری و وردەکاری و کەمالاتەی کە بوونەوەران جوان دەکەن و دەیانڕازێننەوە و ڕووناکی‌یان تێدا پەخش دەکەن، وای لە زەوی و ئاسمانان کردبێت کە بە زایەلەی دەنگی: (سبحان الله.. ماشاء الله.. الله اکبر) و، بە (زیکر و تەسبیحات و الله أکبر) کردنی سەرسوورمانەوە، دەنگ بدەنەوە؟

ئەو کەسە کێ‌یە کە بە ئاوازی قورئانی پیرۆز سەرانسەری بوونەوەرانی ڕاتەکاندووە و، وشکایی و دەریاکانیشی خستووەتە جۆش و خرۆشێکی تابلێی توندوتیژەوە و شەوق و تاسەیەکی یەکجار زۆریشی بەرامبەر بەو قورئانە پیرۆزەوە تێدا هەژاندوون و، وای لێ کردوون کە ڕێزلێنان و سەرسوورمانی خۆیان بەرامبەر جوانیی ئەو قورئانە بە بیرکردنەوە و ئاشکراکردن و، بە زیکر و تەهلیلەوە دەربڕن؟ دەبێ ئەو زاتە پیرۆزەی کە ئەم کارانە ئەنجام دەدات کێ بێت جگە لە حەزرەتی محەممەدی ئەمین ﷺ؟

جا پێغەمبەرێکی ئاوا مەزن ﷺ کە بەهۆی تهێنیی: "السبب کالفاعل"ەوە هەردەم بە ئەندازەی ئەو کردەوە چاکانەی نەتەوەکەی کردوویانە و دەیکەن، کردەوەی چاك دەخرێتە سەر تای تەرازووی کردەوە چاکەکانی.. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە سەرجەمی ئەو سڵاواتانەی نەتەوەکەی لەسەری دەدەن، دەخرێنە سەر کەماڵاتە مەعنەوییەکانی.. ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە هێندە میهرەبانی و خۆشەویستیی خواوەندی بەسەردا دەبارێت کە نەتوانرێت سنووری بۆ دیاری بکرێت، سەرەڕای ئەو بەروبوومانەش کە پاداشتی گەورە و مەعنەوین و هی بەئەنجامگەیاندنی ئەرکی پێغەمبەرایەتین..

بەڵێ، ڕۆیشتنی پێغەمبەرێکی گەورەی ئاوا ﷺ - بە بێ هیچ گومانێك - بۆ بەهەشت و "سدرة المنتهى" و "قاب قوسين أو أدنى": عەینی حەق و حەقیقەتە و، سەرتاپا حیکمەتی خواوەندە و، کارێکە هیچ گومانێکی تێدا نی‌یە[1].

---

(١) ڕۆژنامەیەکی ئیسلامی کە بایەخ بە بارودۆخی موسڵمانان دەدات، دەڵێت:

پیاوە بەناوبانگەکانی یاسا و سیاسەت لەوانەی کە گرنگی بە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەدەن، سالی ١٩٢٧ز لە ئەورووپا کۆنگرەیەکیان بەستووە کە چەندین فەیلەسووفی بیانی لەو کۆنگرەیەدا لە بارەی شەریعەتی ئیسلامەوە دواون. وا لە خوارەوەدا دەقی وتەکانیان دەهێنین. بەمەش ژمارەی ئەو شایەتی‌یانەی کۆمان کردوونەتەوە لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی ئیسلام لە هەموو یاسایەك حەق و ڕەواترە دەگەنە بیست و پێنج شایەتی، دوای ئەوەی کە ئەم دوو شایەتی‌یەش دەخەینە سەر ئەو بیست و سێ شایەتی‌یە ڕاستەی لە کۆتایی "پەیامی نوور"دا باس کراون. (والفضلُ ما شهدتْ به الأعداءُ)!

ئەوەتا تەنانەت زانایانی خۆرئاواش دانیان ناوە بە بەرزیی بیروباوەڕەکانی ئیسلام و چاکی و شیاویی‌دا بۆ هەموو جیهان. مامۆستا "شبوول"ی ڕاگری کۆلیجی "مافەکان"ی زانکۆی ڤییەننا لە کۆنگرەی سالی ١٩٢٧ی یاسازاناندا دەڵێت:

"مرۆڤایەتی شانازی دەکات بەوەی کە پیاوێکی وەك محەممەد ﷺ یەکێکە لە ڕۆڵەکانی، چونکە هەرچەندە محەممەد ﷺ کەسێکی نەخوێندەوار بووە بەڵام دوازدە سەدە پێش ئێستا توانیی یاسایەك بهێنێت کە ئێمەی ئەورووپایی ئەوپەڕی بەختەوەر دەبین گەر پاش دوو هەزار سالی تر بتوانین پێی بگەین"!

"بەرناردشۆ"ش دەڵێت: "ئایینی محەممەد ﷺ هەمیشە جێی بەرزترین ڕێزم بووە، لەبەر ئەوەی ژیان و تین و گوڕێکی سەرسووڕهێنی تێدایە، چونکە وەك بۆم دەرکەوتووە تاکە ئایینێکە توانای هەرس کردنی گشت قۆناغە جیاجیاکانی ژیانی بێت و بتوانێت هەموو بەرەیەکی مرۆڤ بەرەو خۆی کێش بکات. بە پێویستی دەزانم کە بە محەممەد ﷺ بوترێت: " ڕزگارکەری مرۆڤایەتی". من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر پیاوێکی وەك ئەو سەرکردەیی جیهانی نوێی پێ بسپێررێت ئەوا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهاندا سەردەکەوێت و ئاسایش و بەختەوەری (واتە ئاسایش و سولحی گشتی) لە جیهاندا بڵاو دەکاتەوە. ئای چەندە جیهانی ئەمڕۆ پێویستی بەم بەختەوەری و ئاسایشەیە"! (دانەر)

## پلەی شازدەهەمی پەیامی:

(الآية الكبرى)

کە سەبارەت بە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەدوێت

**لەبەر ئەوەی ئێرە جێیەکی گونجاوە بۆ ئەم پلەیە، ئەوا کرا بە پاشکۆی ئەم باسە.**

......

پاشان ئەو گەشتیارەی کە لە دنیادا خەریکی گەشتوگوزار بوو، بە "عەقڵ"ی خۆی وت:

مادەم من بە دوای بەدیهێنەر و خاوەنی خۆمدا دەگەڕێم و لەم پێناوەدا پرسیار لە بەدیهێنراوانی ناو گەردوون دەکەم، ئەوا باشتر وایە سەر لەو کەسە بدەم کە کامڵترین مرۆڤی ناو بوونەوەرە و مەزنترین کەسێکە بە شایەتیی دوژمنانیشی - چ جای دۆستانی - خەڵکی بەرەو چاکە دەبات و، بەناوبانگترین و ڕاستگۆترین و پلە بەرزترین و خاوەنی ڕووناکترین ژیرییە کە بریتییە لەو محەممەدە ئەمینەی ﷺ کە بەهۆی ڕەوشتە بەرزەکانی و قورئانەکەیەوە چواردە سەدەی ڕەبەقی ڕووناک کردەوە.. جا لەبەر ئەوەی بە سەرلێدانی شاد ببم و لە بارەی ئەو شتانەی بە دوایاندا عەودالم پرسیاری لێ بکەم، ئەوا دەبێ بە یەکەوە (واتە خۆی و عەقڵی) بڕۆین بۆ باشترین سەردەم و سەدە و کات، کە چەرخی بەختەوەرییە، چەرخی پێغەمبەرێتیی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ.

بەم جۆرە ئەو مرۆڤە گەشتیارە، بە "عەقڵ" ڕۆشتە ناو چەرخی بەختەوەرییەوە. کە ڕۆشت، بینیی:

ئەم چەرخە بەهۆی پێغەمبەرەوە ﷺ بە ڕاستی بووە بە چەرخی بەختەوەریی مرۆڤایەتی. چونکە بە بۆنەی ئەو نوورەی کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ هێنابووی، لە ماوەیەکی کورتدا نەتەوەیەکی نوقم بووی ناو نەخوێندەواری و ڕەگداکوتاوی ناو ژیانی "دەشتەکێتی"ی گۆڕی و، کردنی بە مامۆستا و سەرکردەی جیهان!

هەروەها ئەم گەشتیارە بە عەقڵی خۆی وت:

دەبێ پێش هەموو شتێك، سەبارەت بە مەزنیی ئەم زاتە خاوەن ئیعجاز و پیرۆزەوە شتێك بزانین، ئەمەش لە ڕێی ڕاستگۆیی و حەق بوونی گوفتار و هەواڵدانەکانیەوە. ئنجا لە بارەی بەدیهێنەرمانەوە پرسیاری لێ بکەین.

پاش ئەمە، ئەو گەشتیارە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد. لە ئەنجامدا ئەوەندە بەڵگەی سەبارەت بە ڕاستیی پێغەمبەرێتیی ئەو دەست کەوت کە لە ژمارە نەدەهاتن، بەڵام توانیی (نۆ) دانەیان دەستنیشان بکات:

**یەکەم:**

ئەوەیە کە: هەرچی سیفەت و ڕەوشتی بەرز و جوانە لەم پێغەمبەرەدا ﷺ هەیە، بە ڕادەیەك کە دوژمنانیشی شایەتی لەسەر ئەمە دەدەن. هەروەها دەرکەوتنی هەزاران موعجیزە لەم پێغەمبەرەوە ﷺ وەك: لەت بوونی مانگ کە بە پەنجە بۆ ڕاکێشانی پێغەمبەر ﷺ بوو بە دوو کەرتەوە و لە دەقی قورئاندا بە: ﴿وانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ باس کراوە.. هەروەها وەك ئەوەی کە سوپایەکی تەواوی دوژمنانی، تەنها بەوەی کە مشتێك خاکی بە سەر و چاودا وەشاندن، هەموو یەکێکی ئەو دوژمنانە لەو گڵ و خاکە ڕۆشتە ناو چاویانەوە، هەروەك دەقی ئایەتی: ﴿وما رمَيْتَ إذْ رميتَ وَلَكِنَّ اللهَ رَمَى﴾ باسی دەکات.. هەروەها وەك تێراوبوونی هاوەڵەکانی لەو کانیاوەی کە وەك کەوسەر لە کاتی تینوێتیی سەختدا لە نێوان هەر پێنج پەنجە پیرۆزەکانیەوە هەڵدەقوڵا و.. جگە لەمانەش سەدان موعجیزەی تر کە لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەدا ﷺ ڕوویان داوە و، بە نەقڵی صەحیح و بێ گومان، یان بە تەواتور پێمان گەیشتوون.

ئیتر ئەم گەشتیارە داوای لە "عەقڵ"ی خۆی کرد کە: بڕوات مەکتووبی نۆزدەهەم(موعجیزاتی ئەحمەدی) بخوێنێتەوە، کە پەیامێکی وەهایە خۆی لە خۆیدا کارێکی لەعادەتبەدەر و خاوەنی کەرامەتە و، زیاتر لە سێسەد موعجیزەی لە موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بەڵگە بێ گومان و سەنەدە باوەڕ پێ کراوەکانیاندا لەخۆ گرتووە.

پاشان ئەم گەشتیارە لەبەر خۆیەوە بە خۆی وت:

کەسێك بەم ئەندازەیە ڕەوشتی جوان و بەم زۆرییەش موعجیزەی ببێت، بێ هیچ گومانێك ئەو کەسە خاوەنی ڕاسترین گوفتارە و، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ ئەو مرۆڤە

لەو پلەیەی خۆی دابەزێت و، وەك خراپكاران دەست بە ساختە و درۆ و دەلەسە بكات.

**دووهەم:**

ئەوەیە كە: ئەو قورئانەی بە دەستیەوەیەتی، لە حەوت ڕووەوە خاوەنی ئیعجازە.. ئەو قورئانەی كە فەرمانێكە لە لایەن خاوەنی گەردوونەوە دەرچووە و، لە هەموو چەرخێكدا سێ‌سەد ملیۆن كەس باوەڕیان پێیەتی.

جا لەبەر ئەوەی وتەی بیست و پێنجەم، واتە: پەیامی (موعجیزاتی قورئانی) كە خۆری پەیامەكانی نوورە، بە چەندین بەڵگەی بەهێزی دامەزراو چەسپاندوویەتی كە بە چل ڕوو قورئانی پیرۆز خاوەنی ئیعجازە و فەرموودەی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە.. لەبەر ئەوە، گەشتیارەكە ئەم كارەی بەو پەیامە ناوبراوە سپارد، چونكە ئەو پەیامە بە درێژی ئەو ئیعجازەی ڕوون كردووەتەوە.

پاشان وتی: ئەو كەسەی كە خواوەند بیكات بە ئەمیندار لەسەر وتەكانی خۆی و، ئەویش ئەم وتانەی خوای گەورە لە خۆی‌دا جێ‌بەجێ بكات و بەم كارەش واتاكانی ڕوون بكاتەوە.. ئەو كەسەی كە خوای گەورە ئەركی ڕاگەیاندنی ئەم قورئانە مەزنەی بە هەموو خەڵكی پێ سپاردبێت، كە ئەمەش كارێكی تەواو حەق و ڕەوایە، هەرگیز مومكین نی‌یە مرۆڤێكی وا درۆی لێ ببینرێت یان جێی گومان بێت.

**سێ‌هەم:**

ئەوەیە كە: ئەم پێغەمبەرە ﷺ بە شەریعەتێكی پاك و ئایینێكی سروشتی و بەندایەتی‌یەكی خاوێن و نزا و لاڵانەوەیەكی بەكوڵ و بانگەوازێكی گشتی و باوەڕێكی دامەزراوەوە ڕەوانە كراوە، كە هیچ شتێك نی‌یە هاوچەشنی ئەوانە بێت كە ئەم هێناونی و، هەرگیز لەوانە باشتر نەبووە و نابێت..

چونكە ئەو شەریعەتەی كە ئەو نەخوێندەوارە ﷺ هێنای و پێنج یەكی مرۆڤایەتیی بە درێژایی چوارده سەدەی ڕەبەق لەسەر بناغەی حەق و دادگەری و بە یاسا پڕ لە وردەكاری و زۆرەكانی بەڕێوەبرد، هەرگیز هاوتای نی‌یە و ناشی‌بێت.

هەروەها ئەو "ئیسلام"ەی كە لە كردار و گوفتار و هەڵسوكەوتی ئەو كەسە نەخوێندەوارەوە دەرچووە، پێشەواو و جێی پرس و ڕای سێ‌سەد ملیۆن مرۆڤە لە هەموو چەرخێكدا و، مامۆستا و ڕابەری عەقڵ و، ڕووناككەرەوەی دڵ و، پەروەردەكار و

پاکژکەرەوەی دەروون و، هـۆی بەرزبوونـەوەی ڕۆحیانـە.. ئـەم ئیسلامە، نـە هاووێنـەی بووە، نە هەرگیز دەیشی بێت.

هەروەها پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی بەسەر هەموو کەسێکدا لەو پەرستنانەی کـە لـە ئایینەکەیدا هەن و، تەقوا مەزنەکەی کە لە هەموو کەسێك زیـاترە و، ترسـانە زۆرەکـەی لە خواوەند و، موجاهەدە بەردەوامەکەی و، چاودێرییە لەڕادەبەدەرەکـەی بـۆ وردتریـن نهێنییـەکانی بەندایـەتی، تەنانـەت لـە ناخۆشـترین بارودۆخیشـدا و، بەندایەتی کردنـە بـێ گەردەکەی هەر لە سەرەتاوە بە جوانترین شێوە، بێ ئەوەی لاسـایی کـەس بکاتـەوە و، لـە سەرەتا و کۆتاییدا هەر یەکتاپەرست بێت، بێ گومان هاوچەشـنی مرۆڤـی وا نـە تـا ئێستا بینراوە و نە لەمەولاش دەبینرێت.

هـەروەها بـە دوعـا و لالآنـەوەی "الجوشـن الكبـير" کـە یەکێکـە لـەو هـەزاران نـزا و پاڕانەوانەی ئەو، وەسفی پەروەردگاری خۆی لە پلەیەکی عارفانەی وەهـادا دەکـات کـە هیچکـام لـە عارفـان و ئـەولیاکان لـە خواناسـیدا نەگەیشـتوونەتە ئـەو پلەیـە و، هــەر لــە کۆنەوە تا ئێستا وەسفی کەسیان نەگەیشتووەتە ڕادە و پایـەی ئـەو وەسـفەی کـە ئـەو هـی خواوەندی دەکات، هەرچـەندەش ئـەوان دەیـانتوانی یـەك لـە دوای یـەك سـوود لـە بیری یەکتر و پێشینانیان وەربگرن. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخـات کـە هـیچ کەسێك نییـە لـە پاڕانەوەدا وەکو ئەو وابێـت. هەرکـەس سـەیری ئـەو ڕوونکردنـەوە کورتـەی بڕگەیـەکی نـەوەدونۆ بڕگەکـەی موناجـاتی "الجوشـن الكبـير" بکـات لــە سـەرەتای پـەیامی "موناجـات"دا، هیچـی بۆ نامێنێتەوە جگـە لـەوەی کـە بڵێـت: هـیچ نـزا و پاڕانەوەیـەك هاوچەشنی ئەم دوعا بەرز و جوانە نییە کە لە چڵەپۆپەی خواناسیدایە.

هەروەها لە گەیاندنی پێغەمبەرێتییەکەی و ڕاگەیاندنی بانگەوازەکەیدا بە خـەڵکی، دامـەزراوی و ئازایەتییـەکی ئـەوتۆی پیشانداوە کـە هـیچ کەسێك - بـا بـە ئـەندازەی گەردیلەیەکیش بووبێـت - لەمـەدا نزیکی نابێتـەوە و پێی ناگاتـەوە و لەگـەڵیدا بـەراورد ناکرێت. هیچ جۆرە دوودڵی و دڵەتەپێیەکیشی تووش نەبووە و هەرگیز تـرس نـەیتوانیوە زەفەری پێ ببات، خۆ هـەرچـەندە دەوڵەتە گەورە و ئایینە مەزنەکانی ئەو دەمە و تەنانەت هۆز و مام و خزمانیشی ئەوپەڕی دوژمنایەتییان لەگەڵدا دەکرد، کەچی ئەم هەر بە تەنها خۆی تەحەددای گشت دنیـای دەکرد و، خواوەندیـش پشتی گـرت و سـەری خسـت و

سەربەرزی کرد و، ئەویش سەری گێتیی بە تاجی ئیسلام ڕازاندەوە.. کەواتە کێ هەیە لە گەیاندنی ئەو ڕاسپاردانەی خوای گەورەدا وەك محەممەد ﷺ وا بێت؟!

هەروەها ئەم پێغەمبەرە ﷺ ئیمانێکی توندوتۆڵی مەحکەم و، یەقینێکی دامەزراوی لە عادەتبەدەر و، دەرخستنی حەقیقەتی سروشتی مرۆڤی بە جۆرێکی دەراسا و، بیروباوەڕی بەرزی ئەوتۆی لەگەڵ خۆیدا هێناوە کە نە بیروباوەڕ و نە دانایی دانایان و سەرگەورە ڕۆحییەکانی ئەو سەردەمە، نەیانتوانی هیچ گومانێك یان دوودڵییەك یان لاوازییەك یان تەنانەت وەسوەسەیەکیش لە دڵی ئەودا دروست بکەن! بەڵێ، هەموو ئەوانە نەیانتوانی هیچ کارێك بکەنە سەر هیچ شتێکی ئەو، چ یەقینی، چ بیروباوەڕی، چ پشت بەخوا بەستنی، چ ئەو دڵنیایییەی کە بە خوای گەورە هەیبوو، هەرچەندەش گشت ئەو بیروباوەڕ و داناییيانەی باس کران، هەموویان دژ و پێچەوانەی ئەو بوون و دوژمنایەتییان لەگەڵدا دەکرد! جگە لەمەش: سەرجەمی ئەولیا و پیاوچاکان کە لە پلە و پایە مەعنەوییەکاندا بەرزبوونەتەوە، لە پێشەکیی هەموویانەوە: هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان بەهۆی ئیلهام و دەرس وەرگرتن لە پێغەمبەر ﷺ و سوود وەرگرتنیان لە پلەی ئیمانەکەی و بەوەی کە پێغەمبەریان ﷺ لە بەرزترین پلەدا دیوە، بەرز بوونەوە و گەیشتن بەو پلە بڵندانە..

هەموو ئەمانە، بە جۆرێکی ئاشکرای بەڵگەنەویست، دەری دەخەن کە ئیمانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ ئیمانێکە هەرگیز هاوتا و هاووێنەی نییە.

ئیتر گەشتیارەکە تێ گەیشت و تەسدیقی عەقڵی خۆی کرد، کە: کەسێك خاوەنی شەریعەتێکی ئاوا بێ وێنە و، ئیسلامێکی پاکی بێ هاوتا و، بەندایەتییەکی خاوێنی بێ گەرد و، پاڕانەوەیەکی جوانی ناوازە و، دەعوایەکی گشتیی گەردوونی و، ئیمانێکی موعجیزی بەم چەشنە بێت، هەرگیزاو هەرگیز جێی درۆی لانابێتەوە و خەڵکیش ناخەڵەتێنێت.

**بەڵگەی چوارەم:**

یەکدەنگیی هەموو پێغەمبەران، درووديان لەسەر بێت و، یەکگرتنیان لەسەر ئەو ڕاستییانەی ئیمان کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ هێناونی، بەڵگەیەکی بێ گومانە لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی گەورە، هەروەها شایەتییەکی ڕاستیشە لەسەر ڕاستی و پێغەمبەرێتیی ئەم پێغەمبەرە ﷺ. چونکە هەر شتێك ببێت بە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرانی تر و لە خولگەی پێغەمبەرێتیی ئەواندا بخولێتەوە، وەك سیفاتی بەرز و پیرۆز و

موعجیزاتیان و ئەو کارانەی ئەنجامیان داون، کتومت وەك ئەوانە و لەوانەش تەواوتر لەم پێغەمبەرەدا ﷺ هەیە، هەروەك مێژوو تەسدیقی ئەمە دەکات..

چونکە ئەو پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - بە زمانی تەورات و ئینجیل و زەبوور و ئەو "صوحوفانەی" لە بەردەستیاندا بوون، هەواڵ و مزگێنیی هاتنی ئەم زاتە پیرۆزەیان بە خەڵکی داوە (تەنانەت بیست ئاماژەی ڕوون و ئاشکرا زیاترمان ڕوون کردووەتەوە کە لەو کتێبە پیرۆزانەدا هەن و، لە پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا تۆمارمان کردوون). جا هەروەك ئەوان مزگێنیی هاتنی ئەمیان بە خەڵکی داوە، بە زمانی حاڵیشیان - واتە زمانی پێغەمبەرێتی و موعجیزاتیان - تێکڕا تەسدیقی دەکەن و مۆری پشتگیری لەسەر ڕاستیی بانگەوازەکەی دەدەن. چونکە هەر ئەو پێغەمبەرەیە کە لە بانگەوازەکەیدا بۆ لای خواوەند، پێش هەموو پێغەمبەرانی تر کەوتووەتەوە.

لەمەوە گەشتیارەکە تێ گەیشت کە ئەو پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - هەروەك بە زمانی گوفتار و یەکدەنگییان دەبن بە بەڵگە لەسەر "یەکتایی" خواوەند، بە هەمان جۆر، بە زمانی حاڵیشیان و یەککگرتنیان شایەتی لەسەر ڕاستی و ڕاستگۆیی ئەم پێغەمبەرە ﷺ دەدەن.

**بەڵگەی پێنجەم:**

گەیشتنی هەزاران ئەولیا بە "حەق" و سەرچاوەی "حەقیقەت".. هەروەها ئەو کەماڵات و کەرامەت و کەشف و موشاهەدانەش پێیان بەهرەمەند بوون، تەنها بەهۆی شوێنکەوتنی دەستوورەکان و، پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ و، شوێن پێ هەڵگرتنیەوە هەموو ئەمانەیان دەست کەوتووە.. جا هەروەك هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر "یەکتایی" خواوەند، هەروەها بە یەکدەنگی و یەککگرتنیشیان شایەتن لەسەر ڕاستیی مامۆستا و پێشەواکەیان، کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ و، لەسەر ئەوەش کە پێغەمبەرێتییەکەی لەوپەڕی حەق و ڕاستیدایە.

جا گەشتیارەکە لەمەوە تێ گەیشت کە ئەم پیاوچاکانە بە "نووری ویلایەت" هەندێکیان لەو شتە غەیبییانە دیوە کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیانەوە دواوە و هەواڵیانی ڕاگەیاندووە، بە نووری ئیمانیش هەموو هەواڵدانەکانی ئەویان دیوە و باوەڕیان پێ هێناوە و، چ بە "علم الیقین" و چ "عین الیقین" و چ "حق الیقین" تەسدیقیان کردووە. ئەمەش وەك خۆری ڕووناك دەری دەخات کە: تا چەندە ئەم پێشەوا و ڕابەرە گەورە و مەزنەیان ڕاستگۆیە و، تا چەندەش لەسەر حەقە.

**بەڵگەی شەشەم:**

ملیۆنان زانای هەڵبژاردەی وردەکار و صیددیقانی لێکۆڵەر و دانایانی بلیمەتی ئیماندار، لەوانەی کە بە بەرزترین پلە گەیشتوون، تەنها بەهۆی ئەوەی کە قوتابیێتیی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەیان ﷺ کردووە و وانەی حەقیقەتە بەرز و پیرۆزەکانیان لە لا خوێندووە و لەمەشەوە چەندین زانیاریی بەرزیان بەدەست هێناوە و چەندین پلەیان لە خواناسیدا بۆ دەرکەوتووە.. گشت ئەو مرۆڤانە، هەروەك هەموویان بناغەی بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ (کە یەکتاپەرستیی خواوەندە) دەچەسپێنن و بە بەڵگە بێ گومانەکانیشیان و بە یەکدەنگی تەسدیقی دەکەن.. هەر بەو جۆرەش هەموویان یەك دەگرن و، لەسەر ڕاستی و ڕاستگۆیی ئەم مامۆستا مەزنە و لەسەر ئەوەی کە سەرجەم فەرموودەکانی حەق و ڕاستن، شایەتی دەدەن.

جا ئەم شایەتیدانەی ئەوان، وەك ڕۆژی ڕووناك، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ڕاستگۆیی ئەم زاتە و ڕاستیی پەیامەکەی. بۆ نموونە: "پەیامەکانی نوور" بە هەموو بەشەکانیەوە کە لە سەد تێدەپەڕن، تەنها یەك بەڵگەن لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ!

**بەڵگەی حەوتەم:**

ئەو کۆمەڵە مەزنەی کە پێیان دەوترێت: "ئال و ئەسحاب" و، سەبارەت بە فیراسەت و زانست و کەمالاتەوە لە دوای پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بەناوبانگترین مرۆڤن و لە هەموو کەسێك وریاترن و لە پلە و پایە و کەمالاتیشدا پلەیان بەرزترە و، بەناوبانگتر و وردبینترن و لە هەموو کەسێکیش زیاتر دەستیان بە ئایینەوە گرتووە..

جا کە ئەم کۆمەڵە مەزنە بەوپەڕی تاسە و شەوق و لێبڕان و وردەکارییەوە بە شوێن هەموو حاڵەت و بیر و هەڵسوکەوتێکی ئاشکرا و پەنهانی پێغەمبەردا ﷺ بە وردی گەڕاون و، ئنجا بە یەکدەنگی و یەکگرتن تەسدیقی ئەوەیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ لە قسە و گوفتارەکانیدا لە گشت کەسێکی ئەم دنیایە ڕاستگۆترە و، لە هەموویان پلەی بەرزترە و، لە هەمووشیان زیاتر و توندتر دەستی بە حەق و حەقیقەتەوە گرتووە.. جا ئەم تەسدیقەی ئەوان کە هێندە دامەزراوە هەرگیز لە جێگای خۆیدا نابزوێت، لەگەڵ ئەو ئیمانە قووڵەش کە هەیانە، بەڵگەیەکی گەلێ ڕوونە و وەك ئەوە وایە کە ڕۆژی ڕووناك دەبێت بە بەڵگە لەسەر ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان.

**بەڵگەی هەشتەم:**

هەروەك ئەم گەردوونە بەڵگەیە لەسەر ئەو بەدیهێنەر و نووسەر و وێنەکێشەی کە دروستی کردووە و بەڕێوەی دەبات و کاری دەسازێنێت و بە وێنەکێشان و ئەندازەدانان و ڕێکخستن دەستکاریی دەکات، وەكبڵێی گەردوون کۆشکێکی ڕەنگین، یان پەڕاوێکی گەورە، یان پیشانگایەکی جوانی ناوازە، یان جێگای دەرخستن و ناوبانگ پێ دەرکردن بێت بۆ ئەو شتانەی کە تیایدایە..

هەروەك ئەم گەردوونەی کە بەم جۆرەیە، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری خۆی، بە هەمان جۆر و بە چەشنێکی بێ گومان، داخوازی ئەوەش دەبێت کە یەکێك ببێت ئەو واتایانە دەرببڕێت کە لەم کتێبە گەورەیەی گەردووندان و، ئامانجەکانی خواوەندیش لە بەدیهێنانی گەردووندا بزانێت و بەخەڵکیشیان بڵێت و، ئەو دانستە پەروەردگارییانەش کە لە ئاڵوگۆڕی گەردووندان و ئەنجامی فەرمانبەری و هەڵسوکەوتەکانی گەردوونن، بە دەرس بیانڵێتەوە و، نرخ و بایەخ و کەمالاتی ئەو شتانەش لە گەردووندا ئاشکرا بکات. واتە داخوازی ئەوە دەبێت کە بانگەوازکارێکی مەزن و ڕاستگۆ و مامۆستایەکی لێکۆڵەر و کارامە، بۆ ئەم کارانە ببێت.

گەشتیارەکە لەم وانەیەوە تێ گەیشت لەوەی کە گەردوون بەڵگە و شایەتە لەسەر ڕاستی و دروستیی ئەم پێغەمبەرە ئەمینەی کە بەڕێزترین و بەرزترین کەسە ئەم فەرمانبەری و ئەرکانەی بە تەواوی ئەنجام دابێت و، بەڵگەیە لەسەر ئەوەش کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ بەڕێزترین و ڕاستگۆترین نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

**بەڵگەی نۆهەم:**

مادەم لە پشت پەردەوە یەکێك هەیە کەماڵی بێ وێنە و وردەکاریی سنعەتی خۆی لە ڕێی ئەم بەدیهێنراوە پڕ لە وردەکاری و دانایییانەوە ئاشکرا دەکات و.. بەو بەدیهێنراوە لەژمارەبەدەر و ڕازاوە و ناسکۆڵە و جوانانەش، خۆی بە غەیری خۆی دەناسێنێت و خۆشەویستی دەکات لە لایان و.. بەو نیعمەتە بەنرخ و خۆش و لە ژمارەبەدەرانەش کە بەخشیونی، سوپاس و شوکرانە لەسەر ئەو بەدیهێنراوانەی خۆی پێویست دەکات و.. بەدیهێنراوانی دەخاتە تاسە و شەوقەوە و هانیان دەدات کە لە بەرامبەر پەروەردگارێتییەکەی ئەودا پەرستشێکی ئەوتۆ ئەنجامبدەن کە پڕ بێت لە خۆشەویستی و سوپاس و شوکرانەبژێری بۆ ئەم پەروەردگاری و ژیاندنە گشتییەی خواوەند کە بەدیهێنراوانی خۆی پێ پەروەردە دەکات و بە جۆرێکی پڕ لە شەفەقەت و

چاودێری دەیانژییەنێت (بە ڕادەیەك كە خۆراك و میوانداریی پەروەردگاریيانەی وا ئامادە و ساز دەكات كە پێویستییەكانی وردترین هەستی چەشتنی ناودەمەكان و هەموو جۆرە ئیشتیهاكان دابین دەكات) و.. داوا لە بەدیهێنراوانیشی دەكات كە باوەڕ و تەسلیم بوون و ملكەچی و گوێڕایەڵییان لە بەرامبەر ئەو خوایەتییەی خواوەندەوە بێت كە بە گۆڕینی وەرزەكان و، شەو بە دوای ڕۆژدا هێنان و، جیاوازییان و، هاوچەشنی ئەم كاروبارە مەزن و هەڵسوكەوتە گەورە و كردارە پەروەردگارییە سەرسووڕهێنەر و پڕ لە دانایییانەوە، ئەو خوایەتییەی خۆی پیشانی ئەوان دەدات و، دادگەری و حەقپەرەوییی خۆیشی بەوە دەردەخات كە هەمیشە پەنای چاكەخوازان دەدات و، خراپە و خراپكاران لەناودەبات و، بە بەڵا و گیروگرفتە ئاسمانییەكانیش ستەمكاران و ئەوانەی پێغەمبەران بە درۆ دەخەنەوە، لەناو دەبات.

كەواتە بێ هیچ گومانێك، خۆشەویستترین بەدیهێنراو و ڕاستگۆترین بەندە لە لای ئەو خواوەندەی كە پەردەی غەیبی بەسەر خۆیدا داداوەتەوە، ئەو كەسەیە كە بە جۆرێكی پاك و بێگەرد و خاوێن بۆ ئەو ئامانج و مەبەستە باسكراوانەی خواوەند كار بكات و نهێنیی هەرە گەورەی بەدیهێنان لە گەردووندا بدۆزێتەوە و ئەو مەتەڵە حەل بكات و گرێ كوێرەكەی بكاتەوە و دەری بخات و، هەمیشە بە ناوی بەدیهێنەرەكەیەوە تێبكۆشێت و، لە هەموو شتێكدا داوای هێز ویارمەتی لەو بكات و، بەم جۆرە یارمەتی و سەركەوتنی لەوەوە دەست كەوتبێت..

جا دەبێ ئەو كەسە كێ بێت جگە لە حەزرەتی محەممەد ﷺ؟

پاشان ئەم گەشتیارە بە "عەقڵ"ی خۆی وت:

مادەم ئەم (نۆ) حەقیقەتە شایەتی ئیسپاتن لەسەر ڕاستیی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ، ئەوا هیچ گومانێك لەوەدا نییە كە پێغەمبەر ﷺ تەوەرەی ڕێزی مرۆڤایەتی و، مایەی شانازیی جیهانە و، ئەوپەڕی شایانی ئەوەیە كە ناوی: "مایەی شەرەفی ئادەمیزاد" و نازناوی: "جێی شانازیی هەموو جیهان"ی لێ بنرێت. ئەو فەرمانەی خواوەندی میهرەبانیش كە لە دەستیدایە، بریتییە لەو قورئانە پیرۆزەی كە باڵی شكۆمەندی و دەستەڵاتی مەعنەویی خۆی بەسەر نیوەی گۆی زەویدا ڕاكێشاوە. ئنجا كەماڵاتی كەسی و ڕەوشتە بەرزەكانی خۆیشی، لەگەڵ ئەو قورئانەدا، دەری دەخەن كە مەزنترین مرۆڤ لە جیهاندا ئەم پێغەمبەرە مەزنەیە ﷺ. كەواتە وتە و گوفتاری حەقی باوەڕ پێ كراو لە بارەی بەدیهێنەرمانەوە، تەنها وتە و گوفتاری ئەوە!

دەسا ئەی عەقڵەكەم! وەرە سەرنج بدە لەوەی كە بناغەی هەموو دەعواكانی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ و ئامانجی سەرەكیی هەموو ژیانی بریتییە لە: شایەتیدان لەسەر "بوون" و "یەكتایی" خواوەند و، ڕوونكردنەوە و دەرخستنی "سیفەتە مەزن" و "ناوە جوانەكان"ی بەدیهێنەرمان. ئەوەتا هەموو ئەمانەی چەسپاندووە و ئاشكرای كردوون و، لەمەشدا پشتی بەو هەزاران ڕاستییە ڕەگداكوتاوە دامەزراوانە بەستووە كە لە ئایینەكەیدان و، هێزی ئەو سەدان موعجیزە ڕوون و ئاشكرایانەش كە خواوەند لەسەر دەستی ئەو دەری خستوون.

واتە: ئەو خۆرە مەعنەوییەی كە ئەم گەردوونەی ڕووناك كردووەتەوە و، بەڵگەی ڕوون و ئاشكرای "بوون" و "یەكتایی" خواوەندی بەدیهێنەرمانە، تەنها ئەم پێغەمبەرە بەڕێزەیە ﷺ كە نازناوی: "خۆشەویستی خوا"ی خەڵات كراوە. چونكە سێ جۆر یەكدەنگیی گەورەی ئەوتۆ هەن كە هەرگیز پشتگوێ ناخرێن و خۆیشیان شت پشتگوێ ناخەن، پشتی ئەم شایەتیدانە دەگرن و تەسدیقی دەكەن:

***یەكدەنگیی یەكەم:***

یەكدەنگیی ئەوانەیە كە لە جیهاندا بە ناوی "ئالی بەیتی محەممەد ﷺ" ناسراون و ناوبانگیان دەركردووە. ئەو كۆمەڵە نوورانییەی كە پێشەواكەیان ئەو ئیمامی عەلییە بەڕێزەیە كە دەفەرموێ: "ئەگەر پەردە لە ڕووی پەنهاندا هەڵبدرێتەوە، یەقینم هەروەك خۆی دەمێنێتەوە" و.. لە دوای خۆیشی هەزاران ئەولیای گەورەی خاوەن بەسیرەتی تیژ و پەنهانبینیان تێدا هەڵكەوتووە، لە پیاوانی وەك شێخی گەیلانی (قُدِّسَ سِرُّهُ) كە هێشتا لەسەر زەوی و لە ژیاندا بووە بە چاوی تیژی بەسیرەتی خۆی سەیری عەرشی مەزن و حەزرەتی ئیسرافیلی، بەو گەورەییە، كردووە!

***یەكدەنگیی دووهەم:***

بریتییە لە یەكدەنگیی ئەو كۆمەڵەی كە بە "هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر ﷺ" بەناوبانگ و ناسراون، كە بە یەكگرتنیان و ئیمانە دامەزراوەكەیان تەسدیقی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ﷺ دەكەن. ئەم تەسدیقەشیان لە ڕادەیەكی وادا بوو كە گەیاندنیە ئەوەی گیان و سامان و باوك و تیرە و هۆزیان لە پێناوی ئەودا بەخت بكەن. ئەوانەی كە پێش پێغەمبەر ﷺ كۆمەڵێكی دەشتەكیی ناو جێگایەكی دوور لە خوێندەواری و بێ بەش لە هەموو ڕواڵەتێكی ژیانی كۆمەڵایەتی و بیری سیاسی بوون و، خاوەنی هیچ پەڕاو و ڕێبازێكی ڕوون نەبوون و، لە تاریكستانی چەرخی "فەترەت"دا ون بووبوون و هەر

ناویان نەدەهێنرا، کەچی لە پاش موسڵمان بوونیان و لە ماوەیەکی کەمدا بوون بە مامۆستا و ڕابەر و سیاسی و کاربەدەستی دادوەری ئەو نەتەوانەی کە لە باری شارستانێتی و بواری زانستی و ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری‌یەوە پێشکەوتووترین نەتەوەی ئەو کاتەی سەرزەوی بوون، بەم جۆرە فەرمانڕەوایی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان گرتە دەست و، ئاڵای دادگەری‌یان لە دەریا و وشکایی جیهاندا دەشەکایەوە.

***یەکدەنگیی سێ‌هەم:***

بریتی‌یە لە تەسدیقی ئەو کۆمەڵە مەزنەی کە لە زانایانی بەڕێز و لەژمارەبەدەری ئەوتۆ پێکهاتوون کە لە زانستەکانیاندا وەك دەریا وان و تابلێی لێکۆڵەر و وردەکار بوون و، لەناو نەتەوەی ئەم پێغەمبەرەدا ﷺ هەڵکەوتوون و گەشەیان کردووە و، لە هەموو چەرخێکدا هێندە مرۆڤی کامڵ و کارامە و لێهاتوویان هەیە کە لە گشت زانیاری‌یەکدا پێش هەموو کەسێك کەوتوونەتەوە.

جا تەسدیقی هەموو ئەو زانایانە، پێکەوە و بە پلەی "علم الیقین" - لە ڕاستی‌دا - یەکدەنگی‌یەکە لە وێنەی نی‌یە.

لەمانەوە گەشتیارەکە بڕیاری دا کە: شایەتیدانی ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە ﷺ لەسەر "یەکتایی خواوەند" شایەتیدانێکی جوزئی و تاکە کەسی نی‌یە، بەڵکو شایەتیدانێکی هەمەکی و گشتیی ئەوتۆیە کە هێندە مەحکەم و دامەزراوە هەرگیز لە جێی خۆی نەبزوێت و گەر سەرجەم شەیتانەکانیش لە هەموو لایەکەوە لێی کۆببنەوە، ناتوانن خۆیان لە بەرامبەریەوە ڕابگرن.

هەر بەم جۆرەش لە پلەی شازدەهەمی مەقامی یەکەمدا، ئاماژەیەکی کورت بۆ ئەم ڕاستی‌یە کراوە کە ئەو گەشتیارە لە گەشتە عەقڵی‌یەکەی‌دا بە ناو لایەنەکانی ژیان لەو قوتابخانە نوورانی‌یەی چەرخی بەختەوەری‌دا دەستی‌کەوت. ئەو ئاماژەیەش بەم جۆرەیە:

(لا إله إلاّ الله الواجبُ الوجودُ الواحدُ الأحدُ الذي دلَّ علــــى وجـــوبِ وجودِهِ في وحدتِه: فخرُ عالمٍ، وشرفُ نوعِ بني آدمَ، بعظمةِ سلطنةِ قرآنــــهِ، وحشمةِ وسعةِ دينِهِ، وكثرةِ كمالاتِه، وعلويّةِ أخلاقِه، حتى بتصديقِ أعدائِـــه، وكذا شَهِدَ وبَرْهَنَ بقوةِ مئآتِ المعجزاتِ الظاهراتِ الباهراتِ الْمُصَدَّقَةِ وبقوةِ آلافِ حقائقِ دينِهِ الساطعةِ القاطعةِ، بإجماعِ آلِـــهِ ذوي الأنـــوارِ، وباتفـــاقِ أصحابِهِ ذوي الأبصارِ. وبتوافقِ محققي أُمَّتِهِ ذوي البراهينِ والبصائرِ النّوارة).

# مەکتووبی بیستەم

**باسمه سبحانه**

**﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾**

(لا إله إلا الله، وحده، لا شريك له، له الملك، وله الحمد، يحيي، ويميت، وهو حي لا يموت، بيده الخير، وهو على كل شيء قدير، وإليه المصير)[1].

(ئەم ڕستەیە کە پوختەی تەوحیدە، بریتی‌یە لە یازدە وشە و، خوێندنی لە پاش نوێژی بەیانی و شێوان گەلێ بەهرە و سوودی زۆری تێدایە، بە ڕادەیەك کە ڕیوایەتێکی صەحیح ئەم ڕستەیەی لە پلەی "ئیسمی ئەعزەم"دا داناوە. کەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت کە هەموو وشەیەکی ئەم ڕستەیە ئومێدێکی شیفابەخش و مزگێنی‌یەکی دڵخۆشکەری لێ بچۆڕێت و، دارای پلەیەکی مەزن بێت لە پلەکانی "تەوحیدی پەروەردگاری" و، لە گۆشەی "ئیسمی ئەعزەم"یشەوە: مەزنیی یەکتایی و.. تەواوەتیی تەوحید، ڕوون بکاتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستی‌یە فراوان و بەرزانە بە تەواوی لە "وتەکان"دا ڕوون کراونەتەوە، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین. بەڵام لێرەدا، لەبەر بەڵێنێکی پێشینە، لە شێوەی پوختەیەکی زۆر کورتدا و، بە پێشەکی‌یەك و دوو مەقام، پێڕستێك بۆ ئەم ڕستەیە دادەنێین).

---

(١) صحيح، رواه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي وأحمد والطبراني وابن خزيمة.

# پێشەکی

بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بزانە کە: بەرزترین ئامانجی بەدیهاتن و، مەزنترین ئەنجامی "سروشت"ی مرۆڤایەتی: "باوەڕبوونە بە خوای گەورە".. هەروەها بزانە کە: بڵندترین پلەی مرۆڤایەتی و، باشترین پایەی ئادەمیزاد: "ناسینی خوا"یە کە لەو باوەڕبوونەدایە.. بیشزانە کە: خۆشترین و جوانترین بەختەوەری و، شیرینترین نیعمەتی ئادەمیزاد: "خۆشویستنی خوایە" کە هەڵقوڵاوی ناسینی ئەوە.. ئەوەش بزانە کە: پوختترین شادمانی بۆ گیانی مرۆڤ و، خاوێنترین کامەرانی بۆ دڵی، بریتی‌یە لەو "تام و چێژە ڕۆحی"یەی کە لەو خۆشویستنەوە نم نم دادەچۆڕێت.

بەڵێ، هەموو جۆرەکانی بەختەوەریی ڕاستەقینە و، دڵخۆشیی بێ گەرد و، نیعمەتی تەواوەتی، لە: "ناسین" و "خۆشویستنی خوای گەورەدایە". چونکە هیچ بەختەوەری و دڵخۆشی و نیعمەتێکی ڕاستەقینە، بێ ئەو ناسین و خۆشویستنەی خوای گەورە، لەکایەدا نی‌یە.

جا هەرکەس بە ڕاستی خوا بناسێت و دڵی لە نووری خۆشویستنی ئەو خوایە پڕ بووبێت، شایانی بەختەوەری‌یەکی بێ کۆتایی و نیعمەتێکی نەبڕاوە و چەندەها نوور و نهێنیی لەبن‌نەهاتوو دەبێت. ئنجا هەروەك شایانیانە، لە پاشانیشدا هەموو ئەمانەی، چ لە ڕاستی و واقیعدا، چ لە توانا و لێهاتنی خۆی‌دا، دەستگیر دەبێت و بۆی دێنەدی. بەڵام ئەو کەسەی کە بەدیهێنەری خۆی بە ڕاستی ناناسێت و، دڵیشی بێ بەهرەیە لەو خۆشویستنەی کە خوای گەورە شایانیەتی، ئەو کەسە، گرفتاری بەدبەختی‌یەکی ماددی و مەعنەویی هەمیشەیی و، دووچاری چەندین ئازار و وەهمی لەژمارەبەدەر دەبێت.

بەڵێ، ئەم مرۆڤە نەگبەتەی کە لە ئەنجامی لەدەستچوونی پارێزگار و خاوەنەکەیەوە، بە ئازارەوە دەتلێتەوە و، لەتاو بێ‌مەبەستی و بێ‌نرخیی ژیانی لە نیگەرانی‌دایە و، لە نێوان چەند کۆمەڵە مرۆڤێکی بێ دەستەڵات و کلۆڵدا، لاواز و دەستەوسانە.. ئەو کەسە، گەر پادشای هەموو دنیاش بێت، چ سوودێکی پێ دەگات و، لە دەست ئەو دەردەی کە گیرۆدەی بووە چی ڕزگاری دەکات؟!

ئەم مرۆڤە نیگەرانەی کە لە گێژاوی ئەم ژیانە فانی و تیاچووەدا و، لە نێوان چەندین کۆمەڵە مرۆڤی بەرباد و بێ‌خاوەندا، گرفتاری شڵەژاوی و دڵەتەپێ بووە.. گەر

پەروەردگار و خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی نەدۆزێتەوە و بە ڕاستی نەیناسێت، چەندە مرۆڤێکی بەدبەختە! بەڵام گەر پەروەردگار و خاوەنی خۆی بدۆزێتەوە، ئەوا هانا بۆ سایەی میهرەبانیی فراوانی ئەو دەبات و پاڵ بە شکۆمەندیی دەسەڵاتی ڕەهای ئەو خوایە دەداتەوە. ئیتر ئەم دنیا سامناکەی بۆ دەبێت بە باخچەیەکی دڵگیری دڵڕفێن و، بازاڕێك بۆ بازرگانی‌یەکی بەکەڵکی سوودبەخش.

## مەقامی یەکەم

هەموو وشەیەك لە وشەکانی ئەم گوفتارە تەوحیدی‌یە ڕەنگینە، مزگێنی‌یەکی دڵخۆشکەر و هیوا و ئومێدێکی گەرموگوڕ دەبەخشن و، هەموو مزگێنی و مژدەیەکیش شیفا و چارەسەرن و، هەموو یەکێك لەو شیفایانەش دارای چێژ و لەزەتێکی مەعنەوی و حەوانەوەی ڕۆحین.

**وشەی یەکەم:** "لا إله إلا الله".

ئەم وشەیە مژدەیەکی گەورە و هیوایەکی دڵخۆشکەری وەك ئەمەی خوارەوەی لێ دەچۆڕێت:

گیانی مرۆڤ کە تامەزرۆ و ئارەزوومەندی چەندین پێداویستیی بێ سنوورە و، لە هەمان کاتیشدا گیرۆدەی داوی چەندەها دوژمنی لەژمارەبەدەرە. ئەم گیانەی کە ئاوا گرفتاری نێوان چەندین پێویستیی بێ سنوور و دوژمنی لەڕادەبەدەرە.. لەم وشەیەدا سەرچاوەیەکی پڕ و بەپیتی یارمەتیدانی دەستگیر دەبێت. چونکە ئەم وشەیە دەرگای چەندەها گەنجینەی میهرەبانیی فراوان لە بەردەم گیانی مرۆڤدا دەکاتەوە کە گشت پێویستی‌یەکانی ئەو دابین دەکەن.. هەروەها ئەم وشەیە پاڵپشت و پشتگیرێکی وا توندتۆڵ و مەحکەمی بۆ گیانی مرۆڤ تێدایە کە هەرچی شەڕ و خراپە و زیان هەن، دووریان دەخاتەوە لەو گیانە. چونکە هێزی خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆی پیشان دەدات و، بۆ لای خاوەن و بەدیهێنەر و بەتوانست و پەرستراوی خۆی ڕێنمایی دەکات. کەواتە ئەم وشەیە بەم بینینە ڕاست و ئاشناکردنەی مرۆڤ بە خواوەندی تاك و تەنیای خۆی، "دڵ"ی مرۆڤ لە تاریکیی بێ‌هاودەمی و وەهم و گومان دەرباز دەکات و "گیان"یشی لە ئازاری خەم و پەژارە دەپارێزێت و، دڵخۆشی‌یەکی هەمیشەیی بۆ دەستەبەر دەکات.

**وشەی دووهەم: "وَحْدَهُ".**

ئاسۆی ئەم وشەیە، تریفەی هیوایەکی درەخشانی لـێ هەڵـهاتووە و، مژدەیەکی دڵخۆشکەری بەم شێوەیەی خوارەوەی لەگەڵ خۆدا هێناوە:

"گیـان" و "دڵ"ی مرۆڤ، کە لـە ژێر پاڵەپەستۆی چەندین پەیوەندیی بـەتینیان بـە زۆربـەی بوونەوەرانـەوە، مـاندوویی زۆری بـۆ هێنـاون، بـەڵکو تـا ڕادەی خنکـانیش گرفتاری تەنگەنەفەسی بوون.. گیان و دڵی مرۆڤ کە گیرۆدەی ئەم بـارە پەشێوەن، لـەم وشەیەدا داڵدەیەکی "بێ وەی"یان دەستگیر دەبێت کە لەو مەترسی و گێژاوانە ڕزگاریان دەکات. واتە وشەی: "وحدە" لە واتا و ناوەرۆکیدا دەڵێت:

خوای گەورە تاك و تەنیایە. کەواتە کاکی مرۆڤ! خۆت بـەوە مـاندوو نەکـەیت کـە زەلیلی لە ڕووی غەیری ئـەودا بنوێنیت و لـە ژێر ئـەرکی منـەت و ئازاریـاندا بنـاڵێنیت! نەخێر. سەریان بۆ دامەنەوێنە و مـەراییان لـە ڕوودا مەنوێنـە و.. بـە هەناسـەبڕکێ بـە دواياندا خۆت ماندوو مەکە.. لێیان مەترسە و لە بەردەمیاندا مەلەرزێ. چونکە پادشـای هەموو گەردوون هەر یەکێکە و کلیلی هەموو شتێك تەنـها لای ئـەوە و جڵـەوی هـەموو شتێکی بەدەستە و، گشت گرێکوێرە و تەنگانە و گیروگرفتێك بە فـەرمان و ڕوخسـەتی ئەو دەکرێنەوە و چارەسەر دەبن. جا ئەگەر ئـەوت دەسـت کەوت، ئـەوا هـەموو شـتێکت دەسـت کـەوتووە و داواکاریـەکانت هاتوونەتـەدی و، لـە کۆڵـە قورسـەکانی منـەت و ئازار و لە دەست دیلیی خەم و پەژارە و گومان، ڕزگار دەبیت.

**وشەی سێهەم: "لا شريكَ لَهُ".**

واتە: هەروەك خوای گەورە یەکێکـە و لـە "خوايـەتی"یەکـەیدا هیـچ دژ و نـەيارێکی نییە، بـە هـەمان جـۆر لـە "پەروەردگارێتی" و کاروبارەکـانی و بەدیـهێنانیدا بۆ هـەموو شتێك، خاوێن و بێ هاوبەشە. بە پێچەوانەی پادشایانی سەر زەوی، چونکە هـەندێ جـار ڕێ دەکەوێت کەسێکی پادشا لە "پادشایی"دا تەنیایە و کەس هاوبەشی نییە، کـەچی لـە "کاروبارەکـانی"دا تـەنیا نیـیە و خزمـەتگوزار و کارمـەندەکانی لـە بەجێـهێنان و ڕاپەڕاندنی کاروباردا هاوبەشی ئەون و، دەتوانن نەیـەڵن هـەموان ملکـەچی ئـەو پادشایە بن و، کارێك بکەن خەڵکی لە پێشدا سەر لەوان بدەن و لە ڕێی ئەوانەوە کەسانی تـر بـە پادشا بگەن!

بەڵام خواوەندی حەق، کە پادشای ئەزەل و ئەبەدە، بەو جۆرە نییە. چونکە هـەروەك لە پادشايیيەکەيدا تاك و تەنیا و بێ هاوبەشـە، بـە هـەمان جـۆر لـە پەروەردگارێتیشـیدا

هەرگیز پێویستی بە هاوبەش و یارمەتیدەر نی‌یە بۆ جێ‌بەجێ کردنی کارەکانی. چونکە گەر بە فەرمان و توانا و هێزی ئەو نەبێت، هیچ شتێك کار ناکاتە سەر شتێکی تر. ئەوەتا لەبەر ئەوەی بێ هاوبەش و یاریدەدەرە، ئەوا هەموان دەتوانن، بێ بوونی هیچ هۆکارێك، ڕاستەوخۆ بڕۆنە خزمەتی. ئنجا ئەو کەسەش کە دەڕواتە خزمەتی، هەرگیز پێی ناوترێت: نابێ بڕۆیتە خزمەت خوای گەورەت.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە ئەم وشەیە خەندەی هیوای لەسەر لێوە و، مژدەی کامەرانیی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە و، دەڵێت:

ئەو مرۆڤەی کە "گیان"ی بە نووری "ئیمان" ڕووناك بووەتەوە، لە هەر جێیەك بێت و بۆ هەر شوێنێك بڕوات، دەتوانێت -بە بێ هیچ پەردە و ڕێگرێك- لە بەردەم ئەو خواوەندە جوان و شکۆمەندە توانا و خاوەن کەماڵەدا هەموو پێداویستی‌یەکانی بدرکێنێت و داوای هەموو ئەو شتانەش بکات کە سەرجەمی ئارەزووەکانی ئەوی پێ دڵنیا دەبن. بەم جۆرە، تێکڕای داواکاری و پێویستی‌یەکانی لە بەردەم ئەو میهرەبانی‌یەدا دەردەخات کە خاوەنی گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوانە و، تەنها بە هێزی ڕەهای ئەو پشت دەبەستێت، ئیتر ئەو کاتە دڵی ئەو مرۆڤە لە شادی و کامەرانی و خۆشی پڕ دەبێت.

**وشەی چوارەم:** "لَهُ الملكُ".

واتە: هەموو موڵکێك -بێ جیاوازی- هی ئەوە. تەنانەت تۆیش موڵکی ئەویت! هەروەك بەندەی ئەویت و کرێکارێکیت لە موڵکی ئەودا کار دەکەیت.

ئەم وشەیە، بۆنی هیوای لێ دێت و مژدەیەکی شیفابەخشی لێ دەچۆڕێت و، دەڵێت:

کاکی مرۆڤ! تۆ خۆت بە خاوەنی خۆت مەزانە. نەخێر.. ئەوەتا ناتوانیت کاروبارەکانی خۆیشت بەڕێ بکەیت و لێت بوون بە بارێکی گران و کۆڵێکی وا قورس کە ناتوانیت لە بەڵا و گیروگرفت بیانپارێزیت و پێداویستی‌یەکانی ژیانت ئامادە و مسۆگەر بکەیت. کەواتە بە خۆڕایی ئازار دەرخواردی خۆت مەدە و خۆت مەخەرە باوەشی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی بێ سوودەوە، چونکە موڵك هی تۆ نی‌یە و هی یەکێکی ترە. ئەو خاوەن موڵکەش هەروەك توانایە، میهرەبانیشە. کەواتە پاڵ بە توانستی ئەو میهرەبانە بەتوانایەوە بدە و.. میهرەبانی‌یەکەی تۆمەتبار مەکە و.. تۆخنی شتی لێڵ مەکەوە و.. شتانی ڕوون و خاوێن هەڵبگرە و.. دەست لەو کارە سەخت و

دەردیسەرییانە دابشۆ و.. هەوای ئاسوودەیی و سەرفرازی هەڵبمژە و.. کامەرانی و بەختەوەری دەستی خۆت بخە.

هەروەها – ئەم وشەیە – بە مرۆڤ دەڵێت:

ئەم "بوون"ەی کە لە ناخەوە شەیدای بوویت و دڵی تۆی پێوە بەندە و، تۆ بۆ بەدبەختی و شڵەژاویی ئەو ئازار دەچێژیت و هەست بە دەستەوەسانی و کۆڵەواریی خۆیشت لە چاککردنیدا دەکەیت.. ئەم "بوون"ە، هەر هەمووی موڵکی بەتوانەیەکی میهرەبانە، کەواتە بە خاوەنەکەی خۆیی بسپێرە، ئەو خۆی سەرپەرشتیی دەکات، تۆ بە کامەرانی و خۆشییەکانی ژیان خۆت بەختەوەر بکە و، هەرگیز ئەشکەنجە و گیروگرفتەکانی دنیا ژیانت لێ تاڵ و لێڵ نەکەن. چونکە خواوەند دانا و میهرەبانە، بەپێی دانایی و میهرەبانیی خۆی لە موڵکی خۆیدا کارەکانی ڕایی دەکات.

خۆ ئەگەر هەر کات سەرسامی و سەرسووڕمان تینی بۆ هێنایت، ئەوا تەنها لە پەنجەرەکانەوە بڕوانە و مەیانکەرەوە، بەڵکو تۆش وەك "ئیبراهیم حەققی"ی شاعیر(١) بڵێ:

ئاخۆ چ کارێك بکات ئەو یارە      هەرچی ئەو دەیکات جوانترین کارە

**وشەی پێنجەم: "لَهُ الحَمْدُ".**

واتە: حەمد و سەنا و مەدح و ستایش و منەت، تەنها هی ئەوە و شایانی ئەوە، چونکە هەموو نیعمەت و بەخشایشەکان تەنها لە لایەنی ئەوەوە هاتوون و ڕێژنەی گەنجینە فراوان و هەمیشەیی و لەبننەهاتووەکانی ئەون.

بەم جۆرە، ئەم وشەیە مژدەیەکی جوان و ناسك بە مرۆڤ دەدات و دەڵێت:

کاکی مرۆڤ! ئازاری نەمانی نیعمەت دەرخواردی خۆت مەدە، چونکە گەنجینەکانی میهرەبانی هەرگیز کۆتاییيان پێ نایەت.. لەتاو نەمانی لەزەت هاوار مەکە، چونکە ئەو نیعمەتە تەنها یەك دانە بەری میهرەبانییەکی فراوانە و، مادەم درەختەکە مابێت، بەرەکانیشی یەك لە دوای یەك پێشکەش دەکرێن.

هەروەها بیشزانە کە: لەزەتی نیعمەت خۆی لە خۆیدا چەندەیە، تۆی مرۆڤ دەتوانیت سەد ئەوەندە مەزن و خۆشتری بکەیت، ئەمەش بەوەی کە لەو نیعمەتەدا

---

(١) شاعیر و زانا و گەشتیار و زاهیدێکی مەزن و بەڕێزە و خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی سەر بە شاری ئەرزرۆمە. لە نێوان ساڵەکانی (١٧٠٣-١٧٨٠ز)دا ژیاوە. لای زانایانی سەردەمی خۆی وانەکانی خوێندووە، بە تایبەت لە شارۆچکەی "تیللۆ"ی سەر بە پارێزگەی "سیعرد". بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ناوی: "مەعریفەتنامە"یە. ئارامگاکەی لە شاری "سیعرد"ە. (وەرگێڕ)

ئاوڕدانەوەی "میهرەبانی" ببینێت، کە بەو نیعمەتە ڕێزی لێ ناوێت. بینینی ئەم ئاوڕ لێدانەوەیەش بە شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاریی ئەو میهرەبانی‌یە دەبێت. چونکە هەروەك ئەوەی گەر پادشایەکی مەزن - بۆ نموونە - سێوێکی بە دیاری بۆ ناردیت، ئەوا خودی دیاری ناردنەکە لەزەتێکی وای تێدایە کە گەلێ لە تامی ماددیی سێوەکە زیاترە، ئەویش لەزەتی ئاوڕ لێدانەوە و چاکەکاریی تایبەتیی پادشایە بەرامبەرت. جاهەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، وشەی: "الحمد لله"یش دەرگایەکی فراوانت لە بەردەمدا دەکاتەوە و لەم دەرگایەوە تام و لەزەتێکی بێ گەردی مەعنەوی دێتە ژوورەوە کە هەزار و یەك جار لە تام و چێژی خودی نیعمەتەکە بەتام و لەزەتترە. ئەمەش بە شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاریی خوای گەورە دەست دەکەوێت، بەوەی کە لە ڕێی نیعمەتەوە هەست بە "نیعمەت بەخشین" بکرێت. واتە: بەهۆی بیر کردنەوە لە نیعمەت بەخشین، نیعمەتبەخش بناسرێت. بە واتایەکی تر: بە بیر کردنەوە و بینینی ئاوڕدانەوەی "میهرەبانی" بۆ لات و شەفەقەت و سۆزی بۆت و بەردەوامیی بەخشینی نیعمەتەکانی پێت.

**وشەی شەشەم:** "يُحْيِي".

واتە: هەر تەنها ئەوە کە ژیان دەبەخشێت و، هەر ئەوە کە بە ڕۆزیدان درێژەی پێ دەدات و، هەر ئەویشە کە هەرچی پێداویستی و پایەی ڕاگیرکەری ژیان هەن تێکرا هەموویانی لە ئەستۆی خۆی گرتووە و ئامادەیان دەکات. چونکە هەموو ئامانجە بەرزەکانی ژیان هی ئەون و گشت ئەنجامە گرنگەکانیشی ڕوویان لەوە. کەواتە لە سەدا نەوەدونۆی ئەنجام و بەروبوومەکانی ژیان بۆ ئەو خواوەندە مەزنە دەگەڕێنەوە.

بەم جۆرە، ئەم وشەیە بانگ لەم مرۆڤە کۆڵەوار و فانی‌یە دەکات و، مژدەی دەداتێ و، گیانی هیوای تێدا دەبووژێنێتەوە و پێی‌دەڵێت:

کاکی مرۆڤ! دەروونی خۆت ماندوو مەکە و، کۆڵە قورسەکانی ژیان مەخەرە ئەستۆی لاوازی خۆتەوە و، بە خەم و پەژارەی تەواوبوون و نەمانی ژیان خۆت مەتوێنەرەوە.. هەر کە نەمانی نیعمەتەکانی ژیان و بێ‌نرخیی بەروبوومەکانی دەبینیت، لە تاو هاتنت بۆ ئەم ژیانە، بێزاری و پەشیمانی دەرمەبڕە! بزانە " ژیان"ت کە "بوون"ی تۆی ئاوەدان کردووەتەوە، تەنها هی خواوەندی "حيّ" و "قيّوم"ە. جا چونکە هی ئەوە، هەر ئەویش هەموو پێداویستی‌یەکانی ئەم ژیانەتی لە ئەستۆ گرتووە و هەر ئەویش دابینیان دەکات. ئەم ژیانە، بە هەموو ئامانج و ئەنجامە زۆرەکانیەوە، تێکرا هی ئەو خواوەندەیە،

تۆیش تەنها کرێکارێکی ئاساییت لە کەشتیی "ژیان"دا کار دەکەیت. کەواتە کارەکانت بە باشی ڕاپەڕێنە و، پاداشتەکەی وەربگرە و لەزەتەکەی بچێژە.

ئنجا هەرگیز:

مەودای مەزنیی ئەم ژیانەی کە کەشتیی دەریای "بوون"ە و..

مەودای گەورەیی و مەزنیی سوود و بەروبوومەکانی و..

مەودای دەست ڕەنگینی و فراوانیی میهرەبانیی خاوەنەکەی..

لە یاد مەکە!

بیر لەمانە بکەرەوە و، ئنجا لەناو دەریای دڵخۆشیدا مەلە بکە و، گەشبین بە و، بەرامبەر بە خاوەنەکەت شوکرانەی ئەو نیعمەتانە بەجێبهێنە کە بە تۆی بەخشیون.

هەروەها بزانە کە ئەگەر بە ڕێك و ڕاستی کارەکانی خۆتت ڕاپەڕاند، ئەوا ئاکامەکانی ئەم کەشتیی ژیانە لە پێش هەموو شتێکدا لە لاپەڕەی کردەوەکانی تۆدا تۆمار دەکرێن و، بەمەش ژیانێکی هەمیشەییت پێ دەبەخشرێت و، هەتاهەتایە بۆ خۆت دەژیت و دەمێنیت.

**وشەی حەوتەم:** "وَيُمِيتُ".

واتە: هەر تەنها ئەوە کە مردن دەبەخشێت!

واتە هەر ئەوە کە لە دەست ئەرکی کارمەندیی ژیان دەتحەوێنێتەوە و ئەم جێیەی دنیای فانیت دەگۆڕێت و، ئەرکی خزمەتگوزاریت لە کۆڵ دەکاتەوە و، لە: بەرپرسیاریی فەرمانبەرداری ڕزگارت دەکات، بە واتایەکی تر: لەم ژیانە فانییەوە بۆ ژیانی هەمیشەییت دەبات.

بەم جۆرە، ئەم وشەیە بە دەنگی بەرز و ئاوازی زوڵاڵ مزگێنی بە گوێی جینننی و مرۆڤی فانیدا دەدات و، پێیان دەڵێت:

مژدە بێت! مردن: ئیعدام و.. بێ مەبەستی و.. هەڕەمەکی و.. قڕان و.. کوژانەوە و.. جودایی هەمیشەیی نییە. نەخێر بە هەڵەدا مەچن! مردن: نەمان و.. ڕێکەوت و.. تیاچوونی خۆیی بێ بکەر نییە. بەڵکو مردن: حەوانەوە و.. دەست پێ هەڵگرتنە لە کار لە لایەن خواوەندێکی کارا و دانا و میهرەبانەوە ئەنجام دەدرێت و.. گۆڕینی جێ و ڕێ و پایە و.. پێشخۆدان(سَوْق)ی مرۆڤە بەرەو بەختەوەریی هەمیشەیی کە نیشتمانی ڕاستەقینەیە. واتە: مردن دەرگای بەیەك شادبوونە لەگەڵ جیهانی بەرزەخدا، ئەو جیهانەی کە لە سەدا نەوەدونۆی خۆشەویستانی تێدا کۆبوونەتەوە!

**وشەی هەشتەم:** "وَهُوَ حَيٌّ لا يَمُوت".

واتە: ئەو کەماڵ و، جوانی و، چاکەکارییانەی کە بە ئاشکرا وان بەسەر ڕوخساری بوونەوەرانەوە و هۆی خۆشەویستین، هەموو ئەوانە (بە چەشنێکی بێ سنوور و بە ڕادەیەك وەسف کردنیان لەتواناداا نییە و بە ئەندازەیەك کە لە سەرووی هەموو پلە بەرزەکانەوەیە) لە خاوەنی جوانی و کەماڵ و چاکەکارییەوە دەردەکەون و دەدرەوشێنەوە. چونکە تەنها پرشنگێکی درەوشانەوەی جوانیی ئەو خاوەن جوانییە مەزنە، هەموو خۆشویستراوەکانی دنیا دەهێنێت..

جا ئەم خواوەندە خۆشویستراو و پەرستراوە، خاوەنی ژیانێکی هەمیشەیی و دوور لە هەموو ئاوێتەیەکی نەمان و سێبەرێکی فەنایە و، هیچ ناتەواوییەکی نایەتە ڕێ.

کەواتە ئەم وشەیە، بۆ سەرجەمی جیننی و ئادەمیزاد و تێکڕای کەسانی خاوەن هەست و ژیری و زیرەکی و گشت ئەهلی عیشق و خۆشەویستی، ئەم مزگێنییەی خوارەوە ڕادەگەیەنێت و دەڵێت:

مژدە بێت! وا شنەی هیوا و سروەی خێر و خۆشی هەڵی کرد! چونکە خۆشویستراوێکی ئەزەلی و هەتاهەتایی واتان هەیە تیماری سەرجەمی ئەو زامانەتان دەکات کە لە ئەنجامی پەژارە و جودایی هەمیشەیی و بەسۆی خۆشەویستە دنیاییەکانتانەوە گرفتاریان بوون.. بە مەڵهەمی میهرەبانیی خۆی دەستی شیفابەخشیان بەسەردا دەهێنێت و تیماریان دەکات. چونکە مادەم ئەو هەیە و دەمێنێتەوە و هەمیشەییە، ئەوا ئیتر هەموو شتێك ئاسانە. کەواتە خەم مەخۆن و دڵگران مەبن، ئەوەتا ئەو جوانی و چاکە و کەماڵەی وای لێ کردوون شەیدای ئەو خۆشەویستانەتان ببن، تەنها تریفەیەکی یەك سێبەری لاواز بوو کە لە درزی چەندین پەردەی زۆرەوە لێتان دەرکەوت، ئەو سێبەرەش هی تەنها یەك دەرکەوتن و درەوشانەوەی نێوان درەوشانەوە زۆر و بێ سنوورەکانی "جوانی"ی ئەو خۆشویستراوە هەمیشەییە بوو..

کەواتە نەمان و جودایی ئەوان ئازارتان نەدات، چونکە هەموو ئەوانە لە جۆرە ئاوێنەیەکی وێنەدەرەوە زیاتر هیچی تر نین. خۆ گۆڕینی ئاوێنەکانیش تیشکدانەوە و پرشنگە ڕەنگینەکانی ئەو جوانییە هەردەم نوێ دەکەنەوە و پتر جوانیی پێ دەبەخشن. جا مادەم ئەو هەیە و دەمێنێتەوە، ئەوا هەموو شتێکی تریش هەیە.

**وشەی نۆهەم:** "بیدِهِ الخَیْرُ".

واتە: هەرچی خێرە تەنها بە دەستی ئەوە، هەموو کارە چاکەکانتان لە تۆمارگەی لای ئەو تۆمار دەکرێن و، هەموو کردەوە باشەکانیشتان لای ئەو دەنووسرێن.

ئەم وشەیە، بانگ لە جینی و ئادەمیزاد دەکات و مژدەیان دەداتێ و، هیوا و تاسەیان پێ دەبەخشێت و دەڵێت:

هەژارینە! کاتێ دنیا بەجێدەهێڵن و ڕووەو گۆڕستان دەڕۆن، خەم مەخۆن و مەڵێن: "ئاخ و.. داخ و.. هاوار.. وا هەرچی سامانمان هەیە لە دەستمان چوو.. هەوڵ و تەقالامان بە خۆڕایی ڕۆشت.. لە دنیای فراوانەوە ڕۆشتینە ناو گۆڕی تەنگ و تار"! نەخێر.. وا مەڵێن و نائومێد مەبن. چونکە هەرچییەکتان هەیە لای خوای گەورە پارێزراوە، هەر کردەوەیەکی باشتان بۆ خۆتان پێشخستووە لای ئەو تۆمار کراوە و نووسراوە، هیچ شتێك بە زایە ناڕوات و هیچ هەوڵێکیش لە بیر ناچێت. چونکە ئەو خواوەندە شکۆمەندەی کە "هەموو خێرێکی بە دەستە"، دوای ئەوەی کە لە خانەی کاتیی گۆڕدا داینان، هێندەی پێ ناچێت بۆ لای خۆیتان بانگ دەکات و پاداشتی کردەوە چاکەکانتان دەداتەوە. کەواتە ئێوە گەلێ بەختەوەرن کە کارەکانی خۆتان تەواو کردووە و هیچ ئەرکێکتان لە ئەستۆدا نەماوە و، ڕۆژگارانی ماندوویی و کاری قورستان کۆتایی پێ هات! ئەوەتا ئێستا بۆ وەرگرتنی پاداشت و کرێ و قازانجی کارەکانتان دەڕۆن!

بەڵێ، ئەو خواوەندە شکۆمەندەی پارێزگاریی تۆو و ناوکەکان دەکات، کە: لاپەڕەی کردەوەکان و.. دەفتەری خزمەتگوزاری و.. خانە و ژوورەکانی کار و فرمانەکانی بەهاری پێشوون و لەم بەهارە قەشەنگەدا بە جوانترین کاڵا و لەوپەڕی درەخشانیدا و، بە پیت و بەرەکەتێکی تابڵێی زۆر و لە ڕەنگینترین شێوەدا دەیانخاتە ڕوو.. بێ گومان ئەم خواوەندە بەتوانایە، پاشەڕۆژی ژیان و ئەنجامی کارەکانی ئێوەش دەپارێزێت و، باشترین و زۆرترین پاداشتیشتان دەداتەوە.

**وشەی دەهەم:** "وهوعلی کلِّ شيءٍ قدیر".

واتە: ئەو خوایە تاك و تەنیایە.. توانای هەموو شتێکی هەیە.. هیچ شتێکی پێ گران و هیچ کارێکیشی بەلاوە قورس نییە. بۆ نموونە: بەدیهێنانی بەهارێك وەك بەدیهێنانی یەك تاقە گوڵ و..دروستکردنی بەهەشتیش بە چەشنی دروستکردنی بەهار لای توانستی ئەو ئاسانە. ئەوەتا گشت ئەو بوونەوەرە لەژمارەبەدەرانەی کە هەموو ڕۆژێك.. هەموو

ساڵێك.. هەموو چەرخێك بەدییاندەهێنێت، بە چەندین زمانی لەژمارە بەدەر شایەتی لەسەر توانستی بێ سنووری ئەو دەدەن.

ئەم وشەیە، جگە لەمە، مزگێنیش بە مرۆڤ دەدات و، هیوای پێ دەبەخشێت و دەڵێت:

کاکی مرۆڤ!

کارەکانت کە ڕاتپەڕاندوون و، پەرستشەکانت کە جێبەجێت کردوون، بێ ئەنجام نین و لە دەست دەرناچن. چونکە خانەیەکی پاداشتدانەوەی هەمیشەیی و پلەیەکی بەختەوەریی شادمانت بۆ ئامادە کراوە. ئەوەتا بەهەشتێکی هەتاهەتاییت لە پێشدایە و بە تاسەمەندییەوە چاوەڕوانی گەیشتنیتۆیە تاکو بە دیدارت شاد ببێت. تۆیش لە بەڵێنی ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەت دڵنیابە کە دەیپەرستیت و سوژدەی بۆ دەبەیت. مەحاڵە بەڵێنی خۆی نەباتەسەر. کەواتە پشت بەو بەڵێنەی ببەستە، چونکە توانستی ئەو هیچ لێڵی و ناتەواوییەك ڕووی تێناکات و، کۆڵەواری و لاوازییش ئاوێتەی کارەکانی نابێت. هەروەك باخچەیەکی بچووکی بۆ دروست کردوویت و ژیانیشی بەو باخچەیە بەخشیوە، دەشتوانێت بەهەشتێکی فراوانت بۆ بەدی بهێنێت. بەڵکو لە ڕاستیشدا بۆی بەدیهێناویت و بەڵێنی پێ داویت. خۆ مادەم بەڵێنی داوە، ئەوا دڵنیابە کە بەڵێنەکەی دەباتەسەر و بۆ ئەو بەهەشتەت دەبات.

هەروەها مادەم بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەم خواوەندە خاوەن توانستە ڕەهایە لە هەموو ساڵێکدا پتر لە سێسەد هەزار جۆری ڕووەك و زیندەوەران، بە ڕێکوپێکیی تەواوەتی و، تەرازووی وردی سەرنەکەر و، بەوپەڕی خێرایی و ئاسانی زیندوو دەکاتەوە.. هەر ئەم بەتوانا شکۆمەندە، دەتوانێت بەڵێنەکەی بباتەسەر.

هەروەها مادەم ئەم خوایەی کە دارای توانستی ڕەهایە، لە هەموو ساڵێکدا هەزاران نموونەی حەشر و بەهەشت، بە چەندین شکڵ و شێوەی جیا جیا، بەدیدەهێنێت.. مادەم لە هەموو فەرمانە ئاسمانییەکانیدا مژدە و بەڵێنی بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەیی ڕادەگەیەنێت.. مادەم هەموو کارەکانی تێکڕا حەق و ڕاستی و ڕاست و دروستن.. مادەم گشت ئاسەوارەکانی شایەتن لەسەر ئەوەی کە گشت کەماڵاتەکانی بەڵگەی خاوێنی و دووریی ئەون لە هەموو ناتەواوییەك.. مادەم پەیمان شکاندن و بەڵێنی ساختە و درۆ و دەستخەڕۆ کردن و لەخشتەبردن، چەپەڵترین ڕەفتارن، سەرباری ئەوەی کە بە ناتەواوی دادەنرێن..

مادەم هەموو ئەمانە وان، ئەوا خواوەندی بەتوانا و شکۆمەند و دانا و میهرەبان و خاوەن کەماڵ و جوانی – بە حەتمی – بەڵێنەکەی دەباتەسەر و دەرگای بەختەوەریی هەمیشەیی دەخاتە سەرپشت و، ئێوەی ئیمانداریش دەباتە ناو بەهەشتی نیشتمانی باوکە ئادەمتانەوە، دروودی لەسەر بێت.

**وشەی یازدەهەم:** "وإليه المصير".

واتە: ئەوانەی بۆ مەبەستی بازرگانی و کارئەنجامدان دەنێررێنە دنیا، کە خانەی تاقیکردنەوەیە، پاش ئەوەی کارەکانیان ئەنجام دا و بازرگانییەکانیان تەواو کرد و خزمەتەکانیان کۆتایی پێ هێنا، جارێکی تر بۆ لای بەدیهێنەری شکۆمەندیان دەبرێنەوە و بە خزمەتی خاوەنە سەخاوەتمەندەکەیان – کە بۆ دنیای ناردبوون – شاد دەبنەوە. واتە دوای ئەوەی کە لە ژانی: "هۆکارەکان" و "تاریکیی پەردەکان" ڕزگاریان بوو، بێ هیچ پەردەیەك لە نێوان خواوەند و ئەواندا، تێکڕا لە نشینگەی ڕاستی(مقعد صـــــدق) و لە بەردەم پادشای دەسەڵاتدار و پەروەردگاری خۆیاندا، شاد و شەرەفمەندی ئامادەبوون دەبن.. لەوێ هەریەك لەو ئیماندارانە بە ناسینێکی تەواوەتی و بێ گەرد، بەدیهێنەر و پەروەردگار و گەورە و پادشای خۆی دەناسێت.

کەواتە ئەم وشەیە، هیوا و مژدەیەکی ئەوتۆی لێ دەدرەوشێتەوە کە گەلێ لەو هیوا و مژدە بەلەزەتانەی تر بەرزترن، چونکە دەڵێت:

کاکی مرۆڤ! ئایا دەزانیت تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت و دەبرێیت؟ ئەوەتا لە کۆتایی وتەی سیودووهەمدا وتراوە کە:

ئەگەر مرۆڤ هەزار ساڵ تەمەن بە خۆشگوزەرانی و بەختەوەری بباتەسەر، هێشتا بەرامبەر یەك سەعاتی ژیانی بەهەشت نییە! هەروەها بەسەربردنی هەزار و یەك ساڵی پڕ لە ژیانی خۆشی و کامەرانیی تەواوی ناو ناز و نیعمەتی بەهەشت، هێشتا بەرامبەر یەك سەعاتی خۆشیی بە دیدار شادبوونی خوای گەورەی خاوەنی جوانی نییە!

کەواتە تۆ – ئەی کاکی مرۆڤ! – بۆ مەیدانی میهرەبانیی ئەو دەگەڕێیتەوە و، دەڕۆیتە بەردەم دەرگای دیوانی ئەو خواوەندە جوانەی خۆت. هەرچی ئەو جوانییانەی لە خۆشەویستە مەجازییەکانتدا دەیانبینیت و لەو ڕێیەوە تاسەمەند و شەیدایان بوویت، تەنانەت هەرچی جوانیی ناو بوونەوەرانی دنیا هەن، تەنها جۆرە سێبەرێکی درەوشانەوەی جوانیی خوای گەورە و جوانیی ناوە جوانەکانی ئەون.. بەهەشت، بە هەموو لایەنە ناسك و نیان و جوان و بەلەزەتەکانی و بە گشت حۆری و

كۆشكەكانیەوە، تەنها یەكێكن لە درەوشانەوەكانی میهرەبانیی ئەو.. هەرچی جۆری شەوق و تاسە و خۆشەویستی و ڕاكێشان و بكێشەكان هەن، كە دڵی مرۆڤ بۆ لای "خۆشەویستی" كەمەندكێش دەكەن، تێكڕا پرشنگێكن لە خۆشویستنی خواوەندی پەرستراوی هەمیشەیی و خۆشەویستی ڕاگیركەری گەردوون. جا ئێوە بۆ ناو بازنەی ڕێزلێنانی شادبوونەوەتان بەو خواوەندەو، پلەی مەزنی ئامادەبوونتان لە حوزووری ئەودا، دەڕۆن و كۆچ دەكەن! كەواتە ئێوە بۆ: "خانەی میوانداریی هەمیشەیی ئەو.. بۆ بەهەشتی بەرینی هەتاهەتایی" بانگێشت كراون.

دەسا ئێوەش كاتێ كە دەڕۆنە ناو گۆڕەكانتان، خەم مەخۆن و مەگرین! بەڵكو بە مزگێنیی خێر و خۆشیی بزانن و، بە ڕووی گەشی دەم بەخەندەو دڵی شادەوە پێشوازیی لێ بكەن!

هەروەها ئەم وشەیە، لەم ئەركەی سەرشانی - كە بەخشینی نوور و هیوا و مژدەدانە - بەردەوامە و دەڵێت:

كاكی مرۆڤ! وا گومان نەبەیت كە تۆ بەرەو: نەمان و، نەبوون و، گاڵتەجاڕی و، تاریكی و، لەبیرچوون و، هەڵوەشان و، شكان و، داڕزان و، نوقمبوون لەناو زۆریدا، دەڕۆیت.. نەخێر! وا گومان مەبە.. بەڵكو تۆ بۆ "مانەوە" دەڕۆیت نەك نەمان.. بەرەو "بوون" دەبرێیت نەك نەبوون.. ڕوەو جیهانی "ڕووناكی" هەنگاو دەنێیت نەك تاریكی.. بۆ لای خاوەنی ڕاستەقینەی خۆت و بەرەو بارەگای پادشای بوون و گەردوون دەگەڕێیتەوە.. ئنجا لەوێ دەحەسێیتەوە و لە مەیدانی "تەوحید"دا دڵت دەكرێتەوە و شادمان دەبیت، نەك ئەوەی لەناو زۆریدا نوقم ببیت. كەواتە تۆ - بەم گەشتەت - بەرەو "مانەوە" و "بەیەكگەیشتنەوە"یەك دەڕۆیت كە هەرگیز دووری و لێك جیابوونەوەی بەدوادا نایەت!

* * *

# مەقامی دووهەم

## پوختە ئاماژەیەكە بۆ چەسپاندنی " تەوحید" لە ڕووی ئیسمی ئەعزەمەوە

**وشەی یەكەم:** (لا إله إلاّ الله).

ئەم وشەیە "تەوحیدی ئولووهییەت" و "تەوحیدی مەعبوودییەت"ی لەخۆ گرتووە. وا بە بەڵگەیەكی بەهێز ئاماژەیان بۆ دەكەین:

بەسەر ڕووی ئەم جیهانەوە، بە تایبەت لەسەر لاپەڕەی گۆی زەوی، كارایی(فعالیة)یەك دەبینرێت كە لەوپەڕی ڕێكوپێكیدایە و.. بەدیهێنەرێتییەك بەرچاو دەكەوێت كە لەوپەڕی داناییدایە و.. فەتتاحییەتێكی ئەوتۆش بە "عین الیقین" دەبینین كە ئەوپەڕی ڕێسای پێوە دیارە (واتە هەر شتە و چ شێوەیەكی لەگەڵدا دەگونجێ، پێی دەدرێت و ئەو وێنە و شكڵەشی پێ دەپۆشرێت كە بۆی بشێت) و.. ئنجا بەخشندەیی و چاكەكارییەكی ئەوتۆشمان پێشچاو دەكەوێت كە لەوپەڕی شەفەقەت و كەرەم و میهرەبانیدایە..

جا ئەم بارودۆخانە، بە زەروورەت و بەڵگەنەویستی: "پێویستیی بوون"ی پەروەردگارێكی: شكۆمەندی، كارای، بەدیهێنەری، فەتتاحی، بەخشندە، دەچەسپێنن. تەنانەت كارێك دەكەن كە مرۆڤ هەست بە "یەكتایی"یەكەشی بكات.

بەڵێ، نەمانی بەردەوامی بوونەوەران و نوێبوونەوەی یەك لە دوای یەكیان، دەری دەخات كە: ئەو بوونەوەرانە درەوشانەوەی ناوەكانی بەدیهێنەرێكی بەتوانا و، چەند سێبەرێكی ناوە جوانەكانی و، ئاسەواری كارەكانی و نەخشونیگاری قەڵەمی قەدەری و، لاپەڕەكانی توانستی و، ئاوێنەكانی جوانیی كەماڵی ئەون.

پەروەردگاری سەرانسەری جیهانەكان، لە ڕێی سەرجەمی ئەو كتێب و صوحوفە خاوێنانەوە كە بۆ گرۆی مرۆڤی ناردوون، ئەم حەقیقەتە تەواو مەزن و پلە یەكجار بەرزەی "تەوحید" ڕوون دەكاتەوە.. هەروەك سەرجەمی زانا لێكۆڵەر و مرۆڤە كامڵەكان، لە ڕێی لێكۆڵینەوەی زانستی و كەشفەكانیانەوە، هەمان پلەی تەوحید دەچەسپێنن.. هەروەها گەردوونیش لەگەڵ هەژاری و دەستەوسانیی خۆیشیدا، لە ڕێی موعجیزاتی سنعەت و كارە دەراساكانی توانست و گەنجینەكانی سەروەت و سامانی ناویەوە، ئاماژە بۆ هەمان پلەی "تەوحید" دەكات.

بەو واتایەی کە خوای گەورەی بینەری ئەزەلی لە ڕێی هەموو کتێب و صوحوفەکانیەوە و، ئەهلی شهوودیش بە هەموو لێکۆڵینەوە و کەشفەکانیانەوە و، جیهانی بینراو(عالم الشهادة)یش بە سەرجەمی کاروبارە پڕ لە دانست و بارودۆخە ڕێکوپێکەکانی.. هەموویان بە یەکدەنگی، قسەیان لەسەر ئەو پلەیەی "تەوحید" یەکانگیر بووە.

جا هەر کەسێك کە ئەو تاك و تەنیایە بە خواوەند و پەرستراوی خۆی قبووڵ نەکات، دەبێ - خوا پەنامان بدات - ژمارەیەکی نەبڕاوەی خوای درۆینە قبووڵ بکات! یان بە وێنەی سۆفستائییە نەفامەکان[1] ئینکاریی خۆی و سەرجەمی بوونەوەرانیش بکات!

**وشەی دووهەم:** (وحده).

ئەم وشەیە پلەیەکی ئاشکرا و ڕاشکاوی "تەوحید" ڕوون دەکاتەوە. وا بەمەی خوارەوە ئاماژە بۆ بەڵگەیەکی یەکجار بەهێز دەکەین کە بە تەواوەتی ئەم پلەیە دەچەسپێنێت:

ئێمە هەر کاتێ کە سەیری بوونەوەران دەکەین و چاویان بە ناودا دەگێڕین، یەکەم شتێك کە سەرنجمان ڕادەکێشێت: "ڕێسا"یەکی گشتیی کامڵ و "تەرازوو"یەکی وردی هەمەلایەنگیرە. چونکە هەموو شتێك لە ڕێسایەکی ورددایە و بە تەرازوویەکی یەکجار هەستیاریش کێشراوە و بە وردییش حسابی بۆ کراوە و لێکدراوەتەوە.

خۆ ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین: "ڕێکخستن" و "کێشانە کردن"ێك دەبینین کە هەمیشە نوێ دەبنەوە. واتە سەرنج دەدەین کە یەکێکی تاك و تەنیا هەیە ئەو ڕێسایە بە

---

(١) سۆفستائییەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نییە. "گۆرگیاس" و "بڕۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائییەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـ، "كشاف إصطلاحات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهند عام ١٨٦٢م، "الموسوعة الفلسفية الميسرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نهضة لبنان - بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

ڕێكوپێكی ده‌گۆڕێت و به‌ ئه‌ندازه‌یه‌كی دیاری كراویش ئه‌و ته‌رازووه‌ نوێ ده‌كاته‌وه‌. به‌م جۆره‌ هه‌موو شتێك ده‌بێت به‌ نموونه‌(مۆدێل)ێكی ئه‌وتۆ كه‌ گه‌لێ وێنه‌ و شێوه‌ی كێشانه‌كراوی ڕێكوپێكی ده‌كرێته‌به‌ر.

ئه‌گه‌ر وردتر بڕوانین، هه‌ست ده‌كه‌ین كه‌ "دادگه‌ری" و "دانست"ێك له‌ ژێر ئه‌و ڕێكخستن و كێشانه‌یه‌دا هه‌یه‌ كه‌ ته‌نانه‌ت هیچ جموجوولێك نی‌یه‌ "سوود" و "حه‌ق" و "به‌رژه‌وه‌ندی" و "دانست"ی تێدا نه‌بێت.

گه‌ر زیاتریش ورد بینه‌وه‌، دیارده‌كانی: "توانست"ێك سه‌رنجی هه‌ستمان ڕاده‌كێشێت، كه‌ له‌ ناوه‌ندی كاراییه‌كی له‌وپه‌ڕی داناییدایه‌ و دره‌وشانه‌وه‌ی "زانست"ێكیش كه‌ ده‌وراندووری هه‌موو شتێكی داوه‌، ته‌نانه‌ت هه‌موو كاروبارێكیشی گرتووه‌ته‌وه‌.

به‌و واتایه‌ی كه‌ ئه‌م ڕێسا و ته‌رازووه‌ی له‌ سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌راندا هه‌ن، ڕێكخستن و كێشانه‌كردنێكی گشتی و هه‌مه‌لایه‌ن بۆ هه‌موو بوونه‌وه‌رێك ده‌رده‌خه‌ن.. ئنجا ئه‌و ڕێكخستن و كێشانه‌كردنه‌ش: حیكمه‌ت و دادگه‌ریی هه‌مه‌لایه‌نه‌ و گشتگیر ئاشكرا ده‌كه‌ن.. ئه‌و حیكمه‌ت و چاودێری‌یه‌ش: توانست و زانستمان ده‌خه‌نه‌ پێش‌چاو. واته‌ خوایه‌كی به‌توانا به‌سه‌ر هه‌موو شتێكدا و زانا به‌ هه‌موو شتێك، له‌ پشت ئه‌و په‌ردانه‌وه‌، پیشانی ژیریی مرۆڤ ده‌ده‌ن.

پاشان كه‌ سه‌یری سه‌ره‌تا و كۆتایی هه‌ر شتێك ده‌كه‌ین، به‌ تایبه‌ت زینده‌وه‌ران، ده‌بینین سه‌ره‌تا و بنه‌چه‌ و ڕه‌گه‌كانیان، به‌ هه‌مان جۆر: به‌ر و ئه‌نجامه‌كانیشیان، له‌سه‌ر ته‌رز و شێوه‌یه‌ك دانراون كه‌ ده‌ڵێی ئه‌و ناوك و بنجانه‌ چه‌ند به‌رنامه‌ و پێڕست و پێناساندنێكن سه‌رجه‌م ئامێر و كۆئه‌ندامه‌كانی ئه‌و بوونه‌وه‌ره‌یان له‌خۆ گرتووه‌ و له‌ ئه‌نجام و به‌ری ئه‌و بوونه‌وه‌ره‌دا كۆبوونه‌ته‌وه‌ كه‌ واتای ئه‌و زینده‌وه‌ره‌ی تێدا ڕۆ كراوه‌ و مێژووی ژیانی خۆی له‌ودا سپاردووه‌. ده‌ڵێی ناوكی ئه‌سڵی ئه‌و زینده‌وه‌ره‌، تۆمارێكی بچووكه‌ بۆ ده‌ستووره‌كانی به‌دیهێنانی. به‌ڵام به‌روبوومه‌كانی له‌ حوكمی پێڕستێكدان بۆ فه‌رمانه‌كانی به‌دیهێنانی.

پاشان كه‌ سه‌یری ڕووی ده‌ره‌وه‌ و ناوه‌وه‌ی ئه‌و زینده‌وه‌ره‌ ده‌كه‌ین، كاربه‌ڕێكردنی توانستێك ده‌بینین كه‌ له‌وپه‌ڕی دانستدایه‌ و نه‌خشه‌كێشان و ڕێكخستنی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی‌یه‌كمان پێش‌چاو ده‌كه‌وێت كه‌ له‌وپه‌ڕی ده‌ست ڕۆیشتندایه‌. واته‌ هێز و

توانستێكی ئەوتۆ لە گۆڕێدایە كە ئەو شتە بەدی دەهێنن و فەرمان و ویستێكیش زاڵە كە ئەو شێوە و وێنەیەی بەبەر دەپۆشن.

بەم جۆرە، هەتا لە سەرەتای هەر بوونەوەرێك وردبینەوە، بەڵگەی "زانست"ی زانایەك دەبینین و.. هەتا بە وردی سەیری كۆتاییەكەشی بكەین، بەرنامەكانی بەدیهێنەرێكمان بەرچاو دەكەوێت و.. هەتا سەرنجی ڕواڵەتەكەشی بدەین، پۆشاكێكی ناوازەی لەوپەڕی وردەكاریدا دەبینین كە بكەرێكی خاوەن ویست و ئیختیار بەبەری ئەو شتەی پۆشیوە و.. هەتا سەیری ناوەوەی ئەو شتەش بكەین، ئامێر و كۆئەندامێكی لەوپەڕی ڕێكوپێكیمان بەرچاو دەكەوێت كە بەدیهێنەرێكی بەتوانا دایمەزراندووە.

جا ئەم بارودۆخانە، بە جۆرێكی ئاشكرا و بەڵگەنەویست، ئەوە ڕادەگەیەنن كە:

هەرگیز ناگونجێ شتێك یان كارێك یان شوێنێك هەبێت لە دەستی كردگاری شكۆمەندی تاك و تەنیادا نەبێت و لە كارسازی و كاربەڕێكردنی ئەو بەدەر بێت. بەڵكو هەموو شتێك و هەموو كاروبارێكی ئەو شتەش، لە دەستی بەتوانایەكی خاوەن ویست و ئیرادەدا بەڕێ دەخرێت و، بە لوتف و بەزەیی میهرەبانێكی بەخشندە جوان دەكرێت و ڕێكدەخرێت و، بە سۆز و بەزەیی خوایەكی سۆزیار و مەننانیش دەڕازێنرێتەوە و ئارایشت دەدرێت.

بەڵێ، ئەم ڕێسا و ڕێكخستن و كێشانە و تەرازووەی كە لە سەرجەمی بوونەوەرانی ئەم گەردوونەدا بەدی دەكرێت، بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر خوایەكی تاك و تەنیای خاوەن توانست و ویست و زانست و دانست، هەروەك پلەیەكی یەكجار مەزنی "وەحدانییەت"یش پیشانی ئەو كەسە دەدەن كە خاوەنی هەست و شعوور و بینین بێت.

بەڵێ، هەر شتێك كە بەدی دەهێنرێت، "یەكبوون"(وحدة)ی تێدایە. ئەم یەكبوونەش بەڵگەیە لەسەر ئەو خواوەندە تاك و تەنیایە. بۆ نموونە: "خۆر" كە چرای ئەم دنیایەیە، هەر یەك خۆرە. بەو واتایەی كە خاوەنی دنیا یەك كەسە. هەروەها بۆ نموونە: "هەوا" و "ئاگر" و "ئاو" كە خزمەتگوزاری زیندەوەرانی ناو ئەم زەوییەن، هەر یەكێكن. بەو واتایەی كە ئەو كەسەی هەموو ئەو شتانە دەكات بە خزمەتگوزاری ئێمە و ملكەچ و گوێڕایەڵیان دەكات بۆمان، هەر یەكێكە!

**وشەی سێهەم:** (لا شريك له).

لە هەڵوێستی یەكەمی وتەی سی و دووهەمدا، بە چەشنێكی ڕوون و ئاشكرا، ئەم وشەیە چەسپێنراوە. بۆیە خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی لێكدانەوەكەی ئەوێ دەكەین. چونكە

هیچ ڕوونكردنەوەیەك نییە لە سەرووی ڕوونكردنەوەكەی ئەویٚ بیٚت. كەواتە ئەوە سەروزیادە و پیٚویست بە ڕوونكردنەوەی تر ناكات.

**وشەی چوارەم:** (له الملك).

واتە: ئاسمانەكان و زەوی و دنیا و ئاخیرەت و هەموو بوونەوەریٚك، هەر لە فەرشەوە تا عەرش و لە زەوییەوە بۆ ئەستیٚرەكان و لە گەردیلەوە بۆ هەسارەكان و لە ئەزەلیشەوە تا ئەبەد، هەر هەموویان مولٚكی ئەون. كەواتە پلەی هەرە بەرزی مولٚكداری، كە مەزنترین پلەی تەوحیدی تیٚدا دەردەكەویٚت، هی خوای گەورەیە.

لە كاتیٚكی ناسك و بە چەند دەستەواژەیەكی عەرەبی، ختوورەیەكی ناسكۆلە خرایە دلٚی منی كۆلەوارەوە. وا لیٚرەدا وەكو خۆی تۆماری دەكەم و، بە ویٚنەی بەلٚگەیەكی مەزن بۆ ئەم پلە یەكجار مەزنەی مولٚكداری و مەقامە گەورەیەی تەوحید، دەیخەمە ڕوو:

(له الملك، لأن ذاك العالَم الكبير كهذا العالم الصغير، مصنوعُ قدرته، مكتوبُ قدَره.. ابداعُه لذاك صيّره مسجداً، ايجادُه لهذا صيّره ساجداً.. انشاؤه لذاك صيّر ذاك مُلكاً، ايجادُه لهذا صيّره مملوكاً..صنعتُه في ذاك تظاهرت كتاباً، صبغتُه في هذا تزاهرت خطاباً.. قدرته في ذاك تُظهر حشمته، رحمته في هذا تنظّمُ نعمته..حشمته في ذاك تشهد: هو الواحد، نعمتُه في هذا تعلن: هو الاحد.. سكته في ذاك في الكل والاجزاء، خاتمُه في هذا في الجسم والاعضاء).

بڕگەی یەكەم: "ذاك العالم الكبير... إلخ".

جیهانی مەزن، واتە سەرانسەری گەردوون.. هەروەها مرۆڤیش كە جیهانی بچووك و نموونەی بچووككراوەی گەردوون و جیهانە، هەردووكیان پیٚكەوە ، ئەو بەلٚگانەی "یەكتایی خواوەند" دەردەخەن كە بە قەلەمی قەدەر و قودرەت لەسەر ئاسۆ و دەروونەكاندا نووسراون.

بەلٚیٚ، نموونەیەكی بچووكی ئەو سنعەتە ورد و ڕیٚكوپیٚكەی "گەردوون" لە "مرۆڤ"دا هەیە. جا هەروەك ئەو سنعەتە لەو بازنە گەورەیەدا شایەتی لەسەر "تاكی"ی ئەو كردگار و سنعەتكارە دەدات، سنعەتە وردە مایكرۆسكۆبییەكانی ناو مرۆڤیش ئاماژە بۆ ئەو كردگارە سنعەتكارە دەكەن و دەبن بە بەلٚگە لەسەر "تەنیایی"یەكەی.. ئنجا هەروەك ئەم "مرۆڤ"ە نووسراویٚكی پەروەردگاریی پڕ لە واتای قوولٚ و پارچە هۆنراوەیەكی "قەدەری"ی خواوەندە، "بوونەوەران"یش بە هەمان جۆر پارچە

هۆنراوەیەکی "قەدەری"ن کە بە هەمان قەڵەم و بە پێوەرێکی گەورەتر نووسراوە و هۆنراوەتەوە. جا ئایا دەگونجێ کەسێکی تری جگە لە خوای تاك و تەنیا دەست لەو سکە و مۆری تەوحیدە وەربدات کە بە نیشانە جوداکەرەوەکان لە ڕوخساری مرۆڤ دراوە و ڕووی لە ژمارەیەکی بێ سنووری گرۆی مرۆڤە؟ یان خۆی لەو مۆری یەکتاییەدا هەڵبقورتێنێت کە لە "بوونەوەران" دراوە و سەرجەم بەدیهاتووانی ناوی کردووە بە هاوکار و شان بە شانی یەکتر؟

بڕگەی دووهەم: "إبداعه لذاك... إلخ".

کردگاری دانا بە داهێنانێکی ناوازە جیهانی مەزنی بەدی هێناوە و ئایەت و نیشانەکانی گەورەیی خۆیشی لەسەر نەخشاندووە، بە چەشنێك کە گەردوونی خستووەتە شێوەی "مزگەوت"ێکی مەزنەوە و.. ئەم مرۆڤەشی لە جوانترین شکڵ و شێوەدا دروست کردووە و ژیریی پێ بەخشیوە، بە چەشنێك کە وای لێ کردووە "سوژدە"ی سەرسووڕمان لە بەردەم موعجیزاتی سنعەت و ناوازەیی توانستی کردگاردا ببات و، ئایەتەکانی گەورەیی خۆیشی بەم مرۆڤە خوێندووەتەوە، تەنانەت لە ڕێی ئەو بەندایەتی و ملکەچییەی کە لە سروشتی ئەودا دایناوە، کردوویەتی بە "بەندەیەکی سوژدەبەر" لەو "مزگەوتە گەورە"یەدا! جا ئایا دەگونجێ جگە لە کردگاری تاك و تەنیا کەسێکی تر "پەرستراوی ڕاستەقینە"ی بەندە سوژدەبەرەکانی ناو ئەم مزگەوتە گەورەیەی بێت؟!

بڕگەی سێهەم: "إنشاؤه لذاك... إلخ".

خاوەن موڵکی شکۆمەند، جیهانی مەزنی، بە تایبەت ڕووی زەویی، بە وێنەی چەند بازنەیەکی لەژمارەبەدەری هاوچەق دروست کردووە. هەریەك لەو بازنانەش بە وێنەی کێڵگەیەك وایە کە هەموو شتانی تێدا دەچێنرێت و پاشان دروێنە دەکرێنەوە و داهاتەکانی بەدەست دەهێنرێن. بەم جۆرە و بە هەمیشە و بەردەوامی موڵکەکەی خۆی دەخاتە کار و، هەڵسوکەوت لە کاروبارەکانیشیدا دەکات، بە ڕادەیەك کە گەورەترینی ئەو بازنانەی - کە بازنەی گەردیلەکانی گەردوونە - کردووە بە کێڵگەیەکی فراوان و شتانی تێدا دەچێنێت و پاشان بە دەستی توانست و دانستی خۆیشی داهاتی بە ئەندازەی گەردوونی لێ بەدەست دەهێنێت و لە جیهانی بینراوی شەهادەوە دەیاننێرێت بۆ جیهانی پەنهانی غەیب و لە بازنەی توانستەوە بەرەو بازنەی زانست ڕەوانەیان دەکات.

هەروەها خوای گەورە ئەم ڕووی زەوی‌یەشی - کە بازنەیەکی مامناوەندی‌یە - بە هەمان جۆر وەك کێڵگەیەك لێ کردووە. بە چەشنێك کە هەموو وەرزێك بە بەردەوامی چەندین جیهان و جۆری جیاجیا و جیاوازی تێدا دەچێنێت و پاشان دروێنەیان دەکات و، لە هەموو وەرزێکدا چەندین داهاتی مەعنەوی‌یان لێ بەدەست دەهێنێت و، ئەمانەش بۆ جیهانە غەیبی و قیامەتی و میسالی و مەعنەوی‌یەکان دەنێرێت.

پاشان خوای گەورە چەندین جار، بگرە هەزار جاریش، بازنەیەکی بچووکی وەك بێستانێکی ڕووی زەوی بە توانستی خۆی پڕ دەکات، پاشان بە دانستەکەشی خاڵی و بەتاڵی دەکاتەوە. پاشان خوای گەورە لە زیندەوەرێکی وەك درەخت و مرۆڤدا - کە بازنەیەکی بچووکترە - سەد و یەك ئەوەندەی خۆیان داهات دەچنێتەوە.

بەو واتایەی کە ئەو خاوەن موڵکە شکۆمەندە، هەموو شتێکی جوزئی و کوللی و گەورە و بچووکی بە وێنەی "مۆدێل"ێکی ئەوتۆ دروست کردووە کە سەدان سنعەتی چنراوی خۆی لەبەر دەکات، لەوانەی کە بە سەدان شێوەی نەخش و نیگاری نوێ و یەك لە دوای یەك ڕازاندوونیەتەوە و نەخشاندوونی. بەمەش درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی موعجیزاتی توانستی خۆی دەردەخات. هەروەك هەموو شتێکی ناو موڵکی خۆیشی وەکو لاپەڕەیەك دروست کردووە کە بە سەدان شێوە و ڕوو، نووسینە ڕەوانەکانی خۆی تێدا دەنووسێت و، بەمەش ئایەتە حەکیمەکانی دەردەخات، تاکو بەدیهاتووە خاوەن هەست و شعوورەکانی بیانخوێننەوە.

پاشان هەروەك خواوەند ئەم جیهانە مەزنەی بەدی هێناوە و کردوویەتی بە موڵکی خۆی، ئەم مرۆڤەشی بەدی هێناوە و کردوویەتی بە بەندە(مملوك)ی خۆی. ئنجا هێندەش ئەندام و کۆئەندام و هەست و نەستی، بە تایبەت: "دەروونی بەدخواز و هەوا و ئارەزوو و حەز و پێویستی و هەڵپە و داواکاری"یشی داوەتێ کە لەو موڵکە فراوانەدا ببێت بە بەندەیەکی موحتاج بۆ هەموو شتانی ناو ئەو موڵکەی خواوەند.. جا ئایا دەگونجێ کەسێکی تر دەست لەو "موڵك"ە وەربدات و گەورەی ئەو "بەندە"یەش بێت جگە لەو خاوەن موڵکەی کە سەرجەمی بوونەوەرانی هەر لە جیهانی گەردیلەکانەوە - کە جیهانێکی یەکجار فراوانە - تا دەگاتە باڵی مێش، کردووە بە موڵك و کێڵگەی خۆی و، ئەو مرۆڤە بچووکەشی بە: "سەرپەرشتیکار" و "پشکنیار" و "جووتیار" و "بازرگان" و "دەلاڵ" و "پەرستشکار" و "بەندە" و "میوانی ئازیزی

خۆشەویست"ی خۆی لەناو ئەو موڵکە فراوانەدا داناوە و گوفتارەکانیشی ئاراستە کردووە؟

بڕگەی چوارەم: "صنعته في ذاك... إلخ".

سنعەتی کردگاری مەزن لە جیهانی گەورەدا هێندە واتای زۆری لەخۆ گرتووە کە ئەو سنعەتە لە شێوەی کتێبێکی ناوازەدا دەربخەن. ئەمەش هانی ژیریی مرۆڤی داوە کە ئیلهامی حیکمەتی زانستە ڕاستەقینەکانی لێ وەربگرێت و کتێبخانەکەشی بەو پێیە بنووسێت. جا ئەو کتێبە ناوازە و سەرانسەر دانستە پەیوەندییەکی گەلێ مەحکەم و توندوتۆڵی بە "حەقیقەت"ەوە هەیە و، بە ڕادەیەکی ئەوتۆش لە "حەقیقەت" وەرگیراوە و سەرچاوەی گرتووە کە لە شێوەی قورئانی حەکیمی بەرجەستە و بینراودا پێش‌چاو خراوە، کە ئەویش نوسخەیەکە لە "کیتابی موبین".

جا هەروەك سنعەتی خواوەند لە سەرانسەری گەردووندا - لەبەر کەماڵی ڕێکوپێکییەکەی - شێوەی "کتێبێك"ی ڕەوانی لەخۆ گرت، نەخشونیگاری دانستی ئەو خواوەندەش لە مرۆڤدا دەمی بە گوڵی "گوفتار"ێك پشکووت. واتە: هێندە واتا و ناوەرۆکی ورد و جوان لەو سنعەتە ناوازەیەدا هەیە کە زمانی ئامێرەکانی ئەو مەکینە زیندووەی خستووەتە قسە و گوفتار و، ئەو نەخش و جێ دەستە پەروەردگارییەش، کە مرۆڤی پێ نەخشێنراوە، مرۆڤی خستووەتە جوانترین شێوە(أحسن تقويم)ی ئەوتۆ کە دەمی بە گوڵی قسە و گوفتار پشکووتووە، کە گوڵێکی زیندووی مەعنەوی و غەیبییە لەو سەرە ماددییە وشك و ڕەقەدا. بەم شێوەیە، خوای گەورە توانای قسەکردن و گوفتار و دەربڕینی بە "سەر"ی ئەم مرۆڤە بەخشیوە، بە ڕادەیەك کە کۆئەندامە بەرز و مەعنەوییەکانی مرۆڤ گەلێ پلەی زۆر و زەبەندەی ئەویان دەرخست و شایستەیی ئەوەیان بۆ ڕەخساند کە گوفتاری پادشای مەزن و ئەزەلیی ئاراستە بکرێت، کە بەمەش بەرزی و بڵندییەکی تایبەتیی بەدەست هێنا.

واتە: ئەو جێ‌دەستە پەروەردگارییەی کە لە سروشتی مرۆڤدایە، گوڵی گوفتاری خواوەندی پشکووتاندووە.

جا ئایا دەگونجێ کەسێکی تری جگە لە خوای گەورەی تاك و تەنیا خۆی لە سنعەتی ئەم بوونەوەرانەدا هەڵبقورتێنێت کە هێندە وردەکاری و ڕێکوپێکییان تێدایە کە دەڵێی کتێبێکی بەرجەستەن؟ یان ئایا دەگونجێ کەسێکی تری غەیری ئەو، دەست لەو

جێدەستە خوایییەی ناو سروشتی مرۆڤ وەربدات کە گەیاندوویەتیە پلەوپایەی: ئاراستە بۆکردنی گوفتاری خواوەند؟ نەخێر.. نەخێر.

برِگەی پێنجەم: "قدرته في ذاك... إلخ".

توانستی خوای گەورە لە جیهانی مەزندا: "مەزنیی پەروەردگاریّتی" دەردەخات، بەڵام میهرەبانیی پەروەردگار لە مرۆڤدا - کە جیهانی بچووکە - نیعمەتەکانی خواوەند ڕێکدەخات. واتە: توانستی کردگار - لە ڕووی مەزنی و شکۆمەندییەوە - سەرانسەری ئەم جیهانەی وەك کۆشکێکی مەزن بەدی هێناوە و، "خۆر"یشی تێدا کردووە بە گڵۆپێکی تیشكبەخش و، مانگ و ئەستێرەکانیشی کردووە بە چەندەها چرا و، ڕووی زەویشی لە شێوەی سفرەیەکی خواردن و کێڵگەیەکی جوان و باخێکی ڕەنگیندا بەدی هێناوە و، چیاکانیشی کردووە بە گەنجینە و مێخی ڕاگیرکردنی زەوی و قەڵای گەورە گەورە.. بەم جۆرە، هەموو شتێکی - بە پێوەرێکی گەورە - کردووە بە پێداویستی و کەلوپەلی ئەو کۆشکە مەزنە، ئنجا هەروەك لە ڕووی "مەزنی" و "شکۆمەندی"یەوە گەورەیی "پەروەردگاری"یەکەی خۆی دەرخست، لە ڕووی "جوانی"یەکەشیەوە هەموو جۆرە جیاجیاکانی نیعمەتەکەشی بە هەموو زیندەوەرێك تەنانەت بچووکترینیشیان بەخشی و بە ڕێکوپێکی لەواندا ڕیزی کردن و دەری خستن. بەم جۆرە، سەرجەمی بوونەوەرانی بە نیعمەتەکانی خۆی ڕازاندووەتەوە و بە لوتف و کەرەمیش ئارایشتی داون. ئەم کارەش هانی ئەم زمانە بچووکانەی مرۆڤی دا - کە بە باسی جوانیی ئەو میهرەبانییە کەوتوونەتە گۆ - لە بەرامبەر ئەو زمانە گەورە و مەزنانەوە ڕابووەستن، کە لە شکۆمەندیی مەزنیی خواوەند دەدوێن. واتە: کاتێ قەبارە گەورەکانی وەك خۆر و عەرش بە زمانی "مەزنی" دەڵێن: "یا جلیل.. یا کبیر.. یـــا عظیـــم" زمانی "میهرەبانی"ش لە: مێشوولە و ماسی و زیندەوەرە بچووکەکاندا بە: "یـــا جمیـــل.. یـــا رحیم.. یا کـــریم" بەرامبەریان دەوەستن و بەمەش چەند ئاوازێکی پێکەوە گونجاوی دەست لە ملان لە سیمفۆنیای مۆسیقایەکی یەکجار گەورەدا پێکدەهێنن کە پتر شیرینی و لەزەتیان پێ زیاد دەبێت.

جا ئایا دەگونجێ کەسێکی تری جگە لەو "شکۆمەندە خاوەن جوانی" و "جوانە خاوەن شکۆمەندی"یە - لە ڕووی دروستکردن و بەدیهێنانەوە - دەست بخاتە ناو ئەم جیهانە گەورە و بچووکانەوە؟ نەخێر.. نەخێر.

برِگەی شەشەم: "حشمته في ذاك... إلخ".

"مەزنیی پەروەردگاریتی" كە بە ئاشكرا بە سەرتاسەری گەردوونەوە دیارە، "تاكی"ی خوای گەورە دەچەسپێنێت و دەبێت بە بەڵگە لەسەری.. هەروەك ئەو نیعمەتە پەروەردگارییەش كە بەپێی یاسایەكی ورد، رِزق و رِۆزی تەنانەت بە زیندەوەرە جوزئییەكانیش دەدات، دەبێت بە بەڵگە و "تەنیایی" خواوەند دەچەسپێنێت.

هەرچی "تاكی"(الوحدة)یە ئەوە دەگەیەنێت كە: سەرجەمی ئەو بوونەوەرانە موڵكی یەك كردگارن و رِوویان لەو كردگارە تاكەیە و هەموویان بەدیهێنراوی یەك بەدیهێنەرن.

هەرچی "تەنیایی"(الأحدية)یشە ئەوە دەگەیەنێت كە: زۆربەی ناوەكانی "بەدیهێنەری هەموو شتێك" لە هەموو شتێكدا دەردەكەون و دەدرەوشێنەوە.

بۆ نموونە: رِووناكیی خۆر، بەو سیفەتەی كە دەورانـدەوری هەموو رِووی زەویی داوە، نموونەیەكە "تاكی" رِوون دەكاتەوە.. ئامادەبوونی رِووناكی و گەرمیی خۆر و حەوت رِەنگەكانی و سێبەرێك لە سێبەرەكانی لە هەموو تەنۆلكەیەكی رِوون و گشت دلۆپە ئاوێكدا، نموونەیەكە بۆ رِوونكردنەوەی "تەنیایی". جا هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا وایە، بە هەمان جۆر: دەركەوتن و درەوشانەوەی زۆربەی ناوەكانی ئەو كردگارە لە هەموو شتێكدا، بە تایبەت لە هەموو زیندەوەرێكدا، بە تایبەتیتر لە هەموو مرۆڤێكدا، نموونەیەكی "تاكی"ی خواوەند رِوون دەكاتەوە..

هەروەها ئەم برِگەیە ئاماژە بۆ مەزنیی ئەو پەروەردگارێتییە دەكات كە كاروباری ئەم جیهانە هەڵدەسوورِێنێت و، ئەو "خۆر"ە گەورەیەشی كردووە بە گڵۆپێكی رِووناكی بەخش و خزمەتگوزار بۆ زیندەوەرانی زەوی.. هەروەك گۆی زل و زەبەلاحی "زەوی"شی خستووەتە شێوەی لانك و خانە و لانە و جێی بازرگانی بۆ زیندەوەران و.. "ئاگر"یشی لە هەموو شوێنێكدا كردووە بە كولێنەری خواردەمەنی و هاورِێیەكی ئامادە و گوێرِایەڵ بۆ ئەنجامدانی كار.. هەروەك "هەور"ەكانیشی كردووە بە پاڵێوەری هەوا و شیردەری زیندەوەران و.. "چیا"كانیشی لە شێوەی گەنجینە و عەمباردا بەدی هێناوە و.. "هەوا"یشی كردووە بە فێنككەرەوە و حەوێنەری دەروونەكان و "ئاو"یشی كردووە بە مایەی ژیان و چەشنی دایك بۆ زیندەوەرە نوێكان..

جا ئەم پەروەردگارێتییە خواییە، بەوپەرِی رِوونی: "تاكی"ی خوای گەورە دەردەخات.

بەڵێ، ئایا جگە لەو بەدیهێنەرە تاکە کێ هەیە کە "خۆر" دەکات بە ملکەچی سەرنشینانی زەوی؟ کێیە جگە لەو تاك و تەنیایە کە "هەوا" دەگرێت و لە چەندین کارمەندیی مەزن و لە سەرانسەری گۆی زەوی‌دا دەیخاتە کار؟ کێ هەیە جگە لەو تاك و تەنیایە کە بتوانێت بۆ کوڵاندنی خواردەمەنیی زیندەوەران "ئاگر" بەکاربهێنێت و وای لێ بکات کە شتانی بە هەزاران جار لە خۆی گەورەتر قووت بدات؟..

بەم جۆرە هەرچی شت و هەرچی توخم و هەرچی قەبارەی ناو ئاسمان هەن، لە ڕووی ئەو پەروەردگاریتی‌یە بەسام و شکۆیەوە، دەبن بە بەڵگە لەسەر خواوەندی تاك و شکۆمەند.

ئنجا هەروەك لە ڕووی شکۆمەندی و مەزنی‌یەوە: "تاکی" دەردەکەوێت، چاکە و نیعمەتیش لە ڕووی جوانی و میهرەبانی‌یەوە: "تەنیایی" خواوەند ڕادەگەیەنن. چونکە هەموو یەکێ لە زیندەوەران، بە تایبەت مرۆڤ، لە ڕووی ئەو سنعەتە هەمەلایەنە وردەی تیایاندا ئەنجام دراوە، هێندە ئەندام و ئامێری هەیە کە جۆرە لە ژمارە نەهاتووەکانی گشت نیعمەتەکانیان پێ بناسێت و وەریانبگرێت و داوایان بکات، بە ڕادەیەك کە مرۆڤ - بە وێنەی سەرتاسەری گەردوون - بەهرەمەندی تیادەرکەوتنی ناوە جوانەکانی خوای گەورە بووە. دەڵێی مرۆڤ بووە بە تیشکۆیەك کە "بە یەك جار" گشت ناوە جوانەکانی خواوەندی لە ئاوێنەی ماهییەتی خۆی‌دا دەرخستووە و، بەمەش "تەنیایی" خواوەندی ڕاگەیاندووە!

بڕگەی حەوتەم: "سکته في ذاك... إلخ".

واتە: هەروەك کردگاری مەزن سکەیەکی گەورە و نیشانەیەکی مەزنی لەسەر "جیهانی مەزن" نەخشاندووە، بە هەمان جۆر سکە و مۆر و نیشانەی "یەکتایی" لەسەر هەموو بەشێکی گەردوون و گشت جۆرێك لە جۆرەکانیشی داوە.. هەروەك مۆری "یەکتایی" لە ڕووی مرۆڤ و جەستەشی داوە، کە جیهانی بچووکە، هەمان مۆری لە هەموو ئەندامەکانیشی داوە.

بەڵێ، ئەو خاوەن توانستە شکۆمەندە: نیشانەیەکی ڕوونی "تەوحید"ی لەسەر هەموو شتێکی کوللی و جوزئی داناوە، ئەوەتا ئەستێرەکان و گەردیلەکانی لەسەر ئەمە گرتووە بە شایەت و.. مۆری "یەکتایی"شی لە هەموو شتێك داوە، تاکو ببێت بە بەڵگە لەسەری.

جا لەبەر ئەوەی ئەم حەقیقەتە مەزنە لە وتەی: بیست و دووهەم و، وتەی سی و دووهەم و، مەکتووبی سی و سیٚهەمدا بە جۆرێکی گومانبڕ چەسپێنراوە، ئەوا لێرەدا کۆتایی بە باسەکە دەهێنین و خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەو شوێنانە دەکەین.

**وشەی پێنجەم:** (له الحمد).

واتە: هەرچی "کەماڵات" لە سەرجەمی بوونەوەراندا هەن و هۆی مەدح و سەنا و ستایشن، هەر هەموویان تایبەتن تەنها بە خوای گەورەوە. لەبەر ئەمە، حەمد و سەنایش هەر تەنها بۆ ئەوە. کەواتە هەرچی مەدح و سەنا کراوە و دەکرێت لە ئەزەلەوە تا ئەبەد لە هەر شتێکەوە بۆ هەر شتێك، تایبەتە تەنها بەو خواوەندەوە. چونکە هەرچی کەماڵ و جوانی هەن کە هۆی مەدح و سەنان و هەر شتێك کە مایەی مەدح و ستایشە، تەنها هی خوایە و تایبەتە بە خۆیەوە.

بەڵێ، وەك لە ئاماژەکانی قورئانەوە دەردەکەوێت، هەرچی: بەندایەتی و تەسبیح و سوژدە و دوعا و حەمد و سەنای سەرانسەری بوونەوەران هەیە، هەر هەموویان بە بەردەوامی بۆ ئەو حوزوورە موقەددەسە بەرز دەبنەوە.

وا ئاماژە بۆ بەڵگەیەکی مەزن دەکەین کە ئەم ڕاستییە تەوحیدییە دەچەسپێنێت:

کاتێ کە سەیری ئەم جیهانە دەکەین، وەك بێستانێکی هێندە مەزن دێتە بەرچاومان کە بنمیچەکەی بە ئەستێرەکان نەخشابێت و زەوییەکەشی بە چەندین بوونەوەری جوان و ڕەنگین ڕازابێتەوە. هەریەك لەم قەبارە بەرز و نوورانی و ڕێکوپێکانە و یەك بە یەکی ئەم بوونەوەرە ڕازاوە پڕ لە حیکمەتانەی "زەوی"ش لەم بێستانە مەزنەدا، بە زمانی تایبەتیی خۆیان، چ یەك بە یەك و چ هەمووشیان پێکەوە، دەڵێن:

(ئێمە موعجیزەی توانستی بەتوانایەکی شکۆمەندین و، شایەتی لەسەر یەکتایی بەدیهێنەرێکی دانا و کردگارێکی توانا دەدەین).

هەر لەم باخ و بێستانەی جیهاندا کە سەیری زەوی دەکەین، دەبینین وەك باخچەیەك وایە کە سەدان هەزار چەشن ڕووەکی ڕەنگاوڕەنگ و شکڵ و شێوەی جوان و سەدان هەزار زیندەوەرانی جۆراوجۆری تێدا بڵاوکراوەتەوە. جا هەموو ئەو ڕووەکە ڕەنگین و زیندەوەرە ڕازاوانەی ناو باخچەی زەوی، لە ڕێی شکڵ و شێوە ڕێکوپێك و هەڵسەنگاوەکانیانەوە، ڕایدەگەیەنن کە:

(ئێمە موعجیزات و کاری دەراسای کردگارێکی تاك و داناین و، بەڵگە و شایەتین لەسەر یەکتاییەکەی).

هه‌روه‌ها كه‌ له‌م باخچه‌ دڵگیره‌دا سه‌یری چڵه‌پۆپه‌ی دره‌خته‌كان ده‌كه‌ین، ده‌بینین: به‌وپه‌ڕی زانست و دانست و كه‌ره‌م و ناسكی و جوانی، گوڵ و به‌روبوومه‌كانیان به‌دی هێنراون. كه‌واته‌ گشت ئه‌و به‌روبووم و گوڵه‌ جوانانه‌، به‌ شكڵ و شێوه‌ و ڕه‌نگه‌ جۆراوجۆره‌كانیان، به‌ یه‌ك زمان ڕایده‌گه‌یه‌نن و ده‌ڵێن:

(ئێمه‌ موعجیزاتی دیاری و خه‌ڵاتی به‌خشنده‌یه‌كی خاوه‌ن جوانی و، كاری ده‌راسای به‌خششی میهره‌بانێكی خاوه‌ن كه‌مالین).

كه‌واته‌ هه‌موو قه‌باره‌ و بوونه‌وه‌رانی ناو باخ و بێستانی جیهان و سه‌رجه‌م ڕووه‌ك و زینده‌وه‌رانی ناو باخچه‌ی زه‌وی و گشت گوڵ و به‌روبوومه‌كانی سه‌ر چڵی دره‌خته‌كان، به‌ ده‌نگێكی به‌رز ڕایده‌گه‌یه‌نن كه‌:

(به‌دیهێنه‌ر و وێنه‌كێشمان، كه‌ پێشكه‌شی كردین به‌ ئێوه‌: كه‌سێكی توانا و خاوه‌نی جوانی و كه‌ره‌م و دانسته‌ و، توانای هه‌موو شتێكی هه‌یه‌ و، هیچ شتێكی به‌لاوه‌ قورس و گران نی‌یه‌، هه‌روه‌ك هیچ شتێكیش له‌ بازنه‌ی توانستی ئه‌و ده‌رناچێت. چونكه‌ ئه‌ستێره‌كان و گه‌ردیله‌كان سه‌باره‌ت به‌ توانستی ئه‌و یه‌كسانن و، "هه‌مه‌كی"ش به‌ وێنه‌ی "هه‌نده‌كی" به‌ لایه‌وه‌ ئاسانه‌ و "جُزء"یش به‌ وێنه‌ی "كُلّ" به‌لایه‌وه‌ به‌نرخه‌ و، گه‌وره‌ترین شت به‌ وێنه‌ی بچووكترینی، بۆ ئه‌و ئاسانه‌ و شتانی بچووك وه‌ك شتی گه‌وره‌ به‌ ورده‌كاری دروست كراون و، ته‌نانه‌ت له‌وانه‌یه‌ بچووكه‌كه‌ ورده‌كاریی ناوازه‌ی گه‌لێ زیاتری له‌چاو گه‌وره‌كه‌دا تێدا بێت. ئه‌وه‌تا هه‌موو ڕووداوه‌كانی ڕابوردوو(وقوعات) كه‌ بریتین له‌ شتانی سه‌رسووڕهێنی توانستی ئه‌و، شایه‌تی ده‌ده‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌و خاوه‌ن توانسته‌ ڕه‌هایه‌ ده‌توانێت شتانی سه‌رسووڕهێنی داهاتوو(ئیمكانات)یش بهێنێته‌دی كه‌ له‌ ئاینده‌دا ڕوو ده‌ده‌ن. چونكه‌ هه‌روه‌ك ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ "دوێنێ"ی هێنایه‌ كایه‌وه‌، ده‌توانێت "سبه‌ینێ"ش بهێنێته‌ گۆڕێ.. به‌ هه‌مان جۆر ئه‌و توانایه‌ی كه‌ "ڕابوردوو"ی دروست كرد ده‌توانێت "ئاینده‌"ش به‌ هه‌مان جۆر دروست بكات.. ئه‌و كردگاره‌ دانایه‌ی كه‌ "ئه‌مدنیا"ی به‌دی هێنا، ده‌توانێت "ئه‌ودنیا"ش به‌دی بهێنێت).

به‌ڵێ، هه‌روه‌ك په‌رستراوی حه‌ق و ڕاسته‌قینه‌ هه‌ر ته‌نها ئه‌و خاوه‌ن توانسته‌ شكۆمه‌نده‌یه‌، هه‌ر ئه‌ویشه‌ كه‌ سوپاسكراوی حه‌ق و ڕه‌وایه‌.. هه‌روه‌ك په‌رستن ته‌نها تایبه‌ته‌ به‌و، حه‌مد و سه‌نایش هه‌ر تایبه‌تن به‌ خۆیه‌وه‌.

جا ئایا ده‌گونجێ ئه‌و كردگاره‌ دانایه‌ی كه‌ ئاسمانه‌كان و زه‌ویی به‌دی هێناوه‌، واز له‌م مرۆڤه‌ بهێنێت كه‌ وه‌ك مه‌زنترین ئه‌نجامی ئاسمان و زه‌وی و كامڵترین به‌روبوومی جیهان

بەدیی هێناوە؟ یان ئایا دەگونجێ دەست لەم مرۆڤە هەڵبگرێت و بە دەستی "هۆکار" و "ڕێکەوت"ەکانی بسپێرێت و، بەم کارەش حیکمەتە ڕوون و ئاشکراکەی خۆی هەڵبگێڕێتەوە و بیکات بە کاری بێهوودە و گاڵتەجاڕی؟ نەخێر.. نەخێر.

ئایا دەچێتە عەقڵەوە ئەو دانا و زانایەی کە چاودێریی "درەخت" دەکات و بە وردی کاروبارەکانی بۆ دەسازێنێت و بەوپەڕی داناییش پێیدەگەیەنێت، "بەروبوومەکان"ی ئەو درەختە، کە ئامانج و سوودی درەختەکەن، پشتگوێ بخات و بایەخیان پێ نەدات تا بەم لا و بەو لادا هەڵبوەرن و لە دەستی گاڵتەجاڕی و بێهوودەیی و کەسانی دزدا دەستاودەستیان پێ بکرێت و لەناوبچن؟! بێگومان ئەم چەشنە گوێ پێنەدانە کارێکی مەحاڵە، چونکە وەك ئاشکرایە ئامانجی بایەخدان بە درەخت تەنها بەروبوومەکانیەتی.

خۆ کامڵترین بەروبوومەکانی درەختی ئەم جیهانە و، ئەنجامی خاوەن هەست و شعوور و، ئامانجی بایەخ پێدانی: تەنها هەر ئەم مرۆڤەیە. جا ئایا دەگونجێ کردگاری دانای ئەم جیهانە، حەمد و پەرستش و شوکرانە و خۆشەویستیی ئەم مرۆڤە، کە بەری بەروبوومە خاوەن هەست و شعوورەکانە، بە کەسێکی تری غەیری خۆی بدات و بەم جۆرەش دانستە ڕوون و درەخشانەکەی بە زایە بدات و دایبەزێنێتە پلەی عەدەم؟ یان توانستە ڕەهاکەی هەڵبگێڕێتەوە و بیکات بە "دەستەوسانی"؟ یان زانستە گشتگیرەکەی بگۆڕێت بە نەزانی؟ نەخێر.. هەزار هەزار جار نەخێر.

ئایا دەگونجێ شوکرانە و پەرستشی پێشکەشکراوی ئەو خاوەن هەست و شعوورانەی کە خولگەی ئامانجە خواییەکانن لە بنیاتنانی کۆشکی گەردووندا بە تایبەت هی مرۆڤ کە باشترینیانە، لە بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی دەستیان کەوتووە، بە کەسێکی تری جگە لە بنیاتنەری کۆشکی گەردوون بگات؟ یان ئەو کردگارە شکۆمەندە بوار بدات شوکر و پەرستشەکان - کە ئامانجی هەموو ئامانجەکانن - بە کەسێکی تری غەیری خۆی پێشکەش بکرێت؟

ئایا دەگونجێ ئەو کەسەی کە بە جۆرەکانی نیعمەتە لە ژمارە نەهاتووەکانی، خۆی لای خاوەن هەستان خۆشەویست دەکات و، بە موعجیزاتی بێ سنووری سنعەتەکانیشی خۆی بەوان دەناسێنێت.. پاشان بایەخ بە شوکر و پەرستش و حەمد و خۆشەویستی و ناسین و ڕەزامەندیی ئەوان نەدات و وازیان لێ بهێنێت بۆ "سروشت" و "هۆکارەکان"؟ بەم کارەش ڕووەو ئینکاری کردنی "دانستە ڕەها"کەی پاڵیان پێوە بنێت و، لە شان و

شكۆی "دەستەڵاتی پەروەردگاریتی"یەکەی دابگرێت و بیهێنێتە خوارەوە بۆ پلەی عەدەم؟ نەخێر.. سەد هەزار جار نەخێر.

ئایا دەگونجێ کەسێك کە لە بەرپاکردنی بەهار و دروستکردنی سەرجەمی بەروبوومەکان و بەدیهێنانی "سێو"دا - کە لە هەموو شوێنێکی زەویدا نیشانەکانیان هەر یەکێکە - دەستەوسان بێت، لە حەمد و ستایشی بەندەکاندا ببێت بە هاوبەشی ئەو سوپاسکراوە ڕەهایە و بچێت سێوێك دروست بکات و وەك نیعمەتێك پێشکەشی یەکێکی بکات و شوکر و سوپاسی ئەوی پێ بەدەست بهێنێت؟ نەخێر.. نەخێر. چونکە ئەو کەسەی کە تەنها یەك دانە سێو بەدی دەهێنێت هەر ئەوە کە بەدیهێنەری هەموو بەرێکی سێوە لە سەرانسەری دنیادا. ئەوەتا سکە و نیشانە و مۆری هەموویان هەر یەکێکە. پاشان ئەو کەسەی کە سێوی لە سەرتاسەری جیهاندا بەدی هێناوە، هەر ئەو دەغڵ و دان و بەروبوومەکانیشی بەدی هێناوە کە خولگەی ڕزق و ڕۆزین. بەو واتایەی کە ئەو کەسەی بچووکترین نیعمەتی جوزئی بە بچووکترین زیندەوەری جوزئی دەبەخشێت، هەر ئەو بەدیهێنەرە ڕۆزیدەر و شکۆمەندەی جیهانە. کەواتە حەمد و شوکر تەنها تایبەتن بەو بەدیهێنەرەو، حەقیقەتی جیهانیش هەمیشە بە زمانی حەق دەڵێت:

"له الحمد من كلّ أحد من الأزل إلى الأبد".

**وشەی شەشەم: (يُحْيي).**

واتە: تەنها هەر ئەوە کە "ژیان" دەبەخشێت، کەواتە هەر ئەویشە کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە. چونکە "ژیان" گیان و ڕووناکی و هەوێن و ئەنجام و پوختەی گەردوونە. کەواتە ئەو کەسەی "ژیان"ی بەخشیوە هەر ئەویش بەدیهێنەری سەرجەمی گەردوونە و.. هەر ئەویش ژیانبەخش و.. زیندووی ڕاگیرکەری گەردوونە.

وا بەم جۆرەی خوارەوە ئاماژە بۆ بەڵگەیەکی مەزنی ئەم پلەیەی تەوحید دەکەین:

لە سەرتاسەری زەویدا چەندین خێوەت دەبینین کە سوپای زۆر و زەبەندەی زیندەوەران هەڵیانداوە و، دەشبینین کە سوپایەکی نوێی نێوان سوپا لەژمارە نەهاتووەکانی خواوەندی زیندووی ڕاگیرکەری گەردوون(الحي القيوم) هەموو بەهارێك لە جیهانی غەیبەوە دێت و چەك و کەرەسە سەربازییەکانی وەردەگرێت.

لەم کاتەدا کە ئێمە سەرنج لەم سوپا گەورەیە دەدەین، دەبینین تاقمی ڕووەکەکان، کە دوو سەد هەزار جۆر زیاتر دەبن و، نەتەوەی زیندەوەرانیش کە لە سەد هەزار جۆری جیاجیا تێپەڕ دەبن، هەموو جۆر و نەتەوە و تاقم و دەستەیەکیان: پۆشاکی تایبەتیی خۆیان

دەپۆشن و، ڕۆزیی جیاوازیان هەیە و، مەشق و ڕاهێنانی تایبەتی دەكرێن و، هەریەكەشیان بە چەشنێكی تایبەتی مۆڵەت وەردەگرن و چەك و تەقەمەنیی گونجاوی خۆیانیان دراوەتێ و، ماوەی خزمەتی سەربازیشیان دەستنیشان كراوە.. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم جیاوازی و لەیەكنەچوونەشدا، پێشەوایەكی یەكجار مەزن بە: توانست و دانستی ڕەها و زانست و ویستی بێ سنوور و میهرەبانیی فراوان و گەنجینە و عەمباری لەبن نەهاتووی خۆی، پێداویستیی هەموویان دابین دەكات و تەنانەت یەك دانە سەربازیش لەیاد ناكات، بەڵكو هەموو یەكێك لەو تاقم و نەتەوانەی كە لە سێ سەد هەزار تێپەڕ دەبن، ڕزق و ڕۆزیی جیاواز و جل و بەرگی جۆراوجۆر و چەكی لەیەك نەچوویان لە كاتی پێویستدا بۆ ڕەوانە دەكرێت و مەشق و ڕاهێنانی جۆراوجۆر دەكرێن و لە چەند كاتێكی جیاجیادا دەستیان لە كارەكانیان پێ هەڵدەگیرێت. ئەمانەش هەموویان بەوپەڕی ڕێكوپێكی و تەرازووی تەواوەتی و لە كاتی گونجاودا ئەنجام دەدرێن و، گشت چاوێكی بینەر و دڵێكی خاوەن بینایی بە "عین الیقین" دەیانبینێت. هەروەك لە وتەیەكی تردا چەسپاندوومانە.

جا ئایا دەگونجێ كەسێك هەبێت خۆی لەم ناوەندەدا هەڵبقورتێنێت و بەشێكی لەم ژیاندن و بەڕێوەبردن و پەروەردەكردنەدا ببێت جگە لەو كەسەی كە خاوەنی زانستێكی ئەوتۆیە دەورەندەوری هەموو پێداویستی و تایبەتمەندییەكانی ئەو سوپایەی داوە و، خاوەنی توانستێكی ڕەهای وەهایشە كە كاروبارەكانی ئەو سوپایە و سەرجەم پێداویستییەكانی بەڕێوە دەبات؟ ئایا كەس هەیە غەیری ئەو؟ نەخێر. هەزار جار نەخێر..

چونكە ئاشكرایە كە ئەگەر تیپێكی سەربازی تەنها دە نەتەوەی جۆراوجۆری تێدا بێت، ئەوا پڕچەككردنی هەر یەكە لەو سەربازانە بە پێداویستی و تەقەمەنیی جیاواز، دە هێندەی پڕچەككردنی سەرجەمی تیپەكە، بە هەمان جۆری تەقەمەنی، كارێكی سەخت و دژوار دەبێت. بۆیە مرۆڤی دەستەوسان و كۆڵەوار، پەنا دەباتە بەر ئەوەی كە یەك جۆر پۆشاك و تەقەمەنییان بۆ دابین بكات. كەچی خواوەندی "زیندووی ڕاگیركەری گەردوون" ئەم سوپا مەزنەی، كە تاقم و نەتەوەكانیان لە سێسەد هەزار تێپەڕ دەكەن، بە پێداویستیی جیاجیا و بەوپەڕی ئاسانی و بێ ماندووبوون و بە ڕێكوپێكییەكی تەواوەتی و بەوپەڕی دانایی پڕچەك و پۆشراو و تێر و پڕ دەكات، بە ڕادەیەك كە یەك بە یەكی كەسانی ئەو سوپایە وا لێ دەكات بە زمانی حاڵ بڵێت: "هـــو الـــذي يحيـــي"!

تەنانەت وا لەو كومەڵە مەزنە دەكات كە لە مزگەوتی گەورەی گەردووندا ئەم ئایەتە بخوێننەوە:

**﴿الله لا إله إلاّ هوَ الحيُّ القيّوم لا تَأخُذهُ سِنةٌ ولا نومٌ لهُ ما في السّموات وما في الأرضِ مَن ذا الذي يَشفَعُ عندهُ إلاّ بإذنِهِ يَعلمُ ما بينَ أيديهم وما خَلفَهُم ولا يُحيطونَ بشَيءٍ من علمهِ إلاّ بما شاءَ وسِعَ كُرسيُّهُ السّموات والأرضَ ولا يَؤودُهُ حفظُهُما وهو العَليُّ العظيم﴾** (البقرة:٢٥٥).

وشەی حەوتەم: (ويُميتُ).

واتە: هەروەك ژیانی بەخشی، مردنیش دەبەخشێت. كەواتە هەر ئەوە ژیان وەردەگرێتەوە و مردن دەبەخشێت.

بەڵێ، مردن: ڕووخاندن و كوژانەوە نی یە تا بدرێتە پاڵ "هۆكارەكان" و بخرێتە ئەستۆی "سروشت"ەوە! بەڵكو مردن هەرچەند لە ڕواڵەتدا بە: هەڵوەشانەوە و كوژانەوە دەردەكەوێت، بەڵام لە ڕاستیدا سەرەتا و پێشەكیی ژیانێكی نەبراوە و هەمیشەیی مرۆڤە و ناوێكە لەو ژیانە نراوە. بە وێنەی "تۆو" كە لە ژێر خاكدا دەپووكێتەوە و بە ڕواڵەت دەمرێت، كەچی لە ڕاستیدا ژیانی "جوزئی"ی تۆوی بەجێ‌هێشتووە و بەرەو ژیانی "كوللی"ی گوڵەگەنم ڕۆشتووە.

كەواتە ئەو خاوەن توانستە ڕەهایەی كە ژیان دەبەخشێت و بەڕێوەی دەبات، بێ هیچ گومانێك، هەر ئەوە كە مردنیش بەدی دەهێنێت.

لە پەنجەرەی بیست و چوارەمی مەكتووبی سی و سێ‌هەمدا ڕوونمان كردووەتەوە كە:

ئەم بوونەوەر و بەدیهاتووانە – بەپێی ویستی خوای گەورە – وەك لافاو بە خوڕ دێن و دەڕۆن و.. بە فەرمانی پەروەردگاریش شێوەیەكی گەڕۆكیان لەخۆ گرتووە و، بە ئیزن و ڕوخسەتی خواوەند، بە هەمیشە و بەردەوامی خوڕ دەبنەوە و دەڕژێنە ناو ڕووباری "زەمان"ەوە و، لە جیهانی پەنهانی "غەیب"ەوە ڕەوانە دەكرێن و، لە جیهانی بینراوی "شەهادە"دا "بوون"ی ڕواڵەتی‌یان لەبەر دەكرێت. پاشان بە ڕێكوپێكی دادەبەزنە ناو جیهانی غەیبەوە.. بەم جۆرە و هەمیشە، بە فەرمانی خواوەند، لە "داهاتوو"ەوە دێن و، بەسەر كاتی "ئێستا"دا تێ‌دەپەڕن و پشوویەكی تێدا دەدەن و، ئنجا ڕۆ دەبنە ناو "ڕابوردوو"!

جا خورڕبوونـەوەی ئەم بەدیهاتووانـە لـە بازنـەی چاکـە و میـهرەبانی‌دا، بـە شێوازێك ئـەنجام دەدرێـت کـە لەوپـەڕی داناییدایـە و.. تێپەڕبوونیشیان بـەناو بازنـەی دانسـت و ڕێکوپێکـیدا، بەوپـەڕی زانـایی بـەڕێ دەکرێــت و.. گوزەرکردنیشـیان بـەناو بازنـەی شەفەقەت و تەرازوودا، بە میهرەبانی‌یەکی فراوان جێبەجێ دەبێت.

بەم جۆرە، ئەم بەدیهاتووانە لە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی دەڕۆن و، سـنگ و بـەرۆکیان بـە مەدالیای چەندەها دانایی و بەرژەوەندی و ئامانجی مەزن دەڕازێنرێتەوە.

بەو واتایەی کە توانایەکی شکۆمەند و دانایەکی خاوەن کەماڵ هەیـە کـە هەمیشـە بـە توانستی خۆی ژیان دەبەخشێت و، دەستە و تاقمەکانی بوونەوەران و جوزئییـاتی هـەموو دەستە و تاقمێك و، ئەو جیهانانەش کە لەو دەستە و تاقمانە پێکدێن، دەخاتە سەر کـار و، پاشـان بـەپێی دانستەکەشـی لەسـەر کـار لایـان دەبـات و مردنیـان پـێ دەردەخـات و بـۆ جیـهانی غـەیبیان دەنێرێت. واتـە لـە جیـهانی "توانسـت"ەوە دەیانگوێزێتـەوە بـۆ جیـهانی "زانست".

جـا ئـەو کەسـەی کـە نـەتوانێت سەرانسـەری گـەردوون بـەڕێوەببات و.. حوکـم و فەرمانی لـە هەموو کـات و زەمانـەکاندا جێبەجێ نـەکرێت و.. توانستیشـی ئـەوەندە بڕ نەکات کە وەك "ژیان و مردن" بە یـەك دانـە دەبەخشـێت، بـە سـەرجەمی جیهانەکانیشـی ببەخشێت و.. نەتوانێت بە وێنەی یەك دانە گوڵ، ژیان بە بەهاریش بدات و لەسەر ڕووی زەویدا دایبنێت و پاشان بە "مردن" لێی بکاتەوە.. ئەو کەسەی کە توانای ئـەم کارانـەی نەبێت، هەرگیزاو هەرگیز توانای بەسەر مردن و ژیاندا ناشکێت!

واتە: مردنی هەر زیندەوەرێك - با زۆر جوزئییش بێـت - دەبێ، وەك ژیانەکـەی، بـە یاسای پەروەردگارێکی شکۆمەند بەڕێ بکرێـت، کـە سـەرجەمی ڕاستی‌یەکانی ژیـان و جۆرەکانی مردنی لە دەستدایە و، دەبێ بە ئیزن و هێز و زانستی خۆی بە ڕێیان بخات.

**وشەی هەشتەم:** (وهو حيٌّ لا يموت).

واتە ژیانی ئـەو: بـەردەوام و ئـەزەلی و ئەبەدی‌یە، هـەرگیز مـردن و فـەنا و تیـاچوون و نەمانی نایەتە ڕێ. چونکە ژیانی ئەو زاتی‌یە و دووچاری نەمان نابێت.

بەڵێ، "ئـەزەلی" - بێ گـومان - "ئەبـەدی"یشـە و.. "قـەدیم"، بـە هەمـان جـۆر، "باقی"یشە و.. ئەو کەسەی "واجب الوجود"ە - بێ گومان - "سەرمەدی"یشە.

بەڵێ، "ژیان"ێك بوونی "واجب الوجـود" ناونیشـانی بێـت.. هـەرگیز فـەنا و نـەمانی تووش نابێت..

"ژیان"ێك كە بە درەوشانەوەی ئەو: سەرجەمی جۆرەكانی ژیان سەرهەڵبدەن و، گشت حەقیقەتە جێگیر و چەسپاوەكانی بوونەوەرانیش پاڵیان پێوە دابێت، تەنانەت ڕاگیربوونیان هەر تەنها بەو بێت.. هەرگیز دووچاری فەنا و تیاچوون نابێت.

بەڵێ، "ژیان"ێك كە بریسكانەوەیەكی تەنها یەك درەوشانەوەی ئەو: یەكبوونێك بەو شتە زۆر و زەبەندانە ببەخشێت كە گرفتاری فەنا و نەمان دەبن و لەم ڕێیەوە مانەوەیان پێ ببەخشێت و لە پەرتەوازەیی ڕزگاریان بكات و "بوون"یان بپارێزێت و بیانكات بە مایەی تیادەركەوتنی جۆرێك لەجۆرەكانی "مانەوە"، (واتە: "یەكبوون"ێك بە زۆری ببەخشێت و لەم ڕێیەوە بیهێڵێتەوە، بە چەشنێك كە ئەگەر ئەم یەكبوونەی لەسەر هەڵبگیرێت، ئەوا شتان پەرتەوازە بن و تیابچن).. بێ گومان تیاچوون و نەمان هەرگیز توخنی ئەم ژیانە واجبە ناكەون كە ئەم هەموو بریسكانەوەیەی "ژیان" یەكێكن لە درەوشانەوەكانی!

شایەتی گومانبڕ لەسەر ئەم ڕاستی‌یە: نەمان و تیاچوونی ئەم بوونەوەرانەیە. واتە هەروەك ئەم بوونەوەرانە لە ڕێی جۆرەكانی "بوون"ی خۆیان و چەشنەكانی ژیانیان، بەڵگە و شایەتن لەسەر "ژیان"ی ئەو خواوەندە زیندووەی كە هەرگیز نامرێت و، لەسەر "پێویستیی بوون"ی ئەو ژیانەی[1].. جۆرەكانی مردنیان و چەشنەكانی نەمانیشیان – بە هەمان جۆر – دەبن بە شایەت و بەڵگە لەسەر "مانەوە" و "هەمیشەیی"ی ئەو ژیانە! چونكە دوای نەمانی بوونەوەران یەكسەر هاووێنەكانیان بە دوایاندا دێن و وەك ئەوان ژیان بەدەست دەهێنن و دەچنە جێگایان. كە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی: خاوەن ژیانێكی هەمیشەیی و بەردەوام هەیە و، هەر ئەویشە كە بەردەوام درەوشانەوەی "ژیان" نوێ دەكاتەوە. چونكە هەروەك بڵق و كەفی ئاوەكانی سەر ڕووبارەكان لە بەرامبەر خۆرەوە دەبریسكێنەوە و، بەم جۆرە دەستە بەدەستە و تاقم لە دوای تاقم دێن و دەبریسكێنەوە و پاشان دەكوژێنەوە و دەڕۆن بە ڕێی خۆیانەوە.. بەڵێ، هەروەك ئەم

(١) كاتێ كە حەزرەتی ئیبراهیم – دروودی لەسەر بێت – لە دەمی گفتوگۆكەی لەگەڵ نەمروددا لە بەڵگەی "مراندن و ژیاندن"ەوە گواستیەوە بۆ "هەڵهاتنی خۆر لە لایەن خواوەند لە خۆرهەڵاتەوە" و دەرخستنی كۆڵەواریی نەمروودیش لەوەدا كە بتوانێت لە خۆرئاواوە هەڵی بهێنێت، لە ڕاستیدا ئەم گواستنەوەیە بەرزبوونەوە و گواستنەوەیە لە مراندن و ژیاندنێكی جوزئی‌یەوە بۆ مراندن و ژیاندنێكی كوللی. واتە گواستنەوەیەكە بۆ فراوانترین و درەخشانترین بازنەكانی ئەو بەڵگەیە و، بەو چەشنە نی‌یە كە هەندێ لە تەفسیرنووسان وتوویانە: وازهێنانە لە بەڵگەی پەنهان و سەركەوتنە بەرەو بەڵگەیەكی ئاشكرا و ڕوون. (دانەر)

بەدوای یەکدا هاتنی بریسکانەوە و کوژانەوەیە بەڵگەیە لەسەر بوونی خۆرێکی بەرز و بەردەوام.. بە هەمان جۆر، ئاڵوگۆڕی "ژیان" و "مردن" و بەدوای یەکدا هاتنیان لەم بوونەوەرە گەڕۆکانەشدا، شایەتە لەسەر "مانەوە" و "بەردەوامی"ی خواوەندێکی زیندووی هەمیشەیی.

بەڵێ، ئەو بوونەوەرانە ئاوێنەن، بەڵام هەروەك "تاریکی" دەبێت بە ئاوێنەیەك بۆ "ڕووناکی" بە چەشنێك کە تا ئەو تاریکییە چڕ و پڕتر بێت، پتر درەخشانیی ڕووناکییەکە زیاد دەکات، بوونەوەرانیش، لە ڕووی "پێچەوانەیی" و "دژایەتی"یەوە و لە چەند ڕوویەکی گەلێ زۆرەوە، ئەرکی ئاوێنە ڕادەپەڕێنن..

بۆ نموونە: بوونەوەران لەو ڕووەوە کە بە "دەستەوسانی"یان، "توانست"ی خوای گەورە دەردەخەن و.. بە "هەژاری"یشیان، دەوڵەمەندییەکەی ئاشکرا دەکەن و، بەم کارە ئەرکی ئاوێنە دەبینن. بە هەمان جۆر، "فەنا" و "نەمان"یشیان دەبێت بە بەڵگە لەسەر "مانەوە"ی خوای گەورە!

بەڵێ، ئەو پۆشاکی برسێتی و بەرگی هەژارییەی کە زەوی و درەختەکانی لە وەرزی زستاندا دەیپۆشن.. پاشان گۆڕینی ئەو بەرگ و پۆشاکانە بە پۆشاکە ڕەنگینە سەرتاپا سەروەت و سامانەکەی وەرزی بەهار، بەڵگەیە لەسەر: بەتوانایەکی خاوەن توانستی ڕەها و بەدەستەڵاتێکی خاوەن دەوڵەمەندیی ڕەها و لەسەر ئەوەش کە: بوونەوەران ئاوێنەیەکی ساف و خاوێنن بۆ دەرخستنی توانست و میهرەبانییەکەی ئەو.

بەڵێ، دەڵێی سەرجەمی بوونەوەران، بە زمانی حاڵ، لە دەرگانەی پەروەردگاری خۆیاندا بە موناجاتەکەی حەزرەتی "وەیسی قەرەنی"[(١)] دەلالێنەوە و دەڵێن:

ئەی خوای ئێمە!

تۆ پەروەردگارمانیت و ئێمەش بەندەی کۆڵەواری تۆین کە تەنانەت لە پەروەردەکردنی خۆیشماندا دەستەوسانین و، هەر تۆی کە پەروەردەمان دەکەیت.

هەروەها تۆ بەدیهێنەریت، چونکە ئێمە بەدیهاتوو و دروستکراوی تۆین.

---

(١) یەکێکە لە گەورە مەردانی تابیعین و خەڵکی یەمەنە. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ژیاوە و موسڵمان بووە، بەڵام لەبەر خزمەتکردنی دایکە پیرەکەی نەیتوانیوە لە مەدینە سەردانی بکات و بە خزمەتی بگات. لە سەردەمی حەزرەتی عومەردا - خوا لێی ڕازی بێت - هاتووە بۆ مەدینە و پاشان لە کووفە نیشتەجێ بووە. لە جەنگی "صیففین" لەگەڵ حەزرەتی عەلیدا بووە - خوا لێی ڕازی بێت - پێ دەچێ کە هەر لەو جەنگە و لە ساڵی ٣٧ی کۆچیدا شەهید بووبێت. بڕوانە: "أسد الغابة ١/١٧٩ حلية الأولياء ٢/٧٩ الأعلام ٢/٣٢". (وەرگێڕ)

هەروەها تۆ ڕۆزیدەریت، چونکە ئێمە موحتاجی ڕۆزیین و دەستیشمان پێی ناگات و، هەر تەنها تۆ بەدیمان‌دەهێنیت و ڕۆزیشمان پێ دەبەخشیت.

هەروەها تەنها تۆ موڵکدار و خاوەنی ئێمەیت، چونکە ئێمە موڵك و بەندە و خاوەندارین، غەیری خۆمان دەستکاریی کاروبارمان دەکات. کەواتە تۆ خاوەنی ئێمەیت.

هەروەها تەنها تۆ مەزنی خاوەن عیززەتیت. چونکە ئێمە زەلیلین و پۆشاکی زەلیلیمان پۆشیوە، کەچی درەوشانەوەی سەربەرزیمان پێوە دیارە، کەواتە ئێمە ئاوێنەی عیززەتی تۆین.

هەروەها تەنها تۆ خاوەنی دەوڵەمەندیی ڕەهایت، چونکە ئێمە هەژارین، کەچی دەوڵەمەندی و سامانێك دەگاتە دەستی هەژاریمان کە لە توانای خۆماندا نییە. کەواتە هەر تۆی دەوڵەمەند و هەر تۆشی بەخشندە.

هەروەها تەنها تۆ "خاوەن ژیانی باقی"یت، چونکە ئێمە دەمرین، کەچی درەوشانەوەی ژیانێکی بەردەوام و هەمیشەیی لە مردن و ژیانماندا دەبینین.

هەروەها تەنها تۆی "باقی". چونکە ئێمە "فانی"ین و، بەقا و مانەوەی تۆ لە فەنا و نەمانی خۆماندا دەبینین.

هەر تەنها تۆش گوێبیستی پاڕانەوەکانمانیت و داواکارییەکانیشمان پێ دەبەخشیت، چونکە ئێمە و سەرجەمی بوونەوەرانیش، بە زمانی گوفتار و حاڵ، هاوار دەکەین و لێت دەلاڵێینەوە و هانات بۆ دەهێنین، تۆیش داواکارییەکانمان دەهێنیتەدی و حەز و ئاواتەکانمان جێبەجێ دەکەیت و ئامانجەکانیشمان پێ دەبەخشیت. ئەی خوای گەورەم!

بەم جۆرە، سەرجەمی بوونەوەرانی هەمەکی و هەندەکی - بە وێنەی وەیسی قەرەنی - موناجاتێکی مەعنەوی لەگەڵ پەروەردگاری خۆیاندا دەکەن و، هەر یەکەشیان ئەرکی ئاوێنە دەبینن و، هەموو بوونەوەرێکیش بە: کوڵەواری و هەژاری و تەقسیر و ناتەواوییەکانی، توانست و کەماڵی خواوەند ڕادەگەیەنێت.

**وشەی نۆهەم:** (بیده الخیر).

واتە: هەموو خێرێك بە دەستی ئەوە.. هەرچی چاکەیە لە تۆماری ئەودایە.. سەرجەمی نیعمەتەکان لە گەنجینەی ئەودان. کەواتە هەر کەسێك داوای خێر دەکات با لەوی داوا بکات و.. هەر کەسیش حەزی لە چاکەیە با لەو بلاڵێتەوە.

وا بۆ ئەوەی حەقیقەتی ئەم وشەیە بە ڕوونی دەربخەین، دەچین لە نێوان بەڵگە لـەژمارە بەدەرەکانی زانســتی خـوای گـەورەدا، ئامـاژە بـۆ نیشـانە و بریسـکانەوەکانی تەنـها بەڵگەیەکی فراوان دەکەین و، دەڵێین:

ئەو کردگارە مەزنەی کە بە کردارە ئاشکراکانی خۆی، شتان لەم گەردوونەدا بەدی دەهێنێـت و دەستکاریان دەکات، خاوەنی "زانسـت"ێکە کـە دەوراندەوری هـەموو شتێکی داوە. ئەو زانستەش تایبەت و پێویستی زاتی مەزنیەتی و مەحاڵە لێی جیـا ببێتـەوە. چونکە هەروەك تەسەووری بوونی زاتی خـۆر بـە بێ ڕوونـاکی نـاکرێت، ئـەم کردگـارە مەزنەش - ولله المثل الأعلى - کە ئـەم بوونەوەرانـەی بـە ڕێکوپێکییـەکی ڕەنگین بـەدی هێناوە، هەرگیز ناگونجێ زانستەکەی لێی جیـا ببێتـەوە. جـا ئـەم زانسـتە هەمەلایـەنگیرە هەروەك بۆ زاتـی مـەزنی کردگـار پێویستە، بـە هـەمان جـۆر بـۆ هـەموو شـتێکیش - لـەو ڕووەوە کە زانستی خوا پەیوەندییان پێوە دەکات - پێویستە. واتە: هیچ شـتێك بـە هیـچ جۆرێ ناتوانێت خۆی لەو زانستە بشارێتەوە! چونکە هەروەك شـتانی سـەر ڕووی زەوی کە بێ پەردە ڕوویان لـە خۆرە، ناتوانن خۆر نـەبینن.. بـە هـەمان جـۆر، بگـرە بـە هـەزاران جـار زیـاتریش، کـارێکی مەحاڵـە کـە شـتان خۆیـان لـە نـووری "زانســت"ی ئـەو زانـا شـکۆمەندە بشـارنەوە. ئەمـەش لەبـەر بوونـی "حـوزوور". واتـە: هـەرچی شـت هەیـە لـە ناوەندی بازنەی بینینی خوای گەورەدایە و بەرامبەریەتی و زانستەکەشی بە ناخی هـەموو شتێکدا ڕۆچووە.

لـە کـاتێکدا کـە نـووری تیشـکی ئـەم خـۆرە بێ گیانـە و، ڕوونـاکیی ئـەم مرۆڤـە دەستەوسانە و، "تیشکی سینی" کە خاوەنی هەست و شعوور نییـە و، تیشـکەکانی تـری هاوچەشنیان کـە "پـەیدابوو(حـــادث) و لاوەکـی و ناتـەواو"ن، کـاتێ ئەمانـە شـتانی بەرامبـەریان ببینـن و بڕۆنـە ناویانـەوە، دەبێ نووری زانستی ئـەزەلی و واجـب و زاتـی و هەمەلایەنگیری خواوەند چۆن بێت؟ کەواتە دەبێ هیچ شتێك خۆی لـێ نەشارێتەوە و لـە دەرەوەی ئەو زانستەدا نەبێت.

هێنـدە نیشـانەی زۆر و زەبـەندە و لەژمارەبـەدەر هـەن لـەم گەردوونـەدا کـە هـەر هەموویان ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکەن. وا ئەمانەی خوارەوەیان لـێ دەهێنین:

هەرچی "دانایی" بەم بوونەوەرانەوە دەبیـنرێن، هـەر هـەموویان ئامـاژە بـۆ ئـەو زانستە گشتگیر(محیط)ە دەکەن، چونکە کاری دانایانە تەنها بە "زانست" دەکرێت.

هەروەها بایەخ پێدان و ڕازاندنەوەی بوونەوەرانیش ئامـاژە بۆ ئەو زانستە گشتگیرە دەکەن. چونکە ئەو کەسەی کە بە "ناسك و نیانی" و "چاودێری" کار بکات، دەبێ "زانا"یش بێت و بە "زانست" کار بکات..

هەروەها هەموو یەکێك لەو بوونەوەرە ڕێکوپێکانەی کە بە تەرازوویەکی ورد کێشانە کراون و.. گشت شێوە و ڕوخسارە دەستنیشان کراوەکانیشیان، ئاماژە بۆ ئەو زانستە گشتگیرە دەکەن. چونکە کاری ڕێکوپێك بە "زانست" ئەنجام دەدرێت..

هەروەها سەرجەمی چاودێری و ڕازاندنەوەکان، ئاماژە بۆ ئەو زانستە دەکەن. چونکە ئەو کەسەی کە بە کێشانە و پێوانە و دەستنیشان کردن و وردەکاری دروستکراوەکانی خۆی بەدی بهێنێت، بێ گومان بۆ هەموو کارێك کە دەیکات پاڵ بە "زانست"ێکی بەهێزەوە دەدات.. هەروەها گشت دەستنیشان کردنە ڕێکوپێکەکان، کە بە سەرجەمی بوونەوەرانەوە دەبینرێن و.. ئەو شکڵ و شێوانەش کە بەپێی حیکمەت و بەرژەوەندییەکان بەقەد باڵای شتان بڕاون و.. ڕوخسار و بارودۆخە بەرهەمدارەکان کە بەپێی دەستوورەکانی قەزا و یاساکانی قەدەر ڕێکخراون، هەر هەموویان بەڵگەن لەسەر زانستێکی هەمەلایەنگیر. بەڵێ، وێنەکێشانی شتانی جۆراوجۆر بە چەشنێکی ڕێکوپێك و بەخشینی شکڵ و شێوەیەکی تایبەتی بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لەگەڵ "بوون" و "بەرژەوەندییەکانی ژیان"ی دا بگونجێت.. ئەم کارە، تەنها بە "زانستێکی گشتگیر" دەکرێت..

هەروەها ناردنی ڕۆزیی سەرجەمی زیندەوەران، بە چەشنێك کە لە حسابیاندا نەبووە، لە کاتی لەبار و شێوەی گونجاو لەگەڵ یەك بە یەکی ئەو زیندەوەرانەدا.. ئەم کارە، تەنها بە زانستێکی گشتگیر دەکرێت. چونکە بێ گومان ئەو کەسەی کە ڕۆزی دەبەخشێت، حاڵ و کاتی ڕۆزیی ئەو زیندەوەرەش "دەزانێت" کە موحتاجی ڕۆزییە و، پەی بە پێداویستییەکانی دەبات و، ئنجا بە جوانترین شێوە ڕۆزیی دەدات..

هەروەها مردنی هەموو زیندەوەرێك لە کات و ئەجەلی دیاری کراوی خۆیاندا، بە یاسایەکی دەستنیشان کراو ـ هەرچەندەش ئەو ئەجەلە پەردەی پەنهانیی بەسەردا دادراوەتەوە ـ بەڵگەیە لەسەر: "زانستێکی گشتگیر" و دەورەدەر بە هەموو شتێك. چونکە ئەجەلی هەموو دەستە و تاقمێکی زیندەوەران لە کاتێکی نێوان دوو سنووردا دەستنیشان کراوە، هەرچەندەش بە ڕواڵەت کاتێکی دیاری کراو بۆ مردنی یەك بە یەك و دانەدانەکانی ئەو دەستە و تاقمانە بە چاو نابینرێت. لەبەر ئەوە، پاراستنی ئەنجام و

بەروبووم و ناوکی ئەو شتە لە دوای مردنی، بە چەشنێك کە دوای نەمانی ئەو، ئەرکی ئەستۆی بە بەردەوامی بهێڵێتەوە و بەروبووم و ناوکەکان بگۆڕێت بە ژیانێکی نوێ.. ئەم کارە، بەڵگەیە لەسەر ئەو "زانستە گشتگیر"ە..

هەروەها لوتف و کەرەمی ئەو میهرەبانی‌یە فراوانەی کە هەموو یەکێ لە بوونەوەرانی بەو شتەی شایانی بێت بەسەر کردووەتەوە و هیچ کامیانی لە بیر نەچووە، بەڵگەیە لەسەر "زانستێکی گشتگیر" لە ناوەندی "میهرەبانی‌یەکی فراوان"دا چونکە ئەو کەسەی کە منداڵ و بێچووی زیندەوەران بە "شیر" پێدەگەیەنێت و، بە "باران"یش ئاودێریی ڕووەکە تینووەکانی سەر ڕووی زەوی دەکات.. دەبێ ئەو کەسە سەبارەت بەو بێچووانە "زانیاری"ی هەبێت و ئاگای لە پێداویستی‌یەکانیان بێت، هەروەها ئەو ڕووەکانەش ببینێت و "بزانێت" کە پێویستیان بە بارانە، ئنجا بارانیان بۆ ڕەوانە بکات. بەم جۆرە، چەندین درەوشانەوەی بێ سنووری "میهرەبانی"یە فراوانەکەی، کە لەگەڵ "چاودێری" و "دانایی"دا دەست لە ملانە، دەبێت بە بەڵگە لەسەر "زانستێکی گشتگیر".

هەروەها هەرچی وردەکاریی سنعەت لە بەدیهێنانی شتاندا دەبینیت، وەك: بایەخ پێدانی لەڕادەبەدەر و، وێنەکێشانی ناوازە و ڕازاندنەوەی بێ وێنە.. هەر هەموویان، بەڵگەن لەسەر: "زانستێکی گشتگیر". چونکە هەڵبژاردنی بارێکی ڕێکوپێك و دانایانە و ڕازاوە و ناوازە لە نێوان هەزاران بار و گریمانی جۆراوجۆردا، تەنها بە زانستێك دەکرێت کە بە ناخی شتاندا ڕۆچووبێت. جا ئەم جۆرە هەڵبژاردنەی کە لە هەموو شتێکدا دەست بەکارە، بەڵگەیە لەسەر: "زانستێکی گشتگیر".

هەروەها ئاسانیی ڕەها لە بەدیهێنان و داهێنانی شتاندا، بەڵگەیە لەسەر "زانستێکی کامڵ". چونکە ئاسانی لە هەر کارێك و بەدیهێنانی هەر بارێکدا، هاوڕێژەیە لەگەڵ مەودای زانست و مەهارەتدا! ئەوەتا زانست هەتا زیاد بێت کارەکەش ئاسانتر دەبێت. جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە: کە سەیری بوونەوەران دەکەین، هەر یەکەیان بە موعجیزەیەکی سنعەت و داهێنان دەبینین و، بە چەشنێکی سەرسووڕهێن و بەوپەڕی ئاسانی و بێ ئەرك و ماندووبوون، لە کورتترین کات و کامڵترین شێوەی موعجیز و دەراسادا، بەدی دەهێنرێن. بەو واتایەی کە "زانستێکی بێ سنوور"ی ئەوتۆ هەیە کە ئەم کارە بە ئاسانی‌یەکی ڕەها ئەنجام دەدات.

بەم جۆرە، ئەو نیشانە ناوبراوانە و هەزاران نیشانەی ڕاستی تر، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە: ئەو پەروەردگارە مەزنەی کاروباری ئەم گەردوونە دەسازێنێت و

بەڕێوەی دەبات: خاوەنی "زانست"ێکی ئەوتۆیە کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە و، هەر ئەویشە کە زانستەکەی دەورواندەوری سەرجەم کاروبارەکانی هەموو شتێك دەدات و، ئنجا کارەکانی بەپێی ئەو زانستە جێبەجێ دەبن.

جا مادەم پەروەردگاری هەموو جیهانەکان "زانست"ێکی ئاوای هەیە، ئەوا دەبێ مرۆڤ و کردەوەکانی مرۆڤیش ببینێت و بیشزانێت کە چ شتێکی لەگەڵدا دەگونجێ و شایانی چی‌یە، ئیتر بەپێی خواستی دانایی و میهرەبانی‌یەکەی مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

دەسا ئەی کاکی مرۆڤ! بۆ لای هۆش و ژیریی خۆت بگەڕێرەوە و بیر لە مەزنیی ئەو کەسە بکەرەوە کە ئاگای لە حاڵی تۆیە و سەیری دەکات. ئەمە بزانە و بێدار بەرەوە!

**گەر بوترێت:**

"زانست" بە تەنها خۆی سەروزیاد نی‌یە، بەڵکو "ویست"یش پێوستە. چونکە گەر "ویست" لە گۆڕێدا نەبێ، تەنها بە "زانست" کار بەڕێوە ناچێت!

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

سەرجەمی بوونەوەران هەروەك بەڵگە و شایەتن لەسەر "زانستێکی گشتگیر" بە هەمان جۆر بەڵگەشن لەسەر "ویستێکی ڕەها" بۆ ئەو کەسەی کە زانایە بە هەموو شتێك. چونکە:

بەخشینی شکڵ و شێوەیەکی ئەوپەڕی ڕێکوپێك بە هەموو شتێك، بە تایبەت بە هەموو زیندەوەرێك، بە گریمانێکی دیاری‌کراو لەناو گەلێ گریمانی زۆر و بێ سنوور و تێکەڵ و پێکەڵدا.. هەروەها بە ڕێگایەکی ئەنجام بەخش لە نێوان گەلێ ڕێی زۆری نەزۆك و بێ ئەنجامدا، بۆ شتێك کە لە نێوان گەلێ ئیمکان و گریمانی زۆردا سەرگەردانە.. ئەم کارە، لە چەندین ڕووی بێ سنوورەوە، بەڵگەیە لەسەر "ویستێکی هەمەکی"(إرادة كلية).

چونکە بەخشینی شکڵ و شێوەیەکی ڕێکوپێك و کێشانەکراو کە بە تەرازوویەکی لەوپەڕی وردی و هەستیاری‌دا و بە پێوانەیەکی یەکجار ورد حسابی بۆ کرابێت و بەوپەڕی وردی ڕێکخرابێت، لە نێوان چەندەها گریمانی بێ سنووردا کە دەورواندەوری ئەو شتەیان داوە و، لە ناوەندی چەندین ڕێگای لەژمارەبەدەری نەزۆك و بێ بەرهەمدا کە چواردەوری ئەو شتەیان گرتووە و، لەناو چەند توخمێکی بێ گیانی تێکەڵ و پێکەڵدا کە بە بێ تەرازوو، بە وێنەی لافاو، خوڕ دەبنەوە.. ئەم کارە، بە چەشنێکی بەڵگەنەویست، بگرە بە بینینیش، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاسەواری "ویستێکی

هەمەکی"یە. چونکە هەڵبژاردنی بارێکی دیاری کراو لە نێوان چەندین باری بێ سنووردا تەنها بە "تەرجیحدان و، تایبەتکردن و، مەبەست و، ویست" ئەنجام دەدرێت و، بە مەبەست و داواکردنیش دەستنیشان دەکرێت..

خۆ گومان لەوەشدا نی‌یە کە: کاری "دەستنیشان کردن" داخوازی "دەستنیشانکەر"ێکە و.. "تەرجیحدان"یش پێویستی بە "تەرجیحدەر"ێکە. ئەو دەستنیشانکەر و تەرجیحدەرەش جگە لە "ویست"ی خواوەند هیچی تر نی‌یە.

بۆ نموونە:

بەدیهێنانی جەستەی مرۆڤ - کە وەك مەکینەیەکی ئەوتۆیە لە سەدان ئامێری جیاجیا و جۆراوجۆر پێکهاتبێت - لە: "نوتفە"یەك.. هەروەها بەدیهێنانی باڵندە، کە سەدان ئەندامی جۆراوجۆری هەیە، لە "هێلکە"یەکی سادە.. هەروەها بەدیهێنانی درەخت، کە سەدان لق و پەلی جۆراوجۆری هەیە، لە "تۆو"ێکی بچووك.. بێ گومان ئەم چەشنە بەدیهێنانە بەڵگەیە لەسەر: "توانست" و "زانست". هەروەك شایەتی‌یەکی پێویست و گومانبڕیش دەدات لەسەر "ویست"ی هەمەکیی کردگارە مەزنەکەیان. چونکە ئەو کردگارە بەو "ویست"ەی خۆی هەموو ئەو شتانە دەستنیشان دەکات کە ئەو بەدیهاتووە پێویستیەتی، هەروەها شێوە و ڕوخسارێکی تایبەتی بە هەموو بەش و ئەندامێکی ئەو شتە دەبەخشێت و هەر یەکەیان بارێکی دیاری کراوی بەبەر دەپۆشێت.

**پوختەی قسە:**

هەروەك - بۆ نموونە - لەیەکچوونی ئەندامە گرنگەکانی شتان و زیندەوەران لە ڕووی بناغە و ئەنجامەکانەوە و، دەرخستنی یەك سکە و مۆر و یەك نیشانە لە نیشانەکانی "تەنیایی" بەسەریانەوە، بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی کە کردگاری گشت زیندەوەران زاتێکی "تاك" و "تەنیا"یە..

بە هەمان جۆر، شکڵ و شێوە جیاواز و جۆراوجۆرەکانی زیندەوەران و جیاکردنەوەی حەکیمانە و دەستنیشان کردنی وردی سیما و ڕوخساریشیان - هاودەم لەگەڵ جیاوازی و لەیەك نەچوونیاندا - بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەدیهێنەرە تاك و تەنیایەیان: بکەرێکی خاوەن "ویست و ئیختیار"ە و هەرچی‌یەکی بوێت دەیکات و، بیەوێت هەر شتێکیش نەکات ئەوا نایکات و، کارەکانی بە مەبەست و ویست ئەنجام دەدات.

واتــە بــە ئــەندازەی ژمــارەی بوونــەوەران، بــەڵکو بــە ئــەندازەی ژمــارەی کاروبارەکانیشیان، بەڵگە و شایەتی هەیە لەسەر "زانسـت"ی خوایـی و "ویسـت"ی پەروەردگاری.

کەواتە نەفی کردنی "ویستی خوایـی" لـە لایـەن بەشـێکی فەیلەسـووفەکانەوە و.. ئینکاری کردنی "قەدەری خواوەند" لـە لایەن هەندێك لـە ئەهلی بیدعەتەکانـەوە و.. ئیددیعا کردنی: "ئاگادارنەبوونی خوای گەورە – پەنا بەخوا – بەسـەر جوزئییـاتدا" لـە لایەن دەستە و تاقمێکی گومڕایانەوە و.. دانـەپاڵ و گێڕانـەوەی بەشـێکی بوونـەوەران بـۆ "سروشت" و "هۆکارەکان" لە لایـەن سروشـت پەرسـتانەوە.. هـەموو ئەمانـە، درۆیـەکی دووچەندانـە و دەمهەڵبەسـتێکی هێنـدە نابـەجێن کـە بوونـەوەران بـە ئــەندازەی ژمـارەی خۆیان دەست بە ڕوویەوە دەنێن و پووچەڵی دەکەنەوە، تەنانەت بە چەندەها قاتی ژمارەی بوونەوەران و کاروبارەکانیشیان، بە: گومڕایی و گێلی و نەفامی دادەنرێن. چونکـە ئـەو کەسەی کە شایەتیی ڕاستی لەژمارەبەدەر بە درۆ دابنێت، بێ گومان درۆیـەکی لەسـنوور بەدەر هەڵدەبەستێت.

ئـا لـێرەوە دەتوانیـت بـۆ خـۆت مـەودای مـەزنیی ئـەو هەڵەیـە لێکبدەیتـەوە و، بزانیـت چەندە قسەی ئەو کەسە لە ڕاستی و دروسـتی و حەقیقەتـەوە دوورە کاتێ سـەبارەت بـەو کاروبارانەی کە تەنها بە "ویستی خواوەند" پەیدا دەبن، بـە مەبەسـتەوە دەڵێـت: "شـتێکی سروشتی‌یە"، لە بریی ئەوەی بڵێت: "إن شاء الله.. إن شاء الله"!

**وشەی دەهەم:** (وهو على كُلِّ شَيْءٍ قدير).

واتە: هیـچ شـتێکی بـەلاوە قـورس و گـران نی‌یـە. چونکــە هـەر شـتێك لـە بازنـەی "ئیمکـان"دا بێـت، ئـەوا ئـەو خواوەنـدە دەتوانێـت بەوپـەڕی سـووك و ئاسانی پۆشـاکی "بوون"ی لەبەر بکات. ئەم کارەشی هێنـدە بـەلاوە ئاسـانە کـە هـەر تەنـها بـە "فـەرمان بـۆ دەرکردن" لـە لایـەن خواوەندەوە ئـەو شـتە دروسـت دەبێـت. بـەپێی خواسـتی ئـەم ئایەتـە پیرۆزەی کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّما أَمْرُهُ إذا أَرادَ شَيْئاً أنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُون﴾ (يس:٨٢).

چونکە هەروەك وەستایەکی لێهاتووی کارامە تەنها بەوەندەی دەسـتی بەر کارەکەی دەکەوێت، یەکسەر ئەو کارە بە وێنەی مەکینە دەکەوێتە گـەڕ.. پاشـان بـۆ دەربڕینـی ئـەو کارامـەیی و خێراییـە، دەوترێـت: "هێنـدە سنعەتەکەی بـەلاوە ئاسـانە دەڵێـی تەنـها بـە

فەرمان بۆ دەرکردن و دەست لێدانی، کارەکان تـەواو دەبن و سنعەتەکانیش جێبەجێ دەکرێن"!

هەروەك ئەم کارە سەبارەت بەو وەستا کارامە و لێـهاتووەوە وایـە، شتانیش بەرامبـەر توانستی خواوەنـدی بـەتوانا و شـکۆمەند بەهـەمان جـۆرن و لـەوپــەڕی ملکــەچی و گوێڕایەڵیدان و، ئـەو توانستەی خواوەنـد بەوپـەڕی ئاسـانی و بێ دەسـت تێـوەردان و ئـەرك و مـاندوو بـوون، شـتان بــەدی دەهێنێــت و کارەکـانیش ڕادەپــەڕێنێت. تەنانـەت قورئانی پیرۆز ئەم خێراییەی بەم ئایەتە پیرۆزە دەربڕیوە کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّما أَمْرُهُ إِذا أَرادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (يس:٨٢).

وا لە نێوان پێنج سەرنجدا، تەنها پێنـج دانـە لـە نهێنییـە بێسنوورەکانی ئـەم ڕاستییە مەزنە ڕوون دەکەینەوە:

*یەکەمیان:*

گەورەترین شت بە وێنەی بچووکترین شت بۆ توانستی خوای گەورە ئاسـانە. ئـەوەتا بەدیهێنانی هەر جۆر(نوع)ێك لە جۆرەکانی زیندەوەرانی بـە ئـەندازەی یـەك دانـەیان و.. بەدیهێنانی بەهەشتی فراوانیشی وەك بەدیـهێنانی بـەهار و.. بەدیـهێنانی بەهاریشـی بـەلاوە وەك بەدیهێنانی یەك تاقە گوڵ بەلاوە سووك و ئاسانە!

لە کۆتایی وتەی دەهەم و لە باسکردنی بنچینەی سێهەمی وتەی بیست و نۆهـەمیش، لـە نـاوەندی شـەش نـهێنیدا، کـە بریتـین لـە نهێنییـەکانی: "نوورانییـەت و، ڕوونـی و، بەرامبـەری و، هاوسەنگی و، ڕێکوپێکـی و، گوێڕایـەڵی و، دەسـتبەرداری" ئـەم ڕازە پەنهانەمان ڕوون کردووەتەوە و لەوێ چەسپاندمان کە: ئەستێرەکان و گەردیلـەکان، لـە بەرامبەر توانستی خواوەنـدەوە یەکسـانن و، بـە ئـەندازەی ئاسـانیی بەدیـهێنانی یـەك دانـە بەدیهاتووی تەنیا و، بێ ئـەرك و دوور لـە دەسـت تێـوەردان، بەدیـهێنانی چـەندەها دانـە و تاکی لەژمارەبەدەریشی بەلاوە ئاسانە.

جا لەبەر ئـەوەی ئـەم شـەش نهێنییانە لـەو وتـە ناوبراوانـەدا ڕوون کراونەتـەوە، ئـەوا لێرەدا باسەکەمان بە پوختی هێنا و خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین.

*دووهەمیان:*

بەڵگەی گومانبڕ و درەخشان لەسەر ئەوەی کە هەموو شتێك سەبارەت بـە توانسـتی خواوەندەوە یەکسانە، ئەوەیە کە بە چـاوی خۆمـان دەبینـین: زینـدەوەران و ڕووەکەکان

بەوپەڕی وردی و جوانیی سنعەت هاودەم لەگەڵ سەخاوەت و زۆرییەکی ڕەهـادا، بەدی دەهێنرێن..

هەروەها ئەوپەڕی لە یەك جیاکردنەوەیان لەوپەڕی تێکەڵی و پێکەڵی‌دا پێوە دەبینرێت..

هەروەها ئەوپەڕی نرخ بەرزیی سنعەت و جوانیی بەدیهێنانیان لە ناوەندی زۆری و فراوانی‌دا تێدا دەردەکەوێت..

هەروەها دەبینرێت کە شتان بە ئاسانی و خێرایی‌یەکی ڕەها بەدی دەهێنرێن، لە کاتێکدا کە پێویستیان بە گەلێ کۆئەندام و ئامێری زۆر و کاتی درێژخایەن دەبێت تاکو سنعەتی ڕێکوپێکیان تێدا بەرجەستە ببێت، بە ڕادەیەك کە دەڵێی موعجیزاتی ئەو سنعەتە ناوازەیە یەکسەری و بێ هیچ شتێك دێتە وجوود!

هەرچی کارایی و توانستی فراوانی خواوەند هەن کە بەسەر ڕووی زەوی و لە هەموو وەرزێکدا دەبانبینین بەڵگەیەکی گومانبڕن لەسەر ئەوەی کە گەورەترین شت بە وێنەی بچووکترین شت سەبارەت بەم توانستەی کە سەرچاوەی ئەم کارایی‌یە فراوانەیە، سووك و ئاسانە. هەروەها بەدیهێنان و بەڕێوەبردنی چەندەها تاك و دانە دانەی بێ سنووری وەك بەدیهێنان و بەڕێوەبردنی یەك دانە بەلاوە ئاسانە.

*سێ‌هەمیان:*

وەك لە بەرچاودایە، گەورەترین "کُلّ" بە وێنەی بچووکترین "جُزء" سووك و ئاسانە بۆ توانستی ئەو کردگارە بەتوانایەی، کە لە ڕێی بەڕێخستنی کاروبارەکانیەوە، بەسەر گەردووندا زاڵ و فەرمانڕەوایە.. ئەوەتا بەدیهێنانی زۆر شتی "کوللی" کە لە ڕووی دانە دانەکانیەوە گەلێ زۆرن، وەك بەدیهێنانی یەك دانە "جوزئی" ئاسانە و، دەتوانرێت لە بچووکترین "جوزئی"ی ئاسایی‌دا داهێنان و ناوازەیی سنعەتی ڕێکوپێك دەربخرێت و پیشان بدرێت.

نهێنیی حیکمەتی ئەم ڕاستی‌یە، لە سێ سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێت:

یەکەم: یارمەتیدان و فریاگوزاریی: "یەکتایی"(الواحدية).

دووهەم: ئاسانیی: "تاکی"(الوحدة).

سێ‌هەم: درەوشانەوەی: "تەنیایی"(الأحدية).

**سەرچاوەی یەکەم: یارمەتیدان و فریاگوزاریی "یەکتایی".**

واتە: ئەگەر هەرچی شت هەیە خاوەنەکەیان یەکێك بێت و هەموویان مولکی یەك کەس بن، ئەوا لە ڕووی "یەکتایی"یەوە دەتوانرێت هێزی هەموو شتان لە پشتی یەك دانە شتەوە جەم بکرێن و، بە ئەندازەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی یەك دانە شتیش کاری هەموو شتان بسازێنرێت و بەڕێوە ببرێت.

بۆ نزیکخستنەوەی ئەم نهێنییە لە تێگەیشتنەوە، نموونەیەك دەهێنینەوە و دەڵێین:

وڵاتێك کە یەك پادشا حوکمڕانیی بکات، پادشاکەی دەتوانێت لە ڕێی: "یەکبوونی دەستەڵات"ەوە هێزی یەك سوپای تەواوەتی لە پشت هەموو یەکێکی سەربازەکانیەوە کۆ بکاتەوە. بۆیە ئەو سەربازە تاك و تەنیا کەسە دەتوانێت لە جەنگدا سەرکردەی گەورەی دوژمن دیل بکات، بەڵکو دەشتوانێت بە ناوی پادشاکەیەوە بەسەر کەسانی لەو سەرکردەیەش گەورەتردا زاڵ بێت.

پاشان هەروەك ئەو پادشایە کارمەندێك یان سەربازێك بە ئاسانی دەخاتە کار، بە هەمان جۆر و لە ڕێی نهێنیی: "یەکبوونی دەستەڵات"ەوە کاروباری سەرجەمی کارمەند و سەربازەکانیش بەڕێوە دەبات. وەك بڵێی بەهۆی نهێنیی "یەکبوونی دەستەڵات"ەوە هەموو کەسێك و هەموو شتێك بنێرێت بە هانای هەر کەسێکەوە کە خۆی بیەوێت.. هەروەها هەموو یەکێك لە دانە دانە و تاکەکانی گەل و هاووڵاتییانی پادشا دەتوانێت پاڵ بە هێز و توانای سەرجەمی کەسانی تری ناو وڵاتەوە بدات. واتە: دەتوانێت داوای یارمەتی و فریاگوزارییان لێ بکات.

بەڵام گەر پەتەکانی "یەکبوونی دەستەڵات" خاو بکرێنەوە و هەڵبووەشێنرێنەوە و، دەستەڵاتدارییەکەش ببێت بە شتێکی بەرباد و هەڕەمەکی، ئەوا ئەو کاتە هەموو یەکێکی سەربازەکان ئەو هێزە بێ سنوورەی بە تەواوەتی لە کیس دەچێت و، لە پلەوپایەی: دەستەڵاتی زۆرەوە دەکەوێتە خوار و دێتە ئاستی مرۆڤێکی ئاسایی. ئەو کاتەش بە ئەندازەی ژمارەی خەڵکی وڵات گیروگرفت بۆ بەڕێوەبردن و خستنەسەرکاری ئەوان پەیدا دەبێت.

کردگاری ئەم گەردوونەش – ولله المثل الأعلى – لەبەر ئەوەی "یەك کردگار"ە، ئەوا بەرامبەر بە هەموو شتێك سەرجەمی ئەو ناوە جوانانەی خۆی کۆ دەکاتەوە کە ڕوویان لە هەموو شتێکە، ئیتر ئەو بەدیهاتووە بە وردەکارییەکی تەواوەتی و شێوە و ڕوخسارێکی

ڕەنگین بەدی دەهێنێت. گەر پێویستیش بكات هەرچی شتی تر هەیە بەرەو ئەو تەنـها شتە دەنێرێت و بەوان پشتی دەگرێت و بەهێزی دەكات.

هەر ئەو خوایە بەهۆی نهێنیی "یەكتایی"یەوە هەرچی شت هەیە، بە وێنـەی بەدیـهێنانی یەك شت، بەدی دەهێنێت و دەستكاری‌یان دەكات و كاروباریان بەڕێوە دەبات.

هـەر لـەم نهێنیی "یـەكتایی"یـەوەیە كـە گـەلـێ چۆنێتیی بـەرز و بەنرخ و یەكجار ورد - لەم گەردوونەدا - لە ناوەندی زۆری و هەرزانی‌دا دەبینرێن.

**سەرچاوەی دووهەم: كە بریتی‌یە لـە ئاسانیی "تاكی".**

واتە: ئەو كارانەی كە بە یاسا و دەستوورەكانی "تاكی" و، لە یەك مەڵبەند و، بـە یـەك دەست‌تێوەردان و، یەك یاسا ئەنجام دەدرێن، ئاسانی‌یەكی ڕەهایان بۆ دەڕەخسێت. بـەڵام گـەر لـە چـەند مەڵبـەندێكی جیـاواز و، بـە چـەند یاسـایەكی جیـاجیـا و، چـەند دەسـتێكی جۆراجۆر بەڕێوە ببرێن، ئەوا گەلـێ گیروگرفتی سەخت و دژوار سەرهەڵدەدن.

بۆ نموونە: گـەر یـەك بـە یـەكی سـەربازەكانی سـوپا لـە یـەك مەڵبـەند و بـە یـەك یاسـا و فـەرمانی یـەك سـەركردەی مـەزن پێداویستی و چـەك و تەقەمـەنی‌یان بـۆ ئامـادە و دابـین بكرێت، ئەوا بە ئەندازەی دابین‌كردنی پێداویستی‌یەكانی یەك دانە سەرباز كارەكە ئاسان دەبێـت. بـەڵام گـەر ئـەم دابین‌كردنی پێداویسـتی‌یانەی ئـەوان بـە چـەند كارگـەیەكی جیاجیـا و چـەند مەڵبـەندێكی جۆراوجـۆر بسـپێررێت، ئـەوا بـۆ دابین‌كردنـی پێداویستی‌یەكانی یەك دانە سەرباز پێویست بە سەرجەم ئەو كارگە سـەربازی‌یانە دەبێت كە پێداویستی‌یەكانی سەرجەمی سوپا ئامادە دەكات!

بـەو واتایـەی كـە ئەگـەر ئـەم كـارە بـە "تـاكی" بسـپێررێت، ئـەوا دابین‌كردنـی ئـەو پێداویستی‌یانەی سەرتاسـەری سـوپا بـە ئـەندازەی دابین‌كردنـی پێداویسـتی‌یەكانی یـەك سەرباز ئاسان دەبێت، بەڵام گەر نەدرێتە پاڵ "تـاكی" ئەوا پڕچـەك كـردن و دابین‌كردنـی پێداویسـتیی یـەك دانـە سـەرباز بـە ئـەندازەی ژمـارەی سـەرجەم سـەربازەكانی سـوپا گیروگرفتی بۆ دێتە پێش.

هـەروەها گـەر - لـە ڕووی "تـاكی"یـەوە - بەروبوومـەكانی درەختێـك لـە یـەك مەڵبەندەوە و بە یەك یاسا و لە یەك ڕەگەوە ماددەكانی پێكهاتنی ژیانی بۆ ڕەوانە بكرێـت، ئەوا سەرجەمی بەروبوومەكان بە ئەندازەی ئاسانیی یـەك دانـەیان ئـەو مـاددە پێویستانەی ژیانیان پێ دەگات. بەڵام گەر هەر یەك لەو بەروبوومانـە ببەسـترێن بـە چـەند مەڵبـەندێكی جیاجیاوە و مادده و كەرەستە پێویستەكانی ژیانیان لەو مەڵبەندانەوە بۆ ڕەوانـە بكرێـت،

ئەوا بە ئەندازەی ژمارەی بەروبوومەکانی ئەو درەختە گیروگرفت سەر هەڵدەدەن. چونکە ئەو کەرەسە و ماددانەی کە بۆ ژیانی درەختێکی تەواوەتی پێویست بن، ئەو کاتە بۆ یەك بە یەکی ئەو بەروبوومانەش پێویست دەبن!

هەر بە وێنەی ئەم دوو نموونەیە، کردگاری ئەم گەردوونەش - ولله المثل الأعلـــى - لەبەر ئەوەی کەسێکی تاك و تەنیایە، ئەوا هەر شتێکی بوێت بە "تاکی" دەیکات. جا لەبەر ئەوەی بە تاکی دەیکات، ئەوا هەموو شتانی بە وێنەی یەك دانە شت بەلاوە ئاسانە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو یەك شتە وەك سەرجەمی شتان بە وردەکاری دروست دەکات و چەندین دانە دانە و تاکی بێ سنوور لە نرخ و بەهایەکی بەرزدا بەدی دەهێنێت و، هەر بە زمانی ئەم بەخششە لەبەرچاو و هەرزانی‌یە نەبڕاوەیەش، سەخاوەتی ڕەها و بەدیهێنەریتیی ڕەهای خۆی دەردەخات.

**سەرچاوەی سێهەم: کە دەرەوشانەوەی "تەنیایی"یە.**

واتە: کردگاری مەزن خاوێنە لە جەستە و جسمانییەت. لەبەر ئەوە، نە لە زەماندا دەستنیشان دەکرێت و نە بە مەکانیش پابەند دەبێت. گەردوون و شوێنەکانیش لە بەردەم حوزووری ئەودا تێکەڵی یەکتری نابن و هۆکار و تەن و قەبارەکانیش نابن بە پەردە لە نێوان کارەکانی‌دا. کەواتە ڕووتێکردن و ڕوانینی خواوەند هەرگیز لەت لەت و دابەش نابێت و هیچ شتێك ڕێ لە شتێکی تر ناگرێت و، چەندەها کاری زۆری بێ سنوور بە وێنەی یەك دانە کار جێبەجێ دەکات. لەبەر ئەمە، واتا و ناوەرۆکی درەختێکی یەکجار مەزن لە تۆوێکی بچووکدا جێ دەکاتەوە و، هەموو جیهان لە یەك کەسدا دادەنێت و، بە وێنەی بە ڕێوەبردنی "یەك کەس" کاروباری "سەرجەمی جیهان"یش بەڕێوە دەبات!

جا هەروەك ئەم نهێنی‌یەمان لە چەند وتەیەکی تردا ڕوون کردووەتەوە، لێرەشدا دەڵێین:

"ڕووناکیی خۆر" تا ڕادەیەك پابەند نی‌یە و دەڕواتە ناو هەموو شتێکی بریسکەدارەوە، چونکە نوورانی‌یە. خۆ ئەگەر هەزاران بەڵکو ملیۆنەها ئاوێنە ڕووبەڕووی خۆر ڕابگیرێنس، ئەوا وێنە نوورانی و میسالی‌یەکەی ئەو خۆرە هەروەك دەڕواتە ناو یەك دانە ئاوێنەوە، دەڕواتە ناو هەموویشیانەوە بێ ئەوەی دابەش ببێت! خۆ ئەگەر ئاوێنە توانا و قابیلییەتی تێدا ببوایە ئەوا دەگونجا ئەو خۆرە، بەو مەزنی‌یەی خۆیەوە، ئاسەوارەکانیشی لەو ئاوێنانەدا دەربخستایە، بێ ئەوەی شتێك ڕێ لە شتێکی تر

بگرێت. چونکە هەروەك بەوپەڕی ئاسانی وێنەی خۆر دەڕواتە ناو یەك ئاوێنەوە، بە هەمان ئاسانی وێنەی خۆر دەڕواتە ناو هەزاران ئاوێنەشەوە.. هەروەك بەو ئاسانی‌یە لە یەك شوێندا ئامادەیە، بە هەمان ئاسانی لە هەزاران شوێنیشدا هەیە و ئامادەیە و، ئەو کاتە هەموو ئاوێنەیەك و هەموو جێگایەك دەبوون بە شوێنی تیادەرکەوتنی خۆر – وەك خۆی – لە هەزاران شوێندا.

کردگاری شکۆمەندی ئەم گەردوونەش – ولله المثل الأعلى – بەهۆی نهێنیی ڕووتێکردنی "تەنیایی"یەکەیەوە، درەوشانەوەیەکی هەیە بە سەرجەمی سیفەتە مەزنەکانی کە هەموویان "نوور"ن و بە گشت ناوە جوانەکانیشی کە "نووراني"ن. ئیتر بەم پێیە لە هەموو شوێنێکدا ئامادە و بینەرە، کەچی هیچ شوێنێکیش ناتوانێت سنووری بۆ دەستنیشان بکات و، هەرگیز دابەشبوون لە ڕووتێکردنی ئەو خواوەندەدا بەرەو بەدیهاتووانی، ڕوونادات. چونکە لە یەك کاتدا و بە بێ ئەرك و ماندووبوون و دەست تێوەدان و جەنجالی، هەر شتێکی بوێت لە هەموو شوێنەکاندا، دەیانکات و ئەنجامیان دەدات.

جا بەهۆی نهێنیی ئەم یارمەتیدانەی "یەکتایی" و، ئاسانیی "تاکی" و، درەوشانەوەی "تەنیایی"یەوە:

گەر بەدیهێنانی سەرجەمی بوونەوەران بدرێتە پاڵ ئەو کردگارە یەکتایە، ئەوا بە وێنەی بەدیهێنانی یەك دانە بوونەوەر بەدیهێنانی هەموویان ئاسان دەبێت و یەك بە یەکیشیان بە ئەندازەی هەموویان لە ڕووی وردەکاری و ناوازەیی داهێنانەوە خاوەنی نرخ و بەهایەکی بەرز دەبن. هەروەك وردەکاریی ئەو سنعەتە ڕێکوپێکەی کە سەرباری زۆر و زەبەندەیی بوونەوەران لە هەموو بوونەوەرێکدا بەدی دەکرێت، ئەم ڕاستی‌یە ڕوون دەکاتەوە.

بەڵام گەر بەدیهێنانی ئەو بوونەوەرانە نەدرێتە پاڵ ئەو کردگارەی کە لە زاتی خۆیدا تاك و تەنیایە، ئەوا ئەو کاتە هەموو بوونەوەرێك بە ئەندازەی گیروگرفتەکانی سەرجەمی بوونەوەران، گیروگرفت لە بەدیهێنانیاندا پەیدا دەبێت و نرخی هەر هەمووشیان دادەبەزێتە نرخی یەك دانە بوونەوەر. ئیتر لەم حاڵەتەدا یەك دانە شتیش نایەتە "وجوود" خۆ ئەگەر بیشهاتایە هیچ نرخێکی نەدەبوو.

لەم نهێنی‌یەوەیە کە دەبینیت ئەو سۆفستائی‌یانەی کە هەر لە دێر زەمانەوە لە فەلسەفەدا ڕۆچوون، کاتێ کە سەیری ڕێی کوفر و گومڕایی‌یان کرد و پشتیشیان لە ڕێی

"حەق" هەڵکردبوو، بۆیان دەرکەوت کە ڕێی "شیرك" بە هەزاران جار لە ڕێی "تەوحید" سەخت و قورسترە، تەنانەت هەرگیز لەگەڵ ژیریدا یەك ناگرنەوە، بۆیە ناچار بوون ئینکاریی بوونی هەموو شتێك بکەن و دەست لە "ژیری"یان دابشۆن!

*سەرنجی چوارەم:*

بەدیهێنانی بەهەشت وەك بەدیهێنانی بەهار و، بەهاریش وەك بەدیهێنانی یەك تاقە گوڵ بۆ توانستی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان ئاسانە، کە پەروەردگارێکە، بە شایەتیی کارە دیار و بینراوەکانی، سەرجەم کاروبارەکانی ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات. هەروەها دەکرێ نرخی جوانیی سنعەتی ناوازە و ناسکیی یەك تاقە گوڵ، یەکسان بێت بە نرخ و بەهای ناسك و نیانیی بەهاری ڕەنگین.

نهێنیی ئەم ڕاستییەش بریتییە لە سێ شت:

یەکەم: پێویستی(الوجوب) و دەستبەرداری(التَّجَرُّد) لە کردگاری مەزندا.

دووهەم: پابەند نەبوون لەگەڵ جیاوازیی ماهییەتەکەی لە هی بوونەوەران.

سێهەم: شوێن نەگرتن هاودەم لەگەڵ دابەش نەبوون و لەت نەبووندا.

نهێنیی یەکەم:

"پێویستیی بوون"(وجوب الوجود) و "دەستبەرداری"ی خواوەند، دەبن بەهۆی سووك و ئاسانیی ڕەها لە "بەدیهێنانی شتان"دا.

وا بە نموونەیەك ئەم نهێنییە یەکجار ورد و قووڵە لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخەینەوە، چونکە:

پلەکانی "بوون" جیاجیان و، جیهانەکانی "بوونەوەران"یش جۆراوجۆرن. لەبەر ئەوە یەك دانە گەردیلەی چینێکی ئەو "بوون"ەی کە لە وجووددا پتر جێگیر و ڕەگداکوتاو بێت، بە قەدەر چیایەکی چینێکی تری وجوود دەبێت کە لەو کەمتر جێگیر بووبێت و ڕەگی داکوتابێت. تەنانەت ئەو چیایە لە خۆیدا جێ دەکاتەوە.

بۆ نموونە: هێز و توانای "حافیظە"ی مرۆڤ، کە لە جیهانی بینراو(عالم الشهادة)دا هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکیش نابێت، کەچی جێی هێندەی کتێبخانەیەکی مەزنی لە وجوودی "جیهانی مەعنا" تێدا دەبێتەوە..

هەروەها ئاوێنەیەکی بچووك کە لە جیهانی دەرەوەی خۆیدا هێندەی نینۆکێك بێت، لە چینێکی وجوودی جیهانی میسالدا شارێکی یەکجار گەورە لە خۆیدا جێ دەکاتەوە.

خۆ ئەگەر ئەو "ئاوێنە"یە و ئەو هێزی "حافیظە"یەش هەست و شعوور و توانای بەدیهێنانیان لە جیهانی دەرەکی‌دا بوایە، ئەوا گەلێ ئاڵوگۆڕ و هەڵسوکەوتی بێ سنووریان لەو وجوودە مەعنەوی و میساڵی‌یەدا بەرپا دەکرد، هەرچەندەش توانای بوونە دەرەکی‌یەکەیان کەم و بچووکە. ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە "وجوود" تا دامەزراوتر بێت و پتر ڕەگی بە ناخی وجوددا داکوتا بێت، هێزەکەشی پتر زیاد دەکات و، شتی "کەم" حوکمی "زۆر" وەردەگرێت. بە تایبەت گەر ئەو وجوودە دەستبەردار(مجرَّد)بێت لە ماددە و بە هیچ یاسا و دەستوورێك پابەند نەبێت و دامەزراوی و ڕەگ داکوتاویی تەواوەتیی بەدەست هێنابێت، ئەوا تەنها یەك درەوشانەوەی جوزئیی ئەو وجوودە دەتوانێت گەلێ جیهانی تری چینە تەنك و ناسکەکانی جیهانی وجوود بەڕێوە ببات.

کردگاری مەزنی ئەم گەردوونە گەورەیەش - ولله المثـل الأعلـى -: "واجب الوجـود"ە. واتە وجوودی خۆی: زاتی و ئەزەلی و ئەبەدی‌یە. "نەبوون" و "نەمان"ی مەحاڵە و "بوون"ی ئەو چەسپاوترین و قایمترین و بەهێزترین و کاملترین چینەکانی وجوودە، بەڵام سەرجەمی چینەکانی تری "وجوود" سەبارەت بە وجوودی خوای گەورەوە وەك سێبەر وان کە لەوپەڕی لاوازی‌دایە.

ئەم وجوودەش تابڵێی: واجب و خاوەن حەقیقەت و دامەزراوە. بەڵام بوونی "مومکینات" لەوپەڕی تەنکی و لاوازی‌دایە، بە ڕادەیەك کە شێخ محیّدینی کوڕی عەرەبی و گەلێ کەسی تری وەك ئەویان لە ئەهلی تەحقیق وا لێ کردووە کە چینەکانی تری وجوود دابەزێننە پلەی "وەهم و ئەندێشە"! ئەوەتا وتوویانە: "لا موجود إلا هو". هەروەها بڕیاریان داوە کە جگە لە "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود" نابێ بە هیچ شتێکی تر بوترێت: "خاوەن وجوود"، چونکە ئەو جۆرانەی تری وجوود شایانی ئەوە نین ناوی "وجود"یان لێ بنرێت!

بەم جۆرە، بەخشینی "بوون" بەم بوونەوەرانەی کە لاوەکی و تازەپەیدابوون و، "چەسپاوی و دامەزراوی"ش بەو مومکیناتەی کە وەستانیان بۆ نی‌یە و خاوەنی هێزیش نین، سەبارەت بە توانستی واجب و زاتیی خواوەندی "واجب الوجود"ەوە لەوپەڕی سووکی و ئاسانی‌دایە.. زیندووکردنەوە و دادگایی کردنی سەرجەمی گیانلەبەران لە حەشری مەزندا سەبارەت بەو توانستەوە بە وێنەی زیندووکردنەوەی گەڵا و گوڵ و

بەروبوومەکان وایە لە وەرزی بەهاردا، بەڵکو لە باخچەیەکی بچووك، تەنانەت لە درەختێکدا.

نهێنیی دووهەم:

"جیاوازیی ماهییەت" لەگەڵ "پابەند نەبوون" دەبن بەهۆی ئاسانی‌یەکی ڕەها لە "بەدیهێنان"دا. چونکە:

بێ هیچ گومانێ بەدیهێنەری شکۆمەندی گەردوون لە ڕەگەزی گەردوون نی‌یە و ماهییەتەکەی لە ماهییەتی هیچ شتێك ناچێت. بۆیە ئەو ڕێگر و پابەندکەرانەی کە لە ناوەندی بازنەی بوونەوەراندا هەن، هەرگیز ناتوانن ڕێ لە کارەکانی ئەو بگرن و بیبەستنەوە و پابەندی بکەن. کەواتە هەر تەنها خۆیەتی کە دەتوانێت ڕاستەوخۆ و لە یەك کاتدا سەرجەمی گەردوون بەڕێوە ببات و ئاڵوگۆڕ لە کاروبارەکانی‌دا بکات.

خۆ ئەگەر بەرێ کردنی کاروبارە ڕواڵەتی و بەرچاوەکانی گەردوون بخرێنە ئەستۆی بوونەوەرەکان خۆیانەوە، ئەوا هێندە ئاڵۆزی و گیروگرفتی زۆر سەرهەڵدەدەن کە هەر لە بناغەدا هیچ ڕێکوپێکی و وجوودێك لە گۆڕێدا نەمێنێت، تەنانەت هەر هیچ شتێك نەیەتە "وجوود"ەوە!

بۆ نموونە:

گەر شارەزایی بنیاتنانی گومەزێك بدرێتە پاڵ بەردەکانی خودی گومەزەکە و.. کاروبارە تایبەتی‌یەکانی "ئەفسەر"یش لە بەڕێوەبردنی تیپێکدا بخرێتە ئەستۆی خودی سەربازەکانەوە، ئەوا یان هەر لە بنەڕەتدا ئەو ئەنجامانە دروست نابن و نایەنە وجوود، یان لە ئەنجامی ناڕێکی و ئاڵۆزی و گیروگرفتەکانەوە دیاردەکانی: هەرەمەکێتی و بەربادی و بەرەڵایی لەو کارانەدا دێنەپێش و بەرجەستە دەبن.

بەڵام گەر شارەزایی بنیاتنانی ئەو گومەزە بدرێتە پاڵ "وەستا"یەك کە لە ڕەگەز و جۆری "بەرد" نەبێت و.. بەڕێوەبردنی "سەربازەکان"ی تیپەکەش بە ئەفسەرێك بسپێررێت کە لە ڕووی پلەی سەربازی‌یەوە ماهییەتی "ئەفسەر"ی بەدەست هێنابێت، ئەوا بنیاتنانی گومەزەکە و بەڕێوەبردنی سەربازەکان گەلێ ئاسان دەبن، چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا چ بەردەکان و چ سەربازەکان ڕێ لە کاری یەکتری دەگرن، بەڵام لەم حاڵەتەدا چ وەستای بەننا و چ ئەفسەرەکە - بێ هیچ تەگەرە و ڕێگرێك - هەموو خاڵێکی بیناکە و سەربازەکان دەبینن و ڕوویان لێیانە و بەڕێوەیان دەبەن.

ماهییەتی خاوێن و موقەددەسی خواوەندی "واجب الوجود"یش - ولله المثل الأعلی - لە ڕەگەزی ماهییەتی بوونەوەران نییە، تەنانەت سەرجەمی حەقیقەتەکانی بوونەوەران تەنها تیشکێکن لە ناوی: "الحق" کە یەکێکە لە ناوە جوانەکانی ئەو ماهییەتە.

جا مادەم ماهییەتە خاوێن و موقەددەسەکەی خواوەند: "واجب الوجود و، ڕووت لە ماددە و، پێچەوانەی سەرجەمی ماهییەتەکان"ە، چونکە هیچ وێنە و نموونە و هاوچەشنێکی نییە، ئەوا بەڕێوەبردن و پێگەیاندن و پەروەردەکردنی سەرانسەری گەردوون سەبارەت بە توانستی ئەو پەروەردگارە شکۆمەند و ئەزەلییەوە، وەك بەڕێوەبردنی وەرزی بەهار بەڵکو وەك بەڕێوەبردنی یەك دانە درەختە ئاسانە. هەروەها بەدیهێنانی حەشری مەزن و ئەودنیا و بەهەشت و دۆزەخیش، وەك ئاسانیی ژیاندنەوەی سەرلەنوێی درەختەکان وایە لە وەرزی بەهاردا کە لە پایزدا مردبوون.

نهێنیی سێهەم:

"شوێن نەگرتن" هاودەم لەگەڵ "دابەش نەبوون" و "لەت نەبوون"دا هۆکارێکی تری ئەو ئاسانییە ڕەهایەن لە "بەدیهێنان"دا. چونکە:

لەبەر ئەوەی کردگاری مەزن خاوێن و مونەززەهە لە شوێن، ئەوا بە توانستەکەی خۆی لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە.. هەروەها مادەم لەت بوون و دابەش بوون سەبارەت بەو لە گۆڕێدا نییە، ئەوا دەتوانێت بە گشت ناوە جوانەکانی خۆی ڕووبەڕووی هەموو شتێك بێتەوە.

جا مادەم لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە و ڕووی لە هەموو شتێکە، ئەوا بوونەوەران و هۆکارەکان و تەن و قەبارەکان نابن بە ڕێگر و تەگەرە و لەمپەر لە بەردەم کارەکانیدا. تەنانەت گەر بە گریمان وا دابنرێت کە پێویستیی بە شتان بێت - کە هەرگیز ئەو پێویستییەشی نابێت - ئەوا ئەو شتانە بە وێنەی "تەلی کارەبا و لقەکانی درەخت و دەمارەکانی جەستەی مرۆڤ" دەبن بەهۆی ئاسانکردن و هۆکاری گەیاندن و گەیشتنی ژیان و خێرایی ئەنجامدانی کارەکان. کەواتە هەرگیز هیچ شتێك توانستی ئەو نابەستێتەوە و ڕێی لێ ناگرێت و خۆی ناکات بەناودا. چونکە ئەو کاتە هەموو شتێك دەبن بەهۆی ئاسانکردن و هۆکاری خێرایی و ئامرازی گەیاندن. واتە لە ڕووی گوێڕایەڵی و ملکەچیی شتانەوە بۆ کاروبارەکانی توانستی خاوەن توانای شکۆمەند،

پێویست بە هیچ شتێك ناكات. تەنانەت گەر بێت و بە گریمانیش ئەو پێویستی‌یە تەسەوور بکرێت – کە هەر وجوودیشی نی‌یە – ئەوا ئەو شتانەی کە بە گریمان دانراون پێویست بن، دەبن بە هۆکاری ئاسانکردنی کاروبارەکانی.

**پوختەی ئەم قسانە:**

کردگاری بەتوانا، بێ ئەرك و ماندووبوون و دەست تێوەردان و لەوپەڕی ئاسانی و خێرایی‌دا و بە جۆرێك کە شایانی ئەو بێت، هەموو شتێك بەدی دەهێنێت و، ئەو کردگارە خاوەن توانستەیە کە "کوللیات" بە ئەندازەی ئاسانیی "جوزئیات" پڕ لە وردەکاری دروست دەکات.

بەڵێ، بەدیهێنەری کوللیات و ئاسمانەکان و زەوی، هەر هەمان بەدیهێنەری جوزئییات و یەك بە یەکی ئەو گیاندارە جوزئی‌یانەشە کە لە ئاسمانەکان و زەوی‌دا هەن و جگە لەو کەسی‌تر نی‌یە. چونکە ئەو جوزئییاتە بچووکانە بەروبووم و ناوك و نموونەیەکی بچووککراوەی ئەو کوللییاتانەن.

هەروەها کەسێك کە بەدیهێنەری ئەو جوزئییاتە بێت، بێ هیچ گومانێك هەر ئەویش بەدیهێنەری ئەو توخم و زەوی و ئاسمانانەیە کە دەوراندەوری ئەو جوزئییاتانەیان داوە. چونکە بە چاوی خۆمان دەبینین کە جوزئییات لە حوکمی ناوکدان سەبارەت بە کوللییات و نوسخەیەکی بچووککراوەی ئەوانن. لەبەر ئەوە، دەبێ توخمە کوللی‌یەکان و ئاسمانەکان و زەویش لە دەستی بەدیهێنەری ئەو جوزئییاتانەدا بن، تاکو بتوانێت بەپێی دەستوورەکانی دانست و تەرازووەکانی زانستی خۆی، پوختە و ناوەرۆك و نموونەی بوونەوەرە کوللی و گشتگیرەکان لەو جوزئی‌یاتانەدا دابنێت کە نموونەی پوخت و بچووککراوەی ئەوانن.

بەڵێ، "جوزئییات" لە ڕووی لایەنە سەرسووڕهێنەکانی سنعەت و دیاردە نامۆکانی بەدیهێنانەوە هەرگیز لە "کوللییات" کەمتر نین، چونکە جوانیی گوڵەکان لە هی ئەستێرە درەخشانەکان کەمتر نی‌یە و.. نرخ و بەهای تۆوەکانیش لە هی درەختە پێ‌گەیشتووەکان نزمتر نی‌یە. تەنانەت ئەو درەختە مەعنەوی‌یەی کە بە نەخشی "قەدەر" لە تۆوە بچووکەکەدا جێی کراوەتەوە گەلێ سەرسووڕهێنەرترە لەو درەختە بەرجەستەیەی کە "قودرەت" لە باخ و بێستاندا چنیویەتی و. بە هەمان جۆر بەدیهێنانی مرۆڤیش لە بەدیهێنانی جیهان گەلێ سەیر و سەرسووڕهێنەرترە!

جا هه‌روه‌ك ئه‌گه‌ر قورئانی دانست به‌ مه‌ره‌كه‌بی گه‌ردیله‌كانی ئه‌ثیر له‌سه‌ر "گه‌وهه‌ری یه‌كتا" بنووسرێته‌وه‌، ده‌گونجێ نرخی له‌ هی ئه‌و قورئانی عه‌زه‌مه‌ت و گه‌وره‌یی‌یه‌ زیاتر بێت كه‌ به‌ ئه‌ستێره‌كان له‌سه‌ر ڕووی ئاسمانه‌كان نووسراوه‌ته‌وه‌.. به‌هه‌مان جۆر، گه‌لێ جوزئییاتی زۆریش هه‌ن كه‌ له‌ ڕووی سنعه‌ته‌وه‌ زۆر زۆر له‌ كوللییات به‌رز و به‌نرختزن.

*سه‌رنجی پێنجه‌م:*

كه‌مێك پێشتر هه‌ندێكمان له‌ نهێنی و حیكمه‌ته‌كانی ئه‌و ئاسانی و خێراییه‌ له‌ ڕاده‌به‌ده‌ره‌ باس كرد كه‌ به‌سه‌ر به‌دیهێنانی شتان و بوونه‌وه‌رانه‌وه‌ ده‌بینرێن.

جا "بوون"ی ئه‌م شتانه‌ به‌م ئاسانی‌یه‌ بێ سنوور و خێرایی‌یه‌ له‌ڕاده‌به‌ده‌ره‌، قه‌ناعه‌تێكی گومانبڕ و ته‌واوه‌تی به‌ ئه‌هلی ئیمان ده‌دات كه‌: به‌دیهێنانی به‌هه‌شت بۆ توانستی به‌دیهێنه‌ری بوونه‌وه‌ران وه‌ك به‌دیهێنانی به‌هار و، به‌هاریش وه‌ك به‌دیهێنانی باخ و بێستان و، باخ و بێستانیش وه‌ك به‌دیهێنانی گوڵ ئاسانه‌ و حه‌شر و زیندووكردنه‌وه‌ی سه‌رجه‌می گرۆی مرۆڤیش به‌ ئه‌ندازه‌ی مراندن و زیندووكردنه‌وه‌ی یه‌ك دانه‌ كه‌س به‌لاوه‌ ئاسانه‌، وه‌ك ناوه‌رۆكی ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ ده‌ری ده‌خات كه‌ ده‌فه‌رموێ:

﴿ما خَلْقُكُم وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨).

هه‌روه‌ها زیندووكردنه‌وه‌ی سه‌رجه‌می خه‌ڵكی له‌ ڕۆژی حه‌شری مه‌زندا هێنده‌ به‌لایه‌وه‌ ئاسانه‌ كه‌ وه‌ك كۆكردنه‌وه‌ی سه‌ربازه‌ بڵاوبووه‌كان وایه‌ له‌ كاتی حه‌وانه‌وه‌دا به‌ شه‌یپووری سه‌ربازی. كه‌ ئه‌مه‌ش ناوه‌رۆكی ڕاشكاویی ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌یه‌:

﴿إنْ كانَتْ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً فَإذا هُمْ جَمِيعٌ لَدَيْنا مُحْضَرُونَ﴾ (يس:٥٣).

جا هه‌رچه‌ند ئه‌م خێرایی‌یه‌ بێ كۆتایی و ئاسانی‌یه‌ بێ سنووره‌، به‌ ئاشكرا و به‌داهه‌ت به‌ڵگه‌یه‌كی گومانبڕ و یه‌قینی‌یه‌ له‌سه‌ر: كه‌ماڵی توانستی كردگاری شكۆمه‌ند و ئاسانیی به‌دیهێنانی هه‌موو شتێك به‌لایه‌وه‌، كه‌چی لای گومڕایان بووه‌ به‌هۆی لێ تێكچوون و لێ‌ئاڵۆزان(إلتبـــاس)! چونكه‌ به‌دیهێنان و پێكهاتنی شتانیان به‌ توانستی كردگاری مه‌زن لێ ئاڵۆزاوه‌ و له‌ به‌رچاویاندا تێكه‌ڵ بووه‌. ئه‌وه‌تا ده‌بینن كه‌ به‌وپه‌ڕی ئاسانی هه‌ندێ شتانی ئاسایی دێنه‌ وجوود، ئیتر ده‌كه‌ونه‌ ئه‌و گومانه‌ی كه‌ پێیان وایه‌ ئه‌و شتانه‌ به‌دی ناهێنرێن، به‌ڵكو له‌ خۆیانه‌وه‌ پێكدێن!

دەسا فەرموو بیر لە قوولایی چالّی ئەو گەوجایەتی و نەفامی‌یە بکەرەوە کە ئەوانە تێی کەوتوون! چونکە بەلّگەی "توانستی ڕەها" دەگرن بە دەستەوە و دەیکەن بە بەلّگە لەسەر "نەبوونی ئەو توانستە" و، دەرگا لەسەر مەحالّە بێ کۆتایی و نەبڕاوەکان دەخەنە سەرپشت! چونکە دەبێ ئەو کاتە هەرچی سیفەتی کەماڵە و پێویستێکی زاتیی کردگاری شکۆمەندە، وەك: "توانستی ڕەها" و "زانستی گشتگیر" و سیفەتەکانی تری هاوچەشنیان، بە یەك بە یەکی گەردیلەکانی گشت بەدیهاتوویەك بدرێن. تاکو ئەو بەدیهاتووانە بتوانن لەخۆیانەوە خۆیان پێکبهێنن!

**وشەی یازدەهەم:** (وإليه المصير).

واتە: گەڕانەوەی ئێمە لە خانەی فەنا و نەمان بۆ خانەی بەقا و مانەوە، هەر بۆ لای ئەوە لە بارەگای ئەبەدیی خواوەندی قەدیمی باقی‌دا.. هەروەك بۆ لای ئەو دەبرێین کاتێ لە بازنەی هۆکارە زۆرەکانەوە دەدرێینە بەر بەرەو بازنەی توانستی خواوەندی تاك و تەنیا.. هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە کاتێ کە لە دنیاوە بەرەو ئاخیرەت دەڕۆین. واتە شوێنی گەڕانەوەتان تەنها دیوانی حوزووری ئەو خواوەندەیە و پەنا و دالّدەشتان هەر تەنها میهرەبانی‌یە فراوانەکەیەتی.

بەم جۆرە، ئەم وشەیە گەلێ حەقیقەتی زۆری وەك ئەمانە دەگەیەنێت.

سەبارەت بە حەقیقەتی گەڕانەوەی مرۆڤیش بۆ بەهەشت و بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەیی، کە لەم حەقیقەتانەوە وەردەگیرێن، ئەوا لە دوازدە بەلّگە بەهێزەکانی وتەی دەهەم و، شەش بنچینەکانی ناو وتەی بیست و نۆهەمدا بە چەشنێکی هێندە گومانبڕ چەسپاندوومانە کە ئیتر پێویستیان بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تر نەهێشتووەتەوە و.. ئەو دوو وتەیە بە ئەندازەی بێ گومانیی هەلّهاتنی "خۆر" لە دوای ئاوابوونی، چەسپاندوویانە:

ئەو "ژیان"ەی کە لە ڕاستی‌دا خۆرێکی مەعنەوی‌یە بۆ ئەم دنیایە، دوای ئاوابوونی بە کاولبوونی دنیا، لە بەرەبەیانی حەشردا بە چەشنێکی بەردەوام و باقی، سەرلەنوێ، هەلّدێتەوە و، بەشێکی جینني و ئادەمیزاد بە دەستکەوتنی بەختەوەریی هەمیشەیی بەهرەمەند دەبن و، بەشێکی تریشیان دووچاری بەدبەختیی هەتاهەتایی و بەردەوام دێن.

جا لەبەر ئەوەی وتەی دەهەم و بیست و نۆهەم بە جوانترین شێوە ئەم ڕاستی‌یەیان چەسپاندووە، ئەوا ئەم باسە بەو وتانە دەسپێرین و، لێرەدا هەر تەنها ئەوەندە دەلّێین کە:

کردگاری دانای ئەم گەردوونە و بەدیهێنەری حەکیمی ئەم مرۆڤـە، کـە خـواوەندێکـە خـاوەنی زانستێکی گشتگیر و ڕەهـا و ویسـتێکی کوللی و ڕەها و توانسـتێکی ڕەهایـە - وەك بـە چەشنێکی گومانـنەهێڵ لـە ڕوونکردنەوەکانی پێشـوودا چەسـپاندمان - لـە هـەموو کتێـب و پەرتووکـە ئاسمانی‌یـەکانی خـۆی‌دا بـەڵێنی بەهەشـت و بەختـەوەریی هەمیشەیی بە ئیمانداران داوە. خۆ مادەم بەڵێنی داوە، ئەوا بێ هیچ گومانێك بەڵێنەکەی دەباتەسەر و بەڵێن شکێنی سەبارەت بەو مەحاڵـە، چونکە ئاشکرایە کە نەبردنەسەری بەڵێن بە نەنگی و ناتەواوی دادەنرێت و، لـەو لاشـەوە "کەماڵی ڕەهـا" پاك و خاوێنـە لـە نـەنگی و ناتـەواوی. ئنجـا نەبردنەسـەری بـەڵێن: یـان ئـەنجامی نەزانی‌یـە، یـان هـی دەستەوسانی و کۆڵەواری. خۆ بێ هیچ گومانێك نـەزانی و دەستەوسـانی سـەبارەت بـەو خواوەنـدەوە، کـە دارای توانسـتی ڕەهـا و زانسـتی هەمەلایـەنگیرە، کـارێکی مەحاڵـە. کەواتە "بەڵێن شکێنی"ش مەحاڵە بۆ ئەو.

پاشان سەرجەمی پێغەمبەران - درووودیـان لەسـەر بێـت - لـە پێشـەنگی هەموویانـەوە سـەروەرمان فـەخری عالـەم ﷺ.. هـەروەها سـەرجەمی ئـەولیا و.. گشـت ئـەصفیا و.. هـەموو ئیمـانداران، هەمیشـە لـە نـزا و لاڵانـەوەکانیاندا داوای ئـەو بەختەوەری‌یـە هەمیشەیی‌یە لەو میهرەبانە بەخشندەیە دەکەن.

ئەمـە جگـە لـەوەی کـە هـەر هـەموویان ئـەم داواکاری‌یـەیان هـاودەم لەگـەڵ نـاوە جوانەکانی خـوای گـەورەدا پێشـکەش دەکـەن. چونکـە نـاوە جوانـەکانی خواوەنـد، لـە پێشـەکیی هەموویانـەوە سـۆز و، میـهرەبانی و، دادگـەری و، دانسـتەکەی.. هـەروەها ناوەکـانی: "الرحمـن والرحيـم والعـادل والحكيـم" و پەروەدگاریتی‌یـە ڕەهاکـەی و دەستەڵاتداری‌یە خـاوەن سام و هەیبەتەکەی و نـاوی "الـرب" و "الله" و زۆربـەی نـاوە جوانـەکانی تـری وەك ئەمانـە، داخـوازی "ئاخـیرەت" و "بەختـەوەریی هەمیشـەیی"ن. هەروەك دەشبن بـە بەڵگـە و پێکـەوە شایەتی لەسـەر هاتنـەدیی ئەو بەختەوەری‌یـە دەدەن. تەنانەت (وەك لە وتەی دەهـەمدا چەسپێنراوە) سەرانسـەری بوونـەوەران، بـە سـەرجەمی ڕاستی‌یەکانیان، ئاماژە بۆ خانەی هەمیشەیی ئەودنیا دەکەن.

پاشـان قورئـانی حـەکیم، بـە هـەزاران ئایـەتی مـەزن و بەڵگـەی ڕاسـت و ڕوون و گومانبڕی خۆی، دەرسی ئەو حەقیقەتە دەڵێتەوە و دەبێـت بە بەڵگە لەسەری..

ئنجا پێغەمبەری نازدار و خۆشەویست ﷺ کە مایەی شانازیی گرۆی ئادەمیزادە، بە درێژایی ژیانە پیرۆزەکەی و بە هەرچی هێزە کە خوای گەورە پێی داوە، وانەی ئەم حەقیقەتەی وتووەتەوە و موسڵمانانی فێرکردووە و، چەسپاندوویەتی و ڕایگەیاندووە و بینیویەتی و پیشانی غەیری خۆیشی داوە و، لەمەشدا پشتی بە هەزاران موعجیزەی ڕوون و ئاشکرای خۆی بەستووە.

اللهم صلّ وسلم وبارك عليه وعلى آله وصحبه بعدد انفاس أهل الجنـــة في الجنـــة واحشرنا وناشر هذا المكتوب ورفقاءه وصاحبه سعيداً ووالدينا وإخواننا وأخواتنا تحـت لوائه وارزقنا شفاعته وادخلنا الجنة مع آله واصحابه برحمتك يا ارحم الراحمين. آمـين.. آمين.

﴿رَبَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نَسِينا أَوْ أَخْطَأْنا﴾ (البقرة:٢٨٦).

﴿رَبَّنا لا تُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْـــكَ رَحْمَـــةً إِنَّـــكَ أَنْـــتَ الْوَهّاب﴾ (آل‌عمران:٨).

﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ۞ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ۞ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِساني ۞ يَفْقَهُـوا قَوْلِي﴾ (طه:٢٥-٢٨).

﴿رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (البقرة:١٢٧).

﴿وَتُبْ عَلَيْنا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوّابُ الرَّحِيمُ﴾ (البقرة:١٢٨).

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيم﴾ (البقرة:٣٢).

* * *

# پاشکۆی
# وشەی دەهەمی مەکتووبی بیستەم

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ

﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد:٢٨).

﴿ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُلاً فيهِ شُرَكاءُ مُتَشاكِسُونَ وَرَجُلاً سَلَماً لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيانِ مَثَلاً الْحَمْدُ للهِ بَلْ أَكْثَرُهُم لا يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر:٢٩).

**پرسیار:**

تۆ لە چەندین شوێندا وتووتە:

"یەکبوون"ی بەدیهێنەر ئەوپەڕی ئاسانیی تێدایە و، "زۆری" و "شیرك"یش لەوپەڕی سەختی و دژواریدایە. هەروەها دەڵێیت: "یەکبوونی بەدیهێنەر" تا پلەی "وجوب" کار ئاسان دەکات و "شیرك"یش تا پلەی "ئیمتیناع" سەختی و گیروگرفتی تێدایە. کەچی ئەو گیروگرفت و مەحاڵانەی کە تۆ باسیان دەکەیت لە ڕووی "یەکبوون"یشدا هەر دێنە پێش. بۆ نموونە: تۆ دەڵێیت: گەردیلەکان گەر کارمەند نەبن دەبێ هەموو یەکێ لەوان یان زانستێکی گشتگیر و توانستێکی ڕەهایان بێت، یان هەریەکەیان ئەندازەیەکی لەسنووربەدەری مەکینە و چاپخانەی مەعنەویی تێدا دانرابێت، کە ئەمەش بە سەد

چەندانە مەحاڵە.. خۆ گەر ئەو گەردیلانە بریتی بن لە کارمەندی خوایی، ئەوا دەبێ لەم حاڵەتەشدا هەریەکەیان ببن بە مەزهەرێك بۆ ئەو شتانەی کە لە گریمانەکەی تردا بە مەحاڵمان دانان، تاکو بتوانن ئەو کارمەندی و ئەرکە بێ سنوورانە ڕاپەڕێنن کە لە ئەستۆیان نراوە!

**وەڵام:**

لە چەند "وتە"یەکی زۆردا چەسپاندوومانە کە:

ئەگەر بەدیهێنانی سەرجەمی بوونەوەران بدرێتە پاڵ تەنها یەك کردگار، ئەوا کارەکە بە ئەندازەی بەدیهێنانی یەك دانە بوونەوەر ئاسان دەبێت. بەڵام گەر بدرێتە پاڵ "سروشت" و "هۆکار"ە زۆر و زەبەندەکان ئەوا بەدیهێنانی یەك دانە مێش بە ئەندازەی بەدیهێنانی ئاسمانەکان سەخت دەبێت و بەدیهێنانی گوڵێکیش بە قەدەر بەدیهێنانی بەهار و بەری درەختیش بە قەدەر بەدیهێنانی باخێك دژوار دەبێت.

جا لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە لە چەندین وتەی تردا ڕوون کراوەتەوە، ئەوا خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەکەین. بەڵام لێرەدا و لە نێوان سێ نموونەدا سێ ئاماژەی بۆ دەکەین، تاکو لە بەرامبەر ئەم ڕاستییەوە "دڵنیایی دەروون" بەدەست بهێنین.

**نموونەی یەکەم:**

گەردیلەیەکی بچووکی بریسکەدار و ڕوون، خۆی بۆ خۆی جێی ڕووناکیی دەنکە شقارتەیەکی تێدا نابێتەوە و ناشبێت بە سەرچاوەی ڕووناکییەك کە بەو ئەندازەیە بێت. چونکە تەنها بە ئەندازەی قەبارە و ماهییەتەکەی - کە وەك گەردیلەیەکی جوزئییە - دەگونجێ ڕووناکیی ڕەسەن و خۆیی ببێت. بەڵام گەر پەیوەندی بە خۆرەوە بکات و چاوەکانی ڕووبەڕووی خۆر بکاتەوە و بۆی بڕوانێت، ئەوا دەگونجێ ئەو گەردیلە بچووکە: ڕووناکی و گەرمی و حەوت ڕەنگەکانی خۆر، تەنانەت ماوەی دوورییەکەشی لە خۆیدا جێ بکاتەوە و جۆرە "مەزهەر"ێکی درەوشانەوە مەزنەکەی خۆر بەدەست بهێنێت.

بەو واتایەی کە ئەگەر ئەو گەردیلەیە بەرەڵا و بێ پەیوەندی بێت و پاڵی بە زاتی خۆیەوە دابێت ئەوا مەگەر بە ئەندازەی گەردیلەیەك دەنا ناتوانێت هیچ شتێك بکات.

بەڵام گەر ببێت بە کارمەند و ئاوێنەی خۆر و پەیوەندیی پێوە ببەستێت، ئەوا دەتوانێت چەند نموونەیەکی جوزئیی کارەکانی خۆر لە خۆیدا دەربخات.

سەبارەت بە خواوەندیشەوە – ولله المثل الأعلى – بە هەمان جۆرە، چونکە ئەگەر هەموو بوونەوەرێك، تەنانەت هەموو گەردیلەیەك بدرێنە پاڵ "زۆری" و "شیرك" و "هۆکارەکان" و "سروشت" و پاڵ خۆیشیان، ئەوا دەبێ ئەو کاتە هەموو گەردیلەیەك و گشت بوونەوەرێك: یان خاوەنی توانستێکی ڕەها و زانستێك بن کە دەوراندەوری هەموو شتێکی دابێت.. یان چەندین چاپخانە و مەکینەی مەعنەویی لەژمارەبەدەریان تێدا پێکهاتبێت، تاکو کارەکانی ئەستۆیان ڕابپەڕێنن.

بەڵام گەر ئەو گەردیلانە بدرێنە پاڵ خواوەندی تاك و تەنیا، ئەوا هەموو بەدیهاتوویەك و هەموو گەردیلەیەك پەیوەندیی پێوە دەکەن و بە وێنەی کارمەندیان لێ دێت لە بەردەستیدا و ئەم پەیوەندییەش وا لە هەموو یەکێکیان دەکات کە درەوشانەوە(تجلي)یەکی ئەو تاك و تەنیایە بەدەست بهێنێت و، بەم بەهرەمەندی و نیسبەت پەیداکردنەیان بە خواوەندی تاك و تەنیاوە هەریەکەیان پاڵ بە زانست و توانستێکی ڕەهاوە بدات و، لەم ڕێیەوە هێندە کار و ئەرکی زۆر و زەبەندە ڕادەپەڕێنێت کە ملیۆنەها جار لە سەرووی هێز و توانستی خۆیەوە بێت. ئەمەش بە هێزی بەدیهێنەرەکەی و نهێنیی ئەو پاڵ پێوەدان و پەیوەندی پێوەکردنەیەوە.

**نموونەی دووهەم:**

گریمان دوو برا هەبن، یەکێکیان: ئازایە و پشت بە خۆی دەبەستێت و بە خۆی دەنازێت. ئەوی تریشیان: جوامەرد و بەغیرەتە و بۆ بەرگری کردن لە نیشتمان ئامادەیە. جا لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا، یەکەمیان لەبەر ئەوەی بە خۆی دەنازێت، پەیوەندی بە دەوڵەتەوە ناکات، بەڵکو حەز دەکات هەر تەنها بۆ خۆی کارەکانی ئەنجام بدات و ڕووبەڕووی دوژمن ڕابوەستێت. دیارە ئەم "بەخۆنازین"ەی ناچاری دەکات کە هەر بە کۆڵی خۆی سەرچاوەکانی هێز و توانای هەڵبگرێت و تەقەمەنی و پێداویستییەکانیشی بەم توانستە کەم و دیاری کراوەی خۆی بۆ بەرەی جەنگ بگوێزێتەوە. بۆیە هەر تەنها بە ئەندازەی ئەو هێزە کەسی و کەمەی خۆی دەتوانێت ڕووبەڕووی دوژمن بجەنگێت.

دەبینیت ئەوپەڕی توانای لەوەدایە کە بەرەنگاری هێزی عەریفێکی سوپای دوژمن ڕابوەستێت، نەك زیاتر..

بەڵام براکەی تر، کە بە خۆی نانازێت، بەڵکو خۆی بە دەستەوسان و بێ هێز دادەنێت، پەیوەندیی بە پادشا و دەوڵەتەوە کرد و بوو بە "سەرباز". ئیتر بەم پەیوەندی کردنەی بە سەربازی‌یەوە سوپای مەزنی دەوڵەت بوو بە خاڵی پاڵ پێوەدانی و، بە هێزێکی مەعنەویی مەزنەوە کە بەرامبەر هێزی سوپایەکی مەزن بێت و لەو پەیوەندی پێوەکردنەوە بەدەستی هێنابوو، ڕۆشتە ناو گەرمەی جەنگەوە، چونکە دەگونجێ پادشا ئەو هێزە مەزنەی بۆ جەم بکات. بەم جۆرە لە جەنگدا بەردەوام بوو هەتا ڕووبەڕووی موشیرێکی سوپای دوژمنی شکست پێهاتوو بووەوە و، بە ناوی پادشاوە دیلی کرد و هێنایەوە بۆ ناو سەربازگەکەی.

نهێنی و حیکمەتی ئەم حاڵەتە لەوەدایە کە:

کەسی یەکەمی سەربەخۆ، لەبەر ئەوەی ناچار بوو سەرچاوەکانی هێز و پێداویستی و تەقەمەنی‌یەکانی بۆ خۆی هەڵبگرێت، ئەوا هەر تەنها کارێکی یەکجار جوزئیی پێ ئەنجام درا. بەڵام ئەم سەربازە کارمەندە ناچار نی‌یە بۆ خۆی سەرچاوەکانی هێز و پێداویستی‌یەکانی هەڵبگرێت، بەڵکو کەرتەکانی سوپا - بە فەرمانی پادشا - بۆی هەڵدەگرن. ئیتر ئەم یەکەیان بەو پەیوەندی و نیسبەت پەیداکردنەی بە دەوڵەتەوە، کارێك دەکات کە خۆی بەو هێزە مەزنەی پادشا و دەوڵەتەوە بەستێت، کتومت وەك ئەوەی کە ئامێری تەلەفۆنەکەی خۆی بەهۆی وایەرێکی ئاسایی‌یەوە ببەستێت بە سەنتەری تەلەفۆنەکانی دەوڵەتەوە.

سەبارەت بە خواوەندیش - ولله المثل الأعلى - گەر هەرچی گەردیلە و بەدیهاتوو هەن هەموویان ڕاستەوخۆ پاڵ بە خواوەندی تاك و تەنیاوە بدەن و پەیوەندیی پێوە بکەن، ئەوا ئەو کاتە "مێروولە" قەڵای فیرعەون لەناو دەبات و کۆشك و تاراجی دەڕووخێنێت و.. "مێشوولە"ش نەمروود لەناو دەبات و بەرەو دۆزەخی دەنێرێت و.. "میکرۆب"ێکی بچووکیش ستەمکارێکی سەرسەخت گۆڕبەگۆڕ دەکات و.. "تۆو"ی بچووکی سنەوبەریش وەك کارگەیەکی لێ دێت بۆ درەختی سنەوبەر کە بە ئەندازەی

چیایەك گەورە و بەرزە و.. "گەردیلەکانی هەوا"ش دەتوانن گەلێ کاری ڕێکوپێك و جۆراوجۆری گوڵ و بەروبوومەکان ڕاپەڕێنن و بڕۆنە ناو پێکهاتە جۆراوجۆرەکانیانەوە.. هەموو ئەم کارانەش بەهۆی توانا و دەستەڵاتی بەدیهێنەر و گەورە و خاوەنی ئەو بەدیهاتووە و بەهۆی هێزی ئەو پەیوەندی کردنەوەیە. جا ئەم هەموو ئاسانی‌یە بینراوە - بە ئاشکرا و بەداهەت - لەو کارگرتنەئەستۆ و پەیوەندی کردنەوە سەرچاوە دەگرن..

دەنا گەر ئەم کارە پێچەوانە بێتەوە و هەڕەمەکی و بەرەڵایی بێتە کایەوە و هەر شتە و پشت بە "خۆی" و "هۆکارەکان" و "شتانی زۆر و زەبەندە"وە ببەستێت و ڕێی "شیرك" بگرێتەبەر، ئەوا مەگەر بە ئەندازەی قەبارە و هەست و شعووری خۆی دەنا هیچ کارێك ناتوانێت ئەنجام بدات.

**نموونەی سێهەم:**

گریمان دوو هاوڕێ هەبن بیانەوێت هەریەکەیان باس(بحث)ێك بنووسن کە چەند زانیاری‌یەکی لەمەڕ ئامار و جوگرافیای چەند وڵاتێکەوە تێدا بێت کە هەرگیز بەچاو نەیانبینیوە و سەردانی ئەو شوێنانەشیان نەکردووە..

یەکێکیان دەچێ پەیوەندی بە پادشای ئەو وڵاتانەوە دەکات و دەڕواتە ناو فەرمانگەی پۆست و تەلگرافەوە و لەوێ بەرامبەر کرێیەکی کەم، هێڵی تەلەفۆنەکەی بە هێڵی بەدالەی دەوڵەتەوە دەبەستێت و لەم ڕێیەوە دەتوانێت پەیوەندی بە هەموو لایەنەکانی دەوڵەتەوە بکات و زانیاری‌یەکانیان لێ وەربگرێت. ئیتر بەم جۆرە ئەم یەکەیان باسێکی لەوپەڕی باشی و وردی و زانستی و بابەتی‌یانەدا سەبارەت بە ئامارە جوگرافی‌یەکان دەنووسێت.

بەڵام ئەوی تریان ماوەی پەنجا ساڵ لە گەشت و گەڕاندا دەبێ و خۆی دووچاری گیروگرفت و مەترسی‌یەکان دەکات تاکو بۆ خۆی ئەو شوێنانە ببینێت و ڕووداوەکانیش بە گوێی خۆی ببیستێت.. یان دەچێ ملیۆنەها لیرە خەرج دەکات تاکو بە وێنەی دەوڵەت و ایەرەکانی تەلەفۆن ڕابکێشێت و وەك دەوڵەتیش خاوەنی ئامێری بروسکە و گفتوگۆ گواستنەوە بێت تاکو بتوانێت وەك هاوڕێکەی باسێکی بەنرخ بنووسێت!

بە هەمان جۆر - ولله المثـــل الأعلـــى - گەر بوونەوەرانی بێ سنوور و شتانی لەژمارەبەدەر بدرێنە پاڵ خواوەندی تاك و تەنیا، ئەوا ئەو کاتە بەهۆی ئەو پەیوەندی‌یەوە هەموو شتێك "مەزهەر"ێکی ئەو پەیوەندی‌کردنە بەدەست دەهێنێت و دەبێت بە شوێنێکی تیادرەوشانەوەی ئەو نوورە ئەزەلی‌یە. ئیتر ئەو شتە چەندین جۆری پەیوەندی بە یاساکانی دانست و دەستوورەکانی زانست و قانوونەکانی توانستی ئەو خواوەندە تاك و تەنیایەوە دەبەستێت و هەموو شتێك بە هێز و توانای خوای گەورە دەبینێت و بە تەجەللی‌یەکی پەروەردگاریی ئەوتۆش بەهرەمەند دەبێت کە لە بریی ئەو بینینەی خواوەندە کە سەیری هەموو شتێکی پێ دەکات و ئەو ڕووەشی کە ڕووی پێ دەکاتە هەموو شتێك و گوفتارەکەشی کە لە هەموو شتێکدا جێ‌بەجێ‌یە.

بەڵام گەر ئەو پەیوەندی‌یە بپچڕێت و نەمێنێت، ئەوا پەیوەندیی هەموو شتێك بەو شتەوە دەپچڕێت و ئەو شتەش بچووك دەبێتەوە و دێتەوەیەك تا بە ئەندازەی قەبارەکەی خۆی لێ دێت. دیارە لەم حاڵەتەدا دەبێ خاوەنی خوایەتی‌یەکی ڕەها بێت تاکو بتوانێت ئەو کارانە ڕابپەڕێنێت کە لە دۆخی یەکەمدا بە ئاسانی ئەنجامی دەدان!

**پوختەی ئەم قسانە:**

ڕێی "یەکتایی" و "ئیمان" تا پلەی "وجوب" ئاسانیی ڕەهای تێدایە. بەڵام ڕێی "شیرك" و "هۆکارەکان" و "زۆری" تا پلەی "ئیمتیناع" سەختی و گیروگرفتی تێدایە. چونکە ئەو "تەنها یەك" بەدیهێنەرە بارێکی دیاریکراو بە چەندەها شتی زۆر و زەبەندە دەبەخشێت و بێ هیچ ئەرك و ماندووبوونێکیش ئەنجامێکی دیاریکراویان لێ بەدەست دەهێنێت. بەڵام گەر دەستنیشان کردنی ئەو بارە و بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامە بخرایەتە ئەستۆی شتە زۆر و زەبەندەکانەوە، ئەوا مەگەر بە چەندین ئەرك و سەختی و جموجووڵی یەکجار زۆر و زەحمەت، دەنا ئەو کارە لە تواناندا نەدەبوو.

جا هەروەك لە مەکتووبی سێ‌هەمدا وتراوە:

هاتوچۆی سوپای ئەستێرەکان لە مەیدانی ئاسمانەکاندا بە سەرکردایەتیی خۆر و مانگ و، بەخشینی دیمەنێکی جوان و ڕەنگینی زیکر و تەسبیح و بارێکی دڵڕاز و سەرنج

ڕاکێش بە: هەموو "شەو"ێك و گشت "ساڵ"ێك.. هەروەها ئاڵوگۆڕ کردنی وەرزەکان و بەدیهێنانی بەرژەوەندی و ئەنجامە بەرز و پڕ لە دانستەکانی زەوی..

گەر هەموو ئەم کارانە بدرێنە پاڵ "تاکی"، ئەوا پادشای ئەزەلی و ئەبەدی بەوپەڕی ئاسانی و بە وێنەی بزواندنی یەك دانە سەرباز دەیانجوولێنێت و، گۆی زەویش - کە وەك سەربازێك وایە لە سوپای ئاسماندا - ملکەچ و گوێڕایەڵ دەکات و، سەرکردایەتیی گشتیی تەن و قەبارە بەرزەکانی دەخاتە ئەستۆ. جا هەر ئەوەندەی "زەوی" ئەم فەرمانە وەردەگرێت، مەستی خۆشیی ئەم کار پێ سپاردنە دەبێت و بە وێنەی موریدی تەریقەتی مەولەوی لە شەوق و شادمانیدا جەزبەی لێ دێت و، بەم جۆرە و بە ئەرکێکی یەکجار کەم، ئەو بارە جوان و ئەنجامە گرنگانە دێنەدی.

بەڵام گەر بە "زەوی" بوترێت: ڕاوەستە و خۆت لەم کارەدا هەڵمەقورتێنە. ئنجا بەدەستهێنانی ئەو بار و ئەنجامانە بە خودی ئاسمانەکان بسپێررێت و، لە بریی "تاکی" ڕێگای "زۆری" و "شیرك" بگیرێتەبەر، ئەوا ئەو کاتە دەبێ ملیۆنەها ئەستێرە کە هەریەکەیان بە هەزاران جار لە گۆی زەویمان گەورەترن، هەموو ڕۆژ و هەموو ساڵێك ماوەی ملیارەها ساڵ ڕێ بە بیست و چوار سەعات ببڕن!

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

قورئانی پیرۆز کاروباری بوونەوەرە بێ سنوورەکان ڕاستەوخۆ دەداتە پاڵ کردگاری تاك و تەنیا و، بەمەش ڕێگایەکی ئاسانی تا پلەی "وجوب" دەگرێتە بەر و، خەڵکیشی بۆ لا بانگ دەکات. ئیماندارانیش هەمان کار ئەنجام دەدەن.

بەڵام ئەهلی "شیرك" و لەخۆبایی، بەوەی کە هەموو یەکێ لە بەدیهێنراوان دەدەنە پاڵ چەندین هۆکاری بێ سنوور، ئەوا ڕێیەکی سەختی تا پلەی "ئیمتیناع" دەگرنەبەر. کەچی هەرچی بەدیهاتوو هەن لە ڕێبازەکەی قورئاندا یەکسانن بە یەك بەدیهاتوو، تەنانەت بەدیهێنانی هەموو شتان لەسەر دەستی خواوەندی تاك و تەنیادا گەلێ ئاسانترە لە بەدیهێنانی یەك شت لە لایەنی شتانی لەژمارەبەدەرەوە.

چونکە تەنها یەك ئەفسەر بە وێنەی ئاسانیی سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی کاری یەك سەرباز، هەزار سەرباز بەڕێوەدەبات و کاروباریان دەسازێنێت. بەڵام گەر کاری یەك

دانە سەرباز بە هەزار ئەفسەر بسپێررێت، ئەوا هەزار و یەك ئەوەندە سەختی و گیرو گرفتی دێتەرێ و، ئالۆ گۆڕ و شڵەژان و دژایەتی لە نێوانیاندا بەرپا دەبێت.

بەم جۆرە، ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە زللە بەهێزەکانی خۆی دەسرەوێنێتە کەللە سەری ئەهلی شیرك و دەیتەقێنێتەوە:

﴿ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَجُلاً فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشاكِسُونَ وَرَجُلاً سَلَماً لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيانِ مَثَلاً الْحَمْدُ للهِ بَلْ أَكْثَرُهُم لا يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر:٢٩).

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللهم صلّ وسلم على سيدنا محمد بعدد ذرّات الكائنات وعلى آله وصحبه أجمعين آمين.. والحمد للّه رب العالمين.

اللهم يا أحد يا واحد ياصمد يا مَن لا إله إلاّ هو وحده لاشريك له.. يا مَن له الملك وله الحمد.. يا مَن يحيي ويميت.. يا مَن بيده الخير.. يا مَن هو على كل شئ قدير.. يا مَن اليه المصير.. بحق أسرار هذه الكلمات اجعل ناشر هذه الرسالة ورفقاءه وصاحبها سعيداً من الموحدين الكاملين ومن الصدّيقين المحققين ومن المؤمنين المتقين. آمين.

اللهم بحق سرّ أحديتك اجعل ناشر هذا الكتاب ناشراً لأسرار التوحيد وقلبه مظهراً لأنوار الايمان ولسانه ناطقاً بحقائق القرآن.

آمين.. آمين.. آمين.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی بیست و یەکەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿وَقَضى رَبُّكَ أَلاّ تَعْبُدُوا إلاّ إيّاهُ وَبالْوَالِدَيْنِ إحْسَاناً إمّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أحَدُهُما أوْ كِلاهُما فَلا تَقُلْ لَهُما أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُما وَقُلْ لَهُما قَوْلاً كَرِيماً ۞ وَاخْفِضْ لَهُما جَناحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْـــمَةِ وَقُلْ رَبِّ ارْحَـــمْهُما كَما رَبَّيانـــي صَغِيراً ۞ رَبُّكُمْ أعْلَمُ بِما في نُفُوسِكُمْ إنْ تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإنَّهُ كانَ لِلأوّابِينَ غَفُوراً ۞﴾ (الإسراء:٢٣-٢٥)

برای بێ ئاگام!

ئەی ئەو کەسەی کە باوکێك یان دایکێکی پیر، یان یەکێك لە خزمانی، یان برایـەکی ئایینیی پەك کەوتە، یان هەر کەسێکی کۆڵەواری نەخۆش لە ماڵیدا دەژی!

بە وردی سەرنج لەم ئایەتە پیرۆزە بدە و بزانە کە چۆن تەنها یـەك ئایـەت پێنـج جـۆری میهرەبانی و بە چەند شێوەیەکی جیاجیا بۆ دایك و باوك بە دەست دەهێنێت.

بەڵێ، بەرزترین حەقیقەتی دنیا بریتی‌یە لە سۆز و بەزەیی و میهرەبانیی دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان، هەروەهـا بەرزترین مافیش مافی ڕێز لێگرتنیانە لە بەرامبـەر ئـەو شـەفەقەت و بەزەیی‌یـەوە. چونکـە دایـك و بـاوك، بەوپـەڕی لـەزەت چەشـتن و بەختیاری‌یـەوە، ژیـانی خۆیان لە پێناوی ژیانی منداڵەکانیاندا بەخت دەکەن.

لەبەر ئەمە، گەر هەر کەسێك مرۆڤێتیی خـۆی لەدەسـت نـەدابێت و نەچووبێتـە ڕیـزی ئاژەڵەوە، بەوپەڕی دڵسۆزی‌یەوە ڕێزی ئەو خۆشەویستە بەڕێز و قوربانیدەرە ڕاستەقینانە

دەگرێت و، بە ڕاستی خزمەتیان دەکات و تێدەکۆشێت دڵیان شاد و خۆش بکات و ڕەزامەندییان بەدەست بهێنێت. دەبێ بیشزانین کە خوشك و برای باوك لە حوکمی باوکدان و، خوشك و برای دایکیش لە حوکمی دایکدان. جا بە قورس زانینی بوونی هەرکام لەو پیرە موبارەکانە، یاخود حەزکردن بە مردنیان، تابڵێی بێ ویژدانی و کەم نرخی و نزمییە. ئەمە باش بزانە و بێداربەرەوە!

بەڵێ، باش تێبگە و بزانە کە حەزکردن لە نەمانی کەسێك ژیانی خۆی لە پێناوی تۆدا بەخت کردووە، چەندە ستەمێکی سەخت و بێ ویژدانییەکی گەورەیە.

ئەی ئەو کەسەی کە لە خەم و خەفەتی ژیاندایە!

باش بزانە کە ستوونی بەرەکەت و هۆکاری میهرەبانیی ناو ماڵەکەت و هۆی دوورخستنەوەی دەرد و بەڵا، تەنها هەر ئەو پیرە پەککەوتەیە، یاخود ئەو کەسە کوێرەی خزمەتە کە بوونی بە قورس دەزانیت!

هەرگیز مەڵێ: دەستم کورتە و ناتوانم خزمەتیان بکەم! نەخێر، گەر ئەو بەرەکەتە نەبوایە کە بەهۆی بوونی ئەو کەسانەوە دەستت دەکەوێت و بەسەرتدا دەبارێت، دەستت لەوە زیاتر کورت دەبوو، هەروەك ڕۆزییەکەشت دەچووە قاتی. ئەم ڕاستییە لە من وەربگرە و باوەڕی پێ بکە، چونکە هێندە بەڵگەی سەلمێنەرم سەبارەت بەم ڕاستییە لە لایە کە دەتوانم بە تۆشی بسەلمێنم. بەڵام بۆ ئەوەی دوور نەڕۆین و درێژەی پێ نەدەین، کورتی دەکەمەوە بۆت.

جا تۆش باوەڕت بەم قسەیەم هەبێت و، منیش سوێندت بۆ دەخۆم کە ئەم ڕاستییە لەوپەڕی بێ گومانیدایە. تەنانەت نەفس و شەیتانەکەشم ملیان بۆ کەچ کرد و تەسلیم بوون. خۆ شتێکی بێ گومانە کە ڕاستییەك بتوانێت شەیتانەکەم تووڕە بکات و دەروونی سەرکەشی بەدخوازیشم بشکێنێت، دەتوانێت بە تۆیشی بسەلمێنێت و قەناعەتت پێ بکات.

بەڵێ، خوای پەروەردگار، کە بە شایەتیی هەموو بوونەوەرانی ناو گەردوون: شکۆمەندی بەخشندە و میهرەبان و نیان و خاوەن کەرەمە، کاتێ کە ئەم خواوەندە مناڵان دەنێرێتە جیهانی دنیا، یەکسەر - بە لوتفی خۆی - ڕۆزییەکانیشیان بە دوادا دەنێرێت، وەك پڕکردنی مەمکان و تەقینەوەیان چەشنی سەرچاوەی ئاو بەرەو دەمی ئەو ساوایانە.

هەر ئەو خواوەندە ڕۆزیی پیر و پەككەوتەکانیش - کە وەك منالّیان لێ هاتووە، تەنانەت لە منالّیش زیاتر پێویستیان بە بەزەیی و میهرەبانییە - لە شێوەی بەرەکەتدا دەنێرێت و، هەرگیز بەخێوکردنیان ناخاتە ئەستۆی ئەو ڕژد و پیسکە و دەست نووقاوانەی خەڵکی. چونکە ئەو ڕاستییەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە ڕایدەگەیەنن:

﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ (الذاريات:٥٨)..

﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ دَابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَها اللهُ يَرْزُقُها وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾(العنكبوت:٦٠)..

ڕاستییەکە بەخشندەیی و کەرەمی لێ دەچۆڕێت و زمانی حالّی هەموو زیندەوەرە جۆراوجۆرەکان دەری‌دەبڕن و دانی پێدا دەنێن.

ئنجا نەك هەر تەنها ڕۆزیی ئەو پیر و پەككەوتە و خزمانە لە شێوەی بەرەکەتدا دێن، بەڵکو هەندێ گیانلەبەری تریش کە خوای گەورە کردوونی بە هاوەڵی مرۆڤ، وەکو "پشیلە"، بە هەمان جۆر لە شێوەی بەرەکەتدا و لە نێوان ڕۆزیی مرۆڤدا ڕۆزی‌یان بۆ دەنێررێت! ئەو شتەش کە پشتی ئەم قسەیەم دەگرێت، ئەم ڕووداوەیە کە بۆتانی دەگێڕمەوە و بە چاوی خۆم دیومە:

هەروەك خۆشەویستە نزیکەکانم ئاگادارن، دووسێ ساڵ پێش ئێستا بەشی خۆراکی ڕۆژانەم تەنها نیو کولێرە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کولێرەی ئەو گوندەی کە تیای‌دا بووم لەچاو هی شوێنانی تردا بچووك بوون، تەنانەت جاری وا دەبوو بەشی نەدەکردم. پاشان چوار پشیلە بوون بە میوانم! کەچی هەر ئەو لەتە کولێرەیە بەشی من و ئەوانیشی دەکرد و هەندێ جار لێشمان دەمایەوە! ئەم ڕووداوەش چەندین جار دووپات بووەوە، بە ڕادەیەك قەناعەتی تەواوم پەیدا کرد کە من سوودم لە بەرەکەتی ئەو پشیلانە وەردەگرت! وا ئێستا ڕایدەگەیەنم و ئاشکرای دەکەم کە ئەو پشیلانە هەرگیز کۆڵێکی قورس نەبوون بەسەر شانمەوە و ئەوان هەرگیز لە ژێر منەتی مندا نەبوون، بەڵکو من لە ژێر منەتی ئەواندا بووم!

جا برای مرۆڤم!

لە کاتێکدا کە ئاژەڵێکی دڕندەئاسا - کە پشیلەیە - بێت بە میوانی ماڵێك و بەو جۆرە بێت بە تەوەرەی بەرەکەتی ئەو ماڵە، ئەی ئایا گەر بەڕێزترین بوونەوەر - کە

مرۆڤە - بڕواتە ئەوماڵەوە دەبێ چۆن بێت؟ کە باشترین مرۆڤیش باوەڕدار بێت و باشترین باوەڕدارێك کە شایستەی خزمەتکردن و خۆشەویستی بن ئەو نەخۆشە پیرانە بن و لەناو ئەوانیشدا دڵسۆزترین هاوەڵ و ڕاستترین خۆشەویست کە دایك و باوکن!

ئیتر بۆ خۆت ئەمە لێك بدەرەوە و بزانە کە چ بەرەکەتێکی گەورە و چ هۆکارێکی دەستکەوتنی میهرەبانی و دوورخستنەوەی موسیبەتن لەو ماڵە! وەك ناوەڕۆکی ئەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە دەگەیەنێت کە دەفەرمویٚ:

"لولا الشيوخُ الرُّكَّعُ لَصُبَّ عليكم البلاءُ صبّاً"[1].

کەواتە برای مرۆڤم!

سەرنج بدە و بیر بکەرەوە و پەند وەربگرە. ئنجا ئەوەش بزانە کە ئەگەر تۆ بەم زووانە نەمریت، خۆ هەر دەبێ پیر ببیت. جا ئەگەر تۆ ئێستا ڕێز لە دایك و باوکت نەگریت، ڕۆژێك دێتە ڕێی تۆش کە مناڵەکانت هیچ ڕێزێکت لێ نەگرن، چونکە ئەو نهێنییەی کە خوای گەورە لە "الجـــزاءُ مِـــنْ جنـــسِ العمـــل"دا دایناوە، ئەمەمان بە باشی پێ دەسەلمێنێت.

جا ئەگەر دواڕۆژی ئەودنیای خۆتت خۆش دەوێت، ئەوا ئێستا گەنجینەیەکی گەورەت لە بەردەستدایە، فریای بکەوە با لە کیست نەچێت. دەستکەوتنیشی تەنها بە خزمەتگوزاری و ڕازیکردنی دڵی دایك و باوك دەبێت.

خۆ ئەگەر دنیاشت خۆش دەوێت، هەر هەوڵ بدە ڕەزامەندییان بەدەست بهێنە و هەمیشە سوپاسیان پێشکەش بکە، با ژیانی دنیات بە حەوانەوە بەسەر بەریت و ڕۆزییەکەشت بەهۆی بەرەکەتی ئەوانەوە دەستگیر ببێت. دەنا بەقورسزانینی ئەوان و حەزکردنت بە مردنیان و بریندارکردنی دڵە ناسکەکانیان وا لەو کەسە دەکات کە حەقیقەتی ئایەتی: ﴿خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ﴾ی (الحج:١١) بەسەردا بچەسپێت.

---

(١) لە سەرچاوەکاندا بەم جۆرەیە: (لولا عباد لله ركّع وصبية رضّع وبـهائم رتّع لصُبّ عليكم البلاء - وفي رواية العـذاب - صبـاً). واتە: ئەگەر لەبەر پیرانی نوێژپاك و منالآنی شیرەخۆر و ئاژەڵانی موحتاج بە لەوەڕنەبوایە، ئەوا دەردوبەڵاتان بەسەردا دەباری. رواه الطيالسي والطبراني وابن منده وابن عدى وغيرهم عن أبي هريرة رفعه... ورواه السيوطي في الجامع الصغير - الحديث نفسه - ثم رُص رصّاً، قال المناوي نقلاً عن الهيثمي. وهو ضعيف. (باختصار عن كشف الخفاء ١٦٣/٢). (وەرگێڕ)

خۆ ئەگەر تۆ بە دوای میهرەبانیی خواوەندی "ڕەحمان" و "ڕەحیم"دا دەگەڕێیت، ئەوا با بەزەییت بە سپاردە وئەمانەتەكانی ئەو خواوەندە "ڕەحمان"ەدا بێتەوە كە لای تۆ داینا‌ون.

برایەكم هەبوو لە برایانی ئاخیرەت ناوی "مستەفا چاوش"[٢] بوو. دەمبینی هەمیشە لە كاروباری دین و دنیایدا سەركەوتووە و، منیش نەمدەزانی چ نهێنییەك لەمەدا هەیە. پاشان بۆم دەركەوت كە ئەم پیاوە موبارەكە زانیبووی مافی دایك و باوك بەسەریەوە چییە، بۆیە بە ڕێكوپێكی چاودێریی ئەو مافانەی كردبوو. هەر لەبەر ئەوەش حەوانەوە و میهرەبانیی لە دنیادا دەستگیر بووبوو.

ئومێدەوارم كە – پشت بەخوا – قیامەتیشی پێ ئاوەدان كردبێتەوە.

جا هەركەسێك كە دەیەوێت بەختەوەر بێت، با چاو لەو بكات و وەك ئەو وابێت.

اللهم صل وسلم على مَن قال: "الجنةُ تحتَ اقدام الامهات"[٣] وعلى آله وصحبه أجمعين.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

---

(٢) مستەفا چاوش: ناوی تەواوەتیی: "خلوصی مصطفى"یە و سالی ١٨٨٢ز لە دایك بووە. لە "بارلا" خزمەتی مامۆستا نوورسیی كردووە. لە مانگی شوباتی سالی ١٩٣٩ز و لە تەمەنی پەنجاوحەوت سالیدا دنیای فانیی جێهێشتووە، خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٣) حديث: (**الجنة تحت اقدام الامهات**) عزاه السيوطي في الجامع الصغير (٣٦٤٢) الى القضاعي والخطيب في الجامع وقال الحاكم صحيح الإسناد ووافقه الذهبي وأقره المنذري إلاّ أنه ضُعف بهذا اللفظ. انظر ضعيف الجامع الصغير وزيادته (٢٦٦٥) وكشف الخفاء (١/٣٣٥). قلت: ويغني عنه مايلي:

عن معاوية جاهمة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ "الزم رجلها فثمَّ الجنة". حسن: في صحيح الجامع الصغير وزيادته (١٢٥٩): رواه ابن ماجة قال المحقق: حسن.

وعن جاهمة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ "الزمها فان الجنة تحت أقدامها" يعني الوالدة. حسن: في صحيح الجامع الصغير وزيادته (١٢٦٠) رواه أحمد والنسائي قال المحقق: حسن.

# مەكتووبی بیست و دووهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

ئەم پەیامە لـە دوو باس پێكهاتووە

## باسی یەكەم

**(ئەم باسە، ئیمانداران بۆ برایەتی و خۆشەویستی بانگ دەكات)**

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿إنَّمَا الْمُؤْمِنونَ إخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُم﴾ (الحجرات: ١٠)

﴿إدْفَعْ بالَّتي هِيَ أَحْسَنُ فَإذَا الّذي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَميمٌ﴾ (فصلت: ٣٤)

﴿وَالْكَاظِمينَ الْغَيْظَ وَالْعَافينَ عَنِ النَّاسِ واللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنين﴾ (آل عمران: ١٣٤)

ئـەو دووبـەرەكی و دووڕوویی‌یـەی كـە بـەهۆی لایـەنگیری و حەسـوودی و سەركەشی‌یەوە لـە نێـوان ئـەهلی ئیمـاندا پـەیدا دەبـن.. هـەروەها ئـەو ڕق و كینـە و دوژمنایەتی‌یەش لـە دەروونیـاندا دروست دەبن، هـەرگیز "حەقیقـەت" و "حیكمـەت" قبووڵی ناكەن و، ئایینی ئیسلامیش - كـە گیـانی مرۆڤایەتی‌یە - پێی ڕازی نـابێت. ئەمە

سەرەڕای ئەوەی کە "دوژمنایەتی" خۆی لە خۆیدا ستەمێکی لەڕادەبەدەرە و، هەموو لایەنە خۆیی و کۆمەڵایەتی و مەعنەوی‌یەکانی ژیانی مرۆڤ تێکدەدات و، دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا بە گشتی.

وا ئێمەش لە نێوان ئەو لایەنە زۆرانەی کە لەم حەقیقەتەدا هەن، شەش لایەن باس دەکەین:

## لایەنی یەکەم

## دوژمنایەتی‌کردنی مرۆڤ لەگەڵ برای مرۆڤی خۆی‌دا لە ڕوانگەی "حەقیقەت"ەوە بە ستەم دادەنرێت

ئەی ئەو کەسەی کە دەروونی لە ڕق و دوژمنایەتی‌کردنی برای باوەڕداری خۆی پڕ بووە! ئەی نامەرد!

گریمان ئێوە لەناو کەشتی‌یەك یان خانوویەکدا بن و، نۆ کەستان بێ تاوان و تەنها یەکێکتان تاوانبار بێت.. وا دابنێ لەم حاڵەتەدا یەکێك دەیویست کەشتی‌یەکەتان نوقم بکات، یان خانووەکەتان بەسەردا برووخێنێت. دیارە لە کاتێکی وادا بەوپەڕی توانای خۆتەوە هاوار دەکەیت و لە دژی ئەو ستەمکاری‌یە ناڕەوایە ڕادەوەستیت و پێی ڕازی نابیت. چونکە هیچ یاسایەك نی‌یە ڕێ بە نوقم‌کردنی کەشتی‌یەکی پڕ لە تاوانبار بدات، مادەم تەنها یەك کەسی بێ تاوانی تێدا بێت.

جا هەروەك ئەم کارە غەدر و ستەمێکی ئاشکرا و ڕوونە، هەر بەو جۆرەش ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی‌کردنت لەگەڵ برای ئیماندارتدا (کە بینا و خانوویەکی پەروەردگاری و کەشتی‌یەکی خوایی‌یە) لە پێناوی ئەوەی کە تەنها "یەك" سیفەتی تاوانکارانەی تێدایە کە زیانت پێ دەگەیەنێت و بێزاری کردوویت، لە کاتێکدا کە "نۆ" سیفەتی بێ تاوان، بەڵکو بیستیشی تێدایە، وەك: ئیمانداری و، ئیسلامەتی و، دراوسێیەتی و... هتد. ئەم کارە بە ستەم و تاوانێکی زۆر گەورە دادەنرێت. چونکە ئەم ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی‌یە گەر بەردەوام بێت، وات لێ دەکات کە پڕ بە دڵ حەز بکەیت بە جۆرێکی مەعنەوی کەشتیی ژیانی نوقم بکەیت و، هەوڵ بدەیت بینا و خانووی جەستەی، بە سووتاندنێکی مەعنەوی، بسووتێنیت.

جا ئایا ئەم ستەم و تاوانەی کە لەم کارەدایە، لەوەی ناو نموونەکە زیاتر نی‌یە؟

## لایەنی دووهەم
### لە ڕوانگەی "حیکمەت"یشەوە دوژمنایەتی بە ستەم دادەنرێت

چونکە دوژمنایەتی و خۆشەویستی - وەك ئاشکرایە - دوو شتی دژ و پێچەوانەی یەکترین و، وەك تاریکی و ڕووناکی وان کە هەرگیز یەك ناگرن و بە جۆرێکی ڕاستەقینە بە یەکەوە کۆنابنەوە..

جا ئەگەر هۆکارەکانی خۆشەویستی کۆبوونەوە و پەرەیان سەند و لە دڵدا ڕیشەیان داکوتا، ئەوا دوژمنایەتی‌یەکە دەبێتە شتێکی ڕواڵەتی، بەڵکو لەوەش تێپەڕ دەکات و شێوەی میهرەبانی و بەزەیی لە خۆی دەگرێت. چونکە مرۆڤی باوەڕدار برای باوەڕداری خۆی خۆش دەوێت و ئەو خۆشەویستی‌یەش شتێکی پێویستە لەسەری. کەواتە هەر ڕەفتارێکی ناشیرین لە براکەیەوە ببینێت، هانی دەدات کە بەزەیی پێدا بێتەوە و، هەوڵ بدات بە هێمنی و لەسەرخۆیی - نەك بە خۆسەپاندن و هێز خستنەکار - هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی‌دا دەفەرموێ:

(لا يحل لرجلٍ أن يَهجُرَ أخاه فوق ثلاث ليال، يلتقيان فيعرض هذا ويعرض هــــذا، وخيرهما الذي يبدأ بالسلام)[1].

بەڵام ئەگەر هۆکارەکانی ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی پەرەیان سەند و ڕەگ و ڕیشەیان لە دڵدا بڵاوکردەوە، ئەوا خۆشەویستی‌یەکە دەبێتە شتێکی ڕواڵەتی و دەچێتە قالبی ڕیاکاری‌یەوە.

کەواتە ئەی مرۆڤی ستەمکار!

بزانە چەندە ستەمێکی گەورەیە کە مرۆڤی ئیماندار ڕق و کینە لە برای خۆی هەڵبگرێت و دوژمنایەتیی لەگەڵدا بکات!

هەروەك ئەگەر چەند بەردە وردەیەکی بێ نرخ بە گەورە بزانیت و پێت وابێت لە "کەعبە" پیرۆزتر و لە چیای "ئوحود"یش گەورە و بەرزترن، بە نەفام دادەنرێیت.. هەر بەو جۆرەش گەر چەند هەڵەیەکی ساکاری کەم نرخ و بێ بایەخی وەك بەردە وردەکان

---

(١) رواه البخاري ومسلم. واتە: حەڵاڵ نی‌یە هیچ کەسێك لە سێ شەو زیاتر دەنگ لە براکەی دابپڕێت، بە جەشنێ کە بە یەك بگەن پشت لە یەکتری هەڵبکەن. باشترینی ئەو دوانەش ئەو کەسەیانە کە لە پێشدا ئەوی تریان ئاشت بکاتەوە و سڵاوی لێ بکات. (وەرگێڕ)

لە براكەتەوە دەربكەوێت و، تۆ بچیت لە تای تەرازوودا بەسەر ئیمانەكەیدا كە وەك كەعبە بەرزە و، بەسەر ئیسلامەتی‌یەكەیدا كە وەك چیای ئوحود گەورەیە، قورسی بكەیت، ئەم كردارە بە هەمان جۆر بە كارێكی نەفامانە دادەنرێت.

كەواتە ئەم كارەی تۆ (واتە زەق كردن و گەورە كردنی ئەو هەڵە ساكارانەی براكەت، لەسەر حسابی ڕەوشتە ئیسلامی‌یەكانی) ستەمێكی ئەوەندە ئاشكرایە كە هەركەس خاوەنی تۆزقاڵێك ژیری بێت هەستی پێ دەكات.

بەڵێ، ئیمان بوون بە یەك بیروباوەڕ، بێ هیچ گومانێك، داخوازی ئەوەیە كە: باوەڕدارانی ئەو بیروباوەڕە لە یەك دڵدا كۆببنەوە و یەك بگرن. هەر یەكێتیی بیروباوەڕە كە داخوازی یەكێتیی كۆمەڵیش دەبێت. ئەوەتا هەست بە جۆرە پەیوەندی‌یەكی تایبەتی دەكەیت لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە پێكەوە لە یەك "تیپ"دان و بە پەیوەندیی برایەتیش لەگەڵ ئەوانەدا كە لە ژێر فەرمانی یەك پێشەوادان. تەنانەت هەست بە پەیوەندیی برایەتی لەگەڵ ئەوانەشدا دەكەیت كە پێكەوە لە یەك شاردان.

خۆ ئەو ئیمانەی لە دڵتدا جێگیر بووە ئەوەندە هەست و ڕووناكیت پێ دەبەخشێت كە چەندین جۆری پەیوەندی و یەكگرتنی لەژمارەبەدەر و نیسبەتی برایەتیی بێ سنوورت پیشان دەدات و دەگەنە ژمارەی ناوە جوانەكانی خواوەند. بۆ نموونە ئەو ئیمانە ڕێنماییت دەكات كە:

خوای هەردووكتان یەكێكە.. خاوەنتان یەكێكە.. پەرستراوتان یەكێكە.. ڕۆزیدەرتان یەكێكە.. بەم چەشنە یەك لە دوای یەك تا دەگاتە "هەزار"..

ئنجا پێغەمبەری هەردووكتان ﷺ یەكێكە.. ئایینتان یەكێكە.. قیبلەتان یەكێكە.. گەر ئەمەش یەك لە دوای یەك بژمێریت دەگاتە "سەد" پەیوەندی.

پاشان لە یەك شار و، لە یەك نیشتمان و، لە ژێر سایەی یەك دەوڵەتدا دەژین. خۆ ئەگەر ئەمەش بژمێریت ئەوا دەگاتە "دە" پەیوەندیی تر.

جا ئەگەر ئیمان ڕێنماییت بكات بۆ ئەم هەموو پەیوەندی‌یە زۆرانەی كە هەموویان داخوازی یەكێتی و یەكدەنگی و یەكگرتن و برایەتی و خۆشەویستین، سەرەڕای ئەوەش، ئەوەندە هێزی مەعنەویتان هەیە كە بتوانن هەموو بەشەكانی ئەم گەردوونە گەورەیە بە یەكەوە ببەستنەوە. كەواتە دەبێ مرۆڤ ستەمێكی چەندە گەورە و لە ڕادەبەدەر بكات، كاتێ پشت لەم هەموو پەیوەندی‌یە گرنگ و توندوتۆڵانە بكات و، بچێت چەند هۆیەكی

لاوازی وەك تانوپۆی جالـجالۆكە بهێنێت، كە دووبەرەكی و دووڕوویی و ڕق و كینـه و دوژمنایەتی دەنێنەوە و، بەسەر ئەو هەموو پەیوەندییانەدا زاڵیان بكـات و هـەموویانی پێ داپۆشێت و، بەو جۆرە دەروونی خـۆی لـە ڕق و كینـه و دوژمنایـەتیی بـرای ئیمـانداری خۆی پڕ بكات؟

ئایا لە ڕاستیدا ئەم كارە گاڵتە كردن نییە بەو هەموو پەیوەندییانەی كـە ئیمـانداران یەكدەخـەن؟ ئایـا سـووكایەتی نییـە بـەو هۆكارانـەی كـە خۆشـەویستیی نـاو ئیمـانداران پێویسـت دەكـەن؟ یـان ئایـا بـە سـتەمكردن نـاژمێررێت لـەو پەیوەندییانـەی كـە برایـەتی دروستدەكەن و بە پێویستی دەزانن؟

جا ئەگەر "دڵ"ت لە لێدان نەكەوتبێت و، "عەقڵ"یشـت بـە تـەواوی تروسـكایی لـێ نەبڕابێت، هەست بەمە دەكەیت!

## لایەنی سێهەم

### تاوانبار تاوانی لە ئەستۆی خۆیدایە

ئـایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى﴾ (الأنعـام:١٦٤) واتـای دادگـەریی ڕووت و ڕاستەقینە دەگەیەنێت..

(واتە: دروست نییە هیچ مرۆڤێك بە تاوانی یەكێكی تر سزا بدرێت).

ئـەوەتا قـورئانی پـیرۆز و سـەرچاوەكانی شـەریعەت و داب و ڕەویـەی ئەهـلی حەقیقەت و حیكمەتی ئیسلامی، هەموویان ئاگادارت دەكەنەوە كە:

ڕق هـەڵگرتن لـە برای ئیمـاندار و دوژمنایـەتی كردنـی سـتەمێكی تـابلێی گـەورە و لەڕادەبەدەرە. چونكە ئەم كارە لە ڕاستیدا بریتییە لەوەی هـەموو ڕەوشـتێكی پـاك و بێ تـاوانی ئـەو بـرا ئیمـانداره تاوانبـار بكرێـت، تەنـها لەبـەر ئـەوەی كـە "یـەك" ڕەوشـتی تاوانكارانەی تێدایە! نەخوازەڵا ئەگەر تەنها لەبەر ئەو ڕەوشتەی كە تۆ بە دڵـت نییـە ئـەو دوژمنایەتییە پەرە بسێنێت و كەسوكاریشی بگرێتـەوە. دیـارە ئـەو كاتـە ستەمەكە دەبێتـە ستەمێكی گەورەتر، هەروەك قورئانی پیرۆز بە "سیغەی موبالەغە" دەریبڕیوە:

﴿إِنَّ الإِنْسَانَ لَظَلُومٌ﴾ (إبراهيم:٣٤)[1].

---

(١) واتە: بە ڕاستی مرۆڤ تابڵێی ستەمكارە. (وەرگێڕ)

ئایا ئیتر پاش ئەمانە، هیچ بەهانەیەك دەهێنیتەوە و لافی ئەوە لێ دەدەیت کە گوایا لەسەر حەقیت؟

ئەوەش بزانە کە:

دوژمنایەتی (لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە) وەك گڵ و شەڕ و شۆڕەکان وان، چەند شتێکی چڕن، شتی چڕیش بڵاو نابێتەوە و پەرە ناسێنێت، مەگەر مرۆڤ خۆی بە تایبەتی هەوڵ بدات لە یەکێکی ترەوە فێری خراپکاری ببێت. بەڵام خێر و چاکەکاری و هەر کردەوەیەکی تر کە هۆی خۆشەویستی بن، چەند شتێکی "ناسك"ن و وەك ڕووناکی و خودی خۆشەویستی وان. دیارە ڕووناکیش بە چەشنێکە ڕەنگدانەوە و پەرەسەندنی تێدایە و شتی تر دەگرێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەو قسەیەی دەڵێت: "هاوڕێی هاوڕێ هاوڕێیە" وەکو وتەیەکی پەسەند لەناو خەڵکیدا بڵاوبووەتەوە و دەیڵێنەوە، دەبینیت ئەم وتەیە دەماودەمی پێ دەکرێت:

(مِن أجلِ عينٍ ألفُ عينٍ تُكرَمُ)[1].

ئەی ئەو کەسەی کە حەق پێشێل دەکات!

ئەگەر بە دوای حەقدا دەگەڕێیت، ئەوا بزانە حەقیقەت ئەمەیە کە باسمان کرد. کەواتە دوژمنایەتی کردن و ڕق هەڵگرتن لە کەسوکاری یەکێك کە ڕەوشتێکی نابەدڵی تۆی تێدایە، ڕەفتارێکی تابڵێی پێچەوانە و دژی حەقیقەتە!

## لایەنی چوارەم

### "دوژمنایەتی‌کردن لەگەڵ برای ئیمانداردا سەبارەت بە ژیانی خۆییشەوە بە ستەم دادەنرێت"

ئەگەر حەز دەکەیت لەم ڕووەوە گوێ ڕابگریت، ئەوا فەرموو چەند دەستوورێك ببیستە کە بناغەی ئەم لایەنەن:

**دەستووری یەکەم:**

هەرکاتێ زانیت لە ڕەوشت و بیرکردنەوەکانتدا لەسەر حەقیت، بۆت هەیە بڵێیت: "ئەو ڕێگایەی گرتوومەتەبەر ڕێیەکی حەقە" یان بڵێیت: "چاکترە". بەڵام بۆت نییە بڵێیت: "ڕێگای حەق تەنها ئەو ڕێگایەیە کە من گرتوومەتەبەر"!

---

(١) واتە: لەبەر خاتری چاوێك نازی هەزار چاو هەڵدەگیرێت. (وەرگێڕ)

چونكە وەك شاعیرێك لەم دێڕە شیعرەدا دەڵێت:

وعينُ الرضا عن كل عيبٍ كليلةٌ كما انّ عين السخط تبدي المساويا[1]

دەردەكەوێت كە: ڕوانینت بە چاوی ڕازیبوون و بیركردنەوەشت بەم شێوە كول و كاسە هەرگیز بە حەكەم و سەنگی مەحەك دانانرێن، تاكو حوكم بەسەر ڕێبازەكانی تردا دەربكەن!

**دەستووری دووهەم:**

"هەر قسەیەك دەكەیت پێویستە حەق بێت، بەڵام بۆت نییە هەرچی حەق دەزانیت بیانڵێیت و بڵاویان بكەیتەوە. هەروەها دەبێ هەر وشەیەك لە زارت دەردەچێت ڕاست بێت، بەڵام كارێكی ڕاست و ڕەوا نییە كە هەرچی ڕاستییە بیانڵێیت"!

چونكە ئەو كەسەی كە وەكو تۆ وابێت و خاوەنی نیازێكی پاك و بێگەرد نەبێت، لەوانەیە بەرامبەرەكەی بورووژێنێت و پێچەوانەی مەبەست بێتەدی.

**دەستووری سێهەم:**

ئەگەر دەتەوێت دوژمنایەتی لەگەڵ یەكێكدا بكەیت، فەرموو لەگەڵ خودی "دوژمنایەتی"دا بیكە كە لەناو دڵتدا ڕیشكی داكوتاوە. هەوڵ بدە كڵپە و بڵێسەكەی بكوژێنیتەوە و ڕەگ و ڕیشەی لە بن دەربهێنیت. هەروەها هەوڵی ئەوە بدە كە ئەم دوژمنایەتییە لەگەڵ دوژمنە هەرە گەورەكەتدا بكەیت، كە زیانی لە هەموان زیاترە، كە نەفسی خۆتە و هەردەم لەگەڵتدایە و وەك سێبەر لێت جیا نابێتەوە! بەڵێ، دوژمنایەتی ئەو دەروونە بكە و بەرەنگاری ئارەزووەكانی ببەرەوە و هەوڵی چاككردنی بدە و، واز لە ئیمانداران بهێنە و، لەبەر خاتری ئەو نەفسە دوژمنایەتییان لەگەڵدا مەكە!

هەروەها ئەگەر دەتەوێت "دوژمنایەتی" بكەیت، ئەوا لەگەڵ زەندیق و كافراندا بیكە، كە تابڵێی زۆرن!

ئەوەش بزانە كە سیفەتی "خۆشەویستی" خۆی لە خۆیدا شتێكی خۆشەویستە، هەروەك ڕەوشتی خراپی "دوژمنایەتی" لە پێش هەموو شتێكی تردا شایستەی دوژمنایەتی كردنە.

---

(١) ئەم شیعرە هی ئیمامی شافیعییە، بڕوانە: "ديوان الإمام الشافعي" ص٩١ جمع وتعليق محمد عفيف الزعبي. نشر دار النور، بيروت سنة ١٣٩١هـ - ١٩٧١م. واتە: چاوی ڕازیبوون لە ئاستی هەموو نەنگییەكدا نابینایە، بەڵام چاوی ڕازی نەبوون هەر خراپە دەردەخات. (وەرگێڕ)

خـۆ ئەگـەر مەبەستیشـــت دوژمنایـەتی کـردن نی‌یـە و تەنـها دەتـەوێت بەسـەر بەرامبەرەکەتدا سەربکەویت، ئەوا چاکەی لەگەڵدا بکە. چونکە ئـاگری دوژمنایـەتی بـە چاکەکردن دەکوژێتەوە. بەڵام ئەگەر لە بەرامبەر خراپەیەکی ئەو کەسەوە تۆش خراپـەی لەگەڵدا بکـەیت، دیـارە دوژمنایەتی‌یەکـە پـەرە دەسـێنێت، خـۆ ئەگـەر لـە ڕواڵـەتدا ژێرکـەوتوو بێـت ئـەوا لـە ناخـەوە دڵـی پڕ دەبێـت لـە ڕق و، دوژمنایەتی‌یەکـەش هـەر دەمێنێت و بەردەوام دەبێت.. بەڵام چاکەکردنت لـە بەرامبـەر خراپەیـەکی ئـەودا، هـانی دەدات بۆ پەشیمانی و لەوانەیە ڕۆژێك لـە ڕۆژان ببێـت بـە برادەرێکـی خۆشەویسـتی خۆت. چونکە مرۆڤی ئیماندار هەردەم سیفەتی "کەرەم"ی تێدایـە و چـاوەڕوانیی ئـەوەی لـێ دەکرێت کە "کەریم" بێت. کەواتە ئەگەر لە ڕواڵەتیشدا بێ چـاووڕوو(لئـیم) بێـت، لە لایەنی ئیمانەکەیەوە هەر بە کەریمی دەمێنێتەوە. ئەوەتا شاعیرێك دەڵێت:

إذا أنتَ أكرمْتَ الكريمَ ملكْتَهُ      وإنْ أنتَ أكرمْتَ اللَّئيمَ تمرَّدَا(١)

بەڵێ، واقیعی ژیان شایەتە لەسـەر ئـەوەی کـە ئەگـەر بـە پیـاوی خـراپ بوترێـت: "تـۆ پیاوێکی باش و بەڕێزیت" دوور نی‌یە ئەم وتەیە هـانی بـدات بۆ ئـەوەی ببێـت بـە پیـاوێکی باش.. هەروەها ئەگەر بە مرۆڤـی باشیش بوترێـت: "تـۆ پیـاوێکی خراپیـت" لەوانەیـە ئـەم وتەیە بەرەو خراپە پاڵی پێوە بنێت.

کەواتە بە گوێی دڵ گوێ بۆ خوای گەورە ڕابگرە کە دەفەرموێ:

﴿...وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً﴾ (الفرقان:٧٢)(٢)

﴿وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (التغابن:١٤)(٣)

---

(١) ئەم شیعرە هی موتەنەبیی‌یە، بڕوانە: "العرف الطيب في شرح ديوان أبي الطيب" ص٣٨٧ الطبعة الثانيـــة، دار القلم، لبنان. واتە: ئەگەر ڕێز لە مرۆڤی بەڕێز و دەست‌خاوێن و دڵپاك بگریت، دەیکەیتە بەندەی خۆت و تا ماوە چاکەی تۆی لە یاد ناچێت، بەڵام ئەگەر ڕێز لە مرۆڤی بێ‌شەرم بگریت ئەوا لێت هەڵدەگەڕێتەوە.

(وەرگێڕ)

(٢) واتە: یـەکێك لـە ڕەوشتەکانی بەندە ڕاستەقینەکانی خـوای میـهرەبان ئەوەیـە کـە: ئـاوڕ بـەلای کـردار و گوفتاری ناڕەوادا نادەنەوە و خۆیان زۆر لەوە بەرز و بەڕێزتر ڕادەگرن کە خۆیانی پێ سەرقاڵ بکەن.

(وەرگێڕ)

(٣) واتە: ئەگەر چاو لە دوژمنانتان بپۆشن و لێیان خۆش بن، بێ‌گومان خـوای گەورەش لە پاداشتی ئـەوەدا بـە لێبوردن و میهرەبانیی خۆی پاداشتتان دەداتەوە. (وەرگێڕ)

بەڵێ، گوێ بۆ ئەم ئایەتانە و دەستووره پیرۆزەکانی تری قورئان ڕابگرە، چونکە ئەمینی و بەختەوەری و سەرکەوتن تەنها لە شوێنکەوتنی ئەو دەستوورانەدایە.

**دەستووری چوارەم:**

ئەوانەی کە دڵیان لە ڕق و کینە و دوژمنایەتیی برایانی ئیمانداریان پڕ بووه، پێش هەموو کەسێك ستەم لە خۆیان دەکەن! جگە لەو ستەمەی کە لەوانی دەکەن و جگە لەوەش کە سنووری میهرەبانیی خواوەند دەشکێنن.

چونکە مرۆڤی حەسوود هەرکات نیعمەتێك بەو کەسەوە ببینێت کە حەسوودیی پێ دەبات، بە جارێ ئاگری تێ بەردەبێت و دەروونی بە ئازارەوە دەتلێتەوە، چونکە ئەو ئەشکەنجە و ئازارەی کە لە حەسوودییەوە پەیدا دەبێت ئازارێکی گەلێ سەختە. هۆکەشی ئەوەیە کە ئازاری حەسوودی زیاتر مرۆڤی حەسوودکار دەگرێتەوە تا مرۆڤی حەسوودی پێ براو، بەڵکو مرۆڤی حەسوودکار هەر بە کڵپە و بڵێسەی حەسوودییەکەی خۆی دەسووتێت، بەڵام مرۆڤی حەسوودی پێ براو یان هیچی لێ نایەت یان زیانێکی کەمی پێ دەگات!

چارەسەریی "حەسوودی"یش بەوە دەبێت کە:

مرۆڤی حەسوود پاشەڕۆژی ئەو شتە لێکبداتەوە کە بووە بە مایەی حەسوودییەکەی و بە وردی سەرنج بدات بۆ ئەوەی هەست بکات کە ئەو شتە دنیاییانەی حەسوودی پێ براوەکە دەستی کەوتووە - چ ماڵی دنیا بێت و چ هێز و چ مەنسەب و پلەوپایە - هەموویان شتێکی کاتی و لەناوچوون، هەروەها سوودیان گەلێ کەمە و ئەرك و ئازاریشیان تابڵێی زۆرە.

بەڵام ئەگەر حەسوودی لە چەند هاندەر و کاروبارێکی ئایینی و سەر بە دوارۆژەوە بێت، بە حەسوودی لە قەڵەم نادرێت. خۆ ئەگەر لە کاروباری ئایینیشدا دەماری حەسوودی بجووڵێت و لێبدات ئەوا مانای وایە ئەو مرۆڤە: کەسێکی حەسوودە، یان ڕیاکارە و، هەر لە دنیادا ئەو کردەوە چاکانەی کە بۆ دوارۆژ کردوونی بە ڕیاکردن دەیاندۆڕێنێت، یان ئەوەیە گومانی خراپ بە حەسوودی پێ براو دەبات و بەمەش ستەمی لێ دەکات.

پاشان ئەو جۆرە مرۆڤانە لە ڕێی حەسوودییەوە ناڕەزایی لە "قەدەری خوا" دەردەبڕن. چونکە ئەگەر فەزڵ و میهرەبانیی خوا بە حەسوودی پێ براوەکە بدرێت، ئەم

خەفەت دایدەگرێت، بەڵام گەر بەڵا و گیروگرفتی تووش ببێت ئەم خۆشحاڵ دەبێت! وەك بڵێی ڕەخنە لە قەدەری خوا دەگرێت و نارەزایی خۆی لە میهرەبانی‌یە فراوانەکەی خوا دەردەبڕێت. خۆ شتێکی ئاشکرایشە کە:

"هەر کەسێك ڕەخنەی لە قەدەری خوا گرت، ئەوا قەدەر دەیخات و بەسەریدا سەردەکەوێت.. هەر کەسیش نارەزایی لە میهرەبانیی فراوانی خوا دەربڕی، لێی بێ بەش دەبێت".

ئایا چ ویژدانێك بەوە ڕازی دەبێت کە دەروونی باوەڕدارێك یەك ساڵی ڕەبەق لە ڕق و کینە و دوژمنایەتیی برای باوەڕداری خۆی پڕ ببێت، تەنها لەبەر شتێکی بێ نرخی ئەوتۆ کە شایانی دوژمنایەتی کردنی ماوەی یەك ڕۆژیش نی‌یە؟ لە کاتێکدا کە دەزانین ئەو خراپەیەی لە برایەکتەوە تووشت دێت هەر تەنها سووچ و دەستی ئەوی تێدا نی‌یە هەتا بەو جۆرە ڕقی لێ هەڵبگریت.. چونکە:

یەکەم: لەبەر ئەوەی "قەدەری خوا" بەشی لەم کارەدا هەیە، دەبێ بە ڕازی بوون و تەسلیم بوون پێشوازی لەم بەشەی قەدەری خوا بکەیت..

دووهەم: "بەشی شەیتان" و "نەفسی ئەممارە"شی تێدایە..

جا ئەگەر ئەم دوو بەشەی لێ لابدەیت، تەنها ئەوەندەت لە بەردەمدا دەمێنێتەوە کە هانت بدات بۆ ئەوەی بەزەییت بە حاڵی ئەو برایەتدا بێتەوە، نەك بچیت دوژمنایەتیی لەگەڵدا بکەیت، چونکە دەبینیت نەفس و شەیتانەکەی بەسەریدا زاڵ بوون، کەواتە چاوەڕوانیی ئەوە بکە لە کردەوەی خۆی پەشیمان بێتەوە و هیواداری ئەوەش بە کە بێتەوە سەر ڕێگای ڕاست و بیر و هۆشی خۆی..

سێ‌هەم: دەبێ لەم کارەدا ئەو قسوور و کەمتەرخەمی‌یانەی خۆیشت ڕەچاو بکەیت کە نایانبینیت یان ناتەوێ بیانبینیت!

ئنجا ئەم بەشە لەگەڵ دوو بەشەکەی پێشوودا دەربکە و جیایان بکەرەوە. ئەو کاتە دەبینیت بەشێکی یەکجار کەم و بچووك دەمێنێتەوە. خۆ ئەگەر بە هیممەتێکی بەرز و پیاوەتی و لێبوردنەوە پێشوازی لەم بەشە کەمە بکەیت، ئەوا لە تاوانی ستەم لێکردن و ئازاردانی ئیماندارێك ڕزگار دەبیت. بەڵام گەر - خوانەخواستە - وا نەکەیت و لە بەرامبەر کردەوە خراپەکەی ئەو کەسەوە تۆش بچیت لە شتە بێ بایەخەکانی دنیادا ڕۆبچیت، بەوەی لات وابێت لە دنیادا هەر دەمێنیتەوە و ڕق و دوژمنایەتی‌یەکی بەردەوام

لە دڵ و دەروونتدا هەڵبگریت، ئەوا بێ هیچ گومانێك سیفەتی: ﴿ظَلُوماً جَـــهُولاً﴾ت[1] بەسەردا دەسـەپێت و، وەك ئەو جوولەکە نەفامەت لـێ دێت کـە سـەروەت و سـامانێکی زۆری لە کڕینـی شووشـە وردە و سـەهۆڵدا - کـە خێرا دەتوێتـەوە - خـەرج کـرد، وای دەزانی ئەوانە هەموویان "ئەڵماس"ن!

* * *

وا بەم چەشنە هەموو ئەو شتانەمان بە درێژی بۆ باس کردیـت کـە ڕوونـی دەکـەنـەوە: "دوژمنایەتی کردن" چۆن دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بـە ژیـانی خۆیـی و تایبـەتیی مرۆڤ. جا ئەگەر تۆش بە ڕاستی حەز بە زیـانی خـۆت ناکـەیت، ئـەوا دەرفـەت بـە "دوژمنایـەتی" مەدە بڕواتە ناو دڵتەوە. خۆ ئەگەر ڕۆشتووە و لە دڵدا جێگیر بووە، تۆ گوێی بۆ ڕامەگرە، بەڵکو گوێبیستی "حافظی شـــیرازی" بە[2] کە خاوەنی بەسیرەتێکی حەقیقـەت بینـە، ئەوەتا دەڵێت:

"دنیا نه متاعیست که أرزد به نزاعی "[3].

جا ئەگەر هەموو ئەم دنیا گەورەیـە و هـەرچێکی تێدایـە هێنـدە بێ‌نرخ و بایـەخ بێـت، وەك ئەوەی "حافظی شیرازی" باسی دەکات، دەبێ شتێکی ئاوا بچووك کـە تۆ لـە دڵـی خۆتدا هەڵـت گرتووە چەندە بێ بایەخ بێت؟

دیسان گوێی لـێ ڕابگرە کە دەڵێت:

آسایش دو گیتی تفسیر إین دو حرف است با دوستان مروت با دشمنان مدارا [4]

---

(١) واتە: مرۆڤ زۆر ستەمکار و نەزانە. ئاماژەیە بۆ ئایەتی: ﴿إِنَّهُ كانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ (الأحزاب:٧٢).

(٢) ناوی محەممەدە و، بـە "خواجە حـافظی شـیرازی" بەناوبانگە. هـەموو قورئـانی پیرۆزی لەبـەر بـووە بۆیـە بـە (حافظ) ناوبانگی دەرکردووە. بیروباوەڕی لەسەر ڕەویەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بووە. لـە سـاڵی ٧٩١ کۆچی لـە تەمـەنی چـل و شـەش سـاڵی‌دا لـە "شـیراز" کۆچـی دوایـی کـردووە و هـەر لـەوێش نێژراوە. بڕوانـە پێشەکیی دیوانەکەی ل: (ب). (وەرگێر)

(٣) واتە: دنیا شتێکی ئەوتۆ نی‌یە کە شایانی ئەوە بێت قرەی لەسەر بکرێت. لە دیوانەکەی حـافظی شـیرازی‌دا بە شوێن ئەم نیو دێڕە شیعرەدا گەڕام نەمدۆزی‌یەوە. دۆستێکی فارسی‌زانم پێـی وابـوو هـی "سەعدیی شیرازی" بێت نەك "حافظی شیرازی". کەچی لە "کلیات سعدی" چاپی "محمـــد علـــی فروغـــی"شدا گەڕام دەستم نەکەوت. (وەرگێر)

(٤) واتە: ئاسایشی هەردوو دنیا لە دوو شـتدایە: بەکـەم جوامێری لـە گـەڵ دۆسـتان.. دووهـەم چاوپۆشی لـە دوژمنان.بڕوانە: "کلیات دیوان خواجه شمس الدین محمد حافظ شیرازی" ص ٣. از انتشارات کتابفروشـــی اسلامیه. تـــهران. ١٣٢٧هـــ ق. (وەرگێر)

ئەگەر دەشڵێیت: "کار لە کار ترازاوە، چونکە ئەم دوژمنایەتی‌یە لە هەست و سروشتمدا ڕەگی داکوتاوە و لە دەستەڵاتی مندا نەماوە، جگە لەوەی کە ئەوان ئازاریان داوم و هەستیان زامدار کردووم، لەبەر ئەوە ناتوانم چاوپۆشی‌یان لێ بکەم"..

وەڵامەکەی ئەمەیە:

ئەگەر ڕەوشتی خراپ لە مرۆڤدا شوێنەوار بەجێ نەهێڵێت و کرداری پێ نەکرێت و خاوەنەکەی لە تەقسیری خۆی ئاگادار بێت، ئەوا هیچ زیانێکی لێ ناوەشێتەوە. جا مادەم تۆ دەستەڵاتت بەسەر ئەم ڕق و دوژمنایەتی‌یەدا نی‌یە و ناتوانیت ڕزگار ببیت لێی، ئەوا هەر ئەو هەست کردنەت بە تەقسیرەکانی خۆت و بەوەی کە لەسەر حەق نیت، سەروزیادە و، خوا یاربێت لە خراپە و شەڕوشۆڕەکانی ئەو دوژمنایەتی‌یە ڕزگار دەبیت. چونکە ئەم هەست کردنە بە جۆرە پەشیمانی‌یەکی نادیار و تۆبەیەکی نهێنی و داوای لێبوردن (إستغفار)ێکی مەعنەوی دەژمێررێت. خۆ ئێمەش ئەم باسەمان تەنها بۆ ئەوە نووسیوە کە ئەو داوای لێبوردن کردنەت دەستگیر بکات و ئیتر حەق و ناحەقت لێ نەئاڵۆزێت و بەرامبەرەکەت - کە لەسەر حەقە - بە ستەمکار دانەنێیت.

ڕۆژێکیان پیاوێکم دی سەروسیمای لە هی زانایان دەچوو، ناوی زانایەکی بەڕێزی بە خراپی دەبرد، بە ڕادەیەك کە گەیاندی‌یە ئەوەی بە کافری لە قەڵەم بدات! ئەمەش هەر تەنها لەبەر ئەوەی کە لە چەند بابەتێکی سیاسی‌دا ڕا و بۆچوونیان جیاواز بوو. هەر لە هەمان کاتدا مەدحی یەکێکی تری مونافیقی کرد کە لە بیروڕای سیاسی‌دا هاوبیر بوون!

منیش کە ئەمەم دی، تەزوویەکی توند بە جەستەمدا هات و، لەدەست ئەم بارودۆخەی کە سیاسەتی تێکەوتووە پەنام بە خوای گەورە برد و، وتم:

"أعوذ بالله من الشيطان والسياسة"!

ئیتر لەو ڕۆژەوە خۆم لە ژیانی سیاسی کێشاوەتەوە.

## لایەنی پێنجەم

### ئەو زیانە کۆمەڵایەتی‌یانەی کە لە دوژمنایەتی‌یەوە پەیدا دەبن

ئەم لایەنە باسی ئەو زیانانە دەکات کە لە ژیانی کۆمەڵایەتی دەکەون و، بەهۆی ڕق و دووبەرەکی و دوژمنایەتی‌یەوە پەیدا دەبن.

**ئەگەر بوترێت:**

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "إختلافُ أمتي رحمةٌ"[1]. دیارە ئیختیلافیش داخوازی دووبەرەکی و پارچەپارچەبوون و تاقمگیری و ڕاپەسەندییە..

بەڵام ئەم ئیختیلاف و پارچەپارچەبوونەش هەندێ لایەنی بەزەیی و میهرەبانیی بۆ "عەوام" (واتە زۆرینەی خەڵك) و چەوساوەکان تێدایە، چونکە ئەگەر چینی "خەواص" (واتە کەمایەتیی تایبەتمەندی ناو کۆمەڵ) و ستەمکاران لە گوندێك یان لە شارۆچکەیەکدا یەکبگرن و یەکێتییان لە نێواندا بێت، ئەوا هەژار و داماوەکان شپرزە دەکەن و دەیانچەوسێننەوە. بەڵام ئەگەر ئەوان لەناو خۆیاندا شپرز و ناکۆك بن، ئەوا کەسانی چەوساوە و ستەم لێکراو جۆرە ڕزگاربوونێکیان لە چنگی ئەو ستەمکارانە دەست دەکەوێت.

پاشان حەقیقەتی شتان لە ڕێی: موناقەشەی ڕاکان و، جیاوازیی ژیرییەکان و یەکنەکەوتنی بیرەکانەوە بە ڕوونی دەردەکەوێت؟

**وەڵام:**

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین:

مەبەست لەو ئیختیلافەی کە لە فەرموودەکەدایە، ئیختیلافێکە ئیجابی و بنیاتنەر و چەسپێنەر بێت. واتە بە جۆرێك بێت کە هەریەکە لە هەوڵی برەوپێدانی ڕێبازەکەیدا بێت و، ڕاکانی خۆی و ڕوانینی تایبەتیی خۆی بۆ شتان - کە بە لایەوە ڕاستە - دەربخات و پێشکەشی بکات، بە بێ ئەوەی هەوڵی ڕووخاندنی ڕێبازەکانی تر بدات، یان تانەیان ئاراستە بکات و ڕێبازەکانیان بە پووچەڵ دابنێت.. بەڵکو بەوە دەبێت کە هەموو توانای خۆی لە پڕکردنەوەی کەلێنەکان و چاکسازی(الإصلاح)دا بەکاربهێنێت.

ئیختیلافی سەلبیش بریتییە لەوەی کە هەر کەسەو هەوڵی ڕووخاندنی ڕێبازی ئەوانی تر بدات، کە ئەمەش لە ڕق و کینە و دوژمنایەتییەوە پەیدا دەبێت. ئەم جۆرە ئیختیلافەش فەرموودەکە دەست بە ڕوویەوە دەنێت و دانی پێدا نانێت. چونکە ئەوانەی

---

(١) "ئیمامی سیوطی" لە بارەی ئەم حەدیثەوە دەفەرموێ: "أخرجه نصر المقدسي في الحجة والبيهقي في الرسالة الأشعرية بغير سند. وأورده الحليمي والقاضي حسين وإمام الحرمين وغيرهم. ولعله خرج في بعض كتب الحفاظ التي لم تصل إلينا". بڕوانە: "الجامع الصغير للإمام السيوطي" ج١/ص١٣. هەروەها "إبن البديع الشيباني"ش دەفەرموێ: "زعم كثير من الأئمة أنه لا أصل له، لكن ذكره الخطابي في غريب الحديث مستطرداً، وأشعر بأن له أصلاً عنده". بڕوانە: "تميز الطيب من الخبيث فيما يدور على ألسنة الناس من الحديث" ص ٩. (وەرگێڕ)

ئیختیلافی نێوانیان بەو شێوەیە بێت، هەرگیز ناتوانن کردارێکی ئیجابی و بنیاتنەر ئەنجام بدەن.

لە وەڵامی پرسیاری دووهەمیشدا دەڵێین:

ئەگەر پارچە پارچەیی و تاقمگیری بە ناوی حەق و لە پێناوی حەقدا بێت، لەوانەیە ببێت بە داڵدەی ئەهلی حەق. بەڵام ئەو شپرزەیی و پارچەپارچەبوونەی دەیانبینین تەنها لەبەر ئامانجی کەسی(الغرض الشـــخصي) و ئارەزووی نەفسی ئەمارەیە و هی شتی تر نییە. کەواتە داڵدە و پاڵپشتی دەروون پیسان و ستەمکارانە. چونکە بە ئاشکرا ستەم لە هەڵسوکەوتیاندا دەبینرێت، بە چەشنێك کە ئەگەر شەیتانێك ببێت بە یارمەتیدەری یەکێکیان و لە بیروڕادا لەگەڵ ئەودا یەکبگرێت، یەکسەر مەدحی دەکات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت.. بەڵام ئەگەر لە ڕیزەکەی بەرامبەریدا مرۆڤێکی مەلائیکەتئاسا ببێت، ئەم لەعنەتی بۆ دەنێرێت و بە خراپی باسی دەکات!

وەڵامی پرسیاری سێهەمیش ئەمەیە:

دەربڕین و پیشاندانی بیروڕاکان لە پێناوی حەق و گەیشتن بە حەقیقەت، لە کاتێکدا دەبێت کە بناغە و بنچینەکان، هەروەها ئاکام و ئامانجەکان یەك بن و، ئیختیلاف تەنها لەو هۆکارانەدا بێت کە ڕێ بۆ گەیشتن بەو ئاکام و ئامانجانە خۆش دەکەن. ئەم جۆرە ئیختیلافە دەتوانێت خزمەتێکی گەورە لە دەربڕین و دەرخستنی هەموو لایەن و گۆشەیەکی حەقیقەتدا پێشکەش بکات..

بەڵام ئەگەر باس و وتووێژکردن لە پێناوی مەبەستی کەسی و، خۆسەپاندن و، خۆ بەرز کردنەوە و، تێرکردنی ئارەزووی نەفسە فیرعەونئاساکان و، ناوبانگ دەرکردن و خۆ دەرخستندا بێت، ئەوا هەرگیز "تروسکایی حەقیقەت" لەم جۆرە ڕادەربڕینانەدا دەرناکەوێت، بەڵکو جگە لە "پزیسکی ئاگری فیتنە" هیچی تری لێ ناوەشێتەوە و، هەرگیز (یەکێتیی ئامانج) لە نێوان ئەو جۆرە کەسانەدا نابینیت، تەنانەت لەسەر گۆی زەویدا یەك کەست دەست ناکەوێت کە بگونجێ ـ لە ڕاستیدا ـ لەگەڵیان ڕێك بکەوێت، چونکە ئەوەی ئەوان دەیکەن لە پێناوی حەقدا نییە. هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینیت ڕادەربڕینی ئەو جۆرە کەسانە ئەوەندە زیادەڕەویی لەسنووربەدەری تێدایە کە لە ئەنجامدا دەیانگەیەنێتە دووبەرەکی و شپرزەییەکی ئەوتۆ هەرگیز یەکگرتن نەگرێتەخۆ و هەر هەوڵێك لەو پێناوەدا بدرێت بێ ئاکام بمێنێتەوە. باری ئێستای جیهان باشترین شایەتە لەسەر ئەمە.

پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:

ئەگەر هەڵسوکەوت و جموجوڵی مرۆڤی باوەڕدار بەپێی ئەو دەستوورانە ئەنجام نەدرێت کە فەرموودەی پیرۆزی: "الحب في الله والبغض في الله"[1] دەستنیشانی کردووە و، لە هەموو کاروبارێکیدا بۆ حوکم و فەرمانەکانی خوا نەگەڕێتەوە، ئەوا دووڕوویی و دووبەرەکی لەناو کۆمەڵدا پەرە دەسێنێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە ئەو دەستوورانە ناکات بە ڕابەری خۆی، "ستەم" لە خۆی دەکات، لەو کاتەدا کە بە دوای "دادگەری"دا دەگەڕێت!

ڕووداوێك کە پەندی تێدایە:

لە یەکێك لە غەزا و ڕووبەڕووبوونەوەکانی ئیسلام لەگەڵ بتپەرستاندا، ئیمامی عەلی - خوای لێ ڕازی بێت - لەگەڵ سوارچاکێکی بتپەرستاندا زۆرانی دەگرت و لە ئەنجامدا ئیمامی عەلی بتپەرستەکەی خست و ویستی بیکوژێت. لەم کاتەدا بتپەرستەکە تفێکی کردە دەموچاوی ئیمامی عەلی. ئیمامیش کە ئەم ڕەفتارەی لێ بینی بەرەڵای کرد و نەیکوشت، بەڵکو وازی لێ هێنا و بەجێی هێشت! بتپەرستەکە سەری لەم کارەی ئیمامی عەلی سووڕما و پێی وت:

- بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ئیمام فەرمووی:

- من تا ئێستا لە پێناوی خوا لەگەڵ تۆدا دەجەنگام.. بەڵام پاش ئەو کارەی کە تۆ بەرامبەر من نواندت، ترسام گەر بتکوژم کارەکەم تۆڵەسەندنەوەی خۆمی تێکەڵ بێت! ئیتر لەبەر خاتری خوای گەورە نەمکوشتیت و وازم لێ هێنایت!

بتپەرستەکە وتی:

- دەبوو ڕەفتارەکەی من زیاتر کاری تێ بکردیتایە.. دەسا مادەم ئێوە لەسەر ئایینێکن کە ئاوا لەوپەڕی لێبوردن و چاوپۆشیدایە، مانای وایە ئەو ئایینە - بێ هیچ گومانێك - ئایینێکی حەق و ڕەوایە!

ڕووداوێکی تر:

جارێك فەرمانڕەوایەکی موسڵمان قازییەکەی لەسەر کار لابرد، لەبەر ئەوەی لە کاتی دەست بڕینی دزێکدا هەندێ تووڕەیی و توندوتیژیی لێ بینی بوو! چونکە ئەو

---

(١) بڕوانە: "صحيح البخاري" كتاب الإيمان ج١/ص٦ الطبعة الثانية. (من كلام الإمام البخاري). (وەرگێڕ)

کەسەی کە فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکات نابێ هیچ بەشێکی نەفسی خۆی بەسەر کەسێکدا بسەپێنێت کە فەرمانی شەرعی لەسەر دەرچووە، بەڵکو دەبێ لە لایەکەوە بەزەیی بە حاڵیدا بێتەوە و، لە لایەکی تریشەوە لە بەجێهێنانی حوکمەکەدا سستی نەنوێنێت و بەزەیی کاری تێ نەکات لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی خوای گەورەدا. خۆ ئەم قازییەش هەندێك لە داخی دەروونی خۆی تێکەڵ بە ئەنجامدانی کارەکەی کردبوو، کە ئەمەش لەگەڵ دادگەریی پەتی و خاوێندا ناگونجێت. لەبەر ئەوە لەسەر کار لابرا!

* * *

## نەخۆشی و حاڵەتێکی کۆمەڵایەتیی سامناك و دڵتەزێن
## کە تووشی نەتەوەی ئیسلام بووە

دواکەوتووترینی تیرە و هۆزەکان لە واتای ئەو مەترسییانە تێدەگەن کە دێنە رێگایان. ئەوەتا لەو کاتانەدا کە دوژمنی دەرەکی هێرش دەکاتە سەریان، ئەوان یەکسەر هەرچی ناکۆکیی ناوخۆیی‌یان هەیە دەیخەنە لاوە و هەموو دوژمنایەتی‌یەکی لاوەکیشیان لە بیر دەبەنەوە.

جا لە کاتێکدا کە دواکەوتوترین تیرە و هۆزەکان رێزی راستەقینەی بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتیی خۆیان دەزانن، بۆچی ئەوانەی کە خزمەتی ئایینی ئیسلام دەکەن و خەڵکیی بۆ لا بانگ دەکەن ئەمە نازانن و، دوژمنایەتی‌یە هەندەکی و بچووکەکانی نێوان خۆیان لە بیر نابەنەوە و لەناوی نابەن؟.. بۆچی رێگا بۆ دوژمنە لەژمارەبەدەرەکان خۆش دەکەن تاکو هێرش بکەنە سەریان؟ لە کاتێکدا کە زۆر بە باشی دەزانن ئەو دوژمنانە لە هەموو جێگایەکدا یەکیان گرتووە و دەوراندەوری ئەهلی ئیمانیان داوە؟

ئەم بارودۆخە لە راستیدا دیاردەیەکی ترسناکە و نیشانەی دواکەوتنە. هەروەك خیانەتکاری‌یەکیشە بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان دەکرێت.

بەم بۆنەیەوە رووداوێکتان بۆ دەگێڕمەوە کە پەند و ئامۆژگاریی تێدایە:

دوو هۆز لە تیرەی "حەسنان" هەر لە كۆنەوە ناكۆكی و خوێنڕێژی كەوتبووە نێوانیانەوە. بەڵام هەر كاتێك مەترسی‌یەكی دەرەكی‌یان لە لایەن هۆزی "سەبكان" یان "حەیدەران"ەوە دەهاتەڕێ، یەكسەر پشتی یەكتریان دەگرت و هەرچی ناكۆكیی نێوانیان بوو، تا كاتی تەواوبوونی مەترسیی هاوبەش، دەیانخستە لاوە و لە بیری خۆیانیان دەبردەوە!

دەسا ئەی ئەهلی ئیمان!

ئایا دەزانن ژمارەی ئەو هۆزانەی كە دوژمنایەتیتان دەكەن و دەیانەوێت هێرش بكەنە سەرتان، دەگاتە چەند؟ ئەو دوژمنانە ژمارەیان لە سەد هۆز تێپەڕ دەكات و، بە وێنەی ئەڵقە هاوجەمسەرەكان ئابلۆقەی ئیسلام و موسڵمانانیان داوە.

جا لە كاتێكی وادا كە پێویستە موسڵمانان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر یەك لەو دوژمنانە لە ناوخۆیاندا یەكبگرن، كەچی - بە داخەوە - هەریەكەیان ڕای جیاوازی خۆی هەیە و لەسەر ڕاكەشی سووره و، ڕێگایەكی جیاوازی گرتووەتەبەر كە لەگەڵ ئامانج و مەبەستە كەسی‌یەكانی خۆیدا بگونجێ! وەك بڵێی ڕێگا بۆ كردنەوەی دەرگای ئیسلام خۆش و ئاسان بكات تاكو ئەو دوژمنە سەرسەختانەی لێوە بڕۆنە ناو ژووری حەرەمی پارێزراوی ئیسلامەوە!

ئایا ئەم كارە شایانی نەتەوەی ئیسلامە؟

ئەگەر دەتەوێت بزانیت ژمارەی ئەو بازنە هاوجەمسەرانەی كە لە دوژمنان پێكهاتوون و دەورانـدەوری ئیسلامیان داوە، چەندەیە، ئەوا بزانە كە هەر لە گومڕایان و مولحیدانەوە، تا جیهانی كوفر و بەڵا و موسیبەتەكان و حاڵەتە پڕ لە ئاشووب و شڵەژاوەكانی دنیا، دەگرێتەوە و، نزیكەی حەفتا بازنە دەبن كە ڕۆشتوون بەناو یەكتریدا و، هەموویان ڕقیان لێتانە و دەیانەوێت زیانتان لێ بدەن و، تێكڕا سوورن لەسەر ئەوەی تۆڵەتان لێ بسێنن.

ئێوەش - ئەی ئەهلی ئیمان! - لە بەرامبەر ئەم هەموو دوژمنە زۆر و سەركەشانەوە، تەنها یەك چەكی بەكار و یەك سەنگەری بێ‌وەی و یەك قەڵای مەحكەمتان هەیە، ئەویش (برایەتیی ئیسلامە)! كەواتە - ئەی برای موسڵمان! - بێداربە! بە باشی ئەوە بزانە كە لەرزە خستن بە قەڵای مەحكەمی ئیسلام، بە چەند بڕوبیانوویەكی لاواز، تابڵێی دژی ویژدانی زیندووە و پێچەوانەی بەرژەوەندیی ئیسلامەتی‌یە.. ئەمە بزانە و ئاگاداری بە!

لە چەند فەرموودەيەكى پيرۆزدا هێما بۆ ناوەرۆكى ئەمەى خوارەوە كراوە:

دەجاڵ و سوفيانى و هاوچەشنيان، لەوانەى كە لە ئاخر زەماندا پەيدا دەبن و مونافيقان لە دەورى خۆيان كۆ دەكەنەوە، دووبەرەكيى نێوان موسڵمانان وەك دەرفەتێك دەقۆزنەوە و، سوود لە هەڵپەكردنى موسڵمانان بۆ بەدەستهێنانى شتومەكە فانىيەكانى ژيانى دنيا، وەردەگرن و، ئنجا بە هێزێكى كەمەوە بەسەر مرۆڤايەتىدا زاڵ دەبن و شپرزيان دەكەن و، ئاشووب و ئاژاوەيان لە نێواندا دەنێنەوە و، لەو رێيەوە بەسەر نەتەوەى ئيسلامدا زاڵ دەبن.

جا ئەگەر ئێوەش بە راستى عەوداڵى ژيانى "سەربەرزى"ن و سەر بۆ كۆت و زنجير و رسوايى دانانەوێنن، ئەوا فەرموون برۆنە ناو قەڵاى مەحكەمى ئايەتى پيرۆزى: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات:١٠) و لەوێ خۆتان قايم بكەن و، لە دەست ئەو ستەمكارانەى كە سوود لە ناكۆكيى نێوانتان وەردەگرن، دەرباز ببن. دەنا رۆژێكتان دێتەرێ كە نەتوانن بەرگرى لە مافى خۆشتان بكەن، تەنانەت نەشتوانن پارێزگاريى ژيانتان بكەن. چونكە وەك ئاشكرايە دوو (پاڵەوان) كە لە (زۆرانبازى)دا بن، تەنها (يەك منالى بچووك) دەتوانێت لە هەردووكيان بدات! يان بەردێكى بچووك دەتوانێت رۆڵ لە بەرزكردنەوەى تايەكى تەرازوو و نزمكردنەوەى تاكەى ترىدا ببينێت، با ئەو دوو تايەش دوو چياى گەورەى هاوسەنگى يەكترىيان تێدا بێت!

دەسا ئەى ئەهلى ئيمان!

ئەگەر بەو جۆرە بمێننەوە، ئەوا هەموو هێز و توانايەكتان لە ئەنجامى بەكارهێنانى ئامانجى كەسى و خۆپەرستى و تاقمگيريى نێوانتاندا، لەناودەچێت. ديارە ئەو كاتەش كەمترين هێز دەتوانێت زەليلى و رسوايىتان پێ بچێژێت! جا ئەگەر بە راستى پەيوەنديتان بە شەريعەت و نەتەوەى ئيسلامەوە هەيە، ئەوا فەرموون ئەم دەستوورە بەرزە پێغەمبەرانەيە بكەن بە رابەرى خۆتان، كە دەفەرموێ: "المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً"(١) كە ئەمەشتان كرد، لە زەليلى و سەرشۆريى دنيا و بەدبەختيى قيامەت رزگار دەبن.

---

(١) رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي. واتە: پەيوەنديى باوەڕدار لەگەڵ براى باوەڕدارىدا وەك پەيوەنديى خشت و بەردى ناو ديوارى خانوو وايە، كە يەكتر راگير دەكەن و پشتى يەكتر دەگرن. بڕوانە: صحيح البخاري، كتاب الإيمان - باب فضل تعاون المؤمنين. (وەرگێر)

## لایەنی شەشەم
## "ئیخلاس" هۆی ڕزگاربوونە لە سزای خوای گەورە

"ئیخلاس" هۆی ڕزگاربوونە لە سزای خوا. بە پێچەوانەشەوە "دوژمنایەتی" و "سەرسەختی" ژیانی مەعنەویی مرۆڤی باوەڕدار دەشێوێنن و، لە ئەنجامی ئەمەشدا کەموکووڕی و ناتەواوی دەکەوێتە ئەو بەندایەتی‌یەی کە پێشکەشی خوای گەورەی دەکات. دیارە هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو مرۆڤە باوەڕدارە ئیخلاسەکەی لەدەست داوە.

چونکە ئەو کەسەی کە لایەنی بیروڕای خۆی و کۆمەڵەکەی دەگرێت، دەیەوێت بەسەر بەرامبەرەکەی‌دا سەربکەوێت، با لە کرداری چاکەیشدا بێت کە ئەو بەرامبەرەی دەیکات! ئیتر ناگاتە ئەو پلەیەی کە کردارێك ئەنجام بدات کە بە تەواوی و بێ گەردی بۆ خوا بێت و، تەوفیقیش نادرێت کە "دادگەری" بەدەست بهێنێت. چونکە ئەو بیرەی کە لە مێشکی خۆی‌دا هەڵی گرتووە و، ئەو کەسانەش کە لە حوکم و ڕەفتاردا هاوبیری ئەون، بەسەر کەسانی تری غەیری ئەواندا پێشدەخات!

بەم جۆرە، ئەم مرۆڤە بەهۆی ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی‌یەوە، دوو بناغەی گرنگی بنیاتنانی چاکەکاریی لە دەست دەردەچێت، کە بریتین لە "ئیخلاس" و "دادگەری".

باسکردنی ئەم لایەنە زۆری دەوێت، بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندە بواری هەیە. بۆیە بەم ئەندازەیە واز لەم باسە دەهێنین.

* * *

# باسی دووهەم

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو القُوَّةِ المَتِين﴾ (الذاریات:٥٨)

﴿وكَأَيِّنْ مِنْ دابَّةٍ لا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللهُ يَرْزُقُها وإِيَّاكُمْ وهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (العنکبوت:٦٠)

ئەی برای باوەڕدار!

لەمانەوە کە باسمان کردن، بۆت دەرکەوت کە "دوژمنایەتی" و "ڕقەبەرایەتی" چ زیانێکی گەورە بەجێ دەهێڵن. ئێستاش ئەوە بزانە کە: هەڵپەکردن بۆ ژیانی دنیا(الحرص) دەردێکە وەك دوژمنایەتی وایە، بەڵکو ئەو زیانەی کە بەهۆی هەڵپەکردنەوە لە ژیانی ئیسلامی دەکەوێت گەلێ لە زیانی دوژمنایەتی زیاترە.

بەڵێ، هەڵپەکردن خۆی لە خۆیدا هۆی نائومێدی و ڕەجاڵییەو، نەخۆشییەکی سامناکە و تابلێی سەرشۆڕی و زەلیلیی لە دووتوێدایە. هەر هەڵپەکردنە کە بایەخی مرۆڤ دادەگرێت و، لەو شتەش نائومێد و بێ بەشی دەکات کە هەڵپەکەی بۆ بەکار دەهێنێت!

باشترین شایەتیش لەسەر ئەم دەرەنجامەی کە هەڵپەکردن بەرهەمی دەهێنێت و مرۆڤی پێوە گیرۆدە دەکات، ئەو زەلیلی و دەستکورتی و ڕسواییەیە کە بە درێژایی مێژوو بەسەر جوولەکەکاندا هات، چونکە ئەوان لە هەموو نەتەوەکانی تر زیاتر هەوڵی بێ وچانیان بۆ کۆکردنەوە و دەستخستنی کەرەسەی بێ‌نرخی دنیای فانی دەدا.

هەڵپەکردن بۆ ژیانی دنیا، هەر لەگەورەترین بازنەی جیهانی بوونەوەرانەوە تا دەگاتە بچووکترین دانە و تاك لەناو ئەواندا، شوێنەواری خراپی خۆی دەردەخات. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە، ئەو هەوڵەی کە هاودەم لەگەڵ "تەوەککول"دا بۆ ڕۆزیی حەڵاڵ دەدرێت، دەبێتە مایەی دڵنیایی و حەوانەوە و، لە هەموو جێگایەکیشدا شوێنەواری بەسوودی خۆی بەجێ دەهێڵێت.

بۆ نموونە: "ڕووەك و درەخت" كە وەك هەر زیندەوەرێكی تر پێویستیان بە ڕۆزیی تایبەتیی خۆیان هەیە، هەرچەند لە جێگای خۆیاندا ڕاوەستاون و بە دوای ڕۆزیدا ناگەڕێن، كەچی - لەبەر ئەوەی قەناعەت و تەوەككولیان هەیە - ڕۆزییەكانیان بۆ دێت بێ ئەوەی بە دوایدا بگەڕێن و هەڵپەی بۆ بكەن! تەنانەت لە زیندەوەرە گیاندارەكان زیاتر پەرە دەسێنن و بەروبووم پێشكەش دەكەن. بەڵام "زیندەوەرانی تر" بە هەوڵ و ماندووبوونێكی زۆر نەبێت ڕۆزییان دەستگیر نابێت، ئەویش بە ئەندازەیەكی كەم و ناتەواو! هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە ئەو زیندەوەرانە بە هەڵپەوە هەوڵی بۆ دەدەن. بەڵكو هەر لە خودی جیهانی زیندەوەراندا دەبینین كە بە لێشاو ڕۆزی بەسەر بێچووەكانیاندا دەبارێت و، لە گەنجینەی بەزەیی خواوەندەوە ڕۆزیی یەكجار پاك و بێ گەردی خۆیان بۆ ڕەوانە دەكرێت. چونكە ئەو ساوا و بێچووانە بە زمانی حاڵی لاوازی و كۆڵەواری و دەستەوسانییان تەوەككولیان لەسەر خوای خۆیان دەردەبڕن، كەچی زیندەوەرە دڕندەكان كە بە هەڵپەوە هێرش دەبەنە سەر نێچیرەكانیان، بە ماندووبوونێكی زۆر و هەوڵدانێكی گەورە نەبێ ڕۆزییان دەستگیر نابێت!

ئەم دوو حاڵەتە، بە جوانی بۆمان ڕوون دەكەنەوە كە هەڵپەكردن دەبێت بەهۆی بێبەش بوون، بەڵام تەوەككول و قەناعەتكردن دەبنە هۆی دەستكەوتنی بەخشایش و میهرەبانی.

هەمان شت لە جیهانی "ئادەمیزاد"یشدا دەبینین. ئەوەتا جوولەكەكان كە لە هەموو كەس زیاتر لە هەڵپەدان بۆ ژیان (ئیتر هەر جۆرە ژیانێك بێت) و، فەزڵی ژیانی دنیا بەسەر هی قیامەتدا دەدەن، بەڵكو تا ڕادەی شەیدابوونیش دنیایان خۆش دەوێت و لەم بوارەدا پێش هەموو نەتەوەیەكی تر كەوتوونەتەوە، ئەم جوولەكانە، هەر لە دێر زەمانەوە لەسەر دەستی نەتەوەكانی تردا چەندین كوشتاریان لێ كراوە و چەندان جاریش زەلیلی و ڕسواییان دەرخوارد دراوە و، هەموو ئەمانەیان بەسەردا هاتووە لە بەرامبەر ئەوەی كە سەروەت و سامانێكی چەپەڵ و حەرامیان لە ڕێی سوو(الربا)وە دەستگیر ببێت و بە هەوڵێكی سەروەری زۆر پەیدای بكەن. كە بەم جۆرەش كۆیان دەكردەوە، بەشێكی كەم نەبێت هیچیان لێ كار نەدەكرد. وەك بڵێی كار و كاسبی و پیشەیان تەنها هەر كۆكردنەوە بێت!

ئەم حاڵەتە ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە هەڵپەكردن كانگا و سەرچاوەی زەلیلی و زەرەرمەندی و بێ نرخییە.

چەندین ڕووداوی لەژمارەبەدەر هەن، هەموویان دەری‌دەخەن کـە مرۆڤی هەڵپەکار هەمیشـە لـە زیـانەوە نزیکـە، بە ڕادەیەك کـە وتەی: "الحريصُ خائبٌ خاسر"[1] بووە بـە پەند و وەك حەقیقەتێك سەیر دەکرێت.

جا مادەم ئەمە حەقیقەت و ئەنجامی هەڵپەکردنە و، تـۆش ئەگـەر بـە ڕاسـتی حـەزت لـە دەستخستنی مـاڵی دنیایـە و دەتـەوێت بـە لێشـاو دەسـتت بکـەوێت، ئـەوا بزانـە کـە بـە هەڵپەکردن دەستگیر نابێت، بەڵکو لە ڕێگـای تەوەککولـەوە هـەوڵی بـۆ بـدە بـا دەسـتت بکەوێت.

دەتوانین تەشبیهی هەڵپەکاران و قانیعان بەم نموونەیە بکەین:

جـارێك دوو کـەس دەڕۆنـە میوانیـیـەکی گـەورە کـە دەسـتەڵاتدارێکی مـەزن سـازی کردبوو.. یەکێك لەو دوانە پـڕ بـە دڵ ئاواتـەخوازی ئـەوەبوو کـە جێـی ببێتـەوە. لـە دڵـی خـۆی‌دا دەیـوت: خـۆزگـا هـەر چـۆن دەبـوو خـاوەنی دیوەخـان جێـی دەکردمـەوە و لــە سەرمای دەرەوە ڕزگاری دەکـردم، من هـەر ئـەوەندەم بەسـە. خـۆ ئەگـەر لـە خـوارووی خەڵکەکەشەوە جێگایەکم بداتێ ئەوا مەردایەتیم لەگەڵدا دەکات.

بەڵام ئەوی تریان، بە پێچەوانەوە، چـەند ڕەفتـارتێکی وای نوانـد کـە ئـەوە بگەیـەنێت مافی بەسەر خاوەن ماڵەوە هەبێت و پێی وابێت دەبێ ئەوان بە ناچـاری خزمـەتی بکـەن و ڕێزی لـێ بگـرن! بـەم جـۆرە، لـە خـۆی بـایی بـوو و لـە دڵـەوە دەیـوت: "دەبێ خـاوەنی دیوەخان بەڕێزترین و باشترین جێگام بۆ دابین بکات". پاشـان بە هەڵپە و تەماعەوە ڕۆشـتە نـاو دیوەخـان و چـاوی بـۆ شـوێنی بـاش و لای سـەرووی مـەجلیس دەگـێڕا! خـاوەنی دیوەخانیش کە ئەم ڕەفتارەی لـێ بینی، خوارتریـن جێـی لـە مەجلیسـەکەدا پیشـان دا کـە تیـای‌دا دابنیشێت! جا لـەو کاتـەدا کـە دەبـوو سوپاسـی پێشـکەش بکردایـە، کـەچی بـە پێچەوانـەوە، ڕەخنـەی لـە خـاوەنی دیوەخـان گـرت و ڕەزای خـۆی لــە بـەرچاوی دانیشتووانـدا قورس کرد.

بـەڵام میوانـی یەکـەمیان، بـە خۆنەویستی و تەوازوعـەوە ڕۆشـتە ژوورەوە و بـە دوای جێگایەکی نزیکدا دەگەڕا. خاوەنی دیوەخانیش بەخێرهاتنی کـرد و ڕێـزی لـێ گـرت و، کە ئەم تەوازوعەشی لـێ بینی، دڵی پێی کرایـەوە و پێـی خـۆش بـوو. لەبـەر ئـەوە، نزیکـی خستەوە لـە خـۆی و جێگایەکی بەرزی پێ بەخشی و ئەمیش تا زیاتر لێی نزیك دەبووەوە، سوپاسی زیاتری لە ڕووی خاوەنی دیوەخاندا دەنواند.

---

(١) واتە: مرۆڤی هەڵپەکار و بە تەماع، نائومێد و زەرەرمەندە. (وەرگێڕ)

دنیاش بەم چەشنەیە، دیوەخانی میوانداریی خوای میهرەبانە.. سەر ڕووی زەوی: سفرە و خوانی پڕ لە میهرەبانیی ئەو خواوەندەیە.. پلەكانی نیعمەت و ڕۆزیيەكانی سەر ئەو سفرەیەش، وەكو جێگا جیاجیاكانی ناو مەجلیس و ئەنجومەنی نموونەكەوان.

كاریگەری و ئەنجامی ناهەمواری "هەڵپەكردن" هەموو كەسێك دەتوانێت بۆ خۆی هەستی پێ بكات، تەنانەت لەو كاروبارانەشدا كە زۆر ورد و بچووكن.

بۆ نموونە:

هەموو كەسێك دەتوانێت لە دڵی خۆیدا هەست بە بێزاری لەو سواڵكەرە بكات كە بە هەڵپە و تەماعەوە یەخەی دەگرێت و بەگیری دەهێنێت، تا وای لێ دێت هیچی ناداتێ و دەست بە ڕوویەوە دەنێت.. هەر هەمان كەس بەزەیی بەو سواڵكەرەدا دێتەوە كە بە قەناعەت و بێدەنگییەوە سواڵ دەكات، ئەم بەزەییەش هانی دەدات كە خێری بداتێ و دەست بە ڕوویەوە نەنێت!

نموونەیەكی تر:

هەر شەوێك خەوت لێ بزڕێت و حەزیشت لە خەو بێت، گەر بیر لە خەوتن نەكەیتەوە، ئەوا هێدی هێدی خەوت لێ دەكەوێ.. كەچی گەر لەسەر نوستن سوور بیت و ببێتە خولیای سەرت و بڵێیت: دەبێ كەی خەوم لێ بكەوێت؟ ئەوا خەوەكەت بە جارێ لێ دەزڕێت!

نموونەیەكی تر:

كاتێك كە چاوەڕوانی یەكێك دەبیت و خەریكە ئارامت نامێنێت و زۆر سووریت لەسەر چاوپێكەوتنی، وردە وردە خەفەت سەرت تێدەكات و لەبەر خۆتەوە دەڵێیت: "بۆچی نەهات؟ بۆچی دواكەوت؟!" تا لە ئەنجامی ئەم سووربوونەت لەسەر بینین و چاوپێكەوتنی، ئارامت لا هەڵدەگیرێت و وات لێ دێت ئەو جێگایە جێ دەهێڵیت. خۆ هەر كە تۆ ئەو شوێنەت بەجێهێشت، ئەو كەسە دێت و دەگاتە ئەوێ! بەڵام پاش ئەوەی كە مەبەست لە هاتنەكەی نەما و لە كیس چوو!

ئەو نهێنی و حیكمەتەش كە لەم چەشنە ڕووداوانەدا هەیە، ئەوەیە كە:

هەروەك "نان" لە ئەنجامی چەند كردارێكی یەك لە دوای یەكەوە پەیدا دەبێت، كە لە كێڵگە و سەرخەرمان و ئاش و تەنووردا بەجێدەهێنرێن، شتانی تریش بە هەمان جۆرن.. واتە دەبێ بە پلەپلە و یەك لە دوای یەك و بەپێی حیكمەتی لەسەرخۆیی بێنە كایەوە. بەڵام

مرۆڤی هەڵپەکار بەبۆنەی هەڵپەکردنەوە چاودێریی ئەو پلە پلە بوون و یەك لە دوای یەك هاتنانە ناکات، کە چەند هەنگاوێکی مەعنەوین و لە ڕێکخستنی شتاندا هەن. ئیتر یان ئەوەیە باز دەدات و پاشان دەکەوێت! یان ئەوەیە پلەیەك لەو پلە زۆرانە بەجێ دەهێڵێت و ناگاتە ئامانج و مەبەستەکەی!

دەسا ئەی ئەو برایانەی کە هێندە بۆ ژیانی دنیا بە پەرۆشن کە سەریان لێ تێکچووە و لە هەڵپەکردنیاندا بۆ دنیا ڕێگایان لێ ون بووە!

بۆچی ئێوە لەبەر هەڵپەکردن بۆ ژیانی دنیا ئاوا بە زەلیلی و سەرشۆڕی ڕازی دەبن، لە کاتێکدا کە ئەم هەموو گیرو گرفت و زیانانەشی لە دووتوێدایە؟

بۆچی بەو چەشنە ڕوو لە هەموو ماڵ و سامان و سەروەتێك دەکەن، بێ ئەوەی گوێ بدەن بەوەی کە ئایا حەڵاڵە یان حەرام؟.. بۆچی لەو پێناوەدا چەند کاروبارێکی گەورە و بەنرخی ئەوتۆ بەخت دەکەن کە ژیانی دوارۆژتان داخوازیانە و لەسەری بەندە؟ تەنانەت واتان لێ هاتووە کە لە پێناوی ئەم هەڵپەیەدا یەکێك لە پایە گەورەکانی ئیسلام (کە زەکاتە) واز لێ دەهێنن. لە کاتێکدا کە زەکات دەرکردن دەرگایەکی گەورەی وایە دەبێتە مایەی پیت و بەرەکەت و دەوڵەمەندی بۆ هەموو کەسێك و، گیرو گرفت و موسیبەتیشی لێ دوور دەخاتەوە؟

ئەوانەی کە زەکاتی ماڵیان دەرناکەن، بە بێ هیچ گومانێك، بە ئەندازەی ئەو زەکاتەی کە دەکەوێتە ئەستۆیان، سامان لەدەست دەدەن و لە شتی پڕوپووچ و بێ سووددا لە ناوی دەبەن. یان بەڵا و موسیبەتێکی وایان دێتەڕێ کە بە زۆر ئەو ئەندازەیان لە دەست دەردەهێنێت و لەناوی دەبات!

ساڵی پێنجەمی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە خەونێکی ئەندێشەیی سەیر و خاوەن حەقیقەتدا، ئەم پرسیارەم لێ کرا:

(ئایا چ نهێنییەك لەم هەژارییەدا هەیە کە نەتەوەی ئیسلام گرفتاری بووە و، بۆچی زەرەر و زیانی ئاوا ڕووی کردووەتە ماڵ و سامانیان؟.. نهێنیی ئەو ئەشکەنجە و ئازارەش چییە کە جەستەیان لە ژێریدا دەناڵێنێت)؟

هەر لەو خەونەدا وەڵامی ئەم پرسیارەم بەم جۆرە دایەوە:

(خوای گەورە لەو ماڵ و سامانەی پێی بەخشیوین، لە هەندێکیاندا یەك لە دە و، لە هەندێکی تریشیاندا یەك لە چلی بە فەرز لەسەر داناوین کە لەو ماڵە دەری بکەین و بیدەین بەو کەسانەی کە خوای گەورە خۆی بۆی دەستنیشان کردووین، تاکو لە

لایەکەوە خێری ئەو دوعایانەمان دەستگیر بێت کە لە زاری هەزارانەوە دەردەچن و، لەلایەکی تریشەوە لە ڕق و کینە و حەسوودیی دەروونیشیان ڕزگارمان بێت. بەڵام ئێمە لەتاو هەڵپەکردنمان بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی دنیا، دەستمان نووقاند و زەکاتمان دەرنەکرد. خوای گەورەش ئەو زەکاتەی بە ڕێژەی (سی لە چل) و (هەشت لە دە) لێ وەرگرتینەوە..

هەروەها خوای گەورە داوای لێ کردین لە پێناوی ئەودا تەنها یەك مانگ لە ساڵێکدا برسێتی بچێژین و بەڕۆژوو ببین، کە ئەمەش نزیکەی حەفتا حیکمەت و سوودی بۆ ئێمە تێدایە. بەڵام ئێمە لەبەر ئەوەی نەفسی خۆمان زۆر بەلاوە ئازیز بوو، بەزەییمان پێدا هاتەوە و، نەمانویست ئەو برسێتییە کاتییەی پێ بچێژین. خوای گەورەش لە سزای ئەمەدا پێنج ساڵی ڕەبەقی یەك لە دوای یەك بە سزای جۆرە برسێتی و ڕۆژوویەك گیرۆدەی کردین کە نزیکەی حەفتا موسیبەتی بۆ ئێمە تێدا بوو..

هەروەها خوای گەورە داوای لێ کردین جۆرە فەرمان و تەعلیماتێکی نوورانی و بەرز و پەروەردگارییانە لە ماوەی یەك سەعاتی ئەو بیست و چوارسەعاتەی شەو و ڕۆژدا بەجێ بهێنین. کەچی ئێمە لە بەجێهێنانی ئەو زیکر و دوعا و نوێژانەدا تەمبەڵیمان نواند و، ئەو سەعاتەشمان لەگەڵ سەعاتەکانی تردا لەدەستچوو. خوای گەورەش لە کەفارەتی ئەو خراپکاری و کەمتەرخەمییانەماندا ناچاری بەجێهێنانی جۆرە پەرستش و نوێژێکی تایبەتیی کردین، کە بریتی بوو لە بەجێهێنانی تەعلیمات و مەشق و هێرش و بگرەو بەردەی جەنگ لە ماوەی پێنج ساڵی ڕەبەقی یەك لە دوای یەکدا)!

بەڵێ، لەو خەونەدا وام وت. پاشان کە بێدار بوومەوە، سەرنجم دا و گەیشتمە حەقیقەتێکی گرنگ کە لەو خەونەدا هەبوو. کە ئەمەی خوارەوەیە:

دوو وشە هەن سەرچاوەی هەموو نزمایەتی و دواکەوتنە ڕەوشتییەکانی مرۆڤایەتین. هەر ئەم دوانەشن کە دەبنە سەرچاوەی باروودۆخە ئاڵۆز و شڵەژاوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ.

لە وتەی بیست و پێنجەمی کتێبی سۆزلەر(وتەکان)دا لە باسی ئەو بەراوردەی کە لە نێوان شارستانێتیی نوێ و فەرمانەکانی قورئانی پیرۆزدا ساز کراوە، ئەو دوو وشەیەمان چەسپاندووە و ڕوونمان کردوونەتەوە. دوو وشەکەش ئەمانەن:

وشەی یەکەم ئەوەیە کە دەڵێت: "من خۆم تێر بم چش لە خەڵکی، با لە برساندا بمرن"!

وشەی دووهەمیش ئەوەیە کە دەڵێت: "تۆ بیکە و، من دەیخۆم"!

دوو شتی تریش هەن، بەردەوامی و مانەوە بەم دوو وشەیە دەبەخشن کە بریتین لە: بڵاوبوونەوەی "سوو"(الربا) و.. نەدانی "زەکات".

تاقانە چارەسەر و دەرمانی شیفابەخشی ئەم دوو نەخۆشی‌یە لەوەدایە کە زەکات بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵدا فەرز بکرێت و، "سوو"یش بە تەواوی لابرێت و حەرام بکرێت. چونکە گرنگیی زەکات تەنها بۆ چەند کەس و کۆمەڵێکی دیاری‌کراو نی‌یە، بەڵکو زەکات پایەیەکی گرنگە لە بنیاتنانی بەختەوەری و شادمانیی تێکڕای مرۆڤایەتی‌دا. بەڵکو ستوونێکی ڕەسەنی ئەوتۆیە کە ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتیی پێ ڕاگیر دەکرێت. چونکە لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی‌دا دوو چین هەن کە پێیان دەوترێت: (چینی عەوام و چینی خەواص). زەکاتیش بەزەیی و چاکەکاریی چینی خەواص بۆ عەوام و، ڕێز و ئیحتیرامی چینی عەوامیش بۆ خەواص دەستەبەر دەکات.. دەنا کوتەکی زوڵم و ستەمکاری و خۆسەپاندنی خەواصەکان بەسەر عەوامەکاندا دەبارێت و، ئەو ڕق و کینەیەش کە لە دەروونی عەوامەکاندایە بەرامبەر دەوڵەمەندان، دەتەقێتەوە و دەردەپەڕێت. ئیتر ئەم دوو چینە هەر بەو جۆرە لە ململانێ و زۆرانکاری‌یەکی بەردەوام و ڕقەبەرایەتی‌یەکی دژواردا دەمێننەوە، تا وردە وردە وای لێ دێت بەرەنگاری یەکتری ببنەوە و بەرامبەر یەکتر ڕابووەستن و لەسەر "دەسمایە" و "کار" دەست بدەنە یەخەی یەکتر، وەك ئەوەی لە ڕووسیادا ڕووی دا!

دەسا ئەی سەخاوەتمەندان و چاکەخوازان و خاوەن ویژدانان!

ئەگەر ئەو خێر و چاکە و دەستگرۆیی‌یانەی دەیانبەخشن، نیەتی زەکاتیان لێ نەهێنن، ئەوا سێ زیانتان لێ دەکەوێت، بەڵکو ئەوەش کە بەخشیوتانە بێ دەستکەوتنی هیچ خێر و قازانج و سوودێك لە دەستتان دەردەچێت. چونکە ئەگەر ئەو چاکەیەی دەیبەخشن، بە ناوی خوا و لە پێناوی خوادا نەبێ، ئەوا - بێ هیچ گومانێك - منەت و پیاوەتی بەسەر ئەوانەدا دەنوێنن کە پێیان دەبەخشن، با بە ئاشکراش ئەم منەتە دەرنەبڕن. بەم کارەش ئەو هەژارە دەکەنە دیلی منەت و دەیبەستنەوە، پاشان لە نزا و دوعای پاك و بێ گەردیشیان بێ‌بەش دەبن.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە خۆتان بە "خاوەن ماڵ" دەزانن و ئینکاریی نیعمەت دەکەن. کەچی لە ڕاستیدا ئێوە لە ئاستی دابەشکردنی ماڵی خوا بەسەر بەندەکانیدا لە "جێنشین" زیاتر هیچی تر نین.

بەڵام ئەگەر چاکە و بەخششەکانتان لە پێناوی خوا و بە ناوی زەکاتەوە بێت، ئەوا پاداشتێکی گەلێ گەورەتان دەستگیر دەبێت. بەم کارەشتان شوکری ئەو نیعمەتانە دەردەبڕن کە خوای گەورە پێی بەخشیون و، دوعا و نزای گیرای ئەو هەژارانەشتان دەست دەکەوێت، چونکە مادەم بەو جۆرە بەخشیوتانە، ئەویش ناچاری ترس و ڕیا نابێت و، کەرامەتی خۆی دەپارێزێت و ئنجا نزاکانیشی بێ گەرد و خاوێن دەردەچن، هەر لەبەر ئەوەش گیرا دەبن.

بەڵێ، ئەوە لە کوێ و.. ئەمە لە کوێ؟

ئەوە لە کوێ کە بە ئەندازەی زەکات – بەڵکو زیاتریش – لە ماڵ و سامان سەرف بکرێت، بەڵام زیانێکی زۆری وەك ڕیا و ناوبانگی تێدا بێت و، خەڵکیش زەلیل و منەتبار بکات..

ئەمەش لە کوێ کە ئەو زەکات و چاکە و بەخششانە لە پێناوی خوادا ببەخشرێن و، خاوەنەکەی بە دەرفەتی بەجێهێنانی یەکێك لە فەرزەکانی خوای بزانێت و، پاداشتی خوای گەورەی دەست بکەوێت و، ئیخلاس و نزا و دوعای گیرایشی دەستگیر ببێت.

بەڵێ، جیاوازی‌یەکی گەلێ زۆریان لە نێواندایە!

﴿سُبْحانك لا علمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنك أنت العليم الحكيم﴾.

اللهم صلِّ على سيدنا محمد الذي قال: "المؤمن للمؤمن كالبنيان المرصوص يشد بعضه بعضاً"[1] وقال: "القناعة كنز لا يفنى"[2] وعلى آله وصحبه أجمعين. آمين.. والحمد لله رب العالمين.

* * *

(١) رواه البخاري ومسلم والترمذي عن أبي موسى الأشعري. (وەرگێڕ)

(٢) رواه الطبراني في الأوسط عن جابر بلفظ: "القناعة مال لا ينفد وكنز لا يفنى". (وەرگێڕ)

## کۆتایی
### کە تایبەتە بە غەیبەتەوە

(ئەو نموونەیەی کە لە نێوان نموونەکانی مەقامی "زەم و زەجر" لە خاڵی پێنجەمی تیشکی یەکەمی ڕۆشنایی یەکەمی وتەی بیست و پێنجەمدا و لە تەنها یەك ئایەتی پیرۆزدا باس کراوە، دەری خست کە: غەیبەت لە ڕوانگەی قورئانەوە تا چ ڕادەیەك کارێکی نەفرەت لێکراوە. چونکە ئەو ئایەتە بە ئیعجازی خۆی دەری خست کە چۆن لە شەش ڕووەوە غەیبەت لە پێش‌چاوی مرۆڤ دەخات و، ئیتر پێویستی بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تر نەهێشتەوە. بەڵێ، دوای ڕوونکردنەوەی قورئان پێویست بە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی تر نامێنێت).

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ (الحجرات:١٢).

ئەم ئایەتە پیرۆزە، لە شەش پلەدا، نەهی لە "غەیبەت" دەکات و، بە سەرزەنشتێکی توندوتیژ مرۆڤی لێ دوور دەخاتەوە.

جا مادەم ڕووی گوفتار لەم ئایەتەدا ئاراستەی غەیبەتکاران کراوە، ئەوا واتاکەی بەم جۆرە دەبێت:

ئەو "هەمزە"یەی کە لە سەرەتادایە بۆ "ئیستیفهامی ئینکاری"یە، چونکە حوکمی ئەم ئیستیفهامە وەك لافاو دەڕژێتە ناو سەرجەم وشەکانی ئەم ئایەتەی کە هەموو یەکێ لە وشەکانی حوکمێکی لەخۆ گرتووە..

ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە لە وشەی یەکەمدا بە "هەمزە" ڕووی گوفتار دەکاتە ئادەمیزاد و پێیان دەفەرموێ:

ئایا ئێوە خاوەنی "ژیری" نین - کە جێی لێپرسینەوەیە - تا لەم کارە چەپەڵە تێ بگات؟

لە وشەی دووهەمیشدا: ﴿أَيُحِبُّ﴾ بە "هەمزە" پێیان دەفەرموێ:

ئایا ئێوە "دڵ"تان - کە جێی ڕق و خۆشەویستییە - سەری لێ شێواوە، کە وای لێ هاتووە بێزراوترین شتی پێ خۆشە و سڵی لێ ناکاتەوە؟

هەر بە "هەمزە" لە وشەی سێ‌هەمیشدا: ﴿أَحَدُكُمْ﴾ پێیان دەفەرموێ:

ژیانی کۆمەڵایەتیتان – کە لە ژیانی کۆمەڵەوە بەهرەمەندی ژیان و حەیەوییەت دەبێت – چیی لێ قەوماوە؟ بۆچی شارستانێتییەکەتان هێندە لە کاروان جێ ماوە کە بە شتانێك ڕازی دەبێت ژیانتان ژەهراوی و ئاسوودەییشتان لێڵ بکات!

لە وشەی چوارەم: ﴿أن يَأكُلَ لَحْمَ أخيهِ﴾یشدا، بە "هەمزە" پێیان دەفەرموێ:

چ تیرێك مرۆڤایەتیی ئێوەی پێکاوە، تا واتان لێ هاتووە بە وێنەی دڕندە، هاوڕێ خۆشەویستەکەتان بە نێچیر دەزانن و پەلاماری دەدەن؟

ئەم ئایەتە لە وشەی پێنجەمیشدا: ﴿أخيــهِ﴾ بەو "هەمزەیە" ڕوویان تێ دەکات و دەفەرموێ:

ئایا بەزەیی‌تان بە هاوڕەگەزی خۆتاندا نایەتەوە؟ ئایا هیچ پەیوەندی‌یەکی سۆز و میهرەبانی نی‌یە کە بە یەکەوە بتانبەستێت؟ تا واتان لێ هاتووە بەردەبنە گیانی کەسێك کە لە چەند ڕوویەکەوە براتانە و، بە دڵڕەقی گۆشتی کەسی مەعنەوی و ستەم لێکراوی ئەو دەخۆن؟ گەر کەسێك گاز لە ئەندامێکی خۆی بگرێت ئایا بە مرۆڤێکی هۆشمەند و ژیر دادەنرێت؟ یان بە شێتێکی نەفام؟!

هەر بەو "هەمزە"یە لە وشەی شەشەمیشدا: ﴿مَيْتاً﴾ پێیان دەفەرموێ:

ویژدانتان لە کوێیە؟ ئایا فیترەتی ئێوە هێندە گەنیوە پەلاماری چەپەڵترین شتی نەفرەت لێکراو بدات، کە خواردنی گۆشتی براکەتانە، لە کاتێکدا کە شایانی هەموو ڕێزێکە؟

لەم ئایەتە پیرۆزەوە و لەو بەڵگە جۆراوجۆرانەی وشەکانیشی کە باسمان کردن، دەردەکەوێت "غەیبەت" لە ڕووی: ژیری و، دڵ و، مرۆڤایەتی و، ویژدان و، فیترەت و، ئایینەوە، کارێکی خراپ و نارەوایە.

دە فەرموو بۆ خۆت بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکەرەوە و، بزانە کە چۆن بە ئیعجازێکی لە ڕادەبەدەر و کورتکردنەوەیەکی زۆر پوخت و لە شەش پلەدا، نەهی لە تاوانی "غەیبەت" دەکات!

بەڵێ ڕاستە، غەیبەت چەکێکی نزم و چەپەڵە و، کەسانی حەسوود و سەرسەخت و دوژمنی یەکتر بەکاری دەهێنن، چونکە مرۆڤی خاوەن دەروونی بەرز دانابەزێتە ئاستی بەکارهێنانی چەکی وا نزم و بێ‌نرخ. هەر لە مێژە شاعیرێك وتوویەتی:

وأُكبِرُ نفســي عن جزاءٍ بغيبة فكل اغتيابٍ جهدُ من لا له جهدُ[1]

---

(١) واتە: خۆم لەوە بە گەورەتر ڕادەگرم کە بە غەیبەتکردن تۆڵەم بسێنمەوە، چونکە "غەیبەت" داڵدەی کەسانی بێ‌توانایە. بڕوانە: (ديوان المتنبي) ص١٩٨ ط. دار صادر – بيروت. (وەرگێڕ)

غەیبەتیش بریتی‌یە لە: "باسکردنی براکەت بـە شـێوەیەك کـە پێـی نـاخۆش بێـت". جـا ئەگەر بەو جۆرە بێت کە تۆ باسی دەکەیت، ئـەوا غەیبـەتت کـردووە. گـەر بـەو جـۆرەش نەبێت، ئەوا بوختانت بۆ هەڵبەستووە. واتە تاوانێکی دووچەندانەت بەرامبەری کردووە.

بـەڵام هەرچـەند "غەیبـەت" حەرامـە، کـەچی لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە چـەند حاڵـەتێکی تایبەتی‌دا دروستە:

یەکێك لەو حاڵەتانە: دەرخستنی ستەم لێکراوی‌یە. واتە ستەم لێکراو بـۆی هەیـە کـە وەسفی ستەمکارەکەی لای حاکمێك بکات تاکو بۆ لابردنـی ئـەو ستەمە یـان ئـەو کـارە ناڕەوایە یارمەتیی بدات.

یەکێکی تر: داوای پرس و ڕایە. واتە گەر یەکێك ڕاوێـژی پـێ کردیـت سـەبارەت بـە هاوبەشی کردنی کـار و کەسـابەت یـان هەرشـتێکی تـر لەگـەڵ کەسـێکدا و، تـۆش بـە بێ گەردی و تەنها لەبەر خاتری خوای گەورە ویستت ئامۆژگاریی خـاوێنی بکـەیت، بێ ئەوەی ئامانجی کەسیی خۆتی ئاوێتـە بێـت، ئـەوا دروسـتە پێـی بڵێـت: "کـەڵکی مامەڵـە لەگەڵ کردنی نی‌یە، تووشی زیان دەبیت".

یەکێکی تر: پێناساندنە، بێ ئەوەی مەبەستت شکاندنی بێت، وەك ئەوەی بڵێت: "ئەو شەلە" یان "ئەو فاسقە".

یەکێکی تر بریتی‌یە لەوەی: ئەو کەسە فاسـقێکی ئـەوتۆ بێـت کـە بـە بـێ شـەرم و ڕوو فاسقی‌یەکەی دەربخات و سڵ لە فەساد و کردەوەی خراپ نەکاتەوە، تەنانەت شانازیش بە کردەوە چەپەڵەکانیەوە بکات و، بە ستەمکردنیشی لە خەڵکی لەزەت بچێژێت.

ئا لەم چەشنە حاڵەتـە تایبەتی‌یانـەدا و لـەبـەر بـەرژەوەندیی تایبـەتی و بێ ئـەوەی بەشـی نەفس و ئامانجی کەسیی تێکەڵ ببێت و، تەنها بۆ مەبەستی گەیشتن بێت بە حەق، دروستە غەیبەت بکرێت. دەنا "غەیبەت" هەموو کردەوە چاکەکانی مرۆڤ پـووچـەڵ دەکاتـەوە و بـە وێنـەی ئـەوەی کـە ئـاگر دار و تەختـە دەسـووتێنێت، ئـەو کـردەوە باشـانەش ئـاوا دەسووتێنێت. جا ئەگەر مرۆڤ تووشـی غەیبـەت بـوو، یـان بـە حـەزی خـۆی گوێـی لـێ ڕاگرت، ئەوا دەبێ ئەم دوعایە بکات: "اللهم اغفر لنا ولمن اغتبناه". پاشان هەرکات بـەو کەسە غەیبەت کراوە گەیشت، داوای لێبوردن و گەردن ئازادیی لـێ بکات.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی بیست و سێهەم

باسمه سبحانه

﴿وَإنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته أبداً بعدد عاشرات دقائق عمرك وذرات وجودك!

برای ئازیز و بە غیرەت و جیددی و خاوەن حەقیقەت و خاوێن و وریام!

کەسانی وەك ئێمەی برای حەقیقەت و ئاخیرەت، هەرگیز جیاوازیی کات و شوێن رێی گفتوگۆ و هاودەمیمان لێ ناگرێت. تەنانەت گەر یەکێکمان لە خۆرهەلات و ئەوی ترمان لە خۆرئاوا و، یەکێکمان لە رابوردوو و یەکێکی ترمان لە داهاتوودا و، یەکێك لە دنیا و یەکێکی ترمان لە قیامەتدا بین، دەکرێ پێمان بوترێت کە: ئەوانە پێکەوەن و دەتوانن لەگەڵ یەکتریدا بدوێن و وت و وێژ بکەن! بە تایبەت کە ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە بۆ یەك ئامانج و مەبەست هەوڵ بدەن و لە پێناوی یەك ئەرك و واجبی گرنگدا کار بکەن. بەڵکو هەریەکەیان لە حوکمی ئەوی تردایە!

سەر لە بەیانیی هەموو رۆژێك وا تەسەوور دەکەم کە ئێوەم لەگەڵدان، بەشێك لە دەسکەوتەکانم - کە سێ یەکە - پێشکەشی ئێوەی دەکەم (لە خوا داواکارم قبوولی بکات) ئێوە لە دوعاکانمدا هەمیشە لەگەڵ "عەبدولمەجید" و "عەبدوررەحمان"دان و پشت بەخوا بەشی خۆتان وەردەگرن.

گیروگرفتە دنیایییەکانتان کاری تێ کردم و ئازارم بە ئازاری ئێوە چەشت. بەڵام برام! مادەم دنیا هەمیشەیی نییەو، بەلا و موسیبەتەکانیشی خێری زۆریان لە دووتوێدایە، ئەوا - لە بریی تۆ - من دەستەواژەی: "هەموو حاڵێ دەگوزەرێ"م بە دڵدا هات و، بیرم لە فەرموودەی: "لا عيش إلاّ عيش الآخرة" کردەوە[1] و، ئایەتی: ﴿إنَّ اللهَ

---

(١) صحيح البخاري (١٣٥٨) مسلم (١٨٠٥) عن أنس رضي الله عنه. (وەرگێڕ)

**مَعَ الصَّابِرِين**﴾م خـوێند و، وتم: ﴿**إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُـــون**﴾. بەمـــەش دڵنـەواییم – لـە بریی تۆ – دەست کەوت و سەبووریم بۆ هات!

برام! ئەگەر خـوای گـەورە بەندەیـەکی خـۆی خـۆش بوێـت، وا لـە دنیـا دەکـات کـە پشت لەو هەڵبکات و، ئنجا دنیای ناشیرین و بێزلێکراو پیشان دەدات. پشت بەخوا، تـۆ یەکێکی لەوانەی کە خواوەند خۆشی دەون..

خـەمی زۆریـی ئـەو تەگـەرە و ڕێگرانـە مـەخۆ کـە ڕێ لــە بڵاوبوونـەوەی "وتـەکان" دەگرن، چونکە ئەو کارانەی کە تا ئێستا لە بڵاوکردنـەوەی پەیامـەکاندا ئـەنجامت داون، گەر میهرەبانیی خوای گەورە قبووڵیان بکات، ئەوا – پشت بەخوا – هەموو ئـەو نـاوك و تۆوە نوورین و پیرۆزانە، دەمیان بە چەندەن گوڵزاری ڕەنگین دەپشکوێ.

ئەم جارە کۆمەڵە پرسیارێکت بۆ ناردووم تاکو وەڵامیان بدەمەوە، بەڵام برای ئازیزم! بـاش بزانـە کـە: زۆربـەی "وتـەکان" و هـەروەها "مـەکتووبات"یـش بـە کتوپڕی و بـە بـێ ویستی خۆم بۆ دڵـم دێـن و، هـەر لـەبەر ئەوەشـە کـە ناسـك و ڕەنگین دەردەکـەون. خـۆ ئەگەر من بە ویست و ئیختیاری خۆم و دوای بیرکردنەوە و تێڕامان و بە ئەندازەی هـێزی زانیاریی "سەعیدی کۆن" وەڵامی پرسیارم بدایەتـەوە، ئەوا وەڵامـەکان کـز و خـامۆش و ناتـەواو دەردەچـوون. وا ماوەیەکە ئـەو واتایانـەی کـە لـە ئاسـۆی دڵمـدا هـەڵدەهاتن، وەستاون و ئنجا هێزی بیر و زەینیشم خامۆش بووە. بەڵام – لەگەڵ ئەوەشـدا – زۆر بـە پوختی وەڵامی پرسیارەکانت دەنووسین، بەو هیوایەی کە بێ وەڵام نەمێننەوە:

○ **پرسیاری یەکەمتان:**

باشترین دوعا کە ئیماندار بۆ برای ئیمانداری خۆی بکات، دەبێ چۆن بێت؟

**وەڵام:**

دەبێ ئەو دوعایە لە نێوان بازنەی هۆکارەکانی قبووڵ بووندا بێت و ئەو هۆکارانـەی تێـدا ڕەچـاو کرابێـت. چونکـە گومـان لـەوەدا نیـیـە کـە "دوعـا" لـە نێـوان چـەند هەلومەرجێکی تایبەتیدا قبووڵ و گیرا دەبێت. ئنجـا هـەتا ئـەو هەلومەرجانـەش زیـاتر بـن ئەوا دوعاکانیش پتر گیرا دەبن.

یەکێك لەوانە: پاکژیی مەعنەوییە. واتە: تۆبـە و داوا کردنـی لێبوردنـە لـە سـەرەتای دەسـتکردندا بـە پاڕانەوە و، پاشـان سـڵاواتدانە لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ کـە – بێ گومـان – دوعایـەکی گیرایـە، تـاکو دوعاکـەر ئـەو سـڵاواتانە بکـات بـە هـاودەم و تکاکـاری لاڵانەوەکەی و، پاشـان لـە کۆتاییشـدا سـڵاوات لەسـەر پێغەمبەر ﷺ دووپات بکاتـەوە،

چونکە هەر نزا و لاڵانەوەیەك کە لە نێوان دوو دوعای گیرادا بێت، ئەویش – پشت بەخوا – گیرا دەبێت.. هەروەها لە پاشملە – نەك لە ڕوودا – دوعای بۆ بکات و.. لەو دوعایانەش بن کە پێغەمبەر ﷺ کردوونی و، ئەوانەش کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، وەك:

﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ (البقرة:٢٠١).

"اللهم إني أسألك العفو والعافية لي وله في الدنيا والآخرة".

ئەمانە و هاوچەشنیان لەو دوعا و نزا گشتییانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتوون..

هەروەها بە نیازی خاوێن و بێ گەرد و، بە ئامادەیی و خشووعی دڵەوە بیکات و.. لە پاش نوێژەکانەوە، بە تایبەتی نوێژی بەیانی و.. لە شوێنە پیرۆزەکاندا بە تایبەت لە مزگەوتەکاندا و.. لە ڕۆژانی جومعە بە تایبەت لە سەعاتی دوعاگیرابووندا و.. لە مانگە پیرۆزەکاندا بە تایبەت شەوە بەناوبانگەکانیان و.. لە مانگی ڕەمەزان بە تایبەت لە "شەوی قەدر"دا.

هەر دوعا و نزایەك بەم هەلومەرجانە بکرێت، لە میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە ئومێد دەکرێت کە گیرای بکات و دەست بە ڕوویەوە نەنێت.

جا ئەو دوعایەی کە گیرا بووە، یان هەر لە دنیادا شوێنەوارەکەی دەردەکەوێت، یاخود بۆ ئەودنیا و ژیانی هەمیشەیی دوعابۆکراوەکە گیرا دەبێت. واتە: ئەگەر ئەو مەبەست و ئامانجەی کە دوعاکەی لە پێناودا کراوە، لەم دنیایەدا نەهاتە دی، ناوترێت دوعاکە گیرا نەبووە. بەڵکو دەوترێت: بە چەشنێکی لەوە باشتر گیرا بووە کە لە دنیادا چاوەڕوان دەکرا.

**❍ پرسیاری دووهەمتان:**

ئایا دروستە جگە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ کەسی تر "رضي الله عنه" بوترێت؟

**وەڵام:**

بەڵێ.. چونکە ئەم نزایە تایبەت نییە بە هاوەڵانەوە و، چەشنی "عليه الصلاة والسلام" نییە کە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ. تەنانەت – جگە لە هاوەڵان – دەبێ دەستەواژەی "رضي الله عنه" بۆ هەر چوار پێشەوا موجتەهیدەکان و، شێخی گەیلانی و، ئیمامی غەزالی و، ئیمامی ڕەببانی و، کەسانی تری هاووێنەی ئەوان لە میراتگرانی

پێغەمبەران و ئەوانەی کە لە پلەی "ویلایەتی کوبرا" و مەقامی "ریضــــا"دان، بەکاربهێنرێت.

بەڵام داب و عورفی زانایان لە دێر زەمانەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتووە کە بۆ هاوەڵان "رضي الله عنهم" و، بۆ تابیعین و ئەوانەی دوایان: "رحمـــهم الله" و، بۆ کەسانی دوای ئەوانیش: "غفر الله لهم" و، بۆ ئەولیاکانیش: "قُدِّسَ سِرُّهُم" بەکاربهێنرێت.

○ **پرسیاری سێهەمتان:**

ئایا کامیان گەورەترن: پێشەوا موجتەهیدە مەزنەکان.. یان شێخان و ئەقتابی تەریقەتە ڕاستەکان؟

**وەڵام:**

نەك هەموو موجتەهیدەکان، بەڵکو چوارەکەیان: (ئیمامی ئەبوحەنیفە و شافیعی و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل" - خوایان لێ ڕازی بێت - ئەوانە گەورەترن و، لە سەرووی ئەقتاب و شێخانی تەریقەتە ڕاستەکانەوەن.

ئنجا ئەوەش هەیە کە هەندێ لە ئەقتابە مەزنەکانی چەشنی شێخی گەیلانی لە ڕوویەکەوە و لە چاکەی تایبەتیدا دارای پلەیەکی ڕووناکترن. بەڵام لە چاکەی گشتیدا پلەی هەرەبەرز هەر هی پێشەوا بەرێزەکانە.

ئنجا هەندێ لە گەورە مەردانی تەریقەت خۆیشیان موجتەهیدن. کەواتە ناوترێت: تێکڕای موجتەهیدان لە تێکڕای ئەقتاب گەورەترن.

بەڵام لە پاش هاوەڵانی بەرێز و حەزرەتی مەهدی - خوا لە هەموویان ڕازی بێت - چوار موجتەهیدەکان بە گەورەترین کەس دادەنرێن.

○ **پرسیاری چوارەمتان:**

چ حیکمەت و مەبەستێك لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەیە کە دەفەرموێ:

﴿**إِنَّ اللهَ مَعَ الصَّابِرِين**﴾ (البقرة:١٥٣)؟

**وەڵام:**

خوای گەورە، بەپێی داخوازیی ناوی: "الحكيم"ی خۆی، لە "بوون"ی هەر شتێکدا چەند پلە و هەنگاوێکی یەك لە دوای یەکی داناوە کە وەك پلیکانەی ئاسایی وان. جا ئەو کەسەی کە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ژیانیدا، لەسەرخۆ نییە و چاودێریی ئەو پلانە ناکات، ئەوا یان بەسەر پلەکاندا باز دەدات و دەکەوێتە خوارەوە.. یاخود بە ناتەواوی بەجێیان دەهێڵێت و بە ئامانج ناگات. هەر لەبەر ئەوەشە کە "هەڵپەکاری" لە

هەر شتێکدا ببێت، دەبێ بەهۆی نائومێدی. کەچی "ئارامگرتن" بە پێچەوانەوەیە و گیرو گرفت چارەسەر دەکات! ئەمەش بە ڕادەیەکی ئەوتۆ ڕوون و چەسپاوە کە وتەی: "الحريص خائبٌ خاســـر" و "الصـــبرُ مفتـــاحُ الفـــرج"[1] وەك پەندیان لێ هاتووە و دەماودەمیان پێ دەکرێت.

بەو واتایەی کە: چاودێری و پشتگیریی خوای گەورە لەگەڵ ئارامگرتندایە. چونکە ئارامگرتن سێ جۆرە:

*یەکەم*: ئارامگرتن لەسەر دوورەپەرێزی و توخن نەکەوتنی گوناهکاری و تاوان. ئەم جۆرە ئارامگرتنە پێی دەوترێت: "تەقوا" و، خاوەنەکەی بە نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿**إِنَّ اللهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ**﴾ (البقرة:١٩٤) بەهرەوەر دەکات.

دووهەم: ئارامگرتن لەکاتی موسیبەتدا. ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت "تەوەککول" و "سپاردنی هەموو کارێك بە خوای گەورە". ئەم چەشنە ئارامگرتنە خاوەنەکەی شەرەفمەندی گەیشتن دەکات بەم ئایەتە پیرۆزانە: ﴿**إِنَّ اللهَ يُحِـــبُّ المتوَكِّلـــينَ**﴾ (آل عمران:١٥٩) و ﴿**وَاللهُ يُحِبُّ الصَّابرينَ**﴾ (آل عمران:١٤٦).

بەڵام گەر کەسێك لەو چەشنە کاتانەی ژیانیدا ئارام نەگرێت، ئەوا لە ناوەڕۆکدا سکاڵا لە دەست خوای گەورە دەکات، کە ئەنجامی ئەم سکاڵایەش دەیگەیەنێتە ئەوەی ڕەخنە لە کاری خوای دانای میهرەبان بگرێت و، میهرەبانییەکەی تۆمەتبار بکات و دەست بە ڕووی دانایی ئەو خواوەندەوە بنێت و دانی پێدا نەنێت!

بەڵێ ڕاستە، مرۆڤی لاوازی کۆڵەوار، لە ناو ئەو مشتەکۆڵانەی کە موسیبەتەکان تێی دەسرەوێنن، ئازار دەچێژێت و دەناڵێنێت و سکاڵا دەکات. بەڵام دەبێ سکاڵای موسیبەت تەنها بۆ لای خوای گەورە ببرێت، نەك سکاڵای لە دەست بکرێت! وەك حەزرەتی یەعقووب - دروودی لەسەر بێت - دەفەرموێ: ﴿**إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِـــي إِلَى اللهِ**﴾ (یوســـف:٨٦) واتە: سکاڵای خەم و پەژارەی سەختم هەر تەنها لای خوای گەورە هەڵدەڕێژم. بەو واتایەی کە دەبێ سکاڵای موسیبەت تەنها بۆ لای خوای گەورە بیات، نەك لای خەڵکی سکاڵا لەدەست خوا دەربڕێت و ئاخ و ئۆف هەڵبکێشێت و بڵێت: "جا من چیم کردووە تا بەم موسیبەتە سزا بدرێم" و بیەوێت بەم جۆرە وتانە

(١) واتە: ئارامگرتن کلیلی دەروو لێ کردنەوەیە. (وەرگێڕ)

دڵنەرمیی ئەو خەڵکە دەستەوسان و هەژارانە بۆ خۆی بیزوێنێت. دیارە ئەم کارە جگە لە زیان هیچ ئەنجامێکی تری نابێت.

*جۆری سێ‌هەمی ئارامگرتن:* بریتی‌یە لە ئارامگرتن لەسەر خواپەرستی، کە لەوانەیە خاوەنەکەی بگەیەنێتە پلەی "مەحبووبییەت" و ئەویش دەیگەیەنێتە پلەی: "بەندایەتیی تەواوەتی" کە بەرز و بلندترین پلەکانی بەندایەتی‌یە.

❍ **پرسیاری پێنجەمتان:**

وەك ئاشکرایە "تەکلیف"ی بەندایەتی لە تەمەنی پازدە ساڵی‌یەوە دەست پێ دەکات. جا ئایا پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئەو تەمەنە و لە پێش پێغەمبەرایەتی‌دا، چۆن خواپەرستیی ئەنجام داوە؟

**وەڵام:**

بەو پاشماوەیەی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - خواپەرستیی دەکرد کە لە نیوەدوورگەی عەرەبدا و لە ژێر چەندین پەردەی زۆرەوە مابووەوە. بەڵام ئەم خواپەرستی‌یەی لە شێوەی فەرز و واجبدا نەبووە، بەڵکو "مەندووب" بووە.

ئەم ڕاستی‌یە درێژخایەنە، بەڵام با ئێستا بە کورتی بمێنێتەوە.

❍ **پرسیاری شەشەمتان:**

چ حیکمەتێك لەوەدا هەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی چل ساڵی‌دا - کە تەمەنی کاملیی مرۆڤە - کرا بە پێغەمبەر ﷺ؟ پاشان حیکمەتی وەفاتیشی چی‌یە لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی‌دا؟

**وەڵام:**

حیکمەتی زۆری تێدایە، کە ئەمەی خوارەوە یەکێکیانە:

"پێغەمبەرایەتی" ئەرکێکی یەکجار گران و کۆڵێکی تابڵێیت قورسە، گەر مرۆڤ هەموو توانستە "ژیرەکی"یەکانی گەشە نەکات و پێ نەگات و، توانا و لێهاتنەکانی "دڵ"یشی بە تەواوی کامڵ نەبووبن، ئەو ئەرکەی ناخرێتە ئەستۆ. کاتی ئەم کامڵبوونەش تەمەنی چل ساڵی‌یە.

بەڵام تافی هەرزەکاری و لاوی، کە دەمی هەڵچوونی هاندەرە دەروونی‌یەکان و گەرمەی قوڵپدانی غەریزەکان و کاتی هەوڵدان و هەڵپەکردنە بۆ دنیا، هەرگیز بۆ کار و فرمانەکانی پێغەمبەرایەتی دەست نادات، کە چەند کار و ئەرکێکی پوختی تەنها سەر بە دواڕۆژن و، بە بێ گەردی و خاوێنی و تەنها بۆ خوای گەورە ئەنجام دەدرێن. چونکە

هەرچەندەش مرۆڤ پێش تەمەنی چل ساڵی لە کارەکانی‌دا جیددی و بێ ئامانج و دوور لە مەبەستی دنیایی بێت، لەوانەیە کەسانی تر لەوانەی کە بۆ ناوبانگ تێدەکۆشن وا گومان ببەن کە ئەمیش وەك ئەوان بۆ دەستخستنی پلەوپایەی دنیا تێدەکۆشێت! کەواتە بە ئاسانی لەو تۆمەتانەی ئەوان دەرباز نابێت. کەچی پاش چل ساڵی، تەمەن ڕووەو دەرگای گۆڕ هەنگاو دەنێت و، ئاخیرەتی لەچاو دنیا زیاتر لێ دیارە. لەبەر ئەوە، بە ئاسانی لە تۆمەتی خەڵکی ڕزگاری دەبێت و، لە کردوکۆشش و ڕەفتارەکانی سەر بە دوارۆژی‌دا پتر سەردەکەوێت و، خەڵکیش گرفتاری گومانی خراپ نابن و ئەوانیش لەو گوناهە ڕزگاریان دەبێت.

سەبارەت بە تەمەنی پیرۆزیشیەوە کە شەست و سێ ساڵ بووە، ئەوا لە نێوان حیکمەتە زۆرەکانی‌دا تەنها یەکێکیان باس دەکەین:

بەپێی فەرمانی شەرع دەبێ ئیمانداران لەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێزدا و، لە هەموو کەسێك زیاتر پێغەمبەری مەزنیان ﷺ خۆش بوێت و ڕێزی لێ بگرن و، نەفرەت لە هیچ شتێك نەکەن کە تایبەت بێت بە پێغەمبەرەوە ﷺ. بەڵکو دەبێ هەموو حاڵ و بارێکی پێغەمبەرەکەیان بە جوان و خاوێن ببینن. لەبەر ئەمە، خواوەندی مەزن پێغەمبەرە خۆشەویست و گەورەکەی خۆی ﷺ بۆ کاتی پیری و کەنەفتی و دەمی گیروگرفت و سەختیی ژیان ناهێڵێتەوە کە لە دوای تەمەنی شەست ساڵی‌یەوە زۆر دەبن. بەڵکو لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی‌دا - کە تەمەنی مامناوەندی و ئەغلەبی نەتەوەکەیەتی - لە دنیا ڕزگاری دەکات و دەینێرێت بۆ لای هاودەمانی پایەبڵند و مەقامی نزیکیی لای خۆی و، بەمەش دەری‌دەخات کە ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەی لە هەموو شتێکدا پێشەوای مرۆڤایەتی‌یە، دروودی لەسەر بێت.

**○ پرسیاری حەوتەمتان:**

ئایا "خيرُ شبابِكم مَنْ تَشَبَّهَ بكهولِكم، وشرُّ كهولِكم مَــنْ تَشَــبَّهَ بشــبابِكم"[1] فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ؟ ئەگەر فەرموودەی ئەوە، مەبەستەکەی چی‌یە؟

**وەڵام:** بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بیستوومە. مەبەستەکەشی ئەوەیە کە:

(١) أخرجه أبو يعلى والطبراني في الكبير من حديث واثلة. قال العراقي في تخريج الإحيــاء ٦٢/٣ باسناد ضعيف. وأخرجه البيهقي في شعب الإيمان من حديث أنس ومن حديث ابن عباس. وأخرجه ابن عــدي في الكامل من حديث ابن مسعود. وقال ابن الجوزي: لايصح. وقد رمز السيوطي لحسنه. بروانه: فيض القديــر ٤٨٧/٣.

"باشترین لاوان ئەوانەن کە بە تەواوی لە خوای گەورە بێئاگا نین و لەم ڕووەوە پێیان زۆر لێ ڕانەکێشاوە، بەڵکو بە چەشنی پیران یادی مردن دەکەنەوە و، بۆ ئاوەدان کردنی دوارۆژیان لێدەبڕێن و لە کۆت و زنجیری هەوا و ئارەزووی لاوان خۆیان ڕزگار دەکەن. خراپترین پیرانیشتان ئەوانەن کە لە خوای گەورە بێئاگان و بێ ئاگایی لاوی ئەوانیشی ڕاپێچ کردووە و، وەك مناڵ لاسایی هەوا و ئارەزوویان دەکەنەوە".

وێنە ڕاستەکەی ئەوەی کە لە بەشی دووهەمی تابلۆکەتدا بینیبووت، بریتی‌یە لەوەی کە:

لە پشتی سەرمەوە تابلۆیەکم هەڵواسیوە، دانایی‌یەکی ڕەوان و ڕێکی تێدایە، بەیانی و ئێوارە سەیری دەکەم و دەرسی لێ وەردەگرم. ئەمەش دەقی تابلۆکەیە:

**(ئەگەر دۆستت دەوێت، خوای گەورەت بەسە بیگریت بە دۆست).**

بەڵێ، ئەگەر ئەو دۆستت بێت، هەموو شتێك دەبێت بە دۆستت.

**(ئەگەر یار و هاودەمت دەوێت، قورئانت بەسە بۆ هاودەمی).**

چونکە ئەگەر لەگەڵ قورئاندا هاودەم بیت، ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و مەلائیکەتاندا دەژییت، کە باشترین یار و هاودەمن.

**(ئەگەر سامانت دەوێت، ئەوا قەناعەت گەنجینەیەکی سەرروزیادە).**

بەڵێ، مرۆڤی قەناعەتکار دەست پێوە دەگرێت، ئەو کەسەش دەست پێوە بگرێت پیت و بەرەکەتی دەست دەکەوێت.

**(ئەگەر دوژمنت دەوێت، ئەوا نەفسی خۆتت بەسە).**

چونکە بێ گومان ئەو کەسەی لە خۆی ڕازی‌یە، دووچاری موسیبەت و تەنگانە و گیروگرفت دەبێت. بەڵام ئەو کەسەی لە نەفسی خۆی ڕازی نی‌یە، هەمیشە حەوانەوە و شادی و میهرەبانیی دەست دەکەوێت.

**(ئەگەر ئامۆژگاریشت دەوێت، ئەوا مردن باشترین ئامۆژگارە).**

بەڵێ ڕاستە، ئەو کەسەی مردنی لە یاد بێت، لە خۆشویستنی دنیا ڕزگاری دەبێت و، بۆ دوارۆژی خۆی لێدەبڕێت و تێدەکۆشێت.

برای بەڕێزم!

○ وا ئێستا منیش **"مەسەلەیەکی هەشتەم"** لەسەر "حەوت پرسیار"ەکەی ئێوە زیاد دەکەم و دەڵێم:

دوو ڕۆژ لەمەوپێش "حافظ"ێکی بەڕێز چەند ئایەتێکی لە سوورەتی "یووسف" خوێند، تا گەیشتە: ﴿**تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين**﴾ (یوسف:١٠١)..

یەکسەر سەرنجێکی ورد و ناسکم سەبارەت بەم ئایەتە پیرۆزەوە بە دڵدا هات. خۆ هەر شتێکیش تایبەت بێت بە قورئان و ئیمانەوە، تابلێی گرنگ و بەنرخە، با لە رواڵەتیشدا بچووك دیار بێت. چونکە لە رووی بایەخ و گرنگییەوە بە سەرنجێکی بەنرخ و مەزن دادەنرێت..

بەڵێ، هەر شتێك یارمەتیی مرۆڤ بدات بۆ دەستخستنی بەختەوەریی هەمیشەیی، بە کەم تەماشا ناکرێت و هەرگیز ناوترێت: ئەم سەرنجە هێندە بچووکە شایستەی بایەخ پێدان نییە.

بێ گومان "ئیبراهیم خلوصی" یەکەم کەسە بیەوێت گوێ لەم چەشنە مەسەلانە رابگرێت، چونکە یەکەم قوتابی و گوێ راگرە کە رێزی شایستە و شایان لە سەرنجە وردەکانی قورئانی پیرۆز دەگرێت.

کەواتە برام! گوێ رابگرە، ئەمە سەرنجێکی "أحسن القصص"ە!

ئایەتی پیرۆزی: ﴿**تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّـــالِحِينَ**﴾ (یوســف:١٠١) کە هەواڵی کۆتایی پێهاتنی "أحسن القصـــص" رادەگەیەنێت - کە چیرۆکی حەزرەتی یووسفە، درووودی لەسەر بێت - سەرنجێکی ورد و ناسك و بەرز و رەوانی تێدایە و، لە هەمان کاتیشدا - بۆ خۆی - موعجیزەیەکی سەربەخۆیە. چونکە:

ئازار و خەم و خەفەتەکانی "نەمان" و "جودایی" کە چیرۆکەکانی تر لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا بەجێی دەهێڵن، هەموو ئەو چێژە خۆش و تام و لەزەتە بێ گەردانەی کە خەیاڵی مرۆڤ لە چیرۆکەکە چەشتبوونی، لێڵ و ئاوێتەی ئازار دەکەن، بە تایبەت گەر ئەو چیرۆکانە لە دەمی چڵەپۆپەی شادی و لوتکەی بەختەوەریدا هەواڵی مردن و جودایی بە گوێبیست و خوێنەرانیان رابگەیەنن! لەم چەشنە کاتانەدا ئازارەکە هێندە سەخت و بەسۆ دەبێت کە دڵتەنگی و پەژارەیەکی زۆر دەرخواردی خوێنەر و گوێبیستانی دەدات.

بەڵام ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان درەخشانترین بەشەکانی چیرۆکی حەزرەتی یووسف لەو دەمەدا کۆتایی پێ دەهێنێت کە عەزیزی میسر بووە و بە دایك و باوکی شاد بووەتەوە و لەگەڵ براکانیشیدا ئاشتی و گەردن ئازادیی کردووە.

جا هەروەك ئەم ئایەتە هەواڵی وەفاتی حەزرەتی یووسفمان - درووودی خوای لەسەر بێت - لەو لوتکەی شادی و بەختەوەرییەی ئەودا دەداتێ، پێشمان

ڕادەگەیەنێت کە حەزرەتی یووسف - درووودی خوای لەسەر بێت - خۆی داوای ئەم وەفاتەی لە پەروەردگاری کردووە! تاکو بەختەوەرییەکی گەلێ زیاتر لەوەی ئەو دەمەی دنیای بەدەست بهێنێت! ئیتر وەفاتی کرد و بەو بەختەوەرییە یەکجار مەزنە شاد و بەهرەمەند بوو!

بەو واتایەی کە لەودیوی گۆڕەوە بەختەوەرییەکی گەلێ گەورەتر و شادی و خۆشییەکی زۆر زیاتر و مەزنتر هەیە لەوەی کە حەزرەتی یووسفی هاوڕاز و هاودەمی حەقیقەت - درووودی خوای لەسەر بێت - ئەو کاتە تیایدا بووە و لە دنیادا خوا پێی بەخشیوە، بەوەدا کە حەزرەتی یووسف - درووودی لەسەر بێت - لەو باروودۆخە دنیاییە یەکجار بەتام و چێژەدا هەر خۆی داوای مردنی "بە ڕواڵەت" تاڵی لە پەروەردگاری کرد، تاکو پتر کامەرانی بەدەست بهێنێت و بەو بەختەوەرییەی ئەوێ شاد ببێت!

کەواتە - برام! - سەرنج لەم ڕەوانبێژییە داناییبەخشەی قورئانی پیرۆز بدە و، بزانە هەواڵی کۆتایی چیرۆکی حەزرەتی یووسفی - درووودی لەسەر بێت - بە چ شێوازێکی ئەوتۆ ڕاگەیاند کە ئازار و پەژارەی لە دڵی گوێبیستاندا بەجێنەهێشت و خەمی نەدانێ. بەڵکو بەم هەواڵە پتر شاد و گەش و دڵخۆشی کردن!

ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە ئەم شێوازە هەواڵدانە، گرۆی مرۆڤ بۆ ئەمەی خوارەوە ڕێنمایی دەکات کە:

"بۆ ئەودیوی گۆڕەکانتان تەقالا بدەن و تێبکۆشن، چونکە بەختەوەری و تام و چێژی ڕاستەقینە و بێگەرد تەنها هەر لەوێیە"!

جگە لەمانەش، ئەم ئایەتە پیرۆزە، پلەی بەرز و بلندی "صددیقییەت"ی حەزرەتی یووسف - درووودی لەسەر بێت - ئاشکرا دەکات. چونکە ئەم ئایەتە دەریدەخات کە: درەخشانترین و خۆش و کامەرانترین حاڵ و بارەکانی ژیانی دنیا، هەرگیزاو هەرگیز، حەزرەتی یووسفی - درووودی خوای لەسەر بێت - لە "خوای گەورە" و "ڕۆژی دوایی" بێئاگا نەکرد و لە بیری نەبردەوە و سستی و کەمتەرخەمیی بۆ فەراهەم نەهێنا، بەڵکو هەمیشە لە چڵەپۆپەی بەختەوەریی دنیاشیدا هەر داواکار و ئاواتەخوازی "بەختەوەریی دواڕۆژ" بووە!

الباقي هو الباقي
**سەعیدی نوورسی**

# مەکتووبی بیست و چوارەم

بسم الله الرحـــمن الرحيم

يفعل الله ما يشاء ويحكم ما يريد

پرسیار:

ئـەو پـەروەردە بـە شـــەفەقەتەی کـە نـاوی جوانـی "الرحیـم"ی خـوای گـەورە داخوازیـەتی و.. تـەگبیر و کارســازیی شـتانیش بـەپێی بەرژەوەندیـیـەکان، کـە نـاوی "الحکیم" داوای دەکات و.. ئەو ناسك و نیـانی و خۆشەویستی‌یەش کە خواستی نـاوی "الـودود"ی خـوای گـەورەن.. ئەوانـە چۆن لەگـەڵ شتانی سـامناك و ترسـێنەری وەك: "مردن و نەمان و نەبوون و جودایی و گیروگرفت و سەختی‌یەکانی ژیان"دا دەگونجێن؟!

وا سەلماندمان کە هەرچی مرۆڤ لـە ڕێـی مردنـدا دەیـانبینێت و دێنـە ڕێـی، هەموویان "جوان"ن، مادەم لەو ڕێیەوە دەگاتە بەختەوەریی هەمیشـەیی. بـەڵام ئایا چ میـهرەبانی و شەفەقەتێك و.. چ دانایی و بەرژەوەندی‌یەك و.. چ سۆز و بەزەیی‌یەك لـەوەدا هەیە کە ئەم هەموو جۆرە درەخت و ڕووەکە ناسـك و گوڵە جوان و ئاژەڵە زۆرانە بـە فـەنا دەدرێـن و لـەناودەبرێن لـە کـاتێکدا کـە شایسـتەیی "بـوون"یـان تێدایـە و حـەزیان لـە "ژیـان"ە و ئارەزوومەندی "مانەوە"ن؟ ئەوەتا بە بەردەوامی و بێ جیاکردنەوە و، بێ مۆڵـەتدانی هیـچ کامیـان، لـەناودەبرێن و بـێ ئـەوەی بـواری حەوانـەوە بـە هیچیـان بدرێـت لـە کـارە قورسەکاندا دەخرێنەکار و.. بە گیروگرفتەکانیش ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهێنرێت. ئنجا بێ ئەوەی مۆڵەتی مانەوەیەکی کەمیان پێ بدرێت یان هیچ کامیان ڕازی بن، بـەردەوام و بێ ڕاوەستان، بەرەو "مردن" و "نەمان" و "جودایی" دەدرێنەبەر؟!

**وەڵام:**

بۆ ئەوەی ئەم پرسیارە شی بکەینەوە، هەوڵ دەدەین لە دوورەوە بڕوانینـە ئـەم ڕاسـتی‌یە مەزنە، چونکـە ڕاسـتی‌یەکی یـەکجار فـراوان و قـووڵ و بـەرزە، تـاکو بتوانین بـە ڕوونـی حەقیقەتەکـەی ببینین. بۆیـە لـە پێنـج هێمـادا "داخـواز"ەکـانی ئەم ڕاستی‌یە و، لـە پێنـج ئاماژەشدا "ئامانج و سوود"ەکانی ڕوون دەکەینەوە:

## مەقامی یەکەم

## لە پێنج هێمادایە

**هێمای یەکەم:**

لە باسەکانی کۆتایی وتەی بیست و شەشەمدا وتمان: وەستایەکی پیشەسازی کارامە، بۆ ئەوەی لێهاتن و کارامەیی خۆی لە "پیشە"کەیدا بخاتە ڕوو، مرۆڤێکی کرێکاری هەژار بە کرێیەکی گونجاو دەگرێت، تاکو وەك نموونە(مۆدیل)ێك بیخاتە کار و هەڵی بسووڕێنێت و بەرگێکی قەشەنگی نایابی لە جوانترین ئارایشت و ڕازاوەیی پێ لەبەر بکات.. بۆ ئەم مەبەستە، تاوێك بەرگەکەی بە درێژی بە بەر دەبڕێت و تاوێکی تر مقەستی تێدەبات؛ کورتی دەکاتەوە و، هەندێ جار بەو بەرگەوە دایدەنیشێنێت و هەندێ جاری تریش هەڵی دەستێنێتەوە سەرپێ و.. بەم جۆرە لە چەندین شێوە و بارودۆخی جیاجیادا بەو بەرگانەوە هەڵیدەسووڕێنێت..

جا ئایا ئەم کەسە هەژارەی کە بەرامبەر کرێیەك ئەم کارانەی پێ ئەنجام دەدرێت، مافی ئەوەی هەیە بە وەستا پیشەسازەکە بڵێت: بۆچی تاوێك دامدەنیشێنیت و تاوێکی تر هەڵمدەسێنیت و جوانەوەم لێ تێك دەدەیت؟! دیارە نەخێر.

خواوەندی دروستکەر و بەدیهێنەری مەزنیش - وللّٰه الْمَثَلُ الأعلى - بە هەمان جۆرە. چونکە ماهییەتی هەموو یەکێك لە جۆرەکانی بوونەوەرانی وەك پێوەر و نموونەیەك بەدی هێناوە و، ئنجا بەرگێکی بە بەری هەموو یەکێکیان بڕیوە کە بە هەستەکان(الحواس) ئەو بەرگەی ڕازاندووەتەوە و، بە قەڵەمی قەزا و قەدەری خۆی چەندین نەخشونیگاری تێدا کێشاوە و، درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خۆیشی تێدا دەرخستووە. هەموو ئەمانەش بۆ مەبەستی: پیشاندان و خستنەڕووی "کەماڵی سنعەتی خۆی" لە ڕێی نەخشونیگاری ناوە جوانەکانیەوە. جگە لەوەی کە ئەو خواوەندە، کەماڵ و لەزەت و بەهرەیەك، بە هەموو یەکێکی ئەو بوونەوەرانە دەبەخشێت و، ئەمانەشیان بۆ دەکات بە کرێ و پاداشتی شیاو بەرامبەر ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی ئەستۆیان.

جا ئایا هیچ کامێکی ئەو بوونەوەرانە مافی ئەوەی هەیە بەو دروستکەر و بەدیهێنەرەی خۆی (کە خاوەنی هەموو موڵکێکە و بۆی هەیە هەر چۆنێکی دەوێت لە موڵکی خۆیدا ڕەفتار بکات) بڵێت: " تۆ ماندووم دەکەیت و جوانەوەم دەشێوێنیت"؟

نەخێر..نەخێر! بوونەوەران – بە هیچ جۆرێك – بۆیان نی‌یە لـە بەرامبەر خواوەندی "واجب الوجود"ەوە داوای هیچ مافێك بکەن، بەڵکو دەبێ ئەوان بەرامبەر بە مافی "بەخشینی پلەکانی بوون" کە ئەو خواوەندە پێی بەخشیون، هەمیشە لـە شوکرانە و سوپاسگوزاریی بەردەوامدا بن. چونکە هەموو پلەکانی "بوون" کە بە بوونەوەر بەخشراون بریتین لە "وقوعات" و پێویستیان بە هۆکار(عیللەت)ێك دەبێت کە بوونیان پێ ببەخشێت، بەڵام ئەو پلانەی "بوون" کە بە بوونەوەران نەبەخشراون: "ئیمکانات"ن، خۆ ئیمکاناتیش بریتین لە "عەدەم"(نەبوون) و هێندە زۆرن کۆتایی‌یان پێ نایەت، ئنجا عەدەمیش پێویستی بە هۆکارێك نی‌یە هەتا بیکات بە عەدەم، شتی بێ کۆتاییش بە هەمان جۆرە.

بۆ نموونە: "کانزاکان" مافی ئەوەیان نی‌یە سکاڵا دەربڕن و بڵێن: بۆچی نەکراین بە ڕووەك؟ بەڵکو مافی ئەو تەنها لەوەدایە سوپاسی بەدیهێنەری مەزنی بکات لەسەر ئەوەی کردوویەتی بە کانزا و نیعمەتی "بوون"ی پێ بەخشیوە..

هەروەها "ڕووەك" مافی سکاڵای نی‌یە و ناتوانێت بڵێت: بۆچی نەبووم بە زیندەوەرێکی وەك ئاژەڵ؟ بەڵکو مافی ئەو بریتی‌یە لەوەی کە شوکرانەی ئەو خواوەندە بکات کە "بوون" و "ژیان"ی پێکەوە پێ بەخشیوە..

هەروەها "ئاژەڵ" مافی سکاڵای نی‌یە و نابێ بڵێت: بۆچی نەکرام بە مرۆڤ؟ بەڵکو مافی ئەو لەوەدایە کە شوکرانە پێشکەشی خوای گەورە بکات لەسەر پێبەخشینی نیعمەتی "بوون" و "ژیان" و "گیان"، ئەو گیانەی کە گەوهەرێکی هەمیشەیی‌یە.

هەر بەم پێوەرە بۆ خۆت هەموو شتێکی تر بپێوە و لێکی بدەرەوە.

ئنجا تۆیش ئەی مرۆڤی سکاڵاکەر! بیر بکەرەوە.. تۆ لە "عەدەم"دا نەماویت، بەڵکو نیعمەتی "بوون"ت لەبەرکراوە و تامی "ژیان"یشت پێ چێژراوە. تەنانەت نەشکراوی بە بوونەوەرێکی بێ گیان یاخود زیندەوەرێکی وەك ئاژەڵ! بەڵکو بە "مرۆڤ" دروست کراویت و بە نیعمەتی: "ئایینی ئیسلام" شاد و بەختەوەر بوویت و لە تەنگ و تاریی گومڕایی‌دا نەماویتەوە و، سەرباری هەموو ئەمانەش بەهرەمەندی نیعمەتەکانی: لەشساغی و.. بێوەیی و.. هتد... کراویت.

ئەی ئەو کەسەی نوقمی ناشکوری بووە!

ئایا دوای ئەم هەموو نیعمەتانە، هێشتا پێت وایە کە مافت بەسەر خوای گەورەوە هەیە؟ خۆ تۆ شوکرانەی نیعمەتە خاوێن و بێ گەردەکانی "پلەکانی بوون"ت تا ئێستا

پێشكه‌ش نه‌كردووه‌ كه‌ خواوه‌ند پێی به‌خشیویت، ئه‌وه‌تا ده‌چیت سكاڵای له‌ ده‌ست ده‌كه‌یت له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی چه‌ند نیعمه‌تێكی به‌نرخی پێ نه‌داویت له‌وانه‌ی كه‌ له‌ جۆره‌كانی "ئیمكانات"ن و له‌ ڕاستی‌دا هه‌موویان "عه‌دهم"ن و توانات به‌ سه‌ریاندا ناشكێت و شایانیشیان نییت. به‌م چه‌شنه‌، تا ده‌توانیت له‌ هه‌ناسه‌بڕكێ و هه‌ڵپه‌ی ناڕه‌وادایت به‌ دواياندا و ناشكوریی نیعمه‌ته‌كانیش ده‌كه‌یت.

ئایا گه‌ر پیاوێك تا سه‌ر لوتكه‌ی مناره‌یه‌كی به‌رز پله‌ پله‌ سه‌ربخرێت و له‌ هه‌موو پله‌یه‌كیشدا دیاری‌یه‌كی به‌نرخی پێشكه‌ش بكرێت هه‌تا ده‌گاته‌ به‌رزترین شوێنی لووتكه‌ی مناره‌كه‌.. ئایا ئه‌و پیاوه‌ مافی ئه‌وه‌ی هه‌یه‌ سوپاسی خاوه‌نی ئه‌و دیاری و نیعمه‌تانه‌ نه‌كات و هێشتا به‌ده‌م خه‌م و په‌ژاره‌وه‌ بڵێت: بۆچی توانای سه‌ركه‌وتنم پێ نه‌درا تاكو له‌مه‌ش به‌رزتر سه‌ربكه‌وم؟! ئایا گه‌ر ڕه‌فتاری ئاوا بنوێنێت چه‌نده‌ كاره‌كه‌ی ناڕه‌وا ده‌بێت و خۆی ده‌هاوێته‌ كه‌نده‌ڵان و شیوی: "ناشكوریی نیعمه‌ت"ه‌وه‌ و، چه‌نده‌ش خۆی گرفتاری گومڕایی‌یه‌كی بێزلێكراو ده‌كات! ئه‌مه‌ ده‌رنجامێكه‌ ته‌نانه‌ت كه‌سانی گێلیش په‌یی پێ ده‌به‌ن.

ئه‌ی هه‌ڵپه‌كاری بێ قه‌ناعه‌ت!

ئه‌ی هه‌ڵه‌خه‌رجی ده‌ست پێوه‌نه‌گر!

ئه‌ی مرۆڤی بێ‌ئاگای به‌ ناحه‌ق سكاڵاكه‌ر!

به‌وپه‌ڕی دڵنیایی‌یه‌وه‌ بزانه‌ كه‌:

"قه‌ناعه‌ت" شوكرانه‌یه‌كی سوودبه‌خش و به‌پیته‌ و، به‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌ "هه‌ڵپه‌كاری" كافری و ناشكوری‌یه‌كی زیانبه‌خشه‌.. هه‌روه‌ها بزانه‌ كه‌ "ده‌ست پێوه‌گرتن" ڕێزنانه‌ له‌ نیعمه‌ت و كارێكی به‌سوود و جوانه‌، به‌ڵام "ئیسراف و هه‌ڵه‌خه‌رجی" ڕێز لێ نه‌نان و پێ نه‌زانینی نیعمه‌ته‌ و زیانده‌ر و بێ كه‌ڵك و ناشیرینه‌.

جا ئه‌گه‌ر تۆ مرۆڤێكی ژیریت، ئه‌وا فه‌رموو خۆت له‌سه‌ر قه‌ناعه‌ت ڕابهێنه‌ و، هه‌وڵ بده‌ بگه‌یته‌ پله‌ی "ڕه‌زامه‌ندی". خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌یشت له‌ تواناد‌ا نه‌بوو، ئه‌وا بڵێ: "یا صبور!" و كاڵای ئارامگرتن به‌ به‌رت ببره‌ و به‌و مافه‌ی خوای گه‌وره‌ پێی داویت ڕازی به‌ و، هه‌رگیز توخنی سكاڵا مه‌كه‌وه‌ و، باش بیر بكه‌ره‌وه‌ و، و بزانه‌ كه‌ تۆ "له‌ ده‌ست كێ" و "لای كێ" سكاڵا ده‌كه‌یت! كه‌واته‌ هه‌تا ده‌توانیت لایه‌نی بێ‌ده‌نگی بگره‌. خۆ ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا هه‌ر ناچاری سكاڵا بوویت، ئه‌وا ته‌نها سكاڵای "نه‌فس"ی خۆت بۆ لای خوای گه‌وره‌ ببه‌! دڵنیابه‌ هه‌موو كه‌موكووڕی‌یه‌ك هه‌ر له‌و "نه‌فس"ه‌وه‌یه‌!

**هێمای دووهەم:**

لـە کۆتـایی دواهـەمین مەسـەلەی "مـەکتووبی هەژدەهـەم"دا وتمـان: یـەکێك لـە حیکمەتـەکانی بەدیهێنـەری مـەزن لـە ئـاڵوگۆڕکردن و تازەکردنـەوەی بـەردەوامی بوونەوەراندا، بە چەشنێکی سەرسووڕهێنەر و بە کـارایی پەروەردگارێتی‌یـە مەزنەکەی، بریتی‌یە لەوەی کە: جموجووڵ و کـارایی بەدیهاتووان لـە: ئیشتیها و حـەز؛ لـە شـەوق و تاسەمەندی؛ لـە چێژ و لـەزەت؛ لـە خۆشەویستی‌یەوە، هـەڵقوڵاوە. تەنانـەت دەتوانـرێ بوترێت:

هەموو کارایی(فعالیة)یەك جۆرە لەزەتێکی تێدایە، بەڵکو هەموو کارایی‌یەك خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لـە جۆرەکانی لـەزەت. لـەزەتیش ڕووی لـە "کـەماڵ"ە. تەنانـەت هـەر خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە کەماڵ.

جا مـادەم "کـارایی" ئامـاژە بـۆ: کـەماڵ و.. لـەزەت و.. جوانـی دەکـات. ئنجـا خواوەندی "واجب الوجود"یش - کە کەماڵی موتڵەق و کامڵی شکۆمەندە - سـەرجەم جۆرەکـانی کـەماڵاتی لـە زات و سیفات و کاروبـاری خـۆیدا کۆکردووەتـەوە.. ئـەوا بێ‌گومان ئەو خواوەندە "واجب الوجـود"ە شـەفەقەت و مەحەبـەتێکی موقـەددەس و بـێ کۆتـایی ئـەوتۆی هەیـە کـە شـایانی "پێویستیی بوون" و "قودسـییەت"ی خواوەنـد بـن و لەگەڵ دەوڵەمەندی و بەرز و بڵندی و خاوێنی و کەماڵی ڕەهای ئەودا بگونجێن و شایانی بن.. ئنجا بێ‌گومـان شـەوقێکی بێ سنوور و موقەددەسیشـی هەیـە کـە لـەو شـەفەقەت و خۆشەویستی‌یە خاوێنـەوە سـەرچاوەی گرتـووە.. پاشـان شـادمانی‌یەکی موقەددەسـی بێ سنووری هەیـە کـە لـەو شـەوقە موقەددەسـەوە سـەرچاوەی گرتـووە و.. لـەزەتێکی بـێ سنووری موقـەددەس و شایانیشـی هەیـە - گـەر ئـەم تـەعبیرە دروسـت بێـت - کـە لـەو شـادمانی‌یە موقەددەسـەوە پـەیدا بـووە.. بێ‌گومـان هـاودەم لەگـەڵ ئـەو لەزەتـە خـاوێن و موقەددەسەدا ڕەزامەندی‌یەکی بێ سنوور و فەخر و شانازی‌یەکی نەبڕاوەی هەیـە - گـەر ئـەم تـەعبیرە دروسـت بێـت - کـە لـە ڕەزامـەندی و دڵنیـایی بەدیهاتووانیـەوە سـەریان هـەڵداوە، کاتێ توانـا و لێهاتنەکانیان لـە دۆخـی "هـێز"ەوە دەڕۆنـە دۆخـی "کـار" و بەرجەسـتە دەبن و، بـە کـارایی توانسـتی خـواوەند ئـەو تـوانا و لێهـاتنانەی ئـەوان دەردەکەون و کامڵ دەبن..

جا ئەو "ڕەزامەندی‌یە موقـەددەس" و "شـانازی‌یە خـاوێن"ە، داخـوازی ئـەم کارایی‌یـە ڕەهایەن لە شێوە ڕەهاکەیدا. ئنجا ئەو کارایی‌یەش داخوازی ئاڵوگۆڕ و تێکدانێکی بـێ

سنوورن و، ئەو ئالوگۆڕە بێ سنوورانەش داخوازی مردن و نەمان و جودایی و لێکدابڕان دەبن.

جارێکیان بینینم ئەو سوودانەی کە تایبەتن بە ئامانجی بەدیهاتووانەوە و لە لایەن حیکمەتی مرۆڤ (واتە فەلسەفە و زانستەکانی)یەوە پێش چاو دەخرێن، یەکجار نزم و بێ نرخن. هەر ئەو کاتەش زانیم کە ئەو دانست و فەلسەفەیە مرۆڤ دەگەیەنێتە "بێهوودەیی"(العبثية)..

ئا لێرەوەیە کە ئەو مرۆڤە فەیلەسووفەی پێی لە فەلسەفەدا چەسپاوە و بە تەواوی تیایدا ڕۆچووە: یان لە "گومڕایی سروشت"دا ڕێ ون دەکات و سەرگەردان دەبێت.. یان دەبێت بە "سۆفستائی".. یان ئینکاریی "ویست" و "زانست"ی خوا دەکات.. یان ناوی "خۆ بەسەر خۆدا سەپێن"(الموجب بالذات) لە بەدیهێنەر دەنێت!

هەر لەو کاتەدا میهرەبانیی خواوەند ناوی جوانی "الحكيم"ی بە هانامەوە نارد. ئەم ناوەش ئامانجە مەزنەکانی بەدیهاتووان و دروستکراوانی بۆ دەرخستم. واتە تێی گەیاندم کە: هەموو دروستکراوێك لە ڕاستیدا: نووسراوێکی پڕ لە دانستی پەروەردگاریی ئەوتۆیە کە هەموو خاوەن هەست و شعوورێك دەیانخوێننەوە.

ئەم ئامانجە ماوەی ساڵێك بەشی کردم. پاشان لایەنە دەراسا و ناوازەکانی سنعەتم لێ دەرکەوت، ئیتر ئەو ئامانجە بەشی نەکردم و ئاوی دڵی نەدام. بۆیە ئەو ناوە جوانەی "الحكيم" ئامانجێکی زۆر لەوەی یەکەم گەورەتری پیشان دام. واتە: گرنگترین ئامانجی هەموو بەدیهاتوویەك لەوەدایە کە بڕوانێتە کردگارە مەزنەکەی. بەو واتایەی: بەدیهاتووەکە کەماڵاتی سنعەتی بەدیهێنەرەکەی و نەخشونیگاری ناوە جوانەکانی و لایەنە ڕازاوە و نەخشاوەکانی دانستە بەنرخەکەی و دیارییەکانی میهرەبانیی فراوانی ئەو بەدیهێنەرە، لە بەردەم بینین و سەیرکردنی خوای گەورەدا پێش چاو بخات و، ببێت بە ئاوێنەیەکی دەرخەری "جوانی" و "کەماڵی" ئەو خواوەندە گەورەیە.

بەم جۆرە لەم ئامانجە تێ گەیشتم، کە ئەمەش ماوەیەکی زۆر بەشی کردم و سەروزیادم بوو.

پاشان "موعجیزەی توانست" و کاروبارە پەروەردگارییەکانی ئالوگۆڕە یەکجار خێراکان لە ناوەندی کاراییەکی سەرسووڕهێنی لەمەڕ بەدیهێنان و وردەکاریی شتاندا، دەرکەوتن. ئیتر دوای ئەمە، ئامانجەکەی پێشوو کورتی هێنا و بەشی ئەم دیاردانەی نەکرد. لەمەوە تێگەیشتم کە دەبێ داواکار و داخوازێکی هێندە گەورە

هەبێت کە بۆ ئەم ئامانجە مەزنە دەست بدات و پڕ بە پێستی بێت. ئا لەو کاتەدا گشت ئەو داخوازییانەم پیشان دران کە لە هێمای دووهەمدان و ئەو ئامانجانەش کە لە ئاماژەکانی لەمەولا باس دەکرێن. ئیتر بە دڵنیایی تێگەیەنرام کە:

کارایی توانستی خواوەند لە گەردووندا و هاتوچۆ و خوڕبوونەوەی شتان، هێندە واتای زۆر و زەبەندەیان لەخۆدا هەڵگرتووە کە کردگاری دانا زمانی هەموو بوونەوەرانی بەو کارایی‌یە خستووەتە گۆ. تەنانەت دەڵێی جموجووڵەکانی ئاسمانەکان و زەوی و جووڵەی بوونەوەرانی ناویان: وشەکانی ئەو گوفتارەن و، هاتوچۆ و خولانەوەکانیشیان: قسەکردن و ئاخاوتنی ئەون.. بەو واتایەی کە ئەو جموجووڵ و لەناوچوونەی لە "کارایی"یەوە هەڵقوڵاون، لە ڕاستی‌دا بریتین لە: وشەکانی تەسبیحاتی بوونەوەران و، ئەو کارایی‌یەش کە لە گەردووندا دەست بەکارە، لە ڕاستی‌دا قسە و خستنە گوفتارێکی بێ‌دەنگە بۆ گەردوون و شتانی ناوی.

**هێمای سێ‌هەم:**

شتان بەرەو نەبوون و نەمان ناڕۆن، بەڵکو لە بازنەی "توانست"ەوە دەڕۆنە ناو بازنەی "زانست" و.. لە جیهانی بینراوەوە دەچنە ناو جیهانی غەیبەوە و.. لە جیهانی فەنا و ئاڵوگۆڕەوە ڕوو دەکەنە جیهانی بەقا و ڕووناکی.

هەروەها جوانی و کەماڵی شتانیش، لە گۆشە نیگای حەقیقەتەوە، هی ناوە جوانەکانی خواوەند و نەخشونیگار و درەوشانەوەکانی ئەو ناوانەیە.

جا لەبەر ئەوەی ناوە جوانەکان "باقی"ن و درەوشانەوەکانیشیان بەردەوامە، ئەوا بێ‌گومان نەخشونیگارەکانیشیان نوێ دەبنەوە و جوان دەبن و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت. کەواتە بۆ "نەبوون" و "نەمان" ناڕۆن، بەڵکو تەنها دەستنیشان کردنە گوێرەیی(التعينات الإعتبارية)یەکانیان دەگۆڕێت، بەڵام حەقیقەت و ماهییەت و هەویە میسالی‌یەکانیان، کە خولگەی جوانی و دەرخەری ڕێژنە و کەماڵی خواوەندن، "باقی"ن و دەمێننەوە. چونکە "جوانی"ی ئەو شتانەی کە گیانلەبەر نین، ڕاستەوخۆ هی ناوە جوانەکانی خواوەندە. کەواتە شەرەفمەندی و مەدح و سەنا هەر بۆ ئەو ناوانەیە. چونکە "جوانی"یەکە هەر هی ئەوە و خۆشەویستیش تەنها ئاراستەی ئەو دەکرێت و، ئیتر ئاڵوگۆڕی ئەو ئاوێنانە هیچ زیانێك بەو ناوانە ناگەیەنێت.

خۆ ئەگەر ئەو شتانە "گیانلەبەر" بن بەڵام خاوەنی "ژیری" نەبن ئەوا جودایی و نەمانیان هەرگیز بە "نەبوون" و "نەمان" دانانرێت، بەڵکو بریتی‌یە لە ڕزگاربوونی ئەو

گیانلەبەرە زیندووە لـە بوونێکـی جیسـمانی و تـەپاوتلی ئەرکـەکانی ژیـان و سـپاردنی بەروبوومی ئەو ئەرکانەی ئەنجامی داون بە گیانـە بـاقی و نەفەوتاوەکـەی. جـا گیـانی ئـەم شتانەش پاڵیان بە ناوە جوانەکانی خواوەنـدەوە داوە و، لـەم ڕێیـەوە هـەر بـە بـەردەوامی دەمێننەوە و بەرەو بەختەوەری‌یەك دەڕۆن کە بۆ ئەوان بشێت و لەگەڵیاندا بگونجێ.

بەڵام گەر ئەو گیانلەبەر و زیندەوەرانە خاوەن "ژیری" بن، ئەوا هەر لە بناغـەدا بـەرەو بەختەوەری‌یـەکی هەمیشـەیی و ئـەو جیـهانی بـەقا و مانەوەیـە دەڕۆن کـە لەسـەر چـەندین کەماڵاتی ماددی و مەعنەوی بنیات نراوە.

کەواتە جودایی و نەمانیان لە ڕاستی‌دا: "مردن" و "نەمان" و "جودایی" نی‌یـە. بـەڵکو بـە یـەك شـادبوونە لەگـەڵ کـەماڵاتدا و، گەشـت و گـوزارێکـی خـۆش و دڵگـیرە بـۆ نـاو جیهانـە نوورانی‌یـەکانی کردگـاری دانـا کـە زۆر لـەم دنیایـە جـوان و ڕەنگینـترن، وەك جیهانی بەرزەخ و جیهانی میسال و جیهانی گیانەکان و، بۆ گەلـێ شـوێن و مەنزڵگـەی تر لەوانەی کە خواوەند ئامادەی کردوون.

**پوختەی قسـە:**

خـوای گـەورە هەیـە و "بـاقی"یـە.. سیفەتەکانیشـی "هەتاهـەتایی" و ناوەکانیشـی "هەمیشـەیی"ن. کەواتـە دەبێـت نەخشـونیگارەکانی ئـەو ناوانـەش، بـە "مانەوەیـەکی مەعنەوی" هەمیشە نوێ بینەوە. لەبەر ئەوە، ئاڵوگۆڕ و نوێ بوونەوەی ئەو درەوشـانەوە و نەخشونیگارانە هـەرگیز کاولکـاری و لـەناوچوون و لـەناوبردن و نـەمان نی‌یـە. چونکـە ئاشکرایە مرۆڤ لـە ڕووی مرۆڤێتی‌یەکەیەوە پەیوەندیی بە زۆربەی بوونەوەرانـەوە هەیـە و بەم بۆنەیەوە لەزەت لـە بەختەوەریی ئەوان دەچێژێت و بە گیروگرفتەکانیشیان دووچاری ئازار دەبێت، بە تایبەت لەگەڵ زیندەوەراندا، بە تایبەت لەگەڵ مرۆڤدا، بە تایبەتتر لەگەڵ کەسـانی ئـەهلی کـەماڵدا کـە ئـەم خۆشی‌دەون و ڕێزیـان لـێ دەگرێـت. ئـەوەتا مـرۆڤ سەبارەت بەوان زیاتر هەست بە ئازاریان دەکات و پـتر بـە بەختـەوەریی ئـەوان بەختـەوەر دەبێت، بـە ڕادەیـەك کـە لـە پێنـاوی بەختـەوەرکردنی ئـەواندا بـەختیاریی خـۆی بـەخت دەکات! بە وێنەی دایکی بەسۆز و میهرەبان کە بەختیاری و حەوانـەوەی خـۆی دەکـات بە قوربانیی جگەرگۆشەکەی.

جـا هەمـوو "ئیمـاندار"ێـك دەتوانێـت – بەهـۆی نووری ئیمـان و قورئانـەوە – بـە مانەوە و بەختەوەری و ڕزگاربوونی بوونـەوەران لـە "عـەدەم" و بوونیـان بـە "نووسـراوی

پەروەردگاری"، بەختەوەری بەدەست بهێنێت و نوورێکی بە ئەندازەی گەورەیی دنیا دەستی خۆی بخات. هەموو ئیماندارێك، بە ئەندازەی پلەی خۆی، دەتوانێت سوود لەم نوور و ڕووناکی‌یە وەربگرێت.

بەڵام گەر ئەو مرۆڤە لە "گومڕایان" بێت، ئەوا جگە لە ئازارەکانی خۆی، نەمان و تیاچوونی ڕواڵەتیی بوونەوەران و ئازاری گیانلەبەرەکانیش گەلێ ئازاری تری دەرخوارد دەدەن. واتە "کافری"یەکەی سەرانسەری دنیای بۆ پڕ دەکەن لە "عەدەم" و لەسەری ئەودا خاڵیی دەکەنەوە! ئیتر پێش ئەوەی بەرەو دۆزەخی ئەودنیا بدرێتەبەر، هەر بۆ خۆی - لەم دنیادا - بەرەو دۆزەخێکی مەعنەوی دەکەوێتە ڕێ!

**هێمای چوارەم:**

وەك لە زۆر شوێندا باس کراوە: پادشا چەند فەرمانگەیەکی جیاجیای هەیە بە بۆنەی ناونیشانە جۆراوجۆرەکانیەوە. ئەوەتا ناوی: پادشا و، خەلیفە و، حاکم و، ناونیشان و سیفەتەکانی تری هەیە.

ناوە جوانەکانی خوای گەورەش - ولله المثل الأعلى - چەندین درەوشانەوەی جۆراوجۆری بێ سنووریان هەیە. جا جۆراوجۆریی بوونەوەران ئەنجامی جۆراوجۆریی ئەو درەوشانەوانەیە.

ئنجا لەبەر ئەوەی هەموو خاوەن جوانی و کەماڵێك حەز دەکات جوانی و کەماڵی خۆی ببینێت و پیشانی غەیری خۆشیان بدات. ئەوا ئەو ناوە جۆراوجۆرانە، لەبەر ئەوەی هەمیشەیی و هەتاهەتایین، داخوازی دەرکەوتنێکی هەمیشەیین.

واتە داخوازی ئەوەن کە درەوشانەوەی جوانی و ڕەنگدانەوەی کەماڵی خۆیان لە ئاوێنەی نەخشونیگارەکانیاندا بە بەردەوامی ببینن و پێش‌چاوی بینەرانیشیان بخەن. واتە داخوازی ئەوەن کە دەم بە دەم و چرکە بە چرکە کتێبی مەزنی گەردوون نوێ ببێتەوە و سەرلەنوێ بە نووسینێکی تری پڕ لە واتا بنووسرێتەوە.

بە واتایەکی تر داخوازی ئەوەن کە تەنها لە یەك لاپەڕەدا هەزاران نامیلکەی جۆراوجۆر بنووسرێن و هەر یەك لەو نامیلکانەش بخرێنە بەردەم بینینی زاتی موقەددەس و خاوەنی ئەقدەسی ئەو ناوە جوانانە و، لە هەمان کاتیشدا پێش‌چاوی خاوەن هەست و شعوورەکانیش بخرێن، تاکو بیانخوێننەوە.

بیر لەم شیعرە بکەرەوە کە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستی‌یە دەکات[1]:

پەڕە و صەفحەی کتێبی "عالەم"ن ئەنواعی نامەعدوود
وشە و پیتی ئەون سەرجەم هەموو ئەفرادی نامەحدوود
لە دەزگای لەوحی مەحفووزی حەقیقەتدا وەها نووسرا:
(وشەی بەرجەستەیە؛ پاراوە؛ پڕ واتایە: هەر مەوجوود)!

**هێمای پێنجەم:**

بریتی‌یە لە دوو سەرنج:

*سەرنجی یەکەم:*

خوای گەورە "مەوجوود"ە. کەواتە ئیتر هەموو شتانی تریش مەوجوودن.

جا مادەم هەموو شتێك نیسبەت و پەیوەندیی بە خواوەندی "واجب الوجود"ەوە هەیە، ئەوا هەموو شتانی ناو ئەم گەردوونە سەبارەت بە هەموو شتێکی ترەوە هەن و دارای وجوودن، چونکە هەموو شتێکی خاوەن "وجوود" بەهۆی نیسبەت و پەیوەندیی بە خواوەندی "واجب الوجود" و لەبەر نهێنیی "تاکی"، پەیوەندیی بە هەموو بوونەوەرانەوە بۆ دروست دەبێت. بەو واتایەی هەر بوونەوەرێك کە بزانێت یان بزانرێت پەیوەندیی بە خواوەندی "واجب الوجود"ەوە هەیە، ئەوا بەهۆی نهێنیی "تاکی"یەوە دەبێت بە پەیوەندیدار لەگەڵ هەموو ئەو بوونەوەرانەدا کە نیسبەت و پەیوەندی‌یان بە خوای گەورەی "واجب الوجود"ەوە هەیە!

واتە لە حاڵی نیسبەت پەیداکردنەوە لەگەڵ ئەو خواوەندەدا هەموو شتێك نوورەکانی وجوودێك بەدەست دەهێنێت کە هەرگیز سنووریان بۆ نی‌یە. کەواتە لەو حاڵەدا "جودایی" و "نەمان" هەرگیزاو هەرگیز لەگۆڕێدا نی‌یە. هەر لەبەر ئەوەشە ژیانێکی ئاوا کە یەك ئان و چرکەی کتوپڕی بخایەنێت، مایەی ڕووناکی‌یەکانی وجوودێکە کە سنوور ناتوانێت دەستنیشانی بکات..

بەڵام گەر ئەو نیسبەت و پەیوەندی‌یە لەگۆڕێدا نەبێت و نەزانرێت کە هەیە، ئەوا هەموو شتێك گرفتاری جۆرە بێ سنوورەکانی "جودایی" و "نەمان" و "نەبوون" دەبن. چونکە ئەو شتە لەو بارودۆخەی‌دا جودا و بێ پەیوەندی‌یە بەرامبەر هەموو بوونەوەرێك کە دەگونجێ پەیوەندیی پێیانەوە هەبێت. واتە چەندین جۆری بێ سنووری "نەبوون" و

---

(١) بۆ مەبەستی پارێزگاری کردنی کێش و سەروای ئەم شیعرە، زیاتر دەقە تورکی‌یەکە ڕەچاو کراوە، بێ ئەوەی زیان بەواتاکەی گەیشتبێت. (وەرگێڕ)

لەژمارەبەدەری "جودایی" لەسەر شان و ئەستۆی وجوودە کەسییەکەی خۆی هەڵدەگرێت و، گەر یەك ملیۆن ساڵ، بە بێ نیسبەت و پەیوەندی، لە وجووددا بمێنێتەوە ئنجا بەرامبەر یەك چرکەی ئەو ژیانە یەکسان دەرناچێت کە پەیوەندی و نیسبەتی تێدا هەبێت بەو "واجب الوجود"ەوە!

هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەهلی حەقیقەت فەرموویانە: یەك چرکەی خێرا و کتوپڕی "وجوودێکی ڕووناك" باشترە لە یەك ملیۆن ساڵی "وجوودێکی بێ پەیوەندی و قرتاو"! واتە: یەك چرکەی وجوودێك کە پەیوەندی و نیسبەتی بە خواوەندی "واجب الوجود"ەوە بێت، باشترە و پێش دەخرێت بەسەر یەك ملیۆن ساڵی وجوودێکدا کە ئەو پەیوەندی و نیسبەتەی تێدا نەبێت. بۆیە ئەهلی تەحقیق وتوویانە:

"نوورەکانی وجوود بریتین لە ناسینی خواوەندی واجب الوجود"!

واتە بوونەوەران لەو حاڵەتەدا کە لە ناوەندی نیعمەتی نوورەکانی "وجوود"دان پڕن لە مەلائیکەت و ڕۆحانییات و خاوەن هەست و شعوورەکان. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمەوە، واتە گەر ناسینی خواوەندی "واجب الوجود" لە گۆڕێدا نەبێت، ئەوا تاریکستانەکانی عەدەم و ئازارەکانی جودایی و ئێشەکانی نەمان دەوراندەوری هەموو بوونەوەرێك دەدەن و دنیا لە بەرچاوی ئەو کەسەدا چۆڵ و سامناك دەبێت!

بەڵێ، لەبەر ئەوەی هەموو یەکێك لە بەرەکانی درەخت پەیوەندیی بە سەرجەمی بەرەکانی تری ئەو درەختەوە هەیە و جۆرە پەیوەندییەکی پتەوی برایەتی و هاوڕێیەتییان لەگەڵدا دەبەستێت، ئەوا بە ئەندازەی ژمارەی ئەو بەروبوومانە وجوودی تری لاوەکی(عەرەضی)ی بەدەست هێناوە.. بەڵام هەر کات ئەو بەرە لەو درەختە بکرێتەوە، ئەوا لە بەرامبەر یەك بە یەکی بەرەکانی درەختەکەوە گرفتاری جودایی و نەمان دەبێت و سەبارەت بەو بەرە لێکراوەیەوە هەموو بەرەکانی تر لە حوکمی "نەبوو"دا دەبن و تاریکایی عەدەمێکی دەرەکی دایاندەپۆشێت.

بە هەمان جۆر، لە خاڵی پەیوەندی و نیسبەت بوونەوە بە توانستی خواوەندی تەنیای صەمەدەوە، هەموو شتێك دەبێت بە هی هەرچی شت هەیە. بەڵام گەر ئەم پەیوەندی و نیسبەتە نەبێت ئەوا بە ژمارەی هەموو شتان، جۆرەکانی عەدەمی دەرەکی گرفتاری هەموو شتێك دەبێت.

دەسا فەرموو لە ناوەندی ئەم هێمایەوە سەیری گەورەیی نوورەکانی "ئیمان" بکە و، ئەو تاریکاییە سامناکەش ببینە کە لە "گومڕایی"دا دەوراندەوری وجوودی داوە!

كەواتە "ئیمان" ناونیشـانی ئەم حەقیقەتە بەرزەیە كە لـەم هێمایەدا ڕوون كرایەوە. هەرگیز ناشگونجێ بە بێ بوونی ئیمان سوود لەم ڕاستییە وەربگیرێت، چونكە هەروەك هەموو شتان "عەدەم" و "نەبوو"ن سەبارەت بە كوێر و كەڕ و لاڵ و شێتەكانەوە، بە هەمان جۆر هەموو شتێكیش "تاریك" و "عەدەم" و "نەبوو"ە سەبارەت بە كەسانی بێ ئیمانەوە.

*سەرنجی دووهەم:*

دنیا سێ ڕووی هەیە:

ڕووی یەكەم:

دەڕوانێتە "ناوە جوانەكانی خـوای گەورە" و ئاوێنـەی ئەو ناوانەیە و، هەرگیز ناگونجێ جودایی و نەمان بەسەر ئەم ڕووەدا بێت. بەڵكو هەمیشە نوێبوونەوەی تێدا بەدی دەكرێت.

ڕووی دووهەم:

دەڕوانێتە "دوارۆژ" و سەیری جیهانی "بەقاء" دەكات و، لە حوكمی كێڵگەی ئەو جیهانەدایە. جا لـەم ڕووەدا گەڵـێ بەروبوومی باقی و بەردەوام پێ دەگەن. ئەم ڕووە خزمەتی مانەوە و بەقاء دەكات، چونكە شتانی "فـانی" دەخاتە حوكمی شتی "باقی" و، درەوشانەوەكانی ژیان و مانەوەیان پێوەیە نەك مردن و نەمان.

ڕووی سێهەم:

دەڕوانێتە شتانی "فانی" واتە دەڕوانێتە ئێمە. ڕوویەكە كەسانی فانی و ئەهلی هەوا و ئارەزوو شەیدای دەبن و، لە هەمان كاتدا شوێنی بازرگانیی كەسانی خاوەن هەست و شعوورە و، گۆڕەپانی تاقیكردنەوەی فەرمانبەر و كارمەندانە. بەم جۆرە، جیلوە و درەوشانەوەكانی "بەیەك شادبوون" و "ژیان" لە حەقیقەتی ئەم ڕووی سێهەمەدا دەبێت بە دەرمانی سارێژكاری زامەكانی ئازاری "نەمان" و "مردن" و "نەبوون" لەم ڕووەی دنیادا.

**پوختەی قسە:**

ئەم بوونەوەرە بەخورەم و گەڕۆكانە: چەند ئاوێنەیەكی هەمیشە گۆڕاون بۆ نوێبوونەوەی نوورەكانی كاری بەدیهێنان لە لایەن خواوەندی "واجب الوجود"ەوە.

* * *

## مەقامی دووهەم

بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەك و پێنج ئاماژە

پێشەکی‌یەکەش لە دوو باس پێکهاتووە

## پێشەکی

**باسی یەکەم:**

لەم پێنج ئاماژانەی کە لەمەولا دێن، چەند نموونەیەك دەهێنرێنەوە کە وەك چەند ڕوانینگا و دووربینێکی بچووك و کز وان بۆ بینینی حەقیقەتی کاروبارە پەروەردگاری‌یەکان. ئەم نموونانەش هەرگیزاو هەرگیز جێی حەقیقەتی پەروەردگاریتی‌یان تێدا نابێتەوە و ناتوانن دەوراندەوری بدەن و ببن بە پێوەرێك بۆی. بەڵام بوار بە مرۆڤ دەدەن کە لە ڕێگایانەوە بڕوانێتە ئەو کاروبارە ناوازانە.

پاشان ئەو تەعبیر و دەستەواژانەی کە شایستەی کاروبارەکانی زاتی شکۆمەندی موقەددەس نین و لەم نموونانەی کە لەمەولا دێن و لە هێماکانی پێشووشدا هاتوون، هی قسوور و ناتەواویی خودی نموونەکانە، بۆ نموونە: ئەو واتا زانراوانەی کە لای ئێمە بۆ: لەزەت و شادمانی و ڕەزامەندی و منەتکردن بەکاردەهێنرێن، هەرگیز ناتوانن تەعبیری کاروبارە موقەددەسەکانی خواوەند بکەن، بەڵام تەنها چەند ناونیشانێکی ڕەچاو کردن و چەند ڕوانینگەیەکن بۆ بیرکردنەوە.

پاشان هێنانەوەی ئەم چەشنە نموونانە یاسایەکی پەروەردگاریی مەزن لەمەڕ کاروبارە پەروەردگاری‌یەکان دەچەسپێنن، لە ڕێی دەرخستنی بەش و چمکێکی ئەو یاسایە لە نموونەیەکی بچووکدا. ئەوەتا لەو نموونانەدا وتراوە: "گوڵ" هەرچەند ماڵئاوایی لەم "وجوود"ە دەکات، کەچی پێش ئەوەی بڕوات هەزاران جۆری "وجوود" دوای خۆی بەجێ دەهێڵێت. جا بەم نموونەیە یاسایەکی مەزنی پەروەردگاریتیی خواوەند ڕوون دەکرێتەوە. ئەوەتا ئەم یاسایە چ لە سەرتاسەری بەهار و چ لە سەرجەم بوونەوەرانی دنیادا دەستبەکارە.

بەڵێ، بەدیهێنەری میهرەبان بە چ یاسایەك پەڕ و پۆشاکی باڵندە دەگۆڕێت و نوێی دەکاتەوە، هەر ئەو کردگارە دانایە بە هەمان یاسا و لە هەموو ساڵێکدا بەرگ و پۆشاکی گۆی زەویش نوێ دەکاتەوە و، بە هەمان یاسا لە دەمی بەرپابوونی قیامەتدا ڕوخساری سەرانسەری گەردوونیش دەگۆڕێت.. هەروەها بە کام یاسا هەموو گەردیلەیەك بە وێنەی موریدی تەریقەتی مەولەوی بە دەوری خۆی و ئەڵقەی زیکرەکەیدا دەجووڵێنێت، هەر بەو یاسایە گۆی زەویش، بەڵکو هەموو جیهانەکان و کۆمەڵەی خۆریش، بە وێنەی ئەو موریدە، لە جێی خۆیاندا دەبزوێنێت.. هەروەها بە چ یاسایەك ئەو کردگارە دانایە خانەکانی جەستەت نوێ و شیتەڵ و ئاوەدان دەکاتەوە، هەر بە هەمان یاسا لە هەموو ساڵ و وەرزێکدا چەندین جار باخ و بێستانەکەت نوێ دەکاتەوە و تەنانەت بە هەمان یاسا گۆی زەویش لە هەموو بەهارێکدا تازە دەکاتەوە و ڕایەخی نوێی تێدا ڕادەخات.. هەروەها بە چ یاسایەکی دانایانە کردگاری بەتوانا مێشێك زیندوو دەکاتەوە، هەر بە هەمان یاسا و لە هەموو بەهارێکدا ژیان بەو درەختە پەلکە مەزنەی ئێرەش - کە لە بەردەممانداية - دەبەخشێتەوە و هەر بەو یاسایەش لە بەهاردا ژیان بە بەر زەویدا دەکاتەوە و، بە هەمان یاساش لە ڕۆژی حەشری مەزندا سەرانسەری بوونەوەران زیندوو دەکاتەوە.

قورئانی حەکیم ئاماژە بۆ ئەمە دەکات کاتێ کە دەفەرموێ:

﴿ما خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان:٢٨).

ئیتر هەر بەم جۆرە شتانی تریش بۆ خۆت لێك بدەرەوە.

گەلێ یاسای پەروەردگاریتیی تری وەك ئەمانە هەن کە هەر لە "گەردیلە"وە تا دەگاتە "کۆی جیهان" بە گشتی، دەستبەکارن. دەسا تۆش بیر لە مەزنیی ئەم یاسایانە بکەرەوە کە لە کارایی پەروەردگاریتیدان و، سەرنج لە فراوانیيەکەیان بدە و نهێنیی "تاکی"یان تێدا ببینە و، ئنجا بزانە کە هەریەك لەو یاسایانە لە خۆیدا بەڵگەیەکی سەربەخۆی تەوحیدە.

بەڵێ، هەموو یەکێك لەم یاسا یەکجار زۆر و مەزنانە، لەبەر ئەوەی یەك یاسایە و لە یەك کاتدا دەورانەوەری وجوودی داوە، ئەوا بە چەشنێکی گومانبڕ: "یەکتایی" و "زانست" و "ویست"ی کردگاری مەزن دەچەسپێنن، جگە لەوەی کە هەریەکەیان درەوشانەوەیەکن لە درەوشانەوەکانی زانست و ویستی ئەو کردگارە مەزنە.

بەم جۆرە، ئەو نموونانەی کە لە زۆربەی باسەکانی "وتەکان"دا هێنراون، هەریەکەیان چمکێکی ئەم چەشنە یاسایانە لە ناوەندی نموونەیەکی جوزئیدا دەردەخات، کەواتە ئاماژە بۆ بوونی خودی ئەو یاسایە دەکەن لە بابەتی دەعوا لەسەر کراودا. جا مادەم نموونەهێنانەوە هاتنەدیی یاساکە ڕوون دەکاتەوە، ئەوا بە وێنەی بەڵگەی مەنتیقی: بابەتی دەعوا لەسەر کراو دەچەسپێنێت. بەو واتایەی کە هەموو یەکێکی نموونەهێنانەوەکانی ناو "وتەکان" لە حوکمی بەڵگەیەکی یەقینی و گومانبڕدان.

**باسی دووهەم:**

لە ڕاستیی دەهەمی "وتەی دەهەم"دا وتراوە کە: هەموو گوڵ و بەرێکی درەخت بە ئەندازەی سەرجەم گوڵ و بەرەکانی ئەو درەختە، ئامانج و دانایی تێدا ڕەچاو کراوە.

جا ئەو دانستانە سێ بەشن:

بەشێکیان ڕووی لە کردگاری مەزنە و نەخشونیگاری ناوەکانی دەردەخات.

بەشێکی تر ڕووی لە خاوەن هەست و شعوورەکانە، چونکە "بوونەوەران" – لە ڕوانگەی بینینی ئەواندا – بریتین لە چەند نامیلکەیەکی بەنرخ و وشەی پڕ واتا و ڕەوان.

بەشێکی تریان ڕووی لە خودی شتەکە و ژیان و مانەوەیەتی و، گەر سوودی بۆ مرۆڤ تێدا بێت ئەوا بەپێی سوودەکانی مرۆڤ دانایی تێدا ڕەچاو کراوە.

کاتێ کە بیرم لەم ئامانجە زۆرانەی هەموو بوونەوەرێك دەکردەوە، ئەم بڕگانەی خوارەوە بە زمانی عەرەبی هاتنە دڵمەوە و، منیش بە شێوەی چەند تێبینییەك بۆ ئەو پێنج ئاماژانەی کە لەمەولا دێن، تۆمارم کردن:

(وهذه الموجودات الجليلة، مظاهر سيالة، ومرايا جوّالة، لتجدّد تجليات أنوار إيجاده سبحانه بتبدّل التعيّنات الاعتبارية..

أولاً: مع استحفاظ المعاني الجميلة والهويات المثالية.

وثانياً: مع إنتاج الحقائق الغيبية والنسوج اللوحية.

وثالثاً: مع نشر الثمرات الأخروية والمناظر السرمدية.

ورابعاً: مع إعلان التسبيحات الربانية وإظهار المقتضيات الأسمائية.

وخامساً: لظهور الشؤونات السبحانية والمشاهد العلمية).

بناغەکانی ئەو ئاماژانەی کە لەمەولا باسیان دەکەین لەم پێنج بڕگەیەدان..

بەڵێ، هەموو بوونەوەرێك بە تایبەت زیندەوەران پێنج چینی جیاوازی "دانست" و "ئامانج"ی جۆراوجۆریان تێدایە. چونکە هەروەك لقە چین لەسەر چینەکانی هەموو درەختێکی بەردار بەر دەگرن، هەموو زیندەوەرێکیش بە هەمان جۆر و لە پێنج چیندا ئامانج و حیکمەتە جۆراوجۆرەکانیان لەخۆ گرتووە.

دەسا ئەی مرۆڤی لەناوچووی "فانی"!

گەر دەتەوێت حەقیقەتی خۆت - کە وەك ناوکێکی جوزئی وایە - بگۆڕیت بە درەختێکی "باقی" و بەردار و، هەر (دە) چینە بەروبوومەکان دەستی خۆت بخەیت کە لە پێنج ئاماژە و دە جۆر ئامانجدا ئاماژەیان بۆ کراوە.. ئەوا "ئیمانی تەحقیقی" بەدەست بهێنە، دەنا لە سەرجەمی ئەو ئامانج و بەروبوومانە بێبەش دەبیت، جگە لەوەی کە لەناو ئەو ناوکە بچووکەدا دەپووکێیتەوە و دەڕزێیت!

**ئاماژەی یەکەم:**

أولاً: مع استحفاظ المعاني الجميلة والهويات المثالية.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو بوونەوەرێك کاتێ کە "وجوود" بەجێ دەهێڵێت، بە ڕواڵەت بەرەو "عەدەم" و "نەمان" دەڕوات. بەڵام ئەو واتایانەی کە گەیاندنی و دەری بڕیبوون، دەمێننەوە و دەپارێزرێن. هەروەك هەویەی میسالی و شێوە و ماهییەتەکەی لە جیهانی میسال و لەوحە پارێزراوەکاندا - کە چەند نموونەیەکی جیهانی میسالن - و لە هێزی پارێزگاریشیدا - کە نموونەی لەوحە پارێزراوەکانە - دەمێننەوە.

بەو واتایەی کە هەموو بوونەوەرێك وجوودێکی مەعنەوی و زانستی بەدەست دەهێنێت.

بۆ نموونە: لە چاپخانەدا بارێکی تایبەتیی ڕیزکردن بە پیتەکانی چاپ دەدرێن، تاکو لاپەڕەیەکی دیاریکراویان پێ چاپ بکرێت. جا شێوە و هەویەی ئەو تەنها لاپەڕە ڕیزکراوەی پیتەکان بە چەندین لاپەڕەی زۆری چاپکراو دەبەخشرێت و واتاکانیشیان لە چەندەها مێشك و ژیریی زۆردا بڵاو دەبنەوە. پاشان بار و شێوە و ڕیزکردنی ئەو پیتانەی ناو چاپخانەکە دەگۆڕرێن، چونکە ئیتر پێویست بەو ڕیزکردنە تایبەتییەی پێشوویان نەماوە، بەڵکو پێویست دەکات چەند لاپەڕەیەکی تر بە هەمان ئەو پیتانە ڕێکبخرێن و بە شێوەیەکی تر ڕیز بکرێنەوە.

بەم جۆرە، قەڵەمی قەدەری خـوای گـەورەش ڕیز کـردن و بـارودۆخێکی دیـاری کراو بەم بوونەوەرانەی سەر ڕووی زەوی دەبەخشێت و، توانستی خواوەندیش لە لاپەڕەیەکی وەرزی بەهاردا بەدییاندەهێنێت و، ئەوانیش واتا جوانەکانی خۆیان دەردەبڕن. جا لـەبـەر ئەوەی شێوە و هەویەکانیان بۆ نـاو تۆمـارێکی جیـهانی غـەیب - وەك جیـهانی میسـال - دەگوێزرێنەوە، ئەوا "توانستی خوایی" داخوازی ئەوەیـە کـە ئـەو بـارودۆخ و ڕیز کردنە تایبەتییە بگۆڕرێت، تاکو لاپەڕەیەکی نوێی تر لە بەهاری داهاتوودا بنووسرێت و ئەویش - بە هەمان جۆر - واتاکانی خۆی ڕابگەیەنێت.

**ئاماژەی دووهەم:**

وثانياً: مع إنتاج الحقائق الغيبية والنسوج اللوحية.

ئـەم بڕگـەیـە ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە: هـەرچی شـت هەیـە، چ جوزئـی بێـت و چ کوللی (بە تایبەت گەر خاوەن ژیان بێت) دوای ئەوەی کـە ڕۆشـت و ئـەم "وجـوود"ەی بەجێهێشت، گەلـێ حەقیقەتی غەیبی بەرهەم دەهێنێـت. جگـە لـەوەی کـە بـە ئـەندازەی ژمـارەی قۆناغـەکانی ژیـانی، شـێوە و وێنـەی خـۆی لـە لەوحـە میسـاڵییەکاندا - کـە تۆمارەکانی جیهانی میسالن - بەجێدەهێڵێت. ئیتر مێژووی ژیانە پڕ و بەپیتەکەی کە پێی دەوترێـت: "موقـەددەراتی حـەیاتی" لـەو وێنـە و شـێوانەوە دەنووسـرێن و، لـە هـەمان کاتیشـدا و دوای کـۆچ کردنی لـەم "وجـوود"ە دەبێـت بـە جێـی موتـاڵا و خوێندنـەوەی ڕۆحانییەکان.

نموونەی ئەمە: هەرچی "گوڵ" هەیە پاش ماوەیەك سیس دەبێتەوە و پاشان لەم وجوودە کۆچ دەکات، بەڵام سەدان وردە تۆو لە وجووددا بەجێدەهێڵێت و ماهییەتەکەی خۆی لەو تۆوانەدا دادەنێت. ئەمە جگە لەوەی کە هـەزاران وێنـەی خۆی لـە چـەندین لـەوحی پارێزراوی بچووکدا و لە هێزە پارێزگارەکاندا - کە چەند نموونەیەکی بچووك کـراوەی لەوحە پارێزراوەکـانن - بـەجێدەهێڵێت. ئیتر لـەم ڕێیـەوە خـاوەن هەستەکان دەخەنە خوێندنەوەی ئەو تەسبیحاتە پەروەردگاری و نەخشونیگارانەی ناوە جوانەکانی خواوەند کە لـە قۆناغـەکانی ژیـانیدا جێبەجێی کـردوون، ئنجـا دوای ئەمـە - ئـەم گوڵـە - لـەم وجوودەدا کۆچ دەکات.

هـەروەها "وەرزی بـەهار"یـش کـە بـە دروست کراوە ڕەنگینـەکان ڕازاوەتـەوە و لـە ڕووی زەویدا دانراوە کە وەك گوڵدانێکی مەزن وایە، لە ڕاستیدا گوڵێکـی گەشـە و، بـە ڕواڵـەت نـامێنێت و بـەرەو عـەدەم دەڕوات، کـەچی "بـەهار" کاتێ کـە دەڕوات ئـەو

ڕاستی‌یە غەیبی‌یانـە دوای خـۆی بـەجێ‌دەهێڵێت کـە گـەیاندوونی و ژمارەشـیان بــە ئەندازەی تۆوەکانیەتی. هەروەك هەویە میسالی‌یەکانیشی بەجێ‌دەهێڵێت کە بە ئەندازەی گوڵەکانی دەبن و بڵاوی کردبوونەوە و، ئەو دانستە پەروەردگاری‌یانەش لە دوای خـۆی دادەنێت کە پێش‌چاوی خستبوون و بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەران دەبن.

جا "بـەهار" ئـەم هـەموو جۆرانــەی "وجــوود" بـەجێ‌دەهێڵێت ئنجـا دەڕوات و لــە پێش‌چاومان ون دەبێت. جگـە لـەوەی کـە جێ بۆ بـەهارە هاوچەشـنەکانی خـۆی چـۆڵ دەکات کە لـە دوای ئەو دێن، تاکو ئەوانیش ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەن.

بـەو واتایـەی کـە وجوودێکـی "ڕوالـەتی" لـە بـەر ئـەو بـەهارە دادەمـاڵرێت، بـەڵام لـە "ناوەرۆك"دا هەزار وجوودی لەبەر دەکرێت.

**ئاماژەی سێ‌هەم:**

وثالثاً: مع نشر الثمرات الأخروية والمناظر السرمدية.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە: دنیا کێڵگە و کارگەیەکە، چەشـنە داهـاتێکی ئـەوتۆ بەرهەم دەهێنێت کە شیاوی بازاڕی ئاخیرەت بن.

چونکە هەروەك کردەوەکانی جینی و ئادەمیزاد ڕەوانەی بـازاڕی قیامـەت دەکرێـن، بە هەمان جۆر بوونەوەرانی ئەم دنیایەش لە پێناوی ئاخیرەتدا گەلـێ کردار ئەنجام دەدەن و داهاتی زۆریشـی بـۆ بەرهـەم دەهێـنن، بـەڵکو گـۆی زەوی لەبـەر ئـەنجامدانی ئـەو کارانـە دەجووڵێـت، تەنانەت دەتوانرێ بوترێت:

ئـەم کەشتی‌یە پەروەردگاری‌یـە(زەوی) لـە مـاوەی یـەك سـاڵدا ڕێـی بیسـت و چــوار هەزار ساڵ دەبڕێت تاکو بە دەوری مەیدانی حەشـردا بخولێتـەوە، وەك لـە چـەندین وتـەی زۆردا چەسپاندوومانە.

بۆ نموونە: گومان لەوەدا نی‌یە کە ئەهلی بەهەشت حەز دەکەن یادی بەسـەرهاتەکانی دنیایان بکەنەوە و لـەناو خۆیـاندا یادداشتەکانیان بـاس بکـەن. بـەڵکو لەوانەیـە پڕ بـە دڵ ئارەزوومەندی بینینـی چـەند دیمـەنێکی ئـەو یادداشـت و نیگـار و ڕووداوانـە بـن، چونکـە گەلـێ چێژ لـە بینینـی ئـەو ڕووداوانـە وەردەگـرن، وەك کەسـێك لەسـەر شاشـەی سینەما لەزەت لە بینینی دیمەنەکان بچێژێت.

جا مـادەم ئەمـە بـەم شێوەیەیە، ئـەوا ئـەو بەهەشـتەش کـە خانــەی لــەزەت و مــەنزڵی بەختەوەری‌یـە – بێ هیـچ گومـانێك – ئـەو دیمەنـە سـەرمەدی‌یانەی گفتوگـۆ و نیگـاری

ڕووداوەکانی دنیای تێدایە، وەك ئایەتی پیرۆزی: ﴿عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾ (الحجر:٤٧) ئاماژەی بۆ دەکات.

بەم جۆرە، "فەنا" و "نەمان"ی ئەم بوونەوەرە جوانانە لە یەك کاتدا و دوای سەرهەڵدانیان.. هەروەها بە دوای یەکتردا هاتنیان، وا دەردەخات کە وەك ئامێرەکانی کارگەیەك بن بۆ پێکهێنانی دیمەنە هەمیشەیی‌یەکان.

بۆ نموونە: خەڵکی شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە دەچن بە چەشنی شاشەی سینەما وێنەی بارودۆخ و بۆنە ناوازە و جوانەکان دەگرن و بە دیاری پێشکەشی نەوەکانی داهاتوویان دەکەن. بەم کارەشیان جۆرە مانەوەیەك بەو بارودۆخە فانی و نەماوانە دەبەخشن و، زەمانی ڕابوردوو لە ناوەندی زەمانی ئێستا و داهاتوودا دادەنێن و دەری دەخەن.

ئەم بوونەوەرانەی بەهار و دنیاش بە گشتی، بە هەمان جۆرن. چونکە دوای بەسەربردنی ژیانێکی کورت، کردگارە داناکەیان ئامانجەکانی ئەوان - کە تایبەتن بە جیهانی بەقائەوە - لەو جیهانەدا تۆمار دەکات، هەروەك ئەو کردگارە مەزنە کارمەندی‌یەکانی ژیانیان و ئەو موعجیزاتە سوبحانی‌یەش کە لە قۆناغەکانی ژیانیاندا ئەنجامیان داون، بەپێی خواستی ناوە جوانەکانی: "الحکیم و، الرحیم و، الودود"ی خۆی، لە چەند دیمەنێکی هەمیشەیی‌دا تۆمار دەکات.

**ئاماژەی چوارەم:**

ورابعاً: مع إعلان التسبیحات الربانیة وإظهار المقتضیات الأسمائیة.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە: بوونەوەران لە قۆناغەکانی ژیانیاندا چەندین جۆری تەسبیحات بەرامبەر پەروەردگاریان ئەنجام دەدەن و ئەو حاڵەتە دەردەخەن کە ناوە جوانەکانی خوای گەورە داخوازیانن.

بۆ نموونە: ناوی جوانی "الرحیم" داخوازی شەفەقەت و بەزەیی پێدا هاتنەوەیە و.. ناوی "الرزاق" داخوازی ڕۆزی‌بەخشینە و.. ناوی "اللطیف"یش داواکاری نەرمونیانی‌یە... هتد. جا هەموو یەکێك لە ناوە جوانەکانی خواوەند داخوازی شتێکە و، هەموو زیندەوەرێکیش بە ژیان و بوونی خۆی خواستی ئەو ناوانە دەردەخات، هەروەك لە هەمان کاتیشدا و بە ژمارەی کۆئەندام و ئامێرەکانی تەسبیحاتی خواوەندی دانا دەکات.

بۆ نموونە: کاتێ کە مرۆڤ میوەی خۆش و بەتام دەخوات، بە ڕواڵەت ئەو میوەیە لەتوپەت و پەرتەوازە بووە و لە گەدەیدا هەرس کراوە، کەچی لە ناوەندی کارایی‌یەکدا چێژ و لەزەت نەك تەنها بە دەم و گەدەی بەڵکو بە هەموو یەکێکی خانەکانی جەستەی دەبەخشێت و دەبێت بە خولگەی چەند حیکمەتێکی یەکجار زۆری وەك نەش و نما و بەردەوامکردنی ژیان لە هەموو لایەکی جەستەیدا، هەروەك خواردنەکە خۆیشی لە پلەی وجوودی ڕووەکی‌یەوە بەرز دەبێتەوە و دەڕواتە ناو پلەی ژیانی مرۆڤەوە..

بوونەوەرانیش بە هەمان جۆرن، چونکە کاتێ کە لە پشت پەردەی نەمانەوە ون و ئاوا دەبن، ئەوا لە بریی یەك بە یەکی ئەوان چەندین تەسبیحاتی باقی و زۆر و زەبەندە دەمێنێتەوە و نەخشونیگار و داخوازی‌یەکانی گەلێ ناوی جوانی خواوەند بە دەستی ئەو ناوانە دەسپێرن. واتە: ئەو نەخشونیگارانە تەسلیمی وجوودێکی باقی دەکەن، ئنجا خۆیان دەڕۆن و ئەم جیهانە بەجێ‌دەهێڵن. جا ئایا گەر هەزاران جۆری "وجوود" - کە جۆرە مانەوەیەکیان بەدەست هێناوە - لە بریی نەمانی "وجوود"ێکی کاتی و فانی بمێننەوە، ئایا ئیتر دەگونجێ بوترێت: داخی بەجەرگم بۆ ئەو وجوودە کاتی‌یە؟! یان بوترێت: بەرەو هەرەمەکی و بێهوودە ڕۆیشتووە؟! یان بوترێت: ئەم بەدیهاتووە ناسکۆڵەیە بۆچی کۆچی کرد؟! ئایا دەکرێت بەم شێوەیە سکاڵا بکرێت؟

بەڵکو دەوترێت: "میهرەبانی" و "دانست" و "خۆشەویستی" سەبارەت بەو بەدیهاتووە وا دەخوازێت، بەڵکو هەر وەهایشە. دەنا لەبەر ڕێ‌گرتن لە ڕوودانی یەك زیان، دەبێت واز لە هەزاران سوود و قازانج بهێنرێت! دیارە ئەو کاتەش هەزاران زیان بەرپا دەبێت!

بەو واتایەی کە ناوە جوانەکانی: "الرحیم، الحکیم، الودود" داواکار و داخوازی ڕۆشتن و ئاوابوونی بوونەوەرانن لە پشت پەردەی جودایی و نەمانەوەو، هەرگیز پێچەوانەی ئەم کارە نین.

**ئاماژەی پێنجەم:**

وخامساً: لظهور الشؤونات السبحانیة والمشاهد العلمیة.

ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە: بوونەوەران بە تایبەت "زیندەوەرانیان" دوای کۆچ کردنی بوونە ڕواڵەتی‌یەکەیان، گەلێ شتی "باقی" بەجێ‌دەهێڵن، ئنجا دەڕۆن.

لە هێمای دووهەمدا ڕوونمان کردەوە کە:

کاروبارە پەروەردگارییەکان: خۆشەویستی و شەفەقەت و شانازی و ڕەزامەندیی ڕەهایان تێدایە، گەر ئەم تەعبیرانە دروست بن. هەروەها ڕەزامەندیی موقەددەس و ڕەها و شادمانیی خاوێن و ڕەها و لەزەتی موقەددەس و ڕەها و خۆشحاڵیی خاوێن و ڕەهایان تێدایە، بە چەشنێ کە شایستەی زاتی شکۆمەند و موقەددەس بن و لەگەڵ بەرزی و خاوێنی و قودسییەتەکەیدا بگونجێن. چونکە ئاسەوارى ئەو کاروبارە خاوێن و موقەددەسانە دەبینرێن، ئەوەتا خواستی ئەو کاروبارانە هەمیشە دەست بەکارە، کە بریتییە لە کۆچ پێ کردنی بوونەوەران بە خێرایی و کاراییەکی سەرسووڕهێن و لەناوەندی ئاڵوگۆڕ و فەنا و نەماندا، کە بەردەوام لە جیهانی بینراوەوە بەرەو جیهانی غەیب ڕەوانە دەکرێن.

کەواتە بوونەوەران لەناوەندی درەوشانەوەی ئەو کارە پەروەردگارییانەدا هەمیشە لە گەشتوگوزار و جووڵە و گەڕانێکی بەردەوامدان و گوێی بێ ئاگایان لە لاواندنەوەی شین و گریان پڕ دەکەن و گوێی ئەهلی ئیمانیش بە ئاوازی زیکر و تەسبیح ئاو دەدەن.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە: هەرچی "بوونەوەر" هەیە، کاتێ لە "بوون"دا نامێنێت و دەڕوات، هێندە واتا و حاڵەت و چۆنێتی لە وجوددا بەجێدەهێڵێت کە ببن بە خولگەیەکی باقی و بەردەوامی دەرکەوتنی کاروبارە "باقی"یەکانی خواوەندی "واجب الوجود".

پاشان کاتێ ئەو بوونەوەرە کۆچ دەکات، سەرجەمی ئەو قۆناغ و حاڵەتانەی پیاياندا تێپەڕیوە، بە شێوەی وجودێکی دوور و درێژ – کە بوونە دەرەکییەکەی دەنوێنێت – لە چەند بازنەیەکی بوونی زانستیدا بەجێدەهێڵێت، وەك: "ئیمامی موبین" و "کیتابی موبین" و "لەوحی مەحفووز" کە چەند ناونیشانێکن بۆ زانستی ئەزەلیی خواوەند.

کەواتە هەموو شتێکی "فانی" تەنها یەك وجود لە دەست دەدات، بەڵام هەزاران جۆری وجود بۆ خۆی و غەیری خۆی بەدەست دەهێنێت.

بۆ نموونە: چەند ماددەیەکی ئاسایی دەخرێنە ناو مەکینەی کارگەیەکی مەزنەوە و ئەو ماددانە بە ڕواڵەت دەسووتێن و نامێنن، کەچی چەندین ماددەی کیمیایی بەنرخ و دەرمانی گرنگ لە چەوتەك و ئەمبیقەکانی ئەو کارگەیەدا دەنیشێت، جگە لەوەی کە هێزی هەڵمەکەشی چەرخەکانی ئەو کارگەیە دەخاتەگەڕ، کە ئەمەش لە لایەکی ترەوە

کاری چنینی قوماشەکان بە ڕێ دەکات و لە لایەکی ترەوە کتێبی پێ چاپ دەکرێت و لە لایەکی تریشەوە شەکری پێ بەرهەم دەهێنرێت.

بەو واتایەی کە بە "سووتان" و "نەمان"ی ڕواڵەتیی ئەو ماددە ئاسایییانە، هەزاران شت "وجوود"یان دەست دەکەوێت. واتە وجوودێکی ئاسایی دەڕوات و نامێنێت، بەڵام چەند جۆرێکی بەرزی وجوود بەجێدەهێڵێت.

جا ئایا لەم چەشنە حاڵەتەدا دەوترێت: نەمانی ئەو ماددە ئاسایییانە چەندە زیانێکی گەورەیە؟! ئایا دەکرێ سکاڵای وا بکرێت؟! یان ئایا دەوترێت: بۆچی خاوەنی کارگە بەزەیی بە حاڵی ئەو ماددانەدا نەهاتەوە، بەڵکو سووتاندنی و لەناوی بردن؟!

بەدیهێنەری دانا و خاوەنی خۆشەویستی و میهرەبانیش - ولله المثــل الأعلــــى - کارگەی ئەم بوونەوەرانە دەخاتە گەڕ و، هەموو وجوودێکی "فانی" دەکات بە ناوکێك بۆ چەندین وجوودی "باقی" و خولگەی دەرخستنی ئامانجە پەروەردگارییەکانی. بەمەش کاروبارە سوبحانییەکانی خۆی دەردەخات و دەیانکات بە مەرەکەبی قەڵەمی قەدەر و مەکووکی چنینەکانی قودرەتی خۆی، بەپێی خواستی "میهرەبانی" و "دانایی" و "وەدوودییەت". ئیتر ئەم بەدیهێنەرە دانا و میهرەبانە، بە کارایی توانستەکەی، بوونەوەران دەداتەبەر تاکو لە پێناوی گەلێ چاودێریی بەنرخ و ئامانجی بەرزدا - کە ئێمە نایانزانین - کارایی و ئەرکی ئەستۆیان ئەنجام بدەن. ئیتر ئەو کاراییە سەرجەمی بوونەوەران دەداتەبەر بە چەشنێك وا لە گەردیلەکان دەکات کە بجووڵێن و، بوونەوەرانیش بڕۆن و بزوێن و، زیندەوەرانیش وەك لافاو خوڕ دەبنەوە و، سەرجەمی گەردوونیش دەخاتە گوفتار تا بە بێدەنگی و کپی ئایەتەکانی بەدیهێنەری بخوێنێتەوە و بە نووسینیان بدات.

لە ڕووی پەروەردگارێتیشەوە کردگاری دانا بوونەوەرانی زەویی کردووە بە چەند عەرشێکی خۆی، ئەوەتا "هەوا" جۆرێکە لە عەرشی فەرمان و ویستی بەدیهێنەر و.. توخمی "ڕووناکی"یش عەرشێکی ترە بۆ زانست و دانستەکەی و.. "ئاو"یش عەرشێکی ترە بۆ چاکە و میهرەبانییەکەی و.. "گڵ"یش جۆرە عەرشێکە بۆ کارەکانی پارێزگاری و ژیاندن کە لە لایەن خواوەندەوە بەڕێ دەکرێن، جا سێ دانە لەو عەرشانەش بەسەر بوونەوەرەکانی ناو زەوییەوە دەخاتە گەڕ.

بەوپەڕی دڵنیایی و بێگومانی بزانە کە:

ئەو حەقیقەتە بەرزەی لەم پێنج هێما و پێنج ئاماژانەدا ڕوون کرایەوە، تەنها بە نووری قورئان دەبینرێت و هەروەها بەهێزی ئیمانیش نەبێت هەرگیز دەستی کەس ناکەوێت. دەنا گەر نووری قورئان و هێزی ئیمان لەگۆڕێدا نەبن ئەوا لە پەرییی ئەو حەقیقەتە "باقی" و "بەردەوام"ە چەندین تاریکایی سامناك هەموو لایەك دەگرنەوە و، دنیای گومڕایان لە چەندین جۆری جودایی و نەمان پڕ دەبێت و، گەردوون سەبارەت بەوان دەبێت بە دۆزەخێکی مەعنەویی ئەوتۆ کە لە توانای کەسدا نەبێت بەرگەی بگرێت. چونکە ئەو کاتە چەندەها عەدەمی بێسنوور دەوراندەوری هەموو شتێك دەدەن کە وجوودێکی ئانی و کتوپڕیان هەیە و، سەرانسەری ڕابوردوو و داهاتووش لە تاریکاییەکانی عەدەم پڕ دەبن، ئەو کاتەش مرۆڤی گومڕا جگە لە ڕووناکییەکی خەمبار لە حاڵی حازریدا - کە زەمانێکی یەکجار کورتە - چیی تری دەست ناکەوێت.

بەڵام هەر ئەوەندەی نهێنیی قورئان و نووری ئیمان دێن بە هانای مرۆڤەوە، یەکسەر هەر لە ئەزەلەوە تا ئەبەد نووری وجوود دەبینرێن و، ئەو مرۆڤەش دەستیان پێوە دەگرێت و بەختەوەریی هەمیشەیی خۆی پێ دەهێنێتەدی.

**پوختەی ئەم قسانە:**

وەك نیازیی میسری[1] وتوویەتی، ئێمەش دەڵێین:

گەر هەناسەم دەریا بێت و
ئەم سنگەشم لەت لەت بکرێ
دەگریم بە زار.. دەنگ هەڵدەبڕم
تا هەناسە و دەنگم دەبڕێ:
ئەی حەق ئەی مەوجوود! یا حەی یا مەعبوود!
یا دانای مەقصوود! میهرەبان! وەدوود!

(١) نیازیی میسری: (١٦١٨-١٦٩٤ز) زانا و شاعیرێکی زاهیدە، لە گوندێکی سەر بە پارێزگای "مەلاتییە"ی تورکیا لە دایك بووە. خوێندنی لە "ئەزهەر" تەواو کردووە، هەر لەبەر ئەوەش پێی وتراوە: "میسری". کە لە میسر گەڕاوەتەوە دەستی کردووە بە ڕێنمایی موسڵمانان لە یەکێك لە قوتابخانەکانی ئەو کاتەی ئەستەمبووڵدا، هەر لەوێش تەریقەتی "خەلوەتی"ی دامەزراندووە کە پێشی دەوترێت: "تەریقەتی نیازی" و "تەریقەتی میسری". جگە لە "دیوانی شیعر" و "مەکتووبات"ەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە وەك: "موائد العرفان"، "عوائد الإحسان"، "هداية الإخوان". (وەرگێڕ)

هەروەها بە دەنگی بەرز دەڵێم:

لا إله الاّ الله الملك الحق المبين محمد رسول الله صادق الوعد الأمين.

باوەڕی دڵنیا و دامەزراوم بەوە هەیە و دەیشی چەسپێنم کە:

(إن البعث بعد الموت حقٌ والجنة حَقٌ والنار حَقٌ.. وإن السعادة الأبدية حــقٌ. وإن الله رحيم حكيم ودود. وإن الرحمة والحكمة والمحبة محيطة بجميع الاشياء وشؤونــها).

﴿وَقالُوا الْحَمْدُ للهِ الَّذِي هَدَانا لِهذا وَما كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أنْ هَدانا اللهُ لَقَــدْ جَــاءَتْ رُسُلُ رَبِّنا بِالْحَقِّ﴾.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ الْعَليمُ الْحَكيمُ﴾.

﴿رَبَّنا لا تُؤاخِذْنَا إنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾.

اللهم صَلِّ على سيدنا محمد صلاة تكون لك رضاءً ولحقّه اداءً وعلى آله وصحبــه وسلم. آمين. والحمد لله رب العالمين.

سبحان مَنْ جعلَ حديقةَ أرضِه: مَشْهَرَ صنعته.. مَحشرَ خلقتِه.. مَظْــهَرَ قُدْرَتــهِ.. مدارَ حِكمتِه.. مَزهرَ رحمتِه.. مَزْرَعَ جنتِهِ.. ممرَّ المخلوقاتِ.. مسيلَ الموجوداتِ.. مكيلَ المصنوعات.

فمُزيِّنُ الحيواناتِ: منقّشُ الطويرات..مُثمِّرُ الشجرات، مُزَهِّرُ النباتات..

معجزاتُ علمِه.. خوارقُ صُنعِه.. هدايا جُوده: براهينُ لطفِه!

دلائلُ الوحدة.. لطائف الحكمة: شواهد الرحمة.

تبسُّم الأزهار، من زينة الأثمار..

تسجّعُ الأطيار، في نسمة الأسحار..

تــهزّجُ الأمطار، على خدود الأزهار..

تزيّنُ الأزهار، تبرّجُ الأثمار، في هذه الجِنان..

ترحُّمُ الوالدات على الأطفال الصغار في كل الحيوانات والإنسان:

تعرُّفُ ودودٍ..

تَوَدُّدُ رحمنٍ..

ترحُّمُ حنّانٍ..

تحنُّنِ مَنّانٍ.. للجنِ والإنسان، والروح والحيوان، والملَكِ والجَانّ.

# پاشکۆی یەکەم

﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبّي لَوْلا دُعَاؤُكُم﴾ (الفرقان:٧٧)

**سەرنجی یەکەم:**

بزانە کە: "دوعا" نهێنی‌یەکی مەزنی بەندایەتی‌یە، بەڵکو کاکڵـە و گیانیـەتی. وەك لـە چەند شوێنێکی زۆری تردا باسمان کردووە.

دوعاش سێ جۆرە:

*جۆری یەکەمی دوعا:*

بریتی‌یە لەو دوعایەی کە بە زمانی توانا و قابیلییەتەکانی ناو هەموو شتێك دەکرێت. بۆ نموونە: سەرجەمی ناوك و تۆوەکان بە زمانی توانا و لێهاتنەکانی خۆیان لە بەدیهێنەری دانایان دەلاڵێنەوە و دەڵێن: ئەی بەدیهێنەرمان! نەش‌ونمایەکمان بۆ ئامادە بکە کـە بتوانین بەهۆیـەوە کـارە ناوازەکـانی نـاوە جوانـەکانت بەرجەستە بکـەین و بیانخەینـە پێش‌چـاوی بینەران.. خوایە گیان حەقیقەتە بچووکەکانمان بگۆڕە بە حەقیقەتێکی گەورە و مەزن کە حەقیقەتی درەخت و گوڵە گەنمە.

هەر لـەم جـۆری دوعـای زمـانی توانـا و لێهاتنـە دوعایەکی تر هەیـە کـە بریتی‌یـە لـە: "کۆبوونەوەی هۆکارەکان". چونکە کۆبوونەوەی ئەو هۆکارانە لە ڕاستی‌دا بریتی‌یـە لـە دوعـاکـردن بـۆ هێنانـەدیی بەهـۆکراوەکە. واتـە هۆکارەکـان حاڵـەت و بـارودۆخێکی تایبـەتی و دیـاریکراوی ئـەوتۆ دەگرنـە خۆیـان کـە وەك زمـانی حـاڵێك وابێـت داوای هێنانەدیی بەهۆکراوەکە لە خواوەندی بەتوانای شکۆمەند بکات. بۆ نموونە: تۆوەکان بـە زمانی توانا و لێهاتنیان داوا لە بەدیهێنەرە بە تواناکەیان دەکەن کە بیانکات بـە درەخـت، ئیـتر هەریـەك لـە: گـەرمی و، گڵ و، ڕووناکی و، ئـاو، لـە دەوری ئـەو تـۆوە حاڵـەتێکی دیاریکراو دەگرنە خۆیـان تـا ئـەو حاڵەتـە وەك زمـانێکی ئـەوتۆی لـێ دێـت بـەم دوعایـە بکەوێتە گوفتار: ئەی خواوەندی بەدیهێنەرمان! ئەم تۆوە بکە بە درەخت.

بـەڵێ، هـەرگیزاو هـەرگیز ناگونجـێ کاروبـار و بەدیـهێنانی درەخـت - کـە خـۆی لـە خۆی‌دا موعجیزەیەکی توانستی دەراسای خوایی‌یە - بخرێتـە ئەسـتۆی ئـەو مـاددە سـادە و بێ هەسـت و نەسـتانەوە. تەنانـەت هـەر مەحاڵـە کـە بدرێتـە پـاڵ ئـەو هۆکارانـە. کەواتـە کۆبوونەوەی هۆکارەکان جۆرێکن لە جۆرەکانی دوعا.

*جۆری دووهەمی دوعا* :

بریتی‌یە لەو دوعایەی کە بە زمانی پێداویستیی سروشتی دەکرێت. چونکە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان سەرجەم خواست و پێداویستی‌یەکانیان - کە لە توانا و ئیختیاری خۆیان بەدەرن - لە بەدیهێنەری میهرەبانیان داوا دەکەن. ئنجا لە باشترین کات و بە چەشنێ کە لە حسابی خۆیاندا نەبێت ئەو خواست و پێداویستی‌یانەیان بۆ دەهێنرێتە دی. خۆ دەستی هەموویشیان گەلێ کورت و کۆتاترە لەوەی بگات بەو شتەی کە دەیانەوێت یان ئەو پێویستی‌یە نەهێڵن کە هاتووەتە رێیان. کەواتە ناردنی ئەو خواستەیان کە لە توانا و ئیختیاری خۆیاندا نی‌یە، لە باشترین کاتدا و بە شێوەیەك کە لە حسابیاندا نەبووبێت، لە لایەن دانایەکی میهرەبانەوە دەنێرێت و، باراندنی ئەم چاکە و نیعمەت بەخشینە تەنها گیرابوونی دوعایەکی فیتری‌یە.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە: ئەم جۆرە دوعا و نزا فیتری‌یە، دوعایەکە زمانی پێداویستیی فیتریی سەرجەمی بوونەوەرانی پێ کەوتووەتە گوفتار و، بەم زمانە داواکاری‌یەکانیان دەخەنە بەردەم بەدیهێنەری میهرەبان. کە ئەمەش وەك پارانەوەی "هۆکارەکان" وایە کە داوای "بەهۆکراوەکان" لە خواوەندی بەتوانای زانا دەکەن.

*جۆری سێ‌هەمی دوعا* :

بریتی‌یە لەو دوعایەی کە خاوەن هەستان بۆ بەدەمەوە چوونی پێداویستی‌یەکانیان دەیکەن. ئەم دوعایەش دوو جۆرە:

بەشی یەکەم: زۆربەی جار گیرایە، گەر گەیشتبێتە پلەی ناچارەکی(الإضطرار).. یان پەیوەندی‌یەکی بەتینی لەگەڵ پێویستیی فیترەتدا هەبێت و لەگەڵی‌دا یەك بکەوێت.. یان نزیك بێت لە زمانی توانا و لێهاتنەکانەوە.. یان هێندە خاوێن و بێ گەرد بێت کە لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵابێت.

ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستی‌یانەی کە مرۆڤ بەدەستی هێناون، تەنها ئەنجامی ئەم جۆرە دوعایەن! چونکە هەموو ئەو شتانەی کە ناوی: "کارە دەراساکانی شارستانێتی"ی لێ دەنێن و ئەو شتانەش کە مایەی شانازیی دۆزینەوەکانیانە، لە راستی‌دا، تەنها بەروبوومێکی ئەم دوعا مەعنەوی‌یەن کە گرۆی مرۆڤ بە زمانێکی خاوێن و بێ گەردی توانا و لێهاتنەکانی داوای کردوون و ئنجا ئەم دوعایەیان گیرا بووە. چونکە هەر دوعایەك کە بە زمانی توانا و لێهاتنەکان، یان بە زمانی پێداویستیی سروشت و لە

ناوەندی هەل و مەرجە تایبەتەکانی خۆیاندا بێت، دڵنیابە کە گیرا دەبێت، گەر هیچ ڕێگرێك لە ئارادا نەبێت.

بەڵام بەشی دووهەم: بریتی‌یە لەو دوعایەی کە خۆمان دەیزانین. ئەمەش دوو لقی لێ دەبێتەوە: یەکێکیان بە کردەوەیە و، ئەوی تریشیان بە گوفتارە..

بۆ نموونە: "کێڵاندنی زەوی" جۆرێکە لە دوعای کردار، مرۆڤ لەم ڕێیەوە داوای ڕۆزی‌یەکەی خۆی لە ڕۆزی‌بەخشی دانا دەکات، نەك لە خاك و گڵی زەوی. چونکە "گڵ" تەنها بریتی‌یە لە دەرگایەکی گەنجینەی میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە و مرۆڤیش بە گاسنەکەی لەو دەرگایە دەدات.

وا درێژەی بەشەکانی تر دەپێچینەوە و، لەمەولا چەند نهێنی‌یەکی دوعای زمانی گوفتار لە چەند سەرنجێکدا باس دەکەین:

**سەرنجی دووهەم:**

بزانە کە "دوعا" کاریگەری‌یەکی مەزنی هەیە، بە تایبەت گەر بەردەوام بێت و هەمەکێتی(الكلية)ی بەدەست هێنابێت. ئەم چەشنە دوعایە زۆربەی جار بەرهەمی دەبێت و هەمیشەش گیرا دەکرێت. تەنانەت دەتوانرێ بوترێت کە: هۆی بەدیهێنانی جیهان تەنها بریتی‌یە لە دوعایەك! چونکە ئەو دوعا گەورەیەی پێغەمبەری مەزن ﷺ کە تیای‌دا پێشی جیهانی ئیسلامی کەوتووە و ئەوانیش هەمان دوعای لە پشت سەرەوە دەڵێنەوە و لەمەشدا پێش گرۆی مرۆڤ کەوتوون کە هەمان دوعا و داواکاری‌یان هەیە.. ئەو دوعایە، بریتی‌یە لە داوای بەختەوەریی هەمیشەیی کە یەکێکە لە هۆکارەکانی بەدیهێنانی جیهان.

واتە: پەروەردگاری هەموو جیهانەکان بە زانستی ئەزەلیی خۆی زانیویەتی کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەی ﷺ بە ناوی سەرجەمی گرۆی مرۆڤەوە، بەڵکو بە ناوی سەرانسەری بوونەوەرانەوە داوای بەختەوەریی هەمیشەیی و بەهرەمەندبوون بە یەکێك لە درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خوا دەکات و.. خواوەندیش ئەو دوعا مەزنەی لێ گیرا کرد و، ئەم جیهانەی بەدی هێنا.

جا ئایا دەگونجێ ئەم دوعایەی کە گرنگی‌یەکی مەزن و فراوانی‌یەکی گشتیی ئاوای بەدەست هێناوە، گیرا نەبێت؟ یان ئایا دەگونجێ ئەو دوعایەی کە هەزار و سێ سەد ساڵە لە هەموو کاتێکدا بە لای کەمەوە ملیۆنەها کەس لە گرۆی ئادەمیزاد لەسەر زمانیانە و، هەموو پاك و خاوێنەکانی گرۆی جینی و سەرجەم مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یە لە ژمارە

بەدەرەكانیش لەگەڵیاندا هەمان دوعا دەڵێنەوە، گیرا نەبێت؟.. ئایا دەگونجێ ئەو دوعایە گیرا نەبێت كە هەموو ئەوانەی باس كران بۆ پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ دەكەن تاكو میهرەبانیی مەزنی خواوەند و بەختەوەریی هەمیشەیی بەدەست بهێنێت؟

جا مادەم ئەم دوعایە تا ئەم ڕادەیە هەمەكێتی و فراوانی و بەردەوامیی بەدەست هێناوە تا گەیشتووەتە پلەی دوعای "زمانی توانا و لێهاتن" و "پێداویستیی فیتری" ئەوا بێ گومان دەبێ ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە كە (حەزرەتی محەممەدی كوڕی عەبدوڵلا)یە ﷺ لە ئەنجامی ئەم دوعایەدا پلە و پایەیەكی هێندە بەرز و بڵندی بەدەست هێنابێت كە ئەگەر سەرجەمی ژیرییەكان بۆ پەی بردن بە حەقیقەتی ئەو پلە و پایەیە كۆ ببنەوە، هەموویان بە تەواوی تیایدا دەستەوسان دەمێنن.

كەواتە مژدەبێ ئەی كاكی موسڵمان! لە ڕۆژی حەشری مەزندا شەفاعەتكارێكی بەڕێزی وەك ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەت ﷺ هەیە.. كەواتە، بە شوێنكەوتنی سوننەتە خاوێنەكەی، هەوڵی بەدەستهێنانی شەفاعەتەكەی بدە.

**ئەگەر دەڵێیت:**

پێغەمبەری ئەكرەم ﷺ كە خۆشەویستی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە، چ پێویستییەكی بەم هەموو دوعا و سڵاوات لەسەر دانە هەیە؟

**وەڵام:**

پێغەمبەر ﷺ پەیوەندییەكی توندوتۆڵی لەگەڵ بەختەوەریی سەرجەمی نەتەوەكەیدا هەیە و، بەشێكی لە هەموو جۆرەكانی ئەو بەختەوەرییانەدا هەیە كە یەك بە یەكی كەسانی ئومەتەكەی بەدەستی دەهێنن. هەروەك بۆ هەر موسیبەت و گیروگرفتێكیش كە دێتە ڕێیان خەفەت دەخوات و ئازاری پێ دەگات.

جا هەرچەند پلەكانی كەماڵ و بەختەوەریی ئەو پێغەمبەرە ﷺ سنووریان بۆ نییە، لەگەڵ ئەوەشدا كەسێك كە گەلێ ئارەزوومەندی ئەوە بێت یەك بە یەكی كەسانی نەتەوەكەی چەندین جۆری بێ سنووری بەختەوەری لە چەند كاتێكی نەبڕاوەی بێ كۆتاییدا بەدەست بهێنن و، چەندین جۆری بێسنووری ئازاریشی پێ بگات لە ئەنجامی بەدبەختی و گیروگرفتەكانی ئەوانەوە، بێ گومان ئەو كەسە - كە پێغەمبەرە ﷺ - موحتاج و شایستەی چەندەها سڵاواتی بێ سنوور و دوعا و نزای لە ژمارە بەدەر و ڕەحمەتی فراوانی نەبڕاوەیە.

**ئەگەر دەڵێیت:**

هەندێ جار دوعای خاوێن و بێ گەرد بۆ چەند شتێك دەکرێت کە گومان لە ڕوودانیاندا نی‌یە، وەك دوعای نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران.. هەندێ جاری تریش دوعا بۆ شتانێك دەکرێت کە هەرگیز ناگونجێ ڕوو بدەن؟!

**وەڵام:**

لە چەند وتەیەکی تردا ڕوونمان کردووەتەوە کە:

"دوعا" جۆرێکە لە جۆرەکانی بەندایەتی و پەرستش. چونکە مرۆڤ بە دوعاکردن دەستەوسانی و هەژاریی خۆی لە بەردەم خواوەنددا ڕادەگەیەنێت. بەڵام ئامانجە ڕواڵەتی‌یەکانی دوعا لە ڕاستی‌دا "کات"ی ئەو دوعا و پەرستن و پاڕانەوە و بەندایەتی‌یەن کە دوعاکانیان تێدا دەکرێت و، هەرگیزاو هەرگیز "ئەنجام" و "سوود"ی ڕاستەقینەی ئەو دوعایە نین. چونکە سوود و بەروبوومی دوعا ڕووی لە دواڕۆژە. واتە: مرۆڤی دوعاکەر ئەو سوود و بەروبوومانە لە دواڕۆژدا دەچنێت. بۆیە گەر ئەو ئامانجە دنیایی‌یانەی کە دوعاکەیان بۆ کراوە نەیەنە دی، نابێت بوترێ: دوعاکە گیرا نەبووە. بەڵکو ڕاست وایە بوترێت: کاتی ئەو دوعایە هێشتا تەواو نەبووە!

جا ئایا دەگونجێت دوعایەك بۆ "بەختەوەریی هەمیشەیی" گیرا نەبێت کە هەموو ئەهلی ئیمان لە گشت کات و سەردەمێکدا بە گەرموگوڕی و بەردەوامی و نیازی خاوێن داوای دەکەن؟ ئایا دەگونجێت خواوەندی خاوەن میهرەبانیی فراوان و کەرەمی ڕەها - کە بوونەوەران شایەتی لەسەر فراوانیی میهرەبانی‌یەکەی و هەمەلایەنگریی کەرەمەکەی دەدەن - ئەم دوعایە قبووڵ نەکات؟ ئایا دەگونجێت ئەو بەختەوەری‌یە هەمیشەیی‌یە نەهێنێتەدی؟!

نەخێر.. نەخێر!

**سەرنجی سێهەم:**

گیرابوونی "دوعای گوفتار و ئیختیاری" لە دوو ڕووەوە دەبێ: یان ئەوەیە دوعاکە وەك خۆی گیرا ببێت و بێتەدی، یان بە جۆرێکی لە خۆی باشتر.

بۆ نموونە: مرۆڤی وا هەیە لە خوای گەورە دەلاڵێتەوە کە منالێکی نێرینەی بداتێ، کەچی خوای گەورە کچێکی وەك حەزرەتی مەریەمی پێ دەبەخشێت!

جا لەم چەشنە حاڵەتەدا هەرگیز ناوترێت: دوعاکەی گیرا نەبووە. بەڵکو لە دوعاکەی خۆی باشتر و چاکتر گیرا بووە.

پاشان هەندێ جار مرۆڤ بۆ دەستکەوت و بەختەوەریەکی دنیایی لە خوا دەپاڕێتەوە، کەچی خوای گەورە بۆ بەختەوەریەکی سەر بە دوارۆژی ئەو مرۆڤە دوعاکەی گیرا دەکات..

کەواتە لەم کاتەدا ناوترێت: دوعاکەی گیرا نەبووە، بەڵکو بە چەشنێکی سوودبەخشتر لە لایەن خواوەندەوە گیرا بووە.

بەم جۆرە، ئێمە لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە و پێداویستیەکانمان تەنها لەو داوا دەکەین. بەڵام خواوەند لەبەر ئەوەی دانا و زانایە، بەپێی خواستی داناییەکەی خۆی مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات. بە وێنەی نەخۆش کە نابێت دانستی ئەو پزیشکەی تۆمەتبار بکات کە چارەسەریی بۆ دەستنیشان دەکات. چونکە لەوانەیە نەخۆشەکە داوای هەنگوین لەو پزیشکە بکات کەچی لەبەر ئەوەی پزیشکەکە دەزانێ تای لێ هاتووە هەنگوینی ناداتێ و دەرمانێکی تاڵی دەرخوارد دەدات! لێرەدا نەخۆشەکە مافی ئەوەی نییە بڵێت: پزیشکەکەم بە دەم خواست و داواکاریەکانمەوە نایەت. چونکە لە ڕاستیدا گوێی لە ناڵەناڵ و هاواری ئەو ڕاگرت و بە کردەوە ڕۆشت بە دەمیەوە و لە داواکاریەکەی ئەو باشتریشی بۆ هێنایەدی.

**سەرنجی چوارەم:**

خۆشترین و جوانترین و ناسکترین بەروبوومی خێرا و حازری، کە مرۆڤ لە دوعاکانیەوە دەیچنێتەوە، ئەمەی خوارەوەیە:

مرۆڤی دەستەودوعا بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە یەکێك هەیە گوێی لێیەتی و بەزەیی پێدا دێتەوە و دەرمانی پێویستی بە هاناوە دەنێرێت و تواناشی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. ئیتر لە دەروونی خۆیدا هەست دەکات کە لەم دنیا فراوانەدا تەنیا و بێ کەس نییە، بەڵکو خاوەنێکی بەکەرەمی ئەوتۆی هەیە کە بە چاوی کەرەم و میهرەبانیەوە بۆی دەڕوانێت. لەمەشەوە هاودەمی و دڵنەوایی دەڕژێتە ناو دڵی ئەو کەسە دەست بە دوعایە و، بیر دەکاتەوە لەوەی کە لە سایەی میهرەبانێکی ئەوتۆدایە دەتوانێت پێداویستیە بێ سنوورەکانی بۆ جێبەجێ بکات و دوژمنە لە ژمارە بەدەرەکانیشی لە کۆڵ بکاتەوە. هەروەك هەست دەکات کە هەمیشە لە حوزووری ئەودایە. ئیتر نوقمی شادمانی دەبێت و وا هەست دەکات کە کۆڵێکی قورسی لەسەر شانی خۆی داگرتووە. بۆیە سوپاسی خوا دەکات و دەڵێت:

الحمد لله رب العالمين.

سەرنجی پێنجەم:

"دوعا" کاکڵە و گیانی بەندایەتی و پەرستشە و ئەنجامی ئیمانێکی بێ گەردە. چونکە مرۆڤی دەستەودوعا بە دوعاکەی دەری دەخات کە: ئەو کەسەی بەسەر هەموو جیهاندا زاڵ و بە دەستەڵاتە و ئاگای لە پەنهانترین کاروبارم هەیە و زانستەکەشی دەورانـدەوری هەموو شتێکی داوە، هەر ئەوە کە دەتوانێت فریای منیش بکەوێت و دوورترین ئامانجەکانم بۆ بهێنێتەدی و، هەر ئەویش بینەری گشت حاڵەتەکانی من و بیسەری سەرجەم بانگ و داواکاری‌یەکانمە، کەواتە هەر تەنها لەوی داوا دەکەم، چونکە هەر ئەوە کە دەنگی سەرجەمی بوونەوەران دەبیستێت و بێ گومان هەر ئەوە دەنگ و هاواری منیش دەبیستێ و هەموو کارەکان بەڕێوە دەبات، بۆیە منیش بەڕێوەبردن و کارسازیی وردترینی کاروبارەکانم تەنها لەو چاوەڕوان دەکەم.

بەم جۆرە، ئەی برای موسڵمان!

بیر لە فراوانیی ئەو "تەوحید"ە خاوێن و بێ گەردە بکەرەوە کە "دوعا" بە مرۆڤی دەبەخشێت. پاشان بۆ ئەو تامە شیرین و بێ گەردەی "نووری ئیمان" بڕوانە کە دوعا دەری دەخات و، یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەم ئایەتە تێبگە کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلا دُعاؤُكُمْ﴾ (الفرقان:٧٧)..

پاشان گوێ لەم فەرمایشتەی خوای گەورەش ڕابگرە کە دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر:٦٠).

ئنجا بزانە ئەو گوفتارە چەندە ڕاست و ڕەوایە کە وتراوە:

*"اگر نه خواهی داد نه دادی خواه".*

واتە: گەر نەیویستایە بیبەخشێت، دوعای ئیلهامی مرۆڤ نەدەکرد!

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللهم صلّ على سيدنا محمد من الأزل إلى الأبد عدد ما في علـم الله وعلى آلـه وصحبه وسلم. سلّمنا وسلّم ديننا آمين. والحمد لله رب العالمين.

* * *

# پاشكۆی دووهەم

## تایبەتە بە میعراجی پێغەمبەرەوە ﷺ

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى ۞ عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى ۞ عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى ۞ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى ۞ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى ۞ لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾(النجم:١٣-١٨)

وا پێنج سەرنج روون دەكەینەوە سەبارەت بە بەشی میعراج لە قەسیدەی "لەدایكبوونی پێغەمبەرﷺ"دا.

**سەرنجی یەكەم:**

بەرێز "سلێمان ئەفەندی"[(١)] كە قەسیدەیەكی لە بارەی لەدایكبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ هۆنیوەتەوە، لەو قەسیدەیەدا بەسەرهاتی عیشقێكی خەمناك باس دەكات دەربارەی ئەو بوراقەی كە لە بەهەشتەوە هێنرا. جا لەبەر ئەوەی ئەو بەرێزە یەكێكە لە ئەولیا پیاوچاكەكان و لە قەسیدەكەشیدا پشتی بە چەند ریوایەتێكی سیرەت بەستووە، ئەوا بێ گومان بەو وێنەیەی كە لە قەیسدەكەیدا بۆ ئەو رووداوەی كێشاوە، حەقیقەتێكی دیاری كراو دەردەبڕێت، كە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

---

(١) ناوی: سلێمان چەلەبی‌یە و، یەكەم كەسە لە بارەی لەدایكبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ بە زمانی توركی قەسیدەی شیعریی هۆنیوەتەوە و گەلێ سەركەوتوو بووە تیایدا. ئەو قەسیدەیەشی لە كتێبی: "وسیلة النجاة"دا تۆمار كردووە. یەكێك بووە لە پیاوچاكان و ئەهلی ویلایەت. سالی ٧٨٠ك لە شاری "بوورسە" كۆچی دوایی كردووە. (وەرگێڕ)

بەدیهاتووانی جیهانی "بەقاء" پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە نووری پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە. چونکە بەهۆی ئەو نوورەی کە پێغەمبەر ﷺ هێنای، بەهەشت و خانەی ئەودنیا بە گرۆی جیننی و ئادەمیزاد ئاوەدان دەبنەوە و، گەر ئەو نوورە نەبوایە نە ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییە پەیدا دەبوو، نە جیننی و ئادەمیزادیش بەهەشتیان ئاوەدان دەکردەوە و، نە بەهرەمەندی سەرجەم نیعمەتەکانی بەدیهاتووانی بەهەشت دەبوون. واتە گەر ئەو نوورە نەبوایە بەهەشت بێ سەرنشین دەمایەوە و لە دانیشتوانی خاڵی دەبوو.

لە لقی چوارەمی وتەی بیست و چوارەمدا وتمان:

لەناو هەموو جۆرەکانی بەدیهاتووەاندا بولبولێکی وتارخوێن هەڵبژێرراوە تاکو بە نوێنەرایەتیی هاورەگەزەکانی: داخوازییەکانیان دەربڕێت.

لە پێشەنگی ئەو بولبولە وتارخوێنانەوە: بولبولی شەیدای گوڵە، کە تا ڕادەی عیشق پێداویستییەکانی دەستەی گیانلەبەران دەردەبڕێت لە بەرامبەر ئەو کاروانی ڕووەکانەی کە لە گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە هاتوون و ڕۆزیی گیانلەبەرانیان هەڵگرتووە.

بەڵێ، ئەم بولبولانە لەسەر چڵی جوانترین ڕووەکەکان بە ئاوازە ناسکەکانیان ئەم پێداویستییانە ڕادەگەیەنن، تاکو ئەو پێشوازییە جوان و شایستەیە دەربڕن کە گیانی تەسبیح و تەهلیلیان بە بەردا کراوە..

پێغەمبەری سەروەریشمان کە حەزرەتی محەممەدی ئەمینە ﷺ و هۆی بەدیهێنانی گەردوون و بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەردوو دنیایە و خۆشەویستی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە، بە هەمان جۆرە. چونکە هەروەك حەزرەتی جوبریل - درودی لەسەر بێت - لە بواری گوێڕایەڵی و خزمەتگوزاریدا بە کەماڵی مەحەبەت بوو بە نوێنەری جۆری مەلائیکەت و بەمەش نهێنیی سوژدەبردن و ملکەچ بوونی مەلائیکەتی بۆ حەزرەتی ئادەم - درودی لەسەر بێت - دەرخست.. بە هەمان جۆر سەرنشینانی بەهەشتیش تەنانەت زیندەوەرانی ناویشی چەندین پەیوەندییان بەم پێغەمبەرە بەڕێزەوە ﷺ هەیە.

جا بەڕێز "سلێمان ئەفەندی"یش لە ڕێی باسکردنی هەست و سۆزی عیشق و خۆشەویستیی ئەو بوراقەی کە پێغەمبەر ﷺ بە سواری ئەو شەوڕەویی کرد، ئەم حەقیقەتەی دەربڕیوە.

**سەرنجی دووهەم:**

یەکێك لە بەسەرهاتەکانی قەسیدەی میعراجی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە بەڕێز سلێمان ئەفەندی ئەو خۆشەویستی‌یە خاوێنەی خوای گەورەی بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە ڕستەی: "من عاشقی تۆم" دەربڕیوە..

لە ڕاستی‌دا ئەم چەشنە تەعبیرانە - بە واتا عورفی‌یەکانیان - شایستەی قودسییەت و بەرزی و خاوێنیی خوای گەورە نین. بەڵام لەبەر ئەوەی بەڕێز سلێمان ئەفەندی یەکێکە لە ئەهلی ویلایەت و حەقیقەت، ئەوەتا ئەم قەسیدەیەی لە لایەن موسڵمانانەوە بە گشتی قبووڵ و ڕەزامەندیی بەدەست هێناوە، ئەوا بێ گومان ئەو واتایەی کە دەری خستووە ڕاستە و بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

خوای گەورە خاوەنی جوانی و کەماڵی ڕەهایە و، هەرچی جۆرەکانی جوانی و کەماڵی سەرجەمی بوونەوەران هەن هەر هەموویان نیشانە و ئاماژەن بۆ جوانی و کەماڵی ڕەهای ئەو.

جا لەبەر ئەوەی هەموو خاوەن جوانی و کەماڵێك بە ئاشکرا و بەداهەت جوانیی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا خوای گەورەش جوانیی خۆی بە چەشنێك خۆش دەوێت کە شایستەی زاتی مەزنی ئەون و، بە هەمان جۆر ئەو ناوە جوانانەی خۆیشی خۆش دەوێت کە چەند تیشکێکی جوانی‌یەکەی خودی خواوەندن. خۆ مادەم ناوەکانی خۆی خۆش دەوێت، ئەوا ئەو سنعەتانەی خۆشی خۆش دەوێت کە ئەو ناوانەیان تێدا دەردەکەون..

هەروەها ئەو بەدیهاتووانەشی خۆش دەوێت کە ئاوێنەی جوانی و کەماڵی ئەون.

جا مادەم هەموو ئەو شتانەی خۆش دەوێت کە جوانی و کەماڵەکەی دەردەخەن، ئەوا ڕەفتارە جوانەکانی ئەو بەدیهاتووانەشی خۆش دەوێت کە ئاماژە بۆ جوانی و کەماڵی ناوەکانی دەکەن.

قورئانی پیرۆز لە ئایەتەکانی خۆی‌دا ئاماژەی بۆ ئەم پێنج جۆرە خۆشەویستی‌یە کردووە.

پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ کە کامڵترین تاك و دیارترین کەسێتیی نێوان بەدیهاتووانی خوای گەورەیە و.. بە زیکر و تەسبیح و تەهلیلێکی سەرنج ڕاکێش سنعەتی خوای گەورە ڕادەگەیەنێت و ڕێزی لێ دەگرێت و.. بە زمانی قورئان و بە چەشنێکی ڕوون و درەخشان ئەو ئایەتە گەردوونی‌یانەی ڕوون کردووەتەوە کە بەڵگەن

لەسەر کەماڵی بەدیهێنەریان و.. بە بەندایەتی‌یە هەمەکی‌یەکەی خۆیشی ئەرکی ئاوێنەی ئەنجام داوە بۆ پەروەردگاریێتیی خوای گەورە، بە ڕادەیەك کە بەهۆی جامیعییەتی ماهییەتەکەیەوە بەهرەمەندی تەواوترین درەوشانەوەی سەرجەمی ناوە جوانەکان بووە..

ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە بەم جۆرەیە، ئەوا بێ گومان:

خواوەندی خاوەن جوانی و شکۆمەند، لەبەر خۆشویستنی جوانیی خۆی، ئەو محەممەدەشی ﷺ خۆش دەوێت کە کامڵترینی ئاوێنەی خاوەن هەست و شعووری ئەو جوانی‌یەیە..

هەروەها لەبەر خۆشویستنی ناوە جوانەکانی، ئەو محەممەدەشی ﷺ خۆش دەوێت کە خاوێنترین ئاوێنەیە کە ئەو ناوە جوانانەی تێدا دەردەکەوێت و، ئەوانەشی خۆش دەوێت کە - هەریەکەیان بەپێی پلەی خۆی - چاو لە حەزرەتی محەممەدﷺ دەکەن و شوێن سوننەتی دەکەون..

هەروەها لەبەر خۆشویستنی سنعەتی خۆی، ئەو محەممەدەشی ﷺ خۆش دەوێت کە لە سەرانسەری گەردووندا ئەو سنعەتەی خواوەندی ڕاگەیاندووە کە گەردوونی خستووەتە مەستی و شەوقێکی ئەوتۆ گوێی ئاسمانەکانی پێ بزرنگێتەوە و وشکایی و دەریاش بۆ شەوق و تاسەی ئەو بورووژێن و، هەموو ئەوانەشی خۆش دەوێت کە شوێن پێی هەڵدەگرن..

هەروەها خوای گەورە لەبەر خۆشویستنی بەدیهاتووانی، حەزرەتی محەممەدیشی ﷺ خۆش دەوێت. چونکە هەر ئەو باشترین کەسی گرۆی ئادەمیزادە، کە کامڵترین خاوەن هەست و شعوورەکانن، کە ئەوانیش کامڵترینی زیندەوەرانن، کە ئەوانیش کامڵترینی بەدیهاتووانی ئەو خواوەندەن..

هەروەها لەبەر خۆشویستنی ڕەفتاری جوانی بەدیهاتووانی، حەزرەتی محەممەدیشی ﷺ خۆش دەوێت. چونکە دۆست و دوژمن یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەم پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ لەسەر لوتکەی ڕەفتار و ڕەوشتە جوان و پەسەندەکاندایە. هەروەها ئەو کەسانەشی خۆش دەوێ کە - هەر یەکە و بەپێی پلەی خۆی - لەو ڕەوشتە جوانانەدا چاو لەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ دەکەن.

واتە هەروەك میهرەبانیی خواوەند دەورانەوری گەردوونی داوە، خۆشەویستی‌یەکەشی، بە هەمان شێوەیە، سەرجەمی گەردوونی لە ئامێز گرتووە. لەبەر

ئەوە، بەرزترین پلەی نێوان ئەو پێنج ڕووە باسکراوانەی خۆش ویستراوە لەژمارە بەدەرەکان، پلە و مەقامێکە کە بە تایبەتی بۆ حەزرەتی محەممەدﷺ تەرخان کراوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ناوی "حبیب الله"ی خەڵات کراوە!

جا "سلێمان ئەفەندی"یش بە دەستەواژەی: "من عاشقی تۆم" ئەم مەقامە بەرز و بڵندەی "مەحبووبییەت"ی دەربڕیوە. دەبێ بیشزانین کە ئەم چەشنە دەستەواژە و تەعبیرانە تەنها دووربینێکە بۆ تێفکرین و، ئاماژەیەکە بۆ ئەم حەقیقەتە لە دوورەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی ئەم تەعبیرە واتایەکی ئەوتۆ بە وەهمی ئەندێشەی مرۆڤدا دەهێنێت کە شایستەی شان و شکۆی پەروەردگاریتیی مەزنی خواوەند نەبێت، ئەوا باشتر وایە بوترێت: "من لێت ڕازیم"!

**سەرنجی سێهەم:**

ئەو گفتوگۆیانەی کە لە "قەسیدەی میعراج"دا هاتوون، گەلێ دەستەوسانن لەوەدا کە بتوانن بە واتا زانراوە بەکارهاتووەکانی ئێمە حەقیقەتە خاوێنەکانی "میعراج" دەربڕن. بۆیە ئەو گفتوگۆیانە تەنها بریتین لە چەند ناونیشانێك بۆ تێرامان و سەرنجدان و، دووربینی تێفکرین و، چەند ئاماژەیەك بۆ ڕاستییە بەرز و قووڵەکان و، بێدارکردنەوەیەکی خەڵکی بۆ بەشێکی حەقیقەتەکانی ئیمان. هەروەك "کینایە"شن لە هەندێ واتای ئەوتۆ کە ناتوانرێت بە "ڕاشکاوی" تەعبیر بکرێن..

دەنا چەشنی گفتوگۆ و ڕووداوەکانی بەسەرهات و چیرۆکەکان نین هەتا بە واتا زانراوە بەکارهاتووەکانی خۆمان دەربخرێن، چونکە هەرگیز ناتوانین بە "ئەندێشە"کانی خۆمان ئیلهامی واتاکانی ئەو ڕاستییانە بەدەست بهێنین کە لەو گفتوگۆیانەدان، بەڵکو تەنها لە ڕێی "دڵەکان"مانەوە دەتوانین ئیلهامی چێژێکی ئیمانیی وورووژێنەر و لەزەتێکی ڕۆحانی و ڕووناکیان لێ بەدەست بهێنین. چونکە هەروەك خوای گەورە لە زات و سیفاتیدا هاوچەشنی نییە، بە هەمان جۆر لە کاروبارەکانی پەروەردگاریتیشیدا هیچ شتێك نییە هاووێنەی بێت و لەو بچێت. ئنجا هەروەك سیفەتەکانی لە سیفەتی بەدیهاتووانی ناچێت، بە هەمان جۆر خۆشەویستییەکەشی لە خۆشەویستیی ئەوان ناچێت!

ئەم چەشنە تەعبیرانەی کە لە "قەسیدەی میعراج"دا بەکارهاتوون، بە تەعبیرە "موتەشابیهەکان" دادەنرێن. لەبەر ئەوە، دەڵێین:

خـوای گـەورە چـەند کاروبـارێکی هـەن کـە وەك خۆشەویسـتیـیەکەی شـایانی "پێویستیی بوون" و "قودسییەت"ی ئەون و لەگەڵ دەوڵەمەندیی زاتـی و کـەماڵی ڕەهـای خۆیدا گونجاون. واتە قەسیدەی ناوبراو لە ڕێی بەسەرهاتەکانی میعراجەوە خەڵکی لـەو کاروبارانە ئاگادار دەکاتەوە.

وتەی سی و یەکەم کە تایبەتە بە میعراجی پێغەمبەرەوە ﷺ حەقیقەتەکانی میعراجی لـە ناوەندی بناغەکانی ئیماندا ڕوون کردووەتەوە. بۆیە لێرەدا بە کورتی لێی دواین.

**سەرنجی چوارەم:**

**پرسیار:**

دەستەواژەی: (پێغەمبەر ﷺ لە پشت حەفتا هەزار پەردەوە پەروەردگاری خۆی بینی) دووریی شوێن دەردەبڕێت. کەچی خـوای گـەورە خاوێنـە لـە جێ و شـوێن و بـۆ هـەموو شتێك نزیکترە لە هەموو شتێك. کەواتە مەبەست لەم دەستەواژەیە چییە؟

**وەڵام:**

وتەی سی و یەکەم بە دوور و درێژی و تێر و تەسەلی و بەڵگەهێنانەوە ئەو حەقیقەتەیان ڕوون کردووەتەوە. بەڵام لێرەدا هەر هێندە دەڵێین کە:

خوای گەورە تابلێی لێمانەوە نزیکە، کەچی ئێمە تابلێی دوورین لێیەوە.

بۆ نموونە: "خۆر" لە ڕێی ئاوێنەکەی ناو دەستمانەوە تابلێی نزیکە لێمانەوە، تەنانەت هـەموو شتێکی ڕوون و بریسکەدار جۆرە عـەرش و مەنزڵگایـەکی خۆرە. خـۆ ئەگـەر "خۆر" خاوەن هەست و شعوور بوایە، ئەوا لە ڕێی ئاوێنەکەی ناو دەستمانەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردین، لە کاتێکدا کە ئێمە چوار هەزار ساڵ لێیەوە دوورین!

بێ تەشبیهـ و تەمسیل، خۆری ئەزەلیش - ولله المثـل الأعلـى - بـۆ هـەموو شـتێك لـە هەموو شتێکی تر نزیکترە، چونکە: واجب الوجـود و، خاوێنـە لـە جێ و شـوێن و، هیـچ شتێك نابێت بە پەردە بۆی. کەچی هەرچی شت هەیە بە چەشنێکی ڕەها دوورە لێیەوە.

لـەم ڕێیـەوە لـە نـهێنیی ئـەو مـاوە یـەکجار دوور و درێـژەی میعـراج تێدەگـەین، لـە کاتێکدا کە هیچ ماوەیەك لە نێواندا نییە بەپێی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ (ق:١٦).

هەروەها ڕۆیشتن و هاتنەوە و بڕینی ماوە درێژخایەنەکان - لە یەك کـاتدا - لـە لایـەن پێغەمبەرەوە ﷺ لەم نهێنییەوە سەرچاوە دەگرێت.

كەواتە "میعراج" بریتییە لە سەیر و سلووك و ناونیشانی ویلایەتی پێغەمبەر ﷺ. چونكە هەروەك ئەولیاكان لە ڕێی سەیر و سلووكی ڕۆحییەوە بە ماوەی چل ڕۆژ تا چل ساڵ بە سەركەوتنێكی مەعنەوی بە پلە ئیمانییەكاندا تا پلەی "حق الیقین" سەر دەكەون، پێغەمبەریش ﷺ كە پادشا و سەروەری سەرجەمی ئەولیاكانە نەك تەنها هەر بە دڵ و ڕۆح بەڵكو هاودەم لەگەڵ ئەوانەشدا بە جەستە و هەست و نەست و گشت لایەنە ناسك و نیانەكانیەوە، بەرەو ژوور سەركەوت و بەمەش ڕاستەڕێ و شەقامێكی گەورەی لێ دا هەتا گەیشتە بەرزترین پلەكانی ڕاستییەكانی ئیمان و ئەم ڕێیەشی ناو نا "میعراج" كە بریتییە لە كەرامەتی ویلایەتی كوبرای ئەو لە چل دەقیقەدا، لە بریی چل ساڵ. ئیتر بە پلیكانەی میعراجدا سەركەوت و لە مەقامی: "قاب قوسین أو أدنى" بە "عین الیقین" گرنگترین ڕاستییەكانی ئیمانی بینی، كە بریتین لە: ئیمان بە خوا و ڕۆژی دوایی. هەروەك ڕۆشتە ناو بەهەشتەوە و بە چاوی خۆی بەختەوەریی هەمیشەیی بینی و، ئنجا دەرگای شاڕێگا مەزنەكەی بە كراوەیی هێشتەوە تاكو سەرجەم ئەولیای نەتەوەكەی بە سەیر و سلووكی ڕۆحانی، واتە بە ڕۆشتنێكی ڕۆحانی و قەلبی، لە ژێر سایەی ئەو میعراجەدا و هەر یەكەیان بەپێی پلەی خۆی، بەو ڕێگایەدا بڕۆن.

**سەرنجی پێنجەم:**

خوێندنەوەی مەولوودنامەی پێغەمبەر ﷺ و قەسیدەی میعراج، عادەتێكی ئیسلامیی جوان و گەلێ سوودبەخشە، تەنانەت مایەی پێكەوە دانیشتن و هاودەمییەكی ناسك و خاوێنە لە ژیانی كۆمەڵایەتیی موسڵماناندا. هەروەك دەرس و وانەیەكە لەوپەڕی تام و لەزەت و خۆشیدا بۆ یادخستنەوەی ڕاستییەكانی ئیمان و، بەهێزترین هۆكاری كاریگەر و وروژێنەرە بۆ: دەرخستنی نوورەكانی ئیمان و بزواندنی خۆشەویستیی خوا و عیشقی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی موسڵماناندا.

لە خوا داوا دەكەین ئەم عادەتە تا ئەبەد بە بەردەوامی بهێڵێتەوە و سۆز و بەزەیی خۆیشی بەسەر بەڕێز "سلێمان ئەفەندی" و نووسەرەكانی هاوچەشنیدا بڕێژێت و بەهەشتی فیردەوس بكات بە شوێنی حەوانەوەیان. ئامین.

# كۆتايی

مادەم بەدیهێنەری ئەم گەردوونە لەناو هەموو "جۆر"ێكی بوونەوەراندا یەك دانەی نایاب و كامڵ و گشتی هەڵدەبژێرێت و دەیكات بە مایەی شانازی و كەماڵی ئەو "جۆر"ە، ئەوا بێ گومان ئەو بەدیهێنەرە سەبارەت بە سەرجەمی بوونەوەران و لە ڕێی دەركەوتن و درەوشانەوەی ئیسمی ئەعزەمی نێوان ناوە جوانەكانی خۆیدا، دانەیەكی نایاب و كامڵ هەڵدەبژێرێت و لە نێوان بەدیهاتووانیدا دەیكات بە دانەیەكی یەكجار كامڵ، بە وێنەی ئیسمی ئەعزەم لە ناوەندی ناوە جوانەكانیدا و، ئیتر هەرچی كەماڵاتی پەرش و بڵاوی خۆی هەیە لەناو بوونەوەراندا، لەو دانە هەرە كاملەدا كۆ دەكاتەوە و دەیكات بە شوێنی تێڕوانینی خۆی.

بێ گومان دەبێ ئەو دانە هەڵبژاردەیە لە نێوان زیندەوەراندا بێت، چونكە كاملترینی جۆرەكانی بوونەوەر: زیندەوەرانن. هەروەها دەبێ لە نێوان خاوەن هەست و نەستەكاندا بێت، چونكە كاملترینی جۆرەكانی زیندەوەران خاوەن هەست و شعورەكانن. هەروەها دەبێ ئەو دانە هەڵبژاردە و ناوازەیە لە گرۆی مرۆڤ بێت، چونكە هەر تەنها مرۆڤە شایستەیی لێهاتنی بەرزبوونەوەی بێ سنووری پێ دراوە. بێ هیچ گومانێك ئەو دانە مرۆڤە هەڵبژاردەیە هەر تەنها حەزرەتی محەممەدی ئەمین ﷺ دەبێت، چونكە لە سەرتاسەری مێژووی مرۆڤدا و تا ئێستا و لەمەولاش كەسێك نەهاتووە و نایەت لەو بچێت، چونكە ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ نیوەی گۆی زەوی و پێنجیەكی گرۆی مرۆڤی لە ناوەندی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتە مەعنەوییەكەی خۆیدا و بە كەماڵی سام و شكۆ و مەزنیی ئەو دەسەڵاتەی، كۆكردەوە كە هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵی خایاند و، لە هەموو حەقیقەتەكاندا بوو بە مامۆستای سەرجەم ئەهلی كەماڵ و، بە یەكگرتن و هاودەنگیی دۆست و دوژمن بەرزترین پلەكانی ڕەوشت و ڕەفتارە جوانەكانی بەدەست هێنا و، هەر لە سەرەتای بانگەوازەكەیەوە بە تەنها خۆی تەحەددای سەرانسەری جیهانی كرد و ئەو قورئانە پیرۆزەی ئاشكرا كرد و ڕایگەیاند كە لە هەموو خولەكێكدا زیاتر لە سەد ملیۆن كەس دەیخوێننەوە!

بێ گومان پێغەمبەرێکی خۆشەویست و بەڕێزی وەك ئەم پێغەمبەرەیە ﷺ کە دەبێت بەو دانە بێ وێنە و هەڵبژاردەیە، نەك کەسی تر. کەواتە هەر ئەوە کە ناوك و بەری درەختی ئەم جیهانەیە.

عليه وعلى آله وصحبه الصلاة والسلام بعدد أنواع الكائنات و موجوداتــها.

ئەوەش بزانە کە گوێ ڕاگرتن لە مەولوود و میعراجی پێغەمبەر ﷺ واتە: گوێ بیست بوون لە باسی سەرەتا و کۆتایی بەرزبوونەوەکەی.. بە واتایەکی تر: زانینی مێژووی ژیانی مەعنەویی ئەو: تابلێی بەلەزەت و نوورانی و مایەی فەخر و شانازی و سەربڵندیە بۆ نەتەوەکەی و، گفتوگۆ و هاودەمییەکی بڵند و بەرزە بۆ ئەو ئیماندارانەی کە ئەویان کردووە بە سەرۆك و سەردار و پێشەوا و شەفاعەتکاری خۆیان.

دەسا ئەی پەروەردگار!

لەبەر ڕێز و حورمەتی حەبیبی ئەکرەم ﷺ و ئیسمی ئەعزەم: دڵ و دەروونی بڵاوکەرەوەکانی ئەم پەیامانە و هاوڕێیانیان بکە بە مەزهەرێك بۆ نوورەکانی ئیمان و، قەڵەمەکانیشیان بکە بە بڵاوکەرەوەی نهێنییەکانی قورئان و، بیانخەرە سەر ڕێی ڕاست. ئامین. ئامین.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنتَ العليمُ الْحكيم﴾.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# مەکتووبی بیست و پێنجەم

دانەنراوە

# مەکتووبی بیست و شەشەم

## ئەم مەکتووبی بیست و شەشەمە لە چوار باسی ئەوتۆ پێکهاتووە کە پەیوەندییەکی سادەیان لە نێواندایە

## باسی یەکەم
### بەڵگەی قورئان بۆ دەمکوت‌کردنی شەیتان و حیزبەکەی

ئەم باسی یەکەمەی کە ئیبلیس دەبەستێتەوە و، شەیتانیش دەمکوت و ئەهلی توغیانیش بێدەنگ دەکات، ئەنجامی ڕووداوێکی واقیعی و بەرپەرچدانەوەی فڕوفێڵێکی سامناکی شەیتانە کە لە نێوان "داوەرییەکی ژیریی بێ لایەن"دا هێنایە پێش. ئەو ڕووداوەش دە ساڵ پێش ئێستا بە پوختی لە کتێبی "چەند بریسکانەوەیەك"دا[1] نووسراوە. وا ئێستا - وەك خۆی - دەیگێڕمەوە.

یازدە ساڵ پێش دانانی ئەم پەیامە و لە "مزگەوتی بایەزید"ی ئەستەمبووڵدا گوێم لە چەند "حافظ"ێکی بەڕێز ڕاگرتبوو کە لە ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا قورئانیان دەخوێند. ئا لەم کاتەدا وام هەست کرد کە وەك بڵێی دەنگێکی مەعنەوی - بێ ئەوەی خودی زاتەکەی ببینم - سەرنجی زەینی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. منیش کە بە ئەندێشە گوێم لێ ڕاگرت، بۆم دەرکەوت کە دەڵێت:

- تۆ پێت وایە "قورئان" گەلێ بەرز و درەخشانە. ئەی ئایا بۆچی بە "ڕوانینێکی بێ لایەن" بۆی ناڕوانیت و، بە تەرازووی داوەرییەکی ژیریی بێ لایەنانە هەڵی

---

(١) پەیامێکی بەنرخە، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە بەرگی سێهەمی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا بڵاوی دەکەینەوە. (وەرگێڕ).

ناسەنگێنیت. واتە وا دابنێ کە قورئان گوفتاری مرۆڤێك بێت و ئنجا دوای ئەم گریمانە سەیری بکە و بزانە ئایا ئەو تایبەتکاری و جوانی‌یانەی تێدا دەبینیت؟!

لە ڕاستی‌دا بەم قسەیە خەڵەتام و لە گۆشەی ئەو گریمانەی کە گوفتاری مرۆڤ بێت، ڕوانیمە قورئان. یەکسەر هەستم کرد لە ناوەندی تاریکایی‌یەکی چڕوپڕدام! چونکە لەگەڵ دانانی ئەو گریمانەدا سەرجەم ڕووناکی‌یە درەخشانەکانی قورئان کوژانەوە و "تاریکایی" هەموو لایەکی گرتەوە، بە وێنەی ئەو تاریکی‌یەی کە سەرتاسەری مزگەوتەکە دەگرێتەوە گەر کەسێك سویچی کارەباکەی بکوژێنێتەوە.

ئیتر زانیم ئەوەی لەگەڵ مندا دەدوێت شەیتانە و، دەیەوێت بمخاتە شیوێکی قووڵەوە. بۆیە یەکسەر دەستم بە خودی قورئانی پیرۆزەوە گرت و، کتوپڕ خوای گەورە نوورێکی ئەوتۆی هاویشتە دڵمەوە کە بتوانم بەهۆیەوە بەهێز ببمەوە و بەرگریی بکەم. ئیتر بەم جۆرەی خوارەوە مونازەرە و گفتوگۆکەم لەگەڵ شەیتاندا دەستی پێ کرد:

پێم وت:

– ئەی شەیتان! داوەریی بێ لایەنانە بریتی‌یە لەوەی کە پشتی هیچ کام لەو دوو لایەنە نەگیرێت و شوێنێکی مامناوەندی لە نێوانیاندا بگیرێتە بەر. بەڵام ئەو داوەری‌یە بێ لایەنەی کە تۆ و قوتابی‌یەکانت لەناو گرۆی ئادەمی‌دا خەڵکی بۆ لا بانگ دەکەن، "بێ لایەن" نی‌یە، بەڵکو لایەنگرتنی لایەنی پێچەوانەیە و دەرچوونێکی کاتی‌یە لە "ئایین". چونکە ڕوانین بۆ قورئان لە گۆشەی ئەو گریمانەوە کە گوفتاری مرۆڤ بێت و ئنجا داوەریی ژیری لە ژێر سایەی ئەم گریمانەدا، لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لەوەی کە لایەنگرتنی "لایەنی بەرامبەر" بکرێت بە بناغە و، پشتگیری‌کردنی "ناحەق"یش بکرێت بە بنەمای ئەو داوەری‌یە. خۆ ئەمەش لە ڕاستی‌دا کارێکی بێ لایەنانە نی‌یە. بەڵکو لایەنگرتن و پشتگیریی ناڕەوا و ناحەقی‌یە!

شەیتان وتی:

– باشە، وا دابنێ گوفتارێکی مامناوەندی‌یە و، نە بڵێ: گوفتاری خوایە و نە بیشڵێ: گوفتاری مرۆڤە!

وتم:

– ئەمەش هەرگیز ناگونجێ! چونکە گەر بێت و ماڵ و سامانێك کێشە و قڕەی لەسەر دروست بوو بێت و هەردوو داواکارەکەش شوێنیان لە یەکتری‌یەوە نزیك بێت، ئەوا ماڵ و سامانەکە لای کەسێکی تری غەیری خۆیان یاخود لە جێ‌یەکدا دادەنرێت کە

دەستی هەردوو کیانی پێ بگات. جا هەر کامیان بە بەڵگە ئەوی تری بەستەوە و داواکەی خۆی چەسپاند، ئەوا ماڵ و سامانەکە بۆ خۆی هەڵدەگرێت..

بەڵام گەر ئەو دوو داواکارە لە ڕادەبەدەر لە یەکترەوە دوور بوون، وەك ئەوەی یەکێکیان لە خۆرهەڵات و ئەوی تریان لە خۆرئاوادا بێت، ئەوا لەو کاتەدا - بەپێی دەستوورێکی زانراو - سەروەت و ماڵەکە لای خاوەن دەستەڵاتەکەیان دادەنرێت، چونکە لەو چەشنە حاڵەتەدا ناتوانرێت لە شوێنێکدا دابنرێت کە بکەوێتە نێوان هەردوو کیانەوە.

هەر بەم جۆرەش "قورئانی پیرۆز" کەرەسەیەکی بەنرخ و ماڵ و سامانێکی بەرز و بڵندی خوای گەورەیە و، دووریی نێوان هەردوو لا دووریی‌یەکی ڕەهای بێ سنوورە، چونکە بریتی‌یە لە دووریی نێوان گوفتاری "رب العالمین" و گوفتاری "مرۆڤ". هەر لەبەر ئەوەیە کە ناگونجێ ئەو ماڵ و سامانە لە نێوان هەردوو لادا دابنرێت. چونکە هەر بە هیچ جۆرێ "نێوان" لە گۆڕێدا نی‌یە، لەبەر ئەوەی کە ئەو دوولایە وەك "وجوود" و "عەدەم" وان کە ناوەندێك نی‌یە بکەوێتە نێوانیانەوە..

لەبەر ئەوە، خاوەن دەست لە مەسەلەی قورئاندا لایەنی "خوای گەورە"یە. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبێ مەسەلەکە بەم جۆرە وەربگیرێت و بەڵگەش بەو پێ‌یە بهێنرێتەوە کە لە دەستی خواوەنددایە، مەگەر لایەنی بەرامبەر بتوانێت هەموو ئەو بەڵگانە یەك لە دوای یەك پووچەڵ بکاتەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن قورئانی پیرۆز گوفتاری خوایە و، تەنها ئەو کاتە دەتوانێت دەستی بۆ درێژ بکات، دەنا ئەو مافەی نی‌یە.

خۆ ئەمەش لە توانای هەموو کەسێکی غەیری خواوەندەوە دوورە، چونکە ئایا کێ دەتوانێت ئەو گەوهەرە بەنرخە لە جێی خۆی‌دا بجوولێنێت کە بە هەزاران چەسپێنەری چەشنی بەڵگە سەرکوت کەرەکان بە عەرشی ئەعزەمەوە داکوتراوە؟.. یان ئایا کێ پڕ کێشی دەکات بەڵگەکانی ئەو ستوونە ڕاگیر و دامەزراوانە برووخێنێت تا بتوانێت ئەو گەوهەرە بەنرخە لەو عەرشە بەرز و بڵندەوە بخاتە خوارێ؟

دەسا ئەی شەیتان! کاتێ ئەهلی حەق و ئینساف شتان هەڵدەسەنگێنن، ئەوا - بە کوێرایی چاوی تۆ - بەم چەشنە داوەری‌یە ژیری‌یە ڕاست و دروستە دادوەریی دەکەن و هەڵی‌دەسەنگێنن، تەنانەت بە بچووکترین بەڵگەش ئیمانیان بە قورئان زیاد دەکات.

بەڵام ئەو ڕێ‌یەی کە تۆ و قوتابیانت پیشانی خەڵکیی دەدەن، واتە گەر وا گریمان بکرێت - با بۆ یەك جاریش بێت - کە قورئان گوفتاری مرۆڤ بێت، واتە گەر ئەو گەوهەرە مەزنەی کە بە عەرشەوە چەسپاوە، بکەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئەوا دەبێ

بەڵگەیەكی هێندە بەهێز و مەزن بەدەستەوە بێت كـە لـە سـەرووی هـەموو ئـەو بەڵگانـەوە بێت و لـە هەموو شیان فراوانتر بێت تاكو بتوانێت قورئان لە زەوی‌یەوە بەرز بكاتەوە و لـە عەرشی مەزنـدا چـەسپی بكـات و، مرۆڤ هـەر تەنـها بەمـە دەتوانێـت لـە تاریكسـتان و وەهـم و گومانی كوفر ڕزگاری ببێت و بگاتە نووری ئیمان. ئەمەش گەلـێ سـەختە و بـە دەگمەن مرۆڤ لەم زەمانـەدا سـەركەوتوو دەبێـت لـە بەدەسـتهێنانی‌دا. هـەر بـەهۆی ئـەم فێڵەشتەوەیە كـە نـاوی "داوەریی ژێـری بێ لایەنانـە"ی لـێ نـراوە، كەسـانێكی زۆر لـەم سەردەمەدا ئیمانەكەیان لە دەست دەدەن.

شەیتان ڕاپەڕی و وتی:

– ڕەوتـی گوفتـاری قورئـان لـە گوفتـاری مـرۆڤ دەچێـت، ئـەوەتا لـە شـێوازی گفتوگۆی مرۆڤدا گفتوگۆكانی خۆی ڕایی دەكات. كەواتـە گوفتـاری مرۆڤـە! چونكـە گەر گوفتاری خوا بوایە، ئەوا لە هەموو لایەكیەوە و بە چەشنێ كە شایسـتەی خـوا بێـت دەراسا(خارق للعادة) دەبوو و، لە گوفتاری مـرۆڤ نـەدەچوو، وەك ئـەوەی كـە سـنعەتی خوا لە سنعەتی مرۆڤ ناچێت!

لە وەڵامدا وتم:

– پێغەمبەری مەزنمان ﷺ جگە لە موعجیزات و كارە تایبەتكاری‌یەكانی خـۆی، دەنـا لە سەرجەمی كردار و ڕەفتار و قۆناغەكانی ژیـانی‌دا هـەر لەسـەر هەڵسـوكەوتی مرۆڤانـە بەردەوام بووە و وەك هـەر مرۆڤێكـی تـر گـوێ ڕایـەڵ و ملكـەچی یاسـاكانی خـواوەنـد و فەرمانە تەكوینی‌یەكانی بووە. ئەوەبوو وەك خەڵكی گرفتاری سەرما و ئـازار دەبـوو. بـەم جۆرە لـە هـەموو حاڵـەت و قۆناغـەكانی ژیـانی‌دا كـاری دەراسـای پـێ نەبەخشـراوە و سەرتاسەری ژیانی موعجیزات نەبووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی كە بە كردارەكـانی ببێـت بـە پێشـەنگی نەتـەوە و، بـە قۆناغـەكانی ژیانیشی ببێـت بە ڕابـەریان و، بە هەڵسـوكەوت و جموجوولەكانیشی ببێت بـە هیدایـەتدەر و ڕێ پیشـاندەری سـەرجەمی خـەڵكی. چونكـە گـەر لـە هـەموو هەڵسـوكەوتێكی ژیـانی‌دا كـردار و ڕەفتارەكـانی موعجـیزەی دەراسـا بوونایە، ئەوا بۆی نەدەڕخسا كە بە زاتی خۆی ببێـت بـە پێشـەوا و پێشـەنگی سـەرجەمی خەڵكی لـە هـەموو كـار و بارەكـانی ژیانیـاندا و، نـەدەبوو بـە ڕابـەری هـەموو خـەڵكی و "رحـــمة للعالمین" لە هەموو حاڵەت و بارودۆخەكانی ژیانی‌دا.

جـا هـەروەك ئەمـە سـەبارەت بـە پێغەمبـەرەوە ﷺ وایـە، سـەبارەت بـە قورئـانی حەكیمیشەوە بـە هـەمان جۆرە. چونكـە قورئـانی پیرۆز: پێشـەوای خـاوەن هەسـتان و..

رابەری جیننی و ئینسان و.. ڕێ پیشاندەری کاملان و.. مامۆستای ڕاستیخوازانە. کەواتە زەرووڕەت داخوازی ئەوەیە کە لەسەر ڕەوت و شێوازی گوفتاری مرۆڤ بێت، چونکە ئادەمیزاد و جیننی ئیلهامی نزا و موناجاتەکانی خۆیانی لێ وەردەگرن و دوعا و پاڕانەوەکانیانی لێ فێر دەبن و، داواکارییەکانیان بە زمانی قورئان داوا دەکەن و، داب و ڕەفتاری هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتریدا لەو وەردەگرن و فێری دەبن. بەم جۆرە، هەموو ئیمانداریك قورئانی پیرۆز دەکات بە مەرجەع و پێشەوای خۆی.

خۆ ئەگەر قورئانی پیرۆز لەو جۆرە گوفتارەی خواوەند بوایە کە حەزرەتی مووسا — درودی لەسەر بێت — لەسەر "کێوی طـــوور" بیستی، ئەوا مرۆڤ نەیدەتوانی بیبیستێ و بەرگەی گوێ لێگرتنی بگرێت و نەیشی دەتوانی بیکات بە مەرجەعی خۆی لە سەرجەمی کاروبارەکانیدا. ئەوەبوو حەزرەتی مووسا - درودی لەسەر بێت - کە یەکێکە لە پێغەمبەرانی ئولولعەزم، نەیتوانی گوێبیستی ئەو گوفتارەی خواوەند بێت و فەرمووی: "أهكذا كلامك"؟ خواوەندیش فەرمووی: "لي قوة جميع الألسنة"[(١)].

بەڵام شەیتان گەڕایەوە و وتی:

- گەلێ خەڵك هەن کە چەندین مەسەلە و بابەتی ئایینیی ئەوتۆ باس دەکەن کە لەوانەی ناو قورئان دەچن، ئیتر ئایا ناگونجێ مرۆڤێك بتوانێت بە ناوی ئایینەوە شتێکی هاووێنەی قورئان بهێنێت؟

منیش پشتم بە ڕێژنەی قورئانی پیرۆز بەست و، وتم:

**یەکەم:**

مرۆڤی خاوەن ئایین هەمیشە "حەق" ڕوون دەکاتەوە و بە هاندەری خۆشویستنی ئایین دەڵێت: "حەق وا دەڵێت.. حەقیقەت بەم جۆرەیە.. فەرمانی خوا بەم شێوەیە".. ئیتر هەرگیز بەپێی ئارەزووی خۆی ناچێت بەدەم خواوە قسە بکات، یان سنووری خۆی - بە چەشنێ کە لە توانایدا نییە - ناشکێنێت بەوەی کە لافی ئەوە لێ بدات بەناوی خواوە و لە بریی ئەو قسە بکات و لاسایی گوفتارەکانی بکاتەوە. بەڵکو لە بەردەم ئەم دەستوورە خوایییەدا لەرزەی بە جەستەدا دێت کە دەفەرموێت:

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ كَذَبَ عَلَى اللهِ﴾ (الزمر:٣٢).

---

(١) عن جابر رضي الله عنه قال، قال رسول الله ﷺ: "لما كلم الله موسى يوم طور كلمه بغير الكلام الـذي كلمه يوم ناداه، فقال له موسى: يارب أهذا كلامك الذي كلمتني به؟ قال: يا موسى إنما كلمتك بقوة عشرة آلاف لسان، ولي قوة الألسن كلها وأقوى من ذلك" (انظر: الدر المنثور للسيوطي ٣/٥٣٦).

**دووهەم:**

هەرگیزاو هەرگیز ناگونجێ کەسێك بۆ ئەم کارە ڕابپەڕێت و پاشان سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنێت، بەڵکو سەد و یەك مەحاڵ لەم کارە دەبینێتەوە. چونکە دەگونجێ کەسانێك کە لە یەکتری‌یەوە نزیك بن چاولێکەریی یەکتر بکەن، تەنانەت دەگونجێ هەندێ جار ئەو کەسانەی لە یەك ڕەگەز و چیندان یەکێکیان کەسایەتیی ئەوی تر بپۆشێت و بە جۆرێکی کاتی خەڵکی بخڵافێنن و بە هەڵەیاندا ببەن. بەڵام هیچ کامیان ناتوانن بە چەشنێکی بەردەوام بیانخەڵەتێنن و بە هەڵەیاندا بەن، چونکە بێ گومان مەودای ڕەفتاری دەستکرد و تەصەنوع لە کردار و ڕەفتارەکانی‌دا بۆ کەسانی زانا و شارەزا دەردەکەوێت و، بێ هیچ گومانێك ڕۆژێك دەبێت کە درۆکەی ئاشکرا ببێت و هەرگیز فێڵەکەی تا سەر بڕ ناکات. خۆ ئەگەر ئەو کەسەی کە دەیەوێت لاسایی یەکێکی تر بکاتەوە کە یەکجار دوور بێت لێیەوە، وەك ئەوەی کەسێکی ئاسایی بیەوێت لە زانستدا لاسایی "ئیبن سینا" بکاتەوە، یان شوانێك بیەوێت خۆی بە وێنەی پادشایەك لەناو مولکەکەی‌دا دەربخات، ئەوا هەرگیز ناتوانێت تەنانەت یەك کەسیش بخەڵەتێنێت، بەڵکو دەبێ بە مایەی سووکایەتی و گاڵتە و نەفرەتی خەڵکی، چونکە ئەو کاتە هەموو حاڵ و ڕەفتارێکی دەم دەکاتەوە و بە دەنگی بەرز هاوار دەکات: ئەمە فێڵ و تەڵەکەیە!

جا هەروەك مەحاڵە مێشوولەی "گوڵەستێرە" بۆ ماوەی هەزار ساڵ و بێ ئەوەی هیچ تەکەللوفێکی پێوە دیاربێت لە شێوەی ئەستێرەیەکی ڕاستەقینەدا بۆ کەسانی ئەهلی ڕەصەد و گەردووناسان دەربکەوێ.. هەروەها وەك مەحاڵە "مێش" ماوەی هەزار ساڵ، بێ ڕەفتاری دەستکرد، لە بەرچاوی بینەراندا لە دیمەنی تاووسدا پێش‌چاو بکەوێت.. هەروەك مەحاڵە "سەرباز"ێکی ئاسایی ماوەیەکی درێژخایەن خۆی بە پۆشاکی "موشیر"ێکی سوپا پیشان بدات و شوێن و مەقامەکەی ئەو بگرێت، بێ ئەوەی کەس بتوانێت فێڵەکەی ئاشکرا بکات.. هەروەها وەك مەحاڵە درۆزنێکی قسە هەڵبەستی بێ ئیمان بە درێژایی ژیانی - بێ هیچ دوودڵی و شڵەژانێك - لە بەرچاوی کەسانی پشکنیار و وردەکاردا لە شێوەی ڕاستگۆترین و ئیماندارترین و دامەزراوترین کەسی خاوەن بڕوادا دەربکەوێت و ئەم تەسەنوع و هەڵوێستە دەستکردانەی لە بەرچاوی کەسانی زیرەك و وریا و بلیمەتدا بشارێتەوە..

هەروەك هەموو یەکێ لەم نموونانە بە سەدان جار مەحاڵن و هەرگیز ناگونجێ کەسێك خاوەنی تۆزقاڵێك ژیری بێت باوەڕیان پێ بکات و بیانسەلمێنێت، بەڵکو بە وڕێنە و شێتی‌یان لەقەڵەم دەدات.. بە هەمان جۆر گریمانی ئەوەش کە - پەنا بەخوا و هەزاران جار حاشا وا نی‌یە - قورئانی پیرۆز گوفتاری مرۆڤ بێت، سەدەها مەحاڵی وا دەهێنێتە گۆڕێ. چونکە ئەم گریمانە داخوازی ئەوە دەبێت کە:

ماهییەتی "کیتابی موبین" کە ئەستێرەی پرشنگداری حەقیقەتە، بەڵکو خۆری درەخشانی کەمالاتە، کە وەك لە بەرچاودایە هەمیشە تیشکی نوورەکانی حەقیقەت لە ئاسمانی جیهانی ئیسلامدا پەخش دەکات.. ئەو گریمانە داخوازی ئەوە دەبێ کە ئەو نوورە درەخشانە تروسکایی‌یەکی کزی ئەوتۆ بێت کە مرۆڤێکی ریاکاری خاوەن ڕەفتاری دەستکرد هەڵی گرتبێت و لە لایەن خۆیەوە - کە هەزاران جار حاشا وا نی‌یە - بە ئەفسانە و خورافات دایبڕێژێت و، ئەو کەسانەش کە لێیەوە نزیکن و لە حاڵەت و ڕەفتارەکانی ورد دەبنەوە بەمەی نەزانن، بەڵکو بە ئەستێرەیەکی بەرز و سەرچاوەیەکی بە خوڕەم و بەپیتی حەقیقەتەکانی ببینن!

خۆ ئەمەش سەدان مەحاڵی لێ دەبێتەوە، سەرباری ئەوەی کە ئەگەر تۆی شەیتان چەندین ئەوەندەی ئێستات لە چەپەڵی و فڕوفێڵەکانتدا پێ ڕابکێشیت هەر هێشتا ناتوانیت ئەم "مەحاڵ"ە بکەیت بە "مومکین" و هەرگیزاو هەرگیز ناشتوانیت ژیری‌یەکی ساغ قەناعەت پێ بکەیت، بەڵام دەچیت خەڵکی لە خشتە دەبەیت و شتانیان لە دوورەوە پیشان دەدەیت و ئەستێرەی درەخشانیان لە بەرچاودا بە بچووکی و چەشنی مێشوولەی گوڵەستێرە بەرچاو دەخەیت!

**سێهەم:**

گریمان کردنی ئەوەی کە قورئانی پیرۆز گوفتاری مرۆڤ بێت، داخوازی ئەوە دەبێت کە: نهێنی و حەقیقەتەکانی ئەم قورئانە حەکیمەی کە چەندین تایبەتکاریی بەرز و بڵندی هەیە و.. خاوەن ئیعجازی بەیانە و.. هەموو تەڕ و وشکێکی لە خۆدا کۆکردووەتەوە و.. وەك لە بەرچاودایە چەندین ئاسەواری مەزن و درەوشانەوەی ڕوونـاك و کاریگەریی خاوێن و ئەنجامی بەنرخی لە جیهانی مرۆڤـایەتی‌دا دەرخستووە و.. گیان بە بەر گرۆی مرۆڤدا دەکات و ژیانی تێدا دەبووژێنێتەوە و دەیگەیەنێتە بەختەوەریی هەمیشەیی..

ئەو گریمانە داخوازی ئەوە دەبێت کە ئەم قورئانە حەکیمە و سەرجەم ڕاستی‌یە مەزن و شکۆمەندەکانی: دەستکرد و دەمهەڵبەستی مرۆڤێکی نەزان و بێ پشت و پەنا بێت و، ئەو کەسە وریا و زیرەکانەش کە لێیەوە نزیکن و بە وردی و چاوی پشکنینەوە دەڕواننە سەرجەم حاڵەتەکانی، هیچ نیشانەیەکی فێڵ و ساختەی تێدا نەبینن، بەڵکو هەمیشە ئیخلاس و دامەزراوی و جیددیەتی پێوە ببینن. خۆ ئەمەش سەد لە سەد مەحاڵە!

ئەمە جگە لەوەی کە ئەو کەسەی لە ڕەفتار و گوفتار و جموجووڵەکانی سەرتاسەری ژیانیدا: ئەمانەت و ئیمان و ئەمینی و ئیخلاس و ڕاستی و ئیستیقامەتی دەرخستووە و خەڵکییشی بۆ ئەمانە ڕێنمایی کردووە و صیددیقانیشی لەسەر ئەم سیفەتە بەرز و ڕەوشتە جوانانە پەروەردە کردووە.. دەبێ - بەپێی ئەو گریمانە - ئەم ڕاستی‌یانە ئاوەژوو بنەوە و کەسێك بێت جێی متمانە و باوەڕ نەبێت و ئیخلاس شك نەبات و هەڵگری هیچ بیروباوەڕێك نەبێت. خۆ ئەمەش لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لەوەی کە مەحاڵ بە حەقیقەتێکی واقیع ببینرێت!

ئەمەش - لە ڕاستی‌دا - کوفرە وڕێنەیەکی ئەوتۆیە کە تەنانەت شەیتان خۆیشی شەرمی پێ دێت! چونکە مەسەلەکە گریمانی مامناوەندیی تێدا نی‌یە، ئەوەتا گەر بە فەرزی مەحاڵ قورئانی پیرۆز گوفتاری خواوەند نەبێت، ئەوا لە عەرشی ئەعزەمەوە دەکەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و لە ناوەڕاستدا ناگیرسێتەوە. ئیتر ئەو قورئانەی کە کۆگای حەقیقەتە خاوێن و ڕوونەکانە، دەبێت بە سەرچاوەی ئەفسانە و خورافات. هەروەها گەر خوانەخواستە ئەو کەسەی کە ئەم فەرمانە پەروەردگاری و نەمرەی ڕاگەیاندووە، بەپێی ئەم فەرزە مەحاڵە، فرستادە و پێغەمبەری خوای گەورە نەبێت، دەبێ لە لوتکەی پلەی "أعلی علیین"ەوە بەرەو نزمترینی پلەکانی "أسفل سافلین" بەربێتەوە و لە پلەی سەرچاوەی کەماڵات و ڕەفتارە بەرزەکانەوە دابەزێتە ئاستی کانگای فروفێڵەکان و لە ناوەڕاستدا نەگیرسێتەوە، چونکە کەسێك درۆ بەدەم خوای گەورەوە هەڵببەستێ دەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو نزمترینی پلەکان.

جا چەندە مەحاڵە بە بەردەوامی "مێش" لە بەرچاودا بە "تاووس" دەربکەوێت و وەسفە بەرزەکانی تاووس لەو مێشەدا ببینرێن، ئەم مەسەلەیەش بە هەمان جۆر مەحاڵە و، تەنانەت ئەو مەستەش کە ژیریی لەدەست داوە تەنیا گریمانێکیشی بۆ دانانێت.

**چوارەم:**

گریمانی ئەوەی کە قورئانی پیرۆز گوفتاری مرۆڤ بێت، داخوازی ئەوە دەبێت قورئان کە: پێشەوای موقەددەس و ڕووناکیی ڕێپیشاندەری نەتەوەی حەزرەتی محەممەدە

ﷺ - کە نەتەوەیەکە گەورەترین کۆمەڵ و سوپای نەوەی ئادەم دەنوێنن - ئەو قورئانەی کە لە ڕێی یاسا توندوتۆڵ و دەستوورە ڕەگداکوتاوەکانی و فەرمانە جێبەجێ بووەکانیەوە دەتوانێت هەردوو جیهان بەو سوپا مەزنە بگرێت و دنیا و قیامەت فەتح بکات بەو ڕێسایەی کە بۆ مەبەستی ئاسانکردنی حاڵەت و ڕێکخستنی کاروبارەکانیان پێی بەخشیون و، بەو چەك و کەرەسە ماددی و مەعنەوی‌یانەش کە ئەوانی پێ پڕچەك کردووە و ژیریی یەك بە یەکی ئەوانی - هەر کەسە و بەپێی پلەی خۆی - فێری زانست کردووە و دڵی ئەوانیشی پەروەردە و گیانیشیانی ملکەچ و ویژدانیشیانی خاوێن کردووەتەوە و ئەندامەکانی ئەوانیشی، وەك لە بەرچاودایە، خستووەتە کار.. دەبێ بەپێی ئەو گریمانە ئەو قورئانەی کە بەم جۆرەیە: گوفتارێکی دەمهەڵبەستی بێ هێز و بێ بناغە بێت و هیچ گرنگی‌یەکی تێدا نەبێت، پەنا بەخوا کە هەرگیز وا نی‌یە. واتە دەبێ بە قبووڵ کردنی ئەم گریمانە سەدان مەحاڵ قبووڵ بکرێت!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کەسەی ژیانی خۆی بە ملکەچی بۆ یاساکانی خواوەند بەسەر بردووە و لە ماوەی ئەو ژیانەی‌دا خەڵکی بۆ لای ئەو یاسایانە ڕێنمایی کردووە و.. بە گوفتارە خۆش و خاوێنەکانی، کە هەر هەموویان پەسەندکراوی ژیرین، بناغە و دەستوورەکانی ئیستیقامەت و ڕێی بەختەوەریی پیشانی خەڵکی داوە و.. لە هەموویشیان زیاتر لە خوای گەورە ترساوە و زیاتریش ناسیویەتی و بە شایەتیی ژیانە خاوێن و پرشنگدارەکەی لە هەموو گرۆی مرۆڤ زیاتر خوای بەوان ناساندووە، بە ڕادەیەك کە بە درێژایی هەزار و سێ سەد و پەنجا ساڵ پێشەوا و پێشڕەوی نەتەوەکەی بووە و پێنج یەکی گرۆی مرۆڤ و نیوەی گۆی زەوی لەو ماوەیەدا لە ژێر ئاڵاکەی‌دا جەم بوون، تا ئەو ڕادەیەی کە سەرانسەری جیهانی هەژاندووە و، بە ڕاستی بووە بە مایەی فەخر و شانازیی نەك تەنها ئادەمیزاد بەڵکو هەموو جیهانەکان..

جا بەپێی ئەم گریمانانە، دەبێ ئەو کەسە - پەنا بەخوا - خوای گەورە نەناسێت و لە ئازارەکانیشی نەترسێت و لە ئاستی مرۆڤێکی ئاسایی‌دا بێت. واتە دەبێ ئەو کاتە مەحاڵی سەد لە سەد ڕوو بدات. چونکە ئەم کێشەیە شوێنی ناوەڕاست و مامناوەندیی تێدا نی‌یە. ئەوەتا گەر قورئانی پیرۆز گوفتاری خواوەند نەبێت و لە عەرشی ئەعزەمەوە بکەوێتە خوارەوە، ئەوا لەو ناوەندەدا ناگیرسێتەوە، بەڵکو ئەو کاتە دەبێ بە کەرەسەی یەکێك لە درۆزنانی سەر ڕووی زەوی!

کەواتە گەر فڕوفێڵەکانی تۆی شەیتان سەد ئەوەندەش دووچەندانە ببنەوە، هێشتا هەر ناتوانیت بەم گریمانە قەناعەت بە کەسێکی ساغی ئەوتۆ بکەیت کە خاوەنی ژیریەکی خاوێنی نەڕزیو یان دڵێکی پاکی نەگەنیو بێت.

شەیتان ڕاپەڕی و وتی:

- چۆن ناتوانم لە خشتەیان ببەم؟! ئەوەتا زۆر کەسم بە تایبەت لە ژیر و بەناوبانگەکان بەرەو ئینکاریی قورئان و پێغەمبەرێتیی محەممەد داوەتە بەر!

وەڵام:

یەکەم: گەر لە شوێنێکی دوورەوە سەیری گەورەترین شت بکرێت، وەك شتێکی یەکجار بچووك دەردەکەوێت. تەنانەت ئەو کەسەی تەماشای ئەستێرەیەك دەکات دەتوانێت بڵێت: ڕووناکییەکەی وەك هی مۆم وایە.

دووهەم: ڕوانینی تەبەعی(شوێنکەوتەیی) و سەرپێیی: شتی "مەحاڵ" بە "مومکین" دەبینێت. دەگێڕنەوە کە پیرێکی بەتەمەن بۆ بینینی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان سەیری ئاسمانی کردووە و لەو کاتەشدا تاڵە موویەکی سپی و کەوانەیی لە برۆیەوە بەسەر چاویدا شۆڕ بووەتەوە و بە گومانی خۆی پێی وا بووە مانگی یەکشەوەیە و وتوویەتی: "هیلا لم بینی.. هیلا لم بینی"!

خۆ مەحاڵە ئەو تاڵە موەە هیلال بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی نیازی ڕاستەوخۆی لەو ڕوانینەدا بینینی هیلال بووە و لەو دەمەشدا تاڵە مووەکەی بەرچاو کەوتووە، ئەوا بە شێوەیەکی تەبەعی، بە هیلالی زانیوە و ئەو مەحاڵەی وەك مومکینێك وەرگرتووە!

سێهەم: "ئینکاری کردن" شتێکە و "قبووڵ نەکردن" و ڕەفزکردنیش شتێکی ترە. چونکە قبووڵ نەکردن: گوێ پێنەدان و چاونووقاندنە لە ئاستی حەقیقەتەکاندا و نەفی کردنێکە بە نەزانی و، هەرگیزاو هەرگیز بە حوکم و بڕیار دانانرێت. هەر بەمەش دەگونجێ گەلێ مەحاڵ لە ژێر ئەم پەردەیەدا خۆی بشارێتەوە، چونکە ژیریی خۆی بەو شتانەوە سەرقاڵ ناکات.

بەڵام ئینکاری کردن هەرگیز بە قبووڵ نەکردن دانانرێت، بەڵکو قبووڵ کردنی نەبوونە و، حوکم و بڕیارە. بۆیە خاوەنەکەی ناچاری بەگەڕخستنی بیر و ژیریی خۆی دەبێت.

جا بەم پێیە، دەگونجێ شەیتانێکی وەك تۆ لە پێشدا ژیریی لێ بسێنێتەوە و پاشان بە ئینکاری کردن بیخەڵەتێنێت. پاشان تۆی شەیتان هەموو ئەو ئاژەڵە بەدبەختانەت

خەڵەتاندووە کە لە شێوە و ڕوخساری مرۆڤدان و، بە: گومڕایی و، بێئاگایی و چاوبەست و، سەرسەختی و، بەهەڵەدابردن و، ملنەدان و، خلافاندن و، چاولێکەری و، فێڵەکانی تری وەك ئەمانە، کە ناحەق بە حەق و مەحاڵ بە مومکین پیشان دەدەن، ڕێی ئەو کوفر و ئینکاریەت بۆ خۆش و ئاسان کردوون کە گەلێ مەحاڵی زۆریان لێ دەبێتەوە.

*چوارەم:* گریمان کردنی ئەوەی قورئانی پیرۆز گوفتاری مرۆڤ بێت، داخوازی ئەوەیە کە تەسەووری کتێبێك بکرێت کە - وەك لە بەرچاودایە - ڕێنمایی ئەو مرۆڤە ئەصفیا و صیددیق و قوتبانە بکات کە بە وێنەی ئەستێرە لە ئاسمانی مرۆڤایەتیدا درەخشانن و.. بە ئاشکرا و بەداهەتیش: حەق و ڕاستی و ئیستیقامەت و ئاسایش و ئەمینی فێری هەموو ئەهلی کەماڵ بکات و.. بە ڕاستیەکانی پایەکانی ئیمان و دەستوورەکان و پایەکانی ئیسلامیش بەختەوەریی هەردوو دنیا بهێنێتەدی و.. کتێبی حەقی ڕوون و حەقیقەتی ئاشکرا بێت و خودی ئەو گوفتارە ڕاستە بێت کە هەرگیز لە هیچ لایەکیەوە - نە لە بەردەم و نە لە پشتەوەی - ناحەق توخنی ناکەوێت.. ئەو گریمانە داخوازی ئەوە دەبێت کە ئەم کتێبە بە پێچەوانەی کاریگەری و ڕووناکی و وەسفەکانی خۆی تەسەوور بکرێت. واتە: داخوازی ئەوە دەبێت کە بە دەمهەڵبەستی کەسێکی خەڵەتێنەری فێڵباز - خوا پەنامان بدات و حاشا هەرگیز شتی وا نییە - تەسەوور بکرێت. خۆ ئەمەش مەحاڵێکی هێندە دژوارە کە تەنانەت سۆفستائییەکان و شەیتانەکان خۆشیان پێیان شەرمە ئیددیعای بکەن، چونکە کوفرە وڕێنەیەکی ئەوتۆیە کە تەزوو بە جەستەدا دەهێنێت.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو گریمانە داخوازی ئەوە دەبێت کە: ئەو کەسەی بە شایەتیی شەریعەتە خاوێنەکەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنای و، بە بەڵگەی ئەو بەندایەتییە بێگەرد و تەقوا بێ وێنەیەش کە بە یەکدەنگیی هەموو لایەك لێی بینراوە و، بە خواستی ئەو ڕەوشتە بەرزانەی شایەتیی دۆست و دوژمن لە سەریان یەکی گرتووە و، بە تەسدیقی ئەوانەش کە پێی گەیاندن لە زانایان و لێکۆڵەران و ئەهلی حەقیقەت و کەماڵ: خاوەنی دامەزراوترین باوەڕ و، پتەوترین ئیمان و، ڕاستگۆترین گوفتار و، ئیماندارترین دڵ بووە.. ئەو گریمانە داخوازی ئەوە دەبێ کە ئەو کەسە: مرۆڤێکی هێندە بێ بڕوا بێت کە

بڕوا و متمانەی پێ نەکرێت و - پەنا بە خوا - لە خوا نەترسێت. خۆ ئەمەش چەپەڵترین مەحاڵی بێز لێکراوە و گومڕاییەکە تابڵێی لە ستەم و تاریکیدا ڕۆچووە.

* * *

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

وەك لە ئاماژەی هەژدەهەمی "مەکتووبی نۆزدەهەم"دا وتراوە:

کەسێك کە لە بواری ئیعجازی قورئاندا جگە لە "بیستن" هیچی تر شك نابات، وتوویەتی: گەر قورئان لەگەڵ سەرجەمی ئەو کتێبانەی بیستوومن بەراورد بکرێت، هەست دەکەین کە لە یەك ناچن و قورئان لە ئاستی ئەو کتێبانەدا نییە، جا یان ئەوەیە قورئان لە ئاستێکی خوار هەموو ئەو کتێبانەوەیە، یان لە سەرووی هەموویانەوەیە! سەبارەت بە کەرتی یەکەمەوە ئەوا سەرباری ئەوەی کە گریمانێکی مەحاڵە، هیچ دوژمنێکیش تەنانەت شەیتان خۆیشی ناتوانێت گوفتاری وای لە زار دەربچێت. کەواتە قورئان لە هەموو ئەو کتێبانە بەرز و بڵندترە. واتە: موعجیزەیە.

هەر بە وێنەی ئەمە، ئێمەش لێرەدا پشت بە بەڵگەیەکی گومانبڕی زانستی ئوسووڵ و زانستی مەنتیق دەبەستین کە پێی دەوترێت: "السبر والتقسيم"[(١)] و دەڵێین:

ئەی شەیتان!

ئەی قوتابییانی شەیتان!

"قورئانی پیرۆز" یان ئەوەیە گوفتاری خواوەندە و لە عەرشی ئەعزەمەوە هاتووە.. یان - کە حاشا هەرگیز وا نییە - گوفتاری دەمهەڵبەستی کەسێکە خوا ناناسێت و لێی ناترسێت و باوەڕی پێی نییە. خۆ تۆ ناتوانیت ئەمەیان بڵێیت، بگرە بەپێی بەڵگە گومانبڕەکانی پێشوو هەرگیز ناتوانیت گوفتاری وات لە زار دەربچێت. کەواتە بە زەرووڕەت و بەداهەت و بێ هیچ گومانێك قورئانی پیرۆز گوفتاری خواوەندی "رب العالمين"ە. چونکە هیچ گریمانێکی ماناوەندی لە مەسەلەکەدا نییە و وەك بە چەشنێکی گومانبڕ چەسپاندمان و خۆیشت بینیت و بیستت کە گریمانی وا مەحاڵە و هەرگیز ناگونجێ ڕوو بدات.

---

(١) سەبر و تەقسیم: بریتییە لە: دەستنیشانکردنی ئەو وەسفانەی کە گومان دەبرێت عیللەتی "حوکم"ێك بن، پاشان پووچەڵکردنەوەی یەك بە یەکی ئەو وەسفانەیە کە بۆ ئەو مەبەستە دەست نادەن، تا لە ئەنجامدا ئەو یەکەیان دەمێنێتەوە کە دەست دەدات و ئیتر ئەو وەسفەیان بە عیللەتی حوکمەکە دادەنرێت. (وەرگێڕ)

هەروەها حەزرەتی محەممەدیش ﷺ یان پێغەمبەری خوا و سەروەری پێغەمبەران و باشترین کەسی نێوان سەرجەمی بەدیهاتووانە.. یان دەبێ گریمانی ئەوە بکرێت - کە حاشا هەرگیز وا نییە - مرۆڤێکی خوانەناسی ئەوتۆ بێت کە باوەڕی بە خوا و سزای خوا نەبێت و درۆی بە دەمەوە هەڵببەستێت و، بەمەش دەکەوێتە خوارەوە بۆ "أسفل سافلین"(١).

خۆ نە تۆی ئیبلیس و نە ئەوانەش کە پێیان دەنازیت لە فەیلەسووفەکانی ئەورووپا و مونافیقانی ئاسیا ناتوانن شتی واتان لە زار دەربچێت، چونکە تەنانەت یەك کەسیش نییە لە جیهاندا کە ئەم گوفتارەت لێ ببیستێت و پاشان باوەڕت پێ بکات.

لەبەر ئەمە، بێ کەڵکترین فەیلەسووف و خاوەنی گەنیوترین ویژدان لەو مونافیقانە - تێکرا - دان بەوەدا دەنێن کە حەزرەتی محەممەد ﷺ لە ژیریدا بەرز و بێ وێنە و لە ڕەوشتیشدا نموونەی ڕەوشت بەرزی بووە.

جا مادەم ئەم مەسەلەیە تەنها لە نێوان دوو گریماندایە و کەرتی دووهەمیشیان هێندە مەحاڵە کە هیچ کەسێك ئیدیعای ناکات و، وەك بە چەندین بەڵگەی گومانبڕیش چەسپاندمان کە ئەم مەسەلەیە گریمانی مامناوەندیی نێوان ئەو دوانە هەڵناگرێت، ئەوا بە کوێرایی چاوی تۆی شەیتان و حیزبەکەشتەوە، بە زەروورەت و بەداهەت و بە "حق الیقین" دەچەسپێت کە حەزرەتی محەممەد ﷺ فرستادەی خواوەند و سەرداری پێغەمبەران و مایەی فەخر و شانازیی جیهانەکان و باشترینی سەرجەمی بوونەوەرانە.

علیه الصلاة والسلام بعدد الملك والإنس والجان.

* * *

(١) ناچار بووم بە فەرزی مەحاڵ ئەم تەعبیرانە بەکار بهێنم و لە هەمان کاتدا تەزووشم بە جەستەدا دەهات. ئەمەش بۆ ئەوەی مەحاڵێتیی بیرە کوفرییەکانی گومڕایان دەربخەم و بە یەکجارەکی بێ کەڵکیی ئەو بیرە ڕوون بکەمەوە. لەمەشدا پشتم بە خودی قورئانی پیرۆز بەستووە کە کوفری کافران و دەستەواژە نابەجێ و بێزلێکراوەکانی ئەوانی بۆ مەبەستی پووچەڵکردنەوەیان، باس کردووە. (دانەر)

## (دووهەم ئیعتیرازی بچووك و بێنرخی شەیتان)

﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلاّ لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ۞ وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ ۞ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ ۞ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ ۞ لَقَدْ كُنْتَ فِي غَفْلَةٍ مِنْ هذا فَكَشَفْنَا عَنْكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ ۞ وَقَالَ قَرِينُهُ هذا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ۞ أَلْقِيا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ (ق:١٨-٢٤).

کاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی سوورەتی (ق)م دەخوێندەوە، شەیتان وتی:

ئێوە ڕەوانی و ڕوونیی قورئان بە گرنگترین پایەی فەساحەت و زمانپاراویەکەی دادەنێن، کەچی گواستنەوە و بازدانەکانی نێوان ئەم ئایەتانە گەلێ لە یەکەوە دوورن. دەبینیت یەکسەر لەو ئایەتەوە کە سەرەمەرگ باس دەکات، دەڕوات بۆ باسی قیامەت و نەفخی صوور و کۆتایی لێپرسینەوە و لەوێشەوە بۆ خستنە ناو دۆزەخ..

جا ئایا ئیتر لە ناوەندی ئەم گواستنەوە سەیر و سەرسووڕهێنەرانەدا جێی ڕەوانی(السلاسة) دەبێتەوە؟ خۆ لە زۆربەی باسەکانی قورئاندا ئەم کۆمەڵە مەسەلە و بابەتە لە یەکتر دوورانە دەبینین، ئیتر کامەیە جێی ڕەوانی و ڕوونی لەمەدا؟

**وەڵام:**

گرنگترینی بناغەی ئیعجازی قورئانی خاوەن بەیان – دوای ڕەوانبێژیەکە لەڕادە بەدەرەکەی – بریتییە لە "ئیجاز" (واتە: باسکردنی بابەتەکانی بە پوختی و کورتبڕی). کەواتە "ئیجاز" گرنگترین و بەهێزترین بناغەکانی ئیعجازی قورئانە. جا ئەم "ئیجاز"ە خاوەن ئیعجازەی قورئانی پیرۆز هەروەك ناسك و نیانە، بە هەمان جۆر زۆر و زەبەندەشە و زانایان و وردەکارانی گرفتاری سەرسامی کردووە.

بۆ نموونە:

﴿وَقِيلَ يا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (هود:٤٤).

ئەم ئایەتە پیرۆزە: لە چەند کورتە ڕستەیەکدا بەسەرهات و ئەنجامەکانی تۆفانە مەزنەکە بە ئیجازێکی هێندە ئیعجازبەخش ڕوون دەکاتەوە کە تەنانەت گەلێ کەسی "ڕەوانگۆ"ی بەرەو سوژدەبردن بۆ جوانیی ڕەوانبێژیی ئەم ئایەتە، داوەتە بەر.

هەروەها ئەم ئایەتانە:

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا ۞ إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا ۞ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ نَاقَةَ اللهِ وَسُقْيَاهَا ۞ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا ۞ وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾(الشمس:١١-١٥).

بە ڕوونکردنەوەیەکی ئیعجازبەخش و لە ئیجازێکی ڕەوان و ڕووندا و بە چەند ڕستەیەکی کورت، سەرجەمی ئەو ڕووداوە سەرسووڕهێنەرانەی ڕوون کردووەتەوە کە بەسەر قەومی سەموودا هاتووە و دوا ئەنجامیان دەردەخات، بێ ئەوەی زیان بە تێگەیشتنی خوێنەر بگەیەنێت.

نموونەیەکی تر ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِباً فَظَنَّ أَن لَن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ (الأنبياء:٨٧).

لە نێوان فەرموودەی خوای گەورەدا: ﴿أَن لَن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ تا دەگاتە ڕستەی: ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ﴾ گەلێ ڕستەی زۆر پێچراونەتەوە. جا ئەو ڕستە باس نەکراوانە هەرگیز تێگەیشتنی مرۆڤ ناشێوێنن و زیان لە ڕەوانیی ئایەتەکە نادەن، چونکە ئایەتە پیرۆزەکە ڕووداوە گرنگەکانی ژیانی حەزرەتی یوونس - دروودی لەسەر بێت - باس دەکات و، پاشماوەکەی حەوالەی ژیری دەکات و بە عەقڵی مرۆڤی دەسپێرێت.

هەروەها لە "سوورەتی یووسف"یش و لە نێوان وشەی: ﴿فَأَرْسِلُونِ﴾ و ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ﴾دا نزیکەی هەشت ڕستە پێچراوەتەوە، بێ ئەوەی زیان بە واتا بگەیەنێت، یان ڕەوانیی ئایەتەکە تێك بدات.

نموونەی ئەم چەشنە "ئیجاز"ە ئیعجاز بەخشە لە قورئانی پیرۆزدا گەلێ زۆرە، هەروەك لە هەمان کاتیشدا گەلێ ناسك و نیانە.

سەبارەت بەم ئایەتانەی سەرەتاش کە لە سوورەتی (ق)دان، ئەوا ئیجازەکەیان گەلێ سەرسووڕهێن و خاوەن ئیعجازە، چونکە ئاماژە بۆ پاشەڕۆژی یەکجار سامناك و دوور و درێژی کافران دەکات، کە تەنانەت ڕۆژێکی ئەو پاشەڕۆژە سامناکەی ئەوان هێندەی پەنجا هەزار ساڵە. بۆیە ئایەتەکە ئەو ئاڵوگۆڕ و ڕووداوە مەزنانەی ئەو ڕۆژانە باس دەکات کە دێنە ڕێی کافران لە پاشەڕۆژیاندا، بە ڕادەیەك کە بیری مرۆڤ بە خێراییەکی سەرسووڕهێنی بروسکە ئاسا بەسەر ئەو ڕووداوە سامناکانەدا دەگێڕێت و، ئەو کاتە درێژخایەنە لە بەردەم مرۆڤدا وەك لاپەڕەیەکی حازری و ئامادە پێش چاو دەخات و، پاشماوەی ڕووداوە باسنەکراوەکانیش بە ئەندێشەی مرۆڤ دەسپێرێت و، بەم کارەشی ئەو ڕووداوانە بە ڕەوانییەکی بەرز و بڵند ڕوون دەکاتەوە.

﴿وَإِذَا قُرِىءَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعراف:٢٠٤).

دەسا ئەی شەیتان چیت پێیە بیڵێ!

شەیتان دەڵێت:

– من ناتوانم بەرامبەر بەم بەڵگانە خۆم ڕابگرم و بەرگری لە خۆم بکەم. بەڵام گەلێ کەسی گەوج و گەلحۆ هەن کە گوێم لێ ڕادەگرن و، گەلێ شەیتانی ئینسیش هەن پشتم دەگرن و دەستی یارمەتیم بۆ درێژ دەکەن و، زۆربەی فەیلەسووفە لەخۆباییە فیرعەون ئاساکانیش ئەو دەرسانەم لەلا دەخوێنن کە ختووکەی غرووریان دەدات و پتر فووی تێدەکات!

بۆیە تەسلیم نابم و، چەکت بۆ دانانێم!

﴿سبحانَكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما عَلّمْتَنا إنّكَ أنتَ العَليمُ الحكيمُ﴾.

* * *

## باسی دووهەم

ئەم باسە لەسەر بناغەی سەرسام بوونی ئەو کەسانە نووسراوە کە هەمیشە خزمەتم دەکەن، چونکە سەرسامی ئەو جیاوازییە سەرسوورهێنەرەن کە لە ڕەفتارەکانمدا بەدیی دەکەن.. هەروەها بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو خۆش باوەڕییە زیاد لە پێویستە نووسرا کە من شایانی نیم و دوان لە قوتابییانم هەیانە بەرامبەرم.

دەبینم هەندێك لەو فەزڵ و چاکەکارییانەی کە هی ڕاستییەکانی قورئانن دەدرێنە پاڵ ئەو هۆکارانەی کە ڕۆڵی بانگەوازکار و دەلالی ئەو ڕاستییانە دەبینن. کەچی ئەم کارە کارێکی هەڵەیە. چونکە تەنها قودسییەت و بەرزیی سەرچاوەی ڕاستییەکانە کە زیاتر لە کاریگەریی بەڵگە زۆر و زەبەندەکان کاریگەری لە دڵدا بەجێ دەهێڵێت و، عەوامی خەڵکیش تەنها بەم قودسییەتەیە کە ملکەچی ئەحکامەکان دەبن. خۆ هەرکات دەلال و بانگەوازکار "بوون"ی خۆی - نەك ڕاستییەکان - پێش چاو خست، واتە لە بریی "ڕاستییەکان" سەرنجەکان ئاراستەی "ئەو" کران، ئەوا قودسییەتی سەرچاوەکە تیادەچێت و نامێنێت!

لەبەر ئەم نهێنییە، وا ئەم ڕاستییەی خوارەوە بۆ ئەو برایانەم ڕوون دەکەمەوە کە گەلێ زیاتر لە توانا و سنووری خۆم بۆم دەڕوانن و، دەڵێم:

مرۆڤ هەندێ جار چەند کەسایەتییەك لە خۆیدا هەڵدەگرێت و، هەر یەك لەم کەسایەتییانەش چەند ڕەفتارێکی جیاجیا و جۆراوجۆریان هەیە.

بۆ نموونە:

"کارمەندی گەورە" لە دەمی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی لە شوێن و ڕێی بەرز و پلە و پایەی فەرمانبەرییەکەیدا، کەسایەتییەکی تایبەتی هەیە. ئەم پلە و پایەیەش داخوازی "ویقار" و چەند ڕەفتارێکی وەهایە کە ڕێزی ڕێ و شوێن و عیززەتی پلە و پایەی بەرپرسیارییەکەی بۆ بپارێزێت. جا تەوازوع دەربڕین لێرەدا بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە سەردانی دەکەن زەلیلیی تێدایە و لە شان و شکۆی ئەو پلە و پایە بەرزە دەهێنێتە خوار..

بەڵام هەر ئەم مرۆڤە لەناو ماڵ و نێوان کەسوکاری خۆیدا کەسایەتییەکی تری ئەوتۆی هەیە کە داخوازی چەند ڕەفتارێکی پێچەوانەی هەڵسوکەوتەکانی دەمی

ئەنجامدانی کارمەندییەکەین، بە چەشنێ کە هەتا تەوازوعی زیاتر بنوێنێت جوانتر و باشترە و، گەر ویقاریش بنوێنێت بە "تەکەببور" لەسەری تۆمار دەکرێت!

واتە هەموو مرۆڤێك لە ڕووی بەرپرسیاری و کارمەندییەکەیەوە کەسایەتییەکی تایبەتیی ئەوتۆی هەیە کە لە چەند خاڵێکی زۆردا لە کەسایەتییە ڕاستەقینەکەی جیا دەبێتەوە. خۆ ئەگەر ئەو کارمەندە شایستە و هاوشانی فەرمانبەرییەکەی بێت و توانایەکی تەواوەتیی بۆ بەڕێوەبردنی کارەکەی تێدا بێت، ئەوا ئەو دوو کەسایەتییەی لە یەکتر نزیك دەبنەوە. بەڵام گەر شایانی فەرمانبەرییەکەی نەبێت و لە توانا و لێهاتنەکانیشیدا هەژار بێت، وەك ئەوەی خۆی لە خۆیدا "سەرباز" بێت و کەچی لە پلەوپایەی "موشیر"دا دانرابێت، ئەوا ئەو دوو کەسایەتییەی بەو ڕێژەیە لە یەکتر دوور دەکەونەوە. چونکە سیفەتە ئاساییەکانی سەرباز و هەست و نەستە ساکارەکانی هەرگیز لەگەڵ ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزانەدا ناگونجێن کە پلەوپایەی موشیر داخوازیان دەبێت.

هەر بەم چەشنە، ئەم برا هەژارەشتان سێ کەسایەتیی تێدایە کە زۆر لە یەکەوە دوورن، تەنانەت دوورییەکی یەکجار زۆریشیان لە نێواندایە:

**یەکەمیان:**

کەسایەتییەکی کاتی و بێگەرد و تایبەتە تەنها بە خزمەتی قورئانەوە، لەو ڕووەوە کە من دەلالی گەنجینە بەرز و بەنرخەکەی قورئانی حەکیمم. جا ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزانەی کە فەرمانبەریی دەلالی کردن بۆ قورئان و بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای قورئان داخوازی دەبن، هی من نین و من خاوەنیان نیم. بەڵکو چەند ڕەوشتێکی بەرزن کە ئەو پلەوپایە بەرز و کارمەندییە مەزنە داخوازی دەبن. کەواتە هەرچی ڕەوشتی بەرز و فەزائیلی لەم چەشنە دەبینن هیچیان هی من نین، بەڵکو تایبەتن بەو پلەوپایەیەوە. کەواتە لەو ڕوانگەیەوە بۆم مەڕوانن.

**کەسایەتیی دووهەم:**

کاتێ ڕوو دەکەمە دەرگانەی خواوەند و لێی دەلالێمەوە، خوای گەورە لە کاتەکانی پەرستش و بەندایەتیدا کەسایەتییەکی تایبەتیم پێ دەبەخشێت کە هەندێ ئاسەواری ئەوتۆ بەرهەم دەهێنێت لە بناغەی واتای "بەندایەتی"یەوە سەریان هەڵداوە. ئەم بناغەیەش بریتییە لەوەی مرۆڤ لە بەردەم خوای گەورەدا تەقسیرەکانی خۆی بزانێت و پەی بە هەژاری و دەستەوسانیی خۆی لە بەردەم خوای گەورەدا ببات و بە زەلیلی و

شکستەیی و نەوازشەوە پەنای بۆ بیات. جا من – بەم کەسایەتی‌یە – خۆم لە هەموو کەسێك بە دەستەوسانتر و بەدبەختتر و هەژارتر و تەقسیربارتر دەبینم لە بەردەم خوای گەورەدا. خۆ ئەگەر سەرانسەری دنیا کۆ ببنەوە و لەسەر مەدح و ستایشم یەك بگرن، هێشتا هەر ناتوانن قەناعەتم پێ بکەن کە من مرۆڤێکی باش و سالح بم.

**سێ‌هەمیان:**

کەسایەتی‌یە ڕاستەقینەکەی خۆمە. واتە ئەو کەسایەتی‌یەمە کە هەڵوەشاوەی سەعیدی کۆنە و چەند دەمارێکی میراتیی ئەوە بۆم ماوەتەوە. دەبینیت هەندێ جار حەز لە ڕیا و پلەوپایە دەکات و، چەند خوو و ڕەفتارێکی نزم لە مندا دەردەخات، هاودەم لەگەڵ "ڕژدی"م لە بواری دەستپێوەگرتندا، چونکە من لە بنەماڵەیەکی خاوەن حەسەب و پلەوپایە نیم.

دەسا برایانم!

لەمە زیاتر لە خراپکاری‌یەکان و لایەنە چەوتەکانی ئەم کەسایەتی‌یەم نادرکێنم، تاکو بە تەواوی لە خۆم دوورتان نەخەمەوە!

دەسا برا بەڕێزەکانم! من شایانی پلەوپایەی بەرز نیم و توانا و قابیلییەتی ئەو پلەوپایە بەرزە لە خۆمدا شك نابەم. کەواتە ئەم کەسایەتی‌یەی خۆم گەلێ دوورە لە ڕەفتار و ڕەوشتی ئەرکەکانی بانگەواز و شوێنەوارەکانی ئەرکی بەندایەتی.

خوای گەورە توانستە میهرەبانەکەی خۆی لە مندا بەپێی ئەو دەستوورە دەرخستووە کە دەڵێت:

**(داد حق را قابلیت شرط نیست).**

واتە: چاکە و بەخششی خواوەند توانا و قابیلییەت لەو کەسە بێ‌بەخشراوەدا بە مەرج ناگرێت. کەواتە تەنها چاکە و بەخششی خوای گەورەیە کە کەسایەتی‌یە یەکجار نزمەکەم – کە وەك سەربازێك وایە لە خزمەتی نهێنی‌یەکانی قورئاندا – گوێ ڕایەڵ و ملکەچ دەکات، کە لە حوکمی بەرزترینی پلەوپایەکانی موشیرێتی‌دایە.

کەواتە "نەفس" لە هەموان نزمترە و، کارمەندی‌یەکەش لە هەموو شتێك بەرز و بڵندترە.

دەسا سەدان هەزار شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە.

الحمد لله هذا من فضل ربـــي.

* * *

# باسی سێهەم

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

﴿يا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾(الحجرات:١٣)

واتە: ئێوەم بە چەند تیرە و هۆز و گەل و نەتەوەیەکی جیاجیا بەدی هێناوە، تاکو بە یەکتر ئاشنا بن و یەکتری بناسن و شارەزای پەیوەندیی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکانی نێوانتان بن. نەك بۆ ئەوەی هۆز و تیرەکانتان بکەن بە مایەی نەناسینی یەکتری و لە ئەنجامدا گرفتاری جەنگ و دژایەتی بن.

ئەم باسە حەوت مەسەلەی لەخۆ گرتووە.

**مەسەلەی یەکەم:**

ئەو حەقیقەتە بەرزەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیگەیەنێت، تایبەتە بە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە. بۆیە ناچار بووم بە نیازی خزمەتکردنی قورئانی مەزن و بە هیوای بنیاتنانی بەربەستێك لە بەردەم هێرشە ستەم و ناڕەواکاندا و بە زمانی "سەعیدی کۆن" کە پەیوەندیی بە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی‌یەوە هەیە، ئەم باسە بنووسم. نەك بە زمانی "سەعیدی نوێ" کە دەیەوێت دوورەپەرێزی لە ژیانی کۆمەڵایەتی بکات[1].

**مەسەلەی دووهەم:**

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دەستووری "یەکترناسین" و "هاوکاری"یەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەکات، دەڵێین:

"سوپا" بەسەر چەند لەشکر و هێز و لیوا و تیپ و سریە و لق و پەلێکدا دابەش دەبێت، تاکو هەموو سەربازێك بەپێی ئەو پەیوەندی‌یە جۆراوجۆرانە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بزانێت و، یەك بەیەکی ئەندامەکانی ئەو سوپایە لە ژێر سایەی دەستووری "هاوکاری"دا کارمەندی‌یەکی ڕاستەقینە ئەنجام بدات، تاکو ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان لە

---

(١) مەبەست ئەو کاروبارە کۆمەڵایەتی‌یانەیە کە پەیوەندی‌یان بە سیاسەتەوە هەیە. (وەرگێڕ)

هێرشی دوژمنان بپارێزێت، دەنا ئەم دابەشبوون و لێك جیاکردنەوەیەی جۆر و چەشنەکانی سوپا بۆ ئەوە نی‌یە کە مونافەسە لە نێوان دوو تیپدا بنێتەوە و دوژمنایەتیش بخاتە نێوان دوو سریە و، دژایەتی و ڕقەبەرایەتیش لە نێوان دوو هێزدا بەرپا بکات.

کۆمەڵگای ئیسلامییش کە وەك سوپای مەزن وایە، بە هەمان جۆرە. ئەوەتا بەسەر چەند تیرە و هۆزێکدا دابەش کراوە. لە کاتێکدا کە هەزار و یەك لایەن و ڕووی "یەکێتی" لە نێوانیاندا هەیە کە یەکیان دەخات. چونکە بەدیهێنەریان یەکێکە، ڕۆزیدەریان یەکێکە، پێغەمبەریان ﷺ یەکێکە، قیبلەیان یەکێکە، کتێبیان یەکێکە، نیشتمانیان یەکێکە... بەم جۆرە یەکێکە.. یەکێکە.. تا دەگاتە هەزاران لایەن و ڕووی "یەکێتی" کە هەر هەموویان داخوازی یەکبوون و برایەتی و خۆشەویستین. بەو واتایەی کە دابەشبوونی گرۆی ئادەمیزاد بەسەر چەند دەستە و تیرە و تاقمێکدا، وەك ئایەتە پیرۆزەکە ڕایگەیاندووە، تەنها بۆ مەبەستی "یەکترناسین" و "هاوکاری"یە، نەك بۆ نەناسین و دوژمنایەتی.

**مەسەلەی سێ‌هەم:**

بیری "نەتەوایەتی" لەم چەرخەدا بڵاو بووەتەوە و ڕەگی داکوتاوە. ستەمکارە فێڵبازەکانی ئەوروپاش بە تایبەتی ئەم بیرە لە شێوە "سەلبی"یەکەی‌دا لە نێوان موسڵماناندا دەنێنەوە، تاکو پارچە پارچەیان بکەن و ئنجا بتوانن بە ئاسانی قووتیان بدەن. جا لەبەرئەوەی بیری نەتەوایەتی چێژێکی تێدایە بۆ "دەروون" و لەزەتێکی ئەوتۆی لەخۆ گرتووە کە مرۆڤ بێ‌ئاگا دەکات و هێزێکی شوومیشی تێدایە، ئەوا ئێستا و لەم کاتەدا سەبارەت بەو کەسانەی کە بە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یەوە سەرگەرمن نابێ بوترێ: واز لە "نەتەوایەتی" بهێنن!

بەڵام "نەتەوایەتی"ش خۆی لە خۆی‌دا دوو بەشە:

بەشێکیان سەلبی و شووم و زیانبەخشە و، بە هەڵلووشینی نەتەوەکانی تر گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت و بە دوژمنایەتیشیان بەردەوامی بەدەست دەهێنێت و، بە حەزەر و مەترسی‌یەوە دەجووڵێتەوە و هەنگاو دەنێت، کە ئەمەش دژایەتی و کێشە لە نێوان گرۆی ئادەمیزاددا دەنێتەوە. بۆیە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە: "الإسلام يجبّ ما قبله"[(١)]. هەروەك دەست بە ڕووی دەمارگیریی جاهیلییەتیشەوە دەنێت.

(١) حديث: (الإسلام يجب ما قبله) رواه ابن سعد في طبقاته عن الزبير وجبير بن مطعم ورواه أحمد والطبراني عن عمرو بن العاص. بڕوانە: كشف الخفاء ١/١٤٠ الحديث (٣٦٣٦) هەروەها: تفسير ابن كثير ٢/٣٠٩، تحفة الأحوذي ٣/١٨٣. (وەرگێڕ)

قورئانی پیرۆزیش لەم ڕووەوە ئەو فەرمانەی داوە کە لەم ئایەتە پیرۆزەدایە:

﴿إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ فَأَنْزَلَ اللهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا وَكَانَ اللهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾ (الفتح:٢٦).

جا ئەم ئایەت و فەرمووده پیرۆزانە، بە توندوتیژی، ڕەفزی قەومییەتی سەلبی و بیری دەمارگیری دەکەن. چونکە غیرەتی موقەددەس و ئیجابیی "ئیسلامەتی" هیچ پێویستی‌یەك بەوانە ناهێڵێتەوە.

ئایا چ ڕەگەزێك لە جیهاندا هەیە کە ژمارەیان سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن کەس بێت و - لە بریی ئیسلام - بەم ژمارەیە "برا" بەڵکو "برای هەمیشەیی" بە بیری مرۆڤ ببەخشێت؟

لە درێژایی مێژوودا گەلێ زیانی زۆر لە قەومییەتی سەلبی‌یەوە سەری هەڵداوە، بۆ نموونە ئەمانەی خوارەوەیان لێ باس دەکەین:

کاتێ ئەمەوی‌یەکان هەندێك قەومییەتیان تێکەڵی سیاسەتەکەیان کرد، ڕق و تووڕەیی‌یان لە دڵی جیهانی ئیسلامی‌دا نایەوە. جگە لەو گیروگرفتە زۆرانەش کە لە ئەنجامی ئاشووبە ناوخۆیی‌یەکانەوە هاتە ڕێیان.

هەروەها کاتێ گەلانی ئەورووپا بانگەشەیان بۆ "دەمارگیری" کرد و لەم چەرخەدا بە تەواوی تیای‌دا ڕۆچوون، ئەو دوژمنایەتی‌یە مێژوویی‌یە پڕ لە کارەساتە ترسناکەی نێوان فەرەنسی و ئەڵمانی‌یەکان سەری هەڵدا.. هەروەك ئەو کاولکاری‌یە سامناکەش کە جەنگی جیهانیی لە گێتی‌دا نایەوە و بەرپای کرد، ڕادەی ئەو زیانە دەردەخات کە ئەم بیرە سەلبی‌یە گرۆی مرۆڤی پێوە دووچار دەکات.

حاڵی لای خۆشمان بە هەمان جۆر بوو، ئەوەبوو لە سەرەتای سەردەمی سەربەستی (واتە ڕاگەیاندنی دەستوور)دا چەند کۆمەڵێکی جۆراوجۆر لە ژێر ناوی چەندین "یانە"ی زۆر و زەبەندەدا بۆ پەناهێنەرەکان لە پێشەنگیانەوە "ڕۆم" و "ئەرمەن" دامەزران و، وەك چۆن بە ڕووخانی بورجی بابل نەتەوەکانی ژێر سایەی ئەو دەوڵەتە پەرتەوازە بوون و بڵاو بوونەوە، ئەوانیش بوون بەهۆی پارچە پارچەبوون و پەرتەوازەبوونی دڵەکان. تەنانەت هەندێکیان بوون بە پارووەکی ئامادەی ئەوتۆ کە بیانی‌یەکان قووتیان دان و، هەندێکی تریشیان هێندە گومڕا بوون کە بە تەواوی لە ڕێ ترازان.

هەموو ئەمانەی باس کران، ئەنجام و زیانەکانی "قەومییەتی سەلبی" ڕوون دەکەنەوە.

سەبارەت بە کاتی ئێستاشەوە ئەوا ڕقەبەرایەتی و لە یەك دووریی توخم و تیرەکانی ئیسلام - بەهۆی بیری "نەتەوایەتی"یەوە - زیانێکی مەزن و مایەی لەناوچوونێکی گەورەیە. چونکە لەم کاتەدا کە هەموو ئەوانە چەندین ستەمی زۆریان لێ کراوە و مافیان خوراوە و گرفتاری هەژارییەکی توندوتیژ کراون و بیانییەکان بە سەریاندا زاڵ بوون، کە هەموو ئەم هۆکارانەش پتر دەیانهاڕێت، لەم کاتەدا پێویستییەکی گەلێ زۆریان بە یەکتری هەیە. خۆ ئەگەر ئەوان لەم کاتەی ئێستادا - کە حاڵیان بەم جۆرەیە - بە چاوی دوژمنایەتییەوە بۆ یەکتر بڕوانن، ئەوا خۆیان دووچاری گێروگرفتێکی هێندە مەزن کردووە کە لە باسکردن نایەت، تەنانەت ئەم کارەیان شێتی و گێلییەکی چەشنی ڕەفتاری ئەو شێتە وایە کە حساب بۆ پێوەدانی مێشوولە دەکات و کەچی بایەخ بەو هەژدیها سەرسەختانە نادات کە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە!

بەڵێ، تەماعی ئەورووپا هەرگیز لە کار ناکەوێت و تێر نابێت، بەڵکو بە وێنەی هەژدیها زەبەلاحەکان وایە کە دەمیان کردووەتەوە بۆ ئەوەی هەرچییەکیان دێتە ڕێ هەڵی بلووشن. کەواتە گوێ نەدان بە فڕوفێڵەکانی ئەو ئەورووپاییانە و یارمەتی دانیان -لە ناوەرۆکدا- بە بڵاوکردنەوەی بیری "دەمارگیریی سەلبی" و گەشەدان بە گیانی "دوژمنایەتی" بەرامبەر هاونیشتمانیانی پارێزگاکانی خۆرهەڵات(کوردستان) یان برایانی ئاییینمان لە باشوور.. ئەم کارە، تیاچوون و زیانێکی ئەوتۆیە کە لە باسکردن نایەت..

چونکە کەسانی خەڵکی باشوور شایانی دوژمنایەتی کردنی ڕاستەقینە نین، بەڵکو لە باشوورەوە هیچ شتێکمان بۆ نەهاتووە جگە لە نووری قورئان و ڕووناکیی ئیسلام کە ئەو ڕووناکییەی لای ئێمە و لە هەموو شوێنێکی تریش بڵاو کردووەتەوە. کەواتە دوژمنایەتی کردنی ئەو برا ئایینییانە.ئەنجامەکەی دوژمنایەتی کردنی ئیسلامە و، لە ڕاستیدا قورئانیش دەگرێتەوە و، دوژمنایەتی کردنی سەرجەمی ئەو هاوولاتییانە و هەردوو ژیانی ئەم دنیا و ئەو دنیاشیانە.

لەبەر ئەوە، لاف لێدانی غیرەتی "نەتەوایەتی" بە نیازی خزمەتکردنی کۆمەڵ، لە ڕاستیدا بەردی سەرگۆشەی هەردوو ژیانەکە پێکەوە هەڵدەوەشێنێت. کەواتە حەماقەتێکی گەورەیە و هەرگیزاو هەرگیز بە حەمییەت و غیرەت دانانرێت.

**مەسەلەی چوارەم:**

"قەومییەتی ئیجابی" لە پێویستییەکی ناوخۆی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە سەرچاوە دەگرێت و هۆی هاوکاری و پشتگیریی یەکترە و هێزێکی سوودبەخش بۆ کۆمەڵ دەهێنێتەدی و دەبێت بە پشتگیرێکی زیاتر بۆ برایەتیی ئیسلامی.

جا دەبێ ئەم بیرە ئیجابییەی قەومییەت خزمەتگوزاری ئیسلام بێت و ببێت بە قەڵایەکی مەحکەم و شوورایەکی قایم لە دەوراندەوری ئیسلام، نەك بچێتە جێگەی و لە بریی ئەو دابنرێت، چونکە ئەو برایەتییەی کە ئیسلام بە موسڵمانی دەبەخشێت هەزاران جۆری برایەتیی لەخۆ گرتووە و، تا جیهانی بەرزەخ و هەتاهەتایی ئەودنیاش بەردەوام و هەمیشەیییە.

لەبەر ئەوە، برایەتیی "نەتەوایەتی" چەندە بەهێزیش بێت هێشتا هەر پەردەیەکە لە پەردەکانی برایەتیی ئیسلامی. بەڵام پێچەوانەی ئەمە، واتە: دانانی "قەومییەت" لە جێگا و لە بریی "ئیسلام" تاوانێکی هێندە نەفامانەیە کە وەك دانانی بەردەکانی قەڵایەك وایە لە گەنجینەی ئەڵماسی ناو ئەو قەڵایەدا و فڕێدانی ئەڵماسەکانە بۆ دەرەوەی قەڵا!

دەسا ئەی هاووڵاتییانی ئەهلی قورئان!

ئێوە ماوەی شەش‌سەد بەڵکو هەزار ساڵە و لە سەردەمی عەبباسییەکانەوە تەحەددای سەرجەمی جیهانتان کردووە و، ئاڵای قورئانتان هەڵگرتووە و لە سەرانسەری جیهاندا بڵاوتان کردووەتەوە و، قەومییەتەکەشتان کردووە بە قەڵای قورئان و ئیسلام و، جیهانتان لە بەرامبەر خۆتانەوە ناچاری بێ‌دەنگی و ملکەچی کردووە و، ئەو گیروگرفتە مەزن و فەوتێنەرانەشتان پاشەوپاش گێڕایە دواوە کە هێندەی نەمابوو ژیانی جیهانی ئیسلامی لەناو بەرێت، بە ڕادەیەك کە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوەتان تێدا هاتەدی کە دەفەرموێ:

﴿فَسَوْفَ يَأْتِي اللهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِـزَّةٍ عَلَـى الْكَـافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ﴾ (المائدة:٥٤).

کەواتە هەرگیز نەخەڵەتێن و شوێن فڕوفێڵی ئەورووپاییەکان و گۆبەند و پیلانی چاولێکەرانیان نەکەون. زۆر زۆر بترسن لەوەی سەرەتای ئەم ئایەتەتان تێدا بەرجەستە ببێت[1]!

(١) کە بریتییە لەم ئایەتە: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَنْ دِينِهِ....﴾. (وەرگێڕ)

## دیاردەیەكی سەرنج ڕاكێش

گەلی "تورك" ژمارەیان لە هەموو نەتەوە ئیسلامییەكانیتر زیاترە و، لە هەر شوێنێكی جیهاندا بین هەر موسـڵمانن، كـەچی نەتـەوەكانی تر موسـڵمان و ناموسـڵمانیان پێكـەوە تێدایە. بۆیە وەك نەتەوەكانی تر نەتـەوەی تـورك بـەش بـەش نـەبوون. لەبـەر ئـەوە، لـە هـەر شـوێنێكدا كۆمـەڵێكی تـورك هـەبن، ئایینیـان ئیسـلامە. خۆ ئەوانەشیان كـە لـە ئیسـلام پاشگەز بوونەتەوە یان ئەوانەی كە هەر لە بنەڕەتدا موسڵمان نەبوون، لەوە دەرچوون كە بـە تـورك دابـنرێن وەك "مەجـەڕ"ەكـان. لـە كـاتێكدا نەتـەوەكانی تـر تەنانـەت بچووكەكانیشیان موسڵمان و ناموسڵمانیان تێدایە!

دەسا ئەی برای تورك!

ئاگادار و وریابە! تۆ بە تایبەتی نەتەوایەتییەكەت بە چەشنێك لەگەڵ ئیسلامدا تێكەڵ بووە كە هەرگیز ناگونجێت لێی جیا بكرێتەوە. خۆ هەر كـات بتـەوێت لەگـەڵ ئیسـلامدا لە یەكیان جیا بكەیتەوە، ئەوا تیادەچیت و نامێنیت! ئایا نابینیت سـەرجەمی ئـەو شـتانەی مایەی فەخر و شانازیی تۆن لە ڕابوردوودا، هەرهەموویان لـە تۆمـاری "ئیسـلام"دا تۆمـار كراون؟! خۆ ئـەو شتانەی كـە مایـەی شـانازیتن هـەرگیزاو هـەرگیز ناسـڕێنەوە و لـەناو نابرێن، دەسا تۆش، بە گوێ ڕاگرتنت لـەو شـوبهە و گومانانـەی كـە شـەیتانەكانی ئینـس بڵاویان دەكەنەوە، لەسەر دڵی خۆتدا مەیان سڕەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

نەتەوە بێداربووەكانی ئاسیا دەسـتیان لـە بیری قەومییـەت گـیر كـردووە و لـە هـەموو ژیـاندا شـوێن پێـی ئەوروپاییـەكانیان هـەڵگرتووە، بـە ڕادەیـەك كـە لـە پێنـاوی ئـەو چاولێكەرییەدا گەلـێ موقەددەساتی خۆیان بەخت كردووە.

كەچی هەموو نەتەوەیـەك جۆرە پۆشـاكێكی گونجـاوی هەیە كە بەپێی قـەد و بـاڵای بڕراوە، تەنانەت گەر جۆری پارچـە و كوتاڵەكـەش یـەكێك بێـت، دەبێ تـەرز و شـێوەی دووریینی لە یەكتری جیا بێت. چونكە نابێت ئافرەت پۆشاكی پۆلیـس و، زانـای ئـایینیش بەرگ و پۆشاكی ئافرەتە ڕووتەكانیان لەبەر بكرێت!

جـا "چاولێكـەریی كوێرانـە" زۆرجـار ئەنجامەكـەی حاڵـەتێكی سـووكایەتی و گاڵتەجاڕیی وەك ئەمە دەبێت! چونكە:

یەكەم: گەر "ئەورووپا" دوكانێك یان سەربازگەیەكی سوپا بێت، ئەوا "ئاسیا" وەك كێڵگە و مزگەوت وایە. دوكاندار هەندێ جار دەچێت بۆ شانۆ بەڵام جوتیار گوێی پێ نادات. بە هەمان جۆر بارودۆخی سەربازگە و مزگەوتیش لە یەك ناچن و جیاواز دەبن.

پاشان پەیدابوونی زۆربەی پێغەمبەران - درووەدیان لەسەر بێت - لە ئاسیا و سەرهەڵدانی زۆربەی فەیلەسووفەكانیش لە ئەورووپادا، هێما و ئاماژەیەكی قەدەری خواوەندە بۆلای ئەوەی كە تەنها "ئایین" و "دڵ" دەتوانن نەتەوەكانی ئاسیا بێدار بكەنەوە و بەرەو پێشكەوتنیان ببەن و بەردەوامیی بەرێوەبردنیان بهێننەدی. بەڵام "فەلسەفە" و "حیكمەت" دەبێ یارمەتیدەری "ئایین" و "دڵ" بن، نەك جێیان بگرنەوە.

دووهەم: ئایینی "ئیسلام" نابێ لەگەڵ "نەصرانییەت" بەراورد بكرێت، چونكە چاولێكردنی كوێرانە لە ئەورووپاییەكان لە بواری پشتگوێ خستنی ئایینەكەیاندا هەڵەیەكی گەلێ گەورەیە. لەبەر ئەوەی كە - پێش هەموو شتێك - ئەورووپاییەكان لە ڕاستیدا دەستیان لە ئایینەكەیان بەرنەداوە، شایەت لەسەر ئەمە و لە پێشەكی هەمووانەوە: "ولسن"(1) و "لوید جورج"(2) و "فینزیلوس"(3) و كەسایەتییە مەزنەكانی تری خۆرئاوان، كە هەر یەكەیان بە وێنەی قەشەیەكی دەمارگیر دەستیان لە ئایینەكەیان

---

(١) ولسن توماس ودرو (١٨٥٦-١٩٢٤): لە بواری یاسادا خوێندوویەتی و، ماوەیەك پارێزەر و پاشان لە نێوان ساڵەكانی (١٩٠٢-١٩١٠)دا بەڕێوەبەری زانكۆی برنستون بووە. ئنجا لە لایەن پارتی دیموكراتییەوە پاڵێوراوە و لە نێوان ساڵەكانی (١٩١٣-١٩٢١)دا بۆ سەرۆك كۆماریتیی ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هەڵبژێرراوە. بە ئاشكرا دژایەتیی خۆی بەرامبەر هەموو جۆرەكانی ئیستیعمار دەربڕیوە. گەلێ كتێبی لە بواری ڕێسا و ڕژێمە سیاسییەكاندا نووسیوە، گرنگترینیان بریتییە لە كتێبی "مێژووی گەلی ئەمریكا" لە پێنج بەرگدا. (وەرگێڕ)

(٢) لوید جۆرج (١٨٦٣-١٩٤٥): مرۆڤێكی سیاسەتمەداری بەریتانییە و خاوەنی ڕێڕەوێكی سەربەست بووە. لە خێزانێكی هەژاری هەرێمی وێلز چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و لە سەرەتای ژیانیدا بە ڕقەبەرایەتی كردنی بۆ "ئیستیعمار" و "داگیركاری" ناسراو بووە. ناوی وەك وتارخوێنێكی ڕەوانبێژ بڵاو بووەتەوە و، چەندین جار پلەی وەزاریی لە ئەستۆ گرتووە و هەتا ماوەیەكی كەمی پێش كۆچی دوایی ئەندامی ئەنجوومەنی گشتیی بەریتانی بووە. (وەرگێڕ)

(٣) فینزیلوس (١٨٦٤-١٩٣٦): سیاسەتمەدارێكی یۆنانییە و یەكێكە لە پیاوە بەناوبانگەكانی دەوڵەت. ڕۆڵێكی گرنگی بووە لە شۆڕشی كریت (١٨٩٦-١٨٩٧)دا لە دژی دەوڵەتی عوسمانی. ساڵی ١٩١٠ وەزارەتی یۆنانیی پێكهێناوە و گەلێ ئاشووبی چەكدارانەی لە دژی حكوومەتی پاشایەتی ڕێكخستووە، بەڵام هەر هەموویان سەركوت كراون و، "فینزیلوس"یش ڕایكردووە بۆ فەرەنسا و لەوێ دوای ساڵێك كۆچی دوایی كردووە. (وەرگێڕ)

گیر کردووە. کەواتە هەموو ئەوانە شایەتن و دەیچەسپێنن کە ئەورووپا دەستی لە ئایینەکەی بەرنەداوە، بەڵکو بە دەمارگیریشەوە شوێنی کەوتووە.

سێهەم: قیاس کردنی ئایینی "ئیسلام" بە "نەصرانییەت" قیاسی دوو شتی لە یەك جیایە و هەڵەیەکی ڕوون و ئاشکراشە. چونکە ئەورووپا کاتێ ئاییندار بوو تەنانەت کە بە دەمارگیریشەوە دەستی لە ئایینەکەی گیر کردبوو، نە پێش کەوتبوو نە خاوەنی شارستانێتیش بوو. بەڵام کاتێ وازی لە دەمارگیری هێنا و دەستبەرداری ئایینەکەی بوو، پێش کەوت و بوو بە خاوەنی شارستانێتی.

دەمارگیریی ئایینی لە ئەورووپادا هێندە شەڕ و ئاژاوەی ناوخۆیی نایەوە کە سێ سەد ساڵی خایاند و، کاربەدەستە ستەمکار و خۆسەپێنەکان ئایینیان کردبوو بە گورزی دەستیان بۆ سەرکوتکردنی عەوام و هەژاران و بیریار و زانایان، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە زۆرینەی خەڵکی جۆرە ڕقێك لە ئایین هەڵبگرن.

بەڵام لە ئیسلامدا – مێژوو شایەتە – کە تەنها یەك جار نەبێت، ئایین نەبووە بەهۆی شەڕ و کێشەی ناوخۆیی. ئنجا موسڵمانانیش تا خاوەنی ئایین بووبێتن و دەستیان پێوە گرتبێت، سەرکەوتنی مەزنیان بەپێی ئەو کات و ڕۆژگارە بەدەست هێناوە. شایەت لەسەر ئەمەش: دەوڵەتی ئیسلامی‌یە لە ئەندەلوسدا کە بوو بە مامۆستایەکی گەورە و مەزن بۆ ئەورووپا. بەڵام گەر هەر کاتێ موسڵمانان ئایینەکەیان پشتگوێ خستبێت، تووشی نزمبوونەوە و دواکەوتن بوون..

پاشان "ئیسلام" لە ڕێی واجب کردنی زەکات و حەرام کردنی ڕیبا و هەزاران مەسەلەی تری وەك ئەمانەوە کە بەزەیی‌یان تێدایە بە حاڵی عەوامدا، پارێزگاریی هەژاران و زۆرینەی خەڵکیی کردووە..

ئنجا "ئیسلام" زانایانی پاراستووە و هەردەم بەم چەشنە ئایەتە پیرۆزانە: ﴿**أفلا يتدبرون**﴾ (النساء:٨٢).. ﴿**ويتفكرون في خلق السموات والأرض**﴾ (آل عمران:١٩١).. ﴿**أفلا يعقلون**﴾ (يس:٦٨) نموونەی بە ژیری و زانست هێناوەتەوە و ئەو ژیری و زانستانەشی لە دەروونەکاندا بێدار کردووەتەوە.

بۆیە ئایینی ئیسلام هەمیشە قەڵای هەژاران و داڵدە و پەنای زانایان بووە. کەواتە لە ئیسلامدا هیچ پێویستی و داخوازێك بۆ ئەم چەشنە دوورە پەرێزی‌یە نی‌یە.

نهێنیی حیکمەت و جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان "ئیسلام" و ئایینەکانی تردا، کە نەصرانییەت یەکێکیانە، بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

بناغەی ئیسلام "تەوحید"ی خاوێن و بێ گەردە و، هەرگیز پشت بە هۆکار و هۆ ناوەندەکان نابەستێت و لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەوانە هیچ نرخ و بەهایەکیان لە بواری دروستکردن و بەدیهێناندا نی‌یە.

بەڵام ئەو بیری "کوڕایەتی"یەی کە لە نەصرانی‌یەتدا پەسەند کراوە، گرنگی و بایەخ بە "هۆکارەکان" دەدات و لەخۆبایی‌بوون و خۆ بەگەورەگرتنی مرۆڤ ناشکێنێت، بەڵکو بەشێکی پەروەدگارێتیی خوا بە حەبر و ڕاهیبەکان دەسپێرێت، بە ڕادەیەك کە ئەم ئایەتە پیرۆزەیان تێدا بەرجەستەیە کە دەفەرموێ:

﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللهِ﴾ (التوبة: ٣١).

ئا لێرەوەیە کە دەبینین گەورە پیاوانی نەصرانییەت لە ئایینەکەیاندا دەمارگیرن و کەچی لە هەمان کاتیشدا پارێزگاری غروور و لەخۆبایی‌بوونیشیان دەکەن، هەرچەندەش پلە و پایەی دنیاییش دەگرنە دەست. وەك "ولسن"ی سەرۆکی ئەمریکا کە پیاوێکی دەمارگیری ئایینی بووە.

کەچی لە ئیسلامدا، کە ئایینی "تەوحید"ی خاوێن و بێ گەردە، دەبێ ئەو کەسانەی کارمەندیی گەورەی دەوڵەت دەگرنە ئەستۆ، دەستبەرداری غروور و خۆپەرستیی خۆیان بن، دەنا ناتوانن بگەنە ئاینداریێتیی ڕاستەقینە و تەواوەتی. بۆیە دەبینیت هەندێکیان کاروباری ئایین پشتگوێ دەخەن، تەنانەت هەندێکیان لەئایینیش دەردەچن.

**مەسەلەی شەشەم:**

ئەوانەی کە زیاد لە پێویست لە دەمارگیری و قەومییەتی سەلبی‌دا ڕۆ دەچن، پێیان دەڵێین.

یەکەم: لە هەموو شوێنێکی زەوی، بە تایبەت لەم وڵاتانەی خۆماندا و هەر لە دێر زەمانەوە چەندەها کۆچی زۆر و زەبەندە ڕووی داوە و، گەلێ نەتەوەش دووچاری ئاڵوگۆڕی زۆر و زەبەندە بوون.

وڵاتی ئێمەش دوای ئەوەی کە بوو بە مەڵبەندی حکوومەتی ئیسلام، کۆچی زیاتری بەخۆیەوە بینی. تەنانەت هەموو نەتەوەکان بە وێنەی پەپوولە بە دەوری ئەم وڵاتەدا

دەهاتن و دەڕۆشتن، تا هاتنە ناوی و تیایدا نیشتەجێ بوون. خۆ لە حاڵەتێکی ئاوادا - مەگەر بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی لەوحی مەحفووز - دەنا ناتوانرێت ڕەگەزە ڕاستەقینەکان لە یەکتر جیا بکرێنەوە!

لەبەر ئەمە، گەر مرۆڤ کاروبار و جوامێری و غیرەتی خۆی لەسەر "دەمارپەرستی" بنیات بنێت، کارێکی بێ واتا و بێ ناوەرۆکی ئەنجام داوە. جگە لەو زیانانەش کە دێنە ڕێی.

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە یەکێك لەوانەی بانگەشەیان بۆ دەمارگیری و قەومییەتی سەلبی دەکرد و بایەخی بۆ ئایین دانەنابوو، ناچار بوو بڵێت: گەر "ئایین" و "زمان" یەکیان گرت، ئەوا ئەو کەسانە بە یەك نەتەوە دادەنرێن!

مادەم وایە، ئەوا دەبێ سەیری زمان و ئایین و پەیوەندییە نیشتمانییەکان بکرێت، نەك دەمارگیریی ڕاستەقینە. چونکە گەر ئەم سیانە یەکیان گرت ئەوا ئەو نەتەوەیە خۆی لە خۆیدا خاوەن هێز دەبێت و، گەر یەکێکیش لەم سیانە کەم بکات هەر لە نێوان قەومییەتدا دەمێنێتەوە.

دووەم: لە نێوان سەدان سووددا کە جوامێری و غیرەتی خاوێنی "ئیسلامەتی" بە ژیانی کۆمەڵایەتیی دەبەخشێت، تەنها دوو دانە لەو سوودانە بۆ ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە دەخەینە ڕوو:

سوودی یەکەم:

ئەو شتەی کە لە بەرامبەر سەرجەمی دەوڵەتە مەزنەکانی ئەورووپاوە پارێزگاریی ژیان و قەوارەی ئەم دەوڵەتە ئیسلامییەی کرد - هەرچەندە ژمارەشیان بیست تا سی ملیۆن کەسە - تەنها ئەو چەمکەیە کە لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە و سوپاکەی هەڵی گرتووە و دەڵێت: "گەر بمرم شەهیدم.. بیشکوژم موجاهیدم"!

بەڵێ، هەر ئەم چەمکە بوو کە ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانەی بە پێکەنینەوە بۆ پێشوازی کردنی مردن دایەبەر و، هەر ئەمەش بوو دڵ و دەروونی ئەورووپاییەکانی ڕاچڵەکاند و ترسی لە دڵدا و لەرزیشی بە جەستەیاندا هێنا.

ئایا چ شتێك هەیە بتوانێت بێتە مەیدان و، ئەم چەشنە قوربانی و خۆبەختکارییە لە گیانی سەربازەکاندا بزوێنێت، لە کاتێکدا کە ئەوان خاوەنی بیری سادە و دڵ و دەروونی ساف و خاوێنن؟

چ ده‌مارگیری‌یه‌ك ده‌توانێت جێی ئه‌م چه‌مكه‌ به‌رز و بڵنده‌ بگرێته‌وه‌؟ یان چ بیرێك ده‌توانێت وا له‌ مرۆڤ بكات كه‌ به‌ كه‌ماڵی ویست و سه‌ربه‌ستیی خۆی، ژیان و دنیاكه‌ی له‌ پێناوی ئه‌ودا به‌خت بكات؟!

سوودی دووهه‌م:

هه‌ركات ده‌وڵه‌ته‌ مه‌زنه‌كانی ئه‌وروپا و هه‌ژدیها سه‌رسه‌خته‌كانی ئه‌وێ ئازاری ئه‌م ده‌وڵه‌ته‌ موسڵمانه‌یان دابێت و مشته‌كۆڵی یه‌ك له‌ دوای یه‌كیان تێ سره‌واندبێت، ئه‌وا به‌و كاره‌یان سێ سه‌د و په‌نجا ملیۆن موسڵمانی سه‌رتاسه‌ری جیهانیان خستووه‌ته‌ گریان كه‌ بۆ ئازاری ئه‌م ده‌وڵه‌ته‌ هاواریان لێ هه‌ڵساوه‌، به‌ ڕاده‌یه‌ك كه‌ ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ ئیستیعماری‌یانه‌ ده‌ستیان له‌ ئازاردانی ئه‌م ده‌وڵه‌ته‌ كێشایه‌ دواوه‌ و وازیان له‌ ده‌ستدرێژی هێنا، تاكو سۆزی سه‌رجه‌می موسڵمانان له‌ دژیان نه‌ورووژێت!

جا ئایا ئه‌م هێزه‌ پشتگیر و مه‌عنه‌وی‌یه‌ هه‌میشه‌یی‌یه‌ی كه‌ له‌ پشتی ئه‌م ده‌وڵه‌ته‌وه‌یه‌ به‌ هێزێكی بچووك و شتێكی كه‌م داده‌نرێت؟ ئایا ده‌كرێت ئینكاری بكرێت و چاوی له‌ ئاستدا بنوقێنرێت؟

ئایا چ هێزێكی‌تر هه‌یه‌ بتوانێت جێی ئه‌م هێزه‌ مه‌زنه‌ بگرێته‌وه‌؟

ده‌سا ئه‌مه‌ مه‌یدانی ته‌حه‌ددی‌یه‌ و ده‌با ئه‌و هێزه‌مان پیشان بده‌ن!

كه‌واته‌ نابێ كارێك بكه‌ین له‌ پێناوی ده‌ستگیر كردن له‌ قه‌ومییه‌تێكی سه‌لبی و جوامێری و غیره‌تێكی دوور له‌ ئاییندا، ئه‌م هێزه‌ پشتگیره‌ مه‌زنه‌ پشتمان لێ هه‌ڵبكات و له‌ ده‌ستی خۆمانی ده‌ربكه‌ین!

**مه‌سه‌له‌ی حه‌وته‌م:**

ئه‌وانه‌ی كه‌ حه‌ماسه‌تێكی توندوتیژ بۆ قه‌ومییه‌تی سه‌لبی ده‌رده‌بڕن، پێیان ده‌ڵێین:

گه‌ر ئێوه‌ ڕاست ده‌كه‌ن و ئه‌م نه‌ته‌وه‌یه‌تان به‌ بێ گه‌ردی و ڕاستی و گه‌رموگوڕی خۆش ده‌وێت و به‌زه‌یی‌تان پێدا دێته‌وه‌، ئه‌وا ده‌بێ غیره‌تێكی هێنده‌ فراوان له‌ دڵ و ده‌روونی خۆتاندا هه‌ڵبگرن كه‌ جێی زۆرینه‌ی ئه‌م نه‌ته‌وه‌یه‌ی تێدا ببێته‌وه‌، نه‌ك ته‌نها كه‌مایه‌تی‌یه‌كی كه‌میان. چونكه‌ خزمه‌تكردنی كۆمه‌ڵایه‌تی و كاتی و بێ‌ئاگایانه‌ له‌ خوا بۆ ئه‌و كه‌مایه‌تی‌یانه‌ی كه‌ پێویستیان به‌ شه‌فه‌قه‌ت و به‌زه‌یی نی‌یه‌ و، له‌ هه‌مان كاتدا بایه‌خ

نەدان و بەزەیی نەهاتنەوەش بە زۆرینەی مەزنی ئەواندا، هەرگیزاو هەرگیز بە جوامێری و غیرەت دانانرێت!

چونکە جوامێری، بەپێی چەمکی ڕەگەزپەرستی، دەگونجێ لە هەموو هەشت کەسێکدا سوودێکی کاتی دەستی یەك دوانێکیان بخات و ئەو جوامێری و غیرەتەیان پێ ببرێت کە شایانی نین. بەڵام شەش کەسەکەی تر: یان پیر، یان نەخۆش، یان گیرۆدەی بەڵایەك، یان منداڵ، یان تەواو لاواز، یان خاوەن تەقوایەکە لە خواوەند دەترسێت و ئومێدەواری بەدەستهێنانی ئاسوودەیی دواڕۆژە. هەموو ئەوانە، بە دوای دڵدانەوە و نوورێکدا دەگەڕێن کە هیوا و ئومێدیان تێدا ببووژێنێتەوە، چونکە ڕوویان لە ژیانێکی بەرزەخی و قیامەتی‌یە، کەواتە گەلێ پێویستیان بەوەیە دەستی سۆز و میهرەبانی‌یان بۆ درێژ بکرێت. جا ئایا ئەوە چ جوامێری و غیرەتێکە کە بوار بە کوژانەوەی چرای ئومێد و هیوای ئەوان دەدات و لە نرخ و بەهای دڵدانەوەیان دادەشکێنێت؟

ئەم دوو هەڵوێستە گەلێ دوورن لە یەکترەوە. ئیتر پێم نالێیت بەزەیی‌هاتنەوە بە نەتەوەدا و خۆبەختکردن لە پێناوی‌دا لە کوێیە و چیی لێ هاتووە؟!

ئێمە هەرگیز لە سۆز و میهرەبانیی خواوەند نائومێد نابین، چونکە وا ماوەی هەزار ساڵە ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە و کۆمەڵە مەزنەکانی و سوپا بەسام و شکۆمەندەکەی لە خزمەتی قورئاندا خستووەتەکار و کردوونی بە هەڵگری ئاڵاکەی. بۆیە ئومێدێکی مەزنمان بە میهرەبانیی خواوەند هەیە کە - پشت بەخوا - بە چەند بەسەرهات و کارەساتێکی سەرپێیی و کاتی لەناویان نەبات و، ئومێدەوارین خواوەند درێژە بەو نووورە بدات و پتر ورشەدار و درەخشانتری بکات و کارمەندی‌یە خاوێنە موقەددەسەکەی بە بەردەوامی بهێڵێتەوە.

* * *

# باسی چوارەم

*بێدارکردنەوەیەك:*

**هەروەك چوار باسەکانی مەکتووبی بیست و شەشەم هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا نییە، ئەم دە مەسەلەیەی باسی چوارەمیش پەیوەندییان لە نێواندا نییە. بۆیە نابێ مرۆڤ بە دوای پەیوەندی لە نێوانیاندا بگەڕێت. چونکە چۆن بە دڵدا هات هەروەهایش نووسراوە.**

**جا ئەم باسە بەشێکە لەو نامەیەی کە بۆ یەکێ لە قوتابییە گرنگەکانی خۆی نارد و، وەڵامی پێنج شەش پرسیاری لەخۆ گرتووە.**

## مەسەلەی یەکەم

دووهەم: برام! تۆ لە نامەکەتدا دەڵێیت: تەفسیرنووسان لە دەمی تەفسیرکردنی: ﴿رب العالمین﴾دا وتوویانە: هەژدە هەزار جیهان هەیە و، پرسیار لە حیکمەتی ئەم ژمارەیە دەکەیت!

برام! من ئێستا حیکمەتی ئەو ژمارەیە نازانم، بەڵام تەنها ئەمەی خوارەوە دەڵێم:

ڕستەکانی قورئانی حەکیم تەنها یەك واتایان لەخۆ نەگرتووە، بەڵکو هەر یەکەیان لە حوکمی "کوللی"یەکدایە کە گەلێ واتای بۆ هەموو چینێك لە چینەکانی مرۆڤ لەخۆ گرتووە. چونکە قورئانی پیرۆز گوفتارێکە ئاراستەی سەرجەم چینەکانی ئادەمیزاد کراوە. کەواتە ئەو واتا ڕوونکراوانە لە حوکمی "جوزئییات"ی ئەو قاعیدە و یاسا "کوللی"یەدان و، هەر تەفسیرنووس و هەر خواناسێك بەشێك لەو واتا کوللییە باس دەکات و، لەم تەفسیرەشدا یان پشت بە کەشفییات یان بەڵگە یان مەشرەبەکەی خۆی دەبەستێت و، یەکێك لەو واتایانە تەرجیح دەدات و هەڵی دەبژێرێت. هەر لە ڕاستیشدا کۆمەڵێك لەو تەفسیرنووسانە لەم ڕووەدا واتایەکی موافیقیان لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا دەرخستووە.

بۆ نموونە: ئەولیاکان، بە گرنگیپێدانێکی زۆرەوە، بەیانی و ئێوارە لە نێوان ویردەکانیاندا ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنن کە دەفەرموێ:

﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَانِ﴾ (الرحمن:١٩-٢٠)..

ئەم ئایەتە گەلێ واتای زۆری هەیە، هەر لە دەریای پەروەردگاریتی‌یەوە لە بازنەی "وجووب" و دەریای بەندایەتی‌یەوە لە بازنەی "ئیمکان".. تا دەگاتە هەردوو دەریای دنیا و ئاخیرەت و جیهانی شەهادە و جیهانی غەیب و، هەروەها تا دەگاتە زەریاکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باکوور و باشوور و دەریای ڕۆم و دەریای فارس و دەریای سپی و دەریای ڕەش و گەورەکەی نێوانیان کە ئەو چەشنە ماسی‌یەی لێ دەردەچێت کە پێی دەڵێن "مەرجان" و.. تا دەگاتە دەریای سوور و نۆکەندی سوێس و، دەریای ئاوە سازگار و ئاوە سوێرەکان و، دەریای ئاوە سازگارە پەرتەوازە بڵاوەکانی ناو زەوی و، دەریا سوێرەکانی سەر ڕووی زەویش کە بە یەکترەوە لکاون و، ئەو ڕووبارە گەورانەی چەشنی نیل و دیجلە و فورات کە پێیان دەوترێت: دەریا سازگارە بچووکەکان و، ئەو دەریا سوێرانەش کە تێکەڵیان دەبن..

هەموو ئەم جوزئیياتانە، لە ناوەندی واتاکانی ئەو ئایەتە پیرۆزەدان و هەر هەمووشیان دروستە ئامانج و جێی مەبەست بن، کەواتە هەموو ئەوانە واتای حەقیقی و مەجازیی ئەم ئایەتە پیرۆزەن.

بە هەمان جۆر: ﴿الحمـد لله ربّ العـالمين﴾یش، وەك ئەمانەی باس کران، گەلێ حەقیقەتی زۆری لە خۆدا کۆکردووەتەوە و، ئەهلی کەشف و حەقیقەتیش بەپێی کەشفییاتی خۆیان بە چەند ڕوونکردنەوەیەکی جۆراوجۆر ئەو ڕاستی‌یانە دەردەخەن.

منیش بەش بە حاڵی خۆم ئەم واتایەی خوارەوە لەم ئایەتە تێ‌دەگەم:

ئاسمانەکان هەزاران جیهانیان تێدایە و، دەگونجێ هەر ئەستێرەیەك لەناو کۆمەڵەکەی خۆی‌دا جیهانێکی سەربەخۆ بێت و، هەموو ڕەگەزێکی ناو گۆی زەوییش جیهانێکی سەربەخۆیە لە خۆی‌دا. تەنانەت هەموو مرۆڤێك جیهانێکی بچووکە. کەواتە وشەی: ﴿ربّ العالمين﴾ ئەوە دەگەیەنێت کە کاروباری هەموو یەکێك لەو جیهانانە ڕاستەوخۆ لە لایەن پەروەردگاریتیی خواوەندەوە بەڕێوە دەبرێت و پەروەردە دەکرێت و کاروبارەکانی بەڕێ دەخرێت.

سێ‌هەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

"إذا أراد الله بقومٍ خيراً أبصرَهُم بعيوبِ أنفسِهم"[1].

---

(١) گەلێ فەرموودە بەم واتایە هاتووە. وەك: "إذا أرادَ اللهُ بعبدٍ خيراً فَقَّهَهُ في الدِّينِ وزَهَّدَهُ في الدنيا وبَصَّرَهُ بعيوبِه". رواه البيهقي عن أنس. بڕوانە: كشف الخفاء للعجلوني (٨١/١). (وەرگێڕ)

قورئانی پیرۆزیش لەسەر زمانی حەزرەتی یووسفەوە - دروودی لەسەر بێت - دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

﴿وَمَا أُبَرِّىءُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ (یوسف:٥٣)..

بەڵێ، ئەو کەسەی لە خۆی ڕازییە و بە خۆی دەنازێت: بەدبەختە. بەڵام ئەو کەسەی عەیبەی خۆی دەبینێت، بەختەوەرە. کەواتە براکەم! تۆ بەختەوەریت. بەڵام هەندێ جار ڕوو دەدات کە نەفسی "ئەممارە" (دەروونی بەدخواز) دەگۆڕێت و دەبێت بە "لوّامــة" یان "مطمئنــة"، کەچی چەك و کەرەسەکانی خۆی بە ڕەگ و دەمارەکان دەسپێرێت، ئیتر ئەو ڕەگ و دەمارانە کارمەندییەکانی "دەروونی بەدخواز" تا کۆتایی تەمەن جێبەجێ دەکەن و، هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنی نەفسی "ئەممارە"شدا بەسەر چووبێت کەچی ئاسەوارەکانی هەر دەردەکەون.

گەلێ کەس لە ئەولیا و ئەصفیا مەزنەکان هەن کە هەرچەندە نەفسیان بووە بە "مطمئنة" کەچی سکاڵا لە دەست نەفسی ئەممارە دەکەن و.. هەرچەندەش دڵیان ساغ و تابلێی ڕووناکە، کەچی لە تاو نەخۆشییەکانی دڵ پەنا و هانا بۆ لای خوای گەورە دەبەن! جا ئەو بەڕێزانە سکاڵاکەیان لە خودی "نەفسی ئەممارە" نییە، بەڵکو لە ئەرك و کارمەندییەکانیەتی کە بە دەمارەکان سپێرراوە. نەخۆشییەکەشیان هی "دڵ" نییە بەڵکو نەخۆشییەکی ئەندێشەییە.

ئنجا برام!

ئەو شتەی کە هێرش دەکاتە سەرت هەروەك لە لایەن دەروونتەوە نییە هی نەخۆشیی دڵیش نییە، بەڵکو حاڵەتێکە - وەك باسمان کرد - گواستوویەتەوە بۆ ناو دەمارەکان تاکو بەپێی سروشتی ئادەمیزاد "موجاهەدە" تا کۆتایی تەمەن بەردەوام بکات، کە پێشکەوتنێکی بەردەوامی بۆ بەدەست دەهێنێت.

## مەسەلەی دووهەم

"پەیامەکانی نوور" وەڵام و ڕوونکردنەوەی سێ پرسیاریان لە خۆ گرتووە کە زانایانی پێشین پرسیاریان لە بارەوە کردووە. بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها بە پوختی ئاماژەیان بۆ دەکەین.

**پرسیاری یەکەم:**

مەبەستی "محیّدینی کوڕی عەرەبی" چییە کە لەو نامەیەیدا بۆ "فەخرەددینی ڕازی"ی[1] نووسیوە، وتوویەتی: "ناسینی خوا جیایە لە ناسینی وجوودی"؟

**وەڵام:**

یەکەم: ئەو نموونەیەی کە خۆت بۆت خوێندەوەو، بۆ مەبەستی دەرخستنی جیاوازیی نێوان تەوحیدی ڕاستەقینە و تەوحیدی عامی لە "وتەی بیست و دووهەم"دا باس کراوە، ئاماژە بۆ مەبەستی پرسیارە کە دەکات و، لە چاو هەڵوێستی دووهەم و سێهەمی "وتەی سی و دووهەم"دا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە.

دووهەم: ئەو شتەی کە وای لە "محیّدینی کوڕی عەرەبی" کردووە ئەم گوفتارەی ئاراستەی "فەخرەددینی ڕازی" بکات، کە ئیمامێکە لە پێشەوایانی زانستی کەلام، ئەوەیە کە ڕوونکردنەوەکانی پێشەوایانی ئوصوولی دین و زانایانی کەلام، سەبارەت بە عەقائید و بوون و تەوحیدی خوای گەورە بەلای "ئیبن عەرەبی"یەوە شتێکی کەمە و ئاوی دڵ نادات.

بەڵێ ڕاستە، ئەو ناسینەی خوای گەورە کە بە بەڵگەکانی "زانستی کەلام" بەدەست هێنراوە، هەرگیز ئەو ناسینە کامڵە نییە کە دڵنیایی و ئاسوودەیی بە دڵ ببەخشێت. بەڵام گەر ئەو ناسینە لەسەر ڕێبازی قورئانی پیرۆزی خاوەن ئیعجاز بێت، دەبێت بە ناسینێکی تەواوەتی و، دڵنیایی کامڵ و تەواو لە دڵی مرۆڤدا دادەمەزرێنێت. لە خوای بەرز و خاوەن توانستی ڕەها دەپاڕێینەوە کە هەموو بەشێکی "پەیامەکانی نوور" وەك چرایەك لێ بکات و ڕێگا ڕاست و نوورانییەکەی قورئانی پیرۆز ڕوون بکاتەوە.

پاشان هەروەك ئەو خواناسینەی کە "ئیمامی ڕازی" لە "زانستی کەلام" هەڵی گۆزیوە بەلای "ئیبن عەرەبی"یەوە کورت و ناتەواو دەردەکەوێت، بە هەمان جۆر خواناسینی ڕێی تەسەووفیش لەچاو ئەو خواناسینەدا کەم و کورت و قرتاو دەردەکەوێت

---

(١) ئیمام فەخرەددینی ڕازی: (٥٤٤-٦٠٦ك/١١٥٠-١٢١٠ز) ناوی محەممەدی کوڕی عومەری کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی تەیمیی بەکرییە و، پێشەوایەکی تەفسیرنووس و تاقانەی بێوێنەی ڕۆژگاری خۆی بووە لە زانستە عەقلی و نەقلی و زانستەکانی پێشینندا. لە بنەچەدا خەڵکی تەبەرستانە و بە نەسەبیش قورەیشییە و لە شاری "ڕەی" لە دایك بووە و پاشان لە ساڵی ٦٠٦ کۆچی لە شاری "هەرات" کۆچی دوایی کردووە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "مفاتیح الغیب" کە تەفسیری قورئانی پیرۆزە لە هەشت بەرگدا و، "لوامع البینات فی شرح أسماء الله تعالی والصفات". بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الأعلام ٣١٣/٦، وفیات الأعیان ٤٧٤/١، مفتاح السعادة ٤٤٥/١، لسان المیزان ٤٢٦/٤، البدایة والنهایة ٥٥/١٣، طبقات الشافعیة ٣٣/٥. (وەرگێڕ)

كە میراتگرانی پێغەمبەران — درووودیان لەسەر بێت - ڕاستەوخۆ لـە قورئـانی پیرۆزەوە هەڵیانگۆزیوە. چونکە "ئیبن عەرەبی" بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی ئامادەیی قەلبیی بەردەوام لـە بـەردەم خـوای گـەورەدا، وتوویـەتی: "لا موجـود إلا هـو" تەنانـەت گەیشـتە ئـەوەی ئینکاریی بوونی بوونەوەران بکات!

بەڵام کەسانێکی تر بـۆ مەبەستی بەدەستهێنانی ئـەو حـوزووره قەلبیـیەوتوویانـە: "لا مشـهـود إلا هـو". بـەم جـۆرە پـەردەی لەبیرچوونـەوەی سەرتاسـەریان بەسـەر ڕووی بوونەوەراندا داداوەتەوە و، بەم پێیە بارودۆخێکی سەیریان گرتە خۆیان.

کەچی ئەو خواناسینەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە هـەڵگۆزراوە، هـەروەك حـوزووری قەلبیی بەردەوام بە مرۆڤ دەبەخشێت، لـە هـەمان کـاتدا حوکمـی "نـەبوون" و "عـەدەم" بەسەر بوونـەوەراندا دەرناکـات و لـە بەندیخانـەی لەبیرچوونـەوەی تەواوەتیشـدا بـەندیان ناکات، بەڵکو لە پشتگوێ خستن و هەرەمەکیێتی ڕزگاریان دەکات و لە پێنـاوی خـوای گەورەدا دەیانخاتە کـار و، هـەرچی شـت هەیـە دەکـات بـە ئاوێنەیـەك کـە ناسینی خـوای گـەورەی تێـدا ببینـرێت و لـە هـەموو شتێکیشـدا پەنجەرەیـەك لەسـەر ناسـینی خواوەنـد دەکاتەوە، وەك سەعدی شیرازی بە شیعر ئەمەی دەربڕیوە و وتوویەتی:

در نظر هوشـیار هـر ورقـی          دفتریست أز معرفت کردگار[1]

لە چەند وتەیەکی تری "پەیامەکانی نوور"دا بۆ مەبەستی دەرخستنی جیاوازییـەکانی نێوان ئەو کەسانەی کە ڕێبازەکانیان لەو پرۆگرامـە هـەرە ڕاسـت و دروستەی "قورئـانی پیرۆز" وەردەگرن و، ئەوانەش کە ڕێبـازی "زانایـانی کـەلام" دەگرنـە بـەر، نموونەیـەکمان هێناوەتەوە کە ئەمەی خوارەوەیە:

هەندێ کەس بۆ بەدەستهێنانی "ئاو" دەچن بـە لوولـە و کـارێز لـە شـوێنێکی دوورەوە ڕایدەکێشـن کـە لـە داوێنـی چیاکانـەوە هـەڵیان کـەندووە. هـەندێکی تـر هــەر شــوێنێك هەڵبکەنن و لە هەر جێگایەکدا بن ئاویان دەست دەکەوێت و کانیاوەکـەی دەتەقێننـەوە. سەبارەت بە یەکەمیان: ئەوا ڕێیـەکی هەڵـەت و دوورە و، ئاوەکـە لـەو ڕێیـەدا تووشـی

(١) مامۆستا نوورسی لێرەدا پوختەی شیعرەکەی شێخی سەعدیی هێناوە. تەواوەتییەکەی بەم جۆرەیە:
برگ درەختان سبز در نظر هوشیار          هر ورقش دفتریست معرفت کردگار
واتە: هەر گەڵایەکی درەختە سەوزەکان بە لای مرۆڤی هۆشیارەوە پڕ بە دەفتەرێك زانیاریی تێدایە سەبارەت بـە ناسینی کردگارەوە.
لە هەندێ چاپدا لە بریی: (در نظـر هوشیار) نووسراوە: (پیـش خداونـد هـوش). بڕوانـە: کلیـات سـعدی – غزلیات ص ٥١٩ بە اهتمام محمد علی فروغی. انتشارات امیر کبیر. تهران – ١٣٧٠ هـ.ش. (وەرگێڕ)

برین و كـەم بوونـەوە دەبێـت. بـەڵام سـەبارەت بـەوانەی كـە بیر هەڵدەكەنن، بێ هیـچ سـەختی و گیروگرفتێك و لە هەر شوێنێكدا نیشتەجێ بن، ئاویان دەست دەكەوێت.

جا زانایانی "زانستی كەلام" لـە ڕێی چەسپاندنی مـەحاڵیی "دەور و تەسەلسـول" لـە كۆتـایی جیـهاندا، زنجیرەی هۆكارەكـان دەقرتێنـن، ئنجـا دوای ئـەوە "بـوون"ی خـوای گەورەی "واجب الوجود" دەچەسپێنن.

بەڵام ڕێبازە ڕاستەقینەكەی "قورئانی پیرۆز" لە هەر شوێنێكدا بێت و هەر جێگایـەك هەڵبكەنێت ئاوی دەسـت دەكـەوێت. كەواتە هـەموو یـەكێك لـە ئایەتـە مەزنـەكانی ئـەو قورئانە وەك عەساكەی دەستی حەزرەتی مووسا – درووودی لەسەر بێت – وایـە، لـە هـەر شـوێنێكدا بیـەوێت كانیـاوی بەلێشـاو هـەڵدەقوڵێنێت و ئـەم دەسـتوورەی خـوارەوە پێش چاوی هەموو شتێك دەخات تاكو بیخوێننەوە:

وفى كلّ شيء له آية تدل على أنه واحد

پاشان "ئیمان" هەر تەنها لە ڕێی زانستەوە بەدەست ناهێنرێت، چونكە گەلـێ لایەنی ناسك(لطائف) لە مرۆڤدا هەن كە ئەوانیش بەشیان لە ئیماندا هەیە. جا هەروەك خواردن كاتێ دەڕواتە ناو گەدەوە دابەش دەبێـت و بەپێی هەریـەك لـە ئەندامـەكان بـەناو ڕەگ و دەمارە جیاجیاكاندا بڵاو دەبێتەوە، مەسەلە و بابەتەكانی ئیمـانیش كـە لـە ڕێی زانسـتەوە هاتبن بە هەمان جۆرن. چونكە كە دەچنە نـاو گـەدەی ژیـری و تێگەیشـتنەوە ئـەوا هـەموو یـەكێكی لایەنـە ناسـكەكانی جەستە، وەك گیـان و دڵ و نـهێنی و دەروون و لایەنـەكانی تری هاوچەشنیان، هەریەكەیان – بەپێی پلـەی خۆی – بەشـی خۆیـانی لـێ وەردەگـرن و دەیمژن. جا ئەگەر یـەكێك لـەو لایەنـە ناسـكانە بەشـە خۆراكـی گونجاوی خۆی دەسـت نەكەوێت ئەوا خواناسینەكەش كەم و كورتی دەهێنێـت و ئەو لایەنە ناسـكە لێـی بێ بـەش دەبێت.

بـەم جـۆرە، "ئیـبن عـەرەبی" سـەرنجی "فـەخرەددینی ڕازی" بـۆ لای ئـەم حاڵەتـە ڕادەكێشێت و بێداری دەكاتەوە.

## مەسەلەی سێهەم

**پرسیار:**

چۆن ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الإسـراء: ٧٠) لەگـەڵ ئایـەتی پـیرۆزی: ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ (الأحزاب: ٧٢) یەك دەخرێت؟

**وەڵام:**

ڕوونکردنەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە لە وتەکانی "یازدەهەم" و "بیست و سێ‌هەم" و بەروبوومی دووهەمی لقی پێنجەمی "وتەی بیست و چوارەم"دا باس کراوە، کە پوختەکەی بەم شێوەی خوارەوەیە:

خوای گەورە بە توانستە کامڵەکەی خۆی گەلێ شتی زۆر لە تەنها یەك شت بەدی دەهێنێت، هەروەك تەنها یەك شت بە چەشنێك دەخاتە کار کە گەلێ کارمەندی و ئەرکی زۆر ئەنجام بدات و، بەم پێیە هەزار و یەك کتێب لە تەنها یەك لاپەڕەدا دەنووسێت.

ئنجا خوای گەورە ئەم مرۆڤەشی لە شێوەیەکی ئەوتۆدا بەدی هێناوە کە گەلێ "جۆر"(نوع)ی تری تێدا کۆکردووەتەوە. واتە: ویستوویەتی بە گرۆی مرۆڤ ئەو کاروبارانە ئەنجام بدات کە پلە جیاجیاکانی سەرجەمی جۆرەکانی زیندەوەران ئەنجامیان دەدەن، بە ڕادەیەك کە هێز و ئارەزووەکانی مرۆڤی لە چەند سنوور و پابەندێکی سروشتی‌دا نەبەستووەتەوە، بەڵکو بە سەربەستی و ڕەهایی هێشتوونیەتەوە. بەڵام هێز و ئارەزووەکانی زیندەوەرانی تری بە چەند پابەندێکی سروشتی‌یەوە بەستووەتەوە. بەو واتایەی کە هەریەك لە هێز و تواناکانی مرۆڤ لە مەیدانێکی یەکجار فراوانی نەبڕاوەدا دێن و دەڕۆن، چونکە مرۆڤ ئاوێنەی چەندین درەوشانەوەی بێ کۆتایی ناوە جوانەکانی "رب العالمین"ە. بۆیە توانا و لێهاتنێکی بێ کۆتایی بە هێزەکانی مرۆڤ دراوە.

بۆ نموونە:

ئەگەر سەرانسەری دنیا بە مرۆڤ بدرێت، هێشتا هەر بە هەڵپەوە داوای زیاتر دەکات و، لە پێناوی سوودێکی خۆی‌دا ڕازی‌یە زیان لە هەزاران کەس بکەوێت.

بەم جۆرە، چەندین پلەی بێ سنووری ڕەوشتە خراپەکان لە بەردەم مرۆڤدا دەردەکەوێت، تا هێندە شۆڕی دەکاتەوە کە دەیخاتە خوارەوە بۆ ئاستی نەمروود و فیرعەونەکان و پڕ بە پێستی خۆیەتی سیفەتی: ﴿ظَلُوماً﴾ی - بە سیغەی موبالەغە - تێدا بەرجەستە ببێت.. هەروەك پلە بەرزە بێ کۆتایی‌یەکانی ڕەوشتە جوانەکانیشی لە بەردەمدا دەکرێنەوە تا دەگاتە پلەی پێغەمبەران - درودیان لەسەر بێت - و صیدیقین.

پاشان مرۆڤ - بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە - هیچ کام لەو شتانە نازانێت کە پێویستن بۆ ژیانە تایبەتەکەی خۆی و، ناچارە هەموو شتێك فێر ببێت. کەواتە مرۆڤ "جەهوول"ە - بە سیغەی موبالەغە - چونکە پێویستی بە فێربوونی گەلێ شتی بێ سنوورە..

کەچی ئاژەڵ کاتێ چاوەکانی بەسەر ژیاندا هەڵدەهێنێت، تەنها پێویستی بە فێربوونی چەند شتێکی کەم هەیە، جگە لەوەی کە بە ماوەی یەك دوو مانگ یان یەك دوو ڕۆژ یان یەك دوو سەعات گشت هەلومەرجەکانی ژیانی خۆی فێر دەبێت، دەڵێی لە جیهانێکی تردا کامڵ بووە ئنجا بۆ ئێرە هاتووە! بەڵام مرۆڤ دوای یەك دوو ساڵ نەبێت ناتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت و بە پێوە ڕابوەستێت، هەروەك دوای پازدە ساڵ تەمەن ئنجا سوود و زیانی خۆی لە یەك جیا دەکاتەوە.

کەواتە سیغەی موبالەغەی: ﴿جهولاً﴾ ئاماژە بۆ ئەمەش دەکات.

## مەسەلەی چوارەم

برام! ئێوە پرسیارتان لە بارەی حیکمەتی فەرموودەی پیرۆزی: "جدِّدوا إيمانكم بـلا إله إلاّ الله"[(١)] کردبوو، خۆ لە زۆر "وتە"دا ئەوەمان باس کردووە. وا ئێستا یەکێك لە حیکمەتەکانی دەخەینە ڕوو:

لەبەر ئەوەی مرۆڤ، چ خۆی و چ ئەو جیهانەی دەوروبەری، هەمیشە نوێ دەبنەوە، ئەوا بە بەردەوامی پێویستی بە نوێکردنەوەی ئیمانەکەیەتی. چونکە هەر تاکە مرۆڤێك لە چەند "دانە"یەکی زۆر و زەبەندەی "مرۆڤ" پێك دێت! ئەوەتا هەموو ساڵێکی تەمەنی دانەیەکە لەو مرۆڤانە، تەنانەت نەك هەر بە ژمارەی ساڵەکانی بەڵکو بە ژمارەی ڕۆژەکان و سەعاتەکانی تەمەنی دانە دانەی مرۆڤ لەودا هەیە. ئەوەتا هەموو دانەیەك لەوانە کەسێکی تری جیاوازە لەوی تر، چونکە هەر دانەیەك لەوانە کە "کات"ی بەسەردا تێدەپەڕێت وەك "مۆدێل"ی لێ دێت کە هەر ڕۆژە و شێوەی دانەیەکی تری نوێ لەبەر دەکات.

(١) "جددوا إيمانكم. قيل: يا رسول الله كيف نجدد إيماننا؟ قال: أكثروا من قول: لا إله إلاّ الله" رواه أحمد والحاكم والنسائي والطبراني بسند حسن عن أبي هريرة. (كشف الخفاء للعجلوني). وأورده المنذري في الترغيب والترهيب ٤١٥/٢ وقال رواه أحمد والطبراني وإسناد أحمد حسن. وأورده الهيثمي في المجمع ١/ ٥٢ وقال: رواه أحمد وإسناده جيد، وفيه سمير بن نهار وثقه ابن حبان، وقال في موضع آخر: ٨٢/١٠ رواه أحمد والطبراني ورجال أحمد ثقات. إهـ. وأخرجه أحمد في المسند ٣٥٩/٢ والحاكم في المستدرك ٢٥٦/٤ وقال: هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، وتعقبه الذهبي: صدقة ضعفوه. وفي سنده أيضاً سمير بن نهار قال الذهبي في الميزان ٤٣٤/٢ سمير بن نهار عن أبي هريرة نكرة.

پاشان هەروەك مرۆڤ بەم شێوەیە لە چەند دانەیەك پێك دێت و هەمیشە بەم جۆرە نوێ دەبێتەوە، ئەو جیهانەش كە تیایدا نیشتەجێ بووە بە هەمان جۆرە و جیهانێكی گەڕۆكە و هەرگیز لەسەر حاڵەتێكی دیاری كراو نامێنێتەوە، ئەوەتا هەمیشە دەڕوات و جیهانێكی تری نوێی دێتە جێ. كەواتە لە ئاڵوگۆڕێكی هەمیشەییدایە و هەرچی ڕۆژە دەرگا لەسەر جیهانێكی نوێ دەكرێتەوە.

جا ئیمانیش لە ڕوویەكەوە نوور و ڕووناكییە بۆ ژیانی هەموو دانەیەك لەو دانە مرۆڤانەی ئەو كەسە. هەروەك لە ڕوویەكی ترەوە ڕووناكیی ئەو جیهانانەیە كە ئەم مرۆڤە دەڕواتە ناویانەوە. "لا إله إلاّ الله"یش كلیلێكە ئەو نوورەی پێ دەكرێتەوە!

پاشان مرۆڤ: نەفس و هەوا و وەهم و شەیتان بەسەریدا زاڵن و بێئاگاییەكەی دەقۆزنەوە و فێڵی لەگەڵدا بەكار دەهێنن، تاكو دەست لە گەرووی ئیمانەكەی توند دەكەن و، لە ڕێی بڵاوكردنەوەی دوودڵی و گومانەكانەوە پەنجەرە و كلاوڕۆژنەكانی لەسەر ئەو نوورەی ئیمان لێ دادەخەن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە جیهانی مرۆڤ هیچ كاتێ بە تەواوی دەستبەرداری ئەو گوفتار و كردارانە نابێت كە دژی ڕواڵەتی شەریعەتن، تەنانەت لای هەندێ كەس لە پێشەوایان لە پلەی كوفریشدا دانراون.

بۆیە لە هەموو كاتێكدا، بەڵكو لە هەموو ڕۆژێكدا، تەنانەت لە هەموو سەعاتێكدا، مرۆڤ پێویستی بە نوێكردنەوەی ئیمانەكەیەتی.

**پرسیار:**

"زانایانی كەلام" دوای ئەوەی لە ڕێی زەینەوە بەسەر هەموو جیهاندا زاڵ دەبن، كە ناوی "ئیمكان" و "حدووث"یان لێ ناوە، ئنجا تەوحید دەچەسپێنن.. بەشێكی "ئەهلی تەسەووف"یش بۆ ئەوەی دڵنیایی و دڵئامادەییان دەست بكەوێت و، دوای ئەوەی كە پەردەی لەبیرچوونەوەیان بەسەر بوونەوەراندا دادایەوە، وتوویانە: "لا مشهود إلاّ هو"، بەشێكی تریشیان بۆ بەدەستهێنانی دڵنیایی و دڵئارامی، بوونەوەرانیان وەك ئەندێشە دانا و خستیاننە ناو عەدەمەوە و وتیان: "لا موجود إلاّ هو".. كەچی تۆ ڕێبازێكی تری جیاواز لەم هەموو مەشرەبانە دەگریتەبەر و ڕێبازێكی ڕاست و دروست لە قورئانی پیرۆزەوە ڕوون دەكەیتەوە و "لا مقصود إلاّ هو.. لا معبود إلاّ هو"یشت كردووە بە دروشمی ئەم بەرنامەیە. جا تكامان وایە كە بە پوختی تەنها یەك بەڵگەی تایبەت بە تەوحیدی ئەم ڕێبازە قورئانییەمان بۆ ڕوون بكەیتەوە.

**وەڵام:**

هەرچی لـە "وتـەکان" و "مـەکتووبات"دا نووسـراون، ئـەو ڕێبـازە ڕاسـت و دروسـتە ڕوون دەکەنەوە.

بەڵام ئێستا، لەبەر حەز و ئارەزووی ئێوە، ئاماژەیەکی یـەکجار پوخـت بـۆ تەنـها یـەك دانە بەڵگەی گەورە و فراوان و دوور و درێژی نێوان بەڵگە گومانبڕەکانی دەکەین:

هەموو شتێکی ناو ئەم جیهانە، سەرجەمی شتانی تر دەداتە پاڵ بەدیهێنـەری خـۆی و.. هەموو ئاسەوارێکیش لەم دنیایەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گشت ئاسەوارەکانی تریـش هەر هی ئەو کاریگەر و ئاسەوارجێهێڵەن و.. هـەموو کـارێکی لەمـەڕ بەدیـهێنانیش لـەم گەردوونـەدا دەیچەسـپێنێت کـە سـەرجەمی کارەکـانی "بەدیـهێنان" کـاری بکـەر و بەدیهێنەرەکەی خۆین و.. هەموو ناوێکیش لە ناوە جوانەکانی خوای گـەورە کـە بەسـەر بوونەوەرانەوە دەدرەوشێنەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکـەن کـە سـەرجەمی ناوەکـانی تریـش هـی خاوەنی ئەو ناوەن. واتە هەرچی شت هەیە بەڵگەیەکی ڕوونی "یەکتایی"یە و پەنجەرەیەکە کە بەسەر "ناسینی خوای گەورە"دا خراوەتە سەرپشت.

بـەڵێ، هـەرچی ئاسـەوار هەیـە، بە تایبـەت زینـدەوەر، نموونەیـەکی بچووککـراوەی بوونەوەرانە و، وەك ناوکی جیهان و بەری درەختی گۆی زەوی وایە. لەبـەر ئـەوە، دەبێ بەدیهێنەری ئەو نموونە بچووککراوەیە و دروستکەری ئەو ناوك و بـەرە، هـەر ئـەو کەسـە بێـت کـە سەرانسـەری بوونەوەرانیشـی بـەدی هێنـاوە، چونکـە هـەرگیز نـاگونجێت بەدیهێنەری "بەر" کەسێکی تری جگە لە بەدیهێنەری "درەخت"ەکەی بێت.

ئنجا هەروەك هەموو یەکێکی ئەو ئاسەوارانە سەرجەمی ئاسەوارەکان دەداتە پاڵ ئـەو کاریگەرەی کە ئەو ئاسەوارەی تێدا جێ هێشـتووە، هـەموو کـارێکیش وەهایـە، چونکـە سەرجەمی کارەکانی تر دەداتە پاڵ بکەری خۆی. ئەوەتا هەر کارێکی لەمەڕ "بەدیهێنان" دەبینین، هەست دەکەین کە چمکێکە لە یاسایەکی بەدیهێنەرانەی ئـەوتۆ دەردەخـات کـە بە ئەندازەی گەردوون فراوانە و، فـەرمان و درێژایی‌یەکەشـی هـەر لـە گەردیلەکانـەوە تـا گەلەستێرەکان دەگرێتەوە. واتە ئەو کەسەی کە خاوەن و بکەری ئـەو کـارە جوزئی‌یـەی لەمـەڕ بەدیهێنانـە، دەبێ هـەر ئـەو کەسە بکـەری سـەرجەمی ئـەو کارانـەش بێـت کـە پـەیوەندی‌یان بـەو یاسـا کوللـی و فـراوان و گـەردوونگیرەوە هەیـە کـە هـەر لـە گەردیلەکانەوە تا خۆرەکان دەگرێتەوە.

کەواتــە ئەو کەســەی مێشــوولەیەك زینــدوو دەکاتــەوە، دەبــێ هــەر ئــەویش زیندوو کــەرەوەی ســەرجەمی مێرووەکــان، بــەڵکو گشــت زینــدوەران، تەنانــەت زیندوو کەرەوەی سەرتاسەری گۆی زەویش بێت.

پاشان ئەو کەسەی گەردیلەکانی خستووەتە دۆخێکی وەهاوە کە وەك موریدی تەریقەتی مەولەوی: بە جەزبەی خۆشەویستی بخولێنەوە، دەبێ هەر ئەویش بێت کە سەرجەمی بوونەوەران بە وێنەی زنجیرەی یەك لە دوای یەك، تا دەگاتە خۆر و هەسارە گەڕۆکەکان، بجووڵێنێت. چونکە ئەو یاسایەی کە لە بوونەوەراندا دەست بەکارە، زنجیرەیەکە بە یەکترەوە پەیوەستن و کارەکانیش بەو یاسایەوە بەستراونەتەوە.

بەو واتایەی کە هەرچی ئاسەوار هەیە سەرجەمی ئاسەوارەکانی تر بۆ هەمان کاریگەر(مؤثــر)ی خۆی دەگێڕێتەوە، هەروەك گشت کارێکی لەمەڕ بەدیهێنانیش سەرجەمی کارەکانی تر دەداتە پاڵ هەمان بەدیهێنەر و بکەری خۆی. هەروەها هەرکام لەو ناوە جوانانەش کە بەسەر بوونەوەرانەوە دەبینرێن سەرجەمی ناوەکانی تر دەگێڕێتەوە بۆ خاوەن ناوەکەی خۆی و دەیچەسپێنێت کە هەموویان ناونیشانی ئەون. چونکە ئەو ناوە جوانانەی کە بە گەردوونەوە دەدرەوشێنەوە، بە وێنەی بازنە هاوچەقەکان و حەوت ڕەنگەکانی خۆر، تێهەڵکێشی یەکترین و هەر یەکەیان پشتی ئەوی تر دەگرێت و یارمەتیی دەدات و شوێنەوارەکەی تەواو دەکات و دەیڕازێنێتەوە..

بۆ نموونە: کاتێ ناوی "المحیی" لە شتێکدا دەردەکەوێت و ژیان بە زیندەوەرێك دەبەخشێت، یەکسەر ناوی "الحکیم"یش دەردەکەوێت و جەستەی ئەو زیندەوەرە، کە نیشتەجێی گیانیەتی، ڕێکدەخات. هەر لە هەمان کاتدا ناوی "الکریم"یش دەدرەوشێتەوە، چونکە ئەو هێلانە و نیشتەجێیە دەڕازێنێتەوە. هەر لەو دەمەدا ناوی "الرحیم"یش دەدرەوشێتەوە، چونکە پێداویستییەکانی ئەو جەستەیە ئامادە دەکات، هەر لە هەمان کاتدا ناوی "الرزاق"یش بە درەوشانەوەی خۆی ئامادە دەبێت، چونکە ڕۆزییە ماددی و مەعنەوییە پێویستەکانی ئەو زیندەوەرە بە چەشنێك کە لە حیسابی خۆیدا نەبوو بێت، دەبەخشێت و ئامادەی دەکات... بەم جۆرە هەتا دوایی..

واتە: ناوی "المحیی" هی کێ بێت، ئەوا ناوی "الحکیم"یش کە گەردوونی ڕووناك کردووەتەوە و دەوراندەوری داوە، هی ئەوە و.. ناوی "الرحیم"یش کە بە میهرەبانی و شەفەقەت بوونەوەران پەروەردە دەکات هی ئەوە و.. ناوی "الرزاق"یش کە ڕۆزی بەسەر بوونەوەراندا دەبارێنێت هەر هی ئەوە... هتد.

بەو واتایەی کە هەموو ناوێك و، هەموو کارێك و، هەموو ئاسەوارێك: بەڵگەی "یەکتایی" و مۆری "تەوحید" و "تاکی"ی خواوەندن، بە ڕادەیەك کە ئەو وشانەی بریتین لە بوونەوەرانی نووسراوی ناو لاپەڕەکانی گەردوون و دێڕی چەرخەکان، لە ڕاستیدا نووسینی قەڵەمی نەخشەکێش و وێنەکێشی ئەزەلیی خۆیانن.

اللهم صل على من قال: "أفضل ما قلت أنا والنبيّون من قبلي: لا إله إلاّ الله"(١) وعلى آله وصحبه وسلم.

## مەسەلەی پێنجەم

دووهەم:

برام! لە نامەکەتاندا پرسیارتان سەبارەت بە کیفایەتی تەنها "لا إله الاّ الله" کردووە. واتە: ئایا ئەم وشەیە بێ ئەوەی "محمد رسول الله"ی لەگەڵدا بێت مرۆڤ دەکات بە ئەهلی نەجات؟

ئەم پرسیارە وەڵامێکی درێژ خایەنی دەوێت، بەڵام ئێستا هەر هێندە دەڵێین کە:

دوو وشەی شایەتمان لە یەکتر جیا نابنەوە، بەڵکو یەکتر دەگرنەخۆ و دەیچەسپێنن، کەواتە هیچیان بێ ئەوی تر نابێت.

جا مادەم پێغەمبەر ﷺ دواهەمینی پێغەمبەرانە - درووودیان لەسەر بێت - و میراتگری هەموویانە، ئەوا بێ گومان ڕێگاکەشی لە پێشەکی و سەرووی گشت ئەو ڕێگایانەوەیە کە مرۆڤ بە خواوەند دەگەیەنن. کەواتە هیچ ڕێگایەکی حەق و هۆکارێکی ڕزگاربوونیتر جگە لە ڕێگای گەورە و ڕاستەشەقامەکەی ئەو لە گۆڕێدا نییە.

سەرجەمی پێشەوایانی زانست و ئەهلی تەحقیق ئەو ڕاستییە دەڵێن کە سەعدی شیرازی دەریبڕیوە و وتوویەتی:

---

(١) جزء من حديث: (أفضل الدعاء يوم عرفة، وافضل ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلاّ الله وحده لاشريك له). رواه مالك عن طلحة بن عبيد الله بن كرير مرسلاً، وأخرجه الترمذي وحسنه عن عمر بن شعيب عن أبيه عن جده بلفظ: خير الدعاء يوم عرفة وزاد: له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير. ورواه البيهقي عن أبي هريرة بلفظ: أفضل الدعاء دعاء يوم عرفة وأفضل قولي وقول الأنبياء قبلي لا إله إلاّ الله.. (كشف الخفاء ١/١٥٣) وأخرجه الأصبهاني في الترغيب (١/٣٣١ المدينة) بلفظ مقارب عن عمرو عن المطلب كما في الصحيحة: ٤/٨٠٧ وقال هذا مرسل حسن الإسناد وحسنه لشواهده وانظر موطأ الإمام مالك برقم: ٥٠٠ و٩٥٥ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم: ١١١٣.

محال است سعدی به راه نجات ظفر بردن جز در پی مصطفی

واتە:

سەعدی! مەحاڵە بێ ڕێی مستەفا کەس زەفەر ببات بە ڕێگەی نەجات

هەروەها وتوویانە: هەموو ڕێگایەك داخراوە جگە لە بەرنامە و ڕێبازی محەممەدی ﷺ.

بەڵام هەندێ جار ڕێ دەکەوێت کە هەندێ کەس ڕاستە شەقامی ئەحمەدی دەگرنە بەر، بێ ئەوەی بزانن کە ئەوە جادەیەکی ئەحمەدی‌یە، یان لە ناوەندی ئەودایە..

هەندێ جاری تر ڕێ دەکەوێ پێغەمبەر ﷺ ناناسن، بەڵام ئەو ڕێیەی گرتوویانەتە بەر بەشێکە لە جادەی ئەحمەدی..

هەندێ جاری تر یان بەهۆی حاڵەتی جەزبە و ئیستیغراقەوە یان لەبەر هۆکارێکی بارودۆخی گۆشەگیری، بیر لە جادەی محەممەدی ناکەنەوە و تەنها بە "لا إلــه إلاّ اللّه" کیفایەت دەکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، گرنگترین ڕووی ئەم کارانە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

"نەبوونی قبووڵ کردن" شتێکە و "قبووڵ کردنی نەبوون"یش شتێکی تری جیایە لەو. جا ئەو جۆرە کەسانەی لە ئەهلی جەزبە[1] و گۆشەگیرین و، پێغەمبەر ﷺ ناناسن و ناویان نەبیستووە و هیچی لە بارەوە نازانن و، کەسانی هاوچەشنیان کە بیریان لە پێغەمبەر ﷺ نەکردووەتەوە تاکو قبوولی بکەن و پێی ڕازی بن، ئەوا لەو حاڵەدا بە نەزان و جاهیل دەمێننەوە و لە بواری ناسینی خوادا جگە لە "لا إلــه إلاّ اللّه" هیچی تر نازانن. جا هەموو ئەوانە، لەوانەیە لە ئەهلی نەجات بن..

بەڵام ئەو کەسانەی کە ناوی پێغەمبەریان ﷺ بیستووە و شارەزای بانگەوازەکەی بوون، گەر تەسدیقی نەکەن، دەچنە ڕیزی ئەوانەی کە خوا ناناسن و باوەڕیان پێی نی‌یە. چونکە وتنی "لا إله إلاّ اللّه" لە لایەن ئەو چەشنە کەسانەوە هەرگیز ئەو تەوحیدەیان پێ نابەخشێت کە مایەی نەجات و ڕزگاربوونە. چونکە ئەو حاڵەتەی ئەوان ئەنجامی نەبوونی قبووڵ کردنێك نی‌یە کە لە نەزانی‌یەوە سەرچاوەی گرتبێت و بە عوزر دابنرێت، بەڵکو قبووڵ کردنی نەبوونە و ئینکاری‌یە. خۆ ئەو کەسەش ئینکاریی ئەو محەممەدە ﷺ

---

(١) مەبەست ئەو جۆرە کەسانەیە کە هێندە شەیدا و مەستی جوانیی خوای گەورەن کە ئاگایان لای خۆیان نەماوە. (وەرگێڕ)

بکات کە بە موعجیزات و ئاسەوارە مەزنەکانی بووە بە مایەی شانازیی گەردوون و شەرەفمەندیی گرۆی مرۆڤ، بێ هیچ گومانێك، تەنانەت یەك ڕووناکییشی دەست ناکەوێت و ئیمانیشی بە خوا نابێت.

بە هەر حاڵ، بەم ئەندازەیە واز لە باسەکە دەهێنین.

## مەسەلەی شەشەم

سێ هەم:

چەند دەستەواژەیەکی بێزلێکراوی ڕێبازی شەیتان لەو گفتوگۆیەدا بەکار هێنراوە کە لە باسی یەکەم لەگەڵ شەیتاندا ئەنجام درا. جا سەرەڕای ڕاستکردنەوە و تەنککردنەوەی ئەو دەستەواژانە بە وشەی: "حاشا هەرگیز وا نییە" و دەرخستنی لە شێوەی فەرزی مەحاڵدا، کەچی هەر لەتاو سام و مەترسیی بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانە تەزوو بە جەستەمدا دەهات.

پاشان هەندێ سووکەڵە ڕاستکردنەوە و دەستکاری لەو بەشەیدا کراوە کە بۆتان ڕەوانە کرا، ئایا نوسخەکەی خۆتان لە ڕۆشنایی ئەو دەستکارییانەدا ڕاست کردووەتەوە؟ من ئێوە دەکەم بە جێگر و وەکیلی خۆم و دەتوانن هەر دەستەواژەیەك بە زیاد دەزانن لای ببەن.

ئەو باسە زۆر گرنگە، چونکە مامۆستای زەندیقەکان شەیتانە. جا ئەگەر شەیتان بە بەڵگەی ڕوون نەبەسترێتەوە و دەمکوت نەکرێت، ئەوا چاولێکەر و شوێنکەوتووانی، قەناعەت ناکەن و مل نادەن.

قورئانی حەکیم لە بواری بەرپەرچدانەوەی گوفتاری کافراندا هەندێ دەستەواژەی ناشیرینی ئەوانی بەکارهێناوە. ئەمەش جورئەتی پێ بەخشیم کە بێنرخی و بێ کەڵکیی تەواوەتیی ئەو ڕێبازەی شەیتان دەربخەم و، بە ترس و لەرزەوە ئەو دەستەواژانەم بەکارهێنا کە نەفامی و گەوجییەك دەردەخات دەستە و پێڕی شەیتان بەپێی خواستی ڕێبازەکەیان ناچاربوون قبوولی بکەن و بەکاری بهێنن و بە زمانی ڕێبازەکەیان دەری ببڕن.

ئیتر لە شێوەی فەرزی مەحاڵدا ئەو دەستەواژانەم بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی دەربکەوێت کە ڕێبازی شەیتان بە تەواوی و یەکجارەکی بێ کەڵك و خراپە. بەم بەکارهێنانەش لە بنکی بیرەکەدا بەستمنەوە و دەستمان بەسەر هەموو مەیدانەکەدا گرت و کردمان بە

مولّکی قورئان و لە پێناوی ئەودا بەکارمان هێنا و هەرچی گوفتاری ناڕەوا و فڕوفێڵی پەنهانیشیان هەیە ئاشکرامان کردن. فەرموو لە ناوەندی ئەم نموونەیەوە بۆ ئەم سەرکەوتنە بڕوانە:

وا گریمان دەکەین کە منارەیەکی هێندە بەرز هەیە سەری لە ئاسمان گیر کردووە و ژێرەکەشی ڕاستەوخۆ بیرێکی یەکجار قووڵە کە بنکەکەی لە چەقی زەویدایە و، ئنجا دوو دەستە و تاقمیش هەن موناقەشەیان لەسەر چەسپاندن و دەستنیشانکردنی شوێنی بانگوێژەکەیە، کە دەنگی بە گوێی هەموو کەسێکی سەرانسەری ولات دەگات. واتە: گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەو بانگوێژە لە کام پلەی منارەکەدا ڕاوەستاوە: هەر لە ئاسمانەوە بۆ چەقی زەوی؟!

دەستەی یەکەم دەڵێن: ئەو بانگوێژە لەسەر لوتکەی منارەکەدایە و لەوێوە بانگ دەڵێت و دەیدات بە گوێی سەرانسەری جیهاندا، چونکە خۆمان گوێمان لەو بانگە بەرز و دەنگە خۆشەیە. خۆ هەرچەند هەموومان ناتوانین لەو شوێنەی خۆیدا ببینین، بەڵام هەریەکەمان بەپێی پلەی خۆی دەیبینێت کاتێ سەردەکەوێت بە منارەکەدا و پاشان دێتە خوارەوە، ئیتر بەم سەرکەوتن و هاتنە خوارەوەیەی دەزانرێت بانگوێژەکە بە منارەکەدا سەر دەکەوێت. ئیتر لە کام پلەی منارەکەدا بێت ئەوە دەگەیەنێت کە خاوەنی پلەیەکی بەرزە.

بەڵام تاقمەکەی تر دەستە و تاقمی شەیتانی گەوج و نەفامن کە دەڵێن:

– نەخێر، شوێنی بانگوێژەکە بنکی بیرەکەیە، نەك لوتکەی منارەکە. با لە هەر شوێنێکی تریشدا ببینرێت!

لە کاتێکدا کە هیچ کەسێك لە بنکی بیرەکەدا نەیدیوە و ناشتوانێت لەوێ ببینێت. مەگەر ئەو بانگوێژە بەردێکی قورسی بێ ویست و ئیرادە بێت و تەنها لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت لەوێ ببینرێت.

ئنجا دەبێ بزانین کە گۆڕەپانی ململانێ و گفتوگۆی نێوان ئەم دوو دەستە و تاقمە نەیارە بریتییە لەو ماوە درێژەی نێوان لوتکەی منارەکە و بنکی بیرەکە..

کۆمەڵی ئەهلی نوور، کە حیزبی خوان، سەبارەت بەوانەی کە دەتوانن لوتکەی منارەکە ببینن پیشانی دەدەن کە شوێنی ئەو بانگوێژە لەو لوتکەیەدایە. سەبارەت بەوانەش کە کورت بینن و ڕوانینیان ناگاتە پلە هەرەبەرزەکان، دەری دەخەن کە ئەو بانگوێژە لە

پلەیەکی بەرزی پلیکانەی منارەکەدایە. واتە هەرکەسە و بەپێی مەودا و ئاسۆی بینینی خۆی پلەی بەرزی بانگوێژەکەی بۆ دەردەخەن. لەبەر ئەوە، نیشانەیەکی بچووك بۆ ئەوان سەروزیادە و بۆیان دەچەسپێنێت کە ئەو بانگوێژە بەرێزە جەستەیەکی بێ گیانی وەك بەرد نی یە، بەڵکو مرۆڤێکی کامڵە و دەتوانێت بۆ بەرزترینی پلەکان سەر بکەوێت و، لەو کاتەشدا کە لەوێ بانگ دەڵێت، دەتوانرێت ببینرێت.

بەڵام تاقمەکەی تر، کە حیزبی شەیتانن، دەڵێن: یان دەبێ پیشانمان بدەن کە لە لوتکەی منارەکەدایە، یان پلەی ئەو لە بنکی بیرەکەدایە! ئیتر بە نەفامی و گەوجی یەکی نەبراوە و بێ کۆتایی، ئەم بڕیارە هەڵەیە دەردەکەن..

چونکە ئەوان - لەبەر نەفامی و گەوجی یان - نازانن کە دەرنەکەوتنی بانگوێژەکە بۆ هەموو کەسێك لەسەر لوتکەی منارەکەدا هی دەستەوسانی و کۆڵەواریی خەڵکە لە بەرزبوونەوەیاندا بۆ ئەو پلەیە. ئنجا دەیانەوێت خەڵکی بە هەڵەدا بەن و لوتکەی منارەکە نەبێت دەست بەسەر هەموو ئەو ماوە دوور و درێژەدا بگرن.

جا بۆ یەکلایی کردنەوەی گفتوگۆی نێوان هەردوو دەستە و تاقمەکە، یەکێك دەرپەڕی یە مەیدان و، ڕووی لە حیزبی شەیتان کرد و، پێی وتن:

- ئەی کۆمەڵە شوومەکە! گەر پلەی ئەو بانگوێژە مەزنە لە بنکی بیرەکەدا بوایە، دەبوو بێ گیان و ژیان و بێ هێزێکی وەك بەرد بوایە و لە هیچ پلەیەکی منارە و بیرەکەدا نەبینرایە. خۆ مادەم لە هەموو پلەکاندا دەیبینین ئەوا بێ گومان: نە بێ گیانە و نە بێ حەقیقەت و ژیانیشە، بەڵکو دەبێ لە لوتکەی منارەکەدا بێت. لەبەر ئەوە، یان دەبێ دەری بخەن کە لە بنکی بیرەکەدایە - کە ئەمەشتان هەرگیز لە توانادا نی یە و ناشتوانن هیچ کەسێکی قەناعەت پێ بکەن - یان بێدەنگ بن! چونکە مەیدانی بەرگری کردنتان تەنها بنکی بیرەکەیە و پاشماوەی مەیدان و ماوە درێژەکە هی ئەم کۆمەڵە پیرۆزەیە. چونکە ئەوان لە هەر شوێنێکی تری غەیری بنکی بیرەکەدا دەری بخەن ئەوا کێشەکە دەبەنەوە!

جا ئەو باسی گفتوگۆیەی کە لەگەڵ شەیتاندا ساز کراوە، وەك ئەم نموونەیە وایە و، مەیدانە فراوان و درێژەکە هەر لە عەرشەوە تا فەرش لە دەستی حیزبی شەیتان دەسێنێتەوە و لە تەسکترین شوێندا - کە بنکی بیرەکەیە - تەنگیان پێ هەڵدەچنێت و ناچاریان دەکات خۆیان بە تەسکترین کون و کەلەبەردا بکەن کە هەرگیز ناتوانن پیای دا

بڕۆن و گوزەر بکەن، بەڵکو کارێکی مەحاڵ و دوور لە ژیریشە. لە هەمان کاتیشدا و بە ناوی قورئانەوە دەست بەسەر هەموو ماوەکەدا دەگرێت.

جا ئیتر دوای ئەمە، گەر پێیان بوترێت: پلەی قورئان چۆن دەبینن؟ دەڵێن:

کتێبێکی ئینسانی‌یە و خەڵکی بۆ "ڕەفتاری جوان" ڕێنمایی دەکات. ئا لێرەدا یەکسەر دەگیرێن و پێیان دەوترێت:

کەواتە گوفتاری خوایە و ناچاریشن ئەم دەرەنجامە قبووڵ بکەن، چونکە ئێوە بەپێی ڕێبازەکەتان ناتوانن بە شتێك بڵێن "جوان". کەچی وا وتتان!

هەروەها گەر پێیان بوترێت: پێغەمبەر ﷺ چۆن دەناسن؟ دەڵێن:

- مرۆڤێکی خاوەن ڕەوشتی "جوان" و ژیریی لەڕادەبەدەرە.

ئا لێرەدا یەکسەر دەگیرێن و پێیان دەوترێت:

- کەواتە دەبێ ئیمانی پێ بهێنن، چونکە مادەم خاوەنی "ڕەوشتی جوان" و ژیریی بەرزی لەڕادەبەدەر بێت، ئەوا پێغەمبەری خوایە، چونکە وشەی "جوان" کە لە زارتان دەرچوو، لە ڕێبازەکەتاندا وجوودی نی‌یە.

دەتوانرێت - بەم جۆرە - ڕووەکانی تری حەقیقەت بۆ پاشماوەی ئاماژەکانی نموونەکە لێك بدرێتەوە.

جا لەسەر ئەم بناغەیە: باسی یەکەم کە ئەو موونازەرەیەی لەگەڵ شەیتاندا لەخۆ گرتووە، بە بچووکترین نیشانە و بەڵگە "ئەهلی ئیمان" ڕزگار دەکات، بێ ئەوەی پێویستیان بە زانینی موعجیزاتی ئەحمەدی و بەڵگە گومانبڕەکانیشی بێت. چونکە هەموو حاڵەتێکی ئەحمەدی و گشت ڕەوشتێکی محەممەدی ﷺ و هەریەك لە ڕەفتارە نەبەوی‌یەکانی وەك موعجیزەیەك وان لە موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ و ڕوونی دەکەنەوە و دەیچەسپێنن کە: پلە و پایەی ئەو لە بەرزترین پلەدایە و هەرگیز لە بنکی بیرەکەدا نی‌یە.

## مەسەلەی حەوتەم

مەسەلەیەك کە پەند و عیبرەتی تێدایە:

ناچار بووم ئیکرامێکی پەروەردگاری و پارێزگاری‌یەکی خوایی باس بکەم کە تایبەتن تەنها بە خزمەتی قورئانەوە. ئەمەش بە بەڵگە و ئاماژەی حەوت نیشانەی ئەوتۆ کە وره و هێزی مەعنەوی بە هەندێ لەو هاوڕێیانەم دەبەخشن کە دووچاری شوبهە و گومان بوون و لە خزمەتگوزاریی قورئاندا کەمتەرخەمی و سستی ڕووی تێ کردوون.

هەروەها بۆ ئەوەی هەندێ لەو هاوڕێیانەشم ڕزگار بکەم کە دەمار و هەستیان زۆر ناسکە و بە خێرایی هەڵدەچن.

ئەو حەوت نیشانەیەش چواریان هی چەند کەسێکن کە لە پێشدا هاوڕێ و دۆست بوون و، پاشان ڕۆشتنە دۆخی دوژمنایەتی کردنی ئەو لایەنەم کە بریتییە لە "خزمەتگوزاریی قورئان" نەك بۆ دوژمنایەتی کردنی "کەس و زات"ی خۆم. ئەم ڕەفتارەشیان لەبەر چەند ئامانجێکی دنیایی گرتەبەر، کەچی زللەی پێچەوانەی ئامانجەکانی خۆیان لێ درا!

سێ نیشانەکەی تر سەبارەت بە چەند کەسێکن کە هاوڕێ و دڵسۆزی ڕاستەقینە بوون و ئێستاش هەر وان. بەڵام بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی خۆشەویستی و ڕازی بوونی ئەهلی دنیا و دەستکەوتی دنیایی و خۆپاراستنیان لە بەلاّ و موسیبەت و گیروگرفتەکان، ئەو پیاوەتی و جوامەردیەیان نەنواند کە وەفا و برایەتی داخوازی دەبن. بەلاّم ئەم سێ هاوڕێیەم - بە داخەوە - سەرزەنشت و گلەییان - بە پێچەوانەی مەبەست و ئامانجەکەیانەوە - ئاراستە کرا.

کەسی یەکەم: لەوانەی کە بە ڕواڵەت دۆست بوون و پاشان ڕەفتاری دوژمنایەتییان لێ دەرکەوت: بەڕێوەبەرێکی بەرپرس بوو، کە بە پاڕانەوە و جەخت کردن و لە ڕێی بەکارهێنانی چەند هۆکارێکەوە داوای نوسخەیەکی لە کتێبی "وتەی دەهەم" لێ کردم و منیش نوسخەیەکم لەو وتەیە پێ دا. کەچی ڕۆشتە هەڵوێستی دوژمنانەوە و وازی لە هاوڕێیەتیم هێنا، تاکو پلەی کارمەندی و فەرمانبەرییەکەی بەرز بکرێتەوە و، کتێبەکەی لە شێوەی سکالاّ و هەواڵگەیاندندا تەسلیمی والی کردبوو! بەلاّم وەك ئاسەوارێکی ڕێزنان و ئیکرامی خوایی بۆ خزمەتگوزاریی قورئان، لە بریی ئەوەی لە کارمەندیدا پلەی بەرز ببێتەوە، دەرکرا و لەسەر کار لابرا!

دووهەم: بەڕێوەبەرێکی بەرپرسی تر بوو، کە ئەویش لە پێشدا هاوڕێ بوو، بەلاّم دوایی ڕۆشتە دۆخی دوژمنایەتی و موونافەسەوە، نەك بەرامبەر "کەسی من" بەلّکو بەرامبەر ئەو سیفەتەم کە "خزمەتگوزاری قورئانی پیرۆز"م، تاکو سەرگەورەکانی لە خۆی ڕازی بکات و ڕووتێکردنی ئەهلی دنیاش ڕووەو خۆی بەدەستبهێنێت. کەچی زللەیەکی پێچەوانەی ئامانجەکەی ئاراستە کرا و، لە کێشەیەکدا، کە بە بیر و ئەندێشەیدا نەهاتبوو، بڕیاری لەسەر دەرکرا!

پاشان داوای دوعای لە خزمەتگوزارێکی قورئان کرد. ئومێدە خوای گەورە ڕزگاری بکات، چونکە دوعاکەی بۆ کرا!

*سێهەم*: مامۆستای قوتابخانەیەك بوو کە بە ڕواڵەت هاوڕێمان بوو، منیش ڕووی بێ گەردی هاوڕێیەتیم بۆ دەرخست. بەڵام دوایی کەوتە دوژمنایەتی کردنم بۆ ئەوەی نەقڵی "بارلا" بکرێت. کەچی زللەیەکی پێچەوانەی ئامانجەکەی لێ درا، ئەوە بوو برا بۆ سەربازی و لە بارلا دوور خرایەوە!

*چوارەم*: مامۆستایەکی قوتابخانەیە، بە دیندار و حافظی قورئانی پیرۆزم دەبینی، بۆیە ڕووی هاوڕێیەتیی خاوێن و بێ گەردم لێ دەرخست، بەو هیوایەی خوای گەورە کاری خزمەتکردنی قورئانی پێ ببەخشێت. کەچی تەنها بە قسەی کارمەندێکی بەرپرس پشتی بەرداین و هەڵوێستێکی دووری لێ گرتین، تاکو ڕووتێکردنی ئەهلی دنیا بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، بەڵام زللەیەکی تەمێ کردنی بە پێچەوانەی ئامانجەکەی لێ درا، چونکە سەرپەرشتیاری کارەکەی زۆر بە توندوتیژی سەرزەنشتی کرد و، پاشان لە فەرمانبەرییەکەشی لا برا!

ئەم چوار کەسە، لەبەر ئەوەی ڕۆشتنە هەڵوێستی دوژمنایەتیی خزمەتکردنی قورئانەوە، زللەی تەمێ کردنیان چەشت.

بەڵام سێ کەسە هاوڕێ ڕاستەقینەکانم، لەبەر ئەوەی ئەو ڕەفتار و هەڵوێستە جوامێری و پیاوەتییەیان نەنواند کە هاوڕێیەتی و وەفاداری داخوازیەتی، ئەوا "بێدارکردنەوە"یان ئاراستە کرا، نەك زللە!

**یەکەم:**

کەسێکە لە قوتابییە جیددی و ڕاستەقینە و دڵسۆزەکانم کە لە بواری خزمەتکردنی قورئاندا گرنگییان بەدەست هێناوە و کەسێکی بەڕێزە و هەمیشە "وتەکان"ی دەنووسییەوە و بڵاوی دەکردنەوە. بەڵام بەهۆی هاتنی بەرپرسێکی گەورەی ڕەفتارنامۆ و، ڕووداني بەسەرهاتێکی تایبەتی و، بۆ ئەوەی لە لایەن ئەهلی دنیاوە دووچاری دەردەسەری نەبێت و خۆی لە شەڕیان بپارێزێت، وتەکانی شاردەوە کە خۆی نووسیبوونی و، بە چەشنێکی کاتییش وازی لە نووسینەوەی پەیامەکان هێنا..

کەچی تەقسیر و کەمتەرخەمی کردنی لە کاری خزمەتگوزاریی قورئاندا و وەستاندنی ئەو کارە، بارێکی ئەوتۆی بۆ فەراهەم هێنا کە بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق بیر لە چۆنیتی تەسلیم کردنی هەزار لیرەی جەزا و غەرامە بکاتەوە کە هاتبووە سەری! بەڵام هەر

ئەوەندەی نییەتی هێنا دەست بە نووسینەوەی پەیامەکان بکاتەوە و گەڕایەوە سەر باری پێشووی، یەکسەر لەو دەعوایەی کە لەسەری تۆمار کرابوو تەبرییە بوو، سوپاس بۆ خوا لە غەرامەدانی ئەو هەزار لیرەیە، سەبارەت بەوی فەقیرحاڵ، ڕزگاری بوو!

**دووهەم:**

هاوڕێیەکی بەوەفا و ئازا و جوامێرە کە ماوەی پێنج ساڵ دراوسێم بوو، بەڵام بۆ ماوەی چەند مانگێك نەیبینیم و تەنانەت هێندە سارد و سڕیی نواند کە مانگی ڕەمەزان و جەژنیش سەردانی نەکردم! ئەمەش بۆ ئەوەی ڕووتێکردن و ڕەزامەندیی ئەهلی دنیا بە تایبەت ئەو بەرپرسەی کە تازە هاتووە، بەدەست بهێنێت. بەڵام هیواکەی نەهاتەدی و ڕووبەڕووی پێچەوانەی ئامانجەکەی بووەوە، چونکە ئەو بەرپرسە دەستەڵاتەکەی جارانی نەما، لەبەر ئەوەی کێشەی گوندەکە کۆتایی پێ هات!

**سێهەم:**

مرۆڤێکی حافظی قورئان بوو، کە حەفتەی یەك دوو جار سەردانی دەکردم. پاشان لە مزگەوتێکدا بە پێشنوێژ دامەزرا و وازی لە من هێنا، تاکو بتوانێت مێزەر لەسەر بکات! تەنانەت جەژنیش نەهات بۆ لام. کەچی بە پێچەوانەی عادەت و ئامانجەکەی خۆیشی، مێزەری لەسەر نەکرد هەرچەندەش نزیکەی هەشت مانگ ئیمامەتی کردبوو!

ئەم چەشنە ڕووداوانە گەلێ زۆرن. بەڵام لەبەر ئەوەی هەستی هەندێ کەس زامدار نەکەم، باسیان ناکەم. لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم: هەرچەند ئەمانە چەند ڕووداوێکی دانە دانە بن و بە چەند نیشانەیەکی لاواز دابنرێن، بەڵام کۆبوونەوە و زۆربوونیان بەهێزیان دەکات و قەناعەت و دڵنیاییمان پێ دەبەخشێت کە ئێمە لە سایەی ئیکرامێکی خوایی و چاودێرییەکی پەروەردگاریدا این، لەو ڕووەوە کە "خزمەتگوزاری قورئان"ین، نەك لە ڕووی "کەس و زات"ی خۆمەوە. چونکە هیچ شتێك لە خۆمدا شك نابەم کە شایانی هیچ چەشنە ئیکرامێکی خوایی بێت.

جا دەبێ هاوڕێ خۆشەویستەکانم بە باشی ئەمە بزانن و گوێ بە وەهم و شوبهە و گومانەکان نەدەن. ئەمەشیان بە تایبەتی بۆ ڕوون دەکەمەوە، چونکە ئەم ئیکرامە ڕێزنانێکی خوایییە لە ڕووی خزمەتکردنی قورئانەوە و هەرگیز بۆ فەخر و شانازی نییە، بەڵکو شوکری خوای گەورەیە. چونکە فەرمانی خوا لەم بارەوە بە ڕاشکاوی دەفەرموێ:

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ (الضحى:١١).

## مەسەلەی هەشتەم

**(پرسیاری پەراوێزی نموونەی سێهەمی خاڵی سێهەمی هۆی پێنجەم لەو هۆیانەی کە لەم سەردەمەدا ڕێگا لە ئیجتیهادکردن دەگرن، کە لە وتەی بیست و حەوتەمدا باس کراوە)**

**پرسیارێکی گرنگ:**

هەندێ کەسی زانا و لێکۆڵەر دەڵێن:

لەبەر ئەوەی وشەکانی قورئان و ئەو زیکر و تەسبیحاتانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراون، هەموو لایەنە نیان و مەعنەوی‌یەکانی ئادەمیزاد ڕووناك دەکەنەوە و دەبن بە خۆراك بۆ ڕۆحی مرۆڤ، ئایا لەبەر ئەمە، باشتر نی‌یە کە هەموو قەومێك بە زمانە تایبەتی‌یەکەی خۆیان دایانبڕێژن، تاکو لە واتاکانی تێبگەن؟ چونکە وشەکان بە تەنها خۆیان مەبەستەکە ناهێننەدی و، لە ڕاستی‌دا تەنها قاڵب و پۆشاکی واتاکانن؟

**وەڵام:**

وشەکانی قورئان و تەسبیحاتی پێغەمبەر ﷺ بەرگی بێ گیان نین تاکو ئاڵوگۆڕ هەڵبگرن، بەڵکو وەك پێستی زیندووی لەش وان، بگرە ڕەوتی ڕۆژگار وای لەو وشە و تەسبیحاتانە کردووە کە لە ڕاستی‌دا بێن بەو پێستە زیندووە. خۆ گومانیش لەوەدا نی‌یە کە گۆڕینی پێست زیان بە لەش دەگەیەنێت.

پاشان ئەو وشە پیرۆزانەی نوێژ و، زیکر و، بانگ، بوون بە ناوی "عەلەم"ی واتا عورفی و شەرعی‌یەکانیان و، هەرگیز ناکرێت ناوی عەلەم بگۆڕرێت.

دوای سەرنجدانێکی ورد لە حاڵەتێك کە بە سەر خۆمدا هات، گەیشتمە ئەم حەقیقەتەی باسمان کرد. ئەو حاڵەتەش بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

لە ڕۆژی عەرەفەدا سەدان جار سوورەتی "ئیخلاص"م خوێند و بە بەردەوامی دووپاتم کردەوە، لەم کاتەدا سەرنجم دا:

هەندێ لە هەستە ناسکە ڕۆحی‌یەکانم، دوای ئەوەی کە لە ئەنجامی دووپات کردنەوەی ئەم سوورەتەدا خۆراکی خۆی وەرگرت، وازی هێنا و ڕاوەستا. چونکە

هێزی بیرکردنەوەم ڕووی کردە واتاکان، ئیتر ئەو هەستانە بەشی خۆیان وەرگرت و پاشان ڕاوەستان. (دڵ)یش کە تامی واتا ڕۆحی‌یەکان دەچێژێت و هەستیان پێ‌دەکات، ئەویش دوای ئەوەی بەشی خۆی لە ڕێگای دووپات کردنەوەی ئەم سوورەتەوە وەرگرت، ڕاوەستا.

لەگەڵ ئەمەشدا، لە ئەنجامی بەردەوام بوونم لەسەر خوێندنەوە و دووپات کردنەوەی سوورەتەکە، بۆم دەرکەوت کە هەندێ لەتائیفی مرۆڤ هەیە وا بە زوویی بێزار نابێت و، ئەو "بێ‌ئاگایی"یەش کە زیان لە هێزی بیرکردنەوە دەدات، زیان لەم نادات، بەڵکو ئەم هەر لەوەرگرتنی بەشی خۆی‌دا بەردەوامە، بێ ئەوەی پێویستی بە وردەکاری و بیرکردنەوەی لە واتاکان ببێت. چونکە ئەو لەتائیفانە تەنها واتا عورفی‌یەکانی ناوەڕۆکەکەی ئەو وشانەیان بەسە و، وشە و واتا کورتەکەی ئەو وتە بەپێز و بەپیت و تێر و تەسەلانە سەروزیادیانە. بەڵکو لەوانیە بیرکردنەوە لە واتاکان بێزاری‌یان بۆ پەیدا بکات. چونکە ئەو لەتائیفانە ئەوەندەی پێویستیان بە یادخستنەوە و ئاراستە کردن هەیە، بەو ئەندازەیە پێویستیان بە تێگەیاندن و فێرکردن نی‌یە.

لەبەر ئەوە، ئەو لەفزەی کە سەبارەت بە واتاکەی وەك پێست وایە بۆ لەش، تەنها خۆی سەروزیادە بۆ ئەنجامدانی کار و ئەرکی واتاکەی. بە تایبەت ئەو لەفزە عەرەبی‌یانە مایەی لێشاوێکی هەمیشەیی ڕووناکین، چونکە گوفتاری خواوەندی میهرەبان دەخەنەوە یادی مرۆڤ.

جا ئەم حاڵەتەی کە هەر بۆ خۆم تاقیم کردەوە، بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە:

حەقیقەتەکانی بانگ و، تەسبیحاتی نوێژ و، سوورەتی ئیخلاص و فاتیحە، کە هەمیشە دووپات دەبنەوە، گەر بە هەر زمانێکی تری جگە لە زمانی عەرەبی دەرببڕێن، زیانێکی زۆری دەبێت. چونکە ئەو لەتائیفە هەمیشەیی‌یانە، دوای ئەوەی سەرچاوە ڕاستەقینەکانی ئەو وشانەی خوا و پێغەمبەر ﷺ ون دەکەن، لە بەشە بەردەوامەکەی خۆیان بێ‌بەش دەبن. سەرەڕای ئەوەی کە بەلای کەمەوە، بۆ هەر پیتێکی (دە) چاکە لە دەست خوێنەرەکەی دەردەکات.

ئنجا لەبەر ئەوەش کە هەموو کەسێك لە نوێژدا خاترجەمی و حوزووری دڵی بە بەردەوامی بۆ نارەخسێت، ئەوا لە کاتی بێ‌ئاگایی‌دا، وشە و دەربڕینی وەرگێڕاوە مرۆڤانەکان تاریکیی خۆیان بۆ ناو ڕۆحی مرۆڤ دەنێرن. جگە لەمانە، زیانی تری هاوچەشنی ئەمانەشیان هەیە.

بەڵێ، هەروەك ئیمامی ئەبووحەنیفە - خوای لێ ڕازی بێت - فەرموویەتی: "لا الــه الاّ الله" عەلەمە بۆ تەوحید. ئێمەیش دەڵێین:

زۆربەی زۆر و ڕەهای وشەکانی زیکر و تەسبیحات، بە تایبەت وشەکانی بانگ و زیکر و نوێژ، وەك ئیسمی عەلەمیان لێ هاتووە. کەواتە سەیری واتا عورفی و شەرعی‌یەکانیان زیاتر دەکرێت، تاکو واتا زمانەوانی‌یەکانیان. لەبەر ئەوە، لە ڕوانگەی شەرعەوە هەرگیز گۆڕانیان مومکین نی‌یە.

ئەو واتایانەش کە دەبێ هەموو ئیماندارێك بیانزانێت، ئەوا هەموو کەسێکی عەوام، دەتوانێت لە ماوەیەکی یەکجار کەم و کورتدا پوختەی واتاکانیان فێر بێت.

ئایا چۆن عوزر و بەهانەی ئەو موسڵمانە وەردەگیرێت کە سەرانسەری تەمەنی دەباتەسەر و، لەو هەموو ماوەیەدا بیر و ژیریی خۆی بە کاروباری وەها پڕوپووچەوە سەرقاڵ دەکات کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بەمەوە نی‌یە، بەڵام بەشێکی کەمی کاتەکەی بۆ تێگەیشتنی ئەو واتایانە تەرخان ناکات کە کلیلی ژیان و بەختەوەریی هەمیشەیی ئەون؟ بگرە ئیتر چۆن بە موسڵمان و مرۆڤێکی ژیر دادەنرێت؟

ئایا کارێکی ژیرانەیە گەر: ئەو وشانەی کە گەنجینەی سەرچاوەکانی ئەو هەموو ڕووناکی‌یانەن، لەبەر کەمتەرخەمیی ئەو تەمبەڵانە تێك بدرێن؟

پاشان هەر ئیماندارێك بە هەر زمانێك بدوێت، کە دەڵێت: "سبحان الله" دەزانێت تەقدیسی پەروەردگاری خۆی دەکات. ئایا ئەم ئەندازەیەی بەس نی‌یە؟ خۆ ئەگەر بە زمانەکەی خۆی سەرنج و بیرکردنەوەی تەنها ئاراستەی واتاکانی بکات، ئەوا تەنها بەپێی ژیری و بیرکردنەوەی خۆی شتێك فێر دەبێت و، لە بەرەکەتی ئەو "لفظ"ە بێبەش دەبێت کە سەرچاوە و خولگەی بەشێکی ئەوەندە زۆری لێشاوی بەرەکەت و ڕووناکی‌یە کە سەدان ئەوەندەی بەشەکانی ئەو ژیری و بیرکردنەوەیە زیاترە. ئەمە سەرەڕای بێبەش بوونی لەو واتا کورتەی کە لەو لەفزەدایە و ئاوێتەی بووە.

بەڵێ، ئەو لەفزە عەرەبی‌یانە قودسییەت و، ڕووناکی و، گرنگی و، لێشاوی بەرەکەتی تایبەتیی خۆیان هەیە، چونکە: "گوفتاری خواوەند"ن!

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:**

وشە و لەفزەکانی قورئان، کە پارێزگار و سەرچاوەی "زەرووریاتی ئایینی"ن، هەرگیز ناگونجێ هیچ لەفزێکی تر بە هیچ جۆرێك جێیان بگرێتەوە و ئەو مەبەستەی ئەوان بگەیەنێت. چونکە ئەو وشانە پیرۆز و بەردەوامن. خۆ ئەگەر ئەو وشە

وەرگێڕراوانە هەندێ لە واتاکانی ئەمانـە بەدەستەوە بـدەن، ئـەوا بـە جۆرێکـی جوزئـی و کاتی دەبێت، نەك بە هەمیشە و بەردەوامی.

کاروبـارە ئایینیـیـەکانی غـەیری "زەروورییـاتی ئـایینی"ش پێویسـتیان بـە گۆڕینـی وشەکانیان نییـە، چونکـە ئەگـەر خەڵکی بـە بـەردەوامی وەعز و نەسیحەت و ڕێنمایی بکرێن، ئەوا پێویستییان بە واتاکانیان نامێنێت.

* * *

**ئەنجامی ئەم قسانە ئەمەیە کە:**

"شموولییەت" و فراوانیی زمانی عەرەبی و، ڕوونکردنەوەی خاوەن ئیعجازی وشـە و لەفزەکانی قورئانی پیرۆز، ڕێ لە وەرگێڕانی ئەو لەفزانـە دەگـرن. لەبـەر ئـەوە، هـەرگیز وەرگێڕانیان مومکین نییە و تەنانەت کارێکی مەحاڵیشە. ئـەو کەسـەی گومـانی لەمـەدا هەیە، با سەر لە "وتەی بیست و پێنجەم" بدات کە لە بارەی موعجیزاتی قورئانەوەیـە، بـا بـە چـاوی خـۆی پلـەی ئایـەتی پـیرۆزی قـورئـان ببینێـت لـە لایـەنی ئیعجـاز و، لـق لێبوونەوەی و، "شموولییەت" و، جوانی و، واتا بەرزەکانیەوە. جا لە کوێ ئەم کارانە بە وەرگێڕان ئەنجام دەدرێن، کە لە ڕاستیدا واتای کورت و قرتاو و ناتەواون؟

## مەسەلـەی نۆهەم

مەسەلەیەکی گرنگ و تایبەتە، یەکێك لە نهێنییەکانی "ویلایەت" دەردەخات.

ئەهلی حەق و ئیستیقامەت، کـە پێـیـان دەوترێـت: "ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت" و زۆرینەی گـەورەی جیهانی ئیسـلامی پێکدەهێنن، لە ڕێی شـــوێنکەوتنی تـەواوەتیی بێ زیـاد و کـەمی سـوننەتی پیرۆزەوە: حەقیقەتـەکانی ئیمـان و قــورئانیان وەك خۆیـان بـە خـاوێنی و بێ گـەردی پاراستووە و، لـە ئـەنجامی ئەمەشـدا زۆرینـەی ڕەهـای ئـەولیا و پیاوچاکان لە ناو ئەو کۆمەڵەدا پەیدا بوون. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا چەند ئەولیایەکی تـر بینراون کە لەسـەر ڕێیەکی پێچەوانـەی بناغـەکانی ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەتن و لـە هەندێکی دەستوورەکانی ئەوان لایان داوە..

جا ئەو کەسانەی کە ئەم دیاردەیەیان بینیوە، سەبارەت بەو ئەولیایانـەوە بـوون بـە دوو بەشەوە:

**یەکەم:**

ئەوانەن کە ئینکاریی ویلایەت و صەلاحی ئەو چەشنە وەلیانەیان کردووە، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی دەستوور و بناغەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕەفتار دەکەن. تەنانەت زیاد لەو ئینکاریەش لە بارەیانەوە دواون، چونکە هەندێك لەوانیان بە کافر لە قەڵەم داوە!

**بەشەکەی تر:**

ئەوانەن کە شوێنیان کەوتن و دانیان بە ویلایەتیاندا نا و لێیان ڕازی بوون و وتیان: حەق تەنها بە ڕێی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە نەبەستراوەتەوە! بەم قسەیەشیان دەستەیەکی بیدعەتکاریان پێکهێنا و جڵەوی خۆیان دایە دەستی گومڕایی و، ئەوەیان لەبیرچوو کە هەر کەسێك بۆ خۆی لەسەر ڕێی هیدایەت بێت مەرج نییە هیدایەتدەری غەیری خۆیشی بێت. خۆ ئەگەر شێخەکانیان، لەبەر ئەوەی مەجزووب بوون، چاو لە هەڵەکانیان بپۆشرێت، ئەوا ئەوان لە شوێنکەوتنیاندا عوزریان بە دەستەوە نییە و چاویان لێ ناپۆشرێت.

**بەشێکی تری سێهەم هەیە:**

ئەم بەشە ڕێیەکی مامناوەندییان گرتەبەر، چونکە ئینکاریی ویلایەت و صەلاحی ئەو چەشنە ئەولیایانەیان نەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕێچکە و ڕێبازەکەشیان ڕازی نەبوون و وتیان: ئەو گوفتارانەی کە پێچەوانەی بناغە و دەستوورە شەرعییەکانن و لە زاری ئەوانەوە دەرچوون: یان هی ئەوەیە چەشنە حاڵەتێکیان بەسەردا زاڵ بووە کە بە هەڵەیاندا بردوون، یان بریتین لە "شطحات" کە وەکو "متشابهات" وان و واتا و ئامانجەکانیان نازانرێت.

بەشی یەکەم، بە تایبەت زانایانی ئەهلی ظاهیر - بە داخەوە - ئینکاریی ویلایەتی گەلێ ئەولیای مەزنیان کرد بە نیازی پاراستنی ڕێی ئەهلی سوننەت، بەڵکو لە ڕێی ئەو نیازەوە ناچار بوون بڕیاری گومڕابوونیشیان دەربکەن! بەڵام ئەوانی تر کە پشتیان گرتن لەبەر خۆشباوەڕیی زیاد لە پێویستیان بە شێخەکانیان، وازیان لە ڕێی حەق هێنا و پشتیان تێ کرد. تەنانەت هەندێکیان هەر لە ڕاستیدا لافاوی گومڕایی ڕایماڵین.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە، حاڵەتێك هەبوو زۆر جار ئەندێشە و بیری سەرقاڵ دەکردم، کە بریتی بوو لەمەی خوارەوە:

لە كاتێكی گرنگدا لە خوای گەورە پاڕامەوە بەشێك لە گومڕایان لەناو بەرێت، كەچی هێزێكی مەعنەویی سامناك ڕێی لە دوعاكەم گرت و دایەوە بە سەرمدا و نەیهێشت جارێكی تر دوعای وا بكەم! پاشان بۆم دەركەوت كە هەندێك لە گومڕایان لە لایەن هێزێكی مەعنەوییەوە كاریان بۆ ئاسان دەكرێت و لەم ڕێیەوە لە كارە ناحەقەكانیاندا ڕۆ دەچن و لە دوژمنایەتی كردنی حەقیشدا پتر پێ ڕادەكێشن و خەڵكی لە پشت سەری خۆیانەوە بەرەو دۆزەخ ڕادەكێشن و، سەركەوتنیان لە كارەكانیاندا تەنها هی زۆرەملێ كردن نییە، بەڵكو بەشێكی ئیماندارانیش لەبەر مەیلێك لە لایەن هێزی ویلایەتەوە تێكەڵیان دەبن و پێیان دەخەڵەتێن. ئیتر ئەو ئیماندارانە چاوپۆشییان لێ دەكەن و هەست ناكەن ئەو گومڕایانە گرفتاری خراپە و فەسادێكی گەورە بووبن!

ئا لەم كاتەدا كە هەستم بەم دوو نهێنییە كرد، ترس و سەرسامی گرتمی و بە سەرسووڕمانەوە وتم:

– سبحان اللّٰه! ئایا دەگونجێ "ویلایەت"ێك هەبێت لەسەر ڕێی حەق نەبێت؟ یان ئایا دەگونجێت ئەهلی حەقیقەت و ویلایەت پشتی تەوژمی سامناكی گومڕایی بگرن؟

پاشان لە ڕۆژی پیرۆزی عەرەفەدا سوورەتی "ئیخلاص"م – لەبەر عادەتێكی ئیسلامیی جوان – سەد جار خوێند و جار لە دوای جار دووپاتم كردەوە. یەكسەر لەم كاتەدا و لە لایەن میهرەبانیی خواوەندەوە و بە بەرەكەتی ئەو خوێندنە، ئەم حەقیقەتەی خوارەوە بۆ ناو دڵی كۆڵەوارم هات، هەروەك وەڵامی پرسیارێكی گرنگیشی لەگەڵ خۆدا هێنابوو.

حەقیقەتەكەش ئەمەی خوارەوەیە:

هەندێك لە ئەولیاكان هەرچەند فام و ژیرییان پێوە دیارە و داوەریی ژیری و مەنتیقی ئەنجام دەدەن، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا مەجزووبن و، وەك "جوبالی بابا" وان كە بەسەرهاتەكەی لە سەردەمی سوڵتان محەممەد فاتیحەوە دەگێڕنەوە و بەسەرهاتێكی بەناوبانگ و پڕ لە پەندە[1].

---

(١) دەگێڕنەوە كە: وەلییەكی پیاوچاك بە ناوی "جوبالی بابا" لە قوستەنتینیەدا ژیاوە و گاورەكانی ئەوێی خۆش ویستووە و ئەوانیش خۆشیان ویستووە، بە تایبەت منالەكانیان كە ئەم گەلێ سۆز و بەزەیی بۆ دەنواندن. جا كاتێ كە سوڵتان محەممەد فاتیح شارەكەی گەمارۆ دا، ئەم وەلییە پیاوچاكە لە خوا دەپاڕایەوە كە تۆپەكانی سوڵتان نیشانەكانیان نەپێكن و ئەو منالە خۆشەویستانە ڕزگاریان بێت! لە ڕاستیشدا فەتحی ئەو شارە ماوەیەك دواكەوت و سوڵتان ڕاوێژی بە "ئاق شەمسەدین"ی مامۆستای كرد كە زانایەكی بەكردەوە و وەلییەكی پیاوچاك بووە. ئیتر ئاق شەمسەدین دوعای بۆ سەركەوتنی دەكرد و جوبالی بابایش بە پێچەوانەی ئەمەوە

بەشێکی تری ئەولیا هەرچەند لە ناوەندی ژیری و فام و بێداریدان، کەچی هەندێ جار چەند حاڵەتێك دەگرنەخۆ کە لە دەرەوەی ڕەفتاری ژیری و داوەریی مەنتیقیدایە. دەستەیەك لەم بەشەش ئەهلی ئیلتیباسن، واتە: لێیان دەئاڵۆزێت و ناتوانن شتان لە یەك جیا بکەنەوە. چونکە هەر مەسەلەیەك کە لە حاڵەتی "مەستی"دا دەیبینن دەچن بەسەر حاڵەتی "بێداری"دا پیادەی دەکەن و، بەم پێیە دەکەونە هەڵەوە و بە خۆشیان نازانن کە هەڵە دەکەن.

مەجزووبەکانیش هەندێکیان لە لایەن خواوەندەوە پارێزراون و لە ڕێ ناترازێن و تێکەڵی گومڕایان نابن، بەڵام بەشێکی تریان لە لایەن خواوەندەوە پارێزراو نین. ئەم بەشەیان لەوانەیە لە گومڕایان و ئەهلی بیدعەت بن، بەڵکو ئیحتیماڵی ئەوەش هەیە کە لە کافران بن!

بەم جۆرە، لەبەر ئەوەی هەندێکیان مەجزووبن – ئیتر ئەم مەجزووبییەیان بە شێوەیەکی کاتی بێت یان بەردەوام – ئەوا لە حوکمی چەند شێتێکی پاك و موبارەکدان. واتە حوکمی شێتیان بۆ هەیە. جا لەبەر ئەوەی چەند شێتێکی موبارەکن، ئەوا لە هەڵسوکەوتیاندا سەربەستن و تەکلیفیان ئاراستە ناکرێت. ئنجا لەبەر ئەوەش تەکلیفیان لەسەر نییە، ئەوا لەسەر هەڵسوکەوتیان موحاسەبە ناکرێن. جا لەبەر ئەوەی ویلایەتە مەجزووبەکەیان لە لایەن خواوەندەوە پارێزراوە، پشتی ئەهلی بیدعەت دەگرن و تا ڕادەیەك بەرەو بە ڕێبازەکانیان دەدەن و دەبن بە هۆکارێکی خراپ و شووم بۆ گیرۆدەبوون و ڕۆشتنی بەشێکی ئیمانداران و ئەهلی حەق بۆ ناو ئەو ڕێبازە!

* * *

---

دوعای دەکرد! تا لە ئەنجامدا ئاق شەمسەدین لە خوای گەورە پارابەوە جوبالی بابا لەناو بەرێ تاکو موسڵمانان سەربکەون. ئەوەبوو جوبالی بابا مرد و قوستەنتینیەش فەتح کرا! (وەرگێڕ)

## مەسەلەی دەهەم

**ئەم مەسەلەیە لەسەر بناغەی یادخستنەوەی هەندێك لە هاوڕێیان نووسرا، سەبارەت بە دانانی قاعیدە و دەستوورێك کە تایبەت بێت بەو کەسانەی سەردانم دەکەن.**

با هەموان بزانن کە ئەو کەسەی سەردانم دەکات:

یان لەبەر چەند کاروبارێکی تایبەت بە "ژیانی دنیا" دێت.. ئەوا با بزانێت کە ئەو دەرگایە داخراوە..

یان لە ڕووی ژیانی "ئەودنیا"وە دێت.. ئەو ڕووەش دوو دەرگای تێدایە:

یان پێی وایە من پیاوێکی پیرۆز و خاوەن پلە و پایەم لای خوای گەورە و لەبەر ئەمە دێت بۆ لامان، ئەوا ئەو دەرگایەش داخراوە. چونکە من لە نەفسی خۆم ڕازی نیم و ئەو کەسەشم ناوێت منی پێ باش بێت. هەردەم حەمد و سوپاسی زۆر و زەبەندە پێشکەش بە خوای گەورە دەکەم کە وای لێ نەکردووم لە خۆم ڕازی بم..

ڕووەکەی تر بریتییە لەوەی کە تەنها لەبەر ئەوە دێت بۆ لام و سەردانم دەکات کە من خزمەتگوزار و دەلاڵ و بانگەوازکاری قورئانی پیرۆزم. جا ئەو کەسەی لەم دەرگایەوە دێت، بەخێربێت و لەسەر چاوم و سەرم دایدەنێم.

ئنجا ئەوانەش کە لەم دەرگایەوە دێن، سێ جۆرن:

یان هاوڕێیە.. یان برایە.. یان قوتابییە.

تایبەتکاری و مەرجی **"هاوڕێ"** ئەوەیە کە:

بە جیددی و گەرموگوڕی لەم کارەماندا، کە بلاوکردنەوەی ڕووناکییەکانی قورئانە (پەیامەکانی نوور) پشتمان بگرێت و، لە دڵەوە مەیلی بەلای ناحەق و بیدعەت و گومڕاییدا نەبێت و هەوڵیش بدات سوود بە خۆی بگەیەنێت.

تایبەتکاری و مەرجی "برا"یش ئەوەیە کە:

بە چوستوچالاکی و هەوڵی ڕاستەقینە و جیددییەوە بۆ بلاوکردنەوەی "پەیامەکان" تێبکۆشێت، جگە لەوەی کە پێنج فەرزەی نوێژ جێبەجێ بکات و خۆی لە حەوت گوناهە گەورەکانیش بپارێزێت.

تایبەتکاری و مەرجی **"قوتابی"**یش ئەوەیە کە:

"پەیامەکانی نوور" وەك دانراوی خۆی بزانێت و بە تایبەتی بە هی خۆی دایانبنێت و، وەك ئەوەی مولکی خۆی بن بەرگرییان لێ بکات و، بلاوکردنەوەی ئەو رووناکییانە و کارکردن لەو پێناوەدا بە مەزنترین کارمەندی و ئەرکی ژیانی خۆی بزانێت.

جا ئەم سێ چینە پەیوەندییان بە هەر سێ لایەنەکەی کەسێتیی خۆمەوە هەیە..

هەرچی هاورێیە: پەیوەستی کەسێتیی زاتیمە و.. برایش: پەیوەندیی بە کەسایەتیی بەندەییمەوە هەیە، واتە لەو رووەوە پەیوەندیم پێوە دەکات کە ئەرکی بەندایەتیم بۆ خوای گەورە جێبەجێ دەکەم و.. قوتابییش: لەو گۆشەیەوە پەیوەندیی پێمەوە هەیە کە بانگەوازکار و دەلالی قورئانی حەکیمم و رێنمایی خەلکیی بۆ لا دەکەم.

ئەم چەشنە چاوپێکەوتنانەش سێ بەرهەمیان هەیە:

**یەکەم:**

ئەو کەسە دەرسی گەوهەرەکانی "قورئانی پیرۆز" یان لە من، یان لە پەیامەکانی نوور وەردەگرێت، با تەنها یەك دەرسیش بێت. ئەمە لە رووی بانگەوازەوە بۆ لای قورئان.

**دووهەم:**

لە رووی بەندایەتیمەوە بۆ خوای گەورە، دەبێت بە هاوبەشم لە پاداشتەکانی سەر بە دوارۆژمدا.

**سێهەم:**

هەموومان پێکەوە لە دلەوە پەیوەندی بە یەکەوە دەکەین و لە خزمەتی قورئاندا پشتی یەکتر دەگرین و روو دەکەینە میهرەبانیی خواوەند و داوای تەوفیق و هیدایەتی لێ دەکەین.

جا ئەگەر "قوتابی" بێت ئەوا هەموو رۆژێك بەیانیان بە ناوەکەی خۆی و هەندێ جار بە خەیال و ئەندێشە، لە لام ئامادەیە.

گەر "برا"ش بێت ئەوا جارجار بە ناوەکەی و شێوەکەی لە دوعاکانمدا ئامادەیە لە لام و، لە پاداشت و دوعادا بەشدارمە. پاشان لە ناوەندی سەرجەمی برایاندایە و بە میهرەبانیی خوای گەورەی دەسپێرم. چونکە کاتێ لەو دوعایەمدا دەلێم: "خوشکان و برایانم" ئەویش بەر دەکەوێت. خۆ ئەگەر راستەوخۆ زاتی ئەو نەناسم، ئەوا خوای گەورە لە من زیاتر دەزانێت و دەیبینێت و دەیناسێت.

ئەگەر "هاورێ"ش بێت ئەوا دوعاکەم هەر دەیگرێتەوە و، لەو ڕووەوە لە ناوەندی براکانمدایە بە گشتی، گەر فەرزەکان ئەنجام بدات و لە گوناهە گەورەکانیش دوورە پەرێز بێت.

دەبێ ئەو سێ چینەش من بخەنە ناو دەستکەوتەکانی سەر بە دوارۆژیانەوە.

اللهم صل على من قال: المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً وعلى آله وصحبه وسلم.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ للهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللهُ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾.

اللهم يا من أجاب نوحاً في قومه، ويا من نصر إبراهيم على أعدائه، ويا من أرجع يوسف إلى يعقوب، ويا من كشف الضر عن أيوب، ويا من أجاب دعوة زكريا، ويا من تقبّل يونس ابن متى..

نسألك باسرار اصحاب هذه الدعوات المستجابات أن تحفظني وتحفظ ناشر هذه الرسائل ورفقاءهم من شر شياطين الإنس والجن.

وانصرنا على أعدائنا.. ولا تكلنا إلى أنفسنا.. واكشف كربتنا وكربتهم.. واشف أمراض قلوبنا وقلوبهم. آمين. آمين. آمين.

* * *

# مەكتووبی بیست و حەوتەم

ئەم مەکتووبە چەند نامەیەکی جوان و ناسك و عەینی حەقیقەتن کە دانەر بۆ قوتابییانی خۆی نووسیون و، هەندێکیشیان ئەوان بۆ مامۆستاکەیان و بۆ یەکتریان نووسیوە لە بارەی ئەو سوودانەی کە لەم پەیامانەوە بەدەستیان هێناوە. جا لەبەر قەبارە گەورەیی ئەم مەکتووبە، کرا بە بەرگێکی سەربەخۆ بە ناوی (پاشبەندەکان) کە پێکهاتووە لە "پاشبەندی بارلا" و "پاشبەندی قەستەمۆنی" و "پاشبەندی ئەمیرداغ".

# مەکتووبی بیست و هەشتەم

### ئەم مەکتووبە هەشت مەسەلەیە

## مەسەلەی یەکەم

### کە پەیامی یەکەمە

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿إِنْ كُنْتُمْ لِلرُّؤْيا تَعْبُرُونَ﴾ (یوسف:٤٣)

دووهەم: برام! داوای لێکدانەوەی خەونە کۆنەکەتان کردبوو کە سێ ساڵ پێش ئێستا بینیبووتان، لە کاتێکدا کە سێ ڕۆژ دوای ئەوەی یەکترمان بینی تەعبیرەکەی دەرکەوت. جا ئایا مافی خۆم نییە لە بەرامبەر ئەو خەونە ناسك و پیرۆز و مژدەبەخشەی کە وەختی بەسەردا تێپەڕیوە و زەمانیش واتاکەی دەرخست، بڵێم:

نە شـــبم نە شـــب پرســـتم مـن　　غـلام شمسـم از شمس می گویم خبر[1]

آن خیـالاتی کـە دام اولیاســـت　　عکس مهرویان بوستان خداســـت[2]

---

(١) لە چاپە تازە فارسی‌یەکەی مەکتووباتی ئیمامی ڕەببانیدا (انتشارات صدیقی – زاهدان ١٣٨٣هـ.ش) ج١/ص٢٩٦ مکتوب شمارە ١٣ هەروەها ج٢/ص٢٠٧ بەم جۆرە نووسراوە:

چو غلام آفتابم همە از آفتاب گویم　　نە شبم نە شب پرستم کە حدیث خواب گویم

لە چاپە عەرەبی‌یەکەشدا (ج١/ص١٢٤ المکتوب ١٣٠ ، ج٢/ص١٠٣ المکتوب ٥٨): بەم جۆرە هاتووە

وإنـــي غلام الشمس أروي حديثها　　فما لـــي وللليل فأروي حديثه؟!

(وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: (مثنوی معنوی)ی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی ١٦/١ (چاپ انتشارات علمی). مامۆستا مەلا محەممەدی شلماشی بەم جۆرەی خوارەوە بۆی کردم بە کوردی:

ئەو خەیاڵانەی کە داوی ئەولیان　　عەکسی مەهرووویانی بێستانی خودان!

(وەرگێڕ)

بەڵێ برای ئازیزم! ئێمە وا ڕاهاتووین کە پێکەوە لەوانەی حەقیقەتی ڕووت و بێ گومان بدوێین و بکۆڵینەوە. لەبەر ئەوە، باسی زانستییانە لە بارەی خەونەوە - کە خۆی لە خۆیدا دەرگای ئەندێشەی لێ خراوەتە سەرپشت - بە تەواوی لەگەڵ ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستیدا ناگونجێ. بەڵام بە بۆنەی ئەو ڕووداوە جوزئییەی خەونەکەتانەوە وا بە چەشنێکی زانستییانە و لەسەر ئەو بناغە و دەستوورانەی کە لە حەقیقەتەوە هەڵێنجراون و بەو شێوەیەی کە ئایەتەکان ئاماژەیان بۆ دەکەن: شەش سەرنج سەبارەت بە "خەون"ەوە باس دەکەین کە هاوتای مردنە. ئنجا لە حەوتەمیشیاندا پوختە تەعبیرێك لە خەونەکەت دەدەینەوە:

❑ سەرنجی یەکەم:

گەلێ ئایەتی قورئانی پیرۆز چەشنی: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً﴾ (النبأ:٩) هەروەها ئەو خەونەش کە حەزرەتی یووسف - دروودی لەسەر بێت - بینی و بناغەی گرنگی سوورەتی یووسفە، دەریدەخەن کە گەلێ حەقیقەتی مەزن لە پشت پەردەی خەونەکانەوە خۆیان شاردووەتەوە.

❑ سەرنجی دووهەم:

ئەهلی حەقیقەت پێیان باش نییە "تەفائول" بە قورئانی پیرۆز بکرێت و حەزیش ناکەن پشت بە خەون ببەسترێت. چونکە:

قورئانی پیرۆز لە گەلێ شوێنیدا هەڕەشەی توندوتیژ لە کافران دەکات. ئەو کەسەش کە تەفائول بە قورئان دەکات لەوانەیە ڕووبەڕووی یەکێك لەو ئایەتە هەڕەشە ئامێزانە ببێتەوە و لەمەوە گرفتاری نائومێدی و نیگەرانی ببێت..

هەروەها هەندێ جار "خەون"یش بە پێچەوانەی واقیع و ڕاستی دەردەکەوێت و مرۆڤ بە شەڕ و خراپ لێکیدەداتەوە، هەرچەندەش خۆی لە خۆیدا خێر و باش بێت. ئیتر ئەم بۆچوونەی خۆی، بەرەو گومانی خراپ دەیبات و تووشی نائومێدیی دەکات و، بەرە بەرە، ورە و هێزە مەعنەوییەکانی ئەو کەسە لاواز دەبن و هەڵدەوەشێنەوە. ئەوەتا گەلێ خەون هەن کە بە ڕواڵەت ترسناك و ناشیرین و زیانبەخشن، کەچی واتا و لێکدانەوەکانیان گەلێ جوان و ڕەنگینە. بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك ناتوانێت پەیوەندیی نێوان شێوەی ڕواڵەتی و حەقیقەتی خەونەکەی بدۆزێتەوە، ئەوا بێ هیچ پێویستی و هۆیەك، تووشی نیگەرانی و خەم و خەفەت دەبێت.

هەر لەبەر ئەمەش بوو کە لە سەرەتای ئەم باسەدا، بە وێنەی ئیمامی ڕەببانی و زۆربەی ئەهلی تەحقیقی زانستی، وتم:

نه شبم نه شب پرستم.

❐ سەرنجی سێهەم:

لە فەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە کە "خەونی ڕاست" بەشێکە لە چل بەشی پێغەمبەرایەتی[1]. بەو واتایەی خەونی ڕاست: حەقە و، پەیوەندیی بە ئەرکە گرنگەکانی پێغەمبەرایەتی‌یەوە هەیە.

ئەم مەسەلە(سەرنج)یەی سێهەم گەلێ گرنگ و درێژخایەن و قووڵە و، پەیوەندیی بە ئەرکەکانی پێغەمبەرایەتی‌یەوە هەیە. بۆیە ئێستا ئەو دەرگایە دادەخەین و - پشت بە خوا - هەڵی دەگرین بۆ کاتێکی تر.

❐ سەرنجی چوارەم:

خەون سێ جۆرە؛ دوانیان بەر ئەو بەشە دەکەون کە قورئانی پیرۆز ناوی "أضغاث أحلام"(خەونی ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵ)ی لێ ناون و، تەنانەت گەر واتاشیان هەبێت هەر شایانی گرنگی و لێکدانەوە نین. چونکە ئەو چەشنە خەونانە: یان ئەنجامی وێنەکێشان و شێوەکاریی هێز و توانای ئەندێشەی ئەو مرۆڤەن کە میزاجی لە هێڵی سروشتیی خۆی لایداوە و ئیتر هێزی ئەندێشەکەی بەپێی جۆری ئەو لادان و ترازانە وێنە و شێوەکان پێکدەهێنێت..

یان ئەنجامی بە خەیاڵدا هاتنی چەند ڕووداوێکی ورووژێنەرن کە مرۆڤ بە ڕۆژدا، یان پێش ڕۆژێك، تەنانەت پێش یەك دوو ساڵ بینیوونی و ئێستا ئەندێشە ڕێکیان دەخاتەوە و وێنەیان بۆ دەکێشێت و شکڵ و شێوەیەکیان لەبەر دەکات.

ئەم دوو بەشە لە جۆری "خەونی ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵ"ن و هەرگیز شایانی لێکدانەوە نین.

بەڵام بەشی سێهەم بریتی‌یە لە: "خەونی ڕاست"(الرؤيا الصادقة).

---

(١) حديث: "رؤيا المؤمن جزء من أربعين جزءاً من النبوة" أخرجه الخطيب البغدادي في الموضح ٣٣٣/٢. وقد وردت أحاديث كثيرة بطرق أخرى منها: "رؤيا المؤمن جزء من ستة وأربعين جزءاً من النبوة" صحيح البخاري / كتاب التعبير، مسلم / كتاب الرؤيا، أبي داود (٥٠١٨)، ابن ماجة (٣٩١٤) مالك (تنوير الحوالك ١٣٠/٣) الديلمي في الفردوس (٣٢٨٨).

سەبارەت بەم بەشەیان: ئـەو لایەنـە ناسـكە پەروەردگاریـیـەی كـە لـە ماهییـەتی مرۆڤدایـە، دوای لـەكار وەسـتانی هەسـت و نەسـتەكانی سـەر بـە جیـهانی شـەهادە، كلاورۆژنەیەك لەسەر جیهانی غەیب دەكاتەوە و لەوێوە پەیوەندیی پێوە دەكات. ئیتر ئەو لایەنە ناسكە پەروەردگاریـیە لـەو كلاورۆژنەیـەوە بۆ چەند رووداوێك دەڕوانێت كە خۆیـان بۆ رووودان ئامـادە دەكـەن و، هـەندێ جـاریش بـە یـەكێك لـە درەوشـانەوەكانی "لـەوحی مـەحفووز" یـان بـە نموونەیـەكی نووسینەكانی "قـەدەر" دەگـات و لـەم رێیـەوە هەندێ رووداوی ڕاستەقینە دەبینێت..

بەڵام هەندێ جار ئەندێشـە دەستكاریی ئـەو رووداوانـە دەكـات و وێنـە و شێوەكانی خۆی بە بەریان دەپۆشێت.

ئەم بەشەش چەند جۆر و چینێكی زۆری هەیە. ئەوەتا هـەندێ جـار رووی داوە كـە لـە خەوندا چۆن بینراوە هەر بەو چەشنەش روو دەدات، هـەندێ جـاری تـر ئـەو رووداوە لـە پشت پەردەیەكی تەنك و، هەندێ جاری تریش لە پشـت پەردەیـەكی چڕی ئەسـتوورەوە دەردەكەوێت.

لە فەرموودەیەكی صەحیحدا چەسپاوە كە:

ئەو خەونانـەی پێغەمبەر ﷺ لـە سـەرەتای "وەحی"دا دەیبینـین، بـە وێنـەی رووونـاكیی سپێدەی بەیان روون و ڕاست و ئاشكرا بوون(١).

☐ سەرنجی پێنجەم:

"خـەونی ڕاسـت" زۆری و زیادیـیەكـە لـە هـێزی هەسـتی پێـش رووودان(الحـس قبـل الوقوع)دا. ئەم هەستەش چ بە شێوەیەكی جوزئی و چ بە شێوەیەكی كوللـی، لـە هـەموو مرۆڤێكدا، تەنانەت لە زیندەوەرانیشدا، هەیە.

جارێكیان بۆم دەركەوت كە:

جگـە لـە هەسـتە ئاشـكرا و پەنهانـەكان، مرۆڤ دوو هەسـتیاری تـری هەیـە كـە لـە جۆری: "هەست كردنن بە شتان پێش رووودانیان"، كە بریتـین لـە هەسـتیاری: "سـائیقە" و

---

(١) حديث: "كان أول مابدئ به الرسول ﷺ الرؤيا الصادقة في النوم، فكان لايرى رؤيا الاّ جاءت مثل فلق الصبح". أخرجه (البخاري) في صحيحه/ كتاب تفسير القرآن و(مسلم)/كتاب الإيمان، والـترمذي (٣٦٣٢) والسيوطي في الدر المنثور (٨/٥٦١) وأبو نعيم في دلائل النبوة ص١٦٨.

"شائیقە" و چەشنی هەردوو هەستیاری ئاشکرای "بینین" و "بیستن" وان. واتە یەکێکیان پاڵ دەنێت و ئەوی دیکەشیان تاسە و شەوق دەخاتە بەر مرۆڤ بەرەو کارێکی تایبەتی.

گومرایان و شوێنکەوتووانی فەلسەفە - بە هەڵە و نەفامانە - ناوی "هاندەری سروشتی"یان لەم چەشنە هەستیارانە ناوە. نەخێر، ئەم هەستانە هاندەری سروشتی نین، بەڵکو جۆرە ئیلهامێکن قەدەری خوای گەورە مرۆڤ و ئاژەڵیان پێ دەداتەبەر.

بۆ نموونە: "پشیلە" و زیندەوەرە هاوچەشنەکانی، کاتێ چاویان لە توانای بینین دەکەوێت، بە پاڵپێوەنانی ئەو هاندەرە قەدەرییە دەڕۆن بە دوای جۆرە ڕووەکێکی تایبەتیدا دەگەڕێن و ئنجا دەیخەنە سەرچاویان و پێی چاك دەبێتەوە!!

هەروەها هەڵۆ و باڵندە ڕاوکەرە گۆشتخۆرەکانی هاوچەشنی - کە ئەرکی کارمەندی تەندروستییان پێ سپێرراوە بۆ خاوێن کردنەوەی ڕووی زەوی لە جەستە و کەلاکی ئاژەڵە مردارەوەبووەکان - بەو هاندانە قەدەرییە و بە ئیلهامی "هەستی پێش ڕوودان" لە دووریی ڕۆژە ڕێیەکەوە پەی بە شوێنی کەلاکی مردارەوەبووان دەبەن!!

هەروەها ئەو هەنگەی تازەکی هاتووەتە ژیان و تەنها یەك ڕۆژ تەمەنیەتی، بە ئیلهامی ئەو هاندانە قەدەرییە، ماوەی ڕۆژە ڕێیەکی تەواو بەناو هەوادا دەفڕێت و پاشان بێ ئەوەی ڕێ ون بکات بۆ ناو شانەکەی خۆی دەگەڕێتەوە!!

بێ گومان هەموو مرۆڤێك گەلێ ڕووداوی دووپاتبووی لەم جۆرەی بە خۆیەوە دیوە. ئەوەتا کاتی وا هەیە ناوی کەسێك دەبات، کەچی هەر لەو کاتەدا دەرگاکە دەکرێتەوە و ئەو کەسە ناوبراوە دێتە ژوورەوە، بێ ئەوەی چاوەڕوانی هاتنی ئەویان کردبێت!

تەنانەت لەناو پەندەکانی پێشینانی کوردیدا پەندێك هاتووە کە دەڵێت:

*(ناڤی گور بینە پالاندار لی وەرینە).*

واتە: هەر کە باسی گورگ کرا، یەکسەر کوتەکی بۆ ئامادە بکە، چونکە وا بە ڕێوەیە!

بەو واتایەی کە ئەو هەستە ناسکەی پەروەردگار لە مرۆڤدا دایناوە، لە ڕێی "هەستی پێش ڕوودان"ەوە، پێشتر بە شێوەیەکی کورت و پوخت هەست بە هاتنی ئەو کەسە دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی هەستی "ژیری" ئاگای لەم هاتنە نییە، ئەوا ئەو کەسە بێ هیچ ویست و ئیختیارێك ناوی ئەو کەسەی بەسەر زماندا دێت!

ئەهلی فیراسەت ئەم چەشنە حاڵەتانە بە شتێکی وەك کەرامەت لێکدەدەنەوە. تەنانەت من بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر حاڵەتێکی لەم جۆرە هەستەم تێدا بوو، بۆیە ویستم ئەو حاڵەتە لە ناوەندی قاعیدە و دەستوورێکدا دابنێم و ڕێکی بخەم، کەچی سەرکەوتنم لەم کارەدا بەدەست نەهێنا. بەڵام ئەم هەستە لای ئەهلی تەقوا و صەلاح، بە تایبەت ئەولیا بەڕێزەکان، پتر بەهێز و زیاد دەبێت و شوێنەواری کەرامەتبەخش دەردەخات.

بەم جۆرە "خەونی ڕاست" جۆرە ویلایەتێك دەستی عەوامی خەڵکی دەخات. چونکە لەم ڕێیەوە ئەوانیش بە وێنەی ئەولیاکان هەندێ ڕووداوی ئاینده و پەنهان دەبینن.

جا هەروەك خەو - لە ڕووی خەونی ڕاستەقینەوە - سەبارەت بە عەوامی خەڵکەوە لە حوکمی پلەیەکدایە لە پلەکانی ویلایەت، هەروەها بۆ گشتیی خەڵکیش سەیرانگەیەکی جوانە کە بە وێنەی دیمەنەکانی سینەما، دیمەنی چەند ڕووداوێکی جێ‌دەستی پەروەردگاری تێدا دەبینن. جا ئەو کەسەی ڕەوشت و ڕەفتاری جوان بێت، بیرکردنەوەکانیشی جوان دەبن و گەلێ تابلۆ و دیمەنی جوان و ڕەنگینی تێدا دەبینێت. بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە ڕەوشت و خووی خراپە و، جگە لە خراپکاری چیی تری بە بیر و تەسەووردا نایەت و، هەر تەنها دیمەنە خراپ و ناشیرینەکانی تێدا دەبینێت.

هەروەها خەو پەنجەرەیەکی جیهانی بینراوە کە بەسەر جیهانی غەیبدا دەڕوانێت و، گۆڕەپانێکی سەربەست و بەرفراوانە بۆ خەڵکی پابەند و فانی و، جۆرە مانەوەیەك بەدەست دەهێنێت. تەنانەت ڕابوردوو و داهاتوو تیایدا لە حوکمی کاتی ئێستادان. هەروەك شوێنی حەوانەوەی ئەو گیاندارانەیە کە لە ژێر ئەرك و گیروگرفتەکانی ژیانی سەخت و قورسدا بە تەواوی ماندوو بوون.

لەبەر ئەم نهێنییانە و هاوچەشنیانە کە قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکی وەك: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً﴾دا (النبأ:٩) خەڵکی بۆ حەقیقەتی خەو ڕێنمایی دەکات.

☐ **سەرنجی شەشەم:** کە گرنگەکەیە.

تا ڕادەی یەقینی بێ گومان و بە چەندین تاقیکردنەوەی زۆری ژیانی خۆم ئەوەم بە دڵنیایی لە لا چەسپاوە کە "خەونی ڕاست" بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەوەی: "قەدەری خوای گەورە" دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە و گرتوویەتیەوە.

ئەم چەشنە خەونانە – بە تايبەت لەم ساڵە نزيكانەی ڕابوردوودا – لای من گەيشتنە پلەی چەسپاوی و بێ گومانی. چونكە بە شەودا ئاساييترين گفتوگۆ و بێ بايەخترين مامەڵە و بچووكترينی ئەو كاروبارانەم دەبينی كە لە سبەينێدا ڕوويان دەدا! ئەوەبوو بێ ئەوەی بە زمان باسيان بكەم، كەچی شەو ئەو ڕووداوانەم بە چاو دەخوێندەوە، بە ڕادەيەك كە دڵنيا بووم لەوەی: "خەون" پێش ئەوەی ببينرێت نووسراوە و دەستنيشان كراوە.

ئەم تاقيكردنەوە و ئەزموونانەش كە بە سەرمدا تێپەڕين چەند ڕووداوێكی كەم و دانە دانە و تەنانەت سەد دانە ئەزموونيش نەبوون، بەڵكو هەزار تاقيكردنەوەی لەم جۆرەم بە خۆمەوە دی. تەنانەت لە خەونەكانمدا كەسانێكم دەبينی كە هەرگيز بيرم لێ نەكردوونەتەوە و، مەسەلە و بابەتی ئەوتۆشم دەهاتە بەرچاو كە بە ئەندێشەمدا نەهاتوون. هەر بۆ ڕۆژی دوای ئەو شەوە خودی ئەو كەسانەم دەبينی و، مەسەلە و بابەتەكانيش - لەگەڵ تەعبيرێكی كەمدا - ڕوويان دەدا! بەو واتايەی كە بچووكترين ڕووداو پێش ئەوەی ڕوو بدات لە لايەن قەدەری خوای گەورەوە نووسراوە و تۆمار كراوە. كەواتە هەرگيز "ڕێكەوت" لە ئارادا نییە و ڕووداوەكانيش بەرباد و هەڕەمەكی نين!

❑ سەرنجی حەوتەم:

لێكدانەوەی خەونە پيرۆزەكەتان، كە موژدەی خێر و خۆشيی پێیە، خێری بۆ ئێمە و كاری خزمەتگوزاريی قورئان تێدايە. بێ گومان ڕۆژگار ئەو خەونەی لێكدايەوە و تا ئێستاش هەر لێكیدەداتەوە و، هيچ پێويستییەكی بۆ لێكدانەوەی تر نەهێشتووەتەوە. سەرباری ئەوەی كە بەشێك لە تەعبيرەكەی لە واقيعدا هاتووەتە دی. گەر بە وردی سەيری بكەيت بۆ خۆت پەيی پێ دەبەيت. بەڵام ئێمە ئاماژە بۆ چەند خاڵێكی دەكەين، واتە: يەكێك لە حەقيقەتەكان ڕوون دەكەينەوە و، ئەو ڕووداوانەش كە وەك خەونەكەت وان بريتين لە خۆنواندنەكانی ئەو حەقيقەتە.

چونكە:

ئەو مەيدانە فراوانە: جيهانی ئيسلامییە و..

مزگەوتەكەی كۆتاييشی: پارێزگای ئيسپارتەيە و..

چڵكاو و قوڕاوەكەش: ليتاوی حاڵی حازرە كە بە هەرزەيی و بيدعەت و بێ كاری چەپەڵ بووە و، سوپاس بۆ خوا، تۆ ڕزگارت بوو لێی، چونكە خێرا گەيشتيتە

مزگەوتەکە. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پشت بەخوا هەر بە ساغی و خاوێنی دەمێنیتەوە و قوڕاوت بەر ناکەوێت و دڵت ناترازێت و تێکناچێت و لە پێش کەسانی ترەوە دەبیت بە خاوەنی نوورەکانی قورئان..

کۆمەڵە کەم و بچووکەکەی ناو مزگەوتەکەش: هەڵگرانی "وتەکان"ن وەك: "حەققی، خلووصی، صەبری، سلێمان، ڕوشدی، بەکر، مستەفا، عەلی، زوهدی، لوتفی، خەسرەو، ڕەئفەت"..

کورسییە بچووکەکەش: گوندێکی بچووکی وەك "بارلا"یە..

دەنگە بەرزەکەش: ئاماژەیە بۆ هێزی "وتەکان" و خێرایی بڵاوبوونەوەی..

ئەو پلەوپایەیەش کە لە ڕیزی پێشەوەدا بە تایبەتی بۆ تۆ دانرابوو: بریتییە لە جێ و شوێنەکەی "عەبدوڕڕەحمان" کە بە تۆ سپێرراوە..

ئەو کۆمەڵەش کە لە ئامێرەکانی "بێتەل" دەچوون: ئاماژەیە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم وانە ئیمانییە بە سەرتاسەری جیهاندا و بۆ ئەوەش کە دەدرێن بە گوێی خەڵکیدا و، پشت بەخوا لە ئایندەدا تەعبیرەکەی بە تەواوەتی دەردەکەوێت، چونکە ئەفراد و دانە دانەکانی گەیاندنی ئەم وانە ئیمانییە ئێستا لە حوکمی چەند ناوکێکی بچووکدان، کە پشت بەخوا - دوایی - دەچنە حوکمی درەختێکی گەورەوە و دەبن بە چەند مەڵبەندێکی بڵاوکردنەوە..

ئەو گەنجە مێزەر بەسەرەش هێمایە بۆ لاوێك لە ڕیزی بڵاوکەرەوەکان و قوتابییاندا کە هاوشانی "خلووصی" دەبێت و لەوانەشە پێشی بکەوێت. لەو گومانەشدام کە یەکێکیان بێت، بەڵام دانیشی پێدا نانێم کە یەکێکیان بێت. جا ئەو لاوە - بە هێزی ویلایەتەوە - لە مەیداندا دەردەکەوێت.

پاشماوەی خاڵەکانی تر تۆ بۆ خۆت لە بریی من لێکیان بدەرەوە.

درێژەدانم بە قسەکردن لەگەڵ ئێوەدا پێ قبووڵە و بەلامەوە شتێکی بەتام و خۆشە، بۆیە درێژەم بەم مەسەلە کورتە دا و، لەوانەشە ئیسرافم تێدا کردبێت. بەڵام مادەم بە نیازی ئاماژەکردن بۆ تەفسیری چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کە تایبەتن بە خەو(نوم)ەوە دەستم بەم باسە کرد، ئەوا - پشت بەخوا - چاوپۆشی لەو ئیسرافە دەکرێ و لەوانەشە هەر بە ئیسراف دانەنرێت.

* * *

# مەسەلەی دووهەم

## کە پەیامی دووهەمە

**ئەم مەسەلەیە بە مەبەستی شیکردنەوەی گرفتێك و نەهێشتنی موناقەشەیەك نووسرا لە بارەی فەرموودەیەکی پیرۆزەوە کە تیایدا باسی ئەوە دەکات: حەزرەتی مووسا - درودی لەسەر بێت - زللەی داوە لە چاوی حەزرەتی عیزرائیل درودی لەسەر بێت[1].**

بیستم کە لە "ئەگریدیر"دا[2] موناقەشەیەکی زانستی ڕووی داوە.

لە ڕاستیدا ئەو موناقەشەیە خۆی لە خۆیدا کارێکی هەڵەیە، بە تایبەت لەم کاتەدا.

هەر هەمان پرسیار ئاراستەی منیش کرا، بێ ئەوەی ئاگام لەو موناقەشەیە بێت و، فەرموودەیەکی پیرۆزیان[3] لە کتێبێکی باوەڕپێکراودا پیشان دام بە هێمای "ق" ئاماژەی بۆ کرابوو، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم فەرموودەیە "متفق علیه"یە.. لێیان پرسیم:

- ئایا ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ یان نا؟

---

(١) "ابن کثیر" لە تەفسیرەکەیدا (٣/٤٥٨) وتوویەتی: لە هەندێ ئاساردا وتراوە: ناوی ئەو مەلائیکەتە عیزرائیلە. کە هەر بەو ناوەش مەشهوورە. (وەرگێڕ).

(٢) مەڵبەندی قەزایەکە لە باشووری تورکیا و نزیکی "بارلا"یە کە مامۆستا نوورسی بۆ ئەوێ ڕەوانەکرابوو. (وەرگێڕ)

(٣) دەقی ئەو فەرموودەیەی کە موناقەشەکەی لەسەر کراوە ئەمەی خوارەوەیە:

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: أرسل ملك الموت إلى موسى عليهما السلام، فلما جاءه صكّه فرجع إلى ربه، فقال: أرسلتني إلى عبد لا يريد الموت. فردّ الله عز وجل عليه عينه، وقال: ارجع فقل له يضع يده على متن ثور، فله بكل ما غطت به يده بكل شعرة سنة، قال: أي رب ثم ماذا؟ قال: ثم الموت. قال: فالآن. فسأل الله أن يدنيه من الأرض المقدسة رمية بحجر. قال: قال رسول الله ﷺ: فلو كنت ثم لأريتكم قبره إلى جانب الطريق عند الكثيب الأحمر. رواه البخاري ١٣٣٩ و٣٤٠٧ ومسلم ٢٣٧٢ وأحمد ١٥٧ و ١٥٨ والنسائي ٤/١١٨،١١٩ والبيهقي ١٢٠. وانظر تعليق الحافظ في الفتح ٧/٤٤٢ على هذا الحديث فإنه نفيس.

پێم وتن:

– بەڵێ، فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و دەبێ پشت بە بڕیاری یەکگرتنی ئیمامی بوخاری و موسلیم لەسەر ڕیوایەتی فەرموودەی ناوبراو لەم کتێبە باوەڕ پێکراوەدا ببەستن و متمانەی پێ بکەن. بەڵام هەروەك قورئانی پیرۆز ئایەتی موتەشابیهی تێدایە، فەرموودەی پیرۆزیش بە هەمان جۆر موتەشابیهی تێدایە و زانایانی خەواص نەبێ کەس لە واتا وردەکانیان ناگات.

هەروەها وتم:

– لەوانەیە ڕواڵەتی ئەم فەرموودە پیرۆزە لە بەشی موتەشابیهاتی موشکەلی حەدیث بێت.

خۆ ئەگەر لە دەمی ئەو پرسیارەدا ئاگام لەو موناقەشەیە بوایە کە سەبارەت بە فەرموودەی ناوبراو کرابوو، تەنها بەو کورتە وەڵامەوە نەدەوەستام، بەڵکو بەم جۆرەی خوارەوە وەڵامی پرسیارەکەم دەدانەوە:

**یەکەم:**

مەرجی یەکەمی موناقەشە کردنی ئەم چەشنە مەسەلانە بریتی‌یە لەوەی کە:

ئەو گفتوگۆیە لە کەشوهەوای بەکارهێنانی ویژداندا بێت و.. بە نیازی گەیشتن بە "حەق" بکرێت و.. لە شێوەیەکدا بێت کە سەرسەختی و عینادیی تێدا بەکار نەیەت و.. لە نێوان ئەوانەشدا بێت کە ئەهلی موناقەشەن، بێ ئەوەی ببێت بەهۆی تێگەیشتنی خراپ و بە هەڵە وەرگرتنی مەسەلەکە..

. تەنها لە ناوەندی ئەم مەرجانەدا موناقەشە کردنی ئەم مەسەلەیە و مەسەلەکانی هاوچەشنی دروست دەبێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەو موناقەشەیە لە پێناوی گەیشتندایە بە حەق، ئەوەیە کە:

موناقەشەکەر هیچ شتێك لە دڵدا هەڵنەگرێت و.. گەر "حەق" لەسەر زمانی بەرامبەرەکەی دەرکەوت دڵگران و تووڕە نەبێت، بەڵکو دڵنیا و ڕازی بێت. چونکە شتێکی نوێ فێر بووە کە زووتر نەیدەزانی، خۆ گەر "حەق" لەسەر زمانی خۆی دەربکەوتایە، زانستێکی نوێ فێر نەدەبوو، بەڵکو لەوانەیە دووچاری "غروور" ببوایە!

**دووهه‌م:**

ئه‌گه‌ر بابه‌تی گفتوگۆ له‌سه‌ركراو فه‌رمووده‌یه‌كی پیرۆز بێت، ده‌بێ پله‌كانی "حه‌دیث" و ده‌ره‌جه‌كانی "وه‌حیی ضیمنی" و به‌شه‌كانی "گوفتاری نه‌به‌وی" بزانرێن، ئنجا گفتوگۆی تێدا بكرێت..

هه‌روه‌ها دروست نی‌یه له نێوان عه‌وامی خه‌ڵكی‌دا گفتوگۆ له‌سه‌ر گیروگرفته‌كانی فه‌رمووده بكرێت، یان مرۆڤ بۆ پیشاندانی سه‌ركه‌وتنی خۆی به‌سه‌ر كه‌سانی تردا به‌رگری له ڕا و بۆچوونه‌كانی خۆی بكات.. هه‌روه‌ها نابێت به دوای ئه‌و به‌ڵگانه‌دا بگه‌ڕێت كه پتر گه‌شه به "له‌خۆبایی بوون"ی ده‌ده‌ن و ڕاكه‌ی به‌سه‌ر حه‌ق و ویژداندا ته‌رجیح ده‌ده‌ن.

به‌ڵام مادەم مه‌سه‌له‌كه پێش‌چاو خراوه و موناقه‌شه و وتووێژی له‌سه‌ر كراوه، ئه‌وا كاریگه‌ریی خراپ له تێگه‌یشتنی ئه‌و عه‌وامانه‌دا به‌جێ ده‌هێڵێت كه ناتوانن له‌م چه‌شنه فه‌رمووده موته‌شابیهانه تێ‌بگه‌ن. چونكه گه‌ر یه‌كێك له‌و عه‌وامانه ئینكاریی بكات ئه‌وا ده‌رگایه‌كی له‌ناوچوون و زیانی له خۆی خستووه‌ته سه‌ر پشت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م ئینكاری و ملنه‌دانه‌ی به‌ره‌و ئینكاری كردنی چه‌ندین فه‌رمووده‌ی چه‌سپاوی صه‌حیح ده‌یداته به‌ر. خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و واتایه‌شی پێ قبووڵ بێت كه ڕواڵه‌تی فه‌رمووده‌كه به ده‌ستیه‌وه ده‌دات و له‌ناو خه‌ڵكیشدا بڵاوی بكاته‌وه، ئه‌وا ده‌بێت به‌هۆی كردنه‌وه‌ی ده‌رگای ڕه‌خنه و ئیعتیرازی گومڕایان و زمان درێژی‌یان به‌رامبه‌ر فه‌رمووده پیرۆزه‌كه و بواریان بۆ ده‌ڕه‌خسێنێت كه ناوی خورافاتی لێ بنێن!

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی، به بێ هیچ داخوازێكی پێویست، به‌ڵكو به چه‌شنێك كه زیانی تێدا بێت، سه‌رنجی خه‌ڵكی بۆ ئه‌م فه‌رمووده پیرۆزه موته‌شابیهه ڕاكێشراوه و، گه‌لێ فه‌رمووده‌ی تری موته‌شابیهی وه‌ك ئه‌مه‌ش هه‌ن، ئه‌وا پێویسته بۆ دوورخستنه‌وه‌ی شوبهه‌كان و نه‌هێشتنی گومان و وه‌همه‌كان "حه‌قیقه‌ت"ێك ڕوون بكرێته‌وه. چونكه سه‌ره‌ڕای چه‌سپاویی فه‌رمووده‌كه، ڕوونكردنه‌وه‌ی ئه‌م حه‌قیقه‌ته‌ش به كارێكی پێویست ده‌زانم.

وا به پوختی ئاماژه بۆ ئه‌و حه‌قیقه‌ته ده‌كه‌ین و، بۆ درێژه‌كه‌شی پشت به په‌یامه‌كانی نوور ده‌به‌ستین وه‌ك: (لقی سێ‌هه‌م و چواره‌می وته‌ی بیست و چواره‌م و، ئه‌و بنچینه‌یه‌ش كه تایبه‌ته به به‌شه‌كانی وه‌حی‌یه‌وه له پێشه‌كیی مه‌كتووبی نۆزده‌هه‌مدا).

حەقیقەتەکەش ئەمەی خوارەوەیە:

مەلائیکەت وەك ئادەمیزاد نین تا تەنها لە یەك شێوەی دیاری کراودا بن، بەڵکو هەرچەند خاوەنی شێوەی دەستنیشانکراوی خۆیانن، کەچی لە حوکمی "کوللی"دان.

جا حەزرەتی عیزرائیلیش - دروودی لەسەر بێت - سەرۆك و سەرپەرشتیاری ئەو مەلائیکەتانەیە کە کاری "گیان کێشان"یان پێ سپێرراوە.

**پرسیار:**

ئایا هەر خودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - گیانەکان دەکێشێت، یان هاوکار و یاریدەدەرانی؟

**وەڵام:**

سێ ڕێباز لەم ڕووەوە هەن:

**ڕێبازی یەکەم:**

خودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - گیانی هەموو کەسێك دەکێشێت. چونکە سەبارەت بەو هیچ کارێك ڕێی کارێکی تری لێ ناگرێت، لەبەر ئەوەی زاتێکی "نوورانی"یە و شتی نوورانیش دەتوانێت بەهۆی چەند ئاوێنەیەکی بێ سنوورەوە بە خودی خۆی لە چەندین شوێنی زۆر و بێسنووردا ئامادە بێت. چونکە خۆنواندنەکانی شتانی نوورانی لەناو شتی تردا تایبەتکارییەکانی خودی ئەو زاتە نوورانییەیان تێدایە و بە خودی ئەو - نەك غەیری ئەو - دادەنرێن..

بۆ نموونە:

هەروەك خۆدەرخستنەکانی "خۆر" لەناو ئاوێنە جۆراوجۆرەکاندا "ڕووناکی" و "گەرمیی خۆر" دەردەخەن، خۆدەرخستنی ڕۆحانییەکانی وەك مەلائیکەتانیش لە ئاوێنە جۆراوجۆرەکانی "جیهانی میسال"دا هەمان تایبەتکارییەکانی ئەوان وەردەگرن. کەواتە ئەو خۆدەرخستن و خۆنواندنانەی ئەوان لەو ئاوێنانەدا خودی ئەو ڕۆحانییانەن نەك غەیری خۆیان.

جا مەلائیکەتەکان بەپێی توانا و قابیلییەتی ئاوێنەکان لەو ئاوێنانەدا دەردەکەون. بۆ نموونە:

حەزرەتی جیبریل – دروودی لەسەر بێت – لەو کاتەی کە لـە بەردەم پێغەمبەر ﷺ و ناو کۆڕی هاوەڵە بەڕێزەکانیدا – خوایـان لـێ ڕازی بێـت – لـە شێوەی هـاوەڵی بەڕێز "دیحیەی کەلبی"دا دەردەکەوت، هەر لـە هەمان کـات و لـە هەزاران شـوێندا بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر دەردەکـەوت و، هـەر لـەو دەمەشـدا باڵـە فـراوان و بەسـام و شکۆدارەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایان پڕ کردبووەوە و، سوژدەشی لـە ژێر عەرشی هەرەمەزندا دەبرد. کەواتە حەزرەتی جیبریل لە زۆر شوێندا و بەپێی توانـایی و قابیلییەتی ئەو شوێنە و بە یەك کات لە هەزاران شوێندا خۆی دەردەخات.

جا بەپێی ئەم ڕێبازە:

نە بەکارێکی مەحاڵ و.. نە بە دیاردەیەکی نائاسایی و.. نە بە ئیشێکی دوور لە ژیـری دادەنرێت کە وێنەی ئەو مەلائیکەتی گیان‌کێشانە لە سەرەمەرگ و دەمی گیان‌کێشـانی مرۆڤدا – کـە نموونەیەکی جوزئیی مرۆڤە – زلـلـەی حـەزرەتی مووسـای – دروودی لەسـەر بێـت – لـێ بدرێـت، کـە کەسـایەتی‌یەکی مـەزن و بەسـام و شـکۆی نێـوان پێغەمبەرانی "ئولولعەزم"ە، پاشان چاوی وێنـە میسـالی‌یەکەی مەلائیکـەتی گیان‌کێشـان دەربهێنێت کە پۆشاکی ئەو وێنە و شێوەیەی لەبەر کردووە.

**ڕێبازی دووهەم:**

مەلائیکەتـە مەزنەکانی وەك حەزرەتی جیبریل و میکـائیل و عـیزرائیل – درووديـان لەسەر بێت – هەر یەکـەیان وەك سـەرگەورە و سەرپەرشـتیارێکی گشتی وان کـە چەند یارمەتی‌دەرێکیان لە جۆری خۆیان هەیە و – بە شێوەیەکی بچووکتر – لەوان دەچن. ئەو یارمـەتیدەرە بچووکانـەش بـەپێی جۆراوجۆریـی ئـەو بەدیهاتووانـەی کـە سەرپەرشتی‌کردنیان خراوەتە ئەستۆیانەوە، جیاجیا و جۆراوجۆرن.

بۆ نموونە: ئەو مەلائیکەتانەی کە گیانی پیاوچاکان[1] دەکێشن جیاوازن لەوانەی کـە گیانی پیاوخراپان دەکێشن. کەواتە مەلائیکەتەکانی گیان‌کێشـان بەپێی ئاماژەی ئایەتـە

(١) کاتێ یەکێك لـە ئەولیا مەزنەکانی ناوچەکەمان کـە بـە "سـەیدا" بەناوبانگـە لـە سـەرەمەرگدا بـووە و مەلائیکەتی بەرپرسی گیان‌کێشان هاتووە گیانی بکێشێت، پەنای بە خوای گەورە بردووە و بە دەنگی بەرز هاواری کردووە: "با ئەو مەلائیکەتە گیانی من بکێشێت کە گیان‌کێشانی قوتابییانی زانستی خراوەتە ئەستۆ، چونکە زۆرم خۆش دەوێت" ! هەموو ئەو کەسانەی کە لە کاتی وەفاتیدا ئامادە بـوون شایەتی‌یان لەسـەر ئەمە داوە. (دانەر)

پیرۆزەکانی: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً ۞ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطاً﴾ (النازعات:١-٢) چەند دەستە و تاقمێکی جیاجیا و جۆراوجۆرن.

جا بەپێی ئەم ڕێبازە:

حەزرەتی مووسا - دروودی لەسەر بێت - زللەی لە خودی حەزرەتی عیزرائیل - دروودی لەسەر بێت - نەداوە، بەڵکو لە ڕووی هێز و هەرەتی مەزنی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی و.. گەورەیی جەستەی و.. بەهێزیی ڕەوشتی و.. پلەوپایەی لای پەروەردگاری بەتوانای خۆی، زللەی لە جەستەی یەکێك لە یاریدەدەرانی حەزرەتی عیزرائیل داوە.

بەم جۆرە، دەردەکەوێت کە ئەم کارە بەلای ژیری‌یەوە گەلێ پەسەندە[1].

رێبازی سێهەم:

لە بنچینەی چوارەمی وتەی بیست و نۆهەمدا ڕوونمان کردەوە و، بەپێی بەڵگەی چەند فەرموودەیەکی پیرۆزیش دەردەکەوێت کە:

هەندێك مەلائیکەت هەن کە چل هەزار سەریان هەیە و، هەر سەرەش چل هەزار زمانی تێدایە - واتە چل هەزار چاویشیان هەیە - هەر یەك لەو زمانانەش چل هەزار جار تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات.

جا مادەم ئەو مەلائیکەتە کار پێ‌سپێرراوانە بەپێی جۆرەکانی "جیهانی بینراو" کاریان خراوەتە ئەستۆ و لە جیهانی گیانەکاندا تەسبیحاتی ئەو جۆرانە دەنوێنن و دەری‌دەخەن، ئەوا دەبێ لەسەر هەمان شێوە و ڕوخساریش بن، چونکە زەوی - بۆ نموونە - یەك بەدیهاتووی خواوەندە و تەسبیحاتی بۆ دەکات کەچی چل هەزار بەڵکو سەدان هەزار جۆر بەدیهاتووی تێدایە کە هەر یەکەیان لە حوکمی چەند سەرێکی تەسبیحات گوزاردان و، هەریەك لەو جۆرانەش هەزاران تاك و دانەیان هەیە کە وەك چەند زمانێك وان... هتد.

---

(١) شارەکەمان پیاوێکی ئازای تێدا بوو. لە سەرەمەرگدا بە مەلائیکەتی گیان‌کێشانی وت: "ئا بەم حاڵەتەوە کە لە جێگادا کەوتووم گیانم دەکێشیت؟!". ئەمەی وت و بە سووکی لە جێگاکەی هەڵسا و سواری ئەسپەکەی بوو، ئنجا شمشێرەکەی ڕاکێشا وەکو ئەو کەسەی لە مەیدانی جیهاد و شمشێرکاری‌دا بێت. ئیتر بەو جۆرە و بە سواری ئەسپەکەیەوە گیانی سپارد و بە مردنی مەردانی بەغیرەت وەفاتی کرد! (دانەر)

کەواتە ئەو مەلائیکەتەی کە سەرپەرشتی کردنی کاروباری زەویی پێ سپێرراوە، دەبێ چل هەزار بەڵکو سەدان هەزار سەری هەبێت و، هەریەك لەو سەرانەش سەدان هەزار زمانی تێدا بێت... هتد.

جا بە گوێرەی ئەم ڕێبازە:

حەزرەتی عیزرائیل – دروودی لەسەر بێت – ڕوویەکی تایبەتیی بۆ هەموو کەسێك هەیە کە بەو ڕووەی بۆ ئەو کەسە دەڕوانێت و چاوێکیشی هەیە کە سەیری ئەوی پێ دەکات. حەزرەتی مووساش – علیە السلام – هەرگیز زللەی لە ماهییەتی کەسێتیی حەزرەتی عیزرائیل و شێوە ڕاستەقینەکەی نەداوە و سووکایەتیی پێ نەکردووە و دەستی بە ڕوویەوە نەناوە، بەڵکو هەڵسوکەوتەکەی ئەو لەو حەز و ڕەغبەتەوە سەرچاوەی گرتووە کە حەزی لە بەردەوامبوون و مانەوەی ئەرکی پێغەمبەرایەتی کردووە. بۆیە لەبەر ئەمە، زللەی وەشاند و بۆیشی هەیە بیوەشێنێت، لەو چاوەی کە موراقەبەی ئەجەلەکەی دەکات و دەیەوێت کۆتایی بە کارمەندییەکەی ئەم لەسەر زەویدا بهێنێت!

والله أعلم بالصواب.

ولا يعلم الغيب إلا هو.

﴿قُلْ إِنَّما الْعِلْمُ عِنْدَاللهِ﴾ (الملك:٢٦).

﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتابَ مِنهُ آياتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتابِ وَأُخَرُ مُتَشابِهاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ ما تَشابَهَ مِنْهُ ابْتِغاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغاءَ تَأْوِيلِهِ وَما يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاّ اللهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنا وَما يَذَّكَّرُ إِلاّ أُولُوا الأَلْبابِ﴾(آل عمران:٧).

* * *

# مەسەلەی سێهەم

## کە پەیامی سێهەمە

**ئەم مەسەلەیە وەڵامێکی یەکجار تایبەتی‌یە و، تا ڕادەیەکیش نهێنی و پەنامەکی‌یە و لە وەڵامی پرسیارێکی گشتی‌دا نووسراوە کە برایان بە گشتی، چ بە زمانی حاڵ چ بە زمانی گوفتار، ئاراستەمی دەکەن.**

**پرسیارەکەش ئەمەیە کە:**

هەر کەسێك سەردانت دەکات تۆ پێی دەڵێت:

(چاوەڕوانیی هیچ هیممەت و یارمەتی و مەدەدێك لە خودی من مەکەن و بە کەسێکی پیرۆزم دامەنێن، چونکە من خاوەنی پلەوپایە نیم. ئەوەتا هەروەك "سەرباز"ی ئاسایی فەرمانەکانی پلەی "موشیر" ڕادەگەیەنێت، منیش بە هەمان جۆر فەرمانەکانی موشیرێتی‌یەکی مەعنەویی بەرز ڕادەگەیەنم و.. هەروەك کەسێکی هەژاری موفلیس دەبێت بە دەڵاڵ و ناسێنەر لە دوکانی گەوهەرە یەکجار بەنرخەکاندا، منیش دەڵاڵێکی وەکو ئەوم لە بەردەم دوکانێکی خاوێن و موقەددەسدا کە قورئانی پیرۆزە).

تۆ وا بە هەموو ئەو کەسانە دەڵێیت کە دێنە سەردانت. بەڵام "ژیری"یەکانی ئێمە پێویستیان بە زانستە و.. "دڵان"یشمان داوای ڕێژنەی ڕووناکی دەکەن و.. "گیانەکان"یشمان بە دوای نووردا عەودالن. بەم جۆرە، ئێمە لە گەلێ ڕووەوە خوازیار و داواکاری چەندین شتی زۆر و زەبەندەین و، هەر بۆ ئەوەش دێینە سەردانت تاکو ئەو پێویستی‌یانەمان نەهێڵێت، چونکە ئێمە زیاتر پێویستمان بە خاوەنی "ویلایەت و هیممەت و کەماڵات" هەیە تا ئەوەی پێویستمان بە "زانا" بێت! جا ئەگەر تۆ بەو چەشنە بیت کە باسی دەکەیت، ئەوا لە سەردانەکانماندا بۆ لات نیشانەکەمان نەپێکاوە!

زمانی حاڵیان ئاوا دەڵێت!!

**وەڵام:**

گوێ لەم پێنج خاڵەی خوارەوە ڕابگرن و پاشان بیر لە سەردانەکانتان بکەنەوە، بزانن ئایا سوودی تێدایە بۆتان یاخود بێ سوودە؟! ئنجا چ بڕیارێك دەدەن، سەربەستن!

● خاڵی یەکەم:

خزمەتکارێکی پادشایەکی مەزن.. یان سەربازێك کە لە ژێر فەرمانی پادشادایە، دیاری و نیشانە و مەدالیا بەرز و بەنرخەکانی پادشا دەگەیەنێتە دەستی فەرماندە مەزن و موشیرە گەورەکان و، لەم ڕێیەوە دەیانخاتە منەت و ڕەزامەندییەوە..

جا ئەگەر ئەو فەرماندە و موشیرانە بڵێن: بۆچی ئێمە لە ئاستی خۆمان دابەزینە خوارەوە و بەخشش و ڕێزلێنانەکانی پادشا لەم سەربازە ئاساییەوە وەربگرین؟! ئەوا بێگومان ئەم گوفتارەیان بە غروور و لەخۆباییبوونێکی شێتانە لە قەڵەم دەدرێت..

هەروەها گەر ئەو سەربازە ئاساییەش هێندە لە خۆی بایی و ڕازی بێت کە لە دەرەوەی ئەم ئەرکەی سەرشانیدا ڕێز لەو فەرماندە و موشیرە نەنێت و لەبەری هەڵنەسێتەوە و پلەی خۆی لە هی ئەو بە بەرزتر بزانێت، ئەوا ئەم کارەی جگە لە شێتی و گێلی هیچی تر نییە..

خۆ ئەگەر یەکێك لەو فەرماندە منەتبارانە تەنازول بکات و بڕوات بۆ سەردانی ماڵی ئەم سەربازە ئاساییەی کە لەتەنانێك نەبێ هیچی تر بۆ میوانە بەڕێزەکەی شك نابات، ئەوا پادشا ـ کە لە حاڵی خزمەتگوزارە ئەمین و دڵسۆزەکەی ئاگادارە ـ لە خواردنگەی تایبەتیی خۆیەوە سینییەکی پڕ لە خۆشترین خۆراك بۆ ماڵی ئەو خزمەتگوزارەی دەنێرێت و نایەڵێت لە بەردەم میوانەکەیدا دووچاری ڕووزەردی بێت!

جا هەروەك خزمەتکاری پادشا لەم حاڵەدا بەم جۆرەیە، خزمەتگوزاری ڕاست و دروستی قورئانیش ـ هەرچەندە لە عەوامی خەڵکیش بێت ـ بە هەمان جۆرە. ئەوەندە هەیە کە ئەم فەرمانەکانی قورئانی پیرۆز بە ناوی خودی قورئانەوە و بێ هیچ دوودڵی و ساردوسڕییەك بە گەورەترین مرۆڤ ڕادەگەیەنێت و، گەوهەرە یەکجار بەنرخەکانی قورئان بەوپەڕی شانازی و سەربەرزی و موحتاج نەبوون و بێ هیچ خۆ زەلیل کردن و تکا و پاڕانەوەیەك، بەو کەسانە دەفرۆشێت کە ڕۆحیان لە هەموو کەسانی تر دەوڵەمەندترە!

جا هەموو ئەو کەسانەی کە لەم ڕێیەوە فەرمانەکانی قورئانیان پێ ڕادەگەیەنرێت و ئەو گەوهەرە بەنرخانەیان پێ دەفرۆشرێت، هەرچەندەش پلەیان بەرز بێت و خاوەنی

مەقامێکی گەورە و بڵند بن، هەرگیز بەرامبەر بەو خزمەتگوزارە ئاسایی‌یە و لە دەمی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی‌دا خۆیان بە گەورەتر نازانن..

لە هەمان کاتدا ئەو خزمەتکارەش هەرگیز لە خۆی بایی نابێت و سنووری خۆی ناشکێنێت کاتێ کە ئەو مەردە مەزنانە دەڕۆن بۆ لای و سەردانی دەکەن!

خۆ ئەگەر هەندێك لەو کەسانەی کە لە بەردەم گەوهەرەکانی گەنجینەی خاوێنی قورئاندا تووشی سەرسامی و سەرسووڕمان بوون، بە چاوی وەلی و پیاوچاك و مرۆڤێکی مەزنەوە بڕواننە ئەو خزمەتگوزارە، ئەوا میهرەبانیی خاوێنی حەقیقەتی قورئان شایانی ئەوەیە و لێی چاوەڕوان دەکرێت کە هیممەت بکات و لە گەنجینەی تایبەتیی خواوەندەوە و بێ ئاگاداری و خۆ تێهەڵقورتاندنی ئەو خزمەتگوزارە، ڕێژنە و یارمەتی‌یان بە هاناوە بنێرێت، تاکو خزمەتگوزارەکەی لە بەردەم ئەو میوانە بەڕێزەی‌دا شەرمەزار و ڕووزەرد نەبێت!

● **حاڵی دووهەم:**

نوێکار(مجدد)ی هەزارەی دووهەم (واتە: ئیمامی ڕەببانی ئەحمەدی فارووقیی سەرهەندی، خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

"دەرکەوتن و ڕوون بوونەوەی حەقیقەتێکی ئیمانم لە هەزار چێژ و کەرامەت پێ باشترە". هەروەها فەرموویەتی: "ئەنجام و ئامانجی سەرجەمی تەریقەتە سۆفی‌یەکان بریتی‌یە لە: دەرکەوتن و ئاشکرابوونی ڕاستی‌یەکانی ئیمان".

جا مادەم ئەمە بڕیاری ڕابەرێکی مەزنی تەریقەت بێت، ئەوا کتێبی "وتەکان" (کە بەوپەڕی ڕوونی ڕاستی‌یەکانی ئیمان دەردەخات و لە دەریای نهێنی‌یەکانی قورئانەوە داچۆڕاوە) دەتوانێت ئەنجامە چاوەڕوان لێکراوەکانی "ویلایەت" بەدەستەوە بدات!

● **حاڵی سێهەم:**

سی ساڵ پێش ئێستا چەند زللەیەکی توند و بەهێز لە سەر و گوێلاکی "سەعیدی کۆن"ی بێ‌ئاگا وەشێنران. ناچار بیری لە کێشەی "مردن ڕاست و ڕەوایە" کردەوە و، بینیی کە سەرتاپا لەناو قوڕ و لیتاودا نوقم بووە.. لە تاوا هاواری فریاگوزاریی لێ هەڵسا و بە دوای ڕێگای دەربازبوون و کەسێکی فریاگوزاردا دەگەڕا کە دەستی بگرێت و لەو بارە پەرێشانە قورتاری بکات. ئنجا ئەو ڕێگایانەش کە بۆ ئەم مەبەستە

دۆزینیەوە لەناو خۆیاندا جیاجیا و بەش بەش بوون! بۆیە سەرسام ما و لە تاوا دەستی دایە کتێبی "فتوح الغیب"ی شێخ عەبدولقادری گەیلانی -خوای لێ ڕازی بێت- و بە گەشبینی‌یەوە کردیەوە. یەکسەر ئەم دەستەواژەیەی تێدا بەدی کرد کە دەفەرموێ:

"أنت في دار الحكمة فاطلبْ طبيباً يداوي قلبك"(١)!

ئەمەم زۆر بەلاوە سەیر بوو! چونکە من ئەو کاتە لە دەزگای "دار الحكمة الإسلامية"دا(٢) ئەندام بووم! وەك بڵێی بۆ ئەوە هاتبمە ناو ئەم دەزگایەوە کە زامەکانی نەتەوەی ئیسلام سارێژ و چارەسەر بکەم، کەچی خۆم لە هەموو کەسێك نەخۆشتر بووم و زیاتر پێویستم بە دەرمان و چارەسەری بوو! خۆ دیارە دەبێ مرۆڤی نەخۆش پێش هەموو کەسێکی تر خەمی خۆی بخوات و چارەسەری خۆی بکات.

بەڵێ، شێخ وای پێ وتم: تۆ نەخۆشیت.. پزیشکێك پەیدا بکە با چارەسەرت بکات! وتم:

- ئەی شێخی بەڕێزم! تۆ ببە بە پزیشکم.

ئیتر دەستم دایە خوێندنەوەی ئەو کتێبە بە چەشنێك کە وا بزانم ڕووی گوفتاری ڕاستەوخۆ ئاراستەی من دەکات.

لە ڕاستی‌دا شێوازی گوفتاری کتێبەکە زۆر توندوتیژ بوو، غروور و لەخۆبایی بوونی منی تێکدەشکاند و گەلێ نەشتەرگەریی قووڵی لەناو دەروونمدا ئەنجام دا. بۆیە توانای بەردەوامبوونم تێدا نەما و وزەم لێ بڕا. چونکە بەو چاوە دەمڕوانی‌یە گوفتارەکانی کە ئاراستەی منیان دەکات..

بەڵێ، بەم چەشنە تا نزیکەی ناوەڕاستی ئەو کتێبەم خوێندەوە، بەڵام نەمتوانی چیی تر لەسەری بەردەوام بم و تەواوی بکەم. بۆیە کتێبەکەم خستەوە جێی خۆی.. کەچی پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك هەستم کرد ئازارەکانی ئەو نەشتەرگەری و زامانە کۆتایی‌یان پێ هاتووە و، چەندین چێژ و لەزەتی سەیر و سەرسووڕهێنی ڕۆحی‌یان لە شوێندا بەجێ

(١) دەقی ئەو دەستەواژەیە بەم جۆرەیە: "يا عباد الله! أنتم في دار الحكمة، لابد من الواسطة، اطلبوا من معبودكم طبيباً يطب أمراض قلوبكم، مداوياً يداويكم". بڕوانە: "المجلس الثاني والستون" ص٣٠٦ ط دار الكتاب العربي. لە کتێبی: (الفتح الرباني)ی شێخی گەیلانی کە لە چاپە پێشووەکاندا لەگەڵ کتێبی (فتوح الغیب)دا پێکەوە و بەم ناوەی دووهەم چاپ دەکران. (وەرگێڕ)

(٢) بڵندترین ئەنجومەنی زانستیی سەر بە مەشیەخەتی ئیسلامیی دەوڵەتی عوسمانی بووە. (وەرگێڕ)

ماوە. ئنجا گەڕامەوە سەری و، خوێندنەوەی کتێبەکەی مامۆستای یەکەمم تەواو کرد و، گەلێ سوودی مەزنم لێ دەست کەوت و، چەند کاتێکی دوور و درێژخایەنم لەگەڵدا بردە سەر کە تیایاندا گوێم لە ویرد و موناجاتە نەرم و خاوێنەکانی ئەو مامۆستایەم دەگرت.

پاشان کتێبی "مەکتووبات"م کەوتە دەست، کە هی "ئیمامی ئەحمەدی فاروقیی سەرهەندی"ی نوێکاری هەزارەی دووهەمە. بە نیازی خێر و گەشبینییەکی خاوێنەوە دەستم دایێ و کردمەوە.. یەکسەر شتێکی سەیرم تێدا بینی! چونکە لە دوو نامەی ئەو کتێبەدا وشەی "میرزا بەدیعوززەمان" بەکار هاتبوو! منیش وام هەست کرد کە لەگەڵ منی بێت و بە ناوی خۆمەوە بانگم بکات، چونکە باوکم ناوی "میرزا" بوو، هەردوو نامەکەش ئاراستەی "میرزا بەدیعوززەمان" ناوێك کرابوون!

لەبەر خۆمەوە وتم:

- سبحان اللّٰه! ئەم نامەیە ڕاستەوخۆ لەگەڵ منیەتی!

چونکە سەعیدی کۆن بە نازناوی "بەدیعوززەمان" ناسرابوو. خۆ هەرچەندە جگە لە "هەمەدانی" - کە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە - کەسێکی ترم شك نەدەبرد بەم نازناوە بەناوبانگ بووبێت، کەچی ئەم نامەیە ئەوەی دەگەیاند کە دەبێ کەسێکی تری غەیری "هەمەدانی" هاوسەردەمی ئیمامی ڕەببانیی سەرهەندی بووبێت و بەم نازناوە نامەکەی ئاراستە کرابێت و، دەشبێت حاڵەتەکەی ئەو وەك هی من وا بووبێت، چونکە دەرمانی دەردەکەی خۆمم لەو دوو نامەیەدا دەست کەوت!

ئیمامی ڕەببانی لەو دوو نامەیە و چەند نامەیەکی تردا ئامۆژگاریی ئەوەی دەکات کە: "قیبلەی ڕوو تێکردنت بکە بە یەك"[1]. واتە شوێن یەك پێشەوا و ڕابەر بکەوە و بە غەیری ئەو ڕابەرەوە سەرقاڵ مەبە!

لە ڕاستیدا ئەم ئامۆژگارییە لەگەڵ ئامادەیی و باری ڕۆحیی ئەو کاتەمدا یەك نەدەکەوت. چونکە بیرم کردەوە لەوەی کە: ئایا شوێن کامیان بکەوم؟ لە پشت سەری ئەمیانەوە بڕۆم یان ئەو؟ لە ڕاستیدا گەلێ سەرسام بووم و نەمدەزانی کامیان هەڵبژێرم.

---

(١) بڕوانە: "مكتوبات الإمام الرباني" ج١/ص٧٨ (وەرگێڕ)

سەرسامییەکەشم زۆر خەست و چڕ بوو، چونکە هەریەکەیان تایبەتکاری و جازیبییەتی خۆی هەبوو. بۆیە نەمتوانی یەکێکیان هەڵبژێرم و دەست لەوی تریان هەڵبگرم!

کاتێ من لەم سەرسامی و حەپەسانە خەست و چڕەدا دەتلامەوە، ختوورەیەکی ڕەحمانیم بە دڵدا هات کە پێی وتم: سەرەتای سەرجەمی ئەم ڕێگایانە و.. سەرچاوەی ئەم هەموو جۆگەلانە و.. خۆری درەخشانی گشت ئەم هەسارە گەڕۆکانە تەنها هەر قورئانی پیرۆزە. کەواتە یەکخستنی ڕاستەقینەی "قیبلە" لە شوێنکەوتنی "قورئانی پیرۆز"دایە. چونکە قورئانی پیرۆز بەرزترین ڕابەر و خاوێنترین مامۆستایە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕووم کردە قورئان و دەستم پێوە گرت و یارمەتی و فریاگوزاریم تەنها لە قورئان وەرگرت.

خۆ توانا و لێهاتنی پەرێشان و ناتەواوی من گەلێ لەوە دەستەوسان و کۆتاترە کە بتوانێت - وەك پێویست - لە ڕێژنەی بەخوڕەمی ئەو ڕابەرە حەقیقییە بنۆشێت، کە وەك کانیاوێکی سەلسەبیل و ئاوی حەیات و ژیانبەخش وایە. بەڵام بە فەزڵی خودی ڕێژنەی قورئان دەتوانین ئەو ڕێژنە و سەلسەبیلە بۆ کەسانی "ئەهلی دڵ" و "خاوەنی حاڵ" و هەریەکەیان بەپێی پلەی خۆی، ڕوون بکەینەوە.

کەواتە "وتەکان" و ئەو ڕووناکییانەش کە لە قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون (واتە: پەیامەکانی نوور) تەنها چەند مەسەلەیەکی "زانستی" و "عەقلی" نین، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا بریتین لە چەند مەسەلەیەکی "قەلبی" و "ڕۆحی" و چەند حاڵەتێکی "ئیمانی". واتە وەك چەند زانستێکی بەرز و بەنرخی خوایی و پەروەردگاری وان.

● **خاڵی چوارەم:**

هاوەڵە بەڕێزەکان و تابیعین و شوێنکەوتووانی تابیعینیش - خوایان لێ ڕازی بێت - کە خاوەنی بەرزترین پلەن و بەهرەمەندی "ویلایەتی کوبرا"ن، سەرجەمی لایەنە ناسکەکانیان ڕاستەوخۆ لە قورئانی پیرۆزەوە بەهرە و بەشی خۆیان وەرگرتبوو. هەروەك "قورئانی پیرۆز"یش "ڕابەر"ێکی ڕاستەقینە و سەروزیادیان بوو. ئەم ڕاستییەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز هەروەك لە هەموو کات و ڕۆژگارێکدا ڕاستییەکانی خۆی دەردەبڕێت، بە هەمان جۆر لە هەموو کاتێکدا ڕێژنەکانی "ویلایەتی کوبرا"ش بەو کەسانە دەبەخشێت کە شایانیانن.

بەڵێ، ڕۆشتن و گوزەرکردن لە دیوی "ڕواڵەت"ی شتانەوە بۆ ناوجەرگەی "حەقیقەت" بە دوو شێوە دەبێت:

*یەکەمیان:* بەوە دەبێت کە مرۆڤ بڕواتە ناو بەرزەخی "تەریقەت"ەوە و لە ڕێی سەیر و سلووکەوە پلە یەك لە دوای یەکەکانی تێدا ببڕێت، تا بە "حەقیقەت" دەگات.

*شێوەی دووهەم:* ڕۆشتنی ڕاستەوخۆیە بۆ ناو "حەقیقەت" بەهۆی سۆز و میهرەبانییەکی بێ گەردی خواییەوە، بەبێ ڕۆشتنە ناو بەرزەخی تەریقەتەوە. ئەم ڕێگایەیان ڕێیەکی تایبەتی و بەرز و بڵند و یەکجار کورتە و، بریتییە لە ڕێی هاوەڵە بەڕێزەکان و تابیعین، خوایان لێ ڕازی بێت.

جا ئەو ڕووناکییانەی کە داچۆڕاوی ڕاستییەکانی قورئانن.. هەروەها "وتەکان"یش کە ئەو ڕووناکییانە دەردەخەن و لە خوێنەران و بیسەرانیان دەگەیەنن، دەگونجێ خاوەنی هەمان تایبەتکاری بن. وەك لە ڕاستیشدا خاوەنی ئەو تایبەتکارییانەن!

● **خاڵی پێنجەم:**

وا بە پێنج نموونەی جوزئی ڕوونی دەکەینەوە کە "وتەکان" هەروەك "ڕاستییەکانی قورئان" فێری خەڵکی دەکەن، لە هەمان کاتدا ئەرکی "ئیرشاد"یش ڕادەپەڕێنن:

❖*نموونەی یەکەم:*

هەر خۆم لە خۆمدا و لە دوای هەزاران - نەك دەیان و سەدان - ئەزموونی دووپاتبووی خۆمەوە قەناعەتی تەواوم کرد کە: "وتەکان" و ئەو نوورانەش کە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزن: هەروەك ڕابەرایەتی "ژیری"م دەکەن و وانەی زانستەکانی پێ دەڵێنەوە، بە چەندەها حاڵەتی ئیمانیش تەڵقینی "دڵ"م دەکەن و گەلێ تام و چێژی ئیمانییش دەرخواردی "ڕۆح"م دەدەن.. ئیتر بەم جۆرە و لە ڕاپەڕاندنی کارەکانی دنیامدا وەکو ئەو موریدەم لێ هاتووە کە چاوەڕوانیی یارمەتی و مەدەد لە شێخە خاوەن کەرامەتەکەی دەکات، چونکە منیش وەك ئەوم لێ هاتووە و یارمەتی و مەدەد لەو نهێنییە خاوەن کەرامەتانەی قورئان وەردەگرم و هێنانەدیی خواست و پێداویستییەکانیشم هەر لەوان چاوەڕوان دەکەم. لە ڕاستیشدا هەموو ئەو خواستانەم لەم ڕێیەوە و بە جۆرێك کە چاوەڕوان نەکراوە و لە حسابدا نەبووە، بۆ دەهاتنە دی!

وا لێرەدا تەنها دوو نموونەی ئەو ڕووداوە جوزئییانە باس دەکەم کە بەهۆی بەرەکەتی نهێنییەکانی قورئانەوە هاتوونەتە دی:

یەکەم:

ئەو ڕووداوەیە کە بە درێژی لە "مەکتووبی شازدەهەم"دا ڕوون کراوەتەوە و بریتی‌یە لەوەی: کولێرەیەکی گەورە و نائاسایی، پێش چاوی "سلێمان"ی میوانم خرا، کە لەسەر درەختێکی قەتران دانرابوو. ئێمەش دوو ڕۆژی تەواوەتی لەو دیاری‌یە غەیبی‌یەمان خوارد (لە کاتێکدا کە هیچ شتێکم شك نەدەبرد بۆ میوانەکەمی دابنێم).

دووهەم:

مەسەلەیەکە تابلێی جوزئی و ناسکە و لەم ڕۆژانەدا ڕووی داوە، کە بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

ڕۆژێکیان لە پێش نوێژی بەیانی‌دا قسەیەکم هاتەوە یاد کە لە لایەن منەوە بە کەسێك وتراوە و، بە چەشنێکی وەهاش ئەو قسەیە کراوە کە ئەو کەسە دووچاری گومان و دوودڵی بکات. لە دڵی خۆمدا وتم: خۆزگا ئەو کەسەم دەبینی تاکو ئەو لەکە و تەپ و تۆزانەی لەسەر پەڕەی دڵی نیشتوون بیانتەکێنم و لایان بەرم. هەر لەو دەقیقەیەدا بیرم کەوتەوە کە پێویستم بەو بەشەی کتێبەکەمە کە ڕەوانەی شاری "نیس" کراوە و، لەبەر خۆمەوە وتم: خۆزگا ئەو بەشەی کتێبەکەمم دەهاتەوە دەست.

لە دوای نوێژی بەیانی دانیشتبووم، کتوپڕ ئەو کەسەی کە لە پێش نوێژەکەم بە خەیاڵمدا هات، خۆی کرد بە ژووردا و ئەو بەشەی کتێبەکەشی بە دەستەوە بوو کە لەو کاتەدا پێویستم پێی بوو!!

لێم پرسی:

- ئەوە چی‌یە بە دەستەوە؟

وتی:

- نازانم! لە بەردەرگادا بە یەکێك گەیشتم کە لە "نیس"ەوە هاتبوو، ئەمەی دامێ و منیش وا بۆم هێنایت!

بە سەرسووڕمانەوە لەبەر خۆمەوە وتم:

- سبحان اللّه! دەرچوونی ئەم پیاوە لە ماڵی خۆی و گەیشتنی ئەم بەشەی وتەکانیش لە "نیس"ەوە لەم کاتەدا، هەرگیز ئاسەواری "ڕێکەوت"ی پێوە نی‌یە. بەڵکو تەنها هیممەتێکی قورئانی پیرۆزە کە ئەم بەشەی کتێبەکەی لە هەمان کاتدا دایە دەستی ئەو کەسە و لەو ڕێیەوە بۆی ناردم!

ئیتر سوپاسێکی زۆری خوای گەورەم کرد.

کەواتە ئەو کەسەی کە شارەزای وردترین، بەڵکو بێ بایەخترینی، خواست و ئارەزووەکانی دڵی منە، هەردەم لە ئامێزی میهرەبانیی خۆیم دەگرێت و لە لایەن خۆیەوە پارێزگاریم دەکات. ئیتر هەرگیز ناڕۆمە ژێر کۆڵی منەت و چاکەی هیچ کەسێکەوە لە سەرتاسەری دنیادا و، بەخشش و چاکەی هیچ کەسێك وەرناگرم.

❖*نموونەی دووهەم:*

"عەبدوڕڕەحمان"ی برازام هەشت ساڵ پێش ئێستا بەجێی هێشتم و لێم دوور کەوتەوە. خۆ هەرچەندە لەم ماوەیەدا لەکەی بێ ئاگایی و شوبهە و گومان و وەهمەکانی دنیای بەرکەوتبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گومانێکی باشی لە ڕادەی خۆم زیاتری پێم هەبوو. بۆیە داوای لێ کردم هیممەتێکی ئەوتۆی فریا بخەم کە من شکی نابەم و لە توانامدا نییە. بەڵام هیممەت و یارمەتیی فریاگوزاریی "قورئانی پیرۆز" فریای کەوت و ڕۆشت بە هانایەوە، چونکە سێ مانگ پێش وەفاتی، "وتەی دەهەم"ی بەدەست گەیاندبوو، کە تایبەتە بە "حەشر"ەوە!

ئەو پەیامەش لە ڕووی پاکژکردنیەوە لە چڵك و چەپەڵییە مەعنەوییەکان و لێڵاییەکانی وەهم و گومان و بێئاگایی، ڕۆڵی خۆی لەودا بینیبوو. تەنانەت بەرەو پلەیەکی وەك پلەی "ویلایەت" بەرزی کردبووەوە، چونکە سێ دانە کەرامەتی ئاشکرای لەو نامەیەدا دەرخستبوو کە پێش وەفاتی بۆی نووسیبووم! ئەو نامەیەش لە ناوەندی بڕگەکانی "مەکتووبی بیست و حەوتەم"دا تۆمار کراوە. با سەیر بکرێت.

❖ *نموونەی سێهەم:*

برایەکی قیامەتیم کە لە هەمان کاتدا قوتابیشم بوو، هەروەك لە ئەهلی دڵ و خاوەنی تەقواش بوو، کە بەڕێز "حەسەن ئەفەندی"یە و خەڵکی شاری "بوردوور"ە.. ئەم برایە، لەبەر ئەوەی گومانێکی باشی لە توانا و سنووری خۆم زیاتری بە من هەبوو، چاوەڕێی هیممەت و مەدەدێکی لەم هەژارە دەکرد بە وێنەی ئەوەی کە لە وەلییەکی مەزنەوە چاوەڕوان دەکرێت.

کتوپڕ و بە بێ هیچ بۆنەیەك پەیامی "وتەی سی و دووهەم"م دا بە یەکێکی گوندنشینی دەوروبەری شاری "بوردوور" تاکو بیخوێنێتەوە. پاشان "کاك حەسەن"یشم بیرکەوتەوە و، بەم برایەم وت: "گەر سەردانی بوردوورت کرد ئەم پەیامە بە دەستی کاك

حەسەنیش بگەیەنە تاکو لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا ئەویش بیخوێنێتەوە". ئیتر ئەم پیاوە کە سەفەری کرد، ڕاستەوخۆ پەیامەکەی دایە دەستی کاك حەسەن. ئەم ڕووداوەش چل ڕۆژ پێش کۆچی ماڵئاوایی کاك حەسەن ڕووی دا!

کاتێ کە پەیامەکەی بەدەست گەیشت، بە شەوق و تاسەمەندییەوە وەری گرت و لەگەڵیدا ژیا و بە وێنەی مرۆڤێکی تینوو بۆ ئاوی سەلسەبیل، لە ڕاستییەکانی ئەو پەیامەی نۆشی. ئنجا هەتا خوێندنەوەی ئەو پەیامەشی دووپات بکردایەتەوە پتر لە ڕێژنەکانی بەهرەمەند دەبوو. هەر بەم چەشنە لە خوێندنەوەیدا بەردەوام بوو هەتا دەرمانی دەردەکەی خۆی تێدا دۆزییەوە، بە تایبەت لە باسی "خۆشەویستیی خوای گەورە" لە هەڵوێستی سێهەمی ئەو پەیامەدا. تەنانەت چەندین ڕێژنەی ئەوتۆی لەو پەیامە بەدەست هێنا کە پێشتر لە "قوتبی ئەعزەم"ی چاوەڕوان دەکرد! هەتا بەپێی خۆی و بە ساغ و سەلامەتی ڕۆشت بۆ مزگەوت و نوێژەکەی لەوێ ئەدا کرد، ئنجا هەر لەوێ گیانی سپارد! ڕەحمەتی فراوانی خوای لێ بێت.

❖ *نموونەی چوارەم:*

بەڕێز کاك "خلووصی" هیممەت و یارمەتی و ڕێژنە و نوورێکی ئەوتۆی لە "وتەکان"ەوە - کە ڕوونکەرەوەی نهێنییەکانی قورئانن - دەست کەوت کە زۆر زیاتر بوون لەو هیممەت و مەدەد و ڕێژنەیەی لە "تەریقەتی نەقشبەندی"دا بەدەستی هێنا، کە گرنگترینی تەریقەتەکانە و لە هەموو شیان کاریگەریی زۆرترە. ئەم شایەتییەشی لە "مەکتووبی بیست و حەوتەم"دا باس کراوە.

❖ *نموونەی پێنجەم:*

"عەبدولمەجید"ی برام بەهۆی کۆچی دوایی "عەبدوڕڕەحمان"ی برازامەوە و، لەبەر چەند بارودۆخێکی ئازاربەخش و خەمگینەوە، هەستی بە شڵەژان و دارمانێکی توند و بەهێز دەکرد لە ناخی خۆیدا. ئنجا ئومێدەواری هیممەت و مەدەدێکی مەعنەویی ئەوتۆ بوو لە لایەن منەوە کە لە توانای مندا نین. خۆ هەرچەندە من نامەم بۆ نەدەنارد، کەچی کتوپڕ چەند پەیامێکم لە "وتەکان" بۆ ڕەوانە کرد، ئەویش لە دوای خوێندنەوەی ئەو وتانە نامەیەکی بۆ ناردم کە تیایدا نووسیبووی: "سوپاس بۆ خوا! ڕزگارم بوو.. چونکە پێش ناردنی ئەم وتانە وەخت بوو شێت ببم! بەڵام هەریەك لەو وتانە جێی ڕابەرێکیان بۆ من گرتەوە. خۆ ئەگەر تەنها یەك ڕابەرم لێ دوور کەوتبێتەوە، ئەوا بە یەك جار چەندین ڕابەری زۆرم دەست کەوت و، سوپاس بۆ خوا لەو بارە پەرێشانە ڕزگارم بوو". منیش

لە لایەنی خۆمەوە کە سەیری حاڵی ئەوم کرد و سەرنجم دا، بۆم دەرکەوت ڕێگا و ڕێبازێکی جوانی گرتووەتەبەر و، بە فەزڵی خوای گەورە لەو حاڵەت و بارودۆخانەی پێشووی ڕزگاری بووە.

گەلێ نموونەی زۆری تر هەن کە لەم پێنج نموونە باسکراوانە دەچن و، هەموو شیان ڕوونی دەکەنەوە کە:

زانستە ئیمانی‌یەکان گەر بێت و وەك چارەسەریی مەعنەوی و بەپێی پێویست و بە وێنەی دەرمانی نەخۆشی‌یەکان ڕاستەوخۆ لە نهێنی‌یەکانی قورئانی پیرۆزەوە وەربگیرێن و بە کردەوە تاقی بکرێنەوە، ئەوا ئەو زانستە ئیمانی و دەرمانە ڕۆحانی‌یانە سەروزیادی ئەو کەسەن کە هەست دەکات پێویستی پێیانە و بە ئیخلاسێکی گەرموگوڕ و تەواوەتی‌یەوە بەکاریان دەهێنێت. ئیتر بارودۆخی فرۆشیار و دەلاڵی ئەو دەرمانانە هیچ کاریگەری‌یەکی لەو چارەسەرکردنەدا نی‌یە. واتە ئەو فرۆشیارە چ کەسێکی ئاسایی و موفلیس و چ دەولەمەندێکی خاوەن پلەوپایە بێت و چ خزمەتگوزارێکی هەژار بێت، سەبارەت بەو چارەسەری‌یانە یەکسانە و هیچ کارێك ناکاتە سەر دەرمانەکان.

بەڵێ، مادەم "خۆری درەخشان" هەڵهاتبێت، پێویست بە داگیرساندنی "مۆم" نامێنێت!

خۆ مادەم من خودی "خۆر"ە درەخشانەکە ڕوون دەکەمەوە، ئەوا نە پێویستیی بە من پەیدا دەبێت و نە هیچ واتایەکیش لەوەدا هەیە کە داوای ڕووناکیی مۆمێك لە خودی خۆم بکرێت، بە تایبەت گەر نەمبێت و شکی نەبەم. بەڵکو لە هەموو شتێك پێویستترە کە ئەو برایانە بە دوعا و نزاکانیان، تەنانەت بە هیممەتی خۆیشیان، یارمەتیم بدەن و پشتم بگرن. چونکە من مافی خۆمە داوای یارمەتی و پشتگیری لەوان بکەم و، دەبێت ئەوانیش بەو ڕێژنە نوورانی‌یەی "پەیامەکان" ڕازی بن و سەروزیادیان بێت.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللّهم صل على سيدنا محمد صلاةً تكونُ لك رضاءً ولحقّه أداءً وعلى آله وصحبه وسلم.

* * *

## نامەیەکی بچووك و تایبەت
### کە دەگونجێ بە تەواوکەری مەسەلەی سێهەمی
### مەکتووبی بیست و هەشتەم دابنرێت

ئەی برایانی ئاخیرەتم و دوو قوتابی‌یە جیددی‌یەکانم؛ بەڕێزان:
"خەسرەو" و "ڕەئفەت"!

ئێمە هەستمان بە سێ کەرامەتی قورئانی دەکرد لە کۆمەڵە پەیامی "وتەکان"دا، کە لە ڕێژنەی نوورەکانی قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە. کەچی ئێوە، بە هیممەت و شەوق و تێکۆشانی خۆتان، کەرامەتێکی تری چوارەمتان خستە سەر ئەو سیانە.

سێ کەرامەتە زانراوەکە بریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەکەم:**

ئاسانی و خێرایی نائاسایی لە دانانیاندا. تەنانەت "مەکتووبی نۆزدەهەم" کە لە پێنج بەش پێکهاتووە، لە نزیکەی سێ ڕۆژدا و هەر ڕۆژەش لە نزیکەی چوار سەعاتدا، واتە بە کۆی دوازدە سەعات و لە نێوان چیا و دۆڵ و باخەکاندا و بێ ئەوەی هیچ کتێبێکی سەرچاوەیی‌مان لەبەر دەستدا بێت، دانراوە!

"وتەی سی‌هەم"یش لە دەمی نەخۆشی و لە ماوەی پێنج شەش سەعاتدا دانراوە.

"وتەی بیست و هەشتەم"یش، کە باسی بەهەشت دەکات، بە یەك دوو سەعات و لە ناو باخەکەی "سولەیمان" لە دەمی شیوەکەدا دانراوە. تەنانەت من و تۆفیق و سولەیمان سەرمان لەم خێرایی‌یە سووڕ دەما!

جا هەروەك ئەم کەرامەتە قورئانی‌یە لە دانانی‌دا هەیە، بە هەمان جۆر:

**دووهەم:**

لە نووسینەوەشی‌دا ئاسانی‌یەکی نائاسایی و شەوقێکی گەرموگوڕ هەست پێ دەکرێت، بێ ئەوەی نووسەرەوەکەی گرفتاری بێزاری ببێت. لە کاتێکدا کە گەلێ

هۆکار لەم ڕۆژگارەدا هەن گیان و ژیری‌یەکان دووچاری بێزاری دەکەن. کەچی هەر ئەوەندەی وتەیەك لە "وتەکان" دادەنرێت، یەکسەر لە گەلێ شوێنی زۆردا لەبەری دەنووسرێتەوە و، ئەم کارەش بەسەر گەلێ ئەرکی گرنگدا پێش دەخرێت.

**سێ‌هەم کەرامەتی قورئانی بریتی‌یە لەوەی کە:**

خوێندنەوەشیان مرۆڤ بێزار ناکات، بە تایبەت گەر خوێنەر هەست بکات پێویستی پێیانە. تەنانەت هەتا زیاتر بخوێنرێنەوە، پتر چێژ و شەوقی خوێنەریش زیاد دەبێت و لێیان بێزار نابێت.

جا ئێوەش - ئەی هەردوو براکەم! - کەرامەتێکی قورئانیی چوارەمتان چەسپاند. ئەوەتا کاك خەسرەوی برامان - کە خۆی بە تەمبەڵ ناو دەبات - لەو کاتەوە کە پێنج ساڵ لەمەوبەر ناوی وتەکانی بیست لە نووسینەوە سارد بووەتەوە، کەچی وا لەماوەی یەك مانگدا بە نووسینێکی ڕێك و جوان چواردە کتێبی نووسی‌یەوە، بە تایبەت "مەکتووبی سی و سێ‌هەم" کە پەیامی پەنجەرەکانە و ڕێزی شایانی لێ نراوە، چونکە بە جوانترین شێوە نووسراوەتەوە.

جا ئەم کارە کەرامەتێکی بێ گومانی نهێنی‌یەکانی قورئانە.

بەڵێ، ئەم پەیامە لە بواری ناسینی خوای گەورە و ئیمان هێناندا بە خواوەند گەلێ بەهێز و درەخشانە، بەڵام پەنجەرەکانی سەرەتای پەیامەکە گەلێ کورت و پوختن، هەرچەندە وردە وردە ڕوون دەبنەوە و پتر درەخشان دەبن. چونکە پێشەکی‌یەکانی زۆربەی "وتەکان" - بە پێچەوانەی کتێبەکانی تر - بە پوختی و کورتی دەست پێ دەکەن، بەڵام وردە وردە ڕوون دەبنەوە.

* * *

# مەسەلـەی چوارەم

## کە پەیامی چوارەمە

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

**وەڵامی پرسیارێکە تایبەتە بە ڕووداوێکی جوزئی‌یەوە و، مایەی وریایی و بێداربوونەوەی برایانمە.**

برا ئازیزەکانم!

**ئێوە لێم دەپرسن و دەڵێن:**

لە شەوی جومعەی پیرۆز و لە دەمی هاتنی میوانێکـی ئـازیزدا و بێ هیـچ هۆکـارێك، دەستدرێژی‌یان کردە سەر مزگەوتە پیرۆزەکەتان.. ئایا نهێنیی ئەم ڕووداوە چی‌یە و لەبەر چی تەنگت پێ هەڵدەچنن و ئاوا ئازارت دەدەن؟

**وەڵام:**

وا بە ناچاری و بە زمانی "سەعیدی کۆن" چوار خاڵ باس دەکـەم، بـەو هیوایـەی کە بـبن بـە مایـەی وریـایی و بێداریـی برایـان و، ئێـوەش لـە لایــەنی خۆتانــەوە وەڵامــی پرسیارەکەتانی لێ دەربهێنن.

◆ **خاڵی یەکەم:**

ماهییەتی ئەو ڕووداوە: فێڵێکـی شـەیتانە و، دەسـت هێنانـە ڕێیـەکی مونافیقانەیـە لـە پێناوی ڕازی کردنی ئیلحاد و، بە پێچەوانەی یاسا و تەنها بە فەرمانی هەوا و ئارەزوو، بە مەبەستی ئـەوەی کـە لـە شـەوی جومعـەدا دڵمـان سـەخڵەت بکـەن و ساردوسڕی بخەنـە گیانی ئەهلی جەماعەتەوە و، ڕێ لەوەش بگرن کە چاوم بە میوانەکانم بکەوێت.

یەکێك لە شتە سەیر و نامۆکان ئەوەیە کە: ڕۆژی پێش ئەو شەوە - واتە پێنج شەممە - بۆ مەبەسـتی گەشـت و گـەڕان ڕۆشـتم بـۆ شـوێنێك. لـە کـاتی گەڕانـەوەمدا ڕەشمـارێکی هێندە درێژم دی کە دەتوت دوو مارن پێکەوە لکاون، لە لای چەپمەوە هات و لە نێـوان من و هاوەڵەکەمەوە تێپەڕی.

ویستم بزانم هاوڕێکەم تا چەندە لەو مارە دەترسێت، لێم پرسی:

- ئایا بینیت؟

وتی:

- چی؟

وتم:

- ئەو مارە ترسناکە!

وتی:

- نەخێر نەمبینیوە و ناشی بینم!

بە سەرسوورمانەوە وتم:

- سبحان الله! چۆن ئەو ڕەشمارە گەورەیەت نەدی کە لە نێوانمانەوە تێپەڕی؟!

لەو دەمەدا هیچ شتێکم لەم بارەیەوە بە خەیاڵدا نەهات. بەڵام دوایی ئەمەی خوارەوەم بە دڵدا هات:

ئەم مارە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە دەبێ ئاگات لە خۆت بێت و وریا بیت!

پاشان تێ گەیشتم کە ئەم ڕەشمارە لە جۆری ئەو مارانەیە کە لە خەوندا دەیانبینم. واتە لە خەونەکانمدا کارمەندە بەرپرسەکەم لە شێوەی ماردا دەبینی هەر کاتێ بە نیازی خیانەتەوە بهاتایە بۆ لام! تەنانەت جارێکیشیان ئەمەم بۆ بەڕێوەبەری ناحیە باس کرد و پێم وت:

- هەرکات بە نیازی خراپەوە سەردانم دەکەیت، لە شێوەی ماردا بە خەون دەتبینم. کەواتە ئاگات لە خۆت بێت!

لە ڕاستیشدا گەلێ جار بەڕێوەبەرەکەی پێش ئەوم لەو شێوەیەدا دەبینی!

بەو واتایەی کە ئەم مارەی ئێستا بە ئاشکرا بینیم، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم جارە خیانەتەکەیان شێوەی دەستدرێژیی ڕاستەقینە دەگرێتە خۆ و تەنها لە شێوەی نیاز و نییەتی دڵدا نامێنێتەوە.

خۆ هەرچەند دەستدرێژی‌یەکەی ئەم جارەیان شتێکی بچووك بووە و خۆیشیان هەوڵ دەدەن بە بچووکی پیشانی بدەن، بەڵام بەهۆی هاندان و هاوبەشی کردنی مامۆستا(معلم)یەکی بێ ویژدانەوە، بەرپرسەکە فەرمانی بۆ پۆلیسەکان دەرکردبوو کە: "بڕۆن ئەو میوانانە دەستگیر بکەن و بیانهێنن". ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئێمە لە مزگەوتدا سەرگەرمی زیکرەکانی دوای نوێژ بووین.

ئامانجی ئەوانیش لەم ڕەفتارەدا ئەوەبوو کە تووڕەم بکەن و بە هەست و نەستەکانی "سەعیدی کۆن" بڕۆم بە گژیاندا و لە بەرامبەر ئەم هەڵسوکەوتە هەڕەمەکی و نایاسایی‌یەوە دەریان بکەم.

بەڵام ئەو بەدبەختە نەیدەزانی کە "سەعید" هەرگیز ناچێت بە دارعەسایەکی شکاوی دەستیەوە بەرگری لە خۆی بکات، لە کاتێکدا کە "شمشێرێکی ئەڵماس"ی دروستکراوی کارگەی قورئانی حەکیمی لە زماندایە، بەڵکو لە بریی دارعەساکەی دەستی، ئەو شمشێرە ئەڵماسە بەکار دەهێنێت!

لەگەڵ ئەوەشدا پۆلیسەکان بە سەلیقە و لەسەرخۆ بوون و، تا کۆتایی هاتنی نوێژ و تەواوبوونی زیکرەکانی چاوەڕوانی‌یان کرد و ڕاوەستان، چونکە هیچ حکومەت و دەوڵەتێك خۆی لە نوێژ و مزگەوتدا هەڵناقورتێنێت تا نوێژ و زیکرەکانی تەواو نەبن. کەچی بەرپرسەکە لەم ڕەفتار و چاوەڕوانی‌یەی پیاوەکانیشی تووڕەیی سەری تێکرد و یەکسەر پاسەوانەکەی بە دوادا ناردن و وتی: پۆلیسەکان گوێڕایەڵیم ناکەن!

بەڵام خوای گەورە من بەم چەشنە مارانەوە سەرقاڵ ناکات. ئامۆژگاریشم بۆ برایانم ئەوەیە کە ئەوانیش پێیانەوە سەرقاڵ نەبن، مەگەر پێویستی‌یەکی ناچارەکی یەخەیان پێ بگرێت. بەڵکو خۆتان بەرزتر ڕابگرن لەوەی کە تەنانەت قسەشیان لەگەڵدا بکەن و بیاندوێنن. چونکە وەك وتراوە: "جواب الأحمق السكوت"(واتە: وەڵامی مرۆڤی گەوج بێدەنگی‌یە)! بەڵام وریای ئەم خاڵەی خوارەوە بن:

هەروەك ئەگەر لە بەرامبەر ئاژەڵێکی دڕندەوە خۆت بە "لاواز" پیشان بدەیت، ئەم کارەت ئازایەتی و غیرەتی دەداتێ کە هێرشت بکاتە سەر، لاوازی نواندنیش (بە مەرایی کردن) بۆ کەسێك کە سروشتی ئاژەڵی دڕندەی لە خۆدا هەڵگرتبێت، بە هەمان جۆرە و هانی دەدات بۆ دەستدرێژی کردن!

کەواتە دەبێ هاوڕێیانمان بە وریایی و حەزەرەوە ڕەفتار بکەن، نەبادا لایەنگرانی زەندەقە و ئیلحاد کەمتەرخەمی و بێ ئاگایی‌یان بقۆزنەوە.

◆ **خاڵی دووهەم:**

﴿**ولا تَرْكَنُوا إلى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمسَّكُمُ النَّارُ**﴾ (هود:١١٣).

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڕەشەیەکی توندوتیژی تێدایە. واتە ئەو کەسانەی کە دەبن بە ئامرازی دەستی ستەمکاران و پشت و لایەنی ئەوان دەگرن، تەنانەت گەر تەنها نزمترین

مەیل و سۆزیشیان بە لایاندا هەبێت، ئەم هەڕەشە ترسناكە دەیانگرێتەوە. چونكە ڕازی بوون بە كوفر مرۆڤی پێ كافر دەبێت و ڕازی بوونیش بە ستەم مرۆڤی پێ دەبێت بە ستەمكار.

یەكێك لە ئەهلی كەماڵ بەم بەیتەی خوارەوە تەعبیری لە گەوهەرێكی نێوان گەوهەرە زۆرەكانی ئەم ئایەتە پیرۆزە كردووە[1]:

هەر دەنی تەبعە لە دنیا كۆمەكیی زاڵم دەكات
تانجی‌یە لەززەت لە خزمەتكردنی ڕاوچی دەبات!

بەڵێ، هەندێ كەس هەن وەك "مار" ڕەفتار دەكەن و.. هەندێكیشیان كاری "سەگ" و "تانجی" ئەنجام دەدەن!

جا ئەو كەسەی كە لەم چەشنە شەوە پیرۆزانەدا و لە دەمی دوعا و لالآنەوە لە بەردەم خوای گەورەدا جاسووسی بەسەر ئێمە و میوانێكی بەڕێزەوە دەكات و خەبەرمان لێ دەدات، وەك بڵێی تاوانێكمان ئەنجام دابێت، پاشان ئەم چەشنە دەستدرێژی‌یەمان دەكاتە سەر.. بێ هیچ گومانێك ـ ئەو كەسە ـ سەرزەنشتی ناو واتای شیعرەكە دەیگرێتەوە!

◆ خاڵی سێهەم:

**پرسیار:**

مادەم تۆ بۆ ڕێنمایی كردنی سەرسەختترین مولحید و كەسانی سەركەش و لە پێناوی چاك كردنی ئەواندا پشت بە قورئانی پیرۆز دەبەستیت و پاڵ بە هیممەتی ئەم قورئانەوە دەدەیت و لە ڕێژنەكانی نووری ئەو قورئانە بەهرەمەند دەبیت و لەسەر ئەم كارەت تا ئێستا بەردەوامیت، ئەدی بۆچی ئەوانەی كە لە خۆتەوە نزیكن و دەستدرێژیت دەكەنە سەر و توندوتیژیت لە ڕوودا دەنوێنن، بۆ ڕێی ڕاست بانگ و ڕێنمایی‌یان ناكەیت؟

**وەڵام:**

یەكێك لە بنچینە گرنگەكانی ئوسووڵی شەریعەت ئەم دەستوورەیە كە دەڵێت:

"الراضي بالضرر لا يُنظر له".

واتە:

"گەر كەسێك بە ویست و حەز و ئارەزووی خۆی، بە زیان و خراپەی خۆی ڕازی بێت، نابێت بە چاوی شەفەقەت و بەزەیی‌یەوە سەیر بكرێت"!

---

(١) تەرجەمەی شیعرێكی توركی‌یە. ناوی شاعیر و سەرچاوەكەیم دەست نەكەوت! (وەرگێڕ)

جا من پشت بە قورئانی پیرۆز دەبەستم و خەڵکیی بۆ لا بانگ دەکەم و، ئەو مولحیدەش کە بە تەواوی پێی لە ئیلحاد ڕاکێشاوە، گەر نەتوانم بە تەواوی قەناعەتی پێ بکەم، ئامادەم لە ماوەی چەند سەعاتێکدا دەمکوتی بکەم و بۆڕی بدەم، بە مەرجێ ئەو کەسە بە یەکجاری نزم و بێنرخ نەبێت و، بە وێنەی مار - کە لەزەت لە بڵاوکردنەوەی ژەهرەکەی دەچێژێت - لەزەت لە بڵاوکردنەوەی گومڕایی نەبات.

بەڵام دەبێ بزانین کە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەو مارانەی لە شێوەی مرۆڤدان و قسەکردن لەگەڵ دەروونێکدا کە تا دواهەمین پلەی نزمی گومڕایی و نوقم بووی نیفاق دابەزی بێت، بە ڕادەیەك کە بە ئاشکرا و هەست و زانینی خۆی ئاینەکەی بە دنیا دەگۆڕێتەوە و ئەڵماسی گرانبەها بە چەند وردە شووشەیەکی بێ نرخی چەپەڵ دەفرۆشێت..

گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا و ڕوونکردنەوەی حەقیقەت بۆیان - لە ڕاستیدا - ستەمە لە حەق و داگرتنە لە شان و شکۆی حەقیقەت. چونکە وەك ئەو وتەیەی پێشینان وایە کە دەڵێت: "تعليق الدرر في أعناق البقر[1]"!

چونکە ئەو کەسانەی کە ئەو جۆرە ڕەفتارانەمان لەگەڵ دەنوێنن، چەندەها جار ئەو ڕاستیيانەیان لە پەیامەکانی نوورەوە بیستووە، کەچی هەرچەندەش ئەم ڕاستیيانە دەناسن، دەچن بۆ مەبەستی ڕازیکردنی زەندەقە و گومڕایی، تێدەکۆشن لە نرخیان دابگرن. کەواتە وەکو ئەو مارانەوان کە لە بڵاوکردنەوەی ژەهرەکانیاندا هەست بە چێژ و لەزەت دەکەن.

◆ خاڵی چوارەم:

چۆنێتی و شێوەی ئەو مامەڵە و ڕەفتارانەی کە ماوەی ئەم حەوت ساڵە لەگەڵ مندا کراون، هەر هەموویان هەڕەمەکین و لەسەر بناغەی هەوا و ئارەزوو بنیات نراون و ڕەفتاری نایاسایین..

چونکە یاسای ڕەهەندە و بەندکراوان ئاشکرایە و هەموان دەیزانن. ئەوەتا بەپێی یاسا چاویان بە خزم و کەسانیان دەکەوێت و ڕێی تێکەڵیی خەڵکیيان لێ ناگیرێت و، گوێڕایەڵی و پەرستنی خوای گەورەش لە هەموو دەوڵەت و نەتەوەیەکدا پارێزراوە و دەستی ناهێنرێتە ڕێ. هەروەها ڕەهەندەکراوەکانی وەك من لەناو شارەکان و لە نێوان

(١) واتە وەك ئەوە وایە ملوانکەی مرواری بکرێتە ملی گا و گۆلك! (وەرگێڕ)

خزم و کەس و خۆشەویستانیاندا مانەوە و، تێکەڵاوی و نامە گۆڕینەوە و تەنانەت گەشتوگوزاریشیان لێ قەدەغە نەکرا، جگە لە تەنیا من.

ئەوە بوو لە هەموو شتێك بێبەش کرام و تەنانەت دەستدرێژی کرایە سەر عیبادەت و مزگەوتەکەشم و ویستیان لە زیکری وشەی تەوحیدم بخەن کە بە لای مەزهەبی شافیعییەوە دوای نوێژ سوننەتە بوترێت. کاتێکیش مرۆڤێکی نەخوێندەوار کە ناوی "شەباب"ە و لەگەڵ ماڵە خەزوورانیدا بۆ گەشت و سەردان هاتە ئێرە(بارلا) و، بە حوکمی ئاشنایی و ناسراویمان – چونکە خەڵکی شارەکەمە – سەری لێ دام، یەکسەر سێ پۆلیسی چەکدار هاتنە ناو مزگەوتەکەوە بە دوایدا و بانگیان کرد بۆ پۆلیسخانە.

بەرپرسەکەش ویستی ئەم کارە نایاسایییەی بەوە داپۆشێت کە وتی: داوای لێبوردنتان لێ دەکەم.. گلەیی مەکەن.. کارمەندییەکەم داخوازی ئەمە بوو! پاشان بواری دا کە بڕوات!

جا ئەگەر ئەم ڕووداوە لەگەڵ مامەڵە و ڕەفتارەکانی تردا لێك بدرێنەوە، دەزانرێت کە سەرجەم مامەڵەکانیان لەسەر بناغەی هەوا و ئارەزووە و، هەموو ڕەفتارەکانیشیان هەڕەمەکی و نایاسایییە. چونکە سەگ و مارەکانم بە سەردا زاڵ دەکەن.

منیش دانابەزمە ئاستی خۆ سەرقاڵ کردن پێیانەوە و، مامەڵە و ڕەفتارەکانی ئەو چەپەڵانە بە خوای خاوەن توانا و دەستەڵات دەسپێرم، تاکو شەڕ و خراپکارییان بباتە دواوە.

لە ڕاستیدا ورووژێنەرانی ئەو ڕووداوانەی کە بوون بەهۆی ڕاگواستنمان، ئێستا لەناو شارەکانی خۆیاندان و سەرۆك هۆزە دەستەڵاتدارەکانیش هەموویان بەردراون و ئێستا سەرۆکایەتیی هۆزەکانیان دەکەن و، تەنها من و دوو برای قیامەتیم لەو خەڵکە جیا کراوینەتەوە و بەرنەدراوین. لە کاتێکدا کە من هیچ پەیوەندییەکم بە دنیاوە نییە، خوا لەناوی بەرێت و بیکات بە مایەی بەڵا و گیروگرفت بۆ ئەوان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فەرمانەشم هەر قبووڵ کرد و وتم: ئەمەش گرنگ نییە.

بەڵام یەکێك لەو دوو برایەش لە شارێکدا دامەزرا بە موفتی و بەوپەڕی سەربەستی بە هەموو شوێنێکی وڵاتدا دەگەڕێت، جگە لە شارەکەی خۆی. تەنانەت دەشتوانێت بڕواتە ناو ئەنقەرەی پایتەختەوە. ئەوی تریش بواری پێ درا کە لە ئەستەمبوولدا چاوی بە

هەزاران کەس لە خۆشەویستانی بکەوێت و لەگەڵ هەر کەسێکدا دەیەوێت گفتوگۆ و چاوپێکەوتن ساز بکات. لە کاتێکدا کە ئەم دوو کەسە وەك من تەنیاباڵ و بێ‌ماڵ و منداڵ نین، بەڵکو گەلێ دەست‌ڕۆیشتوون و قسەیان دەڕوات و.. هەروەها و.. هەروەها..

بەڵام منیان ترنجاندە گوندێکەوە و خستمیانە نێوان کەسانێك کە هەرگیز دارای ویژدان نین. تەنانەت لە ماوەی شەش ساڵدا دوو جار نەیێت نەمتوانیوە سەردانی گوندێکی نزیك بکەم کە بیست دەقیقە لە بارلاوە دوورە و نەیانهێشت بڕۆم چەند رۆژێك لەو گوندەدا کات بەسەر بەرم.

بەم جۆرە، هەوڵ دەدەن لە ژێر پاڵەپەستۆی ئیستیبدادێکی دووچەندانەدا بمهارن. لە کاتێکدا کە هیچ حکوومەتێك لە دنیادا نی‌یە لە یەك یاسا زیاتری هەبێت، واتە چەند یاسایەکی جۆراوجۆر بەپێی کەس و گوند و شوێنەکان دانەنراون! بەو واتایەی کە ئەو یاسایەی بەسەر منی‌دا دەسەپێنن هەرگیز یاسا نی‌یە، بەڵکو دەرچوونە لە یاسا. جا بەرپرسەکانی ئێرە دەسەڵاتی حکوومەت دەقۆزنەوە و لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئامانجە کەسی‌یەکانی خۆیاندا بەکاری دەهێنن.

بەڵام لە رووی باسکردنی نیعمەتەوە دەڵێم:

سەد هەزار جار سوپاس بۆ خوای گەورە کە هەموو تەنگ پێ هەڵچنین و خۆسەپاندنێکی ئەوان وەکو تەختەداری لێ دێت بۆ گڕپێوەنانی ئاگری هیممەت و غیرەت، تاکو نوورەکانی قورئان پتر رووناك و درەخشان بن!

جا ئەو رۆوناکی‌یانەی قورئان، کە بە تەنگ پێ هەڵچنین لە لایەن ئەوانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کرا، گەرموگوڕیی غیرەت و هیممەتیان تێدا بووژاپەوە و هێندە فراوانی‌یان بەدەست هێنا کە سەرانسەری پارێزگا، تەنانەت زۆربەی شارەکانی تریشیان وەکو قوتابخانە لێ کرد و تەنها بە "بارلا"وە نەمانەوە!

پێیان وابوو کە منیان لە گوندێکدا بەند کردووە.. کەچی ئەو گوندە(بارلا)، بە کوێرایی چاوی زەندەقە و ئیلحاد و بە فەزڵی خوای گەورە و بە پێچەوانەی ئاواتی ئەوانەوە، بوو بە کورسیی دەرس و وانەی نوورەکانی قورئان. تەنانەت گەلێ شوێنی تر بە وێنەی "ئیسپارتە" رۆشتنە ریزی قوتابخانەکانەوە.

الحمد لله هذا من فضل ربي.

# مەسەلەی پێنجەم

## كە پەیامی پێنجەمە

## پەیامی شوكر

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤)

قورئانی پیرۆز، بە ڕوونكردنەوەی ئیعجازبەخشی خۆی، لە گەلێ ئایەتیدا باسی شوكرانەبژێریی كردووە و خەڵكیی بۆ هان داوە، كە ئەمانەی خوارەوە هەندێكن لەو ئایەتانە:

﴿أَفَلا يَشْكُرُون﴾ (يس:٣٥)..

﴿أَفَلا يَشْكُرُون﴾ (يس:٧٣).

﴿وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِين﴾ (آل عمران:١٤٥).

﴿بَلِ اللهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِين﴾ (الزمر:٦٦).

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتانەدا دەری دەخات كە: مەزنترین كردارێك بەدیهێنەری میهرەبان لە بەندەكانی داوای دەكات بریتییە لە: "شوكر". چونكە بە ڕاشكاوی و ئاشكرا خەڵكی بۆ شوكرانە و سوپاسگوزاری بانگ دەكات و بایەخێكی تایبەتیی دەداتێ، بەوەی كە دەری دەخات: پشت هەڵكردن لە شوكرانەبژێری - لە ڕاستیدا - بەدرۆخستنەوە و دان نەنانە بە نیعمەتەكانی خوای گەورەدا!

هەروەها لە سوورەتی "الرحمن"دا لە ڕێی ئایەتی: ﴿فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبان﴾ەوە بە شێوازێكی ترسناك سی و یەك جار هەڕەشەی توند و تیژی ئاراستەی گرۆی ئادەمی و جینێنی كردووە و دەری خستووە كە: پشتگوێ خستنی شوكرانەی خوای گەورەی

نیعمەت بەخش لە ڕاستی و نـاوەڕۆکدا: بەدرۆخستەنەوە و ئینکـاری و ملنەدانـە بۆ ئـەو نیعمەتانەی خواوەند.

ئنجا هەروەك قورئانی پیرۆز ڕوونی دەکاتەوە کە "شوکر" ئاکام و ئامانجی بەدیهێنانی بوونەوەرانـە.. بە هـەمان جۆر "گـەردوون"یش، کـە وەك قورئـانێکی مـەزنی بەرجەستە وایـە، دەری دەخـات کـە گرنگـترین ئـەنجامی بەدیـهێنانی بوونـەوەران بریتی‌یـە لــە: "شوکرانەبژێری" چونکە ئەگـەر بـە وردی سـەرنجی بوونـەوەران بدرێـت، دەردەکـەوێت کە:

ڕوخسـاری گـەردوون و شـتانی ناویشـی بـە شـێوەیەك نەخشـەیان کێشـراوە و بـە چەشنێکی ئـەوتۆ داڕێـژراون کـە "شـوکر" بەرهـەم بـهێنن و ئـەنجامی شـتانیش بـەرەو شـوکرانەبژێری بـەن. ئـەوەتا هـەموو شـتێك - لـە ڕوویەکـەوە - ڕووی لـە شـوکرانەیە، تەنانەت گرنگترین بەری درەختی بەدیهاتووان شوکرانە کردنە، بگـرە سوپاسـگوزاری و شوکرانە کردن نایابترین و بەنرخترینی ئەو کالآیانەیە کە کارگـەی گـەردوون بەرهـەمیان دەهێنێت، چونکە ئێمە دەبینین کە:

بوونەوەرانی ناو ئەم جیهانە بە شێوە و تەرزێك نەخشەیان کێشـراوە و ڕێ و شـوێنیان بۆ دیاری کراوە کە وەك بازنەیـەکی مـەزن وابن.. ئنجـا "ژیـان"یـش بـە چەشـنێك بـەدی هێنراوە کە چەقە خاڵی ئەو بازنەیە بنوێنێت، دەبینیت: سەرجەمی بوونەوەران لە خزمەتی "ژیـان"دان و ڕوویـان لێیـەتی و سـەرپەرشـتی و چـاودێریی دەکـەن و، گەشـــەپێدانی کەرەســە و پــەرەپێدان و دابـین کردنـی پێداویستی‌یەکانی "ژیـان" دەخەنــە ئەسـتۆی خۆیانـەوە. کەواتـە بەدیهێنــەری گـەردوون لــە نێـوان بەدیـهێنراوانی خـۆیدا "ژیـان" هەڵدەبژێرێت..

پاشان کە تەماشای جیهانی زیندەوەران (واتە: خاوەن ژیانەکان) دەکەین، دەبینین لـە شێوەی بازنەیەکی فراواندا بەدی هێنراون و، "مرۆڤ"یش لە چەقی ئەو بازنەیەدا پلەی بۆ دیـاری کراوە و سـەرجەمی ئامــانج و مەبەسـتەکانی زینـدەوەران لـەودا جـەم بـوون و، بەدیهێنەری بەخشندەش هەموو شتانی لە دەوری مرۆڤدا کۆکردووتەوە و لەبەر مـرۆڤ و لە پێناوی خزمەتگوزاریی ئـەودا ژێربـار و گوێڕایـەڵی کـردوون و مرۆڤـی بـە سـەردار و فــەرمانڕەوای ئــەوان دانــاوە. کەواتــە بەدیهێنــەری گــەردوون لــە نێــوان خــاوەن ژیانەکان(زیندەوەران)دا "مرۆڤ" هەڵدەبژێرێت و دەیکات بە جێی ویســت و ئیختیـاری خۆی..

پاشان جیهانی مرۆڤ و تەنانەت جیهانی زیندەوەرانی تریش - بەهەمان جۆر - لە شێوەی بازنەیەكی تردا دەبینین كە لە چەقی ئەو بازنەیەدا "ڕۆزی" دانراوە و، ئنجا تاسە و شەوقی "بەدەستهێنانی ڕۆزی"ش لە ناخی مرۆڤ و سەرجەم زیندەوەرانی تردا جێگیر كراوە، ئەوەتا دەبینین كە هەر هەموویان - بەم شەوق و تاسەمەندییەیان - بوون بە خزمەتگوزار و ملكەچ و گوێڕایەڵ و ژێربـاری "ڕۆزی". چونكە "ڕۆزی" فەرمانڕەوایانە و بەسەریاندا زاڵ و دەسەڵاتدارە..

ئنجا دەبینین خودی "ڕۆزی"یش كراوە بە گەنجینەیەكی مەزن و فراوانی ئەوتۆ كە ئەگەر گشت جۆر و نیعمەتەكانی تێدا جەم بن و ڕەچاو بكرێن ئەوا هێندە زۆر دەردەچن كە لە ژمارە نایەن. (تەنانەت دەبینین هەر تەنها "هێزی چەشتن" لەناو زماندا، بە ئەندازەی ژمارەی خواردەمەنییەكان، وردیلە كۆئەندام و تەرازووی هەستیاری مەعنەویی تێدا دانراوە كە تامی هەموو چێژەكانی ڕۆزییە جۆراوجۆر و زۆر و زەبەندەكانیان پێ بزانێت).

كەواتە "ڕاستیی ڕۆزی" سەرسووڕهێنەرترین و بەپیترین و سەیر و نامۆترین و شیرینترین و گشتیترینی ڕاستییەكانی ناو گەردوونە..

پاشان هەروەك هەموو شتان لە دەوری "ڕۆزی" كۆبوونەتەوە و چاویان تێبڕیوە، دەبینین خودی "ڕۆزی"یش (بە مادده و ناوەڕۆك و، لە حاڵ و مەقامدا و، بە گشت جۆرەكانیشیەوە) پابەندی شوكرە و، بە شوكرانەوە پەیوەستە و، لە ڕێی شوكرانەبژێرییەوە دەست دەكەوێت و، شوكرانەش بەرهەم دەهێنێت و، دەیخاتەڕوو. چونكە حەز و تاسە و شەوقی زیندەوەر بۆ "ڕۆزی" جۆرێكی سروشتیی شوكرانەیە، تەنانەت لەزەت چەشتنیشی لەو ڕۆزییە هەر بە شوكرانەبژێری دادەنرێت، بەڵام بە شێوەیەكی ناهەستی(غیر شعوری). دەبینیت سەرجەمی زیندەوەران لەم شوكرانەیەدا بەشدارن، جگە لە مرۆڤ كە بە تەنها خۆی لەناو ئەواندا ڕێیەكی جیاواز دەگرێتە بەر و، بە شوێنكەوتنی كوفر و گومڕایی ماهییەتی ئەو شوكرە سروشتییە دەگۆڕێت و، لە پلەی بڵندی "شوكرانەبژێری"یەوە بەرەو قووڵایی بنكی "شیرك" خۆی دەهاوێتە خوارەوە.

پاشان دەبینین هەموو نیعمەتەكان - كە ڕۆزیی زیندەوەرانن - بە چەندین وێنەی ڕەنگین و ناوازە و قەشەنگ ڕازاونەتەوە و.. بۆن و بەرامەی عەترین و خۆش بە دەوری خۆیاندا پەخش دەكەن و.. دارای گەلێ تام و چێژ و لەزەتی زۆر و زەبەندەن..

جا هەموو ئەم دیاردانەی کە بە نیعمەت و ڕۆزی‌یەکانەوەن ـ لە ڕاستی‌دا ـ چەند دەلاڵ و ڕێ پیشاندەرێکن و زیندەوەران بەرەو "شوکرانەبژێری" ڕێنمایی دەکەن! چونکە تاسە و شەوق لە زیندەوەراندا دەورووژێنن و بەرەو جۆرێکی ڕێزلێنان و قەدرزانی و نرخ شناسیی ڕۆزی‌یەکان هانیان دەدەن و، لەم ڕێیەوە شوکرێکی مەعنەوی‌یان تێدا جێگیر دەکەن و، سەرنجی خاوەن هەستانیش بۆ تێرامان و بیرکردنەوە لەو نیعمەتانە ڕادەکێشن و دەیانخەنە بارێکی ئەوتۆوە کە ئەو نیعمەتانەیان بەلاوە گەلێ جوان و قەشەنگ بێت و سەرسوورمانی خۆیان لە ئاستدا دەربڕن و، بەرەو ڕێزنانی شایستە و گونجاو لەو نیعمەتانە، هەڵیاندەنێن و هانیان دەدەن.

کەواتە ئەو نیعمەتانە، سەرجەمی خاوەن هەستان بەرەو شوکرانەبژێریی (بە کردار و گوفتار) شارەزا و ڕێنمایی دەکەن و، دەیانخەنە ڕیزی شوکرانەبژێرانەوە و، لە ناوەندی ئەم شوکر و سوپاسگوزاری‌یەشدا بەنرخترین و خاوێنترین و بەتام و چێژترین لەزەتیان دەرخوارد دەدەن! چونکە بۆ خاوەن هەستانی دەردەخەن کە ئەو نیعمەت و ڕۆزی‌یە خۆش و بەتامانە: لەزەت و بەهرەیەکی ڕواڵەتی و کاتین و هی ماوەیەکی کورت و کەم خایەنن، بەڵام گەر شوکرانەیان لەسەر بکرێت، ئەوا بەو شوکرانەیە، بیری مرۆڤ بۆ: "ئاوڕلێدانەوەی میهرەبانیی خواوەند" بێدار دەکەنەوە کە لە ڕاستی‌دا تام و چێژێکی بێ گەردی ڕاستەقینە و هەمیشەیی و نەبڕاوەیە..

واتە لەبەر ئەوەی "ڕۆزی" بەم شوکرانەبژێری‌یە ئاوڕلێدانەوەی خواوەندی بەخشندە و خاوەنی گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوان یادی مرۆڤ دەخاتەوە (ئەو ڕێزلێنان و ئاوڕدانەوەیەی کە تام و چێژێکی نەبڕاوەی بێ سنووری تێدایە) ئەوا بەم هەست و بیرکردنەوەیە و هەر لەم دنیایەدا چێژ و تامێکی مەعنەویی بەهەشتی هەمیشەیی بە مرۆڤی شوکرانەبژێر دەبەخشن.

جا هەروەك بەهۆی شوکرانەبژێری‌یەوە "ڕۆزی" دەبێت بە گەنجینەیەکی گشتی و فراوانی گەلێ بەبیت و بەرەکەت و بەتام و لەزەت، بە وازهێنانیش لەو شوکرانەبژێری‌یە و گوێ پێ نەدانی، لەو پلە بڵندەی خۆی دەترازێت و بە تەواوەتی دەکەوێتە خوارەوە.

لە "وتەی شەشەم"دا ڕوونمان‌کردووەتەوە کە:

ئەگەر کار و ئەرکی هەستی "تام چەشتن"ی ناو زمانی مرۆڤ ڕووی لە خوای گەورە بێت و لە پێناوی ڕەزامەندیی ئەودا خرابێتە کار، واتە لەبەر ئەنجامدانی ئەرکی "شوکرانەبژێریی مەعنەوی" ڕووی لە "ڕۆزی" کردبێت، ئەوا ئەو هەست و هێزی تام چەشتنەی ناو زمان لە حوکمی سەرپەرشتیکارێکی شوکرانەبژێر و بەڕێوەبەرێکی سوپاسگوزاری خاوەن ڕێز و ویقار و پایەداردا دەبێت بەسەر خواردنگەکان(مطابخ)ی میهرەبانیی بێ سنووری خوای گەورەدا!

بەڵام هەر کات کار و ئەرکی سەرشانی دەروون بۆ مەبەستی تێرکردنی ئارەزووەکانی بێت، واتە: بێ هیچ بیرکردنەوەیەك لە "نیعمەت بەخش" ڕووی لەو ڕۆزی و نیعمەتانە کرد، ئەوا "هێزی چەشتنی" ناو زمان لەو پلەوپایە بەرز و بڵندەی خۆیەوە - کە پلەی سەرپەرشتیکاری دەستپاك و ئەمینە - بەرەو پلەی: دەرگاوانی "کارگەی سك" و پاسەوانی "پشتیری گەدە" دادەبەزێتە خوار!

جا هەروەك ئەم خزمەتگوزارەی ڕۆزی (واتە: هێزی تامچەشتنی ناو زمان) بەم پشت هەڵکردنەی لە شوکرانەبژێری، بەرەو پلەیەکی ئاوا نزم شۆڕ دەبێتەوە.. بە هەمان جۆر، ماهییەتی خودی "ڕۆزی" و سەرجەم خزمەتگوزارەکانی تریشی، بە هەمان ڕێژە، لە بالاترین پایە و بڵندترینی مەقامیانەوە بەرەو بنکی نزمترین پلەی "نزمی" دەکەونە خوارەوە، تەنانەت گرفتاری بارێکی هێندە نزم دەبن کە بە تەواوەتی جیاواز و دوورە لە "دانست"ی بەدیهێنەری مەزنەوە.

پێوەر و نیشانەی شوکر: قەناعەت و، دەستپێوەگرتن و ڕازیبوون و، منەت زانینی نیعمەتبەخشە.. بەڵام نیشانە و پێوەری ناشکوری و گوێ نەدان بە سوپاسگوزاری: هەڵپە و، ئیسراف و، قەدر نەزانی و، هەڵلووشینی هەرەمەکیی هەموو شتێکە بێ پرسینەوە لە حەڵاڵ و حەرام!

بەڵێ، هەڵپەکاری هەروەك لە لایەکەوە بریتییە لە گوێ نەدان بە شوکرانەبژێری و پشت هەڵکردن لە سوپاسگوزاری.. لە لایەکی ترەوە هۆی بێ بەشی و سووکی و ڕیسواییشە! تەنانەت "مێروولە" کە گیاندار و مێروویەکی موبارەکە و خاوەنی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە، لە پێناوی هەڵپەی توند و تیژی بۆ ڕۆزی و لە ئەنجامی لاوازیی قەناعەتەکەیەوە، ژێر پێی ڕێبواران دەکەوێت و دەپلیشێتەوە! چونکە لە کاتێکدا کە چەند دەنکە گەنمێك سەروزیادی پێویستیی ساڵێکی تەواوی ئەوە، کەچی قەناعەتی نییە و هەر بە دوای ڕۆزیدا دەگەڕێت و، گەر بتوانێت، هەزاران دەنکە گەنم بۆ ئەو ساڵەی کۆ دەکاتەوە، تا لەو پێناوەدا تیا دەچێت!!

بەڵام "هەنگ" کە مێروویەکی قەناعەتکاری تەواوە، وەك ئەو نییە، چونکە قەناعەتەکەی هێندە بڵندیی دەداتێ کە لەو بەرزاییەوە باڵ بگرێتەوە و لە سەرووی ئاستی "سەر"ی خەڵکییەوە بفڕێت و بە دوای ڕۆزیدا بگەڕێت! ئیتر بەو چەشنە قەناعەت بە ڕۆزییەکەی خۆی دەکات و بە فەرمانی خوای گەورەش چاکەمان لەگەڵدا دەنوێنێت و هەنگوینێکی پوخت و بێ گەرد دەکاتە دیاریی دەستی و پێشکەشی گرۆی مرۆڤی دەکات!

بەڵێ، ناوی "الرحمن"ی خوای گەورە، کە یەکێکە لە ناوە هەرە مەزنەکانی و ڕاستەوخۆ لە دوای ناوی "اللّٰه"وە دێت، کە ئیسمی ئەعزەم و ناوی "عەلەم"ی زاتی خاوێن و بێ گەردی خوایە.. ئەم ناوی "الرحمن"ە، "ڕۆزی" دەخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە. لەبەر ئەوە، مرۆڤ دەتوانێت بەو شوکرانەبژێرییەی کە لە دوو تویێی ڕۆزیدا هەیە، بگات بە نوورەکانی ئەم ناوە مەزنەی خوای گەورە. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئاشکراترینی واتاکانی: "الرحمن" بریتییە لە: "الرزاق".

پاشان "شوکرانەبژێری" چەندین جۆری جیاجیای هەیە. بەڵام گشتیترین و هەمەکیترینی ئەو جۆرانە و پێڕستە گشتییەکەیان بریتییە لە: "نوێژ"!

هەروەها شوکرانەبژێری "ئیمان"ێکی ساف و خاوێن و، "تەوحید"ێکی بێ گەردی لە دووتوێدایە، چونکە ئەو کەسەی "بە ناوی خوا"وە سێوێك دەخوات و لە کۆتاییشدا "الحمد للّٰه"ی لەسەر پێشکەش دەکات، بەم شوکرانەبژێرییەی، ڕایدەگەیەنێت کە: ئەو سێوە یادگارێکی گەورەی ڕاستەوخۆی دەستی توانستی خوای گەورەیە و، دیارییەکە یەکسەری لە گەنجینەی خواوەندەوە دەرچووە. کەواتە ئەو کەسە - بەم وتە و باوەڕەی - سەرجەمی شتانی هەندەکی و هەمەکی ڕاستەوخۆ بە دەستی توانستی خواوەند دەسپێرێت و، پەی بە درەوشانەوەی میهرەبانیی خوای گەورە لە هەموو شتێکدا دەبات و، لەم ڕێیەوە "ئیمان"ێکی ڕاستەقینە و "تەوحید"ێکی بێ گەرد دەردەخات.

وا لێرەدا تەنها لە یەك ڕووی ئەو زیانە زۆرانە دەدوێین کە بە ناشکوری و پێنەزانینی نیعمەتەکان مرۆڤی بێ ئاگا دووچاریان دەبێت:

ئەگەر کەسێك نیعمەتێکی بەلەزەتی نۆشی و شوکرانەی پەروەردگاری لەسەر پێشکەش کرد، ئەوا بەو شوکرانەبژێرییە نیعمەتەکەی بۆ دەبێت بە: نوورێکی ڕووناکیبەخش و بەرێکی بەهەشت لەودنیای هەمیشەییدا. ئنجا وێڕای ئەو تام و

لەزەتەش کە لێی بەرخوردار دەبێت، هەر لەم دنیایەشدا، کاتێ بیر دەکاتەوە لەوەی کە ئەو نیعمەتە ئاسەوارێکی ئاوڕلێدانەوە و ڕێزلێنانی میهرەبانیی خوای گەورەیە، هەر تەنها ئەم بیرکردنەوەیە، لەزەتێکی مەزنی بەرز و بێ سنووری پێ دەبەخشێت..

بەم پێیە، مرۆڤی شوکرانەبژێر ئەم چەشنە کاکڵە خاوێن و، پوختە ساف و بێ گەردانە و، ئەم مادده و کەرەسە مەعنەوی‌یانە بەرەو ئاستێکی بڵندی وەك ئەو پلە و پایانە دەنێرێت و، ئنجا توێکڵ و مادده بێ سوودەکانیشیان، کە ئەرکی ئەستۆیان تەواو کرد و کاری خۆیان ئەنجام دا و مرۆڤ پێویستی پێیان نەما، دەبن بە چەند زبڵ و پاشەڕۆیەك کە بۆ توخمە بنەڕەتی‌یەکانیان دەگەڕێنەوە.

بەڵام گەر ئەو کەسە شوکری نیعمەتی پێشکەشی پەروەردگار نەکرد و، بگرە بەلایەوە نەنگی بوو کە سوپاسگوزاری لە ڕووی خوادا بنوێنێت، ئەوا هەر ئەو لەزەتە کاتی‌یە، لە دوای خۆی، بە نەمانەکەی ئازاری مرۆڤ دەدات و خەم و پەژارەی نەمانی بۆ بەجێ دەهێڵێت و، بۆ خۆیشی دەبێت بە پاشەڕۆیەکی چەپەڵ. بەم چەشنە، ئەو نیعمەتە ئەڵماس‌ئاسا و گرانبەهایە دەگۆڕێت و هێندە بێ نرخ و بەها دەردەچێت کە وەك خەڵووزی بێ بایەخی لێ دێت!

کەواتە ڕۆزی‌یە فانی و لەناوچووەکان، بە بۆنەی "شوکرانەبژێری"یەوە، چەندەها تام و لەزەتی بەردەوام و بەروبوومی هەمیشەیی بەرهەم دەهێنن.. بەڵام ئەو نیعمەتانەی کە شوکرانەیان لەسەر نەکراوە، لە شێوە و دیمەنە بەرز و جوانەکەیان لادەدەن و وێنەیەکی نزمی بێزلێکراوی چەپەڵ دەگرنە خۆیان، چونکە مرۆڤی بێ ئاگای ناشوکر پێی وایە: ئەو ڕۆزی‌یە - دوای لەزەت لێبردنی - جگە لە پاشەڕۆ هیچ ئەنجامێکی دیکەی نی‌یە!

بەڵێ، ئەو "ڕۆزی"یەی شوکرانەبژێریی لەسەر کرابێت، وێنەیەکی هێندە ڕوونە کە شایانی عیشق و خۆشویستنە، دەنا عیشق و هەڵپەی بێ ئاگا و گومڕایان بۆ "ڕۆزی" جگە لە ئاژەڵێتی هیچی تر نی‌یە!

بۆ خۆت بیر لەمە بکەرەوە با مەودای زەرەری گومڕا و بێ ئاگایان بزانیت و ڕادەی زیانیان هەڵبسەنگێنیت.

لەناو سەرجەمی زیندەوەراندا تەنها "مرۆڤ"ە کە پتر لە هەموویان پێویستی بە ڕۆزی بێت، چونکە خواوەندی مەزن مرۆڤی لەسەر شێوەی ئاوێنەیەك دروست کردووە کە سەرجەمی ناوە جوانەکانی خۆی تێدا دەرخستووە و، وەك موعجیزەیەکی ئەوتۆش بەدیی

هێناوە کە بەڵگەی توانستی ڕەهای ئەو بێت، ئەوەتا چەندەها کۆئەندامی وەهای پێ داوە کە بەهۆیانەوە دەتوانێت هەموو نیعمەتە پاشەکەوت کراوەکانی ناو گەنجینەکانی میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەیان پێ هەڵبسەنگێنێت و بیانناسێت. هەروەها لە شێوەی ئەو جێنشینەی زەویشدا دروستی کردووە کە خاوەنی هێندە ئامێری هەستیار و کۆئەندامی وەهایە بتوانێت لە ڕێیانەوە وردترینی وردەکارییەکانی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوایان پێ لێکبداتەوە..

جا لەبەر هەموو ئەمانە، خوای گەورە لەم مرۆڤەدا "هەژاری"یەکی بێ سنووری داناوە و موحتاجی گشت جۆرە لە سنووربەدەرەکانی "ڕۆزی"ی ماددی و مەعنەویی کردووە، ئنجا ئەو تاکە هۆکار و تەنیا ڕێگایەش کە دەتوانێت لە ناوەندی ئەو "هەمەلایەنی"یەی ماهییەتی مرۆڤدا بۆ مەزنترین پلە، کە پایە و مەقامی: ﴿أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ە، ئادەمیزاد سەربخات، بریتییە لە: "شوکرانەبژێری"!

خۆ ئەگەر "شوکر" لە گۆڕێدا نەما، مرۆڤیش بەرەو نزمترینی پلە نزمەکان پێی دەترازێت و لەو پایە و مەقامەوە دەکەوێتە خوار و، لەم ڕێیەوە ستەمێکی گەلێ مەزن لە خۆی دەکات!

**پوختەی قسە:**

"شوکر" مەزنترینی ئەو چوار بناغانەیە کە ڕێبواری مەزنترین ڕێگا دەیگرێتەبەر، کە ڕێی: "بەندایەتی و.. خۆشویستن لەبەر خوا و.. مەحبووبییەت"ە.

ئەو چوار بناغانەش بەم شێوەیەی خوارەوە تەعبیر کراون:

"در طريق عجزمندى لازم آمد چار چيز:

عجز مطلق..

فقر مطلق..

شوق مطلق..

شكر مطلق..

اى عزيز! (١) ".

---

(١) واتە: ئەی برای ئازیزی دەستەوسان! لە ڕێی "کۆڵەواری و دەستەوسانی"دا دەبێ چوار شت ئەنجام بدەیت: کۆڵەواری و دەستەوسانیی ڕەها.. هەژاریی ڕەها.. شەوق و تاسەمەندیی ڕەها.. شوکرانە بژێریی ڕەها . (وەرگێڕ)

# مەسەلەی شەشەم

## کە پەیامی شەشەمە

لێرەدا نەنووسرا چونکە پشت بەخوا لە کۆمەڵە پەیامێکی تردا بلاو دەکرێتەوە

# مەسەلەی حەوتەم

## کە پەیامی حەوتەمە

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم مەسەلەیە بریتی‌یە لە حەوت ئاماژە

بەلام لە پێشدا، بۆ مەبەستی باسکردنی نیعمەتی خوای گەورە، "حەوت هۆکار" باس دەکەین کە چەند نهێنی‌یەکی "چاودێریی خوای گەورە" دەردەخەن.

❑ **هۆکاری یەکەم:**

پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی و لە دەمی هەڵگیرسانیشی‌دا، ئەم خەونە ڕاستەم دی:

خۆم لە ژێر چیای "ئەرارات"دا بینی.. کتوپڕ ئەو چیایە پارچە پارچە بوو و، بەردی هێندە گەورە گەورەی بەم لا و ئەو لای ڕووی زەوی‌دا دەهاویشت کە هەریەکەیان ئەوەندەی چیایەك دەبوون. کاتێ لەو بارە سامناکەدا بووم، دایکمم لە تەنیشتی خۆمەوە بینی - خوا لێی خۆش بێت - پێم وت:

"دایە گیان! ترست نەبێت، ئەمە فەرمانی خوای گەورەیە، خۆ ئاشکراشە کە خواوەند دانا و میهرەبانە".

کە من لەم حاڵەدا بووم، مرۆڤێکی مەزنی پیاوچاکم لێ پەیدا بوو، فەرمانی پێدام و وتی:

"ئیعجازی قورئان ڕوون بکەرەوە".

کە لە خەو هەڵسام، تێ گەیشتم: تەقینەوەیەکی مەزن ڕوودەدات و، لە ئەنجامی ئەم تەقینەوەیەشدا ئەو شووورایانە دەڕووخێن کە دەوری قورئانی پیرۆزیان گرتووە، ئنجا

قورئـان هێرشـی دەکرێتـە سـەر و خـۆی بـۆ خـۆی بـەرگری لـە خـۆی دەکـات و، "ئیعجاز"ەکەشی قەڵای مەحکەم و پۆڵایینـی دەبێـت و، یـەکێکی وەك منیـش دەستنیشـان دەکرێم تاکو لەم زەمانەدا یەکێك لە جۆرەکانی "ئیعجـازی قورئـان" ڕوون بکەمـەوە، بـە چەشنێ کە زۆر لە سەرووی توانای خۆیشمەوە بێت.

ئیتر تێ گەیشتم کە من بۆ ئەم کارە دەستنیشان کراوم.

جا لەبەر ئەوەی تا ڕادەیەك ئیعجازی قورئـانی پیرۆز بـە "وتـەکان" ڕوون کراوەتـەوە، ئـەوا دەرخستنی چاودێری‌یـەکانی خواوەنـد سـەبارەت بـەم خزمەتـەمان کـە بـۆ قورئـانی پیرۆزی دەکـەین، پشتگیری و هـێز و پـێز بـەو ئیعجـازە دەدات. چونکـە ئـەم خزمەتـە لـە پێناوی پێش‌چاو خستنی ئەو ئیعجازەدایە و وەك نم و بەرەکەتەکانی ئـەو وایـە. واتـە دەبـێ ئەو چاودێری‌یانەی خواوەند پێش‌چاو بخرێن.

❑ **هۆکاری دووهەم:**

مـادەم لـە هـەموو کارێکمـاندا قورئـانی پـیرۆز ڕابـەر و مامۆسـتا و پێشـەوا و ڕێ پیشـاندەرمانە و، ئـەم قورئانـەش سـەنا و ستایشـی خـۆی دەکـات، ئـەوا ئێمـەش سـەنا و ستایشی تەفسیرەکەی دەکەین و لەمەشدا شوێن ڕێنمایی‌یەکانی ئەو قورئانە دەکەوین.

هەروەها مادەم "وتەکان" جۆرە تەفسیرێکن بۆ قورئانی پیرۆز و، پەیامـەکانی نووریـش بە گشتی موڵکی قورئانن و ڕاستـی‌یەکانی ئەویان لـەخۆ گرتـووە و.. قورئـانی پـیرۆزیش بەسام و شکۆ و عەزەمەتەوە خۆی ڕادەگەیەنێت و تایبەتکاری‌یەکانی ئاشـکرا دەکـات و بەو سەنا و ستایشەی کە شایانی بێت لە گەلێ ئایەتی‌دا، بە تایبەت لـەو سـوورەتانەدا کـە بە ﴿الر﴾ و ﴿حم﴾ دەست پێ دەکەن، سەنا و ستایشی خـۆی دەکـات، ئەوا ئێمـەش بـە ئەرکی سەرشانمانی دەزانین ئـەو چاودێری‌یـە پەروەردگاری‌یانـە بخەینـە ڕوو کـە نیشـانەی قبـووڵ بوونـی ئـەم خزمەتـەمانن لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەو ئیعجـازەی قورئـاندا کـە بەسـەر "وتەکان"ەوە دەبریسکێنەوە و، لەمەشدا چاو لە مامۆستاکەمان(قورئانی پیرۆز) دەکـەین کە بۆ ئەم چەشنە کارە ڕێنمایی‌مان دەکات.

❑ **هۆکاری سێهەم:**

ئـەم قسـەیەی کـە سـەبارەت بـە "وتـەکان"ەوە دەیکـەم، لـە ڕووی تەوازوعـەوە نی‌یـە، بەڵکو ڕوونکردنەوەی حەقیقەتە:

ئەو ڕاستی و تایبەتکاری‌یانەی لە "وتەکان"دان، هەرگیزاو هـەرگیز زادەی بـیری مـن نین، بەڵکو تەنها هی قورئانی پـیرۆزن. چونکـە ئـەو وتانـە چەنـد نمێکـن لـە ئـاوی زوڵاڵـی

قورئان، بە ڕادەیەك كە وتەی دەهەم(پەیامی حەشر) لە ڕاستیدا چەند دڵۆپێکی نمنم داتکاوی سەدان ئایەتی قورئانی پیرۆزە. هەروەها پەیامەکانی تریش.

جا مادەم خۆم دەزانم پەیامەکانی نـوور ئەمانەن كە باسم کردن و، دەشزانم من ئەم ژیانە بەجێدەهێڵم و کۆچی ماڵئاوایی لێ دەکەم، ئەوا نابێ شوێنەوارێك بە منی فانییەوە ببەسترێت كە دوای نەمانی من ئەو هەر دەمێنێت و لەناوناچێت..

هەروەها مادەم گومڕایان و ستەمکاران گەر بیانەوێت بەها و نرخی کتێبێك بشکێنن كە بە کەڵکی ئەوان نەیەت، دەچن لە ڕێزی دانەرەکەی دادەگرن، ئەوا دەبێ ئەم پەیامانەی كە پەیوەندییان بە ئەستێرەکانی ئاسمانی قورئانی پیرۆزەوەیە، بە پاڵپشتێکی شڕی وەك منەوە نەبەسترێنەوە كە شایانی هەڵە و کەوتنم و، دەگونجێ لە هەموو لایەکەوە بە زۆری ڕەخنەم ئاراستە بکرێت و بیانووم پێ بگیرێت.

هەروەها مادەم خەڵکی وا ڕاهاتوون كە لە هەڵسوکەوتی دانەری کتێبدا بە شوێن لایەنە تایبەتەکانی کتێبەکەدا دەگەڕێن، چونکە لایان وایە ئەو دانەرە سەرچاوە و تەوەرەی خێری ئەو کتێبەیە، ئەوا ئەوپەڕی ستەم کردنە لە ڕاستی و پێشێل کردنیەتی، گەر وا دابنرێت ئەو ڕاستییە بەرز و گەوهەرە گرانبەها و بەنرخانە تفاقی موفلیسێکی وەك من بن، كە ناتوانم یەك لە هەزاری ئەو تایبەتکارییانەیان دەربخەم.

لەبەر هەموو ئەمانە، دەڵێم: پەیامەکان هی من نین و لە بیری منەوە دەرنەچوون، بەڵکو موڵکی قورئانن. هەر لەبەر ئەوەشە كە ناچارم جوانییەکانیان باس بکەم، چونکە ئەم پەیامانە چەند نمێکیان لە تایبەتکارییەکانی قورئانی پیرۆز دەست کەوتووە.

بەڵێ، ئەو تایبەتکارییانەی لە هێشووی بەلەزەتی ترێدا هەن، وا مەزانە هی قەد و پەل و لقی ئەو مێوەیە كە ئەو هێشووەی گرتووە. منیش وەکو ئەو قەد و لقانە وام سەبارەت بەو ترێ بەلەزەتانە!

❑ **هۆکاری چوارەم:**

هەندێ جار دەربڕینی "تەوازوع" ئەنجامەکەی سپڵەیی و پێنەزانی دەبێت بەرامبەر بە نیعمەتەکان، تەنانەت بە "کوفری نیعمەت"یش تەواو دەبێت.. هەروەها هەندێ جاری تر باسکردنی نیعمەت سەری لە شانازی و بەخۆنازینەوە دەردەچێت. دیارە ئەم دوانە هەردوو کیان زیانبەخشن.

تاکە هۆکاری ڕزگاربوون لەوەی كە مرۆڤ نە گرفتاری "کوفرِی نیعمەت" و نە دووچاری "شانازی" ببێت، لەوەدایە كە دان بە تایبەتکاری و فەزڵ و

چاكەكارىيەكاندا بنێت، بێ ئەوەی لافی خاوەنێتیيان لێ بدات. واتە دەبێ بەو چەشنە پێش‌چاويان بخات كە ئاسەواری نيعمەتی خواوەندی نيعمەت‌بەخشی ڕاستەقينەن..

بۆ نموونە: گەر كەسێك دەستێك بەرگ و پۆشاكی جوان و نايابی كردە بەرت و تۆش بەم پۆشاكەوە لە پێش‌چاودا جوان دەركەوتيت. ئنجا خەڵكی پێيان وتيت: "ماشاء الله چەندە جوانيت! ئەم بەرگ و پۆشاكەت زۆر جوان لێ دێت" تۆش بە تەوازوعەوە وەڵامت دانەوە: نەخێر! من هيچ نيم.. "جوانی" لە كوێ و ئەم "دەستە پۆشاكە"ش لە كوێ! بێ گومان ئەم وەڵامەت بە كوفری نيعمەت و بێ ئەدەبی دادەنرێت بەرامبەر بەو وەستا كارامە و لێهاتووەی كە ئەو دەستە پۆشاكەی لەبەر كردوويت. هەروەها گەر بە شانازىيەوە وەڵامت دانەوە و پێت وتن: "بەڵێ، من لە ڕاستىدا جوانم، كێ هەيە وەك من قەشەنگ و جوان بێت"! ديارە ئەم وەڵامەت بە شانازی و لەخۆباييبوون دادەنرێت.

ڕاستەشەقامی نێوان "كوفری نيعمەت" و "شانازی كردن" لەوەدايە كە بڵێيت: "بەڵێ ڕاستە، من بەم دەستە پۆشاكەوە جوانم، بەڵام ئەو جوانىيە هی من نىيە، بەڵكو هی پۆشاكەكەيە و، فەزڵی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كەسەی كە لەبەری كردووم".

خۆ ئەگەر من دەنگم بە هەموو جێگايەكی جيهان بگەيشتايە، ئەوا بە هەرچی هێز و توانام هەيە دەموت:

"وتەكان" تێكرا حەقيقەتن و تابلێی جوان و ڕەنگينن. بەڵام لە منەوە سەرچاوەيان نەگرتووە، بەڵكو چەند تيشكێكن لە ڕاستىيەكانی قورئانی پيرۆزەوە پەيدا بوون و درەوشاونەتەوە. كەواتە جوانيی ڕاستىيەكانی قورئان لە لايەن منەوە نىيە و من نەمڕازاندووەتەوە، تەنانەت هەر نەمتوانيوە جوانىيەكەی دەربخەم، بەڵكو ڕاستىيە جوانەكانی قورئانی پيرۆز، وشە و تەعبيرەكانی منيان ڕازاندووەتەوە.

من مەدح و ستايشی قورئانم بە وتەكانم نەكردووە.. بەڵكو وتەكانم بە ستايشی قورئان مەدح و سەنا كردووە.

مادەم ئەمە وايە، ئەوا بەناوی جوانيی ڕاستىيەكانی قورئانەوە دەڵێم:

دەرخستن و ئاشكراكردنی جوانيی "وتەكان" – كە چەند ئاوێنەيەكی دەرخەری ئەو ڕاستيیانەن – هەروەها ڕوونكردنەوەی ئەو چاودێرىيە خواييیانەی كە لە جوانيی ئەو ئاوێنانەوە سەريان هەڵداوە، لە ڕاستىدا برىتىيە لە باسكردنی نيعمەتی خوای گەورە و بە كارێكی باش دادەنرێت.

❑ **هۆکاری پێنجەم:**

ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا لە وەلی‌یەکی پیاوچاکم بیست دەیوت:

"لە ئاماژە غەیبی‌یەکانی چەند ئەولیایەکی پێشینەوە دەرەنجامێکی ئەوتۆی بەدەست هێناوە کە قەناعەتی ئەوەی داوەتێ: لە خۆرهەڵاتەوە ڕووناکی‌یەك پەیدا دەبێت و تاریکیی بیدعەتەکان دەڕەوێنێتەوە"!

ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی سەرهەڵدانی ئەم چەشنە ڕووناکی‌یەم کرد و ئێستاش هەر چاوەڕوانم. بەڵام خۆ گوڵەکان لە بەهاردا دەمیان دەپشکوێ! کەواتە دەبێ هەر لە ئێستاوە ڕێ بۆ پشکووتنی ئەم چەشنە گوڵە خاوێنانە ئامادە بکەین و، زانیمان ئێمە بەم خزمەتەمان ڕێ بۆ هاتنی ئەو نوورانی‌یە بەڕێزانە خۆش دەکەین!

بێ گومان باسکردنی ئەو چاودێری‌یانەی خواوەند کە تایبەتن بە "وتەکان"ەوە، هەرگیز نابن بەمایەی "شانازی" و "لەخۆبایی بوون" چونکە ناگەڕێنەوە بۆ خودی خۆمان. بەڵکو دەبن بە مایەی سوپاسگوزاری و باسکردنی نیعمەت.

❑ **هۆکاری شەشەم:**

مەبەست لە "چاودێریی پەروەردگار" کە هۆکاری هاندان و.. بەخششێکی خێرا و.. پاداشتێکی پێشەکیی خزمەتکردنمانە بۆ قورئان بەهۆی دانانی "وتەکان"ەوە، ئەم چاودێری‌یە سەبارەت بە ئێمە بریتی‌یە لە تەوفیق و سەرکەوتنمان لە کار و خزمەتدا. ئەم تەوفیقەش لە خزمەتدا شتێکە ئاشکرا دەکرێت و پێش‌چاو دەخرێت.

خۆ ئەگەر ئەم چاودێری‌یە لە تەوفیقدان و سەرخستندا هەر بەردەوام بێت و پتر بەرز ببێتەوە، ئەوا دەبێت بە "ڕێزلێنانی خوایی". دیارە دەرخستنی ڕێزلێنانی خواییش شوکرانەبژێری‌یەکی مەعنەوی‌یە.

ئنجا گەر ئەم چاودێری‌یە لە سنووری "ڕێزلێنان"یش زیاتر بەرز بووەوە، ئەوا بێ گومان بە "کەرامەتێکی قورئانی" دادەنرێت کە ئێمەی پێ بەهرەمەند بووین. خۆ دیارە دەرخستنی کەرامەتی لەم جۆرەش، کە بەبێ ئیختیاری خۆمان و بە چەشنێك ڕووی داوە کە ئاگا و خەبەر و زانیاریمان لە بارەیەوە نەبووە، هیچ زیانێکی تێدا نی‌یە.

ئنجا گەر ئەو چاودێری‌یەی خواوەندیش لە سەرووی کەرامەتی ئاسایی‌یەوە بوو، ئەوا ئیتر کاری "ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆز"ە. خۆ مادەم دەبێ ئیعجاز ئاشکرا بکرێت، ئەوا دەرخستن و ئاشکراکردنی ئەو شتەش کە هێز و پێز بەو ئیعجازە

دەبەخشێت هەر لە پێناوی ئەودایە و هەرگیز نابێت بە هۆکاری فەخر و شانازی و لەخۆباییبوون، بەڵکو دەبێ بە مایەی شوکر و سوپاسگوزاری.

❑ **هۆکاری حەوتەم:**

لە سەدا هەشتای خەڵکی، کەسانی لێکۆڵەر و زانا نین تاکو بۆ خۆیان بڕۆنە ناو کاکڵەی حەقیقەتەوە و تەسدیقی بکەن و وەری بگرن. بەڵکو بە چاولێکەریی ئەو کەسانەی کە جێی بڕوا و متمانەیانن و بەپێی ڕواڵەت و گومانی باشیان بەوان، هەرچییان لێ دەبیستن ڕاستەوخۆ باوەڕی پێ دەکەن. بە ڕادەیەك کە ئەگەر ڕاستییەکی مەزن لە دەستی کەسێکی لاوازدا بێت، ئەو ڕاستییەش بە لاواز دەزانن، بەڵام گەر مەسەلەیەکی بێ نرخ لە دەستی کەسێکی بەرزدا بێت، بە مەسەلەیەکی بەنرخی دادەنێن!

جا لەبەر ئەوەی لە بەرچاوی خەڵکیدا لە نرخ و بەهای ئەو ڕاستییانەی ئیمان و قورئان دانەگرم کە لە دەستی کەسێکی لاوازی بێ گرنگی و بایەخی وەك مندان، ئەوا ناچارم ئەمە ڕابگەیەنم و بڵێم:

یەکێك هەیە - بێ ئەوەی بەخۆمان بزانین و بە بێ ویستی خۆمان - بۆ خزمەتکردن دەمانداتەبەر و لە چەندین ئیشی مەزندا دەمانخاتەکار.

بەڵگەیشمان ئەوەیە کە:

هەندێ چاودێری و ئاسانکردنمان لە کاردا بۆ دەڕەخسێت، کە لە هەست و ویستی خۆمان بەدەرن.

لەبەر ئەوە، ناچارین ئەو چاودێرییەی خوای پەروەردگار ئاشکرا بکەین.

* * *

جا لەسەر بناغەی ئەم حەوت هۆکارانەی پێشوو، وا ئاماژە بۆ چەند "چاودێری"یەکی پەروەردگاری و هەمەکی دەکەین:

❍ **ئاماژەی یەکەم:**

بریتییە لەو "تەوافوقات"ەی کە لە سەرنجی یەکەمی مەسەلەی هەشتەمی "مەکتووبی بیست و هەشتەم"دا ڕوون کراوەتەوە.

ئەوەبوو لە شەست لاپەڕەی پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا و هەر لە ئاماژەی سێهەمەوە تا ئاماژەی هەژدەهەم - دوو لاپەڕەی نەبێت - زیاتر لە دووسەد دانە وشەی:

"ڕەسووڵی ئەکرەم، علیه الصلاة والسلام" لای یەکێك لە نووسەرەوەکانی ئەو پەیامە و بێ ئەوەی بەو تەوافوقەی زانیبێت، دەیانڕوانییە یەکتر..

جا هەر کەس بە ویژدانەوە سەیری تەنها دوو لاپەڕەی ئەو پەیامە بکات، بۆی دەسەلمێت کە هەرگیز ئەو تەوافوقە ئەنجامی "ڕێکەوت" نییە. چونکە لەوانەیە هەندێ جار چەند وشەیەکی هاوشێوەی یەکتر لە لاپەڕەیەکدا - گەر بێن - بەرامبەر یەکتر دەربچن و لەبەر گریمانی بوونی "ڕێکەوت" لە مەسەلەکەدا بە تەوافوقی ناتەواو لە قەڵەم بدرێت.

بەڵام خۆ وشەی: "ڕەسووڵی ئەکرەم، علیه الصلاة والسلام" لە چەند لاپەڕەیەکی زۆری ئەو پەیامەدا، بەڵکو لە هەموویاندا و بە چەشنێکی هاوسەنگ دەیانڕوانیە یەکتر و تەوافوقیان پێکهێنابوو. لە کاتێکدا کە تەنها دوو یان سێ یان چوار یان شتێك زیاتر لەو وشەیە لە هەر لاپەڕەیەکی ئەو پەیامەدا بەکار هێنرابوو. واتە بە ژمارەیەکی زۆر بەکارنەهاتوون..

کەواتە بۆ یەکتر ڕوانینی ئەم وشانە هەرگیز کاری "ڕێکەوت" نییە و "تەوافوق"ە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم تەوافوقە لای هەشت کەسی نووسەرەوەی پەیامەکاندا سەری هەڵدا و، هەرچەندە جیاوازی لە نووسین و شوێنەکانیشیاندا هەبوو، کەچی هەر نەگۆڕرا و وەکو یەك هاتە دی..

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "تەوافوق" ئاماژەیەکی غەیبیی تابلێی بەهێزە. چونکە هەروەك ڕەوانبێژییەکەی "قورئان" گەیشتە پلەی "ئیعجاز" و کتێبی هەموو ڕەوانبێژەکانی بەجێ هێشت و پلەی بەرزی بەسەردا تۆمار کردن بە ڕادەیەك کە هیچ کام لەو ڕەوانگۆیانە ناتوانن بگەنە ئاستی ئەو ئیعجازە.. بە هەمان جۆر تەوافوقەکانی ناو "مەکتووبی نۆزدەهەم"یش - کە ئاوێنەیەکە بۆ موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ - هەروەها لە وتەی "بیست و پێنجەم"یشدا کە ئیعجازی قورئان دەداتەوە و، لە بەشەکانی تری پەیامەکانی نووریشدا کە جۆرە تەفسیرێکی قورئانی پیرۆزن..

ئەم هەموو تەوافوقانە لەو پەیامانەدا هێندە نامۆن کە لە سەرووی هی هەموو کتێبەکانی ترەوەن و، بەچەشنێکن مرۆڤ وا هەست دەکات کە جۆرێك بن لە کەرامەتەکانی موعجیزاتی قورئان و موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ کە لەو ئاوێنانەدا دەرکەوتوون!

○ **ئاماژەی دووهەم:**

دووهەم "چاودێریی پەروەردگار" كە تایبەتە بەم خزمەتە قورئانیی‌یەوە، بریتی‌یە لەوەی كە خوای گەورە لە گەنجینەی نیعمەتەكانی خۆیەوە چەند برایەكی بەهێز و گەرموگوڕ و دڵسۆز و بەغیرەت و خۆبەختكاری پێ بەخشیوم، كە قەڵەمەكانیان وەكو شمشێری ئەڵماس وایە و، هانی داون یارمەتیی كەسێكی نیمچە خوێندەواری لە خەڵكدابڕاوی وەك من بدەن، كە بە باشی ناتوانێت بنووسێت و لە وڵاتی غەریبیدا تێكەڵاویی خەڵكی لێ قەدەغە كراوە و، ئەو كۆڵە قورسەی خزمەتی قورئانی خستە سەر ئەستۆی بەهێزی ئەوان كە ئەستۆی لاوازی من توانای هەڵگرتنی نەبوو. بەم پێیە، خوای گەورە كۆڵە قورسەكەی لەسەر شان سووك كردم.

جا ئەو كۆمەڵە پیرۆزە (وەك خلووصی دەڵێت): لە حوكمی ئامێری پەخشی "بێ‌تەل"دان و، بە وێنەی مەكینەی دینەمۆی كارەباش وان (وەك صەبری دەڵێت). خۆ هەرچەندە هەریەكەیان چەندین تایبەتكاریی بەرز و جۆراوجۆریان تێدایە كە لە یەكتر جیایان دەكاتەوە، كەچی (وەك صەبری دەڵێت): جۆرە تەوافوقێكی غەیبیی‌یان لە نێواندایە. ئەوەتا هەموویان لە شەوق و هەوڵ و تەقالای كاركردن و غیرەت و گەرموگوڕیی خزمەت‌كردندا لەیەك دەچن.

چونكە بڵاوكردنەوەی نهێنیی‌یەكانی قورئان و نوورەكانی ئیمان و گەیاندنیان بە هەموو شوێنێك لە لایەنی ئەو برایانەوە، هەروەها ڕاپەڕاندنی چوستوچالاكانەی كارەكانیان بە شەوقێكی بەردەوام و هیممەتێكی بەرزەوە لەم ڕۆژگارە سەختەدا كە پیتەكانی نووسین گۆڕاون و چاپخانە دەست ناكەوێت و خەڵكییش پێویستیان بە نوورەكانی ئیمانە و، سەرەڕای ئەو كۆسپ و تەگەرە زۆرانەش كە ڕێی كاركردن دەگرن و مرۆڤ سست و سارد دەكەنەوە و شەوقی لاواز دەكەن.. ئەم خزمەتەی ئەوان لەم بارودۆخەدا، كەرامەتێكی ئاشكرای قورئانی و چاودێری‌یەكی دیار و لەبەرچاوی خوایی نەبێت، هەرگیز هیچی تر نی‌یە.

بەڵێ، هەروەك "ویلایەت" كەرامەتی هەیە، بە هەمان جۆر "نیازی خاوێن" و "ئیخلاس"یش كەرامەتیان هەیە. بە تایبەت پەیوەندیی توندوتۆڵ و پشتگیریی پتەوی نێوان برایان لە ناوەندی بازنەی برایەتی‌یەكی خاوێن و بێ گەردا بۆ خوای گەورە، گەلێ

کەرامەتی زۆری دەبێت. تەنانەت "کەسی مەعنەوی"ی ئەم چەشنە کۆمەڵە دەگونجێ لە حوکمی "وەلی‌یەکی کامل"دا بێت و لە چاودێری‌یەکانی خواوەند بەهرەمەند ببێت.

دەسا ئەی برایانم و ئەی هاوەڵانم لە خزمەتی قورئاندا!

هەروەك ئەگەر هەموو شەرەفمەندی و دەستکەوتەکانی جەنگ بە فەرماندەی ئەو تیپە سەربازی‌یە بدرێت کە قەڵایەکی فەتح کردووە، بە کارێکی هەڵە و ستەم دادەنرێت..

بە هەمان جۆر، ناگونجێ چاودێری‌یە خوایی‌یەکانی ئەو فتووحاتانەش کە بە هێزی کەسی مەعنەوی و پێنووسەکانی ئێوە بەدەست هێنراون، بدرێنە پاڵ کەسێکی کۆڵەواری دەستەوسانی وەك من. چونکە ئەم چەشنە کۆمەڵە پیرۆزە ئاماژەیەکی غەیبیی بەهێزی زیاتر لە تەوافوقی غەیبی‌یان تێدایە و من بۆ خۆم دەیبینم، بەڵام ناتوانم بۆ هەموو کەسێك و عامەی خەڵکیی باس بکەم!

**○ ئاماژەی سێ‌هەم:**

چەسپاندنی سەرجەم "ڕاستی‌یە گرنگەکانی ئیمان و قورئان" بە چەشنێکی درەخشان تەنانەت بۆ سەرسەختترین کەسی ملنەدەر و سەرکەش لە لایەن بەشەکانی پەیامەکانی نوورەوە، لە ڕاستی‌دا ئاماژەیەکی غەیبیی یەکجار بەهێز و چاودێری‌یەکی مەزنی خوای گەورەیە.

چونکە پەیامەکانی نوور چەندین ڕاستیی ئەوتۆی ئیمان و قورئانیان ڕوون کردووەتەوە و چەسپاندووە کە تەنانەت کەسانی یەکجار زیرەکی وەك "ئیبن سینا"ش دانیان بە دەستەوسانیی خۆیاندا ناوە لە تێگەیشتنی‌دا. ئەوەتا لە مەسەلەی حەشردا وتوویەتی: "مومکین نی‌یە بە عەقڵ و ژیری ڕێی چەسپاندنی حەشر بگیرێتە بەر". کەچی "وتەی دەهەم" تەنانەت مناڵ و عەوامەکانیش فێری چەندین حەقیقەتی ئەوتۆ دەکات کە ئەو فەیلەسووفە نەیتوانیوە بە زیرەکیی خۆی پێیان بگات و پەی‌یان پێ ببات.

هەروەها ئەو مەسەلانەی "قەدەر و جوزئی ئیختیاری" کە زانای مەزن "سەعدی تەفتازانی"[1] لە بەشی دوازدە پێشەکی‌یەکەی کتێبی "التلويح"دا بە پەنجا لاپەڕە ئنجا

(١) ناوی "مەسعوودی کوڕی عومەری کوڕی عەبدوڵلا"یە. ساڵی ٧١٢ك (یان٧٢٧) لە تەفتازانی سەر بە خوراسان لە دایك بووە و، لە سەمەرقەندیش ساڵی ٧٩٣ك کۆچی دوایی کردووە. لە زانستەکانی زمانی عەرەبی و مەنتیق و کەلام و بەلاغەدا پێشەوای زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە. دوای ئاوابوونی خۆری زانستە ئیسلامی‌یەکان لە ئەنجامی هێرش و پەلامارەکانی مەغۆلدا ئەم زانایە هەوڵی دا ئەو زانستانە زیندوو بکاتەوە و گەلێ کتێبی سەرچاوەیی گرنگیشی بۆ ئەم مەبەستە دانا. تەنانەت بە سنووری نێوان زانایانی پێشین و دوایین

توانیویەتی شیتەڵی بکاتەوە و تەنها بۆ زانا تایبەتمەندەکانیشی ڕوون کردووەتەوە، کەچی هەر ئەم مەسەلانە بەوپەڕی تێروتەسەلی لە دوو لاپەڕەی باسی دووهەمی وتەی بیست و شەشەم(پەیامی قەدەر)دا بە چەشنێکی ئەوتۆ ڕوون کراونەتەوە کە لە ئاستی تێگەیشتنی سەرجەمی خەڵکیدا بێت. جا ئەگەر ئەم کارە ئاسەوارێکی "چاودێریی خواوەند" نەبێت، دەبێ چی بێت؟

هەروەها "نهێنیی بەدیهێنانی جیهان" کە پێی دەوترێت: "مەتەڵ و تەلیسمی بوونەوەران" و ژیریی کەسانی ژیر و هۆشمەندی گرفتاری سەرسامی کردووە و هیچ فەلسەفەیەك نەیتوانیوە شیی بکاتەوە، ئیعجازی مەعنەویی قورئانی مەزن (واتە پەیامەکانی نوور) لە: "مەکتووبی بیست و چوارەم" و سەرنجە ڕەمزییەکەی کۆتایی "وتەی بیست و نۆهەم" و شەش دانست و حیکمەتەکەی ئاڵوگۆڕ و جموجووڵی گەردیلەکان لە "وتەی سیهەم"دا، نهێنییەکانی ئەو مەتەڵەی ئاشکرا کردووە و گرێ کوێرەکانیشی کردووەتەوە. بەڵێ، ئەم پەیامانە مەتەڵە داخراوەکەی گەردوونیان شی کردووەتەوە و، پەردەیان لەسەر نهێنییەکانی ئەو گرێ کوێرە پەنهانەی بەدیهێنان و ئەنجامی گەردوون هەڵداوەتەوە و، حیکمەت و ئاڵوگۆڕەکانی گەردیلەکانیان ڕوون کردووەتەوە. سەرجەمی ئەم پەیامانەش لە بەردەستی خەڵکیدان، هەرکەسێك بیەوێت، دەتوانێت بیانخوێنێتەوە و لەم دەرەنجامە دڵنیا ببێت.

هەروەها ڕاستییە گەورە و مەزنەکانی چەشنی: "تاکی" و "تەنیایی"ی "پەروەردگاریتیی بێ هاوبەش" و.. ڕاستییەکانی "نزیکیی خوای گەورە" - تەنانەت لە خۆشمان نزیکتر - لێمانەوە و "دووریی ڕەهای ئێمە" لە خوای گەورەوە.. بەوپەڕی تەواوەتی لە لایەن وتەی "شازدەهەم" و وتەی "سی و دووهەم"ەوە ڕوون کراونەتەوە.

هەروەها ڕاستییەکانی: "توانستی هەمەلایەنگری خواوەند" کە دەورانـدەوری هەموو شتێکی داوە و.. "یەکسانیی گەردیلەکان و هەسارە گەڕۆکەکان" لە بەردەم ئەو توانستەدا و.. "ئاسانیی زیندووکردنەوەی سەرجەمی گیانلەبەران" لە حەشری مەزندا بە ئەندازەی ئاسانیی زیندووکردنەوەی یەك دانەیان لە لایەن ئەو توانستەوە و.. "خۆ

---

دادەنرێت. ئەمەش ناوی هەندێکە لە کتێبەکانی: تهذیب المنطق، شرح المقاصد، شرح العقائد النسفية، المطول، مختصر المعاني، التلويح في كشف حقائق التنقيح). تا ئێستاش هەندێ لەم کتێبانە لە قوتابخانەکانی کوردستان و زانکۆکانی چەشنی زانکۆی ئەزهەردا بە دەرس دەخوێنرێن. (وەرگێڕ)

هەڵنەقورتاندنی شیرك و هاوبەشایەتی" بە هیچ جۆرێك لە بەدیهێنانی گەردووندا و، چەسپاندنی ئەم ڕاستیەش بە چەشنێكی ئەوتۆ كە دەری بخات خۆهەڵقورتاندنی شیرك تا پلەی ئیمتیناع و مەحاڵی لە عەقڵ و ژیریەوە دوورە..

هەموو ئەم ڕاستیانە، لە دەمی لێكدانەوەی "وهو على كلّ شيءٍ قدير"ی "مەكتووبی بیستەم" و پاشكۆكەیدا - كە سێ نموونەی لەخۆ گرتووە - ڕوون كراونەتەوە و ئەو نهێنیە مەزنەی "تەوحید" شیتەڵ كراوەتەوە.

ئەمە سەرباری ئەوەی كە "ڕاستیەكانی ئیمان و قورئان" هێندە فراوانن كە زیرەكترین مرۆڤ نەتوانێت دەوراندەوریان بدات!

جا ئایا دەركەوتنی وردەكاریەكانی زۆربەی ڕەهای ئەو ڕاستیانە، بەوپەڕی خێرایی و لە كاتی تەنگانە و گیروگرفتدا، بۆ كەسێكی وەك منی زەین شێواوی پەرێشان حاڵی ئەوتۆ كە هیچ سەرچاوەیەكی كتێبی لە لا نیە.. ئایا - ئەم كارە - یەكێك نیە لە ئاسەوارەكانی "ئیعجازی مەعنەویی قورئان" و دەركەوتن و درەوشانەوەیەكی "چاودێریی پەروەردگار" و ئاماژەیەكی بەهێزی غەیبی؟

○ ئاماژەی چوارەم:

خوای گەورە، بە نیعمەت و بەخشایشی خۆی، دانانی شەست پەیامی بەم چەشنە نیعمەت و چاكەكاریە پێ بەخشیم. چونكە كەسێكی وەك من كە بە كەمی بیر دەكاتەوە و، تەنها شوێن سنووحاتی دڵ[1] دەكەوێت و، بوارێكی فراوانی بۆ باس و لێكۆڵینەوە لەبەر دەستدا نیە، كەچی پەیامی وای لەسەر دەستدا دادەنرێت كە كۆمەڵێك زانا و بلیمەتی بەتوانا بە هەوڵ و تێكۆشانیش نەتوانن دایبنێن..

جا دانانی ئەم پەیامانە بەو شێوەیەی كە باس كرا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پەیامەكان ئاسەواری "چاودێری"یەكی ڕاستەوخۆی پەروەردگارن..

چونكە لە ڕێی "هێنانەوەی نموونەی زۆر"ەوە سەرجەم ڕاستیە ورد و قووڵەكانی ئەم پەیامانە دەخرێنە ئاستی وانە و تێگەیشتنی تەنانەت مرۆڤە عەوامەكانیشەوە. لە كاتێكدا كە گەلێ زانای بەرێز سەبارەت بە زۆربەی ئەو ڕاستیانەوە وتوویانە:

"ئەمانە بە دەرس ناوترێنەوە و تێگەیاندنیان لە تواناندا نیە".

---

(١) مەبەست لە: "سنووحات" ئەو واتا ئیمانیە بەرزانەیە كە لە ئاسۆی دڵ هەڵدێن. (وەرگێڕ)

لە ئەنجامی ئەم بۆچوونەشیاندا: ئەو ڕاستییانەیان هەروەك بە کەسانی عەوام نەوتەوە، تایبەتمەندانیشیان لـێ بێ بەش کردن.

جا ئەم ئاسانکردنە دەراسایەی دانانی ئەو پەیامانە و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانیان، بەوەی کە دوورترین "ڕاستی" هێندە لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخەنەوە کە دەڵێی لە بەردەستدایە و هەروەها وتنەوەی ئەم ڕاستییانە و تێگەیاندنی سادەترین و نەخوێندەوارترین کەس لێیان، هەرگیز لە توانای کەسێکی وەك مندا نییە کە: دەستێکی کورتی لە زمانی تورکیدا هەیە و، گوفتارەکانیشی داخراون و خەڵکی لە زۆربەیان تێناگەن، تەنانەت کاتێ کە لە ڕاستییە ئاشکراکانیش دەدوێت دەیانکات بە گرێ کوێرە و، هەر لە کۆنیشەوە بەم سیفەتانە ناسراوە و ئاسەوارە دێرینەکانیشی ئەم ناوبانگە خراپەی دەسەلمێنن.

جا دەرکەوتنی ئەم ئاسانی و ڕوونکردنەوە ئاشکرایانە لەسەر دەستی کەسێکی ئاوادا، بێ هیچ گومانێك، یەکێکە لە ئاسەوارەکانی "چاودێریی خوای گەورە" و هەرگیز ناکرێت هی کارامەیی و لێهاتنی ئەو کەسە بێت، بەڵکو یەکێکە لە درەوشانەوەکانی "ئیعجازی مەعنەویی قورئانی پیرۆز" و، دانەوەی وێنەیەکی "نموونەهێنانەوەکانی" ئەو قورئانەیە.

○ ئاماژەی پێنجەم:

هەرچەند بە شێوەیەکی گشتی و زۆر بە فراوانی "پەیامەکانی نوور" بڵاوبوونەتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك لەو چین و دەستە و تاقمانەی کە خەڵکیان لـێ پێکهاتووە، هەر لە مەزنترین زاناوە تا دەگاتە بچووکترین کەس لە عامەی خەڵکی.. هەر لە گەورەترین وەلی و پیاوچاك و خواناسەوە تا دەگاتە نزمترین فەیلەسووفی مولحیدی سەرسەخت.. هیچ کام لەمانە تا ئێستا ڕەخنەیان لـێ نەگرتوون، هەرچەندەش ئەم پەیامانەیان لە بەردەستدایە و دەیانبینن و دەیانخوێننەوە و، هەر کۆمەڵ و تاقمێکیش بەپێی پلەی خۆیان سوودیان لـێ وەرگرتووە و، هەندێکیش دووچاری زللەکانی ئەم پەیامانە بوون!

هەموو ئەمانە، تەنها شوێنەواری چاودێرییەکی پەروەردگارین و کەرامەتی قورئانی پیرۆزن!

پاشان ئەم جۆرە پەیامانەی کە دوای لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوەیەکی قووڵ نەبێت ناگونجێ دابنرێن، کەچی دەبینین بەوپەڕی خێرایی نائاسایی و لەڕادەبەدەر و لە کاتی تەنگانە و دڵتەنگی‌دا - کە هەست و بیرم دەشێوێنن - دەنووسرێن..

دیارە ئەمە جگە لە جێدەستی چاودێریی خوای گەورە هیچی تر نییە.

بەڵێ، زۆربەی برایانم و، ئەو هاوڕێیانەش کە لێرە لەگەڵمدان و، سەرجەمی نووسەرەوەکانیش دەزانن کە هەر پێنج بەشەکەی "مەکتووبی نۆزدەهەم" لە ماوەی سێ چوار ڕۆژدا و هەر ڕۆژەش بە ڕێژەی دوو سێ سەعات، واتە بە کۆی دوازدە سەعات و بە بێ گەڕانەوەش بۆ هیچ کتێبێك، دانراوە. تەنانەت بەشی یەکجار گرنگی چوارەمی ئەو مەکتووبە کە مۆرێکی ئاشکرای پێغەمبەرایەتی لە وشەی "ڕەسووڵی ئەکرەم، علیـــه الصلاة والسلام"دا دەرخست، بە "لەبەر" و لە ماوەی چوار سەعات و لە ناوەندی شیو و دۆڵی ناو چیا و شاخەکان و لە ژێر باراندا نووسراوە.

هەروەها "وتەی سی‌هەم" کە پەیامێکی مەزن و وردە، لەناو باخێکدا و بە ماوەی شەش سەعات دانراوە. هەروەك "وتەی بیست و هەشتەم" لە ماوەی دوو سەعات و لەناو باخەکەی سولەیماندا دانراوە.

دانانی زۆربەی پەیامەکانی تریش هەر بەم جۆرە بوون.

ئنجا ئەو کەسانەش کە زۆر لێمەوە نزیکن، دەزانن من - لەوەوپێش - هەرکاتێ بەدەست شتێکەوە بێزار بوومایە نەمدەتوانی ئاشکراترین حەقیقەت ڕوون بکەمەوە، تەنانەت وام لێ دەهات کە نەیشیزانم! بە تایبەت گەر نەخۆشی و تەنگانەم لەسەر کۆ ببوونایەتەوە، ئەوا لەو چەشنە کاتانەدا دەستم لە کتێبدانان و دەرس وتنەوە هەڵدەگرت..
کەچی وتە گرنگەکان و پەیامەکانی تریش لە چەند کاتێکی ئەوتۆدا دانراون کە تەنگانە و نەخۆشی‌یەکانم لەچاو کاتەکانی تردا گەلێ توندوتیژتر بوون و بە خێرایی و لە کەمترین وەختدا دانراون.

جا ئەگەر ئەم دیاردەیە ڕێزلێنانێکی پەروەردگاری و کەرامەتێکی ڕاستەوخۆی قورئان نەبێت، دەبێ چیی تر بێت؟

پاشان هەر کتێبێك ئەم چەشنە ڕاستی‌یە خوایی و ئیمانی‌یانەیان باس کردبێت، هەندێ لە بابەت و مەسەلەکانیان زیانی لە چەندین کەسدا بەجێ هێشتووە. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە هەموو مەسەلەکانی ئەو چەشنە کتێبانە بۆ سەرجەمی خەڵکی بڵاو نەدەکرانەوە. بەڵام ئەم پەیامانە هیچ زیانێکیان بە کەس نەگەیاندووە و هیچ کاریگەری‌یەکی سەلبی‌یان

بۆیان نەبووە و زەینی کەسیشیان نەڕووشاندووە، هەرچەندە لەم ڕووەوە پرسیارم لە گەلێ کەس کردووە. بە ڕادەیەك کە بە دڵنیایی‌یەوە بۆمان ڕوون بووەتەوە کە ئەم دیاردەیە "ئاماژەیەکی غەیبی" و "چاودێری"یەکی ڕاستەوخۆی پەروەردگاری‌یە.

**❍ ئاماژەی شەشەم:**

بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بۆم دەرکەوتووە کە زۆربەی ڕووداوەکانی ژیانم بە بێ توانا و هەست و تەگبیری خۆم ڕوودەدەن، چونکە ڕەوتێکی سەیریان پێ گیراوەتەبەر تاکو ئەم هەموو پەیامانە بەرهەم بێنن کە خزمەتی قورئان دەکەن. بەڵکو هەر هەموو ژیانی زانستیم - بە گشتی - وەك چەند پێشەکی‌یەك وان بۆ ئەوەی بە "وتەکان" ئیعجازی قورئان ڕوون بکەمەوە، بە ڕادەیەك کە بەسەرچوونی ئەم حەوت ساڵەی ژیانم بە ڕەهەندەیی و ئاوارەیی و دوورخرانەوەم لە خەڵکی، بێ هیچ هۆیەك و لە دژی ئارەزووی خۆم و، بەسەرچوونی ژیانم لە گوندێکی دووردا بە پێچەوانەی مەشرەبەکەم و، دوورەپەرێزیم لە زۆر پەیوەندیی کۆمەڵایەتی کە زووتر لەگەڵیاندا ڕاهاتبووم..

هەموو ئەمانە، قەناعەتێکی تەواوی دوور لە گومانیان پێ داوم کە هەموویان بۆ ئەوەن من تەنها بۆ خزمەتگوزاریی قورئان ئامادە بکەن، خزمەتگوزاری‌یەکی بێ گەردی وا کە هیچ خلتەیەکی ئاوێتە نەبێت.

تەنانەت قەناعەتێکی یەکجار تەواوم بەوە هەیە کە: هەموو ئەو تەنگانانەی زۆربەی کات دەیانهێننە ڕێم و، ئەو کۆڵی ماندووبوونەی بە ناڕەوا لە ژێریدا دەناڵێم، هەموویان کاری دەستێکی نادیاری میهرەبانن، بۆ ئەوەی وام لێ بکەن تەنها بۆ ڕازەکانی قورئان بڕوانم و ئاوڕم بەم لا و ئەو لادا پەرتەوازە نەکەم و بە هیچ شتێکی ترەوە سەرقاڵ نەبم.

هەرچەند من پێشتر گەلێ حەزم لە خوێندنەوەی کتێب بوو، کەچی وا ئێستا دوورەپەرێزی و توخن نەکەوتنی هەموو کتێبێکی غەیری قورئان بە ڕۆحم بەخشراوە. لەمەوە تێ گەیشتم کە ئەو شتەی وازی لە کتێب خوێندنەوە پێ هێنام - کە دڵدەرەوەی من بوون لەم چەشنە ئاوارەیی‌یەدا - تەنها ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان بە تەنیا خۆیان مامۆستا و ڕابەرم بن.

پاشان زۆربەی هەرە زۆری پەیام و دانراوەکان لە ئەنجامی پێویستی‌یەکی کتوپڕی "ڕۆح"م و بێ ئەوەی هۆیەکی دەرەکی لە گۆڕێدا بووبێت، وەك نیعمەتێك پێم بەخشراون.

کە ئەمەم بۆ هەندێ لە هاوڕێیانم باس کرد، وتیان:

"ئەم پەیامانە دەرمانی زامەکانی ئەم سەردەمەن".

پاش بڵاوکردنەوەشیان، لە ڕێی زۆربەی برایانمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم پەیامانە پێویستییەکانی ئەم چەرخە ناهێڵن و هەموویان ئەنجام دەدەن و زامەکانیشی ساڕێژ دەکەن.

جا ئەم هەموو حاڵەتانەی لە سەرەوە باس کران، کە هەر هەموویان لە هەست و نەست و ویستی خۆم و ڕەوتی ژیانم بەدەرن و.. تێکڕای لێگەڕان و پشکنینە زانستییەکانیشم، کە ئەویش - بە بێ ویستی خۆم - بە پێچەوانەی داب و ڕەویەی زانایان بوون.. هەموو ئەمانە، هیچ گومانێکیان لەوەدا بۆ نەهێشتم کە ئەو پەیامانە:

چاودێریی خوای گەورە و، ڕێزنانی ڕوون و ئاشکرای پەروەردگارن، تاکو بگەیەننە ئەم ئەنجامە بەرز و پیرۆزە.

○ ئاماژەی حەوتەم:

بە چاوی خۆمان و بێ هیچ موبالەغەیەك سەد دانە ئاسەواری ڕێزلێنانی خوایی و چاودێریی پەروەردگاری و کەرامەتی قورئانیمان بینیوە لە ماوەی شەش ساڵی خزمەتماندا بۆ قورئانی پیرۆز. لە "مەکتووبی شازدەهەم"دا ئاماژەمان بۆ بەشێکیان کردووە و بەشێکی تریشمان لە ناوەندی مەسەلە پەرش و بڵاوەکانی باسی چوارەمی "مەکتووبی بیست و شەشەم" و مەسەلەی سێهەمی "مەکتووبی بیست و هەشتەم"دا ڕوون کردووەتەوە. هاوەڵە نزیکەکانم ئەمانە دەزانن، بە تایبەت هاوەڵی بەردەوامم کاك سلێمان لە زۆربەیان ئاگادارە.

ئیتر بەم جۆرە ئێمە بەهرەمەندی کارئاسانییەکی خاوەن کەرامەتی خوایی بووین کە هەرگیز بە دڵ و ئەندێشەماندا نەهاتووە، چ لە بڵاوکردنەوەی "وتەکان" و پەیامەکانی تردا و، چ لە ڕاستکردنەوەیان و دانانیان لە شوێنی خۆیاندا و، چ لە ڕەشنووس و پاکنووسیاندا. ئیتر دوای ئەمانە هیچ گومانێکمان لەوەدا نەما کە هەموو یەکێك لەو چاودێرییە خواییانە کەرامەتێکی قورئانی پیرۆزن.

سەدان نموونەمان لەسەر ئەمە بەدەستەوەیە.

پاشان هەست دەکەین کە ئێمە بە "شەفەقەت" و "میهرەبانی" پەروەردە دەکرێین و، گوزەرانمان بە "چاودێری" دەبرێت بەڕێوە، بە چەشنێك خاوەنی ئەو چاودێرییەی کە

ئێمەی لەم خزمەتەدا خستووەتە کار بچووکترین ئارەزووەکانی دڵمان بۆ دەهێنێتەدی و بێ ئەوەی لە نیاز و حسابیشماندا بووبێت پێمانی دەبەخشێت..

جا ئەم حاڵەتە ئاماژەیەکی غەیبیی لەوپەڕی بەهێزیدایە بۆ ئەوەی کە: ئێمە لەم خزمەتە قورئانییەدا دەدرێینە بەر و دەخرێینە کار و، ڕەزامەندیی خوای گەورەش دەورەی داوین و لە ژێر سایەی میهرەبانیی پەروەردگاردایین.

الحمد لله هذا من فضل ربي.

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللهم صلّ على سيدنا محمد صلاةً تكون لك رضاءً ولحقهِ اداءً وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً كثيراً. آمين.

* * *

## وەڵامی پرسیارێکی تایبەت

ئەم نهێنییە، کە نهێنیی چاودێرییەکی پەروەردگارە، بۆ ئەوە نووسراوە کە بە شێوەیەکی تایبەتی دەستاودەستی پێ بکرێت و خرایە کۆتایی وتەی چواردەهەمەوە. بەڵام نووسەرەوەکان - بە هەرحاڵ - لە بیریان چوو لەوێ بینووسنەوە. لەبەر ئەوە بە پەنهانی و نادیاری مایەوە. کەواتە شوێنی خۆی ئێرەیە، کە زیاتر بۆی دەست دەدات.

برام!

تۆ دەپرسیت:

بۆچی لە "وتەکان"دا - کە لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە هەڵگۆزراون - هەست بە کاریگەرییەکی نائاسایی و لەعادەت بەدەری ئەوتۆ دەکەین کە مەگەر بە دەگمەن دەنا لە نووسینی خواناسان و تەفسیرنووساندا هەستی پێ ناکەین، چونکە ئەو کاریگەرییەی کە یەك دێڕی "وتەکان" دەیکات، بەرامبەر کاریگەریی یەك لاپەڕەی کتێبێکی ترە و.. ئەو هێزەش کە لە لاپەڕەیەکیدا هەستی پێ دەکرێت مەگەر لە کتێبێکی تەواوی تردا ئنجا دەست بکەوێت؟

وەڵامی ئەمە، کە وەڵامێکی جوانە، ئەمەی خوارەوەیە:

مادەم فەزڵی ئەم شتە بۆ ئیعجازی قورئـان دەگەڕێتـەوە نـەك بۆ من، ئـەوا بـە بـێ هیـچ دوودڵییەك دەڵێم:

بەڵێ، بە ئەغلەب وایە. چونکە "وتەکان":

(تَصَوُّر) نییە بەڵکو (تَصدیق)ە[1].. (ئیسلام) نییە بەڵکو (ئیمـان)ە[2].. (معرفـة) نییە بەڵکو (شهادة) و (شهود)ە[3].. (تقلید) نییە بەڵکو (تحقیق)ە[4].. (إلـتزام) نییـە بەڵکو (إذعان)ە[5].. (تصوف) نییە بەڵکو (حقیقة)ە.. (إدعاء) نییە بەڵکو (بەڵگە)یە لـە دووتوێی (دەعوا)دا.

حیکمەتی ئەم نهێنییەش لەوەدایە کە:

بناغە و بنچینەکانی ئیمان لە سەردەمەکانی پێشوودا تابلێی دامەزراو بووە و لە لایـەن ئیمـاندارانەوە گوێڕایەڵییەکی تـەواویان بـۆ کـراوە، بە ڕادەیـەك کـە ئەگـەر عارفـان و شـارەزایان لـە مەسـەلە فەرعییـەکاندا بەڵگەشـیان نەهێنابایەتـەوە، هـەر تەنـها ڕوونکردنەوەکانیان سەروزیاد بوون بۆ دروستکردنی قەناعەتی هاوچەرخانی خۆیان.

بەڵام لە کاتی ئێستاماندا، لەبەر ئەوەی گومڕایی زانستی (واتە: ئەو گومڕاییەی کـە بە ناوی زانستەوە خەڵکی لە ڕێ دەترازێنێت) پـەلی بـۆ بناغـەکانی ئیمـانیش هاویشتووە، ئەوا خـوای گـەورە و میهرەبان کـە دەرمـانی هـەموو دەردێك دەبەخشـێت، بـە دانـایی و میهرەبانیی خۆی پرشنگێکی لە: "ضرب الأمثال"(واتـە:نموونـە هێنانـەوە) پێ بەخشـیوم، کـە ڕوونـترین و درەخشـانترینی موعجیزاتی قورئانـە. ئەمـەش تەنـها بـەزەیی خـواوەنـدی میهرەبانـە کـە نـاردی بـە هانـای لاوازی و ناچـاری و هەژاریمەوە لـە نووسینەکانمدا کـە

---

(١) تصوّر: بریتییە لە پێزانینی شتێك، لێتر بێ ئەوەی بە "نەفی" یان "ئیثبات" حوکمـی بەسـەردا بدرێت. بەڵام "تصدیق": بریتییە لەوەی کە بە ویستی خۆت ڕاستی(صدق) نیسبەت بدەی بۆ لای قسەکەر.

(٢) ئیسلام و ئیمان: لێرەدا مەبەست ئەو جیاوازییەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە: ﴿قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا ولكن قولوا أسلمنا﴾(الحجرات:١٤).

(٣) معرفة: واتە پێزانینی شتێك بەو جۆرەی کە هەیە. "شهادة": گێڕانەوەی شتێك یان ڕووداوێك پاش دیتن بـە چاو. "شهود": لێرەدا مەبەست بینینی خوای گەورەیە بە چاوی دڵ لە حەقیقەتدا.

(٤) تقلید: چاولـێکەری. "تحقیق": گەیشتن بە ئەنجام پاش لێکۆڵینەوە.

(٥) إذعان: جەزم کردنی عەزمە پاش دوودڵی.

تێبینی: بۆ واتای ئەم زاراوانە سوود لە کتێبی "التعریفات"ی "جرجاني" وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

تایبەتن بە خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز. کەواتە تەنها سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو خواوەندە میهرەبانەیە کە:

بە دووربینی (ضرب الأمثـــال) دوورترین حەقیقەت لە پێش چاودا یەکجار نزیك خرایەوە و..

بەهۆی یەکێتیی بابەتیش لە (ضرب الأمثال)دا زۆربەی مەســـەلە پەرش و بڵاوەکان کۆکرانەوە و..

بە پلیکانەی (ضرب الأمثـلل)دا زۆر بە ئاسانی سەرکەوتن بۆ بەرزترین حەقیقەت بەدەست هات و..

لە دەروازەی (ضرب الأمثال)ەوە دڵنیایی ئیمانیش لە بەرامبەر حەقیقەتە شاراوەکانی غەیب و بناغەکانی ئیسلامەوە بە ئەندازەیەك هاتەدی کە دەتوانم بڵێم زۆر لە (شهود)ەوە نزیکە.

ئیتر هەروەك لەم ڕێیەوە "ژیری" و "ئەندێشە" و "وەهم" و "دەروون" و ئارەزووەکانی تەسلیم بوون، بە هەمان جۆر "شەیتان"یش چەکی دانا و توانای بەرگریی نەما!

**بە پوختی:**

هەرچی لە بارەی کاریگەری و تەئسیر لە نووسینەکانمدا دەردەکەوێت، هیچی هی من نییە و لە بیری منەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە بریسکانەوەنەکانی ئەو (ضرب الأمثال)ەیە کە بە ئاسمانی قورئانی پیرۆزەوە دەدرەوشێتەوە و، بەشی من لەم کارەدا تەنها ئەوەیە کە لەوپەڕی پێویستی و بێ دەستەڵاتیدا هانا دەبەمە بەر خواوەند و لێی دەپاڕێمەوە.

کەواتە دەرد ەکە لە منەوەیە و دەرمانەکەشی لە قورئانی پیرۆزەوە.

* * *

## کۆتایی مەسەلەی حەوتەم

**ئەم کۆتایی‌یە تایبەتە بە لابردنی ئەو شوبهە و گومانانـەی کـە لـە دەوری ئاماژە غەیبی‌یەکان ورووژێنراون یان لەوانەیە بورووژێنرێن، ئەوانەی کـە لـە شێوەی هەشت چاودێریی پەروەردگاردا باس کران. لە هەمان کاتیشدا – ئەم کۆتایی‌یە – نهێنی‌یەکی مەزنی چاودێری‌یەکی خوایی دەردەخات.**

ئەم کۆتایی‌یە بریتی‌یە لە چوار سەرنج:

❑ **سەرنجی یەکەم:**

لە دەمی باسکردنی "تەوافوقەکان"ی ناو پەیامەکاندا ئیددیعای بینینـی درەوشـانەوەی ئاماژەیەکی غەیبی‌مان کـرد و ئەمـەشمان لـە باسـی "هەشـتەم چـاودێریی خـوای گـەورە"دا نووسی. ئەم ئاماژەیەشمان لەو حەوت چاودێری‌یە هەمـەکی و مەعنەوی‌یـەی خواوەنـدەوە هەست پێ کرد کە لە مەسەلەی حەوتەمی "مەکتووبی بیست و هەشتەم"دا باس کراون.

ئێمە تا ئێستاش ئیددیعا دەکەین و دەڵێین: ئەم حەوت هەشت چاودێری‌یە هەمەکی‌یانە هێندە بەهێز و گومانبڕن کە هەر یەکەیان بە سەربەخۆ ئەو ئاماژە غەیبی‌یانـە دەچەسپێنن. تەنانەت گەر بە فەرزی مەحاڵیش وا دابنرێت کـە هـەندێکیان لاواز دەربکـەون، یـا خـود گـەر ئینکـاریش بکرێـن، ئـەوا هـەرگیز ئـەم کـارە قەتعییـەت و بێ‌گومـانیی ئـەو ئامـاژە غەیبی‌یانە تێك نادات. چونکە کەسێك گەر نەتوانێت ئینکاریی ئەو هەشت چاودێری‌یانە بکات، ناشتوانێت ئینکاریی ئەو ئاماژانە بکات.

بـەڵام لەبـەر ئـەوەی چینـەکانی خـەڵکی جیاجیـا و جۆراوجـۆرن و چینـی عــەوامیش زۆرینەی خەڵك پێکدەهێنن و، ئەوانیش زیاتر پشت بە بینـین دەبەسـتن، ئـەوا لـە نـاوەندی ئـەو چاودێری‌یـە خوایی‌یانـەدا "تەوافوقـەکان" زیـاتر دەردەکـەون. خـۆ هەرچـەندە ئـەم تەوافوقانە بـەهێزترینی ئـەو چاودێری‌یانـە نین و ئـەوانی ترمـان بـە لاوە بـەهێزترن، کـەچی تەوافوقەکان لەچاو ئەوانی تردا گشتی‌ترن. لەبەر ئەمە، ناچار بووم لـە شـێوەی سـازدانی بەراوردێکدا ڕاستی‌یەکی دیاری کراو ڕوون بکەمەوە، تاکو ئەو شوبهە و گومانانە ببڕێنـە دواوە کە لە دەوری "تەوافوقەکان"دا دەورووژێنرێن. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

سەبارەت بەو چاودێری‌یە ئاشکرایەوە وتمان:

تەوافوقی هەردوو وشەی: "قورئانی پیرۆز" و "ڕەسووڵی ئەکرەم، علیه الصلاة والسلام" هێندە ئاشکرا و لە بەرچاون کە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵنەوە: ئەم وشانە بە ئامانج و مەبەست ڕێکخراون و دۆخێکی بەرامبەر یەکیان پێ دراوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەم ویست و ئامانج و مەبەستە لە لایەن ئێمەوە نەبووە، ئەوەیە کە خۆمان دوای نزیکەی چوار ساڵ بەم تەوافوقانەمان زانیوە! واتە: ئەم ویست و مەبەستە شتێکی غەیبی و ئاسەوارێکی چاودێریی خواوەندە و لەم ڕێیەوە ئەو شێوە نامۆیە بەو دوو وشەیە بەخشراوە، وەك پشتگیرییەکی ڕووت و بێ گومان بۆ "موعجیزاتی ڕەسووڵی ئەکرەم علیه الصلاة والسلام" و "ئیعجازی قورئان"..

ئیتر بە بەرەکەتی ئەم دوو وشەیە: "تەوافوقەکان" بوون بە مۆری تەصدیق بۆ هەردوو پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی" و "موعجیزاتی قورئانی". تەنانەت گەلێ وشەی تری وەك ئەم دووانەش چەندین تەوافوقی وەك ئەمەیان بەدەست هێنا، بەڵام لە چەند لاپەڕەیەکی دیاری کراودا. کەچی ئەم دوو وشەیە لە زۆربەی لاپەڕەکانی پەیامەکاندا بە گشتی و لە هەموو لاپەڕەکانی ئەم دوو پەیامەدا بە تایبەتی ئەم تەوافوقەیان دەرخستووە!

گەلێ جار دووپاتمان کردووەتەوە و وتوومانە کە: دەگونجێ ئەسڵی ئەم تەوافوقانە لە کتێبەکانی تریشدا بە زۆری ڕوو بدەن، بەڵام هەرگیز تا ئەم ئەندازە نامۆیە نین، کە بەڵگەیە لەسەر ویست و مەبەستێکی بەرز و بڵند.

ئنجا هەرچەند بە هیچ جۆرێ ناگونجێ ئەم دەعوایەمان هەڵبووەشێنرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا یەكدوو ڕووی تێدایە لەوانەیە بە بینینی ڕواڵەتی وەك بەتاڵ و ناڕەوا دەربکەون. یەکێکیان بریتییە لەوەی کە:

لەوانەیە بوترێت:

ئێوە خۆتان دوای تێفکرین و سەرنجدانێکی ورد ئەم تەوافوقانە ڕێك دەخەن. خۆ دیارە لە کاتێکی وادا ئەنجامدانی ئەم کارە بە ویست و مەبەست کارێکی ئاسان دەبێت.

**لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین:**

دوو شایەتی ڕاستگۆ لە هەر کێشە و دەعوایەکدا سەروزیادە بۆ چەسپاندنی ئەو دەعوایە.

خۆ ئێمە دەتوانین سەد شایەتی ڕاستگۆ بهێنینە پێشەوە کە شایەتن لەسەر ئەوەی: دوای نزیکەی چوار ساڵ ئێمە بەم تەوافوقانەمان زانیوە و بێ ئەوەی ویست و مەبەستی خۆشمان بۆ ئاراستە کردبێت.

وا بەم بۆنەیەوە خاڵێك ڕوون دەکەمەوە:

ئەم کەرامەتە ئیعجازی‌یە، لە ڕووی ڕەوانبێژی‌یەوە، لە جۆری "پلەی ئیعجازی قورئان" نی‌یە. چونکە لە ئیعجازی بەلاغیی قورئاندا مرۆڤ بە تەواوەتی دەستەوسانە لەوەدا کە بتوانێت بە گرتنەبەری ڕێی ڕەوانبێژی بگاتە ئاستی پلەی بەلاغەتی قورئان. بەڵام ئەم کەرامەتە ئیعجازی‌یە بە دەستەڵاتی مرۆڤ ڕوو نادات و ناتوانێت بە توانستی خۆی دەستی تێ وەربدات، دەنا نیشانە و شێوەی دەستکردی پێوە دەردەکەوێت[1].

❑ سەرنجی سێهەم:

وا بە بۆنەی باسی: "ئاماژەی تایبەت" و "ئاماژەی گشتی"یەوە، ئاماژە بۆ نهێنی‌یەکی وردی نێوان نهێنی‌یەکانی "پەروەردگاریتی" و "ڕەحمانییەت" دەکەین.

یەکێك لە برایانم قسەیەکی جوانی هەیە. منیش دەیکەم بە بابەتی ئەم مەسەلەیە:

ڕۆژێکیان تەوافوقێکی جوان پیشانی ئەم برایە درا. ئەویش وتی: "ئەم تەوافوقە شتێکی جوان و ڕەنگینە، چونکە هەموو حەقیقەتێك جوانە. بەڵام لە هەموویان جوانتر ئەو تەوفیق و تەوافوقەیە کە لە نێوان ئەو و شانەدایە"!

منیش وتم: (بەڵێ، هەموو شتێك جوانە. بەڵام یان ئەوەیە بە حەقیقەت و لە زاتی خۆی‌دا جوانە، یاخود لەبەر ئەنجامەکانی بە جوان دادەنرێت. ئەم جوانی‌یەش ڕووی لە پەروەردگاریتیی "گشتی" و میهرەبانیی هەمەلایەنە و درەوشانەوەی "گشتی"یە. ئنجا ئەم ئاماژە غەیبی‌یەش کە لەم تەوفیقەدایە - وەك تۆ وتت - لەوان جوانترە، چونکە میهرەبانی و پەروەردگاریتیی درەوشانەوەیەکی "تایبەت" دەردەخات).

وا بە نموونەیەك ئەمە لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخەینەوە:

---

(١) لە ئاماژەی هەژدەهەمی مەکتووبی نۆزدەهەمی نوسخەیەکی دەستنوسدا: نۆ دانە وشەی "قورئانی پیرۆز" تەوافوقیان لە نێواندا بوو، ئێمەش کە هێڵێکمان لە نێوانیاندا کێشا لە کۆی هەموویان وشەی "محمـــد" دەرچوو! کە هەمان هێڵیشمان لە نێوان هەشت دانە وشەی "قورئانی پیرۆز"ی لاپەڕەی بەرامبەردا کێشا، "الله" لە کۆی هەموویان دەرکەوت! جا لەم چەشنە نموونە ناوازانەی تەوافوق لەو پەیامانەدا گەلێ زۆرە*.

* واقیعی ئەم پەراوێزەمان بە چاو بینی. (بەکر، تۆفیق، سلێمان، غالب، سەعید"دانەر"). [منیش ئەو نوسخە دەستنووسەم لە شاری ئیسپارتە بە چاوی خۆم بینی. (فاروق) - وەرگێڕ]

"پادشا" لە ڕێی دەوڵەتەكەی و یاساكانیەوە، هەموو یەكێكی نەتەوەكەی دەخاتە ژێر چاودێری و میهرەبانیی خۆیەوە. ئیتر لەم ڕێیەوە هەموو كەسێك ڕاستەوخۆ لوتف و كەرەمی پادشای دەستگیر دەبێت و لە سایەی دەوڵەتەكەیدا دەحەوێتەوە. واتە لە ناوەندی ئەم شێوە "گشتی‌یە"دا یەك بە یەكی میللەتەكەی پەیوەندیی تایبەتی‌یان پێوەی هەیە.

بەڵام ڕووی دووهەمی چاودێری و میهرەبانی‌یەكەی "پادشا" بریتی‌یە لە نیعمەت و فەرمانە "تایبەتی"یەكانی كە لە سەرووی هەموو یاساكانەوەیە و، هەموو یەكێك لە كەسانی میللەتەكەی بەشێكیان لەم نیعمەت و بەخششە تایبەتی‌یانەی "پادشا"دا هەیە.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە:

**یەكەم:**

هەموو شتێك بەشێكی لە ڕووتێكردنی پەروەردگاریتی و میهرەبانیی هەمەلایەنگر و گشتیی بەدیهێنەری دانا و میهرەبان و "واجب الوجود"دا هەیە..

واتە هەموو شتێك لەو ڕووەیەوە كە تیایدا بەهرەمەندی ئاوڕلێدانەوەی ئەو پەروەردگاریتی و میهرەبانی‌یەی خواوەند بووە، پەیوەندی‌یەكی تایبەتیی بەو پەروەردگاریتی و میهرەبانی‌یە گشتی‌یەوە هەیە. هەروەك خواوەند بە ویست و توانست و زانستی هەمەلایەنگریشی هەڵسوكەوت لە هەموو شتێكدا دەكات. چونكە پەروەردگاریتیی خواوەند هەموو شتێك تەنانەت بچووكترین كرداریش دەگرێتەوە و، هەرچی شت هەیە لە سەرجەمی كاروبارەكانیدا پێویستی بەو خواوەندە پەروەردگارەیە. ئیتر خوای گەورە، بە زانست و دانستی خۆی، كاروبارەكانی ئەو شتە ڕێكدەخات.

كەواتە "سروشت" ناتوانێت خۆی لە ناوەندی بازنەی دەستتێوەردان و هەڵسوكەوتی پەروەردگاریتی‌یە مەزنەكەی خواوەند بشارێتەوە، یان خۆی تێدا هەڵبقورتێنێت و جێ‌دەست و كاریگەریی تێدا هەبێت.. هەروەك "ڕێكەوت"یش ناتوانێت خۆی لەو كاروبارانەی خواوەندا هەڵبقورتێنێت كە بە تەرازووی وردی "دانست" تەرازوو كراون.

لە بیست شوێنی پەیامەكاندا كاریگەرنەبوون و دەستەوسانیی "سروشت" و "ڕێكەوت"مان بە چەشنێكی گومانبڕ چەسپاندووە و هەردووكیانمان بە شمشێری قورئانی پیرۆز كوشتووە و لەناوبردووە. هەروەك بە چەندین بەڵگەی بەهێزیش ڕوونمان

کردووەتەوە کە دەستتێوەردانی ئەم دووانە لە کاروبارەکاندا بە تەواوی کارێکی مەحاڵە.

بەڵام بێئاگایان ناوی "ڕێکەوت"یان لەو شتانە ناوە کە لەبەرچاوی ئەواندا دانست و هۆکارەکانیان نازانرێت، لەو چەشنە دیاردانەی کە "پەروەردگاریتیی گشتی" دەیانگرێتەوە.. هەروەك کاتێ لە بینینی یاساکانی ئەو کارە خواییانەشدا دەستەوسان مان کە حیکمەتەکانیان لە ژێر پەردەی سروشتەوەیە و پەیی پێ نابرێت، ئەوا ئەو کارانەیان دایە پاڵ "سروشت"!

**دووهەم:**

بریتییە لە پەروەردگاریتیی ڕیزلێنان و یارمەتیی میهرەبانیی "تایبەت". بە چەشنێك کە ئەو کەسانەی بەرگەی باڵەپەستۆی یاسا گشتییەکان ناگرن، هەر دوو ناوی "الرحمن" و "الرحیم" بە هانایانەوە دەچێت و فریایان دەکەوێت و بە چەشنێکی "تایبەتی" یارمەتییان دەدات و لەو سەختی و تەنگانەیە ڕزگاریان دەکات.

لەبەر ئەمە، هەموو زیندەوەرێك بە تایبەت "مرۆڤ" هەمیشە داوای یارمەتی و پشت و پەنا هەر لە خوای گەورە دەکات. چونکە هەرگیز ناگونجێ چاکە و نیعمەتەکانی خواوەند - کە لەم پەروەردگاریتییە تایبەتەدان - لە ژێر پەردەی "ڕێکەوت"دا بشاررێنەوە یان بدرێنە پاڵ "سروشت" تەنانەت لە لایەن بێئاگایان خۆشیانەوە!

**جا لەسەر بناغەی ئەمانەی پێشوو:**

ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەو ئاماژە غەیبییانەی لە "موعجیزاتی ئەحمەدی" و "موعجیزاتی قورئانی"دان: ئاماژەیەکی غەیبیی "تایبەتی"ن و، دڵنیاین لەوەی کە یارمەتیدانێکی پەروەردگاری و چاودێرییەکی خوایی "تایبەت"ن، بە چەشنێك کە خۆیان لە بەردەم کەسانی سەرسەخت و ملنەدەردا دەردەخەن. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئاشکرامان کردن، تاکو ڕەزامەندیی خواوەند بەدەست بهێنین. خۆ ئەگەر تەقسیرێکمان تێدا کردبێت، ئەوا داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەین و، ئومێدەواریـن چاوپۆشیمان لێ بکات. ئامین.

﴿ربَّنا لا تُؤاخِذْنا إنْ نَسينا أوْ أخطَأْنا﴾.

* * *

# مەسەلەی هەشتەم

## کە پەیامی هەشتەمە

ئەم مەسەلەیە بریتی‌یە لە هەشت سەرنج و، لە وەڵامی شەش پرسیاردا نووسراوە

❖ **سەرنجی یەکەم:**

گەلێ جۆری ئاماژەی غەیبیی ئەوتۆمان هەست پێ کردووە، کە دڵنیامان دەکەن لەوەی ئێمە لە ژێر چاودێری‌یەکی خوایی‌دا لەم خزمەتە قورئانی‌یەدا خراوینەتە کار. ئەوەبوو هەندێکمان لەو ئامـاژە غەیبی‌یانە ڕوون کـردەوە و، ئەمەی خوارەوەش ئاماژەیەکی تری نوێ‌یە کە بریتی‌یە لە: بوونی گەلێ تەوافوقی غەیبی لە زۆربەی "وتەکان"دا(١).

یەکێك لەوانە ئاماژەیەکی غەیبی‌یە بۆ بەرجەستەبوونی جۆرێك لە نووری ئیعجاز لە وشەی: "ڕەسوولی ئەکرەم" هەروەها لە دەستەواژەی: "علیه الصلاة والسلام" و وشەی "قورئان"ی پیرۆزدا. خۆ ئاماژەی غەیبی با زۆر پەنهان و لاوازیش بێت، بەڵام من هەر پێم وایە گەلێ گرنگ و بەهێزە، چونکە دەبێت بە بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستیی مەسەلەکان و قبووڵ بوونی خزمەتەکەمان، هەروەك لە شان و باڵی غروور و لەخۆبایی‌بوونیشم دەشکێنێت.

ئەم ئاماژە غەیبی‌یانە بە ڕوونی بۆیان دەرخستم کە من جگە لە وەرگێڕ و تەرجوومانێکی پەیامەکان هیچی تر نیم، ئیتر شتێکیان بۆ من نەهێشتەوە کە مایەی شانازی کردن بێت، بەڵکو تەنها ئەو شتانەم پیشان دەدەن کە تەنها مایەی شوکرانەبژێرین.

جا لەو ڕووەوە کە ئەم ئاماژە غەیبی‌یانە تایبەتن بە قورئانی پیرۆزەوە و لە پێناوی ڕوونکردنەوەی ئیعجازەکەی‌دایە و، هەرگیز ویستی ئێمەی تێکەڵ نی‌یە و، هاندەری کار و کۆششن بۆ ئەوانەی کە لە خزمەتکردندا تەمبەڵی دەنوێنن و، قەناعەت بە مرۆڤ دەبەخشن سەبارەت بە ئەحەققییەتی پەیامەکان و، جۆرە ڕێزلێنانێکی خوایین بۆ ئێمە و،

---

(١) "تەوافوقەکان" ئاماژەن بۆ "ئیتتیفاق" کە ئەویش نیشانەی یەکێتی و یەکبوونە، دیارە یەکبوونیش بەڵگەیە لەسەر "تەوحید"، تەوحیدیش مەزنترینی چوار بناغەکانی قورئانی پیرۆزە. (دانەر)

ئاشكراكردنیشیان بە باسكردنی نیعمەتی خواوەند دادەنرێت و لە هەمان كاتیشدا دەمكوت كردنە بۆ ماددییە سەرسەختەكان.. ئەوا لەبەر ئەمانە، پێویستە ئاشكرا بكرێن و، پشت بەخوا هیچ زیانێك لە باسكردنیاندا نایێت.

جا یەكێك لەو ئاماژە غەیبییانە ئەوەیە كە:

خوای گەورە بە كەماڵی میهرەبانی و گشتی بوونی لوتف و كەرەمی خۆی و بۆ ئەوەی هانی ئێمەی خزمەتگوزارانی قورئان و ئیمان بدات و دڵنیامان بكات: نیعمەتێكی ناسكی لە شێوەی ڕێزلێنانێكی پەروەردگاری و چاكەكارییەكی خواییدا پێ بەخشیوین، تاكو ببێت بە نیشانەیەك لەسەر قبووڵ بوونی خزمەتەكەمان و تەسدیقێك بۆ ئەحەققییەتی ئەو پەیامانەی كە دامان ناون. ئەویش بریتییە لەو ئاماژە غەیبییانەی تەوافوقەكان كە لە هەموو پەیامەكانماندا دەركەوتوون، بە تایبەت پەیامەكانی: "موعجیزاتی ئەحمەدی" و "موعجیزاتی قورئانی" و "پەنجەرەكان". چونكە ئەو وشانەی كە لە یەك دەچن لە یەك لاپەڕەدا هەموویان دەیانڕوانیە یەكتر.

ئەمەش ئاماژەیەكی غەیبیی تێدایە بۆ ئەوەی كە ئەو تەوافوقانە بە ویستێكی غەیبی ڕێك دەخرێن. (واتە: چەندین نەخشونیگار و ڕێكوپێكیی ناوازە لەم پەیامانەدا بەڕێ دەخرێن، بێ ئەوەی ویست و ئیختیاری ئێوە ئاگایان لێیان بێت. تەنانەت هەر هەستیشیان پێ ناكەن. كەواتە بە هەست و ویستی خۆتان مەغروور مەبن)!

بە تایبەت لە پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا وشەی "ڕەسوولی ئەكرەم"ﷺ و وشەكانی سڵاوات لەسەردانی، وەكو ئاوێنەیەكی ئەوتۆیان لێ هات كە ئەو تەوافوقە غەیبییانەیان بە ئاشكرا دەرخست. تەنانەت دەستەواژەی سڵاوات لەسەردانی لە دووسەد لاپەڕە زیاتردا - پێنج لاپەڕەی نەبێت - لە لای نووسەرەوەیەكی تازە و سەرەتایی لە نووسینەوەدا، بەرامبەری یەكتر دەرچوون.

جا هەروەك ئەو تەوافوقانە هەرگیز كاری ئەو "ڕێكەوت"ە نین كە ئەوپەڕی توانای هێندە بڕدەكات لە نێوان دە وشەدا تەوافوق بخاتە نێوان تەنها دوانیانەوە، بە هەمان جۆر لە بیركردنەوەی كەسێكی لاوازی وەك منیشەوە سەرچاوەیان نەگرتووە كە لەم سنعەتەدا كارامە نییە و.. بیر و ڕوانینی خۆی دەترنجێنێتە ناو واتاكان و.. بە خێراییەكی لەرادەبەدەر و لە ماوەی نزیكەی دوو سەعاتدا چل لاپەڕە دادەنێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە خۆی قسەكانی نانووسێت، بەڵكو بۆ غەیری خۆی دەیانڵێت و ئەوانیش بۆی دەنووسنەوە..

ئنجا لە دوای تێپەڕبوونی شەش ساڵی ڕەبەق و بە ڕێنمایی قورئانی پیرۆز و تەفسیری "إشارات الإعجاز" بەم تەوافوقانەم زانی. چونکە لەو تەفسیرەدا لە نۆ دانە وشەی "إنّ"دا تەوافوق دەرکەوت. تەنانەت نووسەرەوەکان کە باسی ئەم تەوافوقەیان لێ بیستم گەلێ سەریان سووڕ ما!

جا هەروەك وشەی "ڕەسوولی ئەکرەم" و وشەکانی "سڵاوات لەسەردانی" لە "مەکتووبی نۆزدەهەم"دا بوون بە ئاوێنەیەکی بچووك بۆ دەرخستنی یەکێك لە جۆرەکانی موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ.. بە هەمان جۆر وشەی "قورئان"یش لە پەیامی "موعجیزاتی قورئانی"دا (کە وتەی بیست و پێنجەمە) و لە ئاماژەی هەژدەهەمی "مەکتووبی نۆزدەهەم"یشدا تەوافوقێکی ناسکی دەرخست. کە ئەمەش بەشێك لە چل بەشەی ئەو تەوافوقانە دەردەخات کە لە پەیامەکانی تریشدا دەرکەوتن و، بە هەرهەموو شیان یەکێك لە چل جۆرەکەی ئیعجازی قورئان دەردەخەن بەرامبەر بەو چینەی خەڵکی کە تەنها پشت بە بینینەکانی خۆیان دەبەستن و، یەکێکن لەو چل چینەی کە خەڵکیان لێ پێکدێت.

چونکە:

وشەی "قورئان" لە "وتەی بیست و پێنجەم" و ئاماژەی هەژدەهەمی "مەکتووبی نۆزدەهەم"دا سەد جار دووپات بوونەوە و هەر هەموویشیان - مەگەر بە دەگمەن - دەنا ڕوویان لە یەکتری بوو.

ئەوەتا لە لاپەڕە چل و سێی تیشکی دووهەمدا: حەوت وشەی "قورئان" هەیە کە هەرهەموویان دەڕواننە یەکتر..

هەروەها لە لاپەڕەی پەنجا و شەشدا نۆ دانە وشەی "قورئان" هەیە کە هەشت دانەیان دەڕواننە یەکتر..

لە لاپەڕەی شەست و نۆشدا - کە ئێستا لە پێش چاوماندایە - پێنج دانە وشەی "قورئان" هەیە کە هەر هەموویان بۆ یەکتری دەڕوانن..

بەم جۆرە، وشە دووپات بووەکانی "قورئان" کە لە هەموو لاپەڕەکاندا هەن، ڕوویان لە یەکترە. مەگەر بە دەگمەن ڕوویدات یەك دانە لەو وشانە لە نێوان پێنج شەشێکدا بەم جۆرە دەرنەچێت.

سەبارەت بە تەوافوقەکانی تر، ئەوا لە لاپەڕەی سی و سێدا - کە ئێستا لە بەردەمماندایە - پازدە وشەی "أمْ" هەیە کە چواردەیان دەڕواننە یەکتری. هەر لەم

لاپەڕەیەی بەرچاوماندا نۆ دانە وشەی "ئیمان" لە ڕیزی یەکتردان و تەنها یەکێکیان کەمێك لەو ڕێکی‌یە ترازاوە، لە ئەنجامی ئەوەی نووسەرەوەکە بۆشایی لە نێوان وشەکاندا داناوە. هەروەها لەم لاپەڕەیەی بەردەمماندا دوو دانە وشەی "محبوب" هەیە کە یەکەمیان لە دێڕی سێ‌هەمدا و ئەوی تریشیان لە دێڕی یازدەهەمدایە و زۆر بە جوانی و بە تەرازوویەکی تەواوەتی کەوتوونەتە ئاستی یەکتر و، چواردانە وشەی "عیشق"یش لە نێوانیاندا بە ڕێکی ڕیزیان بەستووە!

تەوافوقە غەیبی‌یەکانی تریش وەك ئەم نموونانە وان.

جا بێ هیچ گومانێك ئەم تەوافوقانە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە هەموو پەیامەکاندا هەن. ئیتر نووسەرەوەکە هەر کەسێك بێت و ژمارەی دێڕ و لاپەڕەکانیش هەرچەندە بن. هەموو ئەمانەش بە جۆرێکن کە بواری هیچ گومانێك بۆ ئەوە ناهێڵنەوە ئەنجامی "ڕێکەوت" یاخود هی "بیرکردنەوە"ی دانەر یان نووسەرەوەی ئەو پەیامانە بێت. بەڵام تەوافوقەکان لە خەتی هەندێ لەوانەی کە پەیامەکان دەنووسنەوە زیاتر سەرنج ڕادەکێشن. بەو واتایەی کە ئەم پەیامانە خاوەنی خەتێکی تایبەتن بە خۆیانەوە و هەندێك لەو نووسەرەوانەش لەو خەتە نزیك دەبنەوە.

یەکێك لە شتە سەیر و نامۆکان لەوەدایە کە زۆربەی ئەم تەوافوقانە لای نووسەرەوە ناکارامەکان سەر هەڵدەدەن! ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی مرۆڤ وا تێ‌بگات کە تایبەتکاری و فەزائیل و جوانی‌یەکانی "وتەکان" - کە جۆرە تەفسیرێکی قورئانی پیرۆزن - موڵکی کەس نی‌یە. تەنانەت پۆشاکی ئەو شێوازە مەوزوون و ڕێکوپێکانەی کە شیاوی قەد و باڵای ڕاستی‌یە پیرۆز و جوان و ڕێکوپێکەکانی قورئانن، هەرگیز بە ئیختیار و هەست و شعووری هیچ کەسێك نابڕێن و نادووررێن، بەڵکو تەنها وجوودی ئەو ڕاستی‌یانەی قورئانە کە داخوازی ئەوەیە ئەو شێوازانە بەم جۆرە بن و، دەستێکی غەیبیش هەیە کە بەپێی ئەو لەش و لارە دەیانبڕێت و دەیاندوورێت و لەبەر ئەو ڕاستی‌یانەیان دەکات. ئەرکی سەرشانی ئێمە تەنها لەوەدایە کە تەرجومان و خزمەتکارێکی ئەو ڕاستی‌یانەین!

❖ سەرنجی چوارەم:

لە پرسیاری یەکەمتاندا، کە پێنج شەش پرسیاری لەخۆ گرتووە، دەڵێن:

خەڵکی لە مەیدانی حەشردا چۆن کۆ دەکرێنەوە! ئایا بە ڕووتی حەشر دەکرێن! ئایا دۆست و خۆشەویستان چۆن بە یەکتری دەگەنەوە! چۆن پێغەمبەر ﷺ بدۆزینەوە بۆ

شەفاعەت؟ چونکە چۆن دەکرێت یەك دانە کەس چاوی بە ژمارەیەکی لە ئەندازەبەدەری خەڵکی بکەوێت! جۆری پۆشاکی ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ چی‌یە! کێ لەوێ ڕێمان پیشان دەدات؟

**وەڵام:**

وەڵامی ئەم پرسیارە بە ڕوونی و تەواوەتی لە کتێبی فەرموودە پیرۆزەکاندا دراوەتەوە.

بەڵام لێرەدا تەنها یەك‌دوو سەرنج باس دەکەین کە لەگەڵ ڕێباز و مەشرەبماندا یەك بکەوێت:

*یەکەم:* لە "مەکتووبێك"دا ڕوونمان کردووەتەوە کە مەیدانی حەشر لە خولگەی ساڵانەی زەوی‌دایە و، گۆی زەویش هەر لە ئێستاوە داهاتە مەعنەوی‌یەکانی خۆی ڕەوانەی لەوحەکانی ئەو مەیدانە دەکات و، بە بزووتنە ساڵانەکەی خۆی بازنەی وجوودێك دەنوێنێت کە دەبێت بە سەرەتای پێکهاتنی مەیدانی حەشر بەو داهاتە مەعنەوی‌یانەی ئەو بازنە وجوودی‌یە..

جا گۆی زەویش، کە وەك کەشتی‌یەکی پەروەردگاری وایە، لەو ڕۆژەدا دۆزەخە بچووکەکەی ناو مەڵبەندی خۆی لە دۆزەخی گەورەدا ڕۆ دەکات. هەروەك سەرنشینانیشی ڕۆدەکاتە ناو مەیدانی حەشرەوە.

*دووهەم:* وجوودی حەشر و مەیدانەکەیمان بە چەشنێکی بێ گومان لە "وتەکان"دا چەسپاندووە، بە تایبەت لە "وتەی دەهەم" و "وتەی بیست و نۆهەم"دا.

*سێ‌هەم:* سەبارەت بە کۆبوونەوە و بە یەك شادبوونی هاوڕێیانیش، ئەوا بە تەواوەتی لە یەك بە یەکی "وتەی شازدەهەم" و "وتەی سی و یەکەم" و "وتەی سی و دووهەم"دا چەسپێنراوە. چونکە بەهۆی نهێنیی "نوورانیێتی"یەوە تەنها یەك کەس دەتوانێت لە ماوەی یەك خولەکدا ملیۆنەها کەس لە هەزار شوێندا ببینێت.

*چوارەم:* خوای گەورە بەپێی خواستی ناوی جوانی "الحکیم"ی خۆی پۆشاکێکی سروشتیی لەم دنیایەدا کردووەتە بەر هەموو زیندەوەران جگە لە مرۆڤ، کە لە مەیدانی حەشردا پۆشاکێکی سروشتیی پێ دەپۆشێت، لەو کاتەدا کە پۆشاکە چنراوە ناسروشتی‌یەکانی لەبەر داماڵراوە.

سەبارەت بە حیکمەتی پۆشاکە چنراوەکانی مرۆڤ لە دنیادا تەنها لەوەدا نی‌یە کە لە سەرما و گەرما بیپارێزێت و بیرازێنێتەوە و عەورەتی داپۆشێت، بەڵکو گرنگترین حیکمەتی ئەو پۆشاکە چنراوانەی دنیا لەوەدایە کە:

ئاماژە دەكات بۆ سەركردەیی مرۆڤ بۆ سەرجەمی جۆرەكانی زیندەوەران و بەدیهاتووان و هەڵسوكەوت كردنی تیایاندا. چونكە پۆشاكە چنراوەكانی مرۆڤ لە نموونەكانی ئەو جۆرانە پێكهاتوون. دەنا خوای گەورە زۆر بە ئاسانی دەیتوانی پۆشاكێكی سادەی سروشتی بكاتە بەر مرۆڤ. چونكە گەر ئەم حیكمەتە نەبوایە ئەوا مرۆڤ كاتێ كە جەستەی خۆی بە پارچەی جۆراوجۆر و سیپاڵی جیاجیا دەپێچایەوە، دەبووە مایەی گاڵتەجاڕی زیندەوەرە خاوەن هەست و نەستەكان.

بەڵام لە مەیدانی حەشردا پێویست بەم حیكمەت و پەیوەندییەی نێوان مرۆڤ و جۆرەكانی تری بەدیهاتووان نامێنێت. لەبەر ئەوە، پێویست بەو پۆشاكانە ناكات كە نموونەكانی ئەو جۆرانەی بەدیهاتووان دەنوێنن.

پێنجەم: ڕێ پیشاندەری ڕێگاش بریتییە لە "قورئانی پیرۆز" بۆ كەسانی وەك تۆ كە ڕۆشتوونەتە ژێر ئاڵا و نووری قورئانی پیرۆزەوە. فەرموو سەیری پیتە لێك بچڕاوەكانی سەرەتای سوورەتەكان بكە وەك: "الم. الر. حم" ئنجا بزانە و ببینە كە قورئانی پیرۆز چ كتێبێكی مەزنە و چ شەفاعەتكارێكی تكا وەرگیراوە و چ ڕێ پیشاندەرێكی ڕاست و ڕاستگۆیە و چ نوورێكی پاك و خاوێنە.

شەشەم: سەبارەت بە پۆشاكی ئەهلی بەهەشت و دۆزەخیشەوە ئەوا "وتەی بیست و هەشتەم" ڕوونی كردووەتەوە.

ئەو دەستوورەش كە لەوێدا سەبارەت بە حەفتا دەستە پۆشاكەكەی "الحور العین" باس كراوە، هەمان دەستوورە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش. چونكە بێ گومان هەموو یەكێكی ئەهلی بەهەشت حەز دەكات لەزەتی هەموو جۆرەكانی نیعمەتەكانی بەهەشت لە هەموو كاتێكدا بچێژێت. خۆ ئاشكراشە كە نیعمەت و لەزەتەكانی بەهەشت لەوپەڕی جیاوازی و جۆراوجۆریدان. جا ئەو مرۆڤەش لە هەموو كاتێكدا هەموو جۆرەكانی ئەو نیعمەتانە بەسەر دەكات. بۆیە چ خۆی و چ حۆرییەكەی، بە پێوەرێكی بچووك، نموونەكانی جوانی و نیعمەتەكانی بەهەشت لەبەر دەكەن و خۆی و حۆرییە عەینەكەی وەك بەهەشتێكی بچووككراوەی بەرجەستەیان لێ دێت..

چونكە هەروەك مرۆڤ لە هەموو جۆرەكانی ئەو گوڵانە كە لە شارەكەیدا دەست دەكەون، لە باخچەی خانووەكەی خۆیدا كۆ دەكاتەوە.. هەروەها وەك دوكاندار كە هەموو بابەت و كەرەسەكانی دوكانەكەی لە لیستێكدا ڕیز دەكات و.. هەروەك مرۆڤ پۆشاك و پێداویستیی ماڵەكەی لەو جۆرانەی بوونەوەرانەوە بەدەست دەهێنێت كە

مامەڵەیان لەگەڵ دەکات و پەیوەندیی پێیانەوە هەیە.. بە هەمان جۆر، ئەو کەسەش کە ئەهلی بەهەشتە بە تایبەت ئەو مرۆڤەی کە بە سەرجەمی هەست و نەستەکانی لە دنیادا خوای گەورەی پەرستووە، خواوەند بە میهرەبانیی خۆی چەندین دەست بەرگ و پۆشاك دەکاتە بەر ئەو مرۆڤە و حۆرییەکەشی، لەو پۆشاکانەی کە هەموو جۆرەکانی جوانی و نیعمەت و چێژەکانی بەهەشت دەردەخەن، بە چەشنێك کە یەك بە یەکی ئارەزووەکانی ئەو مرۆڤە تێر بکەن و سەرجەم هەست و نەستەکانیشی ڕەزامەندی دەربڕن و یەك بە یەکی ئامێر و کۆئەندامەکانیشی لەزەت بچێژن. هەروەك تام چەشتنی هەموو یەکێك لە لایەنە ناسکەکانیشی بۆ ئاسان دەکرێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە پۆشاکە زۆر و زەبەندەکانی بەهەشت لە یەك جۆر و ڕەگەز نین، ئەو فەرموودە پیرۆزەیە کە بەم واتایە هاتووە و دەفەرموێت:

"حۆریی عەینی بەهەشت حەفتا پۆشاك دەپۆشن و لە ژێر ئەم پۆشاکانەشەوە مۆخی ئێسکەکانیان دەبینرێت"[(١)].

بەو واتایەی کە: هەر لە پۆشاکی سەرووییەوە تا دواهەمینیان: سەرجەمی پلەکانی چێژ و لەزەت لێبردن دەردەخەن بە چەشنێك کە گشت هەست و نەستەکانی مرۆڤ لە چەندین لەزەتی جۆراوجۆر و بە چەند شێوە و چەشنێکی جیاجیا، تێر دەبن و لەزەت دەبەن.

سەبارەت بە ئەهلی دۆزەخیشەوە: ئەوا ئەو کەسە بە گوێ و چاو و دڵ و زێری و دەست و سەرجەمی ئەندام و هەست و نەستەکانی خۆی، لە دنیادا گوناهـ و تاوانی ئەنجام داوە. کەواتە دەبێ چەندین پۆشاکی لە چەند جۆر و ڕەگەزێکی جیاجیا بۆ ببڕێت، تاکو ئازار بدرێت پێیان و چەندین ئازاری جۆراوجۆر بەپێی هەریەك لە ئەندام و هەست و نەستەکانی بچێژێت. بە ڕادەیەك کە ئەو پۆشاکانە سەبارەت بەو دەبن بە دۆزەخێکی بچووك و دەورەی دەدەن. ئەمەش هەرگیز دژی خواستی دانایی و دادگەریی نییە.

❖ سەرنجی پێنجەم:

پرسیارتان کردبوو کە: ئایا باپیرانی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی "فەترەت"دا شوێن چ ئایینێك کەوتبوون؟

---

(١) حديث: "إن المرأة من الحور العين ليرى مخ ساقها من وراء اللحم والعظم ومن تحت سبعين حلــة" رواه الطبراني في الكبير (٨٨٦٤) عن ابن مسعود والترمذي (٢٥٣٣) والسيوطي في الدر المنثور (٧١٢/٧)..

**وەڵام:**

چەند ڕیوایەتێك هەن لەسەر ئەوەی کە شوێن پاشماوەی ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - کەوتبوون، دوای ئەوەی کە پاشماوەی ئەم ئایینە چەند قۆناغێکی بێئاگایی و تاریکیی مەعنەویی بەسەردا تێپەڕیبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەند کەسێکی تایبەت، پەرستنەکانیان بەپێی ئەو پاشماوەیە جێبەجێ دەکرد. بێ گومان ئەوانەی کە لە وەچەی حەزرەتی ئیبراهیم - دروودی لەسەر بێت - کەوتوونەتەوە و ئەو زنجیرە نوورانییەیان پێکهێناوە کە ئاکامەکەی لەدایکبوونی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بووە: ئایینی حەقیان پشتگوێ نەخستووە و نەکەوتوونەتە ناو تاریکستانی کوفرەوە..

جگە لەمەش، ئایەتی پیرۆزی: ﴿وما كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الإسراء:١٥) ڕوونی دەکاتەوە کە "ئەهلی فەترەت" لە ئەهلی نەجاتن و، لە بابەتە فەرعییەکاندا - بە ئیتیفاقی زانایان - لەسەر هەڵە و گوناهەکانیان لێپرسینەوەیان نابێت. تەنانەت ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەشعەری لایان وایە کە ئەوانە گەر دووچاری کوفریش بووبێتن و بناغەکانی ئیمانیان لەلا گەڵاڵە نەبووبێت، هەر ئەهلی نەجاتن. چونکە تەکلیفی خوای گەورە لە بەندەکانی لە دوای ناردنی پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - دەبێت و پاش ئاگاداربوونی ئەو بەندانە لە هاتنی پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - ڕووبەڕووی تەکلیف دەبنەوە.

خۆ مادەم بێئاگایی و تێپەڕبوونی کات و سەردەمەکان، ئایینەکانی پێغەمبەرانی پێشینیان - دروودیان لەسەر بێت - داپۆشیبوو، ئەوا ئەو ئایینە داپۆشراوانە نابن بە حوججەت بەسەر خەڵکی سەردەمی "فەترەت"ەوە. جا ئەگەر ئەوان لەو چەشنە کاتانەدا گوێ ڕایەڵیی فەرمانەکانی خوایان کردبێت، پاداشت دەدرێنەوە. ئەگەر گوێ ڕایەڵیشیان نەکردبێت، سزا نادرێن. چونکە ئەو ئایینە پێشینانە مادەم شارراونەتەوە و دیار و ئاشکرا نەبوون، حوججەت نین بەسەر خەڵکی ئەو سەردەمانەوە.

❖ **سەرنجی شەشەم:**

دەپرسن و دەڵێن:

ئایا هیچ کام لە باپیرانی پێغەمبەرمان ﷺ بە پێغەمبەریتی ڕەوانە کراوە؟

**وەڵام:**

هیچ دەقێکی گومان لێنەکراو بە دەستەوە نییە کە ئەوە بگەیەنێت دوای حەزرەتی ئیسماعیل - دروودی لەسەر بێت - کەسی تر لە باپیرانی پێغەمبەرمان ﷺ پێغەمبەر و

ڕەوانەکراوی خوای گەورە بوو بێت. بەڵام لە غەیری باپیرانیدا دوو پێغەمبەر پەیدا بوون کە بریتین لە: "خالیدی کوڕی سینان"[١] و "حەنزەلە"[٢] درووودیان لەسەر بێت.

قەسیدەیەکی بەناوبانگی "کەعبی کوڕی لوئەی" هەیە کە یەکێکە لە باپیرانی پێغەمبەرمان ﷺ لەو قەسیدەیەدا دەڵێت:

علی غفلةٍ یأتـــي النبي محمدٌ     فیُخبر أخباراً صدوقاً خبیرها[٣]

ئەم گوفتارە لە گوفتارێکی خاوەن ئیعجازی پێغەمبەرایەتی دەچێت.

ئیمامی ڕەببانی، لە ڕێی پشتبەستنیەوە بە "بەڵگە" و "کەشف"ەکانەوە، فەرموویەتی: "گەلێ پێغەمبەری زۆر لە وڵاتی هیندستاندا ڕەوانەکراون، بەڵام هەندێکیان هیچ کەسێك شوێنیان نەکەوتوون و، هەندێکی تریشیان کەسانێکی کەم باوەڕیان پێ هێناون، بۆیە ناوبانگیان دەرنەکردووە، یاخود وەك "پێغەمبەر" لە لایەن خەڵکییەوە نەناسراون"[٤].

جا لەسەر بناغەی ئەم قاعیدەیەی ئیمامی ڕەببانی: دەگونجێ لەناو باپیرانی پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ چەندین پێغەمبەر پەیدا بووبن، بەڵام مێژوو هیچی لە بارەوە تۆمار نەکردبێ.

❖ سەرنجی حەوتەم:

دەپرسن و دەڵێن:

ڕاستترین و بەهێزترین هەواڵ سەبارەت بە ئیمان هێنانی دایك و باوکی پێغەمبەر ﷺ و "عەبدولموتەلیب"ی باپیرییەوە چییە؟

---

(١) خالیدی کوڕی سینانی عەبسی: یەکێکە لە پێغەمبەرانی عەرەب لە سەردەمی جاهیلیدا لەناو تیرەی "بەنی عەبس"دا خەڵکی بۆ سەر ئایینی حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێت – بانگ کردووە. مێژوونووسان وتوویانە: پێش حەزرەتی محەممەد ﷺ جگە لەو کەسی تر لە نەوەی ئیسماعیلدا – درووودی لەسەر بێت – نەبووە بە پێغەمبەر. کچەکەی هاتووەتە خزمەتی پێغەمبەرمان ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ پۆشاکەکەی بەری خۆی بۆ ڕاخستووە و لەسەری داناوە و فەرموویەتی: "ابنة نبيّ ضیعه أهلـــه" لە فەرموودەیەکی تردا دەڵێت پێی فەرمووە: "مرحباً بابنة أخي". بڕوانە: الإصابة ٤٦٦/١ أسد الغابة ٢٩٦/٢ الأعلام ٩٩/٢. (وەرگێڕ)

(٢) حەنزەلەی کوڕی صەفوانی ڕەسسی: یەکێکە لە پێغەمبەرانی عەرەب لە سەردەمی جاهیلیدا و لە نێوان ماوەی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا و سەرهەڵدانی ئیسلامدا ژیاوە و لە "أصحابُ الـــرَّس"ە کە لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە، خوای گەورە ناردی بۆ هیدایەتی ئەوان کەچی بەدرۆیان خستەوە و شەهیدیان کرد. بڕوانە: الأعلام ٢٨٦/٢. (وەرگێڕ).

(٣) بڕوانە: الشفا ٣٤٤/١.

(٤) بڕوانە: "مكتوبات الإمام الرباني ٢٣٩/١" مەکتووبی دووسەد و پەنجا و نۆهەم. (وەرگێڕ)

**وەلام:**

ماوەی دە سـاڵە "سـەعیدی نـوێ" جگە لە قورئانی پیرۆز هیچ کتێبێکی تری لـە لا نی‌یە و دەڵێت: لە کتێبدا تەنها قورئانی پیرۆزم بەسـە و، کـاتێکی فراوانیشـم بـە دەستەوە نی‌یە بۆ باس و لێکۆڵینـەوەی ئـەم چەشنە مەسـەلە فەرعی‌یانـە لـە کتێبی فـەرموودەکاندا، تاکو بتوانم بگەمە ڕاسترین و بەهێزترین هەواڵ لەم بارەیەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم:

دایـك و بـاوكی پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ ئەهلی نـەجات و بەهەشـت و ئیمـانن. چونکـە بێ گومـان خـوای گـەورە دڵـی خۆشەویستەکەی خـۆی ﷺ ئـازار نـادات و ئـەو شەفەقەتە ناسكەش زامدار ناكات كە ئەو دڵە پیرۆزەی خۆشەویستەکەی ئـەویان لـێ پڕ بووە.

**گەر بوترێت:**

مادەم وایە، ئەدی بۆچی بۆ ئیمان هێنان تەوفیق نەدران و بە پێغەمبەرایـەتیی پێغەمبـەردا ﷺ ڕانەگەیشتن؟

**وەلام:**

خـوای گـــەورە – بـە كـەرەمی فراوانـی خـۆی – دایـك و بـاوكی پێغەمبـــەرە خۆشەویستەکەی ﷺ ناخاتە ژێر كۆڵی قورسی منەتەوە..

ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی چـاودێریی هەسـت و نەستی پێغەمبـەر ﷺ بکـات. بـەڵکو میهرەبانیی خوای گەورە خواستی وابووە كە خۆشەویستەکەی خۆی ڕازی بکات و، لە لایـەكی تریشـەوە دایـك و باوكیشـی بەختـەوەر بکـات و بیانخاتـە ژێـر سـایەی منـەتی پەروەردگاریتیی بێ گەردی خۆیەوە، تاكو لە پلەی دایك و باوكێتی‌یەوە دایـان نەبەزێنێتـە پلەی ئەولادی مەعنەوی.. بۆیە بە ڕواڵـەت دایـك و بـاوك و باپیری نـەكردن بـە نەتـەوەی ئـەو، كـەچی لـە تایبـەتكاری و فـەزڵ و چاكە و بەختـەوەریی نەتەوەكـەی ئەویشـی پـێ بەخشین..

بەڵێ، گەر لە بەردەم موشیرێكی گەورەی سوپادا باوكی ئەو موشیرە لە پلەی نـەقیبدا ئامادە بكرێت، ئەوا ئەو باوكە دەكەوێتە ژێر كاریگـەریی دوو دژە هەستەوە، بۆیـە پادشـا بەزەیی بە موشیرەكەیدا دێتەوە و باوكی ناخاتە ژێر ئەمر و فەرمانی كوڕەكەیەوە!

❖ **سەرنجی هەشتەم:**

دەپرسن:

ڕاستترین قسە لە بارەی "ئەبوو تالیب"ی مامیەوە چی‌یە؟

**وەڵام:**

شیعە دەڵێن: ئیماندار بووە. کەچی ئەهلی سوننەت زۆربەیان دەڵێن: ئیمانی نەهێناوە.

بەڵام ئەوەی کە من بە دڵمدا هات، بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

"ئەبوو تالیب" خودی کەسی پێغەمبەری ﷺ - نەك پێغەمبەرایەتی‌یەکەی - بە خاوێنی و بێ گەردی خۆش دەویست. بێ گومان ئەم خۆشەویستی‌یە یەکجار بێ گەرد و شەفەقەتە بەهێزەی ئەبوو تالیب بۆ کەسی پێغەمبەر ﷺ لەناوناچێت و لای خوای گەورە زایە نابێت.

بەڵێ، "ئەبوو تالیب" کە خۆشەویستی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی بەوپەڕی خاوێنی خۆش ویستووە و لە دوژمنان پاراستوویەتی و پشتی گرتووە، گەر بێت و لەسەر ئیمان نەهێنانی ڕواڵەتیی - لەبەر شەرم و دەمارگیریی نەتەوایەتی و هەست و نەستەکانی هاوچەشنیان نەك لەبەر سەرسەختی و ئینکاری - بڕواتە دۆزەخەوە، ئەوا خوای گەورە دەتوانێت لە پاداشتی چاکەکاری‌یەکانی‌دا بەهەشتێکی تایبەتیی لەناو دۆزەخدا بۆ دروست بکات و دۆزەخە تایبەتی‌یەکەی بۆ بکات بە بەهەشتێکی تایبەت. وەك ئەوەی کە هەندێ جار لە ناوەندی سەختیی زستاندا بەهارێکی ڕەنگین بەدی‌دەهێنێت و بە وێنەی ئەوەش کە لە ڕێی بینینی خەونێکەوە بەندیخانەی تەسك و تاریك دەکات بە کۆشکێکی ڕەنگین!

والعلم عند الله، ولا یعلم الغیب الاّ الله.

﴿سُبْحانَكَ لا عِلْمَ لَنا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أنْتَ الْعَلِیمُ الْحَكِیمُ﴾.

# مەکتووبی بیست و نۆهەم

**ئەم مەکتووبی بیست و نۆهەمـە لـە نـۆ بـەش پێکـهاتووە. ئەمـەش بەشـی یەکەمیەتی و نۆ سەرنجی لەخۆ گرتووە.**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ بـرای ئـازیز و بـەوەفا و ڕاسـت و هـاوڕێی بێ گـەرد و جیدديـم لـە خزمـەتگوزاریی قورئاندا!

ئەم جارە لە نامەکەتاندا داوای وەڵامی مەسـەلەیەکی گرنگتـان کـردووە کـە حـاڵ و کاتەکانی ئێستام بواری ئەو وەڵامەم نادەن.

برام! سـوپاس بـۆ خـوا ئەمسـاڵ ژمـارەی ئەوانـەی کـە پەیامـەکانی نـوور دەنووسـنەوە گەلـێ زیادی کردووە و، هەڵەگیریی نووسـینەوەی دووهـەمیش دێتـەوە لام و بـە درێژایی ڕۆژ و بـە شـێوەیەکی خێرا پێیانـەوە سـەرقاڵ دەبم، بۆیـە گەلـێ کاروبـاری گرنگـم دوا دەکەوێت. چونکە پێم وایـە ئـەم ئەرکە لـە هـەموو کـارێکی تـر گرنگـترە، بـە تايبـەت لـە مانگی شەعبان و ڕەمـەزاندا کە بەشـی "دڵ" لـەم دوو مانگـەدا زیـاترە لـە هـی "ژیـری".. هەروەك "ڕۆح"یـش تیایـاندا دەکەوێتـە جموجـووڵ. لەبەر ئەوە، باسـکردنی ئـەم مەسـەلە مەزنە – پشت بەخوا – بۆ کاتێکی تر هـەڵدەگرین. خـۆ هـەرکات بـە فـەزڵی میـهرەبانیی خواوەند شتێك لەم بارەیەوە هاتە دڵەوە، ئەوا وردە وردە دەینووسم و دەینێرم بۆتان.

وا ئێستاش سێ سەرنج ڕوون دەکەمەوە[1]:

❑ **سەرنجی یەکەم:**

(نهێنیـیـەکانی قورئـــان بـــە تـــەواوی نـــازانرێن و تەفسیرنووســـانیش پـــەیان بـــە حەقیقەتەکەی نەبردووە)!

---

(١) دوایی لە نۆ سەرنجدا تەواو بوو. (دانەر).

ئەم چەمکە دوو ڕووی هەیە و، ئەوانەش کە ئەم قسەیە دەکەن دوو دەستەن:

*دەستەی یەکەم:*

ئەهلی حەق و زانست و تەدقیقن. ئەمانە دەڵێن: "قورئانی پیرۆز" گەنجینەیەکی مەزنی نەبڕاوەیە و خەڵکی هەموو چەرخ و سەردەمێك بەشی خۆیان لە ڕاستییە پەنهان و شارراوەکانی وەردەگرن، لەوانەی کە لە جۆری تەواوکەر(تتمات)ن بۆ ئەوانەی پێشووتر، هاودەم لەگەڵ ملکەچی و تەسلیمبووندا بۆ دەقە کانی قورئان و ئایەتە موحکەمەکانی، بێ ئەوەی ئەو ڕاستییە نادیارانەی قورئان لە بەشی تێگەیشتنی ئەهلی سەردەمەکانی تر کەم بکەنەوە.

بەڵێ ڕاستە، تا ڕۆژگار بگوزەرێت و هەتا کات و سەردەمەکانیش تێپەڕ بن، ڕاستییەکانی قورئان پتر ڕوون دەبنەوە و دەردەکەون.

بەڵام هەرگیز ئەم گوفتارە ئەوە ناگەیەنێت کە سێبەری گومان ئاراستەی ئەو ڕوونکردنەوانەی پیاوچاکانی پێشین بکرێت کە سەبارەت بە "ڕاستییە ئاشکراکان"ی قورئانی پیرۆزەوە پێش‌چاویان خستوون. چونکە ئەو ڕاستییانە چەند دەقێکی قەتعی و چەند بناغە و پایەیەکی ئەوتۆن کە دەبێ مرۆڤ ئیمانی پێیان بێت. فەرمایشتی خوای گەورە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَهٰذا لِسانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ﴾دا(النحل:١٠٣) دەریدەخات کە واتای قورئان ڕوون و ئاشکرایە.

خۆ گوفتاری خواوەندیش لە قورئانە پیرۆزەکەیدا هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە دەوری ئەو واتایانەدا دەخولێتەوە و بەهێزیان دەکات تا دەیانگەیەنێتە پلەی ڕوونی "بەداهەت". لەبەر ئەوە، وەرنەگرتنی ئەو واتایانەی کە دەقیان لەسەرە، ئەنجامەکەی - پەنا بە خوا - بەدرۆخستنەوەی خواوەند دەبێت و سەری لەوە دەردەچێت کە - خوا نەخواستە - پێغەمبەر ﷺ تێگەیشتنی ئەو دەقانەی نەپێکابێت. واتە ئەو لێکدانەوە و واتایانەی دەقیان لەسەرە، بە زنجیرەی ئیسناد لە سەرچاوەی ڕیسالەتەوە هەڵگۆزراون و وەرگیراون. تەنانەت "ئیبن جەریری تەبەری" لە تەفسیرە مەزنەکەیدا سەرجەم واتاکانی قورئانی بە سەنەدەوە بردووەتەوە سەر کانیاوی ڕیسالەت.

*دەستەی دووهەم:*

"چەند هاوڕێیەکی نەفام"ن کە زیاتر تێکدەر و کاولکارن تا ئەوەی چاکەکار بن (واتە: زیانیان لە سوودیان زیاترە).. یاخود "چەند دوژمنێکی زیرەکی شەیتان ئاسا"ن و دەیانەوێت ڕووبەڕووی ئەحکامەکانی ئیسلام ڕابووەستن و بەرەنگاری ڕاستییەکانی

ئیمان بینەوە و، تێدەکۆشن کەلێنێك بۆ خۆیان لە سوورەتەکانی قورئاندا بدۆزنەوە کە هەریەکەیان - بەپێی تەعبیری ئێوە - شوورایەکی پۆلاینی قەڵای مەحکەمی قورئانی پیرۆزن. جا ئەو جۆرە کەسانە بۆیە برەو بەم چەشنە گوفتارانە دەدەن تاکو - خوا نەخواستە - سەبارەت بە ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئان گومان لەناو دڵی خەڵکیدا بڵاو بکەنەوە.

❑ **سەرنجی دووهەم:**

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سوێندی بە زۆر شت خواردووە. سوێندەکانی قورئانیش چەندین سەرنجی تایبەتی مەزن و گەلێ نهێنیی یەکجار زۆریان تێدایە.

یەکێك لەوانە:

ئەو سوێندەی کە لەم ئایەتەدایە: ﴿**وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا**﴾ (الشمس:١) ئاماژەیە بۆ دەرخستنی "گەردوون" لە شێوەی کۆشکێکی مەزن و شارێکی ئاوەداندا. کە ئەمەش بناغەی ئەو نموونە ڕەنگینەی پێکهێناوە کە لە "وتەی یازدەهەم"دا هێنراوەتەوە.

یەکێکی تر: سوێندی ناو ئەم ئایەتانە: ﴿**يس ۞ والقرآنِ الحكيم**﴾ قودسییەت و خاوێنیی ئیعجازی قورئان یاد دەخاتەوە کە لە پلەیەکی هێندە گرنگدایە سوێندی پێ بخورێت.

سوێندی: ﴿**والنَّجْمِ اذا هَوَىٰ**﴾ش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی: "کەوتنەخوارەوەی ئەستێرەکان" نیشانەی بڕانی هەواڵە غەیبی‌یەکانە لە جینی و شەیتانەکان، تاکو هیچ گومانێك ڕوو نەکاتە "وەحیی خوای گەورە" و.. لە هەمان کاتیشدا سوێندی: ﴿**فَلا أُقْسِمُ بمواقِعِ النُّجومِ ۞ وإنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تعلَمُونَ عظيم**﴾ (الواقعة:٧٥-٧٦) "مەزنیی توانست" و "کەماڵی دانست" یاد دەخاتەوە لە دانانی هەریەك لەو ئەستێرە گەورە و زەبەلاحانە - بە کەماڵی ڕێکوپێکی - لە شوێنی تایبەتیی خۆیاندا و، سووڕاندنەوەی هەسارە گەڕۆکە مەزنەکانیش بە خێرایی‌یەکی یەکجار گەورە (بە دەوری خۆردا).

سوێندی: ﴿**والذاريات**﴾ و ﴿**والمرسلات**﴾یش: حیکمەتە مەزنەکانی ناو شەپۆلەکانی "هەوا" و بەڕێ‌کردنی "با" یادی مرۆڤ دەخەنەوە. چونکە خوای گەورە سوێند بەو مەلائیکەتانە دەخوات کە ئەرکی بەڕێخستنی "با"یان خراوەتە ئەستۆ. بەمەش سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە ئەو کاروبارانەی وا گومان دەبرێت بە "ڕێکەوت" ڕوو بدەن، گەلێ دانایی ورد و ئەرکی گرنگ جێ‌بەجێ دەکەن.

بەم چەشنە، هەریەك لەو شوێنانەی كە سوێندیان تێدا بەكارهێنراوە، سەرنجی ڕەوان و سوودی تایبەتیی خۆیان هەیە. جا مادەم كاتەكەمان بواری درێژەپێدانمان نادات، ئەوا بە پوختی ئاماژە بۆ تەنها یەك دانە سەرنجی نێوان سەرنجە زۆرەكانی ئەو سوێندە دەكەین كە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿والتِّينِ وَالزَّيْتُونِ﴾دا هەیە.

خوای گەورە كە سوێند بە "هەنجیر" و "زەیتوون" دەخوات، "مەزنیی توانست" و "كەماڵی میهرەبانی" و "گەورەیی نیعمەتەكانی" خۆی دەخاتەوە یادی مرۆڤ و سەرنجی ئەویان بۆ لا ڕادەكێشێت كە پێشتر ئەو سەرنجە ئاراستەی ئاستە یەكجار نزمەكان كرابوو. بەمەش ئاماژە بۆ مرۆڤ دەكات كە دەتوانێت گەلێ پلەی بەرزی مەعنەوی بەدەست بهێنێت، تەنانەت بە "شوكرانە بژێری" و "بیركردنەوە" و "ئیمان" و "كردەوەی چاك" بەرەو بەرزترینی پلە و ئاستە بەرزەكان سەربكەوێت و بەرز ببێتەوە.

تایبەتكردنی "هەنجیر" و "زەیتوون"یش لە نێوان نیعمەتەكانی تردا بۆ ئەم سوێند پێخواردنە، لەبەر ئەوەیە كە:

ئەم دوو میوەیە سوودبەخش و بە پیتن و، ئنجا بەدیهێنانیان و ئەو نیعمەتە مەزنانەش كە تیایاندایە، سەرنجی مرۆڤ بۆ لای خۆیان ڕادەكێشن. چونكە "زەیتوون" بناغەیەكی گرنگ پێكدەهێنێت لە ژیانی كۆمەڵایەتی و بازرگانی و، هۆكارەكانی ڕووناككردنەوە و، خۆراك پێدانی مرۆڤدا. هەروەك بەدیهێنانی "هەنجیر"یش موعجیزەیەكی دەراسای توانستی خواوەند دەردەخات، كە بریتییە لەوەی ئامێرەكانی درەختی گەورە و مەزنی هەنجیر لە ناوەندی تۆوێكی یەكجار بچووكدا دانراوە و جێی كراوەتەوە. ئنجا سوێندخواردنیش بە هەنجیر ئەو نیعمەتە خواییانە یادی مرۆڤ دەخاتەوە كە - بە پێچەوانەی میوەكانی تر - لە تام و سوودەكان و بەردەوامیی ئەم میوەیەدا هەیە. لە هەمان كاتیشدا و بەرامبەر بەم نیعمەتانە، مرۆڤ بۆ "ئیمان" و "كردەوەی چاك" ڕێنمایی دەكات، تاكو بەرەو پلە و ئاستە نزمەكان بەرنەبێتەوە.

❑ **سەرنجی سێهەم:**

پیتە پچرپچرەكانی سەرەتای سوورەتەكانی قورئان بریتین لە: چەند پەرلە(شفرة)یەكی خوایی كە لە ڕێیانەوە خوای گەورە هەندێ "ئاماژەی غەیبی" ئاراستەی بەندە تایبەتییەكەی خۆی دەكات و، كلیلی ئەو پەرلەیەش لە لای بەندە تایبەتییەكەی و میراتگرانی ئەوە!

جا لەبەر ئەوەی قورئانی حەکیم گوفتاری خۆی ئاراستەی هەموو چینەکانی گرۆی مرۆڤی هەموو سەردەم و کاتێك دەکات، ئەوا هێندە واتای جۆراوجۆر و ڕووی زۆر و زەبەندە و جامیعی لەخۆ گرتووە کە بەشی هەموو دەستە و تاقمێکی گشت چەرخ و سەردەمەکان بکات. خاوێنترینی ئەو واتا و ڕووانەش ئەوانەن کە پیاوچاکانی پێشین (السلف الصالح) بە جوانی ڕوونیان کردوونەتەوە. هەروەك ئەولیا و لێکۆڵەرانیش گەلێ ئاماژەی مامەڵەی غەیبییان سەبارەت بە سەیر و سلوکی ڕۆحانییەوە لەو پیتە پچڕپچڕانەدا دۆزیوەتەوە.

لە تەفسیری سەرەتای سوورەتی "البقرة" لە کتێبی "إشارات الإعجاز"دا، چەردەیەکمان لە بارەی ئەو پیتە پچڕپچڕانەوە باس کردووە، با سەیر بکرێت.

□ سەرنجی چوارەم:

"وتەی بیست و پێنجەم" چەسپاندوویەتی کە:

هەرگیزاو هەرگیز ناگونجێ بە جۆرێکی ڕاستەقینە و تەواوەتی قورئانی پیرۆز تەرجەمە بکرێت و ناتوانرێت شێوازی بەرزی ئیعجازە مەعنەوییەکەی بۆ هیچ زمانێك وەربگێڕرێت.

تێگەیاندنی خەڵکی لەو چێژ و حەقیقەتەی کە لە شێوازی بەرزی ئیعجازە مەعنەوییەکەی قورئاندان کارێکی گەلێ دژوارە. بەڵام وا تەنها بۆ مەبەستی ڕێنمایی، ئاماژە بۆ یەك دوو ڕووی دەکەین. ئەمەش بەم ئایەتە پیرۆزانەی خوارەوە:

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّموات وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوانِكم﴾ (الروم:٢٢).

﴿والسَّموات مَطْوِيّاتٌ بيمينِهِ﴾ (الزمر: ٦٧).

﴿يَخْلُقُكُمْ في بُطُون أُمَّهاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ في ظُلُمات ثلاث﴾ (الزمر:٦).

﴿خَلَقَ السَّموات وَالأَرْضَ في سِتَّةِ أَيّامٍ﴾ (الأعراف:٥٤).

﴿يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ﴾ (الأنفال:٢٤).

﴿لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثقالُ ذَرَّةٍ﴾ (سبأ:٣).

﴿يُولِجُ اللَّيْلَ في النَّهارِ وَيُولِجُ النَّهارَ في اللَّيْلِ وهُوَ عَليمٌ بِذات الصُّدُورِ﴾ (الحديد: ٦).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە و ئایەتەکانی تری هاوچەشنیان، بە شێوازێکی بەرزی خاوەن ئیعجاز و لە کۆکردنەوەیەکی دەراسا(خارق) و ناوازەدا، تەسەوور کردنی ڕاستیی "خەڵلاقییەت" لە بەرچاوی ئەندێشەدا دادەنێن. چونکە ڕوونی دەکەنەوە کە:

بەدیهێنەری جیهان و بنیاتنەری گەردوون، هەروەك مانگ و خۆر لە جێگەی خۆیاندا دادەنێت، بە هەمان جۆر گەردیلەكانیش لە شوێنی تایبەتیی خۆیان لەناو بیلبیلەی چاوی زیندەوەراندا جێ دەكاتەوە و، بە هەمان ئامراز و لە هەمان كاتدا هەریەكەیان لە شوێنی خۆیدا جێگیر دەكات..

هەر ئەو بەدیهێنەرە: هەروەك ئاسمانەكان بە چەند چینێك و بە وردی ڕێكدەخات و یەك لە دوای یەك دەرگاكانیان دەكاتەوە، هەر ئەو بەدیهێنەرە بە هەمان ئامراز و ئامێری مەعنەوی و لە هەمان كاتدا: چینەكانی "چاو"یش ڕێكدەخات و پەردەكانیشی بە كێشانە و تەرازوو هەڵدەداتەوە و دەیانكاتەوە..

هەروەها وەك ئەستێرەكان بە ڕووی ئاسماندا دەپرژێنێت و لە شوێنی خۆیاندا دایاندەنێت، بە هەمان جۆر چەندین خاڵی بێ سنووری نیشانە جوداكەرەوەكانیش لە ڕووی مرۆڤدا دەنەخشێنێت و بە هەمان ئامێری مەعنەویی توانستیش هەست و نەستە ڕواڵەتی و پەنهانەكانی تێدا جێگیر دەكات.

واتە ئەو كردگارە شكۆمەندە: بۆ ئەوەی پڕ بە چاو و گوێی مرۆڤ كارەكانی خۆی پیشان بدات و ئەوەش دەربخات كە هەر تەنها خۆی كارەكانی ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدات، ئەوا یەك جار وشەیەكی ئایەتە قورئانیيەكانی بە "گەردیلە"دا دەكێشێت و بەمەش لە شوێنی خۆیدا چەسپی دەكات و وشەیەكی تری هەمان ئایەتیش یەك جار بە "خۆر"دا دەكێشێت و لە مەڵبەندی خۆیدا ڕاگیری دەكات و بەم كارەش "تاكی" لە ناوەندی "تەنیایی"دا و.. ئەوپەڕی "شكۆمەندی"ش لە نێوان ئەوپەڕی "جوانی"دا و.. ئەوپەڕی "گەورەیی" لەناو ئەوپەڕی "پەنهانی"دا و.. ئەوپەڕی "فراوانی" لەوپەڕی "وردی"دا و.. ئەوپەڕی "سام و هەیبەت" لەوپەڕی "میهرەبانی"دا و.. ئەوپەڕی "دووری"ش لەوپەڕی "نزیكی"دا دەردەخات! واتە ئەوپەڕی پلەكانی كۆكردنەوەی شتانی دژ بە یەك - كە بە كارێكی مەحاڵ دادەنرێن - لە شێوەی پلەی "وجووب"دا دەردەخات و، ئەمەش بە ڕەوانترین و بەرزترین شێواز دەچەسپێنێت!

هەر ئەم شێوازە ئیعجازبەخشەیە كە گەردنی كەڵە ئەدیبان بۆ خۆی نەوی دەكات و دەیانخاتە دۆخێكی ئەوتۆ كە سوژدە بۆ ڕەوانبێژیيەكەی ببەن.

ئەم ئایەتە پیرۆزەش نموونەیەكی ترە:

﴿وَمِنْ آياتِهِ أَنْ تَقُومَ السَّماءُ وَالأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ اذا دَعاكُمْ دَعْوَةً مِنَ الأَرْضِ إذا أَنْتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ (الروم:٢٥).

ئەم ئایەتە پـیرۆزە لـە شـێوازێکی بەرز و بڵنـددا "مـەزنیی پەروەردگاریتیی خواوەنـد" دەردەخات. چونکە پیشانی دەدات کە:

ئاسمانەکان و زەوی وەك دوو سەربازگەی تـەواو ملکـەچ و گوێڕایـەڵ و نیشـتەجێی دوو سەربازگەی سوپای مەزنی لەوپەڕی ڕێسا و ڕێکوپێکیدان. بوونەوەرانی ناویشیان، کە لە ژێر پێخەفی فەنا و پەردەی عـەدەمدا ڕاکشـاون، بەوپـەڕی خێرایی و گوێڕایـەڵیی تەواوەتی، ئەو تەنیا فەرمان و ئاماژەیەی "نەفخی صوور" جێبەجێ دەکەن، تاکو بڕۆن بۆ مەیدانی حەشر و تاقیکردنەوە.

دەسـا بڕوانـە کـە چـۆن ئـەم ئایەتـە پیرۆزە حەشـر و قیامـەتی بـە شـێوازێکی خـاوەن ئیعـجـاز و بـەرز دەربڕیـوە و، چۆن لـە نـاوەندی "دەعـوا"دا ئامـاژەی بـۆ "بەڵگـە"یـەکی قەناعەتبەخش کرد، بە وێنەی دەرهاتنی ئەو تۆوانەی کە وەك مردوو لەناو زەویدا خۆیان شاردبووەوە و، ئەو دڵۆپانەی بارانیش کە لە بەرزایی ئاسمـان و گـۆی هـەوادا بـە پەنـهانی بڵاو بووبوونەوە، کەچی بە ڕێکوپێکی و خێراییەکی تەواوەتی کۆ دەبنەوە و دەڕۆنە ناو مـەیدانی تاقیکردنـەوەی هـەموو بەهارێکـەوە. تەنانـەت - وەك لـە بەرچاودایــە - دەنکـە دانەوێڵـەکانی نـاو زەوی و دڵۆپـە بارانـەکانی ئاسمـانیش شـێوەی حەشـر و نەشـر دەگرنـە خۆیان!

جا حەشری مەزنیش هـەر بـە هـەمان ئاسـانی دێتـە کایـەوە. چونکـە مـادەم لـێرەدا ئـەم دیاردەیە دەبینرێت، ئەوا ناتوانن ئینکاریی حەشر بکەن.

بەم جۆرە دەتوانن بۆ خۆتان پلـەکانی ڕەوانبێژیی ئایەتـەکانی تـر لـە هـی ئـەم ئایەتـەوە لێك بدەنەوە و هەستی پێ بکەن .

جا ئایا دەتوانرێـت ئەم چەشنە ئایەتە پیرۆزانە - بە جۆرێکی ڕاستەقینە - بۆ زمانـەکانی تر تەرجەمە بکرێن؟ بێ گومان ئەم کارە هەرگیز لە تواناذا نییە.

خـۆ ئەگـەر هـەر پێویسـت بـە لێکدانـەوەی ئایەتـەکان بکـات، ئـەوا دەبـێ یـان چــەند واتایەکی پوختـی ئایەتە پیرۆزەکە لێـك بدرێنـەوە، یـان هـەموو ڕستەیەکی ئایەتـەکان بـە نزیکەی شەش دێڕ تەفسیر بکرێن.

□ **سەرنجی پێنجەم:**

با - بۆ نموونە - تەنـها یـەك ڕستەی قورئـان وەربگریـن کـە بریتیـیە لـە: "الحمـد لله". ئـەوەتا کورتـترین واتاکـانی ئـەم ڕستەیە، بـەپێی یاسـاکانی زانسـتی "بـەیان" و "نـەحو"، بریتییە لەمەی خوارەوە:

"كلُّ فردٍ مِن أفرادِ الحمدِ مِن أيِّ حامدٍ صدرَ وعلى أيِّ محمودٍ وقعَ مـــن الأزلِ إلى الأبدِ، خاصٌ ومستحقٌ للذاتِ الواجبِ الوجودِ المسمى باللهِ".

واتـە: هـەر حـەمد و مـەدح و سـەنایەك لـە هـەر سوپاسـگوزارێكەوە بـۆ هـەر سوپاسكراوێك ئاراستە كرابێت، هەر لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، تەنها تایبـەت و شـایانی زاتـی "واجب الـوجود"ە كە ناوی "اللّٰه"یە.

كـە دەڵێـین: "هـەرچی حـەمد و سـەنایەك هەیـە" ئـەم واتایـە لـە "أل"ی ئیسـتیغراقەوە وەرگیراوە.

واتای: "لە هەر سوپاسگوزارێكەوە ئاراستە كرابێت" لەوەوە وەرگیراوە كە "حەمد" مـەصدەرە و لـەم چەشـنە مەقامـەدا عموومییـەت دەگەیـەنێت، چونكـە فاعیلـەكـەی بـاس نەكراوە.

واتای: "بۆ هەر سوپاسكراوێك" لە نەهێنانی مەفعوولەكەوە وەرگـیراوە، چونكـە ئـەم كارە لە مەقامی "خیطاب"دا عموومی و هەمەكێتی دەگەیەنێت.

"لە ئەزەلەوە تا ئەبەد"یش لە جێگیربوون و بـەردەوامیی ئـەو حـەمدەوە وەردەگـیرێت، بەپێی دەستووری گواستنەوەی گوفتار لە جوملەی "فیعلی"یەوە بۆ جوملەی "ئیسمی".

واتای: "تایبەت و شایان"یش لە لامی حـەرفی جـەڕی "للّٰه" وەرگـیراوە، چونكـە ئـەو لامە بۆ شایستەیی و تایبەتكردنە.

واتای: (زاتی واجب الوجود كە ناوی "أللّٰه"یە)ش لەوەوە هاتووە كـە لـەفزی جەلالـە "أللّٰه" بـەپێی دەلالـەتی ئیلتیزامی[1] بەڵگـەیە لەسـەر زاتی "واجب الـوجود". چـونكـە ئەم

---

(١) دەلالـەتی ئیلتـیزامی: زاراوەیـەكی "زانسـتی مـەنتیق"ە. بـەپێی ئـەم زانسـتە هـەر وشـەیەك كـە بۆ واتایـەكی تایبەتی دانرابێت، كاتێ كە بـە كاردەهێنرێت، یـان مەبەسـت لـەو بەكارهێنـانە واتـای پڕاوپڕی وشـەكەیە، وەك ئەوەی كە ناوی كەسێك دەهێنرێت مەبەست خـودی ئـەو كەسـە بێـت كـە ئـەو نـاوەی لـێ نـراوە. ئەمـەش پێـی دەوترێ "دەلالـەتی موتابەقە".. یان مەبەست لە بەكارهێنانی وشەكە بەشێكە لە واتاكـەی، نـەك هـەمووی. وەك ئـەوەی پزیشـك بـە نەخۆشـەكەی بڵێـت: "تۆ پێویسـتت بـە خـواردنـی ڤیتامینـەكانـە، كەواتـە میـوە و سـەوزەی نەكوڵاو بخۆ". ئیتر بە شێوەیەكی ناوەكی(ضمـــني) ڕێنمـایی نەخۆشـەكەی دەكـات كـە ڤیتامینـەكان لـە میـوە و سەوزەی نەكوڵاودا هەیە. ئەم بەشەیان پێی دەوترێ: "دەلالـەتی تەزەممونی" واتە ناوەكی، چونكە ڕاستەوخۆ ئەو واتایە مەبەسـت نـەبووە، بـەڵام لـە نـاوەندی واتـا سـەرەكییەكەوە ئەم واتایە وەرگـیراوە.. یـان مەبەسـت لـە بـەكارهێنانی وشـەكە واتایـەكی دەرەوەی واتـا پڕاوپڕەكـەی وشـەكەیە، بـەڵام چ لـە ڕێـی ژیرییـەوە – وەك لـە زانستی مەنتیقدا – چ لە ڕێی عورفەوە – وەك لە زانستی بەلاغـەدا – بـە واتایـەكی پێوسـت(لازم) دادەنرێـت بـۆ واتا سەرەكییەكەی ئەو وشەیە، لەبەر ئەوە پێی دەوتـرێ: "دەلالـەتی ئیلتیزامی". نموونـەی لازمـی عـەقلی وەك ئـەوەی یـەكێك بڵێـت: "ئـەم ژمارەیـە جووتـە و تـاك نییـە". لـە ڕێـی دەلالـەتی ئیلتیزامییەوە ئەم قسـەیە ئـەوە

وشەیە سەرجەم سیفەت و ناوەكانی خواوەند لە خۆدا كۆ دەكاتەوە و ئیسمی ئەعزەمە و، لەبەر ئەوەشە كە "واجب الوجود" پێویستییەكی لازمی خوایەتییە و ناونیشانێكە بۆ ڕەچاوكردنی زاتی مەزنی خواوەند.

جا ئەگەر كورتترین واتای ڕواڵەتیی ڕستەی: "الحمد لله" بەم شێوەیە بێت، وەك زانایانی زمانی عەرەبی لەسەری یەكیان گرتووە، دەبێ چۆن بتوانرێت قورئانی پیرۆز بە هەمان هێز و ئیعجازەوە بۆ زمانێكی تر تەرجەمە بكرێت؟!

پاشان جگە لە زمانی عەرەبیی فوسحا تەنها یەك زمانی نەحوی ڕەوانی تر لە نێوان سەرجەم زمانەكانی جیهاندا هەیە، كە ئەویش هەرگیز ناگاتە ئاستی جامیعییەت و شموولییەتی زمانی عەرەبی.

وشەكانی قورئانی پیرۆز بەو زمانی عەرەبییە فوسحا و جامیع و دەراسایەن و، لە شێوەیەكی ئیعجازبەخشدان و، لە زانستێكی گشتگیری ئەوتۆیشەوە سەرچاوەیان گرتووە كە دەوراندەوری هەموو شتێكی داوە و هەموو لایەنەكانی هەڵدەسووڕێنێت.. ئیتر لە كوێ وشەكانی زمانێكی تر، كە پێكهاتن و ئاڵوگۆڕەكانیان لەم جیایە، مافی ڕەوا بە وەرگێڕانیان دەدات، لە لایەن كەسێكیشەوە كە: زەینێكی جوزئی و هەست و نەستێكی كۆتا و بیرێكی ئاڵۆز و دڵێكی تاریكی لە خۆدا هەڵگرتووە؟ یان ئایا چۆن وشەكانی وەرگێڕانێك جێی ئەو وشە پیرۆزانە دەگرنەوە؟ تەنانەت دەتوانم بڵێم و بیشی چەسپێنم كە: هەموو یەكێك لە پیتەكانی قورئانی پیرۆز وەك گەنجینەیەكی حەقیقەتەكان وایە، تەنانەت لەوانەیە یەك دانە پیتی قورئان پڕ بە لاپەڕەیەك حەقیقەتی لە خۆدا هەڵگرتبێت.

□ **سەرنجی شەشەم:**

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم واتایە، حاڵەتێكی نوورانیی تایبەت و خەیاڵێكی خاوەن حەقیقەتتان بۆ باس دەكەم كە بەسەر خۆمدا هاتووە. بۆ مەبەستی ڕوونكردنەوەی وشەی ﴿نَعْبُدُ﴾ و دەرخستنی لایەنێكی پەنهانی نهێنییەكەی:

---

دەگەیەنێت كە ژمارەكە بەسەر ژمارە دوودا دابەش دەكرێت بە بێ مانەوەی هیچ كەرتێك. نموونەی لازمی عورفیش وەك ئەوەی بوترێ: "دیوەخانەكەی فلانە كەس خەڵكی زۆری تێدایە". بەپێی دەلالەتی ئیلتیزام ئەو واتایە بە دەستەوە دەدات كە ئەو كەسە میوانی زۆرە، كە ئەوە دەگەیەنێت مرۆڤێكی نان بدەیە، دیارە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو ناوبراوە كەسێكی سەخییە! بڕوانە سەرچاوە مەنتیقییەكان. بۆ نموونە: (ضوابط المعرفة) نووسینی: مامۆستا (عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني) ص٢٧-٣٢ .(وەرگێڕ)

ڕۆژێکیان بیرم لە "ن"ی "متکلم مع الغیر"ی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ کردەوە و، دڵم کەوتە گەڕان و پشکنین بۆ دۆزینەوەی هۆی گواستنەوەی شێوازی "موتەکەللیمی موفرەد"(تاکە کەس) بۆ شێوازی "جمع"(کۆ) لە وشەی ﴿نَعْبُدُ﴾دا..

کتوپڕ حیکمەت و فەزیلەتی "نوێژی جەماعەت" لەو "ن"ەوە دەرکەوت. چونکە بەهۆی بەشداری کردنم لە نوێژێکی جەماعەتی مزگەوتی "بایەزید"دا بۆم دەرکەوت کە هەموو یەکێکی نوێژکەران وەکو تکاکارێك وان بۆ من.

هەروەها بینیم کە هەموو یەکێك لە نوێژکەرانی ئەو جەماعەتە: شایەت و پشتگیری ئەو بڕیار و بابەتانەن کە لە خوێندنی ناو نوێژەکەمدا دەرمخستن. ئەمەش ئازایەتی‌یەکی سەروزیادی بۆ ئەوە پێ بەخشیم کە پەرستشە ناتەواوەکەم، هاوڕێ لەگەڵ پەرستشە گەورە و مەزنەکەی ئەو جەماعەتەدا، بۆ حوزووری خاوێنی خوای گەورە بەرز بکەمەوە.

لەم کاتەدا کە من بیرم لەمە دەکردەوە، کتوپڕ پەردەیەکی ترم لە بەرچاودا لادرا و، سەرجەم مزگەوتەکانی ئەستەمبوڵم وا هاتە بەرچاو کە پێکەوە پەیوەست بن و پاڵیان بە یەکەوە دابێت! ئیتر ئەو شارەم لە بەرچاودا وەك ئەم مزگەوتە لێ هات و، هەستم بە "شەرەفمەندی" بگرە "تەسدیق"ی سەرجەم دوعای نوێژکەرانی ئەم مزگەوتە گەورەیە کرد.

ئا لێرەدا خۆم لە ناوەندی ئەو ڕیزە بازنەیی‌یانەدا بینی‌یەوە کە لەناو "مزگەوتی گۆی زەوی" و لە دەوری کەعبەی پیرۆزدا یەك لە دوای یەك بازنەی نوێژیان پێکهێنابوو! یەکسەر سوپاسی زۆری خواوەندم کرد و پڕ بە دڵ وتم: "الحمد لله رب العالمين". چونکە ئەم هەموو تکاکار و شەفاعەتخوازە زۆرەم هەیە کە هەر هەموویان تەسدیقم دەکەن و پێکەوە ئەو شتانەم لەگەڵدا دووپات دەکەنەوە کە من لە نوێژەکەمدا دەیانڵێم.

لەبەر خۆمەوە وتم:

مادەم بە ئەندێشە پەردەکەم بەم چەشنە لە بەرچاودا هەڵدرایەوە و کەعبەی پیرۆزیش وەك میحرابی سەرنشینانی زەویی لێ هات، دەبا ئەم هەلە بقۆزمەوە و پوختەی ئیمانەکەم کە لە شایەتمانی نوێژدا دەیڵێم و بریتی‌یە لە: "أشهد أن لا إله إلاّ الله وأشهد أنّ محمداً رسول الله" بە ئەمانەت لای "الحجر الاسود" دابنێم و گشت ڕیزەکانی نوێژیشی لەسەر بگرم بە شایەت!

ئـا لـێرەدا حاڵـەتێکی تـرم لـێ دەرکـەوت، چونکـە بینیـم ئـەم کۆمەڵــە مەزنـەی کـە ڕۆیشتمە ناویانەوە، بوون بە "سێ" بازنە و کۆمەڵ:

*یەکەمیان*: ئەو کۆمەڵە مەزنەیە کە لـە ئیمـانداراني یەکتاپەرسـتی سەرتاسـەری ڕووی زەوی پێکهاتووە.

*دووهەمیان*: بازنـە و کۆمـەڵی سـەرجەمی بوونەوەرانـە کـە "هـەر یەکـەیان نوێـژ و تەسبیحاتی خۆی دەزانێت"[1] و خۆم لە نـاوەندی نوێژ و تەسـبیحاتە مەزنەکەی ئەواندا بینیی‌یەوە و، زانیم کە ئەو شتەی پێی دەوترێت: "ئـەرك و کارمـەندیی شـتان" لـە ڕاستی‌دا ناونیشانی پەرستن و عبوودییەتی ئەو بوونەوەرانەیە.. ئیتر لە سەرسامی‌دا و لە بـەردەم ئـەم مەزنی‌یەدا سەرم داخست و وتم: "ألله أكبر"! پاشان بیرم کردەوە لە خۆم و لە بازنەی:

*سێهەم*: بینیم جیهانێك هەیە کە لەم بازنەیەدا لە گەردیلـەکانی وجوودمـەوە دەست پێ دەکات و بە هەستە ئاشکراکانم کۆتـایی پـێ دێـت.. ئـەم جیهانـەش گەلـێ بچووکـە، بەڵام یەکجار گەورەیـە! بـە ڕادەیـەك کـە مـرۆڤ دووچـاری سەرسـامی و سـەرسووڕمان دەکات. جیهانێکە بە ڕواڵەت لەوپەڕی بچووکی‌دایە، کـەچی حەقیقـەت و ئەرکـەکانی سەرشانی یەکجار مەزن و گەورەن.

بـەڵێ، بینیـم کـە هـەموو یـەکێك لـە کۆمەڵــەکانی ئـەم جیهانـە سـەرگەرمی کارمەندی‌یەکانی بەندایەتی و ئەرکەکانی شوکرانەبژێریی ئەستۆی خۆیـانن. ئنجا بینیـم لایەنـە ناسـکە پەروەردگاری‌یەکـەی ئەو بازنەیـەش کـە لـەناو دڵمدایـە، بـە نـاوی ئـەم کۆمـەڵەوە: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دووپات دەکاتەوە، بە وێنەی زمانم کە بـە نییـەتی دوو کۆمەڵە مەزنەکەی یەکەم دووپاتی کردەوە.

**بە کورتی:**

"نون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ ئاماژە بۆ ئەم سێ کۆمەڵە دەکات و بەڵگەیە لەسەر هەرسێکیان.

کاتێ کە من لەم حاڵەتەدا بووم، کتوپڕ کەسایەتیی مەعنـەوی و پیرۆزی ڕاگەیەنـەری قورئانی پـیرۆزم بـە مـەزنی و ویقـاری خۆیـەوە ﷺ لـە بـەردەمدا بەرجەستە بـوو، کـە لـەو دەمەدا لـەسەر مینبـەرە مەعنەوی‌یەکەی(مەدینـەی مونـەووەرە) ڕاوەسـتابوو، چ مـن و چ غەیری منیـش گوێمـان لـێ ڕاگرتبـوو، وتـارێکی ئاراستەکراوی ئیلاهیـی ڕادەگـەیاند و دەیفەرموو: ﴿يا أيُّها النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمْ.. ﴾ (البقرة:٢١). لەو کاتەدا بە ئەندێشە بینیم کە

(١)﴿كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ﴾ (النور:٤١).

هەریەك لەو سێ كۆمەڵـە ـ بـە وێنـەی مـن ـ پێكـەوە وەڵامـی ئـەو وتـارە پەروەردگاری‌یـە مەزنەیان دەدایەوە و دەیانوت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾.

ئا لێرەدا و بەپێی دەستووری: "إذا ثبتَ الشيءُ ثبـــتَ بِلَوازِمِـــهِ" ڕاستی‌یەكی تر لـە بەردەم بیرمدا بەرجەستە بوو، كە بریتی‌یە لەوەی:

مادەم پـەروەردگاری هـەموو جیهانـەكان ڕووی گوفتـاری خـۆی ئاراسـتەی گـرۆی مرۆڤ كردووە و لەگەڵ هەموو بوونەوەران دەدوێت و، ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەش ﷺ وتارە پەروەردگاری‌یـە مەزنەكـەی خواوەنـدی بـە سـەرجەمی گـرۆی مـرۆڤ، بـەڵكو بـە هـــەموو خـــاوەن هەســـت و شـــعوورەكان، تەنانـــەت بـــە سەرانســـەری گیانلەبـــەران ڕاگـەیاندووە، ئـەوا دەبـێ "ڕابـوردوو" و "داهـاتوو"ش حوكمـی كـاتی "ئێسـتا"یـان وەرگرتبێت و سەرجەم گرۆی ئادەمیزادیش لە چەند ڕیزێكی جۆراوجۆردا بووبن بە یەك كۆڕ و كۆمەڵ و ئەنجوومەن. چونكە ڕووی گوفتارەكە ئاراستەی هەموویان كراوە!

ئا لێرەدا هەموو یـەكێك لـە ئایەتـەكانی قورئـانم لـە چڵەپۆپـەی ڕەوانبێـژی و لـوتكـەی ڕەوانی و دوا پلەی ئیعجازێكدا بینی كە ڕووناكی‌یـە درەخشـانەكەی تیشـكی دەدایـەوە. چونكە بەرزی و بڵندی و هێزی هەموو یەكێكی ئایەتەكانی قورئان هی ئەوەیە كە:

لەو "مەقامە بەرز و بڵندە"وە سەرچاوەی گرتووە كە گەورەیی‌یەكەی بێ كۆتایی‌یـە و فراوانی‌یەكەشی بڕانەوەی نی‌یە و بەرزی‌یەكەشی كۆتایی پێ نایەت. واتە لە شكۆمەندیی خـاوەن مـەزنیی ڕەهـا و خـاوەن گوفتـاری ئەزەلی‌یـەوە ـ جـــلَّ جلالُـــه ـ سـەرچاوەی گرتووە..

هەروەها بەرزی و بڵندی و هێزی ئـەو ئایەتانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ "ڕاگەیەنـەر"ەكەشیان كە لە مەقامی "مەحبووبییەتی هەرە مەزن"دایە و خاوەنی پلە و پایەی بەرز و باڵایە..

هەروەها لەوەدایە كە گوفتارێكە ئاراستەی ئـەو "بەدیهاتووانـە" كـراوە كـە لەوپـەڕی زۆری و گرنگی و جیاوازیدان.

لەبەر ئـەوە، بـە لێكۆڵینـەوە و دڵنیایی‌یـەوە بـۆم دەركـەوت كـە: نـەك هـەر سـەرجەمی قورئان، بەڵكو یـەك بـە یـەكی سوورەتەكانی و هـەموو یـەكێكی ئایەتـەكانی موعجیـزەی دەراسایە، تەنانـەت هـەموو وشـەیەكیش لـە وشـەكانی لـە حوكمـی موعجیزەیەكدایـە بـۆ خۆی. بۆیە لەبەر خۆمەوە وتم:

"الحمد لله على نعمة الإيمان والقرآن".

ئیتر هەروەك لە "نون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ەوەوە ڕۆیشتمە ناو ئەم ئەندێشەیەی كە عەینی حەقیقەتە، بەم و شەیەش لێی هاتمە دەرەوە و، تێ گەیشتم لەوەی كە نەك هەر تەنها ئایەت و وشەكانی قورئان موعجیزەن، بەڵكو پیتەكانیشی - وەك ئەوەی لە "نون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾دا بینیم - چەند كلیلێكی نوورانین بۆ گەلێ حەقیقەتی گەورە و مەزن.

دوای ئەوەی كە "دڵ" و "ئەندێشە" لە "نون"ی ﴿نَعْبُدُ﴾ هاتنە دەرەوە، "ژیری" ڕووبەڕوویان بووەوە و پێی وتن:

منیش داوای بەشی خۆم دەكەم لەو حاڵەتەی كە ئێوەی تێدان! چونكە من وەك ئێوە ناتوانم بفڕم و، بەپێی بەڵگە و دەلیل نەبێت ناتوانم بڕۆم و هەنگاو بنێم.. دەسا فەرموون ئەو ڕێگایەم پیشان بدەن كە مرۆڤ لە ﴿نَعْبُدُ﴾ و ﴿نَسْتَعِين﴾ەوە دەگەیەنێتە "پەرستراوی ڕاستەقینە" و "یارمەتیدەری ڕاستەقینە"ی خۆی، تاكو منیش بتوانم بیم بە هاوڕێتان.

هەر لەو كاتەدا ئەمەی خوارەوە هاتە (دڵ)مەوە كە:

بەو "ژیری"یە سەرگەردانە بڵێ:

بیر لە گشت بوونەوەرانی جیهان - بە زیندەوەر و نازیندوویانەوە - بكاتەوە. چونكە هەریەكەیان لە شێوەی كارمەندییەكدا و بەپێی ڕێسایەكی ورد و لە ناوەندی گوێڕایەڵییەكی تەواودا، پەرستشی تایبەتیی خۆیان هەیە.

خۆ هەرچەندە بەشێكی ئەو بوونەوەرانە دارای هەست و شعوور نین، كەچی بەوپەڕی بەندایەتی و ڕێسا و هەست و شعوورەوە كارمەندی و ئەركەكانی ئەستۆیان ڕادەپەڕێنن..

كەواتە دەبێ "پەرستراوێكی ڕاستەقینە" و "فەرماندەرێكی ڕەها" هەبێت كە ئەو بوونەوەرانە ملكەچ بكات و بەرەو بەندایەتی بیانداتە بەر.

هەروەها پێی بڵێ: با بیر لە هەموو "بوونەوەران" بە تایبەت "زیندەوەران" بكاتەوە، چونكە هەریەكەیان بۆ مەبەستی بەردەوامبوونی ژیانیان و مانەوەی جۆرەكەیان، چەندین پێداویستیی زۆر و جۆراوجۆر و گەلێ خواستی زەبەندە و جیاجیایان هەیە. جا لە كاتێكدا كە هیچ كامیان دەستیان ناگاتە داوێنی سادەترینی ئەو خواست و پێداویستییانە و لە توانای خۆیاندا نییە بیانهێنێتەدی، كەچی دەبینین ئەو پێداویستی و خواستە بێ سنوورانەیان: بە ئاسانی و، لە هەموو شوێنێكەوە و، لە باشترین و شیاوترینی كاتدا، بۆ ڕەوانە دەكرێت و دێنە بەردەستیان!

جا ئەو هەزاری و پێداویستی‌یە بێ کۆتایی‌یەی بوونەوەران لە لایەکەوە و، ئەم یارمەتیدانە غەیبی و فریاگوزاری‌یە ڕەحمانی‌یانەش لە لایەکی ترەوە، بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە: ئەو بوونەوەرانە ڕۆزیدەرێکیان هەیە فریایان دەکەوێت و دەیانپارێزێت..

ئەو ڕۆژیدەرەش خاوەنی: دەوڵەمەندیی ڕەها و.. کەرەمی ڕەها و.. توانستی ڕەهایە، بە چەشنێ کە هەموو شتێك و هەموو زیندەوەرێك داوای یارمەتی و فریاگوزاریی لێ دەکات.

واتە هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە لە ناوەڕۆك و واتادا دەڵێت:

- ﴿إيّاكَ نستعين﴾!

ئا لێرەدا "ژیری"ش خۆی بە دەستەوە دا و وتی:

- آمنّا وصدّقنا!

□ سەرنجی حەوتەم:

دوای ئەوە، کە: ﴿إهْدِنا الصِّراطَ الْمُستَقيم ۞ صِراطَ الَّذينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾م خوێند، سەیری کاروانەکانی گرۆی مرۆڤم کرد کە بەرەو ڕابوردوو کۆچیان کردووە. بینیم کاروانی پێغەمبەرە بەرێزەکان - عليهم السلام - و صیدیقان و شەهیدان و ئەولیا و پیاوچاکان، ڕووناکترین و درەخشانترینی ئەو کاروانانەن. تەنانەت ڕووناکیی ئەو کاروانە، تاریکی‌یەکانی ئایندەش دەرەوێنێتەوە، چونکە ئەوان بە ڕێگایەکی ڕاستەشەقامی هێندە مەزندا ڕۆشتوون کە تا ئەبەد درێژەی هەیە. هەروەها بینیم ئەم ڕستەیە ڕێی پێگەیشتنەوەی ئەم کاروانە پیرۆزەم پیشان دەدات، تەنانەت دەیشمگەیەنێتەوە پێیان.

بۆیە وتم:

-سبحان الله! دەبێ ئەو کەسە چەندە زەرەرمەند بێت و گرفتاری چ زیان و تیاچوونێکی گەورە بووبێت کە شوێن ئەم کاروانە نوورانی‌یە مەزنە ناکەوێت، کە کاروانێکە بە ئاشتی و ئاسایش و ئارامی ڕێی خۆی بریوە و پەردەی تاریکایی‌یەکانی لاداوە و ئایندەشی ڕووناك کردووەتەوە! هەرکەسێ خاوەنی کێشی گەردیلەیەك هەست و شعوور بێت، پەی بەمە دەبات.

ئایا ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ به‌هۆی پیاده‌كردنی بیدعه‌ته‌كانه‌وه‌ له‌ ڕێی ئه‌و كاروانه‌ مه‌زنه‌ ترازاوه‌، له‌ كوێوه‌ ڕووناكی به‌ده‌ست ده‌هێنێت تا به‌رپێی خۆی ببینێت؟ یان ئایا به‌ره‌و كوێ مل ده‌نێت؟ خۆ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست و پێشره‌ومان ﷺ فه‌رموویه‌تی:

"كلُّ بدعةٍ ضلالةٌ وكلُّ ضلالةٍ في النارِ"[1]!

نازانم ئه‌و به‌دبه‌ختانه‌ی كه‌ شایانی ئه‌وه‌ن ناوی "علماء السوء"یان لێ بنرێت، چ به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كیان ده‌ست ده‌كه‌وێت كه‌ له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌م فه‌رمووده‌ پیرۆزه‌وه‌ فه‌توایه‌كی پێچه‌وانه‌ی شه‌عائیره‌ به‌دیهی‌یه‌كانی ئیسلام ده‌رده‌كه‌ن، كه‌ به‌ ئاشكرا زیانی تێدایه‌ و هیچ پێویستی‌یه‌كی ناچاره‌كیش له‌ گۆڕێدا نی‌یه‌ بۆ ده‌ركردنی و، پێیان وایه‌ ئه‌و شه‌عائیرانه‌ ده‌گونجێت ئاڵو گۆڕیان تێدا بكرێت! خۆ ئه‌گه‌ر شتێكیان له‌مه‌دا به‌دی كردبێت، له‌وانه‌یه‌ ته‌نها بێداربوونه‌وه‌یه‌كی كاتیی ده‌ركه‌وتنی "واتا كاتی"یه‌كه‌ی ئه‌و وشانه‌ بووبێت ئه‌وانی خه‌ڵه‌تاندبێت..

بۆ نموونه‌:

گه‌ر پێستی زینده‌وه‌رێك یان توێكڵی میوه‌یه‌ك له‌و زینده‌وه‌ر و میوه‌یه‌ بكرێنه‌وه‌، ئه‌وا جوانی‌یه‌كی كاتی له‌و گۆشت و میوه‌یه‌وه‌ ده‌رده‌كه‌وێت، به‌ڵام پاش ماوه‌یه‌كی كه‌م ئه‌و گۆشته‌ جوان و میوه‌ ناسكه‌، له‌ ئه‌نجامی به‌رگێكی لاوه‌كی و نامۆ و چرپ و چه‌په‌ڵه‌وه‌، ڕه‌ش داده‌گیرسێن و بۆگه‌ن ده‌كه‌ن!

ته‌عبیر و ده‌سته‌واژه‌كانی خوا و پێغه‌مبه‌ریش ﷺ كه‌ له‌ شه‌عائیره‌كانی ئیسلامدا هه‌ن، وه‌كو پێستی زیندوو وان و خوێندنیان پاداشتی له‌سه‌ر ده‌نووسرێت. به‌ڵام گه‌ر ئه‌و ته‌عبیرانه‌ داماڵرێن، ئه‌وا به‌ شێوه‌یه‌كی كاتی شتێكی كه‌م له‌ نووری واتاكانیان ده‌رده‌كه‌وێت و، به‌ وێنه‌ی نه‌مانی ناسكیی ئه‌و میوه‌یه‌ی كه‌ توێكڵه‌كه‌ی لێ كرایه‌وه‌ "گیان"ی ئه‌و واتا پیرۆزانه‌ش كه‌ له‌و ته‌عبیرانه‌دایه‌ ده‌فڕێت و "وشه‌" مرۆڤانه‌كان له‌ دڵ و ژیری‌یه‌ تاریكه‌كاندا به‌جێ ده‌هێڵێت و له‌گه‌ڵ ئه‌ودا ڕووناكی‌یه‌كانیش ده‌ڕۆن و جگه‌ له‌ "دوو كه‌ڵ" هیچی تر نامێنێته‌وه‌!!

به‌ هه‌ر حاڵ..

---

(١) صحيح: جزء من حديث أخرجه احمد (٣/٣١٠، ٣١١، ٣٣٧، ٣٣٨، ٣٧١)، ومسلم (٨٦٧) والنسائي (٣/١٨٨) وابن ماجه (٤٥) والبيهقي في السنن (٣/٢١٣، ٢١٤) وغيرهم من عدة طرق كلهم من حديث جابر رضي الله عنه. وزيادة (وكل ضلالة في النار) هي عند النسائي فقط من بين هؤلاء وسندها صحيح.

**❑ سەرنجی هەشتەم:**

پێویستە یەکێك لە دەستوورەکانی "حەقیقەت" ڕوون بکرێتەوە کە تایبەتە بەم مەسەلەیەوە. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

شەریعەتی ئیسلام دوو جۆر "ماف"ی تێدایە: "مافە کەسییەکان" و "مافە گشتییەکان" کە لە جۆری "مافەکانی خوای گەورە"ن..

هەروەها "مەسەلە شەرعییەکان"یش هەندێکیان پەیوەندییان بە "کەسان"ەوە هەیە و هەندێکی تریشیان پەیوەندییان بە "سەرجەمی خەڵك"ەوە هەیە، واتە لە ڕووی عوموومییەتەوە پەیوەندیی بە هەموو خەڵکییەوە هەیە. ئەم بەشەیان پێی دەوترێت: "شەعائیری ئیسلامی".

جا لەو ڕووەوە کە ئەم شەعائیرانە پەیوەندییان بە عموومی خەڵکییەوە هەیە، ئەوا هەموو کەسێك بەشێکی تێدا هەیە و هەر دەست تێوەردانێك لەم جۆرە شەعائیرەدا بە دەستدرێژی دادەنرێت بۆ سەر مافی سەرجەمی خەڵکی، گەر - هەر هەموویان - بەو دەست تێوەردانە ڕازی نەبن. دەبێ بیشزانین کە بچووکترینی مەسەلەکانی ئەو شەعائیرانە (با بڵێین لە جۆری سوننەتیش بێت) وەك هەر مەسەلەیەکی گەورە، گرنگییەکی مەزنی تێدایە. چونکە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامییەوە هەیە.

جا ئەو کەسانەی هەوڵ و تەقالایان لە پێناوی پچڕاندنی ئەو زنجیرە نوورانییانەدایە کە سەرجەم گەورە مەردانی ئیسلام هەر لە سەدە باشەکانی پێشینەوە تا ئێستا پابەندیان بوون و، دەیانەوێت ئەو زنجیرانە برووخێنن و دەستکارییان تێدا بکەن.. با بزانن چ هەڵەیەکی گەورە دەکەن و، گەر هێندەی کێشی گەردیلەیەك هەست و شعووریان تێدایە، با تەزوو بە جەستەیاندا بێت!

**❑ سەرنجی نۆهەم:**

بەشێکی مەسەلە شەرعییەکان پێیان دەوترێت: "مەسائیلی تەعەببودی". ئەم بەشە هیچ پەیوەندییەکی بە داوەریی ژیرییەوە نییە و، چۆن فەرمانیان لە بارەوە دراوە، هەر بەو جۆرەش ئەنجام دەدرێن. چونکە "عیللەت"ی حوکمی ئەم بەشە تەنها "فەرمانی خوا"یە.

بەشەکەی تری مەسەلە شەرعییەکان پێی دەوترێت: "معقول المعنى". واتە دانست و بەرژەوەندییەکی ئەوتۆیان تێدایە کە تەشریع کردنی ئەو حوکمە تەرجیح دەدەن، نەك

ئەوەی هۆکار و "عیللەت"ی تەشریعی ئەو حوکمە بن. چونکە "عیللەتی ڕاستەقینە" هەر تەنها: "فەرمان" و "نەهی"ی خوای گەورەیە.

جا هەرگیز حیکمەت و بەرژەوەندی ناتوانن بەشی "تەعەببودی" لە شەعائیرەکاندا بگۆڕن، چونکە لایەنی "تەعەببود"(واتە: خواپەرستی) لەم بەشەدا زاڵ و تەرجیحدراوە. بۆیە هەرگیز ناگونجێت دەستی تێ وەربدرێت، یان بە هیچ جۆرێك دەستکاریی تێدا بکرێت، تەنانەت گەر سەد هەزار "بەرژەوەندی" و "حیکمەت"یش بۆ ئەو دەستکارییە لە گۆڕێدا بێت! هەروەها ناگونجێ بوترێت: "سوودەکانی شەعائیر تەنها بریتین لە: بەرژەوەندییە زانراوەکان"، ئەم چەمکە بۆچوونێکی هەڵەیە. بەڵکو ئەو بەرژەوەندییە زانراوانە لەوانەیە تەنها یەك دانە سوود بن لە نێوان حیکمەت و سوودە زۆرەکانیاندا.

بۆ نموونە: گەر یەکێك لەو جۆرە کەسانە بڵێت:

حیکمەتی "بانگ" بریتییە لە بانگێشتی موسڵمانان بۆ ئەنجامدانی نوێژ، کەواتە تەقاندنی گوللە تفەنگێك سەروزیادی ئەنجامدانی ئەم کارەیە.. ئەوا دیارە ئەو گێژ و گەلحۆیە تێنەگەیشتووە لەوەی کە "بانگێشتی موسڵمانان بۆ نوێژ" تەنها یەك دانە بەرژەوەندییە لە نێوان هەزاران بەرژەوەندیی ئەوتۆ کە لە "بانگ"دا ڕەچاو کراون. تەنانەت گەر هەر دەنگێك لە بریی "بانگ" بەکار بهێنرێت و ئەو بەرژەوەندییە ناوبراوەش بهێنێتەدی، هێشتا هەر جێی "بانگ" ناگرێتەوە کە هۆکاری ڕاگەیاندنی "تەوحید"ە و، "تەوحید"یش ئەنجامی هەرە مەزنی بەدیهێنانی جیهان و گرۆی مرۆڤە و هۆی دەرخستنی بەندایەتیی ئادەمیزادە لە بەرامبەر پەروەردگارێتیی خواوەندەوە، بەناوی خەڵکی ئەو شارەوە، هەروەك بە ناوی سەرجەمی گرۆی مرۆڤیشەوە بە گشتی.

**پوختەی قسە:**

دۆزەخ زیاد لە پێویست دروست نەکراوە، چونکە زۆر شت هەن کە بە هەموو هێزێکیانەوە هاوار دەکەن: بژی دۆزەخ! هەروەك بەهەشتیش بە مفتە و خۆڕایی دەستی کەس ناکەوێت، بەڵکو داوای نرخێکی گران دەکات!

**﴿لا يَسْتَوِي أَصْحَابُ النَّارِ وَأَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾**(الحشر: ٢٠).

* * *

## بەشی دووهەم
### کە پەیامی دووهەمە

## پەیامی ڕەمەزان

**لە کۆتایی بەشی یەکەمدا پوختەیەك سەبارەت بە شەعائیرە ئیسلامی‌یەکانەوە نووسرا. لەبەر ئەوە، لەم بەشەی دووهەمدا چەند حیکمەتێك باس دەکرێن کە تایبەتن بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە، کە درەخشانترین و مەزنترینی شەعائیرەکانە.**
**(ئەم باسە بریتی‌یە لە "نۆ" سەرنج و مەسەلەی ورد و ناسك کە "نۆ" دانە لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەردەخات)**

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذي أُنْزِلَ فيهِ القُرْآنُ هُدىً لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالفُرْقَانِ﴾(البقرة:١٨٥)

◆ **سەرنجی یەکەم**

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام و، بە یەکێك لە گرنگترین پەرستشەکانی ئایینی ئیسلام دادەنرێت.

زۆربەی ئەو حیکمەتانەی کە بەروبوومی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانن، ڕوو دەکەنە: دەرخستنی پەروەردگارێتیی خوای گەورە و، ژیانی خۆیی و کۆمەڵایەتیی مرۆڤ و، پەروەردەکردن و پاکژکردنەوەی دەروون و، شوکرانەی بەخشایشە خوایی‌یەکان.

لێرەدا، لە نێوان ئەو حیکمەتە زۆرانەی کە لە ڕۆژوودا هەن و، پەروەردگارێتیی خوای گەورەیان تێدا دەردەکەوێت، تەنها یەك حیکمەت باس دەکەین. ئەویش ئەوەیە کە:

خوای گەورەی باڵادەست سەرزەویی کردووە بە سفرە و خوانێکی پڕ لە نیعمەتی لە ژمارەبەدەر، بە جۆرێکی وەهایش ئامادەی کردووە کە مرۆڤ پێی نازانێت و بیری بەلای‌دا ناچێت. جا خوای گەورەش دەیەوێت بەم شێوەیە کەماڵی پەروەردگارێتی و میهرەبانیی خۆی دەربڕێت. کەچی ئەو حەقیقەتە جوانەی کە شێوەی سفرە و خوانەکە زمانی حاڵیەتی، مرۆڤ لە ژێر پەردەی بێ‌ئاگایی و هۆکارەکاندا نایبینێت و لەوانەیە لە بیریشی بچێتەوە.

بەڵام لە ڕەمەزانی پیرۆزدا ئیمانداران یەکسەر وەك سوپایەکی ڕێکوپێکیان لێ دێت و کاڵای بەندایەتی دەپۆشن و، پێش بەربانگ هەموو ئامادەی ئەنجامدانی ئەو فەرمانەی خوای گەورەی خاوەن توانای ئەزەلی دەبن. کە خولکیان دەکات بۆ سەر ئەو سفرە و خوانە پڕ لە کەرەمەی خۆی و پێیان دەفەرموێ: "فەرموون"!

ئیتر ئیماندارانیش، بەم حاڵەیان، لە بەرامبەر ئەم بەزەیی و میهرەبانی‌یە گەورە و گشتی‌یەی خوای گەورەوە، بەندایەتیی فراوانی گەورە و ڕێکوپێك دەردەبڕن.

جا ئایا ئەو کەسانەی کە لەم پەرستشە بڵند و ڕێزلێنانە بەرزەدا بەشداری‌یان نەکردووە، شایانی ئەوەن ناوی مرۆڤیان لێ بنرێت؟

◆ **سەرنجی دووهەم**

چەندین حیکمەتی زۆر لە ڕۆژووی ڕەمەزانی پیرۆزدا هەن، کە مرۆڤ ئاراستەی شوکرانەبژێریی نیعمەتەکانی خواوەند دەکەن.

ئەمەش بەم نموونەیەی خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

بێ‌گومان ئەو خۆراکەی کە خزمەتکارێك لە چێشتخانەی پادشاوە دەیهێنێت، نرخی خۆی هەیە (وەك لەوتەی یەکەمدا باس کراوە). کەواتە بە کەم ڕوانین و بێ‌نرخ زانینی ئەو خۆراکە بەنرخانە نیشانەی گێلی‌یە و، نەناسینی بەخشندەی ڕاستەقینەشیان لە بێ عەقڵی‌یەوەیە، لە کاتێکدا کە خزمەتکارەکە پاداشت بدرێتەوە و خەڵات بکرێ!

هەر بەم جۆرە، ئەو نیعمەتە لەژمارەبەدەرانەی کە خوای گەورە لەسەر زەوی‌دا بڵاوی کردوونەتەوە، بێ‌گومان داوای نرخەکانیمان لێ دەکات، کە ئەویش بریتی‌یە لە شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتانە. هۆکارە ڕواڵەتی‌یەکان لە ڕاستی‌دا بارکێشی ئەو نیعمەتانەن، هەروەها خاوەنە ڕواڵەتی‌یەکانیشیان وەك خزمەتکاروان بۆ پێشکەش

کردنی ئەو نیعمەتانەی خواوەند. جا ئێمە وەك بەهای پێویست بەو خزمەتکارانە دەدەین، منەتبار و چاولەبەریشیان دەبین، بەڵکو زیاتر لە ئەندازەی خۆیان ڕێز و سوپاسگوزاری لە ڕوویاندا دەنوێنین.

بەڵام خۆ بەخشندەی ڕاستەقینەی ئەو نیعمەتانە، کە بەو جۆرە بەخشیونی و بڵاوی کردوونەتەوە، گەلێ شایانترە کە ئەوپەڕی سوپاسگوزاری و ستایشی بکەین و لە ڕادەبەدەر ڕەزامەند و منەتباری ببین کە هەر خۆی - بە زیادەوە - شایستەی هەموو ئەمانەیە.

جا پێشکەش کردنی سوپاس بۆ ئەو خواوەندە و، دەربڕینی ڕەزامەندی لە ئاستی ئەو نیعمەتەدا بەوە دەبێ کە بزانین ڕاستەوخۆ لە لایەن خواوەند خۆیەوە هاتوون و، نرخیان بزانین و، ڕاستەوخۆ هەست بەوە بکەین کە پێویستمان پێیانە.

کەواتە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز کلیلی شوکرانەبژێریی ڕاستەقینە و خاوێنە و، شوکر و سوپاسێکی گەورە و گشتییە بۆ خواوەند، چونکە زۆربەی خەڵك لە کاتەکانی تردا ئاوا بە ناچاری نرخی زۆربەی نیعمەتەکان نازانن، چونکە بە ئازار و سوێی برسێتی گرفتار نابن. بۆ نموونە: ئەوانەی کە زۆر تێرن، بە تایبەتی دەوڵەمەندان، ڕادە و پلەی ئەو نیعمەتە نازانن کە لە خواردنی لەتە نانێکی وشکدا هەیە، بەڵام باوەڕداری ڕۆژووانەتی لە دەمی بەربانگدا هەست دەکات کە ئەو لەتە نانە وشکە نیعمەتێکی بەنرخی خوایە و، بە هەستی "چەشتن" شایەتی لەسەر ئەمە دەدات.

کەواتە ئەوانەی لە ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو دەبن هەر لە پادشاوە تا دەگاتە بێنەواترین هەژار، بە بۆنەی هەست کردنیان بە نرخ و بایەخی ئەو نیعمەتە گەورانە، شوکرانەیەکی مەعنەویی گەورەیان دەستگیر دەبێت و پێشکەشی خواوەندی خۆیانی دەکەن.

خۆڕاگرتنی مرۆڤ بە ڕۆژگاری مانگی ڕەمەزان لە خواردنی ئەو خۆراکانە، وا لەو مرۆڤە دەکات کە بە نیعمەتیان بزانێت و لە جێگای شیاوی خۆیاندا دایانبنێت. چونکە ئەو مرۆڤە لەگەڵ خۆیدا دەدوێت و بە خۆی دەڵێت: (ئەم نیعمەتانە موڵکی من نین و من خاوەنیان نیم، چونکە لە خواردنیاندا سەربەست نیم، کەواتە موڵکی یەکێکی ترن، کە هەر لە سەرەتاوە نیعمەتی ئەو بوون و هەر ئەویش پێی بەخشیوم، وا ئێستاش چاوەڕوانی فەرمانی ئەو دەکەم بۆ خواردنیان).

بەم جۆرە، شوکرانەبژێرییەکی مەعنەویی ئەو نیعمەتانە پێشکەشی خوای خۆی دەکات.

ئیتر بەم چەشنە، ڕۆژوو لە هەموو لایەکەوە دەبێت بە کلیلی دەرگای شوکرانەبژێری، کە ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانی مرۆڤە.

◆ سەرنجی سێهەم

یەکێك لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژوو کە ڕوو لە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دەکات ئەوەیە کە: ئەم خەڵکە لە باری گوزەرانەوە جیاجیا دروست کراون..

لەبەر ئەوە، خوای گەورە داوا لە دەوڵەمەندان دەکات کە دەستی یارمەتی بۆ برا هەژارەکانیان درێژ بکەن. گومان لەوەشدا نییە کە دەوڵەمەندان بە تەواوی هەست بەو حاڵی هەژارییەی هەژاران ناکەن، کە مایەی بزواندنی بەزەیی مرۆڤە و، ناتوانن پەی بە ڕادەی برسێتیی هەژاران ببەن وەك ئەوەی هەژاران خۆیان هەستی پێ دەکەن، مەگەر بەهۆی ئەو برسێتییەی کە لە ڕۆژوودا ئەوانیش تامی دەچێژن و بەخۆیانەوە دەیبینن!

جا ئەگەر ڕۆژوو نەبوایە، زۆر کەس لەو دەوڵەمەندانەی کە شوێنی ئارەزووەکانیان دەکەون، نەیاندەتوانی ئەندازەی ئازاری ئەو برسێتی و نەبوونییەی هەژاران و ڕادەی پێویستییان بۆ بەزەیی و میهرەبانی، تێبگەن.

لەبەر ئەوە، بەزەییهاتنەوەی مرۆڤ بە هاوڕەگەزی خۆیدا (کە خواوەند ئەم بەزەییەی لە ناخی مرۆڤدا جێگیر کردووە) دەبێت بە یەکێك لەو بنچینانەی کە هاندەری سوپاسگوزاریی ڕاستەقینەن. چونکە هەموو کەسێك (هەر کەسێك بێت) هەردەم دەتوانێت لە خۆی هەژارتر بدۆزێتەوە، کە لە لایەن خوای گەورەوە لێپرسراوە بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوە و دەستگرۆیی کردنی..

جا ئەگەر "نەفس" بۆ چەشتنی تاڵاوی برسێتی ناچار نەکرایە، کەس چاکەی لەگەڵ کەسی تردا نەدەکرد، کە ئەمەش بەزەیی بەیەکداهاتنەوەی نێوان مرۆڤ داخوازیەتی. خۆ ئەگەر ئەم کارەشی ئەنجام بدایە، نەیدەتوانی بە جۆرێکی کامڵ و شایستە ئەنجامی بدا، چونکە لە دڵ و دەروونی خۆیدا بە هەستێکی ڕاستەقینە هەست بەو بەزەییە ناکات.

◆ سەرنجی چوارەم

سەبارەت بە پەروەردەکردنی نەفسی مرۆڤیشەوە، چەند حیکمەتێك لە ڕۆژوودا هەیە.

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە سروشتی "نەفس"ی مرۆڤ بە جۆرێکی وایە حەز دەکات لە هەموو خۆبەستنەوەیەك دەرباز ببێت و هەمیشە خۆی بە سەربەستی ببینێتەوە، بە ڕادەیەك کە داوای پەروەردگارێتییەکی وەهمی بۆ خۆی دەکات، تا بە ئارەزووی خۆی بجووڵێتەوە..

"نەفس" هەرگیز نایەوێت بیر بکاتەوە لەوەی کە بە نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانی خوای گەورە گەشە دەکات و پەروەردە دەکرێت. بە تایبەت ئەگەر لە دنیادا خاوەنی سەروەت و دەستەڵات بێت و غەفڵەتیش پشتی گرتبێت. لەبەر ئەوە، وەك ئاژەڵ - بێ پرس - تەپ دەداتە سەر نیعمەتەکانی خوا و دەکەوێتە هەڵلووشینیان.

بەڵام لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا "نەفس"ی هەموو کەسێك، هەر لە زەنگینترین دەوڵەمەندەوە تا نەدارترین هەژار، دەکەوێتە ناسینی خۆی و تێدەگات کە خۆی خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نییە و، مۆڵەت نەدراوە بە ئارەزووی خۆی ڕەفتار بکات، بەڵکو موڵکێکە و خاوەنێکی هەیە و بەندەیەکی فەرمانبەردارە و بە بێ ڕوخسەت و فەرمانی خاوەنەکەی ناتوانێت دەست لە بچووکترین کار وەربدات، تەنانەت دەست بۆ قومێك ئاویش ڕابکێشێت!

بەم جۆرە، لەخۆبایی‌بوون و پەروەردگاریتی‌یە وەهمی‌یەکەی "نەفس" دەشکێت و، کاڵای بەندایەتی کردنی بۆ خوای گەورە دەپۆشێت و، ئەرکی سەرەکیی سەرشانی خۆی، کە شوکرانەبژێری‌یە، ڕادەپەڕێنێت.

◆ **سەرنجی پێنجەم**

سەبارەت بە ڕێککردن و پوختەکردنی ڕەفتارەکانی دەروونی یاخی و هاندەری خراپکاری(النفس الأمارە بالسوء) و نەرمکردن و هاندانی بۆ وازهێنان لە هەڵسوکەوتە چەواشەکانی، ڕۆژووی ڕەمەزان حیکمەتی زۆری تێدایە. لێرەدا تەنها یەك دانەیان باس دەکەین:

"نەفس"ی مرۆڤ - بە هۆی بێ‌ئاگایی‌یەوە - خۆی لەبیر دەچێتەوە و، ئەو کۆڵەواری‌یە بێ سنوور و.. هەژاری‌یە لەڕادەبەدەر و، کەمتەرخەمی‌یە زۆرەی لە ماهییەتیدان، نە دەیانبینێت، نە حەزیش دەکات بیانبینێت! لەبەر ئەوە، لە: لاوازیی خۆی و، بەرەو نەمان چوونی و، ئەندازەی ئەو کارەساتانەی لە مەڵاسدان بۆی، بیر ناکاتەوە. ئەوەشی لە یاد دەچێت کە جەستەی لە گۆشت و ئێسکێکی ئەوتۆ پێکهاتووە کە بە خێرایی دەپتورکێ و دادەڕزێت.. بۆیە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بە جۆرێکە وەك پێی وابێت لە پۆڵا داڕێژراوە و مردن و فەوتانی بەسەردا نایەت! دەبینیت هەڵمەت بۆ دنیا دەبات و بە کۆڵێ ڕژدی و تەماعکاری‌یەوە خۆی دەهاوێتە باوەشیەوە و، پەیوەندی‌یەکی بەتینی لەگەڵدا دەبەستێ و بە توندی چنگی لە هەموو شتێکی بەلەزەت و سوودبەخش گیر دەکات!

"نەفس" لەم ڕێیەوە ئەو بەدیهێنەرەی لەبیر دەچێتەوە كە بەوپەڕی میهرەبانی پێی دەگەیەنێت و پەروەردەی دەكات. ئنجا لەمەوە بەرەو هەڵدێری بەدڕەفتاری دەخزێ و، دواڕۆژی ئەمدنیا و پاشەڕۆژی ئەودنیاشی لە یاد دەچێت.

بەڵام ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان وا لە بێ ئاگاترین و سەرسەختترین كەسی یاخی دەكات كە هەست بە لاوازی و كۆڵەواری و هەژاریی خۆیان بكەن. چونكە هەركام لەوانە، بەهۆی برسێتییەوە دەكەوێتە بیركردنەوە لە خۆی و گەدەی بەتاڵی و، تێدەگات گەدەی پێویستی بە چییە! ئیتر خۆی بە باشی دەناسێت و ئەندازەی لاوازی و ڕادەی پێویستیی بۆ سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە، بیر دەكەوێتەوە و.. لە ناخی دڵەوە – بە مەرجێ بێئاگایی چاوی دڵی كوێر نەكردبێت – هەست بە تاسە و ئارەزوومەندییەكی ئەوتۆ دەكات كە بە هەژاری و لارەملی لە دەرگانەی لێبوردن و میهرەبانیی خوای گەورە بدات و، دەست لە فیرعەونایەتیی نەفس هەڵبگرێت.

بەمەش ئامادەی ئەوە دەبێت كە بە دەستی سوپاسگوزاریی مەعنەوی لە دەرگانەی بەزەیی و میهرەبانیی خوا بدات.

◆ **سەرنجی شەشەم**

لە نێوان ئەو حیكمەتە زۆرانەی كە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا هەن، سەبارەت بەوەی كە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتووەتە خوارەوە و، ڕەمەزان گرنگترین كاتی نازڵ بوونیەتی، تەنها یەك حیكمەت باس دەكەین:

لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز لە مانگی ڕەمەزاندا نازڵ بووە، دەبێ واز لە داخوازییە نزمەكانی "نەفس" بهێنرێت و، كردارە بێكەڵك و نابەجێكانی پشت گوێ بخرێن، تاكو خۆمان بۆ پێشوازی لێكردنی ئەو فەرمایشتە ئاسمانییە – كە قورئانی پیرۆزە – ئامادە بكەین. ئەمەش بەوە دەبێ كە نازڵ بوونی قورئان لەم مانگەدا بخەینەوە یادمان و، بە وازهێنان لە خواردن و خواردنەوە چەند حاڵەتێكی ڕۆحانی و مەلائیكەت ئاسا بۆ خۆمان بڕەخسێنین و، قورئانی پیرۆز بە جۆرێ بخوێنین كە وا هەست بكەین هەر ئێستا بە گەرموگوڕی و پاراوی ئایەتەكان نازڵ بووبن. هەر بەم هەست و نەستە و بەوپەڕی ملكەچییەوە گوێی بۆ شل بكەین تاكو پلەیەكی ئیمانیی باڵا و حاڵەتێكی ڕۆحانی و بەرزمان دەستگیر ببێ، بە جۆرێك ئەوخوێنەرە وا بزانێت كە ڕاستەوخۆ لە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵكو لە حەزرەتی جوبریلەوە – دروودی لەسەر بێت – بەڵكو لە خوای گەورەی ئەزەلییەوە، دەیبیستێ.. پاشان لە پێناوی ڕوونكردنەوەی یەكێك لە

حیکمەتەکانی نازڵ بوونی ئەم قورئانەدا، ئەرکی فێرکردن و خوێندنەوە و ڕاگەیاندنی بە کەسانی تر، ئەنجام بدەین.

بەڵێ، لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا جیهانی ئیسلام وەکو مزگەوتێکی لێ دێت، بەڵام چ مزگەوت؟.. مزگەوتێك کە هەموو گۆشە و سووچێکی بە ملیۆنەهای لەبەرکەرانی قورئان پڕ بووە و، ئەو فەرمایشتە ئاسمانییە بە گوێی زەوی نشیناندا دەدەن و، بە شێوەیەکی جوان و ڕوونیش ناوەرۆکی ئایەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ القُـرْآن﴾ لە پێش چاودا دەردەخەن. بەمەش دەیچەسپێنن کە لە ڕاستیدا مانگی ڕەمەزان مانگی قورئانە.. تاك تاکانی کەسانی تری ئەو کۆمەڵە مەزنەش هەندێکیان بەوپەڕی سام و شکۆ و ملکەچییەوە گوێ لەمان ڕادەگرن و، هەندێکی تریشیان بۆ خۆیانی دەخوێنن!

جا ئیتر چی لەوە ناشیرینتر و شوورەییترە بۆ کەسێك کە خۆی لەم مزگەوتە پیرۆزە بە سام و شکۆیە دادەبڕێت و بە پێی فەرمانی نەفسی یاخی و بەدڕەفتاری - لەم مانگەدا - بە شوێن خواردن و خواردنەوەدا لە هەڵپە و لسکەدایە؟ دەبێ ئەو کەسە تا چ ڕادەیەك مایەی بێز لێهاتنەوەی مەعنەویی کۆمەڵی ئەو مزگەوتە گەورەیە بێت؟!

حاڵی هەموو ئەو کەسانەی کە لە مانگی ڕەمەزاندا بە پێچەوانەی ڕۆژوو گرانەوە ڕەفتار دەنوێنن، بەو چەشنەیە.. ئەوانە - بە هەمان پلە - مایەی ڕسوایی و بێز لێکردنەوەی مەعنەوین لە لایەن سەرانسەری جیهانی ئیسلامییەوە!

◆ **سەرنجی حەوتەم**

مرۆڤ بۆ ئەوە هاتووەتە دنیا تاکو خەریکی کشتوکاڵ و بازرگانییەك بێت کە لەودنیادا دروێنەی بەروبوومەکانی بکات و قازانجەکانی وەربگرێت.

مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیش سەبارەت بە دەستکەوتەکانی مرۆڤ لەم ڕووەوە، چەندین حیکمەتی زۆری تێدایە، لێرەدا تەنها یەکێکیان باس دەکەین:

"پاداشتی کردەوەکان لە ڕەمەزاندا یەك بۆ هەزار زیاد دەکرێن".

ئاشکرایە کە هەر پیت(حرف)ێکی قورئانی پیرۆز (دە) پاداشتی هەیە کە بە (دە) چاکە بۆ مرۆڤ دەژمێررێت و (دە) بەروبوومی بەهەشت دەست خوێنەرەکەی دەخات، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە.

بەڵام لـە ڕەمـەزاندا لـە بریـی ئـەو (دە) دانـە بەروبوومـە (هـەزار) بـەروبوومی دواڕۆژ دەگرێ و بە خوێنەرانی قورئانیـان دەبەخشـێت و، هـەر پیتێکـی چـەند ئایـەتێکی تایبـەتیی وەك: "آية الكرسي" دەرگا لە بەردەم هەزاران پاداشت و چاکـەدا دەکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی لەودنیا لە شێوەی بەروبوومدا پێشکەش بە خوێنەرەکەی بکرێن. ئەم پاداشـتە لـە ڕۆژانـی جومعەی ڕەمەزاندا لەزیادبووندا دەبن و، لە شەوی "قەدر"یشدا دەگەنە سی هەزار.

بـەڵێ، هـەر پیتێکـی قورئـانی پـیرۆز مایـەی دەسـتکەوتنی سـی هـەزار بـەروبوومی هەمیشەیی‌یە، بۆ ئەوەی ببێت بە درەختێکی نوورانیی وەك درەختی تووبای بەهەشـت، بـە جۆرێـك کـە بـاوەڕداران ئـەم مانگـە پیرۆزە بـە هـەل بزانـن و، ئـەو بەروبوومـە نـەبڕاوە و هەمیشـەیی‌یانەیان – کـە ژمارەیـان بـە ملیۆنەهایـە – دەسـتگیر ببێـت. فـەرموو بـۆ خـۆت سەرنج لەم بازرگانی‌یە بەسوودە بدە و، بیر لەوانە بکەرەوە کـە ڕێـزی شایسـتەی ئـەم پیتـە پیرۆزانە ناگرن و، بزانە چ زەرەر و زیانێکی گەورەیان لـێ کەوتووە؟!

بەم جۆرە دەرکەوت کە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز زیاتر وەك: پیشانگایەکی دڵڕفێن وایە بۆ بازرگـانیی قیامـەت.. یـاخود بازاڕێکـە لەوپـەڕی جموجـووڵ و قازانجدایـە بـۆ ئـەو بازرگانی‌یـە.. زەوی‌یـەکی بەپیتی بـەراوە بۆ بەرهەمـهێنانی خـەرمانی قیامـەت.. بـارانی نیسانە و گەشە بەو کشتوکاڵە دەسێنێت و فەڕی تێ‌دەخات.. جـەژنێکی پڕ لـە شـادی و پیرۆزە بۆ پیشاندانی بەرنامەکانی بەندایەتیی مـرۆڤ لـە بـەردەم مـەزنیی پـەروەردگاری و عیززەتی خوایەتیی خوای گەورەدا..

لەبـەر هـەموو ئەمانـە، مرۆڤ ئـەرکی ڕۆژووگرتنـی خراوەتـە ئەستۆ، بۆ ئـەوەی لـەو کاتانەدا توخنی پێداویستی‌یە ئاژەڵی‌یەکانی دەروونـی نەکـەوێت، ئـەو دەروونـەی کـە لـە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بێ ئاگایە. وەك بڵێی مرۆڤ بـەم ڕۆژووگرتنـەی بووبێـت بـە ئاوێنەیـەك بـۆ ڕەنگدانـەوەی سـیفەتی "صەمەدییـەت"ی خواوەنـد. ئـەوەتا پشـتی لـــە پێداویستی‌یە ئاژەڵی‌یـەکان هـەڵکردووە و لـەناو دۆخێکـی مەلائیکـەت ئاسـادایە. یـاخود بـووە بـە کەسـێکی قیامـەتخواز و ڕۆحێکـی بەرجەسـتەی ئاشـکرا، ئەمـەش بـەهۆی وازهێنانێکی کاتی لـە پێویستی‌یە دنیایی‌یـەکانی و بەشـداری کردنـی لـە بازرگانی‌یـەکی قیامەتی‌دا.

بەڵێ، ڕەمەزانی پیرۆز لەم دنیا فانی و تەمەنە کورت و ژیانە کەم خایەنەدا، بۆ ڕۆژوانەتی دەبێت بە مایەی دەستخستن و دابین کردنی تەمەنێکی بەردەوام و ژیانێکی هەمیشەیی.

کەواتە، یەك مانگی ڕەمەزان، دەتوانێت بەروبوومی تەمەنێکی هەشتا ساڵی بە مرۆڤی ڕۆژوانەتی ببەخشێت. خۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لەبارەی "لیلـــــة القـدر"ەوە ڕایگەیاندووە و فەرموویەتی: "ئەم شەوە لە هەزار مانگ بە فەڕ و خێرترە" بە هێزترین بەڵگەی ئەم ڕازەیە!

وەك چۆن پادشا لە سەرانسەری ماوەی فەرمانڕەوایەتیی خۆیدا، یان هەموو ساڵێکی ئەو سەردەمە، چ بە ناوی چوونە سەر تەختەوە، یان بە هەر بۆنە و یادێکی تر، چەند ڕۆژێك وەك بۆنە و جەژن بۆ دانیشتووانی وڵاتەکەی دەستنیشان دەکات و، لەو ڕۆژانەدا پادشا بە پێی یاسا عادەتییەکانی لەگەڵ ڕەعیەتە دڵسۆزەکانیدا ڕەفتار ناکات، بەڵکو بە خەڵات و بەراتی تایبەتی بەهرەمەندیان دەکات و، ڕاستەوخۆ لە کۆشك و بارەگای خۆیدا میوانداریيان بۆ دەسازێنێت و سایەی کەرەم و بەخشایشیان لەسەر ڕادەگرێت و، بە چاوی ڕێزەوە بۆیان دەڕوانێت ..

خواوەندی بەدەستەڵاتی هەمیشەییش بە هەمان جۆر لەگەڵ بەندەکانیدا مامەڵە دەکات، ئەو خوایەی کە خاوەنی بەخشایش و مەزنییە و، پادشای ئەزەل و ئەبەدە و، سوڵتانی شکۆمەندی هەژدە هەزار جیهانە..

ئەوەتا ئەو خواوەندە گەورەیە فەرمانە پڕ لە دانستە بەرزەکانی و قورئانە پیرۆزەکەی خۆی - کە ڕووی لە هەزاران جیهانە - لەم مانگە پیرۆزەدا نازڵ کردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە جێی خۆیەتی و خواستێکی "دانست"ی خواوەندە کە مانگی ڕەمەزان وەك جەژن و بۆنەیەکی شادمان و تایبەتیی خوایی و، پیشانگایەکی دڵڕفێنی پەروەردگار و، کۆڕێکی ڕۆحانیی بەسام و شکۆ دانراوە.

جا لەبەر ئەوەی مانگی ڕەمەزان لە دیمەنی ئەو بۆنە و جەژنە پڕ لە شادی و خۆشییانەدا خۆی دەنوێنێت و، بۆ ئەوەی خەڵکی - تا ڕادەیەك - لە سەرقاڵییە نزم و ئاژەڵییەکان دوور بن و بەسەریاندا بەرز ببنەوە، لەبەر هەموو ئەمانە، پێویستە فەرمانی ڕۆژوو گرتنی تێدا دەربکرێت. کامڵ بوونی ئەو ڕۆژوەش بەوە دەبێت کە هەموو

هەستەکانی مرۆڤ (چەشنی: چاو و گوێ و دڵ و بیر و ئەندێشە) وەکو "گەدە" هەریەکەیان لە ڕۆژووی تایبەتیی خۆیاندا بن. واتە ئەو هەستانە لە شتی حەرام و لاوەکی بپارێزرێن و، هەریەکەیان بەرەو بەندایەتیی تایبەتیی خۆیان ئاراستە بکرێن.

بۆ نموونە:

مرۆڤ "زمان"ی بۆ ڕۆژووگرتن لە درۆ و غەیبەت و قسەی نابەجێ ڕابهێنێت و، بە خوێندنی قورئان و یادی خوا و تەسبیحات کردن و سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و هەموو جۆرەکانی تری زیکر، زمانی پاراو بکات..

"چاو"یشی لە شتی حەرام بپارێزێت و بە چاوی پەند وەرگرتن بۆ هەموو شتێك بڕوانێت و..

"گوێ" لە وتەی ناشیرین ڕانەگرێت و قورئانی پیرۆز و "حەق"ی پێ ببیستێ..

هەر بەم جۆرە، گشت هەستەکانی تریشی لەسەر جۆرە ڕۆژووگرتنێکی تایبەتی ڕابگرێت.

ئاشکرایە ئەو "گەدە"یەی کە وەك کارگەیەکی مەزن وایە گەر بە ڕۆژووگرتن لەکار بخرێت، ئەوا لەکارخستنی کارگە بچووکەکانی تر زۆر ئاسان دەبێت!

◆ **سەرنجی هەشتەم**

یەکێك لەو حیکمەتە زۆرانەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، کە پەیوەندییان بە ژیانی خۆیی مرۆڤەوە هەیە، بە کورتی بەم جۆرەی خوارەوەیە:

گرنگترین و کاریگەرترینی جۆرەکانی چارەسەرکردن لە "پارێز"دایە، چ پارێزی ماددی چ مەعنەوی.

ئەوەتا پارێز لە زانستیی پزیشکیدا چەسپاوە، چونکە هەرکات نەفسی مرۆڤ لە خواردن و خواردنەوەدا ئەوپەڕی سەربەستیی پێ بدرێت، ئەوا لە ژیانی کەسییدا دووچاری گەلێ زیانی ماددی دەبێت..

بەربەرەڵایی بۆ ژیانی مەعنەویش هەر بە هەمان جۆرە، چونکە گەر "نەفس" بێ بیرکردنەوە لە حەڵاڵ و حەرام هەرچییەکی بێتە ڕێ هەڵیبلووشێت، ئەوا ژیانی مەعنەویی تێکدەچێت و ژاراوی دەبێت، هەتا وای لێ دێت "نەفس"ی ئەو مرۆڤە گوێڕایەڵی "دڵ" و "ڕۆح" نابێت و ملیان بۆ کەچ ناکات، ئیتر ئەو "نەفس"ە بۆ خۆی

جڵەوی خۆی بەدەستەوە دەگرێت و بەوپەڕی سەرکەشی لە ژیاندا ڕەفتار دەکات و، مرۆڤ بەرەو ئارەزووە بەدەکانی خۆی ڕادەپێچێت، بێ ئەوەی دەستەڵاتی خودی مرۆڤەکەی بەسەرەوە بمێنێت.

بەڵام لە ڕەمەزانی پیرۆزدا "نەفس" بەهۆی ڕۆژووەوە لەسەر جۆرە پارێزێك ڕادێت و، لە پێناوی پاکبوونەوە و گەشەکردنیدا بە لێبڕانەوە تێدەکۆشێت و فێری گوێڕایەڵیی فەرمانەکان دەبێت. ئیتر تووشی ئەو نەخۆشییانە نابێت کە لە پڕبوونی گەدە و، خۆراك بەسەر خۆراکدا پەیدا دەبن و، توانای فەرمانبەرداری و ملکەچی بۆ فەرمانەکانی شەرع بەدەست دەهێنێت. ئنجا لەبەر ئەوەی کە بە بۆنەی ڕۆژووەوە خۆی لە خواردنی حەڵاڵ پاراستووە، ئەوا لە حەرامیش خۆی دەپارێزێت و لێ دەبڕێت تاکو ژیانی مەعنەویی خۆی نەشێوێنێت و ڕوونی‌یەکەی نەشڵەقێنێت و لێڵی نەکات.

پاشان زۆربەی کەسانی گرۆی مرۆڤ گەلێ جار گرفتاری برسێتی دەبن، کەواتە پێویستیان بە خۆڕاهێنان هەیە بە برسێتی‌یەك کە مرۆڤ لەسەر ئارامگرتن ڕابهێنێت.

جا ڕۆژووی ڕەمەزان بریتی‌یە لە ڕاهاتن و خۆڕاگرتن لەسەر برسێتی‌یەك پازدە سەعات دەخایەنێت، یاخود بیست و چوار سەعات بۆ ئەوانەی فریای پارشێو نەکەوتوون.

کەواتە ڕۆژوو چارەسەرێکی کاریگەرە بۆ سەراسیمەیی و بێ ئۆقرەیی مرۆڤ، کە هۆی پترکردنی بەڵا و گرفتاری‌یەکانی مرۆڤن.

"گەدە"ش وەك کارگەیەك وایە کە چەندین کرێکاری کارگوزاری هەیە و، لە مرۆڤیشدا گەلێ ئامێر هەن کە لەگەڵ گەدەدا پەیوەندی‌یان هەیە. جا ئەگەر "نەفس" بە شێوەیەکی کاتی و بۆ ماوەی مانگێك پەکی سەرقاڵی‌یەکانی خۆی نەخات و وازیان لێ نەهێنێت، ئەوا هەموو ئەو کارگوزار و کرێکارانە بە ئیشی خۆیەوە سەرقاڵ دەکات و، پەرستشە تایبەتی‌یەکانی خۆیانیان لەبیر دەباتەوە و، دەیانخاتە ژێر فەرمان و دەستەڵاتی خۆیەوە. ئیتر بەم پێیە سەر لەو ئامێر و هەستانە دەشێوێنێت و بە گرم و هۆڕی جەڕوپێچەکانی ئەو کارگەیە و چەرە دووکەڵەکەی، حەوانەوە و ئاسوودەیی‌یان لە لا هەڵدەگرێت و سەرنجی هەموویان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و فەرمانبەری‌یە بەرزەکانیان - بە جۆرێکی - کاتی لەبیر دەباتەوە.

هەر لەبەر ئەم ئەنجامەش بووە کە زۆر کەس لە ئەولیا و پیاوچاکان خۆیان لەسەر خواردن و خواردنەوەی کەم ڕادەهێنا، تاکو بە پلەکانی "کاملی"دا سەربکەون و بەرز بنەوە.

بەڵام بە هاتنی مانگی ڕەمەزان، ئەو کرێکارانە هەست دەکەن کە تەنها لە پێناوی ئەو کارگەیەدا دروست نەکراون، بەڵکو ئەو ئامێر و هەستانەی مرۆڤ، چەند چێژ و لەزەتێکی بەرزی ڕۆحانی و مەلائیکەت ئاسایان لەم مانگەدا دەست دەکەوێت و، لەبریی ئەو ڕابواردنە بێتام و نزمانە، ڕوو لەو چێژ و لەزەتە ڕۆحانییە بەرزانە دەکەن.

هەر لەبەر ئەوەشە کە دەبینیت ئیمانداران لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا جۆرەهای جۆری نوور و بەرەکەت و دڵخۆشیی مەعنەوییان - هەر کەس بە پێی پلەی خۆی - دەستگیر دەبێت و، هەر لەم مانگە پیرۆزەدا "دڵ" و "عەقڵ" و "ڕاز" و لایەنە ناسك و نیانەکانی تری هاوچەشنیان، چەندین پلە بەرز دەبنەوە و پیت و بەرەکەتیان دەست دەکەوێت، جا هەرچەندە "گەدە" لە شین و گریان و هەنسك هەڵکێشاندا بێت، ئەمان بە بێ گەردی و میهرەبانییەوە پێی پێدەکەنن!

◆ سەرنجی نۆهەم

چەند حیکمەتێك لە ڕۆژووی ڕەمەزاندا هەن، سەبارەت بەوەی کە پەروەردگارێتییە وەهمییەکەی "نەفس" ڕاستەوخۆ دەشکێنێت و، بەندایەتییەکەی بۆ خوا پێ دەناسێنێت و، وای لێ دەکات زەبوونیی خۆی لە بەردەم پەروەردگارێتیی خوادا دەربڕێت، وا ئێمەش یەکێك لەو حیکمەتانە باس دەکەین:

"نەفس" نایەوێت خوای خۆی بناسێت، بەڵکو دەیەوێت لە شێوەی فیرعەونایەتییەکی سەرکەشانەدا لافی پەروەردگارێتی لێ بدات. ئنجا لەسەر ئەم لاف لێدانەشی تا ئەشکەنجە و ئازار بدرێت، سوودێکی ئەوتۆی نابێت و ڕەگی ئەو پەروەردگارێتییە وەهمییەی هەر تێدا دەمێنێت و، هیچ شتێك ئەو ڕەگە نابڕێت و لە لێدانی ناخات و سەری پێ دانانەوێنێت، مەگەر برسێتی!

بەم جۆرە، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان مشتەکۆڵێکی ڕاستەوخۆی جەرگبڕ دەهاوێتە سەر لایەنە فیرعەونییەکەی نەفس و، بە جارێ هەموو کەشوفش و لاف و گەزافێکی دەشکێنێت و، زەبوونی و لاوازی و هەژارییەکەی پێ دەردەخات و، بەندایەتییەکەی بۆ پەروەردگار پێ دەناسێنێت.

لە یەكێك لە ڕیوایەتەكانی فەرموودەیەكدا هاتووە كە:

خوای گەورە فەرمووی بە "نەفس":

(من كێم و تۆ كێیت)؟

نەفس لە وەڵامدا وتی:

(من منم و، تۆش تۆیت)!

خوای گەورەش خستیە دۆزەخەوە و ئازاری دا. پاشان هەمان پرسیاری لێ كردەوە، ئەویش هەر لە وەڵامدا وتی: (من منم و، تۆش تۆیت)! جا هەرچەندە ئەشكەنجە و ئازاری جۆراوجۆری دەدا، ئەو هەر وازی لە خۆویستی(الأنانية)ی خۆی نەهێنا. پاشان خواوەند بە برسێتی ئازاری دا (واتە بە برسێتی هێشتیەوە) ئنجا لێی پرسییەوە:

(من كێم و تۆ كێیت)؟

نەفسیش وتی:

(تۆ پەروەردگاری میهرەبانی منی و، منیش بەندەی زەبوونی تۆم)!

اللهم صلِّ على سيدنا محمد صلاة تكون لك رضاءً، ولحقــــه أداءً، بعــــدد ثـــواب حروف القرآن في شهر رمضان، وعلى آله وصحبه وسلم.

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمَّا يَصِفُون ❁ وسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِين ❁ وَالْحَمْــدُ لله رَبِّ العَالَمين﴾ (الصافات:١٨٠-١٨٢).

آمين.

**داوای لێبوردن:**

ئەم پەیامەم گەلێ بە پەلە و تەنها لە ماوەی چل دەقیقەدا داناوە! جا لەبەر ئەوەی من و نووسەری ڕەشنووسەكە هەردووكمان نەخۆش و ماندوو بووین، ئەوا دوور نییە هەندێ قسوور و ناتەواوی لە پەیامەكەدا بێت. لەبەر ئەوە، داوای لێبوردن لە برایانمان دەكەین و، ڕاستكردنەوەی هەر شتێكیشیان بە گونجاو زانی تكایە با ڕاستی بكەنەوە. (دانەر)

* * *

# بەشی سێهەم
## کە پەیامی سێهەمە

**ئەم بەشەم بۆ پرس و ڕا کردن نووسی بە برایانم لە خزمەتکردنی قورئاندا و، بۆ ئەوەی خۆیشم بێدار بکەمەوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نیازە گرنگەی لە دڵمدا بوو سەبارەت بە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز، بە نووسینێکی وا کە نەخشێکی ئەوتۆی ئیعجازی تێدا دەربکەوێت کە بە یەکێك لە دووسەد بەشی ئیعجازی قورئانی پیرۆز دادەنرێت. ئەوەبوو نیازەکەی خۆمم پێشچاو خستن تاکو ڕای ئەوانیش سەبارەت بە نووسینەوەی ئەو قورئانە پیرۆزە بزانم کە ئەو نەخشە ئیعجازییە دەردەخات، لەگەڵ پشت بەستندا بەو قورئانەی بە دەستخەتی "حافظ عثمان"[1] نووسراوەتەوە و، دەستنیشان کردنی ئایەتی "مودایەنە"ش بە یەکەی پێوانەی درێژیی لاپەڕەکانی ئەو قورئانە و، سوورەتی "ئیخلاص"یش بۆ درێژیی دێڕەکانی.**

ئەم بەشی سێهەمە بریتییە لە نۆ مەسەلە.

● **مەسەلەی یەکەم:**

لە وتەی بیست و پێنجەمدا کە ناوی "موعجیزاتی قورئانی"ی لێ نراوە، بە چەندین بەڵگەی بەهێز و گومانبڕ چەسپاوە کە جۆرەکانی ئیعجازی قورئانی پیرۆز دەگەنە چل جۆر و، هەر لەوێشدا هەندێك لەو جۆرانە بە درێژی بۆ کەسانی سەرسەخت ڕوون کراونەتەوە، بەڵام جۆرەکانی تر بە پوختی و شێوەیەکی کورت مانەوە.

هەروەها لە ئاماژەی هەژدەهەمی "مەکتووبی نۆزدەهەم"دا دەرکەوت کە: قورئانی پیرۆز ئیعجازی خۆی بە چەند ڕوویەکی جیاجیا سەبارەت بە چل چینی خەڵکییەوە دەردەخات و، هەر ئەو ئاماژەیەش بەشی (دە)دانە چینی لەو ئیعجازە چەسپاند..

(١) خۆشنووسێکی تورکە و یەکێکە لە گەورە خۆشنووسانی خەتی عەرەبی و، ناوی (عوسمانی کوڕی عەلی)یە و ناسراوە بە (حافظ عثمان). ساڵی ١٠٥٢ك لە ئەستەمبووڵ لەدایك بووە و ساڵی ١١١٠ك لە دنیا دەرچووە. خوای گەورە لە نووسینی موصحەفێکی پیرۆزدا یارمەتیی داوە کە لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا بە ناوی (موصحەفی حافظ عثمان) ناسراوە و سەدان چاپی لەبەر گیراوەتەوە. (وەرگێڕ)

بەڵام سەبارەت بە (سێ) چینەکەی تر، ئەوا قورئانی پیرۆز ئیعجازی خۆی بۆ خاوەنی هەموو مەشرەبە جیاجیاکانی ئەولیا و زانایانی زانستە جۆراوجۆرەکان دەرخستووە. بەڵگەش لەسەر ئەمە: ئیمانی تەحقیقیی هەموو یەکێکی ئەوانە لە پلەی "علم الیقین" و "عین الیقین" و "حق الیقین"دا بەوەی کە: قورئانی پیرۆز بە ڕاستی گوفتاری خوای گەورەیە. بەو واتایەی کە هەموو یەکێکی ئەوان ڕوویەکیان لە ڕووەکانی ئیعجاز دیوە.

بەڵێ، جوانیی درەوشانەوەکانی ئیعجاز بەپێی جیاوازیی مەشرەبەکان دەگۆڕێت. چونکە ئەو ئیعجازەی کە وەلییەك لە چینی "عارفان" لێی تێ دەگات جیاوازە لەو ئیعجازەی وەلییەك دەیبینێت کە نوقمی "خۆشەویستیی خوا" بووە. هەروەها ئەو ڕووە ئیعجازییەی کە یەکێك لە پێشەوایانی "ئوصوولی دین" دەیبینێت جیایە لەو ڕووە ئیعجازییەی کە زانایەك دەیبینێت لە مەسەلە فەرعییەکانی شەریعەتدا ئیجتیهاد دەکات... هتد.

جا لەبەر ئەوەی ناتوانم هەموو یەکێك لەو ڕووە ئیعجازییە جۆراوجۆرانە بە درێژی ڕوون بکەمەوە، چونکە توانای بینینی هەموویانم نییە و زەینیشم جێی هەموویانی تێدا نابێتەوە، ئەوا تەنها (دە) چینم لەو چل چینە ڕوون کردەوە و تەنها ئاماژەیەکی پوختم بۆ چینەکانی تر کرد. هەر ئەو کاتەش دوو چینیان لە "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا پێویستیان بە لێدوان و ڕوونکردنەوەی زیاتر بوو، وا ئێستا ڕوونیان دەکەینەوە:

**چینی یەکەم**: ئەوانەن کە تەنها لە ڕێی بیستنەوە پەی بە "ئیعجاز" دەبەن. چونکە مرۆڤی عەوام تەنها بە گوێ قورئان دەبیستێت و هەر تەنها لە ڕێی بیستنیشەوە لە ئیعجازی قورئان تێ دەگات. واتە لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێت:

ئەم قورئانەی کە دەیبیستم لە هیچ کتێبێکی تر ناچێت. جا یان لە سەرووی هەموو کتێبەکانی ترەوەیە یاخود لە خوار هەموویانەوەیە. خۆ کەس ناتوانێت ئەم گریمانەی دوایی بڵێت و کەسیش نەیوتووە، تەنانەت خودی شەیتانیش قسەی وای لە زار دەرنەچووە. کەواتە قورئان لە سەرووی هەموویانەوەیە.

ئەم پوختەیە لە "ئاماژەی هەژدەهەم"دا وتراوە. پاشان "باسی یەکەم"ی "مەکتووبی بیست و شەشەم" کە ناسراوە بە "بەڵگەی قورئان بۆ دەمکوت کردنی شەیتان و حیزبەکەی" ئەم پوختەیەی ڕوون کردووەتەوە و تێگەیشتنی ئەم چینەشی لە ئیعجازی قورئان دەرخستووە و چەسپاندوویەتی.

**چینی دووهەم**: ئەوانەن کە تەنها بە چاو "ئیعجاز" دەبینن. واتە تەنانەت خەڵکی عەوام و ئەو ماددیيانەش کە ژیریيان دابەزیوەتە چاویان و تەنها ئیمان بەو شتانە دەهێنن کە بە چاو دەیبینن، تێدەگەن کە قورئانی پیرۆز ئاماژەیەکی ئیعجازیی وای هەیە بە چاو دەبینرێت.

لە "ئاماژەی هەژدەهەم"دا ئەم ئیددیعایە کراوە و پێویست بوو - بۆ چەسپاندنی ئەم دەعوایە - زیاتر روون بکرایەتەوە، بەڵام لەبەر حیکمەتێکی پەروەردگاریی گرنگ - کە ئێستا پێمان زانیوە - کاتێکی ئەوتۆمان لەوێ بە دەستەوە نەبوو روونکردنەوەی پێویستی لەسەر بکەین. لەبەر ئەوە، لەوێدا تەنها چەند ئاماژەیەکی سادە و ساکار بۆ چەند رووپەکی جوزئیی ئەو ئیعجازە کرا.

ئێستاش دوای ئەوەی کە نهێنیی ئەو حیکمەتە روون بووەوە، قەناعەتی تەواوەتیمان کرد بەوەی کە دواخستنی باشتر بووە. جا بۆ مەبەستی ئاسانکردنی تێگەیشتنی ئەو چینە و چەشتنی ئەو جۆرەی ئیعجازی قورئان لە لایەن ئەوانەوە، موصحەفێکی شەریفمان دا بە نووسینەوە، کە ئەو رووەی نێوان چل رووەکەی ئیعجاز دەربخات.

> پاشماوەی مەسەلەکانی تری ئەم بەشی سێهەمە و "بەشی چوارەم"یش لێرەدا دانەنرا، چونکە لە بارەی "تەوافوقات"ەوەن. بۆیە ئەو پێرستەمان بە سەروزیاد زانی کە تایبەتە بەو تەوافوقانەوە و لێرەدا هیچمان لە بارەیانەوە نەنووسی. بەڵام تەنها "سەرنجی سێهەم"ی "بەشی چوارەم"مان نووسی لەگەڵ "بێدارکردنەوەیەك"دا.

**بێدارکردنەوەیەك:**

بۆ مەبەستی روونکردنەوەی ئەو سەرنجە گرنگەی کە لە وشەی "الرسول"دا هەیە و لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، سەد و شەست ئایەتی پیرۆزی قورئان نووسرایەوە. خۆ هەرچەندە ئەم ئایەتە پیرۆزانە گەلێ تایبەتکاریی مەزنیان تێدایە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەریەکەیان - لە رووی واتاوە - ئەوانی تر تەواو دەکات و دەیانچەسپێنێت. بۆیە دەتوانرێت ئەو ئایەتە پیرۆزانە بکرێن بە حیزبێکی قورئانی بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت چەند ئایەتێکی جیاجیا لەبەر بکەن و بیانخوێننەوە.

هەروەها دەبینرێت کە "رەوانبێژی" و "پاراوی"ی ئەو شەست و نۆ ئایەتە مەزن و پیرۆزانەش کە وشەی "القرآن"یان تێدا هاتووە و لە بارەی روونکردنەوەی سەرنجە

مه‌زنه‌كه‌ی ئه‌م وشه‌یه‌وه كۆكراونه‌ته‌وه: گه‌لێ به‌رز و بڵنده. بۆیه ئامۆژگاریی برایان ده‌كرێت كه بیانكه‌ن به حیزبێكی قورئانیی تر.

وشه‌ی "قورئان"یش كه له موصحه‌فی شه‌ریفدا هه‌یه، له شێوه‌ی حه‌وت زنجیره‌دا هاتووه و، ته‌نها دوو دانه وشه‌یان له ده‌ره‌وه‌ی زنجیره‌كاندا مانه‌وه. ئه‌و دوانه‌ش به واتای: "قیرائه‌ت" هاتبوون و، ئه‌م ده‌رچوونه‌یان له‌و زنجیرانه هێزی سه‌رنجه‌كه‌ی پتر زیاد كرد!

سه‌باره‌ت به وشه‌ی "الرسول"یش ئه‌وا له نێوان سووره‌ته‌كانی قورئاندا سووره‌تی "محمد" و سووره‌تی "الفتح" زیاتر په‌یوه‌ندی‌یان پێوه‌ی هه‌یه. بۆیه سه‌رنجی خۆمان له باره‌ی ئه‌و وشه‌یه‌وه ته‌نها ئاراسته‌ی ئه‌و زنجیرانه كرد كه له‌و دوو سووره‌ته‌وه ده‌رده‌كه‌ون و، ئه‌وانه‌ی ده‌ره‌وه‌ی زنجیره‌كه‌مان - له‌م كاته‌ی ئێستادا - نه‌نووسی‌یه‌وه. پشت به‌خوا - گه‌ر كاتمان بۆ بڕه‌خسێت - نهێنی‌یه‌كانی وشه‌ی "الرسول" ده‌نووسرێن.

● **سه‌رنجی سێ‌هه‌م:**

كه ئه‌ویش له چوار سه‌رنج پێكهاتووه.

***یه‌كه‌م:***

له سه‌رتاسه‌ری قورئانی پیرۆزدا دووهه‌زار و هه‌شت سه‌د و شه‌ش جار له‌فظی جه‌لاله: (الله) هاتووه[1]. وشه‌ی "الرحمن"یش - له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی "به‌سمه‌له"دا - سه‌د و په‌نجاونۆ جار و.. وشه‌ی "الرحیم"یش دووسه‌د و بیست جار و.. وشه‌ی "الغفور"یش شه‌ست و یه‌ك جار و.. وشه‌ی "الرب" هه‌شت سه‌د و چل و شه‌ش جار و.. وشه‌ی "الحكیم" هه‌شتاوشه‌ش جار و.. وشه‌ی "العلیم" سه‌د و بیست و شه‌ش جار و.. وشه‌ی "القدیر" سی و یه‌ك جار و.. وشه‌ی "هو"ی "لا إله إلاّ هـــو"یش بیست و شه‌ش جار به‌كار هاتوون[2].

(١) به‌پێی (المعجم المفهرس) ژماره‌ی له‌فظی جه‌لاله له قورئاندا (٢٦٩٧) دانه‌یه، به‌ڵام گه‌ر (١١٣) دانه‌كه‌ی ناو به‌سمه‌له‌كانیشیان بخه‌ینه سه‌ر ده‌بن به (٢٨١٠) دانه. (وه‌رگێڕ)

(٢) كۆی ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز كه شه‌ش هه‌زار و شه‌ش سه‌د و شه‌ست و شه‌ش ئایه‌ته و، په‌یوه‌ندیی ئه‌م ژماره‌یه‌ش به شه‌ش ڕه‌نووسی نێوان چه‌ند ناوێكی جوانی خوای گه‌وره‌وه كه له‌م لاپه‌ڕه‌یه‌دا هاتوون، ئاماژه بۆ نهێنی‌یه‌كی گرنگ ده‌كات، به‌ڵام له كاتی ئێستادا باسكردنی ئه‌م نهێنی‌یه خرایه لاوه. (دانه‌ر)(*)

(*) سه‌رچاوه‌كانی "ئیعجازی ژماره‌یی" ئه‌م سه‌رده‌م ورۆژگاره ئایه‌ته‌كانی قورئانی پیرۆز به (٦٢٣٦) ئایه‌ت داده‌نێن. (وه‌رگێڕ).

گەلێ نهێنی و سەرنجی زۆر لە ژمارەكەی لەفزی جەلالە: (الله)دا هەیە.

یەكێك لەوانە بریتییە لەوەی كە:

وشەی (الله) و "الرب" لە قورئاندا لە هەموو ئەو وشانەی تر زیاتر بەكار هاتوون. دوای ئەوان وشەكانی: (الرحمن و الرحیم و الغفور و الحكیم). هەروەها ژمارەی ئەم وشانە لەگەڵ وشەی (الله)دا نیوەی ژمارەی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز پێكدەهێنن.

هەروەها ژمارەی لەفزی جەلالە (الله) لەگەڵ ئەو وشانەی "الرب"دا كە بە واتای (الله) هاتوون - بە هەمان جۆر - نیوەی ژمارەی ئایەتەكانی قورئانن. چونكە وشەی "الرب" هەشت سەد و چل و شەش جار بەكار هاتووە و پێنج سەد و چەند دانەیەكی ئەم ژمارەیە لە بریی وشەی (الله) بەكار هێنراون. بەڵام دووسەد و چەند دانەیەكی تریان بە واتای (الله) نەهاتوون.

هەروەها كۆی ژمارەكانی لەفزی جەلالە: (الله) لەگەڵ ژمارەی وشەكانی: "الرحمن و الرحیم و العلیم" و چەند دانەیەكی وشەی "هو"ی "لا إلـه الا هو"یش - بە هەمان جۆر - نیوەی ژمارەی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزە و جیاوازییەكەیان تەنها چوار ژمارەیە.. لەگەڵ وشەی "القدیر"یشدا - كە لە بریی وشەی "هو" دایبنێین - بە هەمان جۆر نیوەی ژمارەی ئایەتەكانە و جیاوازی تەنها نۆ ژمارەیە.

بەم سەرنجە، لێرەدا كۆتایی بەم باسە دەهێنین. چونكە گەلێ سەرنجی زۆر لە كۆی ژمارەی لەفزی جەلالەدا هەیە.

*دووهەم:*

ئەم سەرنجە لە ڕووی سوورەتەكانی قورئانەوەیە و، ئەمیش گەلێ سەرنجی تری لەخۆ گرتووە و چەندین تەوافوقی ئەوتۆش دەردەخات كە بەڵگەن لەسەر ڕێكوپێكی و قەصد و ویست و مەبەست.

یەكێك لەوانە بریتییە لەوەی كە:

لەفزی جەلالەی: (الله) لە سوورەتی "البقرة"دا هێندەی ژمارەی ئایەتەكانیەتی و جیاوازیی نێوانیان تەنها چوار ژمارەیە و، لە هەمان كاتیشدا چوار وشەی "هو" لە بریی (الله) بەكار هاتووە وەك ئەوەی كە لە "لا إله إلا هو"دا هەیە. بەمەش تەوافوقەكە كامڵ و تەواو بووە!

لەفزی جەلالەی ناو سوورەتی "آل عمران"یش لەگەڵ ژمارەی ئایەتەکانیدا تەوافوقیان لە نێواندایە. ئەوەندە هەیە لەفزی جەلالە لە دوو سەد و نۆ ئایەتدا بەکارهاتووە، بەڵام ژمارەی ئایەتەکان دوو سەد ئایەتن، واتە جیاوازییەکەیان لە نۆ ژمارەدایە. خۆ لەم چەشنە تایبەتکارییە کەلامی و سەرنجە ڕەوانبێژییانەدا ئەم جیاوازییە بچووکانە زیان ناگەیەنن، چونکە تەوافوقە لێك نزیکەکان بۆ ئەم مەبەستە سەروزیادن.

هەروەها تەوافوق لە نێوان ژمارەی ئایەتەکانی هەر سێ سوورەتی "النساء و، المائدة و، الانعام" و کۆی ژمارەی لەفزی جەلالەی ناو ئەم سێ سوورەتەدا هەیە. چونکە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتانە چوار سەد و شەست و چوارە، بەڵام کۆی ژمارەی وشەی: (الله) لە هەرسێکیاندا چوارسەد و شەست و یەکە. خۆ ئەگەر لەفزی جەلالەی ناو بەسمەلەی هەر سێ سوورەتەکەش بخەینە سەر ئەو ژمارەیە ئەوا ژمارەکان بە تەواوەتی یەکاویەك دەردەچن.

هەروەها ژمارەی لەفزی جەلالە لە پێنج سوورەتی یەکەمدا دوو هێندەی ژمارەی هەمان وشەیە لە سوورەتەکانی "الاعراف و، الانفال و، التوبة و، یونس و، هود"دا. واتە ژمارەی لەفزی جەلالە لەم پێنج سوورەتەی دواییدا نیوەی ژمارەکەیەتی لە پێنج سوورەتەکەی پێشوودا!

هەروەها ژمارەی ئەم وشەیە لە سوورەتەکانی "یوسف و، الرعد و، إبراهیم و، الحجر و، النحل"دا نیوەی ژمارەیەتی لە نیوەکەی پێشوودا.

پاشان ژمارەی ئەم وشەیە لە سوورەتەکانی "الإسراء و، الكهف و، مريم و، طه و، الأنبياء و، الحج"دا[1] نیوەی نیوەی ئەو نیوەیەی پێشووە.

گەر بێت و هەمان وشە لە سوورەتەکانی دوای ئەمانەدا پێنج سوورەت لە دوای پێنج سوورەت بژمێررێن، ئەوا ئەم ژمارەیە لە نزیکی ئەو ڕێژەیەدا بەردەوام دەبێت. بەڵام چەند

---

(١) بەپێی ئەم دابەشکردنە پێنج پێنجە (واتە: پێنج سوورەت پێنج سوورەت) نهێنییەك دەرکەوت و، لێرەدا بێ ئەوەی هیچ کامێمان پێی بزانین لە بریی پێنج، شەش سوورەت تۆمار کرا. بۆیە هیچ گومانێکمان لەوەدا نەما کە شەشەم دانەیان بە شێوەیەکی غەیبی و لە دەرەوەی ویستی خۆمانەوە هاتووەتە ناوەوە، تاکو ئەم نهێنیی نیوە نیوەیە تیا نەچێت. (دانەر)

جیاوازی‌یەك لە هەندێ کەرتە ژمارەکاندا ڕوو دەدات، کە ئەویش لەم چەشنە مەقامە خیطابی‌یانەدا گوێ‌یان پێ نادرێت.

بۆ نموونە: هەندێکیان سەد و بیست و یەکن هەندێکی تر سەد و بیست و پێنج و.. هەروەها هەندێکی تر سەد و پەنجا و چوار و هەندێکی دیکەش سەد و پەنجا و نۆ دانەن.

پاشان لە پێنج سوورەتەکەی تری دوای ئەواندا کە لە سوورەتی "الزخرف"ەوە دەست پێ دەکات، ژمارەکە دادەبەزێتە نیوە. واتە نیوەی نیوەی ئەو نیوەیە.

ئەو پێنج سوورەتەش کە لە سوورەتی "النجم"ەوە دەست پێ دەکات ژمارەکە: نیوەی نیوەی نیوەی ئەو نیوەیە، بەڵام بە شێوەیەکی نزیك. خۆ لەم چەشنە مەقامە خیطابی‌یانەدا جیاوازیی کەرتە بچووکەکان زیان ناگەیەنن.

پاشان لە سێ کۆمەڵی پێنج سوورەتە بچووکەکاندا سێ ژمارەی لەفزی جەلالە بەکارهێنراوە.

جا ئەم چۆنێتی‌یانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە "ڕێکەوت" تێکەڵی ژمارەکانی لەفزی جەلالە نەبووە، بەڵکو بەپێی "ڕێکوپێکی" و "دانایی" دەستنیشان کراون.

*سەرنجی سێ‌هەمی لەفزی جەلالە* (الله):

کە تایبەتە بە ڕێ و شوێن و بارودۆخەکانی لەسەر لاپەڕەکانی موصحەفی شەریفدا:

ژمارەکانی لەفزی جەلالە لە هەر دانە لاپەڕەیەکی موصحەفدا پەیوەندیی بە ڕووی لای ڕاستی ئەو لاپەڕەیە و لاپەڕەکەی بەرامبەری ئەو ڕووەوە هەیە. هەندێ جاری تریش پەیوەندیی بە لاپەڕەکەی بەرامبەرەوە لە لای چەپ و ڕووی ئەوەی پشتەوەشی هەیە.

لە نوسخەیەکی موصحەفەکەی خۆمدا کە بە دوای ئەم تەوافوقانەدا گەڕام، بۆم دەرکەوت کە زۆربەی جار بە ڕێژەیەکی ژمارەیی تا بڵێی جوان تەوافوق لە لەفزی جەلالەدا هەیە. لە موصحەفەکەی خۆمدا نیشانەم لەسەر داناون. هەندێ جار یەکسان دەردەچوون و هەندێ جاری تریش (نیوە) یان (سێ‌یەك) دەبوون. بە هەر حاڵ، هەموویان ئەوە لە هەست و نەستی مرۆڤ دەگەیەنن کە بە ڕێکوپێکی و دانایی لە شوێنی خۆیاندا دانراون.

***چوارەم:***

تایبەتە بەو تەوافوقانەی کە لە یەك لاپەڕەدان.

خۆم و براکانم لە سێ چوار نوسخەی جیاجیای موصحەفدا - کە لەگەڵ یەکتردا بەراوردمان کردن - بە دوای ئەم تەوافوقانەدا گەڕاین. لە ئەنجامدا گەیشتینە ئەو قەناعەتەی کە تەوافوقەکان لە هەر هەموویاندا کارێکی پێویستە و ئەنجامی مەبەست و ئامانجێکی دیاری کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نووسەرەوەکانی قورئان لە چاپخانەکاندا چەند ئامانجێکی تریان ڕەچاو کردووە، ئەوا هەندێ نارێکی لە تەوافوقەکاندا پەیدا بووە. خۆ ئەگەر بێت و بە وردی ڕێك بخرێنەوە ئەوا لە کۆی قورئاندا تەوافوق لە ژمارەکانی لەفزی جەلالەدا دەبینرێت کە دەگەنە دوو هەزار و هەشت سەد و شەش دانە، مەگەر چەند حاڵەتێکی یەکجار دەگمەن ڕوو بدات لەو تەوافوقانە نامۆ بن. ئەو کاتەش نووری ئیعجازێکی گەورە لەو تەوافوقانەوە هەست پێ دەکرێت، چونکە گەلێ ئەستەمە کە بیری مرۆڤ دەوراندەوری ئەم هەموو لاپەڕە فراوان و زۆرانە بدات و ئاگای لە هەموویان بێت. بۆیە بە هیچ جۆرێ ناتوانێت دەستیان تێ وەربدات.

دیارە "ڕێکەوت"یش بە هیچ جۆرێك دەستی بەم ڕێ و شوێن و بارودۆخە پڕ لە حیکمەتانەی لەفزی جەلالە ناگات.

سەرلەنوێ موصحەفێکی تری شەریف بە نووسینەوە دەدەین، تاکو "سەرنجی چوارەم" تا ڕادەیەك دەربکەوێت و هەوڵیش دەدەین پارێزگاریی لاپەڕە و دێڕەکانی ئەو موصحەفانە بکەین کە زیاتر بڵاون و لە بەردەستدان، هاودەم لەگەڵ ڕێکخستنی ئەو شوێنانەی کە لەبەر گوێ پێنەدانی سنعەتکاران - لە چاپخانەکاندا - بایەخ بە ڕێکوپێکییان نەدراوە. ئەو کاتەش - پشت بە خوا - نهێنیی ڕێکوپێکیی ڕاستەقینەی تەوافوقەکان دەردەکەوێت.

(لە ڕاستیشدا دەرخرا).

اللهم يا مُنَزِّلَ القرآن! بحق القرآن فهّمنا أسرار القرآن، ما دار القمران، وصلّ وسلّم على مَن أُنْزِلَتَ عليه القرآن، وعلى آله وصحبه أجمعين.. آمين.

* * *

## بەشی پێنجەم

### کە پەیامی پێنجەمە

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿اللهُ نُورُ السَّموات وَالأَرْضِ﴾ (النور:٣٥)

لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و لە حاڵەتێکی ڕۆحی‌دا هەستم بە یەکێك لە نوورەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە کرد و، لە بینینێکی وەك ئەندێشەدا سەرجەمی بوونەوەران و گشت زیندەوەرانم لە دۆخێکی وەهادا بینی کە بە موناجاتە بەناوبانگەکەی "وەیسی قەرەنی" موناجاتیان لەگەڵ پەروەردگاری خۆیاندا دەکرد و دەلاڵانەوە، کە موناجاتێکە بەم پاڕانەوەیە دەست پێ دەکات:

إلهي أنت ربّي.. وأنا العبد..

وأنت الخالق.. وأنا المخلوق..

وأنت الرزّاق.. وأنا المرزوق.. الخ.

ئەم ڕووداوە ئەندێشەیی‌یەی کە بە دڵ بینیم، قەناعەتێکی ئەوتۆی دامێ کە هەموو یەکێکی ناوە جوانەکانی خوای گەورە نوور و ڕووناکی‌یە بۆ یەك بە یەکی هەژدە هەزار جیهانەکان.

وا بەم جۆرەی خوارەوە ئەو ڕووداوە دەگێڕمەوە:

هەروەك یەك بە یەکی پەڕەکانی گوڵ دەبن بە بەرگی یەکتری و هەریەکەیان ئەوەی ژێر خۆی دادەپۆشێت، ئەم جیهانەشم بە هەمان جۆر بینی! چونکە هەریەك لەو جیهانانە بە هەزاران پەردە پێچراونەتەوە و چەندین جیهانی تریان لە ژێردا شارراوەتەوە. هەروەها بینیم کە هەر کات یەکێك لەو پەردانە هەڵدەدرێتەوە و لادەبرێت جیهانێکی ترم لە بەرامبەرەوە دەردەکەوێت کە شێوەی تاریکستانێکی چڕ و چۆڵ و سامناکی لەخۆ گرتووە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە وێنەکەی کێشاوە و فەرموویەتی:

**﴿أَوْ كَظُلُماتٍ في بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحابٌ ظُلُماتٌ بَعْضُها فَوْقَ بَعْضٍ إذا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَراها وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللهُ لَهُ نُوراً فَما لَهُ مِنْ نُورٍ﴾**(النور:٤٠).

لەم کاتەدا کە من ئەم جیهانەم لەم جۆرە تاریکی‌یە چڕەدا بینی، کتوپڕ یەك درەوشانەوەی ناوێك لە ناوەکانی خوای گەورە تیشکێکی مەزنی بۆ ئاراستە کرد و یەکسەر بە وێنەی نوورێك سەرتاسەری ئەو جیهانەی ڕووناك کردەوە! ئیتر هەتا یەکێك لە دیمەنەکانی ئەم جیهانانە دەربکەوتنایە و پەردەیەك لە پەردەکانیان لە بەردەم ژێری‌دا هەڵبدرایەتەوە، دەرگای جیهانێکی تر لە بەردەم ئەندێشەدا دەخرایە سەر پشت و، بەهۆی بێ‌ئاگایی‌شەوە ئەو جیهانە لە شێوەی تاریکستانێکی بێ بندا دەردەکەوت، ئنجا کتوپڕ یەکێك لە ناوەکانی خوای گەورە - بە وێنەی خۆری درەخشان - هەڵدەهات و سەرانسەری ئەو جیهانەی ڕووناك دەکردەوە... هتد.

ئەم گەشت و گەڕانەی دڵ و ئەندێشەم بەم شێوەیە درێژەی کێشا و بەردەوام بوو.. وا ئەمانەی خوارەوەیان - بۆ نموونە - لێ باس دەکەین:

کاتێ سەیری "جیهانی زیندەوەران"م کرد و سەرنجی: دەستەوسانی و، لاوازی و، پێویستی و، برسێتی و، موحتاجیی لەڕادەبەدەریانم دا، ئەو جیهانەم وا هاتە پێش‌چاو کە نوقمی تاریکستانێکی چڕ و گیرۆدەی خەم و پەژارەیەکی بەردەوام بوویێت. هەر لەم کاتەدا ناوی "الرحمن" وەك خۆری درەخشان لە بورجی ناوی "الرزاق"ەوە - واتە لە واتاکەی‌دا - هەڵهات و سەرانسەری ئەو جیهانەی بە ڕۆشنایی "میهرەبانی" ڕووناك کردەوە!

پاشان لە نێوان جیهانی زیندەوەراندا "ساوا و بێچووانیان"م بەدی کرد.. بینیم ئەو ساوا و بێچووانە لە تاو: لاوازی و، دەستەوسانی و، پێداویستی‌یەکانیاندا هەڵدەبەزنەوە، چونکە جیهانەکەیان هێندە ڕەش و تاریکە کە سۆز و بەزەیی بینەرانیان دەجووڵێنێت. کاتێ کە من لەم حاڵەتە ئازاربەخشەدا بووم، کتوپڕ ناوی "الرحیم" لە بورجی شەفەقەتەوە هەڵهات و ڕووناکی‌یە درەخشانەکانی بە هەموو جیهاندا بڵاو کردەوە و گۆڕیی بە جیهانێکی شیرین و ناسك و ڕەنگین. تەنانەت فرمێسکەکانی: "سکاڵا" و "خەم" و "سۆز"ی گۆڕی بە چەند فرمێسکێك کە خۆشی و شادمانی و شوکرانەبژێری‌یان هەڵدەڕشت!

پاشان پەردەکە لادرا.. کتوپڕ "جیهانی مرۆڤ"م بە وێنەی دیمەنەکانی سینەما لە بەر چاودا لێ دەرکەوت، کە جیهانێك بوو لە هەموو لایەکەوە تاریکایی‌یەکی چڕوپڕ و ترس و لەرزێکی بەردەوام دایپۆشی بوو. تەنانەت لە تاو سام و مەترسیی ئەو دیمەنەی کە بینیم، دەنگم لێ هەڵبڕی و هاوارم لێ هەڵسا! چونکە بینیم: ئەو ئاواتانەی کە لە

مرۆڤدا جێگیر كراون و تا ئەبەد درێژ بوونەتەوە.. هەروەها ئەو بیروبۆچوونانەش كە دەوراندەوری گەردوونیان داوە و.. ئەو هیممەت و توانا و بەهرە و لێهاتنانەشی كە داوای مانەوەی هەتاهەتایی و بەختەوەریی هەمیشەیی دەكەن و تاسەمەندی بەهەشتی هەمیشەیین، هەموو ئەمانە لەم مرۆڤەدا، هاودەمن لەگەڵ هەژارییەكی توند و تیژ و پێداویستی و موحتاجییەكی شاررراوەدا، هەرچەندەش ڕووی لە چەندین ئامانج و خواستی نەبڕاوە كردووە. هەروەها مرۆڤ لەگەڵ هەژارییەكی ئەوتۆشدا دەست لەملانە كە هیچ كاتێ لێی جیا نابێتەوە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا دووچاری هێرشی گەلێ بەڵا و گیروگرفت و دوژمنی زۆریش دەبێت! جگە لەمانەش: مرۆڤ لە تەمەنێكی كورت و، ژیانێكی ناساز و، گوزەرانێكی شلەژاو بەولاوە هیچی تر شك نابات و، هەمیشە تاڵیی جودایی و نەمانیان تێدا دەچێژێت كە هەردەم ئازارێكی توندوتیژ دەرخواردی دڵی دەدەن. چونكە كاتێ كە "بە ڕوانینی بێ ئاگایانە" دەڕوانێتە گۆڕەكەی بەردەمی، ئەوا بە تاریكستانێكی هەتاهەتایی ئەوتۆ دێتە بەرچاوی كە مرۆڤی - بە دانە و بە كۆمەڵ - تێدا فڕێ دەدرێتە ناو ئەو چاڵە تاریكەوە!!

هەر هێندەی جیهانی مرۆڤم بەم جۆرە هاتە بەرچاو كە نوقمی ناو ئەم هەموو چەشنە تاریكایییانە بووبوو، یەكسەر هەموو لایەنە ناسكە مرۆڤانەكانم هاودەم لەگەڵ "دڵ" و "ڕۆح" و "ژیری"م، تەنانەت هەموو گەردیلەكانی وجوودیشم، خۆیان بۆ گریان و هاواری داد و بێداد ئامادە كرد! بەڵام لەم كاتەدا ناوی جوانی "العادل"ی خوای گەورە لە بورجی "الحكیم" و ناوی "الرحمن" لە بورجی "الكریم" و ناوی "الرحیم" لە بورجی "الغفور" و ناوی "الباعث" لە بورجی "الوارث" و ناوی "المحیی" لە بورجی "المحسن" و ناوی "الربّ"یش لە بورجی "المالك"ەوە - واتە لە واتاكانیاندا - هەڵهاتن و، یەكسەر ئەم ناوە جوانانەی خوای گەورە گەلێ جیهانی زۆر و زەبەندەی لە ناوەندی ئەو جیهانە تاریكەی مرۆڤدا ڕوون كردەوە و چەندین پەنجەرەی جیهانی ڕووناكی دواڕۆژیشیان خستە سەر پشت و گەلێ ڕووناكیی درەخشانیان ئاراستەی دنیا تاریكەكەی مرۆڤ كرد.

پاشان پەردە لەسەر دیمەنێكی مەزنی تر لادرا، كە دیمەنی "جیهانی زەوی"یە. ئەم جیهانەش لە پێشچاوی ئەندێشەدا بە جیهانێكی سامناك دەركەوت، چونكە یاسا زانستییە تاریكەكانی فەلسەفە، مرۆڤی لاواز لەم جیهانەدا دەخاتە ناو تاریكاییەكی سامناكەوە. ئەوەتا زەوی - لەم ڕوانگەیەوە - لەناو بۆشایی جیهانێكی بێ سنووردا و بە

خێرایی‌یەك دەڕوات کە حەفتا جار لە خێرایی هاوێشتنی بۆمبا زیاترە و، لە ماوەی یەك ساڵدا ڕێگایەك دەبڕێت کە دەگاتە بیست و پێنج هەزار ساڵ. هەروەها زەویی پیر و پەککەوتە - لەم ڕوانگەیەدا - هەموو کاتێك بەهۆی بوومەلەرزە مەزنەکانی ناویەوە نزیکە پارچە پارچە و هەپروون هەپروون ببێت.. ئیتر لە ناو چرووپریی ئەو تاریکایی‌یەی کە باڵی بەسەر ئەم جیهانەدا کێشابوو سەرم دەخولایەوە و گێژی دەخوارد! کتوپڕ ناوی: "خالق السموات والأرض" و ئەم ناوانەی تری خوای گەورە کە بریتین لە: "القدير، العليم، الربّ، الله، ربّ السموات والأرض، مسخّر الشمس والقمر" لە بورجەکانی: میهرەبانی و، مەزنێتی و، پەروەردگاریتی‌یەوە هەڵهاتن و، بە چەندین نووری درەخشان ئەو جیهانە تاریکەیان ڕووناك کردەوە و، گۆی زەویشیان وەك کەشتی‌یەکی گەشتوگوزاری ئەوتۆ لێ کرد کە لەوپەڕی ڕێکوپێکی و گوێڕایەڵی و کەماڵ و حەوانەوە و دڵنیایی‌دایە و، بینیم کە - بە ڕاستی - ئەم گۆی زەوی‌یە بۆ: سەیران و، گەشتوگوزار و، بازرگانی، ئامادە کراوە.

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەموو یەکێك لەو هەزار و یەك ناوە جوانەی خوای گەورە کە ڕوویان لە گەردوونە، بە وێنەی خۆری مەزن، یەکێك لەو جیهانانە ڕووناك دەکاتەوە. تەنانەت هەموو ئەو جیهانانەی تریش ڕووناك دەکاتەوە کە لە ناوەندی یەك بە یەکی جیهانەکاندا هەن. چونکە بەهۆی نهێنیی "تەنیایی"ی خوای گەورەوە، درەوشانەوەی سەرجەم ناوەکانی تر لە ناوەندی درەوشانەوەی هەموو یەکێکی ئەو ناوانەدا دەبینرێت.

وەك بڵێی "دڵ" - لەم گەشتەدا - بەردەوام دەکرایەوە و، هەر کاتێ ڕووناکی‌یە جۆراوجۆرەکانی لە پشت پەردەی هەر تاریکی‌یەکەوە دەبینی پتر حەز و تاسەمەندیی بۆ بینینی ڕووناکیی تر زیادی دەکرد! تەنانەت ویستی سوار پشتی ئەندێشە ببێت و بەناو ئاسمانەکاندا بگەڕێت، ئا لەم کاتەدا پەردە لەسەر دیمەنێکی یەکجار گەورە و فراواندا هەڵدرایەوە و، دڵیش ڕۆشتە ناو جیهانی ئاسمانەکانەوە و، بینیی کە:

ئەو ئەستێرانەی بزە و خەندەی نوورانی بەناو ئاسماندا پەخش دەکەن: بارستایی‌یان لە هی گۆی زەوی گەلێ زیاترە و، زۆر لەویش خێراترن و، لەناو یەکتری‌دا دەسووڕێنەوە. خۆ گەر بێت و یەکێکیان تەنها بۆ ماوەی یەك خولەك ڕێگای خۆی ون بکات و وێڵ ببێت، ئەوا بەر یەکێکی تریان دەکەوێت و دەتەقێتەوە و دەنگ و زرمەیەکی هێندە گەورە دەداتەوە کە هەناوی گەردوونی پێ کوناودەر و ورد و خاش ببێت. دیارە ئەو کاتەش

ئەستێرەکان تیشکی ڕووناکی پەخش ناکەنەوە، بەڵکو ئاگریان تێ بەردەبێت و لە بریی دابەشکردنی زەردەخەنە نوورانی‌یەکانیان، تاریکایی‌یەکی بەردەوام دەیانگرێتەوە..

بەهۆی ئەم ئەندێشەیەوە، ئاسمانەکانم بە جیهانێکی فراوانی چۆڵ و سامناك و سەرسووڕهێن هاتە پێش‌چاو. ئیتر هەزار جار پەشیمانیی خۆمم بۆ سەردانم لە ئاسمانەکان دەربڕی! بەڵام ئا لەم کاتەدا کە من بەدەست ئەم بارە پەرێشانەوە دەتلامەوە، کتوپڕ ناوە جوانەکانی خواوەندی "ربّ السموات والأرض" و "ربّ الملائكة والروح" بە درەوشانەوە و دەرکەوتنی خۆیانەوە لە بورجی: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّماءَ الدُّنْيا بِمَصابِيحَ﴾ (الملك:٥) و ﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ەوە (الرعد:٢) هەڵهاتن و، ئەو ئەستێرانەی کە تاریکی داپۆشیبوون، یەك تروسکایی‌یان لەو ڕووناکی‌یە مەزنانە – لە ڕووی ئەو واتایەوە – بەدەست هێنا. ئیتر یەکسەر ئاسمان – بەم تروسکایی‌یە – بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی داگیرسا و وەك چراخانی لێ هات و بە مەلائیکەت و ڕۆحانی‌یەکان پڕ و ئاوەدان بوونەوە، پاش ئەوەی کە وا گومان دەبرا کاول و چۆڵ بن. هەروەها ئەو خۆر و ئەستێرە کارگوزار و جووڵاوانەم وەك سوپایەکی نێوان سوپاکانی پەروەردگاری جیهانەکان و پادشای ئەزەل و ئەبەد هاتە بەرچاو، وەك بڵێی لە ناوەندی مانۆڕ و نمایشێکی بەرز و بڵنددا مەزنیی پەروەردگارێتیی ئەو پادشا بەتوانایە دەربخەن.

ئیتر منیش، بە هەموو هێزێکمەوە، تەنانەت گەر بمتوانیایە بە هەموو گەردیلەکانی وجوودیشم و، بە زمانی هەموو بوونەوەران – گەر گوێیان لێم بێت – ئەم ئایەتە پیرۆزەم خوێندەوە:

﴿اللهُ نُورُ السَّمواتِ وَالأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكاةٍ فيها مِصْباحٌ الْمِصْباحُ في زُجاجَةٍ الزُّجاجَةُ كَأَنَّها كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لا شَرْقِيَّةٍ وَلاغَرْبِيَّةٍ يَكادُ زَيْتُها يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نارٌ نُورٌ عَلى نُورٍ يَهْدِي اللهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشاءُ﴾ (النور:٣٥).

ئیتر لە ئاسمانەوە دابەزیم و هاتمەوە بۆ زەوی و، لەو ڕووداوە ئەندێشەیی‌یە بێدار بوومەوە و، وتم:

الحمد لله على نور الإيمان والقرآن!

* * *

## بەشی شەشەم

### کە پەیامی شەشەمە

**ئەم باسە بۆ ئەوە نووسرا کە قوتابیان و کارگوزارانی قورئان بێدار بنەوە و نەیەڵێت لەخشتە ببرێن.**

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ﴾ (هود:١١٣)

"ئەم بەشەی شەشەم – پشت بەخوا – شەش فڕوفێڵی شەیتانەکانی ئینس و جینی پووچەڵ دەکاتەوە و، لە هەمان کاتیشدا شەش دانە ڕێی هێرشەکانیان پێ دەبەستێت".

❑ **فڕوفێڵی یەکەم:**

"شەیتانەکانی ئینس" لەو دەرسانەوە کە لە "شەیتانەکانی جینی" وەریان گرتووە، هەوڵی ئەوە دەدەن کە خزمەتگوزارانی قورئان بخەڵەتێنن و لەو کارە خاوێن و جیهادە مەعنەوی‌یە بەرزەی خۆیان دووریان بخەنەوە بەوەی کە دەچن "پلە و پایە" و "ناوبانگ"یان لە لا شیرین و خۆشەویست دەکەن و، ئەم جۆرە شتانەیان لە بەرچاودا دەڕازێننەوە! ئەویش بەم فێڵە شەیتانی‌یەی خوارەوە:

هەموو مرۆڤێك بە گشتی و یەك بە یەکی ئەهلی دنیاش بە تایبەتی حەزێکی "کوللی" یان "جوزئی"یان بۆ وەرگرتنی پلە و پایە تێدایە، کە خۆی لە خۆیدا بریتی‌یە لە "ڕیاکاری". هەروەها هەوڵ دەدەن چەند شوێن و پلەیەك بەدەست بهێنن کە لەبەر چاوی خەڵکیدا بە پلەی بەرز و بلند دادەنرێن. تەنانەت کاتی وا هەیە مرۆڤ بە هاندەری هەڵپەکردن بۆ ناوبانگ و بۆ مەبەستی تێرکردنی ئەم حەز و ئارەزووەی خۆی، ژیانیشی بەخت دەکات!

جا ئەم حەز و ئارەزووە بۆ "ئاخیرەت خوازان" تابڵێی مەترسیی تێدایە و.. "دنیاخوازان"یش ئەوپەڕی هاندان و خۆشحاڵیی تێدا دەبینن.. هەروەك سەرچاوەی گەلێ ڕەوشتی ناپەسەندیشە.

ئەم حەز و ئارەزووە - لە ڕاستیدا - لایەن و سروشت و دەمارێکی لاوازە لە مرۆڤدا. واتە هەر کەسێك ختووکەی ئەم هەستەی بدات دەتوانێت بە سەریدا زاڵ ببێت و لەخشتەی ببات و بۆ لای خۆی ڕایبکێشێت. لەبەر ئەمە، گەورەترین مەترسی و نیگەرانیم سەبارەت بە برایانم لەوەدایە کە دەگونجێ مولحیدان ئەم لایەنە لاوازەی دەروونی مرۆڤ لە برایانمدا بقۆزنەوە، چونکە هەندێ لە هاوڕێ نادڵسۆزەکانمیان بەم شێوەیە بۆ لای خۆیان ڕاکێشا و لە هەڵدێری تیاچووندا هەڵیاندانە خوارەوە[1].

ئەی برا و هاوڕێیانم لە خزمەتکردنی قورئاندا!

کاتێ جاسووسانی ئەهلی دنیا و برەودەران بە گومڕایی و قوتابییانی شەیتان، لە گۆشەی: "حەز لە ناوبانگ کردنەوە" دێن بۆ لاتان، پێیان بڵێن:

ڕەزامەندیی خوای گەورە و ڕێزلێنانی میهرەبانیی ئەو خوایە و وەرگیراویی لای پەروەردگار، پلەیەکی ئەوەندە بڵند و مەزنە کە ڕووتێکردن و سەرسووڕمانی خەڵکی لە چاویدا وەك تەنها یەك گەردیلە وایە.

خۆ ئەگەر میهرەبانیی خوای گەورە تەنها یەك ئاوڕمان لێ بداتەوە، ئەوا سەروزیادمانە و پێویستمان بەوە نابێت کە خەڵکی ڕوومان تێ بکەن. ڕووتێکردنی خەڵکی کاتێك خراپ نییە کە ئەگەر سێبەرێکی ڕەنگدانەوەی ئاوڕلێدانەوەی میهرەبانیی خوای گەورە بێت. دەنا هەرگیز بە سەربەخۆیی داوا ناکرێت و ئێمە بە دوایدا ناگەڕێین، چونکە تا دەرگای گۆڕ بڕ دەکات و هەر هێندەی گەیشتە ئەوێ دەکوژێتەوە و لەوێدا فلسێکی قەڵبیش ناهێنێت!

پاشان گەر ئەم هەستی مەنسەب ویستی و حەز لە پلە و پایە کردنە لەغاو نەکرێت و لە مرۆڤدا نەسڕێتەوە، ئەوا دەبێ بەم جۆرەی خوارەوە ڕووی بەرەو ڕوو کارێکی تر ئاراستە بکرێت:

---

(١) ئەو بەدبەختانە پێیان وایە کە تەنها بەوەی بڵێن: "دڵمان لەگەڵ مامۆستادایە" ئیتر گرفتاری تیاچوون نابن! بەڵام ئەو کەسەی هێزوپێز بە تەوژمی ئیلحاد دەدات و بە پڕوپاگەندەی مولحیدان لە خشتە دەچێت، تەنانەت بێ ئەوەش بە خۆی بزانێت بۆ جاسووسی کردن لە پێناوی ئەواندا بەکار دەهێنرێت.. ئەو کەسەی کە ئەمە حاڵیەتی و خەریکە تیا دەچێت و لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێت: "دڵم پاك و بەوەفایە بۆ ڕێبازی مامۆستاکەم" حاڵی ئەو بەدبەختە وەك هی ئەو کەسە وایە کە لە نوێژدا گرفتاری تەنگاوی بووە و بە بایەك دەستنوێژەکەی شکاوە، کەچی کاتێ پێی دەوترێت: نوێژەکەت بەتاڵ بووەتەوە، دەڵێت: نەخێر، بەتاڵ نەبووەتەوە، چونکە دڵم خاوێنە! (دانەر).

ئەم هەستی حەز لە پلە و پایە کردنە لەوانەیە ڕوویەکی ڕەوا و مەشرووعی تێدا بێت، ئەویش بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی پاداشتی دوارۆژ و بە نیازی دەستکەوتنی دوعای کەسانی تر لە ڕووی کاریگەریی ڕێکوپێك و جوانیی خزمەتکردنی قورئانەوە و، لەسەر بناغەی ئەم نموونەیەی خوارەوە:

وا دابنێ مزگەوتی "ئەیاصۆفیا" پڕە لە کەسانی خاوێن و بەڕێزی ئەهلی فەزڵ و کەماڵ.. بەردەرگا و هەیوانەکانیشی چەند منداڵێکی لاسار و کەسانی هەرزە و نزمی تێدان.. لای پەنجەرەکانیشیەوە چەند گەشتیارێکی بیانی ڕاوەستاون کە حەزیان لە گەمە و گاڵتەیە..

گەر لەم کاتەدا یەکێك هاتە ناو مزگەوتەکەوە و ڕۆشتە ناو ئەو کۆمەڵە بەڕێزەوە و بە دەنگێکی خۆش چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی خوێند، ئەوا سەرنجی ڕوانینی هەزاران کەسی ئەهلی عیلم و فەزڵی بۆ ئاراستە دەبێت و بە دوعاکردنیان بۆی و ڕازی بوونیان لێی پاداشتێکی گەورەی دەست دەخەن. کەچی منداڵە لاسار و مولحیدە هەرزە و بیانی‌یەکان ئەم کارەیان پێ خۆش نابێت!

بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی کە هاتە ناو مزگەوت و کۆڕی کۆمەڵە بەڕێزەکەوە، لە بریی قورئان خوێندن، دەستی کرد بە گۆرانیی بێ شەرمانە و سەما و غەڵبە و دەنگ و هەرا، ئەوا کارەکەی دەبێت بە مایەی سەرسووڕمان و خۆشحاڵیی منداڵە هەرزەکان و شادمانیی ئەو گومڕایانە، هەروەك چەند زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی ئەو بیانی‌یانەش بەدەست دەهێنێت کە بە بینینی ناتەواوی و کەموکوڕیی موسڵمانان خۆشحاڵ دەبن! کەچی کۆمەڵە بەڕێزەکەی ناو مزگەوت بە چاوی سووکایەتی بۆی دەڕوانن و لە نزمترینی پلەکان و بنکی "أسفل سافلین"دا دەیبینن.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە:

جیهانی ئیسلامی و کیشوەری ئاسیا: مزگەوتێکی مەزنە و.. ئیمانداران و ئەهلی حەقیقەتی ناویشیان: کۆمەڵە بەڕێزەکەی ناو ئەو مزگەوتەن.. مەبەستیش لە منداڵە چەپەڵ و لاسارەکان: ئەو مەرایی‌کەرانەن کە خاوەنی عەقڵ و فامی منداڵانەن.. مەبەست لەو خراپکارە هەرزانەش: ئەو مولحیدانەن کە لاسایی ئەورووپایی‌یەکان دەکەنەوە و شارەزای هیچ ئایینێك نین.. بیانی‌یە سەیرکەرەکانیش: ئەو ڕۆژنامەنووسانەن کە بیر و بۆچوونی بیانی‌یەکان بڵاو دەکەنەوە.

ئنجا هەموو یەکێکی موسـڵمانان بـە تایبـەت کەسـانی خـاوەن فـەزڵ و کـەماڵ - هـەر یەکە و بەپێی پلەی خۆی - شوێنێکی لەم مزگەوتـە بەسـام و شـکۆیەدا هەیـە و بـەپێی ئـەو شوێنەی سـەرنجی ئاراستە دەکرێت و بۆی دەڕوانرێت. جـا ئەگـەر ئـەو کەسـە چـەند کردارێکی بـەپێی فـەرمانی ئـەحکام و حەقیقەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز ئـەنجام دا و ئـەو کردارانەشی ئیخـلاس و ڕەزامـەندیی خـوای گـەورەیان پێـوە دیـار بـوو، کـە بناغـەی ئیسلامەتین.. هەروەها زمانی حـاڵی هەڵسوکەوتەکانی واتـای چـەند ئایـەتێکی قورئـانی پیرۆزی خوێندەوە، ئـەوا ئـەو دوعایـە دەیگرێتـەوە کـە هـەموو یـەکێك لـە موسـڵمانانی جیهانی ئیسلامی دەیکەن و دەڵێن: "اللّهم اغفر للمؤمنين والمؤمنـــات" و، لـەم ڕێیـەوە بەشێکی لەو دوعایـە دەسـت دەکـەوێت و، پەیوەندییـەکی برایانـەی لەگـەڵ سـەرجەمی ئیمـاندارانـدا بـۆ دروسـت دەبێـت. بـەڵام شـوێنەکەی لـە پێش‌چـاوی هـەندێك لــەو گومڕایانەدا دەرناکەوێت کە بە وێنەی ئاژەڵ و مێرووی زیانبەخشن و، پلەوپایەکەشی لە لایەن ئەو نەفامانەوە نابینرێت کە وەك منالی ڕیش لێهاتوو وان!

خۆ ئەگەر بێـت و ئەو مرۆڤە پشت لە مایەی شانازیی باپـیرانی هـەڵبکات، کـە هێمـای شەرەفی ئەون.. هەروەها مێژووەکەی لە بیر خۆی بباتەوە، کە بـە مایـەی شـانازیی خـۆی دادەنێت و.. ڕاستەشەقامی نوورانیی پیاوچاکانی پێشین واز لـێ بهێنێت، کە بە پاڵپشـتی "ڕۆح"ی خۆی دەزانێت و.. لـە پێنـاوی بەدەستهێنـانی ناوبـانگ و بیدعـەتکاریدا چـەند کردار و ڕەفتـارێکی نواند، کـە بـە ڕیـا و هـەوا و ئـارەزوو چەپەڵ بووبوون.. ئـەوا لــە ناوەرۆکدا و لە پێش چاوی ئەهلی حەقیقەت و ئیماندا بەردەبێتەوە بۆ نزمـترینی پلـەکان. چونکە ئیماندار هەرچەندەش جاهیل و عەوام بێت و لە ڕێی "ژیری"یەوە پەی بـە هـەندێ شت نەبات، بەڵام بـە "دڵ" هەستیان پێ دەکـات و نـەفرین لـە کـرداری هاوچەشـنی ئـەم مرۆڤە دەکات کە لە خۆیان ڕازین، بەپێی ناوەرۆکی فەرموودەی پیرۆزی:

"اتقوا فراسةَ المؤمنِ فإنّه ينظرُ بنورِ اللهِ"[1].

بەم جۆرە، مرۆڤی خۆپەرستی شەیدای پلە و پایە کە بە دوای ناوبانگدا هەناسەبڕکێی پێ کەوتووە (واتە: پیـاوی دووهـەم) لـە پێش‌چـاوی کۆمەڵـە زۆرە لەژمارەنەهاتووەکـەدا بەرەو پلەی نزمی: "أسفل سافلين" بەر دەبێتەوە و، لە لای چەند هەرزەیەکی گاڵتـەکاری سووك و لەڕێ ترازاویشدا ڕێ و شوێنێکی شووم و کاتیی دەست دەکەوێت. چونکە لـە

(١) رواه الطبراني في الكبير (٧٤٩٧) وابو نعيم في الحلية (٩٤/٤) قال الهيثمي في المجمع (٢٦٨/١٠) واسناده حسن. وانظر التفصيل في كشف الخفاء ٤٢/١.

دنیادا جگە لـە چـەند هـاوەڵێکی سـاختە و زیانبـەخش نـەبێ کەسـی تر لـە دەوری خـۆی نابینێت کە هەر ئەوانیش دەبن بەهۆی سزای بەرزەخی و لـە دوارۆژیشـدا دوژمنایـەتیی دەکەن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿الأَخِلاَّءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلاَّ الْمُتَّقِينَ﴾ (الزخرف:٦٧).

بەڵام پیاوەکەی حاڵەتی یەکەم، گەر حەز و خۆشەویستیی پلە و پایە لـە دڵـی خـۆی‌دا لانەبات، ئەوا جۆرە پلەیەکی مەعنەویی مەشرووع و بەسـام و شـکۆ بەدەسـت دەهێنێـت، کە ئەمەش بە تەواوەتی دەماری ئەو حەز و خۆش ویستنی پلە و پایەیە – کە تیای‌دا ڕەگـی داکوتـاوە – تـێر و دڵنیـا دەکـات، بـە مـەرجێ ئیخـلاس و ڕەزامـەندیی خـوای گـەورەی کردبێت بە بناغەی کارەکانی و حەز لـە مەنسـەب و ویستنی پلـە و پایـەی نـەکردبێت بـە ئامانجی خۆی.

جا ئەم پیاوە شتێکی کەم، بگرە هەر زۆر کەم و بێ بایـەخی لەدەسـت داوە، بـەڵام لـە بریی ئەوە شتێکی گەلـێ زۆری تابلێیی بەنرخ و بێ زیانی دەست کەوتووە. تەنانەت چەند مار و هەژدیهایـەکی لـە خـۆی دوور خسـتووەتەوە و لـە بریـی ئـەوان گەلـێ بەدیـهاتووی پیرۆزی کردووە بە هاوڕێی خۆی و دڵی پێیان دەکرێتـەوە. یـان وەك ئـەو کەسـە وایـە کـە زەردەواڵەکانی دەوروبەری ڕادەفڕێنێت، بەڵام پـوورەی هـەنگ لـە جێگایـاندا بـۆ خـۆی دادەنێـت، کە ساقیی شەرابی ڕەحمەتن و هەنگوینیان لەدەسـت وەردەگرێـت! واتـە هێنـدە کەسانی خۆشەویستی دەست دەکـەوێت کـە لـە ڕیزنـەی دوعاکـانی خۆیـاندا بەشـداری دەکـەن و شـەربەتێکی سەلسـەبیلی وەك کەوسـەریش دەرخـواردی ڕۆحـی دەدەن کـە لەمسەر و ئەوسەری جیهانی ئیسلامی‌یەوە بـۆی دەهێنرێـت و، لـەو ڕێیـەوە پاداشـت لـە دەفتەری کردەوەکانی‌دا تۆمار دەکرێت.

جارێکیـان نـاوەرۆکی ئـەم نموونەیـەی پێشـووم بـە توندوتیـژی و هـێزەوە دا بـە ڕووی مرۆڤێکی بچووکدا کە پلە و پایەیەکی دنیایی گەورەی وەرگرتبوو، ئەوەی کە لە پێناوی ناوبانگدا گەوجایەتی‌یەکی گەورەی ئەنجام دا و بوو بـە مایـەی سـووکایەتی پێ کردن لـە لایەن جیهانی ئیسلامی‌یەوە..

ئەم دەرسە زۆر بە توندی ڕاپچڵەکاند.. بەڵام لەبەر ئەوەی نەمتوانی بـە تـەواوی خـۆم لـە خۆشویسـتنی مەنسـەب و پلـە و پایـە ڕزگـار بکـەم، ئـەوا ڕاچڵەکاندنەکـەم بێـداری نەکردەوە!

❑ فرِوفێڵی دووهەم:

هەست کردن بە "ترس" هەستێکی قووڵە لە ناخی مرۆڤدا. سەرسەختان و ستەمکارە فێڵبازەکانیش گەلێ جار ئەم هەستەی مرۆڤ دەقۆزنەوە و کەسانی ترسنۆکی پێ لەغاو دەکەن! هەروەك زۆربەی جار جاسووسەکانی ئەهلی دنیا و بانگەوازکارانی گومڕاییش سوودێکی زۆر لەم هەستە دەبینن لە لای زۆرینەی خەڵکی، بە تایبەت زانایان. چونکە ترس و بیم دەخەنە دڵیانەوە و وەهم و گومانەکانیان تێدا دەورووژێنن!

جا بە وێنەی ئەوەی کە ئەگەر کەسێکی فێڵباز لە سەربانی خانوویەکەوە مرۆڤێك بترسێنێت و شتێکی ئەوتۆی پیشان بدات کە مایەی ترسی ئەو مرۆڤە بێت و وردە وردە بەم ترساندنەوە پشتاوپشت بەرەو دواوە بیبات هەتا لە لێواری سەربانەکە نزیکی دەخاتەوە و ئنجا بە پشتدا بیخاتە خوارەوە و بەم جۆرە تیا بچێت.. گومڕاایانیش بە هەمان جۆرن، دەچن دەماری ترس و لەرزی خەڵکی دەجووڵێنن و لەم ڕێیەوە و لە ئەنجامی چەند مەترسییەکی نزم و بێ نرخەوە وایان لێ دەکەن کە واز لە گەلێ کاروباری گەورە و گرنگ بهێنن. تەنانەت هەندێکیان لە ترسی پێوەدانی مێشوولە پاشەوپاش دەگەڕێنە دواوە تا دەکەونە ناو دەمی هەژدیهاوە!

وا نموونەیەك دەهێنمەوە:

ئێوارەیەکیان هاتم بۆ لای پردەکەی ئەستەمبووڵ و زانایەکی مەزنیشم لەگەڵدا بوو - خوا لێی خۆش بێت - کە دەترسا سواری بەلەم بێت! بەڵام جگە لە بەلەم هیچ هۆکارێکی تری گواستنەوەمان دەست نەکەوت و ناچاریش بووین بڕۆین بۆ مزگەوتی "ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری". بۆیە جەختم لێ کرد کە سواری بەلەم بین، چونکە ڕێگاچارەی ترمان لە بەردەستدا نییە.

وتی:

- دەترسم.. لەوانەیە بخنکێین!

پێم وت:

- ژمارەی بەلەمەکانی ئەم کەنداوە بە چەند بەلەم مەزەندە دەکەیت؟

وتی:

- لەوانەیە هەزار بەلەم بین.

وتم:

- لە ساڵێکدا چەند بەلەم نوقمی ئاو دەبن؟

وتی:

- یەك دوانێك، لەوانەشە لە چەند ساڵێكدا هیچیان ژێر ئاو نەكەوێت!

وتم:

- ساڵێك چەند ڕۆژە؟

وتی:

- سێ سەد و شەست ڕۆژ.

وتم:

- گریمانی ئەو خنكان و نوقم بوونەی كە بەسەر زەینتدا زاڵ بووە و ترسی تۆی هەژاندووە گریمانێكە لە نێوان سێ سەد و شەست هەزار گریماندا. جا ئەو كەسەی كە لەو گریمانە بترسێت، نە بە مرۆڤ دادەنرێت و نە بە ئاژەڵ!

پاشان پێم وت:

- بە مەزەندەی خۆت چەندەی تر دوای ئێستا دەژییت؟

وتی:

- من پیرێكی بەتەمەنم، لەوانەیە هەر تەنها دە ساڵی تر بژیم!

وتم:

- گریمانی مردن لە هەموو ڕۆژێكدا هەیە، چونكە ئەجەل سەبارەت بە ئێمەوە شارراوە و پەنهانە. واتە سێ هەزار و شەش سەد گریمانی مردنت لە ڕێدایە. كەواتە گریمانی مردن وەك هی ژێر ئاو كەوتنی بەلەمەكە نی یە كە گریمانێكە لە نێوان سێ سەد هەزار گریماندا. بەڵكو گریمانێكە لە نێوان سێ هەزاردا و لەوانەیە هەر ئەمڕۆ ئەو گریمانەش ڕوو بدات! كەواتە دەبێ ترست لێ بنیشێت و دەست بە گریان بكەیت و هەر ئێستا وەسیەتەكەشت بنووسیت!

ئەم قسەیەم كاری تێكرد و گەڕایەوە بۆ لای ژیریی خۆی و، ئنجا هەرچەندەش لەرزی لێ هاتبوو كەچی سواری بەلەمم كرد! پاشان لەناو بەلەمەكەدا پێم وت:

خوای گەورە بۆیە هەستی "ترس"ی پێ بەخشیوین تاكو ژیانی پێ بپارێزین، نەك بۆ ئەوەی بیكەین بە هۆكارێك بۆ ڕووخاندنی ژیانەكەمان و ئەم ژیانە لە خۆمان بكەین بە ئازار و مایەی سەختی و گیروگرفت. جا ئەگەر "ترس" لە نێوان "دوو" یان "سێ" بگرە "پێنج شەش" گریماندا سەری هەڵدابێت، ئەوا لەوانەیە حسابی بۆ بكرێت و بە ترسێكی ڕەوای لە جۆری "حەزەر كردن" دابنرێت. بەڵام گەر ئەو ترسە گریمانێك بێت لە نێوان

"بیست" یان "چل" گریمانداا ئەوا بە "ترس" دانـانرێت بـەڵكو "وەهـم"ێكـە بەسـەر مرۆڤـدا زاڵ بووە و ژیانی لـێ دەكات بە ئەشكەنجە و دەردی سەری.

دەسا برایانم!

گەر ئەو كەسانەی كلكەلەقێ بۆ گومڕایان دەكەن و بە مـەرایی و دووڕوویـی خۆیـان لە ئەهلی ئیلحاد دەبەنە پێشەوە.. گەر ئەوانە هێرشیان كـردە سـەرتان تـاكو بتانترسێنن و واتان لـێ بكەن واز لـەو جیهادە مەعنەوی‌یە پیرۆزەتان بهێنن، پێیان بڵێن:

ئێمە حیزب و دەسـتەی قورئـانین.. خۆمـان بـە قـەڵای مەحكـەمی قورئـانی پـیرۆز پـەنا دەدەیـن. خـۆ قورئـانی پـیرۆزیش پـەروەردگاری مـەزن پارێزگـاریی دەكـات، وەك خـۆی فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر:٩). ئێمە شوورایەكی مەزن دەورەی داوین كە بریتی‌یە لە شوورای: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران). كەواتـە ئێوە هەرگیز ناتوانن – بە ئیختیـاری خۆمـان – بـەرەو ڕێگایـەك ڕاپێچمـان بكـەن كـە بێ هیچ گومـانێك هـەزاران زیـان بـە ژیـانی هەمیشـەیی‌مان دەگەیـەنێت، لـە ترسـی زیـانێكی سادەی ئەوتۆ كە گریمانی یەك لە هەزارانی ئەوەی تێدایە بتوانێت زیان لەم ژیانە كورتـەی دنیامان بدات.

هەروەها پێیان بڵێن: كام لە ئێمە، یان كێی وەك ئێمە بەهۆی "سەعیدی نوورسی"یەوە تووشی زیان بووە كە لە خزمەتكردنی قورئانی پیرۆزدا هاوڕێمانە و لە جێبەجێ كردنـی ئەو خزمەتە پیرۆزەشدا مامۆستامانە و لە كاركردنیشـدا ڕابەرمانە؟ یـان كـێ لـە قوتابی‌یـە تایبەتمەندەكانی گرفتـاری بەڵایـەك بـووە هـەتا ئێمـەش گرفتـاری ببین؟ یـان لـە ترسـی ئـەو بەڵایەی كە لەوانەیە تووشی ببین بشلەژێین و خەم و پەژارە سـەرمان تـێ بكـات! خـۆ ئـەم برایـەمان هـەزاران هـاوڕێ و بـرای ئاخیرەتی هەیـە، كـەچی نزیكـەی سـی سـاڵە نـەمان بیستووە یەكێك لەو برایانەی تووشی زیانێك بوو بێت، هەرچەندەش لەو ماوە ناوبراوەدا هێز و چەكوشی سیاسەتی گرتبوو بە دەستەوە و بە چەشنێكی كاریگەریش تێكەڵی ژیانی كۆمەڵایەتی دەبوو. خۆ ئێستا لـە بریـی چەكوشـی سیاسـەت تەنـها نـووری حەقیقـەتی بـە دەستەوەیە. ئنجـا هەرچـەندەش كـاتی خـۆی نـاوی خرایـە ڕیـزی ئـەو كەسـانەی كـە بەشـداری‌یان لـە ڕووداوەكـانی "٣١ی مـارت"دا[1] كردبـوو، هـەروەها هـەندێك لـە

(١) ڕووداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ (بە تەقویمی ڕۆمی) بریتی‌یە لە هەڵگەڕانەوەیەكی سەربازی و ملنەدانی سەربازەكان بۆ فەرمانی فەرماندەكانیان. ئەم ڕووداوە یەكەم جار لە سەربازگەی "تاش قشلە"ی ئەستەمبووڵ

هاوەڵەکانی ئەویشیان لەو ڕووداوەدا لەناو برد، کەچی دوایی دەرکەوت ڕووداوەکە لەلایەن چەند کەسانێکی ترەوە ئامادە و ساز کرابوو. هاوڕێکانیشی نەك بەهۆی هاوڕێیەتیی ئەمەوە، بەڵکو بەهۆی دوژمنانیەوە تووشی زیان هاتن. ئەمە جگە لەوەی کە زۆر کەسیشی لە هاوڕێیانی خۆی لە دەمێ ئەو ڕووداوانەدا لە تیاچوون ڕزگار کرد.

جا برایانم!

دەبێ ئێوە لەسەر بناغەی ئەمانەی باس کران، بە مەرایی کەران و ئەڵقە لە گوێیانی گومڕایان بڵێن:

(ئێمە هەرگیز بەوە ڕازی نابین کە لەبەر "ترس"ی گریمانێك لە نێوان هەزار بەڵکو هەزاران گریماندا گەنجینەیەکی هەمیشەیی‌مان لەدەست دەربچێت. کەواتە ئەی شەیتانە ئینسییەکان! هەرگیز بیر لەم کارە مەکەنەوە)!

بەڵێ برایانم! دەبێ ئێوە دەریان بکەن و ئەم گوفتارە بە سەروگوێلاکیاندا بدەن.

هەروەها بەو مەرایی کەرانە بڵێن:

ئەگەر گریمانی تووشبوون و لەناوچوونمان تەنانەت بەڕێژەی سەدلە سەدیش بێت - نەك یەك لە هەزاران - ئەوا گەر هێندەی کێشی گەردیلەیەك ژیریمان بێت واز لە "سەعید نوورسی" ناهێنین و دەستی لێ هەڵناگرین، چونکە بە چەندین تاقیکردنەوەی

---

سەری هەڵدا، پاشان سەربازگەکانی تری شاری گرتەوە و، ئنجا سەربازە هەڵگەڕاوەکان ڕژانە ناو شەقامەکان و هەندێ وەزیر و پەرلەمانتار و ئەفسەریان کوشت. خۆ ئەگەر ئەو وتارانەی "مامۆستا نوورسی" نەبوایە کە دەڕۆشت لەناو سەربازگەکانیاندا ئاراستەی دەکردن لەوانەبوو گەلێ ئاکامی ناهەموارتر لەو هەڵگەڕانەوەسەربازی‌یە بکەوتایەتەوە، بەڵام وتارەکانی مامۆستا هۆکارێکی گرنگ بوون لە هێدی کردنەوەی سەربازە هەڵگەڕاوەکاندا. ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژی ١٣/نیسان/١٩٠٩زدا دەستی پێ کرد، واتە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتیەت(ڕژێمی پەرلەمانی)ی دووهەم و هاتنەسەرحوکمی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی. ئنجا سولتان عەبدولحەمید بە ناهەق تاوانبار کرا بە سازدانی ڕووداوەکە و، کۆمەڵەی ناوبراو کۆمەکی سەربازیی لە شاری سولانیکەوە - کە بنکەی سەرەکی‌یانی لێ بوو - هێنایە ناو شاری ئەستەمبوول. خۆ هەرچەندە سولتان عەبدولحەمید دەیتوانی ئەو هێزە سەربازی‌یە تەفروتوونا بکات، بەڵام لەبەر نەڕشتنی خوێنی ناهەق لە ڕووداوێکدا کە دەستێکی گومان لێکراوی پەنهانی لە پشتەوە بوو ڕووبەڕووی ئەو کۆمەکە سەربازی‌یە نەبووەوە. دوابەدوای گەیشتنی هێزە سەربازی‌یەکەش یەکسەر باری نائاسایی لە شاردا ڕاگەیەنرا و هەڵگەڕانەوەکەش سەرکوت کرا و دادگای سەربازی پێکهێنرا و گەلێ کەسی پێ لە سێدارە درا. ئنجا کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ئەم ڕووداوەی قۆزتەوە و لە ٢٧/نیسان/١٩٠٩دا سولتان عەبدولحەمیدی لەسەر کورسیی خەلافەت و پادشایی لابرد. بەم جۆرە و لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت کە ڕووداوەکە هەر لە بناغەدا بۆ ئەو دەرەنجامە ساز کرابوو! (وەرگێڕ)

زۆر بینراوە و ئێستاش هەر دەبینرێت کە هەر کاتێ گیروگرفت و موسیبەت دادەبارێت یەکەم جار ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە دەمی تەنگانە و ڕۆژانی سەختدا بە چاوی سووکەوە دەڕواننە مامۆستا و برایانی گەورەی خۆیان، جگە لەوەی کە مامەڵەیەکی ستەمکارانە و دوور لە بەزەیی‌شیان لەگەڵدا دەکرێت و بە وێنەی کەسانی نزم و بێ نرخ سزا دەدرێن. ئیتر جەستەکانیان لە زەلیلی و سووکایەتی‌دا دەمرێت و گیانەکانیشیان تیا دەچێت. ئنجا ئەوانەش کە سزایان دەدەن بەزەیی‌یان پیایاندا نایەتەوە، چونکە دەڵێن: ئەمانە گەلێ نزم و بێ نرخن، ئەوەتا خیانەتیان لە مامۆستا بەسۆز و میهرەبانەکەی خۆیان کردووە! کەواتە لە بریی سۆز و بەزەیی، شایانی سووکایەتی پێ کردنن!

جا مادەم حەقیقەت بەم جۆرەیە و.. لە لایەکی تریشەوە گەر بابای ستەمکار مرۆڤێکی لە ژێر پێی خۆی‌دا پلیشاندەوە و ستەم لێکراوەکەش لێی پاڕایەوە و پێی ستەمکارەکەی ماچ کرد، ئەوا بەهۆی نواندنی ئەو زەلیلی‌یەوە لە پێش "سەر"ی‌دا "دڵ"ی ورد و خاش دەبێت و، پێش "جەستە"شی "گیان"ی دەمرێت، ئنجا هەروەك سەری تیا دەچێت عیززەت و شەرەفیشی لەگەڵدا دەڕوات. چونکە دەربڕینی لاوازی‌یەکەی لە بەردەم ئەو ستەمکارەدا، هانی ستەمکارەکە دەدات کە پتر بیهاڕێت و زیاتر بیپلیشێنێتەوە!

بەڵام گەر تف بکاتە ڕووی ئەو ستەمکارە، ئەوا "دڵ" و "گیان"ی ڕزگار دەکات و "جەستە"شی دەبێ بە شەهیدێکی ستەم لێکراو.

بەڵێ، ئێوەش تف لە ڕووی بێ شەرمانەی ستەمکاران بکەن!

کاتێ ئینگلیزەکان (لە جەنگی جیهانی‌دا) تۆپەکانی دەربەندیان تێکشکاند و ئەستەمبووڵیان داگیر کرد، سەرگەورەی قەشەکانی کەنیسەی ئینگلیکی شەش پرسیاری ئاراستەی "مەشیەخەتی ئیسلامی" کرد، کە ئەو دەمە لە "دار الحكمة الإسلامية"دا ئەندام بووم. پێیان وتم:

وەڵامی پرسیارەکانیان بە شەش سەد وشە بدەرەوە، وەك خۆیان دەستنیشانیان کردووە.

وتم:

وەڵامی ئەم پرسیارانە: نە شەش سەد و نە شەش وشە و نە یەك وشەیە، بەڵکو تەنها یەك تفە کە بکرێتە ناوچاویان!

چونکـە لـەم کاتـەدا کـە ئـەو دەوڵەتـە پێـی ناوەتـە سـەر دەربـەندەکانمان و وەك لەبەرچاوتاندایە دەستیان لە گەرووماں گیر کردووە، دەبێ تـف بکرێتە رووی سـەرۆکی قەشەکانیان لە بەرامبەر ئەو پرسیارانەوە کە بە هەموو کەشـوفش و لەخۆباییبوونێکیـەوە ئاراستەی کـردوون. هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو کـە پێـم وتـن: تـف لـە چارەی بـێ نرخـی ستەمکاران بکەن!

ئێستاش دەڵێم:

لەو کاتەدا کە دەوڵـەتێکی گـەورەی وەك ئینگلیز وڵاتی ئێمـەی داگیر کردبوو، بە زمانی چاپخانەکان وەڵامم دانەوە و تەحەددام کردن، لە کاتێکدا کـە تیاچوونم حـەتمی و بە رێژەی لە سەدا سەد بوو. کەچی پارێزگاریی قورئانی پیرۆز منی پاراست و سەروزیادم بوو. بێ گومان هەر ئەم پارێزگارییەی قورئان سەد ئەوەندە زیاتر سەروزیادی ئێوەشە لـە بەرامبەر زیانێکەوە کە لەوانەیـە بـە ئیحتیمـالی یـەك لـە سـەد لـە لایـەن ستەمکارانەوە بێتە رێتان.

پاشان ئەی برایانم!

زۆر کەس لە ئێوە لە ریزەکانی سوپادا خزمەتی کردووە و، ئەوانەشـتان سـەربازییان نەکردووە بێ گومان بیستوویانە و، ئەوانەش نەیانبیستووە با لە منی ببیستن:

زۆربـەی ئـەو کەسـانەی لـە جـەنگدا برینـدار دەبـن و دەپێکرێـن ئەوانـەن کـە لـە سەنگەرەکانیان دەردەچن و هەڵدێن، هـەروەك کـەمترین ژمـارەی پێکراوانیش لـە ریـزی ئەوانەدایە کە سەنگەرەکانیان بەجێ ناهێڵن! جا "واتای ئاماژەیی" ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿قُلْ إنَّ الْمَوْتَ الذي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإنَّهُ مُلاقِيكُمْ﴾ (الجمعة:٨) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەوانـەی لە مردن هەڵدێن لە کەسانی تر زیاتر رووبەرووی مردن دەبنەوە!

❑ **فروفێڵی سێهەمی شەیتان:**

شەیتانەکان زۆر کەس بە تەڵە و داوی "تەماع" ڕاو دەکەن!

لـە گەلـێ پـەیامدا بـە چـەندین بەڵگـەی گومـانبڕی ئـەوتۆ کـە لـە ئایـەت و ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆزەوە وەرمان گرتوون، چەسپاندوومانە کە:

"ڕۆزیی حەڵاڵ بە ڕێژەی دەستەوسانی و هەژاری دێتە دەسـتی مرۆڤ، نـەك بـە پلـەی توانا و ویست و ئیختیار".

گەلـێ بەڵگە و نیشانەی بێ سنووریش هەن کە ئەم حەقیقەتە ڕوون دەکەنەوە.

یەكێك لەوانە ئەوەیە كە:

"درەختەكان" - كە جۆرێكی زیندەوەرن و موحتاجی ڕۆزین - لە شوێنی خۆیاندا ڕاوەستاون، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆزی‌یەكانیان دێن بۆ لایان. كەچی "ئاژەڵەكان" لەبەر هەوڵ و هەڵپەیان بە دوای ڕۆزی‌دا، بە وێنەی درەختەكان گەشە ناكەن و خۆراك و نەشونمای تەواوەتی بەدەست ناهێنن! هەروەها تەمبەڵترین و گەڵحۆترین و لاوازترین و بێ دەسەڵاتترینی ماسی‌یەكان بە جوانترین شێوە خۆراكیان دەست دەكەوێت و بە شێوەیەكی گشتی لە پێش چاودا قەڵەو دەردەكەون، لە كاتێكدا، لەناو لم و بنكی دەریاكاندا دەژین. كەچی مەیموون و ڕێوی و ئاژەڵە زیرەك و بەتواناكانی هاوچەشنیان، لەبەر خراپیی گوزەرانیان، هەمیشە بە لاوازی دەژین!

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە هۆكاری بەدەستهێنانی ڕۆزی: "هەژاری"یە نەك "بەتوانایی"!

هەروەها ئەو خۆشگوزەرانی‌یەی كە ساوای ئادەمیزاد و بێچووی زیندەوەران تیای‌دا دەژین و.. ئەو شیرە پوخت و خاوێنەش كە وەك چاكەكاری‌یەكی نەرمونیان لە لایەن گەنجینەی میهرەبانیی خواوەندەوە و بێ ئەوەی لە حسابیاندا بووبێت، بە دیاری و سۆز و بەزەیی هاتنەوە بە هەژاری و دەستەوسانی‌یاندا، پێشكەشیان دەكرێت.. بەرامبەر بەمەش: سەختیی گوزەرانی ئاژەڵە دڕندەكان.. هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە: هۆكاری دەستكەوتنی ڕۆزیی حەڵاڵ دەستەوسانی و هەژاری‌یە، نەك توانایی و زیرەكی!

هەروەها ئەو جوولەكانەش كە - وەك بەناوبانگە - لە هەموو كەسێك زیاتر دەست لە داوێنی ژیانی دنیا گیر دەكەن، لە بواری كۆشش و هەوڵدان بە دوای ڕۆزی‌دا پێش هەموو نەتەوەكانی تر كەوتوونەتەوە. كەچی لە هەموو نەتەوەكانی تر زیاتر سووكی و ڕیسوایی‌یان هاتووەتە ڕێ و زیاتریش گرفتاری سەختیی گوزەران بوون، تەنانەت دەوڵەمەندەكانیشیان بە زەلیلی دەژین. ئەو سەروەت و سامانەی كە بە ڕیبا و ڕێگا نامەشرووعەكانی تر پەیدای دەكەن، هەرگیز ئەم مەسەلەیەی ئێمە زامدار ناكات، چونكە بە "ڕۆزیی حەڵاڵ" دانانرێت.

هەروەها زۆربەی "ئەدیبان" و "زانایان" بە ژیانی كولەمەرگی و دەستكورتی گوزەران بەسەر دەبەن، كەچی لە هەمان كاتدا گەلێ كەسی گێژ و گەڵحۆ و تەمبەڵ هەن كە هەڵدەگرێن و دەوڵەمەند دەبن..

هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هۆکـاری بەدەستهێنانی "ڕۆزی" زیرەکی و توانـای مـرۆڤ نییـە، بـەڵکو دەسـتەوسـانی و هـەژاری و تەسـلیم بوونـی ئاوێتـەی تـەوەککـول و دوعا و نزای زمانی گوفتار و حاڵ و کردارە.

ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُوالْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ (الذاريــــات:٥٨) ئـەم حەقیقەتـە ڕادەگەیەنێت و بەڵگەیەکی مەزن و بەهێزی ئەم دەعوایەمانە. بـە ڕادەیـەك کـە سـەرجەمی ڕووەك و زیندەوەران و ساوایانی ئادەمیزاد بە زمـانی حـاڵ دەیخوێننـەوە، تەنانـەت هـەموو دەستە و تاقمێکیان کە بە دوای ڕۆزیدا دەگەڕێن، دەیخوێننەوە و داوای "ڕۆزی"شی پێ دەکەن.

جا لەبەر ئـەوەی "ڕۆزی" لـە لایـەن "قـەدەر"ی خـوای گـەورە تـەقدیر کـراوە و، وەك نیعمەتێك ڕەوانە دەکرێت و، نیعمەتبەخش و تەقدیرکـەری ڕۆزییـش هـەر تەنـها خـوای گەورەیـە، کـە ئـەویش بەخشـندە و میهرەبانـە.. ئـەوا ئـەو کەسـەی کـە مـاڵ و سـامانێکی حەرام و چەپەڵ و بێ بەرەکەت وەردەگرێت و لـە بەرامبەریـەوە ویژدانـی خـۆی تەنانـەت هەندێ جار موقەددەساتیشی دەدات بە بەرتیل و بە چەشنێکی نامەشرووع ئـاوی ڕووی خۆی دەتکێنێت، بە ڕادەیەك کە تۆمەت دەخاتە پاڵ میـهرەبانیی خواوەندیش و گاڵتـە بـە بەخشندەیی ئەو دەکات.. با ئـەو کەسـە، بیر لـە مـەودای گێژی و شێتیی ئـەم ڕەفتـارەی خۆی بکاتەوە!

بەڵێ، ئەهلی دنیا - بە تایبەت گومڕایان - پارە و پوولی خۆیان بە هـەرزان نابەخشـن! بەڵکو لە بەرامبەر نرخ و بەهایـەکی یـەکجار گرانـەوە دەیفرۆشـن. چونکـە پـارە و پـوولی ئەوان لەوانەیە ماوەی ساڵێك درێژە بە ژیانێکی دنیایی بدات، بەڵام هەندێ جار دەبـێ بـە مایەی تیاچوونی گەنجینەیەکی ژیـانی هەمیشـەیی. ئیـتر مرۆڤ لـەو کاتـەدا کـە دەیـەوێت ڕەزامەندیی گومڕایانی پێ بەدەستبهێنێت، بەم هەڵپە یەکجار هەڵـە و بێ کەڵکـە، خـۆی دووچاری ڕقی خواوەند دەکات!

دەسا برایانم!

هەرکات مەرایی کەرانی ئەهلی دنیا و مونافیقانی ڕێچکەی گومڕایـی ئێوەیـان خسـتە نـاو تەڵـەی تەماعـەوە و بـەم دەمـارە لاوازەی کـە لـە مرۆڤدایـە ڕاویـان کـردن، بـیر لـەم ڕاسـتییەی پێشـوو بکەنـەوە و، ئنجـا ئـەم بـرا هەژارەشـتان بکـەن بـە نموونەیـەکی چاولێکراوی خۆتان.

وا من دڵنیاتان دەكەم كە "قەناعەت" و "دەستپێوەگرتن" گەلێ زیاتر لە "مووچە" درێژە بە ژیان و گوزەرانتان دەدات و پتر ڕۆزیشتان بۆ دەستەبەر دەكات. بە تایبەت ئەو پارە و پوولە نامەشرووعانەی كە بە ئێوە دەدرێت لە بەرامبەریەوە داوای چەندین قات، بەڵكو داوای هەزار هێندەی خۆیتان لێ دەكات! هیچ نەبێ ڕێ لەم خزمەتە قورئانییە دەگرێت، یاخود كەمی دەكاتەوە، كە خزمەتێكە هەموو سەعاتێكی دەتوانێت دەرگاكانی گەنجینەیەكی هەمیشەیی‌تان بۆ بخاتە سەرپشت. خۆ دیارە لەدەستچوونی ئەمەش زیانێكی هێندە گەورە و بۆشایی‌یەكی ئەوەندە ترسناكە هەزاران مووچە و مەعاش پڕی ناكەنەوە.

**بێداركردنەوەیەك:**

ئەو گومڕایانەی كە هەمیشە خەریكی نیفاق و نانەوەی فڕوفێڵن، كاتێ لە بەرامبەر ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمانەوە كە لە قورئانی حەكیمەوە وەرمان گرتوون و بڵاومان كردوونەتەوە دەستەوسان دەمێنن، دەچن تەڵەی فرت و فێڵ دەنێنەوە و لە هەموو ڕێیەكەوە هەوڵ دەدەن هاوڕێیانم لێ دوور بخەنەوە و بە داوەكانی: "مەنسەب ویستی" و "ترس" و "تەماع" لە خشتەیان بەرن و، ئنجا بەوەش كە هەندێ شتم بدەنە پاڵ تاكو لە بەرچاوی ئەواندا بمشكێنن و سووكایەتیم پێ بكەن.

ئێمە لەم خزمەتە پیرۆزەماندا تەنها بە چەشنێكی "ئیجابی" دەجووڵێینەوە. بەڵام دوورخستنەوەی ئەو ڕێگرانەی كە ڕێی هەر كارێكی خێرمان لێ دەگرن، هەندێ جار - بە داخەوە - ناچاری جموجوڵی "سەلبی"مان دەكات.

جا لە بەرامبەر ئەم پڕوپاگەندە خەڵەتێنەرانەی مونافیقانەوە، برایانم بەو سێ خاڵەی پێشوو بێدار دەكەمەوە و هێرشیان لێ دوور دەخەمەوە.

وا لەم كاتەی ئێستادا گەورەترین هێرش دەكەنە سەر خودی خۆم، چونكە دەڵێن: "سەعید كوردە، ئیتر بۆچی ڕێزی لێ دەگرن و شوێنی دەكەون"؟

بۆیە ناچارم بە زمانی سەعیدی كۆن و دوور لە حەز و ئارەزووی خۆم، چوارەم فڕوفێڵی شەیتان بنووسم، تاكو ئەو مونافیقانەی پێ دەمكوت بكرێت.

**❑ فڕوفێڵی چوارەمی شەیتان:**

هەندێ لەو مولحیدانەی كە مەنسەبی گرنگیان هەیە، هێرش دەكەنە سەرم و بڕەو بە چەند پڕوپاگەندەیەك دەدەن كە لە شەیتان و بە گوێداخوێندنی گومڕایانەوە

وەریان گرتوون، تاکو برایانم لەخشتە بەرن و دەماری نەتەوایەتی‌یان تێدا ببزوێنن. ئەوەتا پێیان دەڵێن:

(ئێوە تورکن، خۆ لە خوا بەزیاد بێ گەلێ مرۆڤی زانا و کەسی خاوەن فەزڵ و کەماڵ لەناو تورکەکاندا هەن. ئنجا ئەم سەعیدەش کابرایەکی کوردە، دیارە هاوکاری کردن لەگەڵ کەسێکدا کە لە نەتەوەی خۆتان نی‌یە پێچەوانەی غیرەتی نەتەوایەتی‌یە)!

وەڵام:

ئەی مولحیدی بەدبەخت!

سوپاس بۆ خوا من موسڵمانم و ئینتیسابم بۆ لای نەتەوە بەرز و بڵندەکەی خۆمە کە ژمارەیان لە هەموو چەرخێکدا سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن کەس دەبێت. خۆ من سەد هەزار جار پەنا بە خوا دەگرم لەوەی کە ئەم هەموو برا پاك و خاوێنانەم بەخت بکەم کە "برایەتیی هەمیشەیی" یەکی‌خستوون و، بە دوعا و نزا بێ‌گەردەکانیشیان پشتم دەگرن و زۆرینەی ڕەهای کوردەکانیشیان لە نێواندایە.. بەڵێ، پەنا بە خوا دەگرم لەوەی کە لە بریی ئەو هەموو برا خاوێن و پیرۆزانەم، بڕۆم دەست لە بانگەوازێکی دەمارگیری و قەومییەتی سەلبی گیر بکەم لە پێناوی بەدەستهێنانی خۆشەویستیی چەند کەسێکی کەمی دیاری‌کراو لەوانەی کە ناوی کوردیان هەڵگرتووە و لە ڕەگەزی کورد دەژمێررێن لەوانەی کە ڕێی ئیلحادیان گرتووەتەبەر و لە هەموو مەزهەب و ڕەوشتێك خۆیان داماڵیوە!

ئەی بابای مولحید! ئەمە ڕەفتاری کەسانی گەوجی وەکو تۆیە، کە دەچێ واز لە برایەتی‌یەکی ڕاستەقینە و نوورانی و سوودبەخشی کۆمەڵێکی مەزنی سێ‌سەد و پەنجا ملیۆن کەسی دەهێنێت لە پێناوی بەدەستهێنانی برایەتیی کافرەکانی مەجەڕ و چەند تورکێکی چاولێکەری ئەورووپا و لە ئایین دابڕاو، کە برایەتی‌یەکی تابلێی بێ سوودە تەنانەت لەم دنیایەشدا!

جا لەبەر ئەوەی لە مەسەلەی سێ‌هەمی "مەکتووبی بیست و شەشەم"دا ماهییەت و زیانەکانی قەومییەتی سەلبیمان بە بەڵگەکانیەوە ڕوون کردووەتەوە، ئەوا درێژەی ئەم باسە بەو پەیامە دەسپێرین و، لێرەدا بەم جۆرەی خوارەوە هەندێ درێژە بە حەقیقەتێك دەدەین کە لە کۆتایی ئەو مەسەلەی سێ‌هەمەدا بە پوختی هێنراوە:

ڕووی گوفتاریشم ئاراستەی ئەو مولحیدانە دەکەم کە لە ژێر پەردەی قەومییەتی تورکی‌دا لافی جوامێری و غیرەت لێ دەدەن و لە ڕاستیشدا دوژمنی نەتەوەی تورکن..

پێیان ده‌ڵێم:

من په‌یوه‌ندی‌یه‌كی یه‌كجار توندوتۆڵم به‌ ئیماندارانی ئه‌م نیشتمانه‌وه‌ هه‌یه‌ كه‌ پێیان ده‌وترێ "تورك" له‌وانه‌ی كه‌ له‌ ڕێی برایه‌تی‌یه‌كی ڕاست و ئه‌به‌دی و ڕاسته‌قینه‌وه‌ په‌یوه‌ندی‌یه‌كی به‌هێزیان به‌ نه‌ته‌وه‌ی ئیسلامه‌وه‌ هه‌یه‌. هه‌روه‌ها به‌ فه‌خر و شانازی و به‌ناوی ئیسلامه‌وه‌ وه‌لاء و خۆشه‌ویستی‌یه‌كی قووڵم بۆ ڕۆڵه‌كانی ئه‌م نیشتیمانه‌ هه‌یه‌ كه‌ نزیكه‌ی هه‌زار ساڵ ئاڵای شه‌كاوه‌ی قورئانیان به‌سه‌ر جیهاندا هه‌ڵكردبوو.

به‌ڵام تۆی لافلێده‌ر و فێڵباز ته‌نها برایه‌تی‌یه‌كی ناڕاستی مه‌جازی و كاتیت له‌گه‌ڵیاندا هه‌یه‌، كه‌ له‌سه‌ر بناغه‌ی "ده‌مارگیری" و "ئامانجه‌ كه‌سی‌یه‌كان" بنیات نراوه‌ و به‌ چه‌شنێكه‌ ئه‌و شتانه‌ پشتگوێ ده‌خات كه‌ مایه‌ی شانازیی ڕاسته‌قینه‌ی نه‌ته‌وه‌ی توركن.

وا من لێت ده‌پرسم:

ئایا "نه‌ته‌وه‌ی تورك" هه‌ر ته‌نها چه‌ند لاوێكی بێ‌ئاگان له‌وانه‌ی كه‌ به‌ دوای هه‌وا و ئاره‌زوودا وێڵن و ته‌مه‌نیان له‌ نێوان بیست تا چل ساڵاندایه‌؟

ئایا ئه‌و سوود و به‌رژه‌وه‌ندی‌یانه‌ی كه‌ غیره‌تی قه‌ومی به‌ پێویستیان ده‌زانێت بۆ ئه‌وانه‌، ته‌نها له‌وه‌دایه‌ كه‌ له‌ شێوه‌ی لاسایی كردنه‌وه‌ی ئه‌ورووپادا په‌روه‌رده‌ بكرێن، كه‌ ئه‌مه‌ش بێ‌ئاگایی‌یان پتر زیاد ده‌كات و له‌سه‌ر خراپكاری و به‌دڕه‌وشتی ڕایانده‌هێنێت و بۆ ئه‌نجامدانی تاوان و گوناهه‌ گه‌وره‌كان هانیان ده‌دات؟ یان ئایا له‌وه‌دایه‌ كه‌ به‌ره‌و ڕابواردن و پێكه‌نینێكی كاتی بدرێنه‌ به‌ر كه‌ چه‌ندین ڕۆژی ته‌مه‌نی پیری‌یان فرمێسكی گریانی په‌شیمانیی بۆ هه‌ڵبڕێژن؟

جا ئه‌گه‌ر غیره‌تی نه‌ته‌وایه‌تی له‌م شتانه‌دایه‌ و..

پێشكه‌وتن و به‌خته‌وه‌ریی ژیانیش بریتین له‌مانه‌ و..

تۆش خه‌ڵكی بۆ ئه‌م جۆره‌ قه‌ومییه‌ته‌ توركی‌یه‌ بانگ ده‌كه‌یت و به‌م شێوه‌یه‌ داكۆكی له‌ نه‌ته‌وه‌ ده‌كه‌یت..

ئه‌وا من تا ده‌توانم له‌م بانگه‌وازی قه‌ومییه‌تی توركی‌یه‌ هه‌ڵدێم و، تۆش بۆت هه‌یه‌ له‌ من هه‌ڵبێیت!

خۆ ئه‌گه‌ر هێنده‌ی كێشی گه‌ردیله‌یه‌ك هه‌ست و شعوور و ویژدان و غیره‌تی نه‌ته‌وایه‌تیی ڕاسته‌قینه‌ت تێدایه‌، ئه‌وا سه‌یری ئه‌م دابه‌شكردنه‌ی خواره‌وه‌ بكه‌ و ئنجا وه‌ڵامیان بده‌ره‌وه‌:

ڕۆڵەكانی ئەم نیشتمانە، كە بە "تورك" ناو دەبرێن، دەكرێن بە شەش بەشەوە.

بەشی یەكەم: ئەهلی تەقوا و صەلاحەتن.

بەشی دووهەم: كەسانی نەخۆش و زیان لێكەوتووان و گیرۆدەبووانی بەلاّ و موسیبەتن.

بەشی سێهەم: پیرانن.

بەشی چوارەم: منالاّنن.

بەشی پێنجەم: هەژاران و كەسانی دەستكورتن.

بەشی شەشەم: لاوانن.

ئایا پێنج بەشەكانی یەكەم بە "تورك" دانانرێن؟ ئایا ئەوان هیچ بەشێكیان لە غیرەتی نەتەوایەتیدا نییە؟ ئایا ئەو كارە بە سەربەرزیی نەتەوایەتی دادەنرێت كە ئازاری پێنج تاقمەكەی یەكەم بدرێت و خۆشی و حەوانەوەیان لێ زەوت بكرێت و ئارامییان بشێوێنرێت و دڵنەواییان لێ تێك بدرێت لە پێناوی دەستەی شەشەمدا كە خۆشحاڵییەكی مەستكەری لەخشتەبەر پێشكەش بە دەروونیان بكرێت؟ ئایا ئەمە غیرەتنواندنە یان دوژمنایەتی كردنە لەگەڵ نەتەوەدا؟ خۆ ئەو كەسەی كە زیان بە "زۆرینە" دەگەیەنێت – بێ گومان – بە دوژمن دادەنرێت نەك دۆست، چونكە هەر بڕیارێك كە دەردەكرێت لەسەر بناغەی "زۆرینە" بنیات دەنرێت.

وا من لێت دەپرسم:

ئایا مەزنترین سوودی بەشی یەكەم (كە ئەهلی تەقوا و صەلاحەتن) لە شارستانێتییەكی لاسایی كەرەوەی ئەوروپادایە؟ یان لە گرتنەبەری ئەو ڕێگە حەق و ڕەوایەدایە كە موشتاقن بۆی و، لە دۆزینەوەی دڵدانەوەی ڕاستەقینەی نوورەكانی ڕاستییەكانی ئیماندایە كە بە یادكردنەوەی بەختەوەریی هەمیشەیی بەدەستی دەهێنن؟

ئەم ڕێگایەی كە تۆ و گومڕایانی هاوچەشنی تۆ لە لافلێدەرانی نەتەوایەتی دەیگرنەبەر، ڕێیەكە سەرجەم ڕووناكییە مەعنەوییەكانی ئیمانداراانی خاوەن تەقوا دەكوژێنێتەوە و دڵدانەوە ڕاستەقینەكەیان لێ دەشێوێنێت و مردنیان وەك ئیعدامێكی هەمیشەیی لە بەرچاودا پیشان دەدات و دەرگای گۆڕیشیان بە دەرگای جودایی هەتاهەتایی پێشچاو دەخات.

یان ئایا سوودی بەشی دووهەم (كە نەخۆش و گیرۆدەبوان و كەسانی نائومێدن لە ژیانی خۆیان) لەوەدایە كە بە پەروەردەیەكی شارستانیی دوور لە ئایین و

لاسایی کەرەوەی ئەورووپا پەروەردە بکرێن؟ لە کاتێکدا کە ئەو دڵتەنگ و گیرۆدەبووانە بە دوای ڕووناکی و دڵدانەوەدا دەگەڕێن و چاوەڕێی پاداشتن لەسەر ئەو گیروگرفتانەی هاتوونەتە ڕێیان و دەیانەوێت تۆڵەی خۆیان لە ستەمکارانیان بسێننەوە و چاوەڕێی لابردنی ترس و بیمن لە دەرگای ئەو گۆڕەی لێی نزیك بوونەتەوە.

بەڵام خۆ بەم غیرەتە درۆینەیەی کە تۆ و هاووێنەی تۆ لێی دەدوێن، چەندین زللەی توندوتیژ و ئازاربەخش دەسرەوێننە سەروگوێلاکی ئەو خاوەن گیروگرفتانەی کە تابلێی پێویستیان بە سەرەخۆشی لێکردن و بەزەیی پێدا هاتنەوە و زام سارێژکردن و نەرمونیانییە کە بەرامبەریان بنوێنرێت. کەچی ئێوە داخ و ئازاری سەخت بە دڵە زامدارەکانیاندا دەکەن کاتێ کە بێبەزەییانە لە ئاواتەکانیان هیوابڕاویان دەکەن و دەیانخەنە ناوەندی نائومێدییەکی بەردەوام و تاریکەوە!

ئایا ئەمەیە غیرەتی نەتەوایەتی؟ ئایا خزمەتی نەتەوە بەمە دەکەن و لەم ڕێگایەوە سوودیان پێ دەگەیەنن؟

دەستەی سێهەمیش (کە توێژی پیرانن و سێیەکی نەتەوە پێکدەهێنن) بەرەبەرە لە مردن و دەرگای گۆڕەکانیان نزیك دەبنەوە و لە دنیاش دوور دەکەونەوە و هاوسێی قیامەتن! جا ئایا دڵدانەوە و سوودی ئەم بەشەی نەتەوە لەوەدایە کە گوێ لە ژیاننامەی پڕ لە ستەم و غەدری ستەمکارانی وەك "جەنگیزخان" و "هۆلاکۆ" ڕابگرن؟ یان ئایا لەم چەشنە ڕەفتارەی ئێستای ئێوەدایە کە دواڕۆژ لە بیری مرۆڤ دەبەنەوە و بە دنیاوە دەیبەستنەوە؟ کە بریتین لە چەند کردارێکی بێ سوود و کەوتنە خوارەوە و بەربوونەوەیەکی مەعنەوی، هەرچەندەش بە ڕواڵەت ناوی پێشکەوتنیان لێ نراوە؟ ئایا ڕووناکیی ئاخیرەت لە سینەمادا و دڵدانەوەی ڕاستەقینەش لە شانۆدایە؟!

خۆ لەو کاتەدا کە ئەو پیرە لاوازانە چاوەڕوانی ڕێزلێنانن لە لایەن غیرەتمەندانەوە، کەچی - لە بریی ئەو ڕێزلێنانە - پێیان دەوترێت: ئێوە بەرەو ئیعدامی هەمیشەیی دەدرێنە بەر! کە ئەمەش دەرگای گۆڕیان - کە بە دەرگای میهرەبانیی دەزانن - لە بەرچاودا دەکات بە دەمی هەژدیهایەك هەڵیاندەلووشێت! بە چپە ئەوەش بە گوێی مەعنەوییاندا دەدرێت کە: ئێوە بەرەو ئەوێ دەڕۆن و کۆچ دەکەن!

خۆ ئەو چەشنە گوفتارانە بە وێنەی شیر و تیری مەعنەوی بە سەر هەستی ناسکی ئەواندا دادەبارێت و بە سەربڕینێکی مەعنەویش سەریان دەبڕێت!

جا ئەگەر غیرەتی نەتەوایەتی بریتی بێت لەم چەشنە ڕەفتارە، ئەوا من سەد هەزار جار پەنا بە خوای گەورە دەگرم لە غیرەتی نەتەوایەتی!

دەستەی چوارەمیش (کە منالآنن) ئەوا داوای سۆز و میهرەبانی لە غیرەتی نەتەوایەتی دەکەن و چاوەڕوانی شەفەقەتن لێیەوە.

خۆ تەنها "باوەڕبوون بە خواوەندی بەدیهێنەری بەتوانای میهرەبان" دەتوانێت لاپەڕەکانی گیانی ئەوان بکاتەوە و لە ڕێی ئەو لاوازی و دەستەوسانی‌یەش کە تیایاندایە توانا و لێهاتنیان گەشە پێ دەسێنێت و بەهرەکانیشیان بەختەوەرانە پێ دەگەیەنێت.. هەروەها بە تەلقینداداني: "تەوەككولی ئیمانی" و "تەسلیم بوونی ئیسلامی" دەتوانن بە چاوی تاسەمەندی و شەوقەوە بڕواننە "ژیان" و لە بەرامبەر ئەو گیروگرفتانەش کە دێنە ڕێیان، خۆیان ڕابگرن.

جا ئایا دەرس پێ وتنەوەی پێشکەوتنی شارستانێتی‌یەك کە پەیوەندی‌یەکی لاوازیان پێوەی هەیە و.. خوێندنی فەلسەفەی ماددی کە هێزی مەعنەوی‌یان هەڵدەوەشێنێتەوە و ڕووناکیی گیانیشیان دەکوژێنێتەوە، جێی ئەوەیان بۆ دەگرێتەوە؟

چونکە گەر مرۆڤ تەنها جەستەی ئاژەڵێك بوایە و خاوەنی "ژیری" نەبوایە، ئەوا لەوانەیە ئەو منالە بەری و خاوێنانە - بە چەشنێکی کاتی و منالانە - بەم بناغە و بنەما بیانی‌یانە خەریك بکرانایە و، سوودێکی دنیایی‌شیان لەم پەروەردە نوێیە وەربگرتایە کە بە پەروەردەی ڕووکەشی نەتەوایەتی ڕازاندووتانەتەوە و ئارایشتتان داوە.

بەڵام خۆ ئەو منالە بەری‌یانە، بێ‌هیچ گومانێك، وەکو هەموو مرۆڤێکی تر دادەبەزنە مەیدانی ژیان و، گەلێ ئاواتی یەکجار زۆریش لە دڵە ناسك و بچووکەکانیاندا هەڵدەگرن و، چەندەها ئامانجی گەورەش لە ژیری‌یە بچکۆلەکانیاندا گەشە دەکات..

مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا بەپێی خواستی بەزەیی پێدا هاتنەوەی ئەوان، کە لەوپەڕی دەستەوسانی و هەژاریدان، دەبێ بە جێگیرکردنی "ئیمان بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی" خاڵێکی پشت پێ بەستنی بەهێز و خاڵێکی یارمەتی لێ وەرگرتنی نەبڕاوە و بێ کۆتایی لەناو دڵیاندا دامەزرێنرێت. هەر تەنها لەم ڕێیەوە دەتوانرێت سۆز و میهرەبانی‌یان بەرامبەر بنوێنرێت، دەنا ئەو بەزەیی هاتنەوەیەی کە تەنها بریتی بێت لە "مەستیی غیرەتی نەتەوایەتی" لە ڕاستی‌دا سەربڕینێکی مەعنەویی ئەو وردیلە بەری و

خاوێنانەیە و، کتومت وەك ئەوە وایە کە دایکێکی شێت منالەکەی خۆی سەر ببڕێت! تەنانەت غەدرێکی هێندە بێ بەزەییانەیە و وەحشی گەری‌یەکی ئەوەندە ستەمکارانەیە کە وەکو ئەوە وایە کەسێك دڵ و مێشکی منال دەربهێنێت و دەرخواردی ئەو منالەی بدات، گوایا بۆ ئەوەی جەستەی منالەکە نەشونما بکات!

دەستەی پێنجەم: (لاوازان و هەژارانن). جا ئایا ئەو "هەژاران"ەی کە بە دەست ئەرکە سەختەکانی ژیانەوە گیرۆدە بوون و، هەژاری‌یەکەشیان پتر ئازاریان دەدات.. هەروەها ئەو "لاوازان"ەش کە ئالوگۆڕە گەورەکانی ژیان هەردەم ئازاریان زیاد دەکات.. ئایا هەموو ئەمانە هیچ بەشێکیان لە غیرەتی نەتەوایەتی بەرناکەوێت؟

ئایا بەشی ئەوان تەنها لەو کردارانەدایە کە لە ژێر پەردەی چاولێکردنی ئەوروپا و شوێن پێ هەلگرتنی ئەو شارستانێتی‌یە فیرعەونی‌یەدایە کە پەردەی شەرم و حەیا لادەبات و ئارەزووی چەند دەولەمەندێکی هەرزە تێر دەکات و دەبێت بە هۆکاری ناوبانگ دەرکردنی چەند ستەمکارێکی بەهێز، کە هەموو ئەمانەش نائومێدی و ئازاری ئەو بەدبەختانەیان پێ زیاد دەبێت؟

نەخێر.. دەرمانی شیفابەخشی زامی هەژاریی ئەوانە هەرگیز لە "ڕەگەزپەرستی"دا نی‌یە. بەڵکو لە دەرمانخانەی موقەددەسی ئیسلام وەردەگیرێت. هێز و بەرگریی لاوازانیش هەرگیز لە فەلسەفەی تاریکی سروشتی‌یەوە وەرناگیرێت کە پالی بە "ڕێکەوت"ی کتوکوێر و "سروشت"ی کەڕوکاسەوە داوە، بەڵکو لە غیرەتی ئیسلامی و نەتەوەی بەرزی ئیسلامەوە وەردەگیرێت.

دەستەی شەشەم: (لاوانن). جا ئەگەر هەرەتی گەنجیی ئەو لاوانە بەردەوام بوایە، ئەوا ئەو شەرابە مەستکەرەی کە بە قەومییەتی سەلبی دەرخواردتان داون، سوودێکی کاتی و وردی بۆ ئەوان تێدا دەبوو! بەلام خۆ کاتێ ئەوان بە هۆکارەکانی پیری و ئازارەکانی ژیان لەو مەستیی لاوی‌یە بە ئاگا دێن و بە پەژارە و حەسرەتیشەوە لە بەرەبەیانی پیری‌دا لەو خەوە خۆشە بێدار دەبنەوە، ئەوا بەکوڵ فرمێسکی گریان هەلدەڕێژن و چەندەها ئازاری مەستیی ئەو شەرابەش دەچێژن، سەرەڕای هەست کردنیان بە ئازاری بەسەرچوون و نەمانی ئەو خەونە خۆشەی کە خەمێکی زۆری بۆ دەخۆن و ئەم خەمەش لە ڕادەیەکدایە کە ئەو مرۆڤە بە ئاخ و داخەوە پەژارە و خەفەت بۆ ئەو خەونەی دەردەبڕێت و دەلێت:

(بەداخەوە هەرەتی لاویم ڕۆشت و تەمەنیشم بەسەرچوو.. وا بە دەستی بەتاڵەوە دەڕۆمە ناو گۆڕەکەم! بریا ژیر بوومایە و پێشتر بۆ هۆشمەندی و ڕەفتاری ڕاست بگەڕامایەتەوە)!

جا ئایا بەشی ئەم دەستە و تاقمە لە بیری نەتەوایەتی‌دا تەنها بریتی‌یە لەوەی کە ڕابواردنێکی کاتی‌یان لە ماوەیەکی کەمدا بۆ دەستەبەر بکرێت و پاشان چەندین کاتی زۆر و درێژخایەنی ژیان دووچاری پەژارە و گریان بکرێن؟ یاخود بەختەوەریی دنیا و لەزەتی ژیانیان لە شوکرانەبژێریی نیعمەتی لاوی‌دایە، بەوەی کە ئەم سەردەمە بەلەزەتەی تەمەن لە "ئیستیقامەت"دا ـ نەك سەفاهەت ـ بەسەر بەرن، تاکو بە خواپەرستی و بەندایەتی "مانەوەی مەعنەوی" بە سەردەمی فانی و لەناوچووی لاوی‌یان ببەخشن و لاوێتی‌یەکی هەمیشەیی لە خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی‌دا، بە گرتنەبەری ڕێی ئیستیقامەت لەو سەردەمەدا، بەدەست بهێنن؟!

جا ئەگەر بە ئەندازەی گەردیلەیەك هەست و شعوور لە خۆتدا شك دەبەیت، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە.

**پوختەی قسە:**

گەر نەتەوەی تورك تەنها دەستەی شەشەم (لاوان) بوونایە و.. لاوێتی‌یەکەیان هەمیشەیی بوایە و.. جگە لەم دنیایەش خانەیەکی تریان لە ڕێدا نەبوایە، ئەوا کارەکانتان کە تێکەڵی چاولێکەریی ئەورووپایە و لە ژێر پەردەی نەتەوایەتیی تورکی‌دا داپۆشراوە، بە غیرەتی نەتەوایەتی دادەنرا و.. ئەو کاتە دەتانتوانی سەبارەت بە یەکێکی وەك من، کە مەگەر بە دەگمەن دەنا بایەخ بە کاروباری دنیا نادات و "ڕەگەزپەرستی"یش بە دەردێکی ترسناکی وەك دەردی سیل دادەنێت و تێدەکۆشێت لاوان لە هەوا و ئارەزووی ناڕەوا و نامەشرووع لا بدات و لە شوێنێکی تردا لەدایك بووە.. دەتانتوانی بڵێن: (ئەوە کوردە و شوێنی مەکەون)! هەروەها لەوانەش بوو بەم قسەیەتان حەقێکتان بەدەست بهێنایە!

بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە، کە پێیان دەوترێت "تورك" لە شەش بەش پێکهاتوون، وەك پێش ئێستا باسمان کرد، ئەوا زیاندان بە پێنج بەشیان و زەوتکردنی حەوانەوەیان و، بەخشینی خۆشی و حەوانەوەیەکی دنیایی و کاتی و بەدئەنجام بە تەنها یەك بەشیان لە ڕێی مەستکردنیانەوە.. بێ گومان ئەم کارە هەرگیز بە وەفاداری دانانرێت بۆ نەتەوەی تورك، بەڵکو لە ڕاستی‌دا بریتی‌یە لە دوژمنایەتی کردنی!

بەڵێ، من لە ڕووی ڕەگەزەوە بە "تورك" دانانرێم، بەڵام هەوڵم داوە و ئێستاش بە هەموو هێزێکمەوە لە بەرژەوەندیی خاوەن تەقوا و گیرۆدەبووان و پیران و منداڵان و هەژارانی تورکدا هەوڵ دەدەم. هەروەك تێدەکۆشم لاوانیش - کە بەشی شەشەمن - لەو کردارە نامەشرووعانە لابدەم کە ژیانی دنیایان ئاوێتەی ژەهر دەکات و ژیانی ئەو دنیاشیان دەفەوتێنێت و لەبەر پێکەنینێك کە سەعاتێکی نەخایاندووە گرفتاری ساڵێك گریانیان دەکات.

خۆ نەك تەنها هەر ئەم شەش حەوت ساڵە، بەڵکو وا بیست ساڵە ئەمە کار و پیشەی منە. ئەوەتا سەرجەمی ئەو پەیامانەی کە بە زمانی تورکی بڵاوم کردوونەتەوە و لە نووری قورئانی پیرۆزەوە وەرمگرتوون، لە بەردەستی هەمووانداں.

بەڵێ، ئەو ئاسەوارانەی کە لە گەنجینەی ڕووناکییەکانی قورئانی پیرۆزەوە دەرهێنراون - سوپاس بۆ خوا - ئەو نوورەیان بۆ "خاوەن تەقوا و ئاییندارا ن" دەرخستووە کە گەلێ پێویستیان پێیەتی.. هەروەك باشترین چارەسەر و دەرمانی شیفابەخشیان لە دەرمانخانەی موقەددەسی قورئان بۆ "نەخۆش و گیرۆدەبووان" پیشان داوە.. هەروەك سەبارەت بەو "پیران"ەش کە لە دەرگای گۆڕەکانیان نزیك بوونەتەوە، بە ڕووناکییەکانی قورئان ئەوەیان چەسپاندووە کە ئەو دەرگایە دەرگای میهرەبانییە نەك هی ئیعدام و لەناوچوون.. لە گەنجینەی قورئانی پیرۆزیشەوە پاڵپشتێکی یەکجار بەهێزی لە بەرامبەر موسیبەت و تیاچوون و زیانەکان بۆ ئەو "منداڵان"ە دەرهێناوە کە دڵێکی نەرمونیانیان لە خۆدا هەڵگرتووە، هەروەك خاڵێکی یارمەتی لێ وەرگرتنیشی لەو گەنجینەیە بۆ پێشچاو خستوون کە دەبێت بە تەوەرەی گەلێ ئاوات و حەز و ئارەزووی بێ سنوور و لە ڕاستیشدا سوودی لێ وەرگیراوە.. هەروەها ئەو ئاسەوارانە، بە ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان، قورسایی ئەرکە سەختەکانی ژیانی لەسەر ئەستۆی "هەژاران و لاوازان" - کە لە ژێریدا دەپلیشێنەوە - سووك و ئاسان کردووە.

بەم جۆرە، ئێمە بۆ سوودی ئەم پێنج بەشەی شەش بەشەکەی "نەتەوەی تورك" تێدەکۆشین.

سەبارەت بە بەشی شەشەمیشەوە کە "لاوان"ن ئەوا برایەتییەکی ڕاستمان لەگەڵ باشەکانیاندا هەیە.

بەڵام هەرگیز و لە هیچ ڕوویەکەوە هاوڕێیەتیمان لەگەڵ مولحیدانی وەك تۆدا نییە، چونکە ئێمە ئەو مولحیدانە بە تورك دانانێین و بە نەتەوەی تورکیان نازانین کە خۆیان لە ئایینی ئیسلام داماڵیوە، ئەو ئایینەی کە مایەی شانازیی ڕاستەقینەی تورکەکانی لەخۆ گرتووە. بەڵکو پێمان وایە بیانییەکە و لە ژێر پەردەی "تورك"دا خۆی پەنا داوە! جا ئەو چەشنە کەسانە، هەرچەندە خۆیان وا پیشان بدەن کە خەڵکی بۆ لای "قەومییەتی تورکی" بانگ دەکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن "ئەهلی حەقیقەت" بخەڵەتێنن، چونکە کردار و ڕەفتارەکانی ئەوانە دەعواکەیان بە درۆ دەخاتەوە!

دەسا ئەی مولحیدانی لاسایی کەرەوەی ئەورووپا! ئەی ئەوانەی کە دەتانەوێت بە پڕوپاگەندەکانتان برا ڕاستەقینەکانم لێ دوور بخەنەوە!

ئێوە چ سوودێك بەم نەتەوەیە دەگەیەنن؟ ئەوەتا دەچن ڕووناکیی کەسانی "خاوەن تەقوا و صەلاحەت" دەکوژێننەوە کە تاقمی یەکەم پێکدەهێنن..

هەروەها ژەهر دەخەنە سەر زامی ئەو کەسانەی کە لە هەموو کەسێ زیاتر پێویستیان بە چارەسەری و میهرەبانی هەیە، کە دەستە و تاقمی دووهەمن..

هەروەها دڵدانەوەی ئەو کەسانەش زەوت دەکەن کە لە هەموان زیاتر شایانی ڕێز و ئیحتیرامن، تەنانەت دووچاری نائومێدیی ڕەهاشیان دەکەن، کە دەستەی سێهەمن..

هەروەها بە تەواوی ورە و هێزی مەعنەویی ئەوانەش هەڵدەوەشێننەوە کە لە هەموو کەس زیاتر پێویستیان بە شەفەقەتە و، چرای مرۆڤایەتییە ڕاستەقینەکەشیان دەکوژێننەوە، کە دەستەی چوارەمن..

هەروەها هیوا و ئاواتەکانی ئەو کەسانەش پووچەڵ دەکەنەوە کە لە هەموان زیاتر پێویستیان بە یارمەتی و دڵنەواییە، بە ڕادەیەك کە ژیان لە پێش چاویاندا لە مردن ترسناکتر پیشان دەدەن، کە دەستەی پێنجەمن..

هەروەها ئەو کەسانەش کە پێویستییەکی زۆریان بە بێداری و بەهۆش هێنانەوە هەیە، دەچن دەرفەت لە بێئاگاییان وەردەگرن و شەرابێکیان دەرخوارد دەدەن کە ئەنجامێکی ترسناك و بە ئازاری بۆ ئەوان تێدایە، کە ئەمانەش بریتین لە دەستە و تاقمی شەشەم.

جا ئایا ئەو قەومییەتەی کە گەلێ موقەددەساتی لە پێناودا بەخت دەکەن، بریتییە لەمانەی کە باس کران؟

ئایا بەم جۆرە لە ڕێی نەتەوایەتی‌یەوە سوود بە تورکەکان دەگەیەنن؟

خۆ من هەزار جار پەنا بە خوای گەورە دەگرم لەم جۆرە کارانە!

بەڕێزان!

من باش دەزانم کە ئێوە هەر کات لە مەیدانی "حەق"دا ژێر دەکەون و دەدۆڕێن، دەچن پەنا بۆ بەکارهێنانی "هێز" دەبەن! بەڵام لەبەر ئەوەی (هێز لە حەقدایە، نەك حەق لە هێزدا) ئەوا گەر هەموو دنیا بهێنن و لەسەر سەرمدا ئاگری پێ بکەنەوە، ئەوا ئەم سەرەی کە لە پێناوی حەقیقەتی قورئاندا بەختی دەکەم، هەرگیزاو هەرگیز بۆ ئێوە نەوی نابێت!

ئەوەش بزانن کە نەك تەنها چەند کەسێکی کەمی بێزلێکراو لە پێش‌چاوی نەتەوەدا، بەڵکو ئەگەر هەزارانی وەك ئێوەش دوژمنایەتیم بکەن، هێشتا لەو بایەخە زیاتریان پێ نادەم کە بۆ ئاژەڵە زیانبەخشەکانی دادەنێم!

گوایا ئێوە دەتوانن چی لە من بکەن؟

خۆ ئەوپەڕی توانای ئێوە لەوەدایە کە کۆتایی بە ژیانم بهێنن، یان تەگەرەم لەبەردەم خزمەتکردنی قورئاندا بۆ دابنێن. چونکە پەیوەندیی من بە دنیاوە لەم دوانە بەدەر نی‌یە.

بەڵام ئێمە ئیمانێکی یەقینیمان لە "پلەی شهوود"دا بەوە هەیە کە هەرگیز ئەجەل گۆڕانی بە سەردا نایەت و لە لایەن قەدەری خوای گەورەوە دەستنیشان کراوە. لەبەر ئەوە گەر بێت و لە پێناوی حەقدا شەهیدیش بکرێم، لە هەڵوێستی خۆم پاشگەز نابمەوە. بەڵکو بە تاسە و شەوقێکی گەرمو گوڕەوە چاوەڕوانی دەستکەوتنی ئەو شەهیدی‌یەم، بە تایبەت منی پیری بەساڵاچوو کە لە یەك ساڵی تر بەولاوە چاوەڕێی ژیان و تەمەن نیم. چونکە گەورەترین ئاواتم بەدەستهێنانی تەمەنێکی هەمیشەیی‌یە لە بریی ئەم تەمەنە ڕواڵەتی‌یە، لە ڕێی دەستکەوتنی پلەی شەهیدی‌یەوە.

سەبارەت بە کاری خزمەتکردنی قورئانی پیرۆزیشەوە، ئەوا خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی گەلێ برای خاوێن و دڵسۆزی لە کاری خزمەت بە قورئان و ئیماندا پێ بەخشیوم و، لە دوای مردنم لە بریی یەك مەڵبەند لە چەندین مەڵبەندی زۆرەوە ئەو خزمەتە ئیمانی‌یە ئەنجام دەدرێت و، گەر مردن زمانم لە گوفتار بخات، ئەوا لە بری زمانی من گەلێ زمانی خاوەن گوفتاری بەهێز و ڕەوان دەدوێن و بەردەوامی بەم خزمەتە دەبەخشن.

تەنانەت دەتوانم بڵێم:

تەنها یەك دانە تۆوی ژێر گڵ، بە مردنی خۆی، ژیانی گوڵە گەنمێك دادەمەزرێنێت و سەدان دەنکی دانەوێڵە لە بریی ئەو یەك دانەیە ئەركەكەی سەرشانی ڕادەپەڕێنن..

منیش ئومێدەوارم كە مردنەكەم - بە هەمان جۆر - هۆیەك بێت بۆ خزمەتکردنی قورئان، زیاتر لە ژیانم.

❑ **فێڵی پێنجەمی شەیتان:**

پشتگیرانی گومڕایی دەیانەوێت سوود لەو خۆپەرستی و لەخۆبایی بوونەی لەمرۆڤدا هەیە، وەربگرن و، بەم داوە هەندێ برایانم لێ دوور بخەنەوە. لە ڕاستیشدا ترسناكترین و لاوازترین دەمار كە لە مرۆڤدا دەبزوێت هی لەخۆبایی بوونە، چونكە دەتوانن دەستی ئافەرین بەسەر شانی ئەو دەمارەدا بهێنن و لەم ڕێیەوە مرۆڤ بۆ گەلێ خراپكاری پاڵ پێوەبنێن!

برایانم! وریا بن! ئەوەك لەم لایەنەوە داوتان بۆ دابنێن و بەم دەماری "لەخۆڕازیبوون"ە ڕاوتانبكەن و بین بە تەڵەوە. گومڕایانی ئەم چەرخە "منپەرستی"ی خۆیان وەك ئەسپێك لێ كردووە و، ئەویش بەناو شیو و دۆڵەكانی گومڕاییدا غاریان پێ دەكات. ئەهلی حەقیش گەر واز لەم "منپەرستی"یەی خۆیان نەهێنن، ناتوانن خزمەتی حەق بكەن، هەرچەندەش ئەو "من"ەیان لە جێی خۆیدا بێت و بە ڕاست و دروستی بەكاریبهێنن هەر دەبێ دەستی لێ هەڵبگرن، تاكو لە گومڕایان نەچن! چونكە ئەگەر وازی لێ نەهێنن گومڕایانیش وا گومان دەبەن كە ئەمانیش وەك ئەوان خەریكی خۆپەرستی بن.

لەبەر ئەوە، وازنەهێنان لە "منپەرستی" زیاندانە لە حەق و خزمەتكردنی حەق، سەرەڕای ئەوەی كە ئەو خزمەتگوزارییەی قورئان - كە ئێمە لە پێناویدا كۆبوووینەتەوە - ڕەفزی "من" و داوای "ئێمە" دەكات. كەواتە كەستان نەڵێن: "من" بەڵكو بڵێن: "ئێمە".

بێ گومان ئێوە قەناعەتتان كردووە كە ئەم برا هەژارەتان بە "من"ی خۆیەوە نەهاتووەتە مەیدان و، ئێوەشی نەكردووە بە خزمەتكاری "منپەرستیی" خۆی. بەڵكو خزمەتكارێكی قورئانە و دارای خۆویستی نییە و، وەك بۆی ڕوون كردوونەتەوە: ڕێبازی لەخۆ ڕازی نەبوون و پشتگیری نەكردنی "منپەرستی"ی گرتووەتەبەر. سەرەڕای ئەوەش بە چەندین

بەڵگەی گومانبڕ بۆی چەسپاندن کە ئەو کتێب و پەیامانەی بۆ سوودی خەڵکی دانراون و ئامادە کراون، موڵکی هەموانە. واتە: چەند نمێکن لە قورئانی پیرۆزەوە پاڵێوراون، هیچ کەسێك بۆی نییە لە ڕێی "خۆپەرستی"ی خۆیەوە بێت و بە هی خۆی دایانبنێت.

یا بە فەرزی مەحاڵ وا دابنێین کە من لە ڕێی خۆویستیمەوە ئەو ئاسەوارانە بە موڵکی خۆم بزانم. بەڵام خۆ - وەك یەکێك لە برایانم دەڵێت - مادەم ئەم دەرگای حەقیقەتەی قورئان کراوەتەوە، ئەوا دەبێ زانایان و ئەهلی کەماڵ چاو لە کەموکووڕییەکانم و سووکیی شان و شکۆم بپۆشن و، وا نەزانن پێویستیان پێم نییە و، لە پشت گرتنمدا دوودڵ نەبن.

خۆ هەرچەندەش ئاسەواری پیاوچاکانی پێشین و زانا لێکۆڵەرەکان گەنجینەیەکی تایبڵێی مەزن و سەروزیادی چارەسەرکردنی هەموو دەردێکن، بەڵام هەندێ جار ڕێ دەکەوێت کە کلیلی دەرگای گەنجینەیەك لە خودی گەنجینەکە گرنگتر دەبێت، گەر ئەو گەنجینەیە داخرابێت و کلیلەکەش دەرگای گەلێ گەنجینەی پێ بکرێتەوە!

پێم وایە ئەو زانا بەڕێزانەش کە غرووڕێکی زانستیی بەهێزیان تێدایە پەیان بەوە بردووە کە "وتە" بڵاوکراوەکان کلیلی ڕاستییەکانی قورئانن و شمشێرێکی ئەڵماسین لەسەر گەردنی ئەو کەسانەی کە بۆ ئینکاری کردنی ئەو ڕاستییانە تێدەکۆشن..

جا با ئەو زانایانەی کە غرووڕێکی زانستیی بەهێزی لەو چەشنەیان تێدایە، بزانن کە ئەوان بەم کارەیان نابن بە قوتابیی من، بەڵکو دەبن بە قوتابیی قورئانی حەکیم و منیش هاوڕێیەکی دەرسخوێندنی ئەوان دەبم. تەنانەت گەر بە فەرزی مەحالیش وا دابنرێت کە من ئیددیعای مامۆستایەتی دەکەم، بەڵام مادەم توانیومانە هۆکارێك بدۆزینەوە سەرجەم چینەکانی ئەهلی ئیمان هەر لە عەوامەوە بۆ خەواص لەو وەهم و گومان و دوودڵییانە ڕزگار بکەین کە ئێستا دێنە ڕێیان، ئەوا دەبێ ئەو زانایانە یان هۆکارێکی لەوە ئاسانتر بدۆزنەوە، یاخود دەست بەم هۆکارەوە بگرن و بە دەرس بیڵێنەوە و ئەم کارە بخەنە ئەستۆی خۆیان!

سەرزەنشتێکی گەورە ئاراستەی زانایانی خراپکار(علماء السوء) کراوە. دەسا با زانایانی ئەم سەردەمە زۆر وریا بن و گەلێ ئاگایان لە خۆیان بێت.

خۆ ئەگەر - وەك دوژمنانمان گومان دەبەن - گریمانی ئەوە بکەن کە من لەپێناوی دەرخستنی خۆویستی و غرووری خۆم لەم خزمەتە ئیمانییەدا کار بکەم، ئەوا مادەم

چەندین کەسی زۆر بە گەرموگوڕی لە دەوری کەسێکی فیرعەون ئاسا کۆبوونەتەوە و وازیان لە غرووری خۆیان هێناوە و لە پێناوی ئامانجێکی دنیایی نەتەوایەتی‌دا بە پەیوەندی‌یەکی زۆر بەهێزەوە پێکەوە کار دەکەن.. ئیتر ئایا ئەم برایەتان مافی ئەوەی نی‌یە کە داواتان لێ بکات بە پشتگیری و پەیوەندی‌یەکی توندوتۆڵ لە دەوری ڕاستی‌یەکانی قورئان کۆببنەوە و واز لە خۆپەرستی‌تان بهێنن، کتومت وەك ناسێنەرەکانی ئەو سەرکردایەتی‌یە دنیایی‌یە؟

ئایا گەورەترین زاناتان لەسەر ناحەق نابێت گەر نەیەت بەدەم ئەم بانگ و هاوارەیەوە لە کاتێکدا کە خۆویستی‌یەکەی خۆی دەشارێتەوە و زانایان بۆ ئەوە بانگ دەکات کە لە دەوری ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئاندا کۆببنەوە؟!

دەسا برایانم!

مەترسی‌ترین ڕووی "خۆویستی" لەم کارەماندا بریتی‌یە لە غیرەکردن و حەسوودی! جا ئەگەر کارەکەمان بەوپەڕی خاوێنی و بێ گەردی و تەنها بۆ خوای گەورە نەبێت ئەوا حەسوودی خۆی دەکات بە ناودا و کارەکەمان لە بناغەوە هەڵدەوەشێنێتەوە.

بەڵام دەبێ بزانین کە هەروەك یەکێك لە دەستەکانی مرۆڤ حەسوودی بەوی تر نابات و غیرەتی لێ ناکات.. هەروەها وەك چاوی مرۆڤ حەسوودی بە گوێی نابات و دڵیشی سەبارەت بە ژیریی غیرەت نایگرێت.. ئێوەش بە هەمان جۆرن، چونکە هەر یەکەتان لە حوکمی ئەندام و هەست و نەستێکدان بۆ کەسێتیی مەعنەویی ئەم کۆمەڵەمان. کەواتە واجبی ویژدانیتان لەوەدایە کە هیچ کامتان حەسوودی بەوانی تر نەبات، بەڵکو هەموو یەکێکتان شانازی بە تایبەتکاریی ئەوی ترەوە بکات و پێی دڵخۆش ببێت.

شتێکی‌تر ماوە کە لە هەموان ترسناکترە، ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە هەندێك لە ئێوە یان لە خۆشەویستانتان حەسوودی و غیرەتی بەرامبەر بەم برا هەژارەتان تێدایە، کە ئەمەش لە ڕاستی‌دا کارێکی پڕ لە مەترسی‌یە!

ئێوە گەلێ زانای زۆر بەتوانا و ئاگادار و مەزنتان لە نێواندایە و، هەندێك لە زانایانیش غرووری زانستی‌یان تێدایە و بە خێرایی دەست لە غرووری خۆیان هەڵناگرن. خۆ هەرچەندەش "ژیری"ی ئیلتیزام بکات و "دڵ"یشی پابەندی خزمەت بێت، کەچی "دەروون"ی هەر دەیەوێت - لە ئەنجامی ئەو غرووروە زانستی‌یەوە - دەربکەوێت و ناوبانگ پەیدا بکات! تەنانەت حەز دەکات موعارەزەکردنی خۆی بەرامبەر بە پەیامە

نووسراوەکان دەربخات و، هەرچەندە بە "دڵ" پەیامەکانی خۆش دەوێت و "ژیری"یشی سەرسووڕمانیان لە ئاستدا دەردەبڕێت و لە پلەیەکی بەرزدا دەیانبینێت، کەچی "دەروون"ی دوژمنایەتی‌یەك لە خۆدا دەشارێتەوە کە لە غرووری زانستی‌یەوە سەری هەڵداوە و، ئاواتەخوازە لە شان و شکۆی "وتەکان" کەم بکاتەوە، تاکو بە بەرهەمەکانی بیری خۆی بگاتە ئەو ئاستە بەرزانە و وەك "وتەکان" برەویان ببێت! بۆیە ناچارم ئەمەی خوارەوە ڕابگەیەنم:

ئەو کەسانەی کە لە ناوەندی بازنەی ئەم دەرسە قورئانیانەدان، تەنانەت گەر موجتەهید و زانای تەواو شارەزا و هەڵکەوتووش بن لە ڕووی زانستە ئیمانی‌یەکانەوە، کار و ئەرکی سەرشانیان تەنها لەوەدایە کە "وتەکان" لێك بدەنەوە و ڕوونیان بکەنەوە، یاخود ڕێکیان بخەن. چونکە لە ڕێی چەندین نیشانەی زۆرەوە بۆمان دەرکەوتووە کە ئێمە ئەرکی فەتوامان لەم زانستە ئیمانی‌یانەدا خراوەتە ئەستۆ!

جا ئەگەر یەکێك لەوانە، کە لەناو بازنەکەماندان، بە هاندانی غرووری زانستیی دەروونی خۆی، هەوڵ بدات شتێك لە دەرەوەی بازنەی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی "وتەکان" بنووسێت، ئەوا وەك موعارەزەیەکی لاواز و چاولێکەری‌یەکی ئابڕووبەر دەردەچێت، چونکە بە چەندین بەڵگە و نیشانە چەسپاوە کە "پەیامەکانی نوور" چەند نمێکی داچۆڕاوی ڕێژنەی قورئانی پیرۆزن. خۆ هەریەك لە ئێمەش بەپێی دەستووری دابەشکردنی کارەکان یەکێك لە کارمەندی‌یەکانی کاری خزمەت بە قورئانمان خستووەتە ئەستۆمان، تاکو ئەو نمە کەوسەری‌یانە بە موحتاجانیان بگەیەنین.

❑ **فێڵی شەشەمی شەیتان:**

ئەم فێڵە بریتی‌یە لەوەی کە "شەیتان" حەزکردنی مرۆڤ لە حەوانەوە و پاڵدانەوە و چاوگێڕانی بۆ بەدەستهێنانی کارمەندی و مەنسەب، دەقۆزێتەوە.

بەڵێ، شەیتانەکانی جینی و ئادەمیزاد هیچ گۆشەیەك پشتگوێ ناخەن کە هێرشی لێوە نەکەن! ئەوەتا هەر کاتێك ببینن کە یەکێك لە هاوڕێکانمان خاوەنی دڵێکی دامەزراو و وەفاداری‌یەکی تەواوەتی و نیازێکی بێ گەرد و هیممەتێکی بەرزە، لە هەموو لایەکەوە دەورەی لێ دەدەن و بەم جۆرەی خوارەوە هێرشی دەکەنە سەر:

دەچن ئەو حەزی ئیسراحەت و حەوانەوەیەی ئەوان دەقۆزنەوە و سوود لە پلە و پایەکانیان لە کارمەندیی دەوڵەتدا وەردەگرن، تاکو ئەرکە گرنگەکەی سەرشانمان لێ تێك بدەن و تەگەرە لە ڕێی خزمەتی قورئاندا دابنێن، یاخود بە چەند فڕوفێڵێکی چەپەڵ

لە کاری خزمەتکردنی قورئان دووریان بخەنەوە، بە ڕادەیەك کە هێندە کار و ئەرکی زۆر بۆ هەندێکیان دەدۆزنەوە کە - بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن - لەو کارانەدا نوقمیان دەکەن، بۆ ئەوەی چیی تر کاتیان بۆ کاری خزمەت بە قورئان بە دەستەوە نەمێنێتەوە.. یاخود چەند کاروبارێکی سەرنج ڕاکێش و لەخشتەبەری دنیایی پێشکەش بە هەندێکیان دەکەن، بۆ ئەوەی هەوا و ئارەزوویان تێدا بورووژێنن، تاکو لە خزمەتگوزاریەکەی سەرشانیاندا تووشی بێئاگایی و غەفلەتیان بکەن... هتد.

بە هەرحاڵ، ڕێگاکانی ئەم هێرشانە دوور و درێژن و، ئێمەش لێرەدا بە پوختی لێیان دواین. درێژەپێدانەکەشی بە وریایی تیژبینیی خۆتان دەسپێرین.

دەسا برایانم!

بزانن! وریابن!

ئەم ئەرکەی سەرشانتان گەلێ خاوێنە و خزمەتەکەشتان تابڵێی بەرز و بڵندە. ئنجا هەریەك لە سەعاتەکانی تەمەنیشتان هێندە بەنرخە کە دەگونجێ وەکو پەرستشی ڕۆژێکی تەواوەتی بێت.

ئەمە باش بزانن تاکو کاتەکانتان بە فیڕۆ لەدەست دەرنەچێت!

﴿يا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصابِرُوا وَرابِطُوا وَاتَّقُوا اللهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران: ٢٠٠).

﴿وَلاتَشْتَرُوا بِآياتِي ثَمَناً قَلِيلاً﴾ (البقرة: ٤١).

﴿سُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ۞ وَسَلامٌ عَلى الْمُرْسَلِينَ ۞ وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الصافات: ١٨١).

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللهم صلّ وسلم على سيدنا محمد النبي الامي الحبيب العالي القدرِ العظيم الجاه وعلى آله وصحبه. آمين.

* * *

پاشکۆی

بەشی شەشەم

## شەش پرسیارەکان

ئەم پاشکۆیە بۆ ئەوە نووسرا کە بە جۆرێکی تایبەت دەستاودەستی پێ بکرێت و، بۆ مەبەستی خۆپاراستن لە وشەکانی سووکایەتی پێکردنی هەستی نەفرەت کە لەوانەیە لە رۆژگارانی ئاییندەدا ئاراستەمان بکرێت. واتە بۆ ئەوەی تفی سووکایەتی پێکردنی کەسانی ئایندە بەر دەموچاومان نەکەوێت، یاخود ڕوخسارمان بسرێتەوە کاتێ کە دەوترێت: دەك پیاوانی بێ غیرەتی ئەو سەردەمە ئەولاتر بچن!!

هەروەها وەك ڕاپۆرت و لائیحەیەکیش نووسرا، تاکو گوێی کەڕ و کاسی سەرۆکە دڕندەکانی ئەورووپای بێ بزرنگێتەوە کە لە ژێر پەردەی ڕووبەندی مرۆڤایەتی‌یەوە خۆیان مەلاس داوە و.. وەك دەرزی‌یش لە چاوی کوێری ئەو بێ ویژدانانەدا بچەقێت کە ستەمکارە غەددارەکانیان بە سەرماندا زاڵ کردووە و.. زللەیەکی چەکوش‌ئاساش بێت بۆ سەروگوێلاکی کۆیلەکانی "مەدەنییەتی دەنی" کە چەندین ئازاری وەك هی دۆزەخی دەرخواردی مرۆڤایەتیی ئەم چەرخە دا، بە ڕادەیەك کە گرۆی مرۆڤ لە هەموو شوێنێکدا دەنگ و هاواری: "بژی دۆزەخ"ی لێ هەڵبڕیوە!

بسم الله الرحـــمن الرحيم

﴿وَمَا لَنا ألاّ نَتوكَّلَ على اللهِ وقد هَدانا سُبُلَنا وَلَنصبِرَنَّ على ما آذيتُمُونا وعلى الله فليَتوكلِ الْمُتوكِلوُن﴾ (إبراهيم:١٢)

لەم ماوەیەی دواییدا لە لایەن ئەو مولحیدانەی کە لە پشت پەردەوە خۆیان مەلاس داوە، گەلێ دەستدرێژیی نابەجێ کرایە سەر مافی ئیماندارە لاوازەکان، بە تایبەت ئەو دەستدرێژی‌یە ئاشکرایەی کردیانە سەرم و خۆیان کوتایە ناو مزگەوتە تایبەتی‌یەکەمەوە کە بۆخۆم ئاوەدانم کردبووەوە و لەگەڵ چەند کەسێکی کەمی هاوەڵە ئازیزەکانمدا نوێژمان تێدا دەکرد و بە نهێنی بانگ و قامەتمان تێدا ئەنجام دەدا..

پێمان وترا: بۆچی نوێژ بە زمانی عەرەبی دەکەن و بە نهێنیش بانگ دەدەن؟

منیش ئارامم لە لا بڕا و نەمتوانی بێ دەنگ بیم..

وا ئێستا ڕووی گوفتارم ئاراستەی ئەو چەشنە کەسە دەنی و نزمانە ناکەم کە لە ویژدان بێ بەش کراون و شایانی ئەوە نین قسەیان لەگەڵدا بکرێت، بەڵکو ڕووی گوفتارم دەکەمە ئەو سەرۆکە فیرعەونئاسایانەی سەرکردایەتی، کە بە گوێرەی هەوا و ئارەزووی ستەم و لەسنوور دەرچوونیان یاری بە چارەنووسی نەتەوە دەکەن و، پێیان دەڵێم:

ئەی ئەهلی بیدعەت و ئیلحاد! داوای وەڵامی شەش پرسیارتان لێ دەکەم:

❖ **پرسیاری یەکەم:**

هەر حکومەتێك کە هی هەر نەتەوەیەك بێت، تەنانەت هی ئەوانەش کە گۆشتی ئادەمیزاد دەخۆن، بگرە سەرۆکی هەر کۆمەڵە چەتە و چەکدارێکی دڕندەش، خاوەنی ڕێباز و چەند بنەما و دەستوورێکن کە حوکمیان پێ دەکەن..

جا ئایا ئێوە لەسەر بناغەی چ دەستوور و بنەمایەکی یاسایی خۆتان ئەم دەستدرێژییە ئابڕووبەرە دەکەن؟.. پیشانمانی بدەن؟ یان ئێوە هەوا و ئارەزووی چەند کارمەندێکی بێ نرخ بە یاسا دادەنێن؟!

چونکە لە هەموو جیهاندا یاسایەك نییە بوار بە خۆهەڵقورتاندن لە بەندایەتی و پەرستشێکی کەسی و تایبەتیدا بدات و، هەرگیز یاسا بۆ کاری وا دانانرێت!

❖ **پرسیاری دووهەم:**

دەستووری سەربەستیی ویژدان (واتە سەربەستیی بیروباوەڕی ئایینی) بە شێوەیەکی گشتی لە سەرتاسەری جیهاندا، نەخوازەڵا لەم چەرخی سەربەستییەدا، زاڵ و فەرمانڕەوایە، بە تایبەت لە چوارچێوەی شارستانێتیی ئێستادا..

جا ئێوە لەم جورئەت و پڕکێشییەتاندا پشت بە چ هێزێك دەبەستن وا لەم دەستوورە دەردەچن و گاڵتەی پێ دەکەن، کە ئەمەش لە خۆیدا بە سووکایەتی کردن دادەنرێت بە سەرجەمی گرۆی مرۆڤ و پشتگوێ خستنێکە بۆ ئەو هەڵوێستە سەرتاسەرییەی ئەوان کە ڕەفزی ئەم کارەتان دەکات؟.. یان چ هێزێکتان بە دەستەوەیە کە وا بە ڕادەیەك دەستتان لە ئیلحاد گیر کردووە، دەڵێی کردووتانە بە ئایینی خۆتان لە کاتێکدا کە ناوی "بێدینی"تان لە خۆ ناوە و ڕاتانگەیاندووە کە نە کارتان بەسەر ئایینەوە هەیە و نە بەسەر ئیلحادیشەوە، کەچی دەچن تا ڕادەیەکی زۆر دەستدرێژی دەکەنە سەر مافی کەسانی ئەهلی ئایین؟!

بێ گومان ئەم كارانەتان هەر وا بە پەنهانی نامێنێتەوە و ڕۆژێك دێت كە لـە بارەیانـەوە پرسیارتان لـێ دەكرێت، ئایا ئەو كاتە وەڵامتان چی دەبێت؟

ئـەوەتا ئێـوە ئیعتـیراز و ڕەفزكردنـی بچووكـترین حكوومـەتی نێـوان بیسـت حكوومەتـەكانتان لـە توانـادا نی‌یـە، ئـەی دەبێ حاڵتـان چـۆن بێـت گـەر هـەر بیسـت حكوومەتەكە پێكـەوە دەسـت بـە ڕووی ئـەم هەوڵەتانـەوە بنێـن كە بـە هێز و زۆرە ملـێ دەتانەوێت سەربەستیی ویژدان هەڵبوەشێننەوە و نەیهێڵن، وەك بڵێی هیـچ حسـابێكتان بـۆ هەڵوێستی نەیارانەی ئەوان نەكردبێت؟

❖ **پرسیاری سێهەم:**

بە چ یاسا و دەسـتوورێك تـەكلیف لـە كەسێكی شـافیعی مەزهـەبی وەك من دەكـەن شوێن فەتوایەك بكەوێت كە پێچەوانەی بـەرزی و خـاوێنیی مەزهـەبی حەنەفی‌یـە و چـەند زانایەكی خراپكار دەریان كردووە لەوانەی كە ویژدانی خۆیان بە دەستكەوتێكی دنیـایی فرۆشتووە؟!

ئێوە گەر هـەوڵی نەهێشتنی مەزهـەبی شـافیعی بـدەن و بتانـەوێت شـوێنكەوتوانی ئـەم مەزهەبە ـ كە بە ملیۆنەها كەس دەبن ـ بكـەن بـە حەنـەفی و، پاشـان بـە هێز و زۆرەملـێ منیـش ناچـاری شـوێنكەوتنی ئـەم فەتوایـە بكـەن، ئـەوا ئـەم كارەتـان لەوانەیـە یاسـایەكی ملهوڕانـەی موڵحیدانـی وەك ئێـوە بێـت، دەنـا نزمایەتی‌یەكـە هـەندێ كـەس بـە هـەوا و ئارەزووی خۆی ئەنجامی دەدات!

بەڵام ئێمە هەرگیز شوێن هەوا و ئارەزووی ئەو جۆرە كەسانە ناكەوین و هەر ناشـیان ناسین!

❖ **پرسیاری چوارەم:**

ئێوە پشت بە چ بناغە و بنەمایەكی یاسایی‌تان دەبەستن كاتێ تـەكلیف لـە كەسـانێكی وەك من دەكەن – لەوانەی كە لـە قەومێكی تـرن – پێیـان دەڵێـن: نوێژەكانتـان بـە زمـانی توركـی بكـەن، لەسـەر بناغـەی بیدعەتـە فەتوایـەكی تـەحریف كراو كـە بـەناوی ڕەگەزپەرستیی توركی‌یەوە دەركراوە، ئەو ڕەگەزپەرستی‌یەی كە لـە ناوەرۆكدا بریتی‌یـە لـە چاولێكـەریی ئـەورووپا و بـە تـەواوەتی پێچەوانـەی قەومییـەت و داب و نـەریتی ئـەم نەتەوەیەیە كە لە دێر زەمانەوە ئاوێتەی ئیسلام بووە و ڕێـزی لـێ ناوە و لەگـەڵی‌دا یـەكی گرتووە؟

خـۆ هەرچـەند مـن پەیوەندی‌یـەکی توندوتـۆڵ و هاوڕێیەتی‌یـەکی خـاوێن و برایەتی‌یەکی بێ گەردم لەگەڵ تورکە ڕاستەقینەکاندا هەیە، کەچی هـەرگیز پـەیوەندیم لەگەڵ بانگەشەی قەومییەتی کەسانی وەك ئێوەدا نی‌یە کە لاسایی ئەورووپا دەکەنەوە.

جا ئیتر چۆن و بە چ یاسایەك ئەو تەکلیفەم لـێ‌دەکەن؟

ئـەو کوردانـەی کـە ژمارەیـان ملیۆنـەها دەبێـت، هـەزاران سـاڵە زمـان و قەومییـەتی خۆیان لـەبیر نەچووەتەوە و، هـەر لـە سـەردەمە پێشینەکانیشـەوە بـرای ڕاستەقینەی تـورك بوون لە نیشتماندا و هاوڕێشیان بوون لە مەیدانەکانی جیهاددا..

دەڵێـم: گـەر بتانەوێـت قەومییـەتیان نـەهێڵن و زمانەکەشیان لـە بـیر بەرنـەوە، ئـەوا ئـەم تەکلیفەتان لە کەسانی وەك ئێمە – کە لە ڕەگەزی تر دادەنرێین – دەستوور و یاسـایەکی دڕندانـەی نێـوان دەسـتوورەکانتانە، دەنـا جگـە لـە هـەوا و ئـارەزوو و ڕەفتـارێکی هەڕەمەکی، هیچی تر نی‌یە.

بەڵام باش بزانن کە هیچ کەسێك شوێن ئەو هەوا و ئارەزووە کەسی‌یانە ناکـەوێت و، ئێمەش شوێنیان ناکەوین!

❖ **پرسیاری پێنجەم:**

هـەموو حکـوومەتێك مافی جێبـەجێ کردنی یاسـاکانی هەیە بەسـەر هاوو‌ڵاتیـانی خۆی و بەسەر ئەوانەشدا کە بە ڕەعیەت و ژێردەستەی خۆیانی دادەنێت. بەڵام ناتوانێـت یاساکانی بەسەر ئـەو کەسـانەدا بسەپێنێت کـە بـە ڕەعییـەتی خـۆی لـە قەڵـەمیان نـادات. چونکە لە کاتی وادا بە لێپرسراوانی ئەو حکوومەتە دەڵێن:

مادەم ئێمە بە ڕەعییەتی ئێوە دانانرێین، کەواتە ئێوەش حکوومەتی ئێمە نین!

جگە لەمەش لە هیچ دەوڵەتێکدا هەرگیز دوو سزا لە یـەك کـاتدا بەسـەر یـەك کەسـدا جێبەجێ ناکرێـت، ئەوەتا – بـۆ نموونـە – مرۆڤـی قـاتڵ یـان لـە سـێدارە دەدرێـت، یـاخود دەخرێتە بەندیخانەوە و، هەرگیز هەردوو سزای بەند کردن و لـە سـێدارەدانی لەسـەر کـۆ ناکرێتەوە.

جا لـەبەر تیشکی ڕووناکیی ئەمەدا دەڵێم:

لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە هیـچ زیـانێکم بـە نیشـتمان و نەتـەوە نەگـەیاندووە، کـەچی بـە درێژایی هەشت ساڵی ڕەبەق گرفتاری "دیلی"تان کردم و مامەڵە و ڕەفتارێکتان لەگەڵدا نواندم کە هەرگیز لەگەڵ تاوانبارێکی ڕاستەقینەدا ناکرێت کە لە نەتەوەیەکی تر تەنانەت لە دوورترینی بیانی‌یە دوور وڵاتەکانیش بێت!

ئەوەتا سەربەستیتان لـێ زەوت کردم و مافە شارستانی‌یەکانتان لـێ سەندمەوە و، لـەو کاتەدا کە لێبوردنتان تەنانەت بۆ "تاوانبارەکان"یش دەرکرد، کەستان نەتان وت: ئەمەش یەکێکە لە رۆڵەکانی ئەم نیشتمانە!

جا ئێـوە بـە چ یاسـایەکتان تـەکلیف لـە کەسـێکی وەك مـن دەکـەن - کـە لـە هـەموو روویەکـەوە لێتـان نامۆیـە - ئـەم دەسـتوورانەتان لـە خـۆیدا جێبـەجێ بکـات کـە دژ و پێچەوانـەی سەربەسـتین و بەسـەر نەتـەوە کلۆڵەکـەتاندا و بـێ رەزامـەندیی خۆیـان سەپاندووتانە و جێبەجێتان کردووە!

مادەم ئێوە ئەو پاڵەوانێتی‌یە گەورانەی کە بەهۆی منەوە - بە شـایەتیی سـەرکردەکانی سـوپا - لـە جـەنگی یەکـەمی جیـهانی لـە پێنـاوی پارێزگـاری کردنـی نیشـتمان و جیـهاد کردن بە نەفس و هەموو شتێکی بەنرخدا ئەنجام دران، هەموو ئەمانەتان بـە تـاوان لەقەڵـەم دا و، ئەو هەوڵـە گـەرموگورانەشتان بە خیانـەت دانـا کـە لـە پێنـاوی پاراستنی رەوشتە بەرزەکانی ئەم نەتەوە کلۆڵەدا و دەستەبەر کردنی بەختەوەریی دنیا و قیامـەتیان ئـەنجاممان داوە..

هەروەها مـادەم ئـەم کەسـەی کـە رازی نی‌یـە رێبـاز و بنـەما ئیلحادی‌یەکانی ئێـوە لـە خـۆیدا جێبـەجێ بکـات، کـە چاولێکـەریی ئەوروپایـە و هیـچ سـوودێکی تێـدا نی‌یـە و تەنانەت سەرتاپا زیانە و مرۆڤ لەناو دەبات..

ئێوە ئەم مرۆڤەتان بە هەشـت سـاڵی ژیـانی ژێـر چـاودێری (وا ئێسـتا بـوو بـە بیسـت و هەشت ساڵیش) سـزا داوە، لـە کـاتێکدا کـە بـەپێی "یاسـا" دەبێ تەنـها یـەك سزا بەسـەر مرۆڤدا جێبەجێ بکرێت و، منیش ئەم کارە نایاسایی‌یەم پێ قبووڵ نەکرا، کەچی ئێوە بـە زۆرەملـێ ناچارتان کردم لەسەری و ئەو سزایەتان پێ چەشتم:

ئایا ئێوە - دوای هەموو ئەمانە - بە چ یاسایەك سزایەکی ترم بە سەردا دەسەپێنن؟

❖ **پرسیاری شەشەم:**

ئێوە پێتان وایە کە ئێمە نەیاری ئێوەیـن و دژایەتی‌یـەکمان لەگـەڵتاندا هەیـە. مامەڵـە و رەفتـارە سـەختەکانتان لەگـەڵماندا شـایەتە لەسـەر ئـەم دەرەنجامـە. ئـەوەتا ئێـوە ئـایین و دوارۆژی خۆتان لە رێی دنیاتاندا دادەنێن، کەچی ئێمـە هەمیشـە ئامـادەین دنیاکـەمان لـە پێناوی ئایین و رێی دوارۆژماندا بەخت بکەین.

ئەمەش نهێنیی ئەو نەیاری و دژایەتی‌یەیە کە پێتان وایە لە نێوانماندا هەیە..

بێ گومان بەخت کردنی چەند ساڵێکی ئەم ژیانەمان کە لـە ژێـر سـایەی حوکمڕانیـیـە توندوتیژ و وەحشی گەرییەکەی ئێوەدا بە زەلیلی و ڕسوایی بەسەر دەچێـت، بـۆ ئـەوەی شەهیدییەکی بێ گەردمان لە پێناوی خوادا دەست بکەوێت، ئەم ژیان بەخـت کردنـە بـۆ ئێمە وەکو ئاوی کەوسەر وایە.

بەڵام من پشت بـە ڕێژنـە و ئاماژەکـانی قورئـانی حەکیم دەبەسـتم و ئـەم هەواڵـەی خوارەوەتان بێ ڕادەگەیەنم تاکو لەرز بە جەستەتاندا بهێنێت:

لە دوای کوشتنی من ئێوە ناژین، چونکە دەستێکی بە زەبروزەنگ لەم دنیایەتان – کە بەهەشتی ئێوەیە و خۆشتان دەوێت – هەڵتان دەگرێت و دەرتان دەکـات و فڕێتـان دەداتـە ناو چەندین تاریکستانی ئەبەدییەوە.. هەروەها دوای من ئەو سەرکردانەشتان کە وەکو نەمروودیان لـێ هاتووە و لە خۆیان بایی بوون، بە کوشتنی ئازەڵانە دەکوژرێن و منیش لە بەردەم حوزووری خوای گەورەدا یەخەیان دەگرم و حەقی خۆمیان بەوە لـێ دەسـێنمەوە کە دادگەریی خواوەند دەیانخاتە ناو "أسفل سافلين"ەوە!

دەسـا ئـەی ئـەو بەدبەختانـەی کـە ئـایین و دواڕۆژی خۆتـان بـە خاشـاکی دنیـا گۆڕیوەتەوە! گـەر ئێـوە بـە ڕاستی دەتانـەوێت بژیـن، ئـەوا بـە هـیـچ جۆرێك توخنی مـن مەکەون و دەستی خراپەم بۆ درێژ مەکـەن! خۆ ئەگـەر هـەر دەتانـەوێت خراپـەم لەگـەڵدا بکەن، ئەوا بزانن کە بە چەندین قات تۆڵەی منتان لـێ دەسێنرێتەوە.

ئەمە باش بزانن، تاکو لەرز بە جەستەتاندا بهێنێت!

من لە میهرەبانیی خوای گەورە ئومێدم وایە کە مردنم زیاتر لە ژیانم خزمـەت بـە ئـایین بکـات. دڵنیاشـم مردنـی مـن بـە وێنـەی بۆمبـا بـە سـەرتاندا دەتەقێتـەوە و تـەفروتووناتان دەکات!

جا ئەگـەر جورئـەت و ئازایـەتیتان تێدایـە، ئـەوا دەسـت بهێننـە ڕێـم! خۆ ئەگـەر ئێـوە بتوانـن هـەر زیـانێك بـە مـن بگەیـەنن، ئـەوا چـاك ئاگـاداری ئـەو تۆڵـە و سـزایەش بـن کـە چاوەڕێی دەکەن و ڕووبەڕووی دەبنەوە.

منیـش لـە لایـەنی خۆمـەوە و بەرامبـەر هـەموو هەڕەشـە و گوڕەشـەکانتان بـە هـەموو هێزێکمەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنمەوە کە دەفەرموێ:

﴿الذينَ قَالَ لَهُمُ النّاسُ إنَّ النّاسَ قَدْ جَمَعُوا لكُمْ فَاخشَوهُم فَزادَهُمْ إيماناً وَقَالوُا حَسبُنَا اللهُ وَنِعمَ الوَكيلُ﴾ (آل عمران:١٧٣).

* * *

## بەشی حەوتەم

### کە بریتی‌یە لـە حەوت ئاماژەکان

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فآمِنُوا باللهِ ورَسُولِهِ النبيِّ الأُميّ الذي يُؤمِنُ باللهِ وكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعوهُ لَعَلَّكُم تَهتَدُون﴾

(الأعراف:١٥٨)

﴿يُرِيدُونَ أنْ يُطفِئُوا نُورَ اللهِ بِأفواهِهِم وَيَأبَى اللهُ إلاّ أنْ يُتِم نُورَهُ وَلَو كَرِهَ الكافِرُون﴾

(التوبة:٣٢)

**ئەم بەشە بریتی‌یە لـە حەوت ئاماژە و لـە وەڵامی سـێ پرسـیاردا نووسـراوە. پرسیاری یەکەمیشیان چوار ئاماژەی لەخۆ گرتووە.**

**❀ ئاماژەی یەکەم:**

ئەوانەی کە هەوڵی گۆڕینی شەعائیرەکانی ئیسلام دەدەن، پاڵپشت و بەڵگەیان بۆ ئەم هەوڵـەیان – وەك هـەموو کـارێکی بێ کـەڵکی تریـان – چـاولێکردنی کوێرانـەی بیانی‌یەکانە. ئەوەتا دەڵێن:

(ئەو کەسانەی کە لە شاری لەندەندا خوای گەورە هیدایەتی داون و ئەو بیانی‌یانـەش کە هاتوونەتە ناو بازنەی ئیمانەوە، گەلـێ شتی وەك بانگ و قامەتی نوێـژ بـۆ زمانـەکانیان وەردەگێڕن و لـە وڵاتـەکانی خۆیاندا کـاری پـێ دەکـەن. ئنجـا جیـهانی ئیسـلامییش بەرامبـەر بـەم کـارەی ئـەوان بێ‌دەنگ دانیشـتووە و ڕەخنـەیان لـێ نـاگرێت. کەواتـە کارەکەیان لە ڕووی شەرعەوە دروستە بۆیە وا لە بەرامبەریانەوە بێ‌دەنگ بوون)!

**وەڵام:**

جیاوازی‌یەکی گەلـێ ئاشکرا لەم قیاسەدا هەیـە و هـەرگیز مرۆڤـی خـاوەن هەسـت و شعوور چاو لەوان ناکات و بە هیچ جۆرێك شتانی ئێرە قیاس ناکاتە سەر ئەوێ. چونکـە

وڵاتی بیانی‌یەکان لە زمانی شەرعدا پێی دەوترێت: "دار الحرب". جا زۆر شت هەن کە بەپێی شەرع دروستە لە "دار الحرب"دا بکرێن، بەڵام لە "دار الإسلام"دا بوار بە کردنیان نادرێت.

پاشان هێز و شەوکەت لە وڵاتەکانی ئەوروپا و خۆرئاوادا بە گشتی هی ئایینی نەصرانی‌یە و، هیچ ژینگەیەکی ئەوتۆ لە کایەدا نی‌یە کە بە زمانی حاڵ چەمکی وشە موقەددەسەکان و واتای زاراوە شەرعی‌یەکان بڵاو بکاتەوە و موسڵمانانی پێ تەلقین بدات. بۆیە لەبەر ناچاری(الضرورة) لەو شوێنانەدا "واتا" موقەددەسەکان پێش خراون بەسەر "لەفز"ە موقەددەسەکاندا. واتە لەبەر پاراستنی واتاکان واز لە وشەکان هێنراوە. بە واتایەکی تر: لەم حاڵەدا کەمترین شەڕ و سووکترین زیان هەڵبژێرراوە.

بەڵام لە "دار الإسلام"دا هەر ژینگەکە خۆی، بە زمانی حاڵ، واتا پوختەکانی ئەو وشە خاوێن و پیرۆزانە بە گوێی موسڵماناندا دەدات و ڕێنمایی‌یان دەکات بۆ لایان. چونکە هەموو ئەو بابەت و گفتوگۆیانەی لە نێوان موسڵماناندا ڕوو دەدات لە بارەی: داب و نەریت و مێژووی ئیسلامی و شەعائیرەکانی ئیسلام بەگشتی و سەرجەمی پایەکانی، هەمیشە و بەردەوام پوختەی واتاکانی ئەو وشە خاوێنانە بە گوێی ئەهلی ئیماندا دەدەن. بەڵکو پەرستگا و قوتابخانە ئایینی‌یەکانی ئەم وڵاتە، تەنانەت نووسراوی سەر کێلی گۆڕەکانیشی، هەریەکەیان ئەرکی مامۆستا و فێرکارێکیان گرتووەتە ئەستۆ کە ئەو واتا خاوێنانە یادی ئیمانداران دەخەنەوە.

ئایا کەسێك خۆی بە موسڵمان بزانێت و هەموو ڕۆژێك لە پێناوی بەرژەوەندی‌یەکی دنیایی‌دا پەنجا وشەی بیانی فێر ببێت.. گەر ئەم کەسە لە ماوەی پەنجا ساڵدا ئەو وشە پیرۆزانەی وەك: "سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله اكبر" فێر نەبێت کە هەرچی ڕۆژە پەنجا جار دەیانڵێتەوە، ئایا بەرنابێتەوە بۆ پلەیەکی پەنجا جار لە هی ئاژەڵ نزمتر؟!

دەسا با باش بزانرێت کە هەرگیز لەبەر ئەو ئاژەڵانە ئەم وشە پیرۆزانە دەستکاری ناکرێن و وەرناگێڕرێن و پشتگوێ ناخرێن. بەڵکو پشتگوێ خستن و دەستکاری کردنی ئەم وشانە لە ڕاستی‌دا هەڵوەشانەوەی نووسینی سەر کێلی قەبرەکان و تەخت کردنیانە لەگەڵ زەوی‌دا و سووکایەتی و پشت هەڵکردنە لە باپیران و دوژمنایەتی کردنە لەگەڵیاندا، بۆیە ئەوانیش لەتاو ئەم سووکایەتی‌یە لە گۆڕەکانیاندا لەرز بە جەستەیاندا دێت!

زانایانی خراپکار(علماء السوء) بە مولحیدەکان خەڵەتاون و، نەتەوەش لەخشتە دەبەن و پێیان دەڵێن:

ئیمامی ئەعزەم(ئەبو حەنیفەی نوعمان) وتوویەتی: "دروستە سوورەتی فاتیحە بە فارسی بخوێنرێت، گەر پێویستی بۆ ئەم کارە لە ئارادا بێت و، بەپێی ئەو پێویستی‌یە و، سەبارەت بە کەسێك کە هەر عەرەبی نازانێت و، لە وڵاتە دوورەکاندا دەژی". جا لەسەر بناغەی ئەم فەتوایە، وا ئێمە پێویستمان بە وەرگێڕانی هەیە، کەواتە دەتوانین بە تورکی بیخوێنین[1].

**وەڵام:**

هەموو پێشەوا مەزنەکان - جگە لە ئیمامی ئەعزەم - هەروەها دوازدە ئیمامەکان و سەرجەمی موجتەهیدەکانیش، هەر هەموویان، فەتوایان بە پێچەوانەی ئەم فەتوایەی ئیمامی ئەعزەمەوە داوە.

خۆ جادە گەورە و فراوانەکەی جیهانی ئیسلامی ئەو شەقامە بەرینەیە کە هەموو ئەو پێشەوا مەزنانە گرتوویانەتە بەر. چونکە نەتەوەی مەزن تەنها بە ڕاستە شەقامی گەورەدا دەڕوات. ئەو کەسانەش کە دەیانەوێت نەتەوە بە توولە ڕێیەکی تایبەتی و تەسکدا ببەن، ئەوا دیارە دەیانەوێت ڕێ لە خەڵکی ون بکەن.

فەتواکەی ئیمامی ئەعزەمیش، لە پێنج ڕووەوە، فەتوایەکی "تایبەت"ە:

*یەکەم:*

ئەم فەتوایە تایبەتە بەو کەسانەی لە شوێنی تر و وڵاتانی دوور لە مەڵبەندی "دار الإسلام"دا دەژین.

*دووهەم:*

فەتوایەکە لەسەر بناغەی "پێویستیی ڕاستەقینە" دەرکراوە.

*سێ‌هەم:*

تایبەتە بە تەرجەمەی زمانی فارسی‌یەوە، کە - لە ڕیوایەتێکدا - بە زمانی ئەهلی بەهەشت دانراوە.

---

(١) لەوانەیە ئەسڵی فەتواکە ئەمە بێت: (بەڵام گەر شتێکی بە واتای قورئان خوێند، ئەوا لای ئەبوو حەنیفە نوێژی پێ دروستە، چونکە بە لایەوە دروستە نوێژ بە فارسی و زمانەکانی تر بکرێت و، وەك ئەوە وایە بە سوورەیانی و عیبرانی گوفتاری خوای گەورەی خوێندبێت. لەبەر ئەوە، ئەو نوێژەی بەلاوە دروستە). بڕوانە: (المبسوط لشمس الدين السرخسي) ج١/ص٢٣٤ (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە).

چوارەم:

حوکمی جەوازی بە تایبەتی بۆ تەنها سوورەتی "فاتیحە" دەرکردووە، تاکو ئەو کەسەی سوورەتی فاتیحە نازانێت، واز لە نوێژەکانی نەهێنێت.

پێنجەم:

بۆیە ئەم جەوازەی بۆ دەرخستوون، تاکو عەوامەکان بە هاندەر و غیرەتێکی ئیسلامیی هەڵقوڵاوی هێزی ئیمانەوە بۆ تێگەیشتن لە واتا پیرۆزەکان هەوڵ بدەن. بەڵام وازهێنان لە ئەسڵە عەرەبییەکانی ئەو واتایانە و تەرجەمەکردنیان بە هاندەری ڕووخاندن و کاولکارییەك کە لە ئیمان لاوازییەوە سەری هەڵداوە و لە بیری ڕەگەزپەرستی و نەفرەت کردن لە زمانی عەرەبییەوە - کە نیشانەی لاوازی ئیمانە - سەرچاوەی گرتووە، ئەوا لە ڕاستیدا هاندان و پاڵپێوەنانی خەڵکییە تاکو واز لە ئایین بهێنن و لێی دەربچن!

❀ ئاماژەی دووهەم:

ئەو بیدعەت خوازانەی کە شەعائیرەکانی ئیسلام دەگۆڕن، لە پێشدا داوای فەتوایەکیان لە زانا خراپکارەکان کرد بۆ مەبەستی ڕاپی کردنی کارەکەیان و بە ڕاستی لەقەڵەمدانی. ئەوانیش ئەو فەتوا ناوبراوەیان پیشان دان، کە ڕوونمان کردەوە لە پێنج ڕووەوە فەتوایەکی تایبەتییە.

دووهەم: بیدعەت خوازان بیرێکی شوومیان لە شۆڕشگێڕە بیانییەکانەوە وەرگرتووە کە بریتییە لەمەی خوارەوە:

ئەورووپا مەزهەبی کاسۆلیکیی بە دڵ نەبوو، بۆیە شۆڕشگێڕان و فەیلەسووفەکان لەبەر چاوی خەڵکیدا مەزهەبی پرۆتستانتیان لەخۆ گرت کە ئەو کاتە بەپێی مەزهەبی کاسۆلیکی بە بیدعەت و ئیعتیزال لەقەڵەم دەدرا. بەم شێوەیە سوودیان لە شۆڕشی فەرەنسی وەرگرت و بەشێکیان لە مەزهەبی کاسۆلیکی ڕووخاند و پرۆتستانتیان لە جێگایدا ڕاگەیاند..

جا لاف لێدەرانی غیرەت لەم وڵاتانەی خۆشماندا، کە لەسەر چاولێکەریی کوێرانە ڕاهاتوون، دەڵێن:

(مادەم ئەم ئاڵوگۆڕە لە ئایینی نەصرانیدا ڕووی داوە و، ئەوانەش کە ئەم ئاڵوگۆڕەیان کرد یەکەم جار بە مورتەد لەقەڵەم دران، بەڵام پاشان بە نەصرانی قبووڵ کرانەوە، ئەوا دەگونجێ ئاڵوگۆڕێکی ئایینیی وەك ئەمەش لە ئیسلامدا ڕوو بدات)!

**وەڵام:**

جیاوازیی ئەم قیاسە لەوەی ئاماژەی یەکەم گەلێ ئاشکراترە. چونکە هەر تەنها بناغە ئایینی‌یەکانی نەصرانییەت لە حەزرەتی عیسا - درودی لەسەر بێت - وەرگیراون، بەڵام زۆربەی ئەو حوکمانەی کە سەر بە ژیانی کۆمەڵایەتین و فەرعە شەرعی‌یەکانیش، لە لایەن حەوارییەکان و سەرگەورە ڕۆحانی‌یەکانی ترەوە دانراون و، بەشی هەرە زۆریشیان لە کتێبە پیرۆزەکانی پێشینەوە وەرگیراون.

چونکە حەزرەتی عیسا - درودی لەسەر بێت - فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتی نەگرتووەتە دەست و لە یاسا کۆمەڵایەتی‌یە گشتی‌یەکانیشدا پرس و ڕای پێ نەکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا یاسا عورفی‌یەکان و دەستوورەکانی شارستانێتی بەناوی شەریعەتی نەصرانی‌یەوە وەرگیراون! وەك بڵێی بناغەکانی ئایینەکەی پۆشاکی دەرەوەی لەبەر کراوە و شێوەیەکی تری دراوەتێ، بە چەشنێ کە ئەگەر ئەم شێوە و پۆشاکە گۆڕانی بە سەردا بێت ئەوا بناغەی ئایینەکەی ناگۆڕێت و ئەم کارە سەری لە بەدرۆخستنەوە و ئینکاری کردنی ئایینەکەیەوە دەرناچێت.

بەڵام پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کە: خاوەنی ئایین و شەریعەتی ئیسلامە و، فەخری عالەمە و، سەروەری هەموو جیهانەکانە و، هەر یەك لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و هیندستان و ئەندەلوس عەرشی دەسەڵاتداری و تەختی حوکمڕانیی ئەون.. ئەم پێغەمبەرە سەروەرە ﷺ هەروەك بە زاتی خۆی بناغەکانی ئایینی ئیسلامی ڕوون کردووەتەوە، بە هەمان جۆر لق و پەلەکانی ئەو ئایینە و دەستووری ئەحکامەکانی و تەنانەت بچووکترین ئادابی جوزئییش لە ئایینەکەی‌دا هەر خۆی هێناونی و هەواڵی لە بارەوە داون و فەرمانی لە بارەیانەوە دەرکردووە.

بەو واتایەی کە کاروبارە فەرعی‌یەکان لە شەریعەتی ئیسلامدا لە شێوەی بەرگ و پۆشاکدا نین کە ئاڵوگۆڕ هەڵبگرن و گەر هەر گۆڕانێکیان تێدا بکرێت بناغەکانی ئایین زیانیان پێ نەگات و وەك خۆیان بمێننەوە، بەڵکو جەستەی ئەو بناغانەن، هیچ نەبێ - بە لای کەمەوە - پێستی جەستەی بناغەکانی ئایینن، چونکە هێندە لەگەڵ یەکتری‌دا تێکەڵ و پەیوەست و هاوپەیوەندین کە لێك جیاکردنەوە هەڵنەگرن و، هەر دەست تێوەردان و گۆڕانێك تیایاندا ڕاستەوخۆ ئینکاری و بەدرۆخستنەوەی خاوەنی شەریعەت دەگرێتەوە.

هەرچی جیاوازیی مەزهەبەكانیشە، ئەوا لە شێوازی تێگەیشتنی ئەو یاسا و دەستووره نەزەرییانەوە سەری هەڵداوە كە خاوەنی شەرع ڕوونی كردوونەتەوە. بەڵام ئەو دەستوورانەی كە لە جۆری "موحكەمات"ن و پێیان دەوترێت "ما عُلِمَ من الدین بالضرورة"، ئەوا هەرگیز تەئویل و ئاڵوگۆڕ تێداكردن بە هیچ شێوەیەك هەڵناگرن و ئیجتیهادیان بە هیچ جۆرێك تێدا ناكرێت. خۆ ئەگەر هەر كەسێك بیانگۆڕێت ئەوا لە ئایین دەردەچێت و ئەو قاعیدەیە دەیگرێتەوە كە دەڵێت:

"یمرقون من الدِّین كما یمرق السهم من القوس"[1]!

بیدعەت خوازان، بۆ مەبەستی پاساودانی ئیلحادەكەیان و دەرچوونیان لە ئایین، ئەم هۆكارە دەدۆزنەوە و دەڵێن:

لە ئەورووپادا هێرش كرایە سەر قەشە و سەركردە ڕۆحانییەكان و مەزهەبی كاسۆلیكی كە مەزهەبی تایبەتیی ئەوانە، پاش "شۆڕشی فەرەنسی"ش كە زنجیرە ڕووداوێكی لە جیهانی مرۆڤایەتیدا بە دوادا هات، ئەم مەزهەبە ڕووخێنرا. پاشان ئەم هێرشە لە لایەن زۆر كەسەوە پەسەند كرا و ئەورووپاییەكان لە دوای ئەمە گەلێ پێش كەوتن!

**وەڵام:**

جیاوازیی ئەم قیاسە - وەك ئەوەی پێشوو - گەلێ ئاشكرایە. چونكە ئایینی نەصرانی، بە تایبەت مەزهەبی كاسۆلیك، لە لایەن پیاوانی دەوڵەت و كەسانی تایبەتمەندەوە وەك ئامرازێكی خۆسەپاندن بەكارهێنرابوو، ئەوەبوو تایبەتمەندەكان لە ڕێی ئەو هۆكارەوە دەستەڵاتی خۆیان بەسەر چینی عەوام(ڕەشەخەڵكەكە)دا درێژە پێ دەدا بە ڕادەیەك كە بوو بە هۆكاری چەوسانەوە و هارینی كەسانی خاوەن هیممەت و غیرەتی نێوان زۆرینەی خەڵكی كە ناوی "ئاژاوەچی" و "ڕەشۆكییەكان"یان لێ نرابوو، هەروەك كرابوو بە هۆكاری سەركوتكردنی ئەو بیریارانەی كە بانگەشەیان بۆ سەربەستی دەكرد و ڕووبەڕووی ستەم و خۆسەپاندنی چینی خەواص دەبوونەوە. تەنانەت ئۆباڵی زەوتكردنی حەوانەوەی خەڵكی و بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا - كە لە

(١) واتە: ئەوانە بە وێنەی دەرچوونی تیر لە كەوان، لە ئایین دەردەچن. (وەرگێڕ)

ئەنجامی ئەو شۆڕشانەوە پەیدا بوون کە نزیکەی چوارسەد ساڵیان لە وڵاتەکانی ئەورووپادا خایاند - خراوەتە ئەستۆی ئەم مەزهەبەوە..

بۆیە هەر بەناوی مەزهەبێکی تری نەصرانییەتەوە - نەك بەناوی ئیلحادەوە - هێرش کرایە سەر ئەم مەزهەبە و لەلای چینی عەوام و چینی فەیلەسووفەکانەوە ڕق و قین و دوژمنایەتی لە دژی ئەم مەزهەبە پەرەی سەند، هەتا ئەو ڕووداوە مێژووییە زانراوە ڕووی دا.

بەڵام لە ئایینی ئیسلامدا هیچ ستەم لێکراوێك و خاوەن بیرێك مافی سکاڵاکردنی لە ئایینی محەممەدی ﷺ و شەریعەتی ئیسلام نی‌یە، چونکە ئەم ئایینە ڕقەبەرایەتی‌یان ناکات، بەڵکو لە ژێر سایەی خۆیدا دەیانپارێزێت.

مێژووی ئیسلام لە بەردەستماندایە و بە درێژایی ئەو مێژووە، مەگەر یەك دوو ڕووداو، دەنا ململانێی ئایینی تیایدا ڕووی نەداوە، بەڵام مەزهەبی کاسۆلیك بوو بەهۆی چەندین شۆڕشی ناوخۆیی کە چوارسەد ساڵی خایاند.

پاشان ئایینی ئیسلام قەڵایەکی مەحکەمە بۆ عەوامەکان زیاتر تا خەواصەکان. چونکە خەواصەکان بەسەر عەوامەکاندا زاڵ ناکات، بەڵکو - لە ڕوویەکەوە - دەیانکات بە خزمەتکاریان. ئەمەش لە ڕێی واجب کردنی "زەکات" و حەرام کردنی "ڕیبا"وە. ئەوەتا دەڵێت:

"خير الناس أنفعهم للناس"(١).

هەروەها:

"سيد القوم خادمهم"(٢).

جگە لەوەی کە هەردەم پرس و ڕا بە "ژیری" دەکات و بێداری دەکاتەوە، ئەوەتا دەبینیت قورئانی پیرۆز گەلێ شت بە ژیری دەسپێرێت و بۆ تێڕامان و سەرنجدان هانی دەدات، بەم چەشنە ئایەتانە:

---

(١) رواه القضاعي عن جابر كما في الجامع الصغير، وفي الأحاديث ما يشهد له كحديث: الخلق عيال الله وأحبهم إلى الله أنفعهم لعياله. (باختصار عن كشف الخفاء ٣٩٣/١)

(٢) رواه أبو عبد الرحمن السلمي في آداب الصحبة، ورواه الخطيب، وأخرجه الديلمي، ورواه الطبراني ما بمعناه.. فالحديث ضعيف كما علمت، على أنه قد يقال إنه حسن لغيره لتعدد طرقه كما مر فتدبر. (باختصار عن كشف الخفاء) (٤٦٣/٢).

﴿ويَتَفَكَّرُون في خَلْقِ السَّموات والأَرْضِ﴾ (آل عمران:١٩١).. ﴿أَفَلا يَتَدَبَّـــرُون﴾ (النساء:٨٢).. ﴿أَفَلا تَعْقِلُون﴾ (آل عمران:٦٥).

بەم کارەش پلەیـەکی بـەرز بـەناوی ئاینـەوە بە زانایـان و بیریـاران و خـاوەن ژیـری و هۆشمەندان دەبەخشێت و، گرنگیـیەکی تایبـەتییان بۆ دادەنێـت و، هـەرگیز "ژیـری" پشتگوێ ناخات و کەلەپچە لە فام و ژیری و دەم و گـوفتاری کەسـانی ژیر و خـاوەن هزر و بیر نادات و بە وێنەی مەزهـەبی کاسۆلیکی داوای چاولێکـەریی کوێرانـەیان لـێ ناکات.

بناغەی نەصرانییەتی ئێستا - نەك نەصرانییەتی ڕاستەقینە - لەگەڵ بناغەی ئیسلامدا لە خاڵێکی گرنگدا لە یـەك جیـا دەبنـەوە، بۆیـە هـەر یەکـەیان، لـە زۆر ڕووی وەك ئەوانـەی پێشوو، ڕێگایەکی جیاواز لە هی ئەوی تر دەگرێتە بەر.

ئەو خاڵە گرنگەش بریتییە لەوەی کە:

ئیسلام ئـایینی "تـەوحید"ی بێ گـەردە و، سـەرجەم هۆکارەکـان لـە کاریگـەرێتی دادەمـاڵێت و، لـە شـان و شـکۆی خۆویستـیی مـرۆڤ کـەم دەکاتـەوە و بەندایـەتیی بێ گەردی مرۆڤ بۆ خـوای گـەورە لـە دڵـدا دادەمـەزرێنێت. بـەم کـارەش دوای هـەموو جـۆرە پەروەردگارێتییـە ناڕەواکـان دەبـڕێت و بـە تـەواوەتی دەسـت بـە ڕوویانـەوە دەنێت و، بۆ ئەم کارەش لە شکاندنی پەروەردگارێتیی دەروونی بـەدخوازەوە دەست پێ دەکات.

لەبەر ئەوە، گەر کەسێك لە "چینی خەواص" بیێت بە مرۆڤێکی "خـاوەن تـەقوا" ئـەوا ناچارە واز لە خۆپەرستی و لەخۆبایی‌بوونی خۆی بهێنێت. خۆ هەرکـەس دەستبەرداری خۆپەرستی و غـرووری خـۆی نـەبێت، ئـەوا لـە دینداری‌دا ساردوسـڕ و خـاو دەبێتـەوە، تەنانەت واز لە هەندێ کاروباری ئاین دەهێنێت!

بـەڵام نەصرانییـەتی ئێستا بـاوەڕی "کوڕایـەتی"(البنـوة)ی پەسـەند کـردووە، بۆیـە کاریگـەریی ڕاسـتەقینە بـە هۆکارەکـان دەدات و، بـەناوی ئاینـەوە بـەرەنگاری "خۆپەرستی" نابێتەوە، بەڵکو جۆرە خاوێنی و قەداسەتێك بە خۆپەرستیی مرۆڤ دەدات. وەك بلێی وەکیلێکی خاوێن بێت لە بریی حەزرەتی عیسا، دروودی لەسەر بێت.

لەبەر ئەمە، مرۆڤە نەصرانی‌یە تایبەتمەندەکان کە بەرزترین پلەوپایەی دنیایی‌یان هەیە دەتوانن لە هەمان کاتدا ئاییندارێکی تەواو بن. ئەوەتا زۆریان لەم چەشنە کەسانە تێدایە وەك: "ولسن"ی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا و "لوید جورج"ی سەرۆك وەزیرانی پێشووتری ئینگلتەرا. هەر یەك لەوانە بە وێنەی هەر قەشەیەکی دەمارگیر بۆ ئایینەکەی، بە دینی خۆیان ئاییندار بوون.

بەڵام لە نێوان موسڵماناندا بە دەگمەن ڕێ دەکەوێت کە ئەو کەسانەی دەڕۆنە ناو ئەم چەشنە پلە و پایانەوە، لەسەر توندوتۆڵیی ئایینی‌یان بمێننەوە و زۆر بە کەمی ڕێ دەکەوێت لە ئەهلی تەقوا و صەلاحەت بن، لەبەر ئەوەی کە وازیان لە خۆپەرستی و غروور نەهێناوە. خۆ تەقوای ڕاستەقینەش هەرگیز لەگەڵ خۆپەرستی و غرووردا یەك ناکەوێت!

بەڵێ، هەروەك دەمارگیریی کەسانی خەواصی نەصرانییەت بۆ ئایینەکەیان و سارد و سڕی و گوێ پێ نەدانی خەواصی موسڵمانان سەبارەت بە ئایینەکەیان جیاوازی‌یەکی گرنگ دەردەخات، بە هەمان جۆر دەبینین ئەو فەیلەسووفانەش کە لەناو ئایینی نەصرانی‌دا سەریان هەڵداوە ئایینەکەیان پشتگوێ خستووە و شێوەی نەیاریان لە ئاستدا گرتووەتە خۆ، کەچی زۆربەی ئەو دانا و حەکیمانەی لە ئیسلامدا پەیدا بوون، دانستەکەیان لەسەر بناغەی "ئایین" بنیات ناوە. کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جیاوازی‌یەکی گرنگ لە نێوان هەردوو ئاییندا.

پاشان چینی عەوامی نەصرانی‌یەکان کە دووچاری بەڵا و گیروگرفتەکان بووبوون و بەشێکی ژیانیان لە بەندیخانەکاندا بەسەر برد، هەرگیز چاوەڕوان و ئومێدەواری هیچ یارمەتی و دەرووبەك نەبوون لە لایەن ئایینەوە! بۆیە زۆربەیان - کاتی خۆی - لە ڕێ دەترازان و دووچاری ئیلحاد دەبوون.

تەنانەت ئەو شۆڕشگێڕانەی کە ئاگری شۆڕشی فەرەنسی‌یان داگیرساند و ناوی "ڕەشۆکی و ئاژاوەچی"یان لێ نرا و لە مێژوودا بەناوبانگن، لەو چینە عەوامە کلۆڵە پێکهاتبوون.. بەڵام لە ئیسلامدا زۆربەی ڕەهای ئەو کەسانەی کە بەشێکی تەمەنیان لە بەندیخانەکاندا بەسەر بردووە و دووچاری بەڵا و گیروگرفت بوون، چاوەڕێی یارمەتی و هاوکاری لە ئایینەکەیانەوە دەکەن، بەڵکو دەبن بە مرۆڤی ئایینداری ڕێکوپێك.

ئەم حاڵەتەش بەڵگەیە لەسەر جیاوازییەكی تری گرنگ.

❀ **ئاماژەی سێهەم:**

ئەهلی بیدعەت دەڵێن:

ئەم "دەمارگیرییە ئایینییە" ئێمەی لە كاروانی شارستانێتی دواخستووە. خۆ هەنگاونانیش لەگەڵ خواستەكانی چەرخ و رۆژگاردا بە دەستبەرداربوون دەبێت لە دەمارگیری.. ئەورووپا كاتێ پێش كەوت كە وازی لە دەمارگیری هێنا!

**وەڵام:**

ئێوە یان ئەوەیە بە هەڵەدا چوون و خەڵەتاون و لەخشتە براون، یاخود خەڵكی لەخشتە دەبەن و دەیانخەڵەتێنن! چونكە ئەورووپا بە دەمارگیرییەوە دەستی لە ئایینەكەی خۆی گیر كردووە! ئەوەتا گەر بە كەسێكی ئاسایی خەڵكی بولگارستان، یان بە سەربازێكی ئینگلیز، یاخود بە كەسێكی هەرزەی فەرەنسی بڵێیت: دەبێ "مێزەر" لەسەر بكەیت دەنا دەخرێیتە بەندیخانەوە، ئەوا بەپێی خواستی دەمارگیرییەكەی لە وەڵامدا دەڵێت: گەر بیشمكوژن بەم چەشنە سووكایەتی پێ كردنانە ئایین و نەتەوەكەی خۆم سووك و ڕسوا ناكەم!

پاشان مێژوو شایەتە لەسەر ئەوەی كە موسڵمانان هەتا دەستیان لە ئایینەكەیان گیر كردبێت، ئەوا بەپێی ئەو رۆژگارە پێشكەوتن و بەرزبوونەوەیان بەخۆیانەوە دیوە و.. هەر كاتێكیش ئایینەكەیان پشتگوێ خستبێت، نزم بوونەتەوە و دواكەوتوون. كەچی ئایینی نەصرانییەت بە پێچەوانەی ئەمەوەیە. ئەم دەرەنجامەش هی جیاوازییەكی بنەڕەتییە لە نێوانیاندا.

پاشان ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئایینەكانی تردا بە یەك چاو تەماشا ناكرێت، چونكە گەر موسڵمان خۆی لە ئیسلام دامالێت ئەوا باوەڕی بە هیچ پێغەمبەرێكی تر نامێنێت. تەنانەت دان بە بوونی خوای گەورەشدا نانێت، بەڵكو باوەڕ بە هیچ شتێكی موقەددەس ناكات و لە ناخی ویژدانی خۆیدا شوێنێك شك نابات كە مایەی سەرهەڵدانی ڕەوشتە بەرزەكان بێت، چونكە ویژدانی - بە تەواوەتی - دەگەنێت و كەڵكی نامێنێت. هەر لەبەر ئەمەشە كە ئەو كەسەی لە ئیسلام پاشگەز دەبێتەوە مافی ژیانی نییە، چونكە ویژدان و هەناوی بە تەواوەتی گەنیوە و وەكو ژەهری كوشندەی لێ هاتووە بۆ كۆمەڵ. كەچی كافری جەنگی - لە ئیسلامدا - مافی ژیانی هەیە، ئەوەتا گەر لە دەرەوەی وڵاتدا

بێت و "په‌یمان" بدات یاخود له‌ناو ولاتدا بێت و "جیزیه" بدات، ئه‌وا ژیانی له سایه‌ی ئایینی ئیسلامدا پارێزراوه.

به‌لام مولحیدی ناو نه‌صرانی‌یه‌كان به‌م جۆره نی‌یه، چونكه ده‌توانێت به‌و مولحیدی‌یه‌ی خۆیه‌وه سوود به كۆمه‌له‌كه‌ی بگه‌یه‌نێت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ندێ موقه‌دده‌سات په‌سه‌ند ده‌كات و باوه‌ڕی به هه‌ندێ له پێغه‌مبه‌ران هه‌یه، هه‌روه‌ك له ڕوویه‌كه‌وه ئیمانداره به خوای گه‌وره‌ش.

ئایا ئه‌و بیدعه‌ت خوازانه - به‌ڵكو ڕاستتر وایه بڵێین: ئه‌و ئه‌هلی ئیلحاده - چ به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كیان ده‌ست ده‌كه‌وێت كاتێ له ئایین ده‌رده‌چن؟ خۆ ئه‌گه‌ر مه‌به‌ستیان له‌م كاره ئاسایشی ولات و بال ڕاكێشانی ڕێسا و ئارامی‌یه تیای‌دا، ئه‌وا به‌ڕێوه‌بردنی (ده) كه‌سی مولحیدی نزم له‌وانه‌ی كه باوه‌ڕیان به خوا نی‌یه، هه‌روه‌ها بوارنه‌دان به نانه‌وه‌ی شه‌ڕ و زیانیان، گه‌لێ سه‌خت و دژوارتره له به‌ڕێوه‌بردنی (هه‌زار) كه‌سی ئیماندار..

گه‌ر حه‌زیشیان له پێشكه‌وتنی شارستانی‌یه، ئه‌وا ئه‌و چه‌شنه مولحیدانه هه‌روه‌ك زیان له به‌ڕێوه‌بردنی ده‌وله‌ت ده‌ده‌ن، ده‌شبن به ته‌گه‌ره له ڕووی پێشكه‌وتندا. چونكه "ڕێسا" و "ئاسایش" تێكده‌ده‌ن كه بریتین له دوو بناغه‌ی گرنگی پێشكه‌وتن و بازرگانێتی.

له ڕاستی‌دا ئه‌و مولحیدانه، به‌پێی خواستی ڕێبازه‌كه‌یان، كاولكار و زیانبه‌خشن و.. نه‌فامترین كه‌سی گه‌وج و گه‌لحۆ له دنیادا ئه‌و كه‌سه‌یه كه پێشكه‌وتن و به‌خته‌وه‌ریی ژیان له‌و چه‌شنه مولحیده هه‌رزانه‌وه چاوه‌ڕوان بكات!

یه‌كێك له‌و گه‌وجانه، كه مه‌نسه‌بێكی گرنگی هه‌یه، وتوویه‌تی:

ئێمه بۆیه دواكه‌وتین چونكه وتمان: "الله.. الله.." به‌لام ئه‌ورووپا بۆیه پێشكه‌وت وتی: "تۆپ.. تفه‌نگ"!

وه‌لامی ئه‌و چه‌شنه كه‌سانه بریتی‌یه له "بێ ده‌نگی" به‌پێی قاعیده‌ی: "جواب الأحمق السكوت"! به‌لام ڕووی گوفتارمان ئاراسته‌ی ئه‌و خاوه‌ن ژیری‌یه به‌دبه‌ختانه ده‌كه‌ین كه شوێن ئه‌و جۆره ئه‌حمه‌قانه كه‌وتوون و، پێیان ده‌ڵێین:

ئه‌ی به‌دبه‌ختینه!

ئه‌م دنیایه میوانخانه‌یه‌كه و، مردنیش حه‌قه و له ڕێماندایه. چونكه هه‌موو ڕۆژێك سی هه‌زار ته‌رم شایه‌تی له‌سه‌ر ئه‌م بڕیاره ده‌ده‌ن. جا ئایا ئێوه ده‌توانن مردن نه‌هێڵن و له‌ناوی

بەرن؟ ئایا دەتوانن ئەو هەموو شـایەتانە بـەدرۆ بخەنـەوە؟ خـۆ مـادەم لەمـەدا دەستەوسـانن، ئـەوا مـردن ناچارتـان دەکـات بلێـن: "الله..الله..". چونکـە ئایا کـام تـۆپ و تفـەنگتان دەتوانێت لـە بریی زیکری "الله.. الله.." جیهانی ئەو کەسەی لـە سـەرەمەرگدایە ڕووناك بکاتـەوە و تاریکستانی هەمیشـەیی بۆ بڕەوێنێتـەوە؟ یـان کـام لــە تـۆپ و تفەنگـەکانتان دەتوانێت لە بریی زیکری "الله.. الله.." نائومێدیی‌یە ڕەش و تەماوی‌یەکەی بۆ بگۆڕێت بە هیوایەکی درەخشان!

جا مادەم مردن هەیە و، چارەنووسمان بە یەقینی بەرەو گۆڕە و، ئەم ژیانـەش دەڕوات و کۆتایی پێ دێت و ژیانێکی باقی و هەمیشەیی دێتە جێ، ئەوا گەر یەك جار پێویست بێـت بوترێ: "تۆپ.. تفەنگ.." دەبـێ هـەزار جـار بوترێـت: "الله.. الله..".. تەنانـەت خـودی تفەنگیش دەڵێت: "الله.. الله.." گەر لە پێناوی خوادا بێت و، تۆپیش لە دەمی بەربانگ و پارشێودا گرمەی لـێ هەڵدەستێ و دەڵێت: "الله أكبر"!

❀ ئاماژەی چوارەم:

بیدعەتخوازانی ڕووخێنەر دوو بەشن:

بەشێکیان لایەنگیریی ئایین دەردەخەن و دەڵێن:

"ئایین لاواز بـووە و ئێمـەش دەمانـەوێت بـە ناشـتنی درەختـە نوورانی‌یەکـەی لـە گڵـی نەتەوایەتی‌دا، هێز و پێزی بە بەردا بکەینـەوە"! واتـە دەیانـەوێت بـە "نەتەوایـەتی"، "ئـایین" بەهێز بکەن! وەك بڵێی بەم کارەیان بیانەوێت خزمەتی ئیسلام بکەن!

بەشی دووهەم لەوانەی کە بیدعەتەکان دەهێننە کایەوە دەڵێن:

"ئێمـە دەمانـەوێت نەتەوەکـەمان بـە لوقـاحی ئیسـلام بکوتـین"! واتـە بـۆ مەبەسـتی بەهێزکردنی "ڕەگەزپەرستی" بەناوی نەتەوە و لە پێناوی قەومییەتدا کار دەکەن.

بە بەشی یەکەمیان دەڵێین:

ئەی زانا خراپکارە بەدبەختەکان کە ناوی "گەوجە هاوڕێ"تان تێدا هاتووەتە دی!..

هەروەها ئەی سۆفی‌یە مەجزووبە بێ‌عەقڵە نەزانەکان!

ڕەگ و ڕیشەی درەختی تووبای ئیسلام لە ناوجەرگە و حەقیقەتی گەردووندا جێگیر بـووە و دەمارەکـانی ئـەو ڕەگانەشـی بـە نـاو سـەرجەمی ڕاستی‌یەکانی گـەردووندا بـڵاو بوونەتەوە. درەختێك کە ئەمە حاڵیەتی هەرگیز ناگونجێ لەناو خاکی ڕەگەزپەرستایەتیی وەهمـی و کـاتی و جوزئـی و تایبـەتی و سـەلبی و تەنانــەت بـێ بناغەشـدا بنێژرێـت کـە

خاکێکە سەرتاسەر پڕە لە مەبەست و ئامانجە تاریك و ستەمکارەکان. هەر هەوڵدانێك بۆ ناشتنی ئەم درەختە لەو خاکەدا، هەوڵێکی بیدعەتکارانە و ڕووخێنەر و نەفامانەیە.

بە قەومی‌یەکانیش دەڵێین، کە بەشی دووهەمی بیدعەت خوازانن:

ئەی مەستانی لاف لێدەری نەتەوایەتی!

لەوانەیە چەرخی پێشوو چەرخی قەومییەت بوو بێت، بەڵام ئەم چەرخە هەرگیز هی قەومییەت نی‌یە! چونکە بیر و بۆچوونەکانی بەلشەفی و سۆسیالیستی خۆیان بەسەر بیرکردنەوەی خەڵکی‌دا زاڵ دەکەن و چەمکی ڕەگەزپەرستی تێکدەشکێنن. کەواتە چەرخی ڕەگەزپەرستی ڕۆشت و بەسەرچوو!

ئەوەش بزانن کە "نەتەوایەتیی بەردەوام و هەمیشەیی ئیسلام" هەرگیز لەگەڵ ڕەگەزپەرستیی لەقولۆقی کاتی‌دا یەك ناکەوێت و بە لوقاحی ئەو ناکوترێت! تەنانەت گەر ئەم چەشنە کوتانە بە لوقاحی ڕەگەزپەرستی ڕوو بدات ئەوا نەتەوایەتیی ئیسلام دەشێوێنێت و هیچ سوودێکیش بە نەتەوایەتیی ڕەگەزپەرستی ناگەیەنێت و نایبووژێنێتەوە.

بەڵێ، چێژێکی کاتی و هێزێکی یەکجار سەرپێی‌یی لە کوتاندنی ئیسلامدا هەیە بە لوقاحی ڕەگەزپەرستی، بەڵام ئەنجامێکی ناهەمواری لێ دەکەوێتەوە.

پاشان بەم کارە: پارچە پارچە بوون و پەرتەوازەیی‌یەکی ئەبەدی و هێندە گەورە دەکەوێتە نێوان نەتەوەی تورکەوە کە هەرگیز یەکگرتنەوە بە خۆیەوە نەبینێتەوە، دیارە ئەو کاتەش هێزی نەتەوە تیادەچێت و دەدرێت بەبادا، چونکە هەریەك لەو کەرتانە هەوڵی ڕووخاندنی کەرتەکانی تر دەدات. نابینیت هەردوو تای تەرازوو گەر دوو چیای مەزنی هاوسەنگیشیان تێدا بێت، ئەوا هێزێکی یەکجار کەم دەتوانێت ڕۆڵ لە نێوان ئەو دوو هێزەدا ببینێت، ئەوەتا دەتوانێت یەکێکیان بۆ لای خوارەوە ببات و ئەوی تریشیان بۆ لای سەرەوە بەرز بکاتەوە!

**پرسیاری دووهەم:**

کە بریتی‌یە لە دوو ئاماژە:

❀ **ئاماژەی یەکەم، کە ئاماژەی پێنجەمە:**

ئەم ئاماژەیە وەڵامێکی یەکجار پوختی پرسیارێکی گرنگە.

**پرسیار:**

چەند ڕیوایەتێکی صەحیح هەن سەبارەت بەوەی کە حەزرەتی مەهدی - خـوای لـێ ڕازی بێت - لە ئاخرزەماندا سەرهەڵدەدات و چاکسازی لـەم جیهانـەدا دەکـات، دوای ئەوەی کە تێکچوون و خراپکاری پەرەی تێدا سەندبوو..

بەڵام خۆ دەزانین ئەم چەرخەی ئێمە چەرخ و سـەردەمی "کۆمـەڵ"ە، نـەك هـی "تاکـە کـەس". چونکـە مرۆڤـی تـاك - بـا زۆر زیرەکیـش بێـت تەنانـەت هـێزی سـەد مرۆڤـی بلیمەتیشی لەخۆدا هەڵگرتبێت - گەر نوێنەری کۆمەڵێکی گەورە نەبێت و گـوزارش لـە کەسایەتیی مەعنەویی ئـەو کۆمەڵـە نـەکات، ئـەوا لـە بـەردەم هـێزی کەسێتیی مەعنـەویی کۆمـەڵی نـەیاردا تێکدەشـکێت. کەواتـە ئیـتر چـۆن حـەزرەتی مـەهدی - بـا هـێزی ویلایەتیشی لـە هـەر ئاستێکدا بێـت - دەتوانێـت چاکسـازی لـەم زەمانـەدا بکـات کـە خراپکاری پەرەی تێـدا سـەندووە و گشـت کۆمـەڵگاکانی مرۆڤیشـی گرتووەتـەوە؟ خۆ ئەگـەر سـەرجەمی کارەکانیشـی دەراسا(خـارق للعـادة) بـن ئـەوا ئـەم کارانـەی دژ و پێچەوانەی ئەو دانست و یاسا بەردەوامانەی خواوەند دەبن کە لـەم گەردوونـەدا دەست بەکارن؟ بەکورتی دەمانەوێت لە نهێنیی مەسەلەی "مەهدی" بگەین.

**وەڵام:**

خـوای گـەورە لەبـەر کـەماڵی میـهرەبانیی خـۆی و، وەك بەڵگەیـەکیش لەسـەر پارێزگاری کردنـی شـەریعەتی ئیسـلام و بەردەوامی و هەمیشـەیی‌یەکەی، لـە هـەموو کات و سەردەمێکی خراپکاری و لەڕێ ترازانی نەتـەوەی ئیسـلامدا: چاکسـازێك، یـان نوێکارێك، یان خەلیفەیەکی مەزن، یان قوتبێکی ئەعزەم، یان ڕابەرێکی کامڵی لـە نێـوان کەسایەتی‌یە مەزنە هەڵکەوتووەکاندا کە وەك "مەهدی" وان، ڕەوانە کـردووە و، ئـەویش خراپکاریی ئەو سەردەمەی نەهێشتووە و چاکسازیی لە نەتـەوەدا ئـەنجام داوە و ئایینیشـی پاراستووە.

خۆ مـادەم سـوننەتی خـوا بـەم جۆرە ڕایی بـووە، ئـەوا گومـان لـەوەدا نی‌یـە کـە لـە دژوارترین کاتەکانی فەساد و خراپکاریی ئاخر زەمانیشدا خوای گەورە کەسێك لە ئالی بەیتی نەبەوی دەنێرێت کە: مەزنترین موجتەهید و، گەورەترین موجەددید و، پایـەدارترین قوتب بێت و، لە هەمان کاتیشدا فەرمانڕەوا و مەهدی و ڕێ پیشاندەری خەڵکی بێت.

ئەو خواوەندە بەتوانایەی کە لە ماوەی یەك خولەکدا نێوان زەوی و ئاسمان لە هەور پڕ دەکات و خاڵییشی دەکاتەوە، دەشتوانێت بە چاوترووکاندنێك زریانی سەختی دەریا هێور بکاتەوە.. هەروەها ئەو بەتوانا شکۆمەندەی کە لە سەعاتێکی ڕۆژەکانی بەهاردا نموونەی وەرزی هاوین و لە سەعاتێکی ڕۆژەکانی هاوینیشدا تۆف و زریانێکی وەك هی زستان بەرپا دەکات، دەشتوانێت لەسەر دەستی "مەهدی"دا ئەو تاریکایی‌یە کەڵەکەبووانەی سەر ڕووی ئاسمانی جیهانی ئیسلامی و ئەو مەترسی‌یانەش ئابلۆوقەیان داون، بڕەوێنێتەوە و بەڵێنی ئەمەشی پێ داوین. بێ گومان بەڵێنەکەشی دەباتە سەر.

گەر بەم جۆرە لە گۆشەی "توانست"ی خواوەندەوە بڕوانینە ئەم مەسەلەیە، ئەوا لەوپەڕی ئاسانی‌دا پێش‌چاو دەکەوێت.

خۆ ئەگەر لە گۆشەی بازنەی هۆکارەکان و دانستی پەروەردگاریشەوە بۆی بڕوانین، دەردەکەوێت کە – بە هەمان جۆر – لەوپەڕی ئاسانی‌دایە، بەڵکو لە هەموو شتێك نزیکتر و شایانتری ڕوودانە. تەنانەت بیریاران و کەسانی خاوەن ڕوانینی ورد و تیژامان پێیان وایە کە: حیکمەتی پەروەردگار ئاوا دەخوازێ و بە حەتمییش هەر بەو جۆرە دەبێت. تەنانەت گەر هیچ ریوایەتێکیش لە هەواڵدەری ڕاستگۆوە ﷺ لەم بارەیەوە نەبێت. واتە هاتنی حەزرەتی مەهدی کارێکی پێویست و زەرووری‌یە. چونکە دوعا و پاڕانەوەی: "اللهم صلّ علی سیّدنا محمد و علی آل سیّدنا محمد کما صلّیت علی ابراهیم وعلی آل ابراهیم فی العالمین إنّك حمید مجید" کە نەتەوەی ئیسلام لە نوێژەکانیاندا هەموو ڕۆژێك بە لای کەمەوە پێنج جار دووپاتی دەکەنەوە، دوعایەکە قبووڵ بوونە کەی بە ئاشکرا چەسپاوە. چونکە ئالی محەممەد ﷺ بە وێنەی ئالی ئیبراهیم – درودی لەسەر بێت – لە هەموو چەرخ و سەردەم و شوێنێکدا پێشڕەو بوون و لە پێشەکیی هەموو وەچە و نەوە پیرۆزەکانەوەن و[1]، ئەو پاڵەوانانە هێندە زۆرن سوپایەکی مەزن لە کۆی هەموویان پێکدەهێنن.

---

(١) تەنانەت یەکێك لەو سەییدانەی ئەهلی بەیت: (سەیید ئەحمەدی سەنووسی)یە کە سەرکردایەتیی ملیۆنەها موریدی دەکات. هەروەها یەکێکی تریان (سەیید ئیدریس)ە کە سەرکردەی زیاد لە سەد هەزار موسڵمانە و، (سەیید یەحیا)یە کە میری سەدان هەزار کەسە.. بەم جۆرە، کەسانێکی زۆری وەك ئەو پاڵەوانە بەجەرگانەی ئالی بەیت لە "ظاهیر"دا دەبینین، جگە لەوەی کە لە "بـاطین"یشدا پێشەوایانی پێشەوای وەك: سەیید عەبدولقادری گەیلانی و سەیید ئەبولحەسەنی شازلی و سەیید ئەحمەدی بەدەوی و هاوچەشنانیان هاتوون و ڕۆڵیان بینیوە. (دانەر)

جا ئەگەر ئەو بەڕێزانە یەك بکەون و بە کردەوە قۆڵیان بە قۆڵی یەکتردا بکەن و لە نێوان خۆیاندا بە گەرموگوڕی پشتی یەکتری بگرن و، هەر لە ڕاستیدا تیپێکی یەکگرتوو لە خۆیاندا پێکبهێنن و، ئایینی ئیسلام بکەن بە پەیوەندیدەری موقەددەسی نەتەوەی ئیسلام و خولگەی ڕابوونی نەتەوە، ئەوا هیچ سوپایەك لە جیهاندا ناتوانێت خۆی لە بەردەمیاندا ڕابگرێ..

جا ئەو سوپا زۆر و بەتوانا و هێز و دەستەڵاتە بریتییە لە "ئالی محەممەد ﷺ" کە تایبەتمەندترینی سوپاکانی حەزرەتی مەهدین.

بەڵێ، لە نێوان هەموو وەچە و ڕەچەڵەکێکی گرۆی مرۆڤ لە مێژووی جیهانی ئەمڕۆدا هیچ وەچە و ڕەچەڵەکێك نییە بە وێنەی ئالی بەیت بەهرەمەندی ئەوە بن کە بە ڕەچەڵەك بڕۆنەوە سەر درەختی بەرز و بڵندی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ و وەك ئەوان هێز و گرنگییان بێت و بڵندترین پلەکانی شەرەف و حەسەبی بەرز و نەسەبی دێرینیان بەدەست هێنابێت کە بە شەجەرە و سەنەد و داب و نەریتەوە بڕۆنەوە سەر دامەزرێنەری ئەو پلە و پایەیە.

هەر لە دێر زەمانەوە ئەو بەڕێزانە پێشەوای هەموو دەستە و تاقمێکی ئەهلی حەقیقەت و سەرکردەی بەناوبانگانی ئەهلی کەماڵ بوون. ئەمڕۆش ئەو وەچە پیرۆز و خاوێنە لە ملیۆنەها تێپەڕ دەبن و هەردەم بێدارن و خاوەنی دڵ و دەروونێکی ئاوەدان و پڕ لە خۆشەویستیی پێغەمبەرن ﷺ و بەهرەمەندی گەیشتنەوەی ڕەچەڵەکیانن بەو درەختە خاوێن و پیرۆزە. وا ئەو ڕووداوە مەزنانەی کە هێزی موقەددەسی ناو دڵ و دەروونی ئەم کۆمەڵە مەزنە دەوروژێنن، لە خۆ ئامادە کردندان.. دەبێ ئەو غیرەتە بەرزەی کە لەو هێزە مەزنەدایە بورووژێت و ڕابپەڕێت و ئەو کاتەش حەزرەتی مەهدی جڵەوی سەرکردایەتی دەگرێتە دەست و ئەو کۆمەڵە بەرەو ڕێی حەق و حەقیقەت ئاراستە دەکات.

ئێمە بە وێنەی چاوەڕوانیمان بۆ بەهاری دوای ئەم زستانە، ڕوودانی ئەم ڕووداوە گرنگە لە سوننەت و میهرەبانیی خواوەند چاوەڕوان دەکەین و، لەم چاوەڕوانییەشماندا حەقمان پێکاوە!

**❀ ئاماژەی دووهەم، واتە ئاماژەی شەشەم:**

کۆمەڵی نوورانیی حەزرەتی مەهدی چاکسازی و ئاوەدانی و تەعمیرکاری لە هەموو ئەو بوارانەدا دەکات کە ڕژێمی بیدعەتکاری ڕووخێنەری سوفیانی تێکی

داوە و، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ زیندوو دەكاتەوە. واتە: ئەو كۆمەڵەی سوفیانی كە بە نیازی ئینكاری كردنی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لە جیهانی ئیسلامدا بۆ ڕووخاندنی شەریعەتی ئەحمەدی تێدەكۆشن، بە شمشێری مەعنەوی و دەراسای كۆمەڵی حەزرەتی مەهدی دەكوژرێن و تەفر و توونا دەكرێن.

پاشان كۆمەڵێكی نەصرانیی بەغیرەت و خۆبەختكار كە شایانی ئەوەن ناوی "نەصرانییە موسڵمانەكان"یان لێ بنرێت، تێدەكۆشن ئایینی ڕاستەقینەی حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – لەگەڵ ڕاستییەكانی ئیسلامدا بە سەركردایەتی حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – جۆش بدەن و یەكیان بخەن. جا ئەم كۆمەڵە ڕژێمی دەجاڵ لەبنج و بێخ هەڵدەتەكێنن و سەركردایەتییەكەشی دەكوژن و لە ناوی دەبەن، كە سەركردایەتییەكی ئەوتۆیە بە نیازی ئینكاری كردنی خوایەتیی خوای گەورە لە جیهانی مرۆڤایەتیدا شارستانێتی و موقەددەساتی گرۆی مرۆڤ دەڕووخێنن و دەیدەن بە بادا. بەم چەشنە ئەو كۆمەڵەی كە حەزرەتی عیسا – دروودی لەسەر بێت – سەركردایەتییان دەكات، گرۆی مرۆڤ لە كارەسات و ئەنجامە ناهەموارەكانی ئینكاریی خوایەتیی خوای گەورە ڕزگار دەكات.

باسكردنی ئەم نهێنییە گەلێ درێژخایەنە، بەڵام بەم ئاماژە كورتە وازم هێنا، چونكە لە هەندێ شوێنی تردا چەند پوختە و چەردەیەكمان لێ باس كردووە.

❀ **ئاماژەی حەوتەم، واتە پرسیاری سێهەم:**

**دەڵێن:**

بەرگرییەكانی پێشووت و شێوازی جیهاد كردنت لە پێناوی ئیسلامدا وەك ئەم شێوازەی كاتی ئێستات نییە.. پاشان تۆ ڕێبازی ئەو بیریارانە ناگریتە بەر كە لە بەرامبەر ئەورووپاوە بەرگری لە ئیسلام دەكەن. جا ئایا بۆچی تەرز و شێوەی "سەعیدی كۆن"ت گۆڕی و لەبەر چی بە شێوازی موجاهیدە مەعنەوییە مەزنەكانیش جیهاد ناكەیت؟

**وەڵام:**

"سەعیدی كۆن" و بیریارەكان لە هەندێكی دەستوورەكانی فەلسەفەی مرۆڤ "ڕازی"ن. واتە شتێكیان لێ پەسەند كردووە و، هەر بە چەكی ئەوان زۆرانیان لەگەڵدا دەگرن و، بەشێك لە دەستوورەكانی فەلسەفەیان بە وێنەی زانستە نوێیەكان وەرگرتووە و سەلماندوویانە. بۆیە ناتوانن – بەم شێوە كاركردنە – وێنەی ڕاستەقینەی

ئیسلام پێشكەش بكەن. چونكە دەچن درەختی ئیسلام بە لق و پەلی ئەو حیكمەت و فەلسەفەیە موتوربە دەكەن كە پێیان وایە خاوەنی ڕەگ و ڕیشەی قووڵ و بەربلاو بن. وەك بڵێی دەیانەوێت بەم كارەیان ئایینی ئیسلام بەهێز بكەن!

بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بە كەمی ڕێ دەكەوێت كە بەم چەشنە كاركردنە سەركەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەست بهێنرێت و.. لەبەر ئەوەش كە هەندێك داشكانی تێدایە لە شان و شكۆی ئیسلام، ئەوا وازم لەو ڕێبازە هێناو، بە ڕاستی و كردار دەرمخست كە بناغەكانی ئیسلام هێندە ڕیشەكدار و قووڵن و ئەوەندە بەناخدا ڕۆچوون كە هەرگیز بناغەكانی فەلسەفەیان پێ ناگات، تەنانەت لە بەرامبەریانەوە بێ بناغە و ڕووكەش دەردەكەون.

لە "وتەی سیهەم" و "مەكتووبی بیست و چوارەم" و "وتەی بیست و نۆهەم"دا ئەم ڕاستییەم بە بەڵگەكانیەوە پێش چاو خستووە.

لە ڕێبازی پێشوودا وا گومان دەبرێت كە فەلسەفە شتێكی قووڵ بێت و ئەحكامەكانی ئیسلامیش ڕواڵەتی و ڕووكەش بن، بۆیە دەست لە پەل و لقەكانی فەلسەفە گیر دەكرێت بۆ مەبەستی پاراستنی ئیسلام!

بەڵام هەرگیز وانییە و ئەم بۆچوونە گەلێ لە واقیعەوە دوورە. دەستوورەكانی فەلسەفە لە كوێ دەتوانن بەو ئەحكامانە بگەنەوە!

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إلاّ ما عَلَّمْتَنا إنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكيم﴾.

﴿الحمدُ للهِ الذي هَدانا لهذا وما كُنّا لِنَهْتَدِيَ لولا أنْ هَدانا اللهُ لقدْ جآءتْ رُسُلُ رَبِّنا بالحق﴾.

اللهم صلّ على سيِّدِنا محمد وعلى آل سيدنا محمد كما صليت على سيدنا ابراهيم وعلى آل ابراهيم في العالمين انك حميد مجيد.

## بەشی هەشتەم

### هەشت هێماكان

بریتییە لە هەشت نامیلكەی بچووك، پشت بەخوا وەك پەیامێكی سەربەخۆ بڵاو دەكرێتەوە. بۆیە لێرەدا دانەنرا.

# بەشی نۆهەم
## نۆ تەلویحەکان

بسم الله الرّحمن الرّحیم

﴿أَلا إِنَّ أَوْلِیاءَ اللهِ لا خَوْفٌ عَلَیْهِمْ وَلا هُمْ یَحْزَنُونَ﴾ (یونس:٦٢)

**ئەم بەشە تایبەتە بە ڕێگاکانی ویلایەتەوە و بریتی‌یە لە نۆ "تەلویح"[١].**

**✿ تەلویحی یەکەم:**

ڕاستی‌یەکی ڕۆحانی و نوورانی و خاوێن لە ژێر ناونیشانەکانی: "تەسەووف" و "تەریقەت" و "ویلایەت" و "سەیر و سلووك"دا هەیە کە گەلێ کەس لە زانایانی ئەهلی کەشف و خاوەن چێژی ئەم بوارە ڕایانگەیاندووە و، بە لێکۆڵینەوە و تەتەڵەکردن و پێناساندنەوە تاوتوێیان کردووە و، هەزاران بەرگی کتێبیان لەبارەوە نووسیوە و، هەواڵی ئەم حەقیقەتەشیان بە ئێمە و سەرجەمی نەتەوەی ئیسلام ڕاگەیاندووە، خوا پاداشتی خێریان بداتەوە.

وا ئێمەش لێرەدا و لە ڕووناکیی ئەو بوارەی کە کاتی ئێستامان بۆمان دەڕەخسێنێت، چەند نمێك ڕوون دەکەینەوە کە وەك چەند دڵۆپێك وان لە دەریای فراوانی ئەو حەقیقەتە.

**پرسیار: تەریقەت چی‌یە؟**

**وەڵام:**

ئامانجی "تەریقەت": ناسین و بەدەستهێنانی ڕاستی‌یەکانی ئیمان و قورئانە لە ڕێی سەیر و سلووکی ڕۆحانی و لە ژێر ئاڵا و سایەی "میعراجی ئەحمەدی"دا بە هەنگاونانی دڵ، هەتا گەیشتن بە حاڵەتێکی ویجدانی و زەوقیی ئەوتۆ کە وەك "شهوود" وایێت. کەواتە تەریقەت و تەسەووف نهێنی‌یەکی بەرزی ئادەمیزاد و کەماڵێکی بڵندی گرۆی مرۆڤە.

---

(١) تەلویح: واتە ئاماژە. بەڵام بە واتایەکی تر: چەند زیادە شەرح و لێکدانەوەیەکە لە کەنار و پەراوێزی کتێبدا. (وەرگێڕ)

بەڵێ، مادەم مرۆڤ پوختەیەکی جامیعی ئەم گەردوونەیە، ئەوا دڵی ئەو وەکو نەخشەیەکی مەعنەوی وایە بۆ هەزارەها جیهان. چونکە هەروەك "مێشکی مرۆڤ" - کە لە سەنتەرێکی بڵاوکردنەوە و وەرگرتنی ئامێرە تەلی و بێ‌تەلی‌یەکان دەچێت - وەك مەڵبەندێکی مەعنەویی ئەم گەردوونە وایە و هونەر و زانستەکانی ئەم گەردوونە وەردەگرێت و پاشان دەریاندەخات و بڵاویان دەکاتەوە، بە هەمان جۆر "دڵ"یشی تەوەرە و مەزهەر و ناوکی ڕاستی‌یە بێ سنوورەکانی ئەم گەردوونەیە، وەك کەسانی لەژمارەبەدەری ئەهلی ویلایەت ڕوونیان کردووەتەوە لەو ملیۆنەها کتێبە درەخشان و بەنرخانەدا کە نووسیویانن و بۆیان بەجێ هێشتووین.

جا مادەم "دڵ" و "مێشك"ی مرۆڤ ئەم پلەوپایە و ڕێ و شوێنەیان هەیە و، ئنجا هەزاران مەکینەی گەورەی سەر بە دوارۆژ و ئامێرە هەمیشەیی‌یەکانیشی لە دڵی مرۆڤدا دانراون، بە وێنەی دانانی ئامێرەکانی درەختێکی مەزن لە تۆوەکەیدا.. ئەوا بەدیهێنەری ئەو دڵەی کە لەسەر ئەم شێوەیە دروستی کردووە، ویستوویەتی ئەم "دڵ"ە بخاتەکار و توانا و لێهاتنەکانی دەربخات و لە دۆخی "هێز"ەوە بیانگوێزێتەوە بۆ دۆخی "کار".

جا مادەم ویستی خوای گەورە بەم جۆرە بووە، ئەوا دەبێ "دڵ"ی مرۆڤ ئەو کارەی خۆی ئەنجام بدات کە لە پێناویدا بەدی هێنراوە، وەك ئەوەی کە "ژیری" کاری خۆی ڕادەپەڕێنێت. بێ گومان گەورەترین هۆکاری بەگەڕخستن و کارپێ کردنی "دڵ"یش لەوەدایە کە بە یاد و زیکری خوای گەورە و لە ناوەندی پلەکانی ویلایەتدا و لە ڕێی تەریقەتەوە ڕوو بکاتە "ڕاستی‌یەکانی ئیمان".

**✿ تەلویحی دووهەم:**

کلیلەکانی ئەم سەیر و سلووکە قەلبی‌یە و هۆکارەکانی ئەم جموجووڵە ڕۆحانی‌یەش تەنها بریتی‌یە لە "زیکری خوا" و "بیر کردنەوە". دیارە لایەنە باش و جوانەکانی "زیکر" و "بیرکردنەوە"ش لە ژمارە نایەن. خۆ ئەگەر سەیری سوودە بێ سنوورە قیامەتی‌یەکانی ئەم دوانە و ئەنجامە بەرزەکانیان لەمەڕ بەرزکردنەوەی مرۆڤ بە پلەکانی کەماڵاتدا نەکەین و، تەنها سەرنج لە یەك سوودی جوزئی‌یان بدەین کە بەم ژیانە دنیایی‌یە شڵەژاوەی مرۆڤی دەبەخشن، ئەوا دەبینین کە:

هەرچی مرۆڤ هەیە بە دوای دڵدانەوە و چێژ و هاودەمێکدا دەگەڕێت کە بتوانێت بێزاریی لەسەر لابات و قورسایی‌یەکانی ئەم ژیانەشی لەسەرشان سووك بکات و لە

کەفوکوڵ و هەڵچوونەکەی – با بە شێوەیەکی جوزئیش بێت – دابگرێت و کەمی بکاتەوە.

جا مادەم ئەو هۆکارانەی کە کۆمەڵگای شارستانێتی لە بواری دڵدانەوەی مرۆڤ و هاودەمی و ئونسی لەگەڵ خەڵکیدا ئامادەیان دەکات، لەوانەیە دڵدانەوەیەکی کاتی و مەستکەر و بێ ئاگایانە بە یەك دوانێك لە ناوەندی دە کەسدا ببەخشێت و.. مادەم هەشتا لە سەدی خەڵکیش یان لە نێوان چیا و دۆڵەکاندا دەژین، یاخود خەم و پەژارەی ژیان و گوزەران بەرەو چەندین جێی دووری سامناکی بردوون، یان دووچاری "گیرو گرفت" یاخود "پیری" بوون کە مەترسیی نزیکبوونەوەی ئاخیرەتیان بە گوێدا دەدات.. ئەوا هەموو ئەو چەشنە کەسانەی باس کران لەو دڵنەواییە بێ بەش دەبن و، دڵدانەوە و دڵنەوایی خۆیان لە هۆکارە شارستانی‌یەکانی کۆمەڵدا نابیننەوە..

لەبەر ئەوە، دڵدانەوەی تەواوەتی بۆ ئەو جۆرە کەسانە و دڵنەوایی و هاودەمیی بێ گەرد سەبارەت بەوان تەنها لەوەدایە کە: دڵیان بە هۆکارەکانی "زیکری خوا" و "بیرکردنەوە" بخەنە گەڕ. ئەوەتا لە شوێنە دوورەکان و لە نێوان شیو و دۆڵی چیاکاندا دڵی ئەو چەشنە مرۆڤە ڕوو دەکاتە ئەم ئامانجە و زیکری "اللّٰه.. اللّٰه" دووپات دەکاتەوە و هاودەمی و دڵنەوایی لەم زیکرە وەردەگرێت و، بیر لەو شتانەی دەوروبەری دەکاتەوە کە لێیان دەترسێت و سامناکی و وەحشەتیان لێوە هەست پێ دەکرێت، کەچی ئەم زیکرەی خوای گەورە هاودەمی و خۆشەویستیی بەسەردا پەخش دەکات و، زیکرخوێنەکەش لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

(ئەو بەدیهێنەرەم کە من ناوی دەهێنم و یادی دەکەمەوە گەلێ بەندە و پەرستیاری لەژمارەبەدەری هەیە کە بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بوونەتەوە. کەواتە من تەنیا نیم و هیچ هۆکارێکیش بۆ وەحشەت و بێزاری لە کایەدا نی‌یە).

بەم جۆرە، لەم ژیانە ئیمانی‌یەدا تامی واتای ئونس و هاودەمی دەچێژێت و، هەست بە بەختەوەریی ژیان دەکات و، لەم ڕێیەوە شوکرانە کردنی ئەو پەروەردگارەی زیاد دەبێت و پەرە دەسێنێت.

✿ **تەلویحی سێهەم:**

"ویلایەت" بەڵگەی ڕیسالەتە و "تەریقەت"یش بەڵگەی شەریعەتە. چونکە ئەو ڕاستی‌یە ئیمانی‌یانەی کە "ڕیسالەت" ڕایگەیاندوون، "ویلایەت" لە پلەی "عەین

اليقين"دا و بە بینینێکی قەلبی و چەشتنێکی ڕۆحانی دەیانبینێت و تەسدیقیان دەکات. ئەم تەسدیقەشی بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر ئەحەققیيەتی ڕیسالەت..

هەروەها ئەو ڕاستییانەی ئەحکامە شەرعییەکان کە "شەریعەت" لەگەڵ خۆیدا هێناونی، "تەریقەت" بەو بەهرە و سوودانەی کە لە ڕێی کەشف و چێژەکانەوە وەری گرتووە لێیان، دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەحەققیيەتی ئەو ئەحکامانە و لەسەر ئەوەش کە لە لایەنی خوای گەورەوە سەرچاوەیان گرتووە.

بەڵێ، هەروەك ویلایەت و تەریقەت دوو بەڵگەن لەسەر ئەحەققیيەتی ڕیسالەت و شەریعەت، بە هەمان جۆر بریتین لە: نهێنیی کەماڵی ئیسلام و تەوەرەی ڕووناکییەکانی، هەروەك كانگای بەرزبوونەوەی گرۆی مرۆڤ و سەرچاوەی ڕێژنەکانی مرۆڤایەتین کە لە نوورەکانی ئیسلام و درەوشانەوەی ڕووناکییەکانیەوە سەرچاوەیان گرتووە.

بەلام سەرەڕای ئەو گرنگییە لەڕادەبەدەرەی کە لە "ویلایەت" و "تەریقەت"دا هەن، بەشێکی دەستە و تاقمە گومڕاکان ئینکاریی ئەو گرنگییەیان کردووە و، لەم ڕێیەشەوە خەڵکییان لە چەند نوور و ڕووناکییەك مەحرووم کردووە کە خۆیان لێی بێ بەشن!

ئەوەی زۆر جێی داخە لەوەدایە کە هەندێ کەس لەو زانایانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە بڕیار لەسەر ڕواڵەتی شتان دەردەکەن و، هەندێکیش لە سیاسەتمەدارانی بێ ئاگا کە دەدرێنە پاڵ ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بۆ داخستنی ئەو گەنجینە مەزنەی "ویلایەت" و "تەریقەت" تێدەکۆشن و، دەچن ئەو ڕەفتارە هەڵە و هەڵسوکەوتە نابەجێیانە دەکەن بە بیانوو کە لە ئەهلی تەریقەتەوە دەیانبینن. تەنانەت هەموو توانایەکیان بۆ ڕووخاندن و وشك کردنی ئەو سەرچاوە کەوسەرییە بەخوڕەم و ژیانبەخشە دەخەنە کار. لە کاتێکدا کە دەزانین لە نێوان شتان و ڕێباز و ڕێڕەوەکاندا بە دەگمەن ڕێ دەکەوێت شتێك یان ڕێباز و ڕێڕەوێك هەبێت قسوور و ناتەواویی تێدا نەبێت و، سەرجەمی لایەنەکانی باش و جوان بن. کەواتە هەر لە ئەنجامدا هەڵە و ناتەواوی و هەڵسوکەوتی خراپی تێدا ڕوو دەدات، چونکە هەرکات کەسانی نائەهلی هەر شتێك بڕۆنە ناو ئەو شتەوە، ئەوا خراپە و هەڵوێستی هەڵەی دەرهەق دەکەن.

بەلام خوای گەورە لە دوارۆژدا "دادگەریی پەروەردگاریتی"ی خۆی بە کێشانە کردن و هەڵسەنگاندنی کردەوەکان و قورسیی تای کردەوە چاکەکان یان خراپەکان، دەردەخات. کەواتە هەر کەسێك تای کردەوە چاکەکانی قورس بوو، ئەوا پاداشتی

باشی دەدرێتەوە و کردەوەکانیشی لێ قبووڵ دەکرێن و.. گەر تای کردەوە خراپەکانی قورس و هی کردەوە چاکەکانیشی سووك دەرچوون، ئەوا سزا دەدرێت و کردەوەکانی لێ وەرناگیرێن. دەبێ ئەوەش بزانین کە لەم کێش و سەنگەدا بایەخ بە "چەندایەتی" نادرێت، بەڵکو سەیری "جۆر"ی کردەوەکان دەکرێت و، لەوانەیە تەنها (یەك) کردەوەی باش لە بەرامبەر (هەزار) کردەوەی خراپەوە قورس دەربچێت. تەنانەت ئەو هەزار کردەوە خراپە بسڕێتەوە و ببێت بەهۆی ڕزگارکردنی خاوەنەکەی!

جا مادەم "دادگەریی خوای گەورە" بەپێی ئەم کێشانە و تەرازووە حوکم دەکات و، حەقیقەتیش ئەم کارە بە کارێکی سەرتاپا حەق و ڕەوا دەبینێت، ئەوا بێ هیچ گومانێك "چاکەکاری"یەکانی ئەو تەریقەتەی کە لە ناوەندی بازنەی سوننەتی خاوێندایە، گەلێ لە "خراپەکانی" قورس و زیاترە.

باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوە:

پارێزگاری کردنی تەریقەتدارانە بۆ "ئیمانەکەیان" لە دەمی هێرشی گومڕایاندا! تەنانەت کەسێکی ئاسایی دڵسۆز و پەیوەندیداری خاوەن تەریقەت، لەو چەشنە کاتانەدا، پتر لە کەسێکی لاف لێدەری زانست پارێزگاریی خۆی دەکات. چونکە بەهۆی ئەو چێژە ڕۆحی‌یەی کە لە تەریقەتدا بەدەستی هێناوە و بەبۆنەی خۆشەویستیی بۆ ئەولیا و پیاوچاکانەوە، ئیمانەکەی خۆی ڕزگار دەکات. تەنانەت ئەو کەسە گەر گوناهی کەبیرەش بکات هەر پێی کافر نابێت، بەڵکو بە فاسق دادەنرێت. چونکە بە ئاسانی ناڕواتە ناو ڕیزەکانی زەندەقە و ئەهلی ئیلحادەوە. هەروەك هیچ هێزێك ناتوانێت ئەو وەلاء و پشتگیری‌یەی زامدار بکات کە بەرامبەر زنجیرەی ئەقتابی ئەو مەشایەخانەوە هەیەتی کە بە خۆشەویستی‌یەکی بەهێز و بیروباوەڕێکی توندوتۆڵەوە پەیوەندیی لەگەڵیاندا بەستووە..

جا لەبەر ئەوەی "گومڕایی" ناتوانێت باوەڕ و دڵنیایی ئەم مرۆڤە بە پیاوچاکان تێك بدات یان هەڵی بوەشێنێتەوە، ئەوا هەرگیز ئەو باوەڕ و ڕەزامەندی‌یەی کە بەو پیاوچاکانە هەیەتی هەڵناوەشێتەوە، مەگەر لە کاتێکدا کە ئەو باوەڕ و دڵنیایی‌یەی پێیان نەمێنێت، دەنا هەرگیز ناڕواتە ناو کوفر و ئیلحادەوە.

دیارە ئەو کەسەی کە هیچ بەشێکی لە تەریقەتدا نی‌یە و دڵیشی دەستی بە جموجووڵ نەکردووە، ئەوا گەلێ سەخت و دژوارە کە - لەم ڕۆژگار و سەردەمەدا - بتوانێت لە

بەردەم فڕوفێڵی زەندیقەکانی ئێستادا بە تەواوی پارێزگاری لە ئیمانەکەی خۆی بکـات، با زانایەکی وردەکاریش بێت!

شتێکی تر ماوە، کە بریتی‌یە لەوەی:

هـەرگیز نـاکرێت و ناگونجێ "تەریقـەت" بـە خراپکـاریی ئـەو مەشـرەب و ڕێڕەوانـە تاوانبـار بکرێـت کـە بـە سـتەم و نـاڕەوا نـاوی تەریقـەتیان لـە خۆیـان نـاوە و، لەوانەشـە شێوەیەکیان لە دەرەوەی بازنەی تەقوا، تەنانەت دەرەوەی بازنەی ئیسلامیش، بـۆ خۆیـان دانابێت.

خۆ ئەگـەر ئـاوڕ لـەو ئەنجـامە بـەرزە ئـایینی و قیامـەتی و ڕۆحی‌یانـە نەدەینـەوە کـە "تەریقەت" دەستی مرۆڤیان دەخات و، تەنها سەیری یەك دانە ئەنجامی تەریقەت بکەین لـە ناوەندی جیهانی ئیسلامی‌دا، دەبینین "تەریقەت" لە پێشەنگی ئەو هۆکارە ئیمانی‌یانەوەیە کە فراوانی بە بازنەی برایەتیی ئیسلامیی نێـوان موسـڵمانان دەدەن و، ئـاڵای پەیوەندی‌یـە خاوێنەکەی ئەم برایەتی‌یەش لـە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامی‌دا هەڵدەکات.

تەریقەتە سۆفی‌یەکان، هەر لە مێژە و تـا ئێسـتاش، یـەکێکن لـەو سـێ قـەڵا قایمـەی کـە لەسەر دیوارە سەختەکانی‌دا هەموو ئـەو هێرشـانەی نەصرانی‌یـەکان تێکشـکێنران کـە بـە سیاسەت دەیانکردە سەر موسڵمانان و، هەموو ئەو فڕوفێڵانەشی تەفروتوونا کـرد کـە بـۆ کوژانەوەی نووری ئیسلام ساز کرابوون.

دەبێ هەرگیز فەزڵ و چاکـە و جێ‌دەسـتی خـاوەن تەریقەتـەکانمان لـە یـاد نـەچێت لـە پارێزگاری کردنی ئەستەمبوولی مەڵبەندی خەلافەتی ئیسلامی‌دا بە درێژایـی پێنـج سـەد و پەنجا ساڵی ڕەبەق، هەرچەندەش جیهانی کوفر و خاچپەرسـتیی ئـەورووپا هێرشـی یـەك لـە دوای یەکیان دەکردە سەر.

جا ئەو هێزە ئیمانی و، خۆشەویستی‌یە ڕۆحانی و، شـەوق و تاسـەمەندی‌یانەی کـە لـە ناسینی خواوەنـدەوە سـەرچاوەیان گرتـووە و، لـە دڵـی ئـەو کەسـانەوە هـەڵدەقوڵێن کـە هەردەم "الله.. الله" لەو تەکیە و خانەقایانەدا دووپات دەکەنـەوە کـە تەواوکـەری ئـەرك و پەیامی مزگەوتەکانن و جۆگەلـەی ئیمانیـان لێـوە خـوڕ دەبێتـەوە، ئـەوە بـوو لـە پێنج‌سـەد شوێنەوە "ڕووناکی‌یەکانی تەوحید" پەخش دەبوون و تیشکیان دەدا..

هـەموو ئەمانـە پێکـەوە، گـەورەترین پاڵپشـت و ورەی تونـدوتۆڵـی ئیمـاندارانی ئـەو مەڵبەندە ئیسلامی‌یە، لە کۆنەوە تا ئێستا، پێکدەهێنن.

دەسا ئەی نەفامانی لاف لێدەری غیرەت و ساختەكارانی نەتەوەپەروەری!

ئایا پێمان نالێن چ خراپەیەك لە خراپەكانی تەریقەت ئەم چاكەكاری‌یە مەزنەی بەرامبەر بە ژیانی كۆمەڵایەتیتان، دەسڕێتەوە؟!

**✿ تەلویحی چوارەم:**

گرتنەبەری ڕێی "ویلایەت" هەرچەندە ئاسانە، كەچی گەلێ سەختە و.. هاودەم لەگەڵ كورتیی ئەو ڕێگایەدا، یەكجار دوور و درێژە و.. چەندەش بەرز و بەنرخە، هێندەش مەترسی دەورەی داوە و.. لەگەڵ ئەوەشدا كە فراوانە، كەچی تابیشڵێیت ڕێگایەكی تەنگژە و تەنگەڵانە!

لەبەر ئەم نهێنی‌یە وردانەیە كە هەندێ جار ڕێبوارانی ئەم ڕێگایە نوقم دەبن و.. هەندێ جاریش پێیان هەڵدەكەوێت و ئازاریان پێ دەگات و.. تەنانەت هەندێ جاری تریش لە ڕێ دەترازێن و خەڵكیش لە ڕێ دەردەكەن!

بۆ نموونە: دوو مەشرەب و ڕێڕەو لە تەریقەتدا هەن كە پێیان دەوترێت: "سەیری ئافاقی" و "سەیری ئەنفوسی".

"سەیری ئەنفوسی" ڕۆشتن و گەشتێكە لە دەروونەوە دەست پێ دەكات و خاوەنی ئەم گەشتە ڕوانینی خۆی ئاراستەی دەرەوە ناكات، بەڵكو بە وردی دەڕوانێتە "دڵ" و، ئنجا "خۆپەرستی"ی خۆی دەبڕێت و كوناودەری دەكات و لێیەوە دەڕواتە دەرەوە و، پاشان لە ناوەندی دڵەوە ڕێگایەك بەرە و "حەقیقەت" دەكاتەوە. ئنجا لەوێوە بۆ ئاسۆ گەردوونی‌یەكان دەڕوات و، دەبینێت كە ئەوانیش بە هەمان ڕووناكیی دڵی خۆی ڕووناك بوونەتەوە و، ئیتر بە خێرایی دەگاتە ئامانج. چونكە ئەو حەقیقەتەی كە لە بازنەی "خۆی"دا بینیی، بە پێوەرێكی گەورەتر لە "ئافاق"یشدا دەیبینێتەوە.

زۆربەی ڕێگاكانی موجاهەدەی خەفی(پەنهان) بەپێی ئەم ڕێبازە دەڕۆن و هەنگاو دەنێن.

گرنگترینی بناغەكانی ئەم سلووك و ڕێبڕینە، بریتی‌یە لە: تێكشكاندنی شان و شەوكەتی "خۆپەرستی" و، وازهێنان لە هەوا و ئارەزووی دەروون و، مراندنی "نەفس".

بەڵام ڕێبازی دووهەم لە ئافاق(ئاسۆكان)ەوە دەست پێ دەكات و، ڕێبواری ئەم ڕێبازە: درەوشانەوەكانی ناوەجوانەكانی خوای گەورە و سیفەتە مەزنەكانی لە ئاوێنەكانی ئەو بازنە ئاسۆیی‌یە گەردوونی‌یە فراوانەدا دەبینێت و، ئنجا كە دەڕواتە ناو بازنەی "دەروونی خۆی"ەوە ڕووناكی‌یەكانی ئەو درەوشانەوانە بە پێوەرێكی بچووكتر

لە ئاسۆكانی گەردوونی دڵی‌دا دەبینێتەوە. ئیتر لەم دڵەوە كورتترین و نزیكترین ڕێ بۆ لای خوای گەورە دەكاتەوە و، دەبینێت كە "دڵ" بە ڕاستی ئاوێنەی خواوەندی صەمەدە و، لەم ڕێیەوە دەگات بە ئامانج و مەرام و ئەوپەڕی ئاواتەكانی.

جا ئەگەر ڕێبواری سەر بە مەشرەبی یەكەم لە كوشتنی دەروونی بەدخواز(نەفسی ئەممارە)ی‌دا دەستەوسان ما و نەیتوانی بە وازهێنان لە هەوا و ئارەزووەكانی ناو دەروونی "خۆپەرستی"ی خۆی تێكبشكێنێت، ئەوا لە مەقامی شوكرەوە بەر دەبێتەوە بۆ فەخر و شانازی و، لەویشەوە دەكەوێتە خوارەوە بۆ ناو لەخۆبایی بوون و غروور. خۆ ئەگەر ئەمەی كە باسمان كرد شتێكی وەك "مەستیی جەزبەی خۆشەویستی"ی ئاوێتە بێت، ئەوا چەند لاف و دەعوایەكی لە زار دەردەچێت كە لە سنوور و توانای خۆی گەلێ گەورەتر بن، لەوانەی كە پێیان دەوترێت: "شەتەحات". ئیتر هەروەك زیان بە خۆی دەگەیەنێت، دەشبێت بەهۆی زیان گەیاندن بە كەسانی تر!

ئەو كەسەی "شەتەحات"ی لە دەم دەردەچێت وەك ئەفسەرێكی بچووك وایە لە پلەی "ملازم"دا كە چێژ و مەستیی سەركردایەتیی ناو بازنە بچووكەكەی خۆی هەست و شعووری لەلا هەڵگرتووە و، لە دەمی ساتێكی ئەم مەستی‌یەدا - بە ئەندێشە - خۆی وەك ئەو موشیرە دەبینێتەوە كە سەركردایەتیی لەشكرە گەورەكان دەكات! ئیتر لەم ئەندێشەیەوە شتان لە زەینی‌دا دەئاڵۆزێن و سەركردایەتیی ناو بازنە بچووكەكەی خۆی لەگەڵ سەركردایەتیی گشتی و فراوانی بازنە گەورەكەدا لێ دەئاڵۆزێت، كتومت وەك ئەو كەسانەی كە وێنەی خۆریان لە ئاوێنەیەكی بچووكدا لەگەڵ هەمان وێنەی خۆر لەسەر ڕووی فراوانی دەریادا لێ تێكچووە، لەو ڕووەوە كە هەردووكیان دانەوەی وێنەی "خۆر"ن، هەرچەندەش لە گەورەیی و فراوانی‌دا جیاوازی‌یان هەیە!

بەم جۆرە، زۆر كەس هەن لە ئەهلی ویلایەت كە هەریەكەیان خۆی زۆر بە گەورە و مەزنتر دەبینێت لەو پیاوچاكانەی كە لە ڕاستی‌دا لەو بەرز و پایەدارترن، لەوانەی كە پلەی ئەم سەبارەت بەوان وەكو نیسبەتی مێش وایە لە ئاستی تاووسدا..

بەڵام ئەم خاوەن دەعوا و لافە، خۆی بەو شێوەیە دەبینێت كە وەسف و باسی دەكات و، لەم بینینەشی‌دا پێی وایە كە لەسەر حەقە و ڕاستیی پێكاوە!

تەنانەت هەر خۆم یەكێكم بینی كە نیشانەكانی قوتبی ئەعزەمی هەڵدەگرت و ئیددیعای حاڵەتەكانی ئەوی دەكرد و جموجووڵ و ڕەفتارەكانی ئەوی بە بەری خۆی

دەپۆشی! کەچی لە ناوەندی سیفەتەکانی قوتبییەتدا جگە لە "بێداربوونەوەی دڵ" و "هەست‌کردن بە نهێنیی ویلایەت لە دوورەوە" هیچی تری تێدا نەبوو!

پێم وت:

برام! هەروەك "یاسای پادشایەتی" چەندین ئاوێنە و دەرخەری "جوزئی" یان "کوللی"ی هەیە کە بە یەك شێوە لە هەموو فەرمانگەکانی دەوڵەتدا دەردەکەون، هەر لە سەرۆکایەتیی وەزارەتەوە تا دەگاتە بەڕێوەبردنی ناحیەیەکی بچووك.. ویلایەت و قوتبییەتیش بە هەمان جۆرن، گەلێ بازنەی جیاجیا و دەرخەر و ئاوێنەی جۆراوجۆریان هەیە و، هەریەك لە مەقامەکانیشیان خاوەنی گەلێ سێبەری زۆرە.

جا تۆ درەوشانەوەی هەرە گەورە و مەزهەری هەرە مەزنی "قوتبییەت"ت -کە وەك سەرۆکایەتیی وەزارەت وایە- لە ناوەندی بازنە بچووکەکەی خۆتدا دیوە کە وەك بەڕێوەبردنی ناحیەیەك وایە. کەواتە ئەم کێشەیەت لێ ئاڵۆزاوە و تیایدا خەڵەتاویت. چونکە ئەو شتەی کە تۆ دیوتە ڕاست و دروستە، بەڵام حوکم و بڕیارەکەت هەڵەیە، ئەوەتا لەوێچێك ئاو سەبارەت بە مێشێك دەریایەکی مەزن و فراوانە!

ئەو برایە، بەم قسەیەم بێدار بووەوە و -بە ویستی خوا- لەو گێژاوە ڕزگاری بوو.

هەروەها چەند کەسێکم دی لەوانەی کە خۆیان وا دادەنێن لە "مەهدی"یەوە نزیك بن یان لەو بچن و، هەریەکەیان دەیوت: من دەبم بە "مەهدی"!

ئەو جۆرە کەسانە نە درۆ دەکەن و نە خەڵکییش دەخەڵەتێنن، بەڵکو خۆیان خەڵەتاون و بە هەڵەدا چوون! چونکە پێیان وایە ئەو شتانەی کە دەیانبینن: حەق و ڕاستن و هەر بەو جۆرەن.

بەڵام هەروەك ناوە جوانەکانی خوای گەورە هەر لە عەرشی ئەعزەمەوە تا دەگاتە گەردیلەکان درەوشانەوەی جۆراوجۆریان هەیە، ئاوێنە و دەرخەری ئەم درەوشانەوانەش لە گەردوون و دەروونەکاندا -بە هەمان ڕێژە- جیاواز و جۆراوجۆرن و.. پلەکانی ویلایەتیش، کە بریتین لە بەدەستهێنانی مەزهەر و ئاوێنەکانی ئەو درەوشانەوانە و شەرەفمەندی و بەهرەمەندبوون پێیان، بە هەمان جۆر، جیاجیا و جۆراوجۆرن.

گرنگترین هۆکار بۆ ئەم لێ ئاڵۆزانە لەوەدایە کە هەندێ لە مەقامەکانی ئەولیا شتێکیان لە تایبەتکاری و ئەرکەکانی "مەهدی" تێدایە و، نیسبەتێکی تایبەتی‌یان بە قوتبی ئەعزەمەوە و پەیوەندی‌یەکی تایبەتییشیان بە حەزرەتی "خضر"ەوە تێدا دەبینرێت. چونکە

هەندێ مەقام هەن کە چەندین پەیوەندی‌یان بە هەندێ لە ناودارانەوە هەیە، بە ڕادەیەك کە بەو مەقامانە دەوترێت: "مەقامی خضر" و "مەقامی وەیس" و "مەقامی مەهدییەت".

جا ئەو کەسانەی کە دەگەنە ئەو مەقامە، یان دەگەنە بەشێکی، یان سێبەرێك لە سێبەرەکانی، ئەوا لەو گومانەدا دەبن کە هەر خۆیان ئەو کەسایەتی‌یە بەرز و بەناوبانگانە بن! ئیتر هی وایان هەیە خۆی بە "خضر" یان "مەهدی" دادەنێت، یاخود لە ئەندێشەی‌دا پێی وایە کە خۆی "قوتبی ئەعزەم" بێت!

جا ئەگەر ئەو کەسە "خۆپەرستی"ی بە تەواوەتی تێدا نەمابوو بە ڕادەیەك کە حەز و چاوگێڕانی بۆ جاهـ و پلەوپایە و شانازی‌کردن بەسەر کەسانی تردا تێدا نەبوو، ئەوا گلەیی لێ ناکرێت و، ئەو لاف و دەعوایانەش کە لە زاری دەردەچن و لە توانا و سنووری خۆی بەدەرن بە "شەتەحات"ێك دادەنرێن کە بەرپرس نی‌یە لێیان و، دەگونجێ چاوپۆشی‌یان لێ بکرێت.

بەڵام گەر ئەم لاف و دەعوایانە لە لایەن کەسێکەوە بن کە "خۆپەرستی"یەکەی هێشتا لەسەر پێ بێت و حەز و چاوگێڕانی بۆ جاهـ و پلەوپایە هەر تێدا مابێت، ئەوا ئەم "خۆپەرستی"یەی بە سەردا زاڵ دەبێت و، دەستی ئەو مرۆڤە دەگرێت و، مەقامی شوکری لە پشتەوە پێ بەجێ دەهێڵێت و بەرەو خوارەوە بۆ مەنزڵگاکانی فەخر و شانازی دەیبات. ئیتر لەوێشەوە وردە وردە بەر دەبێتەوە بۆ ناو شیو و دۆڵی ئەو لەخۆبایی بوون و غرووورەی کە کردەوە چاکەکانی مرۆڤ دەسڕێتەوە.

ئنجا یان ئەوەیە گرفتاری شێتی دەبێت، یاخود بە یەکجارەکی دوور دەکەوێتەوە و لە ڕێ دەترازێت. چونکە خۆی لە ڕیزی ئەو پیاوچاك و ئەولیا مەزنانە داناوە، کە ئەم کارەش – لە خۆی‌دا – بریتی‌یە لە "گومان خراپی" بەو مرۆڤە پیاوچاکانە، چونکە ئەو قسوورانەی کە لە نەفسی خۆی‌دان و "نەفس" هەر چەندەش لە خۆی بایی بووبێت هەستیان پێ دەکات، ئەم قسوورانە دەکاتە بەر ئەو پیاوچاك و ئەولیا بەرزانەش کە بە چاویلکەی دەروونە خاوەن قسوورەکانی خۆی سەیریان دەکات! ئیتر گرفتاری ئەو وەهمە دەبێت کە ئەو زاتە مەزنانەش – وەك خۆی – تەقسیربار بن و، لەمەشەوە ڕێزی بۆیان کەم دەکاتەوە و، دوای ئەمەش ڕێزی تەنانەت پێغەمبەرانیشی – درووديان لەسەر بێت – لە لا کەم دەبێتەوە.

ئەو جۆرە كەسانەی كە ئەو مەقامانەیان بەو چەشنە لێ ئالۆزاوە، پێویستە "میزانی شەریعەت" بە دەستەوە بگرن، تاكو كردەوەكانی خۆیانی پێ هەڵبسەنگێنن و لە سنووری ئەو دەستوورانەدا ڕابووەستن كە زانایانی "ئوسوولی دین" دەستنیشانیان كردوون و، بە ڕابەرایەتیی ئەو ڕێنماییانە هەنگاو بنێن كە "ئیمامی غەزالی" و "ئیمامی ڕەببانی" و ئەولیا لێكۆڵەرە زاناكانی هاوچەشنیان دایانناون و، هەمیشە "نەفس"ی خۆیان بە تۆمەتبار دابنێن و بزانن كە "قسوور" و "كۆڵەواری" و "هەژاری" هەمیشە هاودەم و هاوڕێی دەروونەكانن، با زۆر بەرزیش بووبێتەوە.

سەرچاوەی شەتەحاتی ئەم مەشرەبە سەبارەت بە هەندێ كەسی سالیكەوە بریتییە لە "خۆشویستنی نەفس". ئەم خۆشەویستییە بە ڕادەیەك گەشە دەكات و گەورە دەبێت كە هەندێ لەو كەسانە پێی وایە: خاوێنیی دەروونی و بریسكانەوەی زاتی خۆی پارچەیەكی ئەڵماسە! كەچی لە ڕاستیدا بریتییە لە پارچە شووشەیەكی بێ‌نرخ و بەها.

ئەم بۆچوونەشی هی ئەوەیە كە بە چاوی لەخۆڕازیبوونەوە بۆ خۆی ڕوانیوە، خۆ دیارە چاوی ڕازی بوونیش لە ئاستی بینینی نەنگی و ناتەواوییەكاندا كول و نابینایە.

ترسناكترینی ئەو هەڵوێستە پڕ لە مەترسییانەی كە لەم جۆرە سلووكەدایە، بریتییە لەوەی كە:

ئەو واتا جوزئییانەی بە شێوەی "ئیلهام" دێنە ناو دڵی سالیكەوە، لە ئەندێشەی خۆیدا بە گوفتاری خوایان دادەنێت و، هەریەك لەو ئیلهامە هاتووانە بە "ئایەت" ناو دەبات! ئیتر بەم وەهم و ئەندێشەیەی خۆی جۆرە ڕێزنەنانێك لە ئەندێشەیدا سەبارەت بە پلەی بەرز و بڵندی "وەحی" پەیدا دەبێت.

بەڵێ هەموو ئیلهامێك، هەر لە ئیلهامی هەنگ و زیندەوەرانەوە تا ئیلهامی عەوامی خەڵكی و.. ئیلهامی مرۆڤە تایبەتمەندەكان و.. عەوامی مەلائیكەت و.. ئیلهامی تایبەتمەند و نزیكەكانی ئەوان لە خوای گەورەوە.. هەریەكەیان، جۆرێكن لە وشە پەروەردگارییەكان. بەڵام دەبێ بزانرێت كە گوفتاری پەروەردگار بریتییە لە درەوشانەوەی فەرمایشت و گوفتاری جۆراوجۆری ئەو كە لە ناوەندی حەفتا هەزار پەردەوە و بەپێی توانا و لێهاتنی ئاوێنە و مەقامەكان، دەبریسكێتەوە.

هەرچی "وەحی"یشە ئەوا ناوی تایبەتیی گوفتاری خوای گەورەیە. ڕووناكترین نموونەی بەرجەستەشی ئەو ناوەیە كە لە ئەستێرەكانی قورئان نراوە و، هەریەك لەو ئەستێرانەش پێی دەوترێت "ئایەت". هەروەك بە شێوەیەكی تەوقیفی پێمان گەیشتووە.

جا ناونانی ئەم جۆرە ئیلهامانە بە "ئایەت" هەڵەیەکی سەرتاسەری و بێ گومانە. چونکە ڕێژەی جیاوازیی وێنەی بچووکی کزی خۆر لە پشت پەردەی ئاوێنە ڕەنگاوڕەنگەکانی ناو دەستمانەوە لەگەڵ خۆری ڕاستەقینەی ناوجەرگەی ئاسماندا چەندەیە، ڕێژەی جیاوازیی نێوان ئیلهامی ناو دڵی ئەو لاف لێدەرانە و ئایەتەکانی خۆری قورئانی پیرۆز کە گوفتاری ڕاستەوخۆی خواوەندە، بەهەمان ئەندازەیە. (وەك لە وتەکانی دوازدەهەم و بیست و پێنجەم و سی و یەکەمی کتێبی "وتەکان"دا ڕوونمان کردووەتەوە و چەسپاندوومانە).

بەڵێ، گەر بوترێت: ئەو وێنەیەی خۆر کە بە ئاشکرا لە ئاوێنەدا دیارە هەر خودی وێنەکەیەتی بە ڕاستی و پەیوەندییشی لەگەڵ خۆری ڕاستەقینەدا هەیە، ئەوا ئەم گوفتارە ڕاستە و هیچ ناتەواوی‌یەکی تێدا نی‌یە. بەڵام هەرگیز ناگونجێ کە گۆی گەورەی زەوی بەم خۆرە بچووکانەی ناو ئاوێنەکانەوە پەیوەست بکرێت و بە جازبییەتی ئەوانەوە ببەسترێتەوە!

✿ **تەلویحی پێنجەم:**

مەشرەبی "وەحدەتی وجوود" کە "وەحدەتی شهوود"یشی لەخۆدا هەڵگرتووە، بە یەکێك لە مەشرەبە سۆفیێتی‌یە گرنگەکان دادەنرێت.

وەحدەتی وجوودیش بریتی‌یە لە تەرخانکردنی ڕوانین تەنها بۆ "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود". واتە: ئەم مەشرەبە پێی وایە کە مەوجوودی حەق و ڕاستەقینە تەنها هەر خوای گەورەی "واجب الوجود"ە و، هەموو مەوجوودەکانی تر بریتین لە چەند سێبەرێکی کز و قەڵب و وەهمی کە لە بەرامبەر "بوون"ی "واجب الوجود"ەوە شایانی ئەوە نین کە سیفەتی "بوون"یان بدرێتە پاڵ!

لەبەر ئەم تێڕوانینە، ئەهلی ئەم مەشرەبە پێیان وایە کە بوونەوەران وەهم و ئەندێشەن و، لە پلەی "تەرکی ماسیوا"دا (واتە: وازهێنان لە غەیری خوادا) ئەو بوونەوەرانە بە عەدەم دادەنێن. تەنانەت هێندە لەمەدا ڕۆدەچن کە دەگەنە ئەوەی بوونەوەران بە چەند ئاوێنەیەکی ئەندێشەیی دابنێن بۆ درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکان!

گرنگترین حەقیقەت کە لەم مەشرەبەدایە، بریتی‌یە لەوەی کە:

بوونەوەر و بەدیهاتووە مومکینەکان لە بەرچاوی گەورە ئەولیاکانی ئەم مەشرەبەدا، کە بەهۆی هێزی ئیمانەکەیانەوە گەیشتوونەتە پلەی "حق الیقین"، بچووك دەبێتەوە و

هێندە لە بەرچاویاندا دادەبەزێتـە خـوار تـا دەگاتە پلـەی وەهـم و عـەدەم. واتـە لـە ئاستی بوونی خوای گەورەی "واجب الوجود"دا ئینکاریی بوونی گەردوون دەکەن.

بەڵام گەلـێ مەترسی و هەڵدێری زۆر لەم مەشرەبەدا هەیـە. یەکـەمیان و گرنگترینیـان بریتی‌یە لەوەی کە:

"پایەکانی ئیمان" شەش دانەن. واتە جگە لـە پایـەی "باوەڕ بـە خـوای گـەورە" چـەند پایەیەکی تری وەك "باوەڕ بە دوارۆژ" هەیە و، ئەم پایانەش داخوازی "بوون"ی بوونەوەرە مومکینەکانن. واتـە ناگونجێ ئـەم پایـە قـایم و تونـد و تۆڵانـەی ئیمـان لەسـەر بناغەیـەکی "ئەندێشەیی" ڕاوەستابێتن!

کەواتـە دەبێ خـاوەنی ئـەم مەشـرەبە کاتێ لـە جیـهانی ئیسـتیغراق و مەسـتی بێـدار دەبێتـەوە، مەشـرەبەکەی لەگـەڵ خـۆیدا نەهێنێتـەوە بۆ جیهـانی بێـداری و کـاری پـێ نـەکات و، ئەم مەشرەبەی کە بـە دڵ و ویـژدان و چێـژ هەسـتی پـێ دەکرێـت، نـەیکات بـە چەند بناغەیـەکی ژیرەکـی و زانسـتی و، بە گوفتـار دەری نـەبڕێت. چونکـە دەسـتوورە ژیرەکی و یاسا زانستی‌یەکان و ئوسـوولەکانی زانسـتی کـەلام - کـە هـەر هـەموویان لـە قورئـان و سـوننەتی خاوێنـەوە هـەڵقوڵاون - نـاتوانن ئـەم مەشـرەبە هـەڵبگرن و بـواری جێبەجێ کردنی ئەویان تێدا نابێتەوە.

هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە لـەناو بێدارانـی ئـەهلی ئیمـاندا (وەك خەلیفـە ڕاشـیدەکان و پێشەوا موجتەهیدەکان و زانا بەکردەوەکانی بەرەکانی پێشـینی باشـی ئـەم نەتەوەیە) ئـەم مەشرەبە بەرچاو ناکەوێت. کەواتە ئەم مەشرەبە بـەرز و بڵندترینـی پلـەکان نی‌یـە، بـەڵکو لەوانەیـە دارای بەرزایی‌یـەك بێـت کـە ناتـەواویی تێـدا بێـت و، چێژێکـی شـیرینی سـەرنج ڕاکێشیشی تێدا بێت، کە تامێکی تیژی بێت.

جا لەبەر شیرینی‌یە ڕواڵەتی و جوانی‌یە سەرنج بزوێنەکەی، ئەو کەسـانەی کـە دەچنـە نـاوی حـەز ناکـەن بڕۆنـە دەرەوە لێـی و، بـەهۆی چـاو گێڕان و سـەر بەرز کردنـەوەی دەروونەکانیان، لەو گومانەدان کە: ئەم مەشرەبە بەرز و بڵندترینی پلەکان بێت.

لەبەر ئەوەی لە پەیامی "خالێك لە نووری ناسـینی خـوای گـەورە" و لـە "وتـەکان" و "مەکتووبات"دا شتێکمان لە بارەی بناغەکان و ماهییەتی ئـەم مەشـرەبەوە بـاس کـردووە، ئەوا بەو ئەندازەیە واز دەهێنین و، لـێرەدا تەنـها لـەبارەی گێژاوێکـی ترسـناکەوە دەدوێـین کە بەشێك لەو کەسانەی تێ دەکەون لە دەوری "وحدة الوجود"دا دەخولێنەوە.

ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

ئەم مەشرەبە تەنها بۆ كەسانی هەرە تايبەتمەند دەست دەدات لە دەمی حاڵەتەكانی ئیستیغراقی تەواوەتیدا و، بۆ ئەو كەسانەش كە دەستبەرداری هۆكارە ماددییەكان بوون و هەموو پەیوەندییەكیان بە غەیری خوای گەورەوە (لە شتان و مومكینات) پچڕیوە.

بەڵام گەر ئەم مەشرەبە لە بەرزایی چێژ و حاڵ و جەزبەكان و ئەشواقەكانی دڵەوە دابەزێتە خوارەوە و بڕواتە ناو بازنەی ڕێڕەوە فیكری و زانستییەكانەوە و، بە شێوەیەكی زانستی و ژیرەكی پێش‌چاوی ئەو خەڵكە بخرێت كە حەز و ئارەزوویان لە ژیانی دنیایە و لەناو فەلسەفە ماددی و سروشتییەكاندا ڕۆچوون، ئەوا ئەنجامەكەی نوقم بوون دەبێت لە سروشت و ماددەدا و دووركەوتنەوە دەبێت لە حەقیقەتی ئیسلام..

چونكە ئەو مرۆڤە ماددییەی كە دەستی لە داوێنی هۆكارەكان گیر كردووە و شەیدای دنیایە، گەلێ بە تاسەوەیە سیفەتی هەتاهەتایی و نەمری بە بەر ئەم ژیانەی دنیای بپۆشێت، چونكە بەلایەوە قورس و دژوارە كە بە چاوی خۆی ببینێت خۆشەویستەكەی لە بەردەستیدا بپێت بە هەڵم و بتوێتەوە!

بۆیە لە ڕوانگەی بیری "وەحدەتی وجوود"ەوە سیفەتی: مانەوە و وجوودی هەمیشەیی بە دنیاكەی دەبەخشێت. دیارە ئەو كاتەش سڵ لەوە ناكاتەوە كە دنیا خۆشەویستەكەی بۆ پلەی "پەرستراو" بەرز بكاتەوە، دوای ئەوەی كە سیفەتەكانی بەردەوامی و نەمری و مانەوەی هەمیشەیی پێ بەخشی! ئیتر لێرەوە – خوا پەنامان بدات – دەرگای ئینكاریی بوونی خوای گەورەی لێ دەكرێتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ستوونەكانی بیری ماددی لەم چەرخەدا بە توندوتۆڵی جێگیر بوون و ئەم بیرە بەسەر زۆرینەی چالاكییە ژیرەكی و زانستییەكاندا زاڵ بووە، تەنانەت ماددە – لای باوەڕپێبووانی – بووە بە بنچینە و بناغەی هەموو شتێك.. ئەوا برەودان بە ڕێڕەوی "وەحدەتی وجوود" لەم چەرخەدا – كە كەسانی تايبەتمەندی ئەهلی ئیمان شتانی ماددیی تێدا تا ڕادەی عەدەم بە بێ‌نرخ و بەها دەبینن – لەوانەیە بەڵگەیەك بدات بەدەست ماددییەكانەوە كە ئەوانیش بانگەوازكاری هەمان ڕێڕەو بن و، بە ئیماندارانی هەڵگری ئەم مەشرەبە بڵێن:

"ئێمە و ئێوە یەكسانین، چونكە ئێمەش هەمان قسە دەكەین و بە هەمان جۆریش بیر دەكەینەوە"!

لە کاتێکدا کە لە سەرتاسەری جیهاندا هیچ مەشرەبێکی تر نی‌یە وەك "وەحدەتی وجوود" لە ڕێبازی ماددی‌یەکان و سروشت پەرستانەوە دوور بێت. چونکە هەڵگرانی ئەم مەشرەبە ئیمانێکی هێندە قووڵیان بە خوای گەورە هەیە کە سەرانسەری گەردوون و سەرجەمی بوونەوەران لەئاستی حەقیقەتی بوونی خوای گەورەدا بە عەدەم و نەبوو دادەنێن، کەچی ماددی‌یەکان هێندە بایەخ بە بوونەوەران دەدەن کە ئینکاریی بوونی خوای گەورە دەکەن لە ئاستی بوونەوەراندا!

ئایا ئیتر کەی ئەمانە لەوان دەچن؟!

✿ **تەلویحی شەشەم:**

بریتی‌یە لە سێ خاڵ.

● خاڵی یەکەم:

(شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ) جوانترین و بەپیت‌ترین و درەخشانترینی ئەو ڕێگایانەیە کە مرۆڤ دەگەیەننە پلەی "ویلایەت".

مەبەستیش لە "شوێنکەوتن" ئەوەیە کە مرۆڤی موسڵمان لە هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی‌دا بە شوێن سوننەتی خاوێندا بگەڕێت و چاوی لێ بکات و، لە سەرجەمی مامەڵە و کردەوەکانیشی‌دا بەپێی ئەحکامی شەرع هەنگاو بنێت. چونکە ئەو کاتە، بەم شوێنکەوتنەی سوننەت، هەموو کردەوەیەکی ڕۆژانە و مامەڵەیەکی عورفی و هەڵسوکەوتێکی سروشتی و ئاسایی ئەو موسڵمانە شێوەی "عیبادەت" دەگرنە خۆیان.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە شوێنکەوتنی سوننەت و گەڕان بە شوێن شەرعی خوای گەورە لە هەموو کاروبارێکدا ئەو ئیمانداره دەخاتە دۆخی بێداری‌یەکی بەردەوام و یادکردنەوەیەکی هەمیشەیی شەرعەوە..

خۆ ئەم یادکردنەوەیەی شەرعیش مرۆڤ دەگەیەنێتە یادکردنەوەی خاوەنی شەرع و ئەمەش دەرەنجامەکەی یادکردنەوەی خوای گەورە دەبێت. خۆ دیارە یادی خوای گەورەش هۆی ئاسوودەیی و دڵنیایی دڵی مرۆڤە.

واتە لە کاتێکی وادا دەکرێت هەموو سەعات و خولەکەکانی تەمەنی مرۆڤ لە پەرستشێکی بەردەوام و دڵنیایی بەخشدا بەسەر ببرێت.

لەبەر ئەوە، "شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێن" ڕێگای ویلایەتی کوبرا و ڕێبازی ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌یە، کە هی هاوەڵە بەڕێزەکان و پێشینانی پیاوچاکن.

● خاڵی دووهەم:

"ئیخلاس" گرنگترین بناغەیە بۆ سەرجەم ڕێگاکانی ویلایەت و تەریقەت. چونکە ئیخلاس تاقانە ڕێگای ڕزگاربوونە لە شیرکی پەنهان. کەواتە هەرکەسێك "ئیخلاس" لەناو دڵیدا هەڵنەگرێت، ناتوانێت بەناو ئەو ڕێگایانەدا هەنگاو بنێت.

هەروەها "خۆشەویستی"ش بەتواناترین هێزە لەو ڕێگایانەدا. چونکە مرۆڤی هەڵگری "خۆشەویستی" هەرگیز بە دوای ناتەواویی خۆشەویستەکەیدا ناگەڕێت، تەنانەت حەزیش ناکات کەموکوڕی و ناتەواویی تێدا ببینێت. بەڵکو لاوازترین بەڵگە و نیشانەکانی کەماڵی خۆشەویستەکەی - لای ئەو - بەهێزترین بەڵگە و نیشانەیە، چونکە هەمیشە لایەنی خۆشەویستەکەی دەگرێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە، ئەو کەسانەی کە لە ڕێی "خۆشەویستی"یەوە بە دڵ ڕوو دەکەنە ناسینی خوای گەورە، گوێ بۆ ڕەخنە و ئیعتیرازەکان شل ناکەن و بە خێرایی هەموو تەگەرە و کۆسپ و گومانەکان دەبڕن و بە ئاسانی خۆیان دەپارێزن و لە وەهم و گومانەکان دەربازی دەکەن، بە ڕادەیەك کە ئەگەر هەزاران شەیتانی سەر ڕووی زەوی لە دژیان کۆ ببنەوە ئەوا هەرگیز ناتوانن تەنانەت یەك دانە نیشانەش پووچەڵ بکەنەوە کە بەڵگە بێت لەسەر بەرزی و کەماڵی خۆشەویستە ڕاستەقینەکەیان.

مرۆڤ بەبێ ئەم خۆشەویستییە لە ژێر کۆتی وەسوەسەکانی نەفس و شەیتانەکەیدا گیرۆدەی گەلێ ئیعتیراز و شوبهە و گومان دەبێت، کە مەگەر هێز و توندوتۆڵیی ئیمانەکەی و وریایی و خۆپاراستنی لەڕادەبەدەری، دەنا هیچ شتێك لەو شوبهە و گومانانە ڕزگاری ناکات.

کەواتە ئەو "خۆشەویستی"یەی کە هەڵقوڵاوی ناسینی خوای گەورە بێت، گەوهەر و کاکڵە و ئیکسیری سەرجەمی پلەکانی ویلایەتە.

بەڵام ئەم خۆشەویستییەش گرفتێکی گەورەی تێدایە، ئەویش لەوەدایە کە مەترسی لە خاوەنی ئەو خۆشەویستییە دەکرێت دەست لە نزا و لالانەوە و زەلیلی بەرامبەر خوای گەورە هەڵبگرێت - کە بریتین لە نهێنیی بەندایەتی - و ڕوو بکاتە ناز و داخوازی و لاف لێدان. دیارە ئەو کاتەش ژیری و ڕاستی و دروستیی هەڵوێستەکانی لەدەست دەدات و، فیز و دەمار بەم "خۆشەویستی"یەوە دەکات، بێ ئەوەی خۆی پابەندی چەند دەستوور و تەرازوویەك بکات..

هەروەها مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێت کە لەو کاتانەدا ڕووی خۆشەویستی‌یەکەی دەکاتە غەیری خوای گەورە، خۆشەویستی لە لای ئەو لە "واتای حەرفی"یەوە بگۆڕێت بە "واتای ئیسمی"[1]. دیارە ئەو کاتەش خۆشەویستی‌یەکەی لە دەرمانێکی شیفابەخشەوە دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە..

چونکە هەندێ جار ڕێ دەکەوێت کە مرۆڤی هەڵگری "خۆشەویستی" ڕوو دەکاتە سیفەتەکان و کەماڵی شەخسی و جوانیی زاتیی ئەو خۆشەویستەی کە غەیری خوایە و، ئەو خۆشویستنەشی بە واتای ئیسمی دەبێت. واتە لەبەر خۆی دەبێت و، بێ ئەوەی یادی خوا و پێغەمبەریش ﷺ بکات ئەو خۆشەویستەی هەر خۆش دەوێت! لە کاتێکدا کە دەبێت خۆشویستنی "غەیری خوا" لەبەر خوا و لە پێناوی خوادا بێت و، لەو ڕووەوە دڵی خۆی پەیوەستی ئەو خۆشەویستە بکات کە ئاوێنەی تیادرەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندە.

جا ئەم چەشنە خۆشەویستی‌یەی کە بە "واتای ئیسمی"یە، نابێت بە هۆکارێك بۆ خۆشویستنی خوای گەورە، بەڵکو دەبێت بە پەردە و بەربەستێك لە بەردەم ئەو خۆشەویستی‌یەدا.

بەڵام هەر خۆشەویستی‌یەك کە بە "واتای حەرفی" بێت، واتە لە ڕووی خۆشویستنی خوای گەورەوە بێت، ئەوا دەبێت بە هۆکارێك بۆ زیادبوونی خۆشویستنی خوای گەورە، تەنانەت دەتوانرێ بوترێت کە: ئەو خۆشەویستی‌یە یەکێکە لە درەوشانەوەکانی خوای گەورە.

● خاڵی سێهەم:

دنیا شوێنی کار و کۆشش و خانەی دانستە، نەك خانەی بەخشش و پاداشت! بەم پێیە، پاداشتی ئەو کردەوە چاکانەی کە لێرەدا ئەنجام دەدرێن، لە ژیانی بەرزەخ و خانەی دواڕۆژدایە و ئەو کردەوە چاکانە لەوێ بەروبووم دەبەخشن.

مادەم حەقیقەت ئەمەیە، ئەوا دەبێ لەم دنیایەدا داوای پاداشت و بەروبوومی کردەوەکانی سەر بە دواڕۆژ نەکرێت. خۆ ئەگەر بێ داوا کردن پێی بەخشران، دەبێ بە دڵخۆشی‌یەکی ئاوێتەی خەم و پەژارە و خەفەتەوە لە دەستی بەخششی پەروەردگاری وەربگرێت، نەك بە خۆشی و شادمانی‌یەکی ڕووت و خاوێنەوە. چونکە بەروبوومی کردەوەکان گەر لە بەهەشتدا وەربگیرێن هەرگیز کۆتایی‌یان پێ نایەت و نابڕێنەوە.

---

(١) بۆ زانینی واتای ئەم زاراوانە بڕوانە پەراوێزی ل (٨٠١-٨٠٢)ی کتێبی (وتەکان). (وەرگێڕ)

كەواتە كارێكی دانایانە نی‌یە گەر لەم چەشنە ژیانە فانی‌یەدا ئەو بەروبوومانە وەربگیرێن، چونكە ئەم كارە وەكو ئەوە وایە مرۆڤ پشت لە گڵۆپێكی هەمیشە ڕووناك و بەردەوام هەڵبكات و دڵ بداتە چرایەك كە تەنها یەك خولەك دادەگیرسێت و پاشان دەكوژێتەوە!

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە وردە، واتە چاوەڕوانیی پاداشت لە ژیانی دواڕۆژدا، ئەولیاكان لەزەت لە كارە سەخت و قورسەكانی گیروگرفت و موسیبەتەكان دەچێژن و، سكاڵا و بێزاری‌یان لە دەست دەرنابڕن، بەڵكو زمانیان هەمیشە: "الحمد لله علی كل حال" دووپات دەكاتەوە..

خۆ ئەگەر خوای گەورە كەرامەتێك یان كەشفێك یان نوور و چێژێكیان پێ ببەخشێت، ئەوا بەوپەڕی ئەدەبەوە لێی وەردەگرن و، بە ئاوڕلێدانەوە و بەخشش و ڕێزلێنانێكی خواوەندی دەزانن و، تێدەكۆشن ئەو كەرامەتە داپۆشن و دەری نەخەن و، شانازیی پێوە نەكەن. تەنانەت ئەم كارە هانیان دەدات كە بە خێرایی بۆ زیاد كردنی شوكرانەبژێری و قووڵكردنەوەی بەندایەتی‌یان تێبكۆشن.

زۆریان هەیە كە هانا بۆ خوای گەورە دەبەن تاكو ئەم حاڵەتانەیان بپۆشێت و دەری نەخات و، ئاواتەخوازن نەمێنێت و لەبەرچاودا ون ببێت، بۆ ئەوەی ئیخلاسی كردەوەكانیان دووچاری ناتەواوی و كەموكووڕی نەبێت.

بەڵێ ڕاستە، گەورەترین نیعمەتی خواوەند سەبارەت بە كەسێكی وەرگیراو لای خوای گەورە بریتی‌یە لەو نیعمەتەی كە بێ ئەوەی بەندە كە هەستی پێ بكات پێی دەبەخشرێت، تاكو لە حاڵی دوعا و پاڕانەوە و لارەملی‌یەوە نەچێتە حاڵ و دۆخی نازكردن بە عیبادەتەكانی و داوا كردنی پاداشت لەسەریان. هەروەها بۆ ئەوەی لە پایەی شوكرانە و حەمدەوە بەرنەبێتەوە و نەكەوێتە باری شانازی و لەخۆبایی بوون.

بەپێی ئەم حەقیقەتە:

ئەو كەسانەی كە حەزیان لە گرتنەبەری ڕێی ویلایەت و تەریقەت هەیە، گەر دەیانەوێت هەندێ لە بەروبوومە لاوەكی‌یەكانی "ویلایەت" لەم دنیادا بەدەست بهێنن و داوای دەكەن و لەزەتی لێ دەبەن، وەك كەرامەت و چێژە مەعنەوی‌یەكان، ئەوا ئەم كارەیان حەز و ئارەزووی ئەوان دەردەخات بۆ دەستخستنی ئەو بەروبوومانە لەم ژیانە فانی‌یەدا كە ئەگەر دەستیان بكەوێت ئەوا چەند بەروبوومێكی بڕاوە و فانی دەبن و، بەم

كاره‌شیان "ئیخلاس"ێكیان له‌ده‌ست داوه كه به‌هۆیه‌وه به‌روبوومی ویلایه‌تیان ده‌ست ده‌كه‌وێت. هه‌روه‌ك به‌م حه‌زه‌یان ڕێگا بۆ له‌ده‌ستدانی خودی ویلایه‌ته‌كه‌ش خۆش ده‌كه‌ن!

✿ **ته‌لویحی حه‌وته‌م:**

بریتی‌یه له چوار سه‌رنج.

❍ سه‌رنجی یه‌كه‌م:

"شه‌ریعه‌ت" ئه‌نجامی ئه‌و گوفتاره ڕاسته‌وخۆیه‌ی خوای گه‌وره‌یه، كه بێ هیچ په‌رده و به‌ربه‌ستێك، له لایه‌ن په‌روه‌ردگارێتیی ڕه‌ها و تاك و ته‌نیاوه ده‌رچووه و ئاراسته كراوه.

كه‌واته به‌رزترینی پله‌كانی "ته‌ریقه‌ت" و بڵندترینی پایه‌كانی "حه‌قیقه‌ت" له‌وه زیاتر تێپه‌ڕ ناكه‌ن كه به‌شێك بن له هه‌مه‌كێتیی "شه‌ریعه‌ت". ئه‌نجامه‌كانی ئه‌م دوانه‌ش بریتین له فه‌رمانه شه‌رعی‌یه موحكه‌مه‌كان.

واته "ته‌ریقه‌ت" و "حه‌قیقه‌ت" هه‌میشه له حوكمی هۆ و پێشه‌كی و خزمه‌تكاری "شه‌ریعه‌ت"دان.

ڕێبواری ڕێبازی ته‌ریقه‌ت ورده ورده به‌ره‌و بڵندترینی پله‌كان سه‌رده‌كه‌وێت كه تیای‌دا ئه‌و واتایه‌ی حه‌قیقه‌ت و نهێنیی ته‌ریقه‌ت به‌ده‌ست ده‌هێنێت كه له خودی شه‌ریعه‌ت خۆی‌دا هه‌ن! ئه‌و كاته‌ش ته‌ریقه‌ت و حه‌قیقه‌ت ده‌بن به چه‌ند به‌شێكی شه‌ریعه‌تی هه‌ره مه‌زن.

له‌به‌ر ئه‌وه، بۆچوونی هه‌ندێ له شوێنكه‌وتووانی ڕێی ته‌سه‌ووف ڕاست نی‌یه كه پێیان وایه: شه‌ریعه‌ت توێكڵێكی ڕواڵه‌تی‌یه و حه‌قیقه‌تیش كاكڵه و ئه‌نجام و ئامانجه‌كه‌یه‌تی.

به‌ڵێ، به‌پێی جیاوازیی ئاستی خه‌ڵكی و چینه‌كانی تێ‌گه‌یشتنیان، ده‌ركه‌وتنی ئه‌حكامه‌كانی شه‌رعیش جۆراوجۆر ده‌بن و، ئه‌وه‌ی له‌و ئه‌حكامانه بۆ چینی "عه‌وام" كه‌شف ده‌بن، جیایه له‌وه‌ی كه بۆ "تایبه‌تمه‌ندان" كه‌شف ده‌بن و ده‌رده‌كه‌ون.

به‌ڵام كارێكی گه‌لێ هه‌ڵه‌یه گه‌ر مرۆڤ له‌و وه‌همه‌دا بێت: ئه‌و ڕواڵه‌ته‌ی شه‌ریعه‌ت، كه له عه‌وامه‌كان ده‌رده‌كه‌وێت، حه‌قیقه‌تی شه‌ریعه‌ت بێت و ناوی حه‌قیقه‌ت و ته‌ریقه‌تیش له‌و پله‌یه‌ی شه‌ریعه‌ت بنرێت كه بۆ تایبه‌تمه‌ندان ده‌رده‌كه‌وێت..

چونکە شەریعەت گەلێ پلەی زۆری هەیە کە ڕوویـان لـە هـەموو چینـەکانی گـرۆی مرۆڤە.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە:

ئەهلی تەریقەت و حەقیقەت هەتا لە ڕێبازەکەیاندا پێش بکەون و بە پلە و پایەکانیاندا پتر سەر بکـەون، زیـاتر خۆیـان لـە کێـش بوونـدا بـەرەو حەقیقەتـە شـەرعی‌یەکان و شوێنکەوتنیان دەبیننەوە و، پتر دەڕۆنە ناو مەبەست و ئامانجەکانیەوە. تەنانـەت وایـان لـێ دێـت کـە ئاسـایی‌ترینی جۆرەکـانی سـونەتی خـاوێنی پێغەمبـەریان ﷺ لـەلا دەبێـت بـە گـەورەترین مەبەسـت و ئامـانج و، بۆ شـوێنکەوتن و چـاولێکردنی لـێ دەبڕێـن و تـەقالا دەدەن..

چونکـە بـە ئـەندازەی بـەرزی و بلندیـی "وەحـی" بەسـەر "ئیلـهام"دا، ئادابـە شـەرعی‌یەکانیش، کـە بـەروبوومی ئـەو "وەحـی"یـەن، بـەرز و بلندتـرن بەسـەر ئـادابی تەریقەتدا، کە بـەروبوومی ئیلـهامن. کەواتـە گرنگـترین بناغـەی تەریقـەت: شـوێنکەوتنی سونەتی خاوێنە.

○ سەرنجی دووهەم:

دەبێ تەریقەت و حەقیقەت لـەوە تێپـەڕ نەکـەن کـە بریتـی بـن لـە دوو "هۆکـار" و، لـە خۆیاندا نـەکرێن بـە "مەبەسـت" و "ئامـانج" بـە چەشـنێك کـە زاڵ بـن بەسـەر دڵ و بیر و ویژدانی سالیکی ئەو ڕێگایەدا.

خۆ ئەگەر تەریقەت و حەقیقەت بکرێن بە جێی مەبەست و ئامانج، ئـەوا بایـەخدان بـە کرداره شـەرعی‌یە موحکەمەکان و دابەکانی سـونەتی خـاوێن کـەم دەبێتـەوە و بـە لای سالیکەوە دێنە پلەی دووهەم و، دەبن بە چەند شـێوەیەکی ڕواڵـەتی و، دڵیشـی بـە داب و ڕەویەی داخوازی‌یەکانی تەریقەتەوە سەرقاڵ دەبێت.

واتە ئەو کاتە مرۆڤ بیر لە ئەڵقـەی زیکرەکـەی زیـاتر دەکاتـەوە تـا نوێژەکـانی و، پـتر خۆی پابەندی ویردەکان دەبینێتەوە تا ئەنجامدانی فەرزەکان و، خۆی ناچار دەکـات کـە لـە پشتگوێ خستنی ئادابەکانی تەریقـەت زیـاتر پارێزگـاری بکـات تـا خۆپاراسـتنی لـە گوناهە گەورەکان!

لە کاتێکدا کە هەرگیز ویردەکانی تەریقەت ناگەنە ئاستی تەنها یەك دانە فەرز کـە بـە مەبەستی گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی شەرع ئەنجام درابێت!

کەواتە ئادابەکانی تەریقەت و ویردەکانی تەسەووف و ئەو چێژانەش کە سالیك لێیانەوە بەدەستی دەهێنێت، دەبێ دەروازەیەك بن بۆ چەندین چێژی شیرینتر و بەرزتر کە سالیك لە دەمی ئەنجامدانی فەرز و سوننەتەکاندا بەدەستیان دەهێنێت.

واتە: دەبێ ئەو چێژانەی کە مرۆڤ لە تەکیە و خانەقاکاندا دەستی دەکەون، سەرەتایەك بن بۆ چێژەکانی ئەو نوێژەی کە لە مزگەوتدا جێبەجێی دەکات، بەوەی کە ئەرکانەکانی بە ڕێکوپێکی و شێوەی پێویست ئەدا بکات.

دەنا ئەو کەسەی کە چێژەکانی تەکیە و خانەقاکەی لەسەر حسابی نوێژەکانی مزگەوتی سەرقاڵی دەکەن و، ئەو نوێژانەی هێندە بەخێرایی و ڕووکەشی ئەنجام دەدات کە گەرموگوڕی و گیانی نوێژیان تێدا نی‌یە، لە "حەقیقەت" دوور کەوتووەتەوە.

○ سەرنجی سێهەم:

**پرسیار:** ئایا دەگونجێ لە دەرەوەی بازنەی سوننەتی خاوێن و ئەحکامی شەریعەتدا تەریقەتێك هەبێت؟

**وەڵام:** بەڵێ و.. نەخێر!

دەڵێین: بەڵێ، چونکە چەند کەسێك لە ئەولیا کامڵەکان بە شمشێری شەریعەت لەناو براون.. دەشڵێین: نەخێر، چونکە ئەولیا لێکۆڵەرەکان لەسەر ئەو قاعیدە و دەستوورە یەکیان گرتووە کە سەعدیی شیرازی بە شیعر دەری بڕیوە:

سەعدی! مەحاڵە بێ ڕێی مستەفا کەس زەفەر ببات بە ڕێگەی صەفا

واتە: مەحاڵە لە غەیری ئەو ڕێگایەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕەچەکەی شکاندووە و بەبێ شوێن پێ هەڵگرتنی هەنگاوەکانی ئەو، کەسێك بگات بە نووره ڕاستەقینەکانی "حەقیقەت".

نهێنیی ئەم مەسەلەیەش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

مادەم پێغەمبەر ﷺ دواهەمینی پێغەمبەرانە و، خوای گەورەش وەك نوێنەری هەموو گرۆی مرۆڤ بۆی ڕوانیوە و گوفتاری خۆی ئاراستە کردووە، ئەوا دەبێ مرۆڤایەتی، جگە لەو ڕێیەی کە ئەم پێغەمبەرە ﷺ ڕوونی کردووەتەوە، بە هیچ ڕێیەکی تردا هەنگاو نەنێت. کەواتە پێویستە مرۆڤ بڕواتە ژێر ئاڵاکەیەوە.

بەڵام مادەم ئەهلی جەزبە و ئیستیغراق، لەبەر ئەو لەتائیف (واتە: چەند لایەنە ناسکان)ەی کە لە مرۆڤدان و مل بۆ تەکلیف و خواستەکانی شەرع کەچ ناکەن، بەرپرسی ئەو کردار و ڕەفتارانەیان نین کە پێچەوانەی شەرعن، ئەوا کاتێ ئەو لایەنە

ناسکە(واتە ئەو لەتیفەیە) خۆی بەسەر ئەو مرۆڤەدا زاڵ دەکات ئەو کەسە بەرپرسیتیی بەرامبەر حوکمەکانی شەرع تێدا نامێنێت..

هەروەها مادەم چەند لەتائیفێکی تر لە مرۆڤدا هەن کە هەروەك مل بۆ تەکلیف و خواستەکانی تەکلیف کەچ ناکەن، گوێ ڕایەڵی ویستی مرۆڤیش نابن و، تەنانەت مل بۆ تەگبیری عەقڵ و فەرمانەکانی دڵ و ژیریش کەچ ناکەن.. ئەوا کاتێ ئەو لایەنە ناسکە بەسەر هەرکەسێکدا زاڵ دەبێت، بە هەنگاونانی بە پێچەوانەی شەرع لە پلەی ویلایەت ناکەوێتە خوار و، تەنها لە دەمی زاڵ بوونی ئەو لایەنەدا چاوپۆشیی لێ دەکرێت، بە مەرجێ شتێکی لێوە دەرنەکەوێت کە لە ڕووی ئینکاری و پووچەڵکردنەوە و گاڵتە پێ کردن و سووکایەتی‌یەوە، پێچەوانەی ڕاستی‌یەکانی شەرع بێت. هەروەها دەبێت تەسدیقی ئەحەققییەتی شەرع بکات، هەرچەندەش بە تەواوەتی مافی خۆی نەداتێ.

دەنا گەر ئەو حاڵەی بەسەردا زاڵ ببێت و شتێکی لێوە دەربکەوێت کە بۆنی ئینکاری و بەدرۆخستنەوەی ئەو ڕاستی‌یە توند و تۆڵانەی لێوە بێت، ئەوا –پەنا بەخوا– نیشانەی تیاچوونە.

**پوختەی قسە:**

ئەو خاوەن تەریقەتانەی کە لە دەرەوەی بازنەی شەرعدان دوو بەشن:

*بەشێکیان*: بەو جۆرەن کە ئێستا باسمان کردن. جا ئەوانە یان حاڵ و جەزبە و ئیستیغراق و مەستی‌یان بەسەردا زاڵە، یان هەندێ لەو لەتائیفانە بەسەریاندا زاڵ بووە کە مل بۆ خواست و تەکلیفەکان کەچ ناکەن و بایەخیش بە ویستی مرۆڤ نادەن و، لەم ڕێیەوە ئەو کەسە لە بازنەی شەرع دەچێتە دەرەوە.

بەڵام ئەم چوونەدەرەوەیە هی ئەوە نی‌یە کە بە شەرع ڕازی نەبێت، یان مل بۆ ئەحکامەکانی شەرع نەدات. بەڵکو لە ناچاری‌دا و بەبێ ویستی خۆی واز لە ئەنجامدانی ئەو ئەحکامانە دەهێنێت. چەندین ئەولیا هەن کە لەم جۆرەن، جگە لەوەی کە هەندێ کەس لە گەورە ئەولیاکان ماوەیەکی تەمەنیان گرفتاری ئەم حاڵە بوون. تەنانەت ئەم بەشە کەسانی وایان تێدا بووە کە ئەولیایانی لێکۆڵەر لە بارەیانەوە بڕیاری ئەوەیان داوە کە نەك هەر لە بازنەی شەرع، بەڵکو لە بازنەی ئیسلامیش ڕۆشتوونەتە دەر. مەگەر هەموو ئەو ئەحکامانە بەدرۆ نەخەنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خوای گەورەوە هێناونی، هەرچەندەش بەهۆی بیرنەکردنەوەیان لەو حوکمانە، یان لەبەر ئەوەی ناتوانن ڕوویان تێ

بکەن، یان ناتوانن بیانزانن و لێیان تێ بگەن، جێبەجێیان ناکەن و مافی خۆیـان نادەنـێ. بەڵام گەر هەرکام لەوانە لەو حوکمانە تێبگـات و بیـانزانێت و ئنجا سـەرپێچییان لـێ بکات و پشتگوێیان بخات، ئەوا تیاچووە.

*بەڵام بەشی دووهەم:* ئەوانەن کە مەجزووبی مەستیی چێژە زرق و برقەدار و سەرنج ڕاکێشەکانی تەریقەت و حەقیقەتن و، گوێ بە حەقیقەتە شەرعی‌یەکان نادەن کە زۆر لـە ئاستی چێژەکانی ئەوان بەرزترن و، هی وایان تێدایـە کـە لەبەر ئەوەی نـاتوانێت بگاتـە ئاسـتی چێـژی "حـەقیقەتەکانی شـەرع" پێی وایە: ئـەو حـەقیقەتانە هیـچ چێژێکیـان تێـدا نی‌یە و، بە شێوەیەکی ڕواڵەتی جێبەجێیان دەکات!

ئیـتر بـەم جـۆرە وردە وردە لەسـەر ئـەم بۆچوونـەی خـۆی دەڕوات تـا دەگاتـە ئـەو گومانەی کە پێی وابێـت: "شەریعەت" تەنها توێکڵێکی ڕواڵەتی‌یە و ئـەو حەقیقەتـەش کـە دۆزیویەتەوە: بناغە و مەبەست و ئامانجە و، لەبەر خۆیەوە دەڵێت: "ئەمەم سـەروزیادە کـە دۆزیومەتەوە" و، چەند کردارێك دەکات کە پێچەوانەی فەرمانەکانی شەرعن.

جا ئەو کەسانەی کە لەم بەشەن و هەست و نەست و ژیریی خۆیان لەدەست نـەداوە، بەرپرسن لە کردەوەکانیان و بە گوناهبار دادەنرێن. تەنانەت گەر لەسەر ئەو کردەوانەیان بـەردەوام بن، لـە ئەنجامدا تیـادەچن. بگـرە هـی وەهایـان تێدایـە کـە مایـەی گاڵتـە و پـێ ڕابواردنی شەیتانە!

○ سەرنجی چوارەم:

ماوەیەك لەوە سەرسام مابووم کـە هـەندێ کەسـی تاقمـە گومـڕا و بیدعـەتکارەکان بەلای نەتـەوەی ئیسـلامەوە قبـووڵ کـراون، کـەچی کەسـانی تـری هاووێنـەیان قبـووڵ ناکرێن و دەست بە ڕوویانەوە دەنرێت، بێ ئـەوەی هیـچ جیاوازی‌یـەکی ڕواڵـەتی‌یان لـە نێواندا بێت!

بـۆ نموونــە: "زومەخشــەری"[(١)] کــە موعتەزیلی‌یــەکی یــەکجار دەمارگــیرە بــۆ ڕێڕەوەکەی، لە لایەن لێکۆڵەرانی ئـەهلی سـوننەتەوە بـە کـافر دانـانرێت و نایخەنـە ڕیـزی

(١) نـاوی "ئەبولقاسـم جـارولڵا مەحموودی کـوڕی عومـەری کـوڕی محەممـەدی زومەخشـەری"یـە. سـاڵی (٤٦٧ك) لە زومەخشەر لەدایك بووە و دوای گەڕانەوەشی لـە مەککـەی پیرۆز لـە سـاڵی (٥٣٨ك)دا وەفـاتی کردووە. لە زانستەکانی زمـان و تەفسیری قورئاندا پێشـەوای چـەرخی خـۆی بـووە. ئەمـە نـاوی هەندێکـە لـە بەرهەمەکانی: "الكشّاف عن حقائق التنـزيل، الفائق في غريب الحديث، المفصل في النحو، أساس البلاغـة". (وەرگێڕ)

گومڕایانەوە، هەرچەندەش ڕەخنە و ئیعتیرازی توند و تیژی لە ئەهلی سوننەت گرتووە، بەڵکو بەهانە و بیانووی بۆ دەدۆزنەوە و بواری ڕزگاربوونی بۆ دەهێڵنەوە.. کەچی "ئەبوو عەلیی جەبائی"(١) کە ئەویش یەکێکە لە پێشەوایانی موعتەزیلە، لێکۆڵەرانی ئەهلی سوننەت دەریدەکەن و بەرپەرچی ڕا و بۆچوونەکانی دەدەنەوە، لە کاتێکدا کە دەمارگیریی ئەم لەچاو هی "زومەخشەری"دا گەلێ کەم و تەنکترە!

ئەم دیاردەیە بەشێکی زۆری بیرکردنەوەی منی گرتبوو! پاشان لە ڕێی لوتفێکی خواوەندەوە تێ گەیشتم کە:

ڕەخنە و ئیعتیرازی "زومەخشەری" بەرامبەر ئەهلی سوننەت هی ئەوەیە ئەو "حەق"ەی گەلێ خۆش دەوێت کە ڕێبازەکەی خەڵکی بۆ لا بانگ دەکات. وەك ئەوەی کە دەڵێت: تەنزیهی ڕاستەقینەی خوای گەورە بەوە دەبێت کە زیندەوەران – وەك ئەو پێی وایە – بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیان بن! بەم جۆرە و لەبەر ئەو خۆشەویستی‌یەی کە ئەنجامی تەنزیهکردنی خوای گەورەیە، بەرپەرچی قاعیدە و دەستووری ئەهلی سوننەتی لەمەڕ "بەدیهێنانی کردەوەکان" داوەتەوە..

بەڵام ئینکاریی پێشەوا وەرنەگیراوەکانی موعتەزیلە بۆ ڕێگای ئەهلی سوننەت لەبەر زێدە خۆشەویستیی "حەق" نەبووە، بەڵکو لەبەر دەستەوسانی و کورتهێنانی ژیریان بووە لە تێگەیشتنی دەستوور و یاسا بەرز و فراوانەکانی ئەهلی سوننەت. بۆیە دەست بە ڕووی گوفتارەکانیانەوە دەنرێت و بەرپەرچ دەدرێنەوە و دەردەکرێن.

جا هەروەك دژەبۆچوونەکانی دەستەی موعتەزیلە بەرامبەر بە ئەهلی سوننەت بە دوو شێوە دەبێت، وەك لە کتێبەکانی زانستی کەلامدا باس کراوە.. بە هەمان جۆر، ئەو کەسانەش کە ئەهلی تەریقەتن و لە دەرەوەی بازنەی سوننەتی خاوێندان و بە پێچەوانەی سوننەتەوە ڕەفتار دەکەن، ئەم ڕەفتارە پێچەوانەیەی ئەوان لە دوو ڕووەوەیە:

**یەکەم:** ئەوەیە وەلی‌یەکە، بە وێنەی کێش بوونی زومەخشەری بۆ ڕێڕەوەکەی، بۆ حاڵ و ڕێبازەکەی خۆی کێش و مەجزووب بوو بێت و، تا ڕادەیەك بایەخ بەو ئادابانەی شەرع نەدات کە هێشتا چێژەکانی ئەو نەگەیشتوونەتە ئاستیان.

---

(١) ناوی "ئەبوعەلی محەممەدی کوڕی عەبدولوەهابی کوڕی سەلامی جەبائی"یە. سالی (٢٣٥ ك) لە دایك بووە و لەسالی (٣٠٣ ك)دا کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە پێشەوایانی موعتەزیلە و سەرگەورەی زانایانی کەلامە لە چەرخی خۆیدا و، تاقمی "جەبائی" سەر بەو بوون. چەند وتار و ڕایەکی سەربەخۆی هەیە لەناو موعتەزیلەکاندا. هەروەك چەند کتێبێکیشی دراونەتە پاڵ کە هەرهەموویان لەناوچوون و نەماون. (وەرگێڕ)

دووهەم: ئەوەیە کە ئەو وەلی‌یە وا بزوانێتە ئادابی "شەریعەت" کە - پەنا بەخوا - لەچاو دەستوورەکانی "تەریقەت"دا دارای هیچ گرنگی‌یەك نەبن، لەبەر ئەوەی کە نەیتوانیوە پەی بەو هەموو چێژە فراوانانە ببات و، پلە و پایە کورت و کۆتاکەی خۆی ناتوانێت بگاتە ئاستی ئەو ئادابە بەرزانە.

✿ **تەلویحی هەشتەم:**

کە بریتی‌یە لە هەشت پێ‌خلیسك و هەڵدێر:

◆ یەکەم:

یەکێك لەو هەڵدێر و داوانەی کە هەندێ لە رێرەوانی تەریقەتە سۆفی‌یەکان تێی دەکەون، لەوانەی کە بە شێوەیەکی راست و دروست شوێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناکەون: باوەڕبوونیانە بە تەرجیح بوونی "ویلایەت" بەسەر "نبووەت"دا!

ئێمە لە وتەی بیست و چوارەم و سی و یەکەمی کتێبی "وتەکان"دا مەودای بەرز و بلندیی "نبووەت"مان بەسەر "ویلایەت"دا و کزیی روونـاکیی ئەممان لەچاو نووری "نبووەت"دا، چەسپاندووە.

◆ دووهەم:

بریتی‌یە لەوەی کە هەندێ کەس لە زیادەڕەوان دەچن فەزڵی "ئەولیاکان" بەسەر "هاوەڵە بەڕێزەکان"دا - خوایان لێ رازی بێت - دەدەن. تەنانەت لە پلەی پێغەمبەرانیشدا - درووديان لەسەر بێت - دەیانبینن!

ئێمە لە وتەی دوازدەهەم و وتەی بیست و حەوتەم (پەیامی ئجتیهاد)دا و لە پاشکۆکەی‌دا، کە تایبەتە بە هاوەڵەکانەوە، روونمان کردووەتەوە کە هاوەڵە بەڕێزەکان - خوایان لێ رازی بێت - بەهۆی هاوەڵێتیی پێغەمبەرەوە ﷺ چەند تایبەتکاری‌یەکی ناوازەی ئەوتۆیان بەدەست هێناوە کە هەرگیز ناگونجێ ئەولیاکان بگەنە پلەوپایەیان، چ جای ئەوەی پێشیان بکەونەوە.

◆ سێ‌هەم:

بریتی‌یە لە تەرجیحدانی ئەوراد و ئادابەکانی تەریقەت بەسەر زیکرەکانی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ لە لایەن هەندێ کەس لە دەمارگیران و زیادڕەوانی تەریقەتەوە. بەم کارەشیان بەر دەبنەوە بۆ سەر پێ‌خلیسکی رەفتاری پێچەوانەی سوننەت و وازلێهێنانی، لەو کاتەدا کە بە توندی دەستیان لە ئەورادی تەریقەتەکەیان گیر کردووە!

واتە: ڕەفتاریان وەك هی ئەو کەسە وایە کە گوێ بە ئادابی سوننەتی نەبەوی نادات و، لەم ڕێیەوە تووشی تیاچوون دەبن.

جا هەروەك ئێمە لە چەندین وتەی زۆردا چەسپاندوومانە و، گەورە لێکۆڵەرانی تەریقەتیش وەك "ئیمامی غەزالی" و "ئیمامی ڕەببانی" جەختیان لەسەر کردووە:

(شوێنکەوتنی یەك دانە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە سەد ئاداب و نەوافیلی تایبەت لە لای خوای گەورە گیرا دەبێت. چونکە هەروەك تەنها یەك فەرز بەسەر هەزار سوننەتدا تەرجیح دەدرێت، بە هەمان جۆر تەنها یەك سوننەتی نەبەوییش بەسەر هەزار ئادابی تەسەووفدا تەرجیح دەدرێت و پێش دەخرێت).

◆ چوارەم:

هەندێ لە زیادەڕەوانی ئەهلی تەسەووف لەو وەهم و گومانە هەڵەیەدان کە "ئیلهام" لە پلەی "وەحی"دا بێت، هەروەك پێیان وایە "ئیلهام"یش جۆرێکە لە جۆرەکانی "وەحی" و، دەکەونە ئەم بێ‌خلیسك و هەڵدێرە ترسناکەوە!

پێشتر لە وتەی دوازدەهەم و وتەی بیست و پێنجەمدا، کە لە بارەی ئیعجازی قورئانەوەیە و، لە چەند پەیامێکی تردا بەڵگەمان بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە: "وەحی" گەلێ بەرز و بڵند و درەخشان و ڕووناك و هەمەکی و گشتی‌یە، بەڵام "ئیلهام" سەبارەت بەو کز و هەندەکی‌یە.

◆ پێنجەم:

هەندێ ئەهلی تەسەووف لەوانەی کە بە تەواوی لەو نهێنی‌یەی "تەریقەت" تێ‌نەگەیشتوون کە تەریقەت "هۆکار"ێکە و لە خۆیدا "ئامانج" و "مەبەست" نی‌یە، بەرەو ئەو چێژ و کەرامەت و ڕووناکی‌یانە کێش دەبن کە دەڕژێت بەسەریاندا و دەبەخشرێت و داوا ناکرێت، چونکە خوای گەورە لەبەر ئەوە پێیان دەبەخشێت تاکو لاوازان بەهێز بکرێن و، تەمبەڵ و کەمتەرخەمانیش هان بدرێن و، ئەو بێزاری و ماندوویتی‌یەی ئەستۆیان - کە لە ئەنجامی زۆر ماندووبوونیان لە عیبادەتدا تووشیان بووە - سووك بکرێت. کەچی ئەوان دەچن فەزڵی ئەو کەرامەت و چێژ و ڕووناکی‌یانە بەسەر فەرزەکانی ئایین و خزمەتگوزاریی ژێر ئاڵاکەی و خوێندنی زیکر و ویردەکاندا دەدەن و، دەکەونە ئەم بێ‌خلیسك و هەڵدێرەوە.

پێشتر بە پوختی لە خاڵی سێ‌هەمی تەلویحی شەشەم و، چەند وتەیەکی تردا وتوومانە کە: ئەم دنیایە خانەی کار و خزمەتە، نەك خانەی بەخشش و پاداشت. جا ئەو کەسانەی

کە حەز دەکەن بەروبوومی کردەوەکانیان لەم دنیا فانی‌یەدا لێ بکەنەوە، ئەوا بەروبوومە هەمیشەیی و نەبڕاوەکانی ئاخیرەتیان بە پاداشت و بەخششێکی فـانیی دنیـا گۆڕیوەتـەوە. سـەرباری ئەوەش کە ئـەم کارەیـان بەڵگەیـە لـەسـەر مانـەوەی پاشماوەی دڵبـەندی‌یان بـە دنیاوە و حەزکردنیان لە چێژ و لەزەتەکانی، کە ئەمەش دەبێت بـەهۆی کزبوونـی تاسـە و شـەوق و لێبڕانیان بۆ ژیانی بەرزەخ. بەڵکو ئەم ژیانەیان لە لا دەبێت بە "ئامانج"، چونکە جۆرێك لە بەروبوومەکانی ئاخیرەتی تێدا بەدەست دەهێنن.

◆ شەشەم:

بریتی‌یە لەو پێ‌خلیسك و هەڵدێرەی کـە هـەندێ لـە ڕێڕەوانـی تەریقەتـە سۆفی‌یەکان تێی دەکـەون لەوانـەی کـە ئـەهلی حەقیقـەت نـین، کاتێ کارەکـەیان لـێ دەئـاڵۆزێت و دەکەونە ئەو وەهمەی کە پێیان وایێت: سـێبەرەکان و نموونـە بچووکـەکانی مەقامـەکانی "ویلایەت" وەك خودی مەقامە ئەسڵی و ڕاستەقینە و هەمەکی‌یەکان وابن..

لـە لقی دووهـەمی وتـەی بیسـت و چـوارەم و چـەند وتەیـەکی تـردا بـە چەشـنێکی بێ‌گومان چەسپاندوومانە کە:

هەرچەندە "خۆر" بەهۆی زۆریـی ئـەو ئاوێنانـەی تیایـاندا دەردەکـەوێت وێنەکانیشـی زۆر دەبن، بـەڵام ڕووناکـی و گـەرمیی خـۆر لـەم وێنانـەدا خـودی ڕووناکـی و گـەرمی‌یـە ئەسڵی و ڕاستەقینەکەی "خۆر" نی‌یە، چونکە هی ئەوانـە گەلـێ کـز و نزمـن لـەچاو هـی خۆری ڕاستەقینەدا.

بە هەمان جۆر مەقامی "نبووەت" و مەقامی گەورە ئەولیاکان هـەندێ سێبەریان هەیـە کە دەگونجێ ئەهلی تەریقەت بڕۆنە سـایەیانەوە. بـەڵام کاتێ دەڕۆنـە ژێـر ئـەو سـێبەرەوە، پێیان وا دەبێت کە پلەیان لە هی ئەولیا مەزنەکان، تەنانـەت لـە هـی پێغەمبـەرانیش - پەنا بەخوا - گەورەترە و، لێرەوە پێ‌یان دەترازێت و لەم هەڵدێرەوە دەکەونە خوارەوە!

جـا بـۆ مەبەسـتی ڕزگـارکردنی خۆیـان لـەم هـەموو پێ‌خلیسـك و هەڵدێرانـەی بـاس کران، دەبێ ئەسڵەکانی ئیمان و بناغەکانی شەرع لە پێش‌چاویـاندا دابنێـن و بیانکـەن بـە ڕابـەرێکی هەمیشـەیی خۆیـان و، پێچەوانـەی چێـژ و بینینـەکانیان ڕەفتـار بنوێنـن و تۆمەتباریان بکەن کاتێ کە لەگەڵ ئەو بناغانەدا یەکیان نەگرتەوە.

◆ حەوتەم:

بریتی‌یـە لـەو هـەڵدێرەی کـە هـەندێك ئـەهلی زەوق و شـەوقی نێـوان شـوێنکەوتوانی تەریقەت تێی دەکەون، کاتێ بـۆ: شـانازی و لاف لێـدان و بڵاوکردنـەوەی شـەتەحات و

داوای ڕووتێکردنی خەڵکی لێیان و بەدەستهێنانی مەرجەعیەتی ئایینی، لێ دەبڕێن و، فەزڵی ئەم شتە خێرا و کەم خایەنانەی دنیا بەسەر: شوکرانە و لالانەوە و حەمد و دەستشۆردندا لە خەڵکی، دەدەن. لە کاتێکدا کە بەندایەتیی پێغەمبەر ﷺ لە بەرزترینی پلەکانی عەبدایەتیدایە و، بە چەشنێکە دەتوانین بە "مەحبووبییەت" یاخود بە "عەبدایەتیی مەحەبەت" وەسفی بکەین.

کەواتە بناغە و نهێنیی بەندایەتی و عبوودییەت بریتییە لە: لالانەوە و حەمد و سەنا و دوعا و ملکەچی و کۆڵەواری و هەژاری و دەستداشۆردن لە خەڵکی. هەر تەنها بەمانەش دەگونجێ مرۆڤ بگاتە کەماڵی حەقیقەتی "بەندایەتی".

بەڵێ، هەندێك لە ئەولیا مەزنەکان، بە بێ ئیختیاری خۆیان و لەبەر زاڵبوونی حاڵ بەسەریاندا، بە شێوەیەکی کاتی ناچار بوون بێنە دەرەوە بۆ ناو مەیدانی شانازی و داواکاری و شەتەحات. کەواتە دروست نییە بۆ هیچ کەسێك، بە ئیختیاری خۆی، لەم حاڵەیاندا چاویان لێ بکات و، ئەو گەورە پیاوچاکانە هەر چەندەش لەسەر ڕێی هیدایەت بن، لەم حاڵەدا پێشەنگی هیدایەت نین بۆ هیچ کەسێك. لەبەر ئەوە، نابێت خەڵکی چاویان لێ بکات و لە دوایانەوە بڕوات.

◆ هەشتەم:

ئەو تیاچوون و هەڵدێرەیە کە هەندێك لەو تەریقەتدارانە تێی دەکەون کە پەلە دەکەن و ئامانجیان تەنها سوودە خۆیی و کەسییەکانە، لەوانەی کە حەز دەکەن "بەروبوومەکانی ویلایەت" - لە بریی ئەودنیا - لەمدنیادا لێ بکەنەوە!

جا کاتێ کە ڕەفتارەکانیان ئەم حەزەیان دەربڕێت و لە ڕێی ئەم چەشنە هەڵسوکەوتانەوە ئەم نیاز و نیەتانەیان دەردەکەوێت، ئەوا لە ڕاستیدا بەردەبنەوە بۆ ئاستی ئەم هەڵدێر و لەناوچوونە. لە کاتێکدا کە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆز چەشنی: ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾ (آل عمـــران:١٨٥) بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستییەی کە لە چەند وتەیەکدا چەسپاندوومانە و ڕوونمان کردووەتەوە کە:

تەنها یەك بەروبوومی "جیهانی بەقاء" لە هەزار باخ و بێستانی ئەم "دنیا فانی"یە چاکترە. لەبەر ئەوە، باشتر وایە ئەو بەروبوومە پیرۆزانەی ئەوێ، لێرە وەرنەگیرێن. خۆ ئەگەر بە بێ حەز و داواکاری لەم دنیایەدا پێی دران، دەبێ حەمد و شوکرانەبژێری دەرببڕێت و، لەو ڕووەوە وەریانبگرێت کە چاکە و فەزڵێکی خواوەندن و، بۆ تەشویق و هاندان بەخشیونی، نەك وەك بەخششێك وەریان بگرێت.

✿ تەلویحی نۆهەم:

لێرەدا بە پوختی نۆ دانە بەروبووم لە سوود و بەروبوومە زۆرەکانی "تەریقەت" باس دەکەین:

✰ یەکەم:

بریتی‌یە لە دەرکەوتن و ڕوون بوونەوەی "ڕاستی‌یەکانی ئیمان" تا پلەی "عین الیقین" لە ڕێی تەریقەتی ڕاست و دروستەوە. ئەو ڕاستی‌یانەی ئیمان کە سەرچاوە و کلیلی چەندین گەنجینەی هەتاهەتایی و بەختەوەریی هەمیشەیین.

✰ دووهەم:

بریتی‌یە لە هێنانەدیی "بوونی ڕاستەقینەی مرۆڤ" لە ڕێی خستنەکاری هەموو لەتائیفەکان لەو شتانەی کە لە پێناویاندا بەدی هێنراون. ئەمەش بەوە دەبێت کە "تەریقەت" ببێت بە هۆکاری بزواندنی "دڵی مرۆڤ" کە مەڵبەندی جەستەی و برغووی جوڵاندن و ڕووپێ‌کردنیەتی بۆ خوای گەورە. بەم کارەش گەلێ لەتائیفی مرۆڤ دەجووڵێن و بەرجەستە دەبن و، لەم ڕێ‌یەوە "حەقیقەتی مرۆڤ" دەردەکەوێت.

✰ سێ‌هەم:

بریتی‌یە لە ڕزگاربوونی مرۆڤ لە وەحشەتی تەنیایی لە دەمی سەیر و سلووکدا و، هەستکردنە بە ئونس و هاودەمیی مەعنەوی لە ژیانی دنیا و بەرزەخدا، لە ڕێی پەیوەندی کردنەوە بە یەکێك لە زنجیرەکانی تەریقەت کاتێ بەرەو ژیانی بەرزەخ و ئەودنیا دەڕوات و کۆچ دەکات و.. بریتی‌یە لە پەیوەندی‌بەستنی هاوڕێ‌یەتی و خۆشەویستی لەگەڵ ئەو کاروانە نووڕانی‌یە لە ڕێی دوور و درێژی هەتاهەتایی‌دا، کە بەم کارەش هەموو وەهم و گومانەکان لەسەر دەروونی مورید دەڕەوێنەوە کاتێ پاڵ بە ئیجماع و یەکدەنگیی کەسانی ئەو کاروانە نووڕانی‌یەوە دەداتەوە، لەو ڕووەوە کە هەموو یەکێك لەو مامۆستا و ڕابەرانە بەڵگەیەکی مەحکەم و پاڵپشتێکی بەهێزن بۆ دوورخستنەوەی ئەو گومڕایی و وەهمانەی دێنە ناو زەینی مرۆڤەوە.

✰ چوارەم:

بریتی‌یە لە ڕزگاربوونی مرۆڤ لەو بێزاری و وەحشەتە گەورەیەی کە لە ژیانی دنیادا دەوراندەوری دەدات و، خۆقوتارکردنە لەو نامۆیی‌یە ئازاربەخشەی کە مرۆڤ بەرامبەر بە گەردوون هەستی پێ دەکات.

ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە تەریقەتی ڕاست و دروست و خاوێن، سەرچاوەکانی "خۆشەویستی" و "ناسینی خوای گەورە" لەناو ئیمانی مرۆڤدا دەتەقێنێتەوە.

پێشتر لە چەند وتەیەکدا چەسپاندوومانە کە: بەختەوەریی هەردوودنیا و لەزەتێك کە ئازاری ئاوێتە نەبێت و ئونس و هاودەمییەك کە بێزاری و وەحشەتی تێکەڵ نەبێت و بەختەوەریی ڕاستەقینەی مرۆڤ تەنها لە "ڕاستییەکانی ئیمان و ئیسلام"دا دەست دەکەوێت، کە "تەریقەت" دەیەوێت پێیان بگات. هەروەك لە وتەی دووهەمیشدا ڕوونمان کردووەتەوە کە: ئیمان تۆوی درەختی تووبای بەهەشتی لەخۆدا هەڵگرتووە..

بەڵێ ئەو تۆوە، بەو پەروەردەیەی کە لە تەریقەتدایە، گەشە دەکات و گەورە دەبێت.

☆ پێنجەم:

بریتییە لە هەست کردن بەو ڕاستییە ناسکانەی کە لە تەکلیف و داخوازییەکانی شەرعدان و هەڵسەنگاندن و ڕێزلێنانیانە بەهۆی ئەو دڵە بێدارەی کە هەردەم لە یاد و زیکری خوادایە، وەك ڕێبازی پەروەردەیی تەریقەت بۆ ئەم دەرەنجامە یارمەتیی دەدات. بەم پێیە "گوێڕایەڵی" و "عیبادەت" دەبن بە ورووژێنەری تاسەمەندی و خۆشەویستی، نەك مایەی ئەرك و ماندووبوون.

☆ شەشەم:

بریتییە لە بەدەستهێنانی مەقامی تەوەککول و، پلەی ڕەزامەندی و، مەرتەبەی تەسلیم بوون. کە هەر ئەم مەقامانە تاکە ڕێگان بۆ چەشتنی تامی بەختەوەریی ڕاستەقینە و، دڵدانەوەی بێ گەرد و، لەزەت چەشتنێك کە پەژارەی تێکەڵ نەبێت و، هاودەمییەك کە بێزاری و وەحشەت توخنی نەکەوێت.

☆ حەوتەم:

ڕزگاربوونی مرۆڤە لە شیرکی پەنهان و ڕیا و مەرایی و ڕەفتارە خراپەکانی هاوچەشنیان، بەهۆی دەستکەوتنی "ئیخلاس"ەوە کە گرنگترین مەرجە بۆ سالیکی تەریقەت و گرنگترینی ئەنجامەکانی تەریقەتیشە. هەروەها بریتییە لە ڕزگاربوونی مرۆڤ لە مەترسییەکانی "نەفسی ئەممارە" و چڵك و چەپەڵییەکانی "خۆپەرستی" لە ڕێی "تەزکیە کردنی نەفس"ەوە کە سلووك و هەنگاونانی عەمەلییە لە تەریقەتدا.

☆ هەشتەم:

بریتییە لەوەی کە مرۆڤ کردارە ئاساییەکانی ڕۆژانەی ئەم دنیایەی دەخاتە حوکمی عیبادەت و کرداری سەر بەدواڕۆژ و، فێری ئەوە دەبێت کە چۆن بە چەشنێکی

ژیرانه سوود له سه‌رمایه‌ی ته‌مه‌نی، به هه‌موو لایه‌نه ورده‌كانی ژیانه‌وه، وه‌ربگرێت و بیانكات به چه‌ند تۆوێك كه ده‌میان به گوڵه‌كانی ژیانی ئه‌ودنیا بپشكوێت. ئه‌مه‌ش له رێی به‌رده‌وام بوونی له‌سه‌ر "زیكری قه‌لبی" و تێرامانی عه‌قڵی، هاوده‌م له‌گه‌ڵ دڵنیایی و ئاماده‌یی‌یه‌كی به‌رده‌وامی دڵی له حوزووری خوای گه‌وره‌دا و، تیژكردنه‌وه‌ی به‌رده‌وامی ویست و، نیازی بێ گه‌رد و، لێبڕانی ڕاستدا. كه هه‌موو ئه‌مانه‌ش ته‌ریقه‌ت مرۆڤیان له‌سه‌ر ڕاده‌هێنێت.

☆ نۆهه‌م:

بریتی‌یه له هه‌وڵدان بۆ گه‌یشتن به پله‌ی "مرۆڤی كامڵ". ئه‌مه‌ش به‌وه ده‌بێت كه مرۆڤی سالیك به درێژایی سه‌یر و سلووكی خۆی و له ده‌می ئه‌رك و ماندووبوونه ڕۆحی‌یه‌كانی‌دا، كه ژیانی مه‌عنه‌ویی ئه‌و به‌رز ده‌كه‌نه‌وه، ڕووی دڵی ئاراسته‌ی خوای گه‌وره بكات. واته گه‌یشتنی به پله‌ی ئیمانداری ڕاسته‌قینه و موسڵمانی ڕاستگۆ. به واتایه‌كی تر: به‌ده‌ستهێنانی حه‌قیقه‌تی ئیمان و ئیسلام، نه‌ك شێوه ڕواڵه‌تی‌یه‌كه‌یان. پاشان بریتی‌یه له‌وه‌ی كه مرۆڤ ببێت به به‌نده‌یه‌كی خاوێن و بێ گه‌ردی خوای په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌كان و جێی ئاراسته كردنی گوفتاری شكۆمه‌ندی و، نوێنه‌رێكی بوونه‌وه‌ران له ڕوویه‌كه‌وه و وه‌لی و خه‌لیلی خوای گه‌وره‌ش له ڕوویه‌كی تره‌وه، به ڕاده‌یه‌ك كه ده‌ڵێی ئاوێنه‌ی دره‌وشانه‌وه‌كانی خوایه و به ڕاستی له "أحسن تقويم"دایه و، بەم كاره‌شی ده‌بێت به به‌ڵگه له‌سه‌ر فه‌زڵدانی نه‌وه‌ی ئاده‌م به‌سه‌ر مه‌لائیكه‌تاندا.

بەم جۆره و به هه‌ردوو باڵی: "ئیمان" و "ڕه‌فتار به شه‌رع" به‌ره‌و پله و مه‌قامه به‌رزه‌كان ده‌فڕێت و، له‌وێوه و هه‌ر له‌م دنیایه‌وه به‌سه‌ر به‌خته‌وه‌ریی هه‌میشه‌یی‌دا ده‌ڕوانێت و ته‌نانه‌ت ده‌شڕواته ناویه‌وه!

﴿سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلاَّ ما عَلَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللّهم صلّ على الغوث الاكبر في كل العصور والقطب الأعظم في كـل الدهـور سيدنا محمد الذي تظاهرت حشمة ولايته ومقام محبوبيته في معراجه واندرج كل الولايات في ظل معراجه وعلى آله وصحبه اجمعين.

آمين والحمد لله رب العالمين.

* * *

# پاشکۆیەك

**(ئەم پاشکۆ یەکجار کورتە دارای گرنگیی‌یەکی مـەزن و سـوودی زۆرە بۆ هەموان).**

چەندین ڕێی زۆر هەن کە مرۆڤ بە خوای گەورە دەگەیەنن، سەرچاوەی هەموو ئەو ڕێ ڕاستانەش "قورئانی پیرۆز"ە. بەڵام ئـەوەندە هەیـە هـەندێ لـەم ڕێیانە لـەچاو ئـەوانی تردا گشتی‌تر و سەلامەتتر و نزیکترە.

من، وێڕای تێگەیشتنی کۆتا و ناتەواوی خۆم، ڕێگایـەکی تـەخت و کـورت و ئاسـانم لە ڕێژنەی قورئانی پیرۆزەوە دۆزیوەتەوە، کە بریتی‌یە لە ڕێی:

(کۆڵەواری، هەژاری، شەفەقەت، بیرکردنەوە).

بەڵێ، "کۆڵـەواری"(العجز) وەك عیشـق وایـە، ڕێ‌یەکـە مـرۆڤ بـە خـوای گـەورە دەگەیـەنێت، بـەڵکو ڕێگایەکـە لـە عیشـق سـەلامەتتر و نزیکـترە، چونکـە لـە ڕێـی "بەندایەتی"یەوە مرۆڤ دەگەیەنێتە "مەحبووبییەت".

"هـەژاری"ش وەهایـە، مـرۆڤ بـە نـاوی پـیرۆزی "الرحـمن"ی خـوای گـەورە دەگەیەنێت.

"شەفەقەت"یش بە هەمان جۆر وەك عیشق وایە، مرۆڤ بە خوای گەورە دەگەیەنێت، بەڵکو لە عیشق تیژڕەوترە و مەوداکەشی لەو فراوانترە، چونکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ناوی پیرۆزی "الرحیم"ی خوای گەورە.

"بیرکردنـەوە"ش وەك عیشـق وایـە، تەنانـەت لـەویش بـەپێزترە و ڕووناکی‌یەکەشـی درەوشاوەترە و ڕێ‌یەکی گەلـێ بـەرینترە. چونکـە ڕێبـواری ئـەو ڕێ‌یـە دەگەیەنێتـە نـاوی پیرۆزی "الحکیم"ی خوای گەورە.

ئەم ڕێ‌یە جیایە لەوەی کە لە "دە" هەنگاو پێکهاتووە و ڕێبوارانی ڕێی نهێنی(الخفـاء) گرتوویانەتەبەر.. هـەروەها جیایشـە لـەوەی کـە لـەڕێی ئاشکرا(الجـهر)دا دەیگرنەبـەر و بریتی‌یە لە "حەوت" هەنگاو بەپێی ژمارەی حەوت دەروونەکان..

ئەم ڕێ‌یە بریتی‌یە لە تەنـها "چوار" هـەنگاو، ڕاستی‌یەکی شەرعیشە زیـاتر تـا ئـەوەی تەریقەتێکی سۆفی‌یانە بێت.

با بە هەڵەدا نەچن، مەبەست لە: قسوور و کۆڵەواری و هەژاری ئەوەیە کە هەموو ئەمانە تەنها لە بەردەم خواوەندی مەزندا دەربڕڕێن، نەك لە بەردەم خەڵکیدا.

ویرد و زیکرەکانی ئەم ڕێیەش ئەمانەی خوارەوەن:

* شوێنپێ هەڵگرتنی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ.

* ئەنجامدانی فەرزەکان، بە تایبەتی بەجێهێنانی نوێژ بە ڕێکوپێکی و، خوێندنی زیکرەکانی دوایان.

* دەست هەڵگرتن لە گوناهە گەورەکان.

سەرچاوەکانی ئەم هەنگاوانەش لە قورئانی پیرۆزدا، ئەمانەن:

﴿فلا تُزكّوا أنفسَكُم﴾ (النجم:٣٢) ئاماژە بۆ هەنگاوی یەکەم دەکات..

﴿ولا تكُونوا كالّذين نسُوا الله فأنساهُمْ أنفُسَهم﴾ (الحشر:١٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی دووهەم دەکات..

﴿ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أَصابَك من سَيِّئَةٍ فمن نفسِك﴾ (النساء:٧٩) ئاماژە بۆ هەنگاوی سێهەم دەکات..

﴿كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَه﴾ (القصص:٨٨) ئاماژە بۆ هەنگاوی چوارەم دەکات.

ڕوونکردنەوەی ئەم چوار هەنگاوە - زۆر بە کورتی - بەم جۆرەیە:

هەنگاوی یەکەم: وەك ئایەتی: ﴿فلا تُزكّوا أنفسَكُم﴾ ئاماژەی بۆ دەکات، بریتییە لەوەی: "نەفس" بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت. چونکە مرۆڤ، بەپێی سروشت و فیترەتی، ڕاستەوخۆ و لەپێشدا تەنها خۆی خۆش دەوێت و لە پێناویدا هەموو شتێك بەخت دەکات و بە چەشنێك بە شان و باڵای خۆیدا دەخوێنێت و مەدحێکی وای دەکات کە تەنها شایستەی خواوەند بێت و، هەردەم خۆی بە خاوێن لە قەڵەم دەدات، تەنانەت هیچ کەموکووڕییەکی بۆ ڕەوا نابینێت و بەرگرییەکی توندی تا ڕادەی پەرستنی لێ دەکات. وەك بڵێی هەموو ئەو ئامێرانەی خوای گەورە بۆ ستایش و پاك ڕاگرتنی خواوەند لەو مرۆڤەدا دایناون، ئەو مرۆڤە دەچێ بۆ خۆی بەکاریان دەهێنێت! بەم جۆرە ڕووبەڕووی ئەو وەسفە دەبێتەوە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیکات: ﴿مَنِ اتَّخذَ إلهَهُ هَواهُ﴾ (الفرقان:٤٣). بەم جۆرە دووچاری لەخۆ ڕازی بوون و لەخۆ بایی‌بوون دەبێت و، پێویستی بەوە دەبێت کە پاکژ بکرێت.. جا پاکژکردنی دەروونی مرۆڤ لەم هەنگاوەدا بەوە دەبێت کە بە پاك نەزانرێت و بە خاوێن لە قەڵەم نەدرێت!

هەنگاوی دووهەم: ئەو دەرسەیە كە لەم ئایەتە پیرۆزەوە وەردەگیرێت:

﴿ولا تكُونوا كالّذين نسُوا الله فأنساهُمْ أنفُسَهم﴾.

ئەویش بەم جۆرە:

مرۆڤ هەردەم خۆی لەبیردەباتەوە، خۆ ئەگەر بیریش لە مردن بكاتەوە، ئەوا ڕووی ئەو مردنە بۆ غەیری خۆی وەردەچەرخێنێت و، گەر لەناوچوون و نەمانیش ببینێت، بۆ كەسانی تری دادەنێت، وەك بڵێی هەرگیز ئەو نەگرێتەوە و هیچ پەیوەندییەكی بە خۆیەوە نەبێت! هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە دەروونی بەدخوازی مرۆڤ لە كاتی بەش و پاداشت وەرگرتندا خۆی بیردەكەوێتەوە و بە توندی دەستی پێوە دەگرێت. كەچی لە كاتی كار و فرمان و خزمەتگوزاریدا خۆی لەبیردەباتەوە! كەواتە پاكژ و خاوێن و پەروەردەكردنی، لەم هەنگاوەدا، ڕەفتاركردنە بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتە. واتە: خۆلەبیرنەچوونەوە لە دەمی لەبیرچوونەوەدا. بە واتایەكی تر: خۆلەبیربردنەوە لە كاتی پاداشت وەرگرتن و، بیر لێكردنەوەشی لە دەمی خزمەتگوزاری و یادی مردندا!

هەنگاوی سێهەم: ئەوەیە كە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ دەكات كە دەفەرموێ:

﴿ما أصابَكَ مِن حَسَنَةٍ فَمِنَ الله وما أصابَكَ من سَيِّئَةٍ فمن نفسِك﴾.

چونكە هەردەم "نەفس" داخوازی ئەوەیە كە هەرچی خێر و چاكەیە بە هی خۆی دادەنێت، ئەم كارەش بەرەو شانازی كردن و لەخۆڕازی بوونی دەبات. كەواتە دەبێت، لەم هەنگاوەدا، لە: ناتەواوی و كەموكووڕی و كۆڵەواری و هەژاری بەولاوە هیچی تر لە خۆیدا نەبینێت و، هەموو چاكە و لایەنە تەواوەكانی خۆیشی بە چاكەی خواوەندی مەزنیان دابنێت و بە بەخشایشی ئەویان بزانێت و، ئیتر لە بریی شانازی و لەخۆ بایی بوون، شوكرانەبژێری دەنوێنێت و سوپاسی خواوەند دەكات.

كەواتە پاكژ كردنی "نەفس" لەم پلەیەدا لە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدایە كە دەفەرموێ:

﴿قد أفلحَ مَنْ زكّاها﴾ (الشمس:٩).

واتە بەوە دەبێت كە بزانێت تەواویی خۆی لە ناتەواوییدا و توانای لە كۆڵەواریی و دەوڵەمەندییەكەشی لە هەژارییدایە. (بەو واتایەی كە بزانێت تەواویی خۆی لەوەدایە كە تەواو نەبێت و، دەستەڵاتی لەوەدایە كە لە بەردەم خوای گەورەدا كۆڵەوار و بێ دەستەڵات بێت و، دەوڵەمەندیشی لەوەدایە كە هەژاری دەرگانەی ئەو بێت).

هەنگاوی چوارەم: ئەو وانەیەیە کە ئەم ئایەتە دەیڵێتەوە:

﴿كلُّ شيءٍ هالِكٌ إلاّ وَجْهَهَ﴾.

چونکە "نەفس" گومانی وایە کە خۆی لـە خـۆیدا سەربەسـت و سـەربەخۆیە، لەبـەر ئەوە لافی جۆرە پەروەردگاری‌یەك لـێ دەدات و، بەرامبەر پەرستراوی ڕاستەقینەی خۆی سـەرپێچیی تێدایـە. جـا هەسـتکردن بـەم ڕاسـتی‌یەی خـوارەوە مـرۆڤ لـەو بـارە ڕزگـار دەکات، ئەو ڕاستی‌یەش بریتی‌یە لەوەی کە:

هەموو شتێك لە خۆیدا و بە "واتا ئیسمی‌یەکەی" لەناوچوو، ونبـوو، تازەپەیدابوو، نەبووە. بەڵام بە "واتا حەرفی‌یەکەی" و لەو ڕووەوە کە بەپێی ئەرك و فرمـانی سـەرشـانی دەوری ئاوێنەی دەرخـەری ناوە جـوانەکانی بەدیهێنـەری مـەزن دەبینێت، ئەوا ئـەو شـتە: بینەر و بینراوە و، هەیە و بووە.

جـا پاکـژ کردنـی "نـەفس" لـەم هـەنگاوەدا بـەوە دەبێـت کـە بزانێـت: نـەبوونی لـە بوونی‌دایە و، بوونیشی لە نەبوونی‌دا! واتە: ئەگەر خۆی بینی و بوونی بە خـۆی بەخشـی، ئـەوا لـە تاریکستانی چـەندین نـەبوونی ئـەوەندە زۆر و زەبـەندەدا نوقـم دەبێـت کـە بـە ئەندازەی هەموو بوونەوەران دەبن.

بە واتایەکی تر دەڵێین: ئەگـەر لـە بەدیهێنـەری ڕاسـتەقینەی خـۆی - کـە خـوای گەورەیە - بێ ئاگا بێت و، بە بوونی خۆی بایی ببێت، ئەوا خـۆی بـە تـەنیایی و خنکـاوی دەبینێتـەوە لـە نـاوەندی تـاریکیی بێ‌کۆتـایی جودایـی و نـەبووندا، بـە چەشـنی گوڵەستێرە(اليراعة) کە تەنـها بـە ڕووناکی‌یە کزەکـەی خـۆی لـە تـاریکیی شـەوی تـاردا بجووڵێتەوە.

بەڵام کاتێ واز لە خۆویستی و لەخۆ بایی بوون دەهێنێت، بۆی دەردەکـەوێت کـە لـە ڕاستی‌دا خۆی لە خۆی‌دا شتێك نی‌یە، بەڵکو ئاوێنەیەکی درەوشـانەوەکانی بەدیهێنەری ڕاسـتەقینەیە. بـەم پـێ‌یە، لـەم ڕێیـەوە "بـوون"ێکی نـەبڕاوە و بێ‌کۆتـایی بەدەسـت دەهێنێت و، ئنجا "بوون"ی هەموو بوونەوەرانیش دەستکەوت و قازانجی دەبێت.

بەڵێ، ئەو کەسەی خوا دەدۆزێتەوە، هەموو شتێکی دەست کەوتووە، چونکە هـەموو بوونەوەران، تێکڕا، بریتین لە: درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندی مەزن!

* * *

# كۆتایی ئه‌م پاشكۆیه

ئه‌م رێگایـه‌ی كـه پێكـهاتووه لـه‌م چـوار هـه‌نگاوه: "كۆلـه‌واری و، هـه‌ژاری و، شه‌فه‌قه‌ت و، بیر كردنه‌وه" له هه‌ر بیست و شه‌ش وته‌كانی پێشـووی كتێبی "وتـه‌كان"دا، كه له: زانستی حه‌قیقـه‌ت و، راستیی شـه‌ریعه‌ت و، حیكمـه‌تی قورئـانی پیرۆز ده‌دوێـن، روون كراونه‌ته‌وه..

به‌لام لێره‌دا ته‌نها ئاماژه‌یه‌كی پوخت بۆ چه‌ند خاڵێك ده‌كه‌ین كه ئه‌مانه‌ن:

ئه‌م رێگایـه كورت‌تریـن و نزیكـترین رێیـه لـه‌چاو ئـه‌وانی‌تردا، چونكه ته‌نـها چـوار هه‌نگاوه. ئنجا ئه‌گه‌ر "كۆله‌واری" به‌سه‌ر نه‌فسدا زاڵ ببێت، ئـه‌وا راسـته‌وخۆ ته‌سـلیمی خواوه‌نـدی "به‌توانا"ی شـكۆمه‌ندی ده‌كـات. بـه‌لام گـه‌ر لـه رێگـه‌ی عیشـقدا – كـه گه‌یه‌نـه‌رترین رێیـه بـۆ لای خـوای گـه‌وره – "عیشـق" به‌سـه‌ر نه‌فسـدا زاڵ ببێـت، ئـه‌وا ده‌روونی مرۆڤ ده‌سته‌كانی له داوێنـی مه‌عشـووقی مـه‌جازی گـیر ده‌كـات و بـه‌و جـۆره ده‌مێنێته‌وه هه‌تا نـه‌مانی ئـه‌و مه‌عشـووقه‌ی ده‌بینێـت، ئنجـا ده‌گـات بـه خـۆش ویسـتراوی راسته‌قینه!

پاشـان ئه‌م رێگایـه لـه هـه‌موو ئـه‌وانی‌تر بێوه‌ی‌تـره، چونكـه "نـه‌فس" لـه‌م رێگایـه‌دا دوو چاری "شه‌ته‌حات" نـابێت و لاف و گـه‌زافی لـه توانـای خـۆی بـه‌ره‌وژوورتر لـێ نـادات، چـونكه مرۆڤ لـه‌م رێگایـه‌دا جگـه لـه: كۆلـه‌واری و هـه‌ژاری و قسـوور و ناته‌واوی، هیچی تر له نه‌فسی خۆی‌دا شك نابات، تا له سنووری خۆی لابدات!

ئه‌م رێیه جاده‌یه‌كی گه‌وره و شه‌قامێكی گشتی‌یه، چونكه مرۆڤ له‌م رێیه‌دا ناچـار نابێت بوونه‌وه‌ران بخاته "به‌ندیخانه‌وه" یان "ئیعدام"یان بكات، به وێنه‌ی رێڕه‌وانی رێگـه‌ی "وحدة الوجود"، كه بۆ مه‌به‌ستی گه‌یشتن به دڵنیایی و حوزووری قـه‌لبی، بوونـه‌وه‌رانیان له وه‌همی خۆیاندا بـه نـه‌بوو(عـدم) لـه قه‌ڵـه‌م دا و، وتیـان: "لا موجـود الا هـو".. یـان بـه وێنه‌ی رێڕه‌وانی رێی "وحدة الشهود" كـه بـۆ مه‌به‌سـتی بـه‌هره‌وه‌ربوون و گه‌یشـتنیان بـه‌و

دڵنیایییە، بوونەوەرانیان لە بەندیخانەی "بیرچوونەوە"دا بەند کـرد و، وتیـان: "لا مشـهود الا هو"!

قورئانی پیرۆز – کە ئەم چوار ڕێیەی لـێ وەرگیراوە – بـە ئاشکرا لـە ئیعدامکردنـی بوونەوەران خۆش دەبێـت و لە بەندیخانەش بەریان دەدات!

جا ئەم ڕێگایە – لەسەر ئەو ڕێبازەی قورئان – بـەو چـاوە دەڕوانێتـە بوونـەوەران کـە: ملکەچ و گوێڕایەڵی بەدیهێنـەری شـکۆمەندیانن و، لـە ڕێـی ئـەودا خزمـەت دەکـەن و، دەرخـەری درەوشـــانەوەکانی نـاوە جوانـەکانن، دەڵێـی ئاوێنـەن ئـەو درەوشـــانەوانە دەدەنـەوە و دەریاندەخـەن. واتـە ئـەم ڕێیـە بوونـەوەران بـە واتـای "حـەرفی" دەبینێـت و مامـەڵەیان لـەگەڵدا دەکات و، دووریان دەخـاتەوە لەوەی کە خاوەنی واتـای "ئیســـمی" بن و هەر بۆ خۆیان کەوتبنە خزمەت و گوێڕایەڵ بووبن.

بەم چەشنە، مرۆڤ لە بێئاگایی ڕزگاری دەبێـت و، لەسەر ڕێبازەکەی قورئانی پیرۆز بە "حوزووری بەردەوام و هەمیشەیی" دەگات و پێـی بـەهرەوەر دەبێـت. ئـەو کاتـەش لـە هەموو شتێکدا ڕێگایەك دەبینێت کە بە خوای گەورەی دەگەیەنێت.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەم ڕێگایە بە "واتای ئیسمی" ناڕوانێتە بوونەوەران، واتە بەو ڕوانینە بۆیـان نـاڕوانێت کە لە خۆیاندا و بۆ خۆیان کەوتبنە کار و گوێڕایەڵ بووبن. بەڵکو ئەم بۆڕوانینەیان لــێ دادەماڵێت و، ئەرك و فەرمانبەریی "ملکەچ بوونیان بۆ خوای گەورە" دەخاتە ئەستۆ.

* * *

# مەکتووبی سیهەم

کتێبی (إشارات الإعجاز)ە کە دانەر بە زمانی عەرەبی دایناوە و بەرگێکی سەربەخۆیە

* * *

# مەکتووبی سی و یەکەم

دابەش بووە بەسەر سی و یەك بریسکەدا لەناوەندی کۆمەڵە پەیامی (بریسکەکان)دا

* * *

# مەکتووبی سی و دووهەم

بریتیيە لە پەیامی (چەند بریسکانەوەیەك) لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی (بریسکەکان)دا

* * *

# مەکتووبی سی و سێهەم

## بریتی‌یە لە سی و سێ پەنجەرە

(ئەم وتەیە لە لایەکەوە مەکتووبی سی و سێهەم و، لە لایەکی تریشەوە وتەی سی و سێهەمە).

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣)

**پرسیار:**

تکایە بە کورتی ئەو بەڵگانەمان بۆ باس بکە، کە لە جیهانی بچووك یان گەورە (واتە: مرۆڤ یان گەردوون)دا هەن لەسەر بوون و، یەکتایی و، سیفەتە مەزنەکان و، کاروبارە پەروەردگاری‌یەکانی خواوەند، کە لەم ئایەتەدا کۆبوونەتەوە. چونکە بێ بڕوایان بە تەواوی پێیان لێ ڕاکێشاوە و بێ پەردە دەڵێن: هەتا کەی دەست بەرز بکەینەوە و بپاڕێینەوە و بڵێین:

﴿وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾؟

**وەڵام:**

ئەو سی و سێ وتەیەی لە کتێبی سۆزلەر(وتەکان)دا نووسراون، لە ڕاستی‌دا بریتین لە سی و سێ دڵۆپ لە دەریای ئەم ئایەتە پیرۆزە. لەبەر ئەوە، دەتوانن سەریان لێ بدەن و بیانخوێننەوە و بگەن بەو دڵنیایی‌یە. بەڵام لێرەدا پەنجە بۆ چەند نمێك لە دڵۆپێکی ئەو زەریا مەزنە ڕادەکێشین و، نموونەیەك دەکەین بە "سەرەتا":

ئەگەر یەکێك خاوەنی توانایەکی بێ وێنە و کارامەیی‌یەکی لەڕادەبەدەر بێت و بیەوێت کۆشکێکی مەزن بنیات بنێت، بێ گومان پێش هەموو شتێك بناغە و بنچینەکانی

ئەو كۆشكە بەوپەڕی ڕێكوپێكی و دانایی دادەمەزرێنێت و، بە چەشنێك ڕێكیان دەخات كە لەگەڵ ئەو مەبەستانەی لە پێناویاندا دروستی دەكات، گونجاو بێت. پاشان بەپێی ئەو كارامەیی و لێزانی‌یەی كە باسمان كرد بەش بەشیان دەكات و دەیانكات بە چەند ژوورێكی جیاجیا. پاشان ئەو ژوورانە بە نەخشونیگاری ڕەنگین و جوان دەڕازێنێتەوە و، ئنجا هەر سووچ و لایەكی ئەو كۆشكە بە چەندین گڵۆپی كارەبایی مەزن ڕووناك دەكاتەوە. پاشان بۆ ئەوەی چاكەكاری‌یەكانی خۆی هەردەم نوێ بكاتەوە و كارامەیی و لێهاتوویی خۆی دەربخات، شتومەكەكانی ناو كۆشك زوو بە زوو دەگۆڕێت و تازەیان دەكاتەوە. دوای ئەمانەش لە یەك بە یەكی ئەو ژوورانەدا تەلەفۆن دادەنێت تاكو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خۆیەوە بكەن و، لە هەریەكەشیاندا پەنجەرەیەك دەكاتەوە كە پلە و پایەی بڵندی ئەوی لێوە ببینرێت.

بە چەشنی ئەم نموونەیە - ولله المثل الاعلى - كردگاری مەزنیش كە هەزار و یەك ناوی خاوێن و جوانی هەیە، وەك ناوەكانی: "الحاكم، الحكيم، العدل، الحكم، الفاطر، الجليل، ليس كمثله شيء" ئەو خواوەندەی كە ویستی بە هەر شتێك ببێت دەستبەجێ ئەنجام دەدرێت، ویستی وا بووە كە درەختی مەزنی بوونەوەران و كۆشكی بێ وێنەی گەردوون بەدی بهێنێت، بناغە و بنچینەكانی ئەو كۆشكە و ڕەگەكانی ئەو درەختەشی لە شەش ڕۆژدا، بەپێی دەستوورەكانی دانایی و یاساكانی زانیاریی ئەزەلیی خۆی و بە گوێرەی دەستوورەكانی قەزا و قەدەر، بە جوانی نەخشاندووە و، بە چەشنێكی وردیش لە یەكتر جیای كردوونەتەوە و كردوونی بە چەند چین و نهۆم و لقێكی بەرز و نزم..

پاشان بەپێی دەستوورەكانی: "چاودێری" و "چاكەكاری"ی خۆی هەریەك لەو بەدیهێنراوانەی ڕێكوپێك كردووە و، پاشان هەموو شت و هەموو جیهانێكی، بەوەی لەگەڵی‌دا بگونجێ و شایستەی بێت، ڕازاندووەتەوە.. بۆ نموونە: دەبینیت ئاسمانی بە ئەستێرەكان ڕازاندووەتەوە و ڕووی زەویشی بە گوڵزار ئارایشت داوە..

پاشان گۆڕەپانی ئەو یاسایانە و ئاسۆكانی ئەو دەستووره گشتی‌یانەشی بە درەوشانەوەی ناوە جوانەكانی خۆی ڕووناك كردووەتەوە..

ئنجا بەپێی خواستی ناوی: "ڕەحمان و ڕەحیم"ی خۆی، بە هانای هەموو ئەوانەوە ڕۆشتووە كە لە دەست تەنگ پێ هەڵچنینی ئەو یاسانە هانای بۆ دەبەن. واتە خواوەند لە توێی ئەو یاسا و دەستووره گشتی‌یانەدا ئەوەندە چاكەكاری و فریاگوزاری و درەوشانەوەی تایبەتیی داناوە كە هەموو شتێك دەتوانێت لە هەموو كاتێكدا ڕاستەوخۆ

ڕووی تێبکات و داوای هەموو پێداویستی‌یەکانی لێبکات.. لە هەموو مەنزڵگاو، چین و، نهۆم و، جیهان و، لە هەموو شتێکدا چەندین پەنجەرەی کردووەتەوە کە هەر هەموویان دەڕواننە ئەو خواوەندە. واتە: "بوون" و، "یەکتایی"ی ئەو خواوەندە گەورەیە ئاشکرا دەکەن، ئەوەتا لە هەموو دڵێکدا تەلەفۆنێکی داناوە تاکو پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە خۆیەوە ببێت.

ئنجا ئێمە لێرەدا باسی ئەو هەموو پەنجەرە لەژمارەبەدەرانە ناگرینە ئەستۆ، چونکە کارێکە لە توانامان‌دا نی‌یە، بەڵکو بە زانستی گشتگیر و لە هەموو شت ئاگاداری خوای گەورەی دەسپێرین، ئەوەندە نەبێت کە "بە کورتی" ئاماژە بۆ تەنها سی و سێ پەنجەرە لەو پەنجەرانە دەکەین کە لە پرشنگدانەوەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە درەوشاونەتەوە. ئەم ئاماژانەش بوون بە "وتەی سی و سێهەم" یان "مەکتووبی سی و سێهەم". ئەمانەشمان لە سی و سێ پەنجەرەدا بە کورتی باس کرد، کە ژمارەی ویردەکانی پاش نوێژن، تاکو لە خێر و فەڕی ئەو ویردانە بەهرەمەند ببین.

ئەو کەسەش دەیەوێت بە شێوەیەکی "فراوان" لەم ڕووەوە ئاگادار بێت، ئەوا حەواڵەی هەموو وتەکانی تری دەکەین.

## پەنجەرەی یەکەم

لە هەموو بوونەوەراندا، بە تایبەتی زیندەوەرانیان، دەست کورتی‌یان دەبینرێت بۆ چەندین پێداویستیی جیاجیا و، داواکاریی لەژمارەبەدەر و جۆراوجۆر. ئنجا بێ ئەوەش بە خۆیان بزانن ئەو هەموو داواکاری و پێداویستی‌یانەیان، یەك لە دوای یەك، لە کاتی گونجاودا بۆ دەهێنرێن. ئەوەش بزانە کە دەستی ئەو بوونەوەرانە تابڵێی کورتن و هەرگیز ناگەنە نزمترین پێویستی، چ جای فراوانترین ئامانج و مەبەستیان. ئەگەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، فەرموو سەرنج لە خۆت بدە، دەبینیت: لە بەرامبەر زۆربەی پێداویستی‌یەکانی هەستە ئاشکراکانت و تێرکردنی ئارەزووەکانی دەروونتدا دەستەوسانیت و هیچ شتێکت پێ ناکرێت.. جا چۆن بەم جۆرە سەرنجت لە خۆت دا، هەر بەو جۆرە سەرنج لە بوونەوەران و زیندەوەرانی تریش بدە، دەبینیت:

هەریەك لەو زیندەوەرانە بە (لاوازیی خۆی) و بەو (پێداویستی‌یانەی کە بە بێ توانا و دەستەڵاتی خۆی بۆی ئەنجام دراون) شایەتی لەسەر خواوەندی "واجب الوجود"

دەدات و، هەر بەم لاوازی و پێداویستی‌یە ئەنجامدراوانەشی ئاماژە بۆ "یەکتایی" ئەو خواوەندە مەزنە دەکات و، بە هەموویشی بەڵگەن لەسەر "بوون"ی ئەو خوایە. وەك ئەوەی کە ڕووناکیی ڕۆژ بەڵگەی بوونی خۆرە. هەروەها ئەوەش بۆ ژیریی مرۆڤی بەویژدان ڕوون دەکاتەوە کە ئەو خواوەندە پاك و بێ گەردە، لەوپەڕی بەخشندەیی و میهرەبانی و پەروەردگاری و کارسازی‌دایە.

دەسا ئەی سەرپێچی کاری نەزان! ئەی لەڕێ لادەری بێ ئاگا!

چەندە لە بێ ئاگایی و نەزانی‌یەکی نەفرین لێکراودایت!

ئەم کارسازی‌یە بەردەوام و پڕ لە دانایی و بینایی و میهرەبانی‌یە بە چی لێك دەدەیتەوە؟

بە سروشتی کەڕو کاس؟

یان بە هێزێکی کتوکوێر؟

یان بە ڕێکەوتی هەڕەمەکی؟

یاخود بە هۆکارە بێ گیان و وشك و کۆڵەوارەکان؟

## پەنجەرەی دووهەم

لە کاتێکدا شتان لە نێوان: "بوون" و "وێنە و شکڵ و شێوەیان"دان، لە ناوەندی چەندین شیمانە و گریمانی جیاجیای لەژمارەبەدەردا سەرسام و سەرگەردانن، دەبینیت ئا لەم کاتەدا، شێوەیەکی تایبەتی و جیاجیایان پێ دەبەخشرێت کە لەوپەڕی ڕێکوپێکی و دانایی‌دایە..

سەرنجی ئەو نیشانە جیاکەرەوانەی دەموچاوی هەموو مرۆڤێك بدە، کە لە دەموچاوی گشت کەسێکی تری جیا دەکەنەوە، ئنجا لەو هەستە ئاشکرا و پەنهانانەش ورد بەرەوە کە بەوپەڕی دانایی و ناوازەیی لە مرۆڤدا دانراون.

ئایا ئەم دەموچاوە بچووکە نیشانەیەکی ئاشکرای "تەنیایی" خوای گەورە نی‌یە؟

هەروەك هەموو دەموچاوێك هەزاران بەڵگەی تێدایە لەسەر "بوون"ی بەدیهێنەرێکی دانا و هەموویان شایەتی لەسەر "یەکتایی" ئەو دەدەن، کۆی ڕووەکان و سەرجەمی دەموچاوەکانی هەموو زیندەوەرانیش بە گشتی بۆ "بەسیرەت"ی خاوەن بینایی تیژی ڕوون دەکەنەوە کە: ئەم دەموچاوانە نیشانەیەکی گەورە و مەزنی بەدیهێنەری تاکی تەنیان.

ئەی مرۆڤی سەرپێچی کار!

ئایا دەتوانیت ئەم هەموو مۆر و نیشانانەی کە هەرگیز لاسایی ناکرێنەوە.. یان ئەم نیشانە مەزنەی خواوەندی تاك و تەنیای "صەمەد"[1] کە لە تێکڕای گشت دەموچاوەکانەوە دەدرەوشێتەوە، بە کاری یەکێکی تری جگە لە بەدیهێنەری وێنەکێش و شێوەبەخشی خۆیانی دابنێیت؟

## پەنجەرەی سێهەم

جۆرەکانی ڕووەك و کۆمەڵەکانی زیندەوەران، کە بەسەر زەوی‌دا پەرش‌وبڵاون و، لە چوارسەد هەزار جۆر و کۆمەڵ زیاترن[2]، لە ڕاستی‌دا وەك سوپایەکی مەزن وان. ئەوەتا هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ئەم سوپایە ڕۆزیی خۆی کە لە هی ئەوانی تر جیایە و.. شێوەی جیاواز و تایبەتیی خۆی و.. چەکە جۆراوجۆر و پۆشاکە جیاکەرەوەکانی و.. مەشقی تایبەتی و.. تەسریح کردنی لە خزمەت بە چەشنێکی جیاواز لەوانی تر.. هەموو ئەمانەی لە دوو توێی ڕێسا و نەخشەبۆکێشانێکی ورددا بۆ ئەنجام دەدرێت.

بەڕێوەبردنی ئەم سوپا مەزنە و، پەروەردەکردنی یەك بە یەکیان، بێ لێ‌تێکچوون و لەبیرچوونەوەی هیچ کەسێکیان، نیشانەیەکی درەخشانی وەك خۆر وایە لەسەر خواوەندی "تاکی تەنیا".

کێ هەیە بتوانێت بۆ مەبەستی دەست‌تێوەردان و هاوبەشی کردن لەم بەڕێوەبردنە دەراسا(خارق)یەدا دەست بباتە پێشەوە، جگە لەو خاوەنە بەتوانایەی خۆی، کە توانا و زانیاری و دانایی ئەو، سنوور و کۆتایی‌یان بۆ نی‌یە؟ چونکە کەسێك لە بەڕێوەبردن و پەروەردە کردنی ئەم هەموو جۆرە تێهەڵکێش و نەتەوە ئاوێتە و تێکەڵانەدا، کۆڵەوار و دەستەپاچە بێت، دیارە بە یەکجاری لە بەدیهێنانی یەکێکیشیاندا دەستەوسان و کۆڵەوار دەبێت. چونکە ئەگەر دەستی لە هەرکام لەوانە وەربدایە، ئەوا جێ‌دەستی دەبینرا و ناتەواوی‌یەکەی دەردەکەوت:

---

(١) صەمەد: ناوێکی تایبەتیی خواوەندە، واتە: ئەو کەسەی کە تەنها ئەو مایەی هیوا و جێی مەبەستە لە ئەنجامدانی پێویستی‌یەکاندا. (وەرگێڕ)

(٢) تەنانەت ژمارەی بەشێکی ئەو تاقمانە، هەر تەنها لە ماوەی ساڵێکدا، لە ژمارەی مرۆڤ، لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە - دروودی لەسەر بێت - تا ڕۆژی دوایی، گەلێ زیاترن. (دانەر)

﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾ (الملك:٣).
خۆ دیارە هیچ کەلێن و ناتەواوی‌یەکی تێدا نابینین، کەواتە هیچ هاوبەشێکی نی‌یە.

## پەنجەرەی چوارەم

خواوەندی بەدیهێنەر، هەموو ئەو نزا و لالانەوانە گیرا دەکات کە لە زمانی لێهاتن و ئامادەیی تۆوەکان و، زمانی پێداویستی‌یەکانی زیندەوەران و، زمانی ناچاریی هانابەرانی گرۆی مرۆڤەوە دەردەچن..

بەڵێ.. گیرابوونی ئەم هەموو نزا و پاڕانەوە لەسنووربەدەرانە، کە لە ڕاستی‌دا ڕوو دەدەن، کارێکە لە بەرچاوماندایە و بە ئاشکرا دەیبینین.

جا هەروەك گیرابوونی یەك بە یەکی ئەو نزایانە ئامازە بۆ: "بوون"ی خواوەندی "واجب الوجود" و "یەکتایی" ئەو دەکات، تێکڕای هەموویشیان بە جۆرێکی ڕوون و ئاشکرا و، بە پێوەرێکی مەزن و فراوانتر، بەڵگەن لەسەر: بەدیهێنەری میهرەبانی دەست ڕەنگینی گیراکاری نزا و لالانەوەکان و، هەموویان پێکەوە سەرنجی بینەران بۆ لای ئەو خواوەندە ڕادەکێشن.

## پەنجەرەی پێنجەم

ئەگەر بە وردی سەرنج لە شتان، بە تایبەت زیندەوەران بدەین، وایان دەبینین کە وەك هەر ئێستا لە دەستی "بەدیهێنان" دەرهاتبن و لە پڕدا هاتبنە جیهانی "بوون".

جا لە کاتێکدا کە ئەو شتانەی بە پەلە و کتوپڕی پەیدا دەبن، دەبێ ساکار و هەڵبزرکاو بن و، شێوە و ڕوخساریان ناشیرین و قەبە و ناقۆڵا بێت و، هیچ وردەکاری‌یەکیشیان تێدا نەبێت، کەچی دەبینین: لە جوانترین و وردترین و ناوازەترین شێوەی دروستکردندا بەدی دەهێنرێن! دیارە ئەمەش داخوازی بوونی کارامەیی‌یەکی لەڕادەبەدەرە.

هەروەها دەیانبینین:

لە جوانترین نەخشونیگار و وردترین شێوە و ڕوخساردان، کە ئەمانەش پێویستیان بە ئارامگرتنێکی مەزن و کاتێکی دوور و درێژخایەن دەبێت.

هەروەها دەیانبینین:

لـە ڕازاوەیی و جوانییەكی سەرنج ڕاكێشدان، كە ئەمانەش داخوازی چەندین ئامێری ئارایشتكاریی زۆر و جۆراوجۆرن.

جا هەریەك لەم وردەكارییە نائاساییو.. ڕوخسارە ناوازەو.. شێوە ڕێك كراوو.. بەدیهێنانە یەكسەرییانە.. شایەتی لەسەر دروستكەر و بەدیهێنەرێكی دانا دەدات و، ئاماژە بۆ "یەكتایی" ئەو دەكات و، هەر هەموویشیان پێكەوە، بە ڕوونی، خواوەندی "واجب الوجود"ی خاوەن توانا و داناییمان بۆ ئاشكرا دەكەن و، "یەكتایی" ئەو دەردەخەن.

دەسا ئەی مرۆڤی بێئاگا لە پەروەردگاری خۆی و سەرگەردان و حەپەساو لە بارەی بوونەوەرانەوە!

ئەم كارە بە چی لێك دەدەیتەوە؟ ئایا بە سروشتی كوێلەواری دەبەنگی نەزان؟ یان دەتەوێت ـ بە هۆی نەزانیتەوە ـ هەڵەیەكی لەئەندازەبەدەر بكەیت و سیفەتەكانی خوایەتیی خواوەند بە "سروشت" بدەیت و، بەم پێیە هەرچی موعجیزاتی توانستی ئەو بەدیهێنەرە مەزن و پاك لە هەموو نەنگی و ناتەواوییە هەن، بە هی سروشتیان دابنێیت و، بەم پێیە بە هەزار و یەك مەحاڵ ڕازی بییت؟

## پەنجەرەی شەشەم

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمواتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾(البقرة:١٦٤).

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەروەك "بوون"ی خوای گەورە ڕوون دەكاتەوە و بەڵگەیە لەسەر "یەكتایی" ئەو، لە ڕاستیدا پەنجەرەیەكی گەلێ فراوان و گەورەشە و، لە نێوان ناوە جوانەكانی خواوەندا بەسەر "ناوی هەرەمەزن"(الاسم الاعظم)دا دەڕوانێت.

پوختەی ئەمەش بەم جۆرەی خوارەوەیە:

هەرچی جیهانە بەرز و نزمەكانی ناو بوونەوەر هەن، هەموویان بە چەندین زمانی جیاجیا بەڵگەن لەسەر یەك ئەنجام، كە پەروەردگارێتیی بەدیهێنەرێكی دانای تەنیایە، بەم جۆرە:

ڕۆشتنی "تەنە ئاسمانی‌یەکان" بەوپەڕی ڕێکوپێکی، بەرەو چەندین مەبەستی مەزن و ئەنجامی بەرز - بەپێی بڕیاری زانستی گەردووناسی - بەڵگەیە لەسەر "بوون"ی خوایەکی خاوەن توانای شکۆمەند و، کارێکە شایەتی لەسەر "یەکتایی" و "پەروەردگاریتی‌یە تەواوەکەی" ئەو خواوەندە دەدات.

هەروەها ئەو ئاڵوگۆڕە ڕێکوپێکەی "زەوی" کە لە وەرزەکانی‌دا دەبینرێن، لە پێناوی چەندین سوود و بەرژەوەندیی گەورە و زۆردا - کە زانستی جوگرافیا دانیان پێدا دەنێت - بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەو خاوەن توانا شکۆمەندە و، شایەتی "یەکتایی" و "پەروەردگاریتی‌یە تەواوەکەی" ئەوە.

پاشان ئەو هەموو "زیندەوەرانەی" کە وشکایی و دەریاکانیان پڕکردووە و، بەپێی میهرەبانی‌یەکی فراوان ڕۆزی بۆ یەك بە یەکیان دەنێرڕێت و، چەندین پۆشاکی جۆراوجۆریان بەپێی دانایی‌یەکی تەواو لەبەر دەکرێت و، بە گوێرەی نەخشەی پەروەردگاریتی‌یەکی تەواویش چەندین هەستی جیاجیایان پێ دەدرێت.. هەریەك لەمانە، ئاماژە بۆ ئەو خواوەندە بەتوانا شکۆمەندە دەکات و، دەبێ بە شایەت لەسەر "یەکتایی" ئەو. هەروەك هەموشیان پێکەوە و بە پێوەرێکی یەکجار فراوانتر، بەڵگەن لەسەر "مەزنیی خوایەتی" و "کەماڵی پەروەردگاریتی"ی ئەو خواوەندە شکۆمەندە.

"ڕووەکەکان"یش کە لەسەر زەوی و باخ و ڕەز و بێستانەکاندا بەوپەڕی هاوسەنگی و ڕێکوپێکی بڵاو دەکرێنەوە و وەك ڕایەخ دادەخرێن، بە هەمان جۆر، هەریەکەیان بەڵگەیە لەسەر ئەو بەدیهێنەرە دانایە و ئاماژە بۆ "یەکتایی" ئەو دەکات، بەهۆی ئەو گوڵە جوانانەی دەیانگرن و، ئەو بەروبوومە هاوسەنگانەی کە ئەم گوڵانە بەرهەمیان دەهێنن و، ئەو نەخشونیگارە ڕەنگینانەش کە بەسەر بەروبوومەکانیانەوەن..

جا هەروەك یەك بە یەکیان بەڵگەی "بوون" و "یەکتایی" ئەو بەدیهێنەرە مەزنە بوون، هەموویشیان پێکەوە "جوانیی میهرەبانی" و "کەماڵی پەروەردگاریتی"ی ئەو دەردەخەن.

پاشان ئەو "دڵۆپە بارانانەی" کە بۆ چەندین دانست و ئامانجی بەرز و بڵند و سوودی گەورە و گرنگ ڕام و گوێڕایەڵ کراون و، لە هەورەکانی ئاسمانەوە نێرراون، بە ئەندازەی ژمارەیان، بەڵگەن لەسەر ئەو بەدیهێنەرە دانایە و، شایەتن لەسەر "یەکتایی" و "تەواویی پەروەردگاریتی"یەکەی.

هەروەها "چیا" سەختەكانیش و، كانزاكانی ناویان و، تایبەتكاریی هەریەك لەو كانزایانە و، ئەو ئامانجە جۆراوجۆرانەش تیایاندا پاشەكەوت كراوە و بۆ چەندین ئامانج و بەرژەوەندیی زۆر ئامادە كراون.. هەر یەكەیان یەك بە یەك و، هەر هەموویشیان پێكەوە، بەڵگەیەكی لە چیاكان بەهێز و سەنگینترن لەسەر بەدیهێنەری دانا و "یەكتایی" و "تەواویی پەروەردگاریێتی"یەكەی.

پاشان هەموو جۆرەكانی ئەو "گوڵ"ە ڕەنگین و ناسكۆڵە و جوانانەی كە بەسەر دەشتایی و تەپۆڵكە و بەرزییەكاندا پەرش و بڵاون و، جوانییان بەو دەشت و سارا و بەرزاییانە بەخشیوە، هەریەكەیان بەڵگەیە لەسەر ئەو بەدیهێنەرە دانایە و شایەتە لەسەر "یەكتایی" ئەو. هەروەك هەموویشیان، بە گشتی، بەڵگەن لەسەر "مەزنیی دەستەڵاتداری" و "تەواویی پەروەردگاریێتییەكەی" ئەو.

پاشان "گەڵاكان" و شێوە ڕێككراوەكانیان و، لەرەلەرە لەسەرخۆ و نەرم و سەرنج بزوێنەكانیان، لە سەرجەمی ڕووەك و درەخت و گژوگیاكاندا، چ بە شێوەیەكی گشتی و چ بە ئەندازەی ژمارەی یەك بە یەكیان، شایەتن لەسەر ئەو بەدیهێنەرە دانایە و، "یەكتایی" و "تەواویی پەروەردگاریێتی"یەكەی.

پاشان "گەشەكردنی لەشەكان" بە چەند هەنگاوێكی ئامانجدار و بەردەوام و، دابین بوون و ئامادەكردنی چەندین ئامێری جۆراوجۆر بۆ هەریەكەیان و، پێكەوە ڕۆشتنی هەموویان بەرەو پێكهێنانی ئەنجام و بەروبوومەكانیان بە چەشنێكی ئەوەندە ئامانجدار كە دەڵێی دارای هەست و شعوورن.. ئەمەی باسمان كرد، وا لە یەك بە یەكی ئەو لەشە گەشەسەندووانە و تێكڕایشیان - بە گشتی - دەكات كە بەڵگە بن لەسەر ئەو بەدیهێنەرە دانایە و، ئاماژە بن بۆ "یەكتایی"یەكەی و، بەڵگەیەكی مەزنتریش بن لەسەر توانستی گشتگیر(المحیط) و، دانایی گشتی و، بەدیهێنانی جوان و، پەروەردگاریێتیی تەواوی ئەو.

پاشان دانانی "دەروون" لە جەستەدا و، جێگیر كردنی "گیان" لە هەموو زیندەوەرێكدا بەوپەڕی دانایی و، پڕچەك كردنی هەریەك لەو زیندەوەرانە بە چەندین چەكی جۆراوجۆر و پێداویستیی جیاجیا، بە ڕێكوپێكییەكی تابڵێی تەواو، ئنجا ئاراستە كردنی ئەو زیندەوەرانە بەرەو چەندین كاری مەزن و، بەكارهێنانیان بە دانایی لە چەندین فەرمانبەریی جۆراوجۆردا.. هەموو ئەمانە، بە ئەندازەی ژمارەی زیندەوەران، بەڵكو بە

ئەندازەی ژمارەی ئامێر و ئەندام و كۆئەندامیان، ئاماژە بۆ "بوون"ی ئەو بەدیهێنەرە دانایە دەكەن و، شایەتی لەسەر "یەكتایی" ئەو دەدەن. هەروەك هەموویشیان بە یەكەوە بەڵگەیەكی ڕووناكن لەسەر جوانیی میهرەبانی و، تەواویی پەروەردگاریێتیی ئەو.

ئەو گشت "ئیلهامە غەیبی‌یانەی" كە ڕێنمایی دڵی مرۆڤ دەكەن و، زانست و ڕاستی‌یەكانی تێدەگەیەنن و، زیندەوەرانی تریش فێری ئەوە دەكەن كە ڕێگای پەیدا كردن و ئەنجامدانی پێویستی‌یەكانیان بدۆزنەوە.. ئەم ئیلهامە غەیبی‌یانە، بە گشت جۆرە جیاجیاكانیانەوە، هەموو كەسێكی خاوەن دڵی ڕووناك و بینا وا لێ دەكەن كە هەست بە "بوون"ی پەروەردگارێكی میهرەبان بكات و، هەر ئەم ئیلهامانە ئاماژە بۆ پەروەردگاریێتیی ئەو خواوەندە دەكەن.

پاشان هەموو "هەست و شعوور"ە جۆراوجۆر و، جیاجیا و، ئاشكرا و پەنهانەكان، كە گوڵەچنیی گوڵزارە مەعنەوی‌یەكانی باخ و بێستانانی ناو گەردوون دەكەن، كە هەر یەك لەو هەستانە كلیلی یەكێك لە جیهانە جیاجیاكانی گەردوونی بەرینن.. وەك خۆری ئاسمان، بەڵگەن لەسەر "بوون"ی دروستكەرێكی دانا و زانا و ڕۆزیدەر و بەخشندە و بەدیهێنەرێكی میهرەبان و، شایەتن لەسەر "تاك و تەنیایی" و "تەواویی پەروەردگاریێتی"ی ئەو.

* * *

هەریەك لەم دوازدە پەنجەرەیە، ڕوویەكی پەنجەرەیەكی گەلێ فراوان دەنوێنن، كە بە دوازدە ڕەنگ لە ڕەنگەكانی "ڕاستی" دەبن بە بەڵگە لەسەر:

"یەكتایی" خوای گەورە و تەنیایی و تاكی و تەواویی پەروەردگاریێتیی ئەو.

دەسا ئەی باوەڕنەكەر و بەدرۆخەرەوەی بەدبەخت!

چۆن دەتوانیت ئەم پەنجەرەیە دابخەیت كە بە ئەندازەی مەزنیی زەوی، بەڵكو بە ئەندازەی گەورەیی و فراوانیی "سووڕگە" ساڵانەكەی زەوی، بەرین و فراوانە؟

بە چ شتێك دەتوانیت سەرچاوەی ئەم ڕووناكی‌یە ئاشكرا و خۆرئاسایە بكوژێنیتەوە و، بە چ پەردەیەكی بێ ئاگایی دەتوانیت دایبپۆشیت؟!

## پەنجەرەی حەوتەم

ئەوانەی بە ئاشكرا لەسەر لاپەڕەكانی گەردووندا دەبینرێن، لە دیاردەكانی: ڕێكوپێكی و هاوسەنگیی تەواو..

وێنەكانی ئارایشتكاری و جوانی كە تیایدا پێكدێن..

ئەو ئاسانی‌یە لەڕادەبەدەرەی كە لە هاتنەبوون و ژیان دەستخستنیاندا دەبینرێت..

ئەو لەیەكتر چوونەیان لە ڕووی ڕوالّەت و چییەتی‌یەكانیانەوە، چ جای یەكبوونیان لە گوێڕایەڵی كردنی دیاردە گەردوونی‌یەكاندا..

هەریەك لەم دیاردە و تایبەتكاری‌یانە، بەڵگەیەكی فراوانی بە ئەندازەی گەردوونە لەسەر: بەدیهێنەری بەتوانا و، شایەتێكی ڕاستگۆ و گومانبڕە لەسەر "تەنیایی" و "توانای ڕەها"ی ئەو.

پاشان "بەدیهێنانی چەندین پێكهاتووی" ڕێكوپێك و لەژمارەبەدەر، لە چەندین توخمی وشكی "سادە پێكهاتوو"، بەڵگەیەكی گومانبڕە - بە ئەندازەی ژمارەی ئەو پێكهاتووانە ـ لەسەر ئەو بەدیهێنەرە بەتوانا و "واجب الوجود"ە و.. بە ئاشكرا ئاماژە بۆ "یەكتایی" ئەو دەكات. سەرەڕای ئەوەی كە هەمووشیان، بە گشتی، "تەواویی توانست" و "یەكتایی" ئەو بەدیهێنەرە بە ئاشكرا ڕوون دەكەنەوە.

پاشان ئەو "جیاكاری‌یە" ڕوون و "جیابوونەوە" تەواوەی كە لە كاتی تازەبوونەوەی بوونەوەراندا، بەهۆی شیتەڵ بوون و پێكهاتنەوە، دەبینرێن، هەرچەندەش ئەو بوونەوەرانە تابڵێی تێكەڵ و ئاوێتەی یەكترین.. بەڵگەیەكی ڕوونە لەسەر ئەو دانایەی كە خاوەنی دانایی‌یەكی ڕەهایە و، ئاماژەش بۆ "پێویستیی بوونی" و "تەواویی توانست"ی ئەو دەكات.

بۆ نموونە:

گوڵ كردنی ئەو دەنكە دانەوێڵانەی كە لەناو خاكدا چێنراون و، گەشەسەندنی بنجی درەختەكان و، پاشان بوونیان بە چەندین ڕووەك و درەختی جیاجیا، هەرچەندەش كە تێكەڵی یەكترین و بەیەكتردا ئاڵاون..

هەروەها جیابوونەوەی ئەو مادده جیاوازانەی كە دەچنە ناو ڕووەك و درەختە جۆراوجۆرەكانەوە و، پاشان بوونیان بە چەند گەڵا و ڕەنگێكی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و چەندین میوە و بەروبوومی ناسك و قەشەنگ، وێڕای تێكەڵیی لەڕادەبەدەری نێوانیشیان..

تەنانەت جیابوونەوە و بەش بەش بوونی مادده هەرە وردەكانی خۆراك كە بە دانایی‌یەكی تەواوەتی و تەرازووكاری‌یەكی ورد دەچنە ناو خانەكانی لەشی زیندەوەرەوە، هەرچەندە تێكەڵ و ئاوێتەی یەكتریشن..

پاشان ژێربارخستن و ڕامکردنی "گەردیلە" بێ گیان و کۆڵەوار و نەزانەکان بۆ ئەنجامدانی چەندین ئەرك و فرمانی ئەوتۆ کە لەوپەڕی ڕێکوپێکی و هەست و توانایی و دانایی‌دان و، کردنی جیهانی "گەردیلە" بە چەشنی کێڵگەیەکی مەزنی وا کە بە جۆرێکی دانایانە چەندین جیهانی تێدا بڕوێنرێت و چەندەهای تریشی تێدا دروێنە بکرێت..

هەموو ئەمانە، چەند بەڵگەیەکی ڕوونن لەسەر: پێویستیی "بوون"ی ئەو "خاوەن توانسته شکۆمەند و بەدیهێنەرە خاوەن کەماڵە" و، شایەتێکی بەهێزن لەسەر "تەواویی توانست" و "مەزنیی پەروەردگاری" و "یەکتایی" و "تەواویی پەروەردگاریی" ئەو خواوەندە بەتوانا و شکۆمەندە.

بەم جۆرە، ئەم چوار ڕێگا فراوانە، دەمانگەیەننە بەردەم پەنجەرەیەکی تابلێی گەورە کە لە ڕووی ناسینی خوای گەورەدا کراوەتەوە، چونکە لەوێوە چاوی ژیریی تیژ سەیری "بوون"ی بەدیهێنەری دانا دەکات.

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە "گومڕایی" بەدبەختی کردووە!

ئایا ئەو بەڵگانەی بینیتن سەروزیاد نین بۆ ئەوەی کە بەدیهێنەری خۆت بناسیت و، مەزنی و دانایی‌یەکەی ببینیت؟

وا گومان نابەم سەرپێچی بکەیت لەمانەی کە بینیتن.

خۆ ئەگەر دوای بینینی ئەم هەموو بەڵگانە هەر سەرپێچی بنوێنیت، ئەوا خاکت بەسەر بۆ خۆت و ئەو ژیری‌یەت کە لە ئەندازەی تێگەیشتنی ئاژەڵ بەولاوە هیچی‌تر تێناگات و، لەو مەودایەش زیاتر بڕ ناکات!

## پەنجەرەی هەشتەم

هەموو پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - کە خاوەنانی "گیان"ی ڕووناکن لە بەرەی مرۆڤدا و، چەندین موعجیزەی ڕوون و ئاشکرا پشتیان دەگرن..

هەروەها گشت ئەولیاکان کە تەوەرەی هەموو دڵە ڕووناکەکانن و، کەشف و کەرامەتەکانیان پشتیان دەگرن..

هەروەها هەموو زانا پاك و بێ گەردەکان کە خاوەنی ژیریی ڕوونن و، لێکۆڵینەوە زانستی‌یەکانیان پشتیان دەگرن..

هەرهەموویان شایەتن لەسەر:

"پێویستیی بوون"ی خواوەندی تاك و تەنیا و بەدیهێنەری هەموو شتێك و، بەڵگەن لەسەر: "تەواویی پەروەردگاریتی" و "یەکتایی" ئەو خوایە.

ئەم پەنجەرەیە تابڵێی فراوان و ڕووناکە و، هەردەم کراوە و لەسەر پشتە بۆ پیشاندانی ئەو پلە بەرزەی پەروەردگاریتی.

دەسا ئەی سەرگەردانی داماوی سەرپێچی کار!

بەچیدا دەنازیت و شانازی بە چیەوە دەکەیت تا گوێ لەم ڕاستییانە نەگریت؟ لەوانەیە وا گومان ببەیت کە بە چاونووقاندنت دەتوانی ڕۆژی ڕووناك بکەی بە: شەو.. خەیاڵت خاوە!

## پەنجەرەی نۆهەم

ئەو پەرستشانەی کە تێکڕای بوونەوەران ئەنجامی دەدەن، بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر "پەرستراوێکی" خاوەن توانستی ڕەها.

بەڵێ، ئەو پەرستش و بەندایەتییەی هەموو مەلائیکەت و ڕۆحانییان دەیانکەن، کە ئەمەش بە شایەتیدانی هەموو ئەو مرۆڤانە چەسپاوە کە بۆ: جیهانی "ڕۆح" پەڕیونەتەوە و چوونەتە ناو ناخی نادیاری "بوون" و، لەوێ بە مەلائیکەت و ڕۆحانییان گەیشتوون و، لە کاتی تەسبیحات و خواپەرستییاندا بینیویانن..

هەروەها کە زیندەوەران - هەرچییەك بن - ئەو ئامانج و کار و ئەرکانەی لە پێناویاندا بەدی هێنراون، بە ڕێکی و تەواوی ئەنجام دەدەن و وەك بەندەی فەرمانپێدراو فەرمانەکانی خواوەند جێبەجێ دەکەن..

هەروەها کە تەنە بێگیانەکان(الجمادات) بە تەواوترین گوێڕایەڵی، خزمەتگوزارییەکانی بەندایەتییان ئەنجام دەدەن..

هەموو ئەم بەندایەتی و پەرستنە ئاشکرا و بینراوانە، ئاماژە بۆ "پەرستراوی ڕاستەقینە" و "واجب الوجود" و "یەکتایی" ئەو دەکەن.

ئنجا هەموو "زانستە ڕاستەکانی خواناسین" کە خواناسان لە ئەنجامی ئیخلاس و بێگەردییان لە خواپەرستیدا دەستیان کەوتووە و.. ئەو شوکرانەبژێرییە بەردارەی کە لە ناخی دڵی شوکرانەبژێرانەوە هەڵقوڵاوە و.. ئەو زیکرە ڕووناکانەی کە زمانی زیکرخوێنانی پێ تەڕ و پاراو بووە و.. ئەو سوپاسگوزارییە نیعمەت زیادکەرەی کە سوپاسگوزاران هەمیشە دەری دەبڕن و.. ئەو یەکتاپەرستییە ڕاستەقینەیەی کە بە

ئایەتەکانی گشت بوونەوەران تەسدیق کراوە و یەکتاپەرستان بڵاوی دەکەنەوە و.. ئەو خۆشەویستی‌یە ڕاستەی خواوەندیش کە خۆشەویستان و عەودالان برەوی پێ دەدەن و.. ئەو ئارەزوومەندی‌یە بێ گەردەی خواویستان بۆ خواوەند و لێبڕانیان لە ڕۆیشتندا بۆ لای خوای گەورە و.. ئەو گەڕانەوە و پەشیمانی‌یە ڕاست و بارە خەمناکانەی ئەوانەی بۆ لای خواوەند دەگەڕێنەوە..

ئەم دیاردانەی کە لە هەموو ئەوانەوە دەرکەوتوون و، کە هەریەکەیان هێزی تەواتور و ئیجماعی لە پشتە، بەڵگەیەکی بەهێزن لەسەر:

پێویستیی "بوون"ی ئەو: پەرستراوە ئەزەلی و.. ناسراو و.. یادکراو و.. شوکرانەبۆکراوو.. سوپاسکراو و.. تەنیا و.. خۆشەویست و.. داواکراو و.. جێی مەبەستە. ئنجا هەمووشیان بەڵگەن لەسەر: "تەواویی پەروەردگاریتی" و "یەکتایی" ئەو.

پاشان هەموو بەندایەتی و پەرستشە قبووڵ بووەکانی مرۆڤە پێگەیشتووەکان و، ئەو لێشاوی فەڕ و بەرەکەت و نزا و پاڕانەوانە و، بینین و کەشف بوونەی لە بەندایەتی و خواپەرستیی ئەو مرۆڤانەوە پەیدا دەبن، هەر هەموویان، بەڵگەیەکی تابڵێی بەهێزن لەسەر ئەو خواوەندەی کە "هەیە" و "هەر دەشبێت" و "پەرستراوی هەمیشەیی"یە.. هەروەها لەسەر: "یەکتایی" و "تەواویی پەروەردگاریتی‌یەکەی".

ئەم پەنجەرە ڕوون و هەرە فراوانە، لە سێ لایەنەوە، لە ڕووی "یەکتایی" خواوەندەوە والا دەبێت.

## پەنجەرەی دەهەم

﴿... وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَلَكُمُ الأَنْهَارَ ۞ وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۞ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَاسَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللهِ لا تُحْصُوهَا﴾(ابراهيم:٣٢-٣٤).

کۆمەکی و هاوکاریی بوونەوەران و بەدەم یەکەوە چوونی نێوانیان و پشتگیری کردنی یەکتریان لە کار و فەرمانبەری و ئەرکی سەرشانیاندا.. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم هەموو بوونەوەرانە لە ژێر چاودێری و پەروەردە کردن و فەرمان و دەستەڵاتی یەك پەروەردگار و کارسازی تاك و تەنیادان.

ئەم یاسای: "کۆمەکی و هاوکاری"یەی ناو بوونەوەران، هەر لە خۆرەوە، کە بە فەرمانی خوا پێداویستییەکانی ژیان بۆ زیندەوەران ئامادە دەکات و، لە مانگەوە کە کاتەکانمان فێر دەکات، دەگرێتەوە، تا دەگاتە: فریاگوزاریی ڕووناکی و ئاو و هەوا و خۆراك بۆ گیانلەبەران و، بەدەمەوە ڕۆشتنی ڕووەك بۆ زیندەوەران و زیندەوەرانیش بۆ مرۆڤ، تەنانەت یارمەتیدان و بەدەمەوە چوونی هەریەك لە ئەندامەکانی لەش بۆ ئەوانی تر و، گەردیلەکانی خۆراك بۆ خانەکانی لەش..

ملکەچ بوونی ئەم هەموو بوونەوەرانە بۆ یاسای: "کۆمەکی و هاوکاری" و، پەیوەندیی بەدەم یەکەوە چوون و لەیەك گەیشتنی نێوانیان بەوپەڕی دانایی و لەخۆبوردەیی و بەخشندەیی و دەستڕەنگینی و، ئنجا هەوڵدانی یەك بە یەکیان بۆ فریاگوزاری و ئامادە کردنی داخوازییەکانی ژیان بۆ ئەوانی تر و ڕاپەڕینیان بۆ نەهێشتنی پێداویستیی یەکتر، لە ژێر فەرمانی یاسای کەرەم و میهرەبانی و بەزەییدا.. هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هەر هەموویان چەند بەدیهێنراوێکی ژێر دەست و کار پێ سپێرراون و کارگوزاریی یەکێکی تاك و تەنیا و صەمەد و خاوەن توانا و زانیاری و کەرەمی ڕەهان.

دەسا ئەی خۆ بە فەیلەسووف زانی موفلیس!

سەبارەت بەم پەنجەرە مەزنەوە چی دەڵێیت؟

ئایا دەشێ ئەو ڕێکەوتەی کە باوەڕت پێیەتی، دەست لەم کارانە وەربدات؟!

## پەنجەرەی یازدەهەم

﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد:٢٨).

"گیان" و "دڵ"ی مرۆڤ لە چنگی: نیگەرانیی سامناك و، گێژەڵووکەی دڵەتەپێ و شڵەژان و مەترسی و.. لەدەست: تینوێتیی گومڕایی و، کسپەی ئاگری لەخوادووری.. تەنها بە ناسینی خوایەکی تاك و تەنیا نەبێت، هەرگیز ڕزگاریان نابێت!

ئەگەر کاروباری گیان و دڵان و گشت بوونەوەران بدرێن بە دەست بەدیهێنەرێکی تاك و تەنیا، ئەوا لەم ڕێیەوە مرۆڤ حەوانەوەی دەست دەکەوێت و، لەدەست دەردی پەریی ئەو بوومەلەرزە دەروونییە کاولکارانە و، لەو نیگەرانی و شڵەژاوییەش دەرباز دەبێت و، دامەزراوی و هێمنیی دەستگیر دەبێت..

چونکە ئەگەر کاروباری گشت بوونەوەران بە دەستی خوایەکی تاك و تەنیا نەبێت، ئەوا دەبێ بەدیهێنانی هەرچی شت هەیە بە چەندەها هۆکاری لەژمارەبەدەر بسپێررێت.. دیارە ئەو کاتەش بەدیهێنانی تاقە شتێك بە ئەندازەی بەدیهێنانی هەموو بوونەوەران بە گشتی ئالۆز و پڕ لە کێشە و گیرو گرفت دەبێت.

لە وتەی بیست و دووهەمدا چەسپاندوومانە کە:

ئەگەر کاری "بەدیهێنان" بدرێتە پاڵ خوای گەورە، ئەوا بەدیهێنانی چەندەها شتی لە سنووربەدەر - بە یەکجاری - یەك خوای تاك و تەنیا ئەنجامی دەدات، دەنا ئیشوکاری بەدیهێنانی هەرچی شت هەیە دەبێت بە دەست چەندین هۆکاری لەژمارە بەدەرەوە بێت. بەم پێیە و لە بارێکی وادا بەدیهێنانی تەنها یەك بەری درەخت - بۆ نموونە - بە ئەندازەی سەرانسەری گەردوون، تەنانەت زیاتریش، قورس و پڕ لە کێشە دەبێت!

با ئەمە بە نموونەیەك ڕوون بکەینەوە:

هەروەك ئەگەر بەڕێوەبردنی یەك سەرباز بە چەندین فەرماندەی جیاجیا بسپێررێت، چەندین کێشەی زۆر دەکەوێتە مەسەلەکەوە، بەڵام ئەگەر بەڕێوەبردنی سەد سەرباز بە تەنها یەك ئەفسەر بسپێررێت، ئەوا کارەکە هێندە ئاسان دەبێت وەك ئەوەی بەڕێوەبردنی یەك دانە سەربازی پێ سپێررابێت.. هەر بەم جۆرەش، یەکگرتنی هۆکارە لەژمارە بەدەرەکان لەسەر دروستکردن و بەدیهێنانی تەنها یەك شت، سەدان ئەوەندە گیرو گرفتی تێدایە. بەڵام ئەگەر یەك خوای تاك و تەنیا شتە جیاجیاکان بەدی بهێنێت، سەدان ئەوەندە کارەکە ئاسان دەبێت.

بەم جۆرە، ئەو ئارەزوومەندی و شەوقەی لە مرۆڤدا هەیە بۆ "ڕاستی" وا لەم مرۆڤە دەکات کە ئەگەر بەو "ڕاستی"یە نەگات، هەردەم لە نیگەرانی و دڵەڕاوکێدا دەبێت، خۆ مەگەر لە یەکتاناسیی بەدیهێنەری خۆی و خواناسیدا دەنا هەرگیز ئاسوودەیی و دڵنیایی دەستگیر نابێت. چونکە گرتنەبەری ڕێی کوفر - کە ئەم هەموو دڵەڕاوکێ و گیرو گرفتانەی تێدایە - کارێکی مەحاڵە و دارای "ڕاستی" نییە.

بەڵام ڕێی "یەکتایی" ئەوەندە ئاسانیی ڕەهای لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا بەم زۆری و داهێنانە ناوازەیەی بەرچاومان تێدایە کە هیچ دەرفەتێك بۆ مرۆڤ ناهێڵێتەوە ئەو ڕێیە نەگرێتەبەر.

ئەمەشت بەلاوە سەیر نەبێت، چونکە "یەکتایی" تاکە ڕێگایە کە دارای ڕاستی و ڕەسەنایەتی بێت!

دەسا ئەی ئەو کەسەی شوێن گومڕایی کەوتووە! ئەی بەدبەختی هەژار!

بیر لە گومڕایی بکەرەوە کە چەندە تاریکە و، چەندەش ئازار دەرخواردی ویژدانی مرۆڤ دەدات.. هەرگیز هەوڵ نەدەیت بیگریتەبەر.

پاشان سەرنج لە ڕێی "یەکتایی" بدە کە چەندە ڕوونە و چۆن هەردەم خەندەی لەسەر لێوە و دڵخۆشی بە مرۆڤ دەبەخشێت، فەرموو بیگرەبەر و خۆت ڕزگار بکە.

## پەنجەرەی دوازدەهەم

﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ۞ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى ۞ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾ (الأعلى:١-٣).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە بۆ ئەوە ڕێنمایی‌مان دەکەن کە: هەرچی شت هەیە، بە تایبەت زیندەوەران، کاتێك دێنە جیهانی "بوون" و پەیدا دەبن، بە چەشنێك دێن وەك بڵێی هەریەکەیان لەناو قالبێکدا بێنە دەرەوە کە بە دانایی نەخشەی کێشرابێت و، ئەو داناییەش نەخشەیەکی ڕێکوپێك و وێنە و شێوەیەکی وا جوانی بە هەموو شتێك بەخشیبێت کە دانستێکی ڕوونیان تێدا دەربکەوێت.

لە لەشدا چەندان هێڵی لار و پێچاوپێچ دەبینیت کە چەندین سوودی زۆریان بۆ لەش لێ پەیدا دەبێت، ئەم سوودانەش هەموو ئەو فەرمانبەری و کارمەندییانەی کە لەشیان لە پێناودا دروست کراوە، بە جوانترین شێوە بۆ لەش ئاسان دەکەن.

هەموو شتێکی "بوو" لە زانیاریی خوای گەورەدا وێنەیەکی مەعنەویی هەیە کە چارەنووسەکانی ژیانی ئەوی تێدایە و لە وێنە ماددییەکەی جیا نابێتەوە و لە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنیدا لەگەڵی دەڕوات. پاشان ئەو وێنە و چارەنووسانە لە ڕەوتی ژیانی ئەو "بوو"ەدا بە چەشنێك گۆڕانیان بەسەردا دێت کە لەگەڵ ئەو دانستەی ئەوی لە پێناودا دروست کراوە بگونجێت و، بە تەواویش لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییانەی وان تیایدا یەك بگرنەوە.. ئەمەش بە ئاشکرا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە:

وێنە و ئەندازەی لەشەکان، لە بازنەی "قەدەر"ی خوای گەورە و دانای خاوەن کەماڵدا دیاری و دەستنیشان دەکرێن و، بە بەری ئەو لەشانە دەبڕرێن و، بە دەستی توانستی خواوەندیش ڕێکدەخرێن و، "توانست"ی خواوەند "بوون"ی دیاریکراو و نەخشە بۆکێشراو بەو وێنانە دەبەخشێت.

جـا ئـەو "بوونـەوەرە" لەسـنوور بەدەرانـە، بەڵگـەن لەسـەر خواوەنـدی "واجب الوجود" و، بـە چـەندین زمـانی لەژمارەبەدەریش شـایەتی لەسـەر "یـەکتایی" و "تـەواویی توانستی" ئەو خوایە دەدەن.

ئەی برای مرۆڤ!

سەرنج لەو سنوورە لار و چەوت و پێچاوپێچە وردانەی لەش و ئەندامەکانت بـدە و، ئنجا بیر لە سوودەکانیان و ئەنجامی خزمەتگوزارییەکانیان بکەرەوە و، لەمەوە "تەواویی توانست" لە توێی "تەواویی دانایی"دا ببینە!

## پەنجەرەی سیازدەهەم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء:٤٤).

هـەرچی شـت هەیـە، بـە زمـانی تایبـەتیی خـۆی، یـاد و تەقدیسـی بەدیهێنـەری خـۆی دەکات، وەك لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێت.

بەڵێ، ئـەو تەسبیحاتەی کـە بوونـەوەران چ بـە زمـانی حـاڵ و چ بـە زمـانی گوفتـار پێشکەشی دەکەن، بە ئاشکرا بەڵگەن لەسەر "بوون"ی زاتێکی خاوێنی تاك و تەنیا.

بەڵێ، بەڵگەی سروشت لێرەدا گەلێ ڕاستە و شایەتییەکەشی پشتگوێ ناخرێت، بە تایبەتی ئەگەر ئەم شـایەتیدانە لـە بەڵگـەی حاڵـەوە بێـت و، بـە تایبـەت تریـش ئەگـەر ئـەم بەڵگانە بە زۆری کۆببنەوە.. لە کاتێکی ئاوادا، بە شایەتییەکی ڕاسـتی ئـەوتۆ دادەنرێـت کە هەرگیز گومانی لـێ نەکرێت.

ئێستا فەرموو سـەرنج لـە وێنـەی بوونـەوەرە ڕێکوپێکـەکان بـدە، دەبینیـت وەك چۆن بازنـە هاوچـەق و ناویەکـەکان لـەوەدا یـەکیان گرتـووە کـە ڕوویـان لـە خـاڵی چـەقی بازنەکەیانـە، دەبینیـت ئـەو وێنانـەش لـەوەدا یـەکیان گرتـووە کـە هـەر هـەموویان ڕووی تەسبیحاتیان لە بەدیهێنەر و داهێنەری خۆیانە کـە سـەرچاوەی "بـوون"ی هـەموو یـەکێك لەوانـە. لەبـەر ئەمـە، ئـەو وێنانـە چـەندین بەڵگـەی بە چـەندین جـۆری لەژمارەبـەدەریان تێدایـە، کـە بـە زمـانی حـاڵ ڕایدەگەیـەنن. چونکـە هەریـەك لـەو وێنانـە لـە جێـی خـۆیدا زمانێکی شایەتیدەرە و شێوە ڕێکوپێکەکانیشیان زمانێکی تـری شـایەتیی ڕاسـتن، بـەڵکو ژیانی هەموو بوونەوەر بە تێکڕایی زمانێکە و هـەردەم بـە تەسـبیح و یـادی خـواوەنـد تـەڕ و پاراوە.

لە وتەی بیست و چوارەمدا چەسپاندوومانە کە:

ئەم هەموو تەسبیحات کردنەی لە بەرچاوی سەرنجدا خۆیان دەردەخەن و، لـە زمـانی حـاڵ و گوفتـاری گشـتی بوونەوەرانـەوە دەردەچـن و، سـڵاو و شـایەتیدانیانە لەسـەر "بـوون"ی زاتێکی خـاوێن و پیرۆز و جیـاواز لـە هەمـوو بەدیهێنراوێك.. ئەمانـە – بـە ئاشـکرا – ئەو خواوەندە "تاك" و "تەنیا" و "واجـب الوجود"ە دەچەسپێنن و، بەڵگـەی "تەواویی خوایەتیی" ئەون.

## پەنجەرەی چواردەهەم

﴿قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (المؤمنون:٨٨).

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ﴾ (الحجر:٢١).

﴿مَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ (هود:٥٦).

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەوەمان تێدەگەیەنن کە:

هەرچی شت هەیە، لە هەموو کاروبارێکیدا، پێویستی بە بەدیهێنەرێکی تاك و تـەنیا و شکۆمەند هەیە. چونکە هەر تەنها بە سەیرکردنێکی ئەو بوونەوەرانـەی گـەردوون کـە لـە بەردەمماندان، دەبینین کە:

چەندین ڕواڵەتی "هێزی ڕەها" لە نێوان "لاوازیی ڕەها"دا بە ئاشـکرا و لـە بـەرچاودا پەیدا دەبن..

ئاسەوار و شـوێنەواری "توانستێکی ڕەهـا" لـە دووتوێـی "کۆڵەوارییـەکی ڕەهـا" و هەست پێ کراودا دەردەکەوێت، وەك ئـەو دۆخـە نائاسایییانەی لـە "تۆو" و "ڕەگ"ی ڕووەکەکاندا دەردەکەون کاتێك گەشە دەکەن و ژیانیان تێدا بێدار دەبێتەوە..

هەروەها دەبینین کە: چەندین ڕواڵەتی "دەوڵەمەندیی ڕەها" لە نێوان "هەژارییـەکی ڕەهـا" و وشـك و برنگـی و بێئاوییـەکی تـەواودا دەردەکـەون، ئەمـەش لـەو سـامان و سەروەتە زەبەندە و، بـار و دۆخـە پڕ لـە پیـت و فـەڕە زۆرەی زەوی و ڕووەك لـە بەهاردا دەبینرێت، دوای ئەوەی کە لە وەرزی زستاندا وشك و بێ بەرهەم بوون..

پاشـان لە نێـوان "بێ گیـانییەکی ڕەهـادا" چەنـد نمێـك دەبینین کـە هـی "ژیـانێکی ڕەهـا"ن و لەو بێ گیانییەوە نم‌نم دەردەکەون. ئەمەش وەك تۆخمـە بێ گیانـەکانی چەشـنی: گڵ و ئاو کە دەبن بە چەند ماددەیەکی زیندوو..

پاشان چەندین دیاردەی "هەست کردنی تەواو" لـە نـاوەندی "نەزانییـەکی تـەواودا" دەبینین. وەك ئـەوەی کـە لـە جموجـووڵ و هـاتوچۆی هـەموو شـتێکدا هەیـە، هـەر لـە

گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان ئەمە دەردەکەوێت. ئەو جموجووڵ و هاتوچۆیانەی کە دارای هەست و شعوورێکی تەواون و لەگەڵ یاسا و دەستووری گشت گەردووندا تا بڵێی گونجاون و، لەگەڵ داخوازییەکانی ژیان و پێداویستییەکانی ئەو داناییەش کە لە "بوون"دا مەبەستە، لەبار و شیاون.

بەم جۆرە دەرکەوت کە:

ئەو توانایەی لە لاوازی و کۆڵەواری‌دایە..

ئەو هێزەی لە کانگای لاوازییەوە دەردەکەوێت..

ئەو سامان و دەوڵەمەندییەی لە خودی هەژاری‌دان..

ڕووناکییەکانی ژیان و هەست و شعوور بەرامبەر بە هەموو شتێك و، درەوشانەوەیان لە نێوان بێ گیانی و نەزانی‌دا..

هەریەك لەم دیاردانە، لە لای خۆیانەوە چەندین پەنجەرە دەکەنەوە و، لەوێوە بەویەڕی پێویستی و بەڵگەنەویستی "بوون"ی زاتێکی پاك و پیرۆز و، خاوەن: توانستی ڕەها و.. دەوڵەمەندیی زۆر ڕەها و.. زانیاریی زۆر ڕەها و، زیندوو و، ڕاگیرکەری بوونەوەر.. دەردەخەن.

ئەمە جگە لەوەی کە هەر هەموویشیان، بە یەکەوە، شایەتن لەسەر "یەکتایی" ئەو خواوەندە و، بە جۆرێکی ڕوون و پێوەرێکی گەورەتریش ڕێی ڕاست ڕوون دەکەنەوە.

دەسا ئەی ئەو مرۆڤەی کەوتووەتە ناو زۆنگاوی سروشتەوە!

ئەگەر لە مەزنیی توانستی پەروەردگاریی خواوەند تێنەگەیت و پێی نەزانیت و، چەمکی: "بەدیهێنەریی سروشت" فرێ نەدەیت، ئەوا دەبێ بە هەرچی شت لە "بوون"دا هەیە، تەنانەت بە هەرچی گەردیلە هەیە:

هێزێکی مەزنی بێ سنوور و..

توانستێکی گەورەی لەئەندازە بەدەر و..

داناییەکی لەسنوور بەدەر و..

کارامەییەکی گەورە و بێ کۆتایی.. بسپێریت!

بەڵکو ئەو کاتە دەبێ:

بیناییەکی تیژی ڕوانەر بۆ هەموو شتێك و..

بەڕێوەبەرییەکی لێهاتووی گشتگیر.. بۆ هەموو شتێك بڕیار بدەیت!

خۆ دیارە ئەمەش لە هەموو نەگونجاوێك مەحاڵترە!

## پەنجەرەی پازدەهەم

﴿الَّذي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (السجدة:٧).

هەموو "شتێك" بە چەشنێكی زۆر ڕێكوپێك، بەپێی بەژن و بالأی "چییەتی"یەكەی خۆی بڕراوە و، بە تەرازوو و پێوەرێكی یەكجار هەستیار و سەرنەكەر ئەندازەی بۆ دانراوە و نەخشەی بۆ كێشراوە و، بە تەواوی لە چییەتی‌یەكەی‌دا ڕێك‌خراوە و..

بە كارامەیی ڕیز كراوە و..

بە لێزانی دروست كراوە و..

جوانترین وێنە و بەرگ و قەشەنگترین چۆنێتیی لە نزیكترین ڕێگاوە كراوەتە بەر و..

ئاسانترین شێوەی دراوەتێ كە لە ئەنجامدانی كارەكەی‌دا یارمەتیی بدات و..

"بوون"ێكی پێ بەخشراوە كە لە هەموو لایەكیەوە مۆرك و شەقڵی "دانایی" بە ئاشكرا پێوە دیارە و، هیچ بێ‌مەبەستی و زیادەڕەوی‌یەكی تێدا نی‌یە.

بۆ نموونە: سەیری "باڵندەكان" بكە؛ دەبینیت: پەڕی نەرمونیانیان بۆ كراوە بە بەرگ و پۆشاك! جا ئایا دەكرێت جگە لە "پەڕ" هیچ بەرگێكی تری بكرێتەبەر كە لەگەڵ خۆی و حیكمەتی بەدیهێنانی‌دا بگونجێت؟! بزانە چ جوانی و نەرمونیانی‌یەك لە خاوێن كردنەوەی ئەم بەرگەی‌دا هەیە و، چ ئاسانی‌یەكی تێدایە كە دەیجوولێنێت و، بۆ هەموو جۆرە ئیشوكارێكی ژیان و گوزەرانی خۆی دەیخاتەكار!

هەرچی شت لە بوونەوەردا هەیە، وەك ئەم نموونەیە وایە و، شایەتێكی گۆیایە لەسەر: "بوون"ی بەدیهێنەری دانا و، هەریەكەیشیان ئاماژەیەكی ئاشكرایە بۆ خوایەكی خاوەن توانست و زانستی ڕەها.

## پەنجەرەی شازدەهەم

ئەو ڕێكوپێكی و بەردەوامی‌یەی لە بەدیهاتنی بوونەوەرانی سەرزەوی‌دا دەبینرێن.. هەروەها لە كارئەنجامدان و نوێ بوونەوەی بەردەوامیان لە هەموو وەرزێكدا.. بەڵگەیەكی تابلێی ڕوون و ئاشكرایە لەسەر "دانایی"یەكی گشتیی ئەوتۆ كە هەموو بوونەوەرانی گرتووەتەوە. ئەم "دانایی‌یە گشتی‌یە" بێ هیچ گومانێك، بەڵگەیە لەسەر دانایەكی خاوەن دانستی ڕەها، چونكە وەك ئاشكرایە "سیفەت" هەرگیز بێ "مەوسووف" نابێت.

پاشان جۆرەهای جۆری ئەو ئارایشتانەی كە بوون بە چوارچێوە و پەراوێز بۆ پەردەی ئەو "دانایی‌یە گشتی"یەی كە گشت بوونەوەرانی گرتووەتەوە، بە ئاشكرا بەڵگەن لەسەر: چاودێری و بایەخ پێدانێكی گشتی. ئەمەش بە ئاشكرا بەڵگەیە لەسەر: بەدیهێنەرێكی دەست ڕەنگین.

ئەو جۆرەهای جۆری دەسترەنگینی و نەرمونیانی و چاكەكاری‌یانەش كە وێنەیان لەسەر پەردەی چاودێری و بایەخ پێدانەوە كێشراوە، بەجۆرێك كە هەموو بوونەوەرانی داپۆشیوە، بە ئاشكرا بەڵگەیە لەسەر میهرەبانی‌یەكی فراوان، ئەم میهرەبانی‌یە فراوانەش بێ هیچ گومانێك بەڵگەیە لەسەر خواوەندی بەبەزەیی و بەخشندە و میهرەبان.

پاشان ئەو جۆرەهای جۆری ڕزق و ڕۆزی و ژیانكاری‌یەی كە لەسەر هەموو چڵ و پەلێكی میهرەبانی گوڵیان گرتووە و، بەسەر هەموو شتێكدا دەڕوانن و، بۆ ئەو زیندەوەرانە ئامادە كراون كە پێویستیان بە ڕۆزی هەیە و، ئنجا ژیاندنی ئەو زیندەوەرانە بەو ڕۆزی‌یانە بە چەشنێكی شیاو و لەبار و گونجاو.. ئەم كارە، بە ئاشكرا، بەڵگەیە لەسەر:

ڕۆزیدەرێكی خاوەن پەروەردە و چاودێری و..
پەروەردگاری‌یەكی خاوەن بەزەیی و میهرەبان.
ئەم پەروەردە و بەڕێوەبردنەش، بێ گومان، بەڵگەن لەسەر:
خواوەندێكی ڕۆزیدەری دەست ڕەنگین.
هەرچی بوونەوەر هەن لەسەر زەوی‌دا:
بە "دانایی‌یەكی تەواو" پەروەردە دەكرێن و..
بە "چاودێری و بایەخ پێدانێكی تەواو" دەڕازێنرێنەوە و..
بە "میهرەبانی‌یەكی بێ كەموكووڕی" نیعمەتیان پێ دەبەخشرێت و..
بە "بەزەیی و سۆزێكی تەواو"یش هۆكاری ژیانیان بۆ دەنێررێت..

هەریەك لەمانە، زمانێكی گۆیایە و ئاماژە بۆ ئەو خوا گەورەیە دەكات كە: دانا و، دەست ڕەنگین و، میهرەبان و، ڕۆزیدەرە. ئنجا هەریەكەشیان پەنجە بۆ "یەكتایی" ئەو خواوەندە درێژ دەكات.

هەروەها هەرچی "دانایی" دیار و ئاشكرا لەسەر زەوی‌دا هەن، ویست و مەبەستداری‌یان تێدا هەست پێ دەكرێت و..

هەروەها هەرچی "چاودێری" و بایەخ پێدانی گشتی لەسەر زەوی‌دا هەن، کە ئەو دانایی‌یەیان تێدایە و..

ئەو میهرەبانی‌یە فراوانەش کە لەسەر ڕووی زەوی‌دایە و ئەوەندە فراوانە هەموو بوونەوەر دەگرێتەوە و، "چاودێری" و "دانایی"شی لە ئامێز گرتووە..

پاشان هەرچی "ڕۆزیدانی گشتی"ی زیندەوەران هەن کە هیچیان بێ بەش ناکات و، ئەو هەموو "ژیانکاری"یە نەرم و ناسك و پڕ لە سەخاوەتەش کە "میهرەبانی و چاودێری و دانایی"یان تێدایە..

هەموو ئەم دیاردانە، چ یەك بە یەك، چ بە کۆمەڵ، بەڵگەیەکی تابڵێی گەورەن لەسەر خواوەندی:

دانا و، دەست ڕەنگین و، میهرەبان و، ڕۆزیدەر..

هەروەها شایەتن لەسەر:

"پێویستیی بوونی"و، "یەکتایی" و "تەواویی پەروەردگارێتی‌یەکەی".

چونکە:

ئەو چاودێری کردنەی کە لە دانایی‌دا هەیە و..

ئەو میهرەبانی‌یەی کە لە چاودێری کردندا هەیە و..

ئەو ڕۆزیدان و ژیاندنەی کە لە میهرەبانی‌دا هەیە.

هەموو ئەمانە، بە شێوەیەکی فراوان، دەبن بە چەند بەڵگەیەکی گومان لێنەکراو لەسەر: خواوەندی "واجب الوجود"، بە چەشنی ئەوەی کە حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆر دەبن بە بەڵگە لەسەر ڕووناکیی ئەو خۆرەی کە ڕۆژگاری لە ڕووناکی پڕ کردووە.

دەسا ئەی مرۆڤی سەرگەردانی بێ ئاگا و سەرسەخت!

ئەم پەروەردە سەرجەم دانایی و..دەستڕەنگینی‌یە گشتی و.. میهرەبانی‌یە فراوان و.. ڕۆزی‌یە زۆرە، بە چی لێك دەدەیتەوە و، ئەم دیاردە سەرانسەر موعجیزاتە بە چی ڕوون دەکەیتەوە؟

ئایا دەگونجێ بە "ڕێکەوت"ی کتوکوێر لێك بدرێنەوە؟

یان بە "هێز"ی مردووی وەك دڵی بێ گیانی تۆ ڕوون بکرێنەوە؟

یان بە "سروشت"ی کەڕی وەك ژیریی تۆ.. یاخود بەو "هۆکارانەی" کە بە چەشنی تۆ کۆڵەوار و بێ گیان و نەزانن، دەکرێت لێك بدرێنەوە؟

یان دەتەوێت هەڵەیەکی تابلێی گەورە بکەیت، بچیت سیفەتەکانی خواوەندی: بەدیهێنەرو، مەزن و، پاك و، بەرز و، بەتوانا و، زانا و، بیسەر و، بینەر.. بۆ "سروشت"ی: کوڵەواری، نەزانی، کەرو کوێر، دابنێیت؟

بە چ هێزێك دەتوانیت چرای ئەم ڕاستی‌یە ڕووناکەی کە وەك خۆر درەخشانە، بکوژێنیتەوە و.. لە ژێر پەردەی کام بێ ئاگایی‌دا دەتوانیت بیشاریتەوە؟!

## پەنجەرەی حەڤدەهەم

﴿إِنَّ فِي السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (الجاثية:٣).

ئەگەر سەرنج لە ڕووی ڕاخراوی ئەم زەوی‌یەی بەرچاومان بدەین، دەبینین:

"دەستڕەنگینی(سەخاوەت)یەکی ڕەها" لە بەدیهێنانی شتانی ناوی‌دا دەردەکەوێت، لە کاتێکدا کە دەستڕەنگینی داخوازی ئەوەیە: شتان لەوپەڕی هەڕەمەکیتی و ناڕێکی‌دا بن.. کەچی لەوپەڕی گونجاوی و ڕێکوپێکی‌دا دەیانبینین!

سەیری هەموو ئەو ڕووەکانە بکە کە ڕووی زەوی دەڕازێننەوە، ئەم ڕاستی‌یە دەبینیت..

ئنجا "خێرایی و زوویی" بە چەشنێکی ڕەها لە بەدیهێنانی شتاندا دەردەکەون. لە کاتێکدا کە خێرا کردن داخوازی ئەوەیە وێنەی شتان: شێواو، هەڵبزڕکاو، ناتەواو بن و، ماددەکانیشیان ناڕێك و شلەژاو بن و بە تەواوی ڕێك نەخرابن.. کەچی لەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردەکاری و هاوسەنگی و دارشتنی تەواودا دەیانبینین!

سەرنجی هەموو ئەو میوە و بەروبوومانە بدە کە ڕووی زەوی‌یان ڕازاندووەتەوە، چونکە ئەم ڕاستی‌یەیان بە جوانترین شێوە تێدا دەردەکەوێت.

ئنجا "زۆری و زەبەندەیی‌یەکی ڕەها" لە بەدیهێنانی شتاندا دەبینین. لە کاتێکدا کە "زۆری" داخوازی ئەوەیە: شتان بێ‌نرخ و پشتگوێ خراو، تەنانەت هەندێ جار ناشیرینیش بن.. کەچی لە ڕێکوپێکی‌یەکی جوان و، دروستکراوی‌یەکی بێ وێنە و، جوانی‌یەکی سەرنج ڕاکێشدا دەیانبینین!

بڕوانە و سەرنجی ئەو گوڵانە بدە کە ڕووی زەوی‌یان ئارایشت داوە و خەملاندوویانە، ئایا ئەمەیان بە تەواوی تێدا دەرناکەوێت؟

هەروەها "ئاسانی‌یەکی ڕەها" لە بەدیهێنانی شتاندا دەبینین. لە کاتێکدا کە "ئاسانی" داخوازی ئەوەیە: شتان زۆر سادە و ساکار بن و هیچ وردەکاری و کارامەیی‌یەکیان تێدا

نەبێت. کەچی لەوپەڕی داهێنانی کامڵ و کارامەیی جوانـدا دەیـابینین. فـەرموو سـەیری "تۆو" بکە و سەرنج لە "ناوکەکان" بدە، ئەوانەی کە چـەند قوتوویـەکی بچووکـن و، لـە ماددەی پێکهاتنیاندا چەندین پێرستیان بۆ ئەندامەکانی درەختێکی تـەواو ڕێکوپێـك و چەندین نەخشەیان بۆ تەنی ڕووەکەکانیان لەناو خۆیاندا هەڵگرتووە..

هەروەها "دووری‌یەکی ڕەها" لە نێوان کات و شوێنی بەدیهێنانی شتاندا دەبینین. خۆ ئـەم دووری‌یـە مەزنـەی نێـوان کـات و شـوێنەکانیش داخـوازی ئـەوەن: شـتان جیاجیـا و جۆراوجۆر بن. کەچی دەبینین لە سیفەت و تایبەتکاری‌دا هەموویان وەکو یەکن!

سەیری جۆرەهای جۆری ئەو دەغڵ و دانانە بکە کە لـە هـەموو لایـەکی سـەرزەوی‌دا چێنراون، سەرەڕای ئەوەی کە دووری و کات و شوێن لە یەکیان جیا دەکاتەوە.

پاشان "تێکەڵی‌یـەکی ڕەهـا" و "تێهـەڵکێش بوونێکـی تونـد" لــە بەدیـهێنانی شـتاندا دەبینین. لە کاتێکدا ئەم تێکەڵ بوونـە داخـوازی ئەوەیـە ماددەکـان بچنـە نـاو یـەکترەوە.. کـەچی دەبینـین بـە تـەواوی لـە یـەك جیـا کراونـەتەوە و بـە ڕێکـی هەریەکـەیان بـۆ شـتێك تایبەتمەند کراوە!

فەرموو بۆ ئەو تۆوە چێنراوانەی ژێر خـاك بڕوانە و بە وردی سـەرنج بدە کە چـۆن لـە کاتی گوڵ‌گرتن و گەشەکردنیاندا لە یەك جیا دەبنەوە، هەرچەندەش پێکـهاتنیان لـە یـەك دەچێـت.. هـەروەهـا بـە وردی تەماشـای ئـەو مـاددە جیاجیایانـە بکـە کـە درەختـەکان پێکــدەهێنن و، چۆن دەگــۆڕرێن و دەبن بە چەندین شــێوەی جیـاوازی وەك گــەڵای ناســك و، گوڵــی ڕەنگین و، بەروبوومی جوان بـۆ ئـەو درەختـە.. هـەروەها سـەرنج لـە جۆرەهای جۆری خۆراکە جیاجیاکان بدە، کە دەڕۆنە ناو گەدەوە و، ئنجـا لـە یـەك جیـا دەبنـەوە و، هەریەکـەیان دەچێتـە نـاو ئـەو ئەندامـەی بـەڵکو ئـەو خانەیـەی کـە لەگــەڵی‌دا دەگونجێـت و بـۆی دەشێـت.. ئـا لێـرەدا بـۆ خـۆت سـەیری جێ‌دەسـت و شـوێنەواری "توانستی ڕەها" لە نێوان "دانایی ڕەها"دا بکە!

پاشان "زۆری"یەکی لەڕادەبەدەر لە شتان و جـۆر و شێوەیاندا دەبینـین. لـە کـاتێکدا کە دەبوو، بەپێی ئەم زۆری‌یە، شــتان بێ‌نرخ و ســادە بوونایـە.. کـەچی دەبینـین تـابلێی بەنرخ و نایابن!

تەماشــای ئـەو بەروبوومـە ناوازانـە بکـە کـە بـۆ سـەر سـفرە و خوانـی زەوی ئامـادە کراون و بە وردی سەرنجی تەنها یەك دانە "بەر" بدە، ئایا ئەم تەنـها بـەرە نموونـەی جوانـی شیرینی و حەلوایەك نی‌یە کە بە دەستی توانستی خواوەند دروست کرابێت؟

بۆ خۆت لێرەدا سەیری "تەواویی میهرەبانی" لە نێوان "تەواویی داهێنان"دا بکە!

بەم جۆرەی کە باس کرا:

لەسەر رووی تێکڕای زەوی‌دا، نایابی و چاکی لە نێوان شتاندا دەبینین، هەرچەندەش زۆر و زەبەندەن..

لە نێوان ئەم زۆری‌یەشدا دەبینین بوونەوەران لە یەك جیا کراونەتەوە، هەرچەندەش لە یەکتردا تێکەڵ بن..

لەم تێکەڵی و تێهەڵکێش بوونەشدا یەکگرتن و لەیەکچوون لە نێوان بوونەوەردا دەبینین، هەرچەندەش دووری‌یان لە نێواندا هەیە..

لە دووتوێی ئەم یەکگرتنەشدا جوانی‌یەکی ناوازە لەناو بوونەوەراندا و، چاودێری‌یەکی گەلێ زۆر لە بەرامبەریانەوە دەبینین، هەرچەندەش بەوپەڕی ئاسانی بەدی دەهێنرێن..

لە نێوان ئەم چاودێری‌یە تەواوەشدا نەخشە و ئەندازە دانانێکی ورد و بەراوردکاری و هاوسەنگی‌یەکی هەستیارانە بەدی دەکەین، هەرچەندەش بە پەلە و زوویی بەدی دەهێنرێن..

لەناوەندی ئەم نەخشەدانان و، هاوسەنگی و، ئیسراف نەبوونەشدا "داهێنان" و "جوانی" لە دروست کردندا دەبینین، وێڕای زۆریی لە ئەندازەبەدەریشیان..

لەناو ئەم جوانی‌یەی دروست کردنیشدا، ڕێکوپێکی‌یەکی بێ وێنە دەبینین، هەرچەندەش سەخاوەتێکی ڕەها لە بەدیهێناندا هەیە..

جا ئەگەر سەرنج لەم هەموو شتانە بدەین، دەبینین کە چەندە ڕۆژ دەبێتە بەڵگە لەسەر رووناکی و ڕووناکییش لەسەر خۆر، گشت ئەمانەش گەلێ گەشتر و ڕووناکتر دەبن بە بەڵگە لەسەر بوونی یەکێکی:

بەتوانای شکۆمەند و..

دانای خاوەن کەماڵ و..

میهرەبانی خاوەن جوانی و..

شایەتی لەسەر:

"یەکێتی و.. یەکتایی و.. تەواویی تواناست و.. جوانیی پەروەردگاری"ی ئەو دەدەن و، بە ئاشکرا یەکێك لە نهێنی‌یەکانی ئایەتی: ﴿لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ (الحشر:٢٤) دەردەخەن.

ئێستا ئەی مرۆڤی بێئاگای سەرپێچی کار و، ئەی نەزانی هەژار!

ئەم ڕاستی‌یە مەزنەی کە بە چاو دەیبینیت، بە چی لێکی دەدەیتەوە؟ یان ئەم بارە نائاسایی‌یانەی بەردەمت بە چی ڕوون دەکەیتەوە؟ کاروباری ئەم بەدیهێنراوە ناوازە و سەیرانە بە کێ دەدەیت؟ ئەم پەنجەرەیەی کە بە ئەندازەی گۆی زەوی فراوانە، بە کام پەردەی بێئاگایی دەتوانیت دایپۆشیت؟

ئەو "ڕێکەوت"ەی باوەڕت پێیەتی و، ئەو "سروشت"ەش کە پشتی پێ دەبەستیت - کە هەردوو کیان بێ هەست و نەستن - لە کوێن؟ بەڵکو هەموو وەهەمەکانی گومڕایی کە پاڵیان پێوە دەدەیت و هاوەڵی‌یان لەگەڵدا دەکەیت، بەرامبەر بەم ڕاستی‌یە سەیر و بارودۆخە سەرسووڕهێنەرانە، لە کوێن؟!

ئایا دەستتێوەردانی "ڕێکەوت" لەم چەشنە کارانەدا کارێکی سەد لە سەد مەحاڵ نی‌یە؟ یان ئایا گێڕانەوەی یەك دانە لەم کارانە - چ جای هەموویان - بۆ "سروشت" هەزاران مەحاڵی تێدا نی‌یە؟

یان ئایا ئەو باوەڕەی کە بە سروشتی بێ گیانی کوێلەوار هەتە، دەتوانێت لە هەموو شتێکدا چەندین مەکینەی مەعنەویی بە ئەندازەی ژمارەی هەموو شتێك دابنێت؟!

دەسا سەرگەردانی و بەدبەختی بۆ گومڕایی و بیروڕاکانی!

## پەنجەرەی هەژدەهەم

﴿أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (الأعراف:١٨٥).

سەرنج لەم نموونەیە بدە کە زووتر لە وتەی بیست و دووهەمدا باسمان کردووە:

"ئاسەوارێکی جوان" وەك: کۆشکێکی گەورەی وا کە هەموو بەشەکانی تەواو بن و پایەکانی بە ڕێکی بنیات نرابن.. ئاسەواری ئاوا بەڵگەی "کارێکی ڕێك"ە. واتە کۆشکەکە دەبێ بە بەڵگە لەسەر کاری وەستای بەننا.. دیارە کاری ڕێکوپێك و تەواویش بەڵگەیە لەسەر بکەرێکی لێزان و ئەندازیارێکی کارامە..

ئەم ناونیشانانەش: بکەرێکی لێزان و.. ئەندازیارێکی کارامە و.. وەستایەکی بەننای سنعەت جوانی ڕێکوپێك.. بەڵگەن لەسەر چەندین سیفەتی دوور لە ناتەواوی کە لەو بکەرەدا هەن، واتە ئەم ناونیشانانە بەڵگەی توانای داهێنانی ئەو بکەرەن.

ئنجا ئەو سیفەت و توانای داهێنانە تەواوەیش بەڵگەن لەسەر "بوون"ی توانایی و لێهاتوویی تەواو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی گیان و زاتێکی بەرز و بڵند..

به هه‌مان شێوه (وللهِ المَثَلُ الأعلى):

ئه‌م شوێنه‌وار و ئاسه‌واره ئاشكرایانه‌ش كه سه‌ر زه‌وی ته‌نانه‌ت گشت گه‌ردوونیان پڕ كردووه و له به‌رچاودان، به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر چه‌ند كردارێكی له‌وپه‌ڕی ته‌واوی‌دا، ناونیشانی ئه‌م كردارانه‌ش - كه له دووتوێی ڕێكوپێكی و دانایی له‌سنووربه‌ده‌ردا ده‌رده‌كه‌ون - به ئاشكرا به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر بكه‌رێكی ته‌واوی پاك له هه‌موو ناته‌واوی‌یه‌ك، چ له ناونیشان و چ له ناوه‌كانی‌دا.. چونكه به ئاشكرا دیاره كاری ڕێكوپێك و پڕ له دانایی، هه‌رگیز بێ بكه‌ر نایه‌ته‌دی..

ئه‌و ناونیشانانه‌ش كه له‌وپه‌ڕی ته‌واوی‌دان به‌ڵگه‌ی چه‌ندین سیفه‌تی تابلێی ته‌واوی ئه‌و بكه‌ره‌ن. چونكه هه‌روه‌ك به‌پێی زانیاریی "صه‌رف"، "ئیسمی فاعیل" له "مه‌صده‌ر" وه‌رده‌گیرێت، هه‌ر به‌و جۆره‌ش سه‌رچاوه‌ی سه‌رهه‌ڵدانی ناو و ناونیشانه‌كان، سیفه‌ته‌كانن. ئه‌و سیفه‌تانه‌ش كه تابلێی ته‌واون، بێ گومان، به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر چه‌ندین كاروباری خۆیی(زاتـــی)ی ئه‌وتۆ كه له‌وپه‌ڕی ته‌واوی‌دان.

توانای خۆیی، یان ئه‌و كاروباره خۆیی‌یانه‌ی كه ئێمه له ده‌ربڕینیاندا ده‌سته‌وسان و كۆڵه‌وارین، به ئه‌ندازه‌ی پله‌ی دڵنیایی: "حق الیقین" به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر زاتێكی خاوێنی ئه‌وتۆ كه دارای كه‌ماڵی ڕه‌هایه.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌موو یه‌كێك له‌و شوێنه‌واره بێ وێنانه‌ی گه‌ردوون كه له به‌رده‌مماندان، هه‌ریه‌كه‌یان خۆی له خۆی‌دا "ته‌واو"ه و..

ئه‌م شوێنه‌واره بێ وێنه‌یه‌ش شایه‌تی كردارێكه و..

كرداره‌كه‌ش شایه‌تی ناوێكه و..

ناوه‌كه‌ش شایه‌ته له‌سه‌ر سیفه‌تێك و..

ئه‌و سیفه‌ته‌ش شایه‌تی كاروبارێكه و..

ئه‌و كاروباره‌ش شایه‌ته له‌سه‌ر زاتێك..

له‌به‌ر هه‌موو ئه‌مانه‌ی كه باس كران:

یه‌ك به یه‌كی ئه‌و ئاسه‌وارانه، شایه‌تی‌یه‌كی ڕاست له‌سه‌ر به‌دیهێنه‌ری مه‌زن و، تاك و، ته‌نیا و، "واجب الوجود" ده‌دات و، ئاماژه بۆ "یه‌كتایی" ئه‌و ده‌كات.

واته هه‌روه‌ك به ئه‌ندازه‌ی ژماره‌ی بوونه‌وه‌ران شایه‌تی و ئاماژه بۆ "یه‌كتایی" خواوه‌ند هه‌ن، هه‌روه‌ها هه‌ریه‌كه‌یشیان، له‌گه‌ڵ هه‌موو شوێنه‌وار و سه‌رجه‌می بوونه‌وه‌رانی گه‌ردووندا، میعراجێكی مه‌زنن بۆ ناسینی خوای گه‌وره و، به ئه‌ندازه‌ی

هێزی گشت بوونەوەرانیش ئەم میعراجە دارای هێزە.. سەرەڕای ئەوەش کە بەڵگەیەکی دامەزراوی ڕەگداکوتاوی نەبزۆکی ئەوتۆی "ڕاستی"یە، کە هیچ گومانێك ناتوانێت توخنی بکەوێت.

ئێستاش ئەی بێ ئاگای سەرپێچی کار!

بە چی دەتوانیت ئەم بەڵگەیە پووچەڵ یان زامدار بکەیت کە بە ئەندازەی گەردوون بەهێزە؟

یان بە چی ئەم پەنجەرە فراوانە دەشاریتەوە کە تیشکەکانی "ڕاستی" لە هەزار و یەك پەنجەرەوە، بەڵکو لە پەنجەرەی ئەوەندە زۆری بە ئەندازەی ژمارەی بوونەوەرانەوە، دەردەخات و ئاراستەی کەسانی خاوەن فام و ژیری‌یان دەکات؟ بە کام پەردەی بێ ئاگایی دەتوانیت دایبپۆشیت؟

## پەنجەرەی نۆزدەهەم

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّموَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾(الإسراء:٤٤).

هەروەك بەدیهێنەری مەزن چەندین دانایی لەژمارەبەدەر و واتای بەرزی لە تەنە ئاسمانی‌یەکاندا داناوە و، ئەو ئاسمانانەی بە "وشە"کانی: خۆر و، مانگ و، ئەستێرەکان ئارایشت داوە، تاکو جوانی و شکۆمەندیی بەدیهێنەریان دەربڕن..

بە هەمان جۆر، ئەم بەدیهێنەرە، چەندین دانایی و، واتای بەرز و، ئامانجی گەورە و گرنگی لە بوونەوەرانی ناو بۆشایی ئاسمانیشدا پێکهێناوە و، دەمی ئەو بۆشایی‌یانەی ئاسمانی بە "وتەکان"ی: هەورەگرمە و، بروسکە و، دڵۆپەکانی باران خستووەتە قسە و گوفتار، تاکو لەم ڕێگایەوە "تەواویی دانایی" و "جوانیی میهرەبانی"ی ئەو بەدیهێنەرە بزانرێن و بناسرێن.

هەروەك خواوەند وای لە گۆی زەوی کردووە کە بە چەندین وتەی پڕ واتا بدوێت و، بەو زیندەوەر و ڕووەکە زۆرانەی کە لەسەر زەوی‌دا بڵاوی کردوونەتەوە و هەریەکەیان وشەیەکی ڕەوانە بۆ خۆی، زەویی خستووەتە قسە و گوفتار و، بەمەش "کەماڵ"ی دروستکردنی بوونەوەرانمان لە لایەنی خۆیەوە بۆ ڕوون دەکاتەوە.. هەر بەو جۆرەش وای لە درەخت و ڕووەکەکان کردووە کە بە زمانی: گەڵا و گوڵ و

بەروبوومەکانیان بدوێن و، بەمەش "تەواویی بەدیهێنانکاریی" خواوەند و "جوانیی میهرەبانییەکەی" ڕابگەیەنن.

هەروەها گوڵ و بەری درەختیش، کە یەکێکن لەو وشانە، خواوەندی بەدیهێنەر وای لێ کردوون کە بە زمانی تۆوە وردەکانیان بدوێن، بەمەش خوای گەورە ئاماژە بۆ وردەکاریی بەدیهێنان و تەواویی پەروەردگاریی خۆی دەکات، بۆ کەسێك خاوەنی هەست و شعوور بێت و بە باشی ببینێت.

ئەگەر دەتەوێت گوێ ڕابگریت، ئەوا فەرموو گوێ لە وشەکانی: زیکر و تەسبیحاتی لەژمارەبەدەری ناو گەردوون بگرە:

وا لە نێوان ئەو جۆرە گوفتارەدا، گوێ لە وتەی تەنها گوڵێکی نێوان هەموو گوڵانی جیهان و، قسەی تەنها یەك گوڵەگەنم لە نێوان هەموو گوڵەگەنمەکانی گشت سەرزەویدا ڕادەگرین، تاکو زیاتر لەوە دڵنیا ببین کە چۆن هەموو ئەمانە شایەتی ڕاستن لەسەر "ڕاستیی یەکتایی خواوەند":

بەڵێ، هەرچی ڕووەك و درەختە، بەڵگەیەکی ئاشکرا و ڕوونە لەسەر بەدیهێنەری خۆی و، بە چەندین زمانی جیاجیایش شایەتییەکی وا ڕاست لەسەر "یەکتایی" بەدیهێنەر دەدات، کە مرۆڤی وردکار و سەرنجدەر دەخاتە سەرسوورمانەوە و لەتاوا دەڵێت:

(سبحان الله! ئەمە چەندە شایەتیدانێکی جوانە لەسەر "یەکتایی" ئەو خواوەندە)!

بەڵێ، بە ئەندازەی ڕوونی و جوانیی ڕووەك خۆی، ئەو تەسبیحاتانەش ڕەنگین و ڕوون و جوانن کە ڕووەکەکان لە کاتی: (گزنگی خەندەیان و، دەم پشکووتنی خونچەیان و، پێگەیشتنی بەر و گوڵەکانیان)دا بە گوێی یەکتریدا دەدەن. چونکە بە لێوی دەم بە خەندەی هەموو گوڵێك و، زمانی وردی ڕێکوپێکی گوڵەگەنم و، وشەی ڕێکخراوی تۆو و دەغڵ و دانەکان ئەو "ڕێسا"یە دەردەکەوێت کە بەڵگەی "دانایی"یە..

ئەو ڕێسایەش، وەك لە بەرچاودایە، لە نێوان تەرازوویەکی سەرنەکەردایە، کە ئەمیش بەڵگەیە لەسەر "زانیاری" و ئەم زانیارییە دەردەخات..

ئەو "تەرازووەش" لە نێوان بەدیهێنانێکی وردەکاردایە، کە ئەمیش بەڵگەیە لەسەر "کارامەییەکی لەسنووربەدەر"..

ئەو بەدیهێنان و دروستکردنە پڕ لە وردەکاری و نەخشونیگارە ناوازانەش لە نێوان ئارایشتێکی جوانی ئەوتۆدان کە "لوتف و کەرەم" دەگەیەنن..

ئەو ئارایشتە جوانەش بۆن و بەرامەی عەترینی وا خۆشی لێ دێت کە "میهرەبانی و چاکەکاری" دەردەخات.

جا ئەم بارودۆخانەی کە چەندین دانایی تێهەڵکێشیان تێدایە و لە تەنیشتی یەکترەوەن، بە هەر هەموویان، زمانێکی گەورەن شایەتی لەسەر "یەکتایی" خواوەند دەدەن، بە چەشنێك کە خواوەند، بە هەموو ناوە پیرۆز و خاوێن و جوانەکانیەوە، بە غەیری خوا دەناسێنێت و، وەسفە بەرز و شکۆمەندەکانی بۆ بڕیار دەدات و، هەموو نوورەکانی دەرکەوتن و درەوشانەوەکانی خواوەندیش لای بەدیهێنراوان دەردەبڕێت.

جا ئەگەر گوێت لە شایەتیدانی وەهای تەنها یەك دانە "گوڵ" ڕاگرت و، ئنجا توانیت گوێ لە شایەتیدانی مەزنی هەموو گوڵەکانی ناو باخ و بێستانە پەروەردگارییەکانی تێکڕای سەرزەوی ڕابگریت و، گوێت لەو ڕاگەیاندنە دەنگدەرەوە و بەزایەڵە مەزنە بوو کە ئەو گوڵانە لە بارەی "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" خواوەندەوە ڕایدەگەیەنن.. ئایا ئیتر دوای ئەمە، هیچ بێ ئاگایی و گومانێکت لە دڵدا دەمێنێت؟ خۆ ئەگەر بمێنن ئایا دەشێ پێت بوترێت: "مرۆڤێکی خاوەن هەستی بەرز و بڵندی هاوڕاز لەگەڵ هەست و شعووری بەرزی گەردوون"؟

وەرە با سەرنج لە درەختێك بدەین:

وا ئێستا لە بەردەم پەیدابوون و گەشەکردنی گەڵاکانیدایین کە لە وەرزی بەهاردا بەوپەڕی ڕێکوپێکی و وردەکارییەوە چرۆ دەکەن و لە نەشونمادان.. هەروەها واین لە بەردەم گوڵەکانیدا کە تابلێی بە ڕێکی و جوانی دەمیان دەپشکوێت و لە خونچەکانیان سەر دەردەهێنن و.. واین لە بەردەم بەرەکانی ئەو درەختەدا کە بە دانایی و میهرەبانی گەشە دەکەن و پەرەدەسێنن..

ئایا بە وردی سەیری ئەوەت نەکرد کە چۆن سروەی با بە نەرمونیانی و خاوێنیی چەشنی دڵپاکیی ساوایان یاریی لەگەڵ گەڵاکانیدا دەکرد؟

ئێستا سەیری دەمی درەخت بکە و، بزانە چۆن بەم زمانانەی خوارەوە لە بارەی حاڵی خۆیانەوە دەدوێن:

زمانی گەڵاکان، کە بە دەستی کەرەم و سەخاوەتمەندی سەوز بوون..
زمانی گوڵەکان، کە خەندەی مەستیی لوتفی خواوەندیان لەسەر لێوە..

زمانی بەروبوومەکان، کە بەهۆی درەوشانەوەی میهرەبانی، شاد و دڵخۆشن..

هەریەك لەم زمانانە، ئەو تەرازووە سەرنەکەرە دادگەرە دەردەبڕێت کە لە ناوەندی ڕێسایەکی مەحکەم و بێ وێنەدایە.

لەم تەرازووە سەرنەکەرەشدا کە "دادگەری" ڕادەگەیەنێت، چەندین نەخشونیگاری وردی ناوازە و، ئارایشتکاریی لەڕادەبەدەری وا هەن کە چەندەها تام و چێژی جۆراوجۆر و بۆنی عەترینی جیاجیایان تێدایە و، بەڵگەن لەسەر "میهرەبانی" و "چاکەکاری"..

لەو تام و چێژە ناسکانەشدا چەندین ناوك و تۆوی وا هەن کە خۆیان لەناو خۆیاندا یەکێکن لە موعجیزەکانی توانستی خواوەند..

ئایا ئیتر ئەمە بە ئاشکرا دەری ناخات و نابێت بە شایەت لەسەر "پێویستیی بوونی" بەدیهێنەرێکی دەست ڕەنگینی، میهرەبانی، چاکەکاری، نیعمەت بەخشی، ڕازێنەری، بەخشندەی، تاك و تەنیا؟.. ئایا نابێت بە شایەت لەسەر جوانیی میهرەبانی و، تەواویی پەروەردگارێتی‌یەکەی؟

ئەگەر بتوانیت لە زمانی هەموو درەختەکانی سەرزەوی، بە یەکەوە، ئەمە ببیستیت، ئەوا تێدەگەیت، بەڵکو بە جوانی دەبینیت کە چەندە گەوهەری جوانی بەنرخ و، مرواریی ناوازە لە گەنجینەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕیزکراون کە دەفەرموێ:

﴿يُسَبِّحُ لِلّٰهِ مَا فِي السَّمٰوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (الحشر:٢٤).

دەسا ئەی مرۆڤی بێ‌ئاگای هەژار!

ئەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات کە بەرەڵا و سەربەستە و هیچ پرسیار و وەڵامێکی لەڕێدا نی‌یە!

ئەی ئەو کەسەی نوقمی سپڵەیی و بێ‌نەزانی بووە!

خواوەندی خاوەنی جوانی و دەست ڕەنگین، بەم هەموو زمانە لەژمارەبەدەرانە، خۆی بە تۆ دەناسێنێت و خۆی لای تۆ خۆشەویست دەکات..

خۆ ئەگەر دەتەوێت لەو پێناساندنە خۆت بدزیتەوە، ئەوا دەبێ ئەو هەموو دەمانە ببەستیت و، ئەو گشت زمانانە بێ دەنگ بکەیت! دیارە ئەمەشت هەرگیزاو هەرگیز لە توانادا نی‌یە!

مادەم هەرگیز ناکرێت ئەو زمانانەی کە بەو جۆرە "یەکتایی" خواوەند ڕادەگەیەنن، بێ‌دەنگ بکرێن، ئەوا چار نی‌یە دەبێ تۆ بێ‌دەنگ بییت و گوێ لەوان ڕابگریت!

دەنا تەنها بە گوێ ئاخنین، بە پەنجەی بێئاگایی، ڕزگار نابیت. چونکە بەم کردارەت تەنها گوێی خۆت دەئاخنیت و گەردوونت پێ بێدەنگ ناکرێت. ئەوەتا سەرانسەری گەردوون و تێکڕای بوونەوەران "یەکتایی" خواوەند ڕادەگەیەنن. خۆ بەڵگەکانی "یەکتایی" خوا و زایەڵەی دەنگی ئەم بەڵگانەش، چەند شایەتێکی ڕاست و دادگەر و بەردەوام و لەبن نەهاتوون، دوائەنجام بە سەرتدا سەردەکەون و تاوانبارت دەکەن!

## پەنجەرەی بیستەم(١)

﴿فَسُبْحانَ الَّذي بِيَدِهِ مَلَكُوتِ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (يس:٨٣).

﴿وإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَـزِّلُهُ إِلاّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾ (الحجر:٢١).

﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّـمَاءِ مَـاءً فَأَسْـقَيْنَاكُمُوهُ وَمَـا أَنْتُـمْ لَـهُ بِخَازِنِين﴾(الحجر:٢٢).

هەروەك لە شتانی هەندەكی و فەرعی و سوود و ئەنجامەكاندا، "تەواویی دانایی" و "جوانیی ڕێکوپێکی" دەبینرێن، هەروەها لە توخمە هەمەکی و بوونەوەرە مەزنەكانیشدا، كە بە ڕواڵەت تێكەڵ و پێكەڵ دیارن و وا دەبەنە وەهمی مرۆڤەوە كە جێی یاری و گاڵتەوگەپی ڕێكەوت بن، دەبینیت سەرەڕای تێكەڵیی ڕواڵەتی‌یان، چەند بـارودۆخێكی وایان هەیە كە "دانایی"و "ڕێكوپێكی"یان پێوە دیارە.

بۆ نموونە:

---

(١) ڕۆژێکیان حەقیقەتی پەنجەرەی بیستەمم بە عەرەبی بەم جۆرەی خوارەوە بە دڵدا هات:

تلألؤُ الضياء من تنويرك.. تشهيرك..

تموجُ الأعصارِ من تصريفك.. توظيفك.. سبحانك ما أعظم سلطانك!

تفجّر الأنـــهارِ من تدخيرك.. تسخيرك..

تزين الأحجار من تدبيرك.. تصويرك.. سبحانك ما أبدعَ حكمتَك!

تبسّمُ الأزهارِ من تزيينك.. تحسينك..

تبرّجُ الأثمارِ من إنعامك.. إكرامك.. سبحانك ما أحسنَ صنعتَك!

تسجّعُ الأطيارِ من إنطاقك.. إرفاقك..

تـــهزّجُ الأمطارِ من إنزالك.. إفضالك.. سبحانك ما أوسعَ رحمتَك!

تحرُّكُ الأقمارِ من تقديرك.. تدبيرك..

تدويرك.. تنويرك.. سبحانك ما أنورَ برهانَك وأبـــهرَ سلطانَك! (دانەر)

"نوور" یان "ڕووناکی(الضـــوء).." بە بەڵگەی کارە پڕ لـە دانایی‌یەکانی تری، بۆ ئەوەیە کە بەدیهێنراوانی خواوەندی گەورە و، بە ویستی خوا خـۆی، لـە بـەرچاوی خەڵکی‌دا پیشان بدات و ڕایانبگەیەنێت. واتە "ڕووناکی" کار پێ‌سپێرراوێکە لـە لایـەنی بەدیهێنەری داناوە، تاکو خوای گەورە بە هۆیـەوە شتە سەیرەکانی بەدیهێنراوانی خـۆی دەربخات و لەبەر تیشکی ڕووناکی‌دا و لـە پیشـانگای بـازاڕی جیـهاندا بەدیـهێنراوە ناوازەکانی خۆی پیشان بدات.

ئنجا سـەیری "با" بکە، دەبینیـت بـۆ ئـەنجامدانی چـەندین فەرمانبـەریی گرنـگ و خزمەتگوزاریی مەزن هەمیشە لە هاتوچۆدایە. ئەو سوودە زۆر و بەنرخانەی کە لـە کـارە پڕ لە دانستەکانی سەرشانیدان، شایەتن لەسەر ئەمە.

کەواتە شـەپۆلەکانی زریـان لـە ڕاستی‌دا ژێربارخسـتن و کـار پێ‌سپاردنن لـە لایـەن بەدیهێنەرێکی داناوە، ئەو زریانە توندەش کە لـە زەریاکـاندا دەبیـنرێت، لـە ڕاستی‌دا هـی گوێ‌ڕایـەڵی کردن و پەلەکردنیانـە لـە جێ‌بەجێ کردنـی فەرمانـە پەروەردگاری‌یـەکانی خواوەنددا.

ئێستا بۆ کانی و ڕووبار و جۆگە "ئاوەکان" بڕوانە و سـەرنجی هـەڵقولانیان لـە نێـوان بەردو چیاکاندا بدە، دەبینیـت هـەرگیز ڕێکـەوت و بێ مەبەستی‌یان تێدا نی‌یە. چونکـە ئەوەندە سـوود و بـەرژەوەندیی ئـەوتۆیان لـێ پـەیدا دەبێـت کـە بـە ئاشـکرا جێ‌دەسـت و ئاسەواری میهرەبانی‌یەکی خوایی ئاشکرا و ڕوونن. ئـەو ئەنجامانـەش کـە لەوانـەوە پـەیدا دەبن، هەموویان بەپێی ژمێرکاری و پێوەرێکی وردن..

هەروەها پاشەکەوت بوون و کۆبوونەوەیان لەناو زەوی‌دا - بە هـەمان جـۆر - بـەپێی حسابێکی ورد و بـە ئـەندازەی پێویستیی زیندەوەرانـە و، تەقینەوەشـیان بـەپێی پێوەرێکـی دانایانەیە..

هەموو ئەمانە، چەند بەڵگە و شایەتێکی گۆیان لەسەر ئەوەی کـە ئـەم ژێربارخسـتن و پاشەکەوت کردنانە هەموو لە لایەن پـەروەردگارێکی دانـاوە دەکرێـن و، ئـەو تەقینـەوە و دەرپەڕین و هەڵقولانە توندوتیژەش کە لە کاتی هاتنـەدەرەوەیاندا دەیبینـین، لـە ڕاستی‌دا، هـی خۆشـی و کامەرانی‌یانـە لـە ئـەنجامدان و جێ‌بـەجێ کردنـی یەکسـەری و کتوپڕیـی فەرمانەکانی پەروەردگاردا.

ئێستا تەماشای جۆرەهای جۆر و شێوەی "بەردەکان و گەوهەرە وردەکان و سـیفەتی کانزاکان" بکە و، سەرنج لـە جوانـی و تایبـەتکاری‌یان بـدە کـە چـەندین سـوودی زۆر و

زەبەندەیان لێ پەیدا دەبێت، دەبینیت: ئەو سوودە پڕ لە دانایییانەی كە پەیوەستە پێیانەوە و.. ئەو لەگەڵ یەك گونجانە تەواوەی نێوان پێداویستییەكانی ژیان و ئەنجامەكانی ئەوان.. پاشان گونجانیان لەگەڵ داخوازییەكانی مرۆڤ و جێبەجێ كردنی پێویستییەكانی و چەندین شتی تردا..

هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە:

ئەم ئارایشت و، ڕێكخستن و، تەگبیركاری و، نەخشاندنە زۆرانە، لە لایەن پەروەردگارێكی داناوە ئەنجام دەدرێن.

ئێستا سەیری "گوڵ و میوە و بەروبوومەكان" بكە، دەبینیت:

گەشاوەیی ڕوویان و..

شیرینیی تامیان و..

جوانیی سەرنج ڕاكێش و، نەخشونیگاری ناوازەیان و..

بۆن و بەرامەی عەترینی خۆشیان..

هەموو ئەمانە، وەك دەلاڵ و بانگەوازكەر وان بۆ میوانداریی خواوەندی پەروەردگاری دەست ڕەنگین و بەخشندەی میهرەبان و.. چەند نامەیەكی پێناساندنی ئەو خواوەندەن لە بەردەم ئەو سفرە و خوانانەی كە لەسەر ڕووی تێكڕای زەویدا ڕاخراون. چونكە هەموو یەكێك لە ڕەنگە جیاجیاكان و، هەر بۆنێك لە بۆنە جۆراوجۆرەكان و، هەر یەك لە تامە جیاوازەكان، بەڵگەن لەسەر: بەدیهێنەری دەست ڕەنگینی سەخاوەتمەند و، هەریەكەیان بە زمانی تایبەتیی خۆی، ئەو بەخشندە میهرەبانە دەناسێنێت.

ئێستا تەماشای "باڵندەكان" بكە، دەبینیت گمە و خوێندن و جریوەجریوی پڕ لە ئاوازی خۆش و جۆراوجۆری ئەم باڵندانە، تەنها لە لایەن بەدیهێنەرێكی داناوەیە.. چونكە ڕاز و نیازی نێوانیان و، ئەو خەمبارییەی كە دەیهاونە ناو ئاوازەكانیانەوە، بە چەشنێكە دڵی مرۆڤ كەمەندكێش دەكات.

ئێستا بۆ "هەورەكان" بڕوانە، دەبینیت تكەی ئەو بارانەی كە بەخوڕ لێیان دەڕژێتە خوارەوە و، نەعرەتەی ئەو هەورە بروسكەیەی ناو ئاسمان، هەرگیز كارێكی هەڕەمەكی و بێ مەبەست نییە، چونكە دروستكردن و پەیداكردنی ئەو دەنگە سەیرانە لەناو ئەو بۆشاییيە فراوانەی ئاسماندا و.. باراندنی ئەو چەندین دڵۆپەی كە هۆی ژیانن و

گووشینی هەورە قورسەكان تاكو ئەو دڵۆپە بارانانەیان لێ بچۆڕێت و، دەرخواردی زیندەوەران بدرێن و فریای تینوان بخرێن..

هەموو ئەم كارانە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەكەنەوە كە:

ئەو تكەی باران و نەعرەتەی هەورانە پڕن لە دانستی خاوەن واتای بەرز و ڕەوان، وەك بڵێی ئەو دڵۆپە بارانانە، بە ناوی پەروەردگاری سەخاوەتمەندەوە ڕوو لە تینوان دەكەن و پێیان دەڵێن:

(مژدە بێت! ئێمە لە لایەن پەروەردگارێكی میهرەبانەوە بۆ لای ئێوە نێرراوین و بە هاناتانەوە هاتووین)!

ئێستاش سەیری ڕووی ئاسمان بكە و، لە نێوان تەنە لە ژمارە بەدەرەكانیدا سەرنج تەنها لە "مانگ" بدە. دەبینیت: جموجووڵی ئەو تەنە ئاسمانییانە، كە یەكێك لەوانە مانگە، بە جۆرێكی تابڵێی مەحكەم و جوان ڕێك خراون و، بە دەستی خواوەندی بەتوانای دانا و بە چەشنێكی مەزن نەخشەی بۆ كێشراوە و ئەندازەی بۆ دانراوە، چونكە چەندین دانایی بەرز كە پەیوەندییان بە زەوییەوە هەیە، بە هەریەك لە جموجووڵەكانی مانگەوە بەندن.

لەبەر ئەوەی ئەمەمان لە شوێنێكیتردا بە درێژی باس كردووە، وا لێرەدا هەر تەنها ئەم ئەندازەیەی لێ دواین.

* * *

بەم جۆرە، هەریەك لەم توخمە هەمەكییانەی باسمان كردن، هەر لە "ڕووناكی"یەوە تا دەگاتە "مانگ"، پەنجەرەیەكی یەكجار فراوان دەكەنەوە لەسەر: "بوون" و "یەكتایی" خوای گەورە.. هەروەها توانست و مەزنیی پەروەردگاریی خواوەندیش، بە پێوەرێكی گەورەتر و بە چەندین ڕەنگ و جۆری جیاواز و ڕەنگاوڕەنگ، ڕادەگەیەنن..

دەسا ئەی مرۆڤی بێئاگا!

ئەگەر دەتوانیت ئەم دەنگانە كپ بكەیت كە وەك نەعرەتەی هەوری ئاسمان دەزرنگێنەوە..

ئەگەر دەتوانیت ئەم هەموو ڕووناكییە درەوشاوانە بكوژێنیتەوە..

ئەوا ئەو كاتە دەتوانیت بەدیهێنەری بەخشندەی دەست ڕەنگین لە یاد بكەیت. دەنا بۆ لای ژیریی خۆت بگەڕێرەوە و ڕووی تێ بكە و، بڵێ:

سبحان من: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمٰوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ﴾ (الإسراء:٤٤).

## پەنجەرەی بیست و یەکەم

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ (یس:٣٨).

"خۆر" کە چرای ئەم بوونەوەرانەیە، پەنجەرەیەکی ڕوونە وەك ڕووناکییەکەی. بوونەوەران لەو پەنجەرەیەوە دەڕوانن "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەری گەردوون!

هەر دوازدە هەسارە گەڕۆکەکان - بە زەویی خۆمانەوە - کە ناوی "کۆمەڵەی خۆر"یان لێ نراوە، بەپێی ڕێسایەکی ڕێکوپێك و تەرازوویەکی ورد و داناییەکی تەواو هاتوچۆ دەکەن. هەرچەندەش لە ڕووی قەبارە و بارستایی و گەورە و بچووکییەوە جیاوازییەکی گەلێ زۆریان لە نێواندا هەیە و، سەرەڕای جیاوازیشیان لە بابەت دووری و نزیکییان لە خۆر و، جموجووڵ و خێرایی هەریەکەیان لە چاو ئەوانی تردا..

بەڵێ، سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەم هەسارانە بەردەوام لە خولگە و سووڕگەی خۆیاندا دێن و دەڕۆن و مەلەی خۆیان دەکەن و بەپێی یاسایەکی خوایی بە خۆرەوە بەندن، ئەم یاسا خواییەیە ئەوەیە کە زانایانی گەردوونناسی ناوی هێزی ڕاکێشان(الجاذبية)یان لێ ناوە. دەبینیت ئەم هەسارانە بەپێی ڕێسایەکی ورد و بە بێ هیچ هەڵەیەك، با بەئەندازەی خولەکێکیش بێت، دێن و دەڕۆن و، بە چەشنێکی ڕەها و تەواو وەك گوێڕایەڵیی نوێژکەرانی جەماعەت بۆ پێشنوێژەکەیان، ملکەچی ئەم یاسایەن.

ئەمەش بەڵگەیەکی تابلێی ڕێك و تەواوە بە پێوەرێکی گەلێ فراوان، لەسەر: "مەزنیی توانستی پەروەردگار" و "یەکێتیی پەروەردگاریی" ئەو. ئەگەر دەتوانیت بۆ خۆت مەزنیی ئەم کارە لێك بدەیتەوە، ئەوا فەرموو لێکی بدەرەوە، تاکو مەودای گەورەیی و داناییت لەوەدا بۆ دەربکەوێت کە وای لەو تەنە بێ گیان و قەبارە مەزن و بێ هەست و نەستانە کردووە کە: بەوپەڕی ڕێکی و هاوسەنگیی تەواو و، بە چەشنێکی تابلێی دانایانە و، بە چەند جموجووڵێکی جۆراوجۆر هاتوچۆ بکەن و بسووڕێنەوە. پاش هەموو ئەمانەش، بۆت دەربکەوێت کە چۆن هەموویان بەپێی ڕێسایەکی ناوازە و جوان ڕام کراون و گوێ ڕایەڵ و ژێرباری فەرمانی خواوەند خراون!

خۆ ئەگەر ڕێکەوت - با بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت - دەستی لەم کارانە وەربدایە، ئەوا تەقینەوەی گەورە گەورەی گەردوونی و بەیەکدا کەوتنی هێندە مەزنی لێ

پەیدا دەبوو کە تێکڕای گەردوونی دەڕووخاند و هەپرووون هەپرووونی دەکرد. چونکە ئەگەر "ڕێکەوت" یەکێك لەم تەنە ئاسمانییانە ڕابووەستێنێت و لە سوورگەی خۆی دەری بکات، ئەوا ڕێگا بۆ چەندین لێککەوتنی لەژمارەبەدەری تەنەکانی ناو ئاسمان خۆش دەکات..

بۆ خۆت دەتوانیت مەودای ئەو سامناکییە مەزنە لێك بدەیتەوە کە چەندەها تەنی مەزنی بە هەزاران جار لە زەوی گەورەتر بەر یەکتر بکەون!

وا کارە سەیر و سەرسووڕهێنەکانی کۆمەڵەی خۆر بە زانیاریی لە هەموو شت ئاگای خواوەند دەسپێرین و، زەینمان تەنها لە تێڕامان و سەرنجدانی گۆی زەویدا خەریك دەکەین، کە یەکێکە لە دوازدە هەسارە گەڕۆکەکان و، بەرێکی پێگەیشتووی درەختی کۆمەڵەی خۆرە..

کە سەرنج دەدەین، دەبینین:

ئەم هەسارە گەڕۆکەی خۆمان - وەك لە مەکتووبی سێ‌هەمدا ڕوونمان کردووەتەوە - بە فەرمانێکی پەروەردگارییانە دەخرێتەکار، تاکو لە ماوەی گەشت و هاتوچۆیەکی دوور و درێژدا چەندین خزمەتگوزاریی مەزن و کاری گرنگ ئەنجام بدات و، کە بە دەوری خۆریشدا دەسووڕێتەوە بۆ ئەوەیە کە مەزنیی پەروەردگاری و گەورەیی خوایەتی و، تەواویی میهرەبانی و دانایی خواوەند، بەم کارەی، دەربخات.. گۆی زەوی وەك کەشتییەکی مەزنی پەروەردگاری جیهانیان وایە؛ پڕە لە بەدیهێنراوە سەرسووڕهێنەرەکانی خواوەند.. یان وەك خانوویەکی هاتوچۆکەر وایە؛ خواوەند بەندە خاوەن هەست و شعوورەکانی خۆی تێدا نیشتەجێ کردوون و، بۆ مەبەستی گەشتوگوزاری ئەم لا و ئەو لای ئەم بۆشاییە فراوانەی ئاسمان، هەردەم دەیانگێڕێت و هاتوچۆیان پێ دەکات.

"مانگ"یش وەك میلەکانی کاتژمێرێکی پابەندی زەوی وایە، کاتەکانمان بۆ دیاری دەکات. جگە لەوەش کە کاتژمێری گۆی زەوییە، چەندین ئەرك و فرمانی تری لەمەڕ شوێنەکانی تری ناو بۆشایی ئاسمانی پێ سپێرراوە.

بەم چەشنە دەردەکەوێت کە ئەم هەسارە گەڕۆکەی خۆمان، لەم گەشتەیدا، ئەوەندە دانایی ورد و ئەرکی مەزنی پێ سپێرراوە، کە "بوون" و "یەکتایی" خواوەند دەچەسپێنێت و دەبێت بە بەڵگە لەسەری و، شایەتییەکی بەهێزی بە ئەندازەی هێز و

مەزنیی گۆی زەویش لەسەر ئەو "بوون" و "یەکتایی"یەی خواوەندی خاوەن توانای ڕەها، دەدات.

پاشان سووڕخواردنی دانایانەی هەسارەکان بە دەوری خۆردا و، پەیوەست بوونیان بە خۆرەوە بەهۆی پەیوەندییەکی مەعنەوی و نادیار کە پێی دەوترێت "جازیبییەت"، ئنجا ڕێکخستن و بەڕێکردنی کاری هەموویان، گەر بەپێی نەخشە و ئەندازەی پرۆگرامی دانایەکی بەتوانا نەبێت هەرگیز ناکرێت و ئەنجام نادرێت.

سەرەڕای ئەمانە، جوولانی خۆر کە بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر لە ماوەی یەك چرکەدا پێنج سەعات ڕێ ببڕێت و بەرەو بورجی "هەرقل" یان "خۆری خۆران" - بەپێی بۆچوون و بڕیاری زانایان - کارێکە بە بێ فەرمانی پادشا و دەستەڵاتداری ئەزەل و ئەبەد و بە بێ توانستی ڕەهای ئەو هەرگیز ناکرێت و نایەتەدی. وەك بڵێی خواوەندی مەزن بە سوپای کۆمەڵەی خۆر و سەربازانی گوێڕایەڵی فەرمانی خۆی، نمایشێکی سوپایانە دەنوێنێت، تاکو مەزنیی پەروەردگارێتییەکەی بۆ هەموو جیهانیان دەربخات.

ئەی کاکی گەردوونناس!

تو خوا پێم بڵێ ئایا دەکرێت "ڕێکەوت" لە کاروباری ئاوا مەزندا دەستی هەبێت؟!

ئایا هیچ کام لەو هۆکارانەی پێت وایە کاریگەرییان لە ڕووداوەکانی گەردووندا هەیە، دەتوانێت دەست بەم کارانە بگەیەنێت؟!

یان هێزێك هەیە بتوانێت توخنی ئەم کارانە بکەوێت؟

ئایا لەو باوەڕەدایت کە پادشا و دەستەڵاتدارێکی شکۆمەند دەرفەت بە هیچ هاوبەشێك - هەرچییەك بێت - بدات دەست لە کاروباری موڵکی مەزنی ئەو بدات و، بەمەش کۆڵەواری و ناتەواویی پادشا پیشان بدات؟!

نەخێر.. نەخێر..

یان ئایا دەگونجێ خواوەند کاروباری "بوونەوەران" کە بەری درەخت و ئەنجام و مەبەست و پوختەی گەردوونن، بداتە دەست بیانییەکان؟ یان دەرفەت بەو بیانییانە بدات - با بە ئەندازەیەکی زۆر کەم و بچووکیش بێت - دەست بخەنە ناو کاروباری پڕ لە دانستی خۆیەوە؟

ئایا ژیریی مرۆڤ بەوە ڕازی دەبێت کە پوختەی ئەو بەروبوومانەی درەختی گەردوون و، تەواوترین بەرهەمەکانی و، جێنشینی خواوەند لە زەویدا و، میوانی

ئازیز و بەڕێزی پادشا، واز لێ بهێنرێت و گوێی پێ نەدرێت و، جڵەوی بدرێتە دەست "سروشت" و "ڕێکەوت" و، بەمەش "گەورەیی دەسـتەڵاتداری" و "تەواویی دانستی خواوەند" لەو ئاستە بەرزەیانەوە بخرێنە خوارەوە؟

نەخێر.. نەخێر.. خوای گەورە و مەزن گەلێ لەوە بەرز و شکۆدارترە کاری وا لە موڵکیدا ڕووبدات.

## پەنجەرەی بیست و دووهەم

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الأَرْضَ مِهَاداً ۞ وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً ۞ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجاً﴾ (النبأ:٦-٨).

﴿فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللهِ كَيْفَ يُحْيِي الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم:٥٠).

ئەگەر گۆی زەوی بە "سەر"ی جەستەی بوونەوەرێکی مەزن[١] دابنێین، ئەوا سەد هەزار دەم[٢] لەم سەرەدا و، لە هەریەك لەو دەمانەشدا سەد هەزار زمان[٣] دەبینین، کە هەریەك لەم زمانانە بە سەد هەزار بەڵگە خواوەندی "واجب الوجود" و، تاك و تەنیا و، بەتوانا بەسەر هەموو شتێکدا و، زانا بە هەموو شتێك، دەچەسپێنێت و.. هەریەك لەم زمانانە سەد هەزار شایەتیی ڕاست دەدات لەسەر یەکێتی و سیفەتە پیرۆز و ناوە جوانەکانی ئەو خواوەندە.

زەوی، لە سەرەتای بەدیهاتنیدا، ماددەیەکی شل بووە. واتە: لە بارێکی شلی و تراویدا بووە، پاشان بەردە ڕەق و تەقەکان و ئنجا لەوانیش گڵ دروست کرا.

خۆ ئەگەر زەوی وەك باری یەکەمی لە دۆخی شلیدا بمایەتەوە، ئەوا ژیانی تێدا نەدەچووە سەر و، بۆ هیچ جۆرێکی نیشتەجێ بوونیش نەدەگونجا. هەروەها ئەگەر بەردە

(١) مەبەست لەو بوونەوەرە مەزنە گەردوونە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە سەد هەزار دەمی ئەوتۆ کە لە یاد و ستایش کردنی نیعمەتەکانی خواوەنددان و، زیکر و تەسبیحاتی پیرۆز بۆ مەزنی و گەورەیی خوا دەکەن و بەڵگەن لەسەر "یەکتایی" خوای گەورە. (وەرگێڕ)

(٣) لەوانەیە مەبەستی بە "زمان" لێرەدا هەموو ئەو شتانە بێت کە بەڵگەن لەسەر یەکتایی و خاوێنی و ڕێکی و جوانی و دانایی کە لە بوونەوەراندان، سەرەڕای کارە گرنگەکانی تری بوونەوەران کە تایبڵێی زۆرن و خزمەتی ئامانجەکانی "ژیان" و "بوون" دەکەن، جا هەریەك لەو کارانە بە زمانی حاڵ - وەك زمانی گوفتار - بەڵگەکانی "بوون"ی بەدیهێنەر ڕوون دەکەنەوە. (وەرگێڕ)

گەورە و ڕەقەکان هەروا بە ڕەقی بمانایەتەوە و هیچ دەستکارییەك نەکرانایە، دیارە ئەو کاتە هیچ سوودێکی لێ وەرنەدەگیرا..

کەواتە ئەو کەسەی کە دۆخێکی لەبار و شیاوی بۆ ژیان و گوزەران بە زەوی بەخشیوە، دەبێ ئەو بەدیهێنەرە دانایە بێت کە داناییە ڕەهاکەی خۆی پیشانی زەوی نشینان دەدات و، هەموو پێداویستییەکانیشیان بۆ ئامادە دەکات.

ئنجا سەرنج لە "چیا سەختەکان" بدە کە پشتی زەوی دەگرن و ڕاگیری دەکەن و، لە کاتی سووڕانەوەیدا قەبارەکەی دەپارێزن. کە سەرنج دەدەین، دەبینین لە ناوجەرگەی زەویدا چەندین ئالوگۆڕی مەزن ڕوودەدات و، لەم ئالوگۆڕانەشەوە چەندین گاز و هەڵم پەیدا دەبن کە لە ڕێی چیاکان و لە شێوەی بوومەلەرزە و گڕکانەوە دەریان دەدات. ئەمەش بۆ ئەوەی کە ئەو ڕووداوانەی ناوەوەی نەبن بە کۆسپ لە ڕێی جێبەجێ کردنی هاتوچۆ ڕێك و کارە سەرەکییە پێسپێرراوەکانیدا.

هەروەها چیاکان بە بۆنەی بەرزییانەوە، بوون بە چەند بەربەستێك و نایەڵن ئاوی دەریاکان سەربکەون و سنووری وشکانی بشکێنن و، لە هەمان کاتیشدا دەبن بە گەنجینە و عەمباری پاشەکەوت کردنی ئاو، بۆ نەهێشتنی پێداویستیی زیندەوەران..

هەروەها وەك شانەوان بۆ پاكژکردن و پوختەکردنی هەوا لە گازە زیانبەخشەکان و، ئاوی هەموو لایەکیان تێدا کۆببێتەوە و، بۆ ئەوەش ببن بە چەند گەنجینەیەك بۆ جۆرەهای جۆری کانزاکان کە بەردەوامبوونی ژیانی زیندەوەریان لەسەر بەندە.

ئەم بار و دۆخانە و گەلێ باری دۆخی تری وەك ئەمانە، شایەتن لەسەر "بوونی" خواوەندی خاوەن توانستی ڕەها و، دانا و، میهرەبان و.. بەڵگەن لەسەر "یەکتایی" ئەو.

ئەی کاکی جوگرافیازان!

پێم بڵێ ئەم هەموو کاروبارانە بە چی لێك دەدەیتەوە؟ ئایا چ ڕێکەوتێك دەتوانێت جڵەوی ئەم زەوییە پڕ لە بەدیهێنراوە سەیرانە بە دەستەوە بگرێت و، لە بۆشاییدا و تەنها لە ماوەی یەك ساڵدا ڕێگایەکی بیست و چوار ساڵیی پێ ببڕێت و بێ ئەوەی هیچ کام لەو پیشانگا سەرسووڕهێنەرانەی ناوی پەرتەوازە و پەرش و بڵاو ببن؟!

ئنجا بە وردی سەیری دروستکراوە ناوازەکانی سەر ڕووی زەوی بکە و بزانە چۆن هەرچی توخمەکانی سەر زەوی هەن، هەر هەموویان بۆ چەند کار و ئەرکێکی گرنگی دانایانە ڕام کراون، بە ڕادەیەکی وا کە بە چاوی ڕێزلێنانەوە سەیری ئەو میوانانەی

خواوەندی بەتوانای دانا دەکەن کە لە چواردەوری سفرە و خوانی سەرزەوی دانیشتوون و، بەم جۆرە - ئەو توخمانە - ڕێزیان لێ دەنێن و بۆ خزمەتی هەموو ئەو میوانانەی خواوەند ڕادەپەڕن.

پاشان بە وردی سەیری سەروسیما و ئارایشتکاری و نەخشونیگاری پێچاوپێچەکانی ڕووی گۆی زەوی بکە و، بڕوانە بۆ شێوە و ڕەنگە جوانەکانی کە بەپێی جۆراوجۆریی خاکەکەی ڕەنگەکانیش دەگۆڕێن و جۆراوجۆر دەردەچن و، هەریەکەیان دانایی و داهێنانکاریی بە جوانی تێدا دەردەکەوێت و مرۆڤ دەخەنە سەرسووڕمانەوە. فەرموو ئەوەتا جۆگە و ڕووبار و دەریا و چیاکان. هەر هەموویان، بە چەشنێك ئامادە کراون کە نیشتەجێی بوونەوەران و هۆی گواستنەوەیان بن لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر.

ئایا نابینیت کە بەوپەڕی دانایی و ڕێسایەکی بێوێنە و ناوازە ڕووی زەوی بە سەدان هەزار جۆر ڕەگەزی ڕووەك و زیندەوەران پڕ دەکرێت و، بەم جۆرە ژیانی پێ دەبەخشرێت.. پاشانیش بەهۆی مردنەوە هەموو ئەو زیندەوەرانە لە کار و فەرمانبەری و ئەرکی سەرشانیان مۆڵەت دەدرێن و وازیان لە کار پێ دەهێنرێت؟! ئەمە دیاردەیەکە هەردەم بە وردی و ڕێکوپێکی بەردەوامە، دەبینیت هەر ئەوەندەی ڕووی زەوییان لێ چۆڵ دەکرێت، سەرلەنوێ و یەکسەر بە هاوچەشنی ئەوان پڕ دەکرێتەوە!

ئایا ئەم کارە ئەوە ناگەیەنێت کە "زیندووبوونەوەی پاش مردن" کارێکی ڕەوایە و هیچ گومانێکی تێدا نییە؟ ئایا ئەم هەموو دیاردانە "شایەت"ی ڕاستگۆ نین کە بە سەدان هەزار زمان شایەتی لەسەر "بوون" و "یەکتایی" خواوەندی بەتوانای شکۆمەند و، دانا و، خاوەن کەماڵ، دەدەن؟

پوختەی قسە ئەوەیە کە:

زەوی، کە وەك "ناوجەرگە" و "دڵ"ی جەستەی گەردوون وایە، بە وێنەی پیشانگایەکە بۆ ناوبانگ دەرکردنی بەدیهێنراوە ناوازە و سەرسووڕهێنەرەکانی خواوەند و.. وەك مەحشەرێك وایە کە شتە سەیرەکانی بەدیهێنراوە جوانەکانی ئەوی تێدا کۆکراوەتەوە و.. ڕێ و شوێنی هاتوچۆی کاروانی بەدیهێنراوە زۆرەکانی خواوەندە و.. مزگەوتێکە بەندەکانی ئەو ڕێزیان تێدا بەستووە و پەرستشەکانیان تێدا بەجێ دەهێنن. ئەم گۆی زەوییە، ئەوەندە تیشکی "یەکتایی" خوا دەردەخات کە هەموو گەردوون پڕ بکات.

ئەی کاکی جوگرافیازان!

ئەگەر "سەر"ی ئەم زەوی‌یە بە سەد هەزار "دەم" خواوەندی پەروەردگاری جیهانیان بناسێنێت و، لە هەریەك لەو دەمانەشدا سەد هەزار "زمان" ببێت و، تۆیش ئەم پێناساندنە پشتگوێ بخەیت و سەرت نوقمی زۆنگاوی "سروشت" بکەیت، ئەوا بیرێك لە چارەنووسی تاوانەکەت بکەرەوە، کە پشت هەڵکردن و گوێ نەدان و ئینکاری کردنە، بزانە بەرەو چ سزایەکت دەداتەبەر؟

وریا و بێدار بە و، سەرت لە لیتاوی بۆگەنی سروشت دەربهێنە و بڵێ:

آمنت بالله ﴿الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ (يس:٨٣).

## پەنجەرەی بیست و سێهەم

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ﴾ (الملك:٢).

"ژیان": درەخشانترین و جوانترین موعجیزەکانی توانستی پەروەردگارە و.. بەهێزترین و قەشەنگترین بەڵگەکانی یەکتایی خواوەندە و.. کۆکەرەوەترین و پرشنگدارترینی ئاوێنەی درەوشانەوەکانی خواوەندی صەمەدە.

چونکە "ژیان" وەك "ڕووناکی" وایە..

هەروەك ڕووناکیی خۆر لە تێکەڵبوونی حەوت ڕەنگەکانی شەبەنگی خۆر پێکدێت، "ژیان"یش بە هەمان جۆرە، لە تێکەڵبوونی وردی چەند سیفەتێکی زۆرەوە پەیدا دەبێت..

"ژیان" وەك دەرمانێك وایە کە لە چەند ماددەیەکی زۆری جۆراوجۆر پێکهاتبێت کە بە چەشنێکی دانایانە ئەندازەی هەریەك لەو ماددانە دەستنیشان کرابن..

کەواتە "ژیان" ڕاستی‌یەکە لە چەندین سیفەتی زۆر پێکهاتووە. هەندێ لەم سیفەتە جیاجیایانەش بەهۆی ڕۆشتن و هاتوچۆیان بەناو جۆگەکانی هەستدا - کە هەریەك لەم هەستانەش ڕەنگی یەکێك لەم ناو و سیفەتانە دەگرێتەخۆ - بڵاو دەبنەوە و جیاوازی‌یان لەگەڵ یەکتر دەردەکەوێت[1].

---

(١) بۆ نموونە: هەست کردن بە "بەزەیی" لە لای زیندەوەر، نمێکە لە بەزەیی خواوەند و، تکاوەتە ناو دڵی زیندەوەرانەوە و، لە ژیانیاندا دەردەکەوێت. هەستەکانی تریش بە هەمان جۆرن. (وەرگێڕ)

بەڵام بەشی هەرە گەورەی ئەم سیفەتانە، لە نێوان ئەو هەستکردنانەدا خۆیان دەنوێنن کە "ژیانیان" زیاتر پێوە دیارە[١].

پاشان "ژیان" ڕۆزی و، میهرەبانی و، چاودێری و، داناییشی تێدایە و هەموو ئەمانە دەگرێتەوە، کە هەریەکەیان لە گەردووندا هەن و، زاڵن بەسەر کاروباری گەردوون و بەدیهێنان و بەڕێوەبردنیدا. وەك بڵێی "ژیان" بۆ هەر لایەك بڕوات، هەموو ئەوانە دەداتە بەر و لەگەڵ خۆیدا دەیانبات..

چونکە هەر ئەوەندەی "ژیان" ڕۆشتە ناو هەر لەشێکەوە یەکسەر ناوی "الحكيم"ی خواوەندی تێدا دەردەکەوێت، دەبینیت ئەو زیندەوەرە بە جۆرێکی ڕێك و "دانایانە" دەست دەکات بە بنیاتنانی خانە و هێلانەی خۆی.. لە هەمان کاتدا ناوی "الكريم"یش دەردەکەوێت، چونکە ئەو زیندەوەرە، بەپێی پێداویستییەکانی، نیشتەجێکەی خۆی ڕێکدەخات و دەیڕازێنێتەوە.. ئنجا ناوی "الرحيم" پەیدا دەبێت، ئەوەتا بۆ مەبەستی بەردەوامکردنی ژیان و گەیشتنی بەو کەماڵەی بۆی دەلوێت، چاکە و بەخشایشەکانی خۆی بە زۆر و زەبەندەیی دەنێرێت.. لە هەمان کاتدا ناوی "الرزاق" بە ئاشکرا خۆی دەردەخات، چونکە پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی ئەو زیندەوەرە، بۆ مەبەستی مانەوە و فراوان بوونی ژیانی، ئامادە دەکات، تەنانەت هەندێ لەو پێداویستییانە لەناو لەشی زیندەوەرەکەدا پاشەکەوت دەکات.

واتە "ژیان" وەك ئەو "تیشکۆ"یە وایە کە تیشکە جۆراوجۆرەکانی ڕووناکیی تێدا کۆ دەبێتەوە، کەواتە سیفەتە جۆراوجۆرەکان لەناو یەکتردا و لەناو "ژیان"دا کۆ دەبنەوە و ئاوێتەی یەکتر دەبن بە چەشنێك کە هەموو یەکێك لەو سیفەتانە بگریت هەمان سیفەتەکانی تریشە، وەك بڵێی "ژیان" یەك پارچە "زانستە".. لە هەمان کاتدا "توانستە".. هەروەها "دانستە".. "میهرەبانییە"... بە بێ جیاوازی..

"ژیان" بەم جۆرە و، لەبەر ئەم چیەتییەی کە هەموو ئەمانەی لە خۆدا کۆ کردووەتەوە، بووە بە ئاوێنەیەك ئەو "صەمەدانییەتەی" خواوەندی تێدا دەدرەوشێتەوە کە

---

(١) بۆ نموونە: هەست کردنی مرۆڤ بە "نەمری" و ئارەزوومەندیی بۆ "مانەوە" لە "ژیان"ەکەیەوە هەڵدەقوڵێت، ئەو ژیانەی کە ناوی پیرۆزی "الباقي"ی خوای گەورەی تێدا دەدرەوشێتەوە.. هەستەکانی تریشی بە هەمان جۆرن. (وەرگێڕ)

کاروبارە پەروەردگاری‌یەکانی تێدا دەردەکەوێت. هەر لەم نهێنی‌یەوەیە کە دەبینین خواوەندی "الحی القیوم" بە جۆرێکی زۆر و زەبەندە و فراوان "ژیان"ی دروست کردووە و لە هەموو جێگایەکی گەردووندا بڵاوی کردوونەتەوە و، وای لە هەموو شتێك کردووە کە بە دەوری ژیاندا بسوورێنەوە و لە پێناویدا بخرێنەکار. کەواتە بەلاتەوە سەیر نەبێت کە فەرمانبەریی "ژیان" فەرمانبەری‌یەکی گەورە و مەزن بێت..

بەڵێ، ئەنجامدانی کاری: "ئاوێنەی دەرخەر"ی "درەوشانەوە صەمەدانی‌یەکانی خواوەند" کارێکی ئاسان و فەرمانبەری‌یەکی کەم نی‌یە. ئەوەتا چەندین جۆری لەژمارەبەدەری ژیان بە چاوی خۆمان دەبینین کە هەردەم بەدی دەهێنرێن و گیانەکانیشیان - کە ئەسڵ و خودی ئەو زیندەوەرانەن - بە یەك جار دروست دەکرێن، دەبینین چەندەها جۆری زیندەوەر ڕاستەوخۆ دەنێررێنە گۆڕەپانی ژیانەوە.

ئایا هەموو ئەمانە نابن بە بەڵگە لەسەر زاتێکی مەزن و، خاوێن و، زیندوو و، ڕاگیرکەری گەردوون؟ زاتێکی ئەوتۆ کە هەرچی سیفەتی خاوێن و ناوی جوانە هەیەتی؟ بەڵگەیەکی وا ڕوون کە لەچاو: بەڵگەبوونی شتە بریسکەدارەکانی ڕووی زەوی لەسەر بوونی خۆر، گەلێ ڕوونتر بێت؟

جا هەروەك ئەو کەسەی باوەڕی بە بوونی "خۆر" نی‌یە و، لە سیفەتەکانی خۆر، کە بە ئاشکرا بەسەر شتانەوە دەبینرێن، خۆی گێل دەکات، ناچار دەبێت ئینکاریی ڕۆژی ڕووناك بکات کە بە ڕووناکیی خۆری ناوجەرگەی ئاسمان ڕوون بووەتەوە..

هەروەك ئەمە وایە.. ئەو کەسەش باوەڕی بە بوونی خواوەندی گەورەی: "الحی القیوم"و "المحیی والممیت" نی‌یە، کە تەنها ڕووناکیی ئەو خواوەندەیە بەهۆی "خۆر"ی تەنیایی(أحدیة)یەوە بەسەر هەموو بوونەوەراندا دەردەکەوێت.. ئەو کەسەی باوەڕی بەم خواوەندە نی‌یە، ناچارە ئینکاریی بوونی ئەو زیندەوەرانە بکات کە سەر ڕووی زەوی تەنانەت هەموو ڕابوردوو و ئایندەیان بە جارێ پڕ کردووە!

دیارە ئەو کاتەش هیچ شوێنێك بۆ خۆی نادۆزێتەوە، مەگەر شوێنێك کە لە پلەی ئاژەڵان سەد هێندە پەست و نزمتر بێت و، لە پایەی گیاندارەوە دابەزێتە پلەی بێ گیانەکان و، لە نەزانی‌دا زیاتر ڕۆبچێت و پتر هەنگاو بەرەو "نزمایی" بنێت!

## پەنجەرەی بیست و چوارەم

﴿لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلاّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (القصص:٨٨).

"مردن" وەکو "ژیان": بەڵگەیەکی ئاشکرا و بەهێزە لەسەر "پەروەردگاری" و "یەکتایی" خواوەند، چونکە بەپێی بەڵگەی ئایەتی پیرۆزی: ﴿الـذي خلـق المـوت والحياة﴾ و، وەك ئەوەی کە لە مەکتووبی یەکەمدا ڕوونمان کردووەتەوە:

"مردن":

نەبوون و..

لەناودان و..

لەناوچوون و..

یاریی بێ مەبەستی و..

قڕانی خۆیی و بێ خاوەن و بکەر..

نییە!

بەڵکو "مردن":

تەواو کردن و دەست پێ هەڵگرتنە لە ئیشوکار، لە لایەن بکەرێکی داناوە ئەنجام دەدرێت و..

جێ و لەش گۆڕینە و..

تەواو کردنی فەرمانبەرییە و..

دەربازبوونە لە بەندیخانەی لەش و..

بەدیهێنراوێکی ڕێکوپێکی نوێیە، کە بەپێی دانایی خواوەند بەدی هێنراوە!

بەڵێ، هەروەك هەموو بوونەوەرە زیندووەکانی سەر ڕووی زەوی بە "ژیان"یان ئاماژە بۆ "بوون" و "یەکتایی" بەدیهێنەری دانا دەکەن، هەر ئەو زیندەوەرانە بە "مردن"یشیان شایەتی لەسەر هەمیشەیی خواوەندی "زیندووی باقی" دەدەن و ئاماژە بۆ "یەکتایی" ئەو دەکەن.

جا لەبەر ئەوەی لە وتەی بیست و دووهەمدا باسی ئەوەمان کردووە کە "مردن" بەڵگەیەکی گومانبڕ و بەهێزە لەسەر یەکتایی و هەمیشەیی خواوەند، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەکەین، بەڵام لێرەدا تەنها سەرنجێکی گرنگ لەم بارەیەوە ڕوون دەکەینەوە، کە ئەمەیە:

هەروەك زیندەوەران بە "بوون"یان بەڵگەن لەسەر بوونی بەدیهێنەری زیندووی خۆیان، بە "مردن"یشیان شایەتی لەسەر هەمیشەیی و یەكتایی خواوەندی زیندووی باقی دەدەن..

با ڕووی زەوی لەسەر ئەمە بگرین بە شایەت:

ئەو ڕێكوپێكی‌یە جوانەی كە خۆی بەسەر تێكڕای گۆی زەوی‌دا ڕاخستووە و بە ئاشكرا دیاردەكانی دەبینین، شایەتێكی ڕاستە لەسەر بەدیهێنەری بەتوانا..

ئەوەتا كاتێ كە زستان دێت و بە كفنە سپی‌یە بەفرینەكەی خۆی ڕووی بەهارانەی زەوی دادەپۆشێت و، ئەو زیندەوەرانەش كە لەسەری‌دا دەژیان، لە ئاسۆی مردندا ئاوا دەبن.. ئا لەو كاتەدا، دیمەنی ئەم مردنە سەرنجی مرۆڤ لەم كاتەی ئێستاوە بۆ زۆر دوورتر دەگوێزێتەوە و، سواری كەشتیی ئەندێشەی دەكات تا بەرەو ئەو ڕابوردووانە بڕوات كە تەرمی هەموو بەهارە مردووەكانی زووتریان تێدا ئەسپەردە كراوە..

ئەو كاتە چەندین دیمەنی "ژیان" و "مردن" كە لەچاو ئەم دیمەنەی كاتی ئێستادا گەلێ زۆرتر و فراوانترن، لە بەردەم نیگای بینینی مرۆڤدا دەردەكەون. چونكە هەریەك لەو بەهارە كۆچكردووە لەژمارە بەدەرانەی پێشوو، پڕ بە قەبارەی زەوی، لە موعجیزەكانی توانستی خواوەند پڕ بووبوون.

ئەم دیمەنە جێی ئەوە لە هەستی مرۆڤدا دەكاتەوە كە: لە بەهاری داهاتوویشدا چەندین بوونەوەری زیندووی تر دێن و سەرلەنوێ سەر ڕووی زەوی پڕ و ئاوەدان دەكەنەوە.

بەم جۆرە بۆمان دەردەكەوێت كە مردنی بەهار، بە پێوەرێكی زۆر مەزن و شێوەیەكی یەكجار جوان و، هێزێكی گەورە، شایەتی لەسەر: بەدیهێنەری شكۆمەند و.. بەتوانای كامڵ و.. زیندووی ڕاگیركەری گەردوون و.. "نووری هەمیشەیی" دەدات و، ئاماژە بۆ یەكتایی و هەمیشەیی ئەو دەكات.

ئیتر ئەم "مردنە" ئەوەندە بەڵگەی ڕوون دەخاتە بەرچاو كە بە ئاشكرا هیچت بۆ نەمێنێتەوە و بڵێیت:

"آمنت بالله الواحد الأحد"!

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە كە:**

بەپێی ئەو دانایی‌یەی لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەیە كە دەفەرموێ:

**﴿ويحيي الأرض بعدَ مَوْتِها﴾**..

ئەوا ئـەم زەوی‌یـە زینـدووە هـەروەك بـە "ژیـان"ی شـایەتی لـەسـەر بەدیهێنـەری دانـای خۆی دەدات، بە "مردن"یشی سەرنجی تێرامانی مرۆڤ بۆ لای موعجیزەکانی توانستی خـوای گـەورە ڕادەکێشـێت کـە هـەردوو بـاڵی: "ڕابـوردوو" و "داهـاتوو"یـان ڕازاندووەتەوە. کەواتە خواوەند بەم مردنەی زەوی، لەبریی یـەك بـەهار، هـەزاران بـەهار پیشانی مرۆڤ دەدات. چونکە لە بریی ئەوەی تەنها یـەك موعجیزە - واتـە یـەك بـەهار - شایەتی توانستی خوای گەورە بێت، لە بریی ئەوە، بەم مردنـەی کـە بەهاری ئێستای پێ بەسەر کرد، هەزاران موعجیزە لەسەر ئەو توانستەی خۆی دەگرێت بە شایەت.

کەواتە هەریەك لـەو هـەزاران بـەهارە مردووانـەی پێشـوو، شـایەتی‌یەکی زۆر بـەهێزتر دەدەن، لـەم ڕووەوە، لـەچاو شـایەتیی بـەهاری ئێستا. چونکـە ئـەو بـەهارەی کـە مـرد و کۆچی بەرەو ڕابوردوو کرد، هاودەم لەگەڵ ئەو هۆیانەدا کۆچی کرد کە تەنیا هۆکـاری ڕواڵەتیی پەیدابوونی ئەو بوون و، سیفەتی مانەوەیان نەبوو. کەواتـە ئـەو هۆکارانـەی کـە دێن و دەڕۆن هەرگیز هیچ کاریگەری‌یەکیان لە هێنـانی بەهاری نـوێ لـە جێـی بـەهاری پێشووی کۆچکـردوودا نی‌یـە، بـەڵکو هـەر تەنـها خواوەنـدی بـەتوانای شـکۆمەندە، کـە هـەرگیز نـەمانی بۆ نی‌یـە، سـەرلەنوێ بـەهار بـەدی دەهێنێتـەوە و، بـەم شـێوە جـوان و خەملاوەی کە دەیبینین، ڕەوانەی ئەم گۆڕەپانە لەبەرچاوەی ئێمەی دەکات.

بـەڵام ڕووەکـانی تـری زەوی کـە لـە داهـاتوودا دێـن و، بـە گوڵـزاری ئـەو بەهارانـە دەخـەملێن کـە ژیانیـان تێـدا دەبووژێتـەوە، شـایەتی‌یەکی زۆر بـەهێز و مەحکـەمتر دەدەن لەچاو ئەم بەهارەی ئێستادا. چونکە هەریەك لەو بەهارانەی کـە لـە داهـاتووەوە دێـن، لـە هیـچ و نەبوونـەوە دێـن و پـەیدا دەبـن و بۆ جێـی دیـاریکراو دەنێررێن و، ئنجـا فـەرمانی تایبەتی‌یان پێ دەسپێررێت.

دەسا ئەی خڵتان و نوقم بووی ناو لیتاوی سروشت!

یەکێك کە دەستی دانایی و توانـای خـۆی لـە هـەموو ئـەو ئایندانـەی کـە دێـن و، جێ پەنجـەی ئـەم دەستەشـی لەسـەر ڕووی هـەموو ئـەو ڕابوردووانـەی کـە ڕۆشـتن، دەرنەکەوێت.. چۆن دەتوانێت و بۆی دەکرێت دەست لە کاروباری ژیانی ئـەم زەوی‌یـە وەربدات؟

ئایا دەکرێت ڕێکەوت و سروشت کە وەك تۆ خاوەنی هیچ شتێك نین، دەسـت بخەنـە ناو کاروباری ژیان لە ڕووی زەوی‌دا؟

جا ئەگەر ڕاست دەکەیت و دەتەوێت خۆت لەم قوڕاوە ڕزگار بکەیت، ئەوا فەرموو لەم ڕاستی‌یە نزیك ببەرەوە و بڵێ:

ئەگەر "سروشت" شتێکی خاوەن "بوون" بێت، ئەوا تەنها دەفتەری توانستی خوای گەورەیە و.. "ڕێکەوت"یش تەنها پەردەی دانایی شارراوەی خوایە کە نەزانیی ئێمە دادەپۆشێت!

## پەنجەرەی بیست و پێنجەم

بێ گومان "لێدراو" بەڵگەی بوونی بکەرێکە کە "لێدەر"ە.. هەروەها "شتی بە وردی دروستکراو" داخوازی بوونی دروستکەرێکی "وردەکار"ە.. بوونی "منداڵ" داخوازی بوونی "باوك"ە.. "خواردوە" پێویستی بە "سەرەوە" هەیە و دەبێ لای سەرەوەی ببێت.... هەروەها تا دوایی..

زانایان بەم چەشنە سیفەتانە دەڵێن: شتە گوێرەیی‌یەکان(الأمور الإضافية، النسبية) واتە هیچیان بێ ئەوی تر نایەتەدی.

جا هەرچی‌یەك لەم شتە گوێرەیی‌یانەی کە لە جۆری "ممکن"دا هەن، چ لە شتە هەندەکی و چ لە هەمەکی‌یەکانی گەردووندا، هەموویان بەڵگەن لەسەر بوونی "وجوب"و.. هەموو ئەو کارتێکراوی(إنفعال) و کارئەنجامدراوی‌یانەی لە هەمووواندا دەبینرێن بەڵگەی کاری یەك بکەرن و.. ئەو بەدیهێنراوی‌یەش کە لە هەموویاندا دیارە بەڵگەیە لەسەر بوونی "بەدیهێنەرێتی" و.. ئەو زۆری و پێکهاتوویی‌یانەش تیایاندا دەبینرێن بەڵگەن لەسەر بوونی "تاکی".

کەواتە "وجوب" و "کار" و "بەدیهێنەرێتی" و "تاکی" بێ هیچ گومان و پێویست بوونێك بە بەڵگە، داخوازی کەسێك دەبن کە سیفەتەکانی: "واجب و، بکەر و، بەدیهێنەر و، تەنیا"ی ببێت.. کەسێك بێت کە "مومکین و، کارتێکراو و، بەدیهێنراو و، زۆر و، پێکهاتوو" نەبێت.

بەپێی ئەم بناغەیە:

هەرچی‌یەك لە گەردووندا هەیە لە بابەتەکانی: "ئیمکان و، کارتێکراوی و، بەدیهێنراوی و، زۆری و، پێکهاتوویی" شایەتی‌یەکی تابلێی ڕوون و ڕەوان دەدەن لەسەر زاتی: "واجب الوجود و، تاك و، تەنیا و، بەدیهێنەری هەموو شتێك، ئەو کەسەی کە هەرچی‌یەکی بوێت دەستبەجێ دەیکات و ئەنجامی دەدات".

**بە پوختی:**

هەروەك:

"وجوب" لەناو "ئیمکانەوە" و..

"کار" لە ڕێی "کارتێکراوەوە" و..

"تاکی" لەناوەندی "زۆری‌یەوە"..

دەبینرێن و، بە چەشنێکی گومانبڕ هەریەکەیان بەڵگەیە لەسەر ئەوی تر.. بە هەمان جۆر ئەو سیفەتانەش کە بە بوونەوەرانەوە دەبینرێن، وەك: "بەدیهێنراوی" و "ڕۆزی‌دراوی" بەڵگەیەکی گومانبڕی ڕوونن لەسەر کاروباری "بەدیهێنەری" و "ڕۆزیدەری". کەواتە بوونی ئەم سیفەتانە - بێ هیچ گومانێك - خۆی لە خۆی‌دا بەڵگەیە لەسەر: "بەدیهێنەر و، ڕۆزیدەر و، دروستکەر و، میهرەبان و.. هتد".

واتە: هەرچی بوونەوەر هەیە، بە بۆنەی ئەو سەدان سیفەتانەی کە هەیەتی، سەدان جار شایەتی لەسەر بوونی زاتی بێ‌گەردی "واجب الوجود" و ناوە جوانەکانی دەدات.

جا ئەی برای مرۆڤ!

ئەگەر ئەم هەموو شایەتی‌یانە وەرنەگریت، ئەوا دەبێ ئینکاریی ئەم هەموو سیفەتانە بکەیت!

## پەنجەرەی بیست و شەشەم [1]

هەرچی جۆرەکانی "جوانی"ی ئاشکرا هەن کە لەسەر ڕووی ئەو بوونەوەرانەی بە پەلە نامێنن و ئاوا دەبن، دەدرەوشێنەوە، پاشان تازەبوونەوە و بەدوای یەکدا هاتنی ئەم جوانی‌یە لەگەڵ تازەبوونەوەی ئەم بوونەوەرانە و، بەردەوامبوونی ئەو جوانی‌یە لەگەڵ بەردەوامبوونی ئەمان.. ئەوە دەردەخات کە هەموو جۆرەکانی ئەو جوانی‌یانە تەنها سێبەرێکن لە سێبەرەکانی "جوانی"یەکی هەمیشەیی کە نەمان و لەناوچوون نایەتە ڕێی. ئەمەش کتومت وەك درەوشانەوە و بریسکانەوەی بلقی سەر ئاو وایە کە هەردەم لەگەڵ تازەبوونەوەی ئەو بلقانەدا بریسکانەوەکانیشیان تازە دەبنەوە و، ئەمەش دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بریسکانەوەی کەف و بلق و شەپۆلەکانی ڕووی دەریا، چەند ئاوێنەیەکی ڕەنگدەرەوەی تیشکی خۆرێکی باقی و بەردەوامن..

---

(١) پەنجەرەیەکە بۆ ئەوانە کراوەتەوە کە دەیانەوێت لێیەوە بڕوانن، بە تایبەت ئەهلی دڵ و خۆشەویستی! (دانەر)

جا هەروەك بریسکانەوەی کەف و بلقەکانی سەر رووبار و ئاوەکان ئەمە دەگەیەنن، درەوشانەوە و بریسکانەوەی جۆرە جیاجیاکانی هاتووان و رۆشتووانی بوونەوەرانیش بەناو جۆگەی بەخوڕی "کات"دا، ئاماژە بۆ جوانی‌یەکی تری هەمیشەیی دەکات و، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەو بوونەوەرانە چەند ئاماژە و نیشانەیەکن لەسەر ئەو جوانی‌یە نەمرە.

پاشان ئەو خۆشەویستی و ئەوینە بێ‌گەرد و ڕاستەی کە لە "دڵ"ی گەردووندا لێ دەدات، بەڵگەی خۆشویستراوێکی "باقی" و هەمیشەیی‌یە. چونکە وەك هیچ شتێك لە بەری درەختدا نی‌یە کە لە خودی درەختەکەدا نەبێت، ئەوینی خۆش و بەتامی خوایی‌یش وەهایە، کاتێ بەسەر دڵی مرۆڤدا - کە بەری درەختی گەردوونە - زاڵ دەبێت، ئەوە دەردەخات کە ئەوینێکی بێ‌گەرد و خۆشەویستی‌یەکی ڕاست، بە هەموو شێوە و جۆرێکی جیاجیا، لە قەوارەی تێکڕای گەردووندا جێگیر بووە و، بە چەند شێوەیەکی جیاجیا و جۆراوجۆر دەردەکەوێت.

جا ئەم خۆشەویستی‌یەی کە دڵی گەردوونی کردووە بە هی خۆی و بەسەریدا زاڵ بووە، خۆشویستراوێکی نەمر و هەمیشەیی ڕادەگەیەنێت.

پاشان ئەو کێش‌بوون(إنجذاب)ەی کە لە دڵی مرۆڤە بێدار و سەرڕاست و دەروون بێ‌گەردەکاندا قوڵپ دەدات و هەستی پێ دەکەن.. ئەو تاسەیەی کە لە خۆیاندا شکی دەبەن و خەوی لێ زڕاندوون.. ئەو ڕاکێش و بکێشانەی لە ناوەوەی خۆیاندا هەستی پێ دەکەن.. ئەو تاسە و شەوق و بێ‌تاقەتی‌یەی لە سنگیاندا هەڵدەقوڵێت.. ئەوە دەگەیەنن کە هەناوی گەردوونیش دووچاری هەمان ئەوین بووە کە مرۆڤی پێوە دەتلێتەوە و، لە ناوەندی ئەم کێشمەکێشەدا، کە بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر دەردەکەون، وەختە لەتوپەت ببێت.

جا ئەم ڕاکێشانەش لە ڕاکێشەرێکی ڕاستەقینە و بکێشێکی هەمیشەیی‌یەوە نەبێت، هەرگیز نایەتەدی و پەیدا نابێت.

پاشان ئەوانەی کە دارای ناسکترین هەست و شعوورن و، خاوەنی ڕووناکترین دڵن لە بەرەی مرۆڤدا، کە ئەولیا و پیاوچاکانی ئەهلی کەشف و شهوودن، بە یەك دەنگ هەموو ڕایانگەیاندووە کە تاریکایی دەروونیان بە هەڵهاتنی خۆری ڕووناکی

درەوشـــانەوەكانی خـــواوەندی شـــکۆمەند پەرتـــەوازە بـــووە و نـــەماوە و، شـــیرینیی خۆناسـاندن و خۆ خۆشەویست کردنی خواوەندی شکۆمەندیان چەشتووە..

جا ئـەم ڕاگەیاندنـەی ئـەوان، شـایەتێکی گۆیایە لـەسـەر بوونـی خـواوەنـدی "واجـب الوجود" و، لەسـەر خـۆ خۆشەویسـت کردنـی خـۆی لـە لای مـرۆڤ لـە ڕێـی ئـەو پیاوچاکانەوە.

پاشـان ئەو قەڵەمی جوانکاری و ئارایشـتدانەی کە نەخشـونیگارە ناوازەکانی خۆی - بە داهێنانێکی بێ وێنە - لەسەر ڕووی بوونەوەراندا دەنەخشێنێت، بە ئاشکرا بەڵگەی جوانیی ناوەکانی خاوەنی ئەو قەڵەمە داهێنکارەیە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە:

ئەو جوانیـیەی لە ڕووی گەردووندا تیشکی دەدرەوشێتەوە..

ئەو ئەوینەی دڵی پێی لێدەدات..

ئەو ڕاکێشانەی سنگ و دەروونی ئەوی پڕ کردووە..

ئەو "کەشف و شهوود"ەی چاوی گەردوون دەیبینێت..

ئەو جوانی و داهێنانەی لە تێکڕای هەموو گەردووندا هەیە..

هەموو ئەمانە:

پەنجەرەیـەکی ڕێـك و ڕوونـاك و درەخشـانن لـە بـەردەم ژیـری و دڵـە بێدارەکـاندا و، خواوەندی جوان و شکۆمەندی لێوە دەردەکەوێت، ئەو خـواوەندەی کـە خـاوەنی نـاوی جوانە و، خۆشەویستی باقی و نەمر و هەمیشەیی و، پەرستراوی ئەزەلییە.

دەسا ئەی لەخۆبایی و نوقم بووی ناو تاریکستانی ماددییەت!

ئەی بێئاگا و گەوزاوی ناو تاریکایی وەهم و، خنکاوی پەتی گومان!

فەرموو: بۆ لای ژیریی خۆت بگەڕێرەوە و..

بە چەشنێك کە لەگەڵ پایەبڵندیی مرۆڤدا بشێت، بەرز بەرەوە و..

لەم چوار پەنجەرەیەوە بڕوانە و..

جوانیی "یەکتایی" ببینە و..

"ئیمانی تەواو" دەستی خۆت بخە و..

ببە بە مرۆڤێکی ڕاستەقینە!

## پەنجەرەی بیست و حەوتەم

﴿اللهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ (الزمر:٦٢).

كە دەڕوانینە هەموو "هۆكار" و "بەهۆكراوەكانی" بوونەوەرانی ناو گەردوون، دەبینین:

بەرزترین و بەڕێزترین "هۆكار" تابلێی دەستی كورتە و ناگاتە نزیكترین مەودای هیچ "بەهۆكراوێك" و لەوەشدا دەستەپاچە و كۆڵەوارە كە بتوانێت سەر دەربكات چی لەم هۆكاری‌یەوە پەیدا دەبێت!

كەواتە "هۆكارەكان" جگە لە چەند پەردەیەك هیچی تر نین. ئەو شتەیش كە "بەهۆكراوەكە - بەدیهێنراوەكە" بەدی دەهێنێت، هەرگیز "هۆكارەكان" نین، بەڵكو شتی تری جگە لەوانە. با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بكەینەوە:

هێزی پارێزگار(الحافظة)ی زەینی مرۆڤ كە بارستایی‌یەكەی تەنها ئەوەندەی تۆوە خەرتەلەیەك دەبێت و، لە گۆشەیەكی مێشكی‌دا دانراوە، وەكو كتێبێكی گەورەی پڕ لە زانیاری، بەڵكو وەك كتێبخانەی سەرگروشتەی ژیانی مرۆڤێك دێتە بەرچاومان. چونكە هەموو بەڵگەنامەكانی ڕووداوەكانی ژیانی ئەوی تێدایە، بێ هیچ تێكەڵبوون و لێ تێكچوونێك..

ئایا ئەوە چ هۆكارێكە دەتوانێت سەر دەربهێنێت و بۆ ڕوونكردنەوە و لێكدانەوەی ئەم موعجیزە ئاشكرایەی توانستی خوای گەورە بێتە پێشەوە و بە هی خۆی لە قەڵەمی بدات؟..

ئایا چرچولۆچ و پێچاوپێچەكانی "مێشك"؟ بۆچی ژیری ئەوە پەسەند دەكات كە ئەمانە هۆی پاراستن و تۆماركردنی ئەم هەموو زانیاری‌یانە بن؟..

یان گەردیلەكانی خانەكانی مێشك، كە دارای هیچ هەست و شعوورێكی ئەوتۆ نین كە بتوانێت شت بپارێزێت و هەڵی بگرێت و تۆماری بكات؟

ئەم موعجیزە ئاشكرایە جگە لە داهێنانی "بەدیهێنەرێكی دانا"، هی هیچ كەسێكی تر نی‌یە و نابێت. ئەو بەدیهێنەرە دانایە "هێزی پارێزگار"ی مرۆڤی وەك كتێب و تۆمارێك بەدی هێناوە كە كردەوەكانی ئەوی لەسەر لاپەڕەكانی‌دا تۆمار كردووە، تاكو هەردەم

ئەوەی بخاتەوە یاد کە پەروەردگاری خۆی هیچ شتێکی گەورە و بچووکی لە دەست دەرناچێت و هەموویان تۆمار و هەژمار دەکات، هەروەها بۆ ئەوەی لە بەردەم دیمەنگای مەزنی ڕۆژی قیامەتیشدا ئەو کردەوانە بخاتە ڕوو.

ئەم "هێزی پارێزگار"ەی مرۆڤ بگرە و، هەموو "بەهۆکراوەکانی" تری پێ بپێوە، وەك: هێلکە.. تۆو.. ناوك و.. هاوچەشنیان لە موعجیزە بچووك و ناوازەکان. ئەوەتا بە هەر لایەکدا چاو بگێڕیت و سەیری هەر بەدیهێنراوێك بکەیت، خۆت لە بەردەم چەندین داهێنانکاریی وا بێ وێنە و ناوازەدا دەبینیتەوە کە لە هێز و دەسەلاتی هیچ کام لە هۆکارەکاندا نییە، تەنانەت هەموو "هۆکارەکان" گەر کۆببنەوە بۆ ئەوەی ئەو بەدیهێنراوە نائاساییە دروست بکەن، ئەوا تێکڕا پڕ بە دەم دەستەوسانی و نەتوانایی و کۆڵەواری و دەستەپاچەیی خۆیان دەردەبڕن، با هەر هەموویشیان یارمەتیدەر و پشتگیری یەکتری بن!

با "خۆر" بە نموونە بهێنینەوە، کە بە لای هەندێکەوە هۆکارێکی گەورەیە:

گریمان "خۆر" خاوەنی هەست و، ویست و، هەڵبژاردن بێت.. گەر پێی بوترێت:

ئەی خۆری مەزن! ئایا دەتوانیت جەستەی تەنها یەك "مێش" بەدی بهێنیت؟

بێ گومان لە وەڵامدا دەڵێت:

ئەو ڕووناکی و گەرمی و ڕەنگانەی خوا پێی بەخشیوم، بەدیهێنانم پێ ڕەوا نابینن و، پێداویستییەکانی بەدیهێنانی تەنانەت "مێشێك"م پێ نابەخشن لە: چاو و، گوێ و، ژیان... هتد، چ جای ئەوەی کە من خۆم دارای هیچ کام لەوانە نیم.

کەواتە ئەوە کارێکە بە تەواوی لە وزەی من بەدەرە.

بەڵێ، هەروەك داهێنانکاریی ئاشکرا و جوانیی ناوازەی "بەهۆکراوەکان" دەستی "هۆکارەکان"ی لە توانای "بەدیهێنان" دوورخستەوە و، بە زمانی حاڵ ڕێنمایییان کردین بۆ لای "هۆساز"ەکەیان و هەموو کاروبارێکیان دایە دەستی خواوەند، وەك ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ﴾ (هود:١٢٣)..

بە هەمان جۆر، ئەو ئەنجام و سوودانەش کە لە "بەهۆکراوەکان"ەوە پەیدا دەبن، هەموویان بە ئاشکرا ئەوە دەردەبڕن کە: لە پشت پەردەی: "هۆکارەکان"ەوە، پەروەردگارێکی دەست ڕەنگین و، دانا و، میهرەبان هەیە و، ئەم شتانەش کە ئێمە

دەیانبینین هەموویان دروستکراو و داهێنان و بەدیهێنانی ئەون. چونکە "هۆکارەکان" - کە بێ هەست و نەست بن - تابلێی لەوەدا دەستەوسانن کە تێبینیی تەنها یەك سوود بۆ یەك بەدیهێنراو بکەن. ئەو بەدیهێنراوە(بەهۆکراوە)ی کە نەك تەنها یەك دانایی، بەڵکو چەندین دانایی زۆر و زەبەندە و سوودی جۆراوجۆری پێوە بەندە. واتە: تەنها پەروەردگاری دانا و دەست ڕەنگینە کە شتان بەدی دەهێنێت و بۆ ئەم جیهانەیان دەنێرێت و ئەو سوودانەش دەکات بە ئامانجی دروستبوونیان.

بۆ نموونە:

"هۆکارە ئاشکراکان"ی پێکهاتنی "باران" گەلێ لەوە دەستەپاچەترن کە بەزەیییان بە زیندەوەراندا بێتەوە، یان کاروباری زیندەوەران ڕەچاو بکەن و بەو پێیە باران ببارێنن!

کەواتە ئەو کەسەی ڕۆزیی زیندەوەرانی خستووەتە ئەستۆی خۆیەوە، تەنها ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەیە کە بەزەیی پێیاندا دێتەوە و بارانیان بۆ دەبارێنێت و لە کاتی پێویستدا فریایان دەکەوێت. وەك بڵێی "باران" لەبەر ئەو هەموو شوێنەوارە زۆرەی میهرەبانی و بەزەیی و سوودە زۆرانەی تیایاندایە، خۆی لە خۆیدا "میهرەبانییەکی بەرجەستەیە". ئا لێرەشەوەیە کە ناوی "ڕەحمەت" واتە میهرەبانییان لە "باران" ناوە.

پاشان ئەو ئارایشتکارییە ناوازە و جوانییە لەبەرچاوەی بەسەر ڕووەك و زیندەوەران و ڕووی تێکڕای بوونەوەرانەوە دیارن و، گشت دیاردە جوانییەکانی تری ئەم بوونەوەرانە، ئەوە دەگەیەنن کە لە پشتی پەردەی غەیبەوە کارسازێك هەیە دەیەوێت لە ڕێی ئەم بەدیهێنراوە جوان و ناوازانەیەوە، کە بەڵگەی "پێویستیی بوون" و "یەکتایی" ئەون، خۆی لە لای بەدیهێنراوانی خۆشەویست بکات.

کەواتە ئەو ئارایشتە جوانەی لە دووتوێی شتاندا هەیە و..

ئەو جوانییە بێ وێنانەی لە ڕواڵەتیاندا دەبینرێن و، چۆنێتییەکەیان کە "دانایی" دەنوێنێت..

هەموو ئەمانە، بەڵگەن لەسەر بوونی دوو سیفەت کە بریتین لە: "خۆناساندن" و "خۆ خۆشەویست کردن".

دیارە ئەم دوو سیفەتەش بە ئاشکرا شایەتن لەسەر:

"بەدیهێنەرێکی بەتوانای ناسراوی خۆشەویست".. جگە لەو شایەتییەش کە لەسەر "یەکتایی" ئەوی دەدەن.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:**

ئەو "هۆکارە"ی ئێمە بە شتێکی تابلێی ئاسایی و بێ‌دەستەڵات و کۆڵەواری دەبینین، "بەهۆکراو" و بەدیهێنراوێکی دراوەتەپاڵ کە لەوپەڕی نایابی و وردەکاری و بەنرخیدایە..

جا ئەم "بەهۆکراوە" بەدیهێنراوەی کە بە چەشنێکی زۆر ورد دروستکراوە، هەر خۆی دەستی ئەو "هۆکارە" کۆڵەوارە دەباتە دواوە و دووری دەخاتەوە لەوەی کە ئەو بەدیی هێنابێت.

پاشان ئامانج و مەبەست و سوودەکانی دروستبوونی بەدیهێنراوە "بەهۆکراوە"کە، "هۆکارە" نەزانە بێ گیانەکان لە نێوان خۆیاندا لادەبەن و، خۆیان بە دەستی خواوەندی بەدیهێنەری دانا دەسپێرن.

پاشان ئەو ئارایشتە نەخشاوانەی سەر ڕوخساری "بەهۆکراوەکان" و.. لایەنە سەرسوورهێنەرەکانی میهرەبانیی خواوەندیش کە بە سیمایانەوە دەردەکەون.. هەموو ئەمانە، ئاماژە بۆ"بەدیهێنەرێکی دانا" دەکەن، کە دەیەوێت "توانست"ی خۆی بە بەدیهێنراوە خاوەن هەستەکانی بناسێنێت و خۆی لای ئەوان خۆشەویست بکات.

ئەی هۆپەرستی هەژار!

ئەم سێ ڕاستی‌یە گرنگەی خستمانە بەردەستت، بە چی لێك دەدەیتەوە و.. چۆن دەتوانیت بە گومان و ئەندێشەکانت خۆت قایل بکەیت؟

ئەگەر مرۆڤێکی هۆشمەندیت، ئەوا پەردەی "هۆکارەکان" بدڕێنە و بڵێ:

(هەر خوای گەورەیە کە تەنیا و بێ‌هاوبەشە و، بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

بەم جۆرە خۆت لە گومانە ڕێ لێ ونکەرەکان ڕزگار بکە.

## پەنجەرەی بیست و هەشتەم

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّموَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذلِكَ لآيَاتٍ لِلْعالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢).

کە سەرنج لەم بوونەوەرانە دەدەین، ئەوا لە هەموو شتێکدا، هەر لە خانەکانی جەستەوە هەتا دەگاتە تێکڕای جیهان بە گشتی، دانایی‌یەکی گشتی و ڕێکوپێکی‌یەکی وردی تێدا دەبینین..

هەروەها کە سەیری خانەکانی لەش دەکەین، هەست دەکەین بەپێی فەرمانەکانی ئەو کەسەی چاوی لە بەرژەوەندی‌یەکانی هەموو جەستەوەیە و کاروباریان بەڕێوە دەبات، کارسازی‌یەك هەیە کە بەوپەڕی گرنگی کاروباری ئەو خانە هەرە بچووکانە ڕێکدەخات.

هەروەك بەشێك لە خۆراك بە شێوەی "چەوری" لە ناوەوەی جەستەدا پاشەکەوت دەکرێت، تاکو لە کاتی پێویستدا بەکاربهێنرێت، بە هەمان جۆر ئەو خانە بچووکانەش توانایەکی تایبلێی وردی پاشەکەوت کردنیان هەیە، کە بەوپەڕی دانایی بەڕێوە دەبرێت..

پاشان کە سەیری ڕووەکەکان دەکەین، دەبینین بە پەروەردەکردنێکی تایبەتیی وەها سەرپەرشتی دەکرێن کە ڕووەك بەرەو مەبەستی خۆی سەردەخات، لە نێوان بەرنامەیەکی دانایانەی وەهاشدا کە لەوە مەحکەمتر هەرگیز بە ئەندێشەی کەسدا نایەت..

کە سەیری زیندەوەران دەکەین، دەبینین لە ناوجەرگەی کەرەمێکی هەرە زۆردا دەژین..

کە سەیری گۆشە و پایە و لاکانی ئەم گەردوونە مەزنە دەکەین، دەبینین بەڕێوەبردن و کارسازی‌یەکی لەوپەڕی مەزنی‌دا لە هەموو لایەکیەوە دەورەی داوە و، ئەم گەردوونە بەرەو چەندین ئامانج و مەبەستی گەورە گەورە دەبەن..

کە سەیری تێکرای گشتیی ئەم گەردوونە دەکەین، وەك وڵاتێکی ڕێکوپێك، یان شارێکی قەشەنگ، یان کۆشك و تەلارێکی بڵند لە بەرچاوماندا خۆی دەنوێنێت و، چەندین ڕێسای وردەکاریی وای تێدا دەبینین کە گەردوون بەرەو گەیشتن بە چەندین دانایی و مەبەستی بەرز بەرز دەبەن و بەرزی دەکەنەوە..

جا هەروەك لە "هەڵوێستی یەکەمی وتەی سی و دووهەم"دا چەسپاندمان:

بوونەوەران لەناو خۆیاندا، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان، بە پەیوەندی‌یەکی مەعنەویی ئەوەندە توندوتۆڵ پەیوەستەی یەکترن کە دەرفەتیان بە ئەندازەی یەك گەردیلەیش بۆ دەست تێوەردانی هیچ هاوبەشێك نەهێشتووەتەوە. چونکە گەر کەسێك هەموو گەلەستێرە و ئەستێرە و هەسارەکان نەکات بە ژێربار و ڕامکراوی فەرمانی خۆی و، جڵەوی هەموویانی بەدەستەوە نەبێت و دەستکاریی کاروباریان نەکات.. هەرگیز ناتوانێت فەرمانی خۆی تەنانەت لە تاکە گەردیلەیەکیشدا جێ‌بەجێ بکات.

خۆ ئەگەر (بە دەستەواژەیەكی تر) ئەمە دەربڕین، دەڵێین:

(ئەو كەسەی پەروەردگاری ڕاستەقینەی یەك دانە گەردیلـە بێـت، دەبێ هـەر ئـەویش خاوەنی گشت كاروبارەكانی هەموو گەردوون بێت).

لەبەر تیشكی ڕوونـاكیی ئـەوەی لـە هەڵوێستی دووهـەمی وتـەی سـی و دووهــەمدا چەسپاندوومانە و ڕوونمان كردووەتەوە، دەڵێین:

ئـەو كەسـەی نـەتوانێت بەسـەر هـەموو ئاسمانـەكاندا زاڵ ببێــت، ناشـتوانێت وێنـەی هێڵەكانی ڕوخساری مرۆڤ بكێشێت. واتە: كەسێك پەروەردگاری هەموو شتێكی نـاو ئاسمانـەكان و زەوی نـەبێت، ناشـتوانێت نیگـاری هێڵـەكانی ڕووی مـرۆڤ بكێشــێت و نیشانە جوداكەرەوەكانی تێدا دابنێت!

بەم جۆرە، پەنجەرەیەكی فراوانی بە ئەندازەی گەردوون لـە بەردەمی خۆتـدا دەبینیـت. جا ئەگەر لێیەوە بڕوانیت، ئەوا بە چاوی ژیری ئەم ئایەتـە پیرۆزانـەت بـەرچاو دەكـەوێت كە لەسەر لاپەڕەكانی گەردووندا بە پیتی گەورە و ڕوون نووسراونەتەوە:

﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُـــلِّ شَـــيْءٍ وَكِيـــلٌ ۞ لَـــهُ مَقَـــالِيدُ السَّـــمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾(الزمر: ٦٢-٦٣).

جـا ئـەو كەسـەی نـەتوانێت ئـەم پیتـە زەق و گـەورانـە ببینێــت كـە لەسـەر لاپـەڕەی بوونەوەراندا نووسراون، دەبێ یەكێك بێت لەم سێ كەسە:

یان "ژیری"ی لەدەست دابێت..

یان "دڵ"..

یاخود ئاژەڵ بێت لە شێوەی مرۆڤدا!

## پەنجەرەی بیست و نۆهەم

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الاسراء:٤٤).

لـە بـەهارێكی ئـەو دەمانـەی نـامۆ و ئــاوارە بـووم، ڕۆژێكیــان هــاودەم لەگـەڵ ئـەو نامۆییەم، لـە ئەندێشــەدا ڕۆچووبـووم و، لەگــەڵ "بـیر"دا گەشــتم دەكــرد و، بـەدەم ئەندێشـە و تێڕامانیشـەوە بـەڕێدا دەڕۆشـتم، تـا بـەم حاڵـەوە هـەنگاوەكانم بـۆ سـەر تەپۆڵكەیەكی سەوزی جوانیان بردم..

کە گەیشتم و چاوم بەم لا و ئەو لای خۆمدا گێڕا گوڵێکی گەشی زەردم بەو قەدپاڵە سەوزەوە بینی کە بە شەرمەوە بۆی دەڕوانیم و سەری هێنایە لامەوە و بە گوفتارێکی پڕ لە سۆزی خۆشەویستی لەگەڵمدا دوا.

ئەم دیمەنە گەلێ کاری تێ کردم و، هەستی بە جارێ جووڵاندم و تاسە و سۆزی لە ناخمدا بۆ چەندین گوڵی هاوچەشنی خۆی بزواند کە لە ڕۆژانی پێشووی تەمەنمدا بە یەکتر گەیشتبووین، چ لە شارەکەی خۆم (وان) و، چ لە شارەکانی تردا کە جار لە دوای جار باوەشیان بۆ نامۆیی و ئاوارەییم دەکردەوە و لە ئامێزیان دەگرتم..

یەکسەر لەمەوە، ئەم واتایەم بە دڵدا هات، وا وەك خۆی دەیگێڕمەوە:

ئەم گوڵە ناسکە - لە ڕاستیدا - "مۆر"ێکە بەسەر لاپەڕەی جوانییەوە و خواوەندی بەدیهێنەری "جوانی" نامە سەوزەکەی خۆی پێ مۆردەکات کە بۆ جیهانی ناردووە. کەواتە کەسێك ئەم گوڵە جوانە مۆر و نەخشی بێت بەسەر ئەم ڕایەخە سەوزەوە، ئەوا هەرچی جۆری ئەم گوڵەش هەن، هەموویان مۆری ئەون بەسەر ڕایەخی تێکڕای زەوییەوە و، چەند نیشانەیەکن یەکێتیی سنعەتی ئەو دەردەخەن.

دوای ئەم وێنە ئەندێشەیییە، یەکسەر ئەم بۆچوونەم بە دڵدا هات:

هەر مۆرێك بەسەر هەر نامەیەکەوە بیبێت، لە ڕاستیدا پێناسەرێکە بۆ ناسینی خاوەنی ئەو نامەیە. کەواتە ئەم گوڵە مۆرێکی میهرەبانییە بەسەر نامەکەی خواوەندی میهرەبانەوە. نامەکەش قەدپاڵی ئەم تەپۆڵکە بچووکەیە کە وشە ڕەوانەکانی: ڕووەك و گوڵ و گیاکانی تێدا نووسراون و، چەندین جۆری نەخشونیگاری دانایانەی وردەکاری تێدا هەڵکەندراوە.. کەواتە ئەم نامەیە هی خاوەنی ئەم مۆرەیە.

پاشان لەم تێڕامانەدا پتر ڕۆچووم و، بینیم ئەم قەدپاڵەم لە بەرچاودا گۆڕرا و بوو بە مۆرێکی مەزن و ڕوون بەسەر نامەی ئەم دەشتاییە فراوانەوە.. ئنجا دەشتاییەکەی بەردەمیشم وەك نامەیەکی جوانی میهرەبانیی خواوەند هاتە بەرچاو کە ئەم قەدپاڵە جوان و ڕەنگینە مۆرەکەی بوو.

ئەو بۆچوونەم منی گەیاندە ئەم ڕاستییە:

هەروەك هەرچی مۆرە بەسەر هەر نامەیەکەوە ئاماژە بۆ خاوەنەکەی دەکات.. هەموو شتێکی تریش وەك مۆر وایە، چونکە ئەو شتە هەموو شتانی دەوروبەری خۆی دەگێڕێتەوە بۆ بەدیهێنەری میهرەبانی خۆی و بەوی دەسپێرێت و، مۆرێکی میهرەبانیی خواوەندە، چونکە هەموو شتێکی دەوروبەری نامەیەکی بەدیهێنەری میهرەبانیەتی.

بەم پێیە بۆمان دەرکەوت کە هەرچی شت هەیە، دەبێت بە پەنجەرەیەکی مەزنی "یەکتاناسی"، بە ڕادەیەك کە هەموو شتێك بە خوای تاك و تەنیا دەسپێرێت. چونکە هەموو شتان، بە تایبەت زیندەوەران، دارای ئەوەندە نەخشونیگاری دانایانە و وردەکاریی ناوازەن، کە ئەو کەسەی بەم شێوەیە بەدیی هێناون، دەشتوانێت هەموو شتێکی تر بەدی بهێنێت. واتە: ئەو کەسەی نەتوانێت هەموو شتێك بەدی بهێنێت، هەرگیز ناشتوانێت یەك دانە شت بەدی بهێنێت.

ئەی مرۆڤی بێ ئاگا!

بە جوانی لە ڕووی بوونەوەران ورد بەرەوە. دەبینیت ڕووی ئەم بوونەوەرانە چەند نامەیەکی تێکەڵی یەکترن و لە لایەن خواوەندی تاك و صەمەدەوە نێرراون.. هەروەها دەبینیت هەریەك لەم نامانەش چەندین مۆری لەژمارەبەدەری "یەکتاناسی"یان لەسەر نەخشاوە.

ئایا کێ هەیە پڕ کێشیی ئەوە بکات کە شایەتیدانی ئەم هەموو مۆرە لەژمارەنەهاتووانە بەدرۆ بخاتەوە؟

چ هێزێك لە توانایدایە ئەم شایەتی‌یە ڕاستگۆیانە بێ دەنگ بکات؟

تۆیش ئەگەر بە گوێی دڵ گوێ بۆ هەرکام لەو نامانە ڕابگریت، ئەوا گوێت لێ دەبێت کە دەڵێت:

"أشهد أن لا إله إلاّ الله"!

## پەنجەرەی سی‌هەم

﴿لَوْ كانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾ (الأنبياء:٢٢).

﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إلاّ وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (القصص:٨٨).

ئەم پەنجەرەیە زانایانی زانستی "کەلام" لێیەوە ڕوانیویانە، کاتێ کە لە پێناوی چەسپاندنی "بوون"ی خواوەنددا ڕێی هێنانەوەی بەڵگەکانی "ئیمکان" و "حدووث"یان دەگرتەبەر.

ئێمەش لە کاتێکدا درێژیی ئەو بەڵگانە بە کتێبەکانی ئەو زانایانە دەسپێرین، وەك "شرح المواقف" و "شرح المقاصد"، لە هەمان کاتدا چەند تیشکێکی لێشاوی نووری

قورئانی پیرۆز لێرەدا باس دەکەین، کە لەم پەنجەرەیەوە هاتنە ژوورەوە و ڕۆشتنە ناو ناخی دڵمەوە:

"فەرمانڕەوایی" یاخود "کاربەدەستی" بە چەشنێکە هەرگیز بە هاوبەشی و مونافەسە و دەست تێوەردان قایل نابێت و دەست بە ڕوویانەوە دەنێت، لە لایەنی هەر کەسێکەوە بێن. بەهۆی ئەمەوەیە کە دەبینین ئەگەر دوو کوێخا لە یەك گوندا بێن، ئەوا ڕێسای ئەو گوندە بە جارێ تێکدەچێ و ئاسایش و حەوانەوەی خەڵکی دەشێوێت. یان ئەگەر دوو بەڕێوەبەر لە ناوچەیەك، یان دوو پارێزگار لە پارێزگایەکدا بێن، ئەوا شیرازەی کاری ئەو شوێنە دەبچڕێت و تەڕ و وشك تێکەڵ بە یەکتر دەبن. یان ئەگەر دوو پادشا لە یەك وڵاتدا بێن، ئەوا ئاشووب لە هەموو لایەکی وڵاتدا پەرە دەسێنێت و ئەوەندە ئاژاوە و پشێوی دەنێنەوە کە ئەنجامی گەلێ ناهەموار و بەسوێی لێ دەبێتەوە.

جا لە کاتێکدا "مرۆڤ" کە بێ دەستەڵات و کۆڵەوارە و هەردەم پێویستی بە یارمەتیی کەسانی تر هەیە و، جگە لە سێبەرێکی هەندەکیی زۆر لاوازی "فەرمانڕەوایی و کاربەدەستی" هیچی تری نییە، تا ئەم ڕادەیە دەست تێوەردانی هیچ کەسێك لە کاروباریدا قبووڵ نەکات و، بە توندی دەست بە ڕووی مونافیسی خۆیەوە بنێت..

بەڵێ، کە مرۆڤی کۆڵەواری بێ دەستەڵات، ئەمە حاڵی بێت، دەبێ فەرمانڕەوایی و کاربەدەستیی خواوەندی بەتوانای خاوەن توانستی ڕەها و پادشای هەرە مەزنی پەروەردگاری جیهانیان چۆن بێت؟

بۆ خۆت لە یاسای "ڕەتکردنەوەی دەست تێوەردان" بکۆڵەرەوە و، بزانە چۆن بەسەر هەموو گەردووندا زاڵ و بەدەستەڵاتە. واتە "تاك و تەنیایی" لە داخوازییەکانی "خوایەتی و پەروەردگاری"ن و لێیان جیا نابنەوە.

ئەگەر داوای بەڵگەی بێ گومان و شایەتی ڕاست لەسەر ئەمە دەکەیت، ئەوا فەرموو سەیری ئەو پێکەوەگونجانە هەرە جوان و ڕێسا یەکجار تەواوە بکە کە لە گەردووندا دەبینرێن..

کە سەیر دەکەیت، ڕێسای ناوازە لە هەموو شتێکدا دەدۆزیتەوە، هەر لە باڵە مێشێکەوە تا دەگاتە چراکانی ئاسمان. ئەم ڕێسا هەرە ڕێکوپێك و پڕ لە وردەکاری و تەواوە کارێك دەکات ژیریی مرۆڤ سەری لە بەردەمدا سووڕبمێنێت و بە سەرسامییەوە "سبحان الله" و "ماشاء الله" و "تبارك الله" بکات و، لە بەردەم مەزنیی داهێنەریدا

بكه‌وێته‌ سوژده‌بردن. چونكه‌ ئه‌گه‌ر به‌ ئه‌ندازه‌ی گه‌ردیله‌یه‌كیش جێگای هیچ هاوبه‌شێك له‌ گه‌ردووندا ببوایه‌، یان هه‌ر جۆره‌ خۆهه‌ڵقورتاندن و ده‌ست تێوه‌ردانێك له‌ كاروباری گه‌ردووندا بكرایه‌، ئه‌وا ڕێسای ئاسمانه‌كان و زه‌وی به‌ جارێ تێكده‌چوو و، شوێنه‌واری ئه‌م تێكچوونه‌ش به‌ ئاشكرا ده‌بینرا و، ئه‌م وێنه‌ ناوازه‌ و جوانه‌ی ئێستای به‌رده‌ممان نه‌ده‌ما.. فه‌رمایشتی خواوه‌ند چه‌نده‌ ڕاسته‌ كه‌ ده‌فه‌رموێ:

﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاّ اللهُ لَفَسَدَتَا﴾ (الأنبياء:٢٢)!

له‌ ڕاستی‌دا ئه‌م ئایه‌ته‌ پیرۆزه‌ی كه‌ ده‌فه‌رموێ:

﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ * ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾ (الملك:٣-٤)..

ئه‌وه‌ ده‌رده‌خات كه‌ هه‌رچه‌نده‌ (مرۆڤ) به‌ وردی و لێبڕان بۆ "ناته‌واوی" له‌ ئاسمانه‌كاندا بگه‌ڕێت، ئه‌وا به‌ مفته‌ ماندوو ده‌بێت و له‌ ئه‌نجامدا به‌ نائومێدی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌. ئه‌مه‌ش ئه‌وه‌مان تێ‌ده‌گه‌یه‌نێت كه‌ ڕێسا و ڕێكوپێكیی ناو گه‌ردوون له‌وپه‌ڕی ته‌واوی‌دایه‌. واته‌ ڕێكوپێكیی بوونه‌وه‌ران شایه‌تێكی ڕاست و بێ گومانن له‌سه‌ر "یه‌كتایی" خواوه‌ند.

◆ سه‌باره‌ت به‌ "حدووث"ه‌وه‌، زانایانی "كه‌لام" وتوویانه‌:

(ئه‌م جیهانه‌ جیهانێكی بگۆڕه‌، هه‌رچی بگۆڕیشه‌ تازه‌ په‌یدا بووه‌، هه‌موو په‌یدابوویه‌كیش ده‌بێ په‌یداكه‌ر، واته‌: به‌دیهێنه‌رێكی ببێت، كه‌واته‌ ده‌بێ گه‌ردوون به‌دیهێنه‌رێكی ئه‌زه‌لی و په‌یدانه‌بووی ببێت).

ئێمه‌یش ده‌ڵێین:

به‌ڵێ ڕاسته‌، گه‌ردوون تازه‌ په‌یدا بووه‌، چونكه‌ ئێمه‌ له‌ هه‌موو چه‌رخ و ساڵ و ته‌نانه‌ت له‌ هه‌موو وه‌رزێكدا جیهانێك ده‌بینین كۆچ ده‌كات و جیهانێكی تری ده‌چێته‌جێ.. چه‌ندین بوونه‌وه‌ر ده‌ڕۆن و هی تر دێنه‌ جێ‌یان.

ته‌نها خواوه‌ندی به‌توانای شكۆمه‌نده‌ كه‌ هه‌موو ساڵێك، به‌ڵكو هه‌موو وه‌رزێك، ته‌نانه‌ت هه‌موو ڕۆژێك ئه‌م جیهانه‌ له‌ نه‌بوونه‌وه‌ به‌دی ده‌هێنێت و، ده‌یخاته‌ پێش‌چاوی خاوه‌ن هه‌ستان، پاشان ده‌یباته‌وه‌ بۆ جیهانی په‌نهانی "غه‌یب" و هی تر ده‌هێنێته‌ جێی. به‌م چه‌شنه‌ یه‌ك له‌ دوای یه‌ك به‌ به‌رده‌وامی بڵاویان ده‌كاته‌وه‌ و، ئه‌م جیهانانه‌ به‌ شێوه‌ی زنجیره‌ له‌ دوای زنجیره‌ به‌سه‌ر ته‌نافی "كات"دا هه‌ڵده‌واسێت.

دەبینیت "بەهار" موعجیزەیەکی ئاشکرای خواوەندی بەتوانای مەزنە، کە شتانی لە نەبوونەوە تێدا بەدی دەهێنێت و، لە "نەبوون" دەم بە دەم ئەو جیهانە بەرینانە نوێ دەکاتەوە.

ئەو کەسەی کە ئەو جیهانانەی بەهار لە نێوان جیهانی مەزندا دەگۆڕێت و هەردەم نوێیان دەکاتەوە، تەنها خواوەندی پەروەردگاری جیهانیانە کە ڕووی زەویی کردووە بە سفرە و خوانێکی پڕ لە ناز و نیعمەت بۆ میوانە ئازیز و بەڕێزەکانی.

◆ لە بارەی "ئیمکان"یشەوە، زانایانی "کەلام" وتوویانە:

(هەردوو لاکەی ئیمکان یەکسانن).

واتە: ئەگەر "بوون" و "نەبوون" سەبارەت بە هەر شتێك یەکسان بوون، ئەوا دەبێ تەرجیحدەر و بەدیهێنەرێك بێت بوونی بەسەر نەبوونیدا تەرجیح بدات و تای تەرازووی "بوون"ی قورس بکات و بەدیی بهێنێت.

چونکە دیارە شتی مومکین - واتە ئەوەی کە بشێت بێت یان نەبێت - ناتوانێت شتێکی مومکینی وەك خۆی بهێنێتەدی. دەنا هاتنەبوونی مومکینی وا بریتی دەبێت لە زنجیرەیەك بازنەی داخراو لە "مومکینات"!

کەواتە پێویستە و دەبێ "بوون"ێك بێت شتان بەدی بهێنێت. واتە: دەبێ "واجب الوجود" بۆ ئەم مەبەستە بێت.

زانایانی زانستی کەلام بیری "دەور" و "تەسەلسول"یان[1] پووچەڵ کردووەتەوە و، بە تەواوی چەسپاندوویانە کە بیرێکی بەتاڵە و، زنجیرەی: "هۆکار و، بەهۆکراو"یان پچڕاندووە و، بەمەش خواوەندی "واجب الوجود"یان چەسپاندووە.

(١) دەور و تەسەلسول دوو زاراوەی فەلسەفە و زانستی کەلامن، ئەمە بە کورتی واتاکانیانە: "تەسەلسول": ڕایەکی لە ژێری دوورە و یەکێکە لە جۆرەکانی هەڵهاتن لە مەسەلەی "بوونی بەدیهێنەر". واتاکەی ئەوە دەگەیەنێت کە بوونەوەران زنجیرە لە دوای زنجیرە لە یەکترەوە پەیدا بووبن، بە بێ کۆتایی هاتن بەم زنجیرانە! زانایانی کەلام ئەم ڕایەیان پووچەڵ کردووەتەوە، چونکە وەك ئاشکرایە، ژیریی مرۆڤ بیری وا هەرگیز وەرناگرێت. نوێترین بابەتی زانستی گەردووناسیش لەم سەردەمەدا ڕای دروستبوونی گەردوونی لە ڕێی تەسەلسولەوە هەر لە بناغەدا هەڵوەشاندووەتەوە و، ئەم بیرە و بیری ئەزەلیەتی ماددەشی پووچەڵ کردووەتەوە. مەبەست بە "دەور"یش ئەوەیە کە دروستبوونی شتێك پشت بە شتێکی تری دووهەم بەستێت، ئەم دووهەمەش لە دروستبوونیدا پشت بە یەکەم ببەستێت، یان بە سێهەم، سێهەمیش بە یەکەم! ئەم گریمانەش وەك لە بەرچاوی ژیریدا بە ئاشکرا دیارە، گریمانێکی مەحاڵە و زانایانی کەلام و هەموو ژیرانیتر پووچەڵیان کردووەتەوە. بۆ زیادە شارەزابوون لە بەڵگەکانی زانیاریی کەلام لەم ڕووەوە بڕوانە: "کبری الیقینیات الکونیة"ی د.محمد سعید رمضان البوطي. (وەرگێڕ)

ئێمەیش دەڵێین:

پیشاندان و دەرخستنی مۆری تایبەتیی بەدیهێنەری مەزن کە هەموو شتێکی پێ مۆر کراوە، گەلێ ئاسانتر و بەهێزتر و روونترە لە چاو بەڵگەی بچڕاندنی زنجیرەی هۆکارەکان، بۆ مەبەستی گەیشتن بە چەسپاندنی بەدیهێنەری گەردوون!

هەموو "وتەکان" و "پەنجەرەکان" کە ئەوانیش لە وتەکانن، ئەم ڕێبازە ئاسان و بێ گومانەیان گرتووەتەبەر. لەگەڵ ئەوەشدا، باسی "ئیمکان" گەلێ فراوانە، چونکە لە چەند ڕوویەکی لەژمارەبەدەرەوە بەدیهێنەر دەچەسپێنێت و، تەنها ئەو ڕێگایە نی یە کە زانایانی کەلام بە بچڕاندنی زنجیرەی هۆکارەکان بۆ چەسپاندنی خواوەند گرتوویانەتەبەر، بەڵکو ڕێیەکی تابلێی فراوانی بێ سنوورە. چونکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ناسینێکی بێ سنووری خواوەندی "واجب الوجود".

ڕوونکردنەوەی ئەمەش، بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لە کاتێکدا هەموو شتێك لە بارەی: بوون و، سیفەت و، ماوەی مانەوە و، ژیانیدا چەندین ئیمکان و گریمانی لەژمارەبەدەری لە ڕێگادایە، ئا لەم کاتەدا، دەبینیت لە نێوان ئەو هەموو ڕووە لەسنووربەدەرانەی لە ڕێی بوونیدان، ڕێیەکی ڕێکوپێکی تایبەت بە خۆی دەگرێتەبەر و، هەموو سیفەتەکانی بە هەمان شێوە و لە هەمان ڕێی تایبەتییەوە پێ دەبەخشرێت، بەڵکو لەوەش زیاتر، ئەوەتا چەند سیفەت و حاڵەتێکی تایبەتیی پێ دەدرێت و بۆی دیاری دەکرێت، کە بە بەردەوامی لە ماوەی ژیان و مانەوەی دنیایدا یەك لە دوای یەك دەیانگۆڕێت.

کەواتە ئەمەی کە هەموو شتێك بەرەو ڕێگایەکی دیاریکراو دەداتەبەر و، ئەم ڕێیەی -کە دەیگەیەنێتە چەندین حیکمەتی دیاریکراو - لە نێوان چەندەها ڕێی تری لەژمارەبەدەردا بۆ هەڵدەبژێرێت، تەنها بە ویستی یەکێك دەکرێت کە بە تایبەتی ئەم ڕێیەی بۆ دەستنیشان دەکات و، تەرجیحی ئەم گریمانەی لە نێوان ئەوانی تردا بۆ دەدات و، بەدیهێنەرێکی دانا ئەمەی بۆ بەدی دەهێنێت[1] چونکە دەبینیت هەموو شتێك پۆشاکی چەندین سیفەتی ڕێکوپێکی دەکرێتەبەر و، چەندەها حاڵەتی ڕێك و تەواوی بە

(١) بۆ ئەوەی بە ئاسانی لەم بڕگانە تێبگەیت، بیر لە پێکهاتنی یەك دانە گەردیلە بکەرەوە و، پاشان ئەم گەردیلەیەش چۆن بارێکی دیاریکراو و چەندەها سیفەتی تایبەتی لە پێکهاتنی گەردێکی بچووکدا وەردەگرێت و، ئنجا ئەم گەردەش چۆن دەچێتە بارێکی دیاریکراوەوە لە تەنێکی پێکهاتوودا... هتد.

(وەرگێڕ)

تایبەتی بۆ دیاری دەکرێت. پاشان ئەم شتە دەدرێتەبەر تا دەبێت بە "بەشێك" لە لەشێکی پێکهاتوودا و، بەم جۆرە لە تەنیایی ڕزگاری دەبێت و، بەمەش ڕێی ئیمکان و گریمانەکان پتر دەبن. چونکە ئەم "بەشە" دەتوانێت هەزاران شکڵ و شێوە لەو لەشەدا وەربگرێت. کەچی دەبینین بارێکی دیاریکراوی پڕ لە سوود و بەرژەوەندیی پێ دەبەخشرێت و لە نێوان چەندەها باری لەژمارەبەدەری بێ سووددا ئەمەی خۆی بۆ هەڵدەبژێررێت. واتە: بەرەو ئەنجامدانی چەندین فەرمانبەریی گرنگ و، بۆ گەیشتن بە چەندەها سوودی جۆراوجۆر لەو لەشە پێکهاتووەدا، دەدرێتەبەر..

پاشان دەبینین ئەم بەشە، دەبێ بە بەشێك لە لەشی پێکهاتوویەکی تردا و، بەم کارەش ڕێگاکانی ئیمکان و گریمانەکان گەلێ زیاتر دەبن، چونکە ئەم لەشەیش دەگونجێ بە هەزاران جۆر و شێوە پێکبێت. کەچی دەبینین بارێکی دیاریکراوی لە نێوان هەزاران تەرز و جۆر و شێوەدا بۆ هەڵدەبژێررێت و، بەرەو ئەنجامدانی چەندەها کار و فەرمانبەریی تر، دەدرێتەبەر..

هەروەها تا زیاتر بەم چەشنە لەناو گریمانەکاندا ڕۆبچیت، پتر بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەم هەموو ڕێگایانە دەتگەیەننە: "کارسازی دانا" و.. قەناعەتی تەواویشت پێ دەبەخشن کە هەموو شتێك بە فەرمانی "فەرماندەرێکی زانا" بەرەو کار و فەرمانبەریی خۆی دەبرێت.

چونکە ـ ئاشکرایە ـ هەرچی شتی پێکهاتوو هەیە، لە چەند "بەش"ێك پێکهاتووە. ئەم بەشانەیش لە چەند بەشێکی تر... هتد.. ئنجا یەك بە یەکی ئەم بەشانە لە شوێنی تایبەتی و دیاریکراوی پێکهاتووەکەدا دانراون و دەبێ کاری تایبەتیی خۆیان لەو شوێنەدا جێبەجێ بکەن. دەبینیت پەیوەندیی نێوان بەشەکانی هەموو پێکهاتوویەك وەك پەیوەندیی سەرباز وایە لەگەڵ پەل و، لق و، تیپ و، لەشکرەکەیدا تەنانەت لەگەڵ سوپادا بە گشتی. چونکە پەیوەندییەکی دیاریکراوی دانایانەی لەگەڵ هەموو ئەو پێکهاتووە سەربازییە ئاڵۆزاوانەدا هەیە و، لەگەڵ هەریەکەیاندا چەند کارێکی گرنگی ڕێکی دیاریکراوی لە ئەستۆدایە. بە چەشنی ئەو خانەیەی وا لە بیلبیلەی چاوتدا.. ئەوەتا ئەو خانەیە پەیوەندیی فەرمانبەرییانەی لەگەڵ چاوتدا هەیە و، فەرمانبەریی دانایانەی بەرژەوەندیدەری سەبارەت بە تێکڕای "سەر"یش هەیە، بە ڕادەیەك کە ئەگەر شتێکی بچووکی هەندەکی لەگەڵ ئەو خانەیەدا تێکەڵ ببێت، ئەوا ویستی ئەو مرۆڤە دەئاڵۆزێت و تێکدەچێت.

ئنجا ئەم خانەیەی وا لەناو بیلبیلەی چاوتدا، پەیوەندییەکی تایبەتیی لەگەڵ خوێنبەرو خوێنهێنەر و دەمارەکاندا، تەنانەت پەیوەندیی فەرمانبەرییانەی لەگەڵ هەموو لەشدا هەیە..

ئەم کارە ئەوەمان بۆ دەچەسپێنێت کە ئەم خانە ناوبراوە ئەو جێگا تایبەتییەی لە بیلبیلەی چاودا پێ بەخشراوە و لە نێوان هەزار شوێندا تەنها ئەوێی بۆ هەڵبژێرراوە، تاکو ئەو کارانە ئەنجام بدات.. خۆ ئەمەش بە دانایی بەدیهێنەرێکی دانا نەبێت هەرگیز دروست ناکرێت و نایەتەدی..

بەم جۆرە، هەموو ئەو "مومکینانەی" کە لەم گەردوونەدان، هەموویان بەم چەشنە و لەسەر ئەم تەرزەن، هەریەکەیان چ خودی خۆی، چ سیفەتەکانی، بە زمانی تایبەتیی خۆی، دروستکەری خۆی ڕادەگەیەنێت و، بەوەش کە تەنها یەك ڕێ لە نێوان چەندین ڕێ و ئیمکانی لەسنووربەدەردا دەگرێتەبەر، شایەتی لەسەر دانایی ئەو بەدیهێنەرەی خۆی دەدات. ئنجا تا زیاتر بڕواتە ناو لەشێکی پێکهاتووی ترەوە، ئەوا بە زمانێکی تر و لە نێوان ئەو ڕێگا مومکینە لەژمارەبەدەرانەدا بەدیهێنەر و دروستکەری خۆی پتر ڕادەگەیەنێت.

بەم پێیە، هەرچی شت هەیە، بە ئەندازەی ژمارەی ئەو ڕێگە مومکینە لەژمارەبەدەرانەی لە ڕێیدان و، بە ئەندازەی ژمارەی پێکهاتووەکان و ئیمکانەکان و پەیوەندییەکانی نێوانیان تا دەگاتە گەورەترین پێکهاتوو.. شایەتی لەسەر دروستکەری دانای خۆی و، ویست و کاری هەڵبژاردنی ئەو بەدیهێنەرە دەدات.

چونکە ئەو کەسەی شتێك بە دانایییەکی تەواو لە هەموو پێکهاتوویەکدا دابنێت و، پارێزگاریی پەیوەندییەکانی نێوانیان بکات، دەبێ تەنها ئەو کەسە بێت کە بەدیهێنەری هەموو پێکهاتووەکانە.

واتە تەنها یەك شت وەك شایەتێك وایە کە هەزاران زمانی بێت و بە هەر هەموویان شایەتی لەسەر بوونی خواوەند بدات. تەنانەت نەك هەزاران شایەتی، بەڵکو بە ئەندازەی ژمارەی سیفەت و، ژمارەی پێکهاتووەکانی هەموو بوونەوەرێك، شایەتی لەسەر: "بوون و، دانایی و، ویست و، بژێرکاریی خواوەند" هەیە.

بەم چەشنە، لە گۆشەی "ئیمکان"ەوە چەندین شایەتیی لە سنوور و ژمارەبەدەر دێن و، دەبن بە بەڵگە لەسەر خواوەندی "واجب الوجود".

دەسا ئەی مرۆڤی بێئاگا!

ئایا گوێ کەڕکردن لە ئاستی ئەم هەموو شایەتیيانەی کە زایەڵەیان تێکڕای گەردوونی پڕ کردووە، ئەوپەڕی کەڕی و نەزانی نیيە؟

## پەنجەرەی سی و یەکەم

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (التين:٤).

﴿وَفِي الأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ ۞ وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات:٢٠-٢١).

لێرەدا لە بەردەم پەنجەرەی "مرۆڤ"داین؛ لە ڕێی دەروونی مرۆڤەوە دەڕوانینە نووری "یەکتاناسی".

ئەو کەسەی دەیەوێت بە درێژی لەم باسە شارەزا ببێت، ڕەوانەی دەکەین بۆ لای ئەو کتێبە زۆرانەی کە لە لایەن هەزاران ئەولیا و پیاوچاکەوە نووسراون، ئەوان لەو کتێبانەیاندا بە درێژی لە "دەروون"ی مرۆڤ کۆڵیونەتەوە. بەڵام حەز دەکەین لێرەدا پەنجە بۆ چەند ئاماژەیەك ڕابکێشین کە لە لێشاوی نووری قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراون. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

(مرۆڤ نوسخەیەکە لە گەردوون، هەرچی تایبەتکاری لە گەردووندا هەن، هەموویان لە مرۆڤدا کۆکراونەتەوە. تاکو مرۆڤ هەست بە هەموو ناوە جوان و درەوشاوەکانی خواوەند بکات).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە، ئەوەندە بەسە کە لە "وتەی یازدەهەم" و چەند پەیامێکی تردا باسمان کردوون. بەڵام لێرە تەنها "سێ خاڵ" لەم بارەوە ڕوون دەکەینەوە:

**خاڵی یەکەم:**

مرۆڤ لە "سێ ڕووەوە" ئاوێنەیەکی ڕەنگدەرەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورەیە:

ڕووی یەکەم: هەروەك "تاریکی" هۆی بینینی "ڕووناکی"یە، واتە تاریکیی شەو تا زیاتر بێت، جوانتر و ڕوونتر ڕووناکی دەردەخات.. مرۆڤیش وایە، بە: لاوازی و، کۆڵەواری و، هەژاری و، پێداویستی و ناتەواویيەکانی.. توانای خواوەندی بەتوانای شکۆمەند و، هێزە مەزن و، دەوڵەمەندیيە ڕەها و، میهرەبانیيە فراوانەکەی ئەو خوا گەورەیە، دەردەخات و دەیناسێنێت..

مرۆڤ بەمە وەك ئاوێنەیەك وایە، گەلێ درەوشانەوەی سیفەتەکانی خواوەندی مەزنی تێدا دەردەکەوێت. بەڵکو ئەو لاوازییە توندوتیژەی مرۆڤ هەیەتی و، دوژمنە زۆر و لە سنووربەدەرەکانیشی کە ئەم لا و ئەو لایان لێ گرتووە، وا لە مرۆڤ دەکەن هەمیشە بە دوای "پاڵپشت" و "پشتیوان"ێکدا بگەڕێت تاکو پاڵی پێوە بدات و پشتی پێ بەستێت. خۆ دیارە ویژدان(وجدان)ی تینووی مرۆڤ جگە لە "خوای گەورە" کەسی تر بۆ ئەم مەبەستە نادۆزێتەوە!

ئنجا مرۆڤ ناچارە بۆ "خاڵ"ێك بگەڕێت کە سەرچاوەی "یارمەتیدان"ی بێت و هەردەم بەدەمیەوە بێت و، پێداویستییە لەبنەهاتووەکانی لەو وەربگرێت و، هەژارییە بێ کۆتاییەکەی خۆی پێ داپۆشێت و، هیوا و ئاواتە نەبڕاوەکانی پێ تێروپڕ بکات..

کە مرۆڤ لەم ڕووەوە بە دوای ئەم خاڵەدا دەگەڕێت، لە ئەنجامدا بۆی دەردەکەوێت کە چار نییە تەنها ئەوە نەبێت پاڵ بە دەوڵەمەندێکی میهرەبانەوە بدات و پشتی پێ ببەستێت. لەبەر ئەوە، بە نزا و لالانەوە هەمیشە لێی دەپاڕێتەوە.

واتە لە ویژدانی هەموو مرۆڤێکدا دوو پەنجەرەی بچووك هەن لە ڕووی: "خاڵی پشت پێ بەستن" و "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن"ەوە.. مرۆڤ لەم دوو پەنجەرەیەوە دەڕوانێتە دیوانی پڕ لە میهرەبانیی خواوەندی بەتوانای میهرەبان.

*ڕووی دووەم:* لە بارەی ئەوەی کە: مرۆڤ ئاوێنەیەکە بۆ دەرخستن و درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە..

کە لەم ڕووەوە دەڕوانینە مرۆڤ، دەبینین:

ئەو نموونە بچووکانەی پێیبەخشراون لە: زانیاری و، توانست و، بینین و، بیستن و، موڵکداری و، فەرمانڕەوایی و سیفەتەکانی تری هاوچەشنی ئەمانە.. مرۆڤ دەکەن بە ئاوێنەیەکی ئەوتۆ هەموو سیفەتە ڕەهاکانی خوای گەورەی تێدا دەربکەوێت و، ئیتر مرۆڤ لەم ڕێیەوە لە: "زانست و، توانست و، بینین و، بیستن و، فەرمانڕەوایی و، پەروەردگاریتی"ی خوای گەورە تێدەگات. ئەو کاتە بە گوێرەی "سنووردارێتی" ئەم سیفەتانە لە لای خۆی، سەر لەو سیفەتە "بێسنوور و ڕەهایانە"ی خواوەند دەردەکات.

دیارە ئەو کاتەی کە مرۆڤ لەمە تێ گەیشت، لەگەڵ خۆی دەدوێت و، بە خۆی دەڵێت:

هەروەك من ئەم خانووەم بنیات ناوە و زۆر بە چاکی ئاگاداری دروست کردنیم و، چاوم لە هەموو لا و بەشەکانیەتی و، بۆ خۆم بەڕێوەی دەبەم، چونکە من خاوەنیم.. دەبێ

بە هەمان جۆر ئەم گەردوونە مەزنەش داهێنەر و خاوەنێكی ببێت كە بە تەواوی شارەزا و ئاگاداری هەموو بەشێكی بێت و، چاوی لە هەموو شتێكی گەورە و بچووكیەوە ببێت و، بەم جۆرە سەرپەرشتیی بكات.

*ڕووی سێهەم:* لەو ڕووانەی كە دەری دەخەن مرۆڤ ئاوێنەیەكی ڕەنگدەرەوەی ناوە جوانەكانی خوای گەورەیە، ئەوەیە كە:

مرۆڤ - جگە لە ڕووەكانی پێشوو - ئاوێنەشە بۆ دەرخستن و پیشاندان و ڕەنگدانەوەی نەخشونیگارەكانی ئەو ناوە جوانانە لە مرۆڤدا.

ئەم ڕووە بە درێژی لە "هەڵوێستی سێهەمی وتەی سی و دووهەم"دا بەم جۆرە باس كراوە:

"چییەتی"ی مرۆڤ، كە زۆر شتی تێدا كۆكراوەتەوە، حەفتا نەخشونیگار زیاتری تێدایە لە نەخشونیگارەكانی ناوە جوانەكانی خوای گەورە. بۆ نموونە:

مرۆڤ بەوەی كە: "بەدیهێنراوە"، ناوی "بەدیهێنەری دانا"ی خۆی ئاشكرا دەكات.. بەوەی جوان دروست كراوە و هەڵسەنگێنراوە، ناوی "ڕەحمان و ڕەحیم"ی خواوەند دەردەخات.. بە چۆنێتیی ڕێكخستن و چاودێری كردنی، ناوی "كەریم" و "لەتیف"ی خوای گەورە دەگەیەنێت... هتد.

بەم جۆرە، مرۆڤ چەندین نەخشونیگاری جۆراوجۆری ناوە جوانە جیاجیاكان، بە هەموو ئەندام و كۆئەندام و، ئەندامە مەعنەوی و پەنهانەكانی و، هەموو هەست و شعوورەكانی، دەردەخات. واتە: هەروەك لە ناوەندی ناوە جوانەكانی خوادا یەكێكیان ناوی هەرەمەزنی خوای گەورەیە.. بە هەمان جۆر لە نێوان نەخشونیگارەكانی ئەو ناوانەشدا نەخشێكی هەرەمەزن هەیە كە "مرۆڤ"ە!

ئەی ئەو كەسەی خۆی بە مرۆڤی ڕاستەقینە دادەنێت!

بۆ خۆت، خۆت بخوێنەرەوە! دەنا هەستەكانت كول دەبن و، ژیریشت وەك سەهۆڵ دەبیەستێت و لە كار دەكەوێت و، ئنجا لە پلەی "مرۆڤایەتی"یەوە بەرەو چەندین پلەی "نزمی" دادەبەزیت.

**خاڵی دووهەم:**

ئەم "خاڵە" ئاماژە بۆ یەكێك لە نهێنییە گرنگەكانی تەنیایی(الأحدية) دەكات. وا بەم جۆرە ڕوونی دەكەینەوە:

مادەم "گیان"ی مرۆڤ پەیوەندیی لەگەڵ هەموو لاکانی لەشی مرۆڤەکەدا هەیە، بە ڕادەیەك کە وا لە هەموو ئەندام و بەشێکی ئەو لەشە دەکات هاوکاری و یارمەتیدانێکی تەواویان لە نێواندا بێت..

واتە: مادەم "گیان" کە شتێکی نیان و ناسکی پەروەردگاری و یاسایەکی ئەمرییە و بەپێی فەرمانە تەکوینییەکانی خواوەند - کە ئەویش درەوشانەوەی ویستی خواوەندە - بوونی دەرەکیی پێ بەخشراوە .. ئەم گیانە، هەموو بەشەکانی لەش بەڕێوەدەبات و سەرپەرشتیی هەموویان دەکات و هیچ شتێك ڕێی ئەمەی لێ ناگرێت و.. پێداویستییەکانی هەموو بەشێك لە بەشەکانی لەش جێبەجێ دەکات و.. دوور و نزیکیان سەبارەت بە "گیان"ەوە یەکسانن و، هیچ شتێك ڕێ لە شتی تر ناگرێت. چونکە دەتوانێت هەموو ئەندامەکانی لەش فریای ئەندامێکی تری پێویست بە یارمەتی بخات و، ئەو ئەندامانەی تر بۆ خزمەتگوزاریی ئەم ئەندامە بهێنێت و بیانخاتەکار.. بەڵکو دەتوانێت هەموو پێداویستییەکانی گشت بەشەکانی لەش بزانێت و، لە ڕێی ئەم بەشەوە هەموو لەش بەڕێوە ببات.. تەنانەت دەتوانێت بە چاوی هەموو بەشێك لە بەشەکانی لەش بڕوانێت و ببینێت و، بەم جۆرە بۆی دەربکەوێت و بزانێت ئایا لەش ڕووناکیی زیاتری دەست کەوتووە یان نا؟

جا مادەم گیان(ڕۆح)، کە یاسایەکی ئەمریی نێوان یاساکانی خوای گەورەیە، ئەم هەموو توانایەی بۆ ئەنجامدانی ئەم هەموو کارانە هەیە لە جیهانی بچووکدا (کە مرۆڤە).. ئیتر چۆن دەبێت لە توانستی ڕەهای خوای گەورە ئەوە بە گران بزانرێت کە چەندین کاری لەژمارەبەدەر ببیستێت و، چەندین نزای بێ سنووری بوونەوەران گیرا بکات؟.. چۆن؟

خوای گەورە چیی بوێت، لە یەك کاتدا دەیکات و، هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێت و نابێتە پەردە و کۆسپ لە بەردەمیدا و لە ئەنجامدانی هیچ کارێکی تردا دەستی ناگرێت و.. لە یەك کاتدا هەموویان دەبینێت و دەبیستێت و.. دوور و نزیکی لە لا یەکسانە و.. ئەگەر بیەوێت شتێك بکات، ئەوا هەموو شتێکی بۆ دەهێنێت و ئامادەی دەکات.. هەر شتێك لەناو شتی تردا بێت، خوای گەورە دەیبینێت و، دەنگی هەموو شتێك دەبیستێت و، بە هەموو شتێك هەموو شتێ دەزانێت، چونکە ئەو خواوەندە گەورەیە، پەروەردگاری هەموو شتێکە.

**خاڵی سێهەم:**

"ژیان" چییەتی‌یەكی مەزن و گرنگ و، فەرمانبەری‌یەكی لەڕادەبەدەر گرنگی هەیە. جا لەبەر ئەوەی ئەم باسە بە درێژی لە پەنجەرەی بیست و سێهەم و، وشەی هەشتەمی مەكتووبی بیستەمدا باس كراوە، ئەوا خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی ئەوێ دەكەین. بەڵام لێرەدا بۆ ئەمانەی خوارەوە ئاگاداری دەكەینەوە:

ئەو نەخشونیگارانەی لەگەڵ ژیاندا تێكەڵ كراون و، لە شێوەی "هەستەكان"دا دەردەكەون، ئاماژە بۆ چەندین ناوی جوانی زۆر و كاروباری تایبەتیی خواوەند دەكەن. كەواتە "ژیان" لەم ڕووەوە، ئاوێنەیەكی ڕەنگدەرەوە و درەخشانی كاروبارە تایبەتی‌یەكانی زاتی خواوەندی زیندووی ڕاگیركەری گەردوونە.

جا لەبەر ئەوەی كاتەكەمان مەودای ئەوەندە فراوان نی‌یە تا ئەم نهێنی‌یە زیاتر بۆ ئەوانە ڕوون بكەینەوە كە هێشتا بەوە ڕازی نین خوای گەورە پەروەردگاریان بێت و، ئەوانەش كە هێشتا نەگەیشتوونەتە پلەی "ئیمانی یەقینی"، لەبەر ئەوە، وا ئەم دەرگایە لێرەدا دادەخەین.

## پەنجەرەی سی و دووهەم

﴿هُوَ الَّذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً ۞ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ﴾ (الفتح:٢٨-٢٩).

﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذي لَهُ مُلْكُ السَّموات وَالأَرْضِ لآ إِلهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ (الاعراف:١٥٨).

ئەم پەنجەرەیە تایبەتە بە: خۆری ئاسمانی پەیامەكانی خوای گەورەوە.. بەڵكو خۆری درەخشانی ناو خۆرەكانی پێغەمبەرایەتی.. خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانیان: حەزرەتی "محەممەد ﷺ".

ئەم پەنجەرەیە، وەك خۆر درەخشان و.. وەك گەردوون فراوان و.. وەك ڕۆژیش ڕووناكە!

جا لەبەر ئەوەی لە پەیامی "میعراج" و "بەڵگەكانی پێغەمبەرێتی" و ئاماژەی نۆزدەهەمی پەیامی "موعجیزاتی ئەحمەدی"دا بە جۆرێكی گومانبڕ مەسەلەی "پێغەمبەرێتی"مان چەسپاندووە، وا ئێستا یادی هەندێ لەو باسانەی كە لەو پەیامە

ناوبراوانەدان، دەکەینەوە و، بۆ ئەوەش کە خوێنەری بەڕێز زیاتر ئاگادار بێت، با سەر لەو پەیامانە بدات، بەڵام لێرەدا دەڵێین:

پێغەمبەری بەڕێز ﷺ کە بەڵگەی گۆیای "یەکتاناسی"یە، زۆر بە ڕوونی و ئاشکرایی و بە هەموو هێزێکیەوە "یەکتایی" خوای گەورەی ڕاگەیاندووە و، بۆ مرۆڤایەتیی باس کردووە و، ئەمەش لە هەموو مێژووی ژیانی خاوێنیدا دەردەکەوێت. چونکە هەر ئەوە کە بە دوو باڵی: "ڕیسالەت" و "ویلایەت"ەوە خاوەنی هێزی یەکدەنگی و تەواتوری هەموو پێغەمبەرەکانی پێش خۆی و ئەولیا و پیاوچاکەکانی دوای خۆیەتی و، بەم هێزە مەزنەوە لە بەردەم ناسینی خوای گەورەدا پەنجەرەیەکی گەورە و فراوانی، بە ئەندازەی فراوانیی جیهانی ئیسلام، کردووتەوە. ئیتر ملیۆنان زانای لێکۆڵەر و پیاوچاکانی بێ گەرد و صیدیقانی وەك: ئیمامی غەزالی و ئیمامی ڕەببانی و محیّدینی عەرەبی و شێخی گەیلانی و کەسانی تری جگە لەمانیش، لەم پەنجەرەیەوە ڕوانیویانە و، بۆ خەڵکی تریشیان ڕوون کردووەتەوە.

باشە ئایا هیچ پەردەیەك هەیە بشێت بەسەر ئەم پەنجەرەیەدا دابدرێتەوە؟!

یان ئایا ئەوەی لەم پەنجەرەیەوە نەڕوانێت، دارای ژیریەیە؟

بۆ خۆت بڕیار بدە!

## پەنجەرەی سی و سێهەم

﴿الْحَمْدُ للهِ الَّذي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَـهُ عِوَجاً * قَيِّماً...﴾ (الكهف:١-٢).

﴿الر * كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ اِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُماتِ إِلى النُّورِ﴾ (ابراهيم:١).

سەرنج بدە و بزانە هەرچییەك لە پەنجەرەکانی پێشوودا باس کراون، تەنها چەند دڵۆپێکن لە دەریای قورئانی پیرۆز.

مادەم وایە، ئەوا بۆ خۆت دەتوانیت ئەو مەودا فراوان و مەزنانەی نووری "یەکتاناسی" لێکبدەیتەوە کە لە دەریای قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەگەر بە سەرپێیی یەکەوە سەیری سەرچاوە و گەنجینە و بناغەی ئەو پەنجەرانەی پێشوو بکەین، کە قورئانی مەزنە، ئەوا دەبینین ئەم قورئانە مەزنە، هەموو پەنجەرەکانی تری تێدا کۆبوونەتەوە و، خۆیشی پەنجەرەیەکی فراوان و مەزنی ئەوەندە ڕووناکە هەردەم نووری پرشنگداری لەڕادەبەدەری لێوە دەردەکەوێت.

جا لەبەر ئەوەی وتەی بیست و پێنجەم (پەیامی موعجیزاتی قورئانی) و ئاماژەی هەژدەهەمی مەکتووبی نۆزدەهەم (پەیامی موعجیزاتی ئەحمەدی)، ئەندازەیەکی تێرو تەسەلیان لە فراوانی و درەخشانی ئەم پەنجەرەیە باس کردووە، ئەوا خوێنەری بەڕێزیان بۆ لا ڕەوانە دەکەین.

* * *

لە کۆتاییدا دەستی نزا و لالآنەوە لە بەردەم عەرشی مەزنی ئەو خواوەندە میهرەبانەدا بەرز دەکەینەوە، کە ئەم قورئانەی بۆ ناردووین و، دەڵێین:

﴿رَبَّنَا لا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ (البقرة: ٢٨٦).

﴿رَبَّنَا لا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذ هَدَيْتَنَا﴾ (آل عمران:٨).

﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (البقرة: ١٢٧).

﴿... وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ (البقرة:١٢٨).

* * *

## بێدارکردنەوەیەك!

لە خوای گەورە داواکارین ئەم مەکتووبی سی و سێهەمە[1]، کە سی و سێ پەنجەرەی تێدایە، بکات بە:

تویشووی ئەو کەسەی ئیمانی نییە، تاکو بانگی بکات بۆ ئیمان..

ئیمانی ئەوانەشی پێ بەهێز بکات، کە ئیمانیان لاوازە..

ئەوانەش ئیمانیان بەهێزە، لە ئیمانی تەقلیدییەوە ئیمانەکەیان بکات بە ئیمانی تەحقیقیی ڕەگداکوتاو..

ئاسۆی ئیمانی تەحقیقیی ڕەگداکوتاویشی پێ فراوان ببێت..

ئەوانەش کە ئیمانیان فراوانە، پلە بەرزەکانی خواناسییان پێ ببەخشێت، کە تەنها ئەم خواناسییە بناغەی ڕاستەقینەی "کەماڵی مرۆڤ"ە.. هەروەها دیمەنی نووورانیتر و ڕوونتر و درەخشانتری لە بەردەمدا بکاتەوە.

---

(١) کە لە ڕوویەکی ترەوە وتەی سی و سێهەمە. (دانەر)

لەبەر ئەمە، با خوێنەری بەڕێز نەڵێت:

(تەنها یەك پەنجەرەم بەسە و ئەوانی ترم ناوێت).

نەخێر.. چونکە هەرچەند "ژیری" سوودی خۆی وەرگرتبێت، "دڵ" و "گیان"یش داوای بەشی خۆیان دەکەن. تەنانەت "ئەندێشە"یش داوای بەشێك لەو ڕووناکی یە دەکات. واتە هەریەك لەو پەنجەرانە چەندین سوودی زۆر و جۆراوجۆر و جیا جیایان هەیە.

* * *

لە پەیامی "میعراج"دا، ڕووی دەمی قسە لە پلەی یەکەمدا لە ئیماندار کرابوو، مرۆڤی بێ ئیمانیش گوێی ڕادەگرت. بەڵام لەم پەیامەدا، لە پلەی یەکەمدا لەگەڵ ئەوانەدا قسە دەکرێت کە ئیمانیان نی یە و ئینکاریی دەکەن، ئنجا ئیمانداریش لە پلەی گوێبیستدا دانیشتووە گوێ ڕادەگرێت.

جا با لە ڕۆشنایی ئەمەدا ئەم پەیامە بخوێنرێتەوە.

* * *

لەبەر ئەوەی ئەم نووسینەم - لەبەر هۆیەکی گرنگ - بەوپەڕی پەلە و خێرایی نووسی، ئەوا وەك خۆی مایەوە و بە ڕەشنووسەکەی دا نەڕۆشتمەوە و هیچ گۆڕانێکم تێدا نەکرد. دیارە لە ئەنجامی ئەمەدا، لە هەندێ دەستەواژەی و لە چۆنێتیی باسکردنی بابەتەکانی دا، هەندێ ناتەواوی و ناڕێکیی تێدا دەبێت. داوام لە برایانم ئەوەیە کە بە چاوی لێبوردن و چاوپۆشی یەوە بۆی بڕوانن و، (گەر لە توانایاندا بوو) ئەو هەڵانەی کە کردوومن ڕاستیان بکەنەوە و، داوای لێخۆشبوونم لە خوای گەورە بۆ بکەن.

والسلام على من اتبع الهدى والملام على من اتبع الهوى.

﴿سُبْحَانَكَ لاعِلْمَ لَنَا إلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللهم صل على من أرسلته رحمة للعالمين وعلى آله وصحبه وسلم.

آمين.

* * *

# ناوکەکانی حەقیقەت

ڕوونکردنەوەیەك:

ماوەیەکە مامی ئازیزم: (بەدیعوززەمان) بە "دڵ" ڕوو دەکاتە ئەو مەسەلانەی کە دەیانووسێت، نەك بە "ژیری". ئنجا هەرچی لەسەر پەڕەی دڵی دەردەکەوێت، بۆ منیان دەڵێت و منیش دەیانووسم.

هەروەها دەڵێت: "زانست ئەو زانستەیە کە لە دڵدا جێگیر بێت، چونکە ئەگەر تەنها لە مێشك و ژیریدا بێت، نابێت بە موڵکی مرۆڤ".

هەروەها دەڵێت: "ئەم مەسەلە و بابەتانە تەنها چەند یاسایەکی زانستی نین، بەڵکو چەند بناغەیەکن کە لە ویجدانی خۆمدا بۆ چەند دەستوورێکی قەلبی داناون".

ئنجا فەرمانی پێ دام کە:

"لەو شتانەی ڕوویان لە دڵم کرد و نووسیمانن، حەزت لە چییە هەڵیانبژێرە".

منیش لە لایەنی خۆمەوە ئەم بڕگانەم لەم بەرهەمانەی خوارەوەی هەڵبژارد:

(نقطة من نور معرفة الله، إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز، سنوحات، شعاعات معرفة النبي ﷺ، رموز، طلوعات، محاكمات، مناظرات، إشارات، قزل إيجاز).

عەبدوڕڕەحمان

بسم الله الرحـــمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

١ – ڕەچەتـەی پزیشـکی بـۆ: چـەرخێکی خەسـتە و.. جەسـتەیەکی نـــەخۆش و.. ئەندامێکی بیمار: تەنها "شوێنکەوتنی قورئان"ە.

٢ – ڕەچەتـەی پزیشـکی بـۆ: کیشـوەرێکی فراوانی گرنـگ، بـەڵام بـێ شـانس و.. دەوڵەتێکی بەناوبانگی خاوەن ڕابـوردووی شـکۆدار، بـەڵام بێ بەخت و.. نەتەوەیـەکی خاوەن عیززەتی مەزن، بەڵام بێ پێشەوا: تەنها "یەکگرتنی ئیسلامی"یە.

٣ – کەسێك خاوەنی دەستێکی وا نەبێت کە بتوانێـت زەوی و خـۆر و ئەستێرەکانی پێ هەڵبگرێت و بە وێنەی دەنکی تەزبێح بیانجووڵێنێت.. هـەرگیز مـافی ئـەوەی نی‌یـە کـە لافی "دروستکردن" و "بەدیهێنان" لـێ بدات، چونکە هەر شتێك لـە گـەردووندا هەیە بە هەموو شتانی ترەوە گرێ دراوە.

٤ – هەروەك زیندووکردنەوەی مێروولەیەك کە لـە وەرزی زستاندا نوقمـی خـەوێکی قورسی چەشنی مردن بووە، بەلای توانستی خوای گـەورەوە کـارێکی ئاسـانە و هـەرگیز گـران نی‌یـە. بـە هـەمان جـۆر: زیندووکردنـەوەی سـەرجەمی گیانلەبـەران بـەلای ئـەو توانستەوە سـووك و ئاسـانە و بەلایـەوە گـران نی‌یـــە. چونکـە توانسـتی خواوەنـد: خـۆیی(ذاتي)یە؛ گۆڕانی بەســـەردا نایـەت و، کۆڵـەواریی ئاوێتـە نـابێت و تەگـەرە و ڕێگریشی نایەتـە ڕێ. کەواتـە ئـەو توانستە "پلـە پلـە" نی‌یـە و هـەموو شـتێك بەلایـەوە یەکسانە.

٥ – ئەو کەسەی چاوی "مێشوولە"ی بەدی هێناوە، هەر ئەویشە کـە "خـۆر"ی بـەدی هێناوە.

٦ – ئەو کەسەی گەدەی "کێچ"ی ڕێکخستووە، هەر ئەویشە کە "کۆمەڵەی خۆر"ی ڕێکخستووە!

٧ – دانان و هۆنینەوەی کتێبی گەردوون "ئیعجـاز"ی تێدایـە، بـە چەشـنێ کـە ئەگـەر بێـت و بـە فـەرزی مـەحاڵیش وا دابنێین هـەموو یـەکێك لــە هۆکـارە سروشـتی‌یەکان: "بکـەر" و "خــاوەنی توانـا و ئیختیـار"یـش بـن، ئـەوا هــەر هــەموویان بـە ملکـەچی و

دەستەوسانییەوە لە بەردەم ئەو ئیعجازەدا سوژدەیان دەبرد و دەیانوت: "سبحانك لا قدرة لنا.. إنك أنت العزيز الحكيم"[1]!

٨ - "هۆکارەکان" کاریگەریی ڕاستەقینەیان نەدراوەتێ. چونکە "تاکی" و "شکۆمەندی"ی خواوەند وا دەخوازن.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هۆکارانە لە دیوی دەرەوەی شتاندا، کە ڕووی "مولك"ە، وەکو "پەردە" دانراون لە بەردەم توانستی خوای گەورەدا، چونکە "مەزنایەتی"ی خواوەند داخوازی ئەمەیە. ئەمەش بۆ ئەوەی کە چاوی ڕواڵەتبین دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی دەستی "توانست" لەو شتانەدا نەبینێت کە لە ڕووی "مولك"دا بە کەمنرخ دەردەکەون.

٩ - ڕووی "مەلەکووت"ی هەموو شتێك، کە جێی پەیوەندی پێوەکردنی "توانست"ی خوایە، ڕوویەکی: تەنك و ڕوون و خاوێنە.

١٠ - جیهانی بینراو(عالم الشهادة) پەردەیەکی نەخشێنراوی ڕازاوەیە بەسەر جیهانە پەنهانەکان(عوالم الغيب)دا دادراوەتەوە.

١١ - بۆ دانانی هەر خاڵێك لە شوێنی تەواوەتیی خۆیدا، پێویست بە توانستێکی ڕەهای ئەوتۆ دەبێت کە بتوانێت سەرانسەری گەردوون بەدی بهێنێت. چونکە هەموو یەکێك لە پیتەکانی کتێبی گەورەی گەردوون - بە تایبەت ئەوانەیان کە زیندوون و خاوەن ژیانن - دەڕواننە هەموو یەکێك لە ڕستەکانی ئەو کتێبە و چاویان لێیەتی.

١٢ - ڕووداوێك ناوبانگی دەرکردووە کە گوایا: لەو دەمەدا خەڵکی چاویان بۆ مانگی یەك شەوەی جەژن دەگێڕا و کەسیشیان نەیانبینی، پیرێکی بەساڵاچوو سوێندی بۆ خواردن کە بە چاوی خۆی دیویەتی!

پاشان دەرکەوت ئەو شتەی کە مامە پیرە دیویەتی و بە مانگی یەك شەوەی زانیوە: مانگ نەبووە، بەڵکو تاڵە موویەکی کەوانەیی بووە کە لە برۆیەوە بەسەر چاویدا شۆڕ بووەتەوە!

جا ئەم تاڵە مووە لەکوێ و مانگی یەك شەوەش لەکوێ؟.. بزووتنی گەردیلەکان لە کوێ و، ئەنجامدەری پێکهێنانی سەرجەمی جۆرەکانی بوونەوەران لە کوێ؟

(١) هەر دەستەواژەیەکی وەك ئەمەی سەرەوە لەم نامیلکەیەدا بە عەرەبی هێنراوە، لە تورکییەکەشدا دانەر خۆی هەر بە عەرەبی دایناون، بۆیە دەستکاریمان نەکردن. (وەرگێڕ)

١٣ - "سروشت":

چاپخانەیەکی میسالی‌یە، چاپکەر نی‌یە.. نەخش و نیگارە، نیگارکێش نی‌یە.. توانای کارتێداکردنی هەیە، بکەر نی‌یە.. ئامرازی پێوانەی شتانە، سەرچاوەیان نی‌یە.. ڕێسا و سیستەمە، ڕێساساز نی‌یە.. یاسایە، توانست نی‌یە.. شەریعەتێکی ویستی خواوەندە، شتێکی خاوەن حەقیقەتی دەرەکی نی‌یە.

١٤ - ئەو کێش و ڕاکێشان(الجذبة والإنجذاب)ەی کە لە ویجدانی مرۆڤدایە - کە ئەویش فیترەت(سروشت)ێکی هەستیارە - تەنها بە "کێش کردنێکی حەقیقی" و لە لایەن "بکێشێك"ەوە ئەنجام دەدرێت.

١٥ - "فیترەت" درۆ ناکات، ئەوەتا مەیلی گەشەکردن کە لەناو "تۆو"دا هەیە، گەر بلێت: "بەر دەگرم" ڕاست دەکات بەر دەگرێت.. "هێلکە" مەیلی ژیانی تێدایە، گەر بلێت: "دەبم بە جووچك"ێك، بە ئیزنی خوای گەورە دەبێت بە جووچك و کردار تەسدیقی گوفتارەکەی دەکات.. هەروەها مەیلی "بەستن"ی ئاو کە پڕ بە لەوێچێك بێت، گەر بلێت: "جێگایەکی فراوانتر دەگرم" ئەوا تەنانەت ئاسنیش بەو ڕەقی و سەختی‌یەی خۆی ناتوانێت بەدرۆی بخاتەوە، بەڵکو ڕاستیی گوفتارەکەی، ئەو ئاسنەش لەت دەکات.

جا ئەم مەیلانە، لە ڕاستی‌دا، دەرکەوتن و درەوشانەوەی ئەو فەرمانە تەکوینی‌یانەن کە لە لایەن ویستی خواوەندەوە دەردەچن.

١٦ - ئەو توانستە خوایی‌یەی کە "مێروولە" بەبێ سەرکردە و "هەنگ"یش بە بێ شاژن ناهێڵێتەوە، هەرگیز گرۆی مرۆڤیش لە "پێغەمبەر" بێ بەش ناکات.

ئنجا هەروەك "لەت بوونی مانگ" موعجیزەیەکی پێغەمبەر بوو ﷺ کە لە جیهانی بینراودا پیشانی مرۆڤ درا.. بە هەمان جۆر "میعراج"یش موعجیزەیەکی گەورەتری ئەحمەدی‌یە کە لە جیهانی "مەلەکووت"دا پێش‌چاوی مەلائیکەت و ڕۆحانییات خرا و، بەم کەرامەتە ئاشکرایە ویلایەتی پێغەمبەرایەتی‌یەکەی چەسپاند. ئەوەبوو کەسایەتی‌یە درەخشانەکەی، بە وێنەی برووسکە و چەشنی مانگی تابان، لە جیهانی مەلەکووتدا درەوشایەوە.

١٧ – هەریەکە لە دوو وشەی "شایەتمان" بەڵگە و شایەتن لەسەر ئەوی تریان، چونکە یەکەمیان: بەڵگەی "لیممی"یە بۆ دووهەم و.. دووهەمیشیان بەڵگەی "ئیننی"یە بۆ یەکەمیان[1].

١٨ – "ژیان" جۆرێکە لە دەرکەوتن و درەوشانەوەی "وەحدەت" لە ناوەندی "زۆری"دا! بۆیە هەموو شتێك بەرەو یەکگرتن دەداتە بەر. ئەوەتا ژیان کارێك دەکات کە تەنها یەك دانە شت خاوەنی هەموو شتان بێت .

١٩ – "گیان" یاسایەکە خاوەنی بوونی دەرەکی(وجود خارجی)یە و هەست و نەستیشی تێدا دانراوە و بە وێنەی یاسا فیترییە بەردەوامەکان لە جیهانی "ئەمر"ەوە هاتووە، توانستی خواوەندیش "وجودی هەست پێ کراو"ی لەبەر کردووە و شتێکی ناسك و شل و نیانی کردووە بە صەدەفی ئەو گەوهەرە.

جا ئەم "گیان"ەی کە خاوەنی "بوونی دەرەکی"یە و ئەو "یاسا"یەش کە بە "ژیری" پەیی پێ دەبرێت، هەردووکیان برای یەکترین و بەردەوامن و لە جیهانی "ئەمر"ەوە هاتوون.

خۆ ئەگەر توانستی ئەزەلیی بەدیهێنەر "بوونێکی دەرەکی"ی بکردایەتە بەر ئەو یاسایانەی کە لە "جۆرەکان"دا دەست بەکارن، ئەوا هەریەکەیان دەبوو بە "گیان"ێك.. یان گەر گیان هەست و شعوور بخاتە لاوە، ئەوا دەبێت بە "یاسا"یەکی باقی و بەردەوام.

٢٠ – بوونەوەران بەهۆی "ڕووناکی"یەوە دەبینرێن و، بەهۆی "ژیان"یشەوە دەزانرێت کە دارای "وجود"ن. کەواتە "ڕووناکی" و "ژیان" هەردووکیان دەرخەر و ئاشکراکەری بوونەوەرانن.

٢١ – ئایینی نەصرانی لە ئەنجامدا چەك فڕێ دەدات و تەسلیمی ئیسلام دەبێت، ئیتر چ بە "کوژانەوە" بێت چ بە "خاوێن بوونەوە". ئەوەبوو ئەم ئایینە چەندین جار لەت لەت بوو هەتا گەیشتە ئەوەی بوو بە پرۆتستانت، کە ئەمەش لەت لەت بوو هەتا لە "تەوحید"ەوە نزیك بووەوە. وا ئێستاش خۆی بۆ کەرتبوونێکی تر ئامادە دەکات! جا یان ئەوەیە بە تەواوی خامۆش دەبێت و کۆتایی پێ دێت، یان ڕووبەڕووی ڕاستییەکانی

---

(١) مامۆستا نوورسی لە "إشارات الإعجاز" ص ١٨٦دا دەڵێت: بەڵگە یان: "لیممی"یە کە بریتییە لە: بەڵگە هێنانەوە بە کاریگەر(المؤثر) لەسەر کارتێکراو.. یان "ئینـــــی"یە، کە بریتییە لە: بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار و کارتێکراو لەسەر بوونی کاریگەر، کە ئەمەیان سەلامەتترە. (وەرگێر هێناویەتی).

ئیسلام خۆی دەبینێتەوە – کە بناغـە و بنەماکانی ئایینی نەصرانییـەتی ڕاستەقینەی لـەخۆ گرتووە – و ئیتر لەم ڕێیەوە تەسلیمی ئیسلام دەبێت.

پێغەمبەر ﷺ بە هەواڵدانی نـازڵ بوونـی حەزرەتی عیسا – درووودی لەسەر بێـت – و بەوەش کـە فەرموویـەتی: یـەکێك دەبێـت لـە نەتەوەکـەم و، شـەریعەتەکەم جێبەجێ دەکات، ئاماژەی بۆ ئەم نهێنییە کردووە!

٢٢ – تەنـها قودسـییەتی سـەرچاوەی شـەرعە – واتـە تەنـها قورئانـە – کـە هـانی جەماوەری خەڵك دەدات گوێڕایەڵی فەرمانـەکانی شـەرع بـن و جێبەجێیان بکـەن و زیاتر لە هێزی بەڵگە بۆ ملکەچی دەیانداتە بەر.

٢٣ – لە سـەدا نـەوەدی ئـەحکامی شـەرع لـەو پێداویستییە سـەلماوە ئایینییانـەن کـە پێیان دەوترێت: "ما عُلِمَ من الدين بالضرورة" و هـەریەکەیان وەك سـتوونێکی ئـەڵماس وایە. بەڵام بابەتە ئیجتیهادییەکان تەنها لە سەدا دەی ئەحکامەکانی شەرعن.

کەواتە نابێ (نەوەد) ستوونی ئەڵماس لە ژێر پارێزگاری و شوێنکەوتەی (دە) ستوونی زێڕدا بن.

جا کتێبە فیقهییەکان و ئیجتیهادەکان دەبێ ئاوێنەی دەرخەر و چاویلکەی پیشاندەر بن بۆ بینینی قورئان، نەك ببن بە پەردە و سێبەر لە ڕێی ئەو قورئانە پیرۆزەدا!

٢٤ – هەر کەسێك توانای "ئیجتیهاد"ی هەیە دەتوانێـت ئیجتیهـاد بـۆ خـۆی بکـات، بەڵام ناتوانێت یاسا و شەرع دابنێت.

٢٥ – بـانگ کردنـی خـەڵك بـۆ لای هـەر "بیر"ێـك بـەندە بـە قبـووڵ بوونیـەوە لای جەماوەری زانایان، دەنا بە "بیدعەت" دەژمێررێت و دەست بە ڕوویەوە دەنرێت.

٢٦ – "مرۆڤ" بە "فیترەت" خـاوەنی ڕێزە. لەبەر ئەوە، هەمیشە "حەق"ی مەبەسـتە و بـە دوایدا عەودالـە. جـا هـەندێ جـار لـە دەمـی گـەڕانی بـە شـوێن "حـەق"دا "ناحـەق" دەدۆزێتـەوە و پێـی وا دەبێ کـە "حـەق" بێـت! بۆیـە لـە سـنگی خـۆیدا دەیشـارێتەوە و دەیپارێزێت. هەندێ جاری تر لە کاتی گەڕانی بە شـوێن "حەقیقـەت"دا – بـە بێ ویسـتی خۆی – "گومڕایی" بـەر سـەری دەکـەوێت، ئـەویش بـە "حـەق"ی دەزانێـت و بـە وێنـەی کڵاو دەیکاتە سەری!

٢٧ – ئـەو ئاوێنانـەی کـە "توانسـت"ی خـوای گـەورە دەردەخـەن گەلـێ زۆرن و، هەریەکەشیان لەوی تر ڕوون و نیانـترە و جۆرەکانیشیان جیاجیایە. ئـەوەتا لـە "ئـاو"ەوە تاکو "هەوا" و، لە هەواوە تاکو "ئەثیر" و، لە ئەثیرەوە تا دەگاتـە "جیـهانی میسـال" و، لـە

جیهانی میسالیشەوە تا دەگاتە "جیهانی ڕۆحەكان" و، تەنانەت لە جیهانی ڕۆحەكانیشەوە بۆ: "كات" و "بیر" و "ئەندێشە".. هەر یەكەیان ئاوێنەیەكن لەو ئاوێنە جۆراوجۆرانە..

ئەوەتا لە ئاوێنەی "هەوا"دا تەنها یەك "وشە" دەبێت بە ملیۆنەها وشە كە قەڵەمی "توانست" بە شێوەیەكی سەرسووڕهێنەر ئەم لەبەرگرتنەوە(كۆپی)یە ئەنجام دەدات.

وێنەی "ماددە چڕەكان" لە ئاوێنەكانیاندا - لە ڕاستیدا - چەند "مردوویەكی بزۆك"ن. بەڵام وێنەی شتانی "نوورانی" لە ئاوێنەكانیاندا هەموویان "زیندوو"ن و بە "ژیان"ەوە پەیوەستن. خۆ ئەگەر ئەو وێنەیەی كە لەو ئاوێنەیەدا دەردەكەوێت خودی ئەو شتە نوورانی‌یە نەبێت ئەوا غەیری خۆیشی نی‌یە!

٢٨ - ئەگەر "خۆر" بەو جووڵەیەی كە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، هەر ئاوا بجووڵێت و ڕاپەڕێت، ئەوا بەروبوومەكانی بەم لا و ئەو لادا هەڵناوەرن. بەڵام گەر نەجووڵێت و ڕانەپەڕێت ئەوا گشت هەسارە گەڕۆكەكانی هەڵدەوەرن و تەفروتوونا دەبن!

٢٩ - ڕۆشنایی "بیر" گەر ڕووناكیی "دڵ"ی لێ نەبریسكێتەوە و ئاوێتەی نەبێت، ئەوا ئەو هزر و بیرە دەبێت بە تاریكایی‌یەكی ئەوتۆ كە ستەمی لێ پەیدا دەبێت. كەواتە هەروەك ئەگەر ڕۆژگاری سپیایی "چاو" تێكەڵ بە شەوگارە ڕەشداگیرساوەكەی نەكرێت[1] بە چاو دانانرێت و توانای بینینی نابێت، بە هەمان جۆر "بیر"ی سپییش گەر ڕەشایی (ناوجەرگە)ی "دڵ"ی لەگەڵدا نەبێت، ئەوا خاوەنی بینایی(بەصیرەت) نابێت!

٣٠ - هەر "زانست"ێك گەر ملكەچ بوونی "دڵ"ی لەگەڵدا نەبێت، ئەوا "نەزانی"یە. چونكە پابەندبوون(إلتزام) شتێكە و باوەڕكردن(إعتقاد)یش شتێكی تری جیاوازە.

٣١ - وێنەكێشان و ڕوونكردنەوەی كاروبارە نارەواكان بە شێوەیەكی ڕێكوپێك، دەبێت بەهۆی گومڕاكردنی زەینە ساف و خاوێنەكان!

٣٢ - زانای ڕابەر دەبێ وەكو "مەڕ" وابێت نەك وەكو "مەل"! ئەوەتا مەڕ شیر دەرخواردی بەرخەكانی دەدات، بەڵام مەل ڕشانەوەی پڕ لیكی خۆی بە دەم جووجەڵەكانیەوە دەكات!

---

(١) واتە سپێنەی چاو، كە وەك ڕۆژ وایە، گەر لەگەڵ ڕەشێنەكەیدا نەبێت، كە دەڵێی شەوە و تاریكە، ئەوا چاو ناتوانێت هیچ شتێك ببینێت! (دانەر)

٣٣ - "بوون"ی هەر شتێك بەندە بە بوونی هەموو بەشەکانیەوە. کەچی نەبوونی یەکێك لە بەشەکانی دەبێت بەهۆی "نەبوون"ی سەرجەمی ئەو شتە!

هەر لەبەر ئەوەشە کە مرۆڤی لاواز مەیلی بە لای خراپکاریدا هەیە، تاکو هێز و توانای خۆی دەربخات! ئەوەتا لە بریی کاری ئیجابی، دەچێ کاولکاری و کاری سەلبی ئەنجام دەدات!

٣٤ - ئەگەر دەستوورەکانی "حیکمەت" و.. یاساکانی "حکومەت" و.. قانوونەکانی "حەق" و.. ڕێسا و پەیوەندییەکانی "هێز" ئاوێتەی یەکتر نەکرێن، ئەوا هەرگیز لای جەماوەری خەڵك سوودبەخش و بەرهەمدار نابن.

٣٥ - ستەم کڵاوی "دادگەری"ی لەسەر کردووە و.. "خیانەت" پۆشاکی "عیززەت"ی پۆشیوە و.. ناوی "بەغی" لە "جیهاد" و، "دیلی"ش لە "سەربەستی" نراوە!

بەم جۆرە، شتانی دژ بە یەك شێوەکانی خۆیان گۆڕیوەتەوە!

٣٦ - ئەو "سیاسەت"ەی کە پابەندی "بەرژەوەندییەکان"ە: دڕندەیەکی سامناکە!

٣٧ - خۆبردنە پێشەوە و خۆخۆشەویست کردن لە لای دڕندەیەکی برسیدا، هەرگیز بەزەیی ئەو دڕندەیە ناجووڵێنێت! بەڵکو پتر ئیشتیهای دەبزوێنێت و، جگە لەوە داوای حەقدەستی کەڵبە و نینۆکەکانیشی دەکات!

٣٨ - ئەم ڕۆژگارە دەری خست کە بەهەشت گرانە و بە هەرزان دەست ناکەوێت.. هەروەها دۆزەخیش زیاد لە پێویست دروست نەکراوە!

٣٩ - ئەو تایبەتکارییەی کە مرۆڤانی "خەواص"ی ئەهلی دنیا هەیانە و داخوازی تەوازوع و بەزەییهاتنەوەیە بە خەڵکدا، ئێستا بووە بەهۆی لەخۆبایی بوون و خۆبەگەورەگرتن بەسەر خەڵکیدا..

هەروەها دەستەوسانی و هەژاریی "عەوام"یش کە هەستی سۆز و بەزەیی و چاکەکاریی خەواص بەرامبەر بەوان دەورووژێنێت، لەم سەردەمەدا بووە بەهۆی دیلی و نزمی و ڕسواییيان.

٤٠ - گەر هەر چاکە و شەرەفمەندییەك لە هەر شتێکدا ببێت، خێرا دەدرێتە پاڵ چینی "خەواص" و پێشکەش بەوان دەکرێت! کەچی گەر هەر خراپە و کارێکی ناپەسەند لەو شتەدا هەبێت دەخرێتە ئەستۆی خەڵکی و دەدرێتە پاڵ چینی عەوام!

٤١ – ئەگەر هزر(بیر) خاوەنی مەبەست و ڕەوشت و ئامانجێكی بەرز نەبێت، یان ئەو ئامانجەی تێدا لە بیرچووبێتەوە، یان لە بیری خــۆ برابێتـەوە.. ئـەوا زەینـەكان دەگۆڕێن و دەبن بە "خۆپەرستی" لەم و لەودا و لە دەوری ئەو خۆپەرستی‌یە كۆ دەبنەوە!

٤٢ – گەر سەرنج لە هەموو جۆرەكانی خراپكاریی گرۆی مرۆڤ بدەیت، دەبینیـت بناغـەی سـەرەكیی هـەموو جۆرەكـانی پشـێوی و ئـاڵۆزی و نـاكۆكی.. هـەروەها سەرچاوەی گشت خراپكاری‌یەكانی لەمەڕ ژیانی كۆمەڵایەتی، تەنها دوو وشەن:

یەكەمیان: "گەر من بۆخۆم تێر بم چیم لە خەڵكی داوە؟ با لە برساندا بمرن"..

دووهەمیان: "تۆ كار بكە با من بەری ڕەنجت بخۆم.. تۆ ماندوو ببە با من بحەوێمەوە"!

قرتێنەری دەماری وشەی یەكەم: تەنها زەكات دانە و.. دەرهێنەری ڕەگ و ڕیشە و، شیفابەخشی دەردی وشەی دووهەمیش: حەرامكردنی ڕیبا(سوو)یە.

دادگەریی قورئان لەسەر دەرگای جیهاندا ڕاوەستاوە و بە "ڕیبا" دەڵێـت: "قەدەغەیـە مـافی هاتنـە ژوورەوەت نی‌یـە"! بـەڵام گرۆی مـرۆڤ لەبـەر ئـەوەی گوێڕایـەڵیی ئـەم فەرمانـەی قورئـانی نەكرد، زللەیـەكی سـەختی خـوارد. چـار نی‌یـە دەبـێ پێـش ئـەوەی زللەیەكی توند و تاڵتر بچێژێت، ملكەچی ئەم فەرمانەی قورئان بێت.

٤٣ – جەنگەكانی نێـوان دەوڵـەتان و گـەلان جێـی خۆیـان بـۆ چــەندین ملمـلانـێ و جەنگی تر چۆڵ كـرد لـە نێـوان چینەكانی مرۆڤـدا. چونكـە مـرۆڤ هـەروەك بـە "دیلـی" ڕازی نی‌یە، بە ژیانی "كرێگرتەیی"ش ڕازی نابێت.

٤٤ – ئـەو كەسـەی كـە بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجـەكانی خـۆی ڕێیـەكی نامەشـروو ع دەگرێتەبـەر، زۆربـەی جـار، بـە پێچەوانـەی نیازەكەیـەوە سـزا دەدرێـت! چونكـە سـزای خۆشەویسـتیی نامەشـرووع – بـۆ نموونـە وەك خۆشویسـتنی ئـەورووپا – دوژمنایەتی‌یـەكی غەددارانەیە لە لایەن ئەو خۆشەویستەوە!

٤٥ – دەبـێ بـە چـاوی "قـەدەر"ی خـوای گـەورە بـۆ "ڕابـوردوو" و "موسـیبەتەكان" بڕوانیـت.. بـەڵام دەبـێ لــە گۆشــە نیگــای: "تــەكلیف"ی خــوای گــەورەوە بڕوانیتــە: "داهاتوو" و "گوناهەكان".

بەم جۆرە، هەریەك لە "موعتەزیلە" و "جەبری‌یە"كان لەم خاڵەدا لەگەڵ ئەهلی حەق یەك دەگرنەوە.

٤٦ – ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کە دەکرێت چارەسەرییان بۆ بدۆزرێتەوە، دەبێ مرۆڤ لە بەرامبەریانەوە دەستەوسان نەبێت.. ئەو گرفت و کێشانەش کە چارەسەر ناکرێن، دەبێ خەفەتیان بۆ نەخورێت!

٤٧ – زامەکانی ژیان ساڕێژ دەبن، بەڵام زامەکانی عیززەتی ئیسلامی و شەرەف و سەربەرزیی نەتەوەی ئیسلام یەکجار قووڵن، هەمیشە هەر دێنەوە سۆ.

٤٨ – ڕۆژگارێك دەبێت کە تەنها یەك وشە سوپایەکی تەواو گیرۆدەی جەنگ دەکات و، تەنها یەك فیشەکیش دەبێت بەهۆی لەناوچوونی سێ ملیۆن کەس[1].

هەروەها چەند باردۆخێکی ئەوتۆ دێنە کایەوە کە تەنها یەك جووڵەی بچووك – لەو باردۆخەدا – مرۆڤ بۆ پلەی هەرەبەرزی: (أعلى عليين) بەرز دەکاتەوە.. بە هەمان جۆر کارێکی سادە و ئاساییش خاوەنەکەی بەرەو نزمترین نزمی(أسفل سافلين) بەردەداتەوە!

٤٩ – یەك دەنکە دانەوێڵەی "ڕاستی"(الصدق) خەرمانێکی "درۆ" دەدات بە بادا.. هەروەك تەنها یەك "ڕاستی"ش لە خەرمانێك "ئەندێشە" باشترە!

دەبێ هەر گوفتارێکت لە زار دەردەچێت: "ڕاست" بێت. بەڵام کارێکی ڕاست و ڕەوا نیی‌یە کە هەرچی قسەی "ڕاست" دەزانیت بیانکەیت، چونکە: "لايلزمُ من لزومِ صدقِ كلِّ قولٍ قولُ كلِّ صدقٍ"[2]!

٥٠ – هەر کەسێك بە باشی شتان ببینێت، هەڵسوکەوت و بیر و بۆچوونەکانیشی جوان دەبن، خۆ هەرکەسیش بیرەکانی جوان بوون، ئەوا تام و لەزەتی "ژیان" دەچێژێت.

٥١ – "هیوا و ئاوات" گیان بە بەری ژیاندا دەکات، بەڵام "نائومێدی" دەیانمرێنێت!

٥٢ – ئەم دەوڵەتە ئیسلامیی‌یەی کە لە دێر زەمانەوە واجبی جیهادی – وەك فەرزێکی کیفایەت لە بریی هەموو موسڵمانان – خستە ئەستۆی لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی: "ألله" و پاراستنی بەردەوام بوونی سەربەستیی جیهانی ئیسلامیدا، کە وەك یەك جەستە وایە و.. خۆی خستە هەڵوێستی قوربانی و خۆبەختکاری بۆ جیهانی ئیسلامی و.. ئاڵای

---

(١) ئەو فیشەکەی کە بە "وەلی عەهد"ی نەمساوە نرا، بوو بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، کە سێ ملیۆن کەسی تێدا کوژرا! (دانەر)

(٢) واتە: کە دەڵێین: "پێویستە هەموو گوفتارێکت ڕاست بێت" ئەوە ناگەیەنێت کە هەرچی قسەی ڕاست هەیە هەموویان بدرکێنیت! (وەرگێڕ)

خه‌لافه‌تی هه‌ڵكردبوو.. ئه‌م ده‌وڵه‌ته – دوای ئه‌م گیروگرفته‌ی كه‌ هاته‌ ڕێی – به‌ پشتیوانیی خوای گه‌وره‌، به‌ "به‌خته‌وه‌ری"یه‌كی ئه‌وتۆ پاداشت ده‌درێته‌وه‌ كه‌ سه‌رانسه‌ری جیهانی ئیسلامی بگرێته‌وه‌ و قه‌ره‌بووی موسیبه‌ت و زیانه‌كانی پێشووی بۆ بكاته‌وه‌. ئه‌وه‌تا ئه‌م گیروگرفته‌ی ئێستای، زۆر به‌ خێرایی، "برایه‌تی"ی نێوان موسڵمانانی له‌ هه‌موو جێیه‌كی جیهانی ئیسلامیدا زیندوو كردووه‌ و هێنایه‌ ڕوو، ئه‌و برایه‌تی‌یه‌ی كه‌ گیان و كاكڵه‌ و گه‌وهه‌ری ژیانی ئێمه‌یه‌.

٥٣ – گێڕانه‌وه‌ی لایه‌نه‌ جوانه‌كانی شارستانێتی بۆ ئایینی "نه‌صرانی" كه‌ خاوه‌نی فه‌زڵ نی‌یه‌ تیایدا.. هه‌روه‌ها پیشاندانی "دواكه‌وتن"یش به‌ شێوه‌یه‌ك كه‌ بخرێته‌ پاڵ ئیسلام كه‌ ئایینێكی دوژمنی دواكه‌وتنه‌.. ئه‌م كاره‌، به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ "موقه‌دده‌رات" به‌ پێچه‌وانه‌ی خولانه‌وه‌ی سروشتیی خۆیانه‌وه‌ ده‌خولێنه‌وه‌! هه‌روه‌ك به‌ڵگه‌ی هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی بارودۆخی شتانه‌!

٥٤ – پارچه‌یه‌ك "ئه‌ڵماس" هه‌رچه‌نده‌ كۆنیش بێت و ژه‌نگی لێ نیشتبێت، له‌ پارچه‌ شووشه‌یه‌ك باشتره‌، با هێنده‌ش خاوێن بێت كه‌ بېریسكێته‌وه‌!

٥٥ – ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌ناو "مادده‌"دا به‌ دوای هه‌موو شتێكدا ده‌گه‌ڕێن، "ژیری"یان له‌ چاویاندایه‌، خۆ دیاره‌ چاویش شتانی "مه‌عنه‌وی" نابینێت!

٥٦ – ئه‌گه‌ر "مه‌جاز" له‌ ده‌ستی زانسته‌وه‌ بكه‌وێته‌ ده‌ستی نه‌زانی، ئه‌وا به‌ "حه‌قیقه‌تی ماددی"ی داده‌نێت و ده‌رگای چه‌نده‌ها ئه‌فسانه‌شی پێ ده‌خاته‌ سه‌رپشت!

٥٧ – دڵنیابه‌ كه‌ هیچ "چاكه‌"یه‌ك چاكتر نی‌یه‌ له‌وه‌ی كه‌ خوای گه‌وره‌ به‌خشیویه‌تی. كه‌واته‌ وه‌سفی هه‌ر شتێك كرا، با وه‌ك خۆی و به‌و سیفه‌تانه‌ی تیایدان وه‌سف بكرێت!

٥٨ – "ناوبانگ" مرۆڤ ده‌كات به‌ خاوه‌نی شتێك كه‌ هی ئه‌و نی‌یه‌!

٥٩ – فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كانگای ژیان و ئیلهامده‌ری حه‌قیقه‌ته‌كانه‌.

٦٠ – زیندووكردنه‌وه‌ی ئه‌م نه‌ته‌وه‌یه‌ به‌: ژیاندنه‌وه‌ی "ئایین" ده‌بێت. هه‌روه‌ك ژیانی ئایینیش – له‌ ڕاستی‌دا – نووری ژیانه‌.

٦١ – قورئانی پیرۆز – كه‌ مایه‌ی به‌خته‌وه‌ریی سه‌رجه‌می گرۆی مرۆڤه‌ – ته‌نها یه‌ك جۆر شارستانێتی په‌سه‌ند ده‌كات و وه‌ری ده‌گرێت، ئه‌ویش ئه‌و چه‌شنه‌ شارستانێتی‌یه‌یه‌

كە "بەختەوەری" بە "هەموو" گرۆی مرۆڤ یان "زۆرینە"یان ببەخشێت.. كەچی شارستانێتیی ئێستا لەسەر پێنج بناغەی سەلبی دامەزراوە:

(١) ستوون و خاڵی پاڵپشتی بریتییە لە: "هێز". كە ئەویش: سنوورشكاندن و دەستدرێژیی لێ دەبێتەوە.

(٢) مەبەست و ئامانجیشی: "سوود و بەرژەوەندی"یە. كە ئەمەش: "پاڵپاڵێن"ی لێ دروست دەبێت.

(٣) دەستووری ژیان بە لایەوە بریتییە لە: "مشتومڕ" و "ململانێ". كە ئەمەش قڕەوبڕە و پاشقول لەیەكتردانی لێ دەبێتەوە.

(٤) ئەو پەیوەندییەش كە بۆ پێكەوە گرێدانی خەڵكی بەكاری دەهێنێت: "دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی"یەكی ئەوتۆیە كە بە هەڵلووشینی نەتەوەكانی تر گەشە دەكات و پەرە دەسێنێت. خۆ دیارە ئەمەش ئاژاوە و جەنگی ترسناكی لێ دەبێتەوە.

(٥) ئەو خزمەتەش كە پێشكەشی مرۆڤایەتیی دەكات، خزمەتێكی سەرنج ڕاكێشە، چونكە بریتییە لە: هاندانی هەوا و ئارەزووەكان و هێنانەدیی حەز و خواستەكانی دەروونی بەدخواز. خۆ ئاشكرایشە كە ئەو هەوا و ئارەزووانە سەروسیمای مەعنەویی ئادەمیزاد دەشێوێنن و مەسخی دەكەن.

بەڵام ئەو شارستانێتییەی كە لە شەریعەتی ئەحمەدیدا هەیە و داوای دەكات:

(١) خاڵی پاڵپشتی: "حەق"ە لە بریی "هێز". خۆ "حەق"یش هەمیشە دادگەری و هاوسەنگی دادەمەزرێنێت.

(٢) ئامانجیشی: "فەزیلەت"ە نەك "بەرژەوەندی"! خۆ بەرهەمی فەزیلەتیش: خۆشەویستی و لێك نزیكبوونەوەیە.

(٣) لایەنی پەیوەندیدەر و هاوپەیوەستیی خەڵكییش بەلایەوە بریتییە لە: "ئایین و هاونیشتمانی و هاوپیشەیی"[1] لە بریی: "دەمارگیری" و "ڕەگەزپەرستی". خۆ دیارە ئەم چەشنە پەیوەندییانەی كە شەریعەت دایناون: برایەتیی خاوێن و ئاشتی بەرهەم دەهێنن و، لە كاتی "دەستدرێژیی دەرەكی"شدا تەنها ڕێی "بەرگری" دەگرێتەبەر.

---

(١) مەبەست پەیوەندی و هاوپیشەیی نێوان ئەو كەسانەیە كە لە مەیل و تەبیعەت و چێژ و بیروبۆچووندا یەك دەگرنەوە و، ئایینی ئیسلامیش ئەم هەڵە دەقۆزێتەوە بۆ زیاتر پتەوكردنی پەیوەندیی نێوانیان. (وەرگێڕ)

(٤) دەستووریشی لە ژیاندا: "هاوکاری و هاوئاهەنگی"یە لە بریی مشتومڕ و ململانێ! خۆ دیارە "هاوکاری"ش: یەکێتی و پشتگیریی یەکتری لێ دەبێتەوە.

(٥) ئنجا لە بریی "هەوا و ئارەزوو": "هـودا" دەدات بە کۆمەڵ. کە ئەمەش ئاستی "گیان"ی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە و بەرەو "کەمالات"ی دەبات.

کەواتە دەست لە ئیسلام بەرمەدە کە پارێزەری بوونی ئێمەیە.. بە توندی دەستی پێوە بگرە، دەنا تیادەچیت.

٦٢ – هۆی دابارینی گیروگرفتە گشتی‌یەکان: هەڵە و تاوانی "زۆرینە"ی خەڵکی‌یە. کەواتە گیروگرفتەکان: "ئەنجام"ی تاوان و "پێشەکی"ی پاداشتن!

٦٣ – "شەهید" خۆی بە "زیندوو" دادەنێت. چونکە لەبەر ئەوەی ژانی سەرەمەرگی نەچەشتووە، پێی وایە کە ئەو ژیانەی بەختی کردووە هەر ماوەتەوە و بەردەوامە، بەڵام لە چاو هی پێشووی گەلێ جوان و خاوێنترە.

٦٤ – دادگەریی تەواوەتی و سەرتاسەریی "قورئان" خوێن و ژیانی یەك کەسی بێ تاوان، تەنانەت لەبەر ژیانی سەرجەمی گرۆی مرۆڤیش بەخت ناکات. چونکە هەروەك بەدیهێنانی هەردووکیان (واتە یەك کەس و سەرجەمی مرۆڤایەتی) لە بەردەم "توانست"ی خواوەندا یەکسانە، بە هەمان جۆر لە بەردەم "دادگەری"ی خوای گەورەشدا یەکسانن. کەچی ئەو کەسەی هەڵپە و "خۆپەرستی"ی بەسەردا زاڵ بووە، دەیەوێت هەر شتێك ڕێ لە هێنانەدیی هەڵپە و خۆپەرستی‌یەکەی بگرێت، لەناوی بەرێت. تەنانەت گەر بتوانێت ئامادەیە سەرانسەری جیهان و ڕەگەزی مرۆڤیش لەو پێناوەدا قەڵاچۆ بکات!

٦٥ – "ترس" و "لاوازی" کاریگەری‌یە دەرەکی‌یەکان ئازا دەکەن و بەریان دەدەنە گیانی مرۆڤ.

٦٦ – هەرگیز بەرژەوەندی‌یەکی "مسۆگەر" لە پێناوی زیانێکی "وەهمی"دا بەخت ناکرێت!

٦٧ – سیاسەتی ئێستای ئەستەمبووڵ وەکو نەخۆشیی "ئیسپانی" وایە؛ مرۆڤ دووچاری وڕێنە دەکات!

٦٨ – گەر بە "شێت" بوترێ: "تۆ باشیت.. هیچت نی‌یە"، دوور نی‌یە چاك ببێتەوە. هەروەها دووریش نی‌یە کە مرۆڤی "ژیر" تێك بچێت گەر پێی بوترێ: "تۆ خراپیت"!

٦٩ - "دوژمنی دوژمن" دۆستە، هەتا دوژمنی بێت.. "دۆستی دوژمن"یش دوژمنە هەتا دۆستی بێت!

٧٠ - سروشتی "عیناد" وایە کە: ئەگەر "شەیتان"ێك یارمەتیی مرۆڤی عینادکار بدات، دەڵێت: ئەوە مەلائیکەتە و، ئیتر ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت.. بەڵام ئەگەر "مەلائیکەت"ێك لە ڕیزی ئەو کەسانەدا ببینێت کە ڕایان لەگەڵ ئەمدا جیایە، دەڵێت: ئەوە شەیتانە بەرگ و پۆشاکی خۆی گۆڕیوە. ئیتر لەعنەتی بۆ دەنێرێت!

٧١ - هەندێ جار دەرمانی نەخۆشی‌یەك دەبێت بە ژەهر بۆ نەخۆشی‌یەکی تر. هەروەها گەر دەرمان زیاد لە پێویست بەکار بهێنرێت هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێت بە دژی خۆی.

٧٢ - (الجمعية التي فيها التساند آلةٌ خُلِقتْ لتحريك السكنات، والجماعة التي فيها التحاسد آلةٌ خُلِقَتْ لتسكين الحركات)!

واتە: ئەو کۆمەڵەی کە پشتگیریی یەکتریی تێدایە، وەك ئامرازێك وایە بۆ بزواندنی شتانی نەجوولاو. بەڵام ئەو کۆمەڵەی کە حەسوودی‌یان لە نێواندا بێت، ئامرازێکە بۆ وەستانی جموجووڵەکان.

٧٣ - گەر هەر کۆمەڵ(جمع)ێك "یەکی تەواو"ی تێدا نەبێت، وەکو لێکدانی کەرتی بیرکاریی لێ دێت، بچووك دەبێتەوە و کەم دەکات[1]!

٧٤ - زۆر جار "نەبوونی قبووڵ" لەگەڵ "قبووڵکردنی نەبوون"دا لە خەڵکی دەئاڵۆزێن! لە کاتێکدا کە بەڵگەی: "نەبوونی قبووڵ": نەچەسپاندنی بەڵگەیە، کەچی "قبووڵکردنی نەبوون" پێویستی بە "بەڵگەی نەبوون"ە. کەواتە یەکێکیان دوودڵی‌یە و ئەوی تریشیان ئینکاری‌یە!

٧٥ - ئەگەر "دوودڵی" بتوانێت بەڵگەیەك بەڵکو سەد بەڵگەش لە "بەڵگەکانی ئیمان" نەسەلمێنێت، هێشتا هەر ناتوانێت زیان بەو بابەتە ئیمانی‌یە بگەیەنێت کە ئەو بەڵگانەی بۆ هێنراوەتەوە، چونکە هەزاران بەڵگەی تری لەسەر هەیە.

---

(١) وەك ئاشکرایە: هەموو ژمارەیەك بە: "کۆکردنەوە" و "لێکدان" زیاد دەکات. وەك: "٤×٤=١٦" بەڵام لە ئەنجامی کۆکردنەوە و لێکدانی کەرتەکاندا ژمارەکە کەم دەکات! بۆ نموونە: ئەنجامی لێکدانی: (سێ‌یەك × سێ‌یەك = نۆیەك)! کۆمەڵانی گرۆی مرۆڤیش بە هەمان جۆرن، چونکە ئەگەر یەکێتی‌یەکی تەوتۆیان لە نێواندا نەبێت کە لەسەر بناغەی "ڕاستی" و "ئیستیقامەت" بنیات نرابێت، ئەوا هەتا زیاد بکەن کەم دەکەنەوە و ڕووبەڕووی تێکچوون و لێکهەڵوەشان دەبنەوە. (دانەر)

٧٦ - پێویستە مرۆڤ شوێنی "زۆرینە"ی موسڵمانان بکەوێت، چونکە کاتێ "ئەمەوی‌یەکان" پشتیان بە زۆرینەی خەڵکی بەست، لە ئەنجامدا - سەرباری قوسوور و کەمتەرخەمی‌یەکانیشیان - هەر لە نێوان ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا گیرسانەوە. بەڵام "عەلەوی"یەکان لەبەر ئەوەی پشتیان بە ژمارەیەکی کەم بەست - هەرچەندەش دەستیان بە حەقیقەتەوە گرتبوو - هەندێکیان لە کۆتایی‌دا لە ناوەندی ڕافزی‌یەکاندا خۆیان بینی‌یەوە.

٧٧ - ئنجا هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە سەبارەت بە ڕێباز و ڕێڕەوەکەی خۆی بڵێت: "ئەمە حەقە.. جوانە". بەڵام مافی ئەوەی نی‌یە بڵێت: "هەر ئەمە حەقە.. هەر ئەمە جوانە"!

٧٨ - گەر "بەهەشت" نەبوایە، دۆزەخ سزای کەسی نەدەدا!

٧٩ - هەتا "زەمان" کۆن و پیرتر ببێت، لاوێتی قورئانی پیرۆز پتر دەردەکەوێت و نهێنی و هێماکانیشی زیاتر ئاشکرا دەبن. جا هەروەك بە ڕواڵەت "نوور" وەکو "ئاگر" دەردەکەوێت، هەندێ جاریش زۆریی "بەلاغەت" بە "موبالەغە" دەبینرێت!

٨٠ - پلەکانی "گەرما" لە ڕاستی‌دا ئەنجامی تێکەڵ بوونی سەرمایە و، پلەکانی "جوانی"ش هی تێهەڵکێش بوونیەتی لەگەڵ ناشیرینی‌دا.. بەڵام "توانستی ئەزەلی"ی خواوەند توانستێکی خۆیی(ذاتي)یە و پێویستە بۆ زاتی پەروەردگار. بۆیە هەرگیز "کۆڵەواری"ی ئاوێتە نابێت و پلەپلەش نی‌یە. ئەوەتا هەموو شتێکی بەلاوە یەکسانە.

٨١ - وێنەی خۆر - کە درەوشانەوەی ڕێژنەی خۆرە - هەمان تایبەتکاریی خۆی لەسەر ڕووی دەریا و دڵۆپەکانیشی دەردەخات.

٨٢ - "ژیان" لە درەوشانەوەی "تەوحید"ەوەیە. کۆتایی‌یەکەشی "تەنیایی" بەدەست دەهێنێت.

٨٣ - مادەم "وەلی" لەناو خەڵکی‌دا و، "سەعاتی دوعاگیرابوون" لە شەو و ڕۆژی جومعەدا و.. "شەوی قەدر" لە ڕەمەزاندا و، "ئیسمی ئەعزەم"ی خواوەند لە نێوان ناوە جوانەکانی‌دا و، "ئەجەل" لە تەمەندا، نەزانراون، ئەوا یەك بە یەکی تاکەکانی تری ئەو جۆرانە نرخ و بەهای خۆیان هەر دەمێنێت. چونکە تەمەنێکی نەزانراوی بیستساڵی گەلێ باشترە لە تەمەنێکی هەزار ساڵیی ئەوتۆ کە بزانرێت کەی کۆتایی پێ دێت!

٨٤ - سزای تاوان لە دنیادا، بەڵگەیە لەسەر بوونی سزای دوارۆژ.

٨٥ - "ڕۆزی" بە وێنەی "ژیان" بە لای خوای گەورەوە دارای گرنگی‌یە، چونکە "قودرەت" ڕۆزی دەهێنێتە دەر و، "قەدەر"یش پۆشاکی تایبەتیی بە بەر دەپۆشێت و، "چاودێری"ش پێی دەگەیەنێت و چاودێریی دەکات.

کەواتە "ژیان" دیار و دەستنیشان کراوە، کەچی "ڕۆزی" وا نی‌یە، بەڵکو ئانی و تەدریجی و پەرش و بڵاوە و مرۆڤ دەخاتە بیرلێکردنەوە.

کەس لە برساندا نامرێت، چونکە مرۆڤ هەتا چەوری و ماددە پاشەکەوت کراوەکانی جەستەی تەواو نەبێت، نامرێت. کەواتە هۆکاری مردن نەخۆشی‌یەکە لە "تەرکی عادەت"ەوە سەری هەڵداوە، نەك لە نەمانی ڕۆزی‌یەوە.

٨٦ - ڕۆزیی دڕندە گۆشت خۆرەکان، کەلاکی زیندەوەرە مرداربووەکانە کە هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن. جا لەو کاتەدا کە ڕۆزیی خۆی دەخوات، ڕووی زەویش خاوێن دەکاتەوە.

٨٧ - پارووێەك بە یەك فلس بێت و پارووێەکی تر کە - بۆ نموونە - بە دە فلس بێت، هەردووکیان پێش ئەوەی بڕۆنە ناو دەمی مرۆڤ و دوای تێپەڕبوونیشیان لە گەرووێەوە، یەکسانن! جیاوازیی نێوانیان تەنها لەزەتبردنی دەمی مرۆڤە بۆ ماوەی چەند چرکەیەك. لەبەر ئەوە، خەرجکردنی دە فلس لە شوێنی خەرجکردنی یەك فلسدا بۆ مەبەستی ڕازی کردنی هەستی چەشتن - کە ئەرکی پشکنین و پاسەوانیی پێ سپێرراوە - لە ڕاستی‌دا هەرزەترینی جۆرەکانی ئیسرافە.

٨٨ - هەر کاتێك تام و لەزەتەکان بانگیان لە مرۆڤ کرد، دەبێ بە: "وابزانە خواردم" وەڵام بدرێنەوە. ئەوەتا ئەو کەسەی کە ئەمەی کرد بە دەستووری ژیانی، دەیتوانی مزگەوتێك بخوات کە ناوی: "وابزانە خواردم"ە، کەچی نەیخوارد(1)!

٨٩ - لە سەردەمەکانی پێشیندا زۆربەی موسڵمانان برسی و دەستکورت نەبوون، بۆیە دروستبوو موسڵمان ژیانی ڕەفاهییەت(خۆشگوزەرانی) بۆ خۆی هەڵبژێرێت. بەڵام لەم سەردەمەی ئێستادا زۆربەیان دەستکورت و برسین، بۆیە ڕوخسەتی شەرعی بۆ هەڵبژاردنی تام و لەزەتەکان بە دەستەوە نەماوە.

---

(1) مزگەوتی: "وا بزانە خواردم **Sanki Yedim**" دەکەوێتە گەڕەکی سولتان محەممەد فاتح لە ئەستەمبوڵ. بنیاتنەرەکەی پارەی پێویستی بۆ ئەو مەبەستە لە دەمی خۆی گرتووەتەوە و، هەر کات حەزی لە خواردنێك بکردایە، نەیدەخوارد و بڕی پارەی ئەو شتەی پاشەکەوت دەکرد و دەیوت: "وابزانە خواردم"! تاکو لەم ڕێیەوە هێندە پارەی کۆکردەوە کە ئەو مزگەوتەی پێ بنیات نا و دوایی ئەو ناوەی لێ نرا! (دانەر)

٩٠ – دەبێ لـە بەرامبەر "ئـازاری کـاتی"یـەوە مـرۆڤ زەردەخەنـە بنوێنێـت و چـەندە پێشوازی لـە "چێژی کـاتی" دەکـات زیـاتر لـەمی بکـات. چونکـە چێـژ و لـەزەتـەکانی ڕابوردوو خەم و حەسرەتێکی ئەوتۆ لـە زاری مـرۆڤ دەهێننـەدەر کـە ئـازارە پەنهانـەکان بەرجەستە دەکەن.. بەڵام ئازارەکانی ڕابوردوو زمانی مرۆڤ بە: "الحمد لله" دەکەنەوە، کە ئەمەش لەزەت و نیعمەتە شاراوە و پەنهانەکان دەردەخات!

٩١ – "لـەبیرچوونـەوە"ش خـۆی لـە خـۆیدا نیعمەتـە، چونکـە تەنـها ئـازاری ڕۆژانـە دەرخواردی مرۆڤ دەدات و ئازارە کەڵەکەبووەکانی لە بیر دەباتەوە!

٩٢ – هەموو گیروگرفت(مصيبة)یـێك پلەیـەکی نیعمەتـی تێدایـە، بـە وێنـەی پلـەکانی گەرما – کە سەرمایان ئاوێتە دەبێت – لەبەر ئەوە، دەبـێ مـرۆڤ شـوکری خـوا بکـات و بیر لـە موسـیبەتی گـەورەتر بکاتـەوە و ئـەو نیعمەتـە ببینێـت کـە لـە موسـیبەتە هـەرە بچووکەکەیدا هەیە. دەنا گەر فوو بکرێتە ئەو گیروگرفتە و بـە گـەورە تەماشـا بکرێـت، ئەوا ئەویش گەورە دەبێت، خۆ ئەگەر مـرۆڤ بەهۆیـەوە تووشـی نیگـەرانی و دڵـەڕاوکێ بێت، ئەوا گیروگرفتەکەی دووچەندانە دەبێت و نموونە وەهمی‌یەکەی لە دڵدا دەبێت بـە حەقیقەتێکی بەرجەستەی ئەوتۆ کە دڵی مرۆڤ لە ژێر پێی خۆیدا دەپلیشێنێتەوە!

٩٣ – هـەموو کەسـێك پەنجەرەیـەکی هەیـە، چ بـۆ سـەیرکردن و چ بـۆ خۆپیشـاندان، لێیەوە دەڕوانێتە کۆمەڵ. بەو پەنجەرەیە دەوترێ: "پلە و پایە". جا ئەگەر ئەو پەنجەرەیـە لـە باڵای نرخ و بەهای خۆی بەرزتر بوو، ئەوا دەیـەوێ بـە "تەکەببور" بـاڵای نـرخ و بەهـای خۆی درێژ بکات! بەڵام گەر پەنجەرەکەی لە باڵای نرخ و بەهای خۆی نزمتر بوو، ئەوا بە تەوازوعەوە خۆی بچووك دەکاتەوە!

پێوەری مەزنێتی لـە مرۆڤدا: تەوازوعـە.. بـەڵام پێـوەری بچووکیـی مرۆڤـی بچـووك: تەکەبوور و خۆبەگەورە زانینە!

٩٤ – ئەو دەروون بەرزیی‌یەی کـە مرۆڤـی "لاواز" لـە بەرامبـەر کەسـانی "بـەهێز"ەوە هەستی پێ دەکات، گەر لە مرۆڤی بەهێزدا بێت بە "تەکەببور" دادەنرێت.. هـەروەها ئـەو "تەوازوع"ەش کە مرۆڤی "بەهێز" بەرامبەر بە "لاواز" هەستی پێ دەکات، گـەر لـە بابـای لاوازدا بێـت بە "خۆ زەلیل‌کردن" دادەنرێت!

جیددییەت و لێـبڕانی کاربەدەسـت و حوکمـڕان لـە ڕێ و شـوێنی کارەکـەیدا، بـە: "ویقار" و، نەرمونیانیشی لەوێدا بە "زەلیلی" لـە قەڵـەم دەدرێـت.. هـەروەك ئەگـەر ئـەم

جیددییەتە لەماڵەکەیدا دەربېڕێت، ئەوا بەڵگەی "تەکەببور"ە و، گەر لەوێ نەرمونیانیش بێت بەڵگەی "تەوازوع"ە!

مرۆڤ گەر بە ناوی خۆیەوە لەو کەسە خۆش ببێت کە خراپەی بەرامبەر کردووە، یان هەرچیی هەیە ببەخشێت و بەختی بکات، کارەکەی بە کردەوەیەکی "باش" دادەنرێت. بەڵام گەر ئەم کارە بە ناوی کۆمەڵەوە بکات، ئەوا بە خیانەت و کارێکی "خراپ" دادەنرێت!

مرۆڤ دەتوانێت لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خۆیەوە ڕقی خۆی بخواتەوە و، مافی ئەوەشی نییە کە شانازی بە هیچ شتێکی خۆیەوە بکات.. بەڵام دەتوانێت شانازی بە نەتەوەکەیەوە بکات، بێ ئەوەی ڕقی خۆی لە شتێکدا بخواتەوە و لەسەری نەیەتە جواب کە مافی نەتەوە بێت!

٩٥ – سپاردنی تەرتیبدانی پێشەکییەکانی هەر کارێك بە خوای گەورە، بە "تەمبەڵی" دادەنرێت. بەڵام بۆ هاتنەدیی ئەنجام بە "تەوەککول" دەژمێررێت..

ڕازی بوونی مرۆڤ بە ئەنجامی کردوکۆششەکانی و ئەو بەشەی کە دەیدرێتێ و دەیکەوێت: "قەناعەت"ە و ئارەزووی بەردەوامبوونی هەوڵ و کۆششی تێدا بەهێز دەکات. بەڵام ڕازی بوون تەنها بەوەی کە لەدەستدایە، کورت هێنانە لە هیممەتدا!

٩٦ – هەروەك لە لایەن مرۆڤەوە گوێڕایەڵی و سەرپێچی – هەردووکیان – بەرامبەر بە فەرمانە شەرعییەکان ڕوودەدەن، بە هەمان جۆریش، گوێڕایەڵی و سەرپێچی بەرامبەر فەرمانە تەکوینییەکان (واتە سوننەتە کەونی و ژیانییەکان) ڕوودەدەن.

زۆربەی جاریش وا دەبێ یەکەمیان کە گوێڕایەڵان و سەرپێچی کارانی فەرمانە شەرعییەکانن، پاداشت و تۆڵەی خۆیان لەو دنیادا وەردەگرن. بەڵام زۆربەی جار دووهەمیان، کە گوێڕایەڵان و سەرپێچی کارانی سوننەتە کەونی و ژیانییەکانن، هەر لەم دنیایەدا بە پاداشت و تۆڵەی خۆیان دەگەن!

جا هەروەك:

پاداشتی ئارامگرتن: سەرکەوتنە و.. تۆڵەی تەمبەڵی و دانیشتن: زەلیلی و سەرشۆڕییە..

بە هەمان جۆر، پاداشتی کۆشش: دەستکەوت و دەوڵەمەندییە و.. پاداشتی بەردەوام بوونیش لەسەر حەق: سەرکەوتنە.

ئەو دادگەرییەی کە "یەکسانی"ی تێدا نەبێت، هەرگیز بە "دادگەری" دانانرێت.

٩٧ - "لەیەکچوون" هۆکارێکی گرنگە بۆ "دژایەتی".. پێکەوەگونجان(التناسب) بناغەیەکە بۆ پشتگیریی یەکتری.. "بچووکیی دەروون" سەرچاوەی "تەکەببور"ە.. "لاوازی"یش کانگای "لەخۆبایی بوون"ە.. "دەستەوسانی"ش مایەی سەرهەڵدانی "خیلاف"ی نێوان خەڵکییە.. "حەزی شارەزابوون" مامۆستای زانستە.

٩٨ - توانستی بەدیهێنەرانەی خوای گەورە، هەموو زیندەوەران لە پێشەکییانەوە مرۆڤی بە هاندەری: "موحتاجی" بە تایبەت بە داخوازییەکانی "برسێتی" بەستووەتەوە. ئنجا ئەم پێویستی و موحتاجییەی ئەوانیشی لە ناوەندی ڕێسایەکدا داناوە. بەم کارەش جیهانی لە قڕەوبڕە ڕزگار کردووە و، بەوەش کە "پێویستی"(موحتاجی)ی کردووە بە مامۆستای شارستانێتی، پێشکەوتنی بۆ مرۆڤ هێناوەتەدی.

٩٩ - "بیربچووکی" و "دەروون تەسکی" مامۆستای "هەرزەیی"ن.. "نائومێدی"ش سەرچاوەی "گومڕایی بیر"ە و.. "تاریکیی دڵ"یش کانگای تەنگبوونی ڕۆحە.

١٠٠ - (إذا تأنّثَ الرِّجالُ بالتَّهَوُّسِ ترجَّلَ النِّساء بالتوقح)!

واتە: (ئەگەر پیاوان بە شوێنکەوتنی هەوا و هەوەسبازی خووی ئافرەتانیان گرت، ئەوا ئافرەتانیش ڕەفتاری چەپەڵ و خووی پیاوانی نالەبار دەگرن).

هەر کۆڕێك گیانی "برایەتی" بەسەر ئەندامانیدا زاڵ بێت، گەر ئافرەتێکی جوانیان بڕواتە ناو، یەکسەر دەماری: "ڕیا و حەسوودی و مونافەسە"یان تێدا بە خەبەر دەهێنێت. کەواتە خۆدەرخستنی ئافرەت هۆکارێکە بۆ خۆدەرخستنی ڕەفتارە نزم و چەپەڵەکانی مرۆڤی شارستانیی ئەم سەردەمە!

١٠١ - ئەو وێنانەی کە چەند تەرمێکی بچووك و مردووی خەندەلێون، ڕۆڵێکی گەلێ ترسناکیان لە گیانی گەلحۆ و نەفامی مرۆڤی سەردەمدا گرتووەتە ئەستۆ کە لەم ڕۆژگارەدا بە چڵك و چەپەڵیی گوناهەکانیەوە ئالوودە بووە.

١٠٢ - ئەو پەیکەرانەی کە لە شەرعدا قەدەغە کراون: یان ستەمێکی بەردبوو.. یان هەوا و ئارەزوویەکی پەیکەر بوو.. یان ڕیایەکی بەرجەستەن!

١٠٣ - ئەگەر مەیلی ئیجتیهاد و فراوانکردنی ئایین لە لایەن ئەو کەسانەوە بێت کە بە ڕاستی لە بازنەی ئیسلامدان و هەموو موسەللەماتێکی ئەم ئایینە لە خۆیاندا جێبەجێ دەکەن، ئەوا کارەکەیان بەڵگەی تەواوییە و هەوڵدانە بۆ تەواوکاری.. بەڵام گەر ئەو مەیل و ئارەزووە لە لایەن ئەو کەسانەوە بێت کە ئەو موسەللەماتانەیان پشتگوێ خستووە

كە پێیان دەوترێ: "ما عُلِمَ منَ الدينِ بـــالضرورة" ئـەوا بە دەرچـوون دادەنرێـت لـەو بـازنەیە و مەیلە کەش دەبێت بە مـەیلی ڕووخـاندن و کاولکـاری. چونکـە لـە کـاتی هەڵکردنی ڕەشەبا و تۆف و زریانە ڕووخێنەرەکاندا بەرژەوەندی وا دەخوازێت کـە نـەك هەر دەرگاکانی ئیجتیهاد نەکرێنەوە، بەڵکو پەنجەرەکانیشی دابخرێن.

ئەوانەی کە گوێ بە ئایین نادەن، نابێ نەرمونیانی‌یان لەگـەڵدا بکرێـت، بـەڵکو دەبێ زۆر بە توندی بێدار بکرێنەوە و "عەزائیم"ەکانیان پێش‌چاو بخرێت.

١٠٤ – "حەقیقەتە بەدبەختەکان" چەندە داماون! ئەوەتا کاتـێ دەکەونـە نـاو دەسـتە نزم و عادی‌یەکانەوە، نرخ و بەهای خۆیان لەدەست دەدەن!

١٠٥ – گـۆی زەویمـان زۆر لـە زینـدەوەر دەچێـت! چونکـە ئاسـەواری "ژیـان" دەردەخـات. ئایـا ئەگـەر تـا ڕادەی بارسـتایی هێلکەیـەك بچـووك ببوایەتـەوە، نـەدەبوو بـە جۆرە زیندەوەرێکی ناسکۆڵە؟ یان ئەگەر میکرۆبێك هێندەی گۆی زەوی گەورە ببێـت، ئایا بە وێنەی زەویی لـێ نایەت؟ خۆ ئەگـەر ئـەو میکرۆبە دارای ژیـان بێـت، ئـەوا دارای ڕۆحیشـە. گـەر ئـەم جیهانـەش بـە ئـەندازەی مـرۆڤ بچـووك ببێتـەوە و ئەسـتێرە و هەسارەکانیشی وەکو گەردیلە و "جەوهەری فەرد"یان لـێ بهاتایە، ئایا جیهان ئـەو کاتـە نەدەبوو بە زیندەوەرێکی خاوەن هەست و شعوور؟

خوای گەورە گەلـێ زیندەوەری وەك ئەمانەی هەیە!

١٠٦ – شەریعەتی خوای گەورە دوو شەریعەتە:

یـەکێکیان: ئـەو شـەرعە زانراوەیـە کە لـە سـیفەتی: "کـەلام"ی خـوای گـەورەوە هـاتووە و کـردار و ڕەفتـار و بـارودۆخی ئەم مرۆڤە ڕێکدەخـات، کـە خـۆی لـە خـۆی‌دا جیهانێکی بچووکە.

ئەوی تریان: ئەو شەریعەتە فیتری‌یە هـەرە مەزنەیـە کـە لـە سیفەتی: "ئیرادە"ی خـوای گەورەوە هـاتووە و جموجوڵـەکانی ئەم جیهانـە ڕێکدەخـات، کـە خـۆی لـە خـۆی‌دا مرۆڤێکـی یـەکجار گەورەیـە و، هـەندێ جـار – بـە هەڵـە – نـاوی: "سروشـت"ی لـێ دەنرێت.

مەلائیکـەتانیش نەتەوەیـەکی مـەزنن و، هـەڵگر و نوێنـەر و جێبەجێ کـەری ئـەو فەرمانانەن کە لە سیفەتی "ئیرادە"وە هاتوون و پێیان دەوترێ: "شەریعەتی فیتری".

١٠٧ – (إذا وازنتَ بين حواس حُوينة "مجهرية" وحواس الإنسان، ترى عجبـــاً: أنّ الإنسان كصورةِ "يس" كُتِبتْ فيها سورةُ "يس")!

واتە: (گەر بەراورد لە نێوان هەست و نەستەکانی مرۆڤ و زیندەوەرێکی یەکجار بچووکی مایکرۆسکۆبیدا بکەیت، نهێنییەکی سەیرت بۆ دەردەکەوێت، چونکە دەبینیت: مرۆڤ وەکو ڕەسمی شێوەی "یس" وایە کە سوورەتی "یس"ی تێدا نووسرابێتەوە)!

١٠٨ - فەلسەفەی ماددی پەتایەکی مەعنەوییە، چونکە بوو بە هۆکاری بڵاوبوونەوەی تاعوونێکی سەرسووڕهێنەر لەناو گرۆی مرۆڤدا و گرفتاری غەزەبی خوای گەورەشی کردن. خۆ هەتا قابیلییەتی تەلقین دادان و ڕەخنەگرتن فراوان بکرێت، ئەو تاعوونەش پتر بڵاو دەبێتەوە.

١٠٩ - بەدبەختترین و دڵتەنگترین کەس: مرۆڤی بێکارە! چونکە "بێکاری" برازای "نەبوون"(عدم)ە. بەڵام هەوڵ و کۆشش ژیانی: "بوون" و بێداریی "ژیان"ە.

١١٠ - سوود و قازانجی ئەم بانقانەی کە هۆکاری "ڕیبا"ن، تەنها دەگەڕێتەوە بۆ کافران کە خراپترین و بێکەڵکترینی کەسانی مرۆڤن، هەروەها بۆ ستەمکارترین و هەرزەترینی کەسانی ئەوان.

زیانی "ڕیبا" بۆ جیهانی ئیسلامی زیانێکی سەرتاپا زەق و ئاشکرایە.

ڕەفاهییەتی سەرجەمی ئادەمیزاد ڕەچاو ناکرێت، چونکە "کافری حەربی" (واتە ئەوەی کە لە دۆخی جەنگدایە لەگەڵ موسڵماناندا) ڕێزی لێ ناگیرێت و خوێنەکەشی پارێزراو نییە.

١١١ - ئامانجی وتاری جومعە: یادخستنەوەی ئەو شتانەیە کە لە ئاییندا پێیان دەوترێ: "ما عُلِمَ من الدين بالضرورة" نەك فێرکردنی شتانی نەزەری. خۆ دەستەواژە عەرەبییەکان سەروزیادی ئەوەن کە ئەم یادخستنەوەیە بە باشترین و بڵندترین شێوە ئەنجام بدەن.

گەر بەراورد لە نێوان "ئایەت" و "حەدیث"دا بکرێت، دەردەکەوێت کە: تەنانەت ڕەوانگۆترین ڕەوانبێژانی گرۆی ئادەمیزادیش ناتوانێت بگاتە ئاستی ڕەوانبێژیی "ئایەت" و، دەردەکەوێت کە: "حەدیث" هەرگیز لە ئایەت ناچێت.

* * *

بسم الله الرحمن الرحيم

يا الله، يا رحمن، يارحيم، يا فرد، يا حي، يا قيوم، يا حكم، يا عدل، يا قدوس!

تو حەققی ئیسمی ئەعزەم و حورمەتی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان و ڕێزی پێغەمبەری ئەکرەم ﷺ: هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم کۆمەڵە پەیامەیان بە چاپ گەیاندووە و یارمەتیدەرە بەڕێزەکانیشیان بە بەهەشتی فیردەوس و بەختەوەریی هەمیشەیی شاد بفەرموو. ئامین.. هەمیشە و بەردەوام لە خزمەتی ئیمان و قورئاندا تەوفیقیان بدە. ئامین.. لە بەرامبەر هەر پیتێکی کتێبی (مەکتووبات)ەوە هەزار کردەوەی چاك لە لاپەڕەی کردەوە چاکەکانیاندا بنووسە. ئامین.. بە فەزڵ و میهرەبانیی خۆت دامەزراوی و بەردەوامییان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نووردا پێ ببەخشە. ئامین..

یا ارحم الراحمین! سەرجەمی قوتابییانی پەیامەکانی نوور لە هەردوو دنیادا بەختەوەر بفەرموو. ئامین.. لە شەڕی شەیتانەکانی ئینس و جینی بیانپارێزە. ئامین..

لە قسوور و گوناهەکانی ئەم "سەعید"ە دەستەوسان و بێچارەیەش خۆش ببە. ئامین.

بە ناوی هەموو قوتابییانی نوورەوە:

سەعیدی نوورسی

# پێڕستی بابەتەکان

**بابەت** **لاپەڕە**

* * *

**چەند تێبینی‌یەك:**

١ – مامۆستا نوورسی ئەم کتێبەی لە زمانی تورکی‌دا ناو ناوە (مەکتووبات). ئێمەش ویستمان بە کوردی ناوی (نامەکان)ی بۆ دابنێین، کە واتایەکی پڕاوپڕی ناوە تورکی و عەرەبی‌یەکەیەتی، بەڵام دواتر لەبەر دوو هۆ لەو نیازە لامان دا و، هەر ناوی (مەکتووبات)مان بۆ کوردی‌یەکەشی پەسەند کرد؛ چونکە جگە لەم بەرگە، لە بەرگەکانی تریشدا گەلێ نامەی تر هەن کە دانەر ئاراستەی قوتابیانی خۆی و کەسانی تری کردوون. هەروەك ئەم جۆرە ناوە لە جیهانی ئەم چەشنە باس و بابەتانەدا شتێکی نامۆ نی‌یە، ئەوەتا (مەکتووباتی ئیمامی رەبانی) و (مەکتووباتی کاك ئەحمەد) و.. هتد، لای ڕۆشنبیر و خوێنەری کورد ئاسایی و زانراوە.

٢ – مامۆستا نوورسی خۆی – نەك ئێمە – لە هەندێ شوێنی پەیامەکاندا هەندێ باس دەهێنێت کە لە پەیامێکی تر یان لە بەرگێکی تری سەرجەمی پەیامەکاندا پێشتر هێناویەتی، ئەوەش بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەو بابەتە. تکایە با خوێنەری بەڕێز ئاگادار بێت.

٣ – وەفاداری و پێزانین داخوازی ئەوەیە کە بڵێین: هاوکات لەگەڵ ئەو بەڕێزانەی ناویان لە وشەی کۆتایی کتێبی (وتەکان)دا هاتووە، ئەم بەڕێزانەش لە پێداچوونەوە و هەڵەگیری و پێشکەشکردنی تێبینیی ورد و جواندا بۆ ئەم بەرگەی (مەکتووبات) بەشداری‌یان کردووە، کە بریتین لە مامۆستایان: (هێمن و ئامر) خوا پاداشتیان بداتەوە و هاووێنەیان زۆر بکات.



**خوێنەرانی بەڕێز!**

**لە نیازدایە کە بە پشتیوانی و چاودێریی خوای گەورە:**

# سەرجەمی پەیامەکانی نوور

**بە زمانی کوردی و لە دە بەرگی گەورەدا بخرێنە بەر دەستی ئێوەی بەڕێزەوە.**

**١ – کۆمەڵە پەیامی (وتەکان) بەرگی یەکەمە و، بڵاوکراوەتەوە.**

**٢ – کۆمەڵە پەیامی (مەکتووبات) ئەم بەرگی دووهەمەی بەردەستی بەڕێزتانە.**

**چاوەڕوان بن بۆ بەرگی سێهەم: کۆمەڵە پەیامی (بریسکەکان).**

# المكتوبات

المجموعة الثانية من كليات رسائل النور

التي ألفها: بديع الزمان سعيد النورسي

ترجـــمها من العربية إلى الكردية: فاروق رسول يحيـــى



**THE LETTERS**

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from the Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya



**MEKTÛBAT**

Risale-i Nur Külliyatından

Müellifi:

Bediüzzaman Said Nursi

Kürtçeye Mütercimi:

Faruk Resul Yahya



**نامەها**

دومين كتاب از كليات رسائل نور

**تأليف دانشمند بزرگ: بديع الزمان سعيد نورسى**

**مترجم به زبان كردى: فاروق رسول يحيـى**